# فەرهەنگی شوادا

نوزاد

## عەرەبی - کوردی

شوکت مەلا اسماعیل حسن

التفسير للنشر والاعلان

بۆ بلاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

ناوی کتێب: فەرهەنگی شوان کوردی - کوردی
نوسەر: شەوکەت مەلا اسماعیل حسن
بلاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆبلاوکردنەوەو راگەیاندن/ هەولێر
تایتلی بەرگ: نەوزاد کۆیی
بەرگ : أمین مخلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم١٤٢٨ك - ٢٠٠٧ز
چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە–هەولێر

لە کتێبخانەی گشتی هەولێر ژمارەی سپاردنی (٥٣١) ی ساڵی ٢٠٠٦ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بلاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

## ناوه ڕۆک

**پێشەکی** :

بەردی بناغەی فەرهەنگ وشەیە، کەرەسەی داڕشتنی زاراوە و ڕستەیە، بەلێکدانی وشە ڕستە پێکدێت، ڕستەش بیرو واتای تەواو بەمرۆڤ دەگەیەنێت. بێگومان جیهانی زمان فراوانە و بووەیەکی زیندووە و هەمیشە لەپەرەسەندن و گەشەکردندایە لەگەڵ ئەوەشدا بنچینەو بنەڕەتی نەگۆڕە. ناوەرۆکی ئەم فەرهەنگە بریتییە لەوشەو زاراوە و هاوواتاکانیان و هەندێ ڕستەی ساز و ئامادە و هەندێ لەپەندی پێشینان.

**وشە** : بریتییە لەکورتە زاراوەیەک، واتە: کورتە ڕاز و مەبەستێکی درکاوە و هۆی گەشەکردن و پەرەسەندنی زمانە و هەرکاتێک توانیمان واتای وشە چاک تێ بگەین ئەوا بێ ناتەواوی دەتوانین هەستی خۆمان دەربڕین بەئاخاوتن یان نوسین. تاگەنجینەی وشە فراوانتربێ بواری بیرکردنەوەو درکاندن قوڵتر و گەشەدارتر دەبێ. هەموو ئەو وشانەی لەم فەرهەنگەدان لەبەشە سەرەکیەکانی ئاخاوتن دا هاتوون، بەوێنە ناو، ئاوەڵناو، کردار، ئاوەڵکردار، . . . .تاد.

**زاراوە**: زاراوە لەڕێزماندا بەشتێکی تایبەتی نییە، لەبەشەکانی ئاخاوتن، بەڵام کەلێنێکی دیاری داگیرکردوە لەوشەسازیدا.

بیری نوێ پێویستی بەوشەی نوێ و لەیاد نەکردنی وشە و زاراوەی کۆنە ئەگینا دەربڕینی مەبەست ناتەواو دەردەکەوێت. زۆربەی ئەو وشە نوێیانەی ئەمڕۆ لەپێویستی ژیان و باسەکانی چەرخەوە دێنە کایەوە بریتین لەزانیاری و تەکنەلۆژی و دەروون ناسی و ڕامیاری . . .تاد. بیری نوێ بەهۆی داڕشتنی زاراوەی نوێوە دەردەبڕێت و زاراوەش بەلێکدانی دوو یا سێ یا زیاتر لەو وشانەی لەئارادان پێکدێت و سوودی تەواو دەبەخشێت. لەوانەیە دەیان وشە و زاراوە بەرچاوبکەون کەلەوە پێشتر نەگونجاوبوون و لاخروان بەڵام ئەمڕۆ لەنوسین دا بەکاردێن و کەلێن پڕ دەکەنەوە. لەبەر چۆنێتی و تایبەتی زاراوە باشتر وایە بەشێوەیەکی گشتی تێی ڕامێنین و فێری بین و لەباری گونجاودا بەکاری بێنین و هەوڵ بدەین لەچوارچێوەی دەستوری ڕێزمان دەرنەچین.

زاراوەش سەرمایەی زمانە ، بێ زاراوە ئاخاوتن و نوسین وەبەر نایەت و زاراوەش زۆر شێوازی هەیە هەندیکی نارێکە بەڵام واتاکەی ڕوون و ڕەوانەو هەندیکیشی لەشێوازێکی ڕێکوپێکدان بەڵام واتەکەی نادیارو شاراوەیە و کۆمەڵی سێیەمی شێوازەکەی سانا و سوکەڵەیە لەسەر زمان بەڵام واتاکەی نەگونجاوە. زۆربەی زاراوەکان لەلێکدان و پێک

بەستنی ناو و ئاوەڵناو پێکدێن و بەشێکی دیکەشیان لەلێکدان و پێک بەستنی کردار وپرێپۆزیشن (ئامرازی وە پاڵخستن) یان بەشەکانی دیکەی ئاخاوتن لەگەڵ(پارتیکل) دا پێکهاتون. واتە: زاراوە یان ئیدیۆم، چەند وشەیەکی لێکدراوە، ئەگەر ویکراپەکارهێنرا واتا یەک دەبەخشێت جیاوازە لەگەڵ واتای هەر وشەیەک لەوشەکانی ئیدیۆمەکە.

**هاوواتا** : مەبەست لە(هاوواتا) ئەوەیە کەوشەیەک، یەک یا دوو یان زیاتر وشەی لەهەمان واتای دەقاودەق و گونجاوی خۆی هەبێت و بەرامبەری دابنرێن یان واتایەکی زۆر نزیک لەخۆی بۆ دیاری کرابێت.

**پەندی پێشینان** : بێژەیەکی سوکەڵەو ساناي سەر زمانە بۆ مەبەستی ئامۆژگاری و ووریاکردنەوە و پێشبینی و سەرنج دان و تێرامان یان شیکردنەوەی هەڵویست بەکاردەهێنرێت و هەندێ پەند ووتەیەکی فۆلکۆرییە و هەندیکی دیکەیان پتەوترە و فەلسەفەیە. بێگومان پەند دەماودەم لەباوباپیرانەوە بۆمان ماوەتەوە و زۆریشیان لەتێکستە کلاسیکییەکانەوە دەستاودەست پێمان گەیشتون و پێوەندی نێوانیان پتەوە.

**رستەی ساز و ئامادە** : مەبەست رستەی کوردیی سازکراو و رەوان و پاراو و نەستەقە و لەوانەیە لەداهاتودا هەندێکیان بچنە ریزی پەندەوە.

## <u>چۆنیەتی بەکارهێنانی ئەم فەرهەنگە</u> :

دارشتنی ئەم فەرهەنگە لەسەر چوۆنییەتی ئەو فەرهەنگانەی لەوەو پێشتر دانراون، هێنراوەتەکایەوە و ناوەرۆکەکەی وشە بەوشە یان زاراوە بەزاراوە...تاد، یەک لەدوای یەک بەگوێرەی زنجیرەی ئەلف و بێی ئێستا نوسراونەتەوە.

هەر وشەیەک یان زاراوەیەک سەرنامەی زنجیرەی واتاکانی خۆیەتی و ئەگەر (فرە واتا)شی هەبێت لەشوێنی خۆیدا دوا بەدوای نوسراونەتەوە. واتە: هەر وشەیەک سەر ووتاری (واتا) یا (هاوواتا) یا (فرەواتا)ی خۆیەتی و خوێنەری هێژا دەتوانێ یەکسەر بێ گیر و گرفت بەگوێرەی داخواز بەکاریان بێنێت. جا ئەگەر ئەم فەرهەنگە کەلێنێک لەکتێبخانەی کوردیدا بگرێت و بێتەجێی رەزامەندی خوێنەری بەرێز ئەوا دەبێتەمایەی شانازیم.

## <u>سەرەتای ئەم فەرهەنگە</u> :

<u>**زمان**</u>: دیاردە و بەشێکی پێبەند و نەپچڕاوی کۆمەڵگا و جم و جۆڵی رۆژانەی مرۆڤە ئامازەکەری قوڵیی مێژووی میللەتە و هێمای رابردوو جێماوی شارستانێتی دێرینی و

دانەرو دروستکەری بیروهۆشی و دەرخەری تیبینییەتی بەرامبەر ئەو جیهانەی میللەتی گرتۆتەباوەشی لەدێر زەمان و ئیستا و داهاتوودا...

زمان ئامرازی بیروهۆشە و هیمای هەموو ئەو بیروهۆشانەی مرۆڤن کەلەوانەیە لەبنەڕەتدا گشتیان هەر لەیەک سەرچاوە هەڵقوڵابن. وەکو ئاشکرایە زمانانی میللەتان جۆراوجۆرن وهەر میللەتە بەگوێرەی زمانی زگماکی خۆی دەئاخەوێ و پێویستییەکانی ژیانی پی ڕاڤەدەکات. بەڕای ئەرستۆ: زمان دەبێ بەگوێرەی ئەو ڕێزمانە ڕەفتاربکات کەلەبنچینەوە بۆی ماوەتەوە و لەسەری ڕاهاتووە و دەبێ نوسین و ڕێنوسی وێنەو ڕەنگدەرەوەی چۆنیەتی دەربڕینی وشە و زاراوەی زگماکی خۆی بێ.

زمان لەهەموو داب و نەریتێکی دیکەی مرۆڤ زیاتر ڕۆڵ و دەستی باڵای هەیە لە دیاری کردنی چارەی خۆ نوسیی ڕەوت و پێش خستنی نەتەوە یا میللەتدا، دەرخەری ئەو پێوەندییە گرنگانەیە کەلەنێوان ئاخاوتن و نوسین و ڕێزماندا هەن... و دیاریکەری وانە مرۆڤایەتییەکان و زانیاری و زانستەکانە. وەپێشەوە چونی زمان بەردەوامە و لەهەڵقوڵیین و گەشەکردندایە، بەڵام لەسەر هەمان بنج و ڕیشەی نەگۆڕی خۆی...، واتە زمان بەردەوامە لەنشونەمای مرۆڤانەی سروشتی خۆی لەهەموو بوارێکی بیر و هۆش و زانیاری نەتەوەدا.

ئیستا زمان بوەتە هۆی دەستاوێژێکی دیموکراسی بەکار و پڕ تەوژم و چالاک لەژیانی جەماوەردا.. بۆیە چاودێری کردن و خەمخۆری لی کردن و بەتەنگەوەهاتنی زمان لەئاکامدا بەرهەمێکی ڕامیاری و کۆمەلایەتی و ئابووری وەدەست میللەت دەخات.

**<u>واتای وشەی فەرهەنگ لەزماندا</u>**: پەروەردە، دانایی، زانیاری، زانست، وێژە، پەڕاوی وشە و زاراوەی زمانی نەتەوەیەک یان میللەتێک. وشەی (قاموس) یش بەم واتایانەی خوارەوە دیاریکراوە: دەریا یان زەریا، قوڵی، ناوەڕاستی دەریا، بەشێکی زۆر لەدەریا، قوڵترین پارچە لەناوەڕاستی دەریادا... بەڵام لەوکاتەوەی (محمد فیروز ئابادی ١٣٢٩-١٤١٤ز) بۆ کتیبەکەی خۆی (القاموس المحیط) وشەی (قاموس)ی بەکارهیناوە.. وشەی قاموس لەزمانی عەرەبیدا بوە بەهاوواتای(معجم) و ئیستا هەندێ نوسەری کوردیش وشەی(قاموس) لەجیاتی وشەی (فەرهەنگ) بەکاردینن.. و لەو ساتەوە وشەی(قاموس) وەک هاوواتای: ( قوڵیی، پان و بەرینی، فراوانی {لەزمانی نەتەوەیەکدا} ) بەکاردەهینرێ.

بەلام وشـەی [Dictionary] ئینگلیـزی پـیتگۆرکەی وشـەی ( Dictionarius یان Dictionarium )ی لاتینییە و بەواتای {لیستەی(وشە یا زاراوە )} پاچڤەکراوە و ئـــەمیش دەگەریتـــەوە ســـەر وشـــەی ( Dictiones ) بـــەواتا {وشـــە یـــا زاراوە } . فەرهەنگسازی ئینگلیـزی ( جـۆن گارلانـد John Garland ) لەسـالی ١٢٢٥ز بـۆ یەکـەم جار ئەم وشەیەی داناوە بۆ ناونیشانی پەراویک کەبریتی بـوە لەکۆمـەلێ وشـە و زاراوەی لاتینـی واتاکـانی بـەئینگلیزی پاچـڤەکردوە بەپـۆل پـۆلی جیـاواز و هـەر پـۆلە سـەبارەت بەزانیاریەک. نزیکەی ٣٢٠ سال لەمەوبەر ( ١٦٨٢ز) {سـەیدایێ مـەزن ئەحمـەدی خـانی} یەکـەم فەرهـەنگی دوو زمـانی ( عـەرەبی - کـوردی )ی دانـاوە لەدوو تـویی پـەراویکدا بـەناوی( نەوبـەهارا بچوکـان ) و ئـەم ناونیـشانەی خـستوەتە بـری وشـەی ( فەرهـەنگ یـا قاموس ). لەپارچە هۆنراوەیەکدا کـەبۆ پیـشەکییەکەی دانـاوە دەفـەرموێ { ئـەڤ چەنـد کەلیمـە ژ لۆغاتـان ...}، واتـە: ( ئـەم چەنـد وشـانەی لەهـەردوو زمـانی ( عـەرەبی - کـوردی )دان... ) .. ئـەو نیـوە بەیتـەی هۆنراوەکـەی خـانی نزیکـە لەپاچـڤەی وشـەی (Dictionarium )ی لاتینیەوە. دوای سەیدای مەزن بەنزیکەی ٣٠٠ سـال مامۆسـتای هێژا (شیخ محمدی خـال ) یەکـەم فەرهـەنگی یـەک زمانی ( فەرهـەنگی خـال، کـوردی - کـوردی ) دانـا لە ١٩٥٩\٨\٣٠ز کـە بـە گـولیکی گەشـاوەی زمانی کـوردی دەژمیـردرێ و دیاردەی هاتنەکایەوەی تاقیکردنەوەیەکی پیشکەوتوانەی نوێیە لەبـواری فەرهەنگسازی یـەک زمانیـدا ( Monolingual ) و داردەسـتی فیرخـوازە و ئامـرازی مامۆسـتایە و کانیـاویکی روونـی وشەسـازیە.. بـەکورتی واتـا و راڤـەی ئـەو وشـە و زاراوانـەی لەفەرهەنگەکەیدایە روون کردۆتەوە. لەبواری فەرهـەنگی دوو زمانیـشدا ( Bilingual ) {هەنبانە بۆرینە - فەرهەنگی کوردی - فارسی} یەکەی مامۆستا و شاعیری کوردپەروەر عبدالرحمان شەرەفکەندی ( هەژار ) - ١٩٨٩ز گەنجینەیەکی پر گەوهەری زمـانی کوردییـە و یاسای بەرز و بەلگە و رابەری ئاخاوتنی پاک و پوخت و دەستنیشانکەری رادەی بەرزی زمانی نەتەوەی کـوردە، بـەهۆی فەرهەنگەکەیـەوە نهێنییـەکانی وشـە و زاراوەی کـوردیی پـەیجۆر کـردوە و وشـەی هاوواتـا و هاومەبەسـت و گونجـاوی بـۆ بەشـە فارسـییەکەش نەخشاندووە...، هەنبانە بۆرینە پاریزەریکی گرنگ و رەنگدەرەوەیەکی پـر کـیش و پـیش کەوتوی زمانی میللەتی کوردە لەم سەردەمەدا.

**ڕاڤەو ڕۆڵی فەرهەنگ**: فەرهەنگ سەرچاوەیەکی سەرەکییە کەلەدوو تویدا بەزنجیرەی ئەلف و بێ وشە و زاراوەی نەتەوە یامیللەتێکی تێدا نوسراونەتەوە و واتاکانیان لێکدراونەتەوە و هەندێکیشیان لەڕستەی جۆراوجۆردا بەکارهێنراون بۆ مەبەستی ڕوونتر و ئاشکراتر کردن و یەکالآکردنی واتایان .. و یاریدەدەری مرۆڤە هەر ساتێک بیەوێ لەکاتی خوێندنەوەدا واتای وشەیەکی پەنهانی بۆ ڕوون بێتەوە یان بۆ ئەوەی لەکاتی نوسیندا واتای وشەیەکی نادیاری تێدا بدۆزێتەوە پەنای بۆ دەبات، هەروەها بۆ وەدەست هێنانی زانیاری پێویست لەبارەی دارشتن و شێوەی درکاندن و دەربڕینی ئەو وشەیە و ئیشەکانی و مێژووی دروست بونی ئەو ئاڵ و گۆرەی بەسەری هاتوە یان هەر گۆڕانێکی دیکە لەشێوازەکەیدا و نیشاندەری چۆنیەتیی بەکارهێنانی بەپێی شوێنی خۆی لەبەشەکانی ئاخاوتندا.. و ئەوەندەی بتوانرێ وێنە و نەخشە و هێلکاریش خولی خۆیان دەبین لەدەرخستن و ئابیدەکردنی هەندێ لەوشەکاندا.

زمان مل کەچی فەرهەنگە چونکە تۆمارەی پێشکەوتنیەتی و ئاوێنەیەکی ڕاستە و ڕاست و دەرخەرو ڕەنگدەرەوەی بارودۆخی پلەی بەرەوپێش چونی بیر و هۆش و شارستانێتی بەکارهێنەرانیەتی لەو سەدەیەدا کەتێیدا دێتە کایەوە .. پێش کەوتنی ئەم پێش کەوتنی بیر و هۆش و زانستی تەواوی ئەو نەتەوەیەیە، چونکە فەرهەنگ و زمان دەست لەناو دەست و شان لەشانی یەکترن بەدرێژایی چەرخی زەمان و پێوانەیەکە هەڵسەنگێنەر و پیشاندەری پێوەندی نێوان مێژووی خوێنەران و ڕۆشنبیرانی ئەو میللەتەیە کەبەوشەکانی دوو توێ دەئاخون یا دەنوسن.

فەرهەنگ شان بەشانی زانست بەرەوپێش دەڕوا و تۆمارکەری مێژووی هاتنەکایەوەی وشە و زاراوەنوێیەکانی زمانە و تەنانەت دەرخەری ئەو تاقیکردنەوە و تێبینیانەیە کەبەسەر ژیانی ئاخاوتەرانی ئەو زمانەدا هاتوون.

فەرهەنگ پێشخەر و هاندەر و تۆمارکەری زانیاری پڕ پیت و پتەوە و پاک کەرەوەو ڕاست کەرەوەی زمانە لەوشەی هەڵە و تێهەڵقوتاو و تێ هەڵاخنراو و هەلآزندراو... بۆیە دەتوانین بڵێین فەرهەنگ بەرهەمێکی گرنگ و پڕ بایەخە لەبەرهەمەکان و بەخششی زانیاری و شارستانیی نەتەوەکەمان.

**فەرهەنگسازی Lexicography** : مەبەست ئیش و کار و پیشەو هونەر و کۆکردنەوە و نوسین و دانان و دروست کردنی فەرهەنگە. هەستی نەتەوایەتی. یەکەم

پاڵ پێوەنەرو ھاندەری فەرھەنگسازە بۆ پاراستن و پێش خستنی زمانی میللەتەکەی و ھەمیشە ئاواتەخوازە و ھەوڵ ئەدا بیگەیەنێتە رادەیەکی پاك و پوخت و سازگار.

پایەبەرزی و شکۆمەندی دێرینی نەتەوە یا میللەت لەنوسەران و زانایان و رۆشنبیران و فەرھەنگسازانیەوەیەتی.

فەرھەنگسازی، زرنگی بیر و ھۆشی دەوێ و شارەزایی یان توانای لێ تێ گەیشتنی زانست و زانیاری ھەمە چەشنەش.. لەکاتێکدا بەکارھێنەری فەرھەنگ بوارو مەودای سوود وەرگرتنی بەستراوە بەئاسۆی ئەو زانست و زانیارییەی کەھەیەتی و ھەروەھا ئەو ھەوڵ و تەقەلایەی ئەیدات بۆ لێ تێ گەیشتن و فێربونی وشە و زاراوەی دیکە لەبواری ئارەزوو ویستی خۆیدا.

فەرھەنگساز بۆی نییە لاگر بێ و تەنھا بەئارەزوو ویستی خۆی وشە و زاراوە بسەپێنێ بەسەر فەرھەنگەکەیدا، بەڵکو پێویستە لەسەری وشەو زاراوە لەدۆخی چینی کۆمەڵایەتییەکەی خۆیدا تۆمار بکات بۆ ئەوەی فەرھەنگەکە و فەرھەنگساز جێی بڕواو متمانەی خوێنەربن.

ئەرکی زۆر و دەردەسەریی وشەونخونی فەرھەنگساز لەپێناوی نوسین و داڕشتنی ناوەڕۆکی فەرھەنگەکەیدا جۆرێکە لەزۆرانبازی لەنێوان ئومێد و نائومێدیی و گەشبینی و ڕەشبینیدا، لەکاتی ئەو قۆناغانەدا کەپێیدا تێپەردەبێ تائەو ڕۆژەی فەرھەنگەکەی لەچاپ دەدرێ و ڕووناکی دەبینێ بەڵام بەرھەمی ئەرك و ڕۆژانەی فەرھەنگساز تەنھا چرا و ھۆی دڵشادیی و خۆشنودیی ھەمیشەییەتی .

**ئەم فەرھەنگە**: مەبەست لەم فەرھەنگە بەشداری کردنە لەچاك کردن و پاك کردن و چەسپاندنی وشەی کوردیدا، بۆ ئەوەی ڕۆڵی تەواوی خۆی ببینێ وسەرچاوەیەکی دڵنیا بێ بۆ خوێنەری ھێژا و پاکەرەوەی ڕێگە وڕێباز و بواری دانانی فەرھەنگی دیکەی (کوردی - کوردی، کوردی) بێ و نیشانەیەکی دیارو ڕوون بێ لەسەر ڕێگەی پەرەپێدان و پێشخستنی فەرھەنگسازی کوردیدا.

لەدوو توێیدا کاکڵەو پوختەی گەنجینەی وشە و زاراوەی ھەموو دایەلیکتەکانی کوردستانی گرتۆتە خۆی کەلەناوجەرگەی کوردستاندا لەدایك بوون و نشونەمایان کردوە و چەسپاون بۆ ئەوەی لەشێوەی زاری یەك ناوچەدا نەبێ و بۆ ھەموو کوردێ لەھەر چوار قورنەی کوردستاندا دەست بدات، و بێتەھۆی چەسپاندن و یەکگیربونی دایەلیکتەکان

لەداهاتودا و خاوێن کردنەوەی زمان لەپەرش و بڵاوی و نەگونجاوییەک کەهەبێ و سوودبەخش بێ بۆ مەبەستی زانست و زانیاری وپێویستی ڕۆژانەی هەمەچەشنە.

تەنانەت هەندێ وشە و زاراوە کەبارودۆخی کۆمەلایەتی تایبەتی نزمیان هەیە، لانەبراون، لەبەرئەوەی خۆیان و دژە واتاکانیان ڕۆڵێکی جیاوازیان هەیە لەدەوڵەمەندکردن و بەرفرەکردنی مەودای زماندا.

دۆزینەوە و دارشتنەوە و یەکالاکردنەوە و چەسپاندنی واتاو ڕافەی وشە و زاراوەکان ئەرکێکی گرنگ و کاتێکی زۆر دەخایەنێ کەدەقاودەق و گونجاوبن لەئاستی یەکتردا. دانەر ئەوپەڕی هەوڵی داوە کەئەم فەرهەنگە بەرهەمێکی تەرزەنوێ بێ و لەسەربنچینەیەکی پتەو بێتەکایەوە و بەڕێنوسێکی ئاسایی پێش کەش بکرێ، چونکە ڕێنوس بەشێکی گرنگی نوسینە و ئاسانکەرو هۆی دەربڕینی وشەیە بەڕاست و ڕەوانی. چەندان وشەی سەر بەئامراز و ماشینی دەستیی و فۆلکلۆری کوردی هێنراونەتە کایەو هاوواتای گونجاوی بۆ دانراوە. هەروەها دانەر کۆششی کردوە واتا و هاوواتای وشە و زاراوەکان لەهەمان بەشی ئاخاوتن بن لەڕێزماندا و یان ڕافە و وشەی مەبەست گونجاو ولەبار و لۆجیکاڵ بێ و سەر بەهەمان بەشی زانیاری، هونەریی ...بێت. برادەرێکی ئەدەب دۆست لەهەڵسەنگاندنی بەشی (ئـ) کەلە ١٩٨٩\٨\٢٩ز دا لەچاپ دراوە دەڵێ:" ئەم فەرهەنگە بریتییە لەسێ فەرهەنگ لەدوو توێیەک پەڕاودا. . چونکەدەتوانرێ وەک فەرهەنگێکی (کوردی-ئینگلیزی، کوردی- کوردی، ئینگلیزی -ئینگلیزی) یش بەکاربهێنرێت...."

لەبەرئەوەی زمانی کوردی بەشێکە لەبەشەکانی زمانی هیندۆ - ئەورووپی کۆن و لەخێزانی هیندۆ- ئێرانییە و هەروەها بەهۆی مێژوو ئاین و بارودۆخی ڕامیاری و جوگرافی وکۆمەلایەتییەوە و ئەو پێوەندییە دێرینەی هەیبوە لەگەڵ عەرەب وعوسمانیدا و گەلێ زمانی دیکەش. . . بەگوێرەی پێویستی یان ناچاری دەیان وشەی خواستوە لەزمانی ئەو میللەتانەوە و لەبۆدەقەی زمانی کوردیدا تواونەتەوە و ئاڵ و گۆڕی تەواو بەسەر زۆربەیاندا هاتووە و بوون بەبەشێکی ڕەسەنی زمانی کوردی .. بۆیە بەپێویست نەزانراوە ئاماژە بکرێ بۆ (سەر بووردەی مێژووی ئەو وشانە ) [ Etymology ]. هەندێ وشەی کوردی بەڕواڵەت زۆر ساکار و سووکەڵەن لەسەر زمان بەلام تەنها یەک هاوواتا بۆ هەر یەکێکیان دۆزراوەتەوە و بەکورتە ڕستەیەکی پتەو و بەچێژ ڕافەکراوە و نەخراوەتەپشت

گویّ چونکه لەوانەیە دوای چەند چاخێکی دیکە هەمان وشە زنجیرەیەک واتای بەپیت و جۆراوجۆر و بیری نویّ و یەکدگیر بگریتە خۆی یان واتا بنچینەییەکەی بگۆڕدریت بۆ واتای خوازەو درکە یان بەراوردکاری.

**ڕوونکردنەوەیەکی زیاتر لەبارەی:**

- **وشە Word**: ئەو هێمایەیە کەمرۆڤ بیرو هەستی خۆی پیّ دەدرکینیّ (یان ددری دەبڕیّ)و بریتییە لەپێوەرێکی ووردبینی بیری مرۆڤ لەهەموو کات و شوێنێکدا.
- **هاوواتا Synonym**: ئەو وشانەن کەماناکانیان دەقاودەق چۆن یەکن یان هێماوڕابەری هاوبەشیان لەنێواندایە و پێبەندی یەکترن، یان وشەیەک کەدەکەوێتە ناو کۆمەڵیّ وشەی هاوپێبەند و هاو هێما و ڕابەری ڕاست و دروست و پڕسوودیان هەبیّ لەئەو ئاخاوتنەدا کەتێیدا بەکاردەهێنرێن. تەنها پێوانەیە کێش بۆ چارەکردن و دڵنیابوون لەهاوواتا ئەوەیە کەئەو وشەیە بگونجیّ لەگەڵ ئاخاوتن و بیر و ئەو هەڵویستەی دەویستریّ ڕاڤەبکریّ و ڕوون بکرێتەوە.
- **دژەواتا Antonym** : وشەیەک کەلەواتادا بەرەنگاربیّ بەوشەیەکی دیکە، دانانی دژە واتا بۆ وشەیەکی سەرەکیی ڕێنیشاندەر و ڕاڤەکەرێکی پڕ چێژ و بەپیتە بۆ خوێنەر کەبتوانیّ جیاوازیی نێوان واتای وشەکان بەڕوونتر و ئاشکراتر تێبگات، دژە واتا یەکسەر لەدوا کلکەی وشە یا زاراوەکەوەدە نوسریّ.

**زاراوە یا ئیدیۆم** : یەکەیەکی یەکگرتوی فەرهەنگییە لەدوو سیّ وشەی سادە یا لێکدراو پێکهاتوە و دەچێتە ناوەڕۆکی ڕستەوە و پێویستی بەدەستنیشانکردن و فێربوونە و بەشێکە هەروەک بەشەکانی دیکەی ناوەڕۆکی فەرهەنگ. واتە: بەشێکی گرنگ و بەپێزی ئەو ڕستەیەیە کەمرۆڤ لەکاتی ئاخاوتن یان نوسیین دا بەکاری دەهێنیّ.

- **خوازە و درکە Metaphor and Metonymy**: بەکارهێنانی وشە لەدۆخی خوازە و درکە دا بڵاوترین و یان وبەرینترین ڕێگەی پەرە پێدان و گۆڕانکاری کردنە لەواتا و بەکارهێنانی وشەدا.
- **چاوگ{دۆخی ژێدەر} Infinitive**: وینەیەکە لەجۆرەکانی کردار، لەڕووداوێک یا دۆخی ڕوداوێک دەدویّ بیّ ئەوەی ئاماژە بکات بۆ :-

هیـچ کەسـانێ لەئاخاوتـەر( پەیـڤەر )، دوانـدراو، غایـب ، دووانـە یـان نـاوی کـۆ: ( خـۆی نابەستیتەوە بـەژمارە، کـەس، یـان نیهـادەوە( واتـە موبتەداکەیـەوە ) ) لەزمـانی کوردیـدا ڕۆڵی( ناو )یش دەبینێ، واتە وەکێ ( ناو )یـش بـەکاردەهێنرێ. کەواتـە ( چـاوگێ ) وشـەیەکە بەواتا ( ڕوودانی کار )یان ( دەرکەوتنی ئاوەڵکردار )، دۆخێکی ( کردار )ە بـێ دیـاریکردنی کات، بویە پێی دەوترێ ( چاوگێ ) چونکە ژێدەری ناوو کرداری دیکەیە، نیشانەی ( چاوگێ ): ( تـن )، ( دن )، ( ون )، یـا ( ان )ە لەکۆتـایی وشـەکەوە، بەمـەرجێ هـەرکاتێ( ن )ەکـە لابـرا ( کرداری ڕابردوو ) بمێنێتەوە، وەک: ( ڕۆیشتن، ڕابوردن، چوون، ڕسـکان )، دوای لابردنـی ( ن )ەکە: ( ڕۆیشت، ڕابورد، چوو، ڕسکا ) ماوەتەوە....

**وشـە**: لەدایـک دەبێـت و پـیر دەبـێ بـەلام بـەهۆی دوو تـوێی فەرهەنگـەوە بەنـەمری دەمێنێتەوە.

بـێ گومـان **فەرهـەنگ** وشـەدانێکە بـۆ فێربـون و لـێ تێگەیـشتنی( واتـای ) وشـە و لەبـەرکردنی ( ڕێنوسـەکەی )بـۆ کـاتی نوسـین و ڕەوانکردنـی ( دەربڕینیـشی )بـۆ کـاتی ئاخاوتن.

ئەو وشەیەی مرۆڤ یەک جار لەژیانیا بەکاری دەهێنێت، دەبێ هەمیشە لەیادیا بـێ!، یان هەر هیچ نەبێت لەدوو توێ فەرهەنگێکی کتێبخانەکەیدا هەبێ.

لەم فەرهەنگەدا دەیان وشەی کوردی کۆن و لەبیر چوو و شاراوە هێنراونەتەوە کایە و هاوواتا و فرەواتای شیاو و گونجاو وشیاویشیان خراونەتەپاڵ، دەتوانین بڵێین.......

ئەم فەرهەنگەی لەبەردەستی خوێنـەری هێژادایـە ڕابـەرێکی سوودبەخـشە بـۆ وەدی هێنـانی ئاخـاوتن و نوسـینێکی پـڕ کـێش و برشـتدارو بەشـێوەیەکی ئـەوتۆ داڕێـژراوە کەخوێنەری بەڕێز بتوانێ بەئاسانی وشە یان زاراوەی مەبەست بدۆزێتەوە و بەکاری بێنـێ بۆ دەربڕینی هەستی خۆی چ بەئاخاوتن چ بەنوسین.

لەپێـشەکی پـیتی ( ئــ ) ڕوونکردنەوەیـەک لەبـارەی وشـەی هاوواتـا و ئیدیۆمـەوە پێشکەش کراوە، بەشێویەکی گشتی ( ئیدیۆم ) لەم فەرهەنگەدا بریتییە لە:

أ- دوو، سێ، یان پتر، وشەی لێک بەستراو.

ب- زاراوە.

جـ- کورتە زاراوە و ڕاوێژی خۆبەخۆ نەگونجاو و فریزۆلۆژیی نائاسا.

د- پەند و باوو وشەی نەستەق.

سەرەنجام دەتوانین بلێین : ئیدیۆم، بریتییە لەچەسپاندنی واتایەکی نوێ بەسەر کۆمەڵێ وشەی لێکدراودا کەلەوە پێشتر هەر وشەیەک لەو کۆمەڵە واتای تایبەتی خۆی هەبووە. ئیستاش دوای پێداچوونەوەی پیتی( ئـ - ئە لف ) و دانانی وشەی سەروتاری ئینگلیزی بەرامبەر وشەی سەرنامەی کوردی ونوسینی دەربڕینی وشەی سەرەکیی کوردی بەپیتی لاتینی ئەوا پیتەکانی ( دیکەش ) یش خراونەتە پاڵ پیتی ( ئـ -ئـە لـف ) و پێشکەشتانی ئەکەم.

دانەر

**سه رچاوه سه ره کیه کورد یه کان**


١- **فەرهەنگی خاڵ** کوردی - کوردی. دانەری : **شێخ محمدی خاڵ** . **چاپخانەی کامەران** - سلێمانی ١٩٥٩\٨\٣٠ز.

٢- **فەرهەنگی مەردۆخ** کوردی - فارسی - عەرەبی. دانەری : **ئایەتوڵلای کوردستانی شێخ محمد مەردوخ**. **چاپخانەی ئارتەشی** - تاران ١٩٥٦ز.

٣-کوردستان. فه رهه نگی کوردی - کوردی . دانه ری : گیو موکریانی . ده زگای چاپ وبلاوکردنه وه ی ئاراس.چاپی یه که م -١٩٩٩ هه ولێر.

٤- **قاموسا** سه لاحه دین ، ئینگلیزی - کوردی .سه لاح سه عدالله .چاپا یه که م ١٩٩٨.

٥- **فەرهەنگی لەک و لور.** دانان وکۆکردنەوەی: **حەمیدی ئیزەد پەناه.** لێدوان و بەراوردکردنی : **مەحمود زامدار.** **چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد** - بەغدا ١٩٧٨ز.

٦- **هەنبانە بۆرینە**، فەرهەنگی کوردی - فارسی (یەک جلدی). دانانی **عبدالرحمن شرفکندی (هەژار)**. **چاپخانەی پویا** - ١٩٩٠ز.

دانــەر



شوكت ملا اسماعيل حسن

لەڕێکەوتی ٢٢ / ٤ / ١٩٣٧ لەشاری سلێمانی .گەڕەکی گۆیژە . لەدایك بووە.

خوێندنی سەرەتایی‌و ناوەندی‌و دواناوەندی لەهەمان شار تەواو کردووە.

ساڵی ١٩٥٧ لە کۆلیژی پۆلیس لەشاری بەغداد وەرگیراوەو لەساڵی ١٩٦٠ تەواوی کردووەو بووە بە ئەفسەر لە هێزی پۆلیسی گەڕۆك.

دوای تێپەڕبوونی سێ مانگ بەسەر بەرپابوونی شۆڕشی ئەیلولی مەزن لەساڵی ١٩٦١، چۆتە ریزی هێزی پێشمەرگە لە بارەگای سەرۆك بارزانی نەمر و دوای دە ڕۆژ یەکەم بنکەی بێتەلی گەڕۆکی سەر بە بارەگای بارزانی نەمر بەناوی (ئاراس)ەوە دامەزراندووە لەو ڕۆژەوە بووە بە لێپرسراوی گشتی دەزگای بێتەلی شۆڕش و لە هاوینی ساڵی ١٩٦٢دا یەکەم شیفرەی بۆ بارەگای بارزانی نەمر و هێزەکانی پێشمەرگە داناوەو هەر لەسەرەتای ساڵی ١٩٦١ەوە پسپۆڕییەکی تەواوی نیشان داوە لە شیکردنەوەی شیفرەی سەرجەم هێزە چەکدارەکانی سەر بە ڕژێمی عیراق بۆ سودی شۆڕش.

لەدوای ڕێکەوتننامە مێژووییەکەی ئازاری ١٩٧٠، کرا بە فەرماندەی (فەوجی پێنج . حرس حدود)ی سەربە شۆڕش و لەهەمان کاتدا فەرماندەیی هێزی کەرکوکی پێ سپێردرا.

لەدوای دەست پێکردنەوەی شەڕ لەنێوان شۆڕش و هێزەکانی رژێمی بەغداد لەساڵی ١٩٧٤دا بۆتەوە بە بەڕێوەبەری گشتی دەزگای بێتەل و شیفرە، دوای نسکۆی ساڵی ١٩٧٥ دوورخراوەتەوە بۆ شاری (سماوە) لە خواروی عیراق و هەر لەوێ‌و بەمەبەستی خزمەتکردنی نەتەوەی کورد دەستی داوەتە فەرهەنگسازی‌و ماوەی (١٦) ساڵ بەم کارەوە خەریك بووە و ئەم فەرهەنگەی هێناوەتە بەرهەم.

دوای ڕاپەڕینە مەزنەکەی ساڵی ١٩٩١ گەڕاوەتەوە سەر کار و بە پلەی لیوای پۆلیس دامەزراوەو لەساڵی ١٩٩٤ لەسەر داوای خۆی خانەنشین کراوەو چۆتە وولاتی ئەڵمانیا و ئێستا لەوێ نیشتەجێیە.

## لیستەی ئەو کورتە وشە و نیشانانەی لەم فەرهەنگەدا بەکارهێنراون
## List of Abbreviations and Symbols used in this Dictionary .

### ABBREVIATIONS
ABBREVIATIONS

| | | |
|---|---|---|
| art. Article. | ئامراز | ئـ |
| zool. Zoology. | ئاژەڵ ( ئاژاڵ - ئاژاڵناسی ) | ئا |
| adv. Adverb. | ئاوەڵکردار | ئاک |
| adj. Adjective | ئاوەڵناو | ئان |
| c. adj. Compound adjective | ئاوەڵناوی لێکدراو | ئانل |
| conj. Conjunction. | ئامرازی پێوەندی | ئپ |
| id. Idiom. | ئیدیۆم | ئد |
| Astro. Astronomy (Astrology). | ئەستێرەناسی | ئس |
| Interj. Interjection. | ئامرازی سەرسوڕمان و بانگهێشتن | ئسپ |
| Mus. instr. Musical Instrument. | ئامرازی مۆسیقا | ئم |
| See See. | بڕوانە | ب |
| E.E. English Equivalent (s). | بەرامبەرەکەی بە ئینگلیزی | بئگ |
| Prep. Preposition. | پریپۆزیشن | پ |
| Interrog. Interrogative. | پرسیار | پر |
| Med. Medicine. | پزیشکی | پز |
| Pvb. Proverb. | پەند | پن |
| N.B. Nota bene (Note Well). | تێبینی | ت |
| Mod. Modern (new Kurdish root). | تازەداتاشراو | تد |
| Pron. Pronoun. | جێناو | ج |
| inse. Insect(s). | جروجانەوەر ( مێروو ) | جج |
| infin. Infinitive. | چاوگ | چ |
| Met. Metaph. Metaphor. | خوازە | خ |
| Ant(s). Antonym(s). | دژە واتا | دژو |
| Rhet. SKurdish Rhetorical Sentence | ڕستەی ساز و ئامادە ( لەزمانی کوردیدا ) | رس |
| Bot. Botany(plants). | ڕووەک ( ڕووەک ناسی ) | رو |
| gram. Grammer. | ڕێزمان | ری |
| Biol Biolog(y)cal. | زیندەوەر ( زانیی ) | ز |

| | | |
|---|---|---|
| Mil. Military. | سوپا | س |
| excl. Exclamation. | سەرسوڕمان | سڕ |
| sth. Something. | شتێ | ش |
| Ter. Term (expression). | شیوە ڕستە | شر |
| Phr. Phrase. | فریز | ف/فر. |
| V. Verb. | کردار | ک |
| Past. t. Past tense. | کرداری ڕابردوو | کر |
| Vt. Verb Transitive. | کرداری تێپەڕ | کتپ |
| Vi. Verb Intransitive. | کرداری تێنەپەڕ | کتن |
| imp. Imperative. | کرداری داخوازی | کد |
| s.o. Some one(Some body). | کەسێ | کە |
| kl. kelhuri | کەلهوڕی | کل |
| Ki. Kirmanji. | کرمانجی | کی |
| T. Translation. | گۆڕین | گ |
| Lit. Literally (word by word) | گۆڕینی ڕاستەوخۆ (وشە بەوشە) | گر |
| F.T. Free Translation. | گۆڕینی سەربەخۆ | گس |
| Lat. Latin. | لاتینی | ل |
| Lu. Luri. | لوڕی | لو |
| B. Bird (fowels). | مەل (پەلەوەر) | م |
| Fru. Fruits. | میوە | می |
| n. Noun. | ناو | ن |
| n.pl. Noun - plural. | ناوی کۆ | نک |
| c. n. Compound Noun. | ناوی لێکدراو | نل |
| e.g. exampli gratia(for example). | نموونە | نم |
| Ha. Hawram(an)i. | هەورامی | هە |
| seso. See also. | هەروەها بڕوانە | هب |
| a.th Anything. | هەچ شتێ | هش |
| a.o. Anyone. | هەچ کەسێ | هک |

## Symbols

١- ⇒

The arrow in the beginning of a line means:
See the opposite entry for.

٢- Minus(-) in the begining of the line, stands for repition of the synonyms of the preceding word i.e. One series of synonyms is marked with a minus

٣- The serial numbers ١, ٢, ٣, ٤, ....etc are used of polysemantic words.

٤- ( )
The brackets are used to show optional words, idioms, ...etc

٥- (=)
Means : The same thing as, is equivalent to, is equal to, equals.

## نیشانەکان

١- ⇐

بەکارهێنانی تیر لەسەرەتای دێرەوە .
بەواتا: بڕوانە وشەی ناوبراوی ئەوبەر.

٢- ( - )نیشانەی تەقەڵ، لەسەرەتای دێرەوە بۆ دووبارە و سێبارە .. تاد، کردنەوەی هاوواتای وشەی سەرەوەیە، واتە یەک زنجیرە وشەی هاوواتا بە تەقەڵێک دەستنیشان کراوە.

٣- زنجیرە ژمارەی ١، ٢، ٣، ٤، ...تاد
بۆ وشەیەکی فرە مانا بەکاردەهێنرێ کەماناکانی بۆ مەبەستی جۆراو جۆرین.

٤- ( )
بەکارهێنانی کەوانەی داخراو بۆ مەبەستی سەرپشکی کردنە لەنێوان وشەکان یا زاراوەکاندا ...تاد

٥- (=)
بەمانی چۆن یەک، وەک یەک، بەرامبەر ...تاد بەکاردەهێنرێ.

# کلیلی دەربڕینی پیتەکان
# Key to pronunciation

| Kurdish | English | Example |
|---|---|---|
| a ئا | a long | hard |
| à ع | vowel | (city). |
| b ب | a | ʻAebadan |
| c ج | b | bat |
| ç چ | c | edge |
| d د | ch | reach |
| e ە، ئە | d | dog |
| ê ێ، ئێ | a short | or as u in cut,shut. |
| f ف | vowel | apple |
| g گ | ê | met |
| h ه | f | far |
| h̲ ح | g | gas |
| x خ | h | hair |
| x̲ غ | h̲ | H̲aifa (city). |
| i ئ | kh | = ch in Scottish |
| î ی | gh | khan .(loch). |
| j ژ | y | ghoul |
| k ک | i long vowel | hit |
| q ق | zh | meet |
| l ل | k | measure |
| l̲ ڵ | q | kitten |
| m م | l | Iraq |
| n ن | l̲ | life |
| o ۆ | m | doll |
| p پ | n | man |
| r̲ ڕ | o | nap |
| r ر | p | fortune |
| s س | r̲ | pan |
| š ش | r | rose |
| t ت | s | dear |
| ü وو | sh | sand |
| v ڤ | t | shoe |
| u,w و | eu | time |
| y ی | v | queue |
| z ز | w | van |
| ö وێ | y | wing |
| | z | young |
| | ö | zebra |
| | | in the |
| | | German word Köln (city). |

# - ئا -

# - A -

**(ئـ)هەمزە (ن).**
پیتێکی بێلایەنە، بێدەنگە یان دەنگدارە..، بەگوێرەی ئەو بزوێنەی کەلەدوایەوە بەکاردێت و بەم جۆرە دەنوسرێت(ئـ) لەسەرەتای وشەوە.

**ئا (ئاک).** a
١- ئاری، ئەرێ، ئەریی، ئێی، بەڵێ، هەرێ، هەریی.
٢ - بەو جۆرەیە،ڕاستە، وایە(ف).
٣ - بەدروستی، بەڕاستییەکەی، دڵمەوە.
٤- ئەهادەی، بێ وەرێوە، دا، دادەی، دەی!، (ئـ، بۆ هاندان).
٥- چیی، چیی ئەڵێی؟، چێئەیژیی؟، چیی ئێژیی؟، (ئـ بو پرسیار، بۆ گومان، سەرسوڕمان).
٦- وا!، واج!، وای!، (ئـ: بۆ زوێریی، ناڕەحەتیی، سەرسامیی، تەوس).

**ئا (ن).** a [٢]
کورتە وشەی (ئاغا) یە .

**ئائل (ئان).** ail
١- نابەجێ، نادروست، ناڕەوا، ناحەقدرۆ: بەجێ، دروست، ڕەوا.
٢- ناپەسەند، نافرەجا، نالایەق.
٣- چەوت، خوار، ناڕاست.
٤- بێبەها، بێنرخ، خراپ، هیچ و پووچ.

**ئائل بوون (کتن)** aîlbün
پڕ بەپێست نەبوون، شایان نەبوون، لەجێی خۆیدا نەبوون.

**ئائلیی (ن).** aîlî
١- نابەجێیی، نادروستی، ناڕەوایی، ناهەحەقیی.
٢- ناپەسەندیی، نالایەقیی.
٣- چەوتیی، خواریی، ناڕاستیی.
٤- بێبەهایی، بێنرخیی، خراپیی، هیچ و پووچیی.

**ئابادی (ن).** abadî
پسووڵە، کاغەز، نامە، نوسراو.

**ئابال بوون (کتن)** abal bün
بادانەوە، چەرخانەوە، زڤران، زڤرین، ڤەزڤڕیین، ڤەزوڕیین، گیلان، گیلانەوە، هاتن، یان هاتنەوە (بۆ دواوە).

**ئابان (ن.).** aban
بورجی دوپشک، جوتەی هەنجیران، کەلووی دوپشک.

**ئابجی (ن).** abcî
١- خوشک، خوێشک، خیشک، والا، واڵە، والێ.
٢- باجی، خوشکی گەورە، داد، دادە، دید، میمی.

**ئابخانە (ن).** abxane
ئابدەست، ئابدەستخانە، ئاڤدەست، ئاڤرێژ، ئاڤرێژن، ئاوخانە، ئاودەس، ئاودەست، ئاودەستخانە، ئاوڕێژ، ئابخانە، ئەدەبخانە، پێشاو، دەستاو، سەراو، سەرپێشاو، کەناراو، کەنشت، کەبیل.

**ئابدار (ن).** abdar
چایچیی، قاوەچیی(دیوەخانی گەورەماڵان).

**ئابدارخانە (ن).** abdarxane [١]
چایخانە، ژووری چالێنان(ژووری) قاوەخانەی دیوەخان.

**ئابدارخانە (ن).** abdarxane [٢]
چاخانە، چایخانە، دوکانی چایچی، قاوەخانە.

**ئابدارخانە (نک).** abdarxane [٣]
بارووبنەی سەفەر، کەلوپەلی گەشت.

**ئابدۆزەک (ن، پز).** abdozek
١- دەرزی، شرینقە. ٢- فیچقە.
٣-قەتارە، لولە شوشەیەکی بچووک و تایبەتییەو مەمکەلاستیکێک بەسەرێکیەوەیەتیی و بەپێوانە شلەمەنیی لێوە دەچۆڕێنرێ.

**ئابرا (ن).** abra
براگەورە، برایگەورە، کاکە.

**ئابروو (ن)** abr̲ü
١- ئاڤاڕوو، ئاڤڕوو، ئاوڕوو، ئاوی ڕوو، ڕەونەقی ڕوو، ورشەوگەشەی دەموچاو.
٢- ئینیی، حەیا، حورمەت، ڕوسپێتیی، ڕووسووریی
٣- ئوودا، دکڕ، ڕێز.
٤- شکۆ، شکۆداریی، شکۆمەندیی.

**ئابروو بران(کتن)** abr̲übran
بێ ئوودابوون، بێحورمەت بوون، بێ ڕێزبوون.

**ئابروو براو(ئاند)** biraw abr̲ü
ئەتک کراو، بەدناوکراو، ڕسواکراو، ڕیسواکراو، ناوزڕاو.

**ئابروو بردن(کتپ)** abr̲übirdin.
١- ئەتک کردن، بەدناو کردن، ڕووسیاکردن، ڕیسواکردن، سووک کردن، ناوزڕاندن.

٢ - بەیت و باڵۆرە شوێن خستن، سووک و چرووک کردن، ناوونانۆرە شوێن خستن (لی‌ هەڵدان).
٣-بەپەندکردن، شەرەف بردن، ناموس بردن، ناموس شکاندن.
**ئابڕووبەرە(ئان).** abrübere
١- ئابڕووبەر، ئاوڕووبەرە، چەتاوە ڕوو، حەیابەرە، مایەی ڕیسوایی (کەسێ).
٢- کارگەند، کارگەنک، کردەوەسووک، نامەرد، ناپیاو. ٣- بێ‌شەرم.
٤- هۆی ئابڕووچوون (ڕەفتار،کەسێ...).
**ئابڕووتکان (کتن).** abrütikan
ب (ئابڕووچوون).
**ئابڕووتکاو(ئان)** abrütikaw
١- ئابڕوو چوو، ئاوڕوو چووک، حەیاچوو، ڕووسیا، ڕیسوا، ناوزڕاو.
٢- بێناموس، پایەنزم، چرووک، سووک، نزم، (کەسێ).
**ئابڕووچوو(ئان)** abrüçü
ئابڕووتکاو.
**ئابڕووچوون(کتن)** abrüçün
ئابڕووتکان، ئابڕووچوون بەدناوبوون، بێئابڕووبوون، بێڕێزبوون، بێشەرم بوون، پەردەلەسەرحەیانەمان، حەیشۆلێ هەڵگیران، ڕیسوابوون، سووک بوون، شەرم نەمان.
**ئابڕوودار(ئان).** abrüdar
ئابڕوومەند، بەڕێز، سەنگین، گران.
**ئابڕوومەند(ئان)** abrümend
ب(ئابڕوودار).
**ئابڕوومەندی(ن)** abrümendî
باشی، بەحورمەتی، بەڕێزی، چەلەنگیی.
**ئابشار(ن).** abšar
ئاوڕێژ، ئیور، پرژ، تاف، تافگە، ڕێژاو، سوولاف، سۆلاف، شۆڕاوە، شۆش، شیپ، شیپۆ، قەڵبەز، قەلوەزە، کەلبەزە، کەلوەز.
**ئابلوقە(ن)** ablüqe
بەگیر، گەمارۆ.
**ئابلوقەدان(کتپ).** ablüqedan
١- بەگیرهێنان، کە لە کۆمەکێشیکردن و هێرش بردنەسەر، گەمارۆدان(سوپا).
٢- چواردەورلێگرتن، چواردەورگرتن، دەوردان، دەورگرتن، دەورەدان.
٣ - بۆژۆکردن، جاڕس کردن، سەرلێ سەندن، وەڕزکردن، وەڕس کردن، هەراسان کردن.
٤. بەگازندە ئابلوقەیان دابوو.
**ئابلوقەدراو(ئان).** ablüqediraw
١- بەگیرهاتوو، بەگیرهێنراو، گەمارۆدراو(بەهێزی دوژمن).
٢- چواردەورە لێ گیراو، چوار دەورە گیراو، دەورە دراو.
٣- لەهەر چوارلاوە لەباوەش گیراو (زەویی، ناوچەی وڵاتێ).
**ئاب و تاب (ن).** abutab
١- ڕووناکی، زرنگی، سایەقە، کراوەیی.
٢- تێگەیشتویی، ڕۆشنبیری، زرنگی، کراوەیی (بیر، هۆش ...)، وریایی.
٣- دڵخۆشی، شادمانی، شادی، گەشی.
٤- ڕای بەڕێ و جێ، گفتوگۆی ڕازاوە و بەڕەونەق، ووتەی خۆش.
٥- ئاوو هەوای گەرم، تاوو توێ و گەرما، گەرماییەکی بەتین.
**ئابوور(ن).** abür
١-پاکژیی، پاکیی، خاوێنیی(دەروون). ٢- ئابڕوو، حورمەت، حەیا، شەرم، ناموس.
**ئابوورکردن(کتپ).** abürkirdin
پێک هێنان، تەکووزکردن، سازدان. نم: مەکارا خۆ ئابوورکر.
**ئابووریی(ن).** abürî ١
پاشەکەوتیی، چاودێریی پاشەکەوت، کارامەیی، ماڵداریی.
**ئابووریی(ن).** abüri ٢
بژیو، مایەی گوزەران.
**ئابووریزان (ن).** abürîzan ١
ئابووریی ناس.
**ئابووریزان(ئان).** abürîzan ٢
بەئابوور.
**ئابووری کردن(کتپ)** bürîkirdin
پاش ڕۆژی کردن، پاشەکەوت کردن، خەمخواریی‌کردن، دەس پێوەگرتن، کارامەیی‌کردن، ماڵداریی‌کردن (ئازوقە، داهات...).
**ئابوونمان(ن).** abüniman
ئابونە.
**ئابوونە(ن).** abüne
١-ئابوونمان، مانگانە یا ساڵانە(پارە)، مەبەست ئەو پارەیەی ئەندام مانگانە یان ساڵانە ئەیدات بەیانە،

پارت..
٢- پیشەکی ئەو پارەیەی ئەدرێ بەخاوەن ڕۆژنامە، گۆڤار ...

**ئابوونەدان** (کتپ). abünedan
ئابوونمان دان، مزدان، مزی هاوبەشیدان.

**ئابۆنە** (ن) abone
تەزە، زلحۆرت (مرۆڤ).

**ئابیدە** (ن). abîde
پەیکەر.

**ئابیدەکەر** (ن). abîdeker
پەیکەرتاش.

**ئاپ** (ن)، (کی). ap (kî)
ئاپۆ.

**ئاپتەر** (ن). apter
١- ئەهرەمەن، ئەهریمەن، پەریپەشک، پەرییمیرگ، دیو، سەتان، سەتەن، شەیتان، مرگ. ٢- بەد، بەدکردار، زۆرخراپ، گەند (مرۆڤ).
٣- بەلا، تەوق، دوژمن، ناحەز.
٤- پەتەریی، پەتیارە، دیین، دیوانە، شیت [ئان].

**ئاپتەرگە** (ن، لو) apterge(lu)
شیتخانە، خەستەخانەی شیتەکان، هەر بیمارخانەیەک بۆ مرۆڤی دیین تەرخان کرابێ.

**ئاپتەریی** (ن، لو) ١ apterî(lu)
تەپ، تەپکەریی، تەفرە، تەڵەکە، تەڵەکەبازی، چەپ ئەندازی، ساختەچیتی، فریو، فریوبازی، فیلبازی، فیل و فەرەج.

**ئاپتەریی** (ن، لو) ٢ apterî(lu)
دووڕوویی، دووزمانیی.

**ئاپتەری کردن** (کتپ) apterîkirdin.
١- تەفرەدان، تەڵەکەبازییکردن، حیلەوحەواڵەکردن، دەس بڕیین، ساختەچیتیی کردن، ساختەلێکردن، فڕ وفیل لێکردن، فریودان، فیلبازیکردن، فیل و فەرەج کردن، فیل و فەرەج لێکردن.
٢- بەسەرداتیپەڕاندن، بردنەسەرکانی و ئاونەدان، چاوبەست لێ کردن، سەرلێتیکدان.

**ئاپوو** (ن، م). apü
١- پوو، کوند، کونەپەپوو، هەپوو.
٢- بەیەکیکی (بەدبەخت) یان (ئاشرین) دەوترێ (خ).

**ئاپۆ** (ن، کی) apo(ki)
١- ئاپ، ئام، ئەموو، باوک برا، برایباوک، مام، مامک، مامۆ، هاپۆ. ٢- - (بانگ کردنی یەکێ لەخۆ گەورەتر - ناونیشانی ڕێز).

**ئاپۆر** (ن). ١ apor
ئاپۆرە.

**ئاپۆر** (ن). ٢ apor
بیانی، بیگانە، تاجک، خەڵکی دوورە وڵات، ناناشنا، ناشنا، نەناسیاو، هاقی، یەکێ لەوڵاتیکی دیکەوە هاتبێ.

**ئاپۆرە** (ن). ١ apore
١- ئاپوورە، ئاپۆرا، جەماوەری خەڵک، چرژە، چرە، قەڵەبالغی، کۆمای خەڵک پیکەوە، کۆمەڵ، کەرەسیسە، کەڵەکەتریێ، گەلە.
٢- دەستە، کۆمەڵ (تایبەتی).

**ئاپۆرە** (ن) ٢ apore
١- بەسەرهاتی خراپ، پیسیر، تووشیی، تەگەرە، تەڵەزگە، تەنگانە، تەنگ و چەڵەمە، دژواریی، ڕووشە، سەختیی، سەخڵەتیی، کۆتەک، گیچەڵ.
٢- ئاسیم، ئۆبال، بەلا، مەینەت، مەینەتیی، نەگبەتیی، وەی.

**ئاپۆرەدان** (کتن،کتپ) aporedan
ئاپۆراکردن، بەناویەکداهاتن بە قەڵەبالغی، تێچرژان، تیک چرژان، قەڵەبالغی کردن، کۆمەڵ بوون، کەرەسیسەکردن (بەناویەکدا یا لەدەور شتێ).

**ئاپۆرهاڵ** (ئان) aporhal
ئاپۆرحاڵ، داماو، ژار، ژارۆ، کەرەواڵە، هەژار، هەژیر.

**ئاتاج** (ئان). atac
١- ئاوسەرکەرم، ئەوەجە، بێپارە، بێپوول و پارە، بێ‌خەرجی، بێ‌سامان، پیداویست، چاولەکۆمەک، دەس کورت، ڕەش و ڕووت، نەدار، نەدارا.
٢- بارچەوت، بارکەوتو، بێ باڵ، چەڵ، کرۆک.

**ئاتاجیی** (ن) atacî
١- ئاوسەرکەمیی، بێ‌پارەیی، بێ پوول و پارەیی، بێ‌خەرجیتی، پیداویستیی، دەست تەنگی، دەست کورتی، کەمایەسی، نەداری.
٢- تەنگانە، تەنگاویی، سەختیی، سەخڵەتیی، کۆنگەڵ، گیژاو، گیژەن، نەگبەتیی، نشووف.
٣- خواز، خواست، ویست.

**ئاتر** (ن). atir
ئاگر.

**ئاتوون** (ن،لو) ١ atün(lu)
ئەتوون.

**ئاتوون** (ن). ٢ atün
کڵ (بۆ سوورکردنەوەی گۆزە و دیزە)، کورەی بەردی قسڵ یان گەچ سوتاندن، کورەی خشت سوورکردنەوە.

**ئاتوون** ٣ (ن) atün
نوسا، بەخێوکەر، خێو(ئافرەت)، گۆشکەر، مامۆستا(ژن).

**ئاتەر** (ن) ater
ئاگر.

**ئاتەران** (ن). ateran
راوە، قراڵە، وڕێنە(لەخەودا یان بەدەم تاوە).

**ئاتەران کردن** (کتپ، کتن) aterankirdin
ساتمەکردن، قسەپەڕاندن، وڕێنەکردن(لە خەودا یان بەدەم تاوە).

**ئاتەشبازی** (ن) atešbazî
ئاگر بازی.

**ئاتەش بازی کردن** (کتپ) atešbazîkirdin .
ئاگربازی کردن.

**ئاتەشپارە** (ئان،ن)١ atešpare
ئاگرپارە.

**ئاتەشپارە** ٢ (ئان). atešpare
زیرەک.

**ئاتەشخانە**(ن، لو) atešxane (lu)
ئاتەشخان، ئاگرخانە، تەندوورەی سەماوەر، ئەو لوولەیەی لە ناوەڕاستی سەماوەردایە و خەڵوزی تێدەکرێ... جێگای ئاگر (لەناوەڕاستی سەماوەردا).

**ئاتەشەک** (ن، پز). atešek
ئاگرە، ئاڵە، ئاوڵە فەرەنگی، سیفلیس، فەرەنگی، ماڵە، مەولە.

**ئاتەشی** ١ (ن). atešî
ب (ئاگری).

**ئاتەشی** ٢ (ن). atešî
تووڕە.

**ئاتەک** (ن). atek
پاڵ، تەک، تەنشت، تەنیشت، رەخ، قەد، قەدپاڵ، کن، نک، لا، لاتەنیشت.

**ئاتەگ** (ن) ateg
١- ئەتەکێ، تەنوورە، داوێن، شاقەل (جل).
٢- بنار، دامێن، داوێن، لای خوارەوە (شاخ یا گرد).
٣- ژێر کراس (ژنانە).

**ئاتێ** (ن). atê
ئاڵتوون.

**ئاجاخ** (ئان). acax
ئاشکرا.

**ئاجاڕ** (ن). acar̄
بنی ڕووەک، ڕەگ، ڕیشە.

**ئاجگیی** (ئان). ١ acgî
بەرچاو تەنگ، پارەپیس، پوولەکیی، پیسکە، چاوبرسیی، چاوتێرنەخۆر، چکوس، دەس ڕژد، دەس قووچاو، دەس گرتوو، دەس گرتیی، ڕەزیل، کونە، گر، گیر.

**ئاجگیی** (ئان) ٢ acgî
چاوپیس، چاوونەفەس پیس.

**ئاجوڕ** (ن، کی). acur̄
ئاجووڕ، ئاگور، توپ، خرچان، خشتی سوور، خشتی سوورەوەکراو، زەنگۆڵ، کەرپووچ.

**ئاجیل** (نک) acîl
بادام و نۆک و دەنکەکولەکەی برژاو، چوور، چەرەز، چەرەس، دەم چوور، شەوچەرە.

**ئاچوخ** (ئان) ١ açux
سپات، کاڵ، مەیلەو سپی(ڕەنگ).

**ئاچوخ** (ئان) ٢ açux
ئاواڵە، بەتاڵ، خاڵیی.

**ئاچوخ** (ئان).٣ açux
١- دانەخراو، کراوە، لەسەرپشت، واڵا.
٢- قەدەغە نەکراو، گشتیی، نەبەستراو.

**ئاچەر** (ن، لو) açer (lu)
١-کلیل، کلیل، هاچەر، هەڵبچڕێنەر (سەرقاپی شووشە .. تەنەکە..).
٢- جەرپادەر، جەڕدەر، جەڕوەکەر.

**ئاحێل** (ئان، لو). ah̲êl (lu)
١- بەتەمەن، بەساڵاچوو، بەساڵداچوو، بەعومر، پیر، تەمەن درێژ.
٢- پەککەوتە، عەمەل مەندە(مەنگە)، لێکەوتە (لەبەر پیریی).

**ئاخ**١ (ن، کی) ١ ax
١- ئەرد، ئەرز، بەژ، زەویی، سستەک، عەرد، گڵ، هەرد.
٢- تۆز، خاکە، خۆڵ، گەرد.
٣- جیهان، دنیا، گیتی (ئەو ئەستێرەیەی مرۆڤ لەسەری دەژی).

**ئاخ** (نسب). ax ٢

ئاخ و داخانم!، ئاه!، بریا!، خۆزگە!، خۆزیا!، کاشکی.

**ئاخ٢** (ن). ax ٣

ئایش، هاوار (لەبەرئازار).

**ئاخ٣** (ن). ax ٤

هەناسەی سارد.

**ئاخافتن** (کتن، کی) axaftin(ki)

ب (ئاخاوتن).

**ئاخافتەر** (ن،کی) axafter(ki)

ب (ئاخاوتەر).

**ئاخاوتن** (کتپ،کتن،کی) axawtin(ki) ١

١-ئاخافتەن، ئاخڤاندن، ئاخۆتن، ئاخافتون، ئاخیوتن، پەیڤیین، پێکڤەئاخافتن، دوان، دواندن، گفت و گۆ کردن، گوتن، گۆتن، وتوویـژکردن، یەکتردواندن. نم: جارێ منالەکە فێری ئاخاوتن نەبووە.

٢- دەربـڕین، دەم کردنـەوە، دەم هـەڵهێنان، زمـان خستنەگەڕ (ئد).

٣- پرس پێکردن، تەگبیرو راوێژپێ کردن، تەگبیر و راڵەگەڵ کردن، تێبینی هەڵ سەنگاندن.

**ئاخاوتن[ئاخێو]** (کتپ، کی) ٢

axawtin (axêw) (ki)

١- پشت گرتن، رام کردن، لنگێ دان (ئەسپ ...).

٢- دەرس دادان، را سـەرکردن، ڕەفتـار فێرکـردن، راهێنان، مەشق پێ کردن.

**ئاخاوتەر** (ن، کی) axawter(ki)

١- ئاخافتەر، ئاخەفتیار، بوێژ، بێژەندە.

٢- بێژەر، قسەکەر، گفتوگۆکەر.

**ئاخایۆک** (ئان) axayok ١

بەفێز، بەهەوا، ترزل، خۆبەگەورەزان، فیزدار، فیززل، لەخۆبایی، لەخۆبـاییبوو، یـەکێ حـەزی لەگـەورەیی بێ بێئەوەی لێی بێ.

**ئاخایۆک** (ن، م) axayok ٢

(جۆرێکی بچوک لەهەڵۆ)، ئەیلۆ، ئەلهۆ (کچکە).

**ئاخ باران** (کتن،کی) axbaran(ki) ١

تۆزباران، خۆڵ باران.

**ئاخباران** (ن، کی) axbaran(ki) ٢

تۆز و خۆڵ، تۆز و غوبار.

**ئاخ باراندن**(کتپ، کی). axbarandin(ki)

تـۆز هـەڵکرتن، تـەپ و تـۆز-هـەڵکردن، تـەپ و تـۆز بەرزکردنەوە.

**ئاخپۆل کردن**(کتپ). axpol kirdin.

قوڕگرتنەوە، قوڕهەڵشیلان، گڵ و ئـاو گرتنـەوە(بـۆ سـواغ دانـی دیـوار، سـەربان، یـان دروسـت کردنـی خشتی کاڵ).

**ئاخترمە**(ن). axtirme

ئەخترمە.

**ئاختە** (ن، ئا) axte

ئەختە.

**ئاخدار** (ئان). axdar

١- ئاخ هەڵکێش، دەم بەگلەیی، نووزە نووزکەر.

٢- خەفەتبار، خەمبار، دڵ بریندار، هەناسە سارد.

٣- بەد بەخت، بێوڵەت، چارە ڕەش، نەگبەت.

**ئاخر** (ن). axir

١- ئەنجام، بنـەبان، پاشـین، دوایـی، دەمـایی، سـەر ئەنجام، سەرەنجام، کۆتایی.

٢- دواجار، دوا ڕۆژ(ئاکە).

٣- پاشان، دواگین، دوای هەموان، دواییـن، لەپاشـدا (ئاکە).

٤- ئەویتر،ئەویدیکە (ئان).

٥- ئیتر، دەسا (ئپ، ئاکە).

٦- بەسەر هاتی دوا ڕۆژ.

٧- مەگەر (ئاکە، ئپ).

**ئاخربوون** (کتن). axirbûn

برانـەوە و خـراپ بـوون، دوایـی هـاتن، سـەرەونگون بوون، نوغرۆبوون، هەڵپێچان

**ئاخرخێر** (ئان) axirxêr ١

١- بێ-وەی، چاکەڵێ وەشاو (مرۆڤ).

٢- خـاوەنی دوا ڕۆژێکـی بـاش (چـاکە)، یـەکێ کەکاروبار و ژیانی بەچاکی و خۆشی دوایی بێت.

**ئاخرخێر** (ئان). axirxêr ٢

بـەدین، پـیاوچاکە، پـیاوی خـوا، پـیری پـیاوچاکە، دینـدار، کەسـێ کـەدوایی تەمـەنی بەدینـداریی بەرێتەسەر، لەخواترس.

**ئاخر زەمان**(ن.) axirzeman

١- دوامـین خـولی دنیـا، ڕۆژگـاری دوایـین، نزیـک بونەوەی ئەو دنیا.

٢- ڕۆژگاری ناخۆش و پڕ ئاژاوە.

**ئاخر شەڕ** (ئان). axirşer

١- بەدکار، پیریبەد فەڕ، نەگریس، خراپ.

٢- کەسـێ کەلەپـیریدا دەسـتی دابێتـەکاری بێچەوانەی ئاین .

٣- لەڕێی ڕاست لاچوو (کەسێ).

**ئاخرشەر (ئان)** axirşer
چارە ڕەش، کەسێ لەدوایی تەمەنی خۆیدا تووشی بەلاو ناخۆشی و هەژاری هاتبێ.
**ئاخرکە (ن، جچ)** axirke
ئاخویرکە، میشولەی وردی بەئالۆش، هوورە.
**ئاخر و ئۆخر (ئاک)** axirwoxir
١- ئاخریی وئۆخریی، دواجار، دوایی، نزیکە(نیزیکە) بەبرانــەوە. ٢- دوای هــەموان. ٣- دومــاهکیی، دوماهیی، لەکۆتاییدا.
**ئاخرهاتن (کتن).** axirhatin
تەواوبوون، دوایی هاتن، کۆتایی هاتن.
**ئاخرەت (ن).** axiret
پەسلان، ڕۆژی قیامەت، هەستانەوەی پاش مردن.
**ئاخرەمین (ئان)** axiremîn
١- پـاش هـەموان، دواتـرین، دواگـین، دوامـین، دوای هەموان، هەرەپاشین.
٢- ئەولاترین، پەرترین، دوورترین.
٣- زلترین، گەورەترین.
٤- بالآترین، بەرزترین، بێ‌وینەترین.
**ئاخریی (ئان)** axirî
١- دواگــین، دوامــین. ٢- دوایــی، ســەرەنجام، لەئەنجامدا، لەدواییدا (ئاک).
**ئاخریی و ئۆخریی سال (ف)** axirî w oxrî sal
کۆتایی سال.
**ئاخریی و عاقیبەتی (ف، ئاک).**
axirî w aqîbetî
ئاخرییەکەی، دوامین، دوماهی،سەرئەنجام.
**ئاخزە (ن)** axize
ئەغزە.
**ئاخش؛ (نسب).** axiş
ئۆخەی.
**ئاخ کیشان (کتپ)** axkêşan
ئاخ ڕاگویزتن، خۆل بارکردن، خۆل گواستنەوە، گل گویزانەوە (لەشوینیکەوە بۆ شوینیکی تر).
**ئاخگە (ن)** axge ١
١- ئاگە، ئامگە. ٢- قەیران.
**ئاخگە (ن)** axge ٢
ئاستانە، پیش دەرگە، دەرمال.
**ئاخل (ن)** axil
ئاخلە.
**ئاخلە (ن)، (لو)** axile ١
ئاخل، پشتیر، تاولە، تەوخ ، تەویلە، زاخە، کۆتـان، کەورک، گەوڕ.
**ئاخلە (ن)** axile ٢
پـاوان، پـووش، گـژ و گیـای وشـکەوەبوو، گیـای وشکەوە بوو، کا.
**ئاخلە(ن)** axile ٣
کادان، کایەن.
**ئاخلە (ن)** axile ٤
پاپۆکە، پەپکە، پەپۆکە (مار..).
**ئاخلە (ن)** axile. ٥
جوخینە، جوێ خوین، جوێخین، جێخەرمان.
**ئاخلە (ن)** axile ٧
خەرمانە (دەوری مانگ).
**ئاخلەدان (کتن)** axiledan ١
ئەلقەدان، پەپکەخواردن، پەپۆکەدان، پیچ خـواردن، خۆلوول دان، لوول بوون.
**ئاخلەدان (کتن)** axiledan ٢
خەرمانەدان، خەرمانە لەدەوری مانگ دروست بوون.
**ئاخلەویک (ن)** axilewêk
ئاخلیڤینک، تـاوە، ڕوپیـشک، ڕەمپیژ، ڕون پـیژ، ڕۆن پیژ.
**ئاخن (ن)** axin
ناواخن، ناوەڕۆک، نیوناخن.
**ئاخنران (ککب)** axinran
ئاخندران بە....، داگیران(دۆشەک..) بە.
**ئاخنراو (ئان)** axinraw
ئاخنـاو، ئاخنـدراو، پەسـتراو، تێـپەستراو،تێ هەلاخنراو، هەلاخنراو.
**ئاخنین (کتپ)** axinîn ١
١-ئاخانــدن، بــەزۆر تیــراکردن، پەســـتاوتن، پەستاوتنەناو، تەپاندنەناو، تێپەستاوتن، داگرتن، داگرتنەوە، کردنە ناو.
٢- تێ‌ترنجاندن، تێ تەپاندن، تێ خستن.
٣- پڕکردن، سەرلیوکردن.
٤- ئەنبارکردن، دا کردن، لەناوئەنباردا کۆکردنەوە.
٥- قەپات کردن (بەتۆپەوانە ..).
**ئاخنین (کتپ)** axinîn
بەندکردن، خستنەبەندیخانە.
**ئاخنینەوە (کتپ)** axinînewe ١
ئاخنین.
**ئاخنینەوە (کتپ)** axinînewe ٢
پەستاندنەوە، پەستانەوە، داگرتنەوە.

**ئاخوا** (ئپ) axiwa
ئاخۆ.

**ئاخ و تف کردن**(کتن) ax w tif kirdin
تف ڕۆکردن، تف فڕێدان، تف کردنەوە، تف وەکردن، تفەوکردن.

**ئاخ و داخ** (ئپ، ن) ax w dax
ئاخ و واخ، ئاە و ناڵە، ئاە و واە.

**ئاخ و داخانم!** (ئسپ) ax w daxanim
داخەکەم ! (بۆ دەربڕینی: پەژارە، بەزەیی، پەشیمانی، نارەحەتی..).

**ئاخوڕ** (ن) axur̲
ئاخل، ئاخلە، ئافڕ، ئالفدان، ئاوەڕ، ئاوەڕە، ئاهوین، باکۆل، دەمگە، کۆلیت، کەلارە، لاوە، (شوێنی هەڵبەستراو بۆ جێی خۆراکی ئاژەڵ).

**ئاخوڕ بەرز {کەسێ}** (ئان) axur̲berz (kesê)
بەدەعیە، بەفیز، بەهەوا، تڕزل، خۆبەشت زان، فیزدار، لووت بەرز، لەخۆبایی.

**ئاخوڕ چەوڕ**(ئان،ند) axur̲çewr
بووە، تیر و تەسەل، دەوڵەمەند، ساماندار، کۆک.

**ئاخوڕخوار** (ئان، خ) axur̲xwar
١- بەدنمەک، نەفرەدەر، تەڵەکەباز.
چەپ ئەندار، چەوت، چەوت و چەواشە، چەوت و چەوێل، دەس بڕ، فریوباز. ٢- دوو ڕوو، دوو زمان، دۆخمان.

**ئاخون** (ن، لو)١ axun (lu)
ئاخون، ئاخوین، نووخان، نەینۆک، نینک، نینۆکە، هەینۆک.

**ئاخون** (ن)٢ axun
ئاخوند، مەلای شیعە، مەلای عەجەمان.

**ئاخووەوند**(ئان،لو) axwewend(lu)
زانا، کارزان، هۆشمەند، هونەرمەند.

**ئاخووەندی** (ئان)١ axwendî
زانایی، کارزانی، هۆشمەندی، هونەرمەندی.

**ئاخووەوندی** (ن)٢ axwewendî
ئازایەتی، پیاوەتی، چالاکی، خورتی، دلێری، مرۆڤایەتی، مەردایەتی.

**ئاخۆ** (ئاک)١ axo
ڕەنگە، لەوانەیە، ویدەچێ.

**ئاخۆ** (ئپ)٢ axo (bo pirsyarêkî labela)
ئاخوا، ئایا، تۆبڵێی، تۆ بێژیی، داخۆ، داخوا، داخودا.

**ئاخۆران** (ن)١ axoran
١- ئاژاوە، ئاشەڤ، بگرەوبەردە، پشێوی، شپرزەیی، شپرێوی، شڵەژان، شێواوی، فرکان فرکان، ئاناڕامی، هەراوبگر، هەراوزەنا، هەراو هوریا، هەراهەرا، هەلاهەلا.
٢- بێ یاسایی، شەڕوکێشە.

**ئاخۆران** (ن)٢ axoran
تاوتوی، تاووتۆف، ڕەشەبای توند (بە باران، تەرزە یان بەفرەوە)، وەیشومە.

**ئاخۆران و باخۆران**(ن.) axoran w baxoran
١- ئاخۆران بخۆران، ئاخۆران و بخۆران، ئاڵۆزیی، پشێوە، هیچ بەسەرهیچەوەنەماو (چۆنیەتی ڕادەی دۆخی کۆمەڵایەتیی).
٢- خۆپەرستی، خۆخۆیی، من منۆکێ.

**ئاخۆرە** (ن، جج) axore
ئاخۆرە، پەخشە، پێشکە، پێشوو، پێشووکوکە: پشی گەلەک هوور، تۆفانە،تەپۆ، خاکە، شەوسوتکە، کورکورۆکە، گمۆرە، مۆر، مێشوولە وردە، هوردە.

**ئاخەبان**(ن،کی) axeban
١- ئەو گڵەی ئەکرێتە سەر تەختی سەربانی خانوو، بانەناو، خابان، گڵەبان.
٢- سەربانی ڕێک و لووس.

**ئاخەبان** (ن،کی) axeban
١- هاوولات، هاونیشتمان، هاووەتەن.
٢- هاوشار، یەکێلەهەمان شار لەدایک بوبێ وەک ئەویتر.

**ئاخەبانوو** (ن.) axebanü
ئاغاژن

**ئاخەر** (ن) axer
کۆتەل.

**ئاخەفتەر** (ن،کی) axafter(ki)
ئاخاوتەر.

**ئاخەلیوە** (ن) axelêwe
١- ئاخلیف، ئاخلیڤە، خاکەلیوە، سەرەتای بەهار، هەرمێ پشکوان، یەکەم مانگی بەهار.
٢- نەورۆز، یەکەم ڕۆژی ساڵ.

**ئاخ هەڵکێشان** (کتن) axhelkêşan
ئاخ کێشان، ئاخین، کرووزانەوە دەربڕین، لەخەمان ئاخ و داخگوتن، هەناسەهەڵکێشان.

**ئاخی باروت**(ن) axîbarüt
ئاخەباروت، خاکەباروت، خاکی باروت، شۆرە.

**ئاخیرەت** (ن) axîret
١- ئاخر زەمان.
٢- ژیانی داهاتوو، لەمەوپاش، لەمەودوا.
٣- ئەزەل، ڕۆژی ئەزەل.
٤- ڕۆژی حەشر، ڕۆژی هەستانەوە، ڕۆی هەڵسانەوە (قیامەت).
٥- دوایی ژیان، ڕێی هەموان، کۆتایی‌ژیان، کۆچی دوایی، کۆچی ماڵاوایی، نەمان، مردن.

**ئاخێز** (ن) axêz
بزڤە، بزوە، جم، جمە، هەڵس.

**ئاخێزکردن**[1] (کتن، کتپ) axêzkirdin
١- بزڤان، بزووتن، جمان، جووڵان(بەنیازی هەستانە سەرپێ)، خیزان، ڕاستەوەبوون، ڕاسەوەبوون، هەستان، هەڵسان، هەڵستان.
٢- بلندبوونەوە، ڕاست بوونەوە .

**ئاخێزکردن**[2](کتن، کتپ) axêzkirdin
١- خستنە کاتێکی‌تر، هەستان (لە کۆبونەوە).
٢- بەجێهێشتن، دیارنەمان، ڕۆیشتن،هەستان و چوون بۆشوێنێکی دیکە.

**ئاخێزە** (ن) axêze
بزڤانۆ، بزوێنەر، جووڵێنەر

**ئاخیە** (ن)، (کی) axiye(ki)
ئاریخ، ئەوسنگەی وڵاخی پێوە دەبەستریتەوە، سنگ، گولمیخ، میخ ئاخور، میخ زنجیر، میخ سندان.

**ئاخی** (ئان) axî
١- پێچەقین، مانگر.
٢- سەرکیش، یاخی، یاغی.

**ئاخیر** (ن) axîr
هەرخان، ئەو شوێنەی بۆ حەواندنەوە و بەخێوکردنی وڵاخی بەرزە یان مەڕ و ماڵات تەرخان کراوە.

**ئاخین** (کتن) [1] axîn
ئاخ هەڵکیشان .

**ئاخین** (کتن) [2] axîn
پەرۆشداربوون، خەفەت خواردن، خەم خواردن، خەمگین بوون، دڵگیربوون، سووایێبوونەوە.

**ئاد** (ن) [1] ad
دورگە.

**ئاد** (ج) [2] ad
ئەو، وی، وێ.

**ئادا**[1] (ن، کی) ada(ki)
دلاوایی، سەخاوەت.

**ئادا** (ن، کی) [2] ada (ki)
پسپۆڕی، لێزانی.

**ئادا** (ن، کی) [3] ada(ki)
١- داپیر، داپیرە، دایکی باوک یا دایکی دایک، نەنک.
٢- نەنکێ!، نەنە!، نازناوی ڕێزە بۆ ژنێکی پیر.

**ئاداب** [1] (نک) adab
ئەتیکیت، داب و دەستور، ڕێ و شوێنی هەستان و دانیشتنی ناو کۆمەڵ، ویل و ماریفەت.

**ئاداب** (ن، پن، کی) [2] adab(ki)
ئاشۆ، چلک، زووخ ، زۆخ، کەم، کیم.

**ئادان** (ئان)، (کی) adan(ki)
١- بەردار، پڕپێژ، دابەر.
٢- بەبەهرە، بەکەڵک، سوود بەخش.
٣- بەپیت، بەفەڕ

**ئادانیی** (ن، کی) adanî(ki)
بەرهەم، سوود، کەڵک.

**ئادگار** (ن) [1] adgar
باڵا.

**ئادگار** (ن) [2] adgar
ڕوخسار، ڕەنگ و ڕوخسار، سەروشکل.

**ئادوودە** (ن،کی) adüde(ki)
ئادۆدە، دار یان قامیشێکی درێژە ئاسنێک بەنوکەکەیەوەیە بنمیچی خانووی پێ پاک ئەکرێتەوە.

**ئادە** (ن، کی) ade(ki)
تەڵەی کەرویشک، تەڵەی لە دار دروستکراو.

**ئادەکردن**(کتپ،کی) ade kirdin (ki).
پاک کردنەوە، نەهێشتن.

**ئادەم**(ن) adem
١- ئایم، ئایەم، بابەئادەم، باوەئادەم، مێردی دایکە وا، هەوەڵین باپیری مرۆڤ، یەکەم مرۆڤ کەهاتۆتە سەر زەوی بەگوێرەی قورئان و ئینجیل.
٢- بنیادەم، پیاو، مرۆڤ، مرۆک، مرۆ، مەردەم، مەریتە، مێر.

**ئادەمیخۆر**(نک) ademîxor
ئادەمیخۆر، ئایم هەرەک، پیاوخۆر.

**ئادەمیزاد**(ن) ademîzad
١- ئادەمزا، ئادەمزاد، ئادەمیزا، ئادەمیی، ئینسان، بەشەر، خەڵک، زەلام، کەس. ٢- ئافەریدە.

**ئادەمیی** (ن) ademî
١- ڕۆح لەبەر، گیان لەبەر.

٢- هەرشتێ پێوەندی بەمەردومەوەبێ.

**ئادەنە** (ن. کی) [١] adene(ki)

ب (ئاوینە / ١).

**ئادەنە** (ن. کی) [٢] adene(ki)

ئافرەت، ژن.

**ئادەی!** (کد) [١] adey!

بەردەوام بە! .

**ئادەی** (نسپ.ئاک) [٢] adey

برۆبەولاوە، دا، داوەی!، دەی!، لاچۆ.

**ئادێ** (ج) adê

ئەوان، ئەوانە، وان.

**ئادێ چی** (ئان.ج) adêçî

ئەوانی دی، ئەوترەکان.

**ئار** (نسپ، کی) [١] ar(ki)

بریا، بریی، خۆزگە، خۆزەیی، خۆزیا، خۆزیی، دەبا، کاشکە، کاشکا، کاشکای، کاشکی.

**ئار**(ن. کی) [٢] ar(ki)

بریا، خۆزگـە، خـۆزەیی، خۆزیـا، خـۆزیی، دەبـا، کاشکە، کاشکای، کاشکی.

**ئار**(ن. کی) [٣] ar(ki)

ئارد.

**ئار** (ن) [٤] ar

تین، گەرمایی، گەرمیی.

**ئار**(ن) [٥] ar

جا، جاگە، جە، جهی، جێگا، جێگە

**ئار** (ن) [٦] ar

بانەمـەڕ، زۆزان، کوێـستان، وار، هاوارگـە، هاوینگـە، هاوینەهەوار، هاوینەوار، هەوارگە.

**ئارا** (ن) [١] ara

١- مەیان، مەیدان، ناو، ناوچە، ناوەنـد. ٢- جێگـەی ژینی هەمیشەیی.

**ئارا**(ن) [٢] ara

١- بەین، مابەین، نێوان. ٢- پێوەندیی، دۆستیی، سەروسەخت، ئاسیاویی، نێوان خۆشیی.

**ئارا** (ن) [٣] ara

ئارەزوو، ئیشتیا، حەز، ویست.

**ئاراستن** (کتن، کتپ) arastin

تەمەڵی کردن، خستنەپـشت گـوێ، دانەپـشت گـوێ، سستیی کردن، کەمتەرخەمییکردن، گوێنەدان.

**ئارام** (ن) [١] aram

ئاسایش، ئاسایشت، ئۆقرە، پشو، ستارە، سرەوت، سەبر.

**ئارام** (ئان) [٢] aram

١- بێـدەنگ، سـەنگین، گـران، لەسـەرخۆ، مەنـد، مەنگ، هێمن(کەسێ).

٢- ئامۆش، بێهەست و خوست، خـامۆش، کـپ، کـڕ، کش ومات، هێوەر.

٣- ئۆقرەگرتوو، بێجووڵە.

**ئارام** (ئان) aram

قشت، نەرم، نیان.

**ئارام** (ئان) [٣] aram

بەتوانا، توانا، تیندار، هێزدار.

**ئارام** (ئاک) [٤] aram

بەئەسـپایی، بەشـێنەیی، بـەکاووخۆ، بەنـەرمیی، بەهێواشیی، بەیەواشیی، هێدی هێدی.

**ئارام بوون** (کتن) arambûn .

١- ئـارام گـرتن، ئـۆقرەگرتن، سـتارەگرتن، سـرەوت بوون، سرەوتن، سەبرگرتن، وەقرەگرتن.

٢- بێدەنگ بوون، مات بوون.

٣- بـێ هەسـت و خوسـت بـوون، خـامۆش بـوون، کڕبوون، کش و مات بوون.

٤- داسەکنان، داکاسیان، لەجووڵەکەوتن.

٥- دابین بـوون، دامرکـان، دامرکیـان، ڕق و تـوڕەیی نیشتنەوە.

٦- ئێش و ئازار نەمان، ورینگ گرتن.

**ئارام دان** (کتپ) aramdan

١- داسـەکناندن، دامرکانـدن، دامرکـانن، شێنەییکردن.

٢- بێدەنگ کردن، ژێرکردن (منداڵ).

**ئارام کردن** (کتپ) aramkirdin

١- ئازار یان ئێش نەهێشتن، ئیفاقەپێدان.

٢- تینوێتی شکاندن.

**ئارامگا** (ن) aramga

ئارامگە، قەبر، گلکۆ، گۆڕ.

**ئارامگا** (ن) [٢] aramga

تەختەبەنـد، تـەختی نوسـتن، جێگـەی نوسـتن، نوستنگا.

**ئارامگا** (ن) [٣] aramga

پەنا، پەناگە، حەشارگە، حەوانگە، داڵدە، داڵە.

**ئارامگا** (ن، س) [٤] aramga .

ئۆقرەگـا، بارەگـا، سـتارگا (مەڵبەنـدی: ڕێکخـراو، ئازووقـە و تەقەمـەنیی، یـان جـم و جـۆڵ ...). نم: ئارامگایەکی گەورەی سوپا لەشارەکەماندایە.

**ئارام گرتن** (کتن) aramgirtin [1]
ب (ئارام بوون / ١).
**ئارام گرتن** (کتن) aramgirtin [2]
١- پشووهەبوون، چاوەڕوانکردن، دان بەخۆداگرتن، ڕەحەت دانیشتن. ٢- هێدیبوونەوە، هێواش بوونەوە، هێوەربوونەوە.
**ئارام لێ بڕان**(کتن) ram lê biṟan
ئۆقرەلەبەرهەڵگیران، ئۆقرەنەمان، ناڕەحەتبوون (هەست).
**ئارام لێ بڕین**(کتپ) aram lê biṟîn
بێزارکردن، ناڕەحەت کردن، هەراسان کردن، هەراس کردن.
**ئارام لێ هەڵگرتن**(کتپ) aramlê helgirtin [1]
ب (ئارام لێ بڕین).
**ئارام لێ هەڵگرتن**(ند) aram lê helgirtin [2]
تووڕەکردن، جاڕس کردن، سەرلێ سەندن، شێتگیرکردن، فیشکەی کردن، هێنانەجۆش.
**ئارام لێ هەڵگیران**(کتپ) aram lê helgiran
زویر بوون، ناڕەحەت بوون.
**ئارام نەگر** (ئان) aramnegir
١- ئارام لێهەڵگیراو، بێئۆقرە، ناڕەحەت، هەراسان.
٢- بێخەو، خەوزڕاو، خەو لێزڕاو.
٣- بێ ئارام، بێ هەدا، پەریشان، شپرزە.
٤- بێ ستارە، سرەوت لەبەربڕاو، سرەوت لێبڕاو، شەپریو.
٥- ڕاتوول، ڕانۆ، ڕیتاڵ، گەڕۆک، گەڕیدە (ن).
**ئارامی دڵان** (ن.) aramî dilan
١-خاتوون، خانم، خانم خاس، ژن.
٢- هاودەمی ژیان.
٣- جەرگە، دەنگ، کچبانوو،کیژ.
**ئارامیدەر** (ئان) aramider
تەسەلاپێدەر، تەسەلادەر، دامرکێن، دامرکێنەر.
**ئارامیی** (ن) aramî [1]
١- بێ دەنگی، بێ هەست و خوستی، هێمنی.
٢- ئۆقرە، بێ تەقەوڕەقەیی، بێ شەڕو شۆڕیی، دنجیی، هەدا. ٣- نەرمی، هێدیتی، هێدیی.
**ئاران** (ن) aran [1]
١- تەختانیی، تەختایی، دەشت، زەوی بێ گرد و تەپۆلکە.
٢- گۆشتە زەوی، نەرمان (زەویی کەبۆ کشت وکاڵ دەست بدات).
٣- چیمەن، لەوەرگا، لەوەرگە.
٤ - دەشت و دەر، سارا، هەرد.
**ئاران** (ن) aran [2]
بنکەی ژیانی زستانەی کۆچەران، گەرمەسێر.
**ئاران** (ن) aran [3]
ئازار، ئەزیەت، ئۆف، ئێش، دەرد، ژان، ژوار، هێش، پیش.
**ئاران** (ئان) aran
سان، لەبار، نەرمەنیشک، هەموار.
**ئاران** (ن) aran [4]
بزواندن، پاڵ پێوەنان، تاودان، جوڵاندن، قاودان، گاڵ دان، هان دان.
**ئاراندن** (کتپ، کی) aran
١- ئازاردان، ئێشاندن، ئێش بردنەدڵ، ئێش پێگەیاندن، ژان بردنەدڵ.
٢- دڵ ئێشاندن، زویرکردن، هەست بریندارکردن.
٣- بریندارکردن، زامدارکردن.
**ئاراو** (ن) araw
ئاراف، سابووناو، کەفاو، کەفاوی‌سابوون کەجل و بەرگی تێدا دەشۆرێ، کەفاوێ کەجارێک جلی تیا شۆرابێ.
**ئارایش** (ن) arayîş [1]
ئارایشت، تاس و لووس، سووراو و سپیاو، لاولووسە، مەبەست کاری خۆرازاندنەوە و خۆ جوان کردنە.
**ئارایش** (ن) arayîş [2]
ئارایشت، تەدارەک، تەنتەنە، جوانیی، خەمڵ، ڕێک و پێکی.
**ئارایش** (ن) arayîş [3]
ئارایشت، دیکۆر.
**ئارایش دان** (کتپ) arayîş dan
ئارایشت دان، تاس و لووس دان، جلی جوان کردنەبەر، جلی جوان لەبەرکردن، جوان کردن، دەست پێداهێنان، ڕازاندنەوە.
**ئارایش کردن** (کتپ) arayîş t kirdin [1]
ئارایشت کردن، خۆ ڕێک و پێک کردن، سووراو و سپیاو کردن.
**ئارایش کردن**(کتپ) arayîş kirdin [2]
ئارایشت کردن، تاس و لووس دان، دەموچاوهەڵگرتن (خۆ یان یەکێکی تر).
**ئارایشگەر** (ن) arayîş ger [1]
ئارایشگەر، تاسولووسدەر، ئەو ئافرەتەی

کەئارایشتی خۆی یان ئافرەتێکی تر بدا.

**ئارایشگەر** ( ن ) ۲ arayîş ger
دەموچاو هەڵگر.

**ئارپەشک** ( ن،کی ) arayîş k (ki)
پەلەپیتکەی تفەنگ، پیتکەی تفەنگ، پیلکەی تفەنگ.

**ئارتوون** ( ن، کی ) ۱ artün (ki)
ب ( جەهەندەم ).

**ئارتوون** ( ن، کی ) ۲ artün (ki)
ب ( ئەتوون ).

**ئارتوون** ( ن، کی ) ۳ artün (ki)
تەنوور، تەنووری نان کردن.

**ئارج** ( ن،رو،کی ) arc (ki)
حەیزەران، دارحەیزەران، قامیشی حەیزەران.

**ئارچەن** ( ن، کی ) arçen (ki)
ئەرزەن، ئەرزینگ، چەناگە، شەویلاگەی خوارەوە.

**ئارختک** ( ن، کی ) arxtik (ki)
مۆتەکە، میردەزمە.

**ئارد** ( ن ) ۱ ard
١- ئار، ئەرفان، دەغلی هاڕراوی ئامادەی نان، کوبین، هارد.
٢- دانەویلەی هاڕراو، دەغلی هاڕراوە.
٣ -خاکەرۆ، خاکەرۆک.

**ئارد** ( ن ) ۲ ard
تۆز، خاکە، وردە، هوردە.

**ئارداڤ** ( ن، کی ) ardav (ki)
ئەروەند، تەشقەڵە، تەفرە، تەڵە، داو، فریو، فێڵ، فێڵ و فەرەج، فەن، گز، گزەونیی، گۆبەند.

**ئارداویژ** ( ن. ) ۱ ardawêj
ئاردەشان، ئاردی پرژاو، ئەوئاردەی بەرداش لەسووڕانەوە دا فڕێ ئەدات ( ئاشی ئاو ) یان ئەو شوینەی ئاردی لەلێواری بەرداشەوە دەڕژێ بۆ قوڵکەی ئاش.

**ئارداویژ** ( ن ) ۲ ardawêj
دەراوی دەمی ویژەر، دەم و گفت، دووان، قسەوباس، گفتوگۆ.

**ئارداویژ** ( ن ) ۳ ardawêj
قسەی حەلەق و مەلەق، وتەی پڕ و پوچ.

**ئارداویژی خۆشە** ( رس ) ardawêjî xoše
١-بەکاردەهێنرێ بۆ یەکێکی دەراوی قسەخۆش، زمان شیرین، سەروزمان شیرین، قسەخۆش، وتەخۆش. ٢- ڕۆح سووک، میهرەبان.

**ئارداویی** ( نان ) ۱ ardawî
بەئارد داپۆشراو، تۆزی ئارد لێ نیشتوو، تۆزی ئاش گرتوو.

**ئارداویی** ( خ ) ۲ ardawî
تۆمەت بەخۆ کردوو، خۆ تووشکردوو.

**ئاردبیژانەوە** ( کتپ ) ardbêjanewe
ئارد لەمێلەک دان.

**ئاردکیش** ( ن ) ۱ ardkêš
قەراش، کۆڵ هەڵگر ( تەنها باراش ).

**ئاردکیش** ( ن ) ۲ ardkêš
ئاردکۆوەکەر، ئاردماڵک، بێلۆکەی دارینی ئاشەوان کە ئاردی پێ لەقوڵکە دەردە دا، خاکەنازی ئارد کۆکردنەوە، دارێکی درێژە تەختەیەکی پانی بەسەرەوەیە ئاشەوان ئاردی پێکۆدەکاتەوە.

**ئاردماڵک** ( ن ) ardmaḻk
ئاردکیش.

**ئاردن** ( کتپ، کی ) ardin(ki)
ئانیین، هانیین، هاوردن، هێنان.

**ئاردو ڕۆن** ( ن ) ard w ṟon
ئارخاف، ئاردخاو، ئاردەوا، ئاردیی، پەڵوو، پەڵوولە، جوجوش، حەڵوا، حەڵوای زەیستان، میوانیی.

**ئاردوو** ( نک ) ۱ ardü
ئاردوو، چیلکە و چەواڵ، سووتمان، سوتەمەنیی، قرش و قاڵ.

**ئاردوو** ( نج ) ۲ ardü
کاری ئاگرکەوتنەوە.

**ئاردە** ( ئان ) arde
تازەبابەت، تازە داهاتوو، نۆ هاتیی.

**ئاردە بارە** ( ن ) ardbare
ئارد بەهرە، ئاردەوارە، بەشەئاردێک کە ئاشێر بۆ هەر بارێک کەمێکی بەخۆشیی خۆی بەئاشەوان دەبەخشێ، قرەمزە، مزەی ئاش، هەق یان کرێی بارکردنی ئارد یان لێ کردنی باراش..تاد.

**ئاردەبیژ** ( ئان ) arde bêj
بەمێلەک بیژراو، بەپەلەکداکراو، زۆر وورد ( وەک ئارد )، لەپەلەک دراو، والابێژ.

**ئاردە پیچ** ( ن ) ۱ arde pêç
ئارد پیچ، حەڵوا.

**ئاردە پیچ** ( ن ) ۲ arde pêç
گاڵگاڵی، مارمارۆکە.

**ئاردە شان**( ن ) ardešan
ب ( ئارداویژ ).

**ئاردە لووکە** (ن) ١ arde lüke
ئاردی ناو قوڵکەی ئاش، وردە ئاردی سەر لێوی قوولکە لە ئاشدا.

**ئاردە لووکە** (ن) ٢ arde lüke
بەفرە لووکە، بەفری زۆر ورد و وشک کە دەبارێ، وردەکلوی بەفر.

**ئاردەڵ** (ن،کی) ardeḻ(ki)
١- ئەردەڵ، ئێشکگر، پاسەوان، حەس حەس، کێشکچیی، وەردیان. ٢- پێش خزمەت، گزیر، راوێژکەری ئاغا، نۆکەری بەردەستی ئاغا.

**ئاردە مشار** (ن) ardemišar
ئاردی هەرە، بڕەمشار.

**ئاردەوا** (ن) ardewa
پەلوولە.

**ئاردەینە** (ن، کی) ardezne(ki)
داماتوو، دامێنراو، ژنووماتیی، نۆچێ بوویی.

**ئاردی بێژراوە** (خ) ardîbêjrawe
١- ئامادەکراو، پوختەکراو، خەملاو، سازاو
٢- ئامادە، پوختە، ساز، لەبەردەس.

**ئاردینە بێژراو** (ن) ardînebêjraw
ئاردی کەپەکاوی، ئاردی لەمێلەک نەدراو، ئاردی نەتەقیاگ

**ئاردیی** (ن) ardî
پەلوولە.

**ئارزان** (ئان، کی) arzan
١- کەم بەها، کەم نرخ ، هەرزان. ٢- بێبەها، هیچ، هیچ و پووچ.

**ئارزێ** (ن) ١ arzî
خاوەن ماڵ، ماڵاخۆ، ماڵخۆ، ماڵیخۆ.

**ئارزێ** (ن) ٢ arzî
ب (ئارەزوو).

**ئارسم** (ن،پز، کی) arsim(ki)
١- باهۆز، تراو، دەمەنیی، ساف، فرفینگ، مرک، هەلامەت.
٢- نووفە، پزوو، پسکە، سەقاو، مرخە، مقاو، مەقاو.

**ئارماز** (ن، کی) armaz(ki)
بەکرە، خرخرە، خرپلە، خولخولۆکە، خەبینەت، غەرغەرە، قرقرە، گرگرە، لوولەیەکی ناوبۆشە، دەزوو، تەل ..تاد لەسەر هەڵدەکرێ.

**ئارمانج** (ن) armanc(ki)
بالەتە، پنگ، خاڵ(بۆ مشتوو لیگرتن بەچەک)، شەقلە، کۆلک، کێلک، مشتە، موور.

**ئارمانجێ** (ن) armancê(ki)
ئەزموونی ئەنگیوەیی، کێ بەرکێ لەتفەنگ و تیر هاوێژدا، نیشانە گریی.

**ئارمانجێ کردن**(ن،کی) armancê kirdin(ki)
ئارمانجانێکردن،
ئەزموونی ئەنگیوەییکردن، کێبەرکێکردن (بەچەک)، نیشانەداکردن، نیشانەگریی کردن، نیشانەگیریی کردن.

**ئارموش** (ن، کی) armüš (ki)
ب (ئاوریشم).

**ئارنگ**(ن، کی) aring(ki)
باق و بریق، بریسک، بریسکە، بریق و باق، بریقە.

**ئاروان** (ن، کی) arwan(ki)
ئازووخەی ئارد لەماڵدا، پەسمەندەی ئارد لەماڵدا.

**ئاروانە** (ن، ئا، کی) arwane(ki)
ئارپانە، ئاروان، ئارە وانە، حوشتر، حیشتر، دەپە، ووشتر.

**ئاروو**(ن، رو، کی) ١ arü(ki)
ئاروێ، خەیار، هاروێ.

**ئاروو** (ن،کی) ٢ arü(ki)
پووک، پووکی دان.

**ئارووشک** (ن،کی) ٣ arüšik(ki)
باوێشک.

**ئارووشک** (ن، کی) ٤ arüšik(ki)
پژمە.

**ئاروین کردن**(کتپ، کی) arwîn kirdin(ki)
ئازموون کردن.

**ئارۆزیان** (کتن، کی) aroziyan(ki)
هرووژان، وروژان.

**ئارهان** (ن، کی) ١ arhan(ki)
ئازار، ئێش، ژان(سووتاو).

**ئارهان**(کتن، کی) ٢ arhan(ki)
١- ئێشانەوە، چووزانەوە، کولانەوە، وە ژان هاتنەوە، هاتنەوە ژان.
٢- برژانەوە، سووتانەوە، (برین)

**ئارهاندن** (کتپ، کی) arhandin(ki)
١- ئاگر پێوەنان، چزاندن، سووتاندن.
٢- داخ کردن، داغ کردن.

**ئارهایی** (ن،کی) arhayî(ki)
ئازاری هەمیشەیی (لەئەندامی لەشدا).

**ئارەزوو** (ن) ١ arezü
١- ئارزیی، ئارۆزە، ئێشتیها، خوەستەک، کەوژ،

وان( بۆ خواردەمەنی ) .
٢- خواز، خواس، خواست، ویست، هەوەس، هێڤی
٣- ئەوین، ئەڤینی، خۆشەویستی، هەڤینی، هەوینی.
٤- حەز، مەیل، هەوەس، هەویا( بۆ سەرجێیی ).

**ئارەزوو( ن )** ٢ arezü
١- ئـاوات، ئومێـد، ئومێـدەواریی، هومێـد، هیـوا، هیواداریی. ٢- ئەڵها، کام، ڤیان.
٣- سەودا، کەڵکەڵە، هەڵپە، هەوا.

**ئارەزوو ( ن )** ٣ arezü
سەرچڵیی، سەرکێشی.

**ئارەزوو( ئان )** ٤ arezü
سەرچڵ، سەرکێش.

**ئارەزوو بزوتن( کتن )** arezü bizütin
١- مەیل جوڵان،هەوەس چوونە سەر
٢- حـەز لەسـەر جێـی کـردن، هـەوەس هەڵسان( هەستان ).

**ئارەزوو بوون( کتن )** arezü bün
١- ئێـشتیابوون، ئێـشتیهابوون، تاسـەمەندبوون، تامەزرۆبوون، ویستن.
٢- ئاواتەخوازبوون، ئاواتییەبوون

**ئارەزووپێ دان( کتپ )** arezü pêdan
١- مەیل بۆ جوولان، هەوەس پێ جـوولان، هـەوەس پێ هەڵسان.
٢- پاڵ پێوەنان، تیژکردن، گاڵ دان، هان دان.

**ئارەزووکردن( کتپ )** arezü kirdin
١- ئێشتیاکردن، تاسەکردن، حەزکردن لە، دڵ بـۆ چوون، مەیل بۆچوون.
٢- خواستن، گاڤیین، ویستن.
٣- دڵ لەدوو بـوون، ڕەچـاوکردن، قـرم لـێ خـۆش کردن.

**(بە ) ئارەزووگەیشتن( کتپ )** (be)arezü geytin
ئـاوات وەدییهـاتن، ئـاوات هاتنـەدی، بـەئارە زوو گەیین، بەئاوات گەیشتن.

**ئارەزوومەند( ئان )** arezü mend
ئاواتەخواز، بەئاوات، بەتاسە، بەعەزرەت، تاسەخواز، تاسەوەن، تاسـەمەند، تامـازرۆ، تامـەزرۆ، هۆمیـدەوار، هیوادار.

**ئارەزوومەندیی ( ئان )** arezü mend
١-ئارەزوو.
٢-ئێشتیای جووت بوون، چێشکەی سەرجێی.

**ئارەق ( ن )** ١ areq
ئارەقـە، ئـەرەق، تـەڕایی کـەلە کونـەکانی پێستەوە دێتەدەر، خوو، خووەی، خویە، خۆ.

**ئارەق ( ن )** ٢ areq
١ -تەقەلا، خەبات، کۆشش، هەوڵ.
٢- ماندوێتی، مانگیی، هیلاکی.

**ئارەق ( ن )** ٣ areq
ئەرەق، بادە، خواردنەوەیەک مەستی بدات، عـارەق، عـەرەق ( جـۆرە مـەیێکی ڕۆژهەلاتییـە لە دۆشـاوی خورمـا، شـەربەتی تـرێ، یـان بـرنج و شـەکر دەردەهێنرێ )

**ئارەق ( ن )** ٤ areq
ئـاو یـان جەوهـەری گـوڵ ( هـەروەها هەنـدێ گژوگیا... )، گوڵاو.

**ئارەق ( ن )** ٥ areq
شلەمەنیی لە هەڵم تکاو.

**ئارەقاویی ( ئان )** areqawî
١- لەش بەئارەقـەوە، یـەکێک زۆر ئـارەقی کردبێتەوە.
٢- شتێ بۆنی ئارەقی لێ بێت.

**ئارەق پێ کردنەوە( کتپ،ئد )**
-areq pêkirdinewe
بەئاوکردن، پۆزی کەسێ شکاندن، تەریق کردنـەوە، چاوبـەرە ژێرکـردن، چـاو پـێ شـۆڕکردن، خەجاڵـەت کردن، شەرمەزارکردن، کردن بە ئاو.

**ئارەقچن ( ن )** areq çin
ئـارەخچن، ئـارەقچین، تەپـلە، تەقیلـە، کـڵاو، کلاوەنگور.

**ئارەقچنیاو ( ئان )** . areq çinyaw
ئارەق چنیاگ، خەلەستوو، قاڵ، قالبوو.

**ئارەق خواردنەوە ( ئان )** areq xwardinewe
بادە نۆش کردن.

**ئارەق خۆر ( ئان )** areq xor.
مـەیخۆر، کەسـێ کـەئارەق خواردنـەوەی کردبـێ بەخوو.

**ئارەق دەردان ( کتن )** areq derdan
ئارەق کردنەوە.

**ئارەق دەرهێنان ( کتپ )**.areq derhênan
ب ( ئارەق گرتن ).

**ئارەق ڕشتن ( کتن )** areq ṟiştin
ئارەق کردنەوە.

**ئارەق فرۆش ( ن. )** areq froš.
مەیخانـەچیی، مـەیفرۆش، کەسێکەپیـشەی ئـارەق فرۆشیی بێ.

**ئارەق كردنەوە(كتن)** areq kirdinenwe.
١- ئارەق دەردان، ئارەق رشتن، ئارەق كردن، تەرایی ئارەق لەئەندام دەركەوتن، تەرپی(ئارەق) لەكونەكانی پیستەوە لەئەندام دەركەوتن، تەرپی(ئارەق) لەكونەكانی پیستەوە هاتنەدەر.
٢- بەخۆدا شكانەوە، خەجالەت بوون، روو زەردبوون، شەرمەزاربوون(ئد).
٣- ئالۆزان، پەشۆكان، تێك چوون، شلەژان، شیوان.
**ئارەق گرتن (كتپ)** areq girtin
ئارەق دروست كردن، ئارەق دەرهێنان، ئارەقەكێشان، جەوهەر دەرهێنان یان گرتن، چكاندن، چۆڕاندن (میوە، گژوگیا..).
**ئارەقگیر (ن)** areqgir ١
ئارەقەی ژێر زینی ولاخ، ئەرەقگیر، پارچەلبادی ژێر زین، پارچەلبادێكی تەنكە لەبن زینەوە دەخرێتە سەر پشتی ولاخ، تەكەلتۆ، ژێر زین، نەرمە زین.
**ئارەقگیر (ن)** areqgir. ٢
ژێرجل، ژێر كراس،فانیلە.
**ئارەقگیر (ن)** areqgir ٣
ئەرەقگیر، تونگەی بەلوولە، تونگەی لوولەدار.
**ئارەقە (ن)** areqe. ١
ب (ئارەق).
**ئارەقە (ن)** areqe. ٢
تیرتۆی دیوار، دیمەك، كۆلەكەی ناو دیوار (بۆ راگرتنی).
**ئارەقە (ن)** areqe ٣
جلەو، دەستەوسار، قەراسە، قەوچە، لغاو، مەهار، هەفسار، هەوسار.
**ئارەقە (ن)** areqe. ٤
تەرایی، تەرپی، رەو، شە، شی.
**ئارەقی رەش و شین دەردان(ئد)**
areqî reš w šîn- derdan.
ب (ئارەقیرەش وشین كردنەوە).
**ئارەقی رەش وشین كردنەوە(ئد)**
areqî reš wšîn- kirdinewe
١- ماندوو بوون، هیلاك بوون.
٢- تەریق بوونەوە، شەرمەزار بوون.
٣- خۆماندوو كردن، خۆ ماندگ كردن، خۆ هیلاك كردن.
**ئارەوەن (ن، رو، كی)** arewen
داری سەروو، سەروو.

**ئارەی (ئان)** arey
پڕ، تژیی، دارماڵ.
**ئاریا (ئان)** arya
باخوە، خودان، سالار، سان، سەراك، سەردار، سەركردە، سەرۆك، سەرەك، گەورە (پلە)، مەزن.
**ئاریان(كتن)** aryan ١
كوان یان زیپكە لەلەش هاتن.
**ئاریان(كتن)** aryan ٢
دل تێك چوون، دل هەلشیوان.
**ئاریباری(ن، می)** arîbarî ١
ئالووچە، زەردەلوو، عەلوچە، هەلۆچكە، هەلۆچە، هەلووژە، هەلووژەی سووری پایزە.
**ئاریباری (ن، می)** arîbarî ٢
ئالوبالوو، بەلالوك.
**ئاریختێ (ن،كی)** arîxtê(ki)
ئاودابەشكەر، میراو، (ئەو كەسەی سەرپەرشتی ئاو دابەشكردنی بەدەستە بۆ ئاودیران).
**ئاریدانك (ن،كی)** arîdank(ki)
١- سەرەنوێلك، سەرەنوێلكی خۆلی عەمەلە، كەلاوەی پڕ لەپیسایی. ٢- تەنەكەی خۆل.
**ئاریشە (ئان)** arîše
دژوار، دشوار، زەحمەت، نارەحەت.
**ئاریشە كردن(كتپ)** arîše kirdin
دژواركردن، زەحمەت كردن، نارەحەت كردن (كاروبار). دژ: ئاسان كردن، سووك كردن.
**ئاریشەن (ن)** arîšen
بەشارەت، پژوون، زەهلە، ورە، وورە.
**ئاریكار(ن،كی)** arîkar(ki)
١- ئالیكار، هاریكار، یارمەتیدەر، یاریدەر، یاریكار، (كەسێ كۆمەك بەكەسێ دەكا).
٢- پشت، پشتیوان، هاوپشت.
٣- تیژووكەر، تیژووكەر، گالدەر، هاندەر، هەشدەر، هەلخراندەر.
٤- ئیشكەر، بەردەسیكەر، بەنیی، دەستوپێوەند، كاركەر، كۆلە، نۆكەر.
٥- تەبان، دەماڵ، كارەكەر، كلفەت، كەنیزەك.
**ئاریكاری (ن، كی)** arîkarî(ki)
ئالیكاری، زبارە، كۆمەگ، هاریكاری، هاریی، هاوپشتیی، یارمەتیی، یاریدە.
**ئاریكاری خواستن(كتن،كتپ، كی)**
arîkarî xwastin(ki)
داوای كۆمەگ كردن، داوای- هاریكاریی كردن، داوای

یاریدەدان کردن (لەکەسێ).

**ئاریکاریی کردن(کتپ،کی)** arîkarîkirdin(ki)
ئاریی کردن کردن، دەستی یارەمتیی بۆ(کەسێ) دریـــژکردن، زیـــارەکردن، هاریکـــاریی کـــردن، یارمەتییدان، یاریدەدان، یاریەدان.

**ئاریلە(ئان)** arîle
ئـالی پـیواز (پـیاوێک خـوو رەوشـتی ژنانـە بێت)، ژنانیلە، ژنەرەنگە، سەرژنانیی.

**ئارینۆک(ن، کی)** arînok(ki)
لەتکەنۆک،نخوشەر.

**ئارێ(ئاک)** arê 1
١- بەڵێ هەرێ.
٢- وایە، هەر وەک تۆ دەڵێی یان دەخوازیی.

**ئارێ(ئاک)** arê 2
ئاما!، تۆ بلێی، رەنگە، لەوانەیە.

**ئارێخ(ن، کی)** arêx(ki)
میخ زنجیر (ولاخی پێ دەبەستنەوە).

**ئارێنج(ن،پز،کی)** arênc(ki)
١- دوومەڵ، قونێر، کوان.
٢- زیرکە، زیپکە، زیتکە، قنچکە.

**ئاری(ن)** arî 1
کۆمەک، هامەیاریی.

**ئاری(نک، کی)** arî 2
بـۆڵ گـەرم، بۆڵـەمر، بـووڵ، تـوون، خۆڵـەمێش، خۆڵەکـەوە، خـۆڵێ، خـەلە کـوو، رتـام، ژیلەمـۆ، سووتوو، سووتەکە، مشکی، مۆڵک.

**ئاری(ئان)** arî 3
پایەبلند، پایە بەرز، گەورە، مەزن.

**ئاری(ن، ئان)** arî 4
هینـدۆ ئەورووپـیی(زمانـەکان)، هینـدۆ ئێرانیـی (ئێلـەکان)، نـەژادی ئـاریی(زمانـەکانیان وئێلەکانیان)، لەرەسەنیی ئاریایی.

**ئاری(ن)** arî 5
پیرۆزی، پێکهاتی، دەربازیی، رزگاری، سەرکەوتی، وەسەرکەوتنی.

**ئاری کردن(کتپ،کی)** arî kirdin
زیـارەکردن، کۆمـەک کـردن، ئاریکـاری کـردن. ئاریکاریی کردن.

**ئاراستە(ئان)** araste 1
١- ئامادە، چاک، دروست، دەبار، دەردەس.
٢- بەسەروبەر، چک، رێکخراو، ساز (لەشکر).
٢- بەدەق، رێک و پێک (کراو).

**ئاراستە(ئان)** araste 2
خەملاو، خەملیو، رازاوە، رازێنراو.

**ئاراستە(ئان)** araste 3
رووبەروو، روو بەرەو روو.

**ئاراستە بوون(کتن)** araste bûn
بەرامبەر بوون، رووتێکردن.

**ئاراستە کردن(کتپ)** araste kirdin 1
١- ئامـادەکردن، چـاک کـردن، حـازرکردن، رێـک خستن.
٢- بەسەروبەر کردن، سازکردن.

**ئاراستە کردن(کتپ)** araste kirdin 2
بەرامبەر کردن، رووتێکردن، رووڵێ کردن.

**ئاراستە کردن(کتپ)** araste kirdin 3
رابەریی کردن، رێپیشان دان، رێگانیشان دان.

**ئاراستە کردن(کتپ)** arastekirdin 4
باسی کەسێ بەخراپەکردن یان بـردن، بەنـد و بـاو بـۆ هەڵبەسـتن، تیلەوتـوانج تێگـرتن، هەڵـە لێ دۆزینەوە.

**ئاراستە کردن(کـتپ)** araste kirdin 5 تـەدارەک کردن، خەملاندن، رازاندنەوە.

**ئارفتە(ئان، کی)** arîfte(ki) 1
١-ئاروفتـە، تێکـدراو، رفتـە، ژێـرە ژوور بـوو، نـوغرۆ بوو. ٢- داتەپیو، رماو، رمیاگ، رووخـاو، روخیـاگ.
٣- تێک تەپاو، دارووخاو، کاول، وێران.

**ئارفتە(ئان، کی)** arîfte(ki) 2
١- پەک کەوتە، لەکارکەوتە(مرۆڤ).
٢- کـــەڵک بـــڕاو، کـــەڵک لێ بـــڕاو، لەکـــەڵک کەوتوو(شت).

**ئارۆ(ئاک)** aro
ئیـستا، ئێـستە، ئیـسە، لەم کاتانـەدا، لەم کاتـەدا، نوکە، نها، نهۆ،نهە.

**ئارین(کتپ، کی)** arîn
١- کردنە ئارد،لەئاش کردن، ورد کردن، وەک ئـارد، هاڕیین، هەڕیین (بەتایبەتی دانەوێڵە).
٢- کوتان، وردکردن، وردوخاش کردن.

**ئاز(ئاک، کی)** az 1
چینچک، زیپکە (سەر پێست).

**ئاز(ئان)** az 2
راست، راستبێژ، راستگۆ، ساغ.

**ئاز(ئان)** az 3
تەماعکار، چاوبرسیی، چاوتێرنەخۆر، نوقـورچ هـاوێژ (بۆ دەسکەوت)، هەڵپە هەڵپەکەر.

**ئازا** (ئان) ١ aza

١- بەجەرگ، بەزات، بەغیرەت، پەردڵ، پەرکیش، ڕۆزبەران،جەسوور، چاوسوور، چاونەترس، دلاڕا، دلێر، شێردڵ، قارەمان، کورد، هەردی.

٢ - پیاو، پیاوی تەنگانە، جوامێر، جوانخاس، جوانمەرد، مەرد، مێر، مێرخاس، وەن، وەند، یارمەتیدەر. ٣- توانا، خورت، لێهاتوو.

**ئازا** (ئان) ٢ aza

بەتاو، بەگوڕ، پەیت، پێتمار، چابوک، چاپک، چالاک، چوست، خۆشڕەو، خێرا، گورج، گورج و گۆڵ.

**ئازا** (ئان) ٣ aza

بەکاکڵ، ساغ (گوێز).

**ئازا** (ئان) ٤ aza

١-باش، چاک، ساخ ، ساغ.

٢- نەشکاو.

**ئازا**(ئاک) ٥ aza

بەپەلە، بەتاڵووکە، بەخێرایی، بەهەڵەداوان. نم: ئازا گەیشتنە سەر سەنگەری دوژمن.

**ئازا** (نک) ٦ aza

ئەندامی لەش، پەلو پۆ، دەست و پێ وبەشەکانی تری لەش بەگشتی. نم: لەدەرەوە رامەوەستە هەموو ئازات تەڕ دەبێ.

**ئازا** (ن) ٧ aza

ئەنام، ئەندام، (کۆمەڵەیەک..).

**ئازاتی** (ن) azatî

ب (ئازایەتیی).

**ئازاد** (ئان) ١ azad

١- ئازاسەر، بەرخوەدار، ڕزگاربوو، سەربەست. ٢- بەرەڵا، ڕاهی.

٣-ئاوەڵا، بەردراو، بەرەڵا، بەرەڵاکراو، سەربەست.

**ئازاد** (ئان) ٢ azad

بازەڵە، بێباک، بێپەروا، پڕڕوو، جەسوور، گوساخ.

**ئازاد** (ئان) ٣ azad

١- بێتاوان، بێخەتا، بێسووچ، بێ گوناه.

٢- بەئیمان، بەدین، پیاوچاک، پیاوی خوا، دیندار، لەخواترس، نوێژکەر.

**ئازادبوون** (کتن) azad bûn

خۆیبوون، سەربەخۆبوون (دوای دەس بەسەری یەکی لەوەوپێشتر)، لەدەس بێگانە ڕزگاربوون.

**ئازادخوا** (ئان) azadxwa

١- سەربەخۆ، سەربەست. ٢-ب (ئازادیخواز).

**ئازادکردن** (کتپ) azad kirdin

١- ئازاسەرکردن، بەردان، بەرەڵاکردن، سەربەست و سەربەخۆکردن، لەبەند ڕزگارو بەرەڵاکردن، لەزیندان بەردان.

٢- دەستووردان، ڕوخسەت دان، مۆڵەت پێدان.

٣- ڕزگارکردن (وڵات لەدەستی بێگانە)، وڵات ڕزگارکردن لەژێر دەستی بێگانە، وڵاتی خۆسەربەست کردن (لەژێر دەستی یەکێ لەوەو پێشتر).

٤- بەندوداوی ئێخسیریی داماڵین، کۆت و زنجیر داماڵین.

٥- ڕاهی کردن، ڕزگارکردن، قوتارکردن.

**ئازادیخوا** (ن) azadîxwa

ئازادخوا، ئازادخواه، ئازادیخواز، ئەو کەسەی لەپێناوی ئازادیدا خۆی بەخت دەکات، داواکاری سەربەستیی، ڕزگاریخواز، کەسێ کەبیروڕای رامیاریی ئازادیخوازانەی هەبێ.

**ئازادیی** (ن) azadî

ئازاهیی، ئازایی، بسەرخۆەیی، تەرخانیی، ڕزگاریی، سەربەخۆیی، سەربەستیی، سەرفرازیی.

**ئازار** (ن) ١ azar

١- ئۆف، ئێش، با، ژان، (ئەندام، لەش..)، هەستی نا ئارامی گیان لە ئاکامی نەخۆشی یان برینداریی.

٢- دەرد، دەردەساریی، نەخۆشیی، نەخۆشیی تەشەنەکەر.

٣- ئاهۆ، دەرد[نەخۆشیی گیانەوەر جگە لەمرۆڤ] قڕ.

**ئازار**(ن) ٢ azar

ئادار،مارت، مارس، دوانزەهەم مانگی ساڵنامەی جوولەکە، سێهەم مانگی ساڵنامەی گریگۆریی.

**ئازارخواردن** (کتن) azar xwardin

هەست بەئازارکردن، هەست بەئێش کردن، هەست بەئێش و ئازارکردن.

**ئازار دان** (کتپ) azardan

١- ئازارپێ گەیاندن، ئێش پێگەیاندن، ئێش گەیان بەکەسێ، ژان بردنە دڵ (کەسێ).

٢- دڵ ئەزیەت دان، زویرکردن، نارەحەت کردن، هەست بریندارکردن، هەست زامارکردن.

٣- ئەزیەت دان، چەوساندنەوە

٤- بریندارکردن، زامارکردن، زامدارکردن.

**ئازار دراو**(ئان.) azardiraw

١- ئازارپێ گەیاندراو، ئەزیەت دراو، ئێش پێ

گەیاندراو، لێ دراو. ٢ - بینەو بەرە پێکراو، دڵ پڕ لەژان کراو، دڵ ڕەنجاو.

**ئازار دەر** (ئان، ن) azarder

١- ئەزیەت دەر، ئێش پێگەیاندەر .

٢- بینەوبەرە پێکەر.

٣- بدەگە، بەدکار، بەدکردار، بەدکردەوە، بەوەزەن، بەوەی، زەرەردەر، زیاندەر، زیانکار، فەتراک، گەلاج.

٤- بەدسرشت، بەدسروشت، بەدفەڕ، ڕووگرژ.

**ئازارسی** (ن، پز) azarsî

١١- ئازاریسیی، باریکۆ، دەردەباریکە، دیق، سیل، نەخۆشیی سیی.

٢- باریکیی، بنەسیی(لەبەرنەبوونی خواردەمەنیی).

**ئازاکردن** (کتن) azakirdin

پەلەپەل کردن، پەلەکردن، پەیت ڕۆیشتن، پەیت کردن، تالووکەبوون، تالووکەکردن، خێراییکردن، رابوون.

(**خۆئازاکردن** (کتن، ند) ١ (xo)azakirdin)

خۆ بەئازا پیشاندان.

**ئازاکە** (رس) azake

خێراکە !، زوویە !،زووکە !، زوو وەرە بەرێوە، گورجکە !.

**ئازاگۆ،ئازامەیدان** (رس) azago، aza maydan

ئانە گورز و ئانەمەیدان، ئەمە ئەرز و ئەوەگەز، خۆش گۆیندە وەرەمەیدان، خۆهەڵکیش چی دەتوانی وەرە بیکە !، (چییت لەدەست دێت بیسەلمێنە).

**ئازاڵە** (نک) azaḻe

١- تەپاڵە، شیاکەی گاومانگا و گامیش (دوای پاک کردنەوە و وشک کردنەوە بۆ سووتەمەنیی بەکاردەهێنرێ، بەتایبەتیی لەگوندەکان).

٢- ئاوردوو، سووتەمەنی (بۆ زستان).

**ئازایانە** (ناک) azayane

ئازانە، چاوقایمانە، دلێرانە، مەردانە.

**ئازایەتیی** (ن) azayetî .

١- ئازاتیی، ئازایی، بەجەرگی، پاڵەوانیتی، پاڵەوانیی،پڕکێشی، چاوسووری، خورتی، دلاوەری، دلێری، نەترسی.

٢- توانایی، توند و تیژی، جوامێری، زەبروزەنگ.

**ئازایی** (ن) azayî

ب (ئازایەتیی/ ١).

**ئازایی کردن** (ند) ١ azayî kirdin

ئازاتییکردن، ئازایەتیی کردن.

**ئازایی کردن** (ند) ٢ azayî kirdin

پیاوەتیی لێ وەشانەوە، جوامێرییکردن، چاکە لەدەس هاتن، خێرخوازییکردن، دەس و دڵ باش بوون، سوودبەخش بوون، سوودپێ گەیاندن، بەکاردەهێنرێ بۆ کەسێ بەمیهرەبانیی و ئاوڕ لەخەڵک دانەوە ناسرابێ.

**ئازایی لە دەس هاتن** (کتن،ند)

azayî le des hatin

ئیش لەدەس هاتن، بەتوانایی بوون، کارامەبوون.

**ئازراندن**(کتپ، کی) ١ azrandin(ki)

١-ئەزیەت پێ گەیاندن، ئەزیەت دان، ئێشاندن.

٢- هەست خرۆشاندن، هەست ورووژاندن.

**ئازراندن** (کتپ،کی) ٢ azrandin(ki)

ئافەرید کردن، داهێنان، هێنانەدیی.

**ئازریی**(ن،پز،کی) azrî(ki)

ئاوڕز، برینی ئاوڕز کردوو، برینی پڕ کێم، برینێ کەکێمی تێ زابێ.

**ئازگار** (ناک،کی) azgar(ki)

بەشوێن یەکدا بێبڕانەوە، تەواو، ڕەبەق، یەکێ بەدوای یەکدابێ بەتەواوی.

**ئازما** (ئان، کی) azma(ki)

١- جوان، ڕازاو، قەشەنگ، نەخشین، نەخشێنراو، (بەشێوەیەکی سەرنج ڕاکێش).

٢- ڕەنگاو ڕەنگ، ڕەنگدار، ڕەنگین.

**ئازمایشت** (ن، نج) azmaîšt

١- ئازموون، ئەزموون، ئۆقڵەمە.

٢- پەیجۆیی، پەیخوازیی، دۆز، دۆزە، دۆزیی.

٣- پشکنین، تاقییکردنەوە، تاقییوەکرن، لەدوو گەڕان، لێکۆڵینەوە (نج).

**ئازموودە** (ئان،کی) azmüde(ki)

ئازموونکراو، ئەزمون کراو،ئۆقڵەمەکراو.

**ئازموکار** (ن، کی) azmükar(ki)

ئاشکراکەر، پشکنەر، پەیجۆ، پەیخواز، تاقیکەرەوە، دەرخەر.

**ئازموون** (ن، کی) azmün(ki)

ئاروین، زمین.

**ئازموون کردن** (کتپ) azmün kirdin

١- ئاروین کردن، ئازمووتن، ئەزموون کردن، تاقییکردنەوە.

٢- بەرامبەرکردن، بەرئاووردکردن، بەراووردکردن،

بەراووردکردنەوە، بەراوەردکردن، پێک گرتن، هەڵ سەنگاندن.

**ئازنگ** (ن.کی) azing(ki)
تاقە خانوو، تەنهاخانوو، تەنیامال، خانووی بەسەر تەختەبەردیپانەوە لەسەریال دروستکراو.

**ئازوبازی تۆم بە مل** (رس) azubazî tom be mil
ئازو بەزەی تۆم بەئەستۆ، ئۆبالت بەئەستۆم.

**ئازوبەزە** (ن) azubeze
ئازوباز، ئۆبال، تاوان، گوناه، وەبال،هۆبال.

**ئازوگویزکردن** (کتپ) azw wêz kirdin
تاو تویکردن، راگویزتن، سەنگەل بەنگەل کردن، گواستنەوە، گۆزاندنەوە، گۆهارتن، گویزاندنەوە، گویزانەوە، گویزتنەوە.

**ئازووخە** (نک) azüxe
ب (ئازووقە).

**ئازووشک** (ن، کی) ١ azüšik(ki)
ئازۆشک، ئاژ، ئاژاژک، ئاژاژیی، ئاژکی، باویشک، بهنژین، ژاژک.

**ئازووشک** (ن، کی) ٢ azüšik(ki)
سەرخەو، قنگەخەو، کەرویشکەخەو، وەنەوز، وەنەوزە کوتێ.

**ئازووقە** (نک) azüqe
ئازوخە، ئازۆخە، بژێو، بژێو، بژیوی، بژیوی، پی‌بژیو، تفاق، داناش، دانەوێر، دانهیرکە، دانیلە، رۆزیی، زاد، زەخیرە، زەواد،قووت، نان وخواردنی پێداویست لەماڵدا.

**ئازووقەدان** (کتپ) azüqedan
ئازووخەپی‌دان، بژیوخستنەبەردەست، تفاق پی‌دان، زەخیرەپی دان.

**ئازووقەدانان** (کتپ) azüqedanan
ئازووخەداخستن، بژیوی دابین کردن، تفاق کۆم کرن.

**ئازوەر** (ئان، کی) zwer(ki)
بەرجل، بەرچاوتەنگ، بەرجل، چکۆس، چەبخووس، دەس گرتوو، رژد، کنووس، کوند، گزاف، مست داخراو، مەندەمۆر.

**ئازوەریی** (ن، کی) azwerî(ki)
بەرچاوتەنگی، پیسکەیی، رژدیی،رەزیلیی.

**ئازەب** (ئان، ن) azeb
جحێل، جەهێل، خورت، خۆرت، عازەب، گەنج، هەرزە، هەرزەکار.

**ئازەبە** (ن، پز) azebe
ئازەبەت، زیبکەی پێست.
زیبکەی دەموچاوی هەرزەکاران. عازەبە، عازەبیی، عازەویی.

**ئازەپ** (ن) azep
بەندەیی، زەرخەریی، کۆیلەی ئەلقەلەگوێ، کۆیلەی بەپارەکڕاو.

**ئازەخ** (ن، پز) azex
بالووک، بالووکە.

**ئازەر** (ن) azer
ب (ئاگر / ١).

**ئازەنتیی** (ن) azentî
راڤە، راوە، شیی.

**ئازەنتیی کردن** (کتپ) azentî kirdin
راڤەکردن، راوەکردن، شییکردنەوە (نوسراو)، مانالێکدانەوە، واتالێکدانەوە.

**ئازیز** (ن، ئان) azîz
١- خۆشەویست، دلبەر، دلدار، دولبەر، دۆست، ڕووناکیدڵ یان ژیان، یار، یور (ن).
٢- بەردل، خۆشەویست، لاوک، هەڤین، هەلکەوتوو، هێژا (ئان).
٣- ئۆفلاز، ژیکەلە، گیژگول (ئان).
٤- بایەخدار، پرپایەخ، نرخدار.

**ئازیزمردە** (ئان) azîzmirde
ئازیز مەردە، ئازیەتبار، خۆشەویست مردوو، خەمباری خۆشەویست مردوو.

**ئازیەت** (ن) aziyet
تازێ، تازیە، پرسە، تەعزێ، تەعزیە، خەم و پەژارە بۆ تازە مردوو، ماتەم.

**ئازیەتبار** (ئان) aziyetbar
ب (ئازیزمردە).

**ئازێ** (ج) azê
ئەوان، خۆیان (ئەو کەسانەی لەوەپێشتر باس کراون).

**ئازین** (ن.) azîn
١- جۆر، چەشن، رەوت، ڕێباز، شێوە، یاسنا، یاسا.
٢- خوو، رەوتار، رەوشت، نەریت.

**ئاژ** (ئان، کی) aj(ki)
ئاژین، درشت،دڕن، گرنج، گرنج گرنج، نەپۆڕ.

**ئاژار** (ن) ajar
بەهرە، پیت، حاسلات، دەرامەت (زەویی و زار).

**ئاژاژک** (ن، کی) ajajik(ki)
ب (ئاژووشک).

**ئاژاشکه** (ن، کی) ۱ ajaške(ki)
تەزوو، جەمین، چۆقە، مچورک، موچرک.

**ئاژاشکه** (ن، کی) ۲ ajaške(ki)
ب (ئاژاوە).

**ئاژاڵ** (نک) ۱ ajal̠
۱- ئـاژەڵ، پـاتاڵ، دەوڵـەت، گاوگۆتـاڵ، گـاوگۆل، مالات، مەڕومالات، ولس، ولست.
۲- چارەوا، چوارپێ، ڕەشەولاخ، ولاخ.

**ئاژاڵ** (نک) ۲ ajal̠
۱- سەوزە، سەوزەگیا، گژوگیا، گیا.
۲- گۆران، لەوەڕ، لەوەڕگا.
۳- چروچیلکە، چڵ و چێو، وردەدار.
٤- پرووپووش، پووش و پەلاش.

**ئاژاڵدار** (ن) ajal̠dar
۱- ئاژەڵـدار، خـاوەن ئـاژەڵ، خـاوەن مـەڕومالات، مەڕدار.
۲- بەدەوڵەت، دەوڵەتدار، دەوڵەتمەند، دەوڵەمەند.

**ئاژاڵداری** (ن) ajal̠darî
ئاژەڵداریی، دەوڵەتداریی.

**ئاژاڵداری کردن** (کتپ) ajal̠darî kirdin
ئاژەڵداریی‌کردن، ئاژەڵ ڕاگرتن، دەوڵەتداریی‌کردن، مالات بەخێوکردن.

**ئاژاڵی دۆشەنی** (نک) ajal̠î došenî
ئـاژەڵی دۆشـەنی، تـەڕەزەن، مـەڕومالاتی دۆشـەندە (بۆ شیر و کەرە و پەنیر).

**ئاژان** (ن، کی) ajan
پۆلیس، جاندار، جەندرمە، درۆغە، قۆڵچی، گزیر.

**ئاژاوڵە** (ن) ajawl̠e
ب (ئاژاوە).

**ئاژاوە** (ن) ajawe
۱- ئاژاوڵـە، ئاژاوڵـەیی، ئـاژاوەیی، هـەرا، هەراهـەرا، هەراوهوریا
۲- ئاژاشـکە، ئاشـۆ، ئاشـووب، ئاشـێو، ئـاڵۆزیی، بێئـارامیی، پـشێونە، پـشێو، پـشێویی، ڕاوەدوو، سەخڵەتیی، شلۆقیی، شەڕیوی، شێواویی، کـەس نەکەس، نائارامیی، ناڕێکیی بار یا دۆخ.
۳- شەڕو شۆڕ، شەڕوکێشە، کـاری تێـک بـەربوونی خەڵک یان بەگژ یەکداچوون، کێشەکێش.

**ئاژاوەچیی** (ن) ajaweçî
ئاژاوەگێـڕ، ئاشـۆبگێڕ، ئاشـووبگێڕ، بـزۆز، بزێـو، دیمـاگۆگ، سـەربەگۆبەند، سـەربەگێچەڵ، سەرەسۆدرە، شەڕەهەڵایسێن، شەڕهەڵخڕێن، کەتنگێڕ، مایەفیتە.

**ئاژاوەگێڕ** (ن) ajawegêr
ب (ئاژاوەچیی).

**ئاژاوەگێڕان** (کتپ) ajawegêr̠an
اژاوەخـستنەوە، ئاژاوەنانـەوە، ئاژاوەخـستنەوە، ئاشووب بەرپاکردن، ئاشووب گێڕان، شەڕهەڵخراندن، شەڕهەڵگیرسـان، فیتنەنانـەوە، کـەتن گێـڕان، هـەراو زەنا بەرپاکردن، هەراوهوریا خولقاندن.

**ئاژاوەنانەوە** (کتپ) ajawenanewe
ب (ئاژاوە گێڕان).

**ئاژاوەیی** (ن) ajaweyî
ئاژاوڵەیی، بێ ئارامی، شەڕیویی.

**ئاژداد** (نک) ajdad
ئـاژدا، ئـەژدا، باپـیران، باوباپـیر، باووباپـیران، پشتاوپشت.

**ئاژر** (ن، کی) ajir
تووڕەیی، ڕق، ڕک، قین.

**ئاژری** (ن، کی) ajirî
بـەڕق، بـەڕک، تـووڕە، ڕق گرتـوو، ڕق هەسـتاو، قیناویی، قین گرتوو.

**ئاژنە** (ن) ajine
چەکوشی بەردچاک کـردن، چەکوشی بەردشکاندن، چەکوشی نەقاڕی.

**ئاژنی** (ن) ajinî
سۆبایی، مەلە، مەلەوانیی.

**ئاژنی کردن** (کتن) ajinî kirdin
خۆبـەدەم ئـاوەوەدان، پـەل هاویـشتن، خۆشـتن لەناوئاودا، شەپۆلی ئاو دڕین.

**ئاژنین** (کتپ) ۱ ajinîn
۱- چیلکـەکردن بەبـەینی دانـدا، نێـوان ددان پـاک کردنەوە بەچیلکە... نێوان ددان کۆڵینەوە بۆ خاوێن کردنەوەی.
۲- دەرزیی‌تێ چەقاندن، سووژن ئـاژنکردن، سـووژن پێداکردن، شتێ‌نوکێ تیژ تێوە کردن.

**ئاژنین** (کتپ) ۲ ajinîn
(دەرگا..)داخستن، (کەلەبەر)گرتن. نم: دەرگاکـە دوای خۆت بئاژنە.

**ئاژنین** (کتپ) ۳ ajinîn
خـۆ ڕووت کردنـەوە، داکەنـدن (جـل و بـەرگ). نم: کراسەکەی لەبەر خۆئاژنیی : دایکەند.

**ئاژنین** (کتپ) ajinîn [٤]
تـــوڕەکردن، ڕق هەڵـــستان، ڕق هەســـتاندن، ڕق هەڵساندن، ڕک هەڵانیین، شێتگیرکردن، کین گرتن، کین هەستاندن.

**ئاژنین** (کتپ) ajinîn [٥]
زیرکردن، زرب کردن، کونجر کونجر کردن.

**ئاژوان** (کتپ، کی) ajwan(ki)
ب (ئاژوتن).

**ئاژوتن** (کتپ، کی) ajütin(ki)
ب (ئاژوتن).

**ئاژوەر** (ن، کی) ajwer(ki)
ئـاژۆ، ئـاژۆژ، ئۆتـۆمبیلچیی، بـران، رادەر، ڕاننـدە، شۆفیر، لیخوڕ.

**ئاژوین** (کتن، کی) ajüyîn(ki)
بلاوبوونـەوە، پـرش و بلاوبـوون، پـەخش بوونـەوە، پەرت و بلاوبوون (شتێک لەشوێنێ).

**ئاژۆ** (ن) ajo
ئالک، ئالیک، دیزیی، کاو جۆ... گژوگیـا (بـۆ مـەڕ و مالات).

**ئاژۆتن** (کتپ، کی) ajotin(ki) [١]
١- ئـاژوان، لێخـوڕیین، هـاژۆتن (ئەسپ، بارەبـەر، ولاخ).
٢- ڕانن، لێخوڕیین (ئۆتۆمۆبیل).
٣- پـــێش خـــۆدان، خـــستنەسەر ڕێ، پـــێخ دان (مەڕ...).
٤- سەرکردایەتییکردن، فەرمانداریی‌کردن.

**ئاژۆتن** (کتن، کی) ajotin(ki) [٢]
بەرێگاوە ڕۆیشتن، بەڕێوەچوون، ڕۆیشتن، ڕۆیین.

**ئاژۆتنەسەر** (کتپ) ajotineser
پـــەلاماربۆ بـــردن، پـــەلاماردان، چوونەســـەر، هەڵکوتانەسەر، هێرش بردنەسەر.

**ئاژۆدان** (کتپ) ajodan [١]
ئاژاڵ لەوەڕاندن لەکێو (بەشەو)، ئاژەڵ لەوەڕانـدن لەشـەوانی بـەهاردا لەشـاخ یـان لە دەشـت، شـەو ئاژووکردن، مێگەل بۆ لەوەڕ بردن بەشەو.

**ئاژۆدان** (کتپ) ajodan [٢]
شەبەیخوون (کردن)، هێرش بردنەسەر (لەشەودا).

**ئاژۆژ** (ن) ajoj
ب (ئاژووەر).

**ئاژۆکردن** (کتپ) ajo kirdin
١-پێ‌دۆزی کـردن، جێ‌پێ هـەلگرتن،دەوس دۆزی کردن، شوێن پێ‌هەلگرتن، شوێنگیریی کردن.
٢- چـاو لەکەسـێ‌کردن، چـاوای‌کردن، لەسـەرڕێ و شوێنی کەسێ‌ڕۆیشتن.

**ئاژەڵ** (نک) ajel
ب (ئاژاڵ).

**ئاژەلداریی** (ن) ajeldarî
ب (ئاژاڵداریی).

**ئاژەلداریی کردن** (کتپ) ajeldarî kirdin
ب (ئاژاڵداریی‌کردن).

**ئاژەلی دۆشەنی** (نک) ajelî došenî
ب (ئاژاڵی‌دۆشەنیی).

**ئاژین** (ئان) ajîn
بەردەلان، بەردەلانی، تمتم، تمتمان، ڕەقەن.

**ئاژینە** (ن) ajîne
١- چەکوشی بیرازکردن (سەرەکەی ددانەی هەیـە) قولنگێ.
٢- چەقچەق، چەقچەکۆک، چەقچەقە، چەقەنە(ئاشی ئاو).

**ئاژین** (کتن) ajîn
درشت بوون، دڕن بوون، زبربوون، زوور بـون، کـەماچ بوون، گرنج گرنج بوون.

**ئاس** (ن) as [١]
پەڕێکە لەپەنجاو دوو پەڕی قومار، (یاریی قومار).

**ئاس** (ن، رو) as [٢]
مۆرد، یاس.

**ئاس** (ئان) as [٣]
کەنەفت، ماندوو.

**ئاس** (ئان) as [٤]
ڕووت، ڕەجاڵ، ڕووت و ڕەجاڵ.

**ئاسا** (پا، ئان، ئاک) asa [١]
پاشبەندیکە ئاوەڵنـاو و ئـاوەڵکردار دروسـت ئـەکات بـەواتای -ئاسـا، چـۆن، وەک، وەکـو، وەکیـی. نم: خۆت ئاسایی.

**ئاسا** (ن) asa [٢]
جۆر، چەشن، ڕا، ڕەوت، ڕێ، ڕێگا، ڕێگە، شێوە.

**ئاسا** (ن) asa [٣]
ب (ئاش).

**ئاسار** (ن) asar
١- ئاسال، بناغـە، بنچینـە، بـن و بنچینـە، بنـەڕەت، بنەوا.
٢- شوێنەوار، نیشانە و شوێنەواری کۆن.

**ئاسارەی زلکە** (ن، ئس) asarey zilke
ئەستێرەی زوحەل ، خوای کشتوکاڵ.

**ئاسارى لەسەر پادارى نەماوە** (رس)
asarî leser padarî nemawe

١- شیرازەی تێک چووە، هیچ شتێکی لەجێی خۆیدا نەماوە.

٢- بزربووە، گوم بووە، لەناوچووە، وون بووە. ٣- بەیەکێکی: بەساڵداچوو، پیر، کۆماو ...دوتری، (ئد).

**ئاساڵ** (ن) asal

ب (ئاسار).

**ئاسان** (ئان) asan

١- بێئەرک، بێگیروگرفت، بێنارەحەتی، سووک، هاسان.

٢- ئاسوودە، سانا، هەدار.

٣-باش، خۆش، گەنگاز.

**ئاسان بوون** (کتن) asan bûn

سازان، سانای بوون شیان، لوان.

**ئاسان کردن** (کتپ) asan kirdin

١- ساناکردن، سووک کردن، گەنگازکردن، هەدارکردن.

٢- خستنەجێی خۆی، ڕێک خستن، لەجێی خۆدانان.

٣- ئەهۆن کردنەوە، دامرکاندن، هێدیکردن.

٤- زۆرکردن، زەحف کرن، فرەکردن، مشەکردن.

**ئاسانە** (ن) asane [1]

١- ئاستانە، ئاستۆن، بەردەرگا، بەرماڵ، پێش خانە، پێش خانوو، پێش دەرگا، پێشدەرکە، دەرماڵ، ژێردەرانە، سەردەرانە (گەورەماڵان).

٢- بن، خوارەوە، دامێن، ژێر، ژێرەوە.

٣- پاگە، جێی پێڵاوداکەندن، کەوشەن.

٤- ئارامگا، بارەگا، بنکە.

**ئاسانە** (ن) asane [2]

دۆخی کەوتنەسەر منداڵ بوون، ژان (ئافرەتی سک پڕ)

**ئاسانەی سووکە** (ژن) (رس) asaney sûke (jin)

بەئاسانی منداڵی دەبێ (یا لێی دەبێتەوە) [ژن]

**ئاسانەی گرانە** (ژن) (رس)
asaney girane(jin)

بە(ئەرک، درەنگ، زەحمەت، گران) منداڵی ئەبێت (یان لێی دەبێتەوە)، [ژن].

**ئاسانیی** (ن) asanî

بێئەرکی، سانایی، سووکیی و بێ گیروگرفتی کاروبار، هاسانی، هەداری.

**ئاساو** (ن) asaw [1]

ب (ئاش).

**ئاساو** (ن) asaw [2]

بەرداش، بەرداشی سەرەوە، بەرداشی خوارەوە(ئاشی ئاو).

**ئاساوان** (ن) asawan

ب (ئاشەوان) .

**ئاسایی** (ئان) asayî [1]

ڕەشۆکیی، ڕەمەکیی، هەڕەمە، هەڕەمەکیی.

***ئاسایی** (ئان) asayî

هەمەچەشنە، هەمەڕەنگ، هەمەڕەنگە.

**ئاسایی** (ئان) asayî [2]

هەردەم، هەموو ڕۆژ، هەموو کات، هەمیشەیی.

**ئاسایش** (ن) asayiš

ب (ئاسایشت).

**ئاسایشت** (ن) asayišt

١- ئارام، ئارامیی، ئاسایش، ئۆقرە، بێدەنگیی، ستارە، هێمنیی.

٢- پشوو، حەسان، حەسانەوە، فەرمانیی، وچان.

٣- ووریینگ، هێور، هێوەریی.

٤- ئاشتیی(گشتیی)، دووری لە جەنگ، دووری لەشەڕ و شۆڕ.

٥- شێنەیی، لەسەرخۆیی.

٦- ئاسوودەیی، ئاسوودەگەریی، بێخەمیی، سەرڕەحەتیی.

**ئاسایشت پەروەر** (ئان) asayištperwer [1]

١- ئاسایش خواز، ئاشتیخواز(ن). ٢- ئاشتیی پەروەر، کەسێ حەزی لەئاشتیبێ، یەکێ شەڕ و شۆڕینەوێ(ئان).

**ئاسایشت پەروەر**(ئان) asayištperwer [2]

لەسەرخۆ، هێدیی، هێمن.

**ئاسپایی** (ئاک) aspayî

بەسەبر، بەهێواشیی، لەسەرخۆ، هێدیکا، هێواش، بەئەسپایی. دژ: بەتوندیی، بەخێرایی. یان: خورتیی، بەملەملانێ.

**ئاست** (ن) ast [1]

١- حانا، حەن،حەنا، عاست. ٢- ڕێ ڕەو، سەرڕێ، سەرەڕێ، سیلە. ٣- جێگا، سەمت، سەنت، شوێن.

**ئاست** (ن) ast [2]

ئاقار، تەراز، تەنیشت، سنوور.

**ئاست** (ن) ast [3]

بەرامبەر، ڕووبەڕوو.

**ئاست** (ئان) ^١ ast
ئامادە، لەسەرپێ، لەکات.
**ئاست** (ئان) ^٢ ast
چەتوون، دژوار، دشوار، زەحمەت(هەرشتێ: کردنی، دانی، یان سەرپەرشتیکردنی ئاسان نەبێ).
**ئاستاش جیا** (شر) asta š ciya
بەجیمی هیشت، بەجێی هیشتم.
**ئاستانە** (ن) astane
ب (ئاسانە).
**ئاستش** (شر) astiš
ڕیگەی دا، هیشتێ.
**ئاستن** (کتن، کتپ) ^١ astin
تلیین، ڕیگەدان، ماوەدان، مۆلەت دان، هیشتن، هیلان.
**ئاستن** (کتپ) ^٢ astin
گل دانەوە، وەرگرتن، هیشتنەوە (پارە، دیاریی...).
**ئاستن**(کتپ) ^٣ astin
پاشەکەوت کردن، پەسەندەکردن (پارە).
**ئاستەر** (ن) aster
ئاسەر، بەر(جل).
**ئاستەم** (ن) ^١ astem
بەحال، پیچ، تۆز، تۆسقال، زەرا، کەم، کەمترین ئەندازە، کەمۆکە، نەخت.
**ئاستەم** (ئان) ^٢ astem
ئاستەنگ، دژوار، سەخت، هەلدیرکە، هەلەمووت، (ڕیگەو بان...).
**ئاستەم** (ئان) ^٢ asteng
ب (ئاستەم).
**ئاسرم** (ن، پز.کی) asrim(ki)
پەتا،پەسیو،مەلامەت
**ئاسک** (ن، ئا) ask
ئاسی، ئاهۆ، ئاهی، بانبز، جەیران، خەزال، کەژال، مامبز، وەرەماس.
**ئاسکوداریی** (ن) askuarî
سەربەست، سەروبەست، سەرپیچ (ژنان).
**ئاسکی میچکە** (ن، ئان) askîmêçke
ئاسکی مێ.
**ئاسمان** (ن، ئس) asman
١- ئاسموو، ئاسمیە، ئەسمەن، عاسمان، عەسمان، گەردوون.
٢- ئەزمان، ئەزمین، چەرخ ، حەوا، عەزمان، فەلەک، هەوا.
**ئاسمان دوورو زەوی سەخت**(پن)
sman dür w zewî sext
واتە:تەنگ و چەلەمەی بێچارە ، دەردی بێدەرمان، (یەکێک دەیلێ کەلەتەنگانەیەکدا بێ و دەستی بەکەسدا نەگات).
**ئاسمان قووتی دا** (رس،ئد) sman qütîda
ئاسمان هەلی لووشیی، دیار نەمان، ڕەش ڕاهاتن.
**ئاسمانگەر** (ن، ئس) asmanger
ئاسمانەوان، ئەستیرەوان.
**ئاسمان لەبەر چاوتاریک بوون** (ئد)
asman leber çaw tarîk bün
١- تووڕەبوون، ڕق هەستان. ٢- پەست بوون، زویربوون، هەست بەنائومیدیی کردن. ٣- بەیەکێک دەوترێ کە (بێ هیڤیی، بێهیوا، نائومید، هیوانەماو) بوو‌بێت. ٤- بەیەکێکی (بێ وورە، تەپیو، ڕووخاو) ئەوترێ. بروا بەخۆ نەماو، شلەژاو.
**ئاسمانە** (ن) asmane
ئاسمانەی دەم، مەلاشوو.
**ئاسمانە** (ن) asmane
١- بنمیچ، میچی ژوور. ٢- پۆش، پۆشە، سەر، سەرقاپڕ.
**ئاسمانیی** (ئان) ^١ asmanî
ئاویی، شین بەڕەنگیئاسمان، شینیکال، عاسمانیی، لاجیوەردیی.
**ئاسمانیی** (ئان) ^٢ asmanî
پەتەڕیی، دین، دیوانە، شیت.
**ئاسمین** (ن، ڕو) asmîn
یاسەمەنە، یاسەمین، یاسەمەنی گول سپی.
**ئاسن** (ن) asin
ئاهە، ئاهین، ئیسن، حەسن، کاراک، ماسن، هەسن، هیسن.
**ئاسنچاو** (نک) asncaw
حاجەت، دەفرو بەرۆشی لەمس چیکریی، دەوریی، قاپ، قاپ و قاچاخ (مسین).
**ئاسندرک** (ن) ^١ asndrik
پەیکولی ئاسن، تەلی دڕکاویی، تیلی وارشی دڕکدار، دڕکە ئاسنینە.
**ئاسندرک**(ن، ڕو) ^٢ asndrik
پەیکول.

**ئاسن سمە** ( ن ) asnsime
ئاسن سم، ئاسن کونکەر، ئاسن کونکەرە، سمۆ

**ئاسنفڕێن** ( ن ) asnfrên
١- ئاسنفڕین، ئاهن ڕوا، کانکیش، گەنی، موگناتیسی‌سروشتیی.
٢- بەردی ئاسنفڕێن، بەردی موگناتیس.

**ئاسنکێش** ( ن، ئا ) asnkê š
ب ( ئاسن فڕێن ) .

**ئاسنگەر** ( ن ) asnger
ئاسن کوت، ئامینکەر، ئامینگەر، وەستاخالە، ماسنکەر، ماسنگەر، وەستای ئامرازی ئاسن، هۆستای هەسنان.

**ئاسنگەریی** ( ن ) [1] asngerî
ئاسن کوتیی، ئامینگەریی، پیشەی‌ئاسنگەر، ماسنگەریی.

**ئاسنگەریی** ( خ ) [2] asngerî
تەقەتەقی زۆر ( وەک حاجەت بەیەکتردا دان ).

**ئاسنەڕێ** ( ن ) asnerê
خەتی شەمەندەنەفەر، ڕێگای ئاسنین، هێلی ئاسنین.

**ئاسنەواڵە** ( نک ) . asnewale
پارچەئاسنی بێکەڵک یان ڕزیو، سەکراب، لەتوپەتی کەل وپەلی لەئاسن ( یان کان ) دروست کراو، لەکارکەوتەو لەت و پەتی ئاسن.

**ئاسنی جۆش** ( نک ) asnîčo š
ئاسنی‌خاو، حەوجۆش.

**ئاسنی سارد کوتان** ( پن ) asınîsardkutan
ئاسنی سارد ئەکوتێ،ئاسنی سارد بەفوو نەرم نابێ، ئاسنی سارد مەکوتە، خۆخەریک کردن بەکاریکەوە تیایداسەرنەکەویی، خۆماندووکردن بەفیڕۆ، کات بەفیڕۆدان، کاری بێ ئەنجام کردن.

**ئاسنی گونجاو** ( نل ) asnîguncaw
ئاسنی‌بەرگەگر، چلیک.

**ئاسنیی** ( ئان ) asinî
ب ( ئاسنیین ).

**ئاسنیین** ( ئان ) asinîn
١- دروست کراو لەئاسن، شتێ‌لەئاسن دروست کرابێ، لەئاسن دروست کراو. ٢- پتەو، تونـد، ڕقرقۆک، ڕەق( وەک ئاسن )، قاییم، قەویی، هەمیز.
٣- ئاسنیی، بەقوەت، بەکێش، بەهێز.
٤- سەنگین، قورس، گران.

**ئاس و پەڵاس** ( ئان ) as w pelas
ڕووت و ڕەجاڵ، ڕووت وقووت، نەبوو، نەدار، پەریشان، هەژار.

**ئاسۆ** ( ن ) aso
١- ئاسۆگێ، ئاسۆگە، ئاسوو، سوو، سوی، سیلە، قەراغی‌ئاسمان، کەلەمل، کەنارەی ئاسمان، ملە. ٢- بەرینایی، پانایی، مەودا، مەیدان، بیر، ڕوانگە، زانیاریی، هۆش‌هەست ( کەسیی ).
٣- مەودای زانیاریی ( بەشێوەیەکی گشتیی ).
٤- تاپۆ، تارمایی، ڕەشایی ( لە دوور ).
٥ - ڕۆشنایی، ڕووناکیی، سۆمایی.
٦- سنووری دوو چۆنیەتی کۆمەڵایەتی.

**ئاسۆک** ( ن ) asok
چۆلکە، سلگات، سای، سایە، سایێک، سەهین، سەی، سێوەرە، سیبەر، سێوەر، سیەی، نزار، نسار، نسرم، نسیی، نیسیی.

**ئاسۆگا** ( ن ) [1] asoga
ئاسۆگە، ئاسووگە، بینینگا، دیارگا.

**ئاسۆگا** ( ن ) [2] asoga
ئاسۆگە.

**ئاسۆیانە** ( ئاک ) asoyane
بەپۆپیی.

**ئاسۆیی** ( ئان ) asoyî
پانەوپان، پۆپیی، ڕێکاوڕێک.

**ئاسوو** ( ن ) asü
١- پیسیی، چرک، چلک، شتێ‌پیس، قرێژ.
٢- بۆگەن، بۆنێ‌ناخۆش، بیگەن، گەندیی.
٣- بەرەڵایی، بێ‌پەردەیی، چەپەڵیی، خاپە، خراپیی، فەلتۆیی، کردەوەی‌خراپ.

**ئاسوودە** ( ئان ) asüde
١- بارسووک، بێ‌خەم، حەساوە، دڵنیا، سەرڕەحەت، سەرسووک.
٢- بێ‌دەنگ، بێ‌قرەوپرە، لەسەرخۆ، هێواش، یەواش.
٣-بێ‌گەرد، دڵپاک، دڵ ساف، ساویلکە.
٤- بێ‌خوست، ئارام، هێمن، هێوەر
٥- بێ‌باک، بێ‌گیروگرفت، خاترجەم.
٦- دینج، ساخ ، ساخلەم، مەشکین.

**ئاسوودەبوون** ( کتن ) asüde bün
١- بارسووک بوون، خاترجەم بوون، گیروگرفت لەکۆڵ بوونەوە
٢- پاڵ دانەوە، پشوودان، ماندوو حەسانەوە، وچان

دان(لەئیش
٣- لێبڕزگاربوون (لەکەسێ).
**ئاسوودە خۆم، کەرم نیە ، لەکاوجۆی خەبەرم نیە** (رس)
le ka w coy .asüde xom kerim niye
xeberim niye.
ئاسوودە کەسێکەری نیە، لەکاوجۆ خەبەرینیە، مالی کەم و خەمێکەم، یەکێک دەیلێ کەسامانێکی ئەوتۆینەبێ لەخولیای پاراستنیدابێ.

**ئاسوودەکردن**(کتپ)[1] asüd kirdin
١ - سەرفرازکردن، گیروگرف لەکۆل کردنەوە.
٢- چارسووک کردن، حەساندنەوە، مۆلەت پێدان، وچان پێدان.

**ئاسوودەکردن**(ئد)[2] asüde kirdin
فەوتاندن، کوشتن، لەناوبردن، (کەسێ)

**ئاسوودەیی** (ن) asüdeyî
١- دلخۆشی، کامرانی، کامەرانی، کەیف خۆشی، گەشیی (دل). ٢- بێ[ خەفەتی،خەمی، گیروگرفتی]، سانایی،هەداریی.
٣- ئارامی، بێدەنگی، بێشەڕوشۆڕی، بی قرەوبرەیی، هەداریی.
٤- پشوو، مۆلەت، وچان، (لەئیش یان ئەرک).

**ئاسووگە** (ن)[1] asüga
ب (ئاسۆگا).

**ئاسووگە**(ن)[2] asüga
تەپکە، تەپلاک، تەپۆکە، تەپۆلکە، تەپۆلە، تەپە، گرد، گردۆلکە، گوویک.

**ئاسوینە** (ن) aswêne
ئاوەستێ، ئەنگوچک، سۆزرانیە ئەنگوچک، کلکەنگوچک، لەوەندیی.

**ئاسەوار** (نک) asewar
١- دێرینە، شوینەواری کۆن.
٢- پاشماوەی ڕەچەلەک.

**ئاسیدە** (ن،کی)[1] asîde(ki)
١- دۆشاوی خورما. ٢- پووشەخورما.

**ئاسیدە** (ن،کی)[2] asîde(ki)
پەلوولە، حەلوا، حەلوایئارد و ڕۆن و دۆشاو، جۆرە شیرینییەکە لەئارد و ڕۆن و شەکر یان دۆشاوی ترێ دروست ئەکرێ.

**ئاسیم** (ئان،کی) asîm(ki)
١- زۆرزان، زیرەک، سالۆز، ستیلم، شابان، قووت، هۆزان.
٢- تەفرەدەر، تەلەکەباز، داوباز، فریوباز، فەنباز، فیلاویی، فیلباز، فیلکەر، فیلەزان.

**ئاسین** (ن،کی) asîn
ئەنگوچک، سۆزانیی، قۆلەکراس، قۆلەکەوا.

**ئاسین هەلکردن** (ئد) asîn helkirdin
قۆل هەلکردن، خۆ بۆ ئیش ئامادەکردن،خۆ دانەبەرکار،دەس دانەئیش.

**ئاسیو**(ن،لو)[1] asîw(lu)
١- ئازار، ئیش، بەلا، میش.٢ - ئاشی، ئاشیو، ئاهۆ، ئەزیەت، چورنم، چەپۆکی ڕۆژگار، کوێرەوەریی، گرداف، مەینەتیی، ناهەمواریی، نەستیل، نەهامەتیی
٣- تەشقەلە، زۆرەملە، گیچەل، گەڕ. ٤- ز،رەر، زیان. ٥- بەند، فیل، کەلەک. ٦- تاوێر، تەلەزگە، تەمەرە، تەوەرە، ڕووشە، قۆرت، کارەسات، کۆسپ، کۆسپە، گل. ٧- بەلا، دەرد، دەردوبەلا، نەخۆشیی، وەی.

**ئاسیو** (ن،لو)[2] asîw(lu)
بەرگریی، بەند، پیشگیرەوەیی، نەمیش، نەمیل، یاساغ.

**ئاسێ** (ئان) asê
١- خورت، دژوار، هێزدار. ٢- زەحمەت،سەخت، نارەحەت
٣- چەپگەر،خوێن مژ،زۆردار، ناداد٤- هەزار بەهەزار، هەلەمووت.

**ئاش**(ن)[1] aš
ئارێش، ئاسا، ئاساو، ئاساوا، ئاسیا، ئاسیاو، ئاشاوا، ئاشێناو، ئێش(دەغل هارێین).

**ئاش**(ن)[2] a š
١- ئاهار، دەمە، شۆ، شۆی پارچە و یاخەی کراس.
٢- سابووناو، شۆ.

**ئاش**(ن)[3] a š
١- چێشت، خۆرشت، شلە، شۆربا، گۆشتاو.
٢- پێخۆر، چاشتیی، خۆراک، زاد، سەرنان، گران، گیرمیی، نان و خۆراکی ڕۆژانە.
٣- ئازۆخە، ئازوخە، داناش، زاد، قووت.

**ئاشاخە**(ئان) a š axe
١- خراپ، خراو، داشاخە، نالەبار. ٢- ئاشاغە، ڕزیو، قرپۆک.
٢- ئاژەلی بێ برەولە جەلەبدا.
٤- بێ ارە (مرۆف).

**ئاشانە**(ن) a š ane
مزاش، مزەی ئاش.

**ئاشبگیر (ن)** a š bigir
تالان، چەپاو، هێرش (بۆ سەر ئاش).
**ئاشبگیرکردن (کتپ) ١** a š bigir kirdin
ئاش تالان کردن، ئاش چەپاکردن، بەزۆر چوونە ناو ئاش و شتومەک بردن (نز. جەردە...).
**ئاشبگیرکردن (کتپ) ٢** a š bigir kirdin
١- تالان کردن، شتومەکی خەڵک بردن (بە زۆر و ستەم).
٢- پەلاماردان، هەڵکوتانەسەر، هێرش بردن، هێرش بردنەسەر (ماڵ و حاڵی خەڵک).
٣- جەردەیی کردن (لەڕێگەوبانــدا)، ڕووت کردنەوە (کاروانیی)، لەکاروان دان....
**ئاشبگیرکردن (کتپ) ٣** a š bigir kirdin
تێک و پەکان دان، خاپوورکردن، ڕووخاندن، کاول کردن، وێران کردن، هەڕفاندن.
**ئاش بە باگێڕان (ئد)** a š bigir kirdin
بەیەکێکی بێباکە یا کەمتەرخەم دەوترێ. مەبەست: خستنەپشت گوێ، دانە پشت گوێ، گوێنەدان.
**ئاش بە تاڵا (شر.ئسپ)** a š betal
١- ئاش ئامادەیە بۆ باراش لێ کردن، ئاش دۆڵ!.
٢- بانگەوازی ئاشەوان بۆ خەڵک لە ئامادەیی ئاش بۆ باراش هاڕیین (لەکاتێکدا ئاشەکەی دانی نەمابێ).
**ئاش بە تاڵ کردن (ئد)** a š betal kirdin
١- ئاش بەتاڵ لێکردن، دەس لەئیش هەڵگرتن، دەس لەکارکێشان، واز لەکارهێنان، هاتنەدواوە (لە ئیش).
٢- پاشەکشە کردن، کشانەدواوە، کشانەوە، گەڕانە دواوە، مەیدان بەجێهێشتن.
٣- بێ ئیش بوون، بێفەرمان بوون، گردەنشیین بوون یان کەوتن.
٤- تەپیین، داتەپیین، ڕمان، ڕوخان، شکست خواردن، وازهێنان لەکارێک یان جووڵانەوەیەکی ڕامیاریی بەنیوە ناچڵیی (نیوە چڵ)، هەڕفتن.
**ئاشپەزی (ن، کی)** ašpezî(ki)
ئاشچێتی، چێشتکەری.
**ئاشپەزی کردن (کتپ،کی)** ašpezîkirdin(ki).
خواردن بۆ سەر خوان ئامادەکردن، شتی خواردن: برژاندن، کوڵاندن، سوورکردنەوە، ئاڵ کردنەوە...، لینان.
**ئاشت (ئان)** ašt
ئاش، بێ شەڕوداوا، دۆست، ڕێک، ساز، نێوان خۆش، یەککگرتوو.
**ئاشت بوونەوە (کتن)** aštbünewe
پێک هاتنەوە (دوای نێوان ناخۆشیی)، ڕێک کەوتنەوە، ڕێکەوتنەوە، سازبوونەوە، مەسلەت کردن، یەک کەوتنەوە (جارێکی دیکە دوای ناکۆکیی)، یەک گرتنەوە.
**ئاشت کردنەوە (کتپ)** aštkirdinewe
پێک هێنانەوە (دۆستایەتیی)، ڕێک خستنەوە، سازکردنەوە، مەسلەت لەنێواندا کردن، ناکۆکی لەنێواندا نەهێشتن، یەک خستنەوە.
**ئاشتەبا (ن)** ašteba
ب (ئەشتەبا).
**ئاشتیخواز (ئان، ئد)** aštîxwaz
١- ئاشتی پەروەر، ئەوکەسەی دژی شەڕوهەرایە، کەسێ حەزی لەئاشتیی بێت، لایەنگیری ئاشتیی، هێمنایی خواز. ٢- دۆست پەروەر، هاوڕێ پەروەر.
٣- بەرەڤان، سازندە، هێوەر.
**ئاشتیی (ن)** aštî
١- تەبایی، کۆکیی، هەداریی، هێمنایەتیی (نێوان یەکتر).
٢- ئاشتیتیی، ئاشتینیی، برادەریی، دۆستایەتیی، ڕێکیی، سازیی، نێوان خۆشیی.
٣- کاری ڕێکەوتن، نەبوون یان نەمانی شەڕ لەنێواندا.
**ئاشتیی کتک و مشک، پرسەی بەقاڵە (پن)**
aštîy kitk w mišk pirsey beqale
یەکگرتنی دوو دوژمن بەرامبەر کەسێکی دیکە تیاچوونی تەنیا کەسەکەیە (سێیەم). ت: پرسە= تازیەمەبەست نەیاریی دوو کەسە بەرامبەر کەسێکی دیکە. بنکێ: واتە هیچ چاکەیەک ناوەشێتەوە لەیەک گرتنی دوو مرۆڤی نالەبار.
**ئاشچیی (ن، لو)** ašçî(lu)
ئازپێش، ئازچیی، ئاشپەز، ئەوکەسەی چێشت و خواردنیخوان دروست ئەکات، چێشتکەر، چێشت لێنەر، شیوکەر، شیولێنەر.
**ئاشچێتیی (ن)** ašçêtî
ب (ئاشپەزیی).
**ئاشخانە (ن، لو)** ašxane(lu)
جێگەی چێشت و نان لێخواردن یان کڕیین بەپارە، چێشتخانە، لۆقنتە.
**ئاشرمە (ن)** aširme
ئاسرمە، پشتێنی زین، هێشرمە.

**ئاشفته** (ئان)[1] ašifte
ب (ئاشق).

**ئاشفته** (ئان)[2] ašifte
١- پەشۆكاو، سەراسیمە، سەرسوڕماو، واق وڕماو.
٢- ئاڵۆز، شێواو(قژ). ٣- پەریشان، داماو.
٤- پشێو، پەشێو، گێژ. ٥- بێسەروبەر، پێكالاو، تێكالاو، ناڕێك، ناقۆڵا، نەساز.

**ئاشفته بوون** (كتن) ašiftebün
حەزلێكردن، دڵ پێداچوون، سەوداسەربوون، گرفتاربوون

**ئاشڤان** (ن، كی) ašivan(ki) .
ب (ئاشەوان)

**ئاشق** (ئان) ašiq
ئاشفتە، ئەویندار، بەندەوار، دڵدار،سەوداسەر، گرفتار.

**ئاشقۆرت** (ئان)[1] ašiqort
١- بزمۆك، پووت، چەمچۆڕ، چیلاز، داڵ گۆشت، ڕژێی، زراف. ٢- بێ تین، بێ هێز، كەم تین.

**ئاشقۆرت** (ئان)[2] ašiqort
بێتووك، بێموو، حولیی، لووس. دژ: تووكن، تیسكن، موودار.

**ئاشقه وماشقه** (نك) ašiqe w mašqe
١- ماری نێر ومێ كاتی تێك ئالان و جووت گرتنیان، نێرومێی مار كاتی جووت گرتنیان.
٢- جووت بوو، جووت گرتوو.
٣- جووتەجەیران، جووتەوجەیران، دڵداری یەكتر، دۆستی یەكتر، دوودولبەر پێكەوە، دوودولبەر لەگەڵ یەك، دووكەس كەدۆستایەتیان گەرم بێ و هەمیشە پێكەوەبن، ژن و مێردی گیانیبەگیانیی، هاوڕێیی ژیانییەكتر.

**ئاشقینی** (ن) ašiqênî
ب (بەنگی سەودایی).

**ئاشقینی كردن** (كتپ) ašiqênî kirdin
ب (ئاشفتە بوون).

**ئاشك** (ن، كی) ašk (ki)
تاقەت، توانایی، وزە، هێز.

**ئاشكرا** (ئان) aškira
١- ئاجاغ، ئاشكار، ئاشكارە، ئاشكر، ئەشكەرە، خوویا، دیار، ڕاستەوڕاست، ڕوون، ڕووناك.
٢- شتیار، ڤالا، كراوە.
٣- بەڵگەنەویست، دیاردیی، ڕاست و دروست.
٤- بڵند، بەرچاو، بەند. ٥- گشتیی، میللیی.

**ئاشكرابوون** (كتن) aškirabün
١- بلاوبوونەوە، پەردەلاچوون، پەردەلەسەرلاچوون، خویابوون، دەركەوتن، وەبەرچاوكەوتن، وەدیاركەوتن (قسە، كار، نهێنیی).
٢- دیاربوون، دیاریدان، ڕوون بوونەوە، شتیاربوون. پەنهان بوون، دەركەوتن، دیاردان.

**ئاشكراكردن** (كتپ) aškirakirdin
١- بڵاوكردنەوە، پەرت كردن، پەردەلەسەرلابردن، پەنهان كردن، پیشان دان، خستنەڕوو. دەرخستن، وەدەرنان (پەنامەكیی، پەنهانیی، كار) ٢- ڕۆشن كردنەوە، ڕاڤەكردن، ڕوون كردنەوە، ڕوون وەكردن.
٣- دزرانەدن، دركاندن، دەربڕین، زەلەكردن، ساتمەكردن، لەدەم ترازاندن، لەدەم دەرچوون

**ئاشكراكەر** (ن) aškira kar
ئاشكراكار، دەرخەر، وەدەرخەر.

**ئاشكرانه كردن** (كتپ) aškiranekirdin[1]
ڕازبەپەنهانیی هێشتنەوە، نهێنی شاردنەوە

**ئاشكرانه كردن** (كتپ)[2] aškiranckirdin
پشوو خواردنەوە، خۆگرتن، دان بەخۆدا گرتن.

**ئاشكرایه !** (شر) aškiraye !
دیارە، ڕوونە، ڕەپ ی ڕوونە، وایە(چوونم، قسە، هەلویست).

**ئاشكرایی** (ن)[1] aškirayî
بێپیچ و پەنایی، خاوێنی، ڕووناكی، ڕوونی، سادەیی.

**ئاشكرایی** (ن)[2] aškirayî
خویایی، دیاردە.

**ئاش گەڕاندن** (كتپ) ašgerandin
ئاش ئیش پێكردن، ئاش گڕاندن، ئاش وەستاییكردن، ئیش بەئاش كردن.

**ئاشگێر** (ن) ašger
١- ئاشگڕین، ئاشگەڕین، وەستای ئاش. هـ ب(ئاش وەستا)
٢- خاوەن ئاش.

**ئاشگێر** (ن) ašger
١- ئەندازەئاوێك ئاشی پێ بگەڕێ، ئەندازەیە لەئاوكە ئاش بگێڕێ(ئاشی ئاو).
٢- ئەو جۆگەیەی (ئاوەكەی) پێدا دەڕوا.

**ئاشماست** (ن، كی) ašmast(ki)
دۆخاو، دۆخەو، دۆكولێو، دووخوا، دۆ(ماست یان كەشك) كەلەگەڵ برنج یان ساوەر لێبنرێ.

**ئاشمای** (کتپ، لو) ašmay(lu)
قرته لیبرِین، قه‌پاندنه‌وه، ماشینه‌وه.
**ئاشمای** (کتپ، لو) ašmay(lu)
خواردنـــه‌وه، فـــڕکردن، ڤـــه‌خوارن، هـــه‌ڵ لووشـــین (به‌یه‌کجار).
**ئاشنا** (ن)¹ ašna
١- ئاوه‌ڵ، ناس، ناسکریی، ناسیاو، هـاوده‌م، هـاوڕا، هاوڕێ، هاونشین، هاوه‌ڵ.
٢- ئامبایی، ئه‌ریاب، ئه‌روو، دۆست، ده‌ستیان، یار.
٣- پێوه‌ند، پێوه‌ندیی، مه‌یل.
**ئاشنا** (ئان)² ašna
به‌له‌د، زانا، شاره‌زا، لێزان.
**ئاشنا په‌یداکردن** (کتپ) ašna peyda kirdin
ئاشـنـایی گـرتن، بـراده‌ر پـه‌یداکردن، براده‌رگرتن، ناسیاوپـه‌یداکردن، ناسـیاوگرتن، هـاوڕێ پـه‌یداکردن، هاوڕێگرتن.
**ئاشناگرتن** (کتپ) ašna girtin
ب (ئاشناپه‌یداکردن).
**ئاش نانه‌وه** (کتپ) ašnananewe
ئاش دروست کردن وخستنه‌گه‌ڕ، هه‌ستان به‌دروست کردنی ئاش.
**ئاش نانانه‌وه** (ئد) aš nanewe
ئاش بـۆ که‌سێنانه‌وه، پـیلان گێڕان،پـیلان نانـه‌وه، گێره‌وکیشه سازکردن (بۆ که‌سێ).
**ئاشنا و ڕۆشنا** (نل) ašna w rošna
ئاشنایان، دۆست و براده‌رانی
یـه‌کتر، دۆسـت و ناسـیاو، شناسـان، هاوڕێیـان، هاومه‌به‌ستی‌یه‌کتر.
**ئاشنایه‌تی** (ن) ašnayetî
ب (ئاشنایی).
**ئاشنایی** (ن) ašnayî
١- ئاشنایه‌تی، تێکه‌ڵی، دۆستایه‌تی، ناسیاوی.
٢- نێوان خۆشیی، هێوه‌ریی، یه‌کێتیی.
٣- ئاخوه‌نـــدیی، به‌ڵـــه‌دی، زانـــایی، ســـه‌رلێ ده‌رچوونیی، شاره‌زایی، لێزانیی.
٤- براده‌ریی، پێوه‌ندیی، سه‌روساخت، سه‌روسه‌خت، شناسیی و تێکه‌ڵی.
٥- کارزانیی، وه‌ستایی.
٦- خونجان، ڕاست که‌تیی، گونجان (نج).
٧- ئاره‌زوو، ئیشتیا، حه‌ز، خواز، خواست، ویست.
**ئاشنایی گرتن** (کتپ) ašnayîgirtin
ب (ئاشنا په‌یدا کردن).

**ئاشو** (ن، پز)¹ ašü
ئاشۆ، جه‌راحه‌ت، چرک، چڵک، زۆخ، زووخ، زووخـاو، کێم، هه‌وا.
**ئاشۆ** (ن)² ašo
پشوو، هه‌ڵویستکه، هه‌ڵویسته.
**ئاشۆت** (ن) ašot
به‌فری کۆمه‌ڵ له‌بارنه‌وه به‌جیاوه، ڕنوو، ڕنی، ڕه‌نی، کلیله، هه‌ره‌س.
**ئاشوو** (ئان) ašü
به‌د، به‌وه‌زه‌ن، پیس، چه‌په‌ڵ، چه‌ڵه‌م، خراپ، لیتۆک، ناپاک، ناله‌بار، نه‌باش.
**ئاشووب** (ن) ašüb
١- ئـاژاوه، ئاشـووبه، ئاشـه‌ف، ئاشـێو، ئـاڵۆزیی، پشێو، په‌شێوی.
٢- جه‌نگ، شه‌ڕ، کێشه، (نێوان میلله‌تان).
٣- جۆش و خرۆش، هه‌را وزه‌نا.
**ئاشووبگێر** (ن) ašübgêr
ئاژاوه‌گێـڕ، فاتـه‌ی سـووره‌بان، که‌سـێ ئاشـووب (بنێته‌وه، به‌رپابکات، هه‌ڵگیرسێنێ).
**ئاشووب گێران** (کتپ) ašübgêran
ئاژاوه‌نانه‌وه، ئاشووب به‌رپاکردن، ئاشـووب نانـه‌وه، ئاشووب هه‌ڵگیرسان، تێکدان.
**ئاشووب نانه‌وه** (کتپ) ašübnanewe
ب (ئاشووب گێران)
**ئاشووپاش** (ئان) ašüpaš
١- خـه‌وی (ئـاڵۆز یـان پـشێو)، خـه‌وی نـاخۆش و بێسه‌روبن، مێرده‌زمه. ٢- ئاخاوتنی‌شڕ و بێهنام، تێکه‌ڵ و پێکه‌ڵ، هاته‌ران پاته‌ران، هـه‌له‌ق و مـه‌له‌ق، مه‌لیت و په‌لیت(خ).
**ئاشووژن** (ن) ašüjin
ئاڤشووژن، ده‌سکه، کشته‌که، کز، که‌نـدر، مـه‌چیر، نه‌ی.
**ئاش وه‌ستا** (ن) ašwesta
پسپۆڕی‌ئاشی ئـاو، که‌سێ له‌میکـانیکی ئاشـی ئـاو بزانێ، وه‌ستای‌ئاش چاک کردن.
**ئاشه‌ته‌نووره** (ن) ašetenüre
ئاشه‌ته‌ندووره، ته‌نووره‌ی ئاو، سـووڕی ئـاوی گـۆمی تووڵ، گێژاف، گێژاو.
**ئاشه‌وان** (ن) ašewan
ئـاره‌وانچیی، ئاسـاوان، ئاسـیاوان، ئاشـڤانچیی، ئاشڤان، ئاشه‌ڤان، ئایشه‌وان، ئه‌ڕاش، کریچ، لۆینه.

**ئاشی ئاو** (ن) ašîaw
ب (ئاش).
**ئاشی با** (ن) ašîba
ئاشی هەوا.
**ئاشیڤ** (ن، کی) ašîv(ki)
ئاشیف، ئاشیڤ، ئالاخ، بژار، پاچەکۆڵە.
**ئاشیڤ کرن** (کتپ،کی) ašîv kirn(ki)
١- ئاشیف (ئاشیڤ) کرن، بژارکردن، پاچە کوڵێ کردن، ڕووەکَ بنکۆڵ کردن،شینایی، پاکَ کردنـەوەلە گژوگیای بەوەزەند.
٢- لەڕەگَ دەرهێنان، هەڵکەندن، هەڵکێشان
**ئاشی قاوە** (ن.) ašîqawe
مەکینەی قاوە(هاڕین).
**ئاشی ئاگەڕێت** (ند) ašînagerêt
١- ئاشـەکەی دانەویڵـە نامـاڕێت، ئاشـی لەکارکەوتووە. واتە: بەساڵداچووە، پەکیکەوتووە، پیربووە.
٢- لەئیش ڕاوەستان، لەکارکەوتن.
٣- بێ هێزبوون، تێکَ شکان، لاوازبوون.
٤- کارسەرنەگرتن،دەستکەوت نەبوون.
**ئاشی نەزان خوا ئەیگێڕێ** (پن)
ašînezan xwa eygêrê
ئاشی نـەزانا خـودێ د گـەڕینیت، بـەخت لە دەرگای گەوجانە.
**ئاشێر** (ن) ašêr
باراش بەر، کەسێکەباراش دەبا بۆ ئاش.
**ئاشێکە** (ن) ašêke
بەردەلان، ڕقان، ڕەقـانیی، ڕەقـایی، ڕەقـە، ڕەقـەن، ڕەقەنیی، زەوییسەخت، زەوییەکَ کەبەکاری کێلان نەیەت.
**ئاشێو** (ن)[1] ašêw
ب (ئاشووب / ١)
**ئاشێو** (ن)[2] ašêw
ئاشـێ، بەسـەرهاتیخراپ، دەردوبـەلا، دەردو کوێرەوەریی.
**ئاشییت** (ن، کی) ašît(ki)
خـۆش گـوزەرانیی، دەوڵەتمەنـدیی، دەوڵەمەنـدیی، ساماندارِیی، کاسەپڕیی، کۆکیی.
**ئاشیین** (ن، پز،کی) ašîn(ki)
خەیارە، دوومەڵ، ڕیشکَ، سوورەکوان، قـۆنێر، کـرە، کولکَ، کونێر، مووچ.

**ئاغا** (ن) ax̱a
١- ئاخـە، ئاغـە، بـاخێ، سـان، سـەردار، سـەرکَ، سـەرکۆمار، سـەروەر، کاربەدەسـتی ئـێل، گـەورە.
٢- خاوەن، خودان، خێو. ٣- سەرکار، ماڵخو.
٤- خاوەن دێ، خاوەن موڵکَ، کوێخا، نازناوێکی ڕێز لێ گرتنە ئەخرێتە پاڵ ناوی سەرۆکَ خێل و خـاوەن موڵکەوە.
**ئاغابانوو** (ن) ax̱abanû
ئاخەبانوو، جامانە، مێزەر.
**ئاغاتیی** (ن) ax̱atî
ب (ئاغایەتیی / ٢).
**ئاغا ژن** (ن) ax̱ajin
١- ئاخـەبانوو، ئاغـەبانوو، ژنیئاغـا، نازنـاوێکی ڕێـز لێگرتنە بۆ ژنی ئاغا.
٢- ژنێکی دیار(ئاغر، خانم ڕەسەن، وەجاغزادە).
**ئاغایەتیی** (ن) ax̱ayetî
١- سـەرانە، مـاف یـان نـەریتی ئاغـا، سەروسـیمای ئاغا.
٢- ئاغاتیی، گەورەیی، مەزنایەتیی.
٣- جوامێریی، جۆمەردیی، دڵفراوانیی، دڵگوشادیی.
**ئاغر** (ئان)[1] ax̱ir
ب (بەڕێز / ١).
**ئاغر** (ئان)[2] ax̱ir
بێ دەنگَ.
**ئاغزوونە** (ن) ax̱züne
ئالقەزوونـە، ئاوزنگـە، ئاوزونگـە، ئاوزونـە، ئاوزینـە، بەرەزوانە، بەلەزوانە.
**ئاغزە** (ن)[1] ax̱ze
ئەغزە، ئەغزەجگەرە.
**ئاغزە** (ن)[2] ax̱ze
بنکەجغارە، بنکەجگەرە، بنکیبغـارە، قنگەجگـەرە، قونچکەسیغارە، قونگەجگەرە، کاغەزێکە دەیپێچن و دەیخەنەبنی قامیشەجگەرەوە.
**ئاغلەوێکَ** (ن) ax̱lewîk
١- ئاخڵەوێکَ، تاوە، ناولنگان.
٢- تەلەبەردی نان برژاندن(لەجیاتی ساج).
**ئاغوور** (ن، کی) ax̱ür(ki)
زەهر، ژار، ژەهر.
**ئاغەبرا** (ن) ax̱ebira
براگەورە، کاکَ.
**ئاغەر** (ن) ax̱er
کۆتـەڵ، نیـشانە (لەکۆمەڵـە بـەردی هـەڵچنراو

دروستکراو).

**ئاخەڵ (ن)** axel

تەویلە، جێی ڕاگرتنی ئاژەڵ، غەڵ، کۆلیت، هۆڵ، (بۆ داکردنی مەڕو ماڵات).

**ئافتاو (ن، لو)** aftaw(lu)

١- خۆر، ڕۆژ.

٢- تیشکی ڕۆژ، هەتاو. ٣- ئافتاوگەردان (نل).

**ئافتاوگەردان (ن)** aftawgrdan

بەرچاوگەی هەتاو، پێشەوەی تەقیلە، لێواری پێشەوەی تەپلە.

**ئافتاوە (ن)** aftawe

ئافتابە، حەوجۆش، خۆشدەر، کەمزلە، لوولەهێن، لوولێنە، مسینک، مسینە، مەسینە، مەعدەنیی.

**ئافتاوەو ئافتاوەو لەگەن (ن)** Aftawe w legen

دەست شۆر و لەگەن، لوولێنەولەگەن، مەسینەولەگەن.

**ئافتووش (ن)** aftüš

کاری خۆ تێ هەڵقورتان، کاری خۆهەڵقورتان (لەکاری مەردومدا).

**ئافڕ (ن، کی)** afiṟ(ki)

ب (ئاخوڕ).

**ئافران (کتن،کی)** afiran

بەدییهاتن، چێبوون، دروست بون، هاتنەدیی، وەدیی هاتن.

**ئافراندن (کتپ، کی)** afirandin

١- ئافەریدکردن، ئافەریدەکردن، بەدیی هێنان، چێکرن، خولقاندن، داهێنان، دروست کردن، دروس کرن، کردن لەنەبوەوە، دروست کردن، وەدییهێنان، هێنانەدیی. ٢- چاک کردن، چێ کرن. ٣- دیاریی کردن. ٤- ڕێک خستن، ڕێک کردن، ڕێک و پێک کردن، سازدان، سازکردن.

**ئافرەت (ن)** afret

١- ژن، ژنک، ژەنیی، مێینەی مرۆڤ[کچ].

٢- ژنی مێردار، کەیبانوو، هاوڕێی ژیان، هاوسەر. دژ: مێرد.

٣- خات، خاتوون، خان، خانم، خانم خاس، یای.

٤- جوانان، جوانکە، موتولفە (ئان).

٥- قەیرەکچ، گەورەکچ.

**ئافوور (ن، ئا)** afür(ki)

گا کێویی.

**ئافەرید (نک)** aferîd

خەلق، خەڵک، کەس.

**ئافەرید کردن (کتپ)** aferîd kirdin

ب (ئافەریدەکردن).

**ئافەریدە (ن،ئان)** aferîde

بوونەوەر، بەشەر، خولقاو، داهێنراو، دروستکراو، ڕسکاو، مرۆڤ، مەریتە، وەدییهاتوو.

**ئافەریدەکردن (کتپ)** aferîd kirdin .

ئافراندن.

**ئافەرین (نسب)[1]** aferîn

ئافەرم، ئافەرەم، ئافەریم!، باشە، پەسندە!، دەس خۆش!، دەم خۆش!، زۆرچاکە!، کاری باشت کرد!.

**ئافەرین (ئان)[2]** aferîn

باش، بەجێ، پەسند، ڕەوا، شیاو. دژ: نابەجێ، ناپەسند، ناشایستە.

**ئافەرین (ن)[3]** aferîn

پەسن، پەسندیی، مەتح، هەڵلا، هەڵنان.

**ئافەرین لێ کردن (کتپ)** aferîn(lê)kirdin

بەچاک دانان (یان زانیین)، بەسەرووپۆتەلاکدا هەڵنان (یان هەڵ دان)، مەتح (مەدح) کردن.

**ئافەریندە (ن)** aferînde

ئافەریدگار، ئیزەد، پەروەردگار، خوا، خواوەند، خودا، خوداوەند، خودێ، خولا، خوێ، داوەر، کارسان، گەورە، یەزدان، یەزەتە، یەکتا.

**ئاڤ (ن، کی)** av(ki)

ب (ئاو).

**ئاڤا (ن، کی)** ava(ki)

ئاوەدان.

**ئاڤابەرف (ن،کی)** ava berf(ki)

(ئاوی بەفر)،بەفراو، سەهۆڵاو.

**ئاڤاتەزیی (ن،کی)** ava tezî(ki)

(ئاوی تەزیو)،ئاوی سارد.

**ئاڤار (ن، کی)[1]** avar (ki)

پێستە، پێستەی ئاژەڵ بەرلەدەباغ، پێستەی خۆش نەکراو، پێستەی دەباغ نەکراو، چەرم، چەرمی گیراوەی ئاژەڵ، کەوڵ.

**ئاڤار (ن، کی)[2]** avar (ki)

پێستەی خۆشکراو، پێستەی دەباغ کراو، چەرم، چەرمی گیراوەی ئاژەڵ، سەختیان، سیرمە، شەقە، شەقەچەرم، قایش، کەوڵ.

**ئاڤارێ (ئان، کی)** avarê (ki)

بەدکار، دووڕوو، سۆتە، لەڕێی ڕاست لاداو.

بێژ، گۆرانیی چڕ، گۆییندە، قامبێژ، مەقامبێژ.

**ئاوازە خوان (ن.)** awaze xwan
١- ب (ئاوازە بێژ). ٢- شایەر، موتریب.

**ئاوازە خوێن (ن.)** awaze bêj
ب (ئاوازە بێژ).

**ئاوازی خرۆش (ن.)** awazîxiroš
بەستەی پڕ جۆش و خرۆش.

**ئاواژی (ئان.، کی.)** awajî(ki)
بەراوەژوو، هەڵەوگێڕاوە.

**ئاواسی (ن.)** awasî
ب (ئەنگوچک).

**ئاواق (ئان.، ن.)** awaq
١- بەتاڵ، چۆڵ. ٢- بیابان، بیاوان، بیاوو، چولگە، چۆڵەوان، دەشت، دەشت و دەر، دەشت و هەرد، دەشتی چۆڵی کاکی بەکاکیی، سارا، هەرد، یاوان.

**ئاواکردن(کتپ.)** awa kirdin[1]
بنیات (بنیاد)نان[دێ یا کۆمەڵەخانوویەک]، بنیات نان و دروست کردن، خانوو دروست کردن، خانوو کردن، دەست بەخانوو دروست eهب (ئاواکردنەوە).

**ئاواکردن (ند.)** awa kirdin[2]
بوون بەهۆی دروست کردنی مەودایەکی خۆش (لەناو کۆمەڵێکدا یان شوێنێکدا)، بەکەیف و زەوق بوون، خۆشی وشادمانی خستنە ناو ماڵەوە.

**ئاواکردن (کتپ.)** awa kirdin[3]
١- شاردنەوە، لەبەرچاو ون کردن، لەبەرچاو نەهێشتن، لەچاو ون کردن. ٢- پەراندنەوە، پەراننەوە، تێپەڕاندن، دەربازکردن.
٣- بەرەودوانان، بەزاندن (دوژمن)، ڕادان، ڕاونان، شکاندن (دوژمن لەشەڕدا)، هەڵبڕین و لێ نەبوونەوە (کاتی شەڕ لەدوژمن).

**ئاواکردن(کتپ.)** awa kirdin[4]
(زەویی) کێلان و چاندن.

**ئاوا کردن (ند.)** awa kirdin[5]
سات بردنەسەر، کات ڕابواردن.

**ئاواکردنەوە(کتپ.)** awakirdinewe
بنیات (بنیاد) نانەوە، سازکردنەوە، شوێنی چۆڵ یان وێران ئاوەدان کردنەوە.

**ئاواڵ (ن.)** awaḻ[1]
١- ئاودەنگێ، ئاوزا، بەردەڤک، هاڤدەم، هامدەم، هاوڕاز، هاونشین،هەمدەم، یاریکار.
٢- هاوتا، هاوچەشن، هاودەنگێ، هاوواتا.
٣- ئاوەڵ، دۆست، هاوبیر، هاوڕێ، هەڤاڵ.

**ئاواڵایەتیی (ن.)** awaḻayetî
ئامرایی، ئاواڵەتیی، ئاودەنگیی، ئاوەڵەتیی، ئاوەڵیی، برادەرێتیی، دۆستایەتیی، دۆستێتیی، دەستەبرایی، هاودەنگیی، هاوڕازیی، هاوڕێتیی، هاوڕێیی، هاونشینیی، هەڤاڵتیی، هەڤاڵێتیی.

**ئاواڵ کراس (ن.)** awaḻkiras
ب (ئاوەڵ کراس).

**ئاواڵ منداڵ (ن.)** awaḻ mindaḻ
ئاواڵ، ئاواڵدان، ئاوەڵ، ئاوەڵ منداڵ، پزدان، جفت، ویلاش، پزڵاش، پەڵاش منداڵ. ئەندامولکەیەکی خەپلەییە لەدوای منداڵ بوون لەسکی زەیستان دێتەدەرێ (ئەم ئەندامولکەیە هاو جووتی کۆرپەلەی ناوسکی ئاولەمەیە بەمنداڵدانەوە و مایەی گەشە پێ کردن و ڕزگارکردنی کۆرپەلەیە لە ماددە زیان بەخشەکان).

**ئاواڵە (ئان.)** awaḻe[1]
ئاوەڵە، ڤالا، ڤەکریی، کراوە، کریاوە، گوشاد، لەسەرپشت (دەرگا)، واز، والا، وەکریی.

**ئاواڵە (ئان.)** awaḻe[2]
ئەبلەق، دەم داچەقیو، سەرسام، واق وڕماو.

**ئاواڵە (ئان.)** awaḻe[3]
١- لێک ترازاو، لێک جویوە بوو، لێک دابڕاو (دوو کەس یان دووشت).
٢- دەم کراوە، سارێژ نەبوو(برین). هب (ئاوەڵە).

**ئاواڵە کردن (کتپ)** awaḻe kirdin
١- خستنەسەرپشت، کردنەوە، گوشاد کردن (پەنجەرە، دەرگا..). ٢- سەرقاپ لابردن، سەری مەنجەڵ لابردن. ٣- دەم داپچڕیین، دەم داچەقاندن، دەم کردنەوە(بەسەرسوورماوییەوە).

**ئاوان (ن)** awan[1]
ئاوونک.

**ئاوان (ن.)** awan[2]
١- حاجەت، قاپ و قاچاخی ناوماڵ.
٢- سەفەرتاسی.

**ئاوان (ن.)** awan[3]
ئاشانە، ئاواناش، پارەیان ئارد کە ئەدرێ بەئاشەوان بەرامبەر هاڕینی ئارد، کرێ، کریی ئارد هاڕین کەئاشەوان دەیسێنێ، مز، مزاش، مزە، مزەی ئاش، مزی ئاش.

**ئاوان (ن.)** awan[4]
بێ فەڕی، خراپی، گەندی، ناڕاستی، نالەباری.

**ئاوان (ئان.)°** awan
ب (ئاوەدان).

**ئاوان (ئان.)[1]** awan
بەدنمەک، بێفەڕ، تەپڕەش، چەپەڵ، خرا، خراپ، خراو، دەستبڕ، دەغەڵ، گەند، گەندەژە، ناپاک، ناڕاست، ناڵەبار.

**ئاوانتە (ئان.)[1]** awante
ئەوەنتە، ئیف، بەلاش، خوڕایی، مشە، مفت، مفتە

**ئاوانتە (ن.)[2]** awante
گەندە دزیی، لاکوتیی، لرف، ملومۆش، ناخونەک، ئەریتیی بردن و خواردنی شتی خەڵک بەخوڕایی.

**ئاوانتە (ن.)[3]** awante
تەشقەلە، گەڕ.

**ئاوانتە (ن.)[4]** awante
حیلە و حەواڵە، فروفیل.

**ئاوانتەچیی (ن.)[1]** awanteçî
ئەوەنتەچیی، ئیفچیی، شان پیاکەر، گەندە دز، لاکوت، لاوورگە، لرف لێدەر، لەماڵی بەلاش گەڕ، مشەخۆر، مفتەخۆر، ملوموشکەر، ناخوونەک کەر- (لێدەر)، هەوانتەچیی.

**ئاوانتەچیی (ن.)[2]** awanteçî
دەبەکار، دەسبڕ، فێڵباز، فێڵەباز.

**ئاوانتەکردن (کتپ)** awanteçî kirdin
شان پیا(پێدا)کردن، شتی خەڵک بردن یان خواردن بەخوڕایی، شتێکەسێ داگیرکردن (بێ ئاگاداریی خاوەنەکەی)، گەندەدزی کردن، لاکوتیکردن، لرف لێدان، ناخونەک کردن یان لێدان.

**ئاوانیی (ن.)** awanî
ب (ئاوایی).

**ئاواووک (ن.)[1]** awawük
تیزەجاڕ، تیزە زاڕۆکە، قەشمەرجاڕ، گەمەجاڕ، گەمەکەر، لیقۆکە.

**ئاواووک (ئان.)[2]** awawük
بلبلە، بلێبلێ، بەژۆکە، بەسبێژ، چەنەباز، چەنەهەراش، چەقەسرۆ، چەقەسوو، چەوچەو، چیرەدرێژ، قەرەچەناغ، لۆترەوان.

**ئاوایی (ن.)** awayî
ئاشامی، ئاوەدانیی، دێ، گوند.

**ئاوباب (ن)[1]** awbab
هاوکار.

**ئاوباب (ن.، ئان.)[2]** awbab
هاوڕێ، هاوشان.

**ئاوبارە (ن.)[1]** awbare
ئوبەرە، ئاوبارە، ئاوێ کەلەبەرزییەکەوە بەبرێ بۆ بەرزییەکی دیکە بەهۆی بۆریی، جۆگەی ئاو (لەدار دروستکراو)، داری درێژ و کۆڵدراو کە بۆ پەڕاندنەوەی ئاو بەسەر کەندالدارایدە کێشن و دەبێتە جۆگە، قەمتەران، قەمتەرە.

**ئاوبارە (ن.)[2]** awbare
ئەو شیلەیەی کەهەنگ لەگوڵانی دەمژێ و دەیکاتە هەنگوین، شلەمەنییەکی تام شیرینە هەندێ گوڵ یان ڕووەک دەری ئەدات و ئەبێتە ماکی هەنگوین.

**ئاوبارە (ن.)[3]** awbare
بنگە، بنەبەندگە، بنەبەنگە، بەربەس، بەربەستی ئاو، بەست، بەستی ئاو، بەندی ئاو، بەنگە، لەمپەری ئاو گەڕاندنەوە.

**ئاوباز (ن.)** awbaz
مەلەوان.

**ئاوبازیی (ن.)** awbazî
مەلەوانیی.

**ئاوبازیی کردن (کتن.)** awbazî kirdin
١- خۆ بەدەم ئاوەوەدان وپەل هاویشتن، مەلەکردن، مەلەوانیی کردن.
٢- ئاژنییکرن، تێکەوتن، تێهەلاتن، خۆلە ئاوی سارد هەڵکیشان، سۆبایی کردن، سۆبایی کرن، سۆبەیی کردن، لەش پیسیی دەرکردن (بەئاو).

**ئاوبر (ن.، م.)[1]** awbir
ماسی گرە، مژگرکی ئاویی، هەلەکەی ئاویی.

**ئاوبر (ن)[2]** awbir
شوێنی داڕین بۆ گوێزانەوەی ئاو، شوێنی بەستن و گۆڕینی ڕەوتی ئاو.

**ئاوبردە (ئان.)** awbir
بەئاودا ڕۆیشتوو، بەفیڕۆچوو، لەدەستچوو.

**ئاوبوون (کتن.)[1]** awbün
بوون بە ئاو، تاوانەوە، تاویانەوە، توانەوە، تۆلانەوە، (نقد)نەرم بوون.

**ئاوبوون (کت.ن)[2]** awbün
بوونە ئاو، تەریق بوونەوە، تەریقەوبوون، شەرمەزاربوون.

**ئاو بەئاگرا (ئاگردا)کرا (ئد)** aw be agira kira
١- ئاگرەکە کوژایەوە، (دامرکایەوە)، ئاگرەکەنەما، ئاوکرابەئاگردا.
٢- ئاژاوە کەکوژایەوە (نەما). ٣- گڕوکفەکەی دامردەوە. ٤- هەرووەها: ڕقی نیشتەوە.

٥- ئارام (هێدیی، هێمن) بوو.
**ئاو بە ئاگرا (ئاگردا)کردن(کتپ ، ئد)**
aw be agira kirdin
١-ئاگر کوژاندنەوە (بەهۆی ئاوەوە)، ئـاو کـردن بـە ئاگردا.
٢- شەڕوشۆڕ کوژاندنەوە، هەراوزەنا نەهێشتن.
**ئاو بە ئاوەدانیدانە ڕوا (دەڕوا) (رس)**
awbe awedanîda derwa
ئاوبەئاوەدانیـدا ئـەچێ، ئـاو بەشـوێنێدا ئـەڕوات کەئاوەدان بێ، بەمانای: تیر ئارەزووی ئاوخۆردنەوە ئـەکات، واتـە تێروتەسـەلە، گورچـوی پـڕە، کـەدەی پڕە.
**ئاوبە خۆداکردن (کتپ)** aw be xoda kirdin
١- خۆشتن، لەش شتن.
٢- خۆپـاک کردنـەوە لەلەش پیـسیی، مـەلەکردن، وسڵ دەرکردن (دوای جووت گرتن).
٣- خۆشتن بەئاوی سارد، سەرولەش شتن.
**ئاوبەر (ن)** awber
١- ب (ئاوکێش). ٢- ئاودەر، ئاودێر، ئاویار، ئـاوێر، کەسێ کەئاوی کشت وکاڵ بدا (بەکرێ).
**ئاوبەرە (ن.)** awbere
ئـەو کاروانـە هەنگـەی لەکـاتی شـانە هەڵبەسـتندا دەچنەسەرکانیاو ئاو دەبەنەپلوورە.
**ئاوبە ژێر کادابردن (ئد.)**
aw bejêr kada birdin
١- بەپەنهانی کارکردن.
٢- بەدزییەوە کـاری خـۆ کـردن، بـەنهێنی دەسـتی خۆ وەشاندن. ٣- بەنهێنی پیلان گێران.
**ئاوبەست (ن.)** aw best
چلوورە، کلوو، کلۆ.
**ئاوبە سەرکشان (کتن، ئد)** aw beser kišan
١- زەوی و زار بەژێر ئاوەوەبوون.
٢- بوون بەژێر ئاوەوە (کەسێ)، خنکان لەناو ئـاودا (یەکێ)، نوقم بوون (مرۆڤ یان شتێ) لەناو ئاودا.
**ئاوبە شوێنی لێژەوە ناوەستێ (رس.، ئد.)**
aw bešwênî - lêjewe nawestê
١- ئاو هەمیـشەبەرەو خـواردەڕوا (بەیـەکێکی دەس بـڵاو ئـەوترێ یـان پـارە بەفیـڕۆدەر یـان ئێجگـار خـواردە). ٢- خـستنەئەولاوە (ئـیش وکـار)، کەمتەرخەمییکردن، گوێ پێنەدان، گوێ نەدان بە..
٣- بەهیچ زانیین، خستنەپشت گوێ، سستیی کـردن لە (ئیش، فەرمان، کار..)، هەڵ بواردن.

**ئاوبە لووتەوەڕانەوەستان(ئد.)**
aw be lûtewe ranewestan
ئـاو ڕانەوەوەسـتان بەلووتـەوە، باپـەرکردن و ئـاو هاتنـەخوارەوە بەلووتـدا، پەرسـیو (پەسـیو)گـرتن، تووشی (هەلامەت)بوون.
**ئاوبەند (ن.، پز.)** awbend.
ئاوبەن، ئاوبەنگ، ئیسقایی، حەیزە، کۆبوونەوەی ئاو یـان هـەر تراوێکـی تـر لەبـۆ شـایی ورگدا یان ئـاو ریشاڵەکانی لەش.
**ئاو بینەو دەست بشۆ (ئد.)**
awbênew dest bišo
١- کارلەکار ترازاوە، هەمووکار تەواو بووە.
٢- هاتنەکۆتایی، هیچ نەمان (لەشتێ یان کارێک).
٣- ڕابووردا، نەما!.
٤- پاشەکـشە لێ کـردن (ئـیش)، خـۆ کـشانەوە لەکارێـــک و خـــۆتێ نەگەیانـــدن، واز لێهێنـــان (فەرمان...کار..).
**ئاوپاڵ (ن.)** aw pal
١- ئاوپالیو، پارزۆنک، پالیوەر، سووزگی، سـووزمە، سووسگیی.
٢- (دەفرێکی دەم پانی نیمچە قووڵە بۆ چێشت تێ کردن بەکارئەهێنرێ)، کەفگیر، کەوگیر.
**ئاوپاڵ کردن(کتن.،کتپ.)** awpalkirdin
١- پارزنیین، پالاندن، پالاوتن، پالیین.
٢- ئاوداداں، ئاوێچوون، دەلاندن.
**ئاوپرژێن (ن)** awpirjên
ئاوپژێن، ئاوپشێن.
**ئاوپرژێن کردن(کتپ)** awpirjên kirdin
ئاوپژاندن، ئاوپژێن کردن، ئاوپشێن کردن.
**ئاوپەڕ (ن.)** awper
پواز (دەخرێتە پاڵ گونجی ئاشی ئاوەوە بۆ ئـەوەی ڕاسـتەوخۆ ئاوەکەبـدا بەناوەڕاسـتی [پـەڕەکە]دا)، دارێکـی کـون کـراوە لەبنـی (دۆڵاش)دا تائاوەکـە بەتەوژم لە [پەڕە]بدا، زەمبوور، زەنبوور.
**ئاوپەرە(ن.،نا.)** awpere
ئاژەڵی ئاوەکی، تەرا، تەرە، لەجەڵەب بەجێماو.
**ئاوپەڕێن (ئان،ن)** awperên
دژاوار، زەوییەک کە ئاوداشتنی دژوارێ.
**ئاوتا (ن.)** awta
١- ئاوێ، هاوپێر، هاوزێ، هەڤبەر، هەمپا
٢- هاوڕێی ژیان (پیاو)، شوو، مێرد، هاوسەر.

**ئاوتێ زان (کتن.)** aw têzan

١- ئاو زایینە دەم، دەم ئاو کردن، ئاو لەدەم زان، دەم پاراوبوون (بەدیتنی خواردەمەنیی خۆش)، دەم پڕ بوون لەئاو.

٢- تەڕ بوون، تەڕایی دانەوە، شێ دانەوە، شێ هەڵهێنان، نیمچە تەڕبوون.

٣- تەڕایی تێ‌زان، خۆش بوون و پێ گەیشتن (بەجۆرێ بخورێ) [میوە].

٤- ئاو تێ چوون، پڕ بوون لەئاو.

٥- ئاوکردن (چاو).

**ئاوتێ زاو[میوە] (ئان.)** aw têzaw(mîwe)

تەڕایی تێ زاو، خۆشبوو وپێ گەیشتوو.

**ئاو تێ کردن(کتپ.)** aw têkirdin

١- ئاو کردنە ناو(شتێکەوە).

٢- ڕوون کردنەوە، شل کردنەوە.

**ئاوتێ وەردان (کتپ)** aw têwerdan

ئاوپیادان، ئاوپیوەدان، ئاوتێهەڵدان، بەئاوپاک کردنەوە (شتێ)، شتن (بەئاو).

**ئاوجۆ (ن)** aw co

بیرە، خواردنەوەیەکی سەرخۆش کەرە لەجۆ ئاوی گەراوە دروست دەکرێ.. هب(ئابجۆ).

**ئاو چاویگ (ن..ئان.)** aw çawig

ئاڤا تەزیی، ئاوی (پاک، چاییک، چەییک، خواردنەوە، خۆش، ڕەوان، سارد، سازگار)، ئەو ئاوەی بۆ خواردنەوە دەست ئەدات.

**ئاو چنیین (کتپ) ١** awçinîn

-١ئاو گرتن(لەمیوە و شتی تری ئاودار)، گوشیین.

٢- ئاوسەندن، ئاوکێشان، ئاوگرتن.

**ئاو چنیین (کتپ) ٢** awçinîn

ئاودانەوە، جەوهەردان.

**ئاو چنیین (کتپ) ٣** awçinîn

ڕام کردن، ڕامێنان، کەویی کردن، مالیی کردن.

**ئاو خواردنەوە(کتن.، کتپ.) ١**
aw xwardinewe

ئاڤ ڤە خارن، ئاو خواردن،ئاو قووت دان، ئاو نۆشیین، ئاوهەڵقوڕاندن، قوم لەئاودان، قوم لێدان(ئاو)، هەڵقوڕان (ئاو).

**ئاو خواردنەوە (ند) ٢** aw xwardinewe

١- بەئاسانیی و بێ ئەرک بەکارێ هەستان یان چورتمێک چارەکردن.

٢- بەکاری (ئاسان، بێئەرک) دەووترێ.

**ئاو خۆر (ن)** aw xor

ئەو کەسەی کەئاو دەخواتەوە، کەسێ ئاو بخواتەوە.

**ئاوخۆرە(ن..ڕو)** awxore

ئاوەخۆرە، ڕەنگیی سەرەکیی ڕووەکە.

**ئاو خۆری(ن.)** aw xorî

(ئەو ئاسنەی لەکۆتایی لغاوەیە و دەچێتە ناو دەمی یەکە سمەوە)، دانە لغاو.

**ئاو خۆریی (ن.، ڕو.) ١** aw xorî

ئاوەخۆرە، ئاوەڕێکی لق کەتەڕایی دخۆراک لەڕەگەوە ڕادەگوێزێ.

**ئاو خۆریی (ن.) ٢** aw xorî

ئاوخۆر، ئاوخۆرە، بادە، بادێ، پەرداخ، پێک، جام، جامۆلکە، جامۆڵە، کاسە، لێوان، لیوان، هەرچ دەفرێک ئاوی پێدەخۆنەوە.

**ئاو خۆریی (ن.) ٣** aw xorî

جەڕە، زەرک، شەربە، قومقومۆک، کووپەی ئاو، گۆزەڵە.

**ئاو خۆریی (ن) ٤** aw xorî

سەرچاوە، سەروچاوە، کانی، کانیاو.

**ئاوداخستن(کتپ)** awdaxistin

ئاوداشکاندن، ئاو داگرتن، ئاوگرتن،ئاوهەڵگرتن (بۆمەزرا).

**ئاو دادان (کتپ) ١** aw dadan

ئاو بەخۆوە ڕانەگرتن (زەویی و زار لەبەر فشەڵیی)، ئاو ڕۆچوون (بەزەویدا)، ئاو قووت دان (خاک)، ئاو گوزەرکردن، چوونە خوارەوە (ئاوبەزەویدا).

**ئاو دادان (کتن) ٢** aw dadan

ئاو تێپەڕبوون، ئاولێتێپەڕبوون، ئاولێ چوون، پالاوتن، دڵۆپەکردن، دەلاندن.

**ئاو دادان (کتن) ٣** aw dadan

شێهەڵهێنان.

**ئاو دار (ئان) ١** aw dar

تەڕ، شەدار، شێدار، نماویی، نمدار.

**ئاو دار (ئان) ٢** aw dar

١- پاراو، پڕلەئاو وکانیاو، زەوی و زارێ کەئاوی زۆربێ. ٢- باتلاخ، زۆنگ، زۆنگاو (ن).

٣- ئاودراو، پاراوکراو.

ئاو دار (ئان) ٣ aw dar
ئاڤدار، ئاڤیی، پاراو، پڕاو، پڕ ئاو، پـڕ لەئـاو، تـەڕ و بـڕ، تـەڕ وتـازە، تـەڕوناراو، تێـراو، خـۆش و بـەتام، گەیشتوو، گەییو، نازاو (میوە).

ئاو دار (ئان) ٤ aw dar
١- بەردی بەنرخی بەورشە و پرشە.
٢- بەورشە و پرشە، ڕەونەقدار، عال، گەش و جوان، مەزەدار(ئافرەت..).
٣- ڕەنگی بەورشە و پرشە، زەرقیی (ڕەنگ).

ئاو دار (ئان) ٥ aw dar
جەوهەردار، دەبان، دەوان (تیغ، خەنجەر...).

ئاو دار (ئان) ٦ aw dar
چاپەن، چاپچی.

ئاو داری (ن) aw darî
خورجی ئاو، شـەلتە، کونـک، کونـدە، کونـدەی ئـاو، کونگە، مەشکەی ئاوکیشی.

ئاو دامان (ن، ئان) aw daman
ئاودامێن، ئـاوەڵ دامـان، ئـاوەڵ دامـێن، داویـن درێـژ (جل)

ئاو دامێن (ئان، ن) aw damên
ئاودامان.

ئاو دان (کتپ) aw dan
١- ئـاڤ دان، ئـاو بـەئاژاڵ دان، ئاوخـستنە بەرمـەڕ ومـالات، ئاودێرییکردن،ئـاووان، ئاویـاریی کـردن، مالات تێراوکردن، مەڕومالات تێراوکردن.
٢- ئاو بۆ سەر زەوی وزاربەردانەوە (لەجۆگەوە یـان ڕووبـارەوە)، ئاوداشـتن، ئـاودیران، ئـاودێرییکردن، ئاوکردنە ژێر داروبرەخت و کشت وکاڵ.

ئاو دانەوە (کتپ) aw danewe
ئـاودان، تیـغ سـورکردنەوە ولەپرخـستنە ئـاوەوە بـۆ پتەو تر بوون، دەمەزەرد کردنەوە(ئاسن)، سەخت و ڕەق کردن(ئاسن) تائەو ڕادەیـەی پێویـستە بـەهۆی ساردکردنەوەی (بەئاو).

ئاو داهاتن (چاو) (کتن) aw dahatin (çaw)
١- ئـاو هێنـان (چـاو)،ئـاوی ڕەش داهـاتن، تووشـی ئاوی مرواری بوون. ٢- کوێربوون.

ئاو دڕکە (ن) aw dirke
ئاڤدرگە، ئاودڕگە، ئاوکەند، چەم، خڕ، دراف، دەلاڤ، زەوییەک کەئاو دای دڕیوە، کـەناو، کونـد، کەنـداو، کەندەلان.

ئاو دز (ن،، پن) ١ aw diz
ئاوپەڕ، ئاوجز، ئاوەدزە، ئاوەزا، ئـاوەزێ، تەشـەنەی برین بەهۆی تەڕبوون یان پیس بوون یـەوە، زلزلـە، زنجکاو، کیم (لەزامدا)، هەو.

ئاو دز (ن) ٢ aw diz
ئاوجز، قەڵشت کەئاو بدزێ، کەلین کە ئاو بدەڵێنێ.

ئاو دزکردن (کتن) awdiz kirdin
ئاوپـەڕکردن، ئـاودزکردن، ئاوسـان، تەشـەنەکردن (برین).

ئاو دزەک (ن) aw dizek
ب (ئاودەزک).

ئاو دۆزەک (ن) aw dozek
ئـاودڕەک، ئـاودزەک، دەرزیـی پزیـشکیی، سـرینج، سرینک، فیچقە.

ئاو دەر (ن) ١ aw der
ب (ئاودێر).

ئاو دەر (ن) ٢ aw der
کەسێ کەئاو دەدا بەدانیشتوانی کوێر، ئاوگێڕ.

ئاو دەردان (کتن) ١ aw derdan
ئاولەبەر ڕۆیشتن، ئاولێچوون، دەلاندن، لێچوون.

ئاو دەردان (کتن) ٢ aw derdan
ئـاو تیانەهێـشتن، ئـاو تێدانەهێـشتن، ئـاولێ بـەتاڵ کردنەوە، ئاو لێخاڵیی کردنـەوە، ئـاو لێ هـەڵێنجان، ئاو لێ هەڵهێنجان، بەتاڵ کردنەوە، خـاڵیی کردنـەوە (لە ئاو)، ئاوی ڕاوەستاو بەدەفر ڕشتن.

ئاو دەست (ن.) aw dest
ب (ئابخانە).

ئاو دەل (ن.، م.) aw del
ئاڤدەل، پۆڕی نێر، نێرەی پۆڕ.

ئاو دەلێن (ن.) aw delên
ئەسـتێرکێ یـان دەفـرێ ئـاوی لەبەربـڕوا، تـەرایی دادەر، هەرچ شتێ ئاوی لێ بچێ یان لێوەبێتەدەر.

ئاو دەم (ن.) aw dem
لیکاوی زار، لیکی دەم.

ئاو دەنگ (ن.) aw deng
هاوبیر، هاوبێژ، هاوڕا.

ئاو دێر (ن.) awdêr
ئاودەر، ئاویار، ئاوێر(زەویی، کشتوکاڵ..)، [بەهۆی ڕوبار، جۆگە...].

ئاو دێران (کتپ) awdêran
ب (ئاودان ٢/).

ئاو دێریی (ن) awdêrî
ئاوپاریی، ئاوێریی، کاری ئاوداشتن.

**ئاو دیریی کردن** (کتپ) awdêrî kirdin
ئاوداشتن، ئاودان، ئاویارییکردن، ئاویرییکردن.

**ئاور** (ئان) awur
بەزمیر، بەسام، بەشیواز، سەنگیین، سەلار، لەسەرخۆ، لەسەرەخۆ، هیمن.

**ئاورا** (ئان) awra
برچیی، برسیی، ڕەودیین، سیرۆژە، گەدەبەربوو، نیز.

**ئاورایی** (ن، کی) awrayî
برچیتی، برچیتی، برسیەتی، برسیتی، ڕەودیی، سیرۆژەیی، گەدەخالیتی، نیزیی.

**ئاوردو** (ن.) awurdü
سوخت، سووتەمەنیی.

**ئاورنگ** (ن) [1] awring
١- ئاورینگ، باق وبریق، بریسک، بریسکە، بریق وباق، بریقە، تەییس، تۆزووسکە، چریسکە.
٢- ئاگری وردیلە کەلەکوتانی ئاسنی سوورەوەکراو دەپەڕێ، برووکە، پڕیشک، چرووسکە.

**ئاورنگ** (ن) [2] awring
ئاورینگ، توڕەوتڕیی، سەرگەرمیی، کەللەیی.

**ئاورنگ** (ن) [3] awring
ئاورینگ، کیس، کیسۆلە، کیسە.

**ئاورنگ** (ن) [4] awring
ئاڤینگ، ئاورینگ، خوناڤ، خوناو، شەونم، جەوان.

**ئاورنگ دان** (کتن.) [1] awring dan
١- ئاورینگ دان، باق و بریقەدانەوە، بروسکین، بریسکان، بریسکەدانەوە، بریسکەبریسک کردن، بریسک لێبوونەوە، بریق وباق لی ‌هاتن،بریقەدان، بریقەدانەوە، تەیسیین، چریسکەدانەوە، ورشەدان، ورشەوپرشەلیوەهاتن.
٢- پڕیشک لێبوونەوە، پڕیشک هاویشتن.

**ئاورنگ دان** (کتن) [2] awring dan
تووڕەبوون، هەلچوون.

**ئاورنگ دەردان** (کتن،کتپ) awringderdan
١- ئارەق دەردان، ئاودەردان(لە شیوەی- ئاورینگدا)، ئاورینگ دانەوە، شێ دەردان.
٢- ئارەق ڕشتن، ماندووبوون، هیلاک بوون.

**ئاوریشم** (ن) awrîšim
ئارمۆش، ئارمویش، ئارمیش، ئاڤرمیش (داوی لیکاوی کرمی ئاوریشم)، سرک، سرکێ، هەرموش، هەڤرمش، ەڤرووشم، هەوریشم.

**ئاورینگ** (ن) awring
ئاورنگ.

**ئاورینگ** (ن) awring
توڕەیی.

**ئاورینگ** (ن) awring
ئاوساوی.

**ئاورینگ** (ن) awring
ئاورنگ،شەونم

**ئاوڕشتن** (کتپ) awr̲ištin
ئاوڕژاندن، ئاوڕژتن، ئاوڕیژتن.

**ئاوڕشتن** (ئد) awr̲ištin
ب (میز کردن،

**ئاوڕشین** (ن، نج) awr̲išên
ئاوپرژین، ئاوپژان، ئاوپژین.

**ئاوڕشین کردن** (کتپ) awr̲išên kirdin
ئاپرژین کردن، ئاوپژاندن، ئاوپژین کردن.

**ئاوڕشینەر** (ن) awr̲išêner
١- ئاوپاچ، ئاوپاش، ئاوپرژین، ئاوپرژینە، ئاوپرژینەر، ئاوپژین، ئاوپژینە، ئاوپژینەر، پژین، پرژینە، پرژینەر، تەنەکەی ئاو ڕشتن، دۆلکەیەکەسەریکی کون کونی پیوەیە و ئاوی پێ دەپرژینن. ٢- ئوتومبیلی ئاوبەر، ماشینی ئاو هینەر یان هەر شلەمەنیەکی دیکە، تانکەر.

**ئاو ڕووناکییە** (رس.) aw r̲ünakîye
کاتیک ئاو لەدەستی یەکیک دەڕژێ بەشتیکی ئەنجام باش دەزانرێ و دەربڕینی ئەم ڕستەیەش بۆ دڵ نەوایییە.

**ئاو ڕوونکەرە** (ن.، جج.) awr̲ünkere
ئاو ڕۆشنکەرە، ئاوڕۆشنەوکەر، ئاوڕوونکەرەوە، ئاو ڕوونکە، ئاوە ڕوونکەرە، کیچەئاویلە.

**ئاو ڕێژ** (ن) awr̲êj
١- ئاوشار، تاف، تافگە، ڕیژاو، سۆلاف، سوولاف، شۆڕاو، شۆش، شیب، قەلوەز، قەلەوەز، کەلپەز.
٢- ئاوەڕۆ، دەراو، ڕیژگە، کەردوو.
٣- ئەو شوینەی چەم تیکەل بەڕووبار ئەبێ، ئەوجێیەی چۆم تیکەل بەڕوخانەدەبێ.
٤- ئاوڕیژگە، ئاوەڕیژ.

**ئاوڕێژن** (ن، ئان) awr̲êjn
ئاڤرێژن، سەربەرەوژێر، سەربەرەوژێرکە(زەویی)، هەر زەوییەک ئاوی لەسەر ڕانەوەستێ.

**ئاوڕیش** (ن) awr̲îš .
بەرامبەریی، بەربەرەکانیی، بەرەنگار، ڕووبەڕوو.

ڕووبە -ڕوویی.

**ئاوڕیش بوون(کتن،کتپ)** aw r̄îšbün

١- بەڕیشەوەبوون، تووش بوون (چوڕتم..).
٢- بەرەنگاربوون، بەگژداچوون، بەگژداهاتن، پڕ بەیەکدا کردن، چنگ لێک قاییم کردن، دەگژڕاهاتن، عەمبازبوون، (یەکتر) [بێ هۆ].

**ئاوڕێگە (ن)** awr̄êge

ڕێگە ئاو، ڕێگەی ئاو، هەچ ئاوێک پانایی و قووڵیی بۆ هاتوچۆی بەلەم و پاپۆڕ دەست بدات..

**ئاوزا (نک)** awza

ئاوزە، ئاوزێ، جمک، جیوک، دووانە، دوو منداڵ کەبەسکێک بووبن لەدایک، هاوزا، هەڤاڵجیوک، هەڤاڵزا.

**ئاوزان (کتن)** awzan

١- ئاوزیان، ئاوزیین، ئاووزیان، تاقەت لێبوون، تاقەت هەبوون، توانیین(بۆ کردنی کارێک)، توانا بەسەر (شتێکدا)شکان، لەوزەدابوون، هێزیەسەردا هەبوون یان(شکان). ٢- پێ گەیشتن.
٣- زانیین، سەرلێدەرچوون، لێ تێ گەیشتن.

**ئاوزانە چاو(کتن)** awzane çaw

چاو ئاوتێ زان، چاو ئاو کردن

**ئاوزانە دەم(کتن)** awzanedem

ئاو تێ زان(دەم)، ئاودەزارگەڕان، ئاوزاینەدەم، دەم ئاو کردن.

**ئاوزنگ (ن)** awzing

ئاوزینگ، ئاوەزینگ، ئاوێلکە، دوا دەمی مەرگ، دواهەناسەی ژیان، سەرەمەرگ، گیانەلا، گیانەلاو.

**ئاوزەنگی (ن)** awzengî

(پلەکانی ئاسنی سەرکەوتنی خوانی زین)، ڕکێف، ڕکێو، زەنگۆ، زەنکوو، ووزەنگیی، ویزەنگیی.

**ئاوزەنگی پیا( پیدا )هێنان (کتن، کتپ)**
awzengî pêda- hênan

ب (ئاوزەنگی تێ تەقاندن).

**ئاوزەنگی ( پیا )پیداهێنان (کتن، کتپ)**
hênan awzengî pêda

١- پاڵ پێوەنان بەرەوپێشەوە.
٢- بەرەو پێش ڕۆیشتن، بەرەوپێشەوەچوون، پێش کەوتن، چوونەپێش.

**ئاوزەنگی تێ تەقاندن (کتن، کتپ)**
awzengî tê- teqandin

ئاوزەنگی پیاهێنان، ئاوزەنگی پیادا‌هێنان، ئاوزەنگی پێداهێنان، ئاوزەنگی لێ دان، دانەچوارناڵە، دانەغار، ڕکێف کوتان، غارپێ کردن، ولاخی زین کراو لێ خوڕیین (ئەسپ).

**ئاوزەنگی داگرتن (ند،کتن،کتپ)**
awzengî dagirtin

١- پێ لەئاوزەنگی توند کردن وقورسایی خستنەسەری بۆ ڕاوەستاندنی ولاخ، سم چەقاندن(ولاخ).
٢- پێ چەقاندن، پێداگرتن لەسەرقسەی خۆ. پێ داگرتن، پێلێ دان بەئەرزدا، پێ لێکردنە کەوش، سووربوون لەسەر قسەی خۆ(کەسێ).

**ئاوزەنگی کوت (ن.)** awzengî kut

١- ئاوزەنگی تەقین، ئاوزەنگی لێدانی یەک لەسەریەک بۆ ئەوەی ولاخەکەبداتە غار.
٢- کاری تێتەقاندن، کاری تێ قاچان (یان ڕۆیشتن بەرەو پێشەوە بەخێرایی).

**ئاوسا (ن.، ئان.)** awsa

دراوسێ، دەراوسێ، هاوسا، هاوسێ.

**ئاوسان (کتن.، ند.)** awsan

ئاماسان، ئاماسیان، ئاوسیان، ئەستوور بوون، بەل بوون، پەنمان، پەنمیان،پەنەمیین، پیڤیان. هەلامسان، هەلاوسان، هەل پنمان.

**ئاوساندن (کتپ)** awsandin

باتێکردن، پەنمان، هەلئاوساندن، هەلپەنماندن.

**ئاوساو (ئان، خ)** awsaw

١- ئامسیاگ، ئاوساگ، ئاوسیاگ، ئەستووربوو، پەنماو، پەنەماو، پیڤیاگ، هەلاوساو، هەلکفاو، هەلمساو. ٢- ئاوساگ،بیزار، پەست، ماندوو، وەڕز، وەڕس، هیلاک. ٣- زرتەبۆز، زەبەلاح، گەورە.

**ئاوساویی (ن، پز)** awsawî

ئەستووریی، با، تەشەنەک، گریی هەوا (لەسەر گەدە).

**ئاوسەرکەم (ئان)** awserkem

١- ب (ئاتاج). ٢- بارچەوت، بارکەوتوو، بێ دەر، بێ‌دەرماڵ، بێ دەرەتان، بێ نەوا.
٣- بەلەنگاز، بێ‌باڵ، بێکەس، کەڕەوالە.

**ئاوسەرکەوتن (کتن)** awserkewtin

ئاو پۆشیین، ئاو داپۆشیین بن ئاو کەوتن، ژێر ئاوکەوتن، کەوتنە ژێر ئاو.

**ئاوسێ (ن، ئان)** awsê

ئەو کەسەی کەلەنزیک یەکێکی ترەوە دەژیی، ئاوماڵ، مالاوسێ، هاوماڵ، هەمسایە

**ئاوسیتی (ن)** awsêtî
١- دراوسیتی، دهراوسێیهتی، هاوسێتی.
٢- نزیکی، نیزیکاهی، نێزیکی.

**ئاوشان (نان)** awšan
لهیهک پلهدا، هاوشان،،ههمبهر.

**ئاوفریدان (کتن)** awfrêdan
ئاو هاتنهوه، بوون، رهحهت بوون (لهکاتی جووت گرتندا).

**ئاوقات (ن)** awqat
ئاوقاتیی، ئهوقاتیی، پاریزهر (یاسایی).

**ئاوقه (ن)** awqe
١- ئاوتا، ئهنبان، ئهوقهد، پهلامار، عهمبان، ههڵزن.
٢- تووش، تووشیار، دووچار، گرفتار، گیرۆده.

**ئاوقه دبوون(کتن،کتپ)** awqedbûn
١- ئاوقابوون، ئهنبازبوون، ئهوقهدبوون، پهلاماردان، پـــیداههڵزنیین، پـــیوهههڵزنان، تیکـــهوهگلان، تیوهئالان، عهمبازبوون، ههڵزنیین.
٢- تـــووش بـــوون، تووشـــیاربوون، دووچـــاربوون، گرفتاربوون، گیرۆدهبوون.
٣- بینـــیین (کهســـێ)بهریکـــهوت، تـــووش هـــاتن، تووشیاربوون، چاوپێکهوتن، هاتنهرێ.

**ئاوکردن(کتن)** awkirdin
١- ئاو یان زنچکاوپهیدابوون (لهبرین، دومهڵ..تاد)، جهراعهت کردن، کیم کـردن، هـهوکردن. ٢- ئـاو زاینهچاو، ئاو لهچاو هاتن، چاوپرپوون لهئاو، چاو پـر لهئاوبوون، فرمیسک زاینه چاو، فرمیسک کردن. ٣- ئاو زاینه دهم.

**ئاوکردن(کتپ)** awkirdin **Sprinkle,(vt.)**.
ئاو پـرژاندن (لهھێنـدێ شـت بـۆ نـهرم کردنـهوهی)، ئاوپرژین کردن، ئاو پیداکردن، ئاو لێ پرژاندن.

**ئاو کردنه ژێر[کهسێ] (کتپ،، ئد.)**
aw kirdine jêr kesê
١- دهرپهراندن، (کهسێ بهدهسیسه بۆ مهبهستی ناو زراندن)، دهرکردن، راودان، قاودان.
٢- ئهزیـهدت دان (کهسـێ) بهپـهنهانیی، تـووش کردن، جێ پێلیژکردن، نارهحهت کردن.
٣- تـهفرهدان، داونانـهوه (بـۆ کهسـێ)، گـزی لێ کردن.

**ئاوکیش (نان.)** awkêš[1]
ئـاوخواز، خـواردنێ ئـاوێ زۆر بهسـهردا بخورێتـهوه، خواردنێ کـهتینوێتی دینـێ، خـۆراکی ئـاوخواز، دهم وشککهر.

**ئاوکیش (ن،. ئس.)** awkêš[2]
١- ئاوهاوهر، ئاو هێنهر. ٢- سهقاقوش(ن، م).
٣- بورجی ئـاوکیش، کـه لـووی ئـاوکیش، یانزهههم کهلوو.

**ئاوکیشان (کتپ)** awkêšan
ب (ئاو چنیین / ٢).

**ئاوکیشان (کتپ)** awkêšan
ئـاو بـردن، ئاوکیـشیی کـردن، ئـاو گواسـتنهوه، ئاوهاوردن، سهقایی‌کردن.

**ئاوکیشیی (ن)** awkêšî
ئاوبهریی، ئاوهاوهریی، ئاوهێنهریی، سهقایی.

**ئاوگر (ن)** awgir
ئهنباراو، عهماراو.

**ئاوگرتن (کتپ)[1]** awgirtin
ئاو ئهنبارکردن(بۆ بهکارهێنان).

**ئاوگرتن (کتپ)[2]** awgirtin
ئاوگوشین، ئاوی میوه گوشیین.

**ئاوگرتن (کتپ، کتن)[3]** awgirtin
ئـاودان (کـشت وکـاڵ)، ئـاو وهرگـرتن بـۆ ئاویاریی(لهنۆره ئاودا).

**ئاوگرتن [برین] (کتن.)[4]** awgirtin (birin)
کیم کردن.

**ئاوگردان (ن.)** awgirdan
ئاوگهردان، جهرخهتوو، چهرخهچیی، چهمچهی قـوڵ و دهسـک رێـژ بـۆ هـهڵهێنجانی ئـاو یـا شـلهمهنیی، دهفریکی دهسکداره ئاوی پێ ههڵدێنجن.

**ئاوگیر (ن.)[1]** awgîr
١- ئهستیرک، باسهره، بهست، بهستۆره، بهستۆکه، بهسـتوو، بهسـتووکه، چـالاو، زهلکـاو، گـۆل، گـۆم.
٢- کۆتهڵ، ئهو شوێنهی باراناوی تێدا کۆدهبێتهوه و دواجاربهکاردههێنرێ.

**ئاوگیر (ن)[2]** awgîr
شاگرد حهمامچیی.

**ئاوگیریی (ن.)** awgîrî
بهرقلیان، بهرقلیانیی، قلیان، بهرکوڵ.

**ئاوگیریی کردن (کتپ.)** awgîrî kirdin
بـهردڵ خـستن، بـهرقلیان کردن،پاروخـستنهبهردڵ، پرووشهکردن، بهرکوڵ کردن، خـواردن[شـتێکی کـهم بـۆ لابردنـی برسـیتیی کـاتی(چێـشتهنگاو)]، قلیـان قاوهڵتی کردن.

**ئاو لهئاوهڕۆ بران (ئد)** aw le awero biran
١- وشـک بـوون وبـران (ئاولهئـاوهڕۆ) [بـههۆی بـێ

بـــارانیی]. ٢- ســــەرچاوەی ســــوود و هـــات کوێربوونــــەوە (لەکاریـــک...)، کوێربوونـــەوە (سەرچاوەی خێر). ٣- چاوەڕوانی دڵ نەرمیی لێ نــەکردن، میهرەبـــانیی لێ نەوەشـــاندنەوە (لەکەسێ). ٤- ئومێد بڕان، بێ هێفیی بوون، بێ هیوابوون، هیوانەمان.

٥- خراپ بوون، دەخەزبوون، نالەباربوون.

٦- بێ‌سوودبوون، بێ‌کەڵک بوون، بێ‌ووودەبوون، لەکەڵک کەوتن. ٧- لەجێی خۆیدانەبوون (ڕووداو)، لەجێی خۆیدا نەمان(کار، ڕەوشت....).

**ئاو لەئاوەڕۆکردن (ند)** aw le awero kirdin

خراپەکردن لە ئەندازە بەدەر، نالەباریی کردن لەرادەبەدەر.

**ئاو لەبەر دڵ ڕۆیین(ند)** aw le ber dil royîn

١- ئاو لەدڵ ڕۆیین، زۆربرسیی بوون، قوڕەی سک هاتن (لەبرسا)، هەست بەبرسێتیی کردن، هەست کردن بەبرسێتیی. ٢- ژیان بەکولە مەرگیبردن بەڕێوە، ژیانێکی ناهەموار بردنەسەر.

٣- حەجوو لوور کردن لەبرسانا، (سەگ، گورگ، چەقەڵ...).

**ئاو لەبەر هەڵنیشتن (ند)** aw le ber helnîştin[1]

ئاو لەبەرچوون،میزبەخۆدا کردن، میز ڕانەگرتن.

**ئاو لەبەر هەڵنیشتن (ند)** aw le ber helniştin[2]

ئارەق کردنەوە(زۆر).

**ئاو لەجێ ماڵی(کەسێ) نان (ند، کتپ)** aw le cê mali- kesê nan

١- ئاو لەماڵی کەسێ بەردان، تەخت و تاراج کردن (خانووی یەکێ)، ماڵی کەسێ ویران کردن.

٢- تووش کردن، تەنگ و چەڵەمە هێنانە ڕێ (کەسێ). ٣- تەنگاوکردن، تەنگەتاوکردن، ایێتونگ کردن، لێ هەڵپێچان، هەراس کردن.

**ئاو لەدەستی ناتکێ (ند)** aw le destî natkê

١- بەرچاوی تەنگە، دەست قووچاوە، زۆر پیسکەیە، زۆر ڕەزیلە.

٢- بەیەکیکی (چرووک، چکۆس، چەپخوس، دەس گرتوو، ڕژد، کنووس، گزاف، مەندەموور) دەوترێ.

**ئاو لەدەم زان (کتن، کتپ)** aw le dem zan

ب (ئاو تێ زان / ١).

**ئاو لەدینگا (دنگا)کوتان [کوتاندن] (ند)** aw le dinga- kutan

١- ڕەنجی بێ هوودەدان، کاری بێ‌ئەنجام کردن، کاری‌بێ کەڵک کردن. ٢- لەخۆڕازییبوون (دوور

لەژێرییەوە). ٣- بەگەوجانە ڕەفتارکردن، هەر: (ئاو لەبێژنگدا هێنان)

**ئاو لەسەرچاوەوە لیلە (رس)** aw le serçawewe lêle

بەلا لەسەری گەورەوە دەست پێدەکات، لەسەرەتایەوە بەخواریی هاتووە (کار...).

**ئاو لەسەر زوڵفی دەتکێ (رس)** aw leserzulfî detkê

١- جەرگەیە، گەنج وجوانە.

٢- بەگەنجیکی(قشتیلە، نەشمیلە)دەوترێ.

**ئاو لەسەر من تێپەڕیی، چ یەک گەز، چ سەد گەز (پن)** aw- leser min têperî, çi yek gez çi sed gez

من کەتیا چووم، لەسەریەک بوختان بێ یان سەد، چۆن یەکە.

**ئاولەمە (ن)** Em awleme

١- ئاوڵەمە، بێچووی ناوسک کەهێشتا خۆی نەگرتووە، پیزە، تۆل لەسەرەتای دروست بوونیا، مندالی ناوسک. ٢- بێچوی ئاژەل کەدایکی سەربڕابێت و لەسکی دایکی دەرهێنرابێ. پز، پس.

**ئاولێ (لەکارێک) نەخواردنەوە(ند)** aw lê nexwar- dinewe

دریغی نەکردن، دەست نەگێڕانەوە وەچوونە پێشەوە بوکردنی کارێک. واتە خۆتەرخان کردن بۆ جێبەجێ کردنی ئیشێکی بەردەست.

**ئاولێ چوون (کتن.)** aw lê çûn

ئاو لەبەر ڕۆیشتن، ئاو لێ ڕۆیشتن، تکەکردن، (دەفر بەهۆی درز یان کون تێ بوونییەوە)، دزەکردن (ئاو لەکونی وردی دەفرەوە).

**ئاوڵ (ن.)** awul

دۆڵی بچکۆلە.

**ئاوڵاویی (ئان.)** awlawî

خوورێلکە، ئاوڵەدار، دەم و چاوی کڕووزبوو (بەهۆی ئاوڵەوە)، دەم و چاو کونج کونج، کەسێ تووشی ئاوڵە بوویێ.

**ئاوڵە (ن.، پز.)** awle

خرووکە، خرووێلکە، خریی، خوورێلکە، خوریک، خوریکە، هاولە، هەلوی، هەولە.

**ئاوڵەدار (ئان.)** awledar

ب (ئاوڵاویی).

**ئاوڵەدەردان (کتن.)** awlederdan

تووشی نەخۆشی ئاوڵەبوون، خوورێلکەلێ هاتن.

ناوله كوت ( ن.پز)awle kut
خورویلکه‌کرت، قۆل کوت
ناوله کوتان ( کتپ. )awle kutan
ناوله‌کوت کردن، خرویلکه‌کوتان، هاوله‌کوتان،
هاوله‌کوت کردن.
ناوله‌ی مانگا ( ن، پز)awley manga
ناوله‌ی ڕه‌شه ولاخ.
ناوله‌ی ولاخ ( ن، پز)awley wulax
ناوله‌ی ولاخی به‌رزه( ئه‌سپ ).
ناومال ( ن )awmal
به‌شدار، نیڤه‌کار، نیوه‌کار، هاوبه‌ش، هه‌ڤا، هه‌ڤبا.
ناومالک ( نک)awmalk
ناومال، ناوماله، ناوهاورده، ئه‌وچیلکه‌و چه‌واله‌ی
لافاوهێناویه‌تیی وداویه‌ته که‌نار، پووش وپه‌لاش،
کۆته‌ره‌داری ناوهاوردوو، کۆته‌ره‌دارو پووش وپه‌لاش
له‌گوێ ناوچه‌م به‌جیماو.
ناومل ( ن )awmil
١- ژن، مێرد، هاوسه‌ر، هاومل.
٢- هاوده‌م، هاوڕاز.
٣- هاوجووت، هاومل، هاونیله.
ناومل کردن ( کتپ. )awmil kirdin
١- ده‌ست کردنه گه‌ردن، ده‌سته‌ملان کردن.
٢- دوو ولاخ به‌یه‌که‌وه به‌ستن، هاوجووت کردن
( دووئێستر، دوو گاجووت.. )، هاومل کردن،
هاونیله‌کردن.
ناونه ( ن )awne
قامچیی نێرگه‌له، لووله‌ی نێرگه‌له، لووله‌قلیان،
میلاوقلیان.
ناوو ناوچیت! ( ئد )awü awçêt!
بچیته ڕیزه‌ی مردوان !، بڕواونه‌یه‌ته‌وه، بمرێ !،
تووشی ته‌نگ و چه‌له‌مه‌یه‌ک بیت ڕزگاری له‌دوا
نه‌بێ، چوونی بێ وهاتنه‌وه‌ی نه‌بێ، له‌وه‌لاتر چیت !.
ناوو ناوه‌دانیان وتووه! ( رس )
awü awedaniyan- wütwe
ئاو نیشانه‌ی ئاوه‌دانی و نشونمایه.
ناوو پیاز ( ن. )awüpiyaz
ئاشپڤان، ئاف پیڤان، پیوازاو، چێشتی شله که‌له پیاز
و ئاو و ڕۆن دروستکرابێ.
ناوو تاو ( ن. )awütaw
داروبه‌رد، کوچک و که‌له‌ک، واته: هه‌موو
( شت..تاد ).

ناوور ( ئان. )awür
ئاووس، سک پڕ.
ناوور ( ن )awür
به‌ر، ته‌ماشا، سه‌یر ( بۆ دواوه )، لا.
ناووردانه‌وه ( کتن. )awür danewe
١-بۆ دواوه ڕوانیین، به‌رتێ کردن، ته‌ماشاکردن،
به‌ری خۆ‌دان، به‌گۆشه‌ی چاو ته‌ماشاکردن
( له‌سه‌رشانه‌وه )، ته‌ماشای دواوه‌کردن، لاکردنه‌وه،
( بۆ لای چه‌پ، ڕاست یا پشته‌وه ).
٢- ته‌ماشاکردن، تێ ڕامان. تێ ڕوانیین، تێ
نواڕیین، ڕاونیین، سه‌رنج لێدان، لێ ووردبوونه‌وه،
نواڕیین.
ناوور له‌که‌سێ دانه‌وه( ئد )
awür le kesê danewe
ده‌ستی یارمه‌تیی بۆ که‌سێ درێژکردن،
یارمه‌تیی‌که‌سێ دان به‌پاره‌وپوول.
ناوور له‌که‌س ناداته‌وه( رس، ئد )
awür le kes- nadatewe
١- ده‌ستی که‌س ناگرێت، ده‌ستی یارمه‌تیی بۆ
که‌س درێژ ناکات، یارمه‌تیی که‌س نادات.
٢-هیچی له‌خۆی نه‌گرتوه، هیچی نه‌گرتۆته‌خۆی.
٣-گوێ له‌که‌س ناگرێت. ٤- خۆ به‌شت زانیین،
خۆخۆیی کردن، له خۆبایی بوون، له‌خۆ گۆڕان.
ناوورلێ‌دانه‌وه( ئد )awürlêdanewe
١- به‌ره‌ودوا لێ ڕوانیین.
٢- به‌ته‌نگه‌وه‌بوون، چاودێریی کردن،
خه‌مخۆریی‌کردن، ده‌س گرتن، لای‌کردنه‌وه،
مشوورخواردن، یارمه‌تیی‌دان.
٣- به‌لووتف بوون له‌گه‌ل که‌سێ، ڕیزگرتن،
لاواندنه‌وه و چاکه له‌گه‌ل کردن، میهره‌بانیی کردن
( له‌گه‌ل که‌سیکدا ).
ناووز ( ن )awüz
فام، هۆش.
ناووزان( کتن،کتپ )awüzan
تێ گه‌یشتن، فامیین.
ناووزیاگ ( ئان )awüziyag
١- پیگه‌یشتوو ( له‌باره‌ی له‌ش وئه‌ندامه‌وه )،
پێگه‌ییک، پیگه‌ییو.
٢- به‌فام، توانا، تێگه‌یشتوو ( مرۆو )، هۆشمه‌ند.
ناووس ( ئان )[١] awüs
١- ئاڤس، باردار، بارگران، تلدار، تۆلدار، تۆل له‌زگ.
دوو گیان، زگ پڕ، ژنێ که‌منداڵی له‌سکدابێ . سک

پڕ، هاوس. ٢- دۆخی داروددرەخت کاتی بوژانەوە وگۆپکە دەرکردن، دۆخی داروددرەخت کاتی دار ئاوسان (ن).

**ئاووس (ئان)**[2] awüs

تووڕە، شێتگیر، کەللەئاووس، کەللەیی.

**ئاووس (ئان)**[3] awüs

بەدخوان، چەپخووس، گزاف.

**ئاووس بوون (کتن)**[1] awüs bün

ئافسین(ئافرەت بەمندال)، زکێ پڕبوون، سکێ پڕ بوون، هاوس بوون.

**ئاووس بوون (ند)**[2] awüs bün

ئەستووربوون، هەلاوسان (پێست یان ئەندامی لەش).

**ئاووس کردن (کتپ)** awüs kirdin

ئافس کرن، زکێ پڕکردن، سکێ پڕکردن، هاوس کردن.
٢- تێکە بەردان(نێرلەمێ، ئاژەل)، چات کردن، چاکێ کردن(مێ لەنێر، چوارپێ).

**ئاووسەدرۆزنە (ن.)** awüsedrozine

ئاووس درۆزنە، شەیتان ئاووس.

**ئاووگۆشت (ن.)** awügošt

ئاڤدۆنکێ، ئاڤدەنکێ، ئاڤگۆشت، ئاودونکێ، ئاوگشت، ئاوگۆشت، گۆشتاو.

**ئاوونگ (ن.)**[1] awüng

ئاڤنگێ، ئاورنگێ، ئۆە، خوناڤ، خوناو، شەونم.

**ئاوونگ (ن.)** awüng

ئاوان، ئاونگی، دەسکاونگێ، دەسکاوونگێ، دەسکێ و ئاوونگێ، ئاوان، ئاونگی، دەسکاونگێ، دەسکاوونگێ، دەسکێ و ئاوونگێ،دەسکەوان، دەفری زەردی قوول کەشتیتێدا دەکوتن، هاوان، هاوون، هاوونگێ، هەوان، هەوونگێ، هۆد.

**ئاوونگ (ن.)** awüng[2]

ئەو ترێیەی کەبۆ زستان بەپەتەوە هەلی دەواسن، ترێ میلاق، میلاق، هێشوە ترێ کە هەلدەواسرێ و هەلئەگیرێ بۆ زستان.

**ئاوونگ (ن.)**[3] awüng

ب (ئاونگێ).

**ئاووهەوا (ن.)** awühewa

١-بیندەر، چۆنیەتیی سەرماو گەرما و سازگارییو ناخۆشیی مەلبەند، کەش.
٢- جێگا، هەوار، وار، وارگە.

**ئاوەچۆڕبوون (کتن.)** aweçorbün

ئاوەچۆڕەبوون، نەمان(ئاو بەشتی تەڕەوە)، وشکێ بوونەوە (لەئاو).

**ئاوەچۆڕکردن (کتپ)** aweçorkirdin

ئاوەچۆڕەکردن، ئاو نەهێشتن بەشتیتەڕەوە، وشکێ کردنەوە.

**ئاوەچۆڕە (ن.، خ)** aweçore

١- دۆخی چۆڕانەوەی ئاو (لەشتێکێ کەلەئاو هەلکێشرابێ یا زۆر تەڕ بێ)کاری ئاو تکان لەشتی تەڕ. ٢- کاری داتنەخوارەوەی ئارەق بەلەشی مرۆڤدا. ٣- کاری وشک بوونەوەی ئاو یان شێ تیادانەمان.

**ئاوەچۆڕەکردن(کتن،کتپ)**[2] aweçorekirdin

ئاوپێداهاتنەخوار،ئاولێ تکان.

**ئاوەچۆڕەکردن (کتن،ند)**[3] aweçorekirdin

ئاو لەبەرهەلنیشتن، زۆرتەڕبوون لەبەرباران یان ئاو ئاو.

**ئاوەچۆڕەی هێنایەوە (رس، ند)**
aweçorey hênayewe

١- هەست ونەست بڕان، وزەی ژیان نەمان.
٢- ژیانێکی ناهەموار(پڕ لەئێش و ئازار، خراپ، نالەبارە) بردنەسەر، شت لێ چوونەقات.

**ئاوەخورە (ن)**[1] awexore

سووریچکە، سوووریچکە، سووریێنە، قورکێ، کورکێ، گەروو.

**ئاوەخورە (ن.)**[2] awexore

دانکێ، قەدی کولۆر کراوی درەخت کەئاوی تیدا دەخرێتە بەر ئاژەل بۆ خواردنەوە.

**ئاوەخورە (ن.)**[3] awexore

ڕەشمە، ڕەشوە.

**ئاوەخورە (ن.)**[4] awexore

دەمولچی ولاخ (ئەو ئەندازەیەی کەلەکاتی ئاو خواردنەوە دا دەیخاتە ناو ئاوەوە).

**ئاوەخورە(ن.)**[5] awexore

ئاوە وەرە، ڕاوەسەرکانیی.

**ئاوەدان (ئان.)**[1] awedan

١- ئاڤا، ئاوا، ئاوان.
٢- پێشکەوتوو(لەبارەی شارستانێتییەوە).

**ئاوەدان (ئان.)**[2] awedan

بەربەرەلا، بەرودە، پان وبەرین، پان وپۆر، ڕەساو، فراوان، گوشاد، گەورە وبەربەرەلا، وڕاق.

**ئاوەدان بوونەوە (کتن)** awedan bünewe

دووبارەسازبوونەوە،سەرلەنوێ ئاوابونەوە.

**ئاوەدان کردنەوە(کتپ)** awedan kirdinewe

١- ئاڤـــاکرن(ســـــەر لەنــــوێ)،ئاواکردنـــــەوە، خانووبەرەدروست کردنەوە، سازکردنەوە.

٢- دێبنیـــات نانـــەوە، ســـەرلەنوێ کۆکردنـــەوە ونیشتەجێکردن (خەڵک) لەشوێنێکدا.

**ئاوەدانیی (ن.)**١ awedanî

١- ئاباـدیی، ئاڤـاهیی، ئـاوانیی، ئـاواهیی، ئـاوایی، دەگا، دێ، گوند، لادێ.

٢- چرە، قەرەباڵغیی، کەرەسیسە.

٣- تەلار، خانوو، کۆچک، کۆشک.

**ئاوەڕ (ن.)** awer̄

باوەڕ، بڕوا، دڵنیایی، متمانە.

**ئاوەردە (ئان.)** awerde

هاوردراو، هاوریاکێ، هێنراو.

**ئاوەڕۆ (ن.)**١ awer̄o

ئاوڕێگە، ئاوەڕۆگە، ڕەهەنـد، ڕێگـەی ئـاوی پـیس، زێراب، زێراو، گونج، گونجە، گونجی ئاوی پیس.

**ئاوەڕۆ (ن)**٢ awer̄o

جۆگە، جۆگەلە، دێراو.

**ئاوەڕۆ (ن.)**٣ awer̄o

بۆریی ئاو یان بەلووعە.

**ئاوەڕۆ (ن.ئان)**٤ awer̄o

ئاڤـرێم، ئـاوەزا، ئـاوەزێ، زۆنـگ، زۆنگـاو، زەنـاو، زەنەک، زەها، زەویی تەڕونمدار.

**ئاوەڕۆگە (ن)** awer̄oge

ب (ئاوەڕۆ).

**ئاوەڕووت (ن)** awer̄üt

ئاو ڕووت، ئاوەکوڵ.

**ئاوەڕووت کردن (کتپ)** awer̄üt kirdin

١- پاک کردنەوە(باڵندە لەپەڕ)، پەڕپێتاندن، ڕووتاندنەوە(پەلەوەر لەپەڕ).

٢- تـووک لابـردن (ئاشـیین)، مـوو ڕووتاندنـــەوە (لەسەر و پێی مەڕ، ئاژەڵ...).

**ئاوەڕەش هێنانەوە (ئد)**١ awer̄eš hênanewe-

دەنگێ وباسی نـاخۆش هێنـان بـۆ کەسـێ، نوقڵانـەی خراپەلێدان.

٢- پشت پێنەبەستن، هیواوڕووناکی نەمان.

**ئاوەڕیس (ن.، ئان.)** awer̄ês .

ئاڤـــەریس، باریـــک(دەزوو..)باریـــک-ڕیــــسراو، دەزوولەیی، ڕیسراوی لووس و باریک.

**ئاوەز (ن.)** awez

ئاریش، ئەقڵ، بیروهۆش، ژیریی، فر.

**ئاوەزێ (ن.،ئان.)** awezê

ئاودەڵین، ئـاوەزا، زەویـی بەتەڕەشـوع، زەوییـەک ئاوی تێدا ژیابێتەوە، زەویی تەڕ

**ئاوەزێڕ (ن)** awezêr̄

ڕووکەش، ڕووکێشی زێڕ کفت، زێڕین.

**ئاوەزێڕکردن (کتپ.)** awezêr̄ kirdin

ڕووکەش کردن (شت) بەئاڵتون، ڕووکێشی زێڕکردن، زەرکەش کردن، زێڕکێش کردن، زێڕیین کردن، لە زێڕ گرتن یان هەڵکێشان.

**ئاوەژوو (ئان.)** awejü

ئـاواژ، ئـاوژێ، باشـبۆکیی، بـەرئاوەژوو، بـەراوەژوو، بەرپاش، بەرواژیی، بەروپشت، بـەرەواژ، پـشت وڕوو، پــێچەوانە، تــــەلەواژیی، وەرگــــەڕاو، وەرگێـــڕاو، هەڵگەڕاوە، هەلوەگەڕاو، هەلەوگێڕاو.

**ئاوەژوو بوون (کتن.)** awejübün

بـەرەواژبوون، بەروپـشت بـوون هەڵگەڕانـەوە(کـاڵا و جل و بەرگێ..).

**ئاوەژووکردنەوە(کتپ.)** awejü kirdinewe

١- سـەرەوژێر کردنـەوە، وەرگێـڕان، هەڵگێڕانـەوە، هەلەوگێرانـــەوە. ٢- ئـاوەژووکردن، بەرەوپـــشت کردن، بەرەواژکردن، پشت و ڕووکردن.

**ئاوەسوو (ئان.،خ.)**١ awesü

١-بەئاوسواو، بەردێک کـەئاو سـووبێتیەوە، بـەردێک لەبـەر ئـاوی زۆر بەسـەردا ڕۆیـشتن لـووس بـووبێ، ســووراوەوە، لـووس(بـەرد یـان شـتێ کـەلەئاودا ســووڕابێتەوە). ٢- ئاوەســـۆ، بێچــاوو ڕوو، بێشەرم، بێعار، چاوقایم، ڕووسەخت، گوێنەدەر.

**ئاوەسوو (ئان)**٢ awesü

خۆش نەکراو (پێستە)، دەباغ نەکراو(چەرم).

**ئاوەسوو (ئان)**٣ awesü

١-زکێ نەکـەر، سـک نەکـەر، عوزرنەشـۆر، لەسـک وەستاو، نەشۆر، نەشوور(ئافرەت).

٢- بێبەر، بێبەرهەم، بێوەر، بیوەر، نێر(درەخت).

٣- ئایـــسە، ئەســـتەویر، قـــسر، گیانـــداری مێچکـــە کەنەزۆک بێ یان بەر نەخاتەوە.

**ئاوەسەر (ن.،ئان.)** aweser

ئاویسەر، ئەو زەویەی ئاو قووت نادا ، سەراو، شۆنە.

**ئاوەسێ (ن.)** awesê

ئەنگوچکە سۆرانی، فەقیانە.

**ئاوەشکێنە (ن.)** aweškêne

ئـەو کەلەبـەرەی لەپـشت ئاشـەوە ئـاوی لێـوە دەشکێنرێ لەکاتێکدا کەبخەوێنرێ (ئاشی ئاو)، ئـەو

کەلەبەرەی لەکاتی ئاش وەستاندا ئاوی ئاشی لێوە بەردەدەنەوە

ئاوەکوڵ (ن.) awekul

ئاوی کوڵهاتوو، ئاوی گەرم.

ئاوەکوڵ (ن.) ٢ awekul

بەدبەختیی، شکەستی، نشووف، نشێویی، نەگبەتیی، نەهاتیی.

ئاوەکوڵ کردن (کتپ.) awekul kirdin

جل لەناو ئاودا کوڵاندن (کالای چلکن)، جلی چلکن لەناو ئاوی کوڵهاتوودا شتن.

ئاوەکیی (ئان.) ١ awekî

١- تراو، شل، وەک ئاو شل.

٢- ئاوایی، تەڕ، نماویی.

ئاوەکیی (ئان.) ٢ awekî

١- ئاپۆرە، ئاوارە، دەربەدەر، لانەواز، هەڵوەدا.

٢- سەرلێ شێواو، گومڕا.

٣- تاربوو،تەرە، دابڕاو، دوورکەوتە، هەڵهاتوو (ئاژەڵ). ٤- ئاڵۆزاو، شێواو.

ئاوەکیی (ئان.) ١ ٣ awekî

١- بیانیی، نائاشنا، ناشنا، هاڤیی.

٢-نابەڵەد، ناشارەزە، نەشارەزا.

ئاوەکیی بوون (کتن) awekî bûn

ب (ئاوەکی کەوتن)

ئاوەکیی کەوتن(کتن) awekî kewtin

ئاوارەبوون، تەرابوون، دابڕان، (لەڕێی ڕاست).

ئاوەلا ن (نک) ١ awelan

ئاوالآن، برادەران، دۆستان.

ئاوەلا نە(ن) awelane[٢]

پاداشت، خەلآت، شیرینیی، مژدە، مژدانە.

ئاوەڵچنە (ن.) awelçine

ئاوهەڵچنە، مەرەکەب هەڵچنەر، مەرەکەب وشکەوەکەر.

ئاوەڵ کراس(ن.) awel kiras

ئاواڵ کراس، دەرپێی ئافرەت، دەرپێی ژنان.

ئاوەڵناو(ن..ری.) awelnaw

١- بریی ناو، سفەت(لە ڕێزماندا).

٢- وشەیەکە کەواتای ناو یان جێناو دەستنیشان دەکات، بەهۆی ڕاڤەکردنی ئەو چۆنییەتە تایبەتییەی پابەندیتیی.

٣- وشەیەکی ڕاڤەکەرە واتا دیاریکەری ناو یان جێناوە بەهۆی دەسنیشان کردنی ئەو چۆنیەتە تایبەتییەی کەهەیەتی.

٤- وشە یان چەند وشەیەکە بەکاردەهێنرێ بۆ دەستنیشان کردن یان ڕاڤەکردنی ناو، واتە: (وشە یا کۆمەڵە وشەیەک کەلەبریی ناو بەکاربهێنرێ).

٥- هەرچ پارستەیەک یان شارستەیەک بەهەمان شێوە بەکارهێنرابێ.

ئاوەڵە (ئان.) awele

ئاواڵە، بەربەرەڵا، کراوە، کراوەوە، وەکراو. هب (بەراوەڵە).

ئاوەڵەبوون (کتن) awelebûn

ئاشکرابوون، پەردەلەسەر (شت)لاچوون، دەرکەوتن.

ئاوەڵەکردن (کتپ.) awelekirdin

١- ئاشکراکردن، پەردە لەسەر لابردن (شتێ یان نهێنی). ٢- پیشان دان، خستنەڕوو، هەڵماڵین.

٣- دۆزینەوە، دیتنەوە، وەدۆزیین.

ئاوەندیار (ن.) awendiyar

ناوبژیکەر، ناوەندیار (کەسێ یان میللەتێک).

ئاوەنیا (ن..ئان.) aweniya

ئاوێژە، ئاوێە، ئاویی، بەراو، پاراو، پایناو، تەڕەکاڵ، ڕەپستە، سەوزەکێڵ، قنگاو، کشتوکاڵی ئاویی، کشتوکاڵێ کەبەئاو کرابێ، واتە: (وشکەوەرد نەبێ)، کۆڵەبەس، کۆڵەبەست، کۆڵەپەست، کۆڵەوەس، مەزرا، نازاو، مەبەست: دەغلێ کەلەپێشدا زەوییەکەی ئاودراوە و کێڵراوە و دوایی تووی لێ چێندراوە، زەوییەک کەبەئاو لێ نان نەرم کرابێتەوە وەتۆو تیاچاندن بێچاوەڕوان کردنی پەڵە.

ئاوەها (ئان..ئاک.) aweha

ئاوا، ئاووا، ئاوها، ئووسا، ئەئاوا، ئەوها، ئەهوا، بەم جۆرە، بەم شێوەیە، بەوتەرحە، بەوتەرزە، بەوجۆرە، بەوجوورە، بەوچەشنە، بەوشێوەیە، پاسە، ڤەهە، وا، ولۆ، وەتۆ، وەسا، وەک وەی، وەها، هۆتۆ، هوسا، هوو.

ئاوهاتنەوە(کتن) awhatinewe

ئاوفڕێدان، بوون، تەواوبوون، ڕەحەت بوون، شاوەت ڕژاندن، شاوەت فڕێدان.

ئاوهەڵچنین (کتپ) awhelçinîn

ئاوخواردنەوە (ئاو کەبچێتە ناوشتێکەوە..)، ئاو هەڵگرتن، ئاوهەڵمژین.

ئاو هەڵسان (کتن) awhelsan

ئاوبەرزبوونەوە، ئاو هەستان، لافاوبوون، لافاوهەستان، لافاو هەڵسان.

ئاوهەڵگرتن( کتپ) awhelkgrtin[١]

١- ئاوبۆ سەرزەوی بردن بۆئاودان، ئاو ڕاکیشان(لە

جۆگا یەکەوە بۆ سەرکشتوکاڵ)، ئاو کردنە سەر شوێنێ بۆ ئاودانی کشتوکاڵ، ئاو وەرگرتن لە ڕوبار... ئاو هەڵکردن. ٢- جۆگە سازکردن بۆ ئاو هێنانە سەرزەوی لەسەرچاوەوە.

**ئاوهەڵێنجان(کتپ)** awhelêncan

ئاو سەرخستن (بەسەتل...)، ئاو (لەبیر...) دەرهێنان، ئاو لەبیرسەر خستن، ئاو هەڵکێشان.

**ئاوهێنان(کتپ)** awhênan

ئاو هاوردن بۆ ئیش وکار یان خواردنەوە.

**ئاوهێنانەوە(کتپ)** awhênanewe

بەدەست شاوەت هێنانەو، جلق کردن، خۆ رەحەت کردن، دەسپەڕکردن، ڕەحەت کردن، مشتەکردن.

**ئاوی بێ لفاو خواردنەوە (ئد.)**

awî bê lixaw- xwardinewe

١- ئیشی سەربەخۆ کردن، سڵ لەکەس نەکردنەوە، کاربەئارەزووی خۆ کردن، گوێ بەکەس نەدان.

٢-هەروەها بەیەکێک دەوترێ کە (بێ ئابڕوو، چەرداوە ڕوو، ڕوو هەڵماراو) بێت و بە ئەوشێوەیە نەرێت بکات.

**ئاوی پێ داهاتن(ئد.)** awî pê dahatin

ماندوو بوون لەبەر زۆر ڕاوەستان.هەب (ئاوی قاچ داهاتن).

**ئاوێتن (کتپ.)** awîtin

فرێدان، هاویشتن.

**ئاوێتە (ئان)[1]** awîte

ئاوێتە، تێکەڵ، تێکەڵاو.

**ئاوێتە (ن)[2]** awîte

ئاوێتە، بێچووی لەزگدا مردوو (ئاژەڵ).

**ئاوی چاو (نک)** awî çaw

ئەستێر، ئەسر، ئەسرین، ڕندک، ڕۆنتک، ڕۆندک، فرمێسک، هوڕمیس، هەڵسی.

**ئاوی چاودان (کتپ..ئد.)** awî çawdan

ئاوی چاودان(بەهۆی تەماشا و دڵ خۆش بوون)، چاوبازیکردن، تەماشای ئافرەتی جوان کردن، چاو زاخاودان، ڕوون کردنەوە و چاو زاخاودان بە تەماشای ئافرەت یان شتی جوان، زاخاوی چاودان.

**ئاوی چاوسەندن (کتن.. ئد.)** awî çaw sendin

ئاوچاو سەنن، ئاوی چاودان،ئاوی چاوسەنن، ئاوی دەم دان، ئاوی زاردان، بزداندن، ترساندن، ترسانن، ترس خستنەدڵ (کەسێکەوە)، تۆقاندن، تۆقانن، زراوبردن، زەنەق بردن.

**ئاوی حەیات(ن.)** awî heyat

ئاوی بێمەرگیی، ئاوی ژین، ئاوێکی ئەفسانەیە گوایا هەر کەسێک لێی بخواتەوە هەر بەگەنجیی و خۆش تەندروست دەمێنێتەوە و هەرگیز نامرێ.

**ئاوی ڕژاو گرد نابێتەوە(پن)**

awîrijaw gird nabêtewe

١- ئاوی لێژان گرد نابێتەوە، شتێ کەلەدەستچوو وەکو خۆی لێناکرێتەوە.

٢- چارە بۆنەمان(شت)، چاک ناکرێتەوە. کارلەکار ترازان. ٣-جێی خۆی ناگرێتەوە، ڕاست ناکرێتەوە.

٤- پینەوپەڕۆناکرێت.

**ئاوی ڕوو تکان (ئد)** awî rû tikan

١- ورشەوگەشەی دەموچاو نەمان (کەسێ).

٢- ڕەفتارسووک بوون، ڕێز لانەمان، شەرم و شکۆنەمان. ٣- بێسوودبوون، بێ کەڵک بوون.

٤- بێبەهابوون، بێ پێت وبەرەکەت بوون، بێ وەربوون.

**ئاوی ڕەش (ن، پز)** awî reş

ئاوی چاو کەدایەت، نیمچەکوێری.

**ئاوی ڕەش (خ)** awî reş

ئیشی ناڕەوا، تاوانی گەورە،تاوانی نالەبار، کرداری نالەبار.

**ئاوی ڕەش داهاتن (کتن،ئد)** awî re š dahatin

ئاوی ڕەش پەیدابوون لەسەر چاو،سۆمایی داهاتن، کوێربوون.

**ئاوی ڕەوان(ن..ئان.)** awîrewan

١- ئاوێ کەلەبەری بڕوات، (ئان).

٢- ئاوی پاک، ئاوی خواردنەوە، ئاوی شیرین، ئاوێ کە بۆ خواردنەوە دەست ئەدات.

**ئاوی سپی (نل،پز)** awî sipî

کزیی چاو، لێڵیی چاو، نەخۆشی چاو کەوردەوردە بێتە هۆی سۆمایی داهاتنی چاو.

**ئاویشتن (کتپ)** awîştin

١- ئاڤێتن، ئاوێتن، ئاوێژتن، ئاوێژتن، ئاوێشتن، پەرت کردن، پەڕدان، هاوێتن، هاوێتین، هاوێژتن، هاویشتن.

٢- ئاراستەکردن(چەک). تێگرتن، وەشاندن.

**(تێ)ئاویشتن (کتپ)** (tê) awîştin

تێ بڕیین، تێ خستن، تێ هاوێژتن، تێ هاویشتن.

**ئاوی شێلوو (ن.. ئان.)** awî şêlû

ئاوی لیخن، ئاوی لیل، قوڕاو.

**ئاوی قاچ داهاتن (ند.)** awî qaç dahatin
١- ئـاوی پـێ‌داهاتن، زۆرمانـدوو بـوون(لەبـەر زۆر بەپێوەبوون)، قاچ شل بوون (لەبەر ماندوێتیی یان زۆر بەپێوە ڕاوەستان).
٢- ورەبەردان، هیچ لەوزەدا نەمان(لەبەر بێ هێزیی یان وزە تیدا نەمان).

**ئاوی‌کێشراو(ن.)** awî kêšraw
ئاوی پالاوتە.

**ئاوی گوێچکە دان (کتپ.،ند.)** awî gwêçke dan
١- ئامۆژگاری کردن (لەبارەی چۆنیەتیی ئیشێک یان گوێ‌دان بەشتێ)، تەگبیرو ڕاکردن (بۆ کەسێ)، خەت بۆ کێشان، لەکار ئاگادارکردن.
٢- بەســەروبەرکردن، ڕێـــک خـــستن، ســـازاندان، سازکردن کۆک کردن.

**ئاوێگە(ن.)** awîge
دوورگە، ژیراف، گەزیرە، ئافرۆ، نیفرۆ.

**ئاوی گەرم (ن.)** awîgerm
ئاڤا کەلیی، ئاوی کولهاتوو، ئاوی لەکوڵ.

**ئاوێلکە(ن.)** awîlke
ئاوزینـکێ، دواهەئاسـە، دەمـی مـەرگێ، سـەرەمەرگێ، گیانەلا، گیانەللا، گیانەلاو.

**ئاوی لووت (ن.)** awîlût
چلم.

**ئاوی لیڵ(ن.،ئان.)** awîlêl
ب (ئاوی شێلوو).

**ئاوی مەنگ (ن.)** awî meng
ئاوی قووڵ، ئاڤا کوور.

**ئاوینەک (ن.)** awînek
پاسەوانیی، دیدەوانیی، کێشکچێتیی، کێشکڤانیی.

**ئاوی وابە بیلەوە(رس.)** awî wabe bilewe
١- ئاوی وابەجۆگەوە، ئاوی ها بەبیلەوە- بەتوانایە، بەدەستەلاتە، جێی ڕێزە، کارامەیە، هـەموو ئـیش وکارێکی بۆ ڕایی دەبێ (یان پـێ دەکرێـت). ٢- بەیـەکێکی (دارا، دەوڵەمەنـد، ســامانداد، کـۆک) دەوترێ.
٣- بەتفاقە، بەدەوڵەتە، خاوەن مەڕومالاتە.

**ئاویە (ن.)١** awiye
سـواخ، سـواغ، سـیواخ، قـوڕی لەبـان یـان دیـوار هەڵسووراو.

**ئاویە(ئان.)٢** awiye
پاراو(پڕ لە ئاو (میوە)).

**ئاویە(ن.)٣** awiye
جۆشی شتی کانزا.

**ئاویەدان (کتپ.)١** awiyedan
جۆش دان، لەحیم کردن(پێکەوە).

**ئاویەدان(کتپ.)٢** awiyedan
سـواخ دان، سـواغ دان، قـوڕتێ هەڵـسوون و لـووس کردن.

**ئاویی (ن.،ئان.)١** awî
ئاسمـانیی (ڕەنـگێ)، ڕەنگـی شـینی ئـاچڕ، شـینی ئاسمانیی، شینی کاڵ، کەوگێ، لاجیوەردیی.

**ئاویی (ئان.)٢** awî
ئاڤـیی، تـەبایی، جانـەوەری ئـاویی، گیانـداری نـاو ئاو(کە بەبێ ئاو نەژیی) یـان هـەر گیاندارێکە لەناو ئاودا بژی.

**ئاویی (ن.،ئان.)٣** awî
ئاڤیی، هب(ئاوەنیا).

**ئاوی بە جۆگەیە کا ڕۆی، ئە بێ هە ر بروا (پن)**
awê be- cogeyeka roy ebê her birwa
شتێ کەڕووی دا ئیتر لەدەست چووە، هـەرچێ بـوو ... بوو!، پەشیمانی داو نادات.

**ئاوێتە (ئان.)١** awête
ئامێتە، تێکەلاو تێکلهەڤ. هب (ئاوێتە).

**ئاوێتە (ئان.)٢** awête
ب (ئاوێتە).

**ئاوێتەکردن (کتپ.)** awête kirdin
ئامێتەکردن، ئاوێتەکردن، تێکلاوکردن، تێکەلاوکردن.

**ئاوێز (ن.)** awêz
کەنار نشین، کەنارەگیر.

**ئاوێزان (کتپ.)** awêzan
دالەقـان، داهـێلان، شـۆڕکردنەوە، هەلاوەسـیین، هەڵواسیین.

**ئاوێزە (ن.)١** awêze
ئاوێز، ئاوێزان، دارۆچکە، دالۆچکە، دالۆچە، دالۆزکە، دالوسکە. ٢- پرپرە، پلپلە، شۆڕابە.

**ئاوێزە (ن.)٢** awêze
چرای هەڵواسراو، چلچرا، لالە.

**ئاوێزە (ن.، نس.)٣** awêze
پیروو، کۆ.

**ئاوێزەی گوارە(نک)** awêzey gwar
پلپلەی گوارە.

**ئاوێژەر (ن.)** awêjer
ئاڤـێژ، ئـاوێژ، ئـاوێژە، ئاوێژیـار، تـووردەر، فرێـدەر،

وەشـــین، وەشـــینەر، هـــاویژ، هـــاویژەر (بـــەرد، گولله..هتد).

**ناویستا (ن.)** Avesta, (n.). awêsta

ناڤیـستا، ئەونیـستا، کتێبـی پـیرۆزی زەردەشـت و پارسەکان، نوسراوە پیرۆزەکانی ئاینی زەردەشت و پارسەکان.

**ناوێکی خراپی ڕشتوە (رس.. ند.)** awêkî xrapî ṟištwe

١- ناوێکی خراپ ڕیژراوە، داب ودەستورێکی خـراپ هێنراوەتە کایەوە، ڕەنگێکی خراپ ڕیژراوە، شـتێکی خراپ کراوە بەباو.

٢- پێشوونەیەکی گەند (گەنگ) خولقاندن.

٣- بەرنامەیـەکی بێکـەڵک دانـان، ڕێبـازێکی خـراپ دانان.

**ناوینە (ن.)** awênc

١- نادەنە، ئەنیێ، خودێ، خۆدێ، خـۆدیی، نرۆڤ، نرووڤ، ڕونایی، قۆدک، نەینۆک.

٢- جام، جامەک، قباله، قیباله.

**ناوینە ئەگرنە ڕووی (ند)** awênc egirme ṟüy

ناوینەبەدەمیـــەوە ئـــەگرن (تـــا بـــزانن هەناســـەی تیداماوە؟) بەیـەکێک دەڵـێن کـەزۆر کەشـەنگ بێـت، واتە: ناگا لەخۆ براو (نەماو)، بـێ خوسـت، بێهـۆش، لەهۆش خۆچوو.

**ناوینە بەدەمیەوە ئەگرن (ند.)**

awêne be demyewe- egrin

ب (ناوینە ئەگرنە ڕووی).

**ناوینەبەند (ئان.)** awêne bend

ژوور یـان تـەلارێک کـە- دیوارەکـانی ناوینـەی تـێ گیرابێ (بۆ ئەوەی جـوانتر بنـوێنێ)، لە ناوینـەگیراو (دیواری ناو ژوور).

**ناوینەگرەوە (ن.)** awêne girewe

١- بـەخت گـرەوە، فـاڵچیی، فـاڵ گـرەوە، قبـاله گرەوە. ٢- باریەژنگەر، تەلەسم باز، جادووگەر.

**ناه (نسپ.، ن.)[1]** ah

ناخ.

**ناه (ن)[2]** ah

ئاواتـەخوازیی، هەناسـەی خـەمباریی، هەناسـەیەکی درێژ بـۆ پیشاندانی (ئـاوات، پـەرۆش، پەشـیمانیی، جخار، ماندویەتیی...).

**ناه (ن)[3]** ah

هێزی کەم.

**ناه (ن.)[4]** ah

ئەوەنـــدەی بلێـــی یـــەک و دوو چاوتروکانێـــک. ماوەیەکی کورت، مەودایەکی زۆر کەم، هەناسەیەک.

**ناها (ناک.)[1]** aha

ب (ناوەها)

**ناها (نسپ.، ن.)[2]** aha

١- بـــڕۆ بـــەولاوە!، خـــۆت لادە!، خەبـــەردار!، دوورکەوە:، هۆشت بێ!، هوشیاربە!، وشیاربە!.

٢-کەی وایە! کێ باوەڕ دەکا، (پر، سر).

**ناه تیا (تیدا) مان (کتن.)** ah têda man

زرپ وزیندوو بـوون، زینـدووبوون، گیـان تیـدامان، هەناسەتیا (تیدا) مان.

**ناه تیا (تیدا) ماو (ئان.)** ah têda maw

زرپ و وینـدوو، زیـدنوو، گیـان تیـداماو، نـەمردوو، هەناسە تیا (تیدا) ماو.

**ناه تیا (تیدا) نەبوون (کتن، ند)**

ah têda nebün

١- ناه تیدا نەمان، بەرەونەمان ڕونیشتن.

٢- مردن، نەمان، هەناسە لەبەربڕان.

**ناه تیا (تیدا) نەماو (ئان.)** ah têda nemaw

١- ناه تیادا نەماو.

٢- مردوو، نەماو، هەناسە لەبەر براو.

**ناه لەبەردا نەمان (کتن،ند.)**

ah leberda neman

بێ تین بوون، بێ هێزبوون، تین (تیا) تیدا نەمان.

**ناه لەبەردا نەماو (ئان.)** ah leberda nemaw

بێ تین بوو، بێ هێزبوو، تین (تیا) تیدا نەماو.

**ناەونالە (ن.)** ah w nale

کسکین، گالین، نالەنال، وەیل، هەناسەی سارد

**ناه ونالەکردن (کتن.)** ah w nale kirdin

ناخ هەڵکیشان و نالاندن،هەناسەی سارد هەڵکیشان.

**ناەونزا (ن.)** ah w niza

ب (ناه و نزوله).

**ناه و نزوله (ن.)[1]** ah wnizüle

ناه ونزا، ناه، تووک ونزای خراپ، نەفرین.

**ناه و نزوله (ن.)[2]** ah w nizüle

١- پاڕانەوە و لالانەوە، خواز، نـزا، نیـاز، هیـواداریی پـڕ بـەدڵ. ٢- ڕۆڕۆ، فینکـە، کارەکـار، گریـان، گریانی بەکول، گریە، لاوانەوە، وەی شیرە.

**ناهوو (ن.)** ahü

کەمایەتیی، کەمایەسیی، ناتەواویی.

**ئاهووری** (ن. رو.) ahûrî
ترەوکە، خەرتەلە، خەردالە، گۆرمزە.

**ئاهۆ** (ن.) ١ aho
١- ئـاهوو، زەدەداریـی، عیللـەت، کـەم و کـوڕیی، نەنگیی(لەتەندروستیدا).
٢- دەرد، ژەهـرک، ژەهریـی، ناسـاخیی، ناسـازیی، ناساغیی، نەخۆشیی، نەساخیی، نەوەشیی.

**ئاهۆ** (ن.، پز.) ٢ aho
بوورانەوە (نەخۆشیی)، پەرکەم، تەپ، گەشکە.

**ئاهۆ** (ن.، پز.) ٣ aho
درم، نەخۆشیی تەشەنەکەر، نەخۆشیی گیرۆ

**ئاهۆ** (ن.، پز.) ٤ aho
چاوقولکە، ڕشانەوە، قڕان.

**ئاهۆ** (ن.، پز.) ٥ aho
شێتیی، لێوەیی.

**ئاهۆ** (ئان.، ئاک.) ٦ aho
خراپ، گەند، گەندەژە، نالەبار.

**ئاهەرا** (ن.) ahera
بزنە ڕێ، ڕێچکە، کوێرە ڕێ، ورچە ڕێ.

**ئاهەک**(ن.، کی.) ahek(ki)
١- ئەهاک، قسل، کسل.
٢- (داڕوو) ماکی موو ڕووتاندنەوە.

**ئاه هەلکێشان بۆ {شتێ}** (کتن.)
ah helkêšan bo štê
ئاخ وداخ هەلکێشان، ئاوات خواستن، پەشیمانیی دەسگیرکردن بۆ (شتێ).

**ئاهەنگ** (ن.) ١ aheng
١- بەزم و ڕەزم وگۆرانیی، بەزم و شادیی، خۆشیی، دیلانـە، شـایی، کـۆڕی بـەزم و ڕەزم و گـۆرانیی، گوبەن، گۆبەند، گۆڤەند، لۆخانە.
٢- ئاوازی ڕێک و پێک، دەنگ و ئاوازی لەگـەڵ یـەک ڕێکەوتوو (...گونجاو).
٣- بـەزم، خۆشـیی دەنـگ یـان مۆسـیقا، دەنـگ و خرۆشیی خۆش بەدوای یەکتردا هاتوو، ڕەزم.
٤- ئاواز، ئاوازە، دەنگ، هەوای گۆرانیی.

**ئاهەنگ** (ن.) ٢ aheng
گاڤین، مەبەس، مەبەست، نیاز، ویست.

**ئاهەنگ** (ن.) ٣ aheng
بەرایی، پێشەکیی، سەرەتا.

**ئاهەنگ** (ن.) ٤ aheng
بەند، پارچەهەڵبەست (سێ دێڕیا شەش و زیاتر).

(وردە) **ئاهەنگ** (ن.، خ) ٥ (wurde) aheng
با، باوێژ، تر.

**ئاهەنگا** (ن) ahenga
ب (ئاهەنگە).

**ئاهەنگدار** (ن) ahengdar
چاوەش، سازندە، شایەر.

**ئاهەنگ گێران**(کتپ.) aheng gêran
ئاهەنگ کردن، ئاهەنگ گرتن، بەزم سازدان، کۆڕی بەزم و ڕەزم گرتن، کەیف و زەماوەند کردن.

**ئاهەنگە**(ن) ahenge
ئاهـەنگا، لۆخانـە، هەڵبەنـدی ئاهـەنگ، هەڵبەنـدی ئاهەنگ گێران.

**ئاهی سارد**(ن.) ahî sard
بـێ هیـڤیتیی، نائومیـدیی، ناهومیـدیی، هەناسـەی سارد.

**ئاهین**(ن.) ahîn
ئاسنی دارشتە، حەوجۆش.

**ئاهێن**(ن) ahên
١- بـار، پـەرۆش، پـەژارە، خەفـەت، سـوو، سـوێ، کەسـەر. ٢- دامـاویی، کزیـی. ٣- پەرێـشانیی، تێشکان، کەنەفتیی، مەینەت، نەگبەتیی.

**ئاهیین** (کتن) ahîn
بـەجۆش گریـان، فینکـەفینک کـردن، کارەکـارکردن، گریان، گریەکردن، گریەوزار کردن، ناڵیین.

**ئای!** (نسپ.) ay!
ئاخ ، ئۆف، وای!، های!.

**ئایا** (ئپ،نسپ،پر) aya
ئاخۆ، ئاخوا، ئایاکوو، ئایە، ئایەکوو، ئەرێ، تۆ بڵێی، چما، چمان، داخۆ، داخوو، داخووە، ما، مەگەر.

**ئایشا** (ج.) ayša
ئەوان، کەسانێ یان شتێ لەوە پێشتر باس کرابن.

**ئایل** (ن.، کی.) ١ ayîl (ki)
١- بچووک، بەرمەمکانـە، زاڕۆ،زاڕۆک، زاڕۆڵـە، شـیرە خۆرە، کۆرپە، مناڵ، منداڵ.
٢- بەچکە، بێچوو، چێژک، سەحەل، وەچکە.

**ئایل** (ئان.) ٢ ayîl
خراپـکار، سـتەمکەر، کەسـێ کـاری نـارەوا دەکـا، نارەواکەر.

**ئاین** (ن) ayîn
ڕەوشت، مەزەب.

**ئاین ونۆین** (ن.) ayîn w oyîn
ئان ونوون، حیلەوحەواڵە، دەستێبەدەستی، فـرت و

فیل ، فیل و تەڵەکە، فیل وفەرەج، فیڵ و فەنگ.
ئاین وئۆینی زۆر لەژوور سەردایە (رس. )
.ayîn w oyînî zor le jür serdaye
بەیەکیکی ئاین و ئۆین باز دەوتریت. واتە:
١- تەفرەدەر، جانانە.
٢- چەپ ئەنداز، چەپەڵ، دەستبڕ، دەس خەڕۆکەر.
٣- تەڵەکەباز، فریوباز، فێڵباز.

**ئایە** (نکێ: )aye
بەر، بەرخوەر، بەرهەم، دەستکەوت، دەسکەوت، سوور، قازانج، کەڵک، هاڤل، هۆ، هەو.

**ئایە ومایە** (ن.)aye w maye
دەسکەوت ودەسمایە، سوود ومایە، قازانج وسەرمایە.

**ئایە ومایە بە دەستەوە نەمان** (رس. ،ند. )
aye w maye be- destewe neman
پارەبەدەستەوەنەمان، قازانج وسەرمایەلەدەست چوون، کەوتنەسەر ساجی عەلی.

**ئاییا** (ن )ayîa
ئایە، پوور، خوشکی باوک، مەت، مەتک، مەتێ، میمک، میمی.

**ئاییسان** (کتن )ayîsan
بلند بوون(گڕی ئاگر)، پێبوون(ئاگر، چرا)، داگیرسان، گرسان، گریان، هەڵ بوون، هەڵگیرسان.

**ئاییساندن** (کتپ. )ayîsandin
داگرساندن، داگیرساندن، شەولقاندن، هەڵکردن،هەڵگیرساندن.

**ئاییساو** (ئان. )ayîsaw
پێکراو (پێکراو)، داگرساو، داگیرساو، هەڵکراو، هەڵگیرساو.

**ئایین** (ن. )ayîn
١- ئاین، ئۆل، دین، ڕەوشت، ڕێ وشوینی ئایینی، ڕێ و شوینی دینیی، مەزەب.
٢- باوەڕگە، ڕاگە، ڕەفتار، ڕەوتار، ڕیگا.
٣- دالنگ، دەستوور، کانوون، یاسا.
٤- بناغە، بنچینە، بنەڕەت.

**ئاییندار** (ئان. )ayîndar
باش، بەئایین، بەدین، پیاوچاک، پیاوخاس، چاک، خاس، ڕاست، قنج، قەنج، لەخواترس.

**ئایندە** (ن )ayînde
ئایەندە، پاشەڕۆژ، دوارۆژ، داهاتوو، کاتی دادێ، کاتی هاتوو، لەمەودوا، لەمەوسا، لەمەولا.

**ئایینرا** (ن. )ayînra
١- باوەڕ، بڕوا، داب ودەستووری ئایین، دەستووری ئایین، ڕێی ئایین. ٢- ڕاستی، ڕیگای ڕاست.
٣- کابە، کەعبە.
٤- تەریقەت (دەرویش).

**ئایینی** (ئان. )ayînî
دینیی، مەزەبیی.

**ئتلیس** (ن. )itlîs
بیز، قیز و بیز، لێ ڕەپزیی، لێ وەڕسیی، لی وەڕەزیی.

**ئسپارکردن**(کتپ. )isparkirdin
تەکمیش کردن، ئاویاخ وەرگیران بە پیمەرە.

**ئستران** (ن.، کی. )istran(ki)
ئاواز، ستران، گۆرانیی.

**ئستینگ** (ن، کی )isting
زەردەواڵە، ژەنگە سوورە.

**ئم** (ئاک )im
ئا، ئاری، بەڵێ.

**ئنجا** (پر )inca
ئینجا، ئەمجا، دەی چیی تر؟.

**ئنجا** (پر )inca
ئەمجار، لەوەپاش.

**ئوتوزبوونەوە** (کتن،کی )utuzbünewe
ئوتوس بوون، تلۆربوونەوە، تلەوەبوون، جالەبرون، گلار بوونەوە، گلۆربوونەوە.

**ئوچ** (ن )uç
قامیش قەڵەم، نووکی قەڵەمی مەرەکەب.

**ئوداگرتن( ئووداگرتن)** (کتپ )üda girtin
ئودگرتن، ئوداگرتن، بەچاویکی ڕیزەوە تەماشاکردن (کەسێ)، ڕیزکرتن، ڕیز لێ گرتن، قەدرگرتن.

**ئورزان** (ن )ürzan
چۆپی، هەڵپەرکێ.

**ئورگ** (ن. ) ürg (ki)
ئوورک، ئوورگ، ئۆرگ، زک، زگ، سک، گەدە، گەیە، ورک، ورگ.

**ئورگ قوپیاگ** (ئان. )ürg qupyag
ئوورگ قوپیاگ، ورگ قوپاو

**ئوسترە** (ن. )üstre
تیغی تەراش، گویزان، گیزان، مووتاش.

**ئوسترلاب** (ن،نس )ustirlab
ئاسمان پیو، ئاسمانپیو، ئامرازی ئەستیرە ناسان بۆ دیاریی کردنی مەودای نیوان ئەستیرەکان.

ئەلفبا (ن) elf-ba
١- ئابێ، ئەلف بێ، ئەلف بێتک، ئەلف بێتکە، ئەلف بێ تێ، ئەلف وبێ، پیتەکانی خوێندن ونوسیین.
٢- بنەڕەت، بەربێژ، ڕەچ، سەرەتا، یەکەم هەنگاو.

ئەلف لەیلە نەخوێنێتەوە [یان نەخوێنێ] (ند)
elif leyle- exwênêtewe
بۆ باسی یەکێک دەوترێ بەمانای:
١- چەنەبازیی کردن، درێژەبەقسەدان، زۆربلێیکردن، نەبڕینەوەی (قسە)، لەسەر ئاخاوتن ڕۆیشتن. ٢- چیرۆکی مێش کردن، قسەی بێ سوود کردن.

ئەلف وبێی نەخوێندووە (رس.)
elf w bêy- nexwêndwe
١- خوێندەواریی نییە، نادانە.
٢- لەئێش نازانێ، نەشارەزایە، نەزانە (کەسێ).
٣- سەرەواوی لەسکدانییە، هەڕی لەبڕیی ناکاتەوە.

ئەلفە (ن) elfe
ب (ئەشکیل).

ئەلوات (ئان،لو) ١ elwat(lu)
بەد فەڕوهەرزە، بێ شەرم، سەرسەریی.

ئەلوات (ئان،لو) ٢ elwat(lu)
دەست بڵاو، ماڵ بەفیڕۆدەر.

ئەلور (ئان) elor
بەبا، بەتەلەب، بەکەڵ، فاڵ (مێچکەی ئاژەڵ).

ئەلوری (ن،ئا) elorî
بزنەکێویی(نێر)، تەگە، چتیر، خەزەڵ، سابرێن، بێریی، هەوری.

ئەلوجەلو (ن،نک) elowcelo
١- ئەلەوجەلە، ئەلەوجەلەو، عەلۆوجەلۆ، هەرزەوهوورزە، هەرچی وپەرچی، هەمەچین، هەمەڕەنگە. ٢- عەشامات، قەرەباڵغیی.
٣- ڕووتەو پووتە، ڕەچاڵە، ڕەش وڕووت.

ئەلەتریک (ن) eletrîk
کارەبا.

ئەلەنگە (ن) elenge
بەرگە، زمانە بچکۆلە، زمانەچکۆلە.

ئەلهۆ (ن،م) elho
ئەیلۆ، هەڵۆ.

ئەلیا (ن) elya
ئەلها، هەوەس.

ئەلیک (ن،لو) elîk(lu)
ڕوومەت، گۆنا، گۆنە، لام، لامچی.

ئەڵامەت (ن،پز) el̲amet
ئالامەت، ئەلامەت، پەتا، پەسیو، درم، فرفینگە، هەلامەت.

ئەڵبەتە (ئاک) el̲bate
١- ئەلبەت، ئەلبەتە، ڕەنگە، لەوانەیە، وێ دەچێ، هەلبەت، هەلبەتە.
٢- بەڕاستیی، بەشکو، بێ درۆ، بێگومان.
٣- بێ ئەملاوئەولا، بێ چەندوچوون.
٤- بەئاشکرا، ڕەپو ڕوون.

ئەڵقاپی (ن) el̲qapî
دەرگای گەورە، دەروازە.

ئەڵقاوێز (ن) ١ el̲qawêz
پێچاوپێچ، لولاولوول.

ئەڵقاوێز (ئان) ٢ el̲qawêz
بەپەت هەڵاوەسراو، بەپەت هەڵخراو، بەپەت هەڵواسراو، بەسێدارەداکراو، بەسێدارەوەکراو، لەسێدارە دراو، مل بەپەتەوەکراو.

ئەڵقاوێز کردن(کتپ) el̲qawêzkirdin
١- ئیعدام کردن، بەداراکردن، لەسێدارەدان، مل بەپەتاکردن، هەڵاوەسیین. ٢- (پەت) هەڵخستن.

ئەڵقە (ن) el̲qe
١- ئاخلە، ئاڵقە، بازنە، تەوق، چەمبل، حەڵقە، خڕ، خەڵەک، عەڵقە، کەمە، گرد، گردەکەڵە، گوولی، گەو.
٢- چەلەمە، خەڵتە، کولەن، کەلەمە، کەلەمە، کەلەوە. ٣- پەراوێز، تار، چوارچێوە، چەمە، چەمەرە. ٤- ئاڵقە، جۆدەس، دەسکە، قولف، گەو (قۆریی، کووپ..). ٥- ئەموستیلە، ئەنگوستیلە، مستیلە. ٦- ئاپۆرە، دەستەکۆمەڵە، کۆڕ، کۆمەڵە، کۆی خەڵک، لەدەوری کەسێ یاشتێ، گردەوەبوو (کەسان)، هۆرگە.

ئەڵقەدان(کتن،کتپ) el̲qedan
ئەڵقەبەستن، ئەڵقەگرتن، پێچ خواردن،گلۆڵەبون، گێنگڵ خواردن، لوول بوون، لوول خواردن، هاتنەوەیەک (بەشێوەی بازنە) [مار..].

ئەڵقەڕێز(ن) el̲qer̲êz
-١ئاڵقەڕێز، ئەلقارێز، جفت، زنجیرۆکەی دەرگا داخستن. ٢- سووڕگی.

ئەڵقەڕێزکردن(کتپ) ١ el̲qer̲êzkirdin
داخستن(دەرگا بەئەڵقەڕێز).

ئەڵقەڕێزکردن(کتپ) ٢ el̲qer̲ezkirdin
بەزنجیربەستنەوە، زنجیرکردن، کۆت کردن، کۆت و زنجیرکردن.

ئه لقه له گوێ (ن.) elqe le gwê

١- ئالقه‌بــه‌گوێ، ئه‌لقه‌بــه‌گوێ، به‌یه‌کێ ئــه‌ووترێ ئه‌لقه‌ی کۆیله‌یی له‌گوێدابێت، گوێ له‌مست.

٢- به‌زێرکواو، به‌نده، به‌نه، به‌نیی، زه‌رخریی، کۆیله، که‌نیزه، نۆکه‌رێکی گوێ رایه‌ڵ.

٣- بــه‌کرێ گــیراو، بێگانه‌په‌رســت، خــۆ فــرۆش به‌بێگانه.

ئه لقه ی زنجیر (ن.) elqeeyzincîr

قوڵفی زنجیر.

ئه لماس (ن.،ئان.) elmas

١- به‌ردێکی به‌نرخ وسه‌خته، بریقه‌دار، ڕووژه.

٢- ده‌م تیژ، زۆرتیژ، نووک تیژ (چه‌قۆ).

ئه لماس ته راش (ن.) elmasteraš

بابــه‌تی شووشــه که‌نه‌خــشینراوی، قــاپ وقاچــاغی شووشه که‌نه‌خشی له‌سه‌ر هه‌ڵکه‌نراوێ.

ئه لماس ڕێژ (ئان.) elmasrêj

ئه‌ڵماس کوت.

ئه لماسه (ن.) elmase

ئاڵشت، ئالیشک، خــووس، خووســار، خــوین، خوێن، زوقم، سیخوار، قراف، وه‌ڕه‌ق.

ئه لوه دا (ئان) elweda

ئاواره، سه‌رگه‌ردان، هه‌ڵوه‌دا.

ئه لها (ن) elha

١- خولیا، که‌ڵکه‌ڵه.

٢- ئــاره‌زوو، ئاســووخ، تاســه، خواســت، خــواهیش، دڵخواز، مگیر، ویست. ٣- هانا، هاوار.

ئه لیم نیره ئه لێ بیدۆشه! (رس)

elêm nêre, elê- bîdoše

من ئــه‌ڵێم: نێره‌ئــه‌و ئــه‌ڵێ: بیدۆشــه، به‌یــه‌کێکی:- (سه‌رســه‌خت، ســه‌ره‌ڕه‌ق، که‌للــه‌ڕه‌ق، مــانگرتوو) ده‌وتــرێ کــه‌ســوور بــێ له‌ســه‌ر ئــه‌و داوایــه‌ی که‌له‌توانادانییه.

ئه لیی (ده لیی) (ف) elêy

١- تــۆ ده‌ڵێــی، هــه‌روه‌ک بڵێــی (بــۆ پــێ چوانــدن بــه‌کارده‌هێنرێ). ٢- چــون، چــۆن، وه‌ر، وه‌ک، وه‌کوو. ٣- به‌هه‌مان جۆر، به‌هــه‌مان چه‌شــن، ده‌ق، ئاوه‌ها، وه‌ک وی.

٤- ئه‌بێ، ئه‌شێ، ده‌بێ،ده‌شێ، وێده‌چێ.

ئه لیی پیکی پۆلایه (رس.) elêy pîkî polaye

به‌یــه‌کێک ده‌وتــرێ بــه‌واتای: بــێ ده‌ردو دوو، بــێ ڕووشه، دروست، له‌ش ساغ.

ئه لیی داری واو ه یلایه (رس)

elêy darî waweylaye

به‌یه‌کێک ده‌وترێ که: (درێژ داهۆڵ، ڕه‌ق وتــه‌ق، زۆر له‌ ڕولاواز) بێت.

ئه لیی دیزه ی ڕه شه (رس) elêy dîzey reše

هه‌روه‌ک دیزه‌ی ڕه‌ش وایه: لێره‌دا (دیــزه‌ی ڕه‌ش) به‌یه‌کێکی: (به‌د،خراپ، گه‌ند، گه‌نده‌ژه )ده‌وترێ.

ئه لیی ڕیویی ته له که بازه (ند)

elêy rêwîy teletbaze

وه‌ک ڕێــویی فێلبــازه، به‌یــه‌کێکی [ته‌ڵه‌کــه‌باز، ساخته‌چیی، گزیکه‌ر] ده‌وترێ.

ئه لیی زیری زه رده (رس) elêy zêrîzerde

ئــه‌ڵیی زه‌ره، به‌منــداڵێکی: خووڕه‌وشــت بــاش، له‌سه‌رخۆ یان که‌سێکی ڕێک وپێک ده‌ووترێ.

ئه لیی سه گی هه له پاسه (رس)

elêy segî helepase

وه‌ک ســه‌گی بــه‌ڕه‌ڵا پــه‌لاماری ناســیاوو نه‌ناســیاو ئه‌دات، به‌یه‌کێکی: بێ چاوو ڕوو، شه‌ڕانیی، هاروهــاج ده‌ووترێ.

ئه لیی سیرمه مه یه (رس،ند) elêy sirmemeye

جیــره وه‌ک پێستــه‌ی خــۆش کــراو (ده‌بــاغ کــراو):-

١- بــۆ چۆنیــه‌تیی خــواردن بــه‌کاردێت، وه‌ک پــارچه‌یه‌ک گۆشــتی جیــر کــه‌جوونی ئاســان نــه‌بێ، نه‌کولاو.

٢- به‌کێش، به‌هێز، ته‌ن دروست، له‌ش ساغ.

ئه لیی سیویکن کراون به دوو که رته وه (رس)

elêy- sêwêkin krawin bedükertewe

زۆر له‌یه‌ک ده‌چن(دووکه‌س)، چۆن یــه‌کن له‌شێوه‌دا یان له‌ خوو وڕه‌وشتدا، هــه‌ر ده‌ڵێــی سێوێکن کــراون به‌دوو که‌رته‌وه.

ئه لیی گه نه ی گونی گایه (رس)

elêy geney gunî- gaye

وه‌ک گه‌نه وایه به‌گونیی گاوه نوساوێ، به‌یه‌کێکی:

١- (براندۆغ، پێ داگر، چیره‌که‌ر، ڕکه‌گر) ده‌ووترێ.

٢- پیاوکاســـــه‌ر، جاڕســــکه‌ر، میــــشک بـــــه‌ر، هه‌راسانکه‌ر.

ئه م (ج) em

١- جێناوه بۆ که‌س یان شتێکی نزیک (جێ، جێگه، کات..تاد)، ئه‌فه، ئه‌یه، ئێد، ئینه، یه.

٢- ئه‌ڤ، ئه‌و، ئیی.

٣- ئه‌مه، ئێمه، خۆمان، مه. ٤- ئه‌ن، من.

ئەمار (ئان) ¹ emar

حۆل، حەشاش، خەیاڵاویی، داڵغەچیی، گێژ، ور.

ئەمار (ن) ² emar

ب (ئەمبار).

ئەماراو (ن) emaraw

ئاڤزێل، ئاڤسارک، ئاڤەڤەک، ئەستێرک، ئەستێل، ئەستیلکە، چاڵاو، حەوز، رەڤکە، ساریچ، قوولکەی ئاو، مەسنا، مەهەر.

ئەمارکردن (کتپ) emarkirdin

برهاڤ کرن، پاشەکەوت کردن، پەرگ هاندن، خڕ کردنەوە، خستنەسەریەک، خستنەلاوە، داکردن، شاردنەوە (شت بۆ کاتی پێویست)، کۆکردنەوە، هەڵ گرتن.

ئەمارەپۆ (ئاک) emarepo

چلکن وداڕزاو (کاڵا) لەناو دووکاندا یان ئەمارداء رزیو، پیس بوو(کوتاڵ).

ئەماس (ئان) emas

بەستوو، بەسراو، مەیی، مەییو.

ئەماس بوون (کتن) emasbûn

بەستن، بەسران، مەیین.

ئەمان (ج، نک) eman

کۆی [(ئەم)ە وتەنیا بۆ ئادەمیزاد بەکاردێ]: ئازی، ئانیشا، ئانیلە، ئەوەکان، وان، هۆوان، ئەوانی نزیک.

ئەمان (ن) ¹ eman

١- بێ ترسیی، دڵنیایی، هێمنیی.

٢- پەنا، داڵدە، داڵڵە.

ئەمان (ئسپ) ² eman

دەخیل، دەخیلە!، هاوار!، هاوارە!.

ئەمان (ئپ) ³ eman

بەڵام، بەڵآن.

ئەمانە (جن، بۆ کەسێ یان شتی نزیک) emane¹

١- ئەڤانە، ئەم شتانە، ئەم کەسانە، ئەم کەس گەلە.

٢- ئەم نزیکانە، یانە.

ئەمانە (ن) ² emane

پاسی گەورە، پاسی مەسلەحە.

ئەمبار (ن) embar

ئەمار، ئەنبار، بارخانە، شوێنی داکردنی دانەوێڵە وکەل وپەل، عەمار، عەمبار، عەنبار، کۆگا، مەسنا.

ئەمبارکراو (ن) embarkiraw

برهاڤ کریی، پاشەکەوت کراو، خڕەوەکراو، داکراو، داکردوو، شارراوە بۆ کاتی پێویست، کۆکراوەوە، کۆوەکراو، گردە وەکراو، هەڵگیراو (شت بۆ کاتی پێویست).

ئەمبارکردن (کتپ) embar kirdin

ئەمارکردن، ئەنبارکردن، عەمارکردن، عەمبارکردن، عەنبارکردن، کۆوەکردن.

ئەمباز (ن) embaz

ب (ئامباز).

ئەمبازبوون (کتن،کتپ) embazbûn

ئاوێزش بوون.

ئەمبایی (ن) embayî

کاری (پێچوون، لێچوون، وێچوون)، هاوچەشنیی، هەڤبەریی، هەڤڕوویی.

ئەمبەر (ن) ember

ئەم تەنیشت،ئەم کەنار،ئەملا، ئەم لا.

ئەمبەروئەوبەر (ن.) emberwewber

ئەم تەنیشت وئەو تەنیشت، ئەم کەنارو ئەو کەنار، ئەملاوئەولا.

ئەمبەروئەوبەرکردن (کتن)

ember w ewber kirdin

ئەم کەنار وئەو کەنارکردن، ئەملاوئەولا کردن، ئەوبەروئەمبەرکردن، چوونە ئەوبەروهاتنەوە ئەمبەر.

ئەمپەڕ (ن) empeṟ

١- هەرەئەملا، هەرە نزیک.

٢- ئەملاترین، نزیکترین.

٣- کەمترین (پلەی شتێ).

ئەمپەڕوئەوپەڕ (ئان) empeṟ w ewpeṟ ئەمبەر وئەوبەر، هاتوچۆ.

ئەمپەڕوئەوپەڕکردن(کتن)

emperwewper kirdin

١- پەڕینەوە لەمبەر بۆ ئەوبەر (ئاو).

٢- ب (ئەمبەر وئەوبەرکردن).

ئەمجار (ن، ئاک) emcar

١- ئنجا، ئەمجا، ئەمجار، ئەم دەفعەیە، ئەنجا، ئەنجار، ئەوجا، ئەوجار، ئینجا، ئینجار، ئینجارەکان، ئینجارەکانێ، ئینجارەکە، ئینجاکوونێ، ئینجاوەکوونێ.

٢- ئەم بارە، ئەمبارە، ئەمجارە، ئەمجارەکە، ئەم دەمە. ئەم کاتە، ئەم کەڕەتە، ئەم کەشە، ئەم کەڕ ئەم هەلە. ٣- پاش ئەمە، دپشت ڤە، لەپاشان.

٤- بەشوێن ئەمەدا، پاشان، پاشیی، دوای ئەوە، [illegible]یی. ٥- کەوابوو، کەواتە.

ئەمجارتر (ئاک) emcartir

جارێکی تر، دیسا، دیسان، دیسانەکە، دیسانەوە.

هەمدیسان، هەمیسان، هەمیسانەوە. هب (ئەمجارە).

ئەمجارە (ناک) emcare

ئیگل، ئەمجارتر.

ئەمدیو (ن) emdîw

ئەم تەنیشت، ئەملا، ڕووی ئەملا (شتێ).

ئەمدیو ئەودیو کردن (کتن، ند)

emdîw w ewdîw- kirdin

١- ئەم تەنیشت و ئەو تەنیشت کردن، ئەم دیو ئەودیوکردن، لەلایەکەوە بۆ لایەکی تر هاتوچۆکردن.

٢- تەپاوتل کردن (لەسەر جێگەی نوستن)، تەپاوتل کردن لەجێگەدا، تەپ وتل کردن، گلاندن بەم دیوو بەودیودا، نارەحەت بوون، خەولێ نەکەوتن، هەڵگەڕانەوە (پاڵ کەوتوو لەسەر لایەکەوە بۆ لاکەی تری).

٣- چوونە بنج و بناوان، چەوتوچیلە لێدان.

٤- سەرنج لێدان، لێ وردبوونەوە، ورد بوونەوە..لە.

ئەمڕۆ (ن،می) emro

هەرمێ، هەمڕۆ.

ئەمری، خوا بە جێ هێنان (کتن،ند)

emrî xwa becê- hênan

١- ئەمری خواکردن، خواکەسێ بۆ خۆبردنەوە، زایەبوون، فەرمانی یەزدان بەجێ هێنان، لەدنیا کۆچ کردن، مردن، نەمان

٢- فەرمانی خواوەند جێبەجێکردن.

ئەمڕۆ (ن،ناک) emro

ئاڕۆ، ئەڤرۆ، ئەمڕۆکە، ئەوڕۆ، ئیڕۆ، ئیمڕۆ، ڕۆژی کەتیاین، ڕۆژی نێوان دوێنێ وسبەینێ، لەم ڕۆدا، ئەدویکە- ئەسوزێ.

ئەمڕۆبە حازر، سبەینێ بە قەرز (رس)

emro be hazir- sibeyne be qerz

بەدرەنگ خستن، دەس بەدەسیی پێ کردن، وەدوا خستن(بەفرت و فێڵ).

ئەمڕۆ سبەی پێ کردن (ند)

emrow sibey pê kirdin

بەدرەنگ خستن، دەس بەدەسیی پێ کردن، وەدوا خستن(بەفرت وفێڵ).

ئەمسا (ن، ناک) emsa

١- ئیسا، ئێستا، ئێستە، ئێستێ، ئیسە، نووکە، نها، نهۆ، نهوو، نهە، هەنووکە.

٢- لەمەوپاش، لەمەودوا، لەمەوسا، لەمەولا، لەمەوەدوا، لەمەوەلا.

ئەمسەروئەوسەر (ئان) emser w ewser

ب (ئەمپەڕوئەوپەڕ).

ئەمسەروئەوسەر پێ کردن(کتپ،ند)

emser w ewser pê kirdin -

١- هێنان وبردن لەسەری ئەمسەرەوە بۆ سەری ئەوسەر. ٢- بۆ ژۆکردن، بێنەوبەرەپێ کردن، ماندووکردن، نارەحەت کردن، هیلاک کردن.

٣- ڕێتێنێکی دوور ودرێژ خستنەبەر.

ئەمسەرو ئەوسەرکردن (کتن،ند)

emser w ewser- kirdin

ڕۆیشتن لەسەری ئەمسەرەوە تاسەری ئەوسەر، هات وچۆکردن.

ئەمشەو (ن، ناک) emšew

ئەڤ شەڤە، ئەڤ شەوە، ئەم شۆ، ئیشەڤ، ئیمشەو، شەوێ کەتیاین، ئەدوێ شەونەسبەی شەو.

ئەملا (ن) emla

ب (ئەمبەر).

ئەملاتر (ناک) emlatir

(لە) ئەملاتر.

ئەملاوئەولا (ناک) emlaw ewla

ئەم شوێن وئەو شوێن.

ئەملاوئەولا کردن (کتن،ند) emlaw ewla kirdin

١- ب (ئەمبەرو ئەوبەرکردن).

٢- گەڕان بەملاوئەولادا، هاتوچۆکردن لەلایەکەوە بۆ لایەکی تر. ٣- بێ ئامانج هەڵسووڕان، ڕەفتارکردن بەکەمتەرخەمی یەوە، کەوتنە شوێن شتی هیچ وپووچ.

ئەملاوە (ن) emlawe

شوێنی نزیکتر.

ئەمن (ن) emin

ئەز، من، وژم.

ئەموست (ن) emust

ئەنگوس، ئەنگوست، پل، پیلک، تبل، تل، تلی، تلیک، تیلک، دیل، تپل، تپلک، کلک، گلک.

ئەموستانە (ن) emustane

ب (مستیلەی دروومان).

ئەموست بەستە (ئان) emust beste

فریو دراو، هەڵخەڵەتاو.

ئەموستە چاو(ئان.) emuste çaw

١- ئەنگوست لەچاو، ئەنگوستەچاو، تاریکایی خەست، تاریکستان، زۆر تاریک، نژار.

٢- تاریکەشەو، شەوانی زۆر تاریک (سێ شەوی

هەرە دوایی مانگ)، شەوەزەنگ، شەوی زۆر تاریک.

**ئەموستی پێ** (ن.) emustî pê

پەنجەی پێ.

**ئەموستی دەست** (نک.) emustî dest

پەنجەکانی دەست:

١- پەنجەتووتە، تووتە، تووتەلە.

٢- براتووتە، برای تووتەڵە.

٣- زەڕنەقوتە، ناوگین، ناوەڕاست.

٤- دۆشاومژە، پەنجەی شایەتمان.

٥- ئەسپێ کوژە، پەنجەگەورە، تبلامەزن، تبلاستوور، تلیستوور، کەڵەئەنگوشت.

**ئەموستیلە** (ن) emustîle

ئەموستەویلە، ئەنگوستیلە، ئەنگوستەویلە، پەنجەوانە، کلکەوانە، مەنگولیسک.

**ئەموستیلەی درومان** (ن.) emustîle drüman

ئەموستانە، ئەنگوستیلەی درومان، ئەموستانە، مستیلەی درومان.

**ئەمە** (ج) [1] eme

١- ئەڤا، ئەڤیها، ئەڤیهی، ئەم کەسەیان ئەم شتە، ئەمەهەی، ئەمهەی، ئەوەی نزیک، ئێد.

٢- ئەوەمە، هەوە. ٣- ئەم، من وکەس یان کەسانی تر. هب: (ئەم/ ٣ we).

**ئەمە** (ناک) [2] eme

ئەیرە، ئێرانە، ئێردانە، ئیرە، ئێرە، ڤێرێ، لەئێرانە.

**ئەمە** (ناک) [3] eme

ئیرەمە، بۆ ئێرە، بەرەوئێرە.

**ئەمەئەرزو ئەوەگەز** (پن) emc erzw ewe gez

ب (ئانەگورز وئانە مەیدان).

**ئەمەتا** (شر) emeta

ئانەمە، ئەڤە، ئەمەتانێ، ئەمەتە، ئەمەتێ، ئەمەسی، ئەمەسە، ئەمەمە، ئەوەمەیە، ئینەشا.

**ئەمەگ** (ن) emeg

١- ئەجری دایک وباوک لەسەر منداڵی خۆیان، چاکە، ڕەندیی، قنجیی، مزی چاکەی دایک وباوک بەسەر مناڵی خۆیانەوە.

٢- پیاوەتیی، جوامێریی، چاکە، سپاسی چاکە، مرۆیەتیی، وەفا. ٣- خێر، خێرخوایی.

**ئەمەگ** (ن) [3] emeg

١- ئەمەک، ئیشی بەئەرک، ئیشی گران، ڕەنج، زەحمەت، زەحمەتیی، کاری سەخت، کاری قورس.

٢- فەرمان، کار، کردار

٣- پێویستیی، گەرەکیی.

**ئەمەگ** (ن) [4] emeg

خۆراک، ژەم.

**ئەمەگ** (ن) [5] emeg

ئامۆژگاریی.

**ئەمەگ** (ن.) [6] emeg

خواردەمەنیی، خواردن.

**ئەمەگ بەجێ هێنان** (کتن،کتپ)

emeg becê hênan

١- ئەمەگ دان، تەقەلادان، تەقەلاکردن، هەوڵ دان، هەوڵ وتەقەلادان.

٢- پاداش دانەوە، چاکەدانەوە.

**ئەمەگ بەخەسارچوون** (کتن)

emeg be xesarbün

ڕەنج بەباچوون، ڕەنج بێ وەربوون، هەوڵ وتەقەلا بەفیڕۆچوون.

**ئەمەگدار** (ئان) (be)emegdar

١- بەبەقا، بەئەمەک، بەوەفا.

٢- ئاخوەوەند، خاوەن پیاوەتیی، کەسێ ئەمەکی بەسەریەکێکی ترەوەبێ

**ئەمەگ لەگەڵ کێشان** (کتپ،ئد)

emegdan legelkêšan

١- ئیش وکاری خەڵک ڕاپەڕاندن، خۆ پێوە ماندووکردن، خۆماندووکردن، خۆ ماندووکردن، بەڕاپەڕاندنی ئیش وکاری یەکێکی ترەوە، خۆماندنووکردن لەگەڵ خەریک بوون بەجێبەجێ کردنی ئیشی یەکێکی دیکەوە، هەوڵ وتەقەلا لەگەڵ دان. ٢- بەخێوکردن (منداڵ)، پەروەردەکردن، ڕەنیوهێنان (مناڵ).

**ئەمەنووچکە** (ئان،ناک) emendüçke

ئەم تۆزە، ئەم تۆسقاڵە، ئەم کەمۆکە، ئەمەندوسکانە، ئەمەندوسکە، ئەمەندوکانێ، ئەمەندووکە، ئەوەندوسکە، ئەمەندووکە، تۆزکەلانەیەک، تۆزلقانەیەک، تۆسقاڵیک، زەڕایەک، شتێکی کەم، هێندێکی کەم.

**ئەمەندە** (ن،ناک) emende

ئەمەن، ئەمەند، ئەمەنە، ئەوچەندە، ئەوقاس، ئەونە، ئەوەند، ئەوەندە، ئەوەنە، ئەوەمەندە، ڤێقاسێ، هێندە.

**ئەمەیان** (ن.،ناک) [1] emeyan

ب (ئەمییانە/٢).

**ئەمەیان** (ن.، ناک.) [2] emeyan

ئەم نزیکەیان، ئەمییانە، ئەمە(ئەم یەکەیان. شتە

نزیکە کەیان، کەسەناسراوەکەیان)، [نێوان دووشت، چەندشتێ..].

ئەمیتر (ن.،ئان.) emîtir

ئەمیکە، ئەوی دواتر، ئەوی دیکە، ئەوی دیی، ئەویکە.

ئەمیش (ن.) emîş

ئەڤژی، ئەمیچ، ئەمیچە، ئەوی دیکەش، ئەویەکەش، دیترژی.

ئەمێ (شر.) [1] emê

ئیمە ئەبێ، گەرەکە ئیمە.

ئەمێ (ئان.) [2] emê

مێ، میچکە، میوینە، مێینە.

ئەمێ (ئاکە.) [3] emê

ئەگرە، ئەم جێگایە، ئەم جیگەیە، ئێرانە.

ئەمییانە (نل.،ئاکە) emyane

١- ئەم دەورویەرە، ئێرانە.

٢- ب (ئەمیان - **This one**).

(لە ئەمییانە (ئاکە) (le)emyane

لەئەم دەورویەرە، لەئێرانە.

ئەنار (ن.،می) enar

هەنار( بەریان دارەکەی).

ئەنارلو (ن.،لو) enarlu(lu)

باغی هەنار، هەنارستان

ئەناز (ئان.،خ.) enaz

داخراو، راخراو، فڕێ دراو، فڕێدراو (لەژێر پێی کەسێ..).

ئەنباز (ن.) [1] enbaz

ئەمباز، عەمباز.

ئەنباز (ن.) [2] enbaz

تووش، دووچار، گرفتار.

ئەنبازبوون (کتن.،کتپ.) enbaz bûn

ب (ئاوقەدبوون).

ئەنتەر (ن.،ئا) enter

١- حەمتەر، عەنتەر، قوون سوور (مەیموون).

٢- مەیموونی نێر، نێرەی مەیموون.

ئەنتیکە (ن.،ئان) entîke

١- دانسقە، شتی هونەریی، عەنتیکە، کەل وپەلی هونەریی یان زۆر کەونارا. ٢- بەنرخ، گران بەها.

٣- جێی سەرسوڕمان، سەرسووڕ هێنەر (کەسێ یانە شتێ)، سەیر، کەم وێنە.

ئەنتیکەخانە (ن) entîkexane

(ئەو خانووەی کەلوپەلی زۆر لەمێژینەی تێدا هەڵ

دەگیرێ)، عەنتیکەخانە، مووزەخانە.

ئەنجام (ن) [1] enjam

١- ئاقیبەت، پاشیین، دوایی، دواییکار، دوماهکی، دوماهی، دەمایی، کۆتایی.

٢- بنەبڕ، بەرە، هەرەدوایی. ٣- بڕیار.

ئەنجام (ئان.،ئاکە) [2] encam

بەرهەم، بەروبووم، دەسکەوت.

ئەنجام (ن) [3] encam

پەڕ، دووا.

ئەنجام پێدان (کتپ) encam pêdan

تەواوکردن، کۆتایی پێ هێنان

ئەنجام دان (کتپ) encamdan

ب[(بە) ئەنجام گەیاندن].

ئەنجام گیریی (ن) encamgîrî

پەیدا.

ئەنجام گیریی کردن(کتپ) encamgîrî kirdin

دەرهێنان، لێ پەیداکردن.

ئەنجامە (ن) encame

بەس، بەست، دوولایی، لاولاوەی دەرگاو پەنجەرە.

ئەنجام هاتن (کتن) encam hatin

١- برانەوە، تەواوبوون، کۆتایی هاتن. ٢- لەسەر بڕیاری خۆڕۆیشتن.

ئەنجامیی (ن.) encamî

کۆتایی، هەرەدوایی(شت).

ئەنجن (ن) encin

ئەنجە، جنراو، لەت، لەت کراو، وردکراو.

ئەنجن ئەنجن (ئان) encin encin

ئەنجەئەنجە، پارچە، پل پل، کوت کوت، لەت لەت، لەت وپەت، ورد جنراو.

ئەنجن ئەنجن کردن (کتپ) encin encin kirdin

١- ئەنجە ئەنجەکردن، پارچەپارچەکردن، پارەپارەکردن، پل پل کردن، تیکەتیکەکردن، جنیین، لەت لەت کردن، لەت وپەت کردن، ونجڕ ونجڕکردن. ٢- شیی کردنەوە (قوماش یان جل وبەرگ). ٣- ب (ئەنجنیین).

ئەنجنراو (ن.،ئان) encindraw

١- ئەننجاو، ئەنجراو، پارچەپارچەکراو جنراو، جنراو، لەت لەت کراو، لەتوپەت کراو، ونجڕ ونجڕ کراو. ٢- پارچە، پل، جنکە، ورد.

ئەنجنیین (کتپ) encinîn

١- پارچەکردن، جنیین، هەنجنیین ورد کردن.

٢- ئەنجن ئەنجن کردن، بریندارکردن (لەشی کەسێ بەخەنجەر، چەقۆ..تاد).

ئەنجوڕ (ن) encur̠
خرچە، زرکێ، عەنجوڕ، قەرەخرچە، کالەکی زرکێ، گندۆرەی کاڵ.

ئەنجومەن (ن) enciumen
١- دانیشتنگە، کۆڕگا، کۆڕگە، کۆمەڵ، کۆمەڵە، کۆنگرە. ٢- کۆمەڵە پێکهاتوویەکێ بۆ دوان و کۆڵینەوە (لەشتێ)، لیژنە. ٣- کۆمەکێ.

ئەنجومەن گرتن (کتپ) encumengirtin
(لیژنە)، پێرپەستن، کۆبوونەوە کۆڕگرتن، کۆمەڵەبەستن، کۆمەڵەگرتن.

ئەنجە (ن.) ence
وردەپارچەی بچووک و باریک.

ئەنجەت (ن) encet
بەهانە، بیانگە، بیانگێ، بیانوو، مەهانە.

ئەنجینە (نک.) encîne
چل وچیو، چیلکە وچەواڵ.

ئەندازکار (ن.) endazkar
ب (ئەندازەگر).

ئەندازە (ن.) endaze
١- بارست، پان وبەرینیی، قاسی، قەبارە، هنداز.
٢- ئەنازە، ئەندازە، پێوانە.
٣- بەرەسە، رادە. ٤- ژمارە، شمارە، نمرە
٥- بارتەقا، بەرتەق، بەرتەقا، قەر، هێند.
٦- ئەڤچەند. ٧- پێوانەزانیی.
٨- سەنگایی، قورسایی.

ئەندازەکردن(کتپ) endazekirdin
ب (ئەندازەگرتن).

ئەندازەکردن لەگەڵ (ند) endazekirdin legel̠
بەراورد کردن لەگەڵ.

ئەندازەکردن لەگەڵ یەکدا (ند)
endaze kirdin legel̠ yekda
هەڵ سەنگاندن (دووشت یان زیاتر) لەگەڵ یەکتردا.

ئەندازەگر (ن) endazegir
پێوەر، لەگەزدەر.

ئەندازەگرتن (کتپ) endazegirtin
١- ئەندازەکردن، بەقەدگرتن، پیڤان، پێوان.
٢- ئێلچیی گرتن، بەراوردکردن، دیاریی کردن (پێوانەی جل وبەرگێ، چەندێتی وقەبارەی شت...).
٣- بەراوردکردن، لێکدانەوە.

ئەندازیار (ن) endazyar
ئەندازکار، ئەندازەگر، زانای ئەندازە.

ئەندام (ن) [1] endam
١- ئازا، ئازای لەش، ئەنام گیان، ئەننام گیان، پەل، چوارپەل، لەش. ٢- کەسێکە لەرێکخراوێکدا یان لیژنەیەکدا کاربکات، هاوبەش لەکۆمەڵێکدا.

ئەندام (ن) [2] endam
بالا، بەژن، بەژن وبالا، قەد، لەشولار.

ئەندامەتی (ن) endametî
هاوبەشیی لەکۆمەڵێکی هاومەبەست وهاودۆزدا.

ئەندۆ (ن) endo
پەژارە، خەفەت، خەم، غەم، کول، کەسەر.

ئەندۆکە (ئان، ئاک) endoke
ب (ئەندوچکە).

ئەندۆناک (ئان) endonak
١- خەمبین، غەمبار، غەمگین، غەمناک.
٢- دل مردگ، دل مردوو، دل مردە.
٣- پەشێو، شپرزە، شلەژاو، شێواو

ئەندەروون (ن) [1] enderün
ئەو ژوورەی کەماڵ ومنداڵی لێدائەنیشێ، بیروونیی، حەرەم، ژووری خاوو خێزان، ژووری ماڵ ومنداڵ، مندروو، مۆڵ، هۆڵە دانیشتن، هوندروو (لەخانوو بەرەی جاران).

ئەندەروون (ن) [2] enderün
توێ، کون یان ناوەوەی هەرچ شتێ.

ئەندەروون (ن) [3] enderün
دەروون، کانگای دل، ناخی دەروون، هەناو.

ئەندەروون (نک) [4] enderün
ناوزگێ، ناوسک، ناو ورگێ.

ئەندیشە (ن) [1] endêše
١- ئەندیش، ئەنیش، خەیال، غایلە، مەترسیی، واهیمە. ٢- بیر، سەرنج، نیهاد، هۆش.
٣- باک، پەروا. ٤- ترس، سام.

ئەندیشە (ن) [2] endêše
تاپۆ، تارمایی، سێبەر.

ئەنقەست (ئاک) enqest
ئانقەس، ئانقەست، ئەنقەس، لەقەست، لەقەستیی، هەڵە لەرووی ئاگادارییەوە.

ئەنگافتن(کتپ،کی) engaftin(ki)
ب (ئەنگاوتن).

ئەنگامە (ن) [1] engame
١- ئاپۆرەی مەردوم، زەنا زەنا، کۆمەڵگا.

کۆمەڵێکی زۆری خەڵک، هەنگامە.
٢- ڕۆمەڵغەزا، قەرەباڵغیی، قەلەباڵغیی.

**ئەنگامە (ن)** [2] engame
هەراوزەنا، هەراوهوریا.

**ئەنگاو (ن)** engaw
هەنگاو.

**ئەنگاوتن (کتپ)** [1] engawtin
١- ئـــەنگافتن، ئـــەنگیوتن، ئـــەنگیوران، پـــێکان، پێکاندن، پێکاوتن، خرچانـدن، قـرچ کـردن، لەئامـانج خستن، لەنیشان دان، لەنیشانەدان، هەنگاوتن.
٢- پێ نواندن، توشی گیروگرفت کردن.

**ئەنگاوتن (کتپ)** [2] engawtin
بەدی کردن، بینیین، دیتن.

**(خۆ)ئەنگاوتن (کتن)** (xo)engawtin
١- پاژنە لەرەقینەی قاچ کەوتن(لەکاتی ڕۆیشتندا)، سەرسم دان، هەڵ نووتان.
٢- بەسەهوو چوون(لەکاردا)، تـێ هـەڵ ئـەنگووتن، خـۆ تـــووش کــردن (لە ئاکــامی هەڵــە کردنــا)، زەللەکردن، هەڵەکردن.

**ئەنگاوتن (کتپ)** engawtin
١- ئـــەنگاوتوو، ئـــەنگواو، پـــێکاو، پـــێکراو، لێ دراو، هەنگاوتوو، هەنگواو.
٢- ئەنگافتە، بەردەردی لابەلاکـەوتوو، بـەلای کوتـو پڕ لێدراو، لێ قەوماو.

**ئەنگاوتە (ن)** [1] engawte
بەسەرهات، بەڵای کوتوپڕ، دەردی کوتوپڕ، کۆنگەڵ، مردنی لەپڕ یان نەخۆشیی لەپڕ، هەنگامە.

**ئەنگاوتە (ئان)** [2] engawte
بەخشندە، چاولێ پۆش، لێ بووردە.

**ئەنگاوتە بوون (کتن)** engawtebün
تووشـــی بـــەڵابوون، تووشـــی ڕووشـــەبوون، خراپەبەسەرهاتن، کتوپڕ نەخۆش کەوتن، گیروگـرفت بۆ پەیدابوون.

**ئەنگر (ئان،کی)** engir(ki) •
١- تووڕە، سەرگەرم.
٢- تـۆراو، تۆریـاگ، تۆریـاو، دەم وپـل بەیـەکادراو، ڕووبەڕ، زویر، زیز، لالووت، لووت خوار.
٣- سرک، سڵ، سوور، کێویی، نەبان.

**ئەنگران (کتن، لو)** engiran(lu)
بەرزفرین، خۆبەشت زانیین، سنگی خۆ دەرپـەڕاندن، لووت لەئاسمان کردن، لەئەندازەدەرچوون، لەپێستی خـۆ دەرچـوون، لەخۆبـایی بـوون، لەخـۆ گـۆڕان، لەڕادەبەدەربوون، هەنگران.

**ئەنگراو (ئان،لو)** engraw(lu)
بـــایی، بـــایی بـــوو، بـــەرزەبلێس، خۆبەشـــت زان، لەئەندازە دەرچوو، لەپێستی خۆ دەرچوو، لەخۆبایی بوو، لەخـۆ گۆڕاو، لەڕادەبـەدەر، لـووت بـەرز، لـووت لەئاسمان.

**ئەنگڵ (ن)** engiḻ
دەسک، قولف، هەنگڵ.

**ئەنگڵ (ن)** engiḻ
قۆڵ لە لای شان، هەنگڵ.

**ئەنگو (ن)** engü
خوناو، خوناوکە، شەونم.

**ئەنگوان (کتپ،کتن)** engwan
پێکران، پێکیان، لێ دران، هەنگیوران.

**ئەنگوتک (ن)** engütik
پەپک، پەپکە، تۆپەڵە هـەویری خـڕ هەڵـدراو بەشـی نانێک، گرنکی، گشتک، گشک، گلۆر، گونتک، گوندک، گونک.

**ئەنگوتک بژێر (ئان..خ.)** engütikbijêr
چرووک، ڕژد، ڕەزیل، گونک ژمێر.

**ئەنگوتک گرتن (کتپ)** engütik girtin
گونتک گرتن، گونک خڕ هەڵ دان، هەویر خڕ هەڵـدان بۆ نان.

**ئەنگوچک (ن)** engüçik
ئـەنوچک، فەقیانـە، قۆڵەکراسـی فـش وفـۆڵ ودرێـژ، گرچک، لەوەندەی.

**ئەنگوستەنما (ئان)** engustinema
ئەنگوستنما، بـەناوبانگ، دیـار، کلکـەنما، لەدوورەوە ناسراو، ناسراو، ناودار.

**ئەنگوست نیشان(ئانل)** engustnîšan
ئەموست نیشان، نیشانەکراو.

**ئەنگوسێ (ئان)** engüsê
پـــێچێ، کەمـــەکێ، کەمـــەکێک(چەنـدیتیی، قـــەبارە، هێز..).

**ئەنگۆ (ج)** engo
ب (ئێوە).

**ئەنگۆرە (ئاک)** [1] engore
دەمەو ئێوارە، دەمـی ئێـوارە، سـەرلە ئێـوارە، سـەر لەئێوارێ.

**ئەنگۆرە (ئاک)** [2] engore
١- ئەودەمــە، ئەوسـا، ئەوکاتــە، بەوپـێیە، پاشـان، دوای ئەودەمـــە. ٢- پـــێش ئێـــستا، کـــۆن،

لەرابوردوودا، لەمەوبەر، لەمەوپێش.

ئەنگورە (ئاک) ٢ engore

سەرەتای هەرەت.

ئەنگوور (ن، می،لو) engrür

ئەنگیر، ئەنووین، بەری ڕەز، تری، تریێ، میوەی دارمێو، هەنگوور.

ئەنگیز (ن) engêz

ئەنگێن، دنەدەر، هاندەر، هانەدەر.

ئەنگیزە (ن) engêze

مایەی سەرەکی، هۆ.

ئەنگیوران (کتپ) engêwran

ب (ئەنگاوتن).

ئەنگیوراو (ئان) engêwraw

ئەنگافتو، بەتیری ئەشق پێکراو، دیوانە، گرفتار، مەفتوون.

ئەنگیوە (ئان) engêwe

ئەنگیوەر، ئەوکەسەی فیشەکی بەفیڕۆ ناڕوات (کاتی تەقەکردن)، پێکەر، دەست ڕاست، کەسێ چاک لەئارمانج بدات، لەئامانج دەر، لیدەری نیشانە، نیشانە ئەنگێو، نیشانەشکێن، نیشانە لێدەر.

ئەنوا (نک) ١ enwa

١- دەرامەت، مایەی گوزەران، هۆی بەڕێوەچوون (ژیان). ٢- بوونیی (دەوڵەت)، توانایی (ماڵی دنیا)، هەبوونیی (شت، شتومەک..).

ئەنوا (ن) ٢ enwa

١- پەنا، پەناوپەسێو، جێگەی خۆ شاردنەوە، جێی حەوانەوەی شەو، حەشارگە، شوێنی حاوانەوە، لانە.

٢- شوێنی باران نەگر.

ئەنوو (ن) enü

ئەندۆ، ئەنۆ، بار، پلمە، پەژارە، خەفەت، خەم، سوو، کزیی، کەسەر، مەینەت.

ئەنە (ن) ene

هەڤی، هەوو، هەوە، هەوێ. نم: دووژنی میردیک ئەنەی یەکترن.

ئەنی (ن) enî

توێل، تیول، ناوچەوان، نێوان چاوان، هەینە هب : (پیشانگی).

ئەنیا (ن) enya

بەرۆش، پێز، تاقەت، توانا، تەوژم، تین، گوڕ، وره، وزە، هێز. ب (ئانیشک).

ئەو (ج) ew

١- ئان، ئەزیچ، ئەوی، وەی، ویی، هەو.

٢- ئەڤ، ئەڤێ، ئەوکەسە، هۆو، هێمایە بۆ یەکێکی دوور. ٣- ئەم (شت یان کەس)، هێمایە بۆ شتێ یان یەکێکی نزیک. ٤- ئائەوە، ئەواهی، ئەوی.

٥- هێمایە بۆ کۆمەڵێکی دوور یان نزیک.

ئەوا (ئاک) ١ ewa

ئاوەها، ئەوها، بەوچەشنە، وا، وشەی ئاگادار کردن لە ڕووداو.

ئەوا (ئاک) ٢ ewa

ئیستا، ئیستە، ئیستێ، نووکە.

ئەوار (ن) ewar

ئەوارگە، جێ، جیگا، جیگە، جیوار، شوێن، شوێنەوار، شوێن هەوار، وار، ویستگە، هەوار، هەوارگە.

ئەوارە (ئان) ١ eware

بیانیی، بێگانە، ئاشنا، هاڤی.

ئەوارە (ئان) ٢ eware

بێ ئیش، بێ دەسەڵات، بێ کار، پاڵووتە، تەپەقوڕە، تەمبەڵ، تەمەڵ، چرۆت، سلۆرت، گردەنشین، ولۆوڵ.

ئەوازن (کتن) ewazin

بوژانەوە، گوپکەکەردن (دارودرەخت).

ئەواگل (کتن،لو) ewagil(lu)

بادانەوە، چەرخانەوە، زڤران، ئەزڤڕیین، ئەگەڕان، گل خواردن، گەرانەوە، وەگەڕان.

ئەوان (ج) ewan

ئازی، ئانیلە، ئایسا، ئەڤان، ئەوانەی دوور، ئەی، وان.

ئەواندن (کتن) ewandin

خۆش ویستن،خوەش گەرەک بون.

ئەوانە (ئان،جن) ewane

ئەو چەند شتە، ئەو چەند کەسە، یانە.

ئەوانی تر (ج،ئان) ewanî tir

ئەوانتر، ئەوانیی دیی، ئەوەکانی تر، کەسانی دیکە، هۆوانەی دیکە، هەرکامانەیەکی تر.

ئەواهی (ج،ئپ،کی) ewahî(ki)

ئائەوشتە، ئائەوە، هۆوە (کەسێ یان شتێکی زانراویان باسکراو).

ئەوبەر (ن،ئان) ewber

١- ئەولا، بەرامبەر، بەرانبەر.

٢- ڤێ ڕەخی، لای ئەولا.

ئەوپەڕ (ن،ئان) ewper

١- ئەنجام، بنەبان، پاشین، پاومان، پایان، دوایی، دەمایی، کۆتایی، هەرەدوایی.

٢- دوورترین سنوور، دوورترین (شوێن).
٣- باڵاترین، بلند، بەرزترین، پۆپە، تاف، دواترین (پلە)، سنوور، شوێن، نیشانە...).

ئەوپیاوەنی یە (ند) ew piaweniye
بەکاری ئەو ئیشەنایەت، پیاوی ئەو کارەنییە.

ئەوتر (ئان.لو) ewtir(lu)
ئەوی تر، ئەوی کە.

ئەوتۆ (ئان) ewto
١- ئەوها، جۆرێک، چەشنێکی وا، شێوەیەک، شێوەیێک، وا، وتە، وەتۆ، وەها.
٢- باسین، شایانی باس، شایانی پێ هەلگوتن.
٣- بەم جۆرە.

ئەوج (ن.ئاک) ewc
١- بلندایی، بلندیی، بەرزیی، تەشق.
٢- باڵاترین پایە، بەرزترین، شوێنی جێگا یان شت، پۆپە، کەلە، لوتکە.
٣- کەوابوو، کەواێ، لەحالێکی وادا، لەحالێکی وەهادا، لەوحاڵەتەدا (ئاک).
٤- پاشان، لەپاشان.

ئەوجا (ئان) ewca
١- ئنجا، ئنجاکو، ئنجاکونێ، ئەنجا، ئەوجار، ئەوجارە کانێ، ئەوجارەکە، ئیمجا، ئیمجار.
٢- ئەم دەم، ئەم کەرەتە، ئەوسایە، پاشان، لەپاشان. ٣- کەوابوو، کەوایە، لەدۆخێکی وادا، لەدۆخێکی وەهادا، لەودۆخەدا.

ئەوجاڕ (ن) ewcar̲
هەوجاڕ، یەرەق.

ئەوجە (ئان) [1] ewce
ئاتاج، ئەوەجە، ئیحتیاج، بایس، پێداویست، حەوجە، گەرەک.

ئەوجە (ن) [2] ewce
ئاتاجیی، ئەوەجە، ئیحتیاجیی، بایستیی، پێداویستیی، گەرەکیی.

ئەوجێ یە خۆشە، کەدڵی لێ خۆشە (رس)
ewcêye xoše - ke dilî lê xoše
جێی خۆش ئەو شوێنەیەکە مرۆڤی تێیدا پێخۆشحاڵە.

ئەو دارەی لەژێریا دانەنیشیی مەیبڕەرەوە (رس)
ew- darey le jêrya daenîšî meybrerewe
پاداشی چاکەبەخراپە مەدەرەوە، ئەوکانیەی ئاوی لێ دەخۆیتەوە بەردی تێ فڕێ مەدە، بەرد مەخەرە ئەو کانیەی ئاوی لێ دەخۆیتەوە.

ئەوداڵ (ئان) [1] ewdal̲
١- ئاگا لەخۆنەماو، ئەبلەق، پەشۆکاو، حەبەساو، سەرسام، واق ورماو. ٢- دلبڕاو، دلدار، دلکەتیی، سەوداسەر، گرفتار (خۆشەویستیی).

ئەوداڵ (ئان) [2] ewdal̲
ب (ئاوارە).

ئەوداڵ (ن. م) [3] ewdal̲
ئاڤدەل، نێرە پۆر.

ئەوداڵ بوون (کتن) ewdal̲bûn
شوێن شتێ کەوتن، وێڵ بوون- (بەدوای شتێکدا).

ئەودەر (ئان) ewder
بەشی دەرەوە، دەرفە، دەرەوە.

ئەودیو (ن) ewdîw
دیوەکەی تر، دیوی پشتەوە.

ئەور (ن) ewr
عەور، هەور.

ئەورا (ئان) [1] ewra
١- ئاورا، برچیی، برسیی، ڕەودیین، سیرووژە، ورسیی.
٢- بەئیشتیا، بەتاسووقە، پرتاسووقە.

ئەورا (ئان) ٢ ewra
چەل، ژاری، نەبوو، هەژار.

ئەورا (ئان) [3] ewra
برسیایەتیی، برسیەتیی، برسیتیی.

ئەوراز (ن) ewraz
بەرەوژوور، سەربەرەوژوور، عەفراز، هەوراز.

ئەورام (ن) [1] ewram
دروستیی، سازگاریی.

ئەورام (ئان) [2] ewram
دروست، ڕەوا، ساز.

ئەورایی (ن، لو) ewra(lu)
ئاورایی، برچێتیی، برسیتیی، سیرۆژەیی.

ئەورەنگ (ن) [1] ewreng
١- بەرزیی، پایەبلندیی، سەروەریی، شکۆ.
٢- دڵ فراوانیی، سەخاوەت، سەغیتیی.

ئەورەنگ (ن) [2] ewreng
زەویی بلند، سەربەرەوژوورکە سەربەرەوژووریی، گرد.

ئەوزار (ن) ewzar
ب (ئامراز).

**ئەوسا (ئاک)** ewsa
١- ئەوجەلە، ئەودەم، ئەودەمە، ئەوسایە، ئەوکاتە، ئەوگافێ، لەکاتی دیاریی کراودا.
٢- جاران، لەمەوبەر.

**ئەوسار (ئاک)** ewsar
پەتۆکەی بەرەشمەوەبەستراو، دەسکەرەشمە، هەوسار.

**ئەوساکە (ئاک)** ewsake
لەودەمەدا، لەوێ چاخیدا.

**ئەوق (ئان)** ewq
دەرەتان لێ براو، قەتیس گیرخواردوو.

**ئەوق کردن (کتپ)** ewq kirdin
دەرەتان لێ بڕین، گیرکردن، ماتەڵ کردن.

**ئەوقە (ن)** ewqe
تووش، دووچار، گیرۆدە.

**ئەوک (ن)** ewk
نوک، بەرمل، ببین، تینتینۆکە، خرخرۆکە، قرگە، قورگە، قورقوراچکە، قورقوراگە، گلۆزیی، گەروو، گەوریی.

**ئەوکێ (ن،ئان)** ewkê
ئاوکە، ئەوکە، ئەوکی، ئەوەکە،ئیوەر، فلان، کابرا(کەس شت)، واکە، وانێکە، هەرامە، هین.

**ئەوگار (ئان)** ewgar
سیس بوو، سیس هەڵگەراو، کز وداماو.

**ئەولا (ن)** ewla
ئەوتەرەف، ڤێ ڕەخ.

**ئەولاترین (ن)** ewlatrîn
بنەبان، پەرترین، دوورترین، دوورترین (شوێن)

**ئەولەگا (ن)** ewlega
١- ئەیزرگە، ئێورگە، بابوێر، پۆرگە، مەڵبەند، نوان، نەوا، نیشتگە، هاوارگا، هاوارگە، هەوارگە، هەنوان.
٢- پەنا، پەناگە، داڵدە، دەرەتان. ٣- نوورت، خاکی باوباپیر، مەڵوەند، نیشتمان، وڵات، وەتەن.
٤- بابو هێر، بابهێر، پژگارگە، قەف، هەمەت.

**ئەوە (ج،ئپ)** ewe
١- ئەوەهە، یە، (بۆ کەسێ، شتێ باسکراو یا زانراو).
٢- بۆ دیاریی کردنی شتێکی دوور وجیاکردنەوەی لە (ئەمە). ٣- ئەوەیها بۆ جیاکردنەوەی شتێک لەنێوان دوشتا بەمەبەستی بەراورد کردن یان (پێکەنەچوون) لەگەڵ (ئەمە)دا.

**ئەوها (ئان،ئاک)** ewha
ب (ئاوا).

**ئەوەتا (ف،ئاک)** eweta
ئەوەتانێ، ئەوەتە، ئەوەتێ، ئەوەسا، ئەوەسە، ئەوەها، ئەویها، خۆیەتی، خۆیەسی، هەوە.

**ئەوەتام! (ف)** ewetam
ئەوەتا لێرەم، ئەمەتام، لێرەم.

**ئەوەتانێ (ف، ئاک)** ewetanê
ب(ئەوەتا).

**ئەوەتای (ف)** [1] ewetaî
ئەوەتۆی لەوێ!، تۆ لەوێیت.

**ئەوەتای (ف)** [2] ewetaî
لەو کاتەوەی کە...، لەوەتەی.

**ئەوەتەی (ف،ئپ،ئاک)** ewetey
ئەوەتیی، ژێی فەختێ، لەودەمەوە، لەوساوە، لەوکاتەوە، لەوکاتەوەکە...، لەوەتا، لەوەتەی، لەوەتیی.

**ئەوەتیی (ف،ئپ،ئاک)** ewetî
ب (ئەوەتەی).

**ئەوەدنیا (نل)** ewe dinya
ئاخیرەت، دنیای ئاخیرەت.

**ئەوەسا (ج،ئاک)** ewesa
ب (ئەوەتا).

**ئەوەکە (ج،ئاک)** eweke
شتەکە، کەسەکە، وانەکەکە، هەرامەکە، (بۆشتێک یان کەسێک بێ ئەوەی ناوی بهێنرێت، ئەوانەی باسی ئەکەن لەنێوان خۆیاندا ئەزانن چییە یان کێیە).

**ئەوەگۆڕی بێت (ئد)** ewe gorî bêt
تۆڵەیە)، شایانی ئەو سزایەیە، هەڵ دەگرێ وای بەسەر بێت.

**ئەوەندە (ج،ئان،ئاک،ن)** [1] ewende
ئەننە، ئەونە، ئەوەند، ئەوەنگە، ئەوەنە، هەتا ئەوپادەیە.

**ئەوەندە (ئاک،ئان،ج)** [2] ewende
هەرچەندی، هەرچەندێ، هەرچەندێک.

**ئەوەندە بێ بچۆ، قەدرت نەچۆ (رس)**
ewende bêw- biço qedrit neço
ئەوەندە مەچۆرە جێگایەک کەلێت وەرس بن، برۆ بۆ دیدەنی خەڵک، بەڵام ئەوەندە ناکەبەچاوی سووک تەماشات بکەن.

**ئەوەندە دزە، کل لەچاو ئەفرێنێ (رس)**
ewende- dize. kil le çaw efrênê
دزە، دەستێکی باڵای هەیە لەدزی کردندا، زۆر دزە.

**ئەوەندە گەڕاوە، دڕاوە! (رس)**
ewende gerawe - dirawe
ئەوەنـدە ئەملاوئـەولای کـردوە زۆر شـت فێربـووە، مایەی سەفەر زۆر فێربوون وقاڵ بوونە،

**ئەوەندەی بلێی یەک ودوو (ئد.ناک)**
ewendey bilêy- yekw dü
بەپەلە، بەهەناسەیەک، زۆربەخێرایی، زۆر زوو.

**ئەوەندەی مست لەچاوان دەی (ئد)**
ewendey mist le- çawan dey
بەتوند وتۆڵی، بەخێرایی، زوو بەزوو.

**ئەوەی (ن.ج)** eweney
ئەڤێ، ئەوشتە یا ئەو کەسەی کە...، ئەوهەی، ئەوی.

**ئەوەیان (ف)** eweyan
ئەم یەکە لەوچەندانە، لەوچەندانە ئەم یەکە.

**ئەوی (ج)** ewî
هەرچی، هەرکەسێک، هەرکێ.

**ئەویانە (ن، ج .ناک)** ewyane
١- ئەوەیان، بۆ (ئەو)ێک لەنـاو کۆمـەڵی (ئـەو)دا.
٢- ئەو جێگەیە، ئەوجێیە، ئەو نزیکە.

**ئەوی بترسێ، ناخەلەسێ (پن)**
ewî bitirsê naxelesê
ئەوکەسەی بترسێ، لەمەترسیی ڕزگاری نابێت، واتە: تووشی ناڕەحەتیی ئەبێ یان ئەمرێ.

**ئەوی بەبابێت، بەباران ئەڕوا (پن)**
ewî be babêt be- baran erwa
ب(ئەوی زوو دێت،زووش ئەڕوا).

**ئـەوی بـەخۆتی ڕەوانـە بینیت بۆخەڵکیشی ڕەوابینـە (پن)**
ewî bexotî rewa ebînît bo xelkîşî rewabîne
بەو جۆرە ڕەفتار بکـە، کەدەتـەوێ خـەڵک ڕەفتـارت لەگەڵ بکات.

**ئەوی بەرزبفڕێ، نزم ئەنیشێتەوە (پن)**
ewî berz- bifrê. nizim enîšê tewe
ئـەوێ بڵنـد بفـڕت وێ نـزم بکەڤـت، لـووت بـەرزیی، لووت شکانی لەدوایە.

**ئەوی تووی درک بچێنێ، تاماوە گوڵ نابینێ (پن)**
ewî- towî dirk bicênê. tamawe gulnabînê
ئەوی چاکـەی لێ ئەوەشـێتەوە، شـایانی میهرەبـانی نییە.

**ئەویچ (ج.هو)** ewîç
ب (ئەویش).

**ئەوی حوشتر ەوانیی بکـا، ئەبێ سەر دەرگاکەی بڵنـدکا.. (ج.هو)**
ewî huštirewanî bika ebêserdergakey - bilindka
ئەگەر بووی بەهاو خـوانی دێـو، ئـەبێ کەوچکەکـەت درێژ تر بێ، دەستت دایە هەرکارێک بەپێی ئەو کارە خۆت ئامادەبکە.

**ئەوی دۆست بەدۆستی ئەکا، دوژمن بەدوژمنی ناکا (پن)**
ewî dost be dostî eka, dujmin bu büjminî naka
پیاو نابێ گلەیی لەبیگانە بکا، چونکـە هـەر دۆسـتی خۆتە خراپەی زیاترت بەرامبەر ئەکات.

**ئەوی زوو دێت، زووش دەڕوا (پن)**
ewî zu dêt, zuš- derwa
ئەوپارەیەی بەئاسانی دێتە دەس، بەئاسانی لەدەس دەردەچێ، زوو بێت، زوو دەڕوات (ماڵی دنیا..).

**ئەویش (ج)** ewîš
ئەویچ.

**ئەوی زۆر بڵێ، چاکیش دەڵێ وخراپیش (پن)**
ewî zor- bilê çakiš delê w xirapîš
زۆربڵێ هەڵەش دەکا.

**ئەویکە (ن.ئان)** ewîke
ئەڤـێ دیـتر، ئەوەکـەی تریـان، ئەوەکـەی دیکـە، ئەوەکەی کە، ئەوەکەی کەیان، ئەویتر، ئـەوی دیکـە، ئـەوی دیـی، ئـەوێ دی، بـۆ دیـاری کردنـی شـتێک لەناوچەند شتێکی هاوچەشنی خۆیدا بەکارئەهێنرێ.

**ئەوی لای دیزەوەدانیشێ، ڕەش ئەبێ (پن)**
ewî lay dîzewe danî š ê. re š ebê
هاوڕێی خراپ، خراپەت ئەهێنێتەڕێ.

**ئەوی لەبەرچاوانە، لەبەردڵانە (پن)**
ewî leber- çawane, leber dilane
ئەوی لەبەرچاوان نیەیە، لەیاددانیەیە، هەرکەسێ یـان هەرشـتێ لەبـەر چـاو نـەبێ لەوانەیـە، زوو لەبـیر بچێتەوە.

**ئەوی لەدیزەدابێ، بەئەسکوێ دەردێ (پن)**
ewî le - dîzeda bê, be eskwê derdê
ئەو شتەی لەدڵدابێ، زمان دەری دەبڕێ، لەکۆتاییـدا هەموو نهێنییەک دەردەکەوێ.

ئەوی منارە بدزێ، کیفیشی بۆ دەکا (پن)
ewî minare- bidzê, kîfîšî bo deka
هەرکەسێ دزی بکا، ئەبێ بزانێ چۆن ئەیشارێتەوە.
ئەوین (ن) [1] ewîn
ئەڤین، دڵداریی.
ئەوین (ن) [2] ewîn
ئەبین، خۆشەویست، دۆست، دولبەر.
ئەویندار (ن) ewîndar
ئاشق، ئەڤیندار، دڵدار.
ئەوینداریی (ن) ewîndarî
ئاشـقیی، ئەڤـینداریی، ئەڤـینیی، ئـەوینیی، حـەز لێکـەریی، خۆشەویـستیی، دۆسـتایەتیی، هەڤـینیی، هەوینیی.
ئەوینیی (ن) ewînî
ب (ئەوینداریی).
ئەوی هێلکەیەک بدزێ، گایەکیش دەدزێ (پن)
ewî- hêlkeyek bidzê, gayekiš dedzê
ئەوی شتێکی بچووک بدزێ، شتی گەورەش دەدزێ.
ئەوێ (ئاک) ewê
ئوچـە، ئـەورە، ئەوێنـدەرێ، ئەیـنـە، ئێرەنـا، ئـەوێ، ئێندەرێ، بەرامبەری ئێرە، دەراهـی، ڤـێ دەرێ، وێ، وەردێ، وێ، ویرێ.
ئەوێستاکە (ئاک) ewêstake
هەمانهۆ، هبـ(ئێستا).
ئەوێیانە (ئاک) ewêyane
ئەو شوێنە (نزیک).
(لە)ئەوێیانە (ئاک) (le)ewêyane
لەو شوێنە
ئەها!(نسپ) [1] eha!
ئەما، ئەهاما، ئـەهای، ئـەهاو، ئـەو، ئـەهۆی، ئـەهێو، هۆو، هۆی!.
ئەها!(نسپ) [2] eha!
باشە، هەلاو!.
ئەهێو!(نسپ) chêw
ئـەحێو!، ئـەهوو!، بـڕواناکـەم!، تـڕحێو!، گومـانم هەیە، وانیيە!.
ئەی!(نسپ) [1] ey!
١- های!، هەی!، هۆ، هۆو (بۆ سەرنج ڕاکێشان).
٢- ئای! (بۆ بانگێ کردنێکی تێکـەڵ بـەئازار، تـرس، خەفەت، سەرسوڕمان..).
ئەی (ئاک، نسپ) [2] ey
١- ئەدی، ئەیی، بەڵێ، هەی.

٢- دروستە، ڕاستە، وایە. ٣- ئەدی.
ئەی (ئاک، ئپ) [3] ey
مەگەر
ئەیارە[بۆ پیوان وکێشان] (ن) eyare
١- ئەیار، پیوانە، حەیارە، عەیارە.
٢- عەیارەی زێڕ یان زیو، یان پاکیی زێڕ وزیو.
٣- عەیارەی چەک..
ئەیاغ (ئان،کی) [1] eyax(ki)
بێ برەو، چروک، قرپۆک.
ئەیاغ (ن) [2] eyax
جەرەتاوی ئاودەستخانە،ڕەهەند.
ئەیباتە سەرکانیی وئاوی نادا (رس)
eybate ser kanî- w awî nada
ئـەیبابۆ سـەرکانی ویـەتینویتیی ئەیهێنێتەوە — پیاوێکی نێزان وفێڵبـازە خـۆی چی ئـارەزوو بـێ، ئەوەت پێ دەسەلمێنێ.
ئەی پاییزە برا، مەرحەبا! (رس)
ey payîze bra. - merheba
بـە (هـاوڕێی نیـوەڕێ)دەوتـرێ، بەیـەکێک دەوتـرێ تانیشێکی ئەبێ ئەیەتەلات.
ئەیرۆ (نسپ) eyro
١- ئـەیـەڕۆ، بەداخـەوە، حـەیفێکم، داخـانم، داخـم ئـاچێ، داخـی داخـانم، داخـی گـرانم، هـەی ڕۆ (بـۆ دەربڕینی ناهەمواریی تێکەڵ بەسەر سوڕمانەوە).
٢- چەند عەیبە، شوورەییە!، شەرمەزارییە.
ئەیڤەزاندن(کتپ،کی) [2] eyvezandin(ki)
١- دانان(شت بەڕێکیی)، ڕاسـت کردنـەوە(شـت..)، دامەزرانـدن. ٢- خـستنەژێر دەسـت، ڕەخـساندن، هێنان، هێنانەبەردەست (لەسەرداخوازیی).
ئەیلۆ (ئان) eylo
جوانکیلە، قشتیلە.
ئەی نا! (ئاک،پر) eyna
با، بەدڵنیایی، بەڵێ، بۆنا؟، چۆن نا؟.
ئەینی (ن،کی) eynî(ki)
ئین، ئینیی، (ڕۆژی) جومعە، حەوتـەم ڕۆژی هەفتـە، هەینو، هەینی.
ئەیوان (ن) eywan
سەکۆی سەرگیراو، هەیوان.
ئەیەوێ بدا لەئاو، لاقی تەڕنەبێ (پن)
eye wê bda- leaw laqî ter nebê
ب (ئەیەوێ ماسی بگرێ ولاقی تەڕ نەبێ)

ئەیەوێ ماسی بگرێ لاقی تەڕنەبێ (پن)
eyewê masî- bigrê w laqî ter nebê

١- ئەوەی ماسی بگرێ دەبێ قوونی تەڕبێ. ئەیەوێ بدا لەناو لاقی تەڕنەبێ. ئەیەوێ گەنجی دەس کەوێ بەبێ ڕەنج، ئەوی بیەوێ میوە بخوات، ئەبێ بەدارا سەرکەوێ. ٢- بەکاردەهێنرێ بۆ یەکێکی: تەفرەدەر،فێلاوی، فێلباز، لەخشتەبەر.
٣- مەبەست مرۆڤی (نێزان، زیرەک..)ە.
٤- جانانە، درۆزن، دووزمان، زمان بەد.

ئەیی (ئپ،ئاک) eyî
کەوابوو، کەوایە.

ئی (ب) îy
هی، وشەی موڵکایەتیی.

ئیتر (ئاک،ئپ) îtir
١- ئیدی، ئیدیی، ئیدی، ئیدیکە، ئیکە، دیکە، هیتر(هیتر). ٢- پاشان، پاشی،پاشیین، دپشت قە، دوایە، دوایی، دۆتر، کاتێکی تر، لەپاشان، لەمەودوا، لەمەولا.
٣- لەوەپتر، لەوەزیاتر، لەوەزیدەتر.

ئیتر بۆی بڕۆ (ئد) îtir boy biro
ئێکەوێی تریش، هەتابنەبان، هەتاهەرەدوایی، هیکەوەی تریش.

ئیتر بەسە! (ئد) îtir bese!
ئیتر بڕۆ بەڕێگەی خۆتەوە، ئیتر واز بێنەو بڕۆ چیت ویست کردت.

ئیتریس (ئان) îtirîs
جێ قین، خوێن تاڵ، ڕەزاگران.

ئیخ خواردن (کتن) îx-xwardin
چۆک دادان (وشتر).

ئیدیۆم (ن،ری) îdyom
١- ڕاوێژ، زاراوە، زاناو، شیوە، فرێزۆلۆژیی ئاناسا، گۆیش. ٢- زمان وزاراوەی ناوچەیەک کەکەسێک لەمنداڵییەوە فێری بووبێ، جۆری وشە، شیوەی وشەسازیی. ٣- زاراوەیەک کەخۆبەخۆ نەگونجاوبێت لەبارەی ڕێزمانەوە(ئەگەروشەکانی لێک جیابکرێنەوە). ٤- سروشتی زمان وقووڵێیەتیی تایبەتیی ئەوزمانە.
٥- ڕێگای سانایی لێک بەستنوڕێکخستنی وشەی زمانێک بۆ دەربڕینی بیبر.
٦- مەبەست زاراوەیەکی وەرگیراو یاچەند وشەیەکی لێکبەستراو، یان شێوە ڕاوێژێکی نەگونجاوە لەگەڵ نموونەی زماندا، بەسەریەکەوە واتایەک دەبەخشێ جیاوازە لەگەڵ واتای وشەبە وشەی زاراوەکەدا.
٧- ئیدیۆم بریتییە لەچەند وشەیەک کە بەسەریەکەوە بەکارهێنران واتایەک دەبەخشێ جیاوازە لەگەڵ واتای یەکەیەکەی ئەو وشانەی ئیدیۆمەکەی لێ پێک هاتووە.
٨- واتە: ئیدیۆم بریتییە لەچەسپاندنی واتایەکی نوێ بەسەر کۆمەڵێ وشەی لێکدراودا کەلەوەپێشتر هەروشەیەک لەو کۆمەڵە واتای تایبەتی خۆی هەبووە.

ئیدیی (ئاک،ئپ) îdî
١- ئەنجا، پاش ئەوە، دوای ئەوە.
٢- جارێکی تر، جارێکی دیی.
٣- ئەودەمەی، ئەودەمی، ئێکە، جا، دەجا، دەسا، سا، هنگافی، هەنگینێ هەینی.

ئیرمان (ن،لو) îrman(lu)
بەردەست، خزمەتکار، خزمەکار، ژێردەستە، نۆکەر.

ئیرۆهە (کتن،کی) îrohe(ki)
ئەم ڕۆژە، لەم دەمەدا.

ئیرەتیی (ن) îretî
لاوازیی، لەڕیی.

ئیرەتیی بوون (کتن) îretîbün
بەناوداچوون، لاوازبوون،لەڕبوون.

ئیزا (ن) ١ îza
پاداش، پاداشت، قەرەبوو.

ئیزا (ن) ٢ îza
تۆڵە، سزا.

ئیزبار (ئاک) îzbar
چاوبەچاو، ڕووبەڕوو.

ئیزرائیل (ن) îzraîl
پێمیرد، عیزرائیل، فریشتەی گیان کێشان.

ئیزۆک (ن،پز) îzok
زیبکەی شیریی کەلەدەموچاوی منداڵان دێت.

ئیست (ن) îst
پشوو، پشوویەک، چاوترووکانێک، دان بەخۆداگرتنێک، بچووک، کاری (وازهێنان لەئاخاوتن، ئیش، بۆ ماوەیەکی کەم)، مۆڵەتێک، وچانێکی کەم، وەستانێکی کەم، هەڵوێستانێکی کەم، هەناسەیەک.

ئیست گرتن(کتن) îstkirdin
ئارام گرتن، ئیست کردن، پشوودان، دان بەخۆدا گرتن بۆ ماوەیەکی کەم، لەنگێ کردن، وچان دان، وچان گرتن، وەستان بۆ ماوەیەکی کورت، وێستان بۆ تۆزێک، هەڵوێستان بۆ مەودایەکی کەم.

**ئیستگە** (ن) [1] îstge
١- ئیزگـە، ئیـستگە، پۆسـکە، پۆسـگە، جێگـەی ڕاوەسـتان، شـوێنی ڕاوەسـتان، ویـستگا، ویـستگە، مەلویـستگە. ٢- ئیزگـە، ئیـستگە(تـەلەفزیۆن، ڕادیۆ...)، جێی بلاوکردنەوەی دەنگ وباس.

**ئیستگە**(ن) [2] îstge
بنکە، بنگە، بنە، ڕوانگە.

**ئیستەرەم** (ئاک) îsterem
بەپەلە، بەتاو، خێرا، دەست بـەجێ، دەم ودەست، دەم ودەلئاست.

**ئیستەرەم** (ئان) îsterem
ئیزدەرەم، سوور لەسەر کردنی شتێ.

**ئیستیکان** (ن) îstîkan
ئیـستکان، ئیـسکان، پـیالەی چـا خواردنـەوە. هب(پیالە)

**ئیسر** (ن) îsir
شوێنی گوشینی ترێ ومیوەی تر، گوشینگە.

**ئیسرائیل** (ن) îsraîl
ئیسرائیل، { ولات،مەلوەند،ئیشتیمان}ی جوولەکە.

**ئیسک** (ن) îsk
١- ئیسکە، نزگەرە، نیزگەرە.
٢- ئیسکۆتکە، هەنسک.

**ئیش** (ن) îš
١- پیشە، شۆل، شوول، فەرمان، کار، کردار.
٢- تەقەلا، خەبات، کۆشش.
٣- بەر، بەرویۆ، بەرویووم، بەرهەم.
٤- تیکەلیکە، چارە، چارەسەر.
٥- دەستکرد، دەسکرد، کر، کردە، کردەیی.

**ئیشار** (ن) î š ar
چارۆکە، کۆلوانە.

**ئیش بەدەس** (ن) îš bedes
فەرمابنەر، کاربەدەست، مووچەخۆر.

**ئیشت** (ن) îšt
ئیش، شەپـازلە، شەپـەزلە، شەپـەزلەی(پـشت مـل)، شەپەلاخ.

**ئیشتیا** (ن) îštiya
ب (ئارەزوو/١).

**ئیشتیابوون** (کتن،کتپ) îštiyabün
ئیشتیهابوون، دڵ چوونەسەر..

. **ئیشتیا کردن**(ن) îštiya kirdin
ئارەزووکردن، ئیشتیهاکردن.

**ئیشتیا لێبوون**(کتن) îštiyalêbün
ئیشتیهالێ بوون، حەزلێ بوون، حەزلێ کردن.

**ئیشتیانە بردن** (کتن) îštiya nebirdin
١- ئیـشتهانەبردن، حەلێنـەکردن، دڵ نـەبردن (خواردەمەنی). ٢- حەز بەخواردن نەکردن.

**ئیشقلکێ** (ن) îšqilkê
هەنگەشەلە،هەنگلەشەلێ.

**ئیشک**(ن، ئان، کی) îšik(ki)
١- تـەڕایی تیانـەماو، حیـشک، وشـک، ویـشک، هەوشان، هیشک، یشک.
٢- زوها، وشک هەلاتوو، وشکەلاتوو، وشکەوەبوو.
٣- ئیـشکەسال، بـێ بـارانیی، سـالێکەم بـاران، سالیکی وشک، کەم بارانیی.
٤- پـۆرخس، ڕووتـال، ڕووتـرش، وشـک وکـەم دوو (مرۆڤ).
٥- دانیشتنی دۆست وبرادەران بـەبێ خواردنـەوەی بادە، داوەتێکـی سـارد وسڕ(لەبەرنـەبوونی ئـارەق، شەراب بۆ خواردنەوە)، میوانداریتی سارد وسڕ.
٦- بێ پیخۆر، نانی ئیشکیی، نانی وشکیی.
٧- ڕەق، ڕەق وتەق.
٨- بێ شیر(ژن، بزن، مەڕ).
٩- داچلەکاو، سلەماو، سلەمیو.

**ئیشکارۆ** (نل،کی) îškaro(ki)
بیابـانی بـێ ئـاو، بێـروون، مەلبەنـدی بـێ ئاووگیـا، وشکانیی، وشکایی، وشکایەتیی.

**ئیشکانیی** (ن) îštkanî
ئیـشکایی، جێگاوشـکەکانی سـەرزەوی، وشـکایی، زەوینی پەنائاو.

**ئیشکانیی** (ن) îškanî
بەژ، بیابان، چۆل. هب (ئیشکارۆ)

**ئیشکاو** (ن) îškaw
دواچۆڕی ئاو

**ئیشکاوداهاتن** (کتن) îškaw dahatin
ب (ئیشکاوهاتن).

**ئیشکاوز** (ن) îškawiz
ئیـشکاوس، تـۆویی بەوشـکەوەکراو، خـەفتان، وشکەوەرد.

**ئیشکاوهاتن** (کتن،ئد) [1] îškaw hatin
١- ئیـشکاوداهاتن، برانەوەونـە ڕۆیـشتنی ئـاو بەجۆگـەدا، دواچـۆڕلێ بـڕان، وشـک بـوون، وشـک داهاتن(کانیاو). ٢- دوایی هـاتن، کۆتـایی هـاتن، نەمان (پاشەکەوت، دەستمایە..).

**ئیشکلوهاتن** (کتن.ئد) îškawhatin[٢]
دەم داخستن، قروقەپ کردن، قسەپێ نەمان، نقەتیانەمان، نقەنەکردن، ورتەلەبەربڕان.

**ئیشک بوون** (کتن، ئد) îškbün
١- تەڕایی تیدانەمان، سیس بوون، وشک هەڵاتن.
٢- وشک بوون، وشک هەڵهاتن( داروبرەخت..). ٣- حەبەسان، واق وڕمان.

**ئیشک بوونەوە** (کتن، ئد) îškbünewe
١- کزبوونەوە، لەتەڕیی ڕزگاربوون، لەتەڕایی قوتاربوون، ووشک بوونەوە( جل وبەرگ، زەویی وزار..تاد).
٢- وشکانیی پەیدابوون لەسەر زەویی.
٣- جووڵەلێ بڕان، قەتیس مان.

**ئیشک کردن** (کتن.کتپ.ئد) îšk kirdin
١- تەڕایی تیدانەهیشتن ( لەشتیکدا کە خۆی تەڕایی هەبێ)، لەتەڕیی ڕزگارکردن، وشک کردن. ٢- خێر لەکاریک یاشتیک بڕین، خێر لێ بڕیین، کەڵکە پیوەنەهیشتن.
٣- شیربڕان (لەمەمکی ژن...، گوانی بزن، مەڕ..تاد)، لەشیردان وەستان (شیردەر).

**ئیشک کردنەوە** (کتپ.ئد) îšk kirdinewe
لەتەڕایی قوتارکردن، وشک کردنەوە.

**ئیشک وبرینگ** (ئان) îškwbring
تەڕایی تیانەماو، تەواو وشک وبرینگ، هەر ج شتێ هیچ تەڕایی تیدانەمابێ.

**ئیشکە** (ئان.ن) îške[١]
قسر، نەزۆک، وشکە (مەڕ، بزن، مانگا.. تاد).

**ئیشکە** (ن) îške[٢]
دواکاتی ژیان.

**ئیشکە** (نک) îške[٣]
(پارەی) پاشەکەوت کراو، لەلاوەدانراوو، نەخرابیتە سەوداو مامەڵەوە، نوستوو.

**ئیشکەر** (ن) îšker[١]
ئەوکەسەی کاردەکا، ئیش لیهاتوو، بەکار، کارکەر.

**ئیشکەر** (ن) îšker[٢]
کۆلە، هب (بەردەس).

**ئیشکەڕن** (ن) îške̱rin[١]
١- کاری بڕینەوەی خوریی مەڕوموویی بزن، کاری ڕنینەوەی خوریی ومووی پیستی مەڕو بزن، وشکەڕن. ٢- خوریی یان مووی: دەسکەنەکراو، ڕنراو( لەکاتی مەڕ بڕینەوەدا).

**ئیشکەڕن** (ن) îške̱rin[٢]
سوعبەت، گاڵتەجاڕ، گەمە، یاریی.

**ئیشکەڕن کردن** (کتپ.ئد) îške̱rin kirdin
١- بڕینەوە، ڕنینەوە، وشکەڕن کردن ( خووریی یان موویی کەوڵی مەڕ وبزن).
٢- بنبڕکردن، لەبن وبیخ دەرهێنان، لەڕەگ وڕەگیشە دەرهێنان (گژوگیا...).
٣- مووی لەش پاک کردنەوە بێ تەڕ کردن یان خووساندن.

**ئیشکەڕۆ** (ئان.ن) îške̱rio
گران ڕەوت، یەک سمی فیرە ڕەوت نەکراو( ئەسپ).

**ئیشکەساڵ** (ن.) îškesa̱l
ب (ئیشک /٣).

**ئیشکەسۆفی** (ن.، ئان.) îškesofî
بەرماڵ لەکۆڵ، پیاوی خوا، سۆفییەکی زۆر بەدین، سۆفی کەللەڕەق، گۆشەگیر، وشکەسۆفی.

**ئیشکەسۆفی** (ئان.ن) îškesofi
حیلەباز، ساختەچیی، سۆفیەدرۆزنە، کەسێ واخۆی دەربخا کەسۆفیەوئاکاریشی سۆفیانەنەبێ.

**ئیشکەسەرما** (ن.) îškeserma
بای سارد (بێ بەفروباران)، سەرمای بێ بەفروتەرزەوباران، سەرمای سەختی بێ بەفر، وشکەسەرما.

**ئیشکەکەلەک** (ن.) îškeke̱lek
ئیشکەبەرد، دیواری بەبەرد هەڵچناوی (هەڵچنراوی)بێ قوڕ، دیواری بەردی چین لەسەر چین بێ ئەوەی ناوکاری لەنیواندابێ، وشکەبەرد (چینی دیوار)، وشکەکەڵەک.

**ئیشکەڵ** (نک.لو) îške̱l(lu)
چاوگە، چروچیلکە، چیلکەوچەواڵ، لق وپۆپی وشک بوو، وشکەلق وچرۆکەبۆ سووتان دەبێ، وشکەڵ( داروبرەخت).

**ئیشکەڵوا** (ن.) îške̱lwa
وشکەحەڵوا، هەڵوای دۆشاو.

**ئیشکەمس** (ن.) îškemis
ئیشکەمز، ڕۆژانە، کرێ، کریی دەستیی بەبێ خواردن،مووچەی کریکار (کەنان خواردن... تاد لەگەڵ نەبێ).

**ئیشکەمس** (ن.) îškemis
کریکار (کەبەڕۆژانەی ڕووت کار ئەکات ونوستن ونان..تاد لەسەر شانی خاوەن کار نییە ).

**نیشک هه لاتن** (کتن) îškhelatin

ڕەق بوون، ڕەق هەلاتن، وشک بوون، وشک هەلاتن، وشک هەلهاتن.

**نیشک هه لاتن** (کتن) îškhelhatin

١- ڕەق وتەق ویاریک بوون، زەعیف بوون، لاوازبوون [لەبەرنەخۆشی( مرۆڤ )].

٢- کزبوون (لەبەرخەم وخەفەت)، لەخەم وپەژارەدا لاواز بوون، لەخەم وخەفەتان داکەوتن.

**نیشک هه لهینان** (کتپ) îškhelhênan

چەوساندنەوە وبرسیی کردن، خەم پێ دان وبوونەهۆی لاوازیی(کەسی)، لاوازکردن، وشک هەلهینان، وشک هەلهینان.

**نیشک هه لهینان** (کتپ) îškhelhênan

بەتەقالا وشک کردن، چەوساندنەوە، خستنەژێر ئەرکی گران

**نیشکیل** (ن) [1] îškêl

ئشکیل، پارچەتەختەیەکی سێ سووچە پەنجەرەی پێ قاییم دەکەن.

**نیشکیل** (ن.) [2] îškêl

ئشکیل، ئەشکیل، ئەلقەیازنجیر یاهەر شتیکی تر، کەدەست وقاچ(پاشوو پیشوو)ی ولاخی بەرزەی پێ دەبەستریتەوە، پیوەندە، پیوەنگ، کۆت.

**نیشکیل** (ن.) îškêl

دەستوور، دەستەلات، دەسەلات،فەرمان، یاسا.

**نیشکیل** (ن،ئان) [2] îškêl

سەدەفۆکەیەکی سپیی وەک گوێ ماسی وایە بەهاران پاش باران دەڕێتەوە، شەیتانۆکە، هیلکە شەیتانۆکە.

**نیشکیل کردن**(کتپ) [1] îškêl kridin

نیشکیل کردن، ئەشکیل کردن، پاشبەندو پیشبەند کردن، پیوەندکردن، پیوەنگ کردن، چوارپەل بەستن، چوارمیخەکردن، کۆت کردن( ولاخی بەرزە... ) .

**نیشکیل کردن**(کتپ) [2] îškêl kridin

خەریک کردن، ڕێ لیگرتن، کۆسپ لەبەردانان، کۆسپ هینانەبەر، گیروگرفت هینانەبەر.

**نیش گوزار** (ئان) îšgyzar

کارزان، کارگوزار.

**نیشک** (ن) [1] îšik

جۆری کەوایە، کورتە، کورتەک.

**نیشلک** (ن) [2] îšlik

ب (ئیلەک).

**نیش لەبەرنەڕۆیشتن** (ند) îšlik

بەلەش گرانیەوە نیش کردن، تەمەلیی‌کردن.

**نیش لەدەس هاتن**(کتن،ند) îš le des hatin

١- توانای کار ڕاپەراندن هەبوون،تین وتوانای کارکردن هەبوون، حەزکردن لەڕاپەراندنی نیش، خزمەت گوزار بوون.

٢- دەسەلاتدار بوون، کارامەبوون، لەکارزانیین.

**نیشی ئەمرۆ مەخەرە سبەینێ** (پن)

îšî emro mexere- sibaynê

ئەو کارەی ئەمڕۆ دەتوانی بیکەیت مەیخەرەسبەینێ. ئەو نیشەی دەتوانی ئیمڕۆ ڕاپەڕینیت هەرگیز دایمەنێ بۆ بەیانیی.

**نیشی تۆ نییە** (رس) îšî toniye

١- بۆتۆ نەهاتووە ئەوکارەبکەیت.

٢- خۆت لەونیشە.. هەل مەقولتینە(هەل مەقورتینە ).

**نیف!** (ئپ) îf

ئای چ باشە !، ئوویف !، بەهبەه !، پەک !، چ باشە !، چ جوانە !، زۆر پەسەندە.

**نیف** (ن،پز) îf

فێ، نەخۆشیی خودارپی، نەخۆشیی فیداریی.

**نیفاقە** (ن) îfaqe

دۆخی (چاک بوونەوە، چاکەوەبوون، خۆش وچاک بوونەوە، ڕاست بوونەوە، ڕاستەوەبوون، لەنەخۆشی ڕاست وچاک بوونەوە ).

**نیفاقە هاتن**(کتن) îfaqehatin

لەنەخۆشی چاک بوونەوە(ڕاست بوونەوە، هەستانەوە، هەستانەوە، هەلسانەوە ).

**نیفتادە** (ئان،لو) [1] îftade(lu)

بەتەمەن، پەک کەوتە، پیر، عەمەل مەندە، عەمەل مەنگە، کەفتەکار(لەبەرتەمەنی دریژ).

**نیفتادە** (ئان،لو) [2] îftade(lu)

بەزیو، ژێرکەوتوو، شکاو، کۆل پێ دراو، کۆل داو، کەوتوو(لەشەڕدا.. ).

**نیفتادە** (ئان) [3] îftade

چەماو، خۆبەکەم زان، خۆ بەکەم گرتوو، دل نزم، سەربەکزگرتوو، سەرچەماو، سەرکز.

**نیفچیی** (ئان) îfçî

بەرچەپ، پاشماوە خۆر، مشەخۆر، هەل پەرست، هەلمەتەکاسە.

**نیفلیچ** (ن،پز) îflîç

شەپلە، شەپلەلیدراو، گۆج.

ئیفلیجی (ن) îflîcî
شەپلە، نەخۆشیی شەپلە، گۆجیی، گیرپی.
ئیفنۆتە (ئان،کی) îfnote(ki)
١- بەتین، بەهێز، تیندار، ساغ، لەش ساغ، هێزدار.
٢- باش، پان وپۆر، تێک سمراو، چوارشانە، خەپـان، دارشتوو(خۆ)، داگرتیی، قەڵەو.
٣- بەجێ(تەن)، پڕپیز، تەن دروست، چاک (لەش).
ئیقل (ئان،ئاک) îqil
هەر ئەو تۆزە، هەرئەوەندووکە.
ئیکلام (ن) îklam کرنووش.
ئیکلام کردن (کتن) îklamkirdin
کرنووش بردن (بۆ کەسێ).
ئیکو (ئاک) îko
چاوا، چلۆن، چۆن، کوو.
ئیکە (ئان) îke
ئیدیکە، هی تر، یادن.
ئیلان (ن) îlan
ئیلیان، ماڵی مەل، میلان، میلانە.
ئیلان وبیلان (ئد) îllan w bîllan
پـێ داگریـی وسـووربوون، هـەر دەبـێ ئەوشـتە یانـەوکارە بکریـت، هـەردەبێ ببیـت(کـار..)، هـەر دەبێ وابێ، هەر دەبێ هوو بێ.
ئیمالە (ن) îmale
حوقنە، دەستوور.
ئیمچون (نک،لو) îmçün(lu)
دەست وپەل، هەرچوارپەل.
ئیمشەو (ن،ئاک) îmšew
شەوی رابردوو(کاتێ لەبەیانیدا باس بکرێ).
ئیمشەو (ن،ئاک) îmšew
ئەمشەو (کاتێ لەپاش نیوەڕۆدا باس بکرێ).
ئینان (ن) [٢] înan
متمانە، هب: (باوەڕکردن).
ئینان کردن (کتن،کتپ) înan
متمانەکردن، هب (باوەڕکردن).
ئینانەوە (کتپ) [١] înanewe
دانـەدواوە(شـت)، دانـەوە(شـتومەک)، زڤـڕاندن، ئەزاڤراندن،ڤـەگەڕاندن، گەڕاندنـــەوە، گێڕانـــەوە، هێنانەوە.
ئینانەوە (کتپ) [٢] înanewe
پەشیمان کردنەوە، دڵ ساردکردنەوە.
ئینتەلا (ن،پز) întela
ترخە، تورخە، زۆرخۆریی، گرفت لەبـەر زۆر خـۆریی، گەدەقورس بوون لەبەر زۆر خۆریی کردن.
ئینتەلاکردن (کتن) întelakirdin
ترخـەکردن، تورخـەکردن، زۆرخـواردن، زۆرخـۆریی کردن، زیا خۆریی کـردن، گـەدە قـورس بـوون لەبـەر زۆر خۆریی کردن.
ئینجانە (ن) încane
دەفری گڵین بۆ گوڵ تێدا چاندن، گوڵدان، گوڵـدانکە، هنجان، یەخسیی.
ئینجە (ن) înce
پەڕەکە، پەڕەکەی ماسیی، پەڕەی ماسیی، فینجـە، کەوانەی ریشەدار، نگۆڵێ.
ئینجەت (ن) încet
ئەنجەت، بەهانە، پەڵپ.
ئینجیل (ن) încîl
ئینجیل، کتێبی پیرۆزی فەلان.
ئینکەبەریی (ن) înkeberî
ئینکێریی، گوێ نەبیستی، لاساریی.
ئینکەبەریی کردن (کتن، کتپ) înkeberî kirdin
ئینکێریی کردن، بێ گوێی کـردن، گـوێ پـێ نـەدان، لاساریی کردن.
ئینە (جن،هە) [١] îne(he)
ئەوانە، هب(ئەمانە).
ئینە (ج،هە) [٢] îne(he)
ئەم یەکە، هب(ئەمە).
ئینەشا (ن،.ج،هە) îneša(he)
ئائەوەیان، ئەوەتانێ.
ئینیی (ن،.کی.) [١] înî(ki)
ب (ئەینی).
ئینیی (ن،کی) [٢] înî(ki)
حەفتە، حەوتوو، هەفتە.
ئیوا (نسب) îw!
عیو!.
ئینیلە (ج،ئاک) înêle
ئەوەکان، شتەکان، کەسەکان.
ئێ (ئاک،ئد) ê
١- بەڵێ وایە، راست دەکەیت، هوویە.
٢- بەڵێ گوێم لێیە.
٣- بویژە، پێم بڵێ، دەقسەبکەدەی، واچە.
٤- بەردەوامبە!، تەواوی کە، لەسەری برۆ.
٥- وەرە!، وەرەبەرێوە.
ئیتۆن (ئان) îton
شڤرەشکە، کۆرە، کوێر، نابینا.

**ئێتیم (ن،کی)** êtîm(ki)
بێ دای وباب، بێ دایک وباوک، بێ دایوباب، سێوی، هەتیم، هەتیو.

**ئێجگار (ئاک)** êcgar
١- ئێجگارەکی، ئێجگاریی، ئێکجار، یجگار، ییگجار، یەجگار، یەکجار، یەکجارەکیی، یەکجاریی.
٢- بێ شومار، تاڕادەیەکی زۆر، زۆر، زۆر وزەبەند، زۆرو زەمەن، زێرە، فرە، گەلەک، گەلێک، مشە.

**ئێجگارەکیی (ئاک)** êcgarekî
١- ئیترقەت، بەتەواویی، بەتێکرایی، بەجارێ،بێ وەگەڕان ودوو پات کردنەوە، هەرگیز، یەکجاریی.
٢- بەردەوامیی، هەمیشەیی.

**ئێچک (ن)** êçk
پارچەیەدلر یان ئاسنە گوریسی پێ شەتەک دەدرێ، چاکل، چاکلە، چاکول، چەلەم، چەلەمە.

**ئێختە (ئان)** êxte[1]
ئەختە، خەساو، خەسەک، خەسیاکێ، خەسێنراو، گون دەرهاتوو، گون دەرهێنراو، یەختە، ییختە(ئەسپ، ئێستر..).

**ئێختە (ئان)** êxte[2]
بۆرەپیاو، بۆرە زەلام، تیک سمراو، زرتەبۆز، شینەزەلام، کەتە، لۆزەندەر، لۆزەنگەر، ناوشان پان.

**ئێختە (ئان،ن،رو)** êxte[3]
ب (ئەختە).

**ئێختەرمە (ن)** êxterme[1]
ئەسپ وچەکی تالانی، ئەسپی لەدوژمن گیراو، چەک وکەل وپەلی دوژمن کەدەستی بەسەردا دەگیرێ بەزۆر، دەستکەوت، دەسکەوت،یەختەرمە، ولاخی بەرزەی براو یا دزراو.

**ئێختەرمە (ن،مزا)** êxterme[2]
ئەسپی دوای سوار، ئەسپی یەدەکێ، ئێدەکێ، ئیدەکێ،ئێردەکێ، یەدەکێ.

**ئێختەکردن (کتب)** êxte kirdin
١- ئاختەکردن، ئەختەکردن، خەساندن، گون دەرهێنان، گونەوێلە دەرهێنان، یەختەکردن، ییختەکردن (ئەسپ،ئێستر..).
٢- لەپیاوەتی خستن، لەگیف وگوڕخستن، لەهەراو هوریا وگوڕخستن، لەهەڕ وگیف خستن.
٣- بەیدەست کردن، ژێردەست کردن، هێنانەبەرپار، هێنانەژێر بار.
٤- ڕامێنان، کەویی کردن، مالیی کردن.

**ئێخستن (کتپ)** êxistin
بەئەرزادان، بەزەویدا دان.

**ئێخسیر (ن،ئان)** êxsîr
١- بەیدەست، دیل، گراولەشەڕ، گیراولەجەنگ، یەخسیر، ییخسیر. ٢- بەند، حەپس، گرتوو، گیراو
٣- بێ دەسەلات، دەستێ وپێ سپی، دەم چەوت، هیچ لەباردانەبوو.
٤- جێگەی بەزەیی، داماو، لێ قەوماو، هەژار.

**ئێدن (ئاک،لو)** êdin(lu)
دووبارە، هەیدی، هی دیکە.

**ئێر (ن)** êr
جێگا، جێگە، شوێن.

**(ژ)ئێر (ن،ئاک،کی)** êdin(ki)
لەباتیی، لەجیاتیی، لەجێگای، لەجێگەی، لەشوێن.

**ئێراق (ئان)** êraq
بەربەڕۆچکە، بەرۆژ، بەرەوڕۆژ، بەرهەتاو، ڕوو بەرەوهەتاو، جێگەی خۆ هەڵخستن لەبەرهەتاو.

**ئێروو (ن)** êrü
ئیروو، بژیو، پێداویستی ماڵ، تروتفاق.

**ئێرە (ئاک،ن)** êre
ئەگرە، ئەگرەتە، ئەم جێگە، ئەمێ، ئەیرە، ئێرا، ئێرانە، ئێروکانە، ئێروکە، ئێرهە، ئێرەکانە، ئێرەکانێ، ئێرەکە، ئێگە، ئێمکە، ئێندا، چوندە، فرێ، فێرێ، لەمێ، لەیرە.

**ئێرەتیی (ئان)** êretî
١- ئاشقۆرت، دالگوشت، زراف، لاواز، لەڕ.
٢- بێ تین، کەم تین، مردگێ.
٣- چەمچوڕ، چیلاز، شیرمردە، مسریی.
٤- چرووک، زەعیف، نامەحکەم، هلۆل.

**ئێرەق (ئان)** êreq[1]
بەل، ڕەپ، ڕەق، قیت، هەستاو، هەڵساو (ئامرازی نێرینە).

**ئێرەقان (ن،پز)** êreqan
یەرەقان، نەخۆشیی زەردوویی.

**ئێرەق بوون (کتن)** êreqbün
بەل بوون، ڕەپ بوون، ڕەق بوون، قیت بوون، هەستان، هەڵسان (چۆک).

**ئێرەق کردن(کتپ)** êreqkirdin
بەل کردن، ڕەپ کردن، ڕەق کردن، هەستاندن، هەڵساندن(چۆک).

**ئێرەکانە (ن،ئاک)** êrekane
ئاگرە، ئاگرەنە، ئەیردانە، ئێرانە، ئێرەکانێ، لەم

**بسته** (ن) [2] biste
پرۆم، کەپک، لوتکە (کێو).
**بسته** (ئان) [4] biste
بەرەللا، فەلیتە (مرۆڤ).
**بسته** (ئان) [5] biste
ئازاد، سەربەست.
**بسته** (ئان) [6] biste
تەلەکەباز، جامباز، فێلباز.
**بسته** (ئان) [7] biste
بەفیین، بوغرا، لەخۆبایی (بوو).
**بسته** (ن) [8] biste
توولێنە، سەبەتە (ئان).
**بستەلێ دان** (ند) biste lêdan
١- پـل تەقانـدن، چەقەنـەلێ دان(نیـشانەی کـەیف وخۆشـیی). ٢-تیزپـیوەکردن، دانەبـەر کلکـان، گالتەپێ کردن، گەە پێ کردن.
**بستەهی** (ن.کی) bistehî(ki)
برووغی، بوغرایی، ترودەعیـە، کـاری خۆخەلەتانـدن، فین، کەش وفشی، لووت بەرزی.
**بستی بە قەرز نادات** (ند) bistî be qerz nadat
١-دریغیی لێ ناکات.
٢- بۆی بلوێ هەموو شتێکی لێ دەکات.
٣- بۆی هەلکەوێ سواری دەبێت.
**بسک** (ن) bisk
ب (ئەگریجە).
**بسکۆک** (ن) biskok
ب (بسک).
**بسکە** (ن) [1] biske
بزە، تووکە، زەردەخەنە.
**بسکە** (ن) [2] biske
دلخۆشیی، ڕووخۆشیی، شادیی، کەیف خۆشیی.
**بسکە لیوەهاتن** (کتن) biske lêwe ahtin
بسکەی سمێل هاتن .
**بسکەی سمێل هاتن** (ند) biskeysmêl hatin
بسکە لیوەهـاتن، دەمـاخ سـاز بـوون، کـەیف خـۆش بوون.
**بسووت** (ئان) bisût
ئاگر بسین، پەلوختە، گرسین.
**بسین** (ن.کل) bisên(kl)
بکر، سەنیار، سینەر، کریار.
**بشکانن** (کتپ) [1] biškanin
پـشکانن، پـشکنیین، گـەڕان (بەشـوێن شـتێکدا)، گەڕیان.
**بشکانن** (کتن) [2] biškanin
بەنووکـەنووک گریـان، دەس بەنووکـەنووک کـردن، نووکەنووک کردن (وەک منداڵ).
**بشکوڕیین** (کتن) biškürîn
دەس بەڕێیشتن کردن، دوور کەوتنەوە.
**بشکوشک** (ن) biškûšik
خونچە (گوڵ)، شکۆفە، گوڵی دەم نەپشکوتوو.
**بشکوول** (ن) biškül
پشکوول، تەقن، چەرک، قوڕ، کوڕ، گیل.
**بشێر بشێر** (ئاک) bišêr biêšr
١- بەبەردەوامیی، بەرەودوا، یەک لەدوای یەک.
بێ پچڕان، هەمووکات، هەمیشە.
**بشێونە** (ئان) bišêwne
پشێونە، تێ چین، شوفان، مایەفیتنە.
**بڤ** (نسپ) biv
ب (بڤە).
**بڤار** (ن.کی) [1] bivar(ki)
ب (بوار).
**بڤار** (ن.کی) [2] bivar(ki)
خـۆبینیی، خۆپەرسـتیی، خۆخـۆیی، خۆکـاریی، مـن منۆکێ.
**بڤر** (ن.کی) bivr(ki)
بیڤر، بیور، تەبەرە، تەڤر، تەور، تەورزین.
**بڤە** (ئان) [1] bive
١- پرمەترسیی، سامدار، سامناک، ترکزە، مۆلەکە.
٢- بزدینەر، ترساوەر، تۆقینەر، زراویەر.
٣- بکوژ، کوشندە، گیژەن، مرینەر.
**بڤە** (نسپ) [2] bive
دەستی بۆمەبە!، مەکە!، وامەکە (ئاراستەی منـداڵ دەکرێ..).
**بڤێ نڤێ** (شر.کی) bivê nivê(ki)
بیێنەبێ، چارنێیە، دەبێ هەر وابێ.
**بکار** (ن) [1] bikar
بکر، بکـەر، بـەجێ هێنـەر، پـیکهێنەر، جێبەجێکـەر، ڕابوونەر، کارا، کردەر، هەلسەر، هەلسوڕێنەر.
**بکار** (ڕێ) [2] bikar(rê)
ناوی کارا
**بکوت** (ن) bikut
ژەنەر، لیدەر، وەشینەر.
**بکوژ** (ن) [1] bikuj
پـیاوکوژ، چـاو پـرلەخوێن، خـوێن ڕێـژ، خـوێنیین،

کوژەر، کوژەوە.

**بکوژ** (ئان) ٢ bikuj
بەتوانا، بەدەسەلات، توانا، خاوەن دەسەلات، دەسەلاتدار، لێهاتوو.

**بکوژ** (ئان) ٣ bikuj
کوشندە، گیژەن، مردناوەر، مرێنەر.

**بکوژوببڕ** (ئان) bikuj w bibir
بکوژ وببڕ، دڵ رەق و خوێن رێژ.

**بکەرب** (ئان) bikerb
ب (ئیسک قورس / ٣).

**بکێڵ** (ن) ١ bikêl̠
جفتیار، جوتیار، وەرزیار، وەرزێر.

**بکێڵ** (ئان) ٢ bikêl̠
دێکانیی، دێهاتیی، لادێیی.

**بکێڵگە** (ن) bikêl̠ge
زەمین، زەوی، زەوین، کێڵگە.

**بگار** (ن) ١ bigar
ب (بوار).

**بگار** (ن) ٢ bigar
رێگا، رێگاو بان، رێگە.

**بگار** (ن) ٣ bigar
بوارە، دەرفەت، کەلێن، ماوە.

**بگاردن** (کتن) ٣ bigardin
بگێرانــــن، تێـپەڕاندن (ژیـانێکی سـانایی وپــر کامەرانیی)، تێپەڕکردن، گوزەراندن.

**بگاردن** (کتپ) ٤ bigardin
بەئەنجام گەیاندن، بەجێ هێنان، پێکهێنان، جێ بەجێکردن، راپەڕاندن (ئیش)، هەڵسوڕاندن.

**بگارەدان** (کتپ) bigaredan
بوارەدان، جێ بۆ کردنەوە، جێگاکردن، ماوەپێ دان، مۆڵەت پێ دان، واز لێ هێنان، هێشتن.

**بگربگر** (ن) bigir bigir
ب (بگرە ویەردە).

**بگرەویەردە** (ن) bigirewberde
١- ئاژاوە، ئاژاوەو پشێویی قورس، بگر بگر، پشێویی، هەراویگر، هەراوهوریا.
٢- ب (ئاخڵران).

**بگیر بگیر** (ن) bigîr bigîr
رەش بگیر، (قاو کردنی هەموو ئەو کەسانەی توانای چەک هەڵگرتنیان هەیە)، کاری مرۆڤ بەسەرباز کردن.

**بگێر** (ن) ١ bigêr̠
بگەڕ، بەڕێوەبەر، سەرپەرشتیکەر.

**بگێر** (ن) ٢ bigêr̠
کارگەچیی، نمەدماڵ، نەووکێ ماڵ.

**بل باریک** (ئان) bil barîk
لاواز، لەڕ، مل باریک.

**بلبال** (نک) bilbal
بنجاڕ، تەراز، زەرزەڤات، سەوزە، سەوزەوات.

**بلبل** (م،ن) ١ bilbil
بولبول، بولبول.

**بلبل** (ن) ٢ bilbil
فیقە (وەک بولبول و لەقوور دروستکراو).

**بلبلە** (ئان) ١ bilbile
شیرەی بەلووعە، قفڵی بەلووعە.

**بلبلە** (ئان) ٢ bilbile
ب (ئاواووک / ٢).

**بلوور بایەکی بەسە** (رس) bilurbayekî bese
١- شتێکی ناسکە.
٢- دڵی زۆر ناسکە، زوو دڵی دەشکێت (دەرەنجێ)، زوو هەستی بریندار دەبێ.

**بلووریی** (ن،ئان) ١ bilürî
١- لەبلوور دروست کراو.
٢- وەک بلوور ورشەدار وبێ گەرد.

**بلووریی** (ن) ٢ bilürî
حەمایل، مەرمەڕشا، هومایل، هومایی.

**بلوول** (ن) bilül
١- پۆر، خوریی.
٢- جل ویەرگی لەخوریی دروست کراو.
٣- بەردەخوریی، خوریی بەردین.

**بلوین** (ن،کی) bilwîn(lu)
ب (بلوێر).

**بلوێر** (ن) bilwêr
بلوور، بلۆر، بلوول، بیک، پیک، شمشاڵ، لوولە، لوولی، نای، نەی، هەڤان.

**بلوێر بەزین** (ئان) bilwêr bezên
١- بێ چاوەڕوو، پەت پسێن، چەقاوەسوو.
٢- بلەربەزین، چەنەباز، زۆربڵێ، مەلابەزین.

**بلوێر ژەن** (ن) ١ bilwêr jen
بلوورڤان، بلۆرڤان، بلوێر لێدەر، شمشاڵ ژەن، شمشاڵ لێدەر.

**بلوێر ژەن** (ن) ٢ bilwêr jen
١- زمان بەد، زمان درێژ. ٢- پروپاگەندەچیی.

**بلویر لێدان** (کتب) bilwêr lêdan

١- شمشاڵ لێ دان، فووکردن بەبلویردا ودەنگ لێ پەیدا کردن، لە بلویردان. ٢- گۆرانیی ووتن یان فیکەلێدان هەروەک فوو کردن بەشمشاڵدا.

**بلوق** (ن) biloq

بلق، پفکە، پۆرگ، پۆقلە، تلۆق، دلۆق، گۆزاولە.

**بلوق کردن** (کتن) biloqkirdin

بلق کردن، تلۆق کردن، هەڵتۆقان،هەڵتۆقیین، تۆقالەکردن.

**بلوک** (ن) bilok

١- خشتی چیمەنتۆی ناو پووچ. ٢- کۆمەڵی دەوڵەتانی یەکگرتوو. ٣- کۆمەڵی (خانوو)گشت بەیەکەوەدیاری کراو، ریزەماڵ. ٤- پارچەیەداری ئەستوور وقورس. ٥- بر، گەل، هەند.

**بلەخش** (ن) bilexiš

بەردی بەقیمەت، گەنج، گەوهەر.

**بلەزەندەر** (ئان) bilezender

١- بەژگە، بێ سەروبەر، خواروخێچ، نادروست، ناڕێک. ٢- ناقۆڵا، نالەبار، وێ نەچوو.

**بلەکناچیی** (ئان) bilknaçî

بلەکناچێ، ڕەنگ ژنانیی، ناپیاو.

**بلەگاز** (ئان) bilegaz

بەلەنگاز، داماو، هەژار.

**بلەلیی** (ن) bilelî

بەلەد، ڕێ بەڵەد، ڕێنما، شارەزا (ڕێگەوبان).

**بلەنگاز** (ئان،کی) bilengaz(ki)

بێ نەوا، دەربەدەر، لانەواز.

**بلەوەز** (ن) ١ bilewez

چەپگەر، خورت، خوێن مژ، دیکتاتۆر، زاڵ، زۆر دار.

**بلەوەز** (ئان) ٢ bilewez

تڕال، تسکەن، تەپلۆس، تەپۆ، تەمبەڵ، تەمەڵ، تەوەزەل، خاو، خلیچک، سست.

**بلیت** (ن) bilît

بارنامە، بلیت، بیتاقە، تکت، تیکت، کۆپۆن، گوزەرنامە.

**بلیچ** (ن) bilîç

گرمەگرمی هەور، گرمەی هەور، گۆلە.

**بلیز** (ن،کل) bilîz(kl)

ب (بلیسە).

**بلیسین** (کتن) bilîsîn

ترسان، تۆقیین، زارەترەک بوون، زراو چوون، سەرسام بوون، واق وڕمان.

**بلیمەت** (ئان) ١ bilîmet

١- دانا، زانا، زیرەک، شامێژن، کەمۆ.

٢- بەکار، پیتۆر، زۆرزان، کارامە، کارزان، لیهاتوو، هەڵکەوتوو، هۆکەل.

٣- جانانە (تەنها بۆ کچ..)، دانی مار، سۆدرە، سەرەسۆدرە، میرکوڕ.

**بلیمەت** (ئان) ٢ bilîmet

ئاجباتیی، سەیر(شت)، ئەجایەب

**بلیمەت** (ن) ٣ bilîmet

پیلان زان، پیلانگێڕ، فێڵزان.

**بلێک** (ن) bilêk

بابووکە، بادف، باندەر، پێچ وکلۆ، کڕێوە.

**بل** (ئان) ١ bil

زۆرگەییو (میوە..)، میوەی زۆر گەیشتوو.

**بل** (ئان) ٢ bil

فلتەفلت (ئاخاوتنی مرۆڤی بێ دان).

**بل** (ئان) ٣ bil

١-نەرم (لەئەندازە بەدەر)، نەرم نەرم.

٢- مەمکی شل (کچ).

**بلا** (شر،نسب،کی) ١ bila(ki)

بهێڵە، بێڵە، بواربدە !، ڕوخسەت بدە.

**بلا** (ناک،نسب،کی) ٢ bila(ki)

بازە، باشە، بلا، بلانە، بلە، بلانە، بلانێ، بەلا، بیلا، بیلانە.

**بلاو** (ئان) ١ bilaw

بەلاف، بەلاف بوو، شاش، فراوان، گوشاد، لەیەک دوور، ولاو.

**بلاو** (ئان) ٢ bilaw

بەربادبوو، پرژ، پرش، پرشاو، پژاو، پژیاگ، پەخش، پەرت.

**بلاوبوونەوە** (کتن) bilawbünewe

١- جوابەزبوونەوە، جیابوونەوە (لەیەکتر)، لێک دوور بونەوە. ٢- لێک ئاشکرا بوون.

٣- لێک دوورکەوتنەوە.

٤- پەرەئەستاندن، پەرەساندن، پەرەسەندن، تەشەنە کردن، تەنینەوە، داکەوتن (نەخۆشیی).

٥- ڕۆژنامە... دەرچوون وبەدەستی خەڵک گەیشتن بەپارە، شتی نوسراوی لەچاپ دراو بلاوبوونەوە بەناو خەڵکدا بۆ مەبەستی فرۆشتن.

٦- پرژان، پژان، پشان، پەرت بوون، هەترەبوون.

٧- ئاشکرابوون (قسەوباس)، پەنهانی کەوتنەدەم خەڵک، دەرکەوتن (ڕاز)، قاوەقاو دەس پێ کردن.

**بلاوکردن** (کتپ) bilawkirdin
١- بەلاڤ کرن، لیک جیاکردنەوە، لیک دوورخستنەوە ٢- پرژانن، پرشاندن، پژاندن، شت بەملاوئەولادا بێ سەروبەریی بلاوکردنەوە.

**بلاوکردنەوە** (کتپ)١ bilawkirdinewe
١- بەخشینەوە(شت بەسەرخەلکدا). ٢- پەخش کردن، دابەش کردن (رۆژنامە..)، وەلاوەکردن.
٣- لەیەک جیاکدنەوە، لەیەک دوورخستنەوە.

**بلاوکردنەوە** (کتپ)٢ bilawkirdinewe
ئاشکراکردن(نهێنیی)، ئاگادارکردن، بانگەوازکردن، جاڕدان، دەرخستن، دەنگ دان.

**بلاوکردنەوە** (کتپ)٣ bilawkirdinewe
پەرە پێ دان، پەرەسەندن.

**بلاوکردنەوە** (کتپ)٤ bilawkirdinewe
فراوان، کردن، گوشادکردن.

**بلاوکەرەوە** (ن)١ bilawkerewe
بەفیڕۆدەر، پەخشانکەر، پەخشەر، پەخشینەر، تەخشانکەر.

**بلاوکەرەوە** (ن)٢ bilawkerewe
چیرۆک بێژ، حیکایەتخوان، گێڕەرەوە(باس وخواس).

**بلاوە** (ن) bilawe
جودایی، جیایی، کەلەبەر، لیک دووریی.

**بلاوە پێ کردن** (کتپ) bilawe pê kirdin
لیک جیاکردنەوە (خەلک)، لیک دوور خستنەوە درپێ دان.

**بلاوەکردن** (کتن) bilawe kirdin
بلاوبوونەوە ولیک دوور کەوتنەوە،
بلاوەلێ کردن، بەملاولادا ڕۆیشتن.

**بلاوە لێ کردن** (کتن) bilawe lê kirdin
ب(بلاوە کردن).

**بل بوون** (کتن) bilbûn
١- زۆر گەیشتن (میوە)، زیاد گەیین(میوە).
٢- تەپیین (کاڵەک).
٣- داکەوتن، زل بوون وشۆڕبوونەوە (مەمک).

**بلتەبلت** (ن) biltebilt
بلقەبلق (ناو)، بلتەی یەک لەدوای یەک.

**بلچ** (ن،رو) bilç
ریلی، کڤێژ، کوێژ، کوێچ، کوێژ، کۆشک، کومێژ، کێوژ.

**بلچیی** (ن) bilçî
بێ شەرمیی، ساتوڵیی، سووکیی.

**بلح** (ئان) bilh
بێ مێشک، تەپۆل، حۆل، سەپۆل، گەوج، گێچ، گێل، هۆل، هەری، هێژ.

**بلح** (ئان) bilh
بێ سوود، بێ فەڕ، بێ کەلک، بێ هوودە، چوو -نە.

**بلحانە** (ئاک) bilhane
بەگەوجیتیی، بەگەوجیی، بێ مێشکانە، حۆلانە، گەوجانە، گێلانە.

**بلح کردن** (کتپ) bilhkirdin
حۆل کردن، گەوج کردن، گێژکردن، گێل کردن، گێلە پێ کردن، وورکردن، هێرکردن.

**بلحیتیی** (ن) bilhêtî
١- بلحیی، بێ مێشکیی، زەین کوێریی، گەوجیتی، گەوجیی، گێژیی، گێلیی، نەفامیی، وورپیی.
٢- بێ ئارەزوویی، بێ دەماریی، بێ ڕوحیی، بێ زەوقیی، سستیی، مردەلۆخەیی.
٣- ئەبلەقیی، کاری سەرسوڕمان، گێژو وێژیی.

**بلغ** (ن) bilx
١- تلپ، تلپە،.
٢- بەلغ(ناو کتلی یان سەماوەر)، بەلغ.

**بلخاخ** (ن) bilxax
داد، داد وبێدا، قیرە، قیرەقیر، قیژە، هاوار.

**بلق** (ن،خ) bilq
١- بلقاو، پفکە، کەفی سەراو، گومزە، گومەزە. ٢- بلوق، بوقژە، بەقبەقوکە، پۆرکە، تلۆق.
٣- بێ بەها، چو-نە، کیشەیەکی چکۆلە(خ).
٤- تەفرە، ڕواڵەتیی گزەون، فریو.

**بلقاو** (ن) bilqaw
زۆنگ، زۆنگاو، زەلکاو، قامیشەلان، هۆڕ.

**بلق دان** (کتن) bilqdan
بلق پەیدابوون، بلق هەلدان، بلۆدان، کەف کردن، کولان، هاتنەقولپ، هاتنەکول.

**بلق هەلدان** (کتن) bilq heldan
ب (بلق دان).

**بلمە بلم** (ن) bilme bilm
١- فلتەفلت (گفتوگۆی مەردومی پیری بێ دان).
٢- بۆلەبۆل، کاری ناڕەزایی دەربڕین، مڕەمڕ.
٣- چرپە، ژێر لێوان(ئاخاوتن)، وورتە وورت.

**بلند** (ئان) blind
١- ب (ئاشکرا / ٤). ٢- ب (نۆفلاز / ٢).
٣- بلن، بولنگ، بلیند، بەرز، درۆک، ژێ هەل، قوت گڵاند، هەوراز. ٤- قنج، قۆز، قیت، گت، هەلکشاو.

٥- پایەبەرز، گەورە (ئد).
٦- ڕەپ، هەستاو، هەڵساو.

**بلندایی** (ن) blindayî
بلنایی، بلندیی، بلیندایی، بلیندیی، بولەنیی، بەرزایی، بەرزیی، چیا، گتایی.

**بلندبوون** (کتن) blindbûn
١- بەرزبوونەوە، سەر لەئاسۆدەرهێنان، لەئاسۆ دەرکەوتن. ٢- بەرزەپێ لەبەرهەستان، لەبەرهەڵسان، هەڵستان.

**بلندبوونەوە** (کتن) blindbûnewe
١- ب (ئاخێزکردن). بلندەوەبوون، بەرزبوونەوە، هەڵبەزینەوە، هەڵستانەوە.
٢- بەرەو ژووربوونەوە، بەرەو ژووروو ڕۆیشتن، گەیشتنەمەودایەکی بەرزتر.
٤- گەیشتنەپایەیەکی بلندتر (لەکۆمەڵدا یان لەئیش وکاردا).

**بلندبێژ** (ن) [1] blindbêj
بلینەبێژ(رادیۆ)، دەنگێ گەورەکەر.

**بلندبێژ** (ئان) [2] blindbêj
دەنگێ بەرز، دەنگێ گەورە

**بلندکردن** (کتپ) blindkirdin
ب (بلند کردنەوە).

**بلندکردنەوە** (کتپ) blindkirdinewe
١- ئەفرازبرن، ئەفرازکرن، بەر بژوورکرن، بەرزکردنەوە، (vt). بەرزەوەکردن، بەرەوهەوابردن، بەرەوژوورتر کردن، هلکافتن، هەڵبڕین، هەڵگرتن، هەڵهێنان.
٢- خستنەسەریەک (شت)، کەڵەکەکردن، هەڵچنین (چینی دیوار).
٣- پایەی کەسێ بەرزکردنەوە، پێش خستن، زل کردن، گەورەکردن (پایەی کەسێ)، وەبەرخستن.
٤- سووکەدزیی کردن، گەنگەدزیی کردن.
٥- خستنەئەولاوە (شت)، لابردن.
٦- ئاشکراکردن، پیشاندان، دەرخستن، ڕاکرن.

**بلندهیمەت** (ئان) blind hîmmet
هیمەت بەرز، وورە بەرز (سوپا).

**بلندیی** (ن) blindaî
١- ب (بلندایی). ٢- بەرزیی، گەورەیی، مەزنیی. ٣- بەندەریی، پرکیشیی، توانایی، تەوان، دەست ودوو، شیاویی، لیهاتوویی، یارا.
٤- سەربەرزیی، شانازیی، کاری پێ خوریین.

**بلودان** (کتن) bludan
ب (بلق دان).

**بلێ بلێ** (ن) [1] blê blê
زمان دریژی، زوان دریژیی، زۆر بلیبیی، زۆر ووتن، قەرەچەناخیی.

**بلێ بلێ** (ن) [2] blê blê
١- زۆر بلێ، چەنەباز، چیرەدرێژ.
٢- چەنەهەراش، قەرەچەناخ، لاتر قەوچەپێچ.

**بلێسە** (ن) blêse
١- بلێز، بلێزە، پێت، زووانە، سوولی، شید، کلپە، گڕ، گوڕی. ٢- تەوژمی گەرما، هەڵاوی گەرما.
٣- ب (ئالاف / ٢).

**بلێسەسەندن** (کتن) blêse sendin
ئاگر گرتن، گڕگرتن.

**بم** (ئان) [1] bim
تیک سمراو، قەڵەو، گۆشتن.

**بم** (ئان) [2] bim
(دەنگێ)زل، بەرز یان گەورە (دەنگێ)، دەنگێ قەڵەبالغ.

**بم کردن** (کتن) [1] bim kirdin
خۆ گرژکردن و لێ هەڵقرچان، خۆگێف کردن.

**بم کردن** (کتن) [2] bim kirdin
ڕووتاڵ کردن، نارەحەتیی پیشان دان بەرامبەرکەسێ.

**بن** (ن) [1] bin
بنداریی، دوخترزینی، دوێتیی، کچانیی، کچێنیی، کەچانیی، کەنیشکیی، لەچەک.

**بن** (ن) [2] bin
١- بنک، بنکە، بنگا، بنگە، بنواشە، بنەوای جم و جۆڵ و دەسەڵات (جەنگێ). ٢- بنەوە، چیر، ژێر.
٣- بنج، بنەڕەت، بێخ، پنچ، ڕەگێ، ڕەگ و ڕیشە. ٤- هەرەدوایی، هەرەژێرەوە(شت).

**بناخە** (ن) binaxe
بنچینە. بنیات.

**بنار** (ن) binar
١- بنەوا، دامێن(گرد)، داینە، داوێن(تەپۆڵکە).
٢- بنەتار، سەراوەڵە، سەربەرەو ژوورکە (ڕێگا).

**بنار کردن**(ن) binar kirdin
پێ داگرتن، پێدانووسان، پێوەنووسان، لەسەرشت سوور بوون، لەکۆڵ نەبوونەوە، لێ نەبوونەوە، وازلێ نەهێنان (بەئاخاوتن یان چەند وچوون)، هەراسان کردن.

**بناخه** (ن) [١] binaxe

١- بناغه، بنچینه، بنگه، بنه، بنه‌ڕه‌ت، بنیاد، به‌ناغ، پیی، ته‌مه‌ل، بن گل. ٢- بنیات، بنیاد

**بناخه** (ن) [٢] binaxe

به‌ربیژ، به‌رگوتن، پێشگوتن، پێش ووته، ڕێ، سه‌ره‌تا.

**بناخه دانان** (کتپ) [١] binaxe danad

١- بناغه‌نان، داڕشتن(بناغه)، دامه‌زراندن، هه‌لبه‌ستن (بنیاد). ٢- ئیش یان کار ده‌س پێکردن، بنیادنان یان کردن.

**بناخه دانان** (کتپ) [٢] binaxc danan

قالب داڕشتن، قالب کردن یان گرتن.

**بناڤێ** (ن،کی) binvê(ki)

١-پیله‌بازیی، ده‌سته‌ویه‌خه، شه‌ڕ وکیشه(له‌سه‌ر شتیکی بێبه‌ها).

٢- ده‌مه‌قاله، ده‌مه‌قالێ، قرومووڕ، قنگه‌شه‌ڕ.

**بناقاقا** (ن) binaqaqa

بناقاقه، بن مل، بنه‌خڕ، بین، بینه‌قاقه، گه‌روو، گه‌لوو، مل.

**بناگر** (ن) binagir

به‌رچاوکه، چاوڕوونکه.

**بناوان** (ن) [١] binawan

بنه‌وان، بنه‌وانه، سه‌رگه‌وره‌ی مال (ژن)، کابان، که‌بانیی، که‌یبانوو، مال به‌ڕیوه‌به‌ر (ژن).

**بناوان** (ن) [٢] binawan

ب (بناخه / ١).

**بناوان** (ن) [٣] binawan

به‌رهه‌لستی به‌رده‌م ئاو، به‌رهه‌لستی به‌رده‌م ڕێژگه، جۆگه‌ی هه‌لبه‌ستراو، سه‌رچاوه‌یه‌ک جۆگای له‌به‌رده‌مدا هه‌لبه‌سترابێ.

**بناوان شیلان** (کتپ،ئد) binawan šêlan

١- ب (بناوان هه‌لبه‌ستن).

٢- ئیش بنج به‌ست کردن، سه‌ره‌تایه‌کی ڕێک وپێک ده‌ست پێ کردن، کارسازاندن.

**بناوان هه‌لبه‌ستن** (کتپ) binawan helbestin

بناوان شیلان، بنه‌جۆگه شیلان، دیوار دروست کردن له‌به‌رده‌م ئاوه‌ڕێژدا، به‌رهه‌لست دانان له‌به‌رده‌م کانیاودا.

**بناوانه‌ی شله** (رس) binawaney šile

١- ژنه‌که‌ی ده‌س بلاوه،که‌یبانووه‌که‌ی ده‌س به‌قریه. ٢-بنچینه‌که‌ی خراپه.

**بن ئاوبوون** (کتن) bin aw bün

بن ئاوکه‌وتن، ژێر ئاوکه‌وتن، که‌وتنه‌بن ئاو، له‌ناوئاودا نوقم بوون.

**بنانی** (ن) binanî

قوولایی، قوولیی.

**بن بار** (ئان) [١] binbar

پێزان، سوپاسکار، سوپاس گوزار. قه‌رزاربار، منه‌تبار، منه‌تدار.

**بن بار** (ن) [٢] binbir

ژێربار (که‌ل وپه‌ل).

**بن بڕ** (ن) [١] binbir

بنه‌بڕ، پینج بڕ، ڕیشه‌بڕ، ڕیشه‌که‌ن.

**بن بڕ** (ن) [٢] binbir

چاوه، سه‌رچاوه، کان، کانگا، کانگه.

**بن بڕکردن** (ن) [١] binbir kirdin

١- بنه‌بڕکردن، بیخ بڕ کردن، ڕیشه‌بڕکردن، ڕیشه‌که‌ن کردن، له‌ڕه‌گ وڕیشه‌ده‌رهینان، له‌ڕیشه‌ده‌رهینان.

٢- براندنه‌وه، ته‌فروتوناکردن، قه‌لاچۆتێ خستن، قه‌لاچۆ کردن، له‌ناوبردن، نه‌هیشتن.

٣- دوایی پێهینان (کاروبار)، کۆتایی پێ هینان، کیشه‌دوایی پێ هینان.

٤- ئه‌نجام پێ دان(به‌شتیکی ناخۆش یان نابه‌جێ). ٥- ب (ئاگر بڕ کردن / ٢ )

**بن بڕکردن** (کتپ) [٢] binbirkirdin

ووشکه‌ڕێ کردن (موو یان خوریی).

**بن بزیو** (ن) binbzêw

ئاوازی خرۆش، به‌سته‌ی پڕ جۆش وخرۆش.

**بن پال** (ئان،ئاک) binpal

١- بێته‌ک، بن چغ، به‌ته‌نیشت، ته‌نیشت (که‌سێ).

٢- که‌لین، لا، لاکون، ماوه.

**بن پژاندن** (کتپ) binpijandin

١- بێ بن کردن، په‌رده‌دڕاندن، کچینیی بردن، که‌نیشکیی هه‌لگرتن.

٢- به‌زۆره ملیی سه‌رجیی کردن له‌گه‌ل کچ.

**بن پێ** (ن) [١] bin pê

بنی پێ، به‌ری پێ.

**بن پێ** (ن) [٢] bin pê

ژێر، ژێره‌وه.

**بنتار** (ن) [١] bintar

جیگه‌و ڕیگه، جێ شوین، سه‌روشوین.

**بنتار (نک)** ٢ bintar
دەنگ وباس، هەواڵی نوێ.
**بنتاو (ن)** bintaw
١- کۆرپەی درەخت، نەمام.
٢- دەستەکو، گەنج (خ). ٣- ناوەڕۆکی دار.
٤- قەدی دار یان بنەوەی دار، ناوقەدی دار.
**بنجار (نک، کی)** bincar(ki)
ئەسوو، تەراز، زەرزەڤات، سەوزە، سەوزەهات، سەوزەوات، سەوزیی.
**بنجامە (ئان)** bincame
چقۆ، دوو ڕوو، ساختەچیی، ساختەکار.
**بنجامەتیی (ن)** bincametî
تەڵەکەبازیی، دووڕوویی، ساختە، ساختەبازیی، ساختەچیتیی، ساختەکاریی، فروفیڵ، فێڵ وفەرەج، کەڵەک، کەڵەکەبازیی.
**بنج بەست (ئان)** ١ bincbest
ڕەگ داکوتاو، ڕوواو.
**بنج بەست (ئان)** ٢ bincbest
١-ئامادە، بەردەس، دەبار، ساز، لەبار.
٢- دامەزراو، ڕێکخراو.
**بنج بەست کردن (کتپ)** bincbest kirdin
جێبەجێ کردن، دامەزراندن، سازکردن.
**بنج بەستن (کتن)** bincbestin
ب (بنج داکوتان).
**بنج داکوتان (کتن)** ١ binc dakutan
ڕووان، ڕەگ داکوتان.
**بنج داکوتان (کتن)** ٢ binc dakutan
١- جێبەجێ بوون، چەسپان، دامەزران، سازان.
٢- خۆدامەزراندن (میوانی سێبەر قورس)، زۆر دانیشتن (میوانی لەش گران).
٣- جێگیربوون، نیشتەجێ بوون.
**بنج وبناوان [ئیش] (ن)** binc w binawan
سەرچاوە وبناغەی کار.
**بنجوو (ئان)** bincü
بنجووگە، بنەجوو، بنەجووگە، بنەچەجولەکە.
**بنجۆری کردن (کتپ،کتن)** bincorîkirdin.
١ - بنجووری کردن، بنگیریی کردن،پەی بردن، جوستوجۆکردن بەدووی شتێکدا، سۆراغ کردن. ٢- بەدواداگەڕان، بەدووی شتێکداگەڕان، پشکڤاندن، پشکنین، گەڕان، لێگەڕان.
٣- جموجۆڵ کردن، ئەسرەوتن، هاتوچۆکردن. ٤- پەیجووری کردن، پەیداکردن، دەس کەوتن.

**بنچی (ئان،ن)** binçî
١- بنچینەیی، بنیادینی، بنیادی، بنگەهیی.
٢- بنیاد، بەشی سەرەکی. ٣- بناغە.
**بنچاخ (ن)** binçax
سەنەدی یاسایی، قەباڵە، قەواڵە، کۆنە، قەواڵەی کۆن.
**بنچک (ن)** binçik
بتە، بنجک، بنەدەوەن، دەوەن، شیخەڵ، مێتک، ووردە درەختی ناودارستان.
**بنچینە(ن)** binçîne
١- ب (ئاسار / ١). ٢- ب (ئایین / ٤).
٣- ب (بناخە / ١).
**بنچینەیی (ئان)** ١ binçîneyî
بناغەیی، بنیاتیی، نەژادیی.
**بنچینەیی (ئان)** ٢ binçîneyî
بەرایی، پێشاهیی، پێشەکیی، سەرانگاهیی، سەرەکیی.
**بندار (ن)** ١ bindar
بن پێ ماو، بن نەپژاو، خام، کچێنیی‌دار، کون نەکراو، لەچەک، نەسمراو(کچ).
**بندار (ن)** ٢ bindar
بنەدار، ژێرەوەی‌دار، کۆتەرە، کۆڵکە، کۆڵکەدار.
**بندار (ن)** ٣ bindar
قەدی دار، ناوقەدی دار.
**بندار (ئان)** ٤ bindar
ب (بناوان).
**بندار (ئان)** ٥ bindar
بێخدار، ڕەگدار، ڕیشەدار.
**بن دەس (ن)** ١ bindes
بن باخەڵ، بن پیل، بنەگڵ.
**بن دەس (ن)** ٢ bindes
بندەست، بەندە، بەنیی، ژێردەس، کۆڵە، کۆیلە.
**بن دەس (ن)** ٣ bindes
پەراسوو، ئێسقانەکانی لاتەنیشت (سەرەوە وناوەڕاست وخوارەوەی تەنی مرۆڤ).
**بن دەسیی (ن)** ١ bin-desî
١- بەندەیی، ژێردەسیی، عەبدایەتیی، کۆیلەیی. ٢- مەینەتیی، نارەحەتیی (ئیش).
**بن دەسیی (ن)** ٢ bin-desî
پەنهانیی، ڕاز، سرت، سرتە، نهێنیی.
**بن دەسیی (ئاک)** ٣ bin-desî
بەپەنهانیی، بەدزیەوە، بەنهێنیی، لەژێرەوە.

**بنژیل** (نک) binjîl

بنجوول، پاشماوه، پاشه‌ڕۆکه، پیما، ماوه، ماوه‌وه.

**بنک** (ن) [١] bink

موور، مووره‌دار.

**بنک** (ن) [٢] bink

بن، بنه‌وه(شت)، خواروو (شت).

**بن کردن** (کتن) bin kirdin

بنج داکوتان، ڕووان، ڕه‌گ داکوتان.

**بنکلێشه** (ن) [١] binklêşe

ده‌روونی ئاده‌میزاد، ناخی ده‌روون، ناوبیر وهۆش، ناوقه‌پیلکه وقالبی مرۆو.

**بنکلیشه** (ن) [٢] binkelîşe

ده‌روونی ئاده‌میزاد، ناخی ده‌روون، ناوبیر وهۆش، ناوقه‌پیلکه وقالبی مرۆو.

**بن کۆشک** (ن) binkošk

ژێرخان.

**بنکۆڵ** (ئان) binkol

بنکه‌ن، بن که‌ند، بن هلۆل، ژێرکه‌ن، ژێرملۆل.

**بنکۆڵ کردن** (کتپ، ئد) binkol kirdin

١ - بنکه‌ن کردن، بن که‌ندکردن،بن هه‌لکۆلین، ژێر که‌ن کردن. ٢- پیلان گێران، کنه‌کردن (ئد).

**بنکه** (ن) binke

باره‌گا.

**بنکه‌ن** (ئان) binken

ب (بنکۆڵ).

**بنکه‌ند** (ئان) binkend

ب (بنکۆڵ).

**بنکه‌ند کردن** (کتپ) binkend kirdin

ب(بنکۆڵ کردن).

**بنگ** (ن) bing

په‌لکه، خۆله‌یدانکه، زیلگه، سه‌رانگویلکه، سه‌ره‌گۆیلکه، سه‌ره‌نویلکه، گیوه‌که.

**بنگووڤ** (ن، کی) bingüv(ki)

که‌له‌خان.

**بنگۆزروان** (ن،پو) binegozirwan

بن گوزه‌له، بنه‌گۆزروان.

**بنگه** (ن) [١] binge

جومگه.

**بنگه** (ن) [٢] binge

ئه‌یاره‌خانه، فرگه، فرۆکه‌خانه، نیشتنگه‌ی فرۆکه.

**بنگیری کردن** (کتپ) bingîrî kirdin

بنجۆری کردن.

**بنمیچ** (ن) binmîç

ب (ئاسمانه / ١).

**بنوار** (ن) binwar

مه‌نزلگا، مه‌نزلگه، وه‌ستانگه، وێستگه.

**بنوو !** (کد) binü !

١- بچۆ بۆخه‌وتن، بڕێخه‌وه، پاڵکه‌وه، ڕاکشێ.

٢- بوه‌سته، بویس، بویسه، بێس، بێسه.

**بنووس** (ن) binüs

نووسه‌ر، نوسیار.

**بنۆڵه** (ن) binole

تووره‌که، جزدان، کیسۆڵکه، کیسه.

**بنه** (نک) [١] bine

(باره‌گای سوپا)، بنکه، هه‌وارگه.

**بنه** (نک) [٢] bine

بارگه، به‌نده‌که، که‌لوپه‌ل، گه‌مه‌ک.

**بنه** (ن) [٣] bine

بنه‌به‌ست، چه‌ق، ناوه‌ڕاست، ناوه‌ند.

**بنه** (ن) [٤] bine

حه‌شارگه، سیپه، قۆخ، قۆخته، قۆخه‌ل، قووخه‌ل، کۆخ، کۆخته، کووخ، کۆمانچ.

**بنه** (ن) [٥] bine

١- ئیستگه، ڕوانگه.

٢- بنجۆری، بنگیری، سۆراغ.

**بنه** (ن) [٦] bine

ده‌ستوور، یاسا.

**بنه** (ن) [٧] bine

خواره‌وه، ژێره‌وه

**بنه** (نک) [٨] bine

پیداویستی، پێویستی.

**بنه‌بان** (ئان) bineban

ئه‌ولاترین (جێگه)، دوورترین(شوێن).

**بنه‌بان** (ن) [١] bineban

شت.

**بنه‌بان** (ن) [٢] bineban

ب (ئه‌نجام / ١).

**بنه‌بان** (ئان) [٣] bineban

ئه‌وپه‌ر.

**بنه‌بان کردن** (کتپ) bineban kirdin

دوایی پێ هێنان،کۆتایی پێ هێنان.

**بنه‌بڕ** (ن) [١] binebir

بن بڕ.

**بنەبڕ** (ن) ٢ binebir
ئەجام.

**بنەپیت** (ن) ١ bine pît
بن خەرمان، پاشەڕۆکی خەرمان.

**بنەپیت** (ن) ٢ bine pît
دەستمایە، سەرمایە.

**بنەتار** (ن) ١ binetar
بنار، بنەوا، داوێن (شاخ).

**بنەتار** (ن) ٢ binetar
١- باپیر، بابەگەورە. ٢- باوو باپیر، ڕەچەڵەک.

**بنەتوو** (ن) ١ binetü
خێزان، (دایک وباوک ومندالان)، کەیبانوو، کەیوانوو.

**بنەتوو** (ن) ٢ binetü
بنەتۆ، بنەتۆم، بنەتۆو، بنەجووت (بەشێک لەو دانەوێلەیەی بۆ تۆوی ساڵی دوایی بەکار دەهێنرێت)، ئەو دانەوێلەیەی کەدەچێنرێ.

**بنەجووت** (ن) ١ binecüt
چۆنیەکیی(لەبەشدا)، نیوانیو، ماوبەشی (کشتوکاڵ).

**بنەجووت** (ن) ٢ binecüt
کێڵگە، مەزرا.

**بنەچە** (ن) bineçe
بنەچەکە،باووباپیر.

**بنەچەکە** (نک) ٢ bineçeke
ڕەگیشە، ڕیشە.

**بنەچەکە** (ن) ٣ bineçeke
بابک، بناچە، بنج، بنچینە، بنەچە، بنەماڵە، بەرەباب، بنیچە، توخم، دەڵل، ڕەچلەک، ڕچەڵەک، ڕەسەن، ڕەگەز.

**بنەدار** (ن) binedar
کۆتک، کۆتکەدار، کۆتەرە، کۆتەلە، کۆتەلەدار.

**بنەدز** (ن) ١ binediz
پاش دز، شەریکەدز.

**بنەدز** (ن) ٢ binediz
چەپەر.

**بنەڕەت** (ن) ١ bineret
بناخە.

**بنەڕەت** (نک) ٢ bineret
ڕەگ وڕیشە.

**بنەڕەت** (نک) ٣ bineret
ئەلفبا.

**بنەڕەت** (ن) ٤ bineret
بن، تەختی بن، تەرک، تەک.

**بنەکردن** (کتپ) ١ binekirdin
بنگیریی کردن، بەپێ وشوێنەوەچوون، سۆراغ کردن، وەدوو کەوتن(بەبەردەوامیی).

**بنەکردن** (کتپ) ٢ binekirdin
دەس نیشان کردن، ڕەنگ ڕشتن، سنوورکیشان، هێل کیشان.

**بنەکردن** (کتپ) ٣ binekirdin
بەسەرداتێپەربوون، بەسەرداڕابوردن. بەسەرداڕۆیشتن، لێ ڕەت بوون.

**بنەکردن** (کتپ) ٤ binekirdin
١- لێ دڵنیابوون، ناسینەوە، وەبیرهاتنەوە، یاد کردنەوە(سەر لەنوێ). ٢- تۆژانەوە(لەشت)، چوونەبنج وبناوان، لێ پێچانەوە.
٣ - بڕیار لەسەردان، دەس نیشان کردن.
٤- دۆزینەوە، هێنانەدی. ٥- هەڵبژاردن.

**بنەگا** (ن) binega
بنکە، بنگە، (جێگای پشوودان لەسەفەردا)، چەقۆ، قۆناخ، مەنزڵگا، مەنزڵگە، هەوار، وار.

**بنەگر** (ن) ١ binegir
جێگر، جێ نشین، دوومان، شوێنگر، میراتگر، وەرت.

**بنەگر** (ن) ٢ binegir
بنەدار، دەسنێژ، دەمڕاست، نوێنەر.

**بنەگرتوو** (ئان) binegirtü
بنج داکوتیو، چەسپاو، چەسپیو، ڕەگ داکوتیو، سەرگرتوو(ئیش وکار).

**بنەماڵ** (ن) ١ binemal
بندار، بنەماڵە، پەرگال، خانەوادە، خێزانی ماڵەخانەدان، وەچە.

**بنەماڵ** (ن) ٢ binemal
خانەدان، گەورەماڵ.

**بنەماڵە** (ن) binemale
ب (بنەماڵ).

**بنەوا** (ن) ١ binewa
ئاتەگ.

**بنەوا** (ن) ٢ binewa
ئاسار.

**بنەوا** (ن) ٣ binewa
بناوان.

**بنەوا** (ن) ٤ binewa
بناوان.

**بنەوانە** ( ن ) binewane

بناوان.

**بنەوبارخانە** ( ن ) binewbarxane

بارگە.

**بنەوشە** ( ن،ئان ) binewše

١-بنـۆوش، بنـەفش، بنـەوش، ڕەنگـی مـۆر، شـینی مۆربـاو، مـۆر، وەنـەوش. ٢- گـوڵ وەنەوشـە، گوڵەوەنەوشە، وەنەوشەوە( گوڵ ).

**بنەوشەیی** ( ئان ) binewšeyî

ڕەنگ مۆر، وەنەوشەیی.

**بنەوە** ( ئاک ) binewe

خوارەوە، ژێرەوە.

**بنی** ( ن ) binî

پاگە، تاوڵە، تەویلە، خۆلە، کۆتـان، کۆلیت، گەوڕ، هەرخان.

**بنیات** ( ن ) [1] binyat

دەس نیشان، نیشانە.

**بنیات** ( ن ) [2] binyat

بناخە.

**بنیات** ( ن ) [3] binyat

چاوە، سەرچاوە، کانگە.

**بنیات** ( نک ) [4] binyat

داهات، دەرامەت، هات.

**بنیات** ( ن ) [5] binyat

چاووکَ، چاووگە.

**بنیات** ( ن ) [6] binyat

گەیشتوو، هاتوو.

**بنیاتی** ( ن ) binyatî

بنچینەیی، بنگەهی، بنیادینی، دەهکەری.

**بنیاد** ( ن ) binyad

ب ( بناخە / ١ )

**بنیادکار** ( ن ) binyadkar

١- بناغەدانـەر، بنیاتنـەر، چەسـپێنەر، دامەزرێنـەر، دامێنەر، ڕێکخەر. ٢- دارێژەر( قاڵب، قاڵبچیی ).

**بنیادکردن** ( کتپ ) binyad kirdin

١-بناغەدامەزرانـدن، بناغـەدانان، بنچینـەدانان، بنیادنان. ٢- دامەزراندن، دروست کردن.
٣- خستنەقاڵبەوە، دارشتن، قاڵب گرتن، لە قاڵب دان. ٤- بنیاکردن، خانوویەرەدروست کردن.

**بنیادنان** ( کتپ ) binyadnan

بنیاد کردن.

**بنیادەم** ( ن ) binyadem

ئادەمزاد، ئادەمیزاد، مرۆو، مـرۆڤ، مـرۆک، مـەردوم، مەریتە. **بنیادەم خۆر** ( نک ) binyadem xor

ئادەمیی خۆر، ئایم هەرەکە، پیاوخۆر.

**بنی پێ هاتنە پشتی پێ** ( ئد )

binî pê hatine piştî pê

زۆر گەڕان وکەشەنگَ بوون، زۆرماندووبوون.

**بنیە** ( ن ) binye

بارە، بەندەری، پڕکێشیی، توانـایی، تـەوان، دەسـت ودوو، زووخ، لێ وەشانەوە، یارا.

**بنیسی** ( ئان ) binêsî

داڵگۆشت، زراف، لاواز، لەڕ.

**بنێشت** ( ن ) binêšt

بریژە، بەنوشت، بەنیشت، جاجک، جاجکـە، جاچـک، چاچکە.

**بوار** ( ن ) [1] bwar

بـار، بـڕ، بـڤار، بـۆر، بـۆری، بهـور، بهـوڕ، تـەنکاو، تەنکانیی ئاو، ڕەون، ڕێبار، ڕێوار، گوزار، گوزەرگا.

**بوار** ( ئاک ) [2] bwar

بەرامبەر، دەرهەق بە...، دەهم، لەبری، لەجیاتیی.

**بوار** ( ن ) [3] bwar

سەمت، سەنت.

**بواردن** ( کتن ) [1] bwardin

بڕ بوون، بردان، بۆردان، گوزەرگاهەبوون، مـاوەی لێ پەڕینەوەدان ( ئاو ).

**بواردن** ( کتن ) [2] bwardin

١-بەجێهێشتن، جێهێلان، فڕێدان، نـەکردن، وازلێ هێنـان، هەڵبواردن. ٢- خـستنەئەولاوە، خستنەپشت گوێ، گوێ پێ نەدان.
٣- بەسەرداتێپەڕبوون، بـیرلێ نەکردنـەوە، سـەرنج پێ نەدان، لێ غافڵ بوون.

**بواردن** ( کتن ) [3] bwardin

بگاردن، ڕەنگێکی جیاوازگرتن ( قوماش، جل.. ).

**بوارە** ( ن ) bware

بگـارە، پـشوو، جێگـا، دەرفـەت، مـاوە، مۆڵـەت، ووچان.

**بوارەدان** ( کتپ ) bwaredan

بگارەدان، بوارەپێدان، پشووپێدان، دەرفـەت پـێدان، ڕێگاپـێدان، ماوەپـێدان، مۆڵـەت دان، ووچان دان.

**بوارەدان** ( کتپ ) bwaredan

پاداش پێ دان

**بواژۆ** (ئان) bwajo
ئالوودە.
**بوت** (ن.خ.) but
١-بت. ٢ - دلدا، یار (خ.).
**بوت پەرست** (ن.) butperist
بت پەرست.
**بوتڵ** (ن.) butil
بوتری، دەسکەلە، دیمکە، شووشە، قاپ.
**بوچک** (ئان) ١ buçik
١ بچکۆلە، بچووک، بچکۆک، پچکۆل، بچکۆلانە، بچووک، وورد، ووردیلانە، ووردیلە.
٢- بێبەها، چو-نە، کورت، کەم، کەم بەها، لاواز، هیچ. ٣- بیرتەسک، خۆخۆ، خۆویست، من منۆک، نزم (پایە).
**بوچک** (ن) ٢ buçik
١- بارتەقا، بەرتەقا، تیەن، قەر، نەخت، هیند، هێند.
٢-پێوانەیەکی سووک، رادەیەکی کەم، کێشانەیەکی کەم (شت).
**بوچکە** (ن) buçike
ئەموست، ئەنگوست.
**بوختان** (ن) buxtan
١-بوختان، بۆختوم، پەندوباو، ووتەی نارەوا (بەرامبەرکەسێ). ٢- درۆ، درۆو دەلەسە.
**بوختان پێ کردن** (کتپ) buxtan pê kirdin
پاشەڵ پیس کردن، تۆمانج پێ کردن، تیوەگلاندن، خراپەخستنەپاڵ، درۆیو هەڵبەستن، ووتە یان کارێکی ناراست دانەپاڵ(کەسێ).
**بوختان کردن** (کتپ) buxtan kirdin
بۆختان کردن، بۆخت رختە، چارەرەش کردن، رەزاقورس کردن، قسەی ناراست کردن، کردەوەی ناراست خستنەپاڵ خەڵک.
**بوختانکەر** (ن) buxtanker
بەدگۆ، درۆهەڵبەست، شلتاخکەر.
**بوخچە** (ن) buxçe
بوستخە، بۆشخە، بەستە، بەسە، پڕو پڕیاسکە، پڕیاسکە، کەلوپەلی پێچراوە.
**بوخچە تێکنان** (کتپ) buxçetêknan
بەستەئامادەکردن، جل وبەرگ خستنەناو بوخچەوە، کردنەباڵە، کەل وپەل لەناو بوخچەدا پێچانەوە.
**بوخچەی نەکراوەیە** (ند.رس)
buxçey nekraweye
١- ژنی نەهێناوە. ٢- نەزاکاوە (شت).

٣- مەرزەکارە.
**بور** (ن) ١ bür
شەرمن، شەرمین.
**بور** (ن) ٢ bür
کشت، (جێگایەکەلەزەوی دا میوەی تێدا هەڵدەگیرێت).
**بوراق** (ئان،لو) buraq
ئازا، بورساق، نەترس.
**بوربور** (ن) ١ bur bur
تاقم تاقم، دەستدەست (ئامیار و لەوبابەتە).
**بوربور** (ئان) ٢ bur bur
زبر، گرنج گرنج.
**بوربور** (ئان) ٣ bur bur
قۆرت قۆرت، گرێ گرێ.
**بوربور** (ن) ٤ bur bur
ڕێ ڕێ.
**بوردن** (کتپ،کتن) ١ burdin
پەڕینەوە، تێپەڕبوون، ڕۆیشتن، لێتێپەڕبوون.
**بوردن** (کتپ) ٢ burdin
بەجێهێشتن، ڕەت بوون، لێ ڕەت بوون.
**بوردن** (کتن) ٣ burdin
زۆر پێ گەیشتن(شووتی..)، زۆرگەیشتن.
**بوردن** (کتپ) burdin
بەخشان، بەخشین، چاوپۆشین، لێ بوردن، لێبوردن، لێ خۆش بوون، نۆبەخش کردن، وەش کردن.
**بوردنەوە** (کتن) ٤ burdinewe
ئاگالەخۆنەمان، بوورانەوە، بێهۆش بوون، لەهۆش خۆ چوون، بێ هۆش کەوتن، لەهۆش خۆچوون.
**بورە** (ئان) büre
بایەر، بوور، بوورە، بەیار، زەویی نەخت نەکراو، زەویی نەکێلراو. **بورا** (ئان) büra
بڕندە، تووژ، تیژ، خوڕ، کژ.
**بورگرتە** (کتپ،لو) bürgirte(lu)
بڕوان، بەسەردلازاڵ بوون، پێش کەوتن(لەیاریدا).
**بوشکول** (ن) buškul
١- بار، بوشکوول، پەژارە، خەفەت، خەم، دڵمایی، غەم، مەینەتیی. ٢- پەرۆش، تاو، سوو، سوێ، کز، کەسەر. ٣- ئێش. ٤- ئاهێن.
**بوغ** (ن) ١ büx
(ئاو لەدۆخی هەڵمدا)، بۆخ، بۆخە، بۆق، دووکەڵی گەرم، هەڵم و هەڵا.

**بوغ (ئان) ٢** büx̱
پیس (هەوا...).

**بوغرا (ئان)** büx̱ra
بایی.

**بوغرابوون (کتن)** büx̱rabün
لەخۆبایی بوون.

**بوغز (ن)** büx̱z
رق، قین، گین، کینە.

**بوغزاندن (کتپ)** büx̱zandin
خۆش نەویستن، رق لێ بوون، رک لێ بوون، رۆشک لێبوون، لێ بەقین بوون، لێ دەخەزبوون، لێ کرژبوون.

**بوغزلەسک (ئان)** büx̱z lesik
بوغزاویی، بەقیین، دڵ پڕلەقین، دڵ رەش، رقاویی، رق هەڵگرتوو، ناحەز، مرقن.

**بوق بەریی (ن.)** büqberî
ئازایی، دلازایی.

**بوکلە (ن.)** bukle
ب (بووک).

**بولبول (ن.م) ١** bulbul
ب (بلبل).

**بولبول (خ.) ٢** bulbul
١- بزمان، بەزمان، رەوان بێژ، زمان پاراو، زمان لووس. ٢- بێژەندە، چیرەدرێژ، زۆربلە، زۆربلێ.

**بولغار (ئان)** bul̠xar
جیبر، کاڵ، نەکوڵاو(گۆشت).

**بونجول (نک)** buncül
شتی نەفرۆشراو یان لەئامباردا دانراو.

**بونچاک (ن)** bunçak
خاقانیی، قاقانیی، قەواڵە.

**بونچینە (ن)** bunçîne
بنچینە، رەچەڵەک(خێزان)، نەوە.

**بونگە (ن)** bunge
ئامۆژگا، ئامۆژگە، بنگا، بنگەی زانیاریی، فێرگە.

**بوهر (ن)** buhir
بەش، بەهرە، پشک، جوون، قسن، قەت.

**بوێژ (ن) ١** bwêj
ئاخافتەر.

**بوێژ (ن) ٢** bwêj
جامەبێژ، شاعر، واتگەر، هەڵبەست بێژ، هۆنەر.

**بوێژ (ن) ٣** bwêj
بنووس، نووسەر.

**بۆ (ن) ١** bo
بۆن.

**بۆ (ن) ٢** bo
بیستان، پارچەزەویی، دیراوی شیناوەرد.

**بۆ (پر.ئاک) ٣** bo
ئەرا، ئەراچووی، بۆچ، بۆچی، بووچە، پچێ، پەی چیش، چرە، چما، چمان، رای، ژ، ژۆ، لۆچی، لەبۆ، لەبەرچی، وەرۆچیش.

**بۆ (پ) ٤** bo
١- ئەرا، پەی، رای، هۆ. ٢- پەرەی، لەبەر، لەپێناو. ٣- لەباتی، لەبریی، لەجیاتیی.

**بۆ (کد) ٥** bo
بڵێ!، بێژە!، بناخەڤە!، قسەبکە!.

**بۆبا (ن)** boba
بۆدرن، بۆگنخ، بۆگەمرخە، بۆن با، بۆنماوی (خوارده - مەنیی).

**بۆبابوون (کتن)** bobabün
بۆگنخ بوون، بۆن بابوون، بۆنماویی بوون، تام ویۆن گۆران (خواردەمەنیی).

**بۆبژاردن (کتپ)** bo bijardin
تۆڵە بۆ کردنەوە، چاک کردنەوە، خەرمانەپێدان، وەکوخۆی بۆ لێکردنەوە.

**بۆبلات (ن)** boblat
بەسەرهات، چورتم، رووشە، کارەسات، کۆستی گەورە.

**بۆپیاوی ژیر ئیشارەتێک بەسە (پن)**
bo piyawî jir - ešretêk bese
پیاوی دانا یەک جار سەرنجی رادەکێشرێ، دانابەدرکاندن.

**بۆت (ن)** bot
ب (ئاویارە).

**بۆت کردن (کتپ.کی)** bot kirdin(ki)
ئاشیف کرن، دەرهێنان، هەڵقاندن، هەڵقەندن، هەڵکەندن، هێنانەدەر.

**بۆتە (ن) ١** bote
بۆتقە، بودقە، گلێنەی کان تێداتواندنەوە.

**بۆتە (ن) ٢** bote
سەوزەڵان، سەوزەڵان وگوڵزار.

**بۆتە (ن) ٣** bote
تاقی کردنەوەیەکی سەخت.

**بۆتەنگانە (ف)** botengane
بۆ رۆژی رەش، بۆکاتی پێویست.

**بۆ تێ چاندن** (کتپ.ند) bo têçandin

١- بوختان (بۆکەسێ) کردن.

بوختان پێ کردن، قسەبۆکەسێ هەڵبەستن.

٢- ئیفتەرا پێکردن، بەکەم تەماشاکردن، بێبەهاکردن، شڵتاخ پێ کردن، کەسێ لەلای خەڵک شکاندن. ٣- پاشگۆتینیی کردن، لەپاشەملەباس کردن. ٤- تووش کردن، تێوەگلان، تێوەگلاندن، دوچارکردن، گرفتارکردن.

**بۆج** (ن) boc

١- بۆدج، بۆدیجە، بودیجە، (کاری ئابووری هەڵسەنگاندن). ٢- توورەکە، کیسە، هەگبە.

٣- ئەمبارکراو، داکردوو (نەختینە)، کۆکراوە (مالات).

**بۆجی** (ن) bocî

بوجی، تووتکە، تووتکەسەگ.

**بۆچاڵ** (ن.ئان) boçal

بۆچاڵ، بۆن چاڵ، بۆنماویی.

**بۆچ خومخانەیە!** (رس) boç xomxaneye

ئەوەندەئاسان نییە وەکوتۆ دەیلێیت، ئیجگار وابەئاسانی و زوو بەزوو جێی بەجێ نایێ (کاروبار...).

**بۆچک** (ن) boçik

١- پارەوپوول، پوول وپارە، داهات، دەوڵەت، سامان، ماڵ. ٢- بوونیی، بووەیی، تێروتەسەلیی، دەوڵەمەندیی، کاسەپڕیی.

**بۆچووم** (ن) boçüm

١- بەخامەنوسراو، خەت، دەستنووس، دەس نووس. ٢- جەغز، دیخ، دێڕ، نوسراو.

٣- بەڵگە، پەلپ، هۆ.

**بۆچوون** (کتن) boçün

١- بەرەوکەسێ یان شتێ ڕۆیشتن.

٢- ئەنجام لێ پەیداکردن، گەیشتنەئاکام (بەهۆی تاقیکردنەوە، هەڵسەنگاندنی ڕواڵەت)، لێک دانەوە، گەیشتنەئەنجام، وەزانیین، یاداوەریی کردن، یادبینیی کردن.

**بۆچی** (پر.ئاک) boçî

ب (بۆ).

**بۆخنک** (ن) boxink

١- پلوورە، پلووسک، چەمبلوولک، سوولاوک، سوولک، سوولی، سۆلین. ٢- چۆڕ، چۆڕاوگە.

**بۆدراو** (ئان) bodiraw

کوتراو، وێردکراو، هاڕاو.

**بۆ دۆستیی هەزارکەمە، بۆ دوژمنیی یەکێک زۆرە** (پن)

bo dostî hezar keme, bo dujminî yekêk zore

مەبەست خەتەرناکیی دوژمنە هەتا ئەگەر تەنها دوژمنێکیش بێ.

**بۆ دەسماڵێک قەیسەرییەک ئاگرئەدا** (رس)

bo-desmalêk qeyserîyek agir eda.

بۆدەسکەوتێکی بچووکی خۆی تاوانێکی گەورەدەکات، ئەوەندەخۆ پەرستەچاوی لەئاستی خەڵکدا نابینایە، بۆ تەنهاقازانجێکی خۆی مالی عالەمێک وێران دەکا، خۆپەرستە.

**بۆدینە** (ن.رو) bodîne

بودینە، پونگە.

**بۆر** (ئان) ١ bor

١- بیجیی، جەون، خاکیی، خۆڵەمێشیی، کەووگ، (ڕەنگ). ٢- ب (ئەسمەر، ١- **Tawny**).

**بۆر** (ئان) bor

بەحورمەت، بەحەیا، بەشەرم، شەرمین

**بۆر** (ئان) ٢ bor

بەجێهێڵراو، بەیار، تۆونەکراو، نەکێڵراو (زەویی).

**بۆر** (ئان) ٣ bor

بزر، پەنهان، شاراوە، گوم، نادیار، ون.

**بۆرایی** (ن) ١ borayî

پەڵەی بۆر، پەڵەی ڕەش باو.

**بۆرایی** (ن) ٢ borayî

تارمایی، ڕەشایی، ڕەشانکە.

**بۆربلو** (ئان) borbau

بۆرەلووکە.

**بۆردومان** (ن) bordüman

بۆمباباران.

**بۆرژان** (ن) ١ borjan

بیرەخەو، خەیاڵ پلاو، زیندەخەو، هەڵەت.

**بۆرژان** (ن) ٢ borjan

بیروهۆش، ڕێ بردنەسەریی، ڕێ‌پێ‌بەریی، سالۆزی، شیتی، وشیاری، هۆشمەندی، هۆش وبیر، هۆشیاری.

**بۆرەبنار** (ن) borebinar

دەمقالیی، دەمەقالێ، شەڕەدەنووک، قرەوبرە، لۆغەلۆغ.

**بۆرەپیاگ** (ن) borepiyag

ب (بۆرەپیاو).

**بۆرەپیاو** (ن) ١ borepiyaw

بۆرەپیاگ، بۆرەکە، پیاوی ئاسایی، مرۆڤی نەناسراو

و نادیار.

**بۆرەپیاو** (ن) ٢ borepiyaw

پیاوی گەلحۆ.

**بۆرەپیاو** (ن) ٣ borepiyaw

پیاوی واق وڕماو، مرۆڤی سەراسیمە.

**بۆرەپیاو** (ن) ٤ borepiyaw

پیاوی دەستەوستان، مرۆڤی دەسەوسان، یەکێکی تەمەڵ.

**بۆرەخزم** (ن) borexizim

بیانی، بێگانە، نائاشنا، ماڤیی.

**بۆرەزەلام** (ئان) ١ borezelam

کەسێکی نەناسراو.

**بۆرەزەلام** (ئان) ٢ borezelam

پێگەیشتوو (لاو).

**بۆرەزەلام** (ن) ٣ borezelam

مرۆڤی هیچ وپووچ

**بۆرەزەلام** (ن) ٤ borezelam

پیاوی تێک سمراو، پیاوی کەتەی گەورە، پیاوی ناوشان پان، شینەزەلام.

**بۆرەسوار** (ن) boreswar

١- سوارێکی نەشارەزا. ٢- سوارێکی نەناسراو یان نادیار، سوارێکی لات، لاتەسوار.

**بۆرەقنە** (ئان) boreqine

ب (بۆرەلووک).

**بۆرەلووک** (ئان) borelûk

بۆرباو، بۆرکار، بۆرەقنە، بۆرەواش، قاوەیی، مەیلەوبۆر.

**بۆریە** (ن) borye

١- پێکە، قامیش، قەمیش، لەڤەن، لیلک، نەیجە.
٢- بالۆل، بۆریک، گونج، لوولە.
٣- بۆری، زوڕنا، شیپوور.

**بۆریی** (ن) ١ borî

بۆریە.

**بۆریی** (ن) ٢ borî

بۆرەقنەیی، مەیلەوبۆریی.

**بۆریی** (ن) ٣ borî

بلۆر، بلوێر، شمشاڵ، لوولە، نای.

**بۆریی هەوا** (ن) borî hewa

حەنک، قرقرتۆکە، قرقروچکە، قورقوراگە، قوڕوو، هەفک.

**بۆڕ** (ئان) ١ bor̲

بەزان، بەزیین، تێقاچان، تێشکاوی، ڕەڤ، ڕەم، ڕەو، ژێرکەوتەیی، قووچان، هەڵاتن.

**بۆڕ** (ئان) ٢ bor̲

گڕ (دەنگ)، گەورە (دەنگی مرۆ).

**بۆڕ** (ن) ٣ bor̲

کۆمەڵەپووش یان (کا) میوەهاتی لەژێردا هەڵدەگیرێت.

**بۆڕ** (ئان) ٤ bor̲

گرە، مەنگەنە.

**بۆڕاندن** (کتن) bor̲andin

-١بۆڕان، بۆڕەبۆڕکردن، قۆڕان (ڕەشەووڵاخ).
٢- دەنگی بەرزلێوەهاتن، نەڕاندن وەک ئاژەڵ.

**بۆڕبۆڕێن** (ن) bor̲bor̲ên

پێش برکە، تەڕاتێن، خوڕ (بۆهەمان شت).

**بۆڕ خواردن** (کتن) bor̲xwardin

١- بەزان، تێشکان، تێقاچان، هەڵاتن.
٢- دەمکووت بوون، زەبوون بوون، قسەپێ نەمان.

**بۆڕدان** (کتپ) bor̲dan

١- بەنەرزدادان، بەزاندن، تێشکان، تێشکاندن، ژێرخستن، شکاندن (کەسێ). ٢- دەمکووت کردن، قسەپێ نەهێشتن. ٣- یاری لێ بردنەوە.

**بۆ ڕۆژی ڕەش (شت) هەڵگرتن** (ند.)

bo r̲ojî r̲eš (šit- hel̲girtin

بۆتەنگانە شت هەڵگرتن، شت هەڵگرتن بۆ کاتی پێویست.

**بۆڕە** (ن..خ.) bor̲e

١- دەنگی پاتاڵ، دەنگی ڕەشەووڵاخ . قۆڕەی گا (ن). ٢- دەنگی ناخۆش، دەنگی ناساز، (نادەمیزاد) [خ].

**بۆڕیش چوو، سمێلی نایەبانیی** (رس.)

bo r̲îš çü, smêl̲î nayebanî

چوو بۆ ڕیش سمێلی نایەبانی، چوو بۆ خوری خۆیان گروو، کۆستە چوو بۆ ڕیش سمێلی نایەبان، بەیەکێک دەووترێ کەبۆ دەسکەوتێ هەوڵ بدا بەڵام بەدەستی بەتاڵ بگەڕێتەوە.

**بۆڕێ کەوتن** (کتن.) bor̲êkewtin

ب (بۆ لووان).

**بۆڕیە** (ن.) bor̲ye

بۆڕی، بۆق، بووق، کەڕەنا.

**بۆز** (ئان.) ١ boz

خۆڵەمێشی، ڕەشوسپی (قژ)، ڕەساسی، زیوی، سەرسپی، غزسپ، ماش وبرنج، هەوری.

**بۆز** (ئان) ٢ boz
چوەوە (ڕەنگ).

**بۆژۆ** (ئان) ١ bojo
١-ئالوودە. ٢- بۆگە، بێزار، نارەحەت، هەراسان.

**بۆژۆ** (ئان) ٢ bojo
بۆژە، بۆگە، بزرکاو، بۆن خنکاو.

**بۆژۆ** (ئان) ٣ bojo
ژاکاو، تێکەڵ، هیچ بەسەر هیچەوە نەماو.

**بۆژۆ** (ئان،ن) ٤ bojo
بـــۆژە، خراپـــکار (ئـــافرەتێ هەردەمــــە بـــە بەرێناویکەوەبێ) ، سۆزانیی، قەپاتمە.

**بۆژۆ** (ن) ٥ bojo
شاڵ.

**بۆژۆکردن** (کتپ) bojo kirdin
١- بـۆژەکردن، بێزارکـردن، سـەرکردنە سەرکەسـێ (بەووتەووت)، هەراسان کردن، هەراس کردن.
٢- ئەمسەر وئەوسەرپێ کردن (بەکەسێ).
٣- چەواشـــەکردن، ڕێ لێ گـــوم کـــردن، ســـەرلێ شێواندن، گومراکردن.
٤- ب (ئیشاندن / ٢ - Hurt ).

**بۆژە** (ن) boje
بۆژە، بۆژلیی، بێزاریی، نارەحەتیی.

**بۆسار** (ئان، ن) bosar
بۆگـەن، بۆگـەنتک، بۆگەنـدیی، بۆگەنکـە، بووگـەن، بۆگەنیک، بۆمچـەوە، بـۆن سـارد، بـۆن کـردوو، بـۆن ناخۆش، بیگەن، بیهن کردی، زیخ. بۆ سارد، بـۆدڕ، بۆکەنیو، بۆمچ، بۆنی ناخۆش، کف، کفکۆ، گفگۆ.

**بۆسارد** (ئان، ن) bosard
ب (بۆ سار).

**بۆسۆ** (ن) boso
١- بۆ چرووک، بۆنسۆ، بۆکروون، بـۆن کـروون، بـووی سووتیاگ، بیسو، بیسوو.
٢- (بۆنی ماستێ کەشیرەکەی زۆر کوڵا بێ)، بۆکن، بۆکس، بۆسیی، بۆنکن، تام سۆ .

**بۆسۆلێ هەستان** (کتن) boso lêhestan
بۆنسۆ لێ هەڵسان، بۆن سووتاویی لێ بەرزبوونـەوە، لەسەرخۆسووتان.

**بۆسۆلێ هەستان** (کتن) boso lêhestan
١- ووتەی ناشیرین ئاراستەی کەسێ کردن.
٢- دەنگ وباسی ناراست بڵاوکردنەوە.

**بۆسە** (ن) bose
١- بووسـە، پـۆرگە، پـەناگە، حاشـارگە، حەشـارگە، کولین، کەلین، کەمین.
٢- کۆمەڵەســـەرباز یـــان کەســـانێکی دیکـــە لە حەشارگەدا بۆ هێرش بردنێکی سەر سوڕهێنەر.
٣- کاری خۆمات دان بۆ هێرش (بردن).

**بۆسە دانان** (کتن،کتپ) bose danan
١- حەشارگە دانان.
٢- بووسـەخواردن، خـۆ حەشـاردان (بـۆ مەبەسـتی ئابلۆقەی لەپڕ)، خۆ خستنەکەمینەوە، خۆئـارنەوە لە بۆسەدا، خۆلەبووسەدان، کەمین کردن. ٣- هێرش بردنەسەر دوژمن لەناوبۆسەوە.

**بۆش** (ئان) ١ boš
١- بەتاڵ، خالیی، زۆن، ڤالا.
٢- پووت، پووچ، پووکە، هلۆڵ.
٣- بێ خێر، بێ هودە، فش.
٤- خام، نەفام، هیچ نەزان.

**بۆش** (ئان) ٢ boš
زۆن، گلک، گەلەک، گەلیک.

**بۆش** (ئان) ٣ boš
چۆڵ، چۆڵەوان، سارا.

**بۆشایی** (ن.) bošayî
١- بەتالیی، خالیتیی، شوێنی چۆڵ، مـەودای چـۆڵ.
٢- ئاسمان، گەردوون.
٣- ماوە، نێوان. ٤- شوێنی بەتاڵ یان خالیی.

**بۆشناخ** (ئان.) bošnax
١- جوان، قشت، قشتیلە، نەشمیل.
٢- بالابەرزوچوارشانە، جوان وساکار، کۆک (مرۆ).
٣- پۆشتە وپەرداخ، حاڵ خۆش، ڕێک وپێک (جـل و بەرگ).

**بۆغ** (ئان) ١ box
بەنگین، چاوسوور.

**بۆغ** (ئان) ٢ box
بوغرا، بۆنگ، غەرا، لەخۆبایی.

**بۆفک** (ن) ١ bofik
١- یارمـەتیی، یاریـدە، یاریکـاریی، هاریکـاریی. ٢- چارە، چارەسەر، چارەسەریی.

**بۆفک** (ن) ٢ bofik
( n. ). چنگ،گولم، مست، مشت.

**بۆفلسێک بەئاسماندا دەچێت** (رس)
bofilsêk be- asmanda deçêt
بێ‌ـپوول وپـــارەیە، پێداویـــستە، نابووتـــە، هـــەژارو نەدارایە.

**بۆق** (ن) ١ boq

بەق، قورواق، قیرناویلکە، هەفتجار.

**بۆق** (ن) ٢ boq

پاڵ، کزی، لەتر، کاری ڕادانی کەسێ یان شتێ.

**بۆق** (ن) ٣ boq

چاودەرپەڕیگی، چاو دەرپەڕیوی، چاودەرپۆقیوی، چاوزەقی.

**بۆق پێوەنان** (کتپ) boq pêwenan

پێش‌دان، پاڵ پێوەنان، دانەپێش، ڕادان، لەترپێ دان.

**بۆقڕاندن** (کتپ) boqirandin

١- نیازی خراپ دەرپەڕاندن (بۆ کەسێ).

٢- ئاواتی خراپە بۆ خواستن.

٣- نوقڵانەی خراپ لێدان.

**بۆق مل** (ن) ١ boq mil

بۆقەتە، بۆقەتەی مل، بۆقی مل، پڕمل، پشت مل، پشتی مل.

**بۆق مل** (ن) ٢ boq mil

دەرپەڕیو، زەق، هەڵتۆقیو.

**بۆقل** (ئان) boqil

١- شل، شلک، نەرم. ٢- مژۆک.

**بۆقە** (ن) ١ boqe

هەلاساو.

**بۆقە** (ن) ٢ boqe

مرقە (دەنگی بەراز).

**بۆقەتەی مل** (ن) boqeteymil

سێوی ئادەم، کەڵەبابەی مل.

**بۆقەتەی مل گرتن** (کتپ،ند) boqeteymil girtin

دەس خستنە بین بەنیازی ڕووت کردنەوە، دەس نانەبین بەنیازی ڕووت کردنەوە.

**بۆکران** (کتن) bokiran

بۆ لووان، پێ کران، سەرکەوتن لە، شیان.

**بۆکز** (ن) bokiz

١-بۆ پرووز، بۆکرووز، بۆنکز، بۆنی شتی سووتاو، بێهن زویرهە.

٢- بۆنی چێشتی سووتاو، تام دووکەڵ.

**بۆکس** (ن) bokis

چەپۆک (بەدەستی نوقاوەوە)، کولمە، کوڵەمستە.

**بۆکوێر شەو وڕۆژ چۆن یەکە** (رس) bo kwêr šewü roj çon yeke

١- بۆ نابینا تاریکی وڕووناکی وەک یەک وایە، بێ هودەیە باسی تاریکی وڕووناکی بۆ کوێر بکرێ.

٢- بنگێ: بەرد ومرواری بۆ پیاوی کوێر چۆن یەکە، واتە: نەزانینی تاریکی یە بۆ بیر وهۆش.

**بۆگە** (ئان) ١ boge

١- بەتین، بەهێز. ٢- ئازا .

**بۆگە** (ئان) ٢ boge

ـیار (لەناوکۆمەڵدا)، گەورە یان مەزن(مرۆڤ).

**بۆگەن** (ئان) ١ bogen

ئالۆس.

**بۆگەن** (ئان) ٢ bogen

کۆنە پەرست (کەسێ یان ڕژیمێک).

**بۆگەن** (ئان) ٣ bogen

بەدخوو، نارەوشت.

**بۆگەن بوون** (کتن) bogen bün

ب (بۆگەن کردن).

**بۆگەن کردن** (کتن) bogen kirdin

بۆگەن بوون، بۆگەنیوبوون، بۆن کردن، بۆن لێ پەیدابوون، بون لێ هەستان، تێکچوون، خراپ بوون، زنخ بوون، کف بوون، کف کردن، کف هەڵهێنان، کەڕوو کردن، کەڕوو هەڵهێنان.

**بۆگەنکە** (ن) ١ bogenke

مشکی خورما..

**بۆگەنکە** (ن،رو) ٢ bogenke

بۆگەنی، خورما سیچان (ڕووەکێکی بۆگەنە).

**بۆل** (ن) ١ bol

بەشێ لەڕانەمەڕ.

**بۆل** (ن) ٢ bol

بسەرخۆیی، سەربەخۆیی، سەربەستیی.

**بۆلک** (ن) bolik

تەپڵەسەر، تەپڵی سەر، تەوقەسەر.

**بۆلوان** (کتن) bolwan

١- باش بۆ هاتن (لەکاردا)، بۆ ڕێک کەوتن، بەختەوەر بوون لە، چاک بۆهەڵکەوتن، سەرگرتن.

٢- بۆ کران، پەڕژان، ماوەبوون، ماوەهەبوون.

**بۆڵ** (ن) ١ bol

دەنک، کلۆ، گلوو، گلە، گلێ.

**بۆڵ** (ن) ٢ bol

زەنگێکی زلی ملی ئێسترە.

**بۆڵ** (نک) ٣ bol

خۆڵەمێش.

**بۆڵ** (ئان) ٤ bol

پێ گەیشتوو، پێگەییو (میوە)، گەییو(ترێ، خورما).

**بۆلاندن** (کتن.کتپ) bolandin

١- بۆلانن، بۆڵەبۆڵ کردن، بۆڵەکردن، خوتەخوت کردن، خوتەکردن، ناڕەزایی دەربڕین.

٢- دەنگێ لێوەهاتن(وورچ، کاتی تووڕەبوون)، مرەمرکردن، مرەکردن.

٣- تێ خوڕیین، دواندن(کەسێ) بەرووتەی نابەجێ، سەرزەنشتیکردن، هەڵەلێ دۆزینەوە.

**بۆڵە** (ن) bole

١- خوتە، مرە. ٢- ناڕەزایی، ناقایلیی.

**بۆڵە بۆڵ** (ن) bole bol

بۆڵەی زۆر، بۆڵەی یەکێ لەدوای یەکێ، خوتەخوت، مرەمر.

**بۆڵەبۆڵ کردن** (ن) bolebol kirdin

(بۆلاندن).

**بۆڵەکردن** (ن) bole kirdin

ب (بۆلاندن)..

**بۆمادەران** (ن.رو) bomaderan

برنجداس، بۆمارانە، سیرمۆکە (جۆرە گیایەکەشتی پێ دەشۆرێ).

**بۆماوە** (ن) bomawe

پاشماگێ، پاشماوە، پاشماوەی مردوان، پێ‌ئێبراو، میراتیی.

**بۆمیچ** (ن) bomiç

بۆسار.

**بۆن** (ن) bon ١

١-بۆ، بووە، بوهن، بهن، بێن، بێهن.. خۆش یا ناخۆش. ٢- هەستیاریی بۆن.

**بۆن** (ن) bon ٢

دەوس، شوێن پێ، شوێن دەوس.

**بۆن** (ن) bon ٣

هەناسە(بەلووت)، کاری هەڵمژین (بەلووت).

**بۆن بەردانەوە** (کتن.کتپ) bon berdanewe ١

باو بڕێ ناوسکێ بەردانەوە: تر کەندن، تس بەرەلاکردن، تس کەئن..

**بۆن بەردانەوە** (کتن) bonberdanewe ٢

بۆگەن کردن، بۆن کردن، بۆن لێ هاتن.

**بۆن بەردانەوە** (کتپ) bonberdanewe ٣

شت سوور کردنەوە و بلاوبونەوەی بۆنەکەی.

**بۆن پێ دان** (کتپ) bon pêdan

ننیوە برژاندن،نیوەبرژ کردن (خواردەمەنیی).

**بۆن پێوەکردن** (کتپ) bon pêwekirdin

بۆنی شت هەڵمژیین، شت تاقی کردنەوە بەهۆی بۆنەکەیەوە، شت لەلووتی خۆنزیک کردنەوە (و هەڵمژینی بۆنەکەی).

**بۆنچی** (ن، ئا) bonçî

تاجیی، تازی، تانجی.

**بۆنخۆش** (ئان) bonxoš

١- ب (بۆندار). ٢- بۆنی خۆش پێوەکراو.

**بۆندار** (ئان) bondar

بۆنخۆش، بۆوەش، بوهندار، بێنخۆش، بێندار، بیهندار.

**بۆندان** (کتپ) bondan

بۆن پێ دان، بۆن پێوەکردن.

**بۆن دانەوە** (کتپ.ئد) bon danewe

١- بۆن بلاوکردنەوە بۆن لێ هاتن، (کتپ).

٢- چراوەچراو بلاوبوونەوە، دەنگێ ودووکەوتنەوە، قاوەقاو بلاوبوونەوە، مقۆمقۆبلاوبوونەوە، واتەوات بلاوبوونەوە.

**بۆندزە** (ن) bondize

بارووتدان، قوم قومەی بارووت.

**بۆنسۆ** (ن) bonso

بۆسۆ.

**بۆن کردن** (کتن.کتپ.ئد) bon kirdin

١- هەست بەبۆن کردن، هەستیاریی بۆن بەکارهێنان.

٢- بۆ کردن، بۆگەن بوون، بۆگەن کردن، بۆن لێ هاتن.

٣- شت لێ تێگەیشتن(لەمەبەست و وشەی ناخاوتەر)، هەست پێ کردن(بەشتێ)، (ئد).

٤- ب (بۆن پێوەکردن).

**بۆنگ** (ن) bong ١

دەباغی،کردنەوە وخۆش کردنی پێستە.

**بۆنگ** (ئان) bong ٢

بۆغ، بوغرا، غەرا.

**بۆنگچیتی** (ن) bongçêtî

(پیشەی پێستەخۆش کردن)، دەباغچیتیی.

**بۆنگ کردن** (کتپ) bongkirdin ١

١- پێستەخۆش کردن، جەوت لێدان، دەباغ کردن (پێستە). ٢- بۆرکردن، قاوەیی کردن (بەهۆی خستنە بەرهەتاو).

بوغرابوون، خۆهەڵتراندن، لەخۆبایی بوون.

**بۆنگ کردن** (کتپ) bongkirdin ٢

پاڵ پێوەنان، جووڵاندن، هاندان.

**بۆنگە** (ن) bonge

دەماخ، کەپوو، کەپۆ، لووت.

**بۆن وبەرام** (ن) bon w beram
ب (بۆن وبەرامە).

**بۆن وبەرامە** (ن) bon w berame
١- بۆ بەرامە، بۆن وبەرام، بۆنی خۆش، بۆ وبەرام، بەرامە، بۆی وەش، هەلاو وبۆنی خۆش.
٢- بۆنی ناخۆش. ٣- بۆن.

**بۆنە** (ن) bone [١]
١- سەبارەت، هۆ. ٢- ئامانج، مەبەست.

**بۆنە** (ن) bone [٢]
بیانک، بیانگ، بیانوو، بەهانە، دەساویژ، دەستاویژ، دەست هاویژ.

**بۆنە** (ئپ) bone [٣]
بۆخاتر، بە، بەهۆی، چونکە، دۆز، لەبەر، لەسەر.

**بۆنە** (ن) bone [٤]
نزیکیی، نیزیکیی، نێزیکیی.

**بۆنەگرتن** (کتن.کتپ) bonegirtin
بەهانەگرتن، بیانووگرتن، پەلپ گرتن، پەلپ وبیانوو پێ گرتن.

**بۆنی پێوەناکەیت** (ند) bonî pêwe nakeyt
هەرگیز دەستت ناکەوێ(شت)، هەرگیز کەلکی لێ وەرناگریت.

**بۆنی شیریخاو لەدەمی دێ** (ند)
bonî šîrîxaw ledemî dê
بەتەمەن منالە، گەنجە، هەرزەکارە.

**بۆ هاتن** (کتن.ند) bo hatin [١]
١- بەختەوەربوون، سەرکەوتن(لەشتێکدا)، لەشتێکداسەرکەوتن، لێدان.
٢- بەدەس گەیشتن، پێ گەیشتن، نەخش هێنان.

**بۆ هاتن** (ند) bohatin [٢]
جوان نواندن، ڕێک وپێک بوون، دەرکەوتن، سپۆرت دەرکەوتن.

**بۆ هەلسووڕان** (ند) bohelsüran
بەڕێوەبردن، جێ بەجێ کردن، لەسەریەردەوام بوون.

**بۆ هەموو مەبەستێ دەست ئەدا** (رس)
bo hemü- mebestê dest eda
بۆ هەموو شتێ دەبێ، سوودبەخشە، شتێکی باشە.

**بۆی ئەهۆنێتەوە {یان بۆ هۆنینەوە}** (رس)
boy- ehonêtewe
١- پرچی لوول ئەدا، قژی بۆ دەکابەپرچ، قژی بۆ دەهۆنێتەوە. ٢- قسەبۆ هەلبەستن، لای خەلک بەخراپەباسی کەسێ کردن. ٣- تاوان بۆ ڕێک خستن. ٤- کەسێ هەلنان(تێک دان).
٥- خستنەژێر لێ پرسینەوە.

**بۆیاخ** (ن) boyax
١- بۆیاغ، مان، واکسی پێلاو. ٢- بۆیە، ڕەنگ، وارنیش (دەرمانی ڕەنگ کردنەوە).

**بۆی برۆ** (ند، کد) boy biro
بچۆرە ژێری، پەسەندی بکە، پەسەندیکە، دلفرەبە.

**بۆی پینە دەکا{بۆ پینەکردن}** (ند)
boy pîne deka
خراپەی بۆدەشاریتەوە(خراپە بۆ کەسێ شاردنەوە)، کەم وکوڕیی بۆ دەپۆشێ (کەم وکوڕیی بۆ کەسێ پۆشیین).

**بۆیە** (ئپ، ئاک) boye [١]
بۆیەکە، بۆیەکا، بۆیەکان، بۆیەکانێ، بۆیەکو، بۆیەکە، لەبەرئەم هۆیە، لەبەرئەوە.

**بۆیە** (ن) boye [٢]
بۆیاخ.

**بۆیە پێت دەلێم کاکە، چۆلەکەم بۆ بگریت** (رس)
boye pêt delêm kake çolekem bo bigrî
گەر بەرژەوەندیم ڕاپەڕێنیی منیش پشتگیریی بەرژەوەندیت دەکەم. واتە: چاکە بەچاکەوەیە (چاکەلەچاکە دەبێتەوە).

**بۆ یەکتر دەرکەوتن** (ند)
bo yektir derkewtin
ب (لێک ئاشکرابوون).

**بۆیەکێ بمرە بۆت بمرێ**(رس)
boyekê bimre botbimrê
چاکە لەگەل یەکێکدا بکەکەئەویش چاکەبەرامبەرت بکا، چاکەلەچاکە دەبێتەوە.

**بوو** (کر) bü [١]
پەیدابوو، ڕوویدا، قەوما، هاتەکایەوە، هەلکەوت.

**بوو** (ن.م) bü [٢]
بایەقوش، بووە، بووەتەقلە، بووەکوێرە، بووەکەڕە، بەبوو، کوندەبەبوو.

**بوو بەئاو** (کر) bübe aw [١]
١- توایەوە(بەهۆی گەرماوە).
٢- گوم بوو، وون بوو، نەما.

**بوو بەئاو** (ند) bübe aw [٢]
١- لاواز بوو، لەڕبوو. ٢- زۆر نەرم بووە.

**بوو بەئاو** (ند) bübe aw Abas [٢]
بەخۆیداشکایەوە، تەریق بووەوە، شەرم گرتیی،

شەرمی کرد.

**بوو بە پەرۆی بۆسۆ** (ئد) bü be peroy boso

بەد ناوبوو، ناوی زڕا.

**بوو بە جەنگی مەغلووبە** (ئد) bü be cengî mexlübe

١- بوو بەهەرا وزەنا. ٢- بوو بەیەکدا چوون.
٣- هیچی بەسەر هیچەوەنەما.
٤- بوو بەشەرەدەنووک و چەنەچەن.
٥- بوو بەجم وجۆڵ وهاتوچۆ.
٦- دام ودەزگای تێکچوو.

**بوو بە خوێنی سیاوەخش** (ئد) bü bexwênî siyawehş

١- بوو بەهۆی ئاژاوەیەکی بەردەوام.
٢- بوو بەهۆی دوژمنایەتیەکی چەسپاو وبێ کۆتایی.
٣- بووبەهۆی هەست بریندارکردنیکی بێچارە.

**بوو بە ریشیەوە** (ئد) bü be rîşyewe

١-تووشی نارەحەتی بوو یان تووشی تالووکەبوو.
٢-لەکاریکەوە گلاوە. ٣- دووچاربوو، گرفتار بوو.

**بوو بە کورتانەکەی جەجاڵ** (ئد) bübe kurtaneky cecal

بوو بەشتیکی بێ بەرەودوا (ئیشیکی بەردەوام و بە ئەرک)، کاریکی بێ پایان.

**بوودڕ** (ن) büdir

(ئەشکەوتی بچکۆلە)، کون، کۆلیت، کەلەبەر.

**بوودەلە** [1] (ئان) büdele

بوتەلە، بۆدەلە، بوولە، بێبەهرە، بێ نموو.

**بوودەلە** [2] (ئان) büdele

١- بوولە، پەخمە، سەپوول، سەپۆل، گەلحۆ، گەوج، گێژ، لەگام، نەزان، هوفە. ٢- دەس وبێ سپی(مرۆف)، هیچ لەدەس نەهاتوو.

**بوودینە** (ن،رو) büdîne

ب (بۆدینە).

**بووردن** (کتپ) bürdin

ب (بووردن).

**بووڕین** [1] (کتپ) bürîn

بووردن، بەخشین، بهورتن، پۆشین، چاوپۆشی کردن، چاولێ پۆشین، خۆش بوون، لێ بووردن، لێ بووڕین، لێ خۆش بوون، نۆبەخش کردن، وەش کردن.

**بووڕین** [2] (کتپ) bürîn

رابووردن(کات)، بەسەرچوون.

**بووژاندنەوە** (کتپ) büjandinewe

١- راست کردنەوە(بێ رۆح)، زیندووکردنەوە، ژیاندنەوە، گیان وەبەرهێنانەوە، هەڵساندنەوە، هێنانەوە ژیان. ٢- قوت کردنەوە، هێنانەوەکایە، هێنانەوەگەڕ، وەباوخستنەوە، وەگەڕهێنانەوە.
٣- بەهێزکردنەوە، هێزهێنانەوەبەر.

**بووژانەوە** (کتن) büjanewe

١- زیندوو بوونەوە، گیان وەبەرهاتنەوە، گیان هاتنەوەبەر، هەڵسانەوە (دوای مردن).
٢- هاتنەوەسەرخۆ، هاتنەوە هۆش خۆ.

**بووسە** (ن) büse

کەلەمە(لە ئامرازی جووت).

**بووسە خواردن** (کتن،کتپ) büse xwardin

ب(بۆسە دانان).

**بووک** [1] (ن) bük

بوویک، بویی، بیتی، بیی، سوور، وەویی، وەویلە، (ئافرەتی تازە شوو کردوو یان لەسەر شوو کردن).

**بووک** [2] (ن) bük

بوکلە، بووکەسوماکەرە، بووکەشووشە، بووکۆک، بووکۆکە، بەبۆکە، قەرەقۆز.

**بووک** [3-] (ن) bük

داوەل، داهۆڵ.

**بووک** [4] (ن) bük

چارەچەقیلە، گانگلۆک، گولالەسوورە.

**بوولێلە** (ن) bülêle

١- زەردەپەر (تارمایی شەوپاش ئاوابوونی رۆژ لەئاسۆ)، سەرلەئیوارە، بوولێل (تاریکایی دوای خۆرئاوا - پێش ئەوەی دنیا بەتەواوی تاریک بێ).
٢- تارمایی، لیلی، مەیلەو رەش.

**بووم** [1] (ن) büm

١- ئەرز، خاک، زەویی، زید. ٢- نیشتمان، وولات.

**بووم** [2] (ن) büm

تەن، قەلافەت، لەش.

**بوون** [1] (کتن) bün

هەبوون، هەبیین.

**بوون** [2] (کتن) bün

پێ گەیشتن، گەیشتن، گەیین (میوە).

**بوون** [3] (ن) bün

بوین، بویین، بیین.

**بوون** [4] (ن) bün

خوستان، دنیا، گیتهان، گیتیی.

**بوون** (کتن) bün
ڕووان، ڕەگ داکوتان، سەوزبوون، شین بوون.

**بوون بەئاو** (کتن، ئد) bün be aw
١-تاوانەوە، توانەوە تۆڵانەوە، خیوارانەوە، هومیین.
٢- ئیجگارتەڕبوون، تەڕبوون.
٣- زۆر کەو بوونەوە، مەحف بوونەوە،نەمان.
٤- پۆت کەوتن، تەریق بوونەوە، شەرم گرتن(ئد).

**بوون بەڕیشەوە**(ئد) bün be rîšewe
ئاوریش بوون.

**بوونەوە** (کتن) [1] bünewe
دووپات بوونەوە، دەس پێ کردنەوە، سەرلەنوێ ڕوودانەوە.

**بوونەوە** (کتن) [2] bünewe
بووژانەوە، کەوتنەوەسەرخۆ.

**بوونەوە** (کتن) [3] bünewe
تازەبوونەوە، نوێ بوونەوە.

**بوونەوەر** (ن) [4] bünewer
ئافەریدە، مرۆڤ، مزۆ.

**بووە** (کر) [1] büewe
ڕووی داوە، قەوماوە.

**بووە** (ئان) [2] büwe
حاڵ خۆش، خاوەن پارە، دارا، دەولەمەند، ماڵدار.

**بووەبە (بۆتە) ئاردی ناو دڕکان** (ئد)
büwe be (bote) ardî naw dirkan
بەهەموولایەکدا بلاوبۆتەوە، پەرش وبلاوبۆتەوە.

**بووەبە (بۆتە) ئەستێرەی سیوەیل** (ئد)
büwe be (bote) estêrey sîweyl.
بەیەکیک دەووترێ کەسەردانی خەلک بکات بەلام زۆرنا، هەروەها مەبەست مرۆڤیکی جوان خاس، ژیکەلە یان ڕیک وپیکە.

**بووەبە (بۆتە) داری پەلک** (ئد)
büwe be (bote)- darî pelk
بەکاردەهینرێ بۆ یەکیکی: بێ فەڕ یان شتیکی بێبەر.

**بووەبە (بۆتە) داسک ودەرزی** (ئد)
büwe be (bote) dask w derzî
زۆر لاوازبوون (بەهۆی نەخۆشیی یان بێ خواردنی یەوە) واتە:- ١- نەخۆش، ناساغ، ناتوان.
٢- دالگوشت، لاواز.

**بووەبە (بۆتە) قەرەبرووت** (ئد)
büwe be (bote) - qerebirüt
ڕەش داگەڕاوە، ڕەش هەلگەڕاوە، زۆر ڕەش بووە.

**بە** (پ) be
١- بەبۆنەی، بەهۆی، ژوی، لەو، لەورا.
٢- دە، لە، لەدەمی...، لەکاتی.
٣- پیکەوە، پەرپی، دەگەڵ، لەتەک، لەگەل، لەیەل، ویکرا. ٤- بەرەو، لەحاست، لەراست، لەعاست.

**بە ئارامیی** (ئاک) be aramî
بە ئەسپایی.

**بە ئاسماندا چوون {چوون بە حەوادا}** (ئد)
be asmanda çün (çün be hewada)
١- تووڕەبوون، هەلچوون. ٢-داچلەکیین، ڕاپەڕیین، ڕاچلەکیین، هەل سلەمیینەوە.
٣- پاشەکشەکردن، وورەبەردان.

**بە ئاس وپەلاسدا چوون** (ئد)
be as w pelasda çün
سوێند بۆ خواردن، سوێند خواردن.

**بە ئاگا** (ئان) be aga
ئاگادار.

**بە ئاگاهاتن** (کتن) beagahatin
١- هاتنەوە هۆش خۆ (مرۆڤ).
٢- ب (ئاگابوونەوە).

**بە ئالۆش** (ئان) bealoš
ئالۆشاویی.

**بە ئاوات گەیشتن** (کتپ،ئد) beawat geyštin
بەمەبست گەیشتن، گەیشتن بەمەبەست.

**بە ئاودادان** (کتپ، ئد) [1] be awda dan
١- تەخشان وپەخشانکردن.
٢- ئەبلەخەرجیی کردن، بەکەم تەرخەمیییەوە پارە خەرج کردن، دەس بلاوی کردن.
٣- بەفیرۆدان، بەهەدەردان، زایەکردن، لەبەردان، لە دەس دان، لەناوبردن.

**بە ئاودادان** (کتپ) [2] be awdadan
بەئاوادان (ڕوبار، دەریا...)، بەدەم ئاوەوەدان.

**بە ئۆک** (ئان) [1] be ok
بەد، خراپ، خراپکار، زەرەردەر، کوشندە، نالەبار، وەیدەر سەربەگژبەند.

**بە ئۆک** (ئان) [2] be ok
ئیسک قورس، ناشرین، ناشیرین.

**بە ئەرک** (ئان) be erk
١- سەنگین، قورس، گران، شتێبە نارەحەت بەرز بکرێتەوە.
٢- بەئازار، پرئیش وئازار، پرنارەحەتیی.
٣- گران(ئیش)، نارەحەت (کاروبار).

**بەرچەوەنگ کردن** (کتپ)
berceweng kirdin
بەراوورد کردن، تێ رامان (لەئاخاوتن)، چاکەوخراپەبەراوورد کردن.

**بەرچاڤک** (نک،کی) berçavik(ki)
ئەینەت، چاویلکە، عەینەک.

**بەرچاو** (ن) berçaw ١
ئاست، بەر، پێش، حاست، حانا، ڕێگە.

**بەرچاو** (ن،ئان) berçaw ٢
١- پێش چاو، پێشگار، مەقبەر، مەمبەر.
٢- ئاشکرا، بەردەم، پەیدا، خویا، دیار، شتیار.
٣- چاو ئەنداز. ٤- بینگار، چاوگار.

**بەرچاو تاریک بوون** (کتن،ئد)
berçaw tarîk bûn
١- باش نەبینین.شت بەلێلی بینین.
٢- تووڕەبوون، ڕق هەستان، شت پێ ناخۆش بوون، گرژبوون(لەرووی بینینی هەڵەیەکەوە یان جەورەوە). ٣- قین هەستان، کین دەربڕین.

**بەرچاوتەنگ** (ئان) berçaw teng
١- بەرچاوتەسک، بیر تەسک. ٢- چرووک، دەس گرتیی، مست قووچاو. ٣- دنیا بەگران گرتوو، ڕژد.
٤- سەرسوالکەر، ناکەس.

**بەرچاو تێر** (ئان) berçaw têr
١- بەدەست ودل، دلفراوان، دل گوشاد.
٢- خێرخوا، خێرکەر، نانبد، ناندەر.

**بەرچاوخستن** (کتپ) berçawxistin
ئامادەکردن(شت)، خشتنەبەرچاو، خشتنەپێش چاو، خستنەڕوو، نیشان دان(شت بەکەسێ)، هێنانە ڕوو، وەدەرخستن.

**بەرچاوکە** (ن.) berçawke
بەرچاوگە، بەرچاوە، پێش چاوکە(ئەسپ).

**بەرچاوکەوتن** (کتپ.) berçaw kewtin
بینیین (بەرێکەوت)، کەوتنەبەرچاو، کەوتنەپێش چاو.

**بەرچاوگە** (ن.) berçawge ١
١- پێشەسەر(خشل). ٢- ب (بەرچاوکە).

**بەرچاوگە** (ن.) berçawge ٢
چاوگە، دەستەچیلە.

**بەرچاوگە** (ن.) berçawge ٣
بزۆزیی، بزێویی، تۆسنیی، جرپنیی، لاساریی.

**بەرچاو ودەم کەوتن** (ئد.)
berçaw w dwmkewtin
لەکەسێ دووان بەباشیی- یان بەخراپە، لێ ووتنەوە یان باس کردن (کەسێ) بەچاکە یان بەخراپە.

**بەرچل** (ن،ئان.) berçil
ئاروەر، بەرجل، پیسکە، ڕەزیل، گزاف.

**بەرچنە** (ن) berçine
بەرچینە، بەروارکە، توولێنە، سەبەتەی توولین، قرتالە، قەرتالە، مەلکەب.

**بەرچەپ** (ن،ئان.) berçep
١- بەرهەڵست، پێچەوانە، دژ.
٢- بەرهەڵستکەر، دژایەتیکەر، ڕقەبەریکەر، ڕقەبەریکەر، ملەملکەر. ٣- ملۆزم، میمل.
٤- ئیفچیی، پاشماوە خۆر، مشەخۆر.

**بەرچەق** (ن.) berçeq
دەسکە، مشتوو.

**بەرچەنگ** (ئان.) berçeng
ئامادە، ئەیڤەر، چک، ساز، لەبەردەس.

**بەرچیت** (ن.) berçît
تیفە، دەپە، ناڤبریکە، ناوبرە.

**بەرخ** (ن،خ.،ئس) berx
١- بچوکێ میشنا، بەر، بەرخک، بیچوەمەڕ، قەرێ، قەریک، وەرک، وەرە. ٢- خۆشەویست(مندال)، ژیرلۆ، نار، نارین، هەڤین (خ.). ٣- بورجی بەرخولە(ئس)، یەکەم کەلووی بوورجەکان

**بەرخستن{ ئافرەت}** (کتن،کتپ) berxitstin
١- بەرێ فرێدان، مندال لەباربردن.
٢- ب (بەرفرێدان).

**بەرخوار** (ن) berxwar ١
بەرخۆر، خۆبەرەپێش(مرۆڤ)، ماستاو ساردکەرەوە.

**بەرخوار** (ن) berxwar ٢
١- چەوت، خوار، خواروخێچ، لار.
٢- نادروست، ناڕاست، نالەبار.
٣- تەلەکەباز، فێلباز، لەخشتەبەر.

**بەرخواردن** (کتپ،ئد) berxwardin
بەرلێ خواردن، بەروبووم خواردن، سوود لێ وەرگرتن، کەلک لێ وەرگرتن.

**بەرخوردار** (ئان.) berxurdar
١- خۆش گوزەران، دل خۆش، کامران، کامەران، کەیف خۆش.
٢- بەئاکام گەیشتوو، سەربلند، سەرفراز،

سەرکەوتوو، کەلک وەرگرتوو (لەکار یان لەشتێ).
٣- تەمەن درێژ ولەسەرخۆشێ، پیروخەرۆ، لەسەر خێروخۆشی.

**بەرخەنێر (ن..خ.)** berxenêr
١- بەرخی نێر (ن).
٢-نێرینەی بەپرشت لەچۆنیەتیی ورەوشتدا (خ).
٣- کوڕ، نێرینە، وەچەی نێرینە.
٤- بەرگەگر، بەووزە.

**بەرخی بازی ئەکات{دەکات}(ئد)**
berxîbazîekat(daket)
١- بەکەیفە، دڵی خۆشە، لەوپەری خۆشیدایە.
٢- دڵ کراوەیە.
٣- لەبرەودایە، هەیەتی (ماڵی دنیا).

**بەرخی نێر بۆ سەربڕینە (پن)**
berxî nêr bo serbir̲îne
هەموو کەسێ (نێرینە) دەبێ ئامادەبێ لەپێناو نیشتماندا خۆی بەخت بکات.

**بەرد (ن.)** berd
١- بەر، بێر، پەل، تل، تەوەنی، سەنگ، کوچک، کووچ، کەڤر، کەمەر. ٢- ئاقووت، بلەخش، پاخەنە، پاگەنە، گەوهەر، یاقووت. ٣- تەلەبەرد، کێل.
٤- دەنک، ناووک(بەری داروبرەخت).
٥- ئەستێ(بەردەئەستێ). ٦- سەنگ (بۆ کێشانە لەتای تەرازوودا دادەنرێ).

**بەردار (ئان.)** berdar
١- (دارو درەختی)بەبەر.
٢- بەکەڵک، سوودبەخش.

**بەردار (ئان)** berdar
ب (ئاووس / ١).

**بەرداربوون (کتن.)** berdarbûn
پەسندکردن، قایل بوون، گەیشتنەهەمان ئاکام.

**بەرداشت بوون (کتن)** berdašt bûn
١- شیان، گونجان. ٢- دەست دان.

**بەردان (کتپ)** berdan
١-ئازادکردن، بەرەڵاکردن، ڕزگارکردن، ڕەهاکردن، کردنــــەدەرەوە. ٢- دەس لێ هـــەڵگرتن، لێ کشانەدواوە، وازلێ هێنان.

**بەردانەوە (کتپ)** berdanewe
١-(شت یان کەسێ)خستنە خوارەوە، (شت) فڕێدان (لەبەرزیێەوە). ٢- بەربەست لابردن، بەردان، خستنەسەرپشت، کردنەوە (بەربەستی ئاو). ٣- وازلێ هێنان (سەرلەنوێ).

**بەردانی (ئان)** berdanî
بەرداویی، بەردەڵان، بەردەڵانیی، بەردین، پڕلەبەرد (زەوی).

**بەرداوێژ (ن)** berdawêj
بەردهاوێژ، بەرهاوێژ، مەودایەک تارادەیەک کورت، نزیک (شوێن).

**بەردایی (ئان)** berdayî
ب(بەردانیی).

**بەرد باران (ن)** berd baran
١-بەردەباران، سەنگەسار، سەنگەسەر.
٢- (کـاری (n.).جنێوپـێدان)، جنێـو، جـوون، جوێن، دژمین، دژمێن، دژوێن.

**بەرد باران کردن (کتپ)** berd baran kirdin
١- بەردەباران کردن، بەردپێدادان، بەردتێ گرتن، بەرد لەکەسێ گرتن.
٢- سەنگەسارکردن، کەسێ بەبەردکوشتن.
٣- ووتەی ناشیرین ئاڕاستەی کەسێ کردن.
٤- ئەتک کردن، ڕسواکردن، شاریەدەرکردن.
٥-تف ولەعنەت کردن،جنێوپێ دان، جوێن پێ دان

**بەرد بەئاو کردن (ئد)** berd be aw kirdin
١-بـەزەیی بزوانـدن، دڵ کـردن بـەئاو، کـارلەدڵی مرۆڤ کردن.
٢- بەدەنگ وئاوازێکی ئێجگار خۆش دەووترێ یان گوێ لەئاوازێکی مۆسیقای خۆش بوون.

**بەرد بەبا کردن (ئد)** berd be ba kirdin
ڕق هەستان، ڕک بوونـەوە، زۆر تووڕەبـوون، قـین هەڵسان، قین هەستان.

**بەرد تاش (ن)** berd taš
بەردتراش، بەرد تەش، سەنگتاش، سەنگتراش، کەڤرتاش، نەقار.

**بەردراو (ئان)** berdiraw
ئازاد کراو، بەرەڵاکراو(مرۆڤ).

**بەردڕکانە (ن)** berdir̲kane
بەخشیش، شاگردانە.

**بەردکێش (ن)** berdkêš
بەردهەڵکەن، بەردکۆکەرەوە، کرێکاری کانەبەرد.

**بەردڵ (ن)** berdil̲ ١
ئاوگیریی، بەرقلیان، بەرقلیانیی، ناشتا.

**بەردڵ (ن)** berdil̲ ٢
بەنرخ، بەهادار، پڕبەها، گران، نرخدار، مۆکگ.

**بەردڵ (ن)** berdil̲ ٣
گەورە، مەزن(مرۆڤ)، ناسراو، ناودار، ناودەرکردوو.

**بەردڵ** (ئان، ن) berdil ٤

ئاگرخوەش، ئۆفلان، خۆشەویست، ژیرکەڵە، ژیرلو، گیزگول، لەبەردڵان، نار، هەڤین.

**بەردڵ خستن** (کتپ) berdilxistin

ب( ئاوگیریی کردن ).

**بەردڵ کەوتن** (کتن)١ berdil kewtin

بـەدل بـوون، بەدڵداچوون،چوونەدڵـەوە، حـەزلێ کردن( لەشتێ )، دڵ بۆ چوون.

**بەردڵ کەوتن** (کتن،کتپ)٢ berdil kewtin

دڵ ئەنگاوتن، لەدڵ دان، وەبەردڵ کەوتن.

**بەردڵک** (ن) berdilk

تووڕەکـەی مـەمک، سـوتیان، سـوخمەی مـەمک، مەمکدان.

**بەرد لە ئەژنۆی خۆدان** (ئد)

berd le ejnoy xo dan

پەشیمان بوونەوە لە...، پەشیمانیی حاسڵ کردن، داخ بۆ خواردن.

**بەرد لە جێی خۆی سەنگینە** (ئد)

berd lecêy xoy sengîne

ئەوکەسانەی لەوڵاتی خۆیاندا دەژین ڕێزیان زیاترە، جرت وفرت کەران یان کەسانی هەڵەشە جێی ڕێزو هیـزانیین. ت/ وشـەی (سـەنگین) لەڕیـشەی (سـەنگ)ەوە هـاتووە، (بـەرد) لیـرەدا بـەواتای (قورس) بەکارهێنراوە، مەبەست (ڕیـز یـان شـایانی ڕێز)ە.

**بەردۆش کردن** (کتن،کتپ) berdoš kirdin

جوولان، جولاندن، هەژان، هەژاندن.

**بەردەبار** (ن،ئان) berdebar

١- دانەر، دامێنەر، دروستکەر، دەرهێنەر، ڤـەداندەر، هەڵێنەر.

٢- دەس ڕەنگین، شارەزا، لێزان (مرۆڤ).

**بەردەباران کردن** (کتپ)

berde baran kirdin

ب( بەرد باران کردن ).

**بەردەباری** (ن) berde barî

١- پسپۆڕیی، شارەزایی تەواو( لەبواریکی زانستدا ).

٢- مەودای پسپۆڕیی.

**بەردەباری کردن** (کتپ) berde barî kirdin

پـەیداکردن، دانـان، دامێنـان، دروسـت کـردن، دۆزینەوە، دەرهانیین، دەرهاوردن، دەرهێنان.

**بەردەباز** (ن) berde baz

بەردەوان، پردەبان، پێبان، پێواز.

**بەردەرگا** (ن،خ.) ber derga

١- بەردەرگە، بەردەرکە، بەردەرگانە، بـەردەروازە، بەر ماڵ، پێش ماڵ. ٢- نزیک لە... (خ.).

**بەردەس{بەردەست}**(ن)١ ber(des,dset)

بەنـدە، بـەنیی، پیـشکار، خزمـەکار، ژێـر دەسـت، کارەکەر، کەدیی، لەلە.

**بەردەس{بەردەست}**(ن)٢ ber(des,dset)

بن دەس، بەرەف، بەرهەڤ،

جڤان، کۆ، کۆم، کۆمەڵ.

**بەردەس{بەردەست}**(ن)٣ ber(des,dset)

سەردەستی فەقیانە، کەف، کەفە.

**بەردەس{بەردەست}** (نک) ٤ ber(des,dset)

ئامراز، ئامیار.

**بەردەست کردن** (ئد) ١ berdset kirdin

ئەژنۆ پێ دادان، سەرپێ شۆڕکردن.

**بەردەست کردن** (ئد)٢ berdset kirdin

ئـیش کـردن لەژێـر دەسـتی یەکیکدا،بەردەسـتیی، هەڵسووڕان (لەبەردەستی یەکێکدا).

**بەردەستی** (ن) ١ berdsetî

بەردەستیکەر، ژێردەستە، کرێکار، یاریدەدەر.

**بەردەستی** (ن) ٢ berdsetî

خزمەت، ژێردەستەیی.

**بەردەڤ** (ن،کی) ١ berdev(ki)

ئاموزکار، ئامۆژگار، ئامۆژگاریکەر، بەردەوک، تـەگبی رکەر، رابەر، ڕاهشکەر، ڕێ پیشاندەر، ڕێ نیشاندەر، مۆژیار.

**بەردەڤ** (ن،کی) ٢ berdev(ki)

هاودەنگ، هاوڕاز، یاوەر.

**بەردەڤ** (ن،کی)٣ berdev(ki)

خۆمانە، خۆمانیی، خۆیی. خۆیی.

**بەردەقانی** (ن) berdeqanî

بـەردەکانی، بـەرزەقانی، بەرڤـانی، قۆچـەقانی، قەڵماسەنک، قەوکانی، کۆچکانی.

**بەردەڵان** (ن،ئان) ١ berdelan

بەردانی.

**بەردەڵان** (ن،ئان) ٢ berdelan

شۆرەزار، شۆرەکات.

**بەردەڵبەرد** (ن) berdelberd

دەربەدەریی، سەرگەردانیی، گومرایی.

**بەردەم** (ن،ئان) ١ berdem

١- پێش، پێش دەم، پێشەوە( شت ).

٢- لەلا، نزیک( ئان ).

**بەردەم ( ن )** ٢ berdem

ئامادەیی، دەربارێی، لەبارێی.

**بەردەھار ( ن )** berde har

بەردھار، ماشێنی بەرد ھاڕین.

**بەردی بچووکیش سەرئە شکێنێ ( پن )**

berdî biçükîşser- eşkênê **Even a small stone will break a head,**

دوژمن بوودەڵەش بێ دەتوانێ دەستی خۆی ھەربوەشێنێ.

**بەردی دەشتیی وچۆلەکەی دەشتیی ( رس )**

berdî deştî- w çolekey deştî

بەدەسکەوتێ دەووترێ کەھیچ پارەی تێنەچێ.

**بــەردی زل ھــە ڵگرتن نیـشانەی نەوەشـانە ) لێنەدانــە ( رس )**

berdîzil helgirtin nîşaney newešane (lê nedane)

١- ئـارەزوو ویستی بەرزەبلیسیی شـتێکی پەسـند نییە، ھەڕەشەوگوڕەشەی توند یـان پـەیمانی قەبـە ھەمیـشەبێ وەرە. ٢- ئەوکەسـانەی پـەیمانی فراوان ئەدەن لەوانەیە نەتوانن بەجێی بھێنن.

**بەردیلک ( ن،ئان )** berdîlk

ھاوتا، ھاوتەقا، ھاوشان، ھەڤبەر، ھەڤڕوو، ھەڤسەر، ھەمپا.

**بەردین ( ئان )** berdîn

١- بەردینە، لەبەرد دروستکراو.

٢- پتەو، توند، ڕەق، ڕقرۆک، قایم، ھەمیز.

٣- براندۆخ، سەرسەخت، سەرڕەق، کەللەڕەق.

٤- بێ بەزەیی، بێ ڕەحم، دڵ ڕەق.

**بــەردێک نـادان بیخاتە گۆمـەوە بەسـەد دانـا دەرنایـەت ( پن )**

berdêk nadan bîxate gomewe be sed dana- dernayet

زەرەرو زیـانی پـیاوی ناشـی بەپـیاوی زیـر ڕاسـت ناکرێتەوە، کارێکی ناپەسەند کەنادان بیکات بەسـەد دانا ڕاست ناکرێتەوە.

**بەرز ( ئان )** berz

١- بەرزا، بلند، ھەڵچوو.

٢-سەربلند، سەربەرز، لەخۆڕازیی.

٣-بـەناوبانگ، پـایەبلند، خویـا، دەرکـەوتوو، دیـار، ناسراو.

٤- قنچ، قوت، قیت، ھەڵساو، ھەڵسێنراو.

**بەرزاخ ( ن )** berzax

بەرزەخ ، بەرشاخ ، بەرکاو، بەرقەد، بەرکێو، دامێنی کێو، کەمەر( شاخ ).

**بەرزاندن ( کتپ )** berzandin

بنـارکردن، جـەنگیین، شـەڕکردن( بەرامبـەر )، شـەڕ بەرپاکردن ( دامەزراندن )، کێشەکردن.

**بەرزئە خورێ{بەرزخوریین}( ئد )**

berzexurê(berz xurîn)

١- پێ خوڕیین،خۆ بەزیاد زانیین، خۆ بەشت زانیین، خۆھەڵکێشان، خەڕبوون، شانازیی کردن، قسەی زل کردن، قەپی گەورەگرتن، لووت بـەرزبوون. ٢- بـاڵ گـرتن، بلندبوونـەوە( بـەباڵ )، بەرزپـەروازکردن، بەرزفیین، بەرزفڕیین، ھەڵفڕیین.

**بەرز ئە نیشێت{بەرزنیشتن} ( ئد )**

berz enîşêt (berz- nîştin)

١- زیاد لەئەندازەی خۆ ھەوڵ دان.

٢- تڕ وتۆپ لێدان، زیاد لەئەندازەی خۆ قەپ گرتن، فیشاڵ کردن.

**بەرزبوونەوە ( کتن )** berzbûnewe

١-بلندبوونـەوە، بـۆ سـەرەوەچوون، بـۆ سـەرەوە ڕۆیشتن، بەرزەوەبوون، بەرەوژوور ھەڵچوون.

٢-پـایەبلند بـوون( کەسـێ )، سـەرکەوتن( لەژیانـدا )، گەیشتنەپایەیەکی بلندتر.

٣- بەرزەوەبوون، ھەستان.

٤- زیندووبوونەوە، ھاتنەوەژیان.

٥-بـوون( ڕووەک )، ڕوان( داروڕەخـت )، سـەوزبوون، شین بوون، نشونەماکردن، ھەڵچوون ( ڕووەک ).

٦- ئاوسان، ھەڵاوسان.

٧- ئاشـکرابوون، پـەیدابوون، دەرکـەوتن، لەکـەل دەرکەوتن، وەدیارکەوتن، ھەڵھاتن.

٨- تووڕەبوون، ڕق ھەستان.

٩- دەس دانەچەک، ڕابوون، شۆڕش بەرپاکردن.

١٠- پەیدابوون، ڕوودان، قەومان، ھەڵکەوتن.

**بەرزڤک ( ن،کی )** ١ berzvik(ki)

بەرھەڵست( دروستکراو )، تەیمان.

**بەرزڤک ( ن،کی )** ٢ berzvik(ki)

ڕوخ ، ڕەخ، قەراغ، کەنار، لێوار ( ڕوبار ).

**بەرزگر ( ن )** berzgir

جووتبەند، جووتیار، چێنەر.

**بەرزە ( ن )** berze

پـلاو، چێـشتی پـلاو ( بـرنج وکـشمیش وبـادام و زیرە... ).

**بەرزە بلێس** (ئان) berze bḻês

چەنــەباز، چەنەهــەراش، چییــرەدرێژ، زۆربلــێ، هەلەوەر.

**بەرزە بلێس** (ئان) berze bḻês ١

قسەترن، گەوج دوو، لاتر، قەوچەپیچ، لۆترەوان.

**بەرزە بلێس** (ئان) berze bḻês ٢

خۆتێ هەلقورتێنەر (لەئاخاوتن یان ئیشی خەلکدا).

**بەرزە بلێس وەستان** (کتن.) berze bḻês westan

بــەرزەبلێس وێــستان،بەگژ دەمــی خەلکداچوونــەوە، تێ هەلچوون لەقسەی خەلکدا، خۆتێ هەلقورتاندن.

**بەرزە پێ هەلسان** (ند.) berze pê heḻsan

لەئاستی خۆ راست بوونەوە

(بــۆ پێــشاندانی رێــز)، هەستانەســەر پــێ (لەسەرکورسی، لەسەر زەوی..).

**بەرزەدەماغ** (خ.) berze demax

١- بۆح زل، لووت بەرز، لووت لەئاسمان، لەخۆرازیی.

٢- خۆ هەلکێش، خەڕۆ.

٣- خەنیی، دل کراوە، شاد، شادمان، کەیف خۆش.

**بەرزەکە** (ن) berzek

بەرزترین شوێن، پۆپە، لوتکە.

**بەرزی** (ن.) berzî ١

١- ب (بلندایی).

٢- نامەدەنگێ، ناوبانگێ، نێوبانگێ، سەروەریی.

٢-پایە، جێگا، رادە، رێ وشوێن.

**بەرزی** (ن) berzî ٢

بەختیاریی، کامرانیی، کامەرانیی.

**بەرژەوەند** (ن) berjewend ١

١- بەرژەند، مەسلەحەت (بۆ بەکارهێنانیی پارە و پوول)، هات (لەبەکارهێنانی پارەدا).

٢- باشیی، چاکیی، لوان.

٣- دەسکەوت، سوو، سوود، قازانج.

٤- توانایی، لێ وەشانەوە، لێ وەشاوەیی.

**بەرژەوەند** (ن) berjewend ٢

تانگێ، تەقدیر، تەگبیر، راوێژ.

**بەرژەوەند** (ن) berjewend ٣

بەراوورد، بەراوەرد، کاری ووردبوونەوە وتێ رامان.

**بەرستکە** (ن) beristik ١

بەرستۆ، بەرەستۆ، بەرۆکە، بەریکە، بەریی، یەخە.

**بەرستکە** (ن) beristik ٢

بــەرکە، بــیرووکە، کــوورکە، گیرفــان (بەجلــەوە هەلدووراو).

**بەرسڤ** (ن، کی) berisiv(ki)

جواب، وەرام، وەلام.

**بەرسمێل کردن** (کتپ) berismêḻ kirdin

١- سمێل رێک کردن وجوان کردن، قـەراغ و بیجـاری سمێل جوان وچاکە کردن بەمقەست.

٢- کەل وکەم کردن٣- کەلین تێ خستن.

٤- جیاکردنەوە، جوێ کردنەوە، دابـڕان، لێـک جـوێ کردنەوە، هەلاواردان.

٥- ئازاردان، زیان پێ گەیاندن.

**بەرڤرێ دان** (کتن،کتپ) ber frêdan

(بەر هاویشتن، منداڵ لەبار خۆبردن.

**بەر ڤەدێر** (ن،کی) ber vedêr(ki)

پارێزەر، دەمراست.

**بەرکە** (ن) berk ١

بەرکێ، بەلک، بیروو، پەرکێ، پەلک، پەلک، گەل، گەلا، گیلا.

**بەرکە** (ن،کی) berk(ki) ٢

فیشەک، فیشەنگێ، گوللە.

**بەرکە** (ن..نس.) berk ٣

ئەستێرەی شیعرا، شیعرای شامیی.

**بەرکار** (نک.) berkar

١- کەرەسەی خانوو.

٢- کەرەستەی ئامادەکراو، کەرەستەی ژێر دەس.

**بەرکاز** (ن.) berkaz

پاجە، پەنجەرە، رۆدە، رەوشەن، لەپ.

**بەرکۆ** (ن) berko

قەرپووز، قەرپووس، قەلپۆز(زین).

**بەرکۆ**(ن) berko

بارگەی بەردەمی سوار، پێشکۆ، زینکۆ.

**بەرکۆش** (ن) berkoš

بــەرامبێل، بەرامــپێل، بــەرانبێل، بەرانــپێچ، بــەرجل. بەردلک، بەروان، بــەروانک، بەرهەلبێنــە، پەشــتەمال. پێش کۆش.

**بەرکەتی** (ئان،کی) berketî(ki) ١

١- بەتین، بەهێز، بۆکە، تینـدار، داگرتیـی، هێـزدار.

٢- ئازا، بەجەرگێ، پۆزبەران، جوامێر، چاقشار، دلێر. زیخ. ٣- بەخووە، خەپان، قەلەو، گۆشتن.

**بەرکەتی** (ئان،کی) berketî(ki) ٢

بــەنرخ، بــەهادار، پــڕبەها، گـران، بــەها، گـران مایـە. ناگۆرە، نرخدار.

**بەرکەتی** (ئان،کی) berketî(ki) ٣

گرنگێ، گەورە، مەزن

**بەرکە کردن** (کتن) berke kirdin
ترەکیین، زان، زاوونێ کردن، زایین، زەوو زووکردن، زیاد کردن(گیانەوەر).
**بەرکەمرە** (ن) berkemire
خەلوونی بەردیی، ڕەژیی بەردی، زوخال سەنگێ.
**بەرکەواندن** (کتپ،کتن) berkewandin
ئەنگاوتن، بەرکەوتن، پێ کاوتن، پێ کەوتن، لێ دان، لێ کەوتن، وەبەرکەوتن.
**بەرکەوت** (ن) ١ berkewt
بەش جوون.
**بەرکەوت** (ن) ٢ berkewt
گەپ، نۆبە، نۆرە.
**بەرکەوت** (ن) ٣ berkewt
ڕووداو، قەوماو.
**بەرکەوتن** (کتپ) ١ berkewtin
بەش پێ بران، بەنسیب بوون، دەس کەوتن.
**بەرکەوتن** (کتن) ٢ berkewtin
بوون بەژێرەوە، بەژێرشتیکەوەبوون.
**بەرکەوتن** (کتن،کتپ) ٣ berkewtin
نۆرەهاتنە سەر، (بەڕیک وپیکی).
**بەرکەوتن** (کتن) berkewtin
بەرکەفتن، پێش فەچوون، پێش کەوتن، کەتنەپێش، کەوتنەپێش، وەپێش کەوتن.
**بەرکەوتن** (کتپ) ٤ berkewtin
ب (بەرکەواندن).
**بەرکەوتوو** (ئان) ١ berkewtü
١- ئەنگاوتە، پێکاو، لێ دراو، وەبەرکەوتوو.
٢- پیر، تێ شکاو، تێ قوپاو، عەمەل مەندە، لێ کەوتە.
**بەرکەوتوو** (کتپ) ٢ berkewtü
بریتیی، پێش بار، پێناو، سەرگۆر، قوربانیی.
**بەرگەیە** (ن) bergeye
١- نوێنەر. ٢- ئاریکار، یارمەتیدەر، یاریکار.
**بەرگ** (ن) ١ berg
تا، کەد، کەل، لق، لق وپۆپ، لک.
**بەرگ** (نک) ٢ berg
پڕۆل، پۆشاک، جل، جلک، جل وبەرگ، سیپال، شمەک، کالا، کنج، کەلپەل، کەلوپەل.
**بەرگ** (نک) ٣ berg
پشتەسەرین یان لیفە.
**بەرگ** (ن) ٤ berg
بەش، بەلگیە، جزم (پەرتووک).

**بەرگ** (ن) ٥ berg
١- پەرە، ڕوو پەرە، ڕووپەل، لاپەرە.
٢- دوو تویی کتیب.
**بەرگ** (ئان) ٦ berg
بەرین، پان، پان وبەرین، فراوان، کووران، گوشاد.
**بەرگ تێ هەلکێشان** (کتپ) berg helkêšan
١- بەرگ تێ گرتن (کتێب).
٢- لەبەرگ گرتن (سەرین، دۆشەک، گۆشە).
**بەرگدروو** (ن) berg dirü
بەرگسان، جل دروو، خەیات.
**بەرگدروون** (کتپ) berg dirün
جل دروون، خەیاتیی کردن، دروومان کردن.
**بەرگر** (ن) bergir
١- بەربەست، بەرهەلست، بەرووەست، بەریان، بەرگیر.
٢- پاریزگەر، پیشگر، پیگیرەوە، نەهیژ، نەهیل.
**بەرگرتن** (کتن) ١ bergirtin
بەردان، بەرهانیین، بەرهینان، هاتنەبەر.
**بەرگرتن** (کتپ) ٢ bergirtin
١- بەرپێ گرتن، دەم گرتن، بەرهەلستیی کردن، پێش گرتن، ڕیگا لێ بڕیین.
٢- ڕیگەبڕیین (لەتەشەنەی هەندێ نەخۆشیی). ٣- بەریان گرتن، بەست دانان. ٤- ڕووبەڕوو بوون، ڕوو بەڕوو وەستان، لەبەردەم ڕاوەستان. ٥- هینانە بەردەم، هینانە ڕوو بەڕوو.
**بەرگرتن** (کتپ،کتن) ٣ bergirtin
بەرگەگرتن، خۆ گرتن بەرامبەر، دل هەلگرتن.
**بەرگرتن{نەخۆش}** (کتپ) ٤ bergirtin
تیمارکردن (نەخۆش).
**بەرگری** (ن) bergirî
بەراکبەریی، بەربەرەکانیی، بەرگل، بەرەوانیی، پیشگیریی.
**بەرگریی کردن** (کتپ) bergirî kirdin
١- پێش گیرەوەیی کردن، نەهیشتن، نەهیلان.
٢- پەک خستن، ژ بەرفەکرن، هیز لەبەر بڕیین.
٣- بەرامبەر دوژمن ڕاوەستان، بەرامبەریی کردن، بەربەرەکانیی دوژمن کردن، دوژمنایەتیی کردن.
**بەرگشت** (ئان) bergišt
پیشکەوتوو، دیار وزال، سەرکەوتوو.
**بەرگوێ خستن** (ئد) ١ bergwê xistin
١- بەگوێدادان، بەگوێداهەلدان، پێ گووتن. پێ

ووتن.
٢- باس كردن، ناوبردن. ٣- جنێوپێ دان
**بەرگوێ خستن[٢] (ئد)** bergwê xistin
سەرنج دان، سەرنج ڕاكێشان .
**بەرگوێ كەوتن (ئد)** bergwê kewtin
ئەژنەفتن، بیستن، بهستن، ژنەفتن، ژینەن، شنەوتن، گوێ پێ دان، گوێ لێ بوون.
**بەرگە (ن)** [١] berge
تاووشت، توانا، توانست، ووزە.
**بەرگە (ن)** [٢] berge
ئەلەنگە، زمانەبچكۆلە، زمانەچكۆلە.
**بەرگەگر (ن)** berge gir
١-بەتوانا، بەووزە، پرووزە، خورت، خۆگر.
٢- بەهێز، پڕ هێز، تیندار، داگرتیی، هێزدار.
٣- بەچیكلدانە، دلفرە.
**بەرگەگرتن (كتن)** berge girtin
خۆڕاگرتن، خۆ گرتن، دەم هێنان، ڕاوەستان.
**بەرگیرخستن (كتپ)** bergîr xistin
١- بەرگیرهێنان، بەگیرهێنان، پەیداكردن، خستنەژێر دەس، وەگیرهێنان.
٢- پەیداكردن، دۆزینەوە.
**بەرگیركەوتن (كتن)** bergîr kewtin
بەرگیرهاتن، بەگیركەوتن، بەگیرهاتن، پەیدابوون، كەوتنەژێردەس.
**بەرگیر هێنان (كتپ)** bergîr hênan
ب (بەرگیرخستن).
**بەرگیری كردن (كتپ)** bergîrî kirdin
بەرگیری كردن، بەرهەڵستی كردن.
**بەر لێ خواردن (ئد)** ber lê xwardin
١- بەرهەم لێ خواردن، میوە لێ خواردن.
٢- ئامانج وەرگرتن، سوود لێ وەرگرتن، كەڵكە لێ وەرگرتن، لەبەرووبووم خواردن.
**بەر لێ كردن[١] (كتپ)** ber lê kirdin
خوری لەمەڕ بڕینەوە،مەڕ بڕینەوە.
**بەر لێ كردن[٢] (كتپ)** ber lê kirdin
پشت تێ كردن، ڕوو بەڕوونەبوون، ڕوو لێ وەرگێران، ژێوەبوون، گوێ پێ نەدان، واز لێ هێنان، یارمەتیی نەدان.
**بەر لێ گرتن (كتپ)** ber lêgirtin
١- بەربەست كردن، بەرەنگاربوون، لەبەردەم ویستان. ٢- دوژمنایەتیی لەگەڵ كردن.
٣- بوارە پێ نەدان، ڕاوەستاندن. ٤- سنوور لێ
گرتن، كەرخ بۆ دانان، كەرخ پێ گرتن.
**بەرلە (پ)** berle
١- بەرامی، پێش. ٢- لەپێش.
**بەرما (نك)** berma
١- بەرماوە، پێماوە. ٢- پاشماوە.
**بەرماڵ (ن)** bermal̲
١- جاجكمۆكەی نوێژ، جانماز، جانومان، جێنماز، دووگر ، ڕووخست، مازلۆخ. ٢- بەرماڵكە، جاجم.
**بەرماڵ بەكۆڵ (ئان)** bermal̲ bekol̲
١- پیاوی ئاینیی، پیاوی خوا،مرۆڤی دینیی، لەخواترس. ٢- پاك( مرۆڤ)، ڕاست وپاك.
**بەرموور (ن)** bermür
بەرمووره، خەناوكە، گرتەمر، گەردانە، گەردن بەند، گەڵوو وەن، ملوانك، ملوانكە، ملوانە، ملوەن، ملوینك، ملوینكە.
**بەرمە جێڵ (ن)** berme cêl̲
چەپەر، دەربەن جەڵە.
**بەرمەمكانە (ن)** bermemkane
زاڕۆ، زاڕۆكە، زاڕۆكە، ساوا، كۆرپە، كۆرپەلە، منداڵی سەرووپێچكە، مەلۆتكە.
**بەرناڤ (ن،كی)** bernav(ki)
بەرناو، پێش ناو، سەرناو، سەرنێو، شۆرەت، لەقەب، نازناو.
**بەرنامە (ن)** bername
بارنامە، بەرنامچە، ڕێڕاز.
**بەرنامەدانان (كتپ)** bernamedanan
بەرنامەدارشتن، بەرنامە سازكردن، ڕێڕاز دیاریی كردن.
**بەروار (ئان)** berwar
بەروارە، بەرواڵ، سەربەرەژوور، سەربەرەو ژوور، سەر بەرەو ژووركە.
**بەروار (ن)** [١] berwar
بانەمەڕ، زۆزان، كوێستان، هاوینگە، هاوینە هەوار، وار.
**بەروار (ن)** [٢] berwar
هاوارگە، هەوارگە.
**بەروار (ن)** [٣] berwar
تەلار، كۆشك (لەگوند).
**بەرواژ (ن،ئان،كی)** [١] berwajî
بەراوە ژوو، بەرواپشت، بەرووپشت، بەرەواژ، پێچەوانە، هەڵگەڕاوەوە، وازیی.

**بەرواژی** (ئان) [٢] berwajî

تیکچوو، چەواشە، سەرلێ تیکچوو، سەر لێ شێواو.

**بەرواژی کردن** (کتپ) berwajîkirdin

١- بەراوە ژووکردن، پێچەوانەکردن، هەلگێرانەوە، واژیی کرن، وەرگێران. ٢- ب (ئاوەژوو کردن).

**بەروو بوو** (ن) berw bü

١- بەروبووم، بەروبۆ، بەرهەم. ٢- ئیروو، پەرتاڵ، دەستاو، سوو، سوود. ٣- ئاکام، ئەنجام.

**بەرو پشت** (ن، ئان) berw pišt

ب (بەرواژی).

**بەرو پشت** (ن) berw pišt

هەردوو دیو، هەردوو لا.

**بەرو پشت بۆ نەبوون** (ئد) berw pišt bo nebün

١- بێ بار بوون، ناپاک بوون، نادروست بوون، ناراست بوون.

٢- مەبەست نادیاربوون، هەلویست نادیاربوون.

٣- بێ بەقابوون، جێی باوەڕنەبوون.

**بەرودوا خستن** (کتپ) berw dwa xistin

پاش و پێش کردن، جێ گۆڕکێ کردن.

**بەرو دوانان** (کتپ) berw dwanan

ڕاونان، شوێن کەوتن، وەدوو کەوتن، وەشوێن کەوتن.

**بەرووش** (ن) [١] berüš

ئەلبەکی، بەرۆش، پاتی، خەزان، سوکرە، قازان، مەنجەل.

**بەرووش** (ن) [٢] berüš

دەرپۆشک، دەرخۆنە، دیزە، گۆشی.

**بەرووەدە** (ئان) berwede

پان، پان وبەرین، گوشاد، ووڕاق.

**بەرووەستا** (ن) berwesta

شاگرد.

**بەروک** (ن) [١] berok

یەخە.

**بەروک** (ن) [٢] berok

پێش، پێشەوە.

**بەروک** (ن) [٣] berok

جەوشن، زرێ.

**بەروک بەردان** (کتپ، ئد) berok derdan

١- بەس کردن، لێ بوونەوە (لەکەسێ)، لێ دوورکەوتنەوە، لێ کشانەوە، واز لێ هێنان، یەخەبەردان. ٢-دەس لێ هەلگرتن، لێ جیابوونەوە. ٣- ژێوەبوون، وازهێنان.

**بەروک گرتن** (کتپ،ئد) berok girtin

١- ڕێ پێ گرتن، ڕێ لێ گرتن.

٢- بەرەنگاربوون، بەگژدا چوون، شەڕ پێ فرۆشتن، گێچەل پێ کردن، یەخەگرتن.

٣- ئالاندن، بەرەنگاریی کردن، هالاندن.

٤- لێ چوونەپێشەوە، لێ نزیک بوونەوە ودواندن، ووتو وێژ لەگەل کردن.

٥- بە زۆر کەسێ ڕازی کردن.

**بەرهاویشتن** (ئد) [١] ber hawîštin

بەرخستن (بەناکامی یان مردوویی)، بەرفڕێ دان، لەبارچوون.

**بەرهاویشتن** (ئد) [٢] berhawîštin

زۆر حەز لەشتێ کردن،

سوێ بوونەوە بۆ خواردەمەنییەک.

**بەرهەڤ بوون** (کتن،کی) berherbün(ki)

خڕ بوونەوە، کۆبوونەوە، کۆنگرە بەستن، گرد بوونەوە.

**بەرهەلست** (ن) berhe̱list

ب(بەربەست).

**بەرهەلستی** (ن) berhe̱listî

خەنیمی، دژایەتیی، دوژمنایەتیی، کاندڕیی، ناحەزیی، نەیاریی.

**بەرهەم** (ن) berhem

ب (بەر).

**بەرهەم هێنان** (کتن،کتپ) [١] berhem hênan

هاتنەبەر(هەم)، وەبەرهاتن.

**بەرهەم هێنان** (کتپ) [٢] berhem hênan

پێگەیاندن، هێنانەبەرهەم.

**بەرهەم هێنان** (کتپ) [٣] berhem hênan

بەبەروو بۆگەیاندن، زیاد کردن.

**بەرهەم هێنان** (کتپ) [٤] berhem hênan

دەرهێنان(بەرهەم).

**بەرهەم هێنان** (کتپ) [٥] berhem hênan

شت دروست کردن لەکارگە.

**بەرهەم هێنان** (کتن) [٦] berhem hênan

تەواوبوون، کۆتایی هاتن.

**بەرهەنگ** (پز) berheng

تەنگەنەفەسیی، ڕەبوو(هەناسە تونگیی یان هەناسەی پڕ ئێش).

**بەرهەنگدار** (ئان) berhngdar

تەنگەنەفەس، ڕەبوواویی، ڕەبوودار.

**بەرە** (ن) ١ bere
دەرگا، دەرگە.

**بەرە** (ن) ٢ bere
بڕ، برە، پارت، تۆف، جۆن، چون، دەست، دەسە، زیوە، کۆمەڵە، کەرت، گرۆ، وینە.

**بەرەبەرە** (ئاک) berebere
١- برەبرە، بەکاوو خۆ، تۆزە تۆزە، چکەچکە، کەم کەمە، لەسەرخۆ، نەختەنەختە، وردەوردە، هێدی هێدی، هێواش هێواش.
٢- بەرێک وپێکی، لەبەرەوە.

**بەرەبەیان** (ن) ١ berebeyan
بەری بەیان،تاریک وروون، دەمەدەمی بەیانی، شەبەقیی، لەگەڵ کەڵەشێری بەیاندا.

**بەرەبەیان** (ن) ٢ berebeyan
پێش هەموو شتێ، سەرەتا، هەرلەبەرایی‌یەوە، یەکەم شت.

**بەرەخوار** (ئان،ئاک) berexwar
بەرەخوارە، بەرەوخوار،
بەرەوخوارکە، بەرەوژێرکە، بەرەوژێرە، بەرەولێژ، بەرەو لێژایی.

**بەرەدان** (کتپ) beredan
١- پەرەپێدان، پەرەپێ سەندن، پەرەدان.
٢- زۆرکردن، مشەکردن. ٣- درێژە پێ دان.

**بەرەڕەت** (ن) bereret
تەپکە، تەڵە، چاڵ، خەپک، داو، ڕەت، فاقە.

**بەرەژوور** (ن،ئان) berejûr
بەرێژوور، بەرەژوور،
بەرەوژوورکە، بەرەوژوورە، بەرەوسەرەوە، بەرەوهەوراز، ڕاژوور، ڕاژۆر، ڕوو بەرەوسەرەوە.

**بەرەژووربوونەوە** (کتن) berejûr bûnewe
ب( بەرەو ژوور بوونەوە ).

**بەرەژێر** (ن،ئاک) berejêr
ب ( بەرەوخوار).

**بەرەڤان** (ن،کی) berevan(ki)
بەرەوان، تکاکار، ناوبژیکەر، ناوەنیی.

**بەرەلەپ** (ن) berelep
بەری دەست، لەپ، لەپی دەس، ناو مشت.

**بەرەڵا** (ئان) ١ berela
بەرەڵدا، بەرەڵلا.

**بەرەڵا** (ئان) ٢ berela
ئاڵدەنگێ، بێ دەربەست، بێ گوێ، تەرە، دەربەس نەهاتوو، وێڵ.

**بەرەڵا** (ئان) ٣ berela
ناپاک، ناتەمیز، ناڕاست.

**بەرەڵا** (ئان) ٤ berela
خوێڕیی.

**بەرەڵا** (ئان) ٥ berela
دەشتانیی، دەشتایی.

**بەرەڵابوون** (کتن) ١ berelabûn
ئازاد بوون.

**بەرەڵابوون** (کتن) ٢ berelabûn
لەبەند ڕزگاربوون، لەبەندیخانە هاتنەدەر.

**بەرەڵاکردن** (کتپ) ١ berelakirdin
١- بەردان، ڕەهاکردن، وێڵ کردن.
٢- ب ( ئازاد کردن/١، ٣).

**بەرەڵا کردن** (کتپ) ٢ berelakirdin
چاودێریی نەرکردن، گوێ پێ نەدان، واز لێ هێنان.

**بەرەڵا کردن** (کتپ) ٣ berelakirdin
بڵاوکردنەوە، ڕاداشتن، ڕایەڵ کردن، ڕاهێلان.

**بەرەڵایی** (ن) ١ berelaî
١- ئازادیی، ئازاهی، ڕزگاری، سەربەستی.
٢- ڕەهائی، ڕەهایی، وێڵ، وێلیی.

**بەرەڵایی** (ن) ٢ berelaî
تێکەڵیی وپێکەڵیی، ناڕێک وپێکیی.

**بەرەنگاربوون** (کتن) berengar bûn
١- بەربەرەکانی کردن، ڕوو بەڕوو بوون( ئازایانە ).
٢- ئاوڕیش بوون، بەرێکەوت چاو پێ کەوتن، تووشی یەکتربوون، تووشی یەکتر هاتن، تێک هەڵەنگوتن، گەیشتنە یەکتر.
٣- بەرامبەریەکتر ڕاوەستان، بەرەنگاریەکتر بوون، بەگژ یەکدا چوون، پێکاهاتن، تێک هەڵەنگوتن، دەگژراچوون، دەگژیەک ڕاچوون، لەیەک دان، لێک دان، لێ هەڵگە ڕانەوە.

**بەرەنیا** (ن) ١ bereniya
بیراز، قەیار، میراس، وەرەنیا.

**بەرەنیا** (ن) ٢ bereniya
تەپ، ژەنان، کاری(کوتان، لێ دان)، مەژەند، هەرشان، هەرەشە(بەلێ دانەوە ).

**بەرەو...** (پ) ...berew
بەرەبە... ڕوویە... .

**بەرەو با مێزکردن** (ند) berew ba mîz kirdin
١- لەخوو ونەریتی گشتی دەرچوون، لەمیلی کۆمەڵایەتی دەرچوون. ٢- سستیی کردن (وەکو خوویەک )، کەمتەرخەمیی کردن، گوێ نەدان.

**بەرەو بردانەوە** (کتپ) berew birdanewe
بەرەنگار بوون، بەرەوبەرپی دانەوە، بەرەوبەرپی کردن، پێش پێ لێ گرتن، ڕوو بەڕوو بوون، ڕێ بڕپی کردن، کۆسپ خستنەبەردەم. **بەرەو پیر چوون** (کتپ) berew pîr çûn
بەپیرەوەچوون،
پێشوازیی کردن، ڕوو لێ کردن(لەمیوان).
**بەرەو پیری** (ن) berew pîrî [1]
١- پیرایی، پێشوان، پێشوازیی.
٢- پێخۆشحاڵیی (بەهاتنی کەسێ).
**بەرەو پیری** (ن) berew pîrî [2]
بەرەو بەساڵدا چوون.
**بەرەو خوار** (ئاک) berew xwar
بەرەوژێر، بۆ لای خوارەوە، سەربەرەوخوار، سەر بەرەوژێر، سەرەوخوار، لەبەرزیییەوە بۆ لای خوارەوە.
**بەرەو خواربوونەوە** (کتن) berew xwarbûnewe
بەرەوخوار ڕۆیین،
بەرەوژێر بوونەوە، بەرەوژێر ڕۆیین (ڕۆیشتن)، سەرەو خوار ڕۆیشتن.
**بەرەو خوارکردنەوە** (کتپ) berew xwarkirdinewe
بەرەوخوارناردن،
سەرەو ژێر ناردن، بۆلای خوارەوە ناردن.
**بەرەو خوارە**(ن) berewxware
بەرەژێر، بەرەژێرکە، بەرەوخواریی، بەرەوژێرە، بەرەو لێژە، سەربەرەو خوارە، سەربەرەوژێرە، سەربەرەولێژە، سەرەولێژە.
**بەرەو دوا** (ئاک) berew dwa
١- بەرودوا، بەنۆبە، یەکێ لەدوای یەکێ.
٢- بەشوێن یەکدا، شوێن یەکێ.
٣- بەرەوپاش، ڕوو بەرەو دواوە
٤- لەپشتەوە، لەدواوە. ٥- دوایی، دوهایی.
**بەرەو دوانان** (کتپ) berew dwanan
بەشوێن(کەسێکدا) ڕاکردن، دوای کەسێ کەوتن، ڕاونان، ڕاوەدوونان، شوێن کەوتن.
**بەرەو ڕوو بوونەوە** (ئد) berewrûbûnewe
ڕوو بەڕوو بوونەوە.
**بەرەو ڕوو کردنەوە** (کتپ) berewrûkirdinewe
(شت) بەرەو ڕووی کەسێ کردنەوە.

**بەرەو ژوور** (ئان) berew jûr [1]
ب (بەرە ژوور).
**بەرەو ژوور** (ئان) berew jûr [2]
**بەرەو ژووربوونەوە** (کتن) berew jûr bûnewe
١- بەرەوژوورچوون، بەرەژووربوونەوە، بەرەوژوورچوون، بەرەوژوور ڕۆیین، بەرەوسەرەوە چوون، بۆلای ژوورەوە ڕۆیشتن، بۆلای ژوورەوە ڕۆیین، سەربەرەو ژووربوونەوە، بەرەوهەوراز چوون.
٢- بەرزبوونەوە، بەرزەوە بوون.
**بەرەوژوور کردنەوە** (کتپ)
berewjûr kirdinewe
بەرەوژوور ناردن، بۆلای ژوورەوە ناردن.
**بەرەوژوورە** (ن) berewjûre
ب (بەرەوژوور).
**بەرەوژێر** (ئاک) berew jêr
ب (بەرەوخوار).
**بەرەوژێربوونەوە**(کتن) berewjêr bûnewe
ب (بەرەوخواربوونەوە).
**بەرەوژێرکە** (ن) berewjêrke
ب (بەرەوخوارە).
**بەرەوسەر** (ئان) berew ser
بەرەو سەرەوە، بەرەوهەوراز.
**بەرەولا** (ئان) berewla
کەچ، لابەلا، لار.
**بەرەوە** (ن) berewe
بەر، بەردەم، بەریان، پێش، پێشەوە.
**بەریان** (ن) beryan [1]
ب (بەربەست).
**بەریان** (ن) beryan [2]
ڕێبان، ڕاڕەوە، ڕێڕەوە، ڕێ گوزەر، گوزەرگا، گوزەرگە.
**بەرێبا بەرەدا** (رس) berî ba berde
١- بڕۆ، بڕۆبەولاوە، لەبەریایەکە لاچۆ.
٢- بەجێی بهێڵە!، بەجێی هێڵە، بەلاوەی نێ!، داینێ، دەستی لێ هەڵگرە، لێی گەڕێ، وازی لێ بهێنە!. ٣- بواربدە!، جێگابکەرەوە!.
**بەرێ بەیان** (ن، ف) berî beyan
١- بەیانیی، سەرلەبەیانیی، مەلابانگدان، سپیدەی بەیانیی. ٢- ب (بەرەبەیان).
**بەرێ خۆەدان** (کتن،کی) berî xohdasn(ki)
ب (ئاووڕدانەوە/ ١).

**بەری دەست خوێندنەوە (کتپ)**
berîdest xwêndinewe
دەست خوێندنەوە، دەس گرتنەوە.

**بەرین (ئان)** ¹ berîn
بەروو، پـان، پـان وبـەرین، پـان وپـۆڕ، پـین، پـەهن، تراز، فراوان، گوشاد، ویراق.

**بەرین (ن،ئان)** ² berîn
بەرگ، بەرگین، بەروو، بەریی، بـەرێ، پێشان، پـێش ئیـستا، پێـشوو، پێـشووتر، رابـردوو، گوزەشـتە، لەوەپێش.

**بەرین (ن،ئان)** ³ berîn
پـلەی سـەرەتایی، سـەرەتا، سـەرەتایی، یەکـەم مەنگاو، یەکەمین هەنگاو.

**بەرینان (نک)** berînan
پیاوانی کۆن، پێشونان، پێشینان، خەڵکی جاران.

**بەرینایی (ن)** berînayî
بـەرینیی، پـانایی، پـان وپـۆڕیی، پـانیی، فراوانیـی، گوشادیی، ویراقیی.

**بەراز (ئان)** ¹ beraz
بەگلەیی، پرگلەیی، دەم بەگلەیی، ناڕازیی، ناقایل.

**بەراز (ئان)** ² beraz
رازداپۆشەر، پۆشەر، رازدار، رازشیرەوە، سرقاییم.

**بەراستی (ئاک)** berastî
١- بەراسـت، تـەـز، تومـەز، تۆمـەز، تۆمـەڵێ، خـۆ، راستی یەکەی، لەراستیدا. ٢- ب (ئەڵبەتە/ ١).

**بەڕشتەوەکردن (کتپ)** berištewe kirdin
بەسەروبەرکردن، پێوەکردن،
دەق دان، رێک خستن، سازاندن، کۆک کردن.

**بەرقەوە تەماشاکردن (کتن)**
beriqewe temašakirdin
تیکورک کردن، خیسەڵێ کردن، لێ مۆربوونەوە.

**بەروو (ن،رو)** ¹ berü
(بەری دار بەڕوو)، بەڵو، دار بەڕوو.

**بەروو (ئان)** ² berü
بێشەرم وشکۆ، رووقاییم،رووکراوە.

**بەرە (ن)** bere
بەر، بەرک، بەرەپۆ، رایەخ، کلیم، گلیم، لەی، ووڕە.

**بەرەڤان (ن،کی)** berevan
١- ب (برەڤان / ١).
٢- تکاکار، دەم بەپارانەوە.
٣- پاریزەر، دەمراست.

**بەرەنگ وبۆ (ئان)** bereng w bo
١- باش، بەکەیف، کۆک.
٢- خۆش گوزەران. ٣- تانە، چاک، خاس، نوێ.

**بەرەوانی کردن(کتن،کتپ)** berewanî kirdin
١- بەرەڤانیی کرن،
کەوتنەنیوان، ناوبژیی کردن، نێوبژیی کردن.
٢- بۆ کەسێ پارانەوە، تکابۆکردن.

**بەرێ بوون (کتن)** berêbün
ڕۆیشتن (بۆ جێگایەک)، کەوتنە رێگا، گەشت دەس پێ کردن، هەوار جێ هێلان، وەڕێ کەوتن.

**بەرێز (ئان)** berêz
١- ئاغر، ئوودە، بەشکۆ، بەشێواز، بەقـەدر، سـەلار، سـەنگین، شـکۆدار، قـەدرگران، هێـژا (لەسـڵاوکردنی نامەدا). ٢- سەرەک، سەرۆک، گەورە، مەزن.
٣- خانەدان.

**بەرێ کردن (کتپ)** berêkirdin
١- بەخوداسپاردن، بەرێ خستن،
خستنەرێ، وەرێ خستن.
٢- رەوانەکردن، ناسن، هەناردن.

**بەرێکەوت (ف)** berêkewt
بەهەڵکەوت، دەرفەتیی، هەرلەخۆوە.

**بەرێ وجێ (ئان)** berê w cê
بەجێ، بەرێ وشوێن، بێنانەواوێی، بێ هەڵە، تـەواو، دروسـست، راسـت ودروسـت، رێـک وپـێک، لەجێـی خۆیدا (ووتە...).

**بەرێوەبردن (کتپ)** berêwe birdin
١- بەرێ بردن، دابیین کـردن (پێداویـستیی ژیـان)، ژیاندن. ٢- بەخێوکردن.

**بەرێوەبەر (ن،ئان)** berêweber
١- چاودێریکەر، سەرپەرشتیکەر.
٢- بەکرد وبـزان(لە ماڵداریـدا)، دەس بەنەختینـەوە گر (مرۆو).

**بەرێوەچوون (کتن)** berêwçün
بەرگەگرتن، خۆگرتن، گوزەران کردن.

**بەرێی خۆوە رۆیشتن(ئد)** berêy xowe royštin
دووی هەوەسـی خۆکـەوتن، کەوتنـەدووی هەوەسـی خۆ، بەئارەزووی خۆ رەفتارکردن.

**بەز (ن)** ¹ bez
پیو، چەوریی، دۆن، پۆن.

**بەز (ن)** ² bez
١- رەڤ، رەو، کاری (رەوییـن، هەڵهاتن).
٢- کـاری (رەدووکـەوتن، هـەڵگیران، ژنـی مێـردار)

{لەگەڵ دۆستێکدا}.

**بەز (ن)** [2] bez

ئود، ڕێز، شکۆ، قەدر.

**بەزات (ن)** bezat

ئازا.

**بەزاج (نک)** bezac

ب (ئاژاوە).

**بەزاجکەر (ئان)** bezacker

دوو ڕوو، دوو زمان، فریوباز.

**بەزاز (ن)** bezaz

ب (بازرگان).

**بەزاندن (کتپ)** bezandin

١- بڕدان، بەسەردازاڵ بوون، دەرپەڕاندن، کۆڵ پێ دان، گاڕدان، لەمەیدانیی چالاکیی دەرپەڕاندن. ٢- زەبوون کردن، سەرکوێر کردن.

**بەزتن (کتن)** [1] beztin

١- بەزین، پشت دان، پەکیین، تاران، تەقیین، تەوریین، ڕاکردن، ڕەڤیین، ڕەم کردن، هەڕاکردن (لەدەس دوژمن)، هەڵاتن، هەڵهاتن.

٢- بزدان، بەزدیین، ترسان.

**بەزتن (کتن)** [2] beztin

بارخستن، هەڵ دان(هەوار)، هەوارداتان، وەزیین (لەشوێنێ).

**بەزدۆنەک (ئان، کی)** bezdonek

١- ترسنۆک، دڵ لەرزۆک.

٢- بێ غیرەت، زارەترەک.

**بەزم (ن)** [1] bezm

١- شایی وزەماوەند، شایی ولۆغان، کەیف وخۆشیی، یاریی وخۆشیی.

٢- ب (ئاهەنگ / ١، ٢، ٣).

**بەزم (ن)** [2] bezm

بەدکردایی، بەدگۆیی، تەشقەلە

. **بەزمان (ئان)** [1] beziman

زمان پاراو، زماندار، زمانزان، زمان کراوە، زمان لووس، ووتە گوشاد.

**بەزمان (ئاک)** [2] beziman

بەدەم، بەدەمیی، بەزار.

**بەزمان (ئان،ن)** [3] beziman

خەڵک لەخشتەبەر، زمان لووس، ماستاو ساردکەرەوە.

**بەزم پێ گرتن (ئد)** bezm pê girtin

١- بەزم پێ کردن، تووشی ناڕەحەتیی کردن.

٢- تەشقەلەپێ کردن، شەڕ پێ فرۆشتن.

٣- تیزپێ کردن، دانەبەرکلکان، دەماخ تەخت کردن بەکەسێ، کات پێ ڕابواردن، گەمە پێ کردن.

**بەزمگا (ن)** bezmga

١- ئاهەنگە، شوێنی بەزم و ڕەزم، لۆخانە، مەڵبەندی شایی وئاهەنگ. ٢- شوێنی کۆبونەوە، مۆڵی کۆبونەوە.

**بەزم گرتن (ئد)** [1] bezm girtin

ئاهەنگ گێران، شایی کردن، کۆڕی کەیف وڕابواردن گێران، گۆوەندسازکردن.

**بەزم گرتن (ئد)** [2] bezm girtin

بەدکرداریی کردن، بەزم گێران.

**بەزم وڕەزم (ن)** [1] bezm w ṟezim

شایی لۆغان، شایی وزەماوەند، شایی وهەڵپەرکێ.

**بەزم وڕەزم (ن)** [2] bezm w ṟezim

هەراوچەقەچەق.

**بەزنجیر بەستنەوە (کتپ)**

bezincîr bestinewe

بەندکردن، حەپس کردن، کۆت وزنجیرکردن.

**بەزۆر (ئاک)** bezor

بەتۆپزیی، بەخورتیی، بەزۆرملیی، بەزۆریی، بەشیروتیر.

**بەزۆک (ن،ئان)** bezok

تاراو، ڕوخاو (ووزە)، ڕەمنە، شکاو (مرۆڤ)، هەڵاتوو.

**بەزە (ن)** [1] beze

تاوانبار، تاوانکەر، گوناهبار.

**بەزە (ن)** [2] beze

تاوان، سەوس، گوناه.

**بەزە (ن)** [3] beze

پیز، تین، هێز.

**بەزە (ن)** [4] beze

تەوژم، گوڕ، گوڕمە.

**بەزە (ن)** [5] beze

تەنیا، گۆ.

**بەزە (ن،س)** [6] beze

وورە، ووزە (سوپا).

**بەزە (ئان)** [7] beze

بەهەڵەچوو.

**بەزەتە (ن،ئان)** bezete

بت، پەرستراو.

**بەزەک** (ن، پز) bezek
زەردوویی، نەخۆشیی زەردوویی.

**بەزەویداچوونە خوار** (کتن) bezeyî da çûne xwar
نوغرۆبوون، نوقم بوون، نەمان.

**بەزەیی** (ن) bezeyî
بەزەویی، جگەرسۆزیی، جەرگ سۆزیی، رەحم، میهرەبانیی، هەستی دڵسۆزیی.

**بەزەیی پیداهاتن** (کتپ) ١ bezeyî pêda hatin
بەزەیی پیداهاتنەوە، دڵ پێ سووتان، دڵ سووتان بۆ (کەسێ)، زگ پێ سووتان، نارەحەت بوون بەنیش ونازار وگرفتاریی کەسێ، هەست بەهاودەردیی (کەسێ)کردن.

**بەزەیی پیداهاتن** (کتپ) ٢ bezeyî pêda hatin
چاو پۆشی لێ کردن،
لێ بووردن، لێ خۆش بوون.

**بەزەییدار** (ئان) bezeyîdar
بەخشندە، پڕ بەزەیی، پیار، دڵ نەرم، میهرەبان.

**بەزین** (کتن) ١ bezîn
١- بەزیان، بورخواردن، دۆڕاندن (لەجەنگدا)، راکردن (لەدەس دوژمن)، سەرنەکەوتن، شکان، شکیان، هەلاتن ، هەڵهاتن، (لەدەس دوژمن). ٢- ترازیان، کۆڵ دان، وازهێنان.
٣- ترسان، زەنەق چوون.
٤- خۆ هاویشتن، خێرا ڕۆیشتن، گورج بوون، گورج کردن. ٥- راکردن(ولاخ)، غاردان.

**بەزین** (کتن) ٢ bezîn
کۆچ وبارخستن(رەوەند)، ماڵ وکۆچ خستن (کۆچەر).

**بەزێنەر** (ن) bezêner
بۆڕدەر، تۆڕدەر، دابینەر.

**بەژ** (ن) ١ bej
١- بەژک، بەژیی، دیم، دیمەڕۆک، دیمەکار، زەویی بێ ئاو، زەوی نەکێڵراو. ٢- ب (ئیشکانیی).

**بەژ** (ن) ٢ bej
برج، بورج، دژ، قەلا، قەلات، کەلات.

**بەژا** (ئان) beja
هاوتەمەن، هاوعومر.

**بەژاڤیت** (ن،کی) bejavît(ki)
رەخنە، لەقەم.

**بەژک** (ئان) ١ bejk
جودا، جیا، جیاواز، ناتەبا.

**بەژک** (ئان) ٢ bejk
بێ سەروبەر، ناڕێک.

**بەژمێر** (ئان) ١ bejmêr
١- بەشیواز، سەلار، سەنگیین، گران، لەسەرخۆ، هەیەر، هێوەر.
٢- بەدەبدەبە، پایەبەرز، پرشکۆ، گەورە، مەزن. ٣- رەوا، شایان، شیان، شیاو.

**بەژمێر** (ئان) ٢ bejmêr
١- خۆشەویست، هێژا. ٢- بژوون، ساز، کیس.

**بەژن** (ن) ١ bejn
ب (بالا).

**بەژن** (ن) ٢ bejn
درێژایی کراس...

**بەژن** (ئان) ٣ bejn
خاوەن ژن، پیاوی ژندار.

**بەژن شووش** (ئان) bejnšüš
بەژن وبالاڕێک، قەدوبالا شووشەیی.

**بەژن وبالا** (ئان) bejnwbala
قەد وبالا.

**بەژێر دەست وپێوەبوون** (ئد) bejêr dest w pêwe bün
١- کەوتنە ژێر دەست وپێ.
٢- گوم بوون، لەناوچوون، وون بوون.
٣- پەشۆکان، شپرزەبوون.
٤- خراپ بوون، هیچ بەسەرهیچەوە نەمان.

**بەژێر لێوەوە کردن** (ئد) bejêr lêwewe kirdin
١- بەپەنهانیی هێشتنەوە، بەکەس نەوتن (مەبەست ونیازی دڵ)، حەشاردان، نەدرکان، شاردنەوە(نهێنیی).
٢- بەتەنگەوەنەهاتن، چاو لێ قووچاندن، خۆ لێ گێل کردن، خۆ لێ کەڕکردن، گوێ پێنەدان.

**بەس** (ن) ١ bes
ئەندازەی تەسەل لەهەر کارێک یان هەرشتێ، بووەیی، تێر وتەسەلیی لە هەموویارەکانیی ژیاندا.

**بەس !** (ئسپ) ٢ bes
بابەس بێ !، بەسە، بەسیە، بەسیەتی، چی دی نە !، وازبێنە.

**بەس** (ئان) ٣ bes
بەسراو، بەسیاگ، داخراو.

**بەس (ن)** ٤ bes
پەنا، پەناگە، قوژبن.

**بەس (ن)** ٥ bes
ئەنجامە، دوولایی (دەرگا...).

**بەسام (ئان)** besam
١- پڕ سام، ترسناک، سامدار، سامناک.
٢- بەهەیبەت.

**بەسانایی (ئاک)** besanayî
بە ئاسانیی.

**بەساڵداچوو (ئان.ف)** besalda çû
بەتەمەن، تەمەن درێژ.

**بەساویلکان (ئاک)** besawîlkan
١- بەپاکیی، بەدڵێکی پاکەوە، بێ غەوشان.
٢- بەگەوجانە، بەمل هوڕیی، منداڵانە، نەفامانە.

**بەست (ن)** ١ best
بەرهەڵست..

**بەست (ن)** ٢ best
چۆم، چەم، خڕ، دۆب، دۆڵ، دەرە، شیو، نەقەب.

**بەست (ن)** ٣ best
١- حەماڵیی خانوو (ژێر دارەڕا).
٢- تەختەی ژێردارە ڕا.

**بەست (ن)** ٤ best
بڕیە، بەڵێن، پەیمان، وەخۆ گرتنیی، هەرین.

**بەستران (کتن)** ١ bestran
بەسترانەوە، بەستن، بەستنەوە، گرێ دران.

**بەستران (کتن)** ٢ bestran
بەزاوانەبوون،
سەرجێی لەدەس نەهاتن (لەگەڵ بووکدا)، گرێ دران (پیاو).

**بەستران (کتن)** ٣ bestran
ڕاوەستان(لەئیش)، گیربوون، لەکارکەوتن، وەستان، ویستان.

**بەسترانەوە(کتن)** bestranewe
بۆڕ خواردن، بەزیین.

**بەسترانەوە بەکەسێکەوە (ند)**
bestranewe - bekesêkewe
١- پێوەبەستران (بەکەسێکەوە لەڕێگەی خۆشەویستی یەوە).
٢- بوون بەژن ومێرد، بوون بەهاوسەری یەکتر.
٣- پێوەبەستران، پێوەندیی لەگەڵ هەبوون، لەبەست بوون.

**بەستراو (ئان)** ١ bestraw
١- بەستراوە، پێوەندکراو، گرێ دراو(بەپەت یان دەزوو).
٢- پێوەدراو، جووتکراو، داخراو، گیراو، مۆرکراو.

**بەستراو (ئان)** ٢ bestraw
لەپیاوەتیی کەوتوو (نێر).

**بەستراو (ئان)** ٣ bestraw
بەستە، تێکەوەپێچراو، لێک پێچراو.

**بەستن (کتپ)** ١ bestin
بیندن، پێچان، گرێ دان، نەژاندن.

**بەستن (کتن)** ٢ bestin
بوونەسەهۆڵ، ڕچیان، ڕەق بوون (تراو، بەهۆی سەرمای زۆر)، قرسیین، قەرسان، قەرساندن.

**بەستن (کتپ)** ٣ bestin
پێکەولکاندن، لێک توندکردن، لێک گرێ دان.

**بەستن (کتپ)** ٤ bestin
بەربەست کردن، بەرهەڵست دانان، (ڕێگا)داخستن، (ڕێگا)گرتن، هاتوچۆ قەدەغەکردن.

**بەستن (کتپ)** ٥ bestin
برین دەرمان کردن، سارغی تێوەپێچان.

**بەستن (کتپ)** ٦ bestin
پێوەدان (دەرگا)، (دەرگا)داخستن.

**بەستن (کتپ)** ٧ bestin
داڕشتن (باس)، گوتن(ووتە یان نوسراو)، ووتن (ئاخاوتن).

**بەستن (کتپ)** ٨ bestin
خستنەژێر ووزەی جادووەوە.

**بەستن (کتپ)** ٩ bestin
ڕاگرتن، وەستاندن.

**بەستن (کتپ)** ١٠ bestin
کۆبونەوەکردن، کۆنگرە گرتن (بەستن).

**بەستنەوە (کتپ)** bestinewe
١- پێوەند کردن(ئاژاڵ..)، گرێ دان (گیانەوەر بەپەت..). ٢- بۆڕدان، پەک خستن(کەسێ لەکاتی ئاخاوتندا). ٣- پێچاننەوە، پێچانەوە.

**بەستە (ن)** ١ beste
١- بابۆڵە، بەستەکە، بەسە، بوخچە، پاکەت. پریاسکە، پێچراوە، پێچۆکە، دەستە، ڕەد، تەڤد.
٢- کۆما، کۆمەڵ، کۆمەڵە، گردکە.
٣- بەش، پارچە، پیچ، تیکە، تیلمە، جزر، کارتکە، کەرتکە، کوت، لەت.

**بەستە** (ن) beste [2]
باقە، چەپک، چەپکە.

**بەستە** (ن) beste [3]
پاشکۆ، توورەکە، جانتا، کیسە، هەبان، هەڤان، هەگبە، هەوان.

**بەستە** (ن) beste [4]
سەمۆل، شەختە.

**بەستە** (ن) beste [5]
تووشبوو، تێوەگلاو.

**بەستەزمان** (ئان) besteziman
١- بەسزمان، بەسزوان، بەسەزمان، بێ دەم وپل، بێ دەم وزمان. ٢- فەقیرۆکە، لەسەرخۆ، هێمن. ٣- پەست، غەمگین، غەمناک.

**بەستەک** (نک) bestek [1]
بارگەنوێن، پێخەف، دەستەنوێن، نوێن وبەرە.

**بەستەک** (ن) bestek [2]
تار، لا، لابار، لنگەبار.

**بەستەک** (ن) bestek [3]
ب (بەستە).

**بەستەکار** (ئان) bestekar
دانەر، ڕێکخەر، ڕێخەر.

**بەستەگی** (ن) bestegî
پەیوەستەگی، پەیوەستی، پەیوەندیی، پێوەندیی.

**بەستەلۆک** (ن) bestelok
١- بەستەلەک، بەسلەک.
٢- بەفریەسەر، بەفرەسەر، بەفرەسەرچە، سەهۆڵ بەندان، شەختەبەند.

**بەستەلەک** (ن) bestelek
ب (بەستەلۆک).

**بەستەنی** (ن) bestenî
بەستنیی، بەستوولە، چلوورە، حەلاوێ، دۆندرمە.

**بەستی** (ئان) bestî
بەردەلان، بەستێن، خڕ، خڕی چەم، شاتی.

**بەستیر** (ن) bestîr
فەرش، ئورتە، ڕایەخ، قالیی.

**بەسزمان** (ئان) besizman
ب (بەستەزمان).

**بەسە** (ن) bese
گوزارە، مانا، ناوەڕۆک، واتا.

**بە سەبەتەی ناگوێزرێتەوە** (ند)
be sebetey nagwêzrêtewe
پیریی کەفتەکاری کردووە، زۆر پیرە، لەبەر پیریی پەکی کەوتەبووە.

**بەسەربردن** (کتپ.ند) beserbirdin [1]
١- تیزپێوەکردن، گاڵتەپێ کردن، گەمە پێ کردن، یاریی بەئەقڵی کەسێ کردن.
٢- بەسەهوو بردن، بەهەڵەدا بردن، چەواشە کردن، خەڵەتاندن، لەخشتەبردن.

**بەسەربردن** (ند) beserbirdin [2]
١- بزۆزکردن، ماندوو کردن، هەراسان کردن.
٢- خراپ لەگەڵ (کەسێکدا) جووڵانەوە، لەگەڵ یەکێکدا خراپ بوون (بەرەفتار).

**بەسەربردن** (کتپ) beserbirdin [3]
کات بردنەسەر، کات ڕابواردن، وەخت دەربازکردن (بەخۆشیی).

**بەسەربردن** (کتپ) beserbirdin [4]
١- ئەنجام پێ دان، بەجێ گەیاندن، دوایی پێ هێنان، دوایی هاوردن. ٢- سازاندن، سازیان، کاربردنەسەر، گوزەران کردن، هەڵکردن.

**بەسەربردن** (کتپ) beserbirdin [5]
ئابڕووی کەسێ بردن.

**بەسەرچوون** (کتن.کتپ) beserçûn
١- تێ پەڕین، ڕابردن، ڕابوردن(کات)، کات برانەوە. ٢- تونابوون، لەناوچوون، نەمان.
٣- زایەبوون(مرۆڤ)، مردن، نەمان.
٤- بەسەردابوردن، بەرسەردابوورین، بەسەرداتێپەڕین، فەرامۆش کردن، لەبیرچوون، لەبیرنەمان، لەیاد دانەمان، هەڵبواردن.
٥- بەهەڵەچوون، هەڵەبەسەرداتێپەڕبوون.
٦- ئاوفرێ دان (گیاندار)، بوون (کاتی سەرجێیی).

**بەسەردا بڕین** (کتپ) beserda birîn
١- بەسەردا چەسپان، بەسەرداچەسپاندن، دەس نانەقوڕگێ (کەسێ).
٢- بەزۆر پێ سەلماندن، بەزۆر پێ قبوڵ کردن.

**بەسەردا تێپەڕاندن** (ند)
beserda têperandin
ب (ئاڤراختن).

**بەسەرداچوون** (کتپ) beserda çûn [1]
بەسەرکەسێکدا چوون، گەیشتنەلای کەسێ (لەناکاو)، بەلای کەسێکدا تێ پەڕبوون بەرێکەوت.

**بەسەرداچوون** (کتن،کتپ)[2] beserda çûn
لێ تێکچوون، لێ گۆڕان، نەچوونەوەسەر، هەڵەکردن.
**بەسەرداچوون** (کتپ)[3] beserda çûn
پشت گوێ خستن، خستنەئەولاوە،گوێ پێ نەدان.
**بەسەرداچوونەوە** (کتپ) beserda çûnewe
ئامارکردن.
**بەسەردا دان** (کتپ)[1] beserdadan
١- چوونەسەر کەسێ(لەناکاو)، هێرش بردنەسەر، هێرش هێنان. ٢- تاڵان کردن، چەپاوکردن.
**بەسەردا دان** (کتپ)[2] beserda dan
پۆشین، داپۆشین.
**بەسەردا دان** (کتپ)[3] beserda dan
لەسەری کەسێ دان (بەشتێ).
**بەسەردا ڕۆیشتن** (کتپ)[1] beserda royştin
بەسەردا ڕۆیین،
فەرامۆش کردن، لەبیرکردن، لەیاد کردن.
**بەسەردا ڕۆیشتن** (کتپ)[2] tinبeserda roy
زۆر لەگەڵ وتن، سەرخستنە سەر، سەر کوێن کردن و هێنانەژێربار.
**بەسەردا زاڵ بوون** (کتپ) beserda zalbûn
١- بۆڕدان، بەزاندن، تۆڕدان،
شکاندن( دوژمن)، کۆڵ پێ دان، گاڕدان.
٢- خستنەژێر ڕکێفی خۆوە، دابیین کردن.
٣- داگیر کردن، دەس بەسەرداگرتن.
٤- دەسەڵات بەسەرداپەیداکردن، بەسەرداشکان.
**بەسەردا هاتن** (کتپ)[1] beserda hatin
ئامۆژگاریی کردن، ئامۆژیاریی کردن، ڕێ وشوێن پیشان دان، ڕێ وشوێن نیشان دان، سەرنج ڕاکێشان.
**بەسەردا هاتن** (کتپ)[2] beserda hatin
بەسەرداچوون، بەلاداتێپەڕبوون، بەملداهاتن، لەپڕدا کەسێ بینین، لەناکاو بەلادا تێپەڕین.
**بەسەردا هاتن** (کتپ)[3] beserda hatin
خاوکردنەوە(ڕقی کەسێ)، ڕق نیشاندنەوە، هێمن کردنەوە، هێنانەوە سەرخۆ.
**بەسەردا هاتن**( کتن)[4] beserdahatin
دوای خولیاکەوتن، کەڵکەڵە کەوتنەمێشک، وابەبیردا هاتن کە....، وازانیین کە....
**بەسەردا هێنان{تاوان}**( ئد) beserda hênan
بەئەستۆدا هێنان، بەملداهێنان (گوناه)، تاوان خستنە پاڵ، خستنە ئەستۆ.

**بەسەرکردنەوە**(کتپ)[1] beserkirdinewe
لێ پرسینەوە، هەواڵ پرسیین.
**بەسەرکردنەوە** (کتپ)[2] beserkirdinewe
ئامشۆ کردن، سەر لێ دان، میواندارییی کردن.
**بەسەرکردنەوە** (کتپ)[3] beserkirdinewe
بەشوێندا گەڕان، پشکڤاندن، پشکنیین، لەدوو گەڕان، لێ گەڕان.
**بەسەرکردنەوە** (کتپ)[4] beserkirdinewe
ئە ژماردن، ژماردن، سەر ژماردن، سەر ژمێرکردن.
**بەسەرم هاتووە** (رس) beserm hatwe
لەئەورووداوەم[ بینیوە، بەسەر هاتووە، تاقی کردۆتەوە]، لەمن
ڕووی داوە، تاقیم ڕدۆتەوە.
**بەسەرەوبەر** (ئان)[1] beserewber
پوختە، چێکە، خنج، دامەزراو، دروست، دەبار، دەردەس، ڕێکە، ڕێک وپێک، ساز، سەرهەف.
**بەسەروبەر** (ئان)[2] beserwber
بووە، دەوڵەمەند، ساماندار، کۆکە.
**بەسەروبەرکردن** (کتپ) beserwberkirdin
١- ڕێکە خستن،
سەر ڕشتەکردن، کۆکە کردن. ٢- ئامادەکردن، پێچاندنەوە وخستنەبەردەس، ساز کردن.
**بەسەرەوەگەڕان** (ئد)[1] beserewegeṟan
خەڵک بەسەر کردنەوە، سەردانیی کردن، سەرلەخەڵک دان (بۆ مەبەستی میهرەبانیی، برادەریتیی، داب و دەستور یان کاروبار).
**بەسەرەوەگەڕان** (ئد)[2] beserewegeṟan
بێ بانگێ هێشتن چوونەسەر خوانی کەسێکی دیی، خۆ بەم وبەو بەخێوکردن، خۆتێ هەڵکوتانەسەر سفرەی خەڵک، مل ومۆ کردن، پارەو پووڵ لەخەڵک وەرگرتن بێ ڕیانەوە یان بیرکردنەوە لەخەرامانەی، مووشەکردن.
**بەسەرەوەنان** (ئد)[1] beserewenan
بەیەکە بێین شت خواردنەوە، خواردنەوە وتەواوکردن، هیچ لەناو جام یان پەرداغدا نەهێشتن.
**بەسەرەوەنان** (ئد)[2] beserewenan
بەتەنگەوەبوون، خەمخۆریی لێکردن، مشوور لێ خواردن.
**بەسەرهات** (ن)[1] beserhat
١- بسەرڤەهاتیی، تەڵەزگە، چورتم، سەرپێ هاتیی. کارەسات. ٢- ڕووداو، سەربردە، سەربۆریی. سەربوهر، سەر گوزەشتە. **بەسەرهات** (ن)

beserhat ٢

جۆری هەڵس و کەوت، چوونیەتیی ژیان، ڕوو پەڕەی ژیان، ڕێگەی ژیان، مێژوونامەی ژیان، مێژووی ژیـان، سەجەرەی مرۆڤ.

**بەسەرهاتن** (کتن) beserhatin

١- ڕوودان، قەومان.

٢- تووش بوون، تووش هاتن.

**بەسەرهەڵبوون** (کتپ) beserhelbün

پەیداکردنەوە، دۆزینەوە، دەس کەوتنـەوە، دیتنـەوە (سەرلەنوێ).

**بەسەری کەسێ گێران** (ئد) beserî kesê gêran

خەریکە کردن، سەر لێ تێک دان، سەرەخولێ پێ خستن، گیرۆدەکردن، گێژکردن، وێڕکردن.

**بەسەر یەکیانەوە هەیە** (رس)
beser yekyanewe heye

ڕیـز لەنێوانیانـدا هەیـە، نێوانیـان باشـە، قـەرزاربارى یەکترن لە...، چاکەیان بەسەریەکەوە هەیە.

**بەسەریەوە ناڕوات** (رس) beseryewe narwat

تۆڵـە لێ سـەندنەوە، سـزا لێ سـەندنەوە، مـاف لێ سەندنەوە، هەق لێ کردنەوە.

**بەسەریەوە نەڕۆیشت {بەسەرەوە نەڕۆیشتن}** (ئد)
beseryewe neroyšt

١- تۆڵـە ئەسـتاندنەوە، تۆڵەسـەندنەوە، تۆڵـە کردنەوە، تۆڵە لێ کردنەوە.

٢- چاو پۆشی لێ نەکردن، واز لێ نەهێنان.

٣- پاش خستن، دواخستن.

**بە سەلیقە** (ئان) be selîqe

بـژیر، بەئـەدا، تێگەیـشتوو، دوریـا، زانـا، زیـرەک، سەلیقەدار، کارزان، وریا.

**بەش** (ن) beš ١

١- پارچە، قۆڵ، کوت، لک، لەت، هێند.

٢- تۆز، تۆزقاڵ، چک، نەخت.

٣- بـژ، بـەرە، بـەهرە، پـیش، بیـەش، پـار، پـش، پشکک، پێ براو، قسن، قەد، ملە، مووچە.

٤- ماف، هەق. ٥- مەڵبەند، ناوچە، هەرێم.

٦- بەباڵابراو، بەرکەوت، شانس، قیسمەت، نسیب.

٧- ڕنق، ڕۆزیی، قووت.

**بەش** (ئان) beš ٢

ئاواڵە، داپچراو، کراوەوە، لێک کراوەوە.

**بەش** (ن، ئان) beš ٣

قەش، قەشان، ناوچەوان سپی (ئاژەڵ).

**بەشارەت** (نک) bešaret ١

١- ئابڕوومەندی، باشی، چاکیی، چەلەنگی، شـەنگی، قەنجی.

٢- پیشە، خوو، ڕەوتی ژیان، ڕەوشت، سـەر ڕشتە.

٣- ئارەزوو، مراز، مەبەس، مەبەست.

٤- ب (ئاریشەن یان ئەترەش / ١).

**بەشارەت** (ن) bešaret ٢

خـوس، خوسـت، زیـی، سووسـە، نتـق، نقـە، وورتـە، هەست.

**بەش بڕان** (کتن) beš biran

بەش بۆ نەمان، بەش خواردن،
بێ بەش بوون، بێ نسیب بوون لەشتێ.

**بەش بڕاو** (ئان) beš biraw

بەش بۆ نەماو، بەش خوراو، بـێ بـەریی، بـێ بـەش، ئائومید، ناهومید.

**بەش بوون** (کتن) beš bün

پەرت بوون، والابوون.

**بەش بەر** (ن) beš ber

١- بەشـدار، بیەشـدار، پـشدار، خـاوەن بـەش، مووچەبەر، هاوبەش، هەڤبا (بەگوێرەی یاسا).

٢- بەرە، وەجاخ، وەچە.

**بەش بەش** (نک) beš beš

پارچەپارچە، کوت کوت، لەت لەت.

**بەش بەش کردن** (کتپ) bešbeškirdin

١- پـارچە پـارچەکردن، جیاجیـا کـردن، جـوێ کردنەوە، لەت لەت کردن. ٢ - مووچە مووچـەکردن، هەرکەسە بەشی خۆیێ دان.

**بەشت** (ن) bešt

تیر، تەخش.

**بەش خواردن** (کتپ) beš xwardin

١- بێ بەهرەکردن.

٢- ماڵی خەڵک بەناڕەوا خواردن.

**بەشدار** (ن،ئان) bešdar ١

١- کاربرا، هاوکار. ٢- نیڤەکار، نیوەکار.

٣- ب (بەش بەر / ١).

**بەشدار** (خ.) bešdar ٢

سەگی بەرماڵ، سەگی ماڵ.

**بەشدارەگی** (ن) darekîbe

بەشداریی، بیەشدارەکیی، بیەشـداریی، پـشکداریی، کـاربراییی، نیوەکـاریی، هاوبەشـداریی، هاوبەشـیی، هەڤبایی.

**بەشداری کردن لە (کتن، کتپ)** beşdarî kirdin le
کاربرایی کردن، نیوەکاریی کردن، هاوبەشیی کردن، هاوکاریی کردن.

**بەشک (ئان)** beşik
١- بەد گومان، بەگومان، تارینەر، دڵ پیس، گوماندار. ٢- جێی گومان، گوماندار.

**بەشکا (ئب،ئاک)** beşka
ئەگەرماتوو، ئەی کە...، بەشکایەک، بەشکایەکم، بەشکایەکو، بەشک، بەشکە، بەشکەم، بەشکوو، بەشکی، بەشکیکم، بەشکیکو، هات و وا...

**بەش کردن (کتپ)** beş kirdin [1]
١- بەش بەش کردن، دابەش کردن، (شت)کردن بەچەند بەشێکەوە. ٢- جوێ کردنەوە، جیاکردنەوە، واڵاکردن. ٣- بەخشینەوە، بەشینەوە، پشاندن، پەخش کردنەوە.

**بەش کردن (کتپ)** beş kirdin [2]
بەس بوون، تێدابوون، تێ هەڵێنان.

**بەشکۆ (ئان)** beşko
بەدەبدەبە، بەربچاف، گەورە، مەزن.

**بەشکەر (ن)** beşker
١- بەشدەر، پشکدەر، پێدەر، دابڕ، داندەر، دەدەر.
٢- دابەشکەر، دابەشەر.
٣- جوێ کەرەوە، جیاکەرەوە.

**بەشوو (ئان)** beşû
١- ب (ئامووتیا).
٢- بەمێرد، شووکردوو، مێرددار (ئافرەت).

**بەشوودان (کتپ،ئد)** beşûdan
١- بەمێرد دان (ئافرەت)،
لەپیاومارەکردن (ئافرەت). ٢- تووشی بەلاکردن، داو بۆ نانەوە وتووش کردن، فریودان، هەڵخەڵەتاندن. ٣- هەڵخەڵەتاندن، یاریی بەئەقڵی کەسێ کردن. ٤- بەرەلاکردن وگوێ پێ نەدان، پشت تێ کردن، گوێ پێ نەدان.

**بەشەرتی چەقۆ (ش)** beşertî çeqo
بەمەرجی چەقۆ(شووتی فرۆشتن...). شت کڕین بە مەرج.

**بەشەرم (ئان)** beşerm
شەرمن، شەرمین، کەم ڕوو.

**بەشینەوە (کتپ)** beşînewe
ب (بەش کردن / ٣).

**بە فاڵ (ئان)** be fal̲
بەتەڵەب، بەدەماخ (میچکەی ئاژەڵ).

**بە فراوخۆر (ئان،خ)** befrawxor
شاخاوی، کوێستانی،چیا نشین.

**بەفربەسەر (ئان)** befrbeser
ب (بەستەڵۆکە / ٢).

**بەفرخۆرکە (ئان)** befr xorke [1]
هەورێکی خوناوییە بەفری کوێستان دەتوێنێتەوە (لەبەهاردا).

**بەفرخۆرکە (ئان)** befr xorke [2]
پرووشە بەفر.

**بەفەر (ئان)** befer̲
١- بەپیت. ٢- بەسوود، بەکەڵک، خزمەت گوزار.

**بەفیڕۆچوون (کتن)** befîr̲oçûn
بەخۆڕایی چوون، بەخۆڕایی لەدەس چوون، لەدەس چوون، لەکیس چوون.

**بەفیز (ئان)** befîz
لەخۆبایی.

**بەفیشاڵ (ئان)** befîşal̲
پیوەنەر، فیشاڵکەر.

**بەقا (ن)** beqa [1]
١- ئەمەکێ، پەیمان، وەفا. ٢- ب (ئومێد).

**بەقا (ن)** beqa [2]
باوەڕ، بایەخ، بڕوا، کاری پشت پێ بەستن.

**بەقا (ن)** beqa [3]
دوام، مان، ماین، مەنن.

**بەقاپێ کردن (کتپ)** beqa pê kirdin
ب (باوەڕ پێ کردن / ٢).

**بەقای پێ ناکرێ (رس)** beqaî pê nakrê
بەقای بۆ نییە، جێی باوەڕنییە.

**بەقلیسۆکە (ئان)** beqlîsok
بێئابروو، ڕوو هەڵماڵراو.

**بەقنگەوە(کەسێ) خستنە کەندەوە (ئد)**
beqingewe(kesê) xistine kendewe
بەقسەکەسێ بەزاندن، بەقنگەوە نانەچاڵ، بەقنگەوە نانەکەندەڵان، دەم کوت کردن.

**بەقنگ هەناسە ئەدات (ئد)**
beqing henase edat
١- کەشەنگ بوون، هەناسە توندبوون، هەناسە سواربوون. ٢- زۆر ماندووە.

**بەقوونداخستن (ئد)** beqûndaxistin
خستنە پشت گوێ، دواخستن، وەدرەنگیی خستن. وەدوا خستن.

**بەقەد (ناک)** beqed

ئەوەندەی، بەئەندازەی، بەپیوانەی، بەقـەدەر، تێـرا، هێندەی.

**بەقەڵافەت (نان)** be qe̲lafet

١- ب (بالابەرز). ٢- زەبەلاح، زەلام، کەتێ.

**بەقینا کەوتن (کتن)** beqîna kewtin

ب(بەقیندا چوون).

**بەقینداچوون(کتن)** beqîndaçûn

بەرقـــداچوون، بەرقداکـــەوتن، بەقیناکـــەوتن، بەقینداکـــەوتن، رق هەســـتان، رق هەڵـــسان، رق هەڵگرتن.

**بەکار (نان)** bekar

١- چالاک، کارامە، گورج، گورج وگۆڵ.

٢- ئیـشکەر، بــەتوانا، توانــا، کــاربیین، لیهــاتوو، مەردەکار.

**بەکارهاتن (کتن)** bekarhatin

بەکارخواردن، بەکەرەم هـاتن، بەکـەڵک هـاتن، دەس دان، دەست دان، سوود هەبوون.

**بەکارهێنان (کتپ)** bekarhênan

بـەکاربردن، رەنیوهێنـان، کارپـێ کـردن، کـەڵک لێ وەرگرتن، کەڵک وەرگرتن لە (شتێ یان کەسێ).

**بەکاری هیچ نایەت {شت یان مرۆڤ} (ند)** bekarî hîç nayet (šit yan mirov)

بەکـەڵکی هیـچ نایـەت، بـێ کەڵکـە، بـێ هوودەیـە (مرۆڤی هیچ وپوچ).

**بەکام گەیشتن (کتپ)** be kam geyštin

ب(ئاوات پێکهاتن).

**بەکاوەخۆ (ناک)** bekawe xo

١- بەهێواشیی، بێ تالووکەیی(ناک).

٢- بەئاســـانیی، بـــەبێ گیروگـــرفت، بەســـانایی، بەکاووخۆ، بێ گیرو گرفت.

٣- بەبێ دەنگیی، بەنەرمیی.

**بەکرووک (نان)** bekrük

بزێو، سەربەگێچەڵ، نارەحەت.

**بەکرە (ن)** bekre

تەقن، دەقن، قوڕ، کوڕ، گیل، هەرکە، هەڕی، چەرکە.

**بەکرێ گیراو (نان، ن)** bekrê gîraw

١-(شـــت) لەخـــاوەن وەرگـــیراو بـــۆ ماوەیـــەک بەپارە(نان).

٢- پاتەخۆر، چلکاوخۆر، نۆکەری بێگانە (ن).

**بەکوتەک کار بەکەسێ کردن (ند)** bekutek kar be kesê kirdin

بەخورتی کەسێ بردن بەرێگـەوە، بەکوتـەک کارپـێ کـردن، پـاڵ پـێوەنان، زۆر لێ کـردن، زۆرەملیـی لێ کردن، کەڵەگایی لەگەڵدا کردن.

**بەکورتییەکەی (ناک)** bekurtiyekey

بەچەند ووشەیەک.

**بەکوڵکەوەبوون (کتن)** beku̲lkewe bûn

بەرپرسـیاربوون، تـووش بـوون، لێ پرسـراو بـوون، وەبال بەئەستۆبوون.

**بەکوڵکەوە کردن (کتپ)** beku̲lkewe kirdin

بەتووشـــەوە کـــردن، بەرپرســـیارکردن، بەســـەردا سەپـــاندن، کـــردن بەتووشـــەوە، وەبـــاڵ بـــە ئەستۆخـــستن. ٢- فـــرو فـــێڵ لێ کـــردن، هـــەڵ خەڵەتاندن، یاریی پێ کردن (لەڕووی ئەقڵەوە).

**بەکۆمەڵ (ناک)** bekome̲l

١- بەتێکرایی، بەسەریەکەوە، پێکرا، تێکرا، هـەموو پـێکەوە، وێکـرا. ٢- تەقـدە، خـڕ، خـشت، رایگـەم، سەراپا، گشت، همی، هەکس، هەموو.

**بەکەر ناوێرێت بەکورتان شێرە(پن)**

be ker nawêrêt- be kurtan šêre

دەســـەڵاتی کەرەکـــەی نییـــە، لەکۆپـــان دەدات، بەیەکێک دەوترێ کەنەتوانێ سزای تانووتێبدا بەڵام ئازایە بەمرۆڤێکی زەبوون بوێرێت کەهیچ پێوەندیی بە کێشەکەوە نەبێ.

**بەکەڵ {ماڵکا} (نان)** beke̲l

ب (ئەلۆر).

**بەکەڵک (نان)** beke̲lk

بەهرەمەند، سوود بەخش.

**بەکەڵک هاتن (کتن)** beke̲lk hatin

ب (بەکارهاتن).

**بەکەیف (نان)** bekeyf

بەدەق، بەدەماخ، خۆشحاڵ، دڵخۆش، کەیف خۆش.

**بەکێش (نان)** bekêš

١- پرکێش، خوشرەو.

٢- بەپشوو، کۆڵ نەدەر، هەزوا.

٣- بەتیین، بەهێز، بۆکە، دوونا.

٤- ساخ(لەش)، لەش ساغ.

٥- بەتەووژم، سەرگەم.

**بەگژداپەڕین (کتپ)** begijda pe̲rîn

ب(بەگژدا چوون).

**پاخاف کرن** (کتن) paxafkirn
سـەرنج لێ دان، کنـەتیاکردن، کنـەکردن، لێ کۆلینەوە، لێ ووردبوونەوە

**پاخر** (ن) paxir
مس.

**پاخستن** (کتن،کل) paxistin(kl)
بەجێ مان، پێخستن، جێمان، لەپـەل وپـۆکەوتن، لەپێکەوتن، ماینان، مانەوە، ماندوو بوون.

**پاخلیسکان** (کتن) paxilîskan
پاخزیان، پاخلیسکیان، پێ خـزان، پـێ خلیسکیان، خزان، خزیان.

**پاخوا** (ن) paxwa
تەپ، تەپە، کۆمەڵ.

**پاخۆشە** (ن،ئان) paxoše
پاشیل، پێخۆشە، پێشیل.

**پادار** (ئان) ١ padar
پێدار، خاوەن پێ(گیاندار)، بەپێ، پێڕەووک.

**پادار** (ن) ٢ padar
قەد (درەخت)، ناوقەد (کۆڵەکە).

**پادار** (ن) ٣ padar
کۆڵەکە، پایە.

**پادار بگرە بێ پا ماڵی ویمانە** (پن،هە)
padar bigre bê pa maḻî wêmane(he)
کەسێ دەیڵێ (کاتی نان خواردن) بۆ مەبەستی هەڵپەکردن وپەلاماردانی خواردنی بەتام کەلەوانەیە زوو لەسەر خوان نەمێنێ.

**پادار بوون** (ئد) padarbûn
زوو هەستانەسەرپێ، ڕابوون، هەستان، هەڵستان.

**پاداش** (ن) padaš
ئیزا، ئێزا، پاداشت، چاکەبەچاکە، خەرامانە، سزا، سەزا، کارنک.

**پاداش پێ دان** (کتپ) padaš pêdan
مووچە پێدان.

**پاداش دانەوە** (کتپ) padaš danewe
پاداشت دانەوە، چاکەبەچاکە کردن، چاکەدانەوە، چاکـەکردن بەرامبـەر کەسـێ، چاکـەکردن لەگـەڵ کەسـێ بەرامبـەر چاکەکـەی خـۆی، چاکـە لەگـەڵ کردن(بەرامبەر بەچاکە)، خەرامانە پێ دان.

**پادان** (کتن) padan
نزیین، شان پیاداکردن.

**پادان لەپەین** (ئد) padan lepeyn
کـاری هیـچ وپـووچ کـردن، ڕەفتـاری بێنـرخ کـردن، گەوجایەتی کردن.

**پاداو** (ن) padaw
پێ داو، داو (لەتامۆسک دروست کراو).

**پادەشت** (ن) padešt
پێدەشت، چۆلگە، چۆلەوان، دەشت.

**پار** (ن) ١ par
پا، پای، پشک، بەش.

**پار** (ن) ٢ par
پارسال، پارەکە، ساڵی پار، ساڵی ڕابوردوو.

**پارازتن** (کتپ) paraztin
ب (پاراستن).

**پاراژۆ** (ن) parajo
ب (بەخێوکەر).

**پاراستن** (کتپ) parastin
ئاگـاداری کـردن، ئاگـالێ بـوون، ئێشکە لێ گـرتن، پارازتن، چاو تێوەبوون، چـاودێری کـردن، چـاودێری لێ کردن، چاو لێ بوون.

**پاراو** (ئان) ١ paraw
پڕ لەئاو، تەڕ، تەڕوبڕ، تێرئاو، تێراو.

**پاراو** (ئان،ن) ٢ paraw
ب (ئاویە).

**پاراو** (ئان) ٣ paraw
ب (ئاودار / ١).

**پارت** (ن) part
دەستە، کۆمەڵە.

**پارتی** (ن) ١ partî
برادەر، دۆست.

**پارتی** (ن) ٢ partî
کۆمەڵەیەکە ڕێکخراوی ڕامیاریی.

**پارتیکل** (ن) ١ partîkiḻ
ئالاو، ئالەت، ئامراز، ئامێر، ئەمراز، ئەوزار.

**پارتیکل** (ن) ٢ partîkiḻ
یەکەیەکی بچووکە لە ئاخاوتن ، هەموو ئەو وشانەی گەردان ناکرێن وشەکانی ئاخـاوتن بێجگـە لـە(نـاو) و(کـردار) بەشـێکی بچووکـە لـەئاخاوتن وەکە : ئامرازەکانی (پـێوەندی و وەپـاڵ خـستن وپێشگر و پاشـگر و پرسـیار و سەرسـوڕمان و بانگهێـشتن) و نـاوەڵکرداری یـەک برگـەیی بەشـێکی کـورت ونائەگەردانی ئاخاوتنە.

**پارچە** (ن) ١ parçe
١-برگە، پار، پارە، پەرچە، پینە، تیکە، تیلماسکە، تیلمـە، سفن، کوت، کـەرت، کـەرتک، کـەرک، لـەت،

پاری. پسپان. ٢- بەش، پشک، پل، چنکە، هێند، پەترۆک، پرزۆل. ٣- قوماش، کالا، کوتاڵ.

**پارچە** (نک) parçe [2]

برشت، تیکەقوماش، سەرەمقەست، تلاشە.

**پارچە پارچە** (ئان) parçe parçe

بربر، بەش بەش، پشک پشک، جون جون، جۆجێ، قەت قەت، کوت کوت، لەت لەت، پل پل.

**پارچە پارچە کراو** (ئان) parçe parçe kiraw

ب(ئەنجنداو).

**پارچە پارچە کردن** (کتپ) parçe parçe kirdin [1]

١- پەل پەل کردن، کوت کوت کردن، کەرت کەرت کردن، لەت لەت کردن، ژ هەڤ بەلاکرن، پژلاندن. ٢- شکاندن، ورد کردن.

**پارچە پارچە کردن** (کتپ) parçe parçe kirdin [2]

بەش بەش کردن، جوێ کردنەوە، جیاجیاکردنەوە.

**پارچە فرۆش** (ن) parçe froš

بازرگان، بەزاز، بیزاز، بیزی فرۆش، کوتاڵ فرۆش.

**پارچە کراو** (ئان) parçekiraw

بڕاو، پارەپارە، پارەکراو، پەرت کراو، دراو، جودابووەوە، کوت کراو، لەت کراو، لیک کراوە، هەلاهەلا.

**پارچە کردن** (کتپ) parçekirdin [1]

ئەنجنین، جنین، لەت کردن، ورد کردن، هەنجنین، پل کردن، کوت کردن.

**پارچە کردن** (کتپ) parçekirdin [2]

ب (پچڕاندن).

**پارخوان** (ن) parxwan

ڕان، لاران، هەردوو تەنیشتی ڕان.

**پاردە** (ن) parde [1]

خەندەق، زێوارە، کەند، کەندەک.

**پاردە** (ن) parde [2]

دیوار، تیکار، کۆسەر، تاک، ڕاستەدیوار.

**پارزوون** (ن) parzün

پارزن، پالێو، پالێونە، پالێوەر.

**پارس** (ن،نا) pars [1]

ب (بەوڕ).

**پارس** (ن) pars [2]

دەرۆزە، سوال، سوالکەری، دەرۆزە، گەدایی، لە ئەچنیی، پارسە.

**پارسا** (ئان) parsa

لەخوا ترس.

**پارس کردن** (کتن) pars kirdin

دەرۆزەکردن، سوال کردن.

**پارسە** (ن) parse

ب (پارس).

**پارسەک** (ن،ئان) parsek

دەرۆزەکەر، سوالکەر.

**پارسەنگ** (ن) parseng

بەرسەنگ، پاسەنگ، وەرسەنگ.

**پارسەنگ خستنە پاڵ** (کتپ) [1]

parseng xistine pal

بەرسنگ گرتن، پاسەنگ کردن، وەرسەنگ کردن.

**پارسەنگ خستنە پاڵ** (ئد) [2]

parseng xistine pal

ناووناتۆرە شوێن خستن، ووتەی سووک خستنەپاڵ، ناوسووک کردن، ناو لێنان، ناووناتۆرە لێنان.

**پارکەر** (ن) parker

پارکیر، پارگیر، تەشی، تەشیلە، کلافەگیر، پاهەلگر، خوری گل، کلافەهەلگر.

**پاروو** (ن) parü

پابۆلە، پاری، تیکە.

**پاروو خستنە بەر دڵ** (ئد) parü xistine ber dil

ب (بەردل خستن).

**پارووکردن** (کتپ) parü kirdin

بابۆلەکردن، بەپاروو کردن(خواردن)، پارووگرتن، کردنە بابۆلە، کردنەپاروو، کردن بەپاروو.

**پارووگرتن** (کتپ) parü girtin

ب (پاروو کردن).

**پاروو گلاندن** (کتپ،کتن) parü glandin

بابۆلەی گەورەکردن، پارووگرتن، پارووی زل گرتن.

**پارووگلێن** (ئان) parü glên

تیکە گلێن، زۆر خۆر وسکەڕۆ.

**پارووی گەورە گلاندن** (ئد)

parüy gewre glandin

١- ب(پاروو گلاندن). ٢- بەرچاوتەنگ بوون. ٣- بەتەماع بوون. ٤- بەرز فرین.

**پارە** (ن) pare [1]

ب (پارچە / ١).

**پارە** (ن) pare [2]

١- پوول، دراو، پەرە. ٢- داهات، سامان، ماڵ، دەولەت، پارە وپوول، نەختینە.

**پارە، پارە ئەهێنێ** (پن) pare, pare ehênê

پارە، پارە رادەکیشێ، پارە پارە ئەدۆزێتەوە یان

پەیدا دەکات.

**پارە پارەکردن (کتپ)** pare pare kirdin

ب (پارچەپارچەکردن).

**پارەپەرست (ئان)** pare perst

پارەخۆشەویست، پوولەکیی.

**پارەپیس (ئان)** parepîs

پیسکە، چرووک، رژد.

**پارەچلکی دەستە (پن)** pare çilkî deste

وریا کردنەوەیە لەبارەی زوو لەدەست چوونی پارەوە، پارەدار ئازادە لەچۆنیەتیی خەرج کردنی پارەی خۆی.

**پارەدار (ئان)** paredar

خاوەن پارەو پوول، دەوڵەمەند، سامانداز، ماڵدار، دەوڵەمەند، کۆک، خۆش گوزەران، بووە.

**پارەسنگی لەزەوی نادات (پن)**

pare singî lezewî nadat

خۆی بۆ پارە ناگۆڕێتەوە، گوێنەداتە ماڵی دنیا، ناوی خۆی لاپەسەندترە وەک لەماڵی دنیا.

**پارەکردن (کتن)** parekirdin

بەبەهرە بوون، پڕ سوود بوون، سوودبەخش بوون، نرخ کردن.

**پارە گۆڕینەوە (کتپ)** pare gorînewe

پارەچواندن،

پارەوپوول وچەکی‌بانق چواندن یان گۆڕینەوە، پوول گۆڕینەوە.

**پارەوپوول پێ نەمان (کتن)**

pare w pul pêneman

تیک شکاندن، تێکەوتن، سوخت بوون، لات بوون، کەوتنە سەر ساجی عەلی.

**پارەی چەرمگ بۆ رۆژی رەش (پن)**

parey çermig bo rojî reš

ماڵی سپی بۆ رۆژی رەش.

**پارەی خەلک کیسە نەدرێنێ (پن)**

parey xelk kîse edrênê

چی قەرزاریی بیدەرەوە و کیسەی باخەڵت سەلامەتە.

**پارەی زۆر سەر شۆڕیی دێنێ (پن)**

pareyzor ser š orîdênê

ئەو کەسەی پارەی زۆری لەرێگەیەکی ناراستەوە هاتبێتە دەست لەوانەیە بەد رەفتاریی پێوەبکات.

**پارەی نوستوو (نک)** parey nustû

پارەی پاشەکەوت(کراو)، پارەیەکە لەلاوە دانرابێ ونەخرابێتە سەوداو مامەڵەوە

**پارێز (ن)** [1] parêz

ب (باخ.).

**پارێز (ن.)** [2] parêz

ب (پارێزگاریی).

**پارێز (ن.)** [3] parêz

ب(پارێزگا).

**پارێز (ن.)** [4] parêz

قەرەووڵ، سەرنج، چاوەچاو، پەرهێز.

**پارێز بوون (کتن،کتپ)** parêz bûn

پارێز کردن، پارێز لەهەندێ خواردەمەنیی کردن، خۆلادان لەهەندێ خواردەمەنیی، دوورە پەرێز بوون لەهەندێ خۆراک، پەرەزییکردن، رێجیم کردن.

**پارێز چوون (کتن)** [1] parêz çûn

بەپارێزێ چوون، بەپارێز بۆ رۆیین، قەرەووڵ چوون، قەرەکەوتن.

**پارێز چوون (کتپ)** parêz çûn [2]

قەرەووڵ لێگرتن، نیشانەکردن، نیشانەلێ گرتن.

**پارێز چوون (کتن،کتپ)** parêz çûn [3]

چوونە ناوپارێز، چوونە ناوحەشارگە، خۆ خستنە ناو بۆسەوە.

**پارێزشکاندن(کتپ)** parêzškandin

گەڕانەوە سەردۆخی جاران لەسەبارەت بەخواردەمەنی یەوە.

**پارێزڤان (ن،کی)** parêzvan(ki)

ب (باخەوان).

**پارێز کردن (کتپ)** parêzkirdin

خۆ پاراستن لە...، خۆ دوور گرتن لە... خۆ لەشتێ پاراستن، دوورە پەرێز لێڕاوەستان، پەرهێز کردن.

**پارێزکەر (ن)** parêzker

پارێزەر، چاودێریکەر، ئاگادارێکەر.

**پارێزگا (ن،س)** [1] parêzga

بۆسە، پارێز، پارێزگە، پازگە، پاسکە، حەشارگە. سەنگەر.

**پارێزگار (ئان)** [2] parêzgar

پارێزکەر، خۆپارێز، خۆلادەر (لەخواردەمەنیی ناجۆر)، دەس پارێز (لەهەندێ خواردن).

**پارێزگاری (ن)** [1] parêzgarî

ئاگادرایی، پارێز، پارێزکاریی، پارێس، خۆپارێزیی. کاری نەخواردنی هەندێ خواردەمەنیی کەبە ئەو کەسە نەکەوێ... پەرهێز، پەهرێز، پەرهێزیی. پیمز. رێجیم، رژێم.

**پارێزگاری (ن)** parêzgarî [2]
خودداریی، دوور بینیی.
**پارێزگاری (ن)** parêzgarî [3]
بیداریی، وریایی، چاوەچاو.
**پارێزگاری کردن (کتپ)** parêzgarî kirdin
ب(پاراستن).
**پارێزگە (ن.)** parêzge
ب(پارێزگا).
**پارێزەر (ن.)** parêzer [1]
پاش میر.
**پارێزەر (ن.)** parêzer [2]
بەرفەدەر، دەمراست.
**پارێزەر (ن)** parêzer [3]
ئاگاداریکەر، ئاردەڵ، ئیشکچیی، ئیشک گر، پاسەبان، پاسەوان، پاراژۆ، چاودێر، چاودێریکەر، حەس حەس، دیدەوان، سەرپەرشتیکەر، کیشکچیی، نقادا، نەیرفان، واژەر، وەردیان، یاساوڵ.
**پارێڤ (ن.کی)** parêv(ki)
رۆست، قوشباشی، گۆشتی برژاو.
**پارێن (ن.نا)** parên
پارکۆلە، پارگوێر، پارونەک، پارۆنەک، پارینە، کۆلە، گولکی پار، گوێرەکەی ساڵە وەخت، گوێرەکەی یەک ساڵە، گوێرەکەی پار، مێنگوێن، نۆیین، پانێر.
**پارێنک (ن)** parênik
پارگۆن، پارکۆن، پارپوینک، پارگیی، جۆگەی قەراغ دەوار، ئاوەڕێی دەوروبەری رەشماڵ، پارێنک(قەراغ سەنگەر).
**پارانەوە (کتپ)** paranewe
پاڕیانەوە، شت داواکردن (بەمل کەچییەوە)، لاڵانەوە، لاڵیان.
**پارزان (کتن)** parzan
بەدڵۆپە هاتنەخوار، رایی بوون(ئاو...).
**پارزیین (کتپ)** parzîn
ب (ئاوپاڵ کردن ١/).
**پارۆ (ن)** paro
١- پارو، چەپە، سەوڵ.
٢- بەفرماڵ، خاکەنازەدارینە.
**پارۆکلە (ن)** parokle
رەورەوە.
**پاروودان (کتپ.کتن)** parüdan
سەوڵ لیدان، بەلەم ئاژۆتن.

**پاروژەن (ن)** parüjen
سەوڵ لیدەر.
**پارەس (ن)** pares
پاگا، پەی، پاگە.
**پارەوکە (ئان)** parewke
پارۆکە، پێپڕەوکە (منداڵ).
**پازناووک (ن)** parznawük
نوێل.
**پاژ (ن)** paj
بەش، هیند.
**پاژنە (ن)** pajne
١- پاژنۆ، پاشنە، گولمە گۆشتی بەشیی دواوەی قولەپێ، پەحنی. ٢- پاژنەی گۆرەویی یان پیلاو.
**پاژنەدەرگا (ن)** pajnederga
گرێژەنە، گیجەنە.
**پاژۆخ (ن.)** pajox
١- پاسوخ، وەلام، وەرام.
٢- بەرپەرچ، بەرپەچ، رەت، بەلگە.
**پاژە (ن.)** paje
بەلگە، سەلمێن.
**پاژەر (ن.)** pajer
پاژدەر، پاشدەر، تیرەک، دووگر، دووگری، دیرەک، پایە،ئەستوون، ستوون.
**پاژەرەژ (ن.)** pajerej
گۆپکە، چرۆ، گۆپیتە.
**پاژینە (ن)** pajîne [1]
سوس، کەپەک.
**پاژینە (ن)** pajîne [2]
دانەرۆکە.
**پاژیی (ئاک)** pajî
کەم تابێژێ، بەشێکیکەم، شتێکی کەم.
**پاس (ن)** pas [1]
ئۆتۆمبیل.
**پاس (ن)** pas [2]
پاسەوانی، چاودیاری، چاودێریکەر، چاودێری، چاوێرکەر، پارێزەر، وەردیان، یاساوڵ.
**پاس (ن)** pas [3]
پاشەکشە.
**پاس (ن)** pas [4]
پەتە، پاسپۆرت، پەساپۆرت، روخسەتنامە، کارت، بلوەر نامە، بروانامە، پاژ، تکت، گوزەرنامە، لایسن، پاسوان، بلیت، کۆپۆن.

**پاسا (ن)** ¹ pasa
پۆشە، پۆشیە، سەرپۆش، سەرقاپ.
**پاسا (ن)** ² pasa
پەردە، تارا، پەچە، چارشێو، پۆشێن.
**پاساردان (کتن)** pasardan
داخی دڵ ڕشتن(بەکەسێ)، کاسەی تووڕەیی ڕشتن (بەسەرکەسێکدا)، زۆر تووڕەبوون، ڕق هەستان، فیشەکێی‌بوون.
**پاساکردن(کتن،کتپ)**¹ pasa kirdin
١- لەبیرخۆ بردنەوە، لەیادی خۆ دەرکردن، فەرامۆش کردن. ٢- خۆ لێ گێل کردن، خۆ ناشی‌کردن، خۆ نەزان کردن.
**پاساکردن (کتپ)** ² pasakirdin
پامال کردن، پێشێل کردن، خستنەژێر پێ، پاکۆت کردن، لەقەشێل کردن.
**پاساکردن (کتپ)** ³ pasa kirdin
پۆشین، داپۆشین، سەرداپۆشین.
**پاساکردن (کتپ)** ⁴ pasa kirdin
بووراندن، چاو پۆشیی لێ‌کردن، لێ‌بووردن، لێ‌خۆش بوون، بەخشین.
**پاسرگیاک (ئان)** ¹ pasirgyak
بریندار، زامدار، کۆڤاندار.
**پاسرگیاگ (ئان)** ² pasirgyag
ئاوساو، سووربووەوە، سوور هەڵگەراو (پێست)، گرمژاو بوو، گرمژاویی.
**پاسقاڵ (ن)** pasqal
سوعبەتچیی، گاڵتەچیی.
**پاس کردن (کتپ)** ¹ paskirdin
پاراستن، ئاگاداریی‌کردن، چاودێریی کردن.
**پاس کردن{سەگ} (کتن)** ² paskirdin(seg)
حەپەحەپ کردن، گەفیین، وەڕیین (سەگ).
**پاس کردن (کتپ)** paskirdin
ب (پاراستن).
**پاسوخ (ن)** pasux
پاسوخ، وەڵام، وەرام، پاژۆخ.
**پاسە (ئاک،ئان)** pase
ئاوەها، وەها، وا، ئاوا، بەوجۆرە، بەوچەشنە، ئاوها.
**پاسەرنیان (کتپ)** paserniyan
بەشویندا ڕۆیین، پێ هەڵگرتن، شوێن دۆزیی‌کردن، شوێن ڕۆیین.
**پاسەوان (ئان،ن)** pasewan
ئاگاداریکەر، ئێشکچیی، پاریزەر، پاسەبان، پیش قەرەووڵ، چاویار، دیدەوان، قۆشەن، قەرەغوڵ، قەرەگوڵ، قەرەووڵ، کێشکچیی، نۆبەچیی، نۆگەچیی.
**پاسەوانی (ن)** pasewanî
ئاگاداریی، ئێشکچیتیی، پاس، چاودێریی، چاویاریی، دیدەوانیی، کێشکچیتیی، نۆبەچیتیی، سەرپەرشتیی، چاوێریی، کێشکڤانیی.
**پاسەوانی لێ کردن (کتپ)** pasewanî lê kirdin
ب(ئێشک گرتن / ٢).
**پاش (پ،ئاک)** paš
پاشان، پاشەوە، دوای شت.
**پاشا (ن)** paša
پاتشا، پادشا، شا، گەورە وسەرۆکی وڵات، سان.
**پاش ئاخوڕ (نک)** paš axur
پاشاخوڕ.
**پاشاخوڕ (نک)** pašaxur
پاش ئاخوڕ، پاش مەنە، بەرماوەی ئاخوڕ، پەساخوڕ، پاشەڕۆک.
**پاش ئاراو (ن)** pašaraw
پاشۆراو، پاشاراو، پەساو، چڵکاو، دوائاراو.
**پاشاگەردانی (ن)** pašagerdanî
بێ‌سەرۆکیی، بێ سەری گەورەیی، بێ شیرازەیی، پاشا گەردانێ، پشێویی(بەهۆی نەمانی گەورە وسەرۆکەوە)، ستەم، بێ‌یاسایی، خۆ خۆیی، هەرکەسە بۆ خۆی.
**پاشان (ئاک)** pašan
ئەودەمە، ئەوسا، ئەوکاتە، ئیتر، بەوپێیە، پاشی، پاشیین، دواگین، دوای ئەودەمە، دوای هەموان، دیشت ڤە، دوایە،د وایی، دۆتر، کاتێکی تر، لەمەولا، لەوکاتەوە، دواجار.
**پاشای سەر لەتە ختی، بنوارەوە ختی (پن)**
pašay ser textî, binware wextî
ئەگەر بوویت بە فەرمانڕەواچاوی بەزەییت لە میللەتەوەبێنت.
١- ئەگەر ویستت لەکەسێ تێبگەیت فەرمانڕەوایی بدەرە دەست. ٢- ئەوەی نەتوانێ فەرمانڕەوایی خۆی بکات، ناتوانێ فەرمانڕەوایی خەڵکی تربکات.
٣- ئەوەی فەرمانڕەوای خۆی بێ، دەتوانێ فەرمانڕەوایی بگرێتە دەست.
**پاشایی (ن)** pašayî
پاتشایی، پادشایی، گەورەیی وسەرۆکایەتیی دەوڵەت.

**پاشایی**(ن.،خ.) pašayî
خۆش گوزەرانی، ژین خۆشی، شادمانی.
**پاشبەند** (ن.) pašbend
ب (پاشگر).
**پاشبین** (ئان.) pašbîn
گورج وگۆل، وریا.
**پاشتەرک** (ن.) pašterk
ب (پاشکۆ).
**پاش خستن** (کتپ) pašxistin
بەجێ هێلان، پاش هێلان، خستنەکاتێکی تر، دواخستن ، ماتەڵ کردن.
**پاشخوان** (نک) pašxwan
ب (پاشماوە).
**پاش خورج** (ن) pašxurc
ب (پاشکۆ).
**پاشدار**(ن،س) pašdar
پاشەنگ، دومان، دومای لەشکر، ڕەدیف.
**پاشدز** (ن) pašdiz
بنەدز، پاشدزە، پاشکەوان، شەریکەدز، هاوکاری دز، یاریدەدەری دز.
**پاشدە** (ئان) pašde
بەجێماو، پاشکەوتە، پاشکەوتیی، پاشکەتیی، درەنگ هاتوو، دواکەوتوو، دواکەوتە، دواماو، شوندەماو.
**پاش ڕۆژی کردن** (کتپ) paš rojîkirdin
ئابووریی کردن.
**پاش ڤە چوون** (کتن،کی) paš ve çün(ki)
ب(پاشەکشەکردن).
**پاش ڤە دان** (کتن،کی) paš vedan(ki)
دوورکەوتنەوە، هەڕاکردن لەمەیدان، ڕاکردن، ڕەڤین، ڕەوین.
**پاشقول** (ن) pašqul
پاچەقول، پاچەقولی، پەنجەقولی (زۆرانبازیی).
**پاشقول گرتن** (کتپ) pašqulgirtin
پێدانەبەرپێ (کاتی زۆران)، گلاندن (لە زۆرانبازیدا).
**پاشقول لێ گرتن**(کتپ) pašqul lêgirtin[1]
ب (پالیدان).
**پاشقول لێ گرتن**(کتپ) pašqul lêgirtin[2]
پیلان بۆ کەسێ گێران، داو بۆنانەوە، فێڵ لێ کردن.
**پاشکۆ**(ن) paško
بەستە، بارگە (پشت سوار)، پاش خورج، پاشەخورج، پاش تەرک، پاش تەرکی، تەرک، خەرج، هەگبە.
**پاشکەوان** (ن) paškewan
پاش دزە، پاشقەوان، پاشگەوان، پاشماشە، فیشەک فرێدەر(تفەنگ)، فیشەک کێش.
**پاش کەوتن** (کتن) paš kewtin
بەجێمان، دواکەوتن، شوندەمان، کەوتنەدواوە، ماتەڵ بوون.
**پاش کەوتوو** (ئان) paškewtü
ب (پاشدە).
**پاش کەوە** (ئان) paškewe
ب (پاشدە).
**پاشگر** (ن،ری) pašgir [1]
پاشبەند، پاشتێ، پاش هاتوو، کلکە، کۆتابەند: (برگەیەکە دەخرێتە دوای وشەوە بۆ مەبەستی گۆڕینی واتاکەی یان پێکهێنانی وشەیەکی نوێ) برگەیان کۆمەڵە برگە یان وشەیەکە دەخرێتە سەر کۆتایی وشە یان بنچینەی وشە بۆ مەبەستی گۆڕینی واتاکەی، بۆ پێدانی کارێکی ڕێزمانیی، یان پێکهێنانی وشەیەکی نوێ.
**پاشگر** (ن،ری) pašgir [2]
هەڵەپاس، پاشدڕ، نهێنگر (سەگ).
**پاش گۆتە** (ن) pašgote
پاش ملە، پاشملە، پاش ووتە، غەیبەت.
**پاش گوێ خستن** (کتپ) paš gwê xistin
بەلاوەنان، پشت گوێ خستن، سستی کردن، کەمتەرخەمیی لێ کردن، گوێ پێنەدان.
**پاشگەز** (ئان) pašgez
پاشگەزبوو، پەشیمان، پوشمان، زوڤان، پەشیوان، پەژیوان، پاشگەزەوەبوو.
**پاشگەزبوونەوە** (کتن)[1] pašgezbünewe
بادانەوە، پاشەکشەکردن، پەشیمان بوونەوە (لەبیروڕا)، وادانەوە، هەڵگەڕیانەوە، گەڕانەوە، گەڕیانەوە، پەشیمانیی حاسڵ کردن، داخ بۆ خواردن.
**پاشگەزبوونەوە** (کتن)[2] pašgezbünewe
کشانەوە(لەبیروڕا)، هەڵگەڕانەوە(لەئایین).
**پاشگەزی** (ن) pašgezî
پەشیمانی، پوشمانی، زوڤانی، پەژیوانی، پاشەکشە.
**پاشماشە** (ن) pašmaše
ب (پاشکەوان).

**پاشماوە** (نک) pašmawe
بەرماوە، پاش خواردن، پاشخوانە، پاشخوان، میراتیی.

**پاشماوە** (ن) pašmawe [1]
بۆماوە، پاشماگ، پاشماوەی مردوان، پێ براو، میراتیی.

**پاشماوە** (ن) pašmawe [2]
بەرماوە (ئاو یان شلەمەنیی).

**پاشماوە** (نک) pašmawe [3]
برشت، برکە، پاشمەنە، تلپە، خلتە وخەوال، ڕیزە.

**پاشماوە** (ن) pašmawe [4]
پیما، پیماو، ماوە.

**پاشماوە** (نک) pašmawe [5]
دیرینە، شوینەوار، کۆنینە، کەونینە.

**پاشماوە** (ن) pašmawe [6]
باستان.

**پاشماوە** (نک) pašmawe [7]
بنجوول، بنژیل، بەرماوە، پاشەڕۆک.

**پاشماوەخۆر** (ن) pašmawexor
ئیفچیی، بەرچەپ، بەرماوەخۆر، مشەخۆر، هەلپەرست.

**پاشمله** (ن) pašmile
ب (پاشەمله).

**پاشمەرگە** (ئان) pašmerge
منداڵیکە دوای نەمانی باوکی لەدایک ببێ، دوای مردنی باوکی (لەدایک بوو).

**پاش میر**(ن) paš mîr
پیاوماقوڵ، پشتەمیر، پاش میر.

**پاش میر**(ن) pašmêr
پشتیوان، پشتگیر، یارمەتیدەر، یاریدەدەر.

**پاش وپیش** (ئان،ئاک) pašwpêš
ناجۆر، ناڕیک یان بەناڕیکی.

**پاش وپیشی خۆی ناناسێ** (ئد)
pašwpêšî xoy nanasê
١- تێ‌نەگەیشتووە، نەزانە. ٢- هیشتامنداڵە.
٢- سەرلێ تیک چوون، شلەژان بەهۆی کاروباری زۆرە وە.

**پاشوو** (نک.) pašü
پاشیی، پشتەوە، دواوە، هەردوویی ولاخی یەک سم، هەردوو قاچی ئاژەڵ.

**پاشەڕۆک** (نک.) pašerok
پاشماوە.

**پاشەڕۆ** (ن.) paše̠ro
بەدووکەوتو، دەستەکۆمەک، دوارۆ، وە دووکەوتوو، پاڵپشت.

**پاشەڕۆژ** (ن..ئان.) paše̠roj
ئایندە، داهاتوو، ڕۆژانی لەمەودوا، کاتی داهاتوو، ئەوی لەمەودوا ڕوودەدات.

**پاشەکشە** (ن.) paše kiše
پێ‌دزکە، پێ دزکێ، پاس، ڕەڤ، ڕەو، شکەست، شکەستیی.

**پاشەکشەکردن**(کتن) pašekiše kirdin [1]
بادانەوە، زڤران، زڤرین، ڤەزفرین، گەڕانەوە، بەرەودوا گەڕانەوە، بەرەودوا هاتنەوە، بەروپاش چوون، گەڕانەدواوە، گیلانەوە، هاتنەدواوە، گیلەکردن، هاتنەپاشەوە، پاشەوپاش گەڕانەوە، پشت وپشت گەڕانەوە.

**پاشەکشەکردن**(کتن) pašekiše kirdin [2]
ب (پاشگەزبوونەوە).

**پاشەکشەکردن**(کتن) pašekiše kirdin [3]
ئەژنۆدادان، بەزین، پاشوەچوون، پاش ڤەچوون، ڕەڤین، شکەستن، شکەستیی هینان، هەڵهاتن، وورە بەردان، تێ‌شکان، ژیرکەوتن، سەردانەواندن.

**پاشەکەوت** (نک) pašekewt
ئابووری، بسات، پاش ئەنان، پاشەکەفت، پاشەکەت، پاشەکەوتی، پاشەکەوت کراوە، پاشمەنە، کۆکراوە (پارەوپوول)، گل دراوە، نوتە، نیاتە، نەختینە.

**پاشەکەوت کردن** (کتپ) pašekewt kirdin
ئابووریی کردن، بۆ ڕۆژی ڕەش پارەهەڵگرتن، دەست پیوەگرتن، کۆکردنەوە (پارەوپوول)، نەختینەدانان.

**پاشەڵ** (ن) paše̠l
پاشڵ، دامین، داوین(کەوا..)، پاشۆڵ، پالوو، پیشک.

**پاشەڵ پیس** (ئان) paše̠l pîs
بەدکار، بەدناو، فیعلچیی، ناپوخت، ناڕاست، داوین پیس ، ناڕیک (مرۆڤ).

**پاشەلەقە** (ن) pašeleqe [1]
ڕۆژیکەدوای پشووی یاسایی، ڕۆژێ دوای جەژن.

**پاشەلەقە** (ن) pašeleqe [2]
پێ لەقە، جووتە.

**پاشەلەقە لێ دان** (کتپ) pašeleqe lê dan [1]
پێ لەقەلێ دان، جووتەلێ‌دان، تێ‌هەڵدان.

**پاشەلەقە لێ‌دان** (کتپ) pašeleqe lê dan [2]
لەقەلێ‌دان، بەچاوی سووک تەماشاکردن، نەویستن.

بەچاوی نزم تەماشاکردن، گاڵتەپێ کردن.
**پاشەملە** (ن) pašemile
پاشملە، لەپاش ملەی کەسێ، لەدوای کەسێ، پیوار.
**پاش هەمووان** (ئان)١ paš hemwan١
ئاخرەمین، دواترین، دوامین، هەرەدوایی.
**پاش هەمووان** (ئان)٢ paš hemwan٢
ئەولاترین، پەرترین، دوورترین.
**پاشەوانە** (ن) pašewane
تۆپەوانە، دەمەوانە.
**پاشەوانە** (ن) pašewane
پاشبەندی پلوورەی هەنگ.
**پاشەوپاش** (ئاک) pašewpaš
بەرەودواوە، پشتاوپشت.
**پاشەوە** (ن) pašewe
دواوە.
**پاشێل** (ئان) pašêl
پاشێل، پاکوت، پایەماڵ، پێ شێل، لەقەشێل، پاماڵ، پێخوست، ژێر پێ کەوتوو.
**پاشێل کراو** (ئان) pašêl kiraw
پێ‌شێل کردن.
**پاشین** (ن) ١ pašîn
ئەنجام، بنەبان، دوایی، دوایی‌کار، دەمایی، دوماهکی، پاشان، سەرئەنجام، کۆتایی.
**پاشین** (ن) ٢ pašîn
دەمادێ، دەمادیت، داهاتوو، لەمەودوا، دواڕۆژ، ئەوەی دەبێ، ئەوەی بەشتانەبووە.
**پاقژ** (ئان.کی) paqij(ki)
ب (پاک).
**پاقژبوون** (کتن.کی) paqijbün(ki)
ب (پاک بوون).
**پاقژ کرن** (کتپ.کی) paqijkirn(ki)
پاک کردن.
**پاک** (ئان) ١ pak
ئاڤیژە، بژوین، بێگەرد، بێ‌لەکە، پاکژ، پاقژ، پوخت، پوختە، پرجەڤان، تەمیز، تەمیس، خاوێن.
**پاک** (ئان) ٢ pak
بێ‌تاوان، بێ سووچ، بێگوناه، پاک داوێن، پوخت، داوێن پاک، دوور لەگوناه، ڕاست (مرۆڤ).
**پاک** (ئان) ٣ pak
ئابروومەند، ئابڕوودار، باقژ، پاک سرشت، پاقژ، پیاو خاس، چاک، خاس، میرخاس، پاکژ.

**پاک** (ئاک) ٤ pak
بەتەواوەتیی، پێکرا، خڕ، سەرانسەر، سەرتاپا، هەر هەمووی، هەموو، ویکرا.
**پاک {ئاو}** (ئان) ٥ pak
زوڵاڵ(ئاو)، سازگار.
**پاک** (ئان) ٦ pak
پەتیی، ڕۆشن، ڕوون، ساف.
**پاک** (ئان) ٧ pak
حەڵاڵ، دروست، ڕەوا، شان.
**پاکار** (ن) pakar
نۆکەر، ژێردەستە، وەڕوپلکە.
**پاکانە** (ن) pakane
کاری دڵ پاک کردنەوەی یەکێک (بەسوێند خواردن).
**پاکانە کردن** (کتن.کتپ) pakane kirdin
سوێن خواردن، سوێن دان، سوێندان، سوێنگ خواردن(دان)، سوێندخواردن.
**پاکایی** (ن) pakayî
پاکی، شوێنێکی پاک لەزەوی.
**پاک بوونەوە** (کتن) pakbünewe
پاکەوەبوون، تەمیزبوونەوە، چڵک پێوە نەمان، خاوێن بوونەوە، ساماڵ بوونەوە.
**پاک بوونەوە** (کتن)١ pakbünewe١
تاوان بەسەرەوەنەمان، پاک دەرچوون، بێ‌تاوان بوون، لەگوناه ڕزگاربوون.
**پاک بوونەوە** (کتن) ٢ pakbünewe
مارەی بێ نوێژی ئافرەت تەواوبوون، تەواوبوونی ئافرەت لەخوێن ڕێژیی مانگانە.
**پاک بوونەوە {بەتەوسەوە}** (کتن) ٣
pakbünewe (betewsewe)
پاکەوەبوون، تەفروتونابوون، مردن، نەمان.
**پاک دەرچوون** (کتن)١ pakderçün١
ب(پاک بوونەوە).
**پاک دەرچوون**(ئد)٢ pakderçün٢
١- مرۆڤێکی ڕاست ودروست دەرچوون.
٢- بێ‌بەوەی دەرچوون (لەکارەساتێکدا).
**پاک دەرچوون** (ئد)٣ pakdreçün٣
مایەی خۆ گرتنەوە (بازرگانیی).
**پاک دەرهێنان** (کتپ) pakderhênan
تاوان لەسەر لابردن، بێ‌تاوان دەرهێنان.
**پاکراو** (ئان) pakiraw
پاکەوەکریاگ، تەمیزکراو.

**پاکردن** (کتن) ١ pakirdin
ژێرکردن، کورت کردن، کورت هێنان، لەکورتیی دان.
**پاکردن** (کتپ) ٢ pakirdin
ب (پاک کردن).
**پاکردنەوە** (کتپ) pakirdinewe
ب (پاک کردنەوە).
**پاکژ** (ن.کی) ١ pakij(ki)
پاوان، پاوە، پاوەن، پاوەند، دارستانی قەدەغەکراو، شوێن لەوەڕ، لەوەڕگا، لەوەڕگە، لەوەڕی قەدەغەکراو.
**پاکژ** (ئان.کی) ٢ pakij(ki)
ب (پاک).
**پاکژ** (ئان.کی) ٣ pakij(ki)
ب (پاک).
**پاکژدان** (کتپ) pakijdan
خواردن.
**پاکژدان** (کتپ) pakijdan
درووێنە کردن، پاکژدان، دەسکەنە کردن، درووێنەوە (دانەوێڵە).
**پاکژکرن** (کتپ.کی) pakijkirin(ki)
ب (پاک کردنەوە).
**پاک سرشت** (ئان) paksrišt
پاقژ، پاکژ، پاکزادە، پاکیزە، خاوێن، پوختە.
**پاک کردن** (کتپ) ١ pakkirdin
پاکردن، توێکل گرتنەوە، توێکل لێکردنەوە، توێکل وەرگرتن، سپێکردن.
**پاک کردن** (کتپ) ٢ pakkirdin
پاکەوەکردن، لابردن، نەهێشتن، هەڵ گرتن، گەسک لێدان.
**پاک کردن** (کتپ) ٣ pakkirdin
پاکژکرن، پاکش کرن، پاک وەکردن، پاکەوەکردن، پاکیزەکردن، تەمیزکردن، شتن.
**پاک کردن** (کتپ) ٤ pakkirdin
بژاردن، بژانن، بژنیین، لەبێژنگ دان، لەمێلەکە دان، هەڵتەکاندن.
**پاک کردنەوە** (کتپ) ١ pakkirdinewe
پوختەکردن، پیسیی پێوەنەهێشتن، خاوێن کردنەوە، پیسیی لابردن، پیسیی پێوەنەهێشتن، تەمیزکردن، پاک وەکردن، چڵک (لەشت) لابردن.
**پاک کردنەوە** (کتپ) ٢ pakkirdinewe
دەردان، گزگ دان، گەسک دان، مالیین، گەسک لێ دان، پیسی تێدانەهێشتن.
**پاک کردنەوە** (کتپ) ٣ pakkirdinewe
بریسکاندنەوە، بریسکەپێدان، خستنەباق وبریق.
**پاک کردنەوە** (کتپ) ٤ pakkirdinewe
پاکەوەکردن (لەشتی ناجۆر)، خەوش لێ گرتن.
**پاک کردنەوە** (کتپ) ٥ pakkirdinewe
بژارکردن، پاچەکۆڵەکردن، خاوێن کردنەوە (باخ)، هەڵکێشان (گژوگیای بەوەزەند لەناوباخ).
**پاک کردنەوە** (کتپ) ٦ pakkirdinewe
ئاوە ڕووت کردن، پاک کردن، ڕووتاندنەوە (پەلەوەر لەپەڕ وپاڵ).
**پاکڵ** (ن) pakil
ب (پایە).
**پاک وپوخت** (ئان) ١ pak w puxt
ئامادەکراو.
**پاک وپوخت** (ئان) ٢ pak w puxt
پاک وتەمیز، پاک وخاوێن، حازروبزر، ساز وبان، تەواو.
**پاک وپووک کردن** (کتپ) pak w pük kirdin
بەبادان (پارە)، بەخت کردن، بەفیڕۆدان.
**پاک وپیس کردن** (کتپ) pak w pîs kirdin
چاک لەخراپ جیاکردنەوە،
شتی چاک لەخراپ دەرکردن، هەڵبژاردن.
**پاکوت** (ئان) pakut
ب (پاشیل).
**پاکوت کراو** (ئان) pakut kiraw
ب (پاشیل کراو).
**پاکوت کردن** (کتپ) pakut kirdin
پێ شێل کردن، شێلان، شێلاندن (بەپێ)، کوتاندنەوە (بەپێ)، لەقەشێل کردن، کردنە پێخوست، بەپێ شێلان، بەپێ چوونەسەر.
**پاکوتکێ کردن** (کتن) ١ pakutkê kirdin
پاڵ پێوەنان، هان دان، وروژاندن، خستنەگەڕ.
**پاکوتکێ کردن** (کتن) ٢ pakutkê kirdin
پێ بەزەویدادان، پێ لێ داگرتن، لەسەرشتێ سووربوون.
**پاکوڕە** (ن.س) ١ pakure
پیادە، پیادەڕۆ، سەربازی پیادە، تفەنگ لەشان.
**پاکوڕە** (ن) ٢ pakure
پاکار، خزمەتکار، نۆکەر.
**پاکوڕە** (ن) ٣ pakure
کەسانی (هەرچی وپەرچی، خوێڕیی، خوێڕیی وبەرەڵا، سووک وناکەس).

**پاكۆدان** (كتپ) pakodan ١
دروێنەكردن، (دروونە، درەو) كردن.

**پاكۆدان** (ئد) pakodan ٢
پاك كردنەوە، نەهێشتن، لەئارادانەهێشتن.

**پاكەت** (ن) paket
بەستە، بەستەك، پرياسكە، پريسكە، پێچراوە، دەستە، دەفر، قوتو، كارتۆن.

**پاكەمی** (ن) pakemî
ماندوويەتی، مانگی، هيلاكی، كەشەنگی.

**پاكيزە** (ئان) pakîze
پاك سرشت.

**پاكيی** (ن) pakî ١
ئابوور، داوێن پاكيی، خاوێنيی (سرشت).

**پاكيی** (ن) pakî ٢
پاكژی، پوختەيی، پوختيی، خاوێنيی، تەميزيی، ڕوونيی، پاكە.

**پاگرتن** (كتن) pagirtin
گەيشتن، كهشتن، گەهيشتن، ياوای.

**پاگوشادانە** (ن) adaneپpag
پی‌گوشادانە، مژدانە، خەلات، پالا درانە، پێ مزانە، بەرات، پالامز، پامز، پێمز.

**پاگوون** (ن) pagün
شيمار، نيشانە، دروشم.

**پاگە** (ن) page ١
تاولە، تەويلە، خۆلە، كۆتان، كۆليت، گەوڕ، هەرخان.

**پاگە** (ن) page ٢
پاگا، پێ برەس، تەنكاو، بگار، بوار.

**پاگە** (ن) page ٣
ب (ئاسانە).

**پاگير** (ئان) pagîr ١
تووشبوو، دووچار، گرفتار، گيرۆدە.

**پاگير** (ئان) pagîr ٢
دەربەس، دەربەست، گوێ‌پێ دەر.

**پاگيربوون** (كتن) pagîrbün
پيوەبوون، تووش بوون، دووچاربوون، گرفتاربوون، گيرۆدەبوون.

**پاگيركردن** (كتپ) pagîrkirdin
تووش كردن، پيوەكردن، دووچاركردن، گرفتاركردن، گيرۆدە كردن.

**پاگيری** (ن) pagîrî
تووش، تووشی، دووچاری، گرفتاريی، گيرۆدەيی.

**پاڵ** (ن) pal ١
تەپۆلكە، گردۆلكە، تەپە.

**پاڵ** (ن) pal ٢
باو، بۆق، تەكان، كاری ڕادانی كەسێيان شتێ، كڕۆ، لەتر.

**پاڵ** (ن) pal ٣
دامين، داوين، قەد، داينە، ڕەخ.

**پاڵ** (ن) pal ٤
گرد، سەرەو ژوورگە (زەويی)، سەر بەرەوژوورە (ئەرز).

**پاڵ** (ن.) pal ٥
پالك، تەك، تەنشت، تەنيشت، ڕەخ، كن، نك.

**پاڵ** (ن.) pal ٦
پالوو، پوتەگا، كەلەكە.

**پاڵا** (نك.) pala
پالێ، پيلاو، كەوش، كلاش، گيوە.

**پاڵاخ** (ن.) palax ١
درك، درك ودال.

**پاڵاخ** (ن.) palax ٢
ناخۆشی،ناهەموارى، تەنگێ و چەڵەمە، ژار، مەينەتی.

**پاڵاوتن** (كتن) palawtin ١
ئاولێ چوون، تكەكردن، دەڵاندن، تكان، چۆڕان.

**پاڵاوتن** (كتن) palawtin ٢
بزديان، ترسان، زارە ترەك بوون، زەنەق چوون.

**پاڵاوتن** (كتپ) palawtin ٣
پالفتەكردن، پاليوتن، پالافتن، خلتەلێ گرتن، خەوش گرتن، خەوش لێ گرتن، خەوش وخاڵ وپيسيی گرتن، ساف كردن، بالاندن، پاليين، پاڕزنيين، داوەرڤاندن، ترهاندن.

**پاڵاوتە** (ئان) palawte
پالافتە، پاليوراو، پالفتە، ساف كراو، ساف كرياگ.

**پاڵپشت** (ن) palpišt ١
ئەرخە، پشتيوان، يارمەتيدەر، ياريدەدەر، پشتگير، پشتەك.

**پاڵپشت** (ن) palpišt ٢
پشتيی، باليف، بەعليف، سەرين، پاڵشت، پالگە، بالنج، كۆشە.

**پاڵ پيوەدان** (كتپ) palpêwedan ١
پاڵ دان بەشتيكەوە.

**پاڵ پيوەدان** (كتپ) palpêwedan ٢
پاڵ دان.

**پاڵ پێوەنان (کتپ)** ١ palpêwenan
بزۆق پێوەنان، پێش دان، دانەپێش، رادان، لەتر پێدان، پاڵ دان، پاڵ نان.
**پاڵ پێوەنان (کتپ)** ٢ palpêwenan
بزواندن، تاودان، تیژکردن، جووڵاندن، دڵ پتەوکردن، دڵ قاییم کردن، زات خستنەبەر، زات پێدان، غیرەت دانە بەر، قاودان، گاڵ دان، هان دان، وورەبەرزکردنەوە، پێش دان، هانەهانەدان.
**پاڵ پێوەنان (کتپ)** ٣ palpêwenan
پەلەپەل پێ کردن.
**پاڵ پێوەنەر (ن)** palpêwener
جووڵێنەر، هەستێکی لەپڕ.
**پاڵتۆ (ن)** palto
پالتاو، پاڵوود، بالاپۆش.
**پاڵ خستن (کتپ)** ١ pal xistin
راکشاندن، تەخت کردن، خستنەسەرلا.
**پاڵ خستن (کتپ)** ٢ pal xistin
بۆ ناشتن ئامادەکردن (مردوو)، جەنازە درێژ کردن.
**پاڵ دان (کتپ)** ١ paldan
پاڵ پێوەدان، پشت پێ بەستن، باوەڕپێ کردن.
**پاڵ دان (کتن)** ٢ paldan
پاڵ دانەوە، پاڵودان، پاڵ وەدان.
**پاڵ دان (کتن)** ٣ paldan
هەڵسپاردن، هەڵ پەساردن
**پاڵ دانەوە (کتن)** ١ paldanewe
ئاسوودەبوون، پاڵ دان، پاڵ کەوتن، پشت بە شتێکەوە دان، حەسانەوە، پشودان، پشت لێدانەوە.
**پاڵ دانەوە (کتن، س)** ٢ paldanewe
بەزیین، تابوشت نەمان،
وازهێنان، واز لێ هێنان.
**پاڵ دانەوە (کتن)** ٣ paldanewe
ب (پاڵ کەوتن).
**پاڵ داوێن (ن)** paldawên
پاڵ دامێن، پاڵ داینە، داینە، بنار.
**پاڵدوو (ن.کل)** ١ paldü(kl)
زمان لوسیی، مرایی، مەرایی، پاتەخۆریی، هەڵ پەرستیی.
**پاڵدوو (ن)** ٢ paldü
ب (پاڵوو).
**پاڵدوو (ن)** ٣ paldü
پێ رامووس، زمان لووس، ماستاو ساردکەرەوە، مراییکەر، مەراییکەر، پاتەخۆر، هەڵپەرست، خۆ هەڵواسەر، خۆ بەرەپێش.
**پاڵدووتەکانن (کتپ)** paldu tekanin
پاڵدوو تەکاندن، چاپلووسیی کردن، پێ رامووس کردن، پێ راموسیی کرین، کلکەسووتەکردن، مرایی کردن، مەرایی کردن، قوسکەشیی کردن، خۆبردنەپێشەوە، زمان لووسی کردن.
**پاڵفت (ن)** ١ palift
شەداری، شیداری، نمداری.
**پاڵفت (ن)** ٢ palift
تکە، چۆڕە، (شلەمەنی).
**پاڵفتە کردن (کتپ.کل)** ١ palifte kirdin(kl)
ب (پاڵاوتن).
**پاڵفتە کردن (کتپ)** ٢ palifte kirdin
بێژاندنەوە، بێژتن، بێژانەوە، ساف کردن، لەمێلەک دان، والابێژکردن، والاوێت کردن، مێلەک کردن.
**پاڵ کەوتن (کتن)** ١ pal kewtin
پاڵ کەفتن، درێژبوون، راکشان (لەسەرجێگە بۆ پشوو دان یان نوستن)، درێژکێشیان، هلاژیان.
**پاڵ کەوتن (کتن)** ٢ pal kewtin
پاڵ دانەوە، پاڵودان، پاڵ وەدان، پشت پێوەدان (بۆ حەسانەوە)، پشت دانەوە، تەخت بوون.
**پاڵگە (ن)** ١ palge
ب (پاڵپشت).
**پاڵگە (نک)** ٢ palge
دەستاوێژ، قەواڵە، قۆچان، کۆدە، کۆد.
**پاڵ لێ دانەوە (کتن)** ١ pal lê danewe
ب (پاڵ دانەوە).
**پاڵ لێ دانەوە (کتن)** ٢ pal lê danewe
پشتێن لێ کردنەوە، خاتر جەم بوون، دڵنیابوون، ئاسوودبوون، ئاسوودە دانیشتن، بێ خەم بوون.
**پاڵ لێ‌دانەوە (ئد)** ٣ pal lê danewe
پشت گوێ خستن، گوێ پێنەدان، خستنەئەولاوە.
**پاڵمە (ن.رو)** palme
شنکێ.
**پاڵ نان (کتپ)** ١ palnan
زۆرلێ کردن، هان دان.
**پاڵ نان (کتپ)** ٢ palnan
پاڵ پێوەنان، بەرەوپێش بردن، پێش دان.
**پاڵوبەن (ن)** palüben
پاڵوبەند، پشتیوان، فریاد رەس، یارمەتیدەر، یاریدەدەر، یاوەر.

**پالوبەنی** (ن) palübenî
پشتیوانی، فریادرەسی، یارمەتی، یاریدە، یاوەری، دەستی یارمەتی.
**پالوو** (ن) ١ palü
پاردوو، پالدە، رانەکی، پالدوو، پشتێنی کۆپان، نەقیزەگا (پارچە چەرمێکی پانە بۆ چەسپ کردنی کورتان).
**پالوو** (ن) ٢ palü
پەراسوو، تەموو، تەنیشت، کەلەکە، لا، لاتەنیشت.
**پالووتە** (ن) palüte
هەرەوەز، هامەیاریی، هاوکاریی.
**پالووتە کردن** (کتن) palüte kirdin
هەرەوەزکردن،
هاوکاری کردن، ویکرا کار کردن.
**پالووگیر** (ن) palügîr
لەنگەر، گرە، گیرە.
**پالە** (ن) ١ pale
رەزیدەر، کارین، کارزان، کارگەر، کرێکار.
**پالە** (ن) ٢ pale
درووینەکەر، دەروێنی، دروەوان، سەپان، وەرزێر.
**پالە** (ن) ٣ pale
پەلە (دەغل، زەویی..).
**پالەپەستۆ** (ن) palepesto
تەووژم، ئاپۆرە، هێرشی خەلک، کاری پال پێوەنان.
**پالەنگ** (ن) paleng
رەشمەومەهار، رەشوە.
**پالەوان** (ن،ئان) ١ palewan
بەهێز، دارێژراو (مرۆڤ).
**پالەوان** (ن،ئان) ٢ palewan
١- پەحلەوان، بزوو.
**پالەوانبازی** (ن) palewanbazî
پالەوانی.
**پالەوانە** (ن) palewane
پالپشت، پایە، کۆلەکە.
**پالەوانی** (ن) palewanî
پالەوانبازی، پەهلەوانی، پێ لقانی، زۆرانبازی.
**پالێن** (ن) palên
ئاوپال، کەوگیر، کەفگیر، ئاوپالێو، پالێنە، پالێوەر، پارزۆنک.
**پالێوکە** (ن) palêwke
سووزگی، سووزمە.

**پالین** (کتپ) palîn
ئاوپال کردن.
**پالە پەین دان** (ئد) pa le peyn dan
بەزین، بێدەسەلات بوون، دەسەلاتی تۆلەسەندنەوە نەبوون، پەرۆی سپی بەرزکردنەوە، سەر شۆڕکردن بۆ دوژمن.
**پالە پەین دان** (ئد) pa le peyn dan
پێ لەپاژنەدان،
پێ لەپەهن دان، ئاژاوەنانەوە.
**پالە ژێر دەرچوون** (کتن) pa le jêr derçün
پێ لەژێردەرچوون، خزان، خزیان، کەفتن، کەوتن، گلان، گلیان.
**پالە شوێنی پای نیەنی** (ئد)
pa lešünî pay niyenî
بێ هاوتایە، بێ وێنەیە، لەوێنەی نییە.
**پالەقە** (ن) paleqe
پاشەلەقە، پێ لەقە، لەقە.
**پالەقە لێ دان** (کتپ) ١ paleqe lê dan
پێلەقە لێ دان، نووکەشەق تێ هەلدان.
**پالەقە لێ دان** (ئد) ٢ paleqe lê dan
نەویستن، شەق تێ هەلدان، بەچاوی سووک تەماشا کردن، بەسووک زانین، بەکەم تەماشاکردن، کەنەفت کردن.
**پالێ دان** (کتپ) ١ palêdan
پاشقول لێ گرتن، پاشقول گرتن، پاچەقەلێ کردن.
**پالێ دان** (کتپ) ٢ palêdan
پادان، شان پیاکردن، دزیین، فڕاندن.
**پاماسی** (ن) ١ pamasî
رەقە، کیسەل.
**پاماو** (ئان) pamaw
**پاماسی** (ن،پز) ٢ pamasî
پاماسە، فیلەپێ، پاغرە.
**پامال** (ئان) ١ pamal
ب (پاشێل).
**پامال** (ئان) ٢ pamal
بەرباد، لەناوچوو، داماو، فەوتاو، پوواو، دارزاو.
**پامال بوون** (کتن) ١ pamal bün
بەربادبوون، لەناوچوون، فەوتان.
**پامال بوون** (کتن) ٢ pamal bün
پاشێل بوون، پاکوت بوون، پایەمال بوون. پێ شێل بوون، لەقەشێل بوون، پێ خوست بوون، بوون بەپێ خوست، کەوتنە ژێر پێ، ژێر پێ کەوتن.

**پاماڵ کردن** (کتپ) pamaḻ kirdin
ب (پێماڵ کردن).
لووس، ساف، بریقەدار.

**پاماوکردن** (کتپ) pamawkirdin
لووس کردن، ساف کردن.

**پامل** (ن) pamil
بنار، رکە، رق، رکۆ، تەنگە.

**پامل کردن** (کتپ) ¹ pamil kirdin
بنارکردن، تەنگەگرتن، رقەبەرێ کردن، رک گرتن، رکۆ کرن، رکەکردن.

**پامل کردن** (کتپ) ² pamil kirdin
پێداگرتن، پێدانووسان.

**پامل کردن** (کتپ،کل) pamilkirdin(kl)³
خورتیی لێکردن، زۆر لێکردن، زۆرە ملیی کردن، مل گرتن.

**پان** (ئان) pan
بەرین، پلێ، بەروەدە، فراوان، فرە، کووران، گوشاد، وراق، پەحن، پیەن.

**پانان** (کتپ) ¹ patan
نزم کردنەوە، هێنانەوەخوار، سووک کردن (دەنگ).

**پانان** (کتپ) ² panan
بردنەخوار، داگرتن.

**پانان** (کتپ،کل) ³ panan(kl)
پێنان، زامن کردن (چەک).

**پانان** (کتپ،کل) ⁴ panan(kl)
پـەلەکردن، تالووکـەکردن، خێراکـردن، لەزانـدان، لەزیان، لەزین، پێ هەڵگرتن، پێ لەناو زەنگیدان.

**پانایی** (ن) ¹ panayî
پانیی، پانتاو، پانتاویی، پانتاوە، پاناف، پـەحناف، پەحینی،
پەهناف، پەهنیی، تەختانیی، تەختایی، شوێنی پـان وتەخت.

**پانایی** (ن) ² panayî
دیو، ڕوو، ڕووکار، پێشەوەی خانوو.

**پانایی** (ن) ³ panayî
پیەنیی.

**پانایی** (ن) ⁴ panayî
ئاسۆ، بەرینایی، مەودا، مەیدان(زانیاریی).

**پان بوونەوە** (کتن) ¹ panbûnewe
پـانەوەبوون، پـلچیان، پـلچەوەبوون، پلیـشانەوە، تلیسانەوە، پیەنەوبوون، تەخت بوون، تێک شکان.

**پان بوونەوە** (کتن) ² panbûnewe
پـاڵ دانـەوە، پـانەوەبوون، خـۆ لـەئیش دزینـەوە، دانیشتن، ڕۆیشتن.

**پان بە پان** (ئاک) pan be pan
بێپەردە، بێپێچ وپەنا، ڕاستەوڕاست، ڕووبەڕوو.

**پان پانۆکێ** (ن) pan panokê
پان پانۆکە، ساف سافۆکێ، سێکس کردنـی نێوان دوو ئافرەت.

**پانتاو** (ن) ¹ pantaw
ب (پانایی).

**پانتاو** (ن) ² pantaw
تەپلەسەری کێو، تەوقەسەری کەژ، زینو، زینوێ.

**پانتاو** (ئان) ³ pantaw
تەخت، ڕێک، ڕێکا وڕێک(زەوی).

**پانتاوی** (ن) pantawî
ب (پانایی).

**پانتۆڵ** (نک) pantoḻ
دەمەر قۆپان، شەرواڵ.

**پان کردنەوە** (کتپ)¹ pant kirdinewe
پلچاندن، پلچانن، پیەنەوکردن، پلیشاندنەوە، تلیساندنەوە، تـەخت کـردن، جیـق وفیـق دەرهێنـان، تێک شکاندن.

**پان کردنەوە** (کتپ)² pant kirdinewe
داخستن (ڕایەخ)، ڕاخستن.

**پانکە** (ن) ¹ panke
بازەن، باوەشێن، باوەشینک، پانکەی بنمیچ.

**پانکە** (ئان) ² panke
پانکەڵە، مەیلەوقەڵەو، خروخەپان، خرپن.

**پان وبەرین** (ئان) pan w berîn
ب (پان وپۆڕ).

**پان وبەرینی** (نک) panwberînî
ئەندازە، قەبارە، هندازە.

**پان وپۆڕ** (ئان) ¹ pan w poṟ
جوان، خرپن، خەپان، خرپۆلە، خرپۆڵە.

**پان وپۆڕ** (ئان) ² pan w poṟ
بەربـەرەڵا، بـەروەدە، ئاوەڵـە، پـان، پـان وبـەرین، دەشـت، دەشـت وفـەکریی، ڕاسـت، ڕاسـت وفـرە، ڕەساو، فراوان، گوشاد، گەورە وبەرەڵا.

**پان وپۆڕ** (ئان) ³ pan w poṟ
تێک سمراو، چوارشانە، خەپان، دارشتوو، داڕێژراو، داگرتیی، قەڵەو.

**پانه وپان** (ئان) pane w pan
ئاسۆیی، پۆپی، رێکاورێک.

**پانیان بەگیانا** (ئد) paniyan be giyana
پێ‌نان بەگیانـدا، پـێ‌لە رۆحـی خۆنـان، رۆحـی خـۆ خستنە سەردەست، لەخۆبوردن.

**پانی کردەوە** (ئد) panî kirdewe[1]
زوو خۆی‌دا بەدەستەوە.

**پانی کردەوە** (ئد) panî kirdewe[2]
نەرم وپێ برشت بوون.

**پانی کردەوە** (ئد) panî kirdewe[3]
کەوتە مەرایی وماستاو ساردکردنەوە.

**پانیی** (ن) panî[1]
پاژنە (پێ، گۆرەوی یان پێلاو).

**پانیی** (ن) panî[2]
ب (پانایی).

**پاوار** (ن،کل) pawar(kl)
رەوتەنی، رێبوار.

**پاوان** (ن) pawan
ب (پاکژ).

**پاوپل** (نک) pawpil
پێ وپل، قاچ وقوول، پەل وپۆ، پل وپا.

**پاوور** (ن،ئا) pawur
پرژانگ، پزان، پزدان، پژوو، پەلای، منالدان.

**پاووشک** (ئان) pawušk
بەووم، بەیووم، پێ‌ووشک، دەم ووشک، سەرپێ خێر، شووم، ناوچەوان رەش.

**پاوە** (ن) pawe
ب (پاکژ).

**پاوە پاکردن** (کتپ) pawe pa kirdin[1]
دەستی بەدەستی پـێ‌کردن، دواخـستن، بینەوبـەرە، پێ‌کردن.

**پاوە پاکردن** (کتپ) pawe pakirdin[2]
ب (پێ دزکێ کردن).

**پاوە جێ** (ن) pawecê
پاوەجێگە، پایەدار، بەردەوام.

**پاوە جێ بوون** (کتن) pawe cê bûn
١- بەردەوام بوون، پاوەجێگەبوون، پایەداربوون.
٢- خۆگرتن، بەپشوو بوون، شت بەئاسـانیی گـرتن، شت بەقورس نەگرتن، چوونە ژێر.

**پاوە جێ کردن** (کتپ) pawecê kirdin
پـاوەجێگە کـردن، تونـدکردن، چەسـپاندن، چەسـپ کردن، چەسپاندن.

**پاوە چەفتە ونان** (ئد،لو)
paweçefte w nan(lu)
سەرپێچی کـردن، لـەرێ دەرچـوون، لەرێگـەی راسـت لادان، لەرێ لادان.

**پاوەرێ** (نک) pawerê
ب (پاوەرە).

**پاوەگەزدان** (ئد،کل) pawegezdan(kl)
بەچیکلدانەبوون، بەرگەگرتن، پشوو خواردنەوە، چیکلدانـە هـەبوون، خـۆگرتن، دلفرەبـوون، دل هەلگرتن.

**پاوەمووری** (ن،کل) pawemürî(kl)
دولکەبێژی، سەر دوولکە، لاوانەوە، هـۆنراوە وئـاوازی بەمردوان هەلگوتراو.

**پاوەمووری کردن** (کتن،کل)
pawemürî kirdin(kl)
ب (لاواندنەوە).

**پاوەند** (ن) pawend[1]
پێ بەند، پێ بەندیی، تەگەرە، کۆسپ.

**پاوەند** (ئد) pawend[2]
ب (پاوان).

**پاوەیەکا هاتن** (ئد) pa we yeka hatin
پێ لەپێ ئالان، سەرلێ شێوان، شلەژان.

**پا هاوردنەوە** (کتن،کل)
pa hawurdinewe(kl)
دابەزیین،
هاتنەخوار (لەسەر پشتی ئەسپ).

**پا هەلکەفتن** (کتن) pa halkeftin
١- بەدەمەوە رۆیین، پێ خلیسکان، پێ هـەلنووتان، سەرسم دان، کـەوتن. ٢- هەلـەکردن، سـاتمەکردن، بەهەلەداچوون، کەوتنە هەلەوە.

**پا هەلگیر** (ن،ئا) pa halgîr
چاروا، ولاخ.

**پای** (ن) pay[1]
بەخت، شانس.

**پای** (پر) pay[2]
بۆ، لەبەرخاتر.

**پایا** (ئان) paya
بەردەوام، پاینە، پایەدار، هەمیشەیی.

**پایاربوون** (کتن) payarbûn
پاداربوون، پایەداربوون، بەرزبوونەوە (لەکۆمەڵدا)، پێش کەوتن.

**پایان** (ن)[1] payan
ئەنجام، دوایی، سەرئەنجام، پایدۆست.

**پایان** (ن)[2] payan
بن، بنکە، بنکە.

**پایان پێ دان** (کتپ) payan pê dan
پایان پێهێنان، دوایی پێهێنان، براندنەوە، گەیاندنە ئەنجام، لەبنەڕەت هێنان، بنەبان کردن.

**پایان هاتن** (کتن) payan hatin
دوایی هاتن، کۆتایی هاتن، برانەوە، سەرئەنجام بوون، لەبنەڕەت هاتن، تنەبان بوون.

**پایتەخت** (ن) paytext
پالە، دەسکەرە، شاری گەورە، شانسین، سەرکۆمار نشین.

**پایتۆن** (ن.) payton
تەختەڕەوان، عارەبانە،عەرەبانە.

**پایدۆست بوون** (کتن.) paydost bûn
ئەنجام هاتن، برانەوە، تەواوبوون.

**پایدەر** (ن.) payder
پایدار.

**پایز** (ن.) payiz
بارێزان، پەھیز، پەییز، گەلاڕێزان.

**پایزەبرا** (خ.) payze bira
بەیەکێک دەووترێ کەدرەنگ درەنگ دەرکەوێت، دۆستێک کە کەم کەم سەردانیی بکات، میوانێ کە کەم هاتووچۆ بکات.

**پایزەبرا** (ئان) payzebira
هاوڕێی نیوەڕێ، برادەری کاتیی،
برادەرێک کە لەنیوەی ڕێگەدا بەجێت بهێڵێ.

**پایماڵ** (ن)[1] paymal
تالان، تالانی.

**پایماڵ** (ن)[2] paymal
میرات، میراتیی.

**پایماڵ کردن** (کتپ) paymal kirdin
تالان کردن، ویران کردن، لێ ئەستاندن، لێ ساندن، ڕووت (vt.)کردنەوە، ویران کردن، چەپاو کردن.

**پایماڵ وەرگرتن** (کتپ) paymal wergirtin
میراتیی وەرگرتن، میراتیی بۆ مانەوە.

**پایمن**(رس) paymin
بەئەستۆی من، بەگەردنی من، لەئەستۆی من، لەملی من، لەسەرمن.

**پایناز** (ن) paynaz
گوشادانە.

**پایناز** (ن) paynaz
بەراو (سەوزە..)، پاراو، نازاو، قنگاو، ئاویی، ئاویە.

**پایە** (ن)[1] paye
پاڵپشت، هەسوون، پاکل.

**پایە** (ن)[2] paye
هەڵویست.

**پایە** (ن)[3] paye
بن، بناغە، بنچینە، بنکە.

**پایە** (ن)[4] paye
ئەندازە، پلە، پێوانە، ڕادە، جێگە، ترنک.

**پایە** (ن)[5] paye
بەرزیی (مرۆڤ لەناو کۆمەڵدا)، ڕێز.

**پایە** (ن)[6] paye ئابڕوو، بڕوومەت.

**پایەبلند{مرۆڤ}**(ئان)[1] paye blind (mirov)
بەناوبانگ، خویا، دەرکەوتوو، دیار، ناسراو، نۆتەدار.

**پایەبلند{مرۆڤ}** (ن.ئان)[2] paye blind (mirov)
بلند، پایەبلند، بەدەبدەبە، بەزمیر، بەڕێز، بەشکۆ، بەنرخ، پایەبەرز، پڕ شکۆ، پایەدار، دەست ڕۆیشتوو، دەست ڕۆییو، قورس، گەورە، مەزن، شکۆ، شکۆمەند.

**پایەبلندبوون** (کتن) paye blindbûn
بەرزبوونەوە، سەرکەوتن، گەیشتنەڕادەیەکی بلندتر.

**پایەبەرز** (ئان) paye berz
ب (پایەبلند).

**پایەبەرزکردن** (کتپ) payeberz kirdin
پێداهەڵدان، پێهەڵگوتن، گەورەکردن، مەزن کردن.

**پایەپەست** (ئان) payepest
١-بەدخوو، بێ ڕێز، بێنرخ ، چرووک، ڕسوا، سووک، نزم، ڕیسوا.
٢- بێ ئابڕوو، بێناموس، پایەنزم.

**پایەدار** (ئان)[1] payedar
ب (پایەبلند).

**پایەدار** (ئان)[2] payedar
پایا، پاوەجێ، جاوید، جاویدان، مایەندە، نەمر، ژیمان.

**پایەدار** (ئان)[3] payedar
بەردەوام، پاوەجێ، پادار، خایاندە، هەمیشە، هەمیشەیی.

**پایەداری** (ن) payedarî
بەردەوامیی، خایانـدەیی، خایەنـدەیی، هەمیشەیی (مەبەست).

**پایەنزم** (ئان) payenizim
ب (پایە پەست).

**پایە نزم بوون** (کتن) paye nizimbün
بێ ڕێزبوون، ڕسوابوون.

**پایین** (ن) [1] payîn
بن، بنکە، بنـەوە، خـوارەوە، خـواروو، لای خـوارووی شت.

**پایین** (ن) [2] payîn
چاودێریی، چاویاریی، سەرپەرشتیی.

**پت** (ن) [1] pit
ئافرەت، پتکۆ، پتۆ، ژن، ژنی مێردار، ژەنی.

**پت** (ن) [2] pit
پـچک، پـیچەک، تـۆز، چـک، کـەم، کـیم (ژمارە یـان شت).

**پت** (ن) [3] pit
خاڵ، نوختە، پنت.

**پت** (ن،کل) [4] pit(kl)
پرتە (چاو).

**پتاپت** (ن) pitapit
پرتەپرت، پتە، پتەپت، پرتە، تریەترپ، تریە (دل).

**پتاپت کردن** (کتپ،کتن) pitapit kirdin
ب (پسەکردن).

**پتات** (ئان) [1] pitat
زۆربلێ، زۆر بێژ، چەنەباز، هەڵەوەڕ.

**پتات** (ئان) [2] pitat
پرووپووچ (کردار، ڕەفتـار)، هیـچ وپـووچ، نـاژیر، بـێ مێشک، ڕێزگاو، ناماقووڵ.

**پتاندن** (کتپ) pitandin
١- خاڵ بۆدانان، خاڵ لەسەردانان.
٢- بەخاڵ جیاکردنەوە، بەخاڵ دیاری کردن.

**پتانن** (کتپ) pitanin
پتەپت کردن، پرتەکردن، پت دان، تروکاندن (چاو).

**پتپت** (ئان) pitpit
قەڵەو، گۆشتن.

**پتیتۆک** (ئان) pitîtok
خاڵخاڵاویی، خاڵخاڵ، خاڵاویی.

**پتر** (ئان،ئاک) pitr
پترە، پیتر، زۆرتر، زەفتر، فرەتر.

**پتربوون** (کتن) pitrbün
زۆرتربوون، زیاتربوون، مشەتربوون.

**پترکردن** (کتپ) pitrkirdin
زۆرترکردن، زیاترکردن، گەورەترکردن، مشەترکردن.

**پتروو** (ن) pitrü
پارچە، پترۆ، پەترۆک، تیلمە، کوت.

**پترووخە** (ن) pitrüxe
پـترووکە، قەتماغـە(سـەربرین)، قرتماغـە، تویـژاڵ (لەسەر برین کاتی سارێژبوون).

**پتکە** (ن) pitke
پنتک، پەڵە (پیسیی).

**پتواڵ** (ئان) pitwal
لووت پان.

**پت و پووز** (ن) pit w püz
١-دەم وپل. ٢- دەم ودوو، دەم وگفت، دەم وقـسە، دەم وناخـــاوتن، دەم و دووان. ٣- دەم و فلـــچ، دەم وکاوێژ، دەم وقەوچ، دەم و فلق، دەم ولەوس.

**پتەپت** (ن) [1] pitepit
١- بۆلەبۆل، پرتەوبۆلە، منجەمنج، نارەزایی.
٢ -پست، پست پست، پسە، چرپە.

**پتەپت** (ن) [2] pitepit
پرتەپرت.

**پتەو** (ئان) [1] pitew
بەردین، بەرداسا، توند، توند وتـۆل، ڕەق، ڕقـرقۆک، قاییم، هەمیز.

**پتەو** (ئان) [2] pitew
ئەستوور، پڕ، سفت، قەویی، گت.

**پتەوکردن** (کتپ) [1] pitew kirdin
ئەستوورکردن، قەویی کردن.

**پتەوکردن** (کتپ) [2] pitew kirdin
توند کردن، قاییم کردن.

**پتێ** (ن) pitê
پتەک، کەم، شتێکی کەم، پـیچ، تـۆز، تۆزقـاڵ، زەرا، نەخت، ئاستەم، هەند، هێند.

**پچ پچ بوون** (کتپ،کتن) piç piç bün
ترش بوون، کف کردن، هەڵاتن (هەویر).

**پچڕان** (کتن) [1] piçran
بڕان، پچڕیان، پسان، پەرت بـوون، قرتـان، پـرچیان، قرتیان، کەرت بوون، لەت بوون، لێک جیابوونەوە.

**پچڕان** (کتن) [2] piçran
پڕوکان، پڕوکیان، پـسان، شـەکەت بـوون، کەشـەنگ بوون، ماندووبوون، هیلاک بوون.

**پچراندن** (کتپ) ١ piçṟandin
بردان.
**پچراندن** (کتپ) ٢ piçṟandin
بـڕیـن، پـارچەکردن، پـچـڕان، پـچـڕیان، پـچـڕیـن، پساندن، پەڵ کـردن، جـوێ کردنـەوە، جیاکردنـەوە، ژێکـرن، قەتانـدن، کـەرت کـردن، کـوت کـردن، لـەت کـردن، لیـک جیاکردنـەوە، لێکردنـەوە، قرتانـدن، کرتاندن.
**پچراندن** (کتپ) ٣ piçṟandin
لێ کردنـەوە، هەڵـپچڕکاندن (گـوڵ)، چنینـەوە، رنینەوە، پچڕکاندن.
**پچرانەوە {تەزبیح}**(کتن) piçṟanewe(tezbîh̠)
بڕیوون، پسانەوە، لیک جیابوونەوە، کەرت بوون.
**پچراو** (ئان) piçṟaw
پـچراوە، پـچڕیاگ، پـڕوگیاگ، پـساو، قوسـاو، کـەرت بوو، پچینراو، ژێ کراو.
**پچرپچر** (ئان) ١ piçṟ piçiṟ
ناتەواو، بەکۆسپ، کۆسپ هاتووە بەر، بەتەگەرە، پـر لەتەگەرە.
**پچرپچر** (ئان) ٢ piçṟ piçṟ
١- کەرت کـەرت، لـەت لـەت، کـەرت وپـەرت، پـارچە پارچە، کوت کوت. ٢-ونجر ونجر، لەت وپەت.
**پچرپچر** (ئان) ٣ piçṟ piçṟ
بزربـزر، بێـسەروبن، بێـسەروبەر، بێـسەرومر، هیـچ بەسەر هیچەوە نەبوو(ئاخاوتن).
**پچرپچر** (ئان) ٤ piçṟ piçṟ
بێسەرومر، نابەردەوام.
**پچرکان** (کتپ) piçṟkan
پارچەپارچەکردن، پچڕکاندن، ووردکردن.
**پچرۆک** (ئان) piçṟok
قرچۆک، پرت، قرچۆڵ (دەزوو...).
**پچرینەر** (ن) piçṟêner
پچڕێنەر، برندە، برەر، کەرتکەر.
**پچرین** (کتپ) piçṟîn
ب (پچراندن).
**پچرینەوە** (کتپ) ١ piçṟînewe
بـڕدان، لیـک جیاکردنـەوە، لیـک دوورخـستنەوە، خستنە لاوە (بۆ مەبەستیک).
**پچرینەوە** (کتپ) ٢ piçṟînewe
رنینـەوە، شـالاویردن، شـالاوبۆ بـردن، چـرنووک لێ گرتن، رووشاندن، چرنووک لێ دان.
**پچرینەوە** (کتپ) ٣ piçṟînewe
لێ سەندن (شت لەکەسێ بەزۆر یان بەنابەدڵیی).
**پچکۆلە** (ئان) piçkole
بووچـک، بوچکەلانـە، پـچکۆل، پـچکۆلانە، پـچکۆلە، پچکە، پچکەلە، پچووک، وورد، ووردیلانە، ووردیلە.
**پچووک** (ئان) piçük
خریلە، ووردیلە.
**پچووک بوونەوە** (کتن) piçükbünewe
بـەجکیین، پـچکەلەبوونەوە، پـچکۆلەبوونەوە، چوونەیـەک، کـەم بوونـەوە، لـەکورتیی دان، هاتنەخوارەوە (رادە).
**پچووک کردنەوە** (کتپ) piçükkirdinewe
پـچکۆلەکردنەوە،کەم کردنـەوە، ووردکـردن، ووردکردنەوە.
**پچووکی** (ن) ١ piçükî
خزمەتکاریی، خواردەستیی، ژێردەستیی.
**پچووکی** (ن) ٢ piçükî
پچکۆلانەیی، زارۆیتیی، کۆرپەیتیی، منداڵیتیی، وەچکەیی، ووردیلەیی.
**پچە پچ کردن** (کتپ) piçe piç kirdin
١- بەپـسەپس دووان، پـسەپس کـردن، فـسە فـس کردن، (س) و(ز) بە (ث) و(ذ) دەربڕیین.
٢- بەناڕیکی یان وەک منداڵ ئاخاوتن.
**پچین** (کتپ) piçîn
پەین لێ دان، شەق تێهەڵدان، لەقەلێ دان.
**پخ کردن** (کتپ) pixkirdin
١- پخەکردن، ژێ کرن، سەربڕیین، لێکردنـەوە (بـۆ خواردن یان فرۆشتن). ٢- کوشتن، فەوتاندن.
**پخمە** (ن) pixme
پیسی، پیسایی.
**پدوو** (ن) pidü
پووک.
**پراش** (ئان) piraš
پریش، داغان، وورد.
**پراش پاش** (ئان) piraš piraš
پەراگەندە، وورد وخاش، وورد وورد.
**پراش کردن** (کتپ) piraš kirdin
پەراگەندەکردن، داغان کـردن، پـرش وبڵاوکردنـەوە، بڵاوکردنەوە.
**پرت** (ن،کل) pirt(kl)
ئازایەتی، دلیری، ئازایی، نەترسیی.

**پرتاپرتا**(نان،ناک)[1] pirtapirta[1]
بەپرتاو، خێرا، بەخێرایی.

**پرتاپرتا**(نان،ناک)[2] pirtapirta[2]
یەک لەدوای یەک، پەیتاپەیتا.

**پرت دان** (کتپ) pirtdan
پرت کردن، تووڕدان، تووڕهەڵدان، فڕێ دان.

**پرتکاندن** (کتپ) pirtkandin
ناوەڕووت کردن، پرتک ژێ کرن، پەرلێ کردنەوە.

**پرت کردن** (کتپ) pirtkirdin
فڕێ دان.

**پرتکە** (ن) pirtke
پرتۆکە، خاکە، خاکەڕۆکە، خاکەڕۆ، قرتکە، ڕیزە، وردکە، وردەی شت، وردتکە.

**پرتکە پرتکە** (ناک)[1] pirtke pirtke
برکە برکە.

**پرتکە پرتکە** (ناک)[2] pirtke pirtke
ڕیزە ڕیزە، نمەنم، ڕیزە بەڕیزە (باران).

**پرتگا** (نان،ن) pirtga
١-تووش، هەزاربەهەزار، لێژ، هەڵەت (نان).
٢- خزگا، لێژایی، خزگە (ن).

**پرتو بۆڵە** (ن) pirt w bole
پلت وبۆڵە، بۆڵە، بۆڵەبۆڵ.

**پرتو بۆڵە کردن** (کتن) pirtwbolekirdin
پلت وبۆڵە کردن، پلتەوبێزاریی دەربڕین، بۆڵاندن، بۆڵەبۆڵ کردن، بۆڵەکردن.

**پرت وپەلا** (نان)[1] pirtwpela
ب (پرش وبلاو).

**پرت وپەلا** (نان)[2] pirtwpela
هیچ وپووچ، بێهوودە.

**پرت وێژ** (نان) pirtwêj
پڕوپووچ، شاش و وێش، هیچ بەسەر هیچەوە نەبوو (ناخاوتن).

**پرت وێژی کردن** (کتن،کتپ) pirtwêjî kirdin
ناخاوتنی شاش و وێش کردن، ووتەی هیچ بەسەر هیچەوە دەربڕین.

**پرتۆکە** (ن) pirtoke
پرتکە.

**پرتە** (ن)[1] pirte
دەنگی دڵ، نەبز، لێدانی دڵ (دەمار).

**پرتە** (ن)[2] pirte
جووڵە، فرتە، لەرزە، لەرە.

**پرتە** (ن)[3] pirte
باڵەفرە، باڵە فڕێ.

**پرتە پرت** (ن) pirte pirt
پرتەی یەک لەدوای یەک، ترووکە، ترووکەترووک (خووی چاو ترووکان).

**پرتە پرت کردن** (کتن) pirte pirt kirdin
ترووکان، ترووکاندن، ترووکەکردن.

**پرتەکردن** (کتن) pirtekirdin
لێدان (دەمار)، پرتەپرت کردن، ترپەکردن.

**پرتەو** (ن) pirtew
ڕۆشنایی، ڕووناکی، شەوق، پەرتو.

**پرچ** (نک) pirç
قژ (مووی سەر کەلەپشتەوە هۆنرابێتەوە)، پەلکە، قژی هۆنراوە، کەزیی.

**پرچ بە بڕین چوون یان سەر بە تاشین چوون** (ند)
pirç be birîn çün
١- ئەتک بوون، بەپەندبوون. ٢- تووشی چورتمی گەورەبوون. ٣- تۆڵەی خراپەی خۆ هاتنەوەڕێ، سزای خۆ وەرگرتن (ئافرەت).

**پرچن** (نان) pirçin
پرچنە، سەرقژن، قژنە، قژ درێژ.

**پرچۆ** (ن) pirço
کاری سەراسیمە، واق وڕکەر، سەر سوڕهێنەر، چاف زیلک، سۆزەت.

**پرچە** (ن) pirçe
قرتە، قرتەقرت، کرتە، کرتەکرت، گارە، گارەگار.

**پرچی ئایشێ وفاتمە** (ن) pirçî ayşê w fatme
پەلکەی ئایشێ وفاتمە، ئەستونە زێڕینە، کۆلکەزێڕینە، شەوبەندە ڕۆژ، پەلکەی ڕەنگینە، کەسکەسۆر، تیرەژە.

**پرخە پرخ** (ن) pirxe pirx
قرخەقرخ، لرخە لرخ، مرخەمرخ، پرخ وهوور، پرخەی یەکلەدوای یەک.

**پرخ وهوور** (ن) pirx w hür
ب (پرخەپرخ).

**پردبوون** (کتن)[1] pirdbün
نەمان، بەئاسمانداچوون، فەوتان.

**پردبوون** (کتن)[2] pirdbün
نەمان، کەوتن، ڕووخان، تەپین، ڕۆچوون.

**پردبە ئاودا دان** (ند) pirdbe awda dan
١- ڕەنج بەفیڕۆدان. ٢- کاروبار لێ تێک دان.

**پردان (کتپ،کل)** pird dan(kl)
پەردان، تووڕدان،فڕێدان، بەتوند (شت) هاویشتن.
**پردان (کتپ)** pird dan
خستن، ڕماندن، ڕووخاندن، تەخت کردن.
**پردژ (ن)** ١ pirdij
ووچان، ویست، چاوەڕوانیی، پشوو.
**پردژ (ن)** ٢ pirdij
دەس پەرژ، دەس ڕەس، ماوە، مەودا.
**پردژدان (کتن)** pirdijdan
پردژگرتن، ووچان دان، ووچان گرتن، وەستان، ڕاوەستان، چاوەڕوان کردن، پشوودان، ویستان.
**پردژگرتن (کتن،کتپ)** pirdijgirtin
ب (پردژ دان).
**پردوخیاگ (ئان)** pirduxyag
هەلپرووزاو، هەلکرووزاو، هەلقرچاو.
**پردوو (نک)** pirdû
پەردوو، کەرەسەی سەربنمیچ، کەرەسەی بنمیچ دروست کردن، زەل وەهەژگی سەرداره ڕا، پردوو.
**پرد هەلبەستن (ند)** ١ pird helbstin
بەسەرناخۆشیدا زاڵ بوون، بەرەنگاری چوورتم ڕاوەستان، کۆڵ پێدان، گاردان.
**پردهەلبەستن (کتپ)** ٢ pirdi helbestin
پرد دروست کردن.
**پردەلە (ن)** pirdele
١- پردی بچووک.
٢-بەشێکە لەماشینی ئاشی ئاو.
**پرز (ن)** pirz
پرزە، ڕووی شاڵ، ووردەتووکی ڕووی شاڵ.
**پرزک (ن،پز)** pirzik
زیپکە، گرمژنە، گەرمەژەنە، گەرماناژنە.
**پرزە (ن)** ١ pirze
جەور، زۆر، خورتیی، ئەشکنجە، کەلەزەریی، بێ دادیی، بار.
**پرزە (نک)** ٢ pirze
ڕۆزیی، نان، قووت، خۆراک، خواردەمەنیی، واردەمەنیی،
خووریی، گیرمیی، خارن، خوارن.
**پرزە (ن،کل)** ٣ pirze(kl)
پەژارە، خەم، غەم، ئاە، خەفەت.
**پرزە (ن)** ٤ pirze
هەناسە، هەنیسک.

**پرزە (ن،کل)** ٥ pirze(kl)
پرزوولکە، دلۆپ، دلۆپە، نمە.
**پرزەبران (کتن)** ١ pirze biran
ئارزووقە نەمان، هەژاربوون، ئاتاج بوون.
**پرزەبران (کتن)** ٢ pirze biran
زیان لێ کەوتن، زیان کردن.
**پرزەبران (کتن)** ٣ pirze biran
ئومێد بڕان، هیوانەمان، هیوابڕوویینەوە.
**پرزەبراو (ئان)** ١ pirze biraw
تەنگەنەفەس،تەنگەهەناسە، هەناسەتوند، هەناسەتونگ.
**پرزەبراو (ئان)** ٢ pirze biraw
زیان لێ کەوتوو، زیان هاوردوو.
**پرزەبراو (ئان)** ٣ pirze biraw
هەژار، داماو، بێهیفیی.
**پرزەپرز (ئاک،کل)** pirzepirz(kl)
بەنمەنم، بەدلۆپە دلۆپ.
**پرزەپرز کردن (کتن،کل)** pirzepirz kirdin(kl)
دادان، داکردن، نمەنم کردن (باران).
**پرزۆڵ (ن)** ١ pirzol
پرزۆڵە.
**پرزۆڵ (ن)** ٢ pirzol
پارچە.
**پرژ (ن)** ١ pirj
پرژۆڵ، پژ، تەرز، ڕیشاڵ، پرش.
**پرژ (ئان)** ٢ pirj
ب (پرش).
**پرژان (کتن)** pirjan
بلاوبوونەوە، ڕژان (وەک شلەمەنیی).
**پرژاندن (کتپ)** ١ pirjandin
ڕشاندن، ئاو پرژێن کردن، ئاوپشین کردن، ئەرکردن.
**پرژاندن (کتپ)** ٢ pirjandin
بلاوکردنەوە، ڕژاندن، ڕشتن.
**پرس (ن)** pirs
پرسە، پرسیار، خواز، داوا، ڕا، ویست.
**پرسا (ن)** I pirsa
پرسیارکەر، جوویا، خوازا، خوازەلۆکە، خوازۆکە، داواکار.
**پرس پێ کردن (کتپ،کتن)** pirs pê kirdin
ئامۆژگاریی لێ وەرگرتن، تەگبیر وراوێژ پێ کردن، لێ پرسیین.

**پرس کردن** (کتپ) pirs kirdin
١- پرسیارکردن، پرسیین. ٢- خوازتن، خواستن، داخوازکردن، داواکردن، ویستن. ٣- داوای ئامۆژگاریی کردن، راوەرگرستن، پێشنیاردان.
**پرسە** (ن) pirse ١
تەعزیێ، ماتەم، ماتەمینیی، شیین، توازوو.
**پرسە** (ن) pirse ٢
سەرخۆشیی (لەخاوەن مردوو)، هاوبەشیی پەژارە.
**پرسەکەر** (ن) pirseker
بەپرسەوەچوو (کەسێ)، سەرخۆشیکەر (لەماڵە مردوو)، توازووخواز.
**پرسە گورگانە** (ن) pirse gurgane
پرسەگورگانێ،
پرسیارێ کەتەنها بۆ گلەیی بەسەرخۆوە نەهێشتن بێ، دەستوور خواستنی سەرپێیی.
**پرسە گورگانە پێ کردن** (ند)
pirse gurgane pê kirdin
پرس پێ کردن، پرس پێ کردن وبەقسە نەکردن، پرس پێکردن بەدرۆوە، پرس بەیەکێ کردن بەناپاکییەوە.
**پرسە لێ کردن** (کتپ) pirse lê kirdin
سەرخۆشی لێکردن، هاوبەشی غەم کردن (لەگەڵ خاوەن تەعزیەدا)، چوون بەپرسەوە، توازووخوازتن.
**پرسیار** (ن) pirsiyar
پرس، پرسە، داوا، ویست.
**پرسیارکردن** (کتپ) pirsiyar kirdin
ب (پرس کردن).
**پرسیارکەر** (ن) pirsiyarker
پرسکەر، داواکەر، خواستەر.
**پرسیی** (ن) pirsî
کاری بەسەرکردنەوە.
**پرسیینەوە** (کتپ) pirsînewe
بەسەرکردنەوە،بەشویندا چوون، چوونەبنج وبناوان.
**پرش** (ئان) pirş
بلاوبەلاف، بەلاف بوو، بەربادبوو، پژ، پژاو، پژیاگ، پرژ، پرژاو، پەخش، پەخشان، پەرت، پەرش، تەخشان، ولاو، لەیەک دوور، لیک ترازاو.
**پرش** (ئان) pirş
شاش، گوشاد، فراوان.
**پرشاو** (ئان) pirşaw
ب (پرش).

**پرشنگ** (ن) pirşing ١
بریسکە، پرشە، پرشنگ، تروسکە، تیشک، شەوق، بروسک، بروسکە.
**پرشنگ** (ن) pirşing ٢
پریشک (ئاگر)، پزیسک، پروسک، پزوسک، پزوسکە، پزۆسک.
**پرشنگدار** (ئان) pirşingdar
ب (تریسکەدار).
**پرشنگ دان** (کتن) pirşingdan
ب (بریسکانەوە).
**پرشنگ دانەوە** (کتن) pirşingdanewe
ب (بریقەدان).
**پرشنگ لێ بوونەوە {کەسێ}** (ند)
pirşing lê bûnewe
بەمرۆڤێکی (پاک، خواپەرست، نوورانیی) دەوروترێ.
**پرش وبلاو** (ئان) pirşw biḻaw
پرژوبلاو، پژوپۆڵ، بەرباد، پرت وپەلا، بلاوەبوو، پەرش و بلاو، تەرفیتین، تەرفەتیین.
**پرش وبلاوکردنەوە** (کتپ)
pirşw biḻawkirdinewe
بەملاولادا فڕێدان، پرژ وبلاوکردنەوە، بەربادکردن.
**پرشە** (ن) pirşe
ب (پرشنگ).
**پرشە پرش** (ن) pirşe pirş
بریسکەبریسک، بریسک وهوور، تریسکەتریسک، تروسکە تروسک.
**پرقیین** (کتن) pirqîn
تریقان، تریقانەوە، بەقاقاپێکەنیین، دانەقاقای پێکەنین، (لەپێکەنیید دا) قاقاکردن، پریق و هوور کردن.
**پرک** (ن) pirk ١
ریشاڵ.
**پرک** (ن،کل) pirk(kl) ٢
ئەقل سووکیی، بێ ئەقلیی، گەوجیی، بێ میشکیی، هێریی.
**پرکام** (ن،پز) pirkam
هەستیریا.
**پرکدار** (ئان) pirkdar
ریشەدار، ریشاڵ دار.
**پرگ** (ن) pirg ١
کەروو، کەفی ترشاو(سەر شلەمەنیی)، گەندەڵ.

گەندیی، ماکە.

**پرگ** (ن) pirg [2]

پرگە، گەرا (کوللە، پەپوولە، میش....)

**پرگ** (ن) pirg [3]

پەلەدەغل ودان، پەلەزەویی، پارچەزەویی.

**پرگ** (ن،ئان) pirg [4]

کەل، نێرە (ئاژەل).

**پرگ گرتوو** (ئان) pirg girtü

کەرواویی، گەنیو.

**پرگ هەڵهێنان** (کتن) pirg helhênan

پرگ کردن، ترشان، ترشەلۆکە بوون،
کەروو هەڵهێنان، پرگ لەسەر پەیدابوون.

**پرواندن** (کتپ) pirwandin [1]

ویران کردن، داتەپاندن، سڕینەوە، نەهێشتن، تەفرو توونا کردن.

**پرواندن** (کتپ) pirwandin [2]

تەکاندن (درەخت)، داتەکاندن، هەڵوەراندن، وەراندن (میوە لەدرەخت).

**پرواندن** (کتپ) pirwandin [3]

شت لەناودەستدا ووردکردن، هەڵپرواندن.

**پرواندن** {ئان} (کتپ) pirwandin [4]

تریت کردن، تێ وولیین، وولیین.

**پرواندن** (کتپ) pirwandin

تەکاندن، داتەکاندن، سڕیین، پاک کردنەوە، پیسیی پێوەنەهێشتن.

**پرواو** (کتپ) pirwaq

پـرووپاکە، تریتکـراو، تریتکریـاکە، ووردکـراو، وورد کریاکە.

**پروسک** (ن) pirüsk [1]

پروسکە، پروش، کرکراگە.

**پروسک** (ن) pirüsk [2]

ئێسکی پشت، پشتمازە.

**پروسک** (ن) pirüsk [3]

ب (پریشک).

**پرووز** (ن) pirüz

بۆکز.

**پرووشە** (ن) pirüşe

دەخەز، ڕق، ڕکە، ڕۆف، ڕۆفکە، قین، کەرب، کووفـان، کین.

**پرووشە لێ بوون** (کتپ) pirüşe lê bün [1]

ڕق لێ‌بوون، ڕکە لێ بوون، قـین لێ بـوون، کـەرب لێ بوونەوە، نەویستن، بوغزاندن.

**پرووشە لێ بوون** (کتپ) pirüşe lê bün [2]

ڕق لێ هـەڵگرتن، قـین لێ هـەڵگرتن، دوژمنایـەتیی لەگەڵدا هەبوون، کەرب لێ هەڵگرتن.

**پرووکە پرووک** (ن) pirüke pirük

فینکەفینکە، نووزەنووز، نوکە نووکە (گریان).

**پرۆت** (ن) pirot

پـرووت، گـۆزە ودیزەکـەر، کەسـێ کـەدەفر لـەگڵ دروست بکات.

**پرۆژە** (ن) piroje

نیش، کارنامە.

**پریاسکە** (ن) piryaske

پارچەقوماش، بوخچەلە، بوخچە، پیارزکە.

**پریش** (ئان) prêş

خاش بوو، ووردبوو، ووردوخاش (بوو).

**پریش پریش** (ئان) prêş prêş

هەلاهەلا، ونجرونجر، شروشر، دراو.

**پریق وهوور** (ن) prîq w hür

پریقە، پریکە وهوور، پێکەنینیی بەقاقای بەرز، تریـق وهوور، تریقە، قاقا، پرق.

**پڕ** (ئان) pir̲

تـەژی، سـەرلێوان، لێـوان لێـو، لێواولێـو، مـالا مـال، مالەو مال.

**پڕ** (ئان) pir̲ [1]

١- تۆکمـە، تیکمـە، سـفت. ٢- داگـیراو (مـرۆف)، داگیریاکە، قەڵەو.

**پڕ** (ئان) pir̲ [2]

چڕ، سفت.

**پڕ** (ئان) pir̲ [3]

ئـامۆ، ئـەمۆ، پـڕ زۆر، زۆردار، نائینـسان، نـامرۆف، خوێن خوار.

**پڕ** (ئان،ئاکە، کی) pir̲(ki) [4]

زۆر، زەحەف، گەلەکە، گەلێکە.

**پڕ** (ئان،ن) pir̲ [5]

زانا، فرەزان.

**پڕ** (ئان،ن) pir̲ [6]

جم وجۆڵی لەناکاو، جووڵانی لەپڕ، خێرایی.

**پڕ لەسرین** (ئان) pir̲ esrîn

پەرۆشـدار، پەرێـشان، خـەمبار، خەمـدار، دڵ پـڕ لەئەسرین، دڵ تەنگە، کەنەفت، مات.

**پراندن** (کتپ) pir̲andin

پرمەکردن، پیراندن.

**پراوپر** (ئان،ئاک) pir̲awpir̲
ئەوەندەی بیگرێ، پڕبەپڕ، سەرانسەر، سەرتاسەر، ئەوەندەی تێی خونجێ.

**پراوپر** (ئان،ئاک) pir̲awpir̲
بێکەم وکوڕی، قیت.

**پربار** (ئان) pir̲bar
بەبەر.

**پربوون** (کتن) [1] pir̲bûn
پڕەوەبوون، تەژیی بوون، سەرلێوان بوون، لێپ بوون، لیوان بوون، لیوان لیوبوون، مالا مال بوون.

**پربوون** (ئد) [2] pir̲bûn
١- پیش خواردنەوە.
٢- تووڕەبوون، هەڵچوون.

**پربوون** (کتن) [3] pir̲bûn
ئاووس بوون (ئافرەت).

**پربوونەوە** (کتن) [1] pir̲bûnewe
تەسەلاهاتن، تیرخواردن، چاو تیربوون، چاوتیرخواردن، داکەوتن.

**پربوونەوە** (کتن) [2] pir̲bûnewe
لیوان لیو بوون (بەرەبەرە).

**پربەپر** (ئاک) pir̲bepir̲
پراوپر.

**پربەپێست** (ف) pir̲be pêst
بەگوێرەی پێویست، لەقەدەرحاڵ.

**پربەپێستییەتی** (رس) pir̲be pêstiyetî
شایانی ئەوسزایەیە.

**پربەپێستییەتی** (رس) pir̲be pêstiyetî
باشە، چاکە، دەمێنێ، لەجێی خۆیدایەتی، هەڵدەگرێ.

**پربەدڵ** (ئاک) pir̲bedil̲
بەئارەزوویەکی زۆرەوە، لەتوێی دڵەوە، لەکانگای دڵەوە، لەناخی دەروونەوە.

**پربەدەم** (ئاک) pir̲bedem
بەدەنگێکی بەرزەوە، بەنەعرەتەیەکی بەرزەوە.

**پربەر** (ئان) pir̲ber
ئیجگار بەردار، بەبەر، زۆر بەبەر( درەخت)، [درەختێ بەری زۆری گرتبێ].

**پربەها** (ئان) pir̲beha
گران بەها.

**پربەیەکداکردن** (کتپ، ئد)
pir̲be yekda kirdin
ئاوڕیش بوون، بەرەنگاربوون، بەگژداچوون (هاتن..)، چنگ لێک گیرکردن، دەگژڕاچوون، ئەمبازبوون.

**پربێژ** (ئان) pir̲bêj
چەنەباز، درێژبێژ، درێژدادڕ، درێژ ودرێژ، دەلوو، زۆربلێ، سازندە، هەرزەچەنە.

**پرپر** (ئان) pir̲ pir̲
تابینەقاقا، لیوڕێژ.

**پر پۆڵ** (ن) [1] pir̲ pol̲
١- پارچە، پڕ زۆل، شرە.
٢-شرەوپرە، شرەومرە (نک).

**پر پۆڵ** (ئان) [2] pir̲ pol̲
بێ کەڵک، چەپەڵ (مرۆڤ)، هیچ وپووچ.

**پرپیادان** (کتپ) pir̲piyadan
پڕ پێدادان، پڕ پێداکردن، پەلاماردان، هێرش بردنەسەر لەناکاو.

**پرپیاکردن** (کتپ) pir̲ piyakirdin
پڕ پێداکردن، پڕدان، پەلاماردان، چنگ پێداکردن وفراندن، قۆزینەوە، هەڵمەت بۆ بردن، قۆستنەوە، دەس دانەشتێک وبردنی، دەس بۆ درێژکردن وبردن.

**پرتاسە** (ئان) pir̲ tase
ئارەزوومەند، بەئارەزوو، سەرگەرم.

**پرتافانن** (کتپ،کی) [1] pir̲tafanin(ki)
١- تاودان، غاردان. ٢- غارکردن (کتن).

**پرتافانن** (کتپ) [2] pir̲tafanin
رفاندن، فراندن.

**پرتافانن** (کتپ) [3] pir̲tafanin
بەرەودوانان، تارانن(وڵاخ)، کەوتنەشوێن (ئەسپ).

**پرتافیان** (کتن) pir̲tafyan
دەرچوون، ڕاکردن، کلک خستنەسەر شان، هەڵتیزان.

**پرتاڵ** (نک) pir̲tal̲
شت، شتومەک، کەل وپەل، پەرتاڵ، پرتی، تروتفاق، شتمەک، پێویستیی ژیان.

**پرتاو** (ن) [1] pir̲taw
١- پرتاف، پرتاق، تەرات، تەراتێن.
٢- غار، تاو، چوارناڵە.

**پرتاو** (ئان) [2] pir̲taw
پرتاف، ناکاو، ناگاو، چاوەڕوان نەکراو، کوت وپڕ.

**پرتاو دانەسەر** (کتپ) pir̲taw daneser
هەڵمەت بردنەسەر، هەڵمەت بۆبردن، هێرش بردنەسەر، بەرەنگاربوون.

**پرتوانا** (ئان) pir̲twana
بەتوانا، بەهێز، بەگوڕ، بەتاقەت، پڕ هێز، بەتین.

**پرتووک** (نک) piṟtük
ب (ئەخشال).
**پرتەندروستی** (ئان) piṟtendrüstî
بەدەماغ، بەکەیف، ساغ وسەلامەت.
**پرچنگ** (ن) piṟçing
ئەوندەی چنگ بیگرێ.
**پرچەک** (ئان) piṟçek
چەکدار، چەک رێژ.
**پرچەک بوون** (کتن) piṟçekbün
چـەک وتەقەمـەنیی پـێبوون، سوپـاکۆکردنەوە، بابـەتیی جـەنگ هێنانەمەیـدان، خـۆ بـۆ شـەڕ ئامادەکردن.
**پرچەک کردن** (کتپ) piṟçek kirdin
چەک پێدان، چەکدانەدەست.
چەکدانەدەست.
**پرچەنە** (ئان) piṟçene
پر بێژ.
**پردان** (کتپ) piṟdan
پڕپیاکردن.
**پردڵ** (ئان) piṟdiḻ
دلاوەر، دڵ شێر، دلێر، شێردڵ.
**پردەسەلات** (ئان) piṟdeseḻat
دینەوەر.
**پردەو** (ئان) piṟdew
بدەو، بەدەو، خۆشرەوت، قوچاغ، گوستاخ.
**پر روو** (ئان) piṟ ṟü
پرکێش.
**پرزۆڵ** (نک) piṟzoḻ
بەرگ.
**پر زۆڵ پرزۆڵ** (ئان) piṟ zoḻ piṟzoḻ
١- پارچە پارچە، شیتاڵ شیتاڵ. ٢- وورد وخاش، وورد وورد.
**پرزۆلە** (ن) piṟzoḻe
پرتاڵە، شیتالۆکە، پارچەی دراو (شرووڕ).
**پرزوو** (ن) piṟzü
برنوو، پر توانایی، پرکێشیی، توانایی.
**پرژانن** (کتپ) pirjanin
پرشاندن.
**پرسام** (ئان) piṟsam
بەسام، ترسناک، سامدار، سامناک، پر مەترسیی.
**پرسوو** (ئان) piṟsü
بەکەڵک، پرسوود، سوودبەخش.

**پرشاندن** (کتپ) piṟšandin
بلاوکردنـەوە، پـرژاندن، پـرژانن، پـەرت کـردن (بەشێوەیەکی نارێک).
**پرشکۆ** (ئان) piṟško
پایەبەرز، شکۆمەند، شکۆدار، خاوەن شکۆ.
**پرکراو** (ئان) piṟkiraw
تەژیی، تەژیی کراو، مالامل کراو، ئاخنراو.
**پرکردن** (کتپ) ١ piṟkirdin
تـژیی کـرن، تـەژییکرن، سـەرلێوان کـردن، لێوریـژ کردن، لێوان لێوکردن، مالامال کردن.
**پرکردن** (کتپ،ند) ٢ piṟkirdin
پاڵ پێوەنان، تیژکردن، تیژکردن (کەسێ لەیەکێکی دیکە)، گاڵ دان، هان دان، تێوەژەندن.
**پرکردن** (کتپ) ٣ piṟkirdin
ئاخنیین، تێ ئاخنیین، تەپاندنەناو، تەپانن، داگرتن، داگرتنەوە.
**پرکردنەوە** (کتپ) piṟkirdinewe
بەرەبەرە زۆر کردن، زێدەکرن، سەرلەنوێ لێوان لێو کردن.
**پرکێش** (ئان) ١ piṟkêš
جوامێر، بژوێن، پرزات، بەزات، توانـا، لێهـاتوو، دەس درێژ (لەکاروباردا).
**پرکێش** (ئان) ٢ piṟkêš
بەدەسـتو دوو، بـەکێش، پـرتەووژم، پـێ سـووک، خۆشرێ، خۆشرەوت، توند وتۆڵ، گورج، گورج وگۆڵ.
**پرکێش** (ئان) ٣ piṟkêš
بـەرپوو، پووقـایيم، پوودار، گوسـاخ، گوسـتاخ، روو هەڵماڵراو.
**پرکێشی** (ن) ١ piṟkêšî
تەوان، توانایی، توند وتیـژیی، تونـدیی، تیـژیی، دڵ گەرمیی، دەستودوو، لێهاتوویی، زات، لێوەشانەوە، کاری بەخۆدا راپەڕموون، تالانت، تاوایی، دەستەڵات.
**پرکێشی** (ن) ٢ piṟkêšî
پر پوویی، گوساخی، گوستاخیی.
**پر کێشی** (ن) ٣ piṟkêšî
ئازایەتیی، پاڵەوانیتیی، پاڵەوانیی، جوامێریی.
**پرکێشی کردن** (کتن) piṟkêšî kirdin
بەخۆدا راپەڕموون، بەگـەرمیی هەڵسوڕان، تـوانیین، زات بەسەرداشکان، زات کردن، کاریین، لـەخۆڕابیین، وێران.
**پرگ** (ن) ١ piṟg
لەنگەر (پاپۆڕ).

**پرگ** (ن) ٢ pirg

توانایی، دەستی باڵا.

**پرگ** (ن) ٣ pirg

لەنگەر (تەرانوو).

**پرگۆشت** (ئان) pirgošt

قەڵەو، مالووس.

**پڕ لە نارەحەتی** (مز) pir le narehetî

دژوار، سەخت، سەخت ونالەبار، گران وخنس، گران و دژوار.

**رماندن** (کتن) pirmandin

پرمانن، پرمەکردن، پیراندن.

**پرمە** (ن) pirme

پژمە، پیرە، دەنگی پژمینیی ئاژەڵ.

**پر مەترسی** (ئان) pirmetirsî

خەتەرناک، سامدار، سامناک.

**پرمەی گریان** (ن) pirmey giryan

پلمە، گریانی بەسۆز، گریانی بەکوڵ ولەپڕ، کوڵی گریان.

**پرمێشک** (ئان) pirmêšk

١- ئاقڵ، لەسەرخۆ، هێمن. ٢- زیرەک، ژیر..

**پرناو** (ئان) pirnaw

پڕ لەناو، پڕئاو، سیخناخ.

**پرنگ** (ن) pirng

برۆنز، رینگژک، زەرد (کان).

**پرنۆ** (ن) pirno

بەلگە.

**پرنۆڵ** (ن) pirnol

پارچە جلی شڕ، پڕوپاتاڵ، شڕە، شڕەومڕە، کاڵای شڕ.

**پرۆژە** (ن) ١ piroje

ئارمانج، ئامانج، پلان، چەخز، مەبەست، ویست.

**پرۆژە** (ن) ٢ piroje

بارنامە، ڕێڕاز، کارنامە.

**پرۆم** (ن) pirom

بستە، کەپەک، لوتکە (کێو).

**پروپا** (نک) pirupa

قاچ وقوول، قوول وقاچ.

**پروپاتاڵ** (ئان) pirupatal

بێبەها، بێ نرخ، پڕوپووچ.

**پروپاگاندە** (ن) pirupagande

ئاوازە، بانگاشە، پروپاگەندە، تەحاتەحا، دەبدەبە، دەمدەمە، زمزمە، واتەوات، هاتەهات، هەمهەمە.

**پروپریاسکە** (ن) pirw piryaske

بوخچە.

**پروپنجڵ** (ئان) ١ pirw pincil

نزم، پایەنزم، هیچ وپووچ، پڕ وپووچ.

**پروپنجڵ** (ئان) ٢ pirw pincil

١- ئاڵۆز، پەشێو، شێواو، ناڕێک. ٢- لەوێنەنەبوو، نائاسا.

**پروپنجڵ** (ئان) ٣ pirw pincil

پیس، پۆخڵ، ناپوخت.

**پروپنجڵی** (ن) ١ pirw pincilî

پیسی، ناپوختیی.

**پروپنجڵی** (ن) ٢ pirw pincilî

ئاڵۆزیی، پەشێویی، شێواویی، ناڕێکیی

**روپۆشتە** (ئان) pirw pošte

پۆشتە، پۆشتە وپەرداخ.

**پروپووچ** (ئان) ١ pirw püç

بێبەهرە، بێ ناوەڕۆک، هیچ وپووچ.

**پروپووچ** (ئان) ٢ pirw püç

بێبەها، بێ سوود، بێ کەڵک، بێ نرخ، بێ هوودە، ناژیر.

**پروپووچ** (ئان) ٣ pirw püç

ئاخاوتنی هەڵبەستراو، درۆ، درۆ ودەلەسە، دوور لە ڕاستییەوە، ناماقووڵ.

**پروپووش** (نک) pirw püš

پل وپووش، پژوون، پلاش، پووشاڵ، پووش وپەلاش، پەلاش، خاشاڵ، زلەقەسەڵ، کا،گژوگیای وشکەوەبوو، گزرەگیا، هەرزن.

**پروپەشێو** (ئان) pirw pšêw

ئاڵۆز، ئاڵۆزاو، بەسەریەکدا کەوتوو، پرش وبڵاو، پەشۆکاو، تێکەڵ وپێکەڵ، شپرزە.

**پروپیت** (نک) ١ pirwpît

پیت وبەرەکەت، خێروبێر، فەڕوبێر.

**پروپیت** (نک) ٢ pirwpît

ووردەشتی ناوماڵ.

**پروپیت** (نک) ٣ pirwpît

پارچەومارچە، پاشماوە، سەکراب.

**پروپیت بە ئاسماندا بردن** (ئد)

pirwpît be asmanda birdin

پیت وبەرەکەت بۆ نەهێشتن، خێروبێر نەهێشتن، فەڕوبێر بردن.

**پروپیرێژن** (نک) pirwpîrêjin

ژنانی (بەساڵداچوو، بەتەمەن، پیربوو).

**پرومر** (نان) pirwmir
تیک سمراو، خڕ وخەپان، داگرتیی، قەلەو، گوشتن.
**پرووز** (ن)[1] pirüz
١- چەوتیی، شوورەیی، ناڕێکیی، نەنگیی.
٢-فێل، فێل وفەرەج، حیلەو حەوالە.
**پرووز** (نک)[2] pirüz
پواویی، چوویی.
**پرووزان** (کتن)[1] pirüzan
پووان، چوون، دڕان (جل وبەرگ).
**پرووزان** (کتن)[2] pirüzan
پرووزیان، سووتان.
**پرووزاندن** (کتپ) pirüzandin
سووتاندن، هەلپرووزان، هەلپرووزاندن، هەلقرچان.
**پرووزاو** (نان) pirüzaw
پردوخیاگ، پرووزیاگ، هەلپرووزاو.
**پرووز دەرخستن** (کتپ) pirüz derxistin
شـوورەیی ئاشـکراکردن، نـەنگی دەرخـستن، عـەیب وعار دەرخستن.
**پرووز دەرکەوتن** (کتن) pirüz derkewtin
شوورەیی دەرکەوتن،
نەنگی دەرکەوتن، عەیب وعار دەرکەوتن.
**پرووزکان** (کتن) pirüzkan
پچران، پرووسقان، پرووسقیان، پرووسـکان، پـسان، لەیەک جوێ بوونەوە، لێک جیابوونەوە.
**پرووزکاندن** (کتپ) pirüzkandin
پـچراندن، پرووسـکاندن، پـساندن، لەیـەک جـوێ کردنەوە، لێک جیاکردنەوە.
**پرووزکاو** (نان) pirüzkaw
پچراو، پروسکاو، پساو، لێک ترازاو
. **پرووزە** (ن)[1] pirüze
بـۆ کـوڕوون، بۆنـسۆ، بـۆنی شـتی سـووتاو، کـاری سووتان.
**پرووزە** (ن)[2] pirüze
بلێسە، گڕ.
**پرووزە** (ن)[3] pirüze
بەزەیی، بەزەویی.
**پرووزە** (ن)[4] pirüze
تینویتیی.
**پرووزە {بۆکەسێ} تێ‌کەوتن** (ند)
pirüze (bo kesê) têkewtin
ئـاگر بـۆگرتن، بـەزەیی پـێداهاتنەوە، گـڕ بۆتێبەربوون، گڕ بۆ گرتن، جـەرگ بۆ سـووتان،
جەرگ پێ سووتان.
**پرووزیان** (کتن) pirüzyan
پـردوخیان، پـلۆخان، داپـلۆخان، سـووتان، هەلـپرووزیان، هەلـپرووزان، هەلـپروسکان، هەلکرووزان.
**پرووش** (ن)[1] pirüš
تویک، تویژال، پێست، تویکل.
**پرووش** (ن)[2] pirüš
پرووشە، پرووکە، تەیژ، تویخ (سەربرین).
**پرووش** (نک)[3] pirüš
پرووسک، سکل، پشکۆ.
**پرووشە** (نک)[1] pirüšc
پرووکە، تووکە.
**پرووشە** (ن) pirüšc[2]
پرووش.
**پرووشە پرووش** (نان)[1] pirüšc prüš
پرووک پرووک، تووکە تووک، هێواش هێواش، هێدی هێدی.
**پرووشە پرووش** (ناک)[2] pirüšc prüş
دانەدانـە، یەکەیەکـە، یـەک لـەدوای یـەک، بەتـەنها، جیاجیا، تاکەتاکە.
**پرووشە کردن** (کتن)[1] pirüše kirdin
بەفریاریین بەووردیی.
**پرووشە کردن** (کتن)[2] pirüše kirdin
کـەم خـواردن، کـەم خـۆریی کـردن (منـدال یـان نەخۆش)، خواردن بەگەروودا نەچوون (نەخۆش).
**پرووکان** (کتن)[1] pirükan
پچران، پسان (لەژێر باردا).
**پرووکان** (کتن)[2] pirükan
زۆر ماندوو بوون، پسان، لەپەل وپۆکەوتن.
**پرووکان** (کتن)[3] pirükan
ژێر کەوتن، شکان.
**پرووکان** (کتن)[4] pirükan
کۆست کەوتن، تووشی چورتمیکی گەورەبوون.
**پرووکان** (کتن)[5] pirükan
١- بەنگی دل بران، بەندی دل بران.
٢- هەلپرووزان (پێستی لەش بەهەوایەکی گەرم).
**پرووکاو** (نان)[1] pirükaw
تاساو (لەگەرماندا).
**پرووکاو** (نان)[2] pirükaw
پرووکیاو، بەندی دل براو، بەنگی دل پـچراو، کۆست کەوتوو.

**پڕه** (ن) pir̲e
پڕەپڕ.
**پڕەنگ** (نان) pir̲eng
نۆكەر، چارشا، رام بوو، راهاتوو.
**پڕهونەر** (نان) pir̲huner
بەزەوق، پڕزەوق، جوان ناس، هونەرزان، هەونەرمەند.
**پڕهێز** (نان) pir̲hêz
بازۆڵەقەوی، وەرزشمەند.
**پڕیشك** (ن) pr̲îšk
ئاورنگ برووكە، پرنچك، پروسك، بژنگ، پرشنگ، پرووسك، پریس، پریسك، پزیسك، تروسكە، چروسكە.
**پڕیشك لێ بوونەوە** (كتن) ١ pr̲îšk lê bünewe
ئاورنگ دان، پڕیشك دانەوە، پڕیشك هاویشتن.
**پڕیشك لێبوونەوە** (ند) ٢ pr̲îšklêbünewe
ئاگر كردنەوە، ڕق هەستان، زۆر تووڕەبوون.
**پز** (ن) ١ piz
ئاولەمە.
**پز** (نان) ٢ piz
بلند، بەرز، سەرلەئاسمان.
**پزدان** (ن) pizdan
پزان، منالدان، مندالدان، منالّلان.
**پزۆر** (نك) pizor
پزوور، هەناو، ورگ، ریخۆڵەی ئاژەل، ناوسك وریخۆڵەی گیاندار.
**پزوو** (پز) pizü
پزگ، پزە، تەبەق، سەگەناز، مەقاو، هەڵامەتی ئاژەل.
**پزیزك** (ن) pizîzk
پریشك.
**پزیشك** (ن) pizîšk
پەزیشك، تیماركەر، چارەكەر، چاك وەكەر، چاكە وەكەر، حەكیم، دوكتور.
**پرینك** (ن) prink
ب (برمەك، بلامك، بەلامەك).
**پژ** (ن) ١ pij
چل، لق، لك، پەش.
**پژ** (ن) ٢ pij
پرتۆل (دانەویلە)، پرتۆل.
**پژ** (ن) ٣ pij
ئژال، پژال، پژل، پژوپۆ، پژی، پیژال، پۆ، لق.

**پژاڵ** (نك) pijal̲
ب (پووش وپەلاش).
**پژان** (كتن) ١ pijan
خوێنی كچێنی بەربوون، كچێتیی نەمان، سەرگوڵی كچێنی نەمان، بن نەمان.
**پژان** (كتن) ٢ pijan
پژیین، خوێنی لووت بەربوون.
**پژان** (كتن) ٣ pijan
بلاوبوونەوە، پرژان، پرژیان، پژیان، پرش بوونەوە، پشان، پشیان، ڕژان، چرژان، وەشان، وەشیان.
**پژاندن** (كتپ) ١ pijandin
فرێدان، دەرپەراندن، هاویشتن، فیچقاندن.
**پژاندن** (كتپ) ٢ pijandin
بلاوكردنەوە، پرژاندن، پرژانن، پرش وبلاوكردنەوە، ڕژاندن، ڕشاندن، وەشاندن، وەشانن، چرژاندن.
**پژاندن** (كتپ) ٣ pijandin
ئاوڕشێن كردن، پرژاندن، پرژانن.
**پژانن** (كتپ) pijanin
وەراندن، هەڵوەراندن، خستنەخوارەوە.
**پژاو** (نان) pijaw
پژیاگ، پشاو، پشیاگ، وەشاو، وەشیاو، وەشێنراو.
**پژران** (ن) pijran
دلاودلی، دلە ڕاوكێ، گومان.
**پژریین** (كتن) pijrîn
دلاودلی كردن، دلەڕاوكێ كردن، گومان كردن.
**پژگ** (پز) pijig
ڕەوانیی، قژكە، كاری سك چوون (ناف چوون)، قزق، بەلەفیرە.
**پژگاڵ** (نك) pijgal̲
ئیش وكار، كاروبار، كاروفرمان.
**پژمە** (ن) pijme
پرمە، پژم، جەخت، پلمە، خەف، سەبر.
**پژمیین** (كتپ) pijmîn
بهنژیین، پژمانن، پژمەكردن، پژمەهاتن، پشكان، پشكیین، پشمیین، خەفیین، هاتنەپژمیین.
**پژمینەر** (نان) pijmêner
پشمینەر، پژمین ئاوەر، پژميناوەر.
**پژوپۆ** (نك) pijwpo
لق وپۆپ، لق وپۆ.
**پژوون** (نك) pijün
ب (پر وپوش).

**پژوێن** (ن) pijwên
پشتوێن، پشتێن، قەڵبەن، کەمەربەند.

**پس** (ن) pis 1
ئاولەمە.

**پس** (ن) pis 2
بەر، بەرە، ڕۆڵە، زگ، سک، کوڕ.

**پس** (نک) pis 3
نەوە، وەجاخ، وەچە.

**پس** (ن،ئان) pis 4
پسک، فس، کەسێ کەبەسەری زمان بئاخەوێ، لاڵ [تەنها بۆ پیتی (ز،س) دەیکات بە (ذ، ث)].

**پسان** (کتن) pisan 1
پرووکان.

**پسان** (کتن) pisan 2
پچران.

**پساندن** (کتپ) pisandin
پچراندن.

**پسپاندن** (کتن) pispandin
بەچرپە ئاخاوتن، پسەپس کردن، پسپساندن، چرپە چرپ کردن، لەژێر لێوەوە ئاخاوتن، پسەکردن، چرپەکردن، بەسرپە ئاخاوتن، پتاپت کردن.

**پسپان کردن** (کتپ) pispan kirdin
پارچە تێ گرتن، پارچەلێ دان، پینەکردن، تیلماسک تێ گرتن.

**پسپۆڕ** (ن،ئان) pispor̲
بزان، بەسەرکەرەوە، زۆرزان، شارەزا، ناسین، لێزان، وریا.

**پسپۆڕی** (ن) pispor̲î
بزانیی، بەردەباری، شارەزایی تەواو (لەبوارێکی زانستدا)، لێزانی (لەمەودای زانستدا).

**پست** (ن) pist
پزت، گفە، گیفە، گیزە (دەنگی گوللە).

**پستان** (ن) pistan
دزداشە، دیزداشە، کراس.

**پستو** (ن) pistü
ملیوان، یەخە.

**پسک** (ن) pisk
پرچ.

**پسکە** (ن) piske 1
بووسە وورد، بێ خشپەیی، (هێواش) ڕۆیشتنی ڕاوچی بەشوێن نێچیردا، ماتەماتەی ڕاوکەر، وورد ڕۆینی ڕاوچی بەرەونێچیر، ماتەمات، لەسەر خۆیی(ڕۆیشتن).

**پسکە** (ن) piske 2
باڵ بەیەکادانی بەچکەی باڵندە بۆ دایک وباوکی.

**پسکبان** (کتن) piskban
پسکەکردن، لەسەر نووکی پێ ڕۆیشتن.

**پس میران** (ئان،ن) pismîran
خانەدان، میرزا، میرزادە.

**پسوولە** (ن) pisül̲e
تکت، ڕەچەتە، باپەتە.

**پسە** (ن) pise
پتاپت، پسەپس، چرپە، چرپەچرپ.

**پسیان** (کتن) pisyan
ب (پسان).

**پش** (ن) piš
پشک، قسن،قەت.

**پشافتن** (کتپ،کی) pišaftin(ki)
تواندنەوە، حەلاندن، کردنەئاو، کردن بەئاو، بەئاو کردن.

**پشام** (ن) pišam
ئاوساویی، با، پەنام، ماس، هەو، ئەستووریی.

**پشام کرن** (کتن،کی) pišam kirin(ki)
ئاوسان، پەنمان، ماسیان، هەوکردن، ئەستووربوون.

**پشاندن** (کتپ) pišandin
بەخشینەوە، بەش کردن، بەشینەوە، بەخش کردن.

**پشپشۆکە** (ن،رو) pišpišoke
کلکە، پشیلە، جۆ کێویلە.

**پشت** (ن) pišt 1
بەشی دواوەی لەشی مرۆڤ (لەمل بەرەو خوار).

**پشت** (ن) pišt 2
مازە، مازیی.

**پشت** (ن) pišt 3
ئێل، باووباپیر، بنچینە، چینە، خێڵ، پشتە.

**پشت** (ن) pišt 4
ئاریکار، ئالیکار، پشتیوان، پەنا.

**پشت** (ن) pišt 5
ئەودیو، پاش، دیوەکەی تر.

**پشتاو** (ن) pištaw
دەمانچە، دەوانچە، دەملنچەی خۆدکار.

**پشتاوپشت** (ئان) pištaw pišt 1
بەئەکسەوە، بەپێچەوانەوە، بەرویشت، پشتەودوا.

**پشتاوپشت** (ناک)[٢] pištaw pišt
بەرەوپشتەوە، پشتەل پشت، ڕووبەرەو پشتەوە.
**پشتاوپشت** (ناک)[٣] pištaw pišt
لەیەکێکەوە بۆ یەکێکی دی، بنچینەو بنچینە، بنەچەو بنەچە.
**پشتاوپشت**(ناک)[٤] pištawpišt
بنچینە، بنەچە، بنەماڵە، ڕەگەز
**پشت ئەستوور** (ئان)[١] pištastür
دڵنیا، بێخەم، ئەرخەیان، ئەوڵە.
**پشت ئەستوور** (ئان)[٢] pištastür
پشت دار، پشت قایم، خاوەن پشت.
**پشت ئەستووری** (ن)[١] pištastürî
پشتداریی، پشت گەرمیی، پشتیوانیی، کۆمەکیی.
**پشت ئەستووری** (ن)[٢] pištastürî
دڵنیایی، بێخەمیی، ئەرخەیانیی.
**پشت بە پشتەوە** (فر) pišt be pištewe
تەک وەتەکەوە،یەک لەتەنیشت یەکەوە.
**پشت پەنا** (ن) pištpena
دالدە، داڵڵە.
**پشت پێ بەستن** (کتپ)[١] pišt pê bestin
باوەڕپێ کردن،بایەخ پێدان، بەڕاست زانیین، پشت پێ ئەستووربوون، سەلماندن (ئاخاوتن).
**پشت پێ نەبەستن** (کتپ)[٢] pišt pê nebestin
تێ ڕانەدیتن، لێ ڕانەبینیین، هیچ تێدابەستەنەبوون (مرۆڤ).
٢- جێی بڕوانەبوون، هیوا پێ نەبوون.
**پشت پێوە یەشان** (ئد) pišt pêwe yešan
١- بەتەنگەوە هاتن، جەرگ بۆ ژان کردن، دڵسۆز بوون. ٢- دڵسۆزانە کارکردن، دەغەڵی لەکاروباردا نەکردن.
**پشت تێ کردن** (ئد) pišt tê kirdin
١- بەجێهێشتن، بەرەڵاکردن، خستنە ئەولاوە، خستنە پشت گوێ، خۆ تێ نەگەیاندن، گوێ پێ نەدان، لێ دوورکەوتنەوە، وازلێ هێنان.
٢- لێ یاخیی بوون. ٣- پشت بەردان.
٤- بوون بەدوژمن، دوژمنایەتیی لەگەڵدا کردن.

٥- وازلێ هێنان، دۆستایەتیی کەسێ نەکردن، لێجیا بوونەوە، هاوکاریی لەگەڵدا نەکردن.
٦- واز لەئیشی خۆ هێنان.
**پشتدار** (ئان،ن)[١] pištdar
بەرگەگر، پتەو، توند، توند وتۆڵ، داڕێژراو، سفت، قاییم، کۆڵوفت.
**پشتدار** (ئان)[٢] pištdar
ب (پشت ئەستوور).
**پشت دان** (کتن)[١] pištdan
پشت کردنەوە، وەرچەرخان (بەرەودوا)، وەرگەڕان.
**پشت دان** (کتپ)[٢] pištdan
١- چەمانەوە، چەمینەوە، ڕاوەستان، خۆدانەواندن، وەستان، ویستان (گیاندای مێ بۆ نێر کەڵیی پەڕێ).
٢- چوونە ژێر فەرمانبەریی کەسێکەوە، خۆ بەدەستەوە دان،گوێ دێریی کەسێ بوون.
٣- بەزیین، تاران، تەقیین، ڕاکردن، ڕەڤیین، هەڕاکردن (لەدەست دوژمن)، هەڵاتن، هەڵهاتن.
**پشت دانەوە** (کتن)[١] pištdanewe
ئاگرخۆش کردن، ئاگر هەڵدانەوە، تیژکردن، تەنوور (سەرلەنوێ) گەرم کردنەوە.
**پشت دانەوە** (کتن)[٢] pištdanewe
پاڵ دانەوە، حەسانەوە.
**پشت ساردبوونەوە**(کتپ)[١] pišt sardbünewe
دەس نەچوونەئیش دوای خۆ تێ هەڵقورتانی کەسێ.
**پشت ساردبوونەوە**(ئد)[٢] pišt sardbünewe
تابوشت بۆ نەمان، تابوشتی کردنی کاروبار نەمان، لە تابوشت کەوتن.
**پشت شکان** (ئد) pišt šikan
بێهێز بوون، دواکەوتن، پاش کەوتن
**پشت شکان**(ئد)[٢] pišt šikan
١- ئەژنۆ شکان، جێی ئومێد بۆ نەمان، جێی ئومێدبڕان، مردنی سەردار وگەورەی کەسێ.
٢- سەروماڵ تێداچوون، کارەساتی گەورە لێ قەومان، ژێر کەوتن
٣- لەهەڵویستێکی لاوازدا کەسێ بەجێ هێشتن.
**پشت شکاندن** (ئد) pišt šikandin
١- تووشی زیانێکی گەورەکردن، ماڵ وێران کردن، داماوکردن، لێدان.
٢- بێ هێز کردن، بێ پشتیوان کردن، بێ پشتیوان هێشتن، پشتیوان بۆ نەهێشتن.
٣- پشت لێ هەڵکردن، پشت بەردان. ٤- بەزاندن، بەسەردا زاڵ بوون. ٥- کەس پێوەنەهێشتن.
٦- تەواوکردنی کارێکی زۆر سەخت وگران، تەواوکردن و بەئەنجام گەیاندن (کاری سەخت).
٧- پشت گرتن، فێرەبار یان سواریی کردن

(جوانوو)، رام کردن (ئەسپ)، مالیی کردن.

**پشت قایم بوون** (کتن) piştqayîmbûn

١- دلنیابوون. ٢- پشت ئەستووربوون، ئەرخەمەبوون، خاوەن کەس وکاری بەدەست بوون، نەترسان (لەئاکام).

**پشت قایم کردن** (ند) pişt qayîm kirdin

١- بەگەرم وگوڕی خۆئامادەکردن (بۆ کردنی کاریک)، پشتێن بۆ لێ بەستن، کەمەر لێ قایم کردن.

٢- خۆ گورج کردنەوە بۆ کردنی کارێ، کاروبار بەتوندیی گرتنەدەس. ٣- خۆ ئامادەکردن بۆ.

**پشت کردنەوە** (کتپ)[1] pişt kirdinewe

پشتێن ترازاندن، پشتێن کردنەوە.

**پشت کردنەوە** (کتن)[2] piştkirdinewe

دلنیابوون.

**پشتکۆڵ** (ن)[1] piştkoḻ

پشتکوول، پشکۆڵ، پشتەکێ (دار یان ئاسن لە رووی ئاوماڵەوە ئەدرێتە پشت دەرگا بۆ زیاتر پتەوکردنی بەشەو)، پشتیوان، پاڵپشت، پاڵپشتی دەرگا (لەناوەوە)، پالگە، باڵین، پژدەر، پشتدەر.

**پشت کول** (ئان)[2] pişt kul

تەمەڵ، لەش بەبار، لەش گران.

**پشت کۆم** (ئان،ن) piştkom

پشت قوقز، قەمبوور، قەموور، کۆم، کۆماو.

**پشت گرتن** (کتپ) piştgirtin

١- دەست گرتن، دەستی یارمەتیی بۆ درێژکردن، چوونە ژێرباڵ، یاریدەدان، پیش خستن، یارمەتیدان. ٢- بەهێزکردن، بەتواناکردن، تیین پێدان، تیین دان.

٣- لەسەرکردنەوە، پشتگیریی کردن، پشتیوانیی کردن، لاگرتن، لایەنگیریی کردن، پشت قایم کردن.

**پشتگە** (ن)[1] piştge

پشت، دوا، لای پشتەوە.

**پشتگە** (ن)[2] piştge

پار، پاڵ.

**پشت گوێ خستن** (کتپ) pişt gwêxistin

١- بەتەنگەوە نەهاتن، پشت لێ کردنەوە، گوێ پێنەدان، لەبیرخۆ بردنەوە، لەبیر خۆ دەرکردن، خستنەئەولاوە.

٢- دوورە پەرێز راوەستان، لێ دوورکەوتنەوە.

**پشت گوێ کردن** (کتپ) pişt gwê kirdin

پشت گوێ تاشین، پەناگوێ هەڵپاچین، سەرتاشین.

**پشت گەرم** (ئان) pişt germ

دلنیا، گەشبین، لەخۆ راپەرموو.

**پشت گەرم بوون** (کتن) pişt germbûn

١- بەتاسەوە ئیش کردن، خۆدانەبەر ئیش کردن، خۆ دانەبەر ئیش، دڵ لەسەر کاری خۆبوون، شان دانەبەر ئیش. ٢- گورج وبەهێز بوون.

**پشتگیری** (ن) piştgîrî

لایەنگیریی، یارمەتیی، یاریدە.

**پشتگیری کردن** (کتپ) piştgîrîkirdin

ب (پشت گرتن / ٢).

**پشتگین** (ئان) piştgîn

دواگین، دواهەمین، دوامین، قرە.

**پشت لەزەویی دان** (ند) pişt lezewîdan

١- بەزاندن، ژێرخستن. ٢- زیان پێ گەیاندن.

٣- ناپاکیی لەگەڵ کردن، دەغەڵیی لەگەڵ کردن.

**پشت لێ دانەوە** (ند) pişt lê danewe

بێ مەترسیی بوون، پشت لێ کردنەوە، دلنیابوون، بێ مەترسیی بوون.

**پشت لێ کردنەوە** (ند)[1] pişt lê kirdinewe

ب (پشت لێ دانەوە).

**پشت لێ کردنەوە** (ند)[2] pişt lê kirdinewe

ب (پشت گوێ خستن).

**پشت لێ هەڵکردن** (ند) pişt lê heḻkirdin

١- بەجێ هێشتن، لێ زویر بوون، وازلێ هێنان.

٢- لەڕوودا هەڵگەڕانەوە، لەڕوودا وەستان، لێ هەڵگەڕانەوە ٣- ئاگا لەکەسێ نەمان، لێ بەئاگا نەمان، لێ پچڕان.

**پشتماڵە** (ن) piştmaḻe

دراوسێ، هاوسا، هاوسێ.

**پشتمێر** (ن،نک) piştmêr

١- پشتیوان، یارمەتیدەر، یاریدەدەر، پشتگیر.

٢- ردیف، رەدیف (س).

**پشت وپەنا** (ن) piştwpena

پشت پەنا، داڵدە.

**پشتە پێ** (ن) pişte pê

پشتەپا، شەق، لەقە.

**پشتەسەر** (ن) pişteser

پاشملە، پشتەملی، غەیبەت، پشتەملە.

**پشتەک** (ن)[1] piştek

پشتکۆڵ.

**پشتەک** (ن)[٢] pištek
پالپشت.
**پشتەکردن** (کتن) pištekirdin
ب (پێ دزکێ کردن).
**پشت هەلکردن** (کتن) pišt heḻkirdin
پشت ئەلکردن، ڕوو هەلچەرخان، ڕوویربوون.
**پشتەملەکردن** (کتپ) pištemile krdin
خورتیی لێکردن، بەزۆرە ملێ ئیش بەکەسێکردن،
زۆر کردن، زۆرلێ کردن، زۆرە ملێ کردن.
**پشتەملێ** (ن) pištemilê
تۆپز، تۆپزان، خورتیی، زۆرەملە، زۆرەملێ.
**پشتەوارە** (ن) pištewaare
پشتیی، کۆل، بار.
**پشتەوە** (ن) pištewe
دواوە.
**پشتەوەشکێن** (ن) pištewe škên
بەپشتاخوارەوە بوو(دیوار)، شتی بەپشتدا چەماو.
**پشتێن** (ن) pištên
پـزدین، پـشتبێن، پـشتەوەن، پـشتوێن، پـشتەک،
پشووتکە ، شۆتکە، کەمەربەند.
**پشتێن بەستن** (کتپ) pištwên bestin
شـــتەک بەســـتن (..دان)، شـــووتکە گـــرێ دان،
کەمەربەند بەستن.
**پشتێن لێ کردنەوە** (ند) pištên lê kirdinewe
ب(پشت لێ دانەوە).
**پشتێنە** (ن) pištêne
ئاقار، ئەلقەگەردان، پشتبێنە، زنجیرە.
**پشتیر** (ن) pištîr
**پشتی** (ن)[١] pištî
پالپشت.
**پشتی** (ن)[٢] pištî
پاشەوانە، تۆپـەوانە. پـشتێر، ئەویلـەی ڕەشـەوولاغ،
مۆدەی ئاژەل.
**پشتیی سەریشی چاوە** (ند) pištî serîšî çawe
زۆر وورپایە.
**پشتیوان** (ن)[١] pištîwan
پالپشت.
**پشتیوان** (نک)[٢] pištîwan
پالوبەن، لاکوشە.
**پشتیوان** (ن)[٣] pištîwan
پـشتیوانیی، خاوەنـداریی، کۆمـەک، یارمـەتیی،
یاریدە.

**پشتیوان** (ن)[٤] pištîwan
پشتکۆل.
**پشتیوانی کردن** (کتن،کتپ) pištîwanî kirdin
خاوەنداریکردن، یارمەتی دان، یاریدەدان.
**پشتی یەکتر لەزەوی نەدان** (ند)
pištî yektir le zewî nedan
١- کۆمەکی یەکتر کردن، هاریکاریی یەکترکردن.
٢- بەربـــەرەکانیی یـــەکتر نـــەکردن، دژ بەیـ..ەک
نەوەستان.
**پشتی یەک گرتن** (کتپ) pištî yek girtin
پشتی یەکتر گرتن، یەکتر بەهێزکردن.
**پشک** (ن)[١] pišk
پـشکل، پـشکل، پـشکەل، پـشکول، قشـپل (مـەڕ،
بزن..).
**پشک** (ن)[٢] pišk
تۆپەوانە، دەم هەلبێن، دەمەلبێن.
**پشک** (ن)[٣] pišk
مووچە، ڕاتوو.
**پشک** (ن)[٤] pišk
پێ براو.
**پشک** (ن)[٥] pišk
پارچە، پل، کوت.
**پشک** (ن)[٦] pišk
خۆوبەخت، خۆو نسیب.
**پشک پشک** (ئان) pišk pišk
بەش بەش، پارچەپارچە.
**پشک خستن** (کتپ) pišk xistin
پـشک خـستنە سـەر، پـشک دادان، خۆوبـەختیی بـۆ
کردن، سەرپشک دانان، یانسیب بۆ کردن.
**پشکدار** (ن) piškdar
بەشدار، پشدار، خاوەن بـەش، مووچەبـەر، هاوبـەش،
هەڤبا.
**پشکداریی** (ن) piškdarî
بەشدارەکیی، بەشداریی، کۆمپانیا، هاوبەشداریی،
هاوبەشیی، هەڤبایی.
**پشکدەر** (ن) piškder
بەشدەر، بەشکەر، پێدەر، دابڕ دانەر، دەدەر.
**پشکڤاندن** (کتپ،کی) piškvandin(ki)
ب (پشکنیین).
**پشکڤین** (کتن،کی) piškvîn(ki)
بـــەردان، لیـــک تـــرازان( دروومـــان)، هەلـــپچڕان،
هەلپچڕیین، هەلتەقاندن، هەلوەشان.

**پشكنەر** (ن) piškiner
ئازمووكار، پەيجۆ، پەيخوار، تاقى كەرەوە.
**پشكنين** (كتپ) [1] piškinîn
تاقى كردنەوە، تەماشاكردن، تێڕامان، سەرنج لێدان، لێ نۆڕيين.
**پشكنين** (كتپ) piškinîn
بەشوێندا گەڕان، پشكانن، گەڕان، لەدووگەڕاان، بشكانن، سۆراغ كردن (بۆ دۆزينەوەى شتێ)، پشكڤاندن، لێ گەڕان، لێ كۆڵينەوە، بەدواداگەڕان.
**پشكۆ** (نك) piško
پندر، پنگر، پەنگر، ئەسكل، پۆلوو، سكل، تراد، پەرەنگێ، پۆل، پۆلكە، چەلاسكە، پەلە، پەل.
**پشكۆڤ** (ن،كى) piškov(ki)
خونچە، گوڵى نەپشكووتوو.
**پشكۆڵ** (ن) piškol̲
پشتەكە.
**پشكووتن** (كتن) [1] piškütin
دەم دانەوە، دەم كردنەوە، گەشانەوە (خونچە).
**پشكووتن** (كتن) [2] piškütin
گۆپكەكردن (درەخت).
**پشوو** (ن) [1] pišü
زيندەگانيى، ژيان، پەتۆ، پريش، هەناسەى ژيان.
**پشوو** (ن) [2] pišü
فەرك، ووچان، هەلوەستە، هەلويست.
**پشوو** (ن) [3] pišü
پشيى، هەناسە.
**پشوو** (ن) [4] pišü
برست، بەچيكلدانەيى، توانيى، سەبر.
**پشوو** (ن) [5] pišü
بگارە، بوارە، دەرفەت، ماوە، مۆڵەت، هەل.
**پشوو** (ن) [6] pišü
ئارامىي، بێ گلەيتيى، لەسەرخۆيى، ماندوونەبوونيى.
**پشووبڕان** (كتن) [1] pišübiṟan
هەناسەبڕان، لەهەناسەكەوتن، مردن.
**پشووبڕان** (كتن) [2] pišübiṟan
ماندوو بوون، هيلاك بوون، شەكەت بوون، هەناسە سواربوون.
**پشوو پێدان** (كتپ) pišüpêdan
بگارەدان، بوارەپێدان، بوارەدان بە...، دەرفەت پێدان، ڕيگا پێدان، ماوەپێ دان، مۆڵەت دان، وچان دان.

**پشوو خواردنەوە** (كتن) pišü xwardinewe
دامركانەوە، خۆگرتن، دان بەخۆدا گرتن، سەبركردن. سەبر گرتن.
**پشوودان** (كتن) pišüdan
ئارام گرتن، پشووگرتن، حەسانەوە، دەس لەئيش هەلگرتن (بۆ مەبەستى حەسانەوە)، وچان دان، وچان گرتن، ويستان بۆ ماوەيەك.
**پشوودانەوە** (كتن) pišüdanewe
ئيسراحەت كردن بۆ ماوەيەكى كەم، وچان گرتن.
**پشوودرێژ** (ئان) pišüdrêj
بەسەبر، خۆگر.
**پشوو گرتن** (كتن،كتپ) pišügirtin
پشوودانەوە.
**پشووگرتن** (كتن،كتپ) pišügirtin
پشووهەبوون.
**پشوو هەبوون** (كتن،كتپ) pišü hebün
بەپشوو بوون، خۆگرتن، سەبرگرتن لەسەر، پشووگرتن.
**پشيلە** (ن) pišîle
پزە، پشە، پسيك، پشى، پششيك، كيك.
**پشيلەشۆر** (ن) pišîlešor
شتنى ئەندام بەناتەواويى وكەم وكوڕيى، نيوە شۆر.
**پشيلە لەماڵ نيە مشكان تليليانە** (پن)
pišîle lemal̲ niye miškan tlîlîyane
ب (ئەگەر پشيلە لەماڵ نەبێ...).
**پشيلەى نێر** (ن) pišîley nêr
داوو، گوربە، پشيلەگوربە، پشيلەگوربز، پشيلە خرتە.
**پشێو** (ئان) pišêw
ئاشفتە، ئاشوفتە، تيكچوو، شلەژاو.
**پشێونە** (ئان) pišêwne[1]
پشێونە، تێچين، شوفاز، مايەفيتنە.
**پشێونە** (ئان،ن) pišêwne[2]
پر ئاشووب، نائارام، نائاسايش، نائاسايشت.
**پشێوى** (ن) pišêwî[1]
ئاشووب، ئاشووبە، ئاخۆران، ئاژاوە، ئاژاولەيى. ئاژاوەيى، پشێونە، نائاراميى، پشێوە، نائاسايشتيى. هەراو زەنا، هەراوهوريا.
**پشێوى** (ن) [2] pišêwî
جەنگ، شەڕ، كيشە (نێوان ميللەتان).
**پشێوى گێران** (كتپ) pišêwî gêṟan
پشێوى نانەوە،پشێوى هەڵگيرسان.

**پف** (ن) pif
بای دەم، بایی دەڤ، پفب، فوو.
**پف دان** (کتپ) pif dan
پف پیاکردن، پف هەڵدان، فووتێ کردن، فوودان.
**پف دراو** (ئان) pif diraw [1]
پف دریاگ، پف هەڵدراو، فووتێ کراو، فوودراو، ئاوساو.
**پف دراو** (خ.) pif diraw [2]
تەڵەو.
**پف کردن** (کتپ) pif kirdin
فووکردن.
**پفلە** (ن،کل) pifle(kl)
فووەڵی، هەلاوساوی.
**پف لە بۆڵەمر کردن** (ئد) pif le bolemir kirdin
ڕەنجی بێ هوودەدان، فوو لەژیلەمۆکردن.
ت: بۆڵە مر = ژیلەمۆ.
**پف لێ کردن {ئاگر}** (کتپ) pif lê kirdin
دامرکاندنەوە،
کوژاندنەوە، (ئاگری چرا....).
**پفەڵ** (ئان) pifel
فش، فشەڵ، فش وفۆڵ، فشۆڵ.
**پف هەڵدان** (کتپ) pifheldan
پف دان.
**پف هەڵدان** (کتپ) pifheldan
پاڵ پیوەنان، هەڵدان.
**پگا** (ن،کل) piga(kl)
خێرایی، نووبەنوویی، نوویی.
**پگر** (ن) pigir
گەمرە (پیسیی ئاژەڵ یان پەلەوەر لەگەووردا پێ شێل و وشک بوبێتەوە).
**پل** (ن) pil [1]
پەنجە.
**پل** (ن) pil [2]
بروسکە (ژان)، تیرە (ئازار).
**پل** (ن) pil [3]
دەراو، دەرە، دۆڵ.
**پل** (ن) pil [4]
زاب، زاو، زێ، ڕوبار.
**پل** (ن) pil [5]
با، ئاو، خول، سوور.
**پلار** (ن) pilar [1]
برک.

**پلار** (ن) pilar [2]
تانووت، توانج، تیلە، بەرد، تیلەوتوانج، تەشەر، ساچمە، تەوس، کولەبرک، کولەدار، ئەروەند.
**پلارتێ گرتن** (کتپ) pilar têgirtin [1]
پلار هاویشتن، تانوت لێدان، توانج لێ گرتن، تیلەو توانج هاویشتن.
**پلار تێ گرتن** (کتپ) pilar têgirtin [2]
برک تێ گرتن، برک هاویشتن، کۆلەبرک ئاراستەکردن.
**پلان** (ن) pilan [1]
بارنامە، بەرنامە، پرۆژە، ڕێراز، کارنامە.
**پلان** (ن) pilan [2]
ئەروەند، نۆین، پەند، پەنگ، پیلان، تەفرە، تەڵەکە، تەڵەکەبازیی، چەف، داو، دەهۆ، ڕیپ، فەند.
**پلاندن** (کتپ) pilandin
پلانن، پلکاندن، پلکانن، تلاندن، تل پێدان، تەپاو تل پێ کردن، خلۆر کردنەوە، گلۆر کردنەوە.
**پل بردن** (کبن،کل) pilbirdin(kl)
پل خواردن، پل دان، تل دان، خزان، خشان، پلیان، جوولان، تل بوونەوە، گلۆر بوونەوە، تل خواردن، تلیان، خلۆر بوونەوە.
**پلپل** (ئان) pilpil
پارچەپارچە.
**پلپل کراو** (ئان) pilpilkiraw
ئەجندراو.
**پلپل کردن** (کتپ) pilpilkirdin
پارچەپارچە کردن.
**پلچ** (ئان) pilç
پان، بەرین.
**پلچاندن** (کتپ) pilçandin
پان کردنەوە، پلچانن، پلیشاندنەوە.
**پل دان** (کتن) pildan
پل هاویشتن، جوولان، پرتە پرت کردن، جوولانەوە، لێ دان (دەمار).
**پلدی** (ن) pildî
خێو، ڕەشکێ، شەڤ، شەوە.
**پلک** (ئان) pilk
پیس، چلکن، چرکن، لەکاویی، قرێژاویی، ناپوخت.
**پل کەفتن** (کتن) pil keftin
بووارەهەبوون، دەرفەت بۆ هەبوون، دەرفەت هەبوون، فریاکەوتن، ماوەهەبوون، لێ هەڵکەوتن.

**پلگانن (کتن،کتپ،کل)** pilganin(kl)
ئـاوریش بـوون، بەلووتـەوەبوون، تـووش بـوون، تیوەئـالان، تیـوەگلان، دووچـاربوون، گرفتـاربوون، هاتنەرێ.

**پلگیاگ (ئان)** pilgiyag
تیوەئالاو، تیوەگلاو، دووچار، گرفتار، تووش بوو.

**پل هاویشتن (کتن)** pilhwîştin
پل دان.

**پله (ن)** ١ pile
پلەکان، پیپلکە، پلیکان، جیگاپێ (لەسەر پەیژە یان پیپلکانە).

**پله (ن)** ٢ pile
ریز، قەدر، نوودا، پەرای، پەزە.

**پله (ن)** ٣ pile
بـوار، فرسـەت، کـات، کـەیس، هـەل، دەرفـەت، هەلکەوت، کەلین، چەخش، پیلیسک.

**پله (ن)** ٤ pile
ئەموست، ئەنگوست، پل، ئەنگوشت، پـەنجە، قامک، تبل.

**پله پرتکێ (ن)** pilepitkê
پـەلە، پەلەپـرووزێ، پەلەپـەل، پـەلەفرتکێ، پـەلە بچرکێ، پەلە پرووزکێ.

**پله پله (ئاک)** pile pile
برەبرە، تۆزەتۆزە، کەم کەمـە، نەختەنەختـە، ووردە ووردە، لەسەرخۆ، لەسەرەخۆ، پچک پچک.

**پله ترازیان (کتپ)** pile trazyan
پاشگەزبوونەوە، پلەتسیان، پەشیمان بوونەوە.

**پله زیقان (ن)** pilezîqan
خۆشی، هەلەکەسەما.

**پله کردن (کتن،کتپ)** pile kirdin
١- خشان، خۆخشان، خۆ خشاندن.
٢- بێ خشپەهاتن، بەدزیەوەهاتن.

**پله مەته (ن)** pilemete
دارکونکـەرە، پـلەمەتێ، مەتـەی دارتـاش، مـەتێ وکەوان (ئامیر).

**پلەندەر (ن)** pilender
خۆ نازاکەر، خۆ نواندەر.

**پل وپاکردن (کتن)** pilwpakirdin
١- تەقـەلادان، کۆشـش کـردن، هـەوڵ دان، تـەلاش کـردن. ٢- پرپـیداکردن، پـەلامـاردان، شـەرکردن، دەستە و یەخە بوون.
٣- بەرمبەریی کردن، پیشبرکێ کردن.

**پلوپا (ن)** pilwpa
تەقەلا، تەلاش، کۆشش، هەوڵ.

**پل وپۆ (ن)** pil w po
خولیا، فاک وفیک.

**پل وپۆی ژن هینانی پێ کەوتووە (رس)**
pilwpoy jin hênanî pê kewtwe
کەوتۆتە سەر فاک وفیکی ژن هینان.

**پلوور (ن)** pilür
بلوور، بلویر، شمشاڵ، لوولە.

**پلوور ژەن (ن)** pilürejen
بلویر ژەن، لوولەژەن، شمشاڵ ژەن، نەی ژەن.

**پلوورە (ن)** pilüre
دووبەرە، کوورەی هەنگ، (دەفریکی لوولەییە هـەنگ شانەی تیادا هەلئەبەستێ).

**پلووسک (ن)** pilüsk
بۆختک، پلوور، پلوورە، چۆراوگە.

**پلووک (ن)** pilük
پارچە، کلۆ، کولۆ.

**پلیان (کتن)** pilyan ١
کەوتن، گلان، گلیان، خلیان.

**پلیان (کتن،کل)** pilyan(kl) ٢
دەرچوون، لەجێ چوون، وەرگەران (جومگە).

**پلیشاندنەوە (کتپ)** pilîşandinewe
پان کردنەوە.

**پلیشانەوە (کتن)** pilîşanewe
پان بوونەوە.

**پلیشاوە (ئان)** pilîşawe
پان بووەوە، تلیساوە، تەخت بوو، تیک شکاو.

**پڵ (نک)** piḻ
پەلە، خـاڵ خـاڵ، شـلیی، منجلیی (دەم وچاو یـان پیست).

**پلاس (ن)** piḻas
پەلاس، ژێر راخەر، ژیرخـەر، (لـەمووی بـزن دروست کراو).

**پلاشە (ن)** pḻaše
تەشت، قەرەوانە.

**پلاو پاڵیو (ن)** pḻawpaḻêw
پلاوپالا، پلاوسافکەر، دەفری شوولینی پەل.

**پلپ (ئان)** piḻp
بێ کەڵک (مرۆڤ)، بێسوود.

**پلپل (ئان)** piḻpiḻ
جۆر، چەشن.

**پلپله** (ن) pilpile
پرپره، ئاویزه، شۆڕابه.

**پلپلی** (ئان) pilpilî
بازکێ، بازوو، پنک پنک، بەڵەک بەڵەک، پلپل، پنۆک، پلـپلین، پەلەپـەلە، خـاڵاویی، خاڵخـاڵاویی، شـل، منجل.

**پلیته** (نک) pilîte
تلپه، خلته.

**پلنگ** (ن،ئان) piling
پالنگ.

**پلوچ** (ئان) pilüç
پلووچ، نادروست، ناڕاست.

**پن** (ن،جج) pin ١
زج، قورنوو.

**پن** (ن) pin ٢
پنک، پنۆک، خاڵ، نوخته، پنت.

**پنتک** (ن) pintik
پەڵە، پیسیی.

**پنتێ** (ئان) pintê
خۆڕیک نەخەر، کەمتەرخەم، گوێ بەخۆ نەدەر(لەجل و بەرگدا).

**پنتی بوون** (کتن) pintî bün
گـوێ بـەڕیک وپـێکیی خـۆ نـەدان (لەبـارەی ڕواڵەتەوە).

**پنچ** (ن) pinç
بنچ، بنچک، نچک.

**پنچ کردن** (کتپ) pinçkirdin ١
پینەکردن، سەرلەنوێ چاک کردنەوه.

**پنچ کردن** (کتپ) pinçkirdin ٢
چارەکردن (کار، هەڵویست).

**پند** (ن) pind ١
قن، قوون، کون، کنکێ.

**پند** (ن) pind ٢
پاش، پاشەوه، دوا، دواوه.

**پنگرکیش** (نک) pingir kêş
مەقاش، مقاش.

**پنۆک** (ن) pinok
خاڵ، نوخته، پنت.

**پنه** (ن) pine
خوان، دەرخۆنه.

**پنیوزکردن** (کتن) pinêwz kirdin
سەردانیی کردن، سەرلێ دان.

**پۆ** (ن) po ١
تەنراوه، چنراوه.

**پۆ** (ن) po ٢
پەل، پۆپە، لق وپۆپ، پەل وپۆ.

**پۆ** (ن) po ٣
پەڕ.

**پۆ** (ن) po ٤
پەڕۆ (ئاگر گیره).

**پۆبر** (ئان) pobir
چڕ، سفت (چنراو).

**پۆپ** (ن) pop ١
پۆپر، زوڵف، سەروقژ، قژی ئافرەت.

**پۆپ** (ن) pop ٢
پۆپە، تەوقەسەر.

**پۆپن** (ئان) popin ١
پۆپنەدار، کڵاودار.

**پۆپنه** (ن) popine ٢
پـۆپ، پۆپـان، پۆپـکه، پۆپـه، پۆپـینه، پـووپ، پووپناکه، پووپنەکه.

**پۆپنه** (ن) popine ٣
کڵاونە، کڵاوبالنده.

**پۆپه** (ن) pope ١
بەرزەخ، بەرزەک، تەپلە سەری شاخ، قوللە، کڵاوه، لوتکـە، بـاڵاترین یـان بـەرزترین شـوین (جێگـا یـان شتێ).

**پۆپه** (ن) pope ٢
بارست، بڵندایی، تەوقەسەر، لوتکه.

**پۆپه** (ن) pope ٣
پۆپنه.

**پۆت** (ن) pot ١
برپره، جۆڵ، زنجیر، شاران.

**پۆت** (ن) pot ٢
پەڕۆ، پەڕۆکۆن، شره، پارچە پەڕۆ کۆن.

**پۆت** (ن) pot ٣
ئەندازه، پیوانه، گێج.

**پۆت** (ن) pot ٤
لۆچ، چرچیی.

**پۆت کردن** (کتپ) potkirdin
چرچ کردن، لۆچ تێ خستن، لۆچ کردن.

**پۆت کەوتن** (کتن) pot kewtin
تەریق بوونەوه، شەرم گرتن.

**پۆتەلاک** (ن) potelak
پۆتلاک، سەرووپێچ، سەروپەست.
**پۆتین** (ن) potîn
بووت، جزمە.
**پۆخ** (ن) pox
گۆپکە، چرۆ، گۆپیتە.
**پۆخڵ** (ئان) poxil
کاڵ، کرچ، نەگەییک، نەگەییو، ترش، ڕەق، سەوز.
**پۆخڵکار** (ئان) poxil kar
بوودەڵە، بووڵە، بووەڵە، پەخمە، سستکار.
**پۆخین** (ن) poxîn
کەپەک.
**پۆر** (ئان) ١ por
بۆر، نادیار.
**پۆر** (ئان) ٢ por
بەور، بۆر، نەکێڵراو (زەوی)، تۆو پێوەنەکراو، بەرەلا کراو، بەیار.
**پۆر** (ن) ٣ por
بلوول، خوریی.
**پۆرت** (ن) ٤ port
(شتی) پەسند، (شتی) بەجێ، پەسەندیی، بەجێیی.
**پۆرخز** (ئان) ١ porxiz
سەرکێش، سەهندە، گرژ، لاسار، مانگر، مۆن.
**پۆرخز** (ئان،ن) ٢ porxiz
زل، زلە، زەلام، زلحۆ، گەلحۆ، مرقن.
**پۆرگ** (ن) ١ porg
بلۆق.
**پۆرگ** (ن) ٢ porg
ناوماڵ (شت)، ترپتفاق، کەل وپەلی ناوماڵ.
**پۆرگ** (ن) ٣ porg
بەرگی خونچەی نەپشکووتوو، فنجانەی گوڵ.
**پۆرتکان** (کتن) portkan
پۆسیان، پزیین، داوەشان.
**پۆڕ** (ن.م) por
زرە کەو، کەوەزرە، تفیلک.
**پۆڕاو** (ئان) poraw
ئەیفەز، ڕێکخراو، لەجێی خۆدانراو، لەڕیز.
**پۆڕگ** (ن) porg
برین، دوومەل.
**پۆرگە** (ن) ١ porge
ئامان، ئەمان، پەنا، پەناگە، داڵدە، قوژبن، کولینکە، ئەوا، هانا، کۆلین، کەلین، پەسیو، سایە.
**پۆرگە** (ن) ٢ porge
بۆسە، بووسە، حاشارگە، حەشارگە.
**پۆڕیان** (ئان) poryan
پۆڕین، ڕێک وپێک.
**پۆز** (ن) ١ poz
لووت.
**پۆز** (ن) ٢ poz
پۆزە، قەپۆز، لمۆز (ئاژەل).
**پۆز** (ن) ٣ poz
ڕوح زلیی، زلیی، گەف، لووت بەرزیی.
**پۆزشت** (ن) pozišt
تەوانۆ، بیانگە، ڕافە، پینەوپەڕۆی هەلویست، عوزر خوایی.
**پۆزشت کردن** (کتپ) pozišt kirdin
بیانگەهێنانەوە، عوزرخوایی هێنانەوە، داوای لێ بووردن کردن.
**پۆزە** (ن) poze
کۆسپایی، هەرە، تەپە، تەپۆلکە، تەپلاک.
**پۆژن** (ن) pojin
پەژارە، پوژن، خەم، غەم.
**پۆس** (ن) ١ pos
توێکل (دارو درەخت)، تۆی، کاژی دار.
**پۆس** (ن) ٢ pos
بۆسە، سەنگەر، قەرەوول.
**پۆس** (ئان) ٣ pos
پیر، بەتەمەن، بەساڵداچوو، تەمەن درێژ.
**پۆستکەندە** (ئان،لو) ١ postkende(lu)
ئاشکرا، بێ پێچ وپەنا، پۆسکەندە، پۆسکەنە، ڕەپ وراست، بێ پەردە، ڕاست ورەوان.
**پۆستکەندە** (ن) ٢ postkende
لێ کۆلیین، بنج وبناوان.
**پۆستکەندەکردن** (کتپ) ١ postkende kirdin
چوونەبنج وبناوان،
لێ کۆلینەوە.
**پۆستکەندەکردن** (کتپ) ٢ postkende kirdin
ڕەخنە لێگرتن، شرت وشۆ لێبڕین، کەم وکووڕیی کەسێ دەرخستن، زۆربەتوندی ڕەخنەگرتن.
**پۆستکەنە قسەکردن** (ئد) postkene qise kirdin
بێ پێچ وپەنا ئاخاوتن،
پۆستکەنە ئاخاوتن، ڕەپ وڕاست ئاخاوتن.

**پۆستەچی** (ئان) posteçî
پۆستەگەیین، نامەبەر.
**پۆستەخانە** (ن) postexane
پۆس، پۆستە، پۆسەخانە.
**پۆس کەندن** (کتپ،لو) ١ poskendin(lu)
پۆست گرتنەوە، پۆست کەندن، پۆس کەنن، پێستی گیاندار گرتنەوە، پێست گرتنەوە، پێست لێ کردنەوە، کەوڵ کردن، گروون.
**پۆس کەندن** (کتپ) ٢ poskendin
تویکل لێ کردنەوە، پاک کردن (میوە).
**پۆسیان** (کتن) posyan
پەرپووت بوون، پەرتووک بوون، پەرتووکیان، پووسیان، داڕزان، ڕزان، گەندن، گەنیین، گەنیو بوون، پۆسان، پوواو.
**پۆسین** (ن) posîn
کەڵەپۆس، کەوڵ، پێستە، سەختیان، گەلاسی.
**پۆشاک** (ن) pošak
پۆشەن، پۆشەنیی، پووشەن، بەرگێ، جل، جل وبەرگێ، جلک.
**پۆشاڵ** (ن) pošal
ریشوو، ڕیشاڵ.
**پۆشان** (کتپ) pošan
ب (پۆشیین).
**پۆشتە** (ئان) pošte
جل وبەرگێ ڕێک وپێک، شیک پۆش، ڕێک پۆش، نوێ پۆش.
**پۆشتەکردنەوە** (کتپ) poštekirdinewe
جل کردنە بەر (کەسێ)، کالا لەبەرکردن.
**پۆشتەوپەرداخ** (ئان) poštewperdax
بۆشناخ، ڕێک وپێک، شیک، حال خۆش.
**پۆشراو** (ئان) pošraw
پەنام، پەنهان، داپۆشراو، شارراوە، بەنهێنیی هیلراوە.
**پۆشمان** (ئان) pošman
ب (پاشگەز).
**پۆشە** (ن) poše
پۆش، سەر، سەرقاپ، لاسەر، لاسەرگێ.
**پۆشیین** (کتپ) ١ pošîn
بەسەرداداان، داپۆشیین.
**پۆشیین** (کتپ) ٢ pošîn
پنام کردن، پۆشان، پۆشاندن، پۆشانن، پەنهان کردن، ساتار کردن، شاردنەوە، وون کردن.
**پۆشیین** (کتپ) ٣ pošîn
پۆشان، پۆشتەکردنەوە، (جل) لەبەرکردن.
**پۆخان** (ن) poxan
کووچە، کووچە وکۆلان، کۆلان.
**پۆقیین** (کتن) poqîn
دەرپەڕان، هاتنەدەرەوە، دەرکەوتن.
**پۆکە** (ن) ١ poke
پووکە، گریانی نەرم، نکە، نووکە نووک، پووکە پووک.
**پۆکە** (ن) ٢ poke
پۆکە پۆک، پەڵەپەلاویی.
**پۆکەکردن** (کتن) poke kirdin
نالاندن، نالەنال کردن، نکەنک کردن، نزاندن، کسکیین، گالیین.
**پۆل** (ن) ١ pol
پشکۆ.
**پۆل** (ن) ٢ pol
کۆمەڵ، گەلە، کۆمەڵە، گەل، جڤات، هۆگە، دەستە، بتۆم.
**پۆل** (ن) ٣ pol
ژووری خوێندن (قوتابخانە)، کلاس.
**پۆل پۆل** (ن) ١ pol pol
پرتە وبۆڵە، گلەمەندیی، گلەیی، بۆڵەبۆڵ.
**پۆل پۆل** (ئان) ٢ pol pol
دەستە دەستە، کۆمەڵ کۆمەڵ.
**پۆلا** (ن.) pola
ڕەقی، سەختیتی، سەختی، بێ بەزەیتی، بێ میهرەبانی.
**پۆلا** (ن) ١ pola
بەهێزیی، پتەویی، قایمیی.
**پۆلا** (ن.) ٢ pola
پوولا، پوولاد.
**پۆلاخۆر** (ئان) polaxor
ئازا، دلێر، شمشێر خۆر.
**پۆلانیاکردن** (کتپ) ١ polaniya kirdin
ڕەق کردن، پتەوکردن، بەهێزکردن، توند وتۆڵ کردن، چەسپاندن.
**پۆلانیاکردن** (کتپ) ٢ polaniya kirdin
تیژکردنەوە، سوونەوە، لەچەرخ دان.
**پۆلایین** (ئان) ١ polayîn
لە پۆلا (دروست کراو)، داڕێژراو.

**پۆلایین** (ئان) ٢ polayîn
بەهێز، توند وتۆڵ، قاییم (دروستکراو)، پتەو.

**پۆلکە** (ن، رو) polke
بازلیا.

**پۆنژین** (ن.کی) ponjîn(ki)
وەنەوز، وەنەوزەکوتێ، قنگە خەو، کەرویشکە خەو.

**پۆنژین کرن** (کتن.کی) ponjîn(ki)
وەنەوزدان، وەنەوزە کوتێ کردن، قنگەخەوکردن، کەرویشکە خەوکردن.

**پۆنگ** (ن) pong
پەنگاو، پۆنگاو، پونگاو، گیژاو.

**پۆیلانە** (ن) poylane
دیاری (بۆ بووک یان زەیستان).

**پوار** (ئان) pwar
پاک، پاکژ.

**پوارتک** (ن) pwartik
ڕزیویی، گەندەڵیی، داڕزیویی.

**پواز** (ن) pwaz
زمانە، زوانە، پشک، سنگ، مۆرە، چیلکە، ئاسمانە، ئاوپەڕ، ئەزمانە.

**پوخت** (ئان) puxt
پاک.

**پوخت کردن** (کتپ) puxt kirdin
پاک کردن.

**پوختە** (ئان) ١ puxte
کولاو، کوڵیاک.

**پوختە** (ئان) ٢ puxte
برژاو، برژیاگ.

**پوختە** (ئان) ٣ puxte
بژاردە، بژێرداو، پاک، پاکژ، تەمیز، خاوێن.

**پوختە** (ئان) ٤ puxte
ئامادە، بەردەست، دەردەست.

**پوختەکراو** (ئان) puxtekiraw
بەسەروبەر، پوختە، خەملاو، دامەزراو، دروست، ئامادە کراو، ڕێک، ڕێک وپێک، سان، سازاو، سازکراو، تەبار، تەپار، دەردەست.

**پوختەکردن** (کتپ) puxtekirdin.
پاک کردنەوە.

**پووان** (کتن) puwan
ئەمارە پۆ بوون، پرتووکیان، پوویان، چوون، داڕزان، دڕان، ڕزان، ڕزیین، شیی بوونەوە، فەرفووت بوون، پڕ تووکان.

**پوواو** (ئان) puwaw
ئەمارە پوو، پرتووک، پوترکاو، پورتکاو، پەرپووت، چووە، داڕزاو، دڕاو، ڕزاو، ڕزیو، فەرفووت، گەندە، گەندەڵ، گەنەڵ، پرتوکیاگ، پوار، داوەشاو.

**پووت** (ئان) ١ püt
بزمۆک، دالگۆشت، لاواز، لەڕ.

**پووت** (ئان) ٢ püt
پووتەڵ، پووچ، پووچەک، پووچەڵ، پۆت، بێناو، پوور، بێ ناووک، کوێر، کلۆر، کوێرەک.

**پووت** (ئان) ٣ püt
ساف، سام، ساو، لووس.

**پووت** (ن) ٤ püt
توانایی، دەست ڕۆیشتوویی، هێز.

**پووت** (ن) ٥ püt
بووت، گزرە (گیای وشکەوەبوو بۆ ئالفی زستانە)، پۆت، وشکە گیای هەڵچنراو (بۆ ئالیکی ئاژەڵ لەزستاندا).

**پووت بوون** (کتن) pütbün
بەناوداچوون، زراف بوون، لاوازبوون، لەڕبوون.

**پووتەگا** (ن) pütega
بنگل، مەنگل.

**پووچ** (ئان) ١ püç
بەتاڵ، خالیی، بێناو، بێناواخن.

**پووچ** (ئان) ٢ püç
پووت.

**پووچ** (ئان) ٣ püç
بۆش، پووک، فش، فشەڵ، فشۆڵ، کلۆر، هلۆڵ، هۆلۆڵ.

**پووچ** (ئان) ٤ püç
بێمانا (ئاخاوتن)، بێهوودە، بێ وێژ، نابەجێ، ناپەسەند، نالایەق، نەشیاو، بەتاڵ، پڕوپووچ (ووتە)، گفتوگۆی بێ سەروبەر، پتپت، پۆت، پۆت پۆت، ئاخاوتنی بێ سەروبەر.

**پووچ بوون** (کتن) ١ püçbün
بێناووک بوون، پووچەک بوون، ناوک تێدانەمان، پووچەڵ بوون.

**پووچ بوون** (کتن) ٢ püçbün
هیچ تیادا نەمان، بەتاڵ بوونەوە.

**پووچ بوونەوە {هیوا}** (کتن) püçbünewe(hiwa)
هیوا پێ نەمان، ئومێدنەمان، بێ هیڤیی بوون، هیوا بڕان.

**پووچ کردن** (کتپ) püçkirdin
خراپ کردن، ئەزیەت دان، وەکو خۆی نەهێشتن.

تێک دان.

**پووچ کردنەوە** (کتپ) püçkirdinewe

بەتاڵ کردنەوە، تێک دان، ڕەش کردنەوە، لابردن، پووچەڵ کردن، بایەخ بۆ نەهێشتن، لەکارخستن (یاسا).

**پووچەک** (ئان) püçek

پووچەڵ.

**پووچەڵ** (ئان) püçeḻ

پووت.

**پووچەڵ کردن** (کتپ) püçeḻ kirdin

ب (پووچ کردنەوە).

**پووچەوەبوون** (کتن) püçewe bün

١- لەناوچوون، نەمان.

٢- لەئارادا نەمان، لەنێوان دەرچوون.

**پووچەوەبوون** (کتن) püçewe bün

نابووت بوون.

**پوور** (ن) pür

پورکە، پلک، میمک، میمی، خوشکی باوک یان دایک.

**پوورت** (ن) ١ pürt

موو، پوور، گژک، پۆر، پۆف.

**پوورت** (ن) ٢ pürt

پرچ، پرچۆک، قژ.

**پوورە** (نک) ١ püre

دەستە، دەسە، کۆمەڵە.

**پوورە** (ن) ٢ püre

کۆمەڵەی هەنگ.

**پووزەوانە** (نک) püzewane

١-گۆرەویی لاسک درێژ. ٢- گێترە.

**پووش** (نک) püš

پر وپووش.

**پووش دانە دەست** (ند) püšdane dest

سوخت کردن، نابووت کردن، هیچ بەدەستەوە نەهێشتن، خستنەسەر ساجی ئەلی.

**پووشوو** (ن) püšü

پۆشی، پیڤۆ، پوشی، خەرکۆل، قاو، پیفک، کۆلە، پیشوو.

**پووش وپەلاش** (نک) püšwpelaš

زبل.

**پووش وپەلاش** (نک) püšwpelaš

پروپووش.

**پووشینە** (ن) püšîne

زەمبیلە، زەمیلە، سەبەتەی پووش.

**پووق** (ن) püq

ب (بۆقەتەی مل).

**پووک** (ن) ١ pük

چەپۆک، کاری لێ دان (بەلەپێدەست).

**پووک** (ئان) ٢ pük

پووچ.

**پووکانەوە** (کتن) ١ pükanewe

بەناوداچوون، بچووک بوونەوە، پووک بون، کەم بوونەوە.

**پووکانەوە** (کتن) ٢ pükanewe

چرچ بوون، چرچ هەڵگەڕان.

**پووکاو** (ئان) ١ pükaw

زراف، لاواز، لەڕ.

**پووکاو** (ئان) ٢ pükaw

پوواو.

**پووڵ** (ن) ١ pül

پارە، دراو، درەم، درهەم.

**پووڵ** (ن) ٢ pül

مزی پۆستە، پۆستەمزانە.

**پووڵ** (ن) ٣ pül

ئێسکی دەفەی شان.

**پووڵ پەرست** (ئان) pül perist

پارە پەرست، پوولەکیی، ئەستۆ خواری پارەوپووڵ، چرووک، ڕژد.

**پوولەکە** (نک) ١ püleke

پوولک، پوولک (ماسیی).

**پوولەکە** (نک) ٢ püleke

پۆلک، پۆلک، پوولک (بەسەر قوماشدا دادەدروێت بۆ جوانیی).

**پوولەکە ڕێژ** (ئان) püleke ṟêj

بەپوولەکە ڕازاو (جل).

**پوولەکی** (ئان) pülekî

پووڵ پەرست.

**پووڵی مەردوم کیسە دەدڕێت** (پن)
pülî merdüm kise dedṟêt

پارەی چاو لەدوو کەس خێری لێنابینێت.

**پەپک** (ن) pepk

گونک (گونکە هەویری پان کراوە)، گوندک، گلۆر، گرنگی، گشتک، گشک، گونتک...

**پەپکە** (ن) [١] pepke
خەرمان (هەڵدراوە وشەن نەکراو).
**پەپکە** (ن) [٢] pepke
خەروا (هەنجیر، پەنیر....).
**پەپکە** (ن) [٣] pepke
کرمۆڵە، کرنگە، گینگڵ خواردوو، پیچ خواردوو.
**پەپکێ** (ن) pepik
پەپک، خەپلە، پەپۆکە، پەپە، کولێرەی پچووک، نان.
**پەپۆڵە** (ن) pepole
سەرەگونکە هەویر.
**پەپوو** (ن،م) pepü
کوندە بەبوو.
**پەپوو تیا نەخوێنێ** (رس) pepü tiya exwênê
پەپــــوو تیــــادەخوێنێ، پەپــــووی لێ (لەســـــەر) دەخوێنێ، ئاواقە، چۆڵە.
**پەپووسلێمانکە**(ن،م) pepüslêmanke
پەپووسلێمانە.
**پەپوولە** (ن،جچ) pepüle
پەرپەرۆکە، پاریکە، پەرپەریکە.
**پەت** (ن) [١] pet
رستە (بۆپەت کردنی تانجی یان باز).
**پەت** (ن) [٢] pet
بەن، بەند، پەتک، پەلەتکە، تەناف، ریسمان، رشتە، رستە.
**پەتا** (پز) peta
ئارسم، پەرسیو، پەسیو، درم، پەرسیڤ.
**پەتاتە** (ن،رو) petate
سیڤەزەمینە، سیوەزەمینە، کەرتوپ.
**پەت بڕ** (ئان) pet bir
سەرکیش، شەموس، شەمۆس، یاخیی.
**پەت بۆ شل کردن** (ئد) pet bo şil kirdin
بوارەدان، پەت بۆ بەردان، جڵە وبۆ بەردان، جڵەو بۆ شل کردن، خۆدانـەدەس کەسـێ، نـەرم بـوون، مـاوە پێ دان.
**پەت پچڕاندن** (ئد) pet piçrandin
١- خۆ پێ ڕانەگیران، لەووزەدا نەمان.
لەووزەدا نەمان. ٢- خۆ گەیاندنە کەسێ.
**پەت پساندن** (کتپ) pet pisandin
١- پچران، پچراندن.
٢- خۆ کردنەوە، خۆ ڕزگار کردن، خۆ وازکردن.

**پەت پەتی** (ن) [١] petpetî
ئەمسەر وئەوسەر، بێنەوبەرە، دەستی بەدەستیی، درۆ و دەلەسە، ئەمرۆ بەسبەی.
**پەت پەتی** (ن) [٢] petpetî
کاری پێچانی برین یان تیمارکردنی.
**پەت پەتیێ کردن** (کتپ) petpetî pê kirdin
پەت پەتان پێ کردن، پەت پەتین پێ کردن، بێنە و بــەرە پــێکردن، تووشــی دەردەســەری کــردن، چەرمەسەریی پێ کـردن، کەسـێ زۆر هێنـان وبـردن، ئەمسەر وئەوسەرپێ کردن، دەستی بەدەستیی پێ کردن، ئەمرۆبەسبەی پێ کردن.
**پەترمە** (ن) petirme
موتوربە، موتربە(لەسەر دەرختێکی دیکە).
**پەترمە کردن** (کتپ) petirme kirdin
موتوربــە کــردن، پــیوەندکردن، موتربــەکردن، چووزکردن.
**پەترۆک** (ن) petrok
پارچە.
**پەتک** (ن) petik
پەتی بادراو.
**پەت کردن** (کتپ) pet kirdin
١- بەپەت ڕاکیشان، رستەکردن (تانجی..).
٢- پەت خستنەمل، پەت کردنە مل.
٣- خستنە ریز، ریزکردن.
**پەتلە** (نک) [١] petle
دانەویلــە، دەغـل ودان (گــەنم، جـۆ، گەنمەشـامی، هەرزن، کزن).
**پەتلە** (ن) [٢] petle
ساوەری درشت.
**پەتۆ** (ن) peto
پشوو.
**پەتوو** (ن) petü
بەتانی، پیخەف، لیفۆکە.
**پەتەڕی** (ئان) peterî
١- بەرەڵا، پەتیارە، شـیت، شـیتۆکە، دین، دیوانـە.
٢-گەمژە، گەلحۆ، گەوج.
**پەت هەڵخستن بۆکەسێ** (ئد)
pet helxistin bo kesê
١- خنکانن، مل بەپەتەوە کردن.
٢- داو بۆ نانەوە، چاڵ بۆ کەسێ هەڵکەندن، تلو بۆ هەڵخستن.

**پەتیارە** (ئان) petyare
بەدسەکوت، سەروسەکوت ناشیرین، ناشرین.
**پەتی درۆ کورتە** (پن) petî diro kurte
ا- درۆزن زوو دەستی دەکەوێتە ڕوو.
ب- درۆزن ئەبێ بیری تیژبێت
ج- درۆزن دەم هەراشەو دەس بەتاڵە
**پەتی** (ئان) petî
١- بێ خەوش، خاوێن، ڕوون، زوڵاڵ.
٢- ڕووت، سادە، ساکار، بێ گەرد.
٣-نەئالۆزاو، نەپەشۆکاو، تێک نەچوو.
**پەچ** (ن) peç
بزمار، پەرچ، بەرپەچ، بزماری پەرچ، پەرچم.
**پەچ دانەوە** (کتپ) peçdanewe
بەرپەچ دانەوە، بەرپەرچ دانەوە، بەرهەڵستیی کردن، پەرچ دانەوە، پەرچی ئاخاوتن دانەوە.
**پەچکاندن** (کتپ،کی) peçkandin(ki)
پچووک کردنەوە، کەم کردنەوە، لێ کەم کردنەوە.
**پەچنین** (ند) peçnîn
پــەژارە خــستنەدڵەوە، پــێش خواردنــەوە، خــۆ خواردنەوە، قووت دانەوە.
**پەچە** (ن) [1] peçe
پێچە، تارای ڕەش، چارشێو، ڕووبەنە، ڕووپۆش.
**پەچە** (ن) [2] peçe
پــەچیە، بەرانگــە، مۆڵگــە، جێگــەی مــۆڵ خــواردنی مەڕوماڵات.
**پەچەتە** (ن) peçete
بەرکۆش، خاولی، سەرکۆش.
**پەح!** (ئسپ) peh̲ !
بەحا، تەحا، پەکوو، تەح، پیاح.
**پەحتن** (کتپ) [1] peh̲tin
کەلانــدن، کولانــدن، نــان (چێــشت)، خــواردن ئامادەکردن (بۆ سەرخوان).
**پەحتن** (کتپ) [2] peh̲tin
برژاندن، کولاندن، سوورکردنەوە، خستنە بەرتینیی ئاگر (گۆشت)، پیشاندن.
**پەحنی لێ‌دان**(کتپ،کی) [1] peh̲inî lê dan(ki)
تیــز پــێوەکردن، بــەچاوی ســووک تەماشــاکردن، بەســووک زانــین (کەســێ)، شــکاندن (مــرۆڤ)، ڕسواکردن.
**پەحنی لێ‌دان**(کتپ،کی) [2] peh̲inî lê dan(ki)
بەپــاژنە لێ دان، بەپــێ‌لێ دان، پــەعیین، تێهەڵــدان، شــەق لێ‌ــدان، دانەبــەر شــەق، پاشــەلەقە لێ‌ــدان، لەقەلێ‌دان، پیحیین.
**پەخ** (ئان) [1] pex
قۆقز.
**پەخ** (ئان) [2] pex
پان، تەخت، داشکاو، داشکیاگ.
**پەخ بوون** (کتن) pexbûn
تیژیی نەمان، قۆقزیی نەمان (زەوی).
**پەخش** (ئان) pexš
پەخشان، پرش، بڵاو، پەرت.
**پەخشان** (ن) pexšan
هەڵبەست، هۆنراوە، ووتە.
**پەخشان کردن** (کتپ) pexšan kirdin
بڵاوکردنەوە، پرش کردن، پرشاندن، پــەرش کــردن، پەخش کردنەوە، پەخشان کردنەوە.
**پەخش بوونەوە** (کتن) pexš bûnewe
بڵاوبوونــەوە، پــرش وبڵاوبوونــەوە، پــەرت بــوون، بەملاولادا ڕۆیشتن.
**پەخشکەرەوە**(ئان) pexškerewe
بڵاوکەرەوە، بەخشەوکەر.
**پەخشە** (ن،جج) pexše
ب (مێشوولە).
**پەخشەکوورە** (ن،جج) pexše kûre
مێشوولە.
**پەخ کردن** (کتپ) pex kirdin
پــەخ کردنــەوە، تیــژیی نەهێــشتن، تــەخت کــردن، قۆقزیی لابردن.
**پەخمە** (ئان) pexme
سەپۆل، گەلحۆ، گێژ، گێژ و وێژ.
**پەراسوو** (ن) perasû
پەرەکە، کەلەکە، پارسوو، پالوو، دەنکە.
**پەراسووە** (ن) perasûwe
ڕایەڵ (خانوو، زنج..).
**پەراش** (ن) peraš
پریشک، پزیشک، پزیسک (ئاگر).
**پەراش بوون** (کتن) perašbûn
پارچە پارچەبوون، وورد بوون.
**پەراڤ** (ن،کی) perav(ki)
ڕۆخی ڕووبار، قــەراغ ئــاو، گــوێ ڕووبار، گــوێ دەریــا، گوێ ئاو.
**پەراگندە** (ئان) peraginde
ب (پەراگەندە).

**پەراگەندە** (ئاک،ئان) peragende

بـڕبوو، بڵاوبـوو، پـەرە، پـەرت، پـەراگندە، پـەرش، دابڕاو، وێڵ، دووركەوتە، پەرتەوازە.

**پەراوێز** (ن) ١ perawêz

سـجاف، سـیجاف، تـار، چەمـە، چەمـەر، چەمـەرە، چوارچێوە.

**پەراوێز** (ن) ٢ perawêz

پارچەی دامێن(كراس، كەوا)، لیوار.

**پەرپتاندن** (كتپ) perpitandin

ئـاوەڕووت كـردن، پەرپـتیین، پـەڕ لێ كردنـەوە، رووتاندنە وە (پەلەوەر).

**پەرت** (ئان) ١ pert

بێجێ، بێكەس، بێ شوێن، لانەواز، وێڵ (مرۆڤ).

**پەرت** (ئان،ن) ٢ pert

نادروست، ناڕاست، چەوت، نادروستیی، ناڕاستیی، چەوتیی.

**پەرت** (ئاک) ٣ pert

بەرەللا

**پەرت** (ئان) ٤ pert

بڵاو، لێک پچڕاو.

**پەرت** (ن) ٥ pert

برنگ، تووڕ، فڕە، هەڵ، برک، پەڕ.

**پەرتاڤ** (ن،کی) pertav(ki)

ب (پەرتەو).

**پەرت بوون** (كتن) ١ pertbûn

بـڕبوون، پـەراگەندەبوون، پـچڕان، پـەرش بـوون، دابڕان، وێڵ بوون، لێک تـرازان، لێـک دووركەوتنـەوە، وەڵ بوون.

**پەرت بوون** (كتن) ٢ pertbûn

والابوون، كرانەوە.

**پەرتخ** (ن) ١ pertix

بن، بنک، ژێر.

**پەرتخ** (ن،کل) ٢ pertix(kl)

ئەوپەڕ، ئەوسەر، سەرپەڕ.

**پەرت دان** (كتپ) pertdan

ئاوێژتن، پـەڕدان، تـووڕدان، تووڕهەڵدان، فـڕێ دان، هاوێشتن، هەوادان، پەرت كردن، برک دان.

**پەرت كردن** (كتپ) ١ pertkirdin

هاوێشتن.

**پەرت كردن** (كتپ) ٢ pertkirdin

برنگ دان، تووڕدان، فڕێدان، هەڵ دان.

**پەرت كردن** (كتپ) ٣ pertkirdin

وازلێ هێنان، وازهێنان، وەڵ كردن.

**پەرت وپەلا** (ئان) ١ pert w pela

پرش وبڵاو، كلپەترە.

**پەرت وپەلا** (ئان) ٢ pert w pela

شڕو و وڕ.

**پەرت وپەلا** (ئان) ٣ pert w pela

هەڵیت وپەڵیت.

**پەرت وێژی** (ن) pert wêjî

وێل بێژی.

**پەرت وێژیی كردن** (كتن) pertwêjî kirdin

خۆ تێ هەڵقورتان، لەناخاوتنی كەسێكدا هەڵدان، وێل وێژیی كردن.

**پەرتەك** (ن،کل) pertek(kl)

هێز، توانایی، توانا، وزە.

**پەرتەك براو** (ئان) pertekbiraw

پـەرتەک بـڕیاگ، بـێ هێـز، هێـز لەبەربـڕاو، وزەپـێ نەماو.

**پەرتەك بڕین** (كتپ) pertekbirîn

بێهێز كردن، هێزلەبەر بڕین.

**پەرتەو** (ن) pertew

پەرتاڤ، ڕۆناهیی، ڕووناكیی، ڕۆشنایی، پرتەو.

**پەرتەوازە** (ئان) pertewaze

پەراگەندە، پەرەوازە.

**پەرتیین** (كتن) pertîn

دران (جل).

**پەرچ** (ن) ١ perç

**پەرچ** (ن) ٢ perç

بەرپەچ، بەرپەرچ، بەرهەڵست.

**پەرچ** (ن) ٣ perç

بیانوو، بیانگ، پەلپ.

**پەرچ** (ن) ٤ perç

پەرژین، پەرچان، پەرچین.

**پەرچ** (ن) ٥ perç

تەنگ وچەڵەمە.

**پەرچ** (ن) ٦ perç

بیشە، چخور، چەم، چەنگەڵ، دارستان، لێرەوار.

**پەرچ** (ن) ٧ perç

لق، پەل، پەل وپۆ، لق وپۆپ، (داودرەخت).

**پەرچاندنەوە** (كتپ) perçandinewe

بەرپەرچ دانەوە، بیانووگرتن، بیانوو پێ گرتن.

**پەرچاوە** (ئان) perçawe
پەرچڕاو، جووت بەقیەکراو.
**پەرچ دانەوە** (کتپ) perçdanewe 1
پەچ دانەوە.
**پەرچ دانەوە** (کتپ) perçdanewe 2
بڕین، پچڕین، قرتاندن.
**پەرچ دانەوە** (کتپ) perçdanewe 3
دروست کردن، جێبەجێ کردن.
**پەرچ دانەوە** (کتپ) perçdanewe 4
سەورەنگ دان، واتالیک دانەوە.
**پەرچقاندن** (کتپ،کی) perçiqandin(ki)
پەڵخاندن، هور هورکرن، وردو خاش کردن، هەرفاندن.
**پەرچەم** (ن) perçem 1
بەرچاوگە (ئەسپ).
**پەرچەم** (ن) perçem 2
مووی سەر (لەئاستی ناوچەوان خشت کرابێ بۆ جوانیی)، بەرچاوگە.
**پەرچەم کردن** (کتپ) perçemkirdin
پەرچەم هێشتنەوە، بەرچاوگەکردن.
**پەرچین گرتن** (کتپ) perçîn girtin
پەرژین کردن.
**پەرخاش** (ن) perxaš
ئاڵۆزیی، جەنگ.
**پەرخاندن** (کتن) perxandin
بەساڵداچوون، پیربوون، ژچاخاخۆ دەرباس بوون.
**پەرد** (ن) perd 1
پەرە، تەبەق، تەوەق (کاغەز)، لاپەڕەی کتێب.
**پەرد** (ن) perd 2
تا، تاکە، قل، یەک.
**پەرداغ** (ن) perdax 1
جامی شووشە، لیوان، پەرداغ.
**پەرداغ** (ئان) perdax 2
ساف کراو، لووس کراو.
**پەرداغ** (ئان) perdax 3
دروست، ڕێک وپێک.
**پەرداخدار** (ئان) perdaxdar
ب (بریسکەدار).
**پەرداغ کردن** (کتپ) perdax kirdin 1
ڕێک وپێک کردن، ساف کردن، لووس کردن.
**پەرداغ کردن** (کتپ) perdaxkirdin 2
ئامادە کردن.

**پەرژ** (ن) perdij
پەرژ، دەس پەرژ، دەس ڕەس، بوار، ماوە، مەودا، ووچان.
**پەردوو** (نک) perdü
هەڵاشی سەربان، زەل وقامیش وگەڵای سەردارە ڕا.
**پەردۆخیان** (کتن) perdoxyan
پەردۆخیاگ بوون، نیوە برژان، نیوە سووتان، هەڵ پرووزان.
**پەردە** (ن) perde 1
پۆش، پۆشە، پۆشەک، سار، سارە، چارچەف، چەرچەف، سەرچەف.
**پەردە** (ن) perde 2
ئاوازە، دەنگ.
**پەردە** (ن) perde 3
کریل، کلیلی مۆسیقا، کلیلی نۆتە، کلیلی ئاوازە.
**پەردە** (ن) perde 4
سار، سارە، پۆشە.
**پەردە** (ن) perde 5
بەش (شانۆگەریی).
**پەردە** (ن) perde 6
توێژ، توێژاڵ.
**پەردە** (ن) perde 7
توێ، توێک، پەرە.
**پەردەدادانەوە** (کتپ) perde dadanewe
سارەدادانەوە،پۆشە هێنانەخوار.
**پەردەدار** (ن) perdedar
پەردەدادەرەوە (شانۆ)، قاپیەوان، دەرگاوان.
**پەردە دڕان** (کتن) perde diṟan
ئاشکرابوون (نهێنی)، دەماودەم کەوتنەوە (شتی پەنهان).
**پەردەدڕین** (کتپ) perdedṟîn
ئاشکراکردن، پەردەدڕان، نهێنی دەرخستن، پەنهانی وەدەرخستن.
**پەردەک** (ئان) perdek 1
نهێنی، نادیار، شارراوە، داپۆشراو.
**پەردەک** (ن) perdek 2
١- مەتەڵ، مەتەڵە، مەتەڵۆک، مامک، قەوسەل، تشتانۆک.
٢- نەهامەتی، نارەحەتی، تەڵەزگە، چوڕتم.
**پەردەگیران** (کتپ) perde gêran
پەردە دانان.

پەردە لەسەر حەیانەمان (ئد) perde leser heya neman
بێ ئابروبوون،ئابروو چوون.
پەردە لەسەرلادان (ئد) perde leser ladan
١- پەردە دڕان، پەردە لەسەر هەڵماڵین، ڕوون کردنەوە، ئاشکراکردن (نهێنی)، پەردە لابردن.
٢-هەست ونەست دەرخستن.
پەردەی بەلەم (ن) perdey belem
بادەوان، چارۆکەی بەلەم.
پەردەی شانۆ (ن) perdy šano
سارەی شانۆ.
پەردەی کچێنی (ن) perdy kçênî
بن، پەردەی شەرم.
پەرژان (کتن) perjan
بوارە هەبوون، پەرژیان، پەرژیین، دەست گەیشتن (بۆ کردنی کارێک)، دەس گەیین، ماوە هەبوون.
پەرژین (ن) perjîn
پەرچین، پەرچان، تان، پەچ، تانۆک، تەلبەند، تەلبەنگ، پەرچ، تەیمان، چیلە، دیوار، حەسار، تانە، تامان، چەپەر، تەحبیر، تەژیر.
پەرژین کردن (کتپ) perjîn kirdin
تەلبەندکردن، تەیمان کردن، حەسارکردن.
پەرس (ن.بنچ) pers
پەرستن، کڕنووش.
پەرست (ن) perist
پەرستەر، کڕنووش بەر، کڕنووش بۆبەر.
پەرستن (کتپ) ١ peristin
بەندەگی کردن، بەندەیی کردن، بڕوایی بوون، کڕنووش بۆ بردن، فەرمانی خوداوەند بەجێ هێنان.
پەرستن (کتپ) ٢ peristin
زۆر حەزلێ کردن، زۆر خۆش ویستن.
پەرکەم (پز) perkem
ب (ئامۆ).
پەرگ (ن) ١ perg
١- گلۆلە، کلافە. ٢- بەن، پەرک، دەزگ، دەزوو.
پەرگ (ن) ٢ perg
پەلک، پەلک، گەڵ، گەڵا، گیلا.
پەرگال (نک) ١ pergal
ڕەوش، فەسال، کیسم.
پەرگال (ن) ٢ pergal
ڕێک وپێکیی، جوانیی، قشتیی.

پەرگال (ن) ٣ pergal
بریقە، تریفە، ڕەوش، ڕەونەق.
پەرگهان (ئان) perghan
جڤان، خۆش مەشرەف، ڕووخۆش، کۆمەڵیی، گوڵی کۆڕ.
پەرموون (کتن) ١ permün
جێی ئومێد بوون، پەرموونەوە، جێی هیوابوون.
پەرموون (کتن) ٢ permün
کۆڵێ کردن، لێ سڵەمینەوە، خۆلێ دوور
پەرموون (ن) ٣ permün
ئومێد، باوەڕ، بڕوا، هیمەت.
پەروا (ن) ١ perwa
بیم، باک.
پەروا (ن) ٢ perwa
ترس، غایلە، سام، ساو.
پەرواز (ن) perwaz
پەروان، کاری (فڕین، باڵ گرتن).
پەروازکردن (کتن) perwaz kirdin
فڕین، لەشەقەی باڵ دان، باڵ گرتن، بەرزبوونەوە.
پەروانە (ن.جچ) ١ perwane
(جۆرە پەپوولەیەکە ئەویندارى ڕووناکیی چرایە)، پەپوولە، پەرپەرێک.
پەروانە (ن) ٢ perwane
پەڕە، پەڕەکە.
پەروە (ن) perwe
خەڵات، پاداش،خاترانە
پەروەر (ن) perwer
ئەڤیندار، ئەویندار، دڵدار.
پەروەردگار (ن) perwerdgar
خوا، خودا، یەزدان، ئافەرێندە.
پەروەردگە (ن) perwerdge
ئامۆژگا، ئامۆژگە، بنکەی زانیاریی، فێرگە.
پەروەردە (ن) ١ perwerde
ئامۆژ، پەروەرش، ڕەنێو، فێر.
پەروەردە (ئان) ٢ perwerde
خۆکرد، دەست کرد.
پەروەردەبوون (کتن) perwerdebün
بەرهەم هاتن، هاتنەبەرهەم، وەبەرهاتن.
پەروەردەکردن (کتپ) ١ perwerde kirdin
بەرهەم هێنان، بەخێوکردن، هێنانەبەرهەم. حاواندنەوە، ڕاگرتن (گیانەوەر)، ڕەنێوهێنان. وەبەرهێنان.

**پەروەردەکردن** (کتپ) perwerde kirdin[2]

چاندن، خەملاندن، کشتوکاڵ کردن.

**پەروەردەکردن** (کتپ) perwerde kirdin[3]

بەخێوکردن، گەورەکردن، شیرپێدان، گۆش کردن.

**پەروەردەکردن** (کتپ) perwerde kirdin[4]

دەرس دادان، مەشق پێکردن، ئامۆژکردن، ڕەنێومینان، فێرکردن.

**پەروەری** (ن) perwerî

بەرهەم، بەر، بەرویێ، بەروبووم.

**پەروو** (ن) perü

ب (بەرتیلانە).

**پەرۆش** (ن)[1] peroš

تاو، چخار، کام.

**پەرۆش** (ن)[2] peroš

ئاواتیی، خوار، هەوەس.

**پەرۆش** (ئان)[3] peroš

بەمشوور، خەمخۆر، دەربەس.

**پەرۆش** (ن)[4] peroš

پەریشانیی، سەغلەتیی، پەژارە، ناڕەحەتیی، تاو، سو، خەفەت، سوێ، کز، کزە، کەسەر.

**پەرۆش** (ئان)[5] peroš

پەریشان، سەغلەت، دڵ گەرم، بەسۆز (بۆ مەبەستێکی دینیی یان ڕامیاریی).

**پەرۆشدار** (ئان) perošdar

ب (پڕ ئەسرین).

**پەروێز** (ئان)[1] perwêz

سەرکەوتوو، پیرۆز.

**پەروێز** (ن)[2] perwêz

سەرکەوت.

**پەرە** (ن)[1] pere

فرەیی، زۆریی، مشەیی.

**پەرە** (پر)[2] pere

بۆ، لەبەر، لەبەرخاتر.

**پەرەپێدان** (کتپ) pere pêdan

پەرەسەکردن، زۆرکردن، فرەکردن.

**پەرەسە** (ن)[1] perese

ئەندازە، ئەنازە، ئامیاری پیوان.

**پەرەسە** (ن)[2] perese

ڕادە.

**پەرەسەندن** (کتن) peresendin

پەرەبەستن، تەشەنەکردن، تەنینەوە، پەرەئەستاندن، زۆربوون،پەرەساندن، پەرەگرتن، داکەوتن (نەخۆشیی).

**پەرەسێن** (ئان) peresên

١- تەشەنەکەر، درم، پەرۆک.

٢-کوشندە، زەهراوی، ژەهراوی.

**پەرەکردن** (کتپ) perekirdin

شی کردنەوە، هەلاجی کردن (لۆکە، خوری...) بۆ ڕستن.

**پەریز** (ن)[1] perêz

حەشارگە.

**پەریز** (ن)[2] perêz

سەنگەر، کەندەک.

**پەریشان** (ئان)[1] perêšan

پەشێو، پەریش، پراش، پەژێو، ژولیاک، ژولیاو، شبرزە، شێواو، گرفتار، ئەوکار، ئاشفتە.

**پەریشان** (ئان)[2] perêšan

ئارەزوومەند (بۆیار)، تاسەمەند، سەوداسەر.

**پەریشان** (ئان)[3] perêšan

کۆست کەوتوو، کەساس، کەلاک، کەنەفت.

**پەریشان** (ئان)[4] perêšan

بێنابۆر، بێپەرگاڵ، بێ قەرار، نەخۆش، ئارام لەبەر براو، بێئارام، بێ هەدا، سرەوت لەبەربڕاو.

**پەریشان بوون** (کتن) perêšanbün

پەریش بوون، شپرزەبوون، شێوان، بێ ئارام بون.

**پەریشان کردن** (کتپ)[1] perêšan kirdin

شپرێو کردن، شلەژاندن، سەرلێ شێواندن.

**پەریشان کردن** (کتپ)[2] perêšan kirdin

شپرزەکردن، شێواندن، بێ ئارام کردن، بڕەش بردن، چەپەرەک کردن، کەنەفت کردن، کلۆلیی بەسەرهێنان.

**پەریشانی** (ن) perêšanî

بێ ئارامیی، پڕژێویی، پەریشیی، پەشێویی، شپرزەیی، کەنەفتیی، مەینەت، نەگبەتیی، شێواویی.

**پەری** (ن) perî

فریشتە، حۆری.

**پەریزاد** (ن) perîzad

پەریزا، پەری دۆت، پەری دوێت، حۆری زادە.

**پەڕ** (ن)[1] per̠

لا، تەنیشت، قەراغ، کەنار، سنوور.

**پەڕ** (ن)[2] per̠

کۆتایی، هەرەدوایی.

**پەڕ** (ن)[3] per̠

ڕۆخ، ڕەخ، کەنار.

**پەڕ (ن)** per ¹
باڵ، پەڕی، تووکی پەلەوەر.
**پەڕان (ن)** peran
تاپڕ، تفەنگی ڕاو، ساچمەزەن.
**پەڕاندن (کتپ)** perandin ¹
پەڕانن، شکاندن، پارچەپارچەکردن.
**پەڕاندن (کتپ)** perandin ²
بەجێهێشتن، بەسەرداتێپەڕبوون، بوواردن.
**پەڕاندن (کتپ)** perandin ³
پەی کردن، بوواردن، تەتەڵەکردن، هەڵەکردن.
**پەڕاندن (کتپ)** perandin ⁴
پەڕانن، بەسەرداکێشان، (نێر لەمێ)، چاکردن، کێشانن، سەرخستن (نێری ئاژەڵ لەمێ)، نێر لەمێ چاک کردن، لێ پەڕاندن.
**پەڕاندنەوە (کتپ)** perandinewe ¹
وەرگێران(کردن)، گۆڕینی، بەرچڤەکرن.
**پەڕاندنەوە (کتپ)** perandinewe ²
بیروڕا تێپەڕاندن.
**پەڕاندنەوە (کتپ)** perandinewe ³
تێ پەڕاندن (کەسێ بەسەرئاودا).
**پەڕاندنەوە (کتپ)** perandinewe ⁴
ڕزگارکدن، لەچورتم دەربازکردن، لەنارەحەتیی ڕزگار کردن، سەرفرازکردن.
**پەڕانن (کتپ)** peranin
باڵ دان، باڵ پێگرتن، پەرواز پێ کردن، خستنەباڵ، خستنەفڕین، فڕانن، پەرواز پێ کردن (فڕۆکە...).
**پەڕانەوە (کتن)** peranewe
پەڕینەوە، بەسەرداتێپەڕبوون، چوونە ئەوبەر (ئاو، شەقام..).
**پەڕبازێ (ن)** perbazî ¹
باڵەفڕێ، پەرواز، باڵەفرکێ.
**پەڕبازێ (ن)** perbazî ²
شۆخیی، ناز، عیشوە.
**پەڕبوون (کتن)** perbûn
کەنارەگیریی بوون، کەنارەگیریی گرتن، گۆشە گیربوون، گۆشە نشین بوون.
**پەڕپتاندن{پەلەوەر} (کتپ)**
perpitandin(pelewur)
ناوەرووت کردن، پەڕوباڵ لێ کردنەوە.
**پەڕپووت (ئان)** perpût
بێ هێز، پەتۆت، پواو، ڕزیو، کۆن، لەیەک ترازاو، لێک ترازاو، لێک بەربوو، عەمارە پۆ.

**پەڕپووت بوون (کتن)** perpûtbûn
بێ ناوەڕۆک بوون (ووتە).
**پەڕپەڕۆچکە (ن)** perperoçke
بەری ئاسمان.
**پەڕدان (کتپ)** perdan
ئاویشتن.
**پەڕکردن{باڵندە} (کتن)** perkirdin(baline)
پەڕ دەرکردن، پەڕوباڵ دەرکردن، پەڕوباڵ هاتن.
**پەڕلە (ن)** perle
باس، گوتە، ووتە، بێژە.
**پەڕندە (ن)** perinde
باڵندە، پەراوو، پەرەوەر، پەڕەوەر، پەلەوەر، پەلەوەر، مەل، مر.
**پەڕنگە (ن)** peringe
بازگە، پەزگە، جێباز (پلووره).
**پەڕۆ (نک)** pero ¹
تەنراوی کۆن، شرە، کۆنە، تیلماسکی کۆن، (کۆنە) پارچە.
**پەڕۆ (ن)** pero ²
دایبیی، پەڕۆ وپاتاڵیی منداڵ پاک کردنەوە.
**پەڕۆک (ئان)** perok ¹
پەرەسێن.
**پەڕۆک (ن)** perok ²
کوتاڵ، چۆخ، پارچە، کاڵا.
**پەڕۆیەک لەمن دادرە (ئد)**
peroyek le min dadire
چاوێلەمن بکە، منیش لەژێر هەمان ناخۆشیدام (بۆ ئامۆژگاری).
**پەروازکردن (کتن)** perwazkirdin
باڵ گرتن.
**پەڕوباڵ (نک)** perwbal
پەڵ وپۆ.
**پەڕوباڵ دەرکەوتن (ئد)** perwbal derkewtin ¹
بەخودا هاتن، کەوتنەفڕین، گەورەبوون، پەڕوباڵ دەرکردن.
**پەڕوباڵ دەرکەوتن (ئد)** ²
perwbal derkewtin
لەکاردا سەرکەوتن، بەختەوەربوون، بژهاتن.
**پەڕوباڵ هاتن (کتن)** perwbal hatin
باڵەفڕەبوون، کەچەڵە بوون، گەیشتنە سەرەتای باڵ گرتن (بێچووەمەل).

**پەڕوباڵ ووشك (ند)** peṟwbaḻ wušk
بێسایە، بێکەلک،
کەلک بۆ کەس نەبوو (کەسێ)، بێ ساکات.

**پەڕوباڵ وەرین (ند)** peṟwbaḻ werîn
١- مەڑاربوون،
مەڑارکەوتن. ٢- بێ دەسەلات بوون.
٣- بەساڵداچوون، پیربوون.
٤- پەک کەوتن، داکەوتن، عەمەل جەندەبوون.
٥- جوانیی بۆنەمان.

**پەڕوو (ن)** peṟü ١
ئەنتیکە، دانسقە، شتی هونەریی.

**پەڕوو (ن)** peṟü ٢
شتێ کەببەخشرێ، کالای بەخشندەیی.

**پەڕە (ن)** peṟe ١
پەروانە.

**پەڕە (ن)** peṟe ٢
گەلا.

**پەڕە (ن)** peṟe ٣
تەبەقی کاغەز، پەرو، پەلە، بەرگ.

**پەڕە (ن)** peṟe ٤
پەرەکەی ماسی، نینجە، کەوانەی ریشەدار.

**پەڕە (ن)** peṟe ٥
توێی کاغەز، توو.

**پەڕە (ن)** peṟe ٦
لا، ڕوو، ڕووکاری دەرەوە.

**پەڕە (ن)** peṟe ٧
پەلە، دامێن، داوێن، داینە، دامان.

**پەڕە پەڕە (ئان)** peṟe peṟe
توێ توێ.

**پەڕە پەڕە کردن (کتپ)** peṟe peṟe kirdin
لاپەڕە هەڵدانەوە.

**پەڕەسێلکە (ن.م)** peṟesêlke
پەرەسیلنکە.

**پەڕەکە (ن)** peṟeke
پەراسوو.

**پەڕەکەر (ن.ئان)** peṟeker
هەلاج.

**پەڕەکەی ئاش (ن)** peṟekey aš
پەرەی ئاسیاو.

**پەڕەوازە (ئان)** peṟewaze
ئاوارە، دوورکەوتە، دەربەدەر، لانەوان، عەودال.

**پەڕەوازە{بوو} (ئان)** peṟewaze(bü)
باڵەفرە(بوو)، کەچەڵ، پەڕوباڵ دەرکردوو، پەڕوباڵ گرتوو.

**پەڕەوازەبوون (کتن)** peṟewazebün ١
ئاوارەبوون، دوورکەوتنەوە،
دەربەدەربوون، لانەوازبوون، عەودال بوون.

**پەڕەوازەبوون (کتن)** peṟewazebün ٢
باڵەفرەبوون، کەوتنەفڕین، فێرە فڕین بوون (باڵندە).

**پەڕەوازەکردن (کتپ)** peṟewaze kirdin
فێرە فڕین کردن،
فێری فڕین کردن، خستنەباڵ.

**پەڕەوازەکردن (کتپ)** peṟewaze kirdin
ئاوارەکردن، دوورخستنەوە، دەربەدەرکردن، لانەواز کردن.

**پەڕ هەڵ وەرین (کتن.کتپ)** peṟe helwerîn
پەڕ فڕێدان، پەڕ وەرین.

**پەڕین (کتن)** peṟîn
هەڵبزرکان (ڕەنگ)، ڕەنگ پەڕین، زەرد هەڵگەڕان.

**پەڕین (کتن)** peṟîn ١
لاچوون، لەسەر لاچوون، لەسەرنەمان، لەجێی خۆنەمان.

**پەڕین (کتن)** peṟîn ٢
بڕان، بڕیان، پروسقیان.

**پەڕین (کتن)** peṟîn ٣
ئاوابوون، نیشتن.

**پەڕین (کتن)** peṟîn ٤
چوونە پشت، سواربوون، نیشتن، هەلاتن (نێر لەمێ).

**پەڕین (کتن)** peṟîn ٥
باز بردن، تڕازان، دەرچوون (شت لەجێی خۆی).
لەجێی خۆ دەرچوون، لاچوون، لێ بوونەوە.

**پەڕین (کتن)** peṟîn ٦
لەگۆچوون (ئەندامی لەش بەهۆی سەرماوە).
سڕبوون، تەزین.

**پەڕین (کتن)** peṟîn ٧
باڵ گرتن، پەرواز کردن، ڕفین، فڕین.

**پەڕینە کۆڵ (کتن)** peṟîne koḻ
سواربوون، چوونە کۆڵ.

**پەڕینەوە (کتن)** peṟînewe ١
چوونە ئەو بەرئاو،
لەئاو پەڕینەوە، لەڕووباردان.

**پەڕینەوە** (کتن) ٢ perînewe
پەڕانەوە.

**پەڕینەوە** (کتن) ٣ perînewe
لەچوورتم ڕزگاربوون، سەرفرازبوون، دەربازبوون.

**پەڕینەوە** (کتن) ٤ perînewe
بووردن، تێپەڕبوون، ڕۆیشتن، لێتێپەڕبوون.

**پەز** (ن،کی) ١ pez(ki)
پەس، مەڕ، مێ.

**پەز** (ن،کی) ٢ pez(ki)
دەوڵەت، ران (بزن، مەڕ...)، مەڕومالات.

**پەزان** (ن) pezan
کاری چێشت لێنان.

**پەزیزانک** (ن) pezîzank
جیقلدان، جیقلدانە، چیکلدان، چیکلدانە.

**پەژ** (نک) pej
لق وپۆپ، هەژکە وپەژکە، هەژکێ وپەژکێ.

**پەژارە** (ن) ١ pejare
ئەنۆ، پۆگە، داخ، پەرۆش، بار، تاو، خەفەت، خەم، زویریی، غەم، سوو، سوێ، کەسەر، ناهەمواریی، دڵمایی، کزە، مەینەت، ناخۆشیی، مەینەتیی، زووخاو، نەهامەتیی، دەردی سەریی.

**پەژارە** (ن) ٢ pejare
بیر، هۆش، یاد.

**پەژارەدار** (ئان) pejaredar
خەفەتبار، خەمبار، غەمبار، زویر.

**پەژقین** (کتن،کی) pejqîn(ki)
پارچە پارچەبوون، شکان.

**پەژک** (ن) pejik
چاوگە، چاووکێ، دەستە چیلە.

**پەژم** (ن) pejim
پەشم، خوریی.

**پەژمردە** (ئان) pejimirde
بێکەیف، پەلمژیاکێ، پەژموردە، ژاکاو، ژاکیاکێ، سیس.

**پەژمردە** (ئان) pejimirde
سیس، کز، کزۆلکە، کزۆلە.

**پەژیراندن** (کتپ) pejîrandin
دڵ پێوەبوون، پەسەندکردن، ویستن.

**پەس** (ن) ١ pes
باختکێ، دزراو.

**پەس** (ئان) ٢ pes
بێناوە، بووچک، بچووک (مرۆڤ)، ریوەڵە.

**پەسا** (ئان) pesa
قۆرخ، زەوت کراو، داگیرکراو، دەست بەسەرداگیراو.

**پەساپۆرت** (ن) pesaport
پاس، پاسپۆرت، گوزەرنامە، لایسز.

**پەساردن** (کتپ) pesardin
هەڵپەساردن، پاڵپێوەدان، پاڵ ویدن، پساردن.

**پەساکردن** (کتپ) ١ pesakirdin
قۆرخ کردن، زەوت کردن، داگیرکردن، دەست بەسەردا گرتن.

**پەساکردن** (کتپ) ٢ pesakirdin
خووساندن، تەڕکردن، شێدارکردن، تێرئاوکردن.

**پەسپۆر** {ئافرەت} (ئان) pespor(afret)
زۆر دوو،چەنەباز، زۆربلێ، زۆر دوو، پەسپور.

**پەسپەندە** (ئان) pespende
بوودەڵە، بێبەها، بێناو، بێ نرخ، کەم بەها(مرۆڤ).

**پەست** (ئان) ١ pest
ناکەس، نزم، بێبەها، بێمایە، بێ نرخ (مرۆڤ)، پایەنزم.

**پەست** (ئان) ٢ pest
پەس، خەمبار، خەمناک، دڵ تەنگێ، زویر، غەمبار، غەمگین، غەمناک.

**پەست** (ئان) ٣ pest
چاڵ، داکەوتوو، کەفتکێ، کەوتوو، کەوتە، نیشتوو، نیشتە.

**پەست** (ئان) ٤ pest
تەنگێ بەر.

**پەست** (ئان) ٥ pest
بێکەیف، جارس، وەڕز، وەرس، هەراسان، بێزار، ماندوو، هیلاک.

**پەستاپەستا** (ئاک، ئان) pesta pesta
بەردەوام، بێپسانەوە، پەیتاپەیتا، یەکێ لەسەریەکێ، لێکدالێکدا.

**پەستانەوە** (کتپ) ١ pestanewe
تێئاخاندن، تێئاخانیین، داگرتنەوە، ئاو ئاخن کردن.

**پەستانەوە**(کتپ) ٢ pestanewe
کوتانەوە، لەیەکێ توندکردن (شتی فشۆل).

**پەستانەوە** (کتپ) ٣ pestanewe
پەستاندنەوە، کوتانەوە، لەیەکێ توندکردن، پەستاندن، پەستاوتن، پەستن، پەستنەوە.

**پەست بوون** (کتن) pestbûn
بێزاربوون، تەوەلابوون، خەمناک بوون، دڵ تەنگ بوون، دڵگیربوون، زویربوون، لالووت بوون.

**پەستراو** (ئان) pestiraw
پەستراوە، کوتراوە، لەیەک توندکراو (شت).

**پەست کردن** (کتپ) pest kirdin ١
بێزارکردن، بۆڵۆکردن، دڵگیر کردن، زویرکردن، هەراسان کردن.

**پەست کردن** (کتپ) pest kirdin ٢
زویر کردن، دڵ ئێشاندن، دڵگیرکردن، تووڕەکردن، تیوەژەندن، ڕق هەڵساندن، ڕق هەستاندن.

**پەستنەوە** (کتپ) pestinewe
پەستانەوە.

**پەستوو** (ن) pestû
پاڵەپەستۆ، پەسیو، تەوژم، هێرش، ڕێز.

**پەستی** (ن) pestî ١
نزمی، ناکەسی.

**پەستی** (ن) pestî ٢
چالاکی، داگفتەگی، داکەوتنی، داکەوتووی.

**پەستی** (ن) pestî ٣
خەمباری، خەمناکی، دڵ تەنگی، زویری، غەمباری، غەمناکی، خەفەتباری.

**پەسخە** (ن) pesxe
لاسایی، دەمەلاسکێ، چاولێ کەریی.

**پەسخە لێ کردن** (کتپ) pesxe lê kirdin
لاسایی کردنەوە، دەمەلاسکێ کردن، چاولێ کردن.

**پەسخەلی** (ئان) pesxelî
لاسایی کەرەوە، هەنەکار، هەنەکچیی، هەنەکۆ.

**پەسمەندە** (نک) pesmend
١- پەسمەنە، بەسەریەکدا کەوتوو (شت)، ماوەوە (شت).
٢- بەرماوە، پاشخوان، پاشخوانە، پاشمەنە.

**پەسن** (ن) pesin
ستایش، ستایشت، پەسن، تاریف.

**پەسەند** (ن) pesend ١
بەنرخ ، پربەها، گران، گران بەها، نرخدار، هێژا.

**پەسەند** (ئان) pesend ٢
باش، بەجێ، پەسەن، خۆش، پەسن، پەسند، پەسەنگ، چاک، گوزیدە، هەڵبژاردە، هەڵبژێرراو، وەجێ.

**پەسەندکردن** (کتن،کتپ) pesend kirdin ١
بەرداربوون، قایل بوون،گەیشتنەهەمان ئاکام.

**پەسەندکردن**(کتپ) pesendkirdin ٢
پەسن کردن، پەسندکردن، پەسەن کردن، پەسەنگ کردن، هەڵبژاردن، بەباش (چاک) زانیین، ستایش کردن، پەسن دان، وەخاس باس کردن.

**پەسەندکردن**(کتپ) pesendkirdin ٣
خۆش هاتن لێ کردن، پێشوازیی کردن.

**پەسیو** (ئان) pesîw ١
ئاوا، نەدیو.

**پەسیو** (پز) pesîw ٢
هەلامەت.

**پەسیو** (ن) pesîw ٣
پەنا، قووژبن، حەشارگە، قوولکە.

**پەسیوگرتن** (کتن) pesîw girtin
هەلامەت گرتن.

**پەشتەماڵ** (ن) peštemal
پێش کۆشی گەرماو، بەرکۆش.

**پەشتەماڵ** (ن) peštemal
خاولی.

**پەشک** (ن) pešk
فڕ، قوم، لرف.

**پەشم** (ن) pešim
ئاخاوتنی پڕوپووچ، ووتەی بێبەها، ئاخاوتنی بێ نرخ.

**پەشمین** (ئان) pešimîn
پەشمینە، پەژمین، لەخوریی دروست کراو.

**پەشۆش** (ئان) pešoš ١
خاو، خاووخلیسک، خاو، خاف، سست، شل، گەوشەک، شل وشیواو، پەشووش، خاو وخلیچک، مردەلۆخە.

**پەشۆش** (ئان) pešoš ٢
پەشووش، فش، فشەل، فشۆل، نەرم، نەرمەلان، مردەلۆخە.

**پەشۆکان** (کتن) pešokan
تێکچوون، شپرزەبوون، شپرزیان، پەشۆکیان، سەرلێ شیوان، شلەژان، ئالۆزان، حەپەسان، پەشێوان، سەرسام بوون، واق وڕمان، پەشێویان، پەکەربوون.

**پەشۆکاندن** (کتپ) pešokandin
تێکدان، پەکەرکردن، شپرزەکردن، شلەژاندن، پەشۆکاندن، سەرلێ شیواندن، ئالۆزاندن.

**پەشۆکاو** (ئان) pešokaw
ئالۆزاو، ئاشفتە، شلەژاو، سەرلێ شیواو، شیواو، حەپەساو، ئالۆز، سەرسام، واق وڕماو، پەشێو،

پەشیواو، پەکەر، پەریش، پەریشان، پەژیو، سەرلێ تیکچوو، ئەبلەق، ئاگا لەخۆ نەماو.

**پەشیو** (ئان) pešêw

پەشۆکاو.

**پەشیوی** (ن) pešêwî

پەژیوی، ئالۆزی، ئاشفتەیی، سەرسامی، سەرلێ شیواوی، شپرزەیی، شلەژاوی.

**پەشیمان** (ئان) pešîman

پاشگەز.

**پەشیمان بوونەوە** (کتن) pešîman bünewe

پاشگەزبوونەوە.

**پەشیمان کردنەوە** (کتپ) pešîan kirdinewe

پاشەکشەپێ کردن،

پاشگەزکردنەوە، کشاندنەوە، باپێ دانەوە.

**پەشیمانی** (ن) pešîanî

پاشگەزیی.

**پەشیمانیی گوورگ مەرگە** (پن)

pešîanî gurg merge

تۆبەی گوورگ مەرگە، پیاوی ئالەبار لەبەد ڕەوشتیی خۆی پاشگەزنابیتەوە، مرۆڤی بەد هەرگیزجلی بروانی یە.

**پەڤ چوون** (کتن.کی) pevçün(ki)

بەگژ یەکداچوون، دەست دانەیەخەی یەکتر.

**پەڤرە** (ئاک.کی) pevre(ki)

بەیەکەوە، پیکرا، پیکڤە، پیکەوە، تەڤدە، دگەل هەڤ، ڤیکرە، لەگەل یەک، ویکرا، دەس لەناودەست، شان بەشان.

**پەقرەج** (ن) peqrec

سەتل، ئاڤدانک، بیدۆش، دۆلچە، دولکە.

**پەک** (ن) pek ١

ئاتاجیی، بێ دەستەلاتیی، دەستوسانیی.

**پەک** (ن) pek ٢

تاکۆز، تەگەرە، قۆرت، کۆسپ، چقل.

**پەک** (ن.کل) pek(kl) ٣

توانایی، ووزە، هێز.

**پەک** (ئان) pek ٤

پڕ لەهەوەس، پڕ هەوەس، لەسەرپێ (بۆ سەرجلی).

**پەکا** (نسپ) pek ٥

ئیش!، ئەرک!، ئەکێ!، پەککو، دەک!، هەک!.

**پەک خستن** (کتپ) pekxistin

دەستەوسان کردن، لەکارخستن، دواخستن، بەرگریی کردن، ژبەر ڤەکرن، هێز لەبەر بڕیین.

**پەک کەڤتن** (کتن) pek keftin

ب (پەک کەوتن).

**پەک کەوتن** (کتن) pek kewtin

پەک کەفتن، دامان، دۆش دامان، لەکارکەوتن، دەستەو سان بوون، داماوبوون.

**پەک کەوتن لەسەر** (ئد) pek kewtin leser

پێدوایستیی پێبوون،

ماتەل بوون لەسەر(شتێ).

**پەک کەوتوو** (ئان) pek kewtü ١

لێکەوتوو، نەبوو، هەژار.

**پەک کەوتوو** (ئان) pek kewtü ٢

ب (پەک کەوتە).

**پەک کەوتە** (ئان) pek kewte ١

پەک کەفتگ، بارکەوتوو، پەک کەوتوو، بەدبەخت، داماو، دەستەوسان، بێ بەخت، چارەڕەش، بارکەوتە.

**پەک کەوتە** (ئان) pek kewte ٢

پیر، تیک شکاو، عەمەل مەندە، لێ کەوتە، عەمەل مەنگە، بەساڵداچوو.

**پەگر** (نک) pegir

تلپە، پاشماوە، پاشەڕۆک.

**پەل** (ن) pel ١

قۆل.

**پەل** (ن) pel ٢

لق.

**پەل** (ن) pel ٣

باسکی چیا.

**پەل** (ن) pel ٤

پارچە.

**پەل** (ن) pel ٥

ئازا، ئەندام، ئەننام، ئەنام، گیان (قاچ، دەست..).

**پەل** (ن) pel ٦

ڕوو (پەڕەکاغەز)، پەڕە، لاپەڕە.

**پەل** (ن) pel ٧

دۆل، نیوان، دووشاخ، نیوان دووچیا، شیوەدەرە، چەم، گەروو، گومۆر، کەریی، قەد، دۆب، ئەقەب، خانۆک، گەلیی.

**پەل** (ئان) pel ٨

بلاو، فراوان، گوشاد، دەم والا(دەفر)، ڤالا، والا.

**پەل** (ن.س) pel ٩

دەستە (جەنگاوەر)، کۆمەلی، دە - دوانزە

شەرکەر، توانزە جەنگاوەر.

**پەلاتیقە** (ن) pelatîqe ١

١- تەقەلا، کۆشش، هەوڵ، چەرخە.

٢- بەریەرەکانی، بەرامبەری

**پەلاتیقە** (نک) pelatîqe ٢

رامیاریی، زانستی رامیاریی، کاروباری رامیاریی.

**پەلاس** (ن،کل) pelas(kl)

١- تاریکی، شەوەزەنگ، دەیجوور.

٢- خەمناکی، پەژارە، خەفەت، دڵ تەنگی.

**پەلامار** (ن) pelamar

شاتاڵ، شاتاوڵ، شلنگ، ماویژە، هەڵپە، هەمەت، هێرش، ئابلووقە، شاڵاو، گەمارۆ.

**پەلاماردان** (کتپ) pelamardan ١

خۆهاویشتن (بۆکار...)، هەڵپەکردن.

**پەلاماردان** (کتپ) pelamardan ٢

پەلاماربردن، هێرش بردن، هێرش بردنەسەر، هێرش کردنەسەر، هەڵمەت بردنەسەر، هەڵمەت بردن، هەڵمەت بۆ بردن، هەڵمەت دان، شاتاڵ دان، شاساوڵ بۆ بردن، شلبنگ دان، بەگژداچوون، بەگژداپەڕین، بەگژداهاتن، دەگژڕاچوون.

**پەل پەل** (ئاک) pel pel ١

بەش بەش، تیکەتیکە، تۆزە تۆزە، کوت کوت.

**پەل پەل** (ئان) pel pel ٢

پارچەپارچە، پارەپارە، تیکەتیکە، کوت کوت، کەرت کەرت، لەت لەت، ونجڕ ونجڕ.

**پەل پەل کردن**(کتپ) pel pel kirdin

پارچەپارچەکردن،

پارەپارەکردن، تیکەتیکەکردن، کوت کوت کردن، کەرت کەرت کردن، لەت وپەت کردن.

**پەلشاندن** (کتپ،کی) pelšandin(ki)

رماندن، رووخاندن، ژەهەف چراندن، تیک وپەکان دان، ژەهەف خستن، تیکدان، ویران کردن، کاول کردن، ویرین، هەرفاندن، خاپوور کردن.

**پەلک** (ن) pelk ١

گەلا.

**پەلک** (ن) pelk ٢

لق.

**پەلکدار** (ن) pelkdar

١- دروەوشی نەخش هەلکەندن، نەخش کیش.

٢- نەخش هەلکەندن، نەخش کیش (مرۆڤ).

**پەل کراو** (ئان) pelkiraw

براو، قەڵەم کراو (داروبرەخت).

**پەل کردن** (کتپ) pelkirdin

پارەکردن، پەی کردن، هەڵپاچیین، بڕیین، داهێنان (درەخت)، قەل کردن، کەل کردن، داتاشیین، قەڵەم کردن، کورت کردنەوە، کەم کردنەوە، لق وپۆپ کردن (بڕیین یان لێ کردنەوە)، پەی کردن، داهێنانەخوار، پەل و وەچ کردن، پەل وپۆپ بڕیین.

**پەل کوتان** (کتن) pelkutan ١

دەست کوتان، پەل هاویشتن (وەک لەتاریکیدا)، بەکویرانە پەل کوتان، هەنگاوی کویرانە هەڵنان.

**پەل کوتان** (کتن) pelkutan ٢

رەنج دان، هەوڵ دان.

**پەل کوتان** (کتن) pelkutan ٣

پەل هاویشتن، تەرزهاویشتن

**پەلکە** (ن) pelke

پرچ، پرچی هۆنراوە، پەلک، کەزیی.

**پەلکە رەنگینە** (ن) pelke r̲engîne

کۆلکە زێرینە.

**پەل گرتن** (کتپ) pel girtin

دەست دانەپەل، پشت گرتن، یاریدەدان، یارمەتیی دان، زیارەکردن، هاریی کردن، هاریکاریی کردن.

**پەل وپۆ** (نک) pelwpo ١

ئازا، ئەندامی لەش، دەست وقاچ، چوارپەل.

**پەل وپۆ** (ن) pel w po ٢

لق وپۆپ، لک.

**پەل وپۆ** (نک) pelwpo ٢

بەرویال.

**پەل وپۆ** (نک) pelwpo ٣

نەوە، وەجاخ ، وەچە، پەلوەچ، پەل، وەچ، زاروڵە.

**پەل وپۆ** (ن) pelwpo ٤

توانایی، ووزە، هێز (بۆ جێبەجێ کردنی هەرچ شتێ).

**پەل وپۆپ** (نک) pelwpop

گەلا وگوڵ.

**پەل وپۆ دەرکردن** (ند) pelwpo derkirdin

١- نەوە لێ کەوتنەوە، وەجاخ روون بوون، وەچە خستنەوە، پەل وەچ کردن، پەلوەچ کردن.

٢- بەخۆدا هاتن، پێ گەیشتن (کەسێ).

**پەل وپۆ کردن** (کتپ) pelwpo kirdin ١

هەوڵ وکۆشش دان.

**پەل وپۆ کردن**(کتپ) kirdin ٢

پەل کردن.

**پەلوەچ** (ن،کل) ١ pelweç(kl)
چرۆ، گۆپکە.
**پەلوەچ** (ن.) ٢ pelweç
بەش، کۆتا.
**پەلوەچ کردن** (کتن،کل) ١ pelweç kirdin(kl)
چرۆدەرکردن، چرۆکردن، گۆپکەکردن.
**پەلوەچ کردن** (ئد،کل) ٢ pelweçkirdin(kl)
ب (پەل وپۆ دەرکردن).
**پەلوەچ کردن** (کتپ) ٣ pelweç kirdin
ب (پەل کردن).
**پەل وەشاندن** (ئد) pel wešandin
ب (پەلەقاژەکردن).
**پەلە** (ئان) ١ pele
شل، شلەکە، شلەمەن.
**پەلە** (ن) ٢ pele
ب (پشکۆ).
**پەلە** (ن) ٣ pele
کاتی (لێ قەومان، ناچاریی، پێداویستیی)، گەرەکە، زووگوور.
**پەلە** (ن) ٤ pele
١- بار. ٢- تا، لایەک (لەبارێک).
**پەلە** (ن) ٥ pele
تالووکە، تالووکە، دەسواکرد، دەس وبرد، زوویی، دەست وبردیی، بلەزیی، خێرایی، لەز.
**پەلە** (ن) ٦ pele
ب (پەرە).
**پەلە پچوورکێ کردن** (کتن،کتپ)
pele piçürkê kirdin
ب(پەلە پەل کردن).
**پەلە پرووزکێ** (ن) pele prüzkê
١- کۆشش، هەوڵ، تەقەلا. ٢- ب (پەلە پەل).
**پەلە پرووزکێ کردن**(کتن) pele prüzkê kirdin
پەلەپروسکێ کردن،
پەلەپچورکێ کردن، پەلە پرووزەکردن، خۆ کوتان بۆ گەیشتن بەشتێ.
**پەلە پەل پێ کردن** (کتپ) ١
pele pel pê kirdin
پاڵ پێوەنان، لەزاندن، هێنانەتالووکە، پەلەلێ کردن.
**پەلە پەل کردن** (کتن،کتپ) ٢ pele pel kirdin
بەتالووکەبوون، بەتاوبوون، پەیت کرن، لەزین، تالووکەکردن، خێراکردن، خێرایی کردن، رابوون، پەلەپچرکێ کردن، پەلەپرووزێ کردن، پەلەپرووزکێ
کردن، هەوڵ دان بۆ خۆ ڕزگار کردن (لە شتێ).
**پەلە پیتکە** (ن) pele pîtke
بلتۆکە.
**پەلە پیتکە وەشاندن** (ئد)
pelepîtke wešandin
کاری ناشیرین کردن،
رەفتاری نابەجێ نواندن، کاری ناشرین کردن (بەرامبەرکەسێ).
**پەلە پیتکەی لێ بدەیت شەق لەبات** (ئد)
pelepîtkey lê bidat šeqebat
داخ لەدڵ بوون (بەرامبەرکەسێ)، زۆر پەست وتووڕە بوون (لەشتێ).
**پەلەتک** (ن.) peletik
پارچەگوریس، پەت، پەتک.
**پەلەخ** (ن.) pelex
پاوەن، پووشەڵان، پووشین.
**پەلەدان** (کتن،کتپ) peledan
پەلەکردن، خۆ ماندووکردن.
**پەلەزێ** (ن،رو) pelezê
سەوسەن، سۆسەن.
**پەلەزیقان** (نک) pelezîqan
خۆشی خۆشی، ئەوپەڕی کامەرانیی.
**پەلەفرتێ** (نک) pelefirtê
پەلەفرتە، پەلەفرتکێ، پەلەقاژە، پەلەقاژێ، پەلەکوتێ، پەلەکوتە، چنگەقرژێ، پەلەپرتکێ.
**پەلە فرتێ کردن** (ئد) pelefirtê kirdin
ب(پەلەقاژەکردن).
**پەلەقاژە** (ن) peleqaje
١- شاڵاو. ٢- تەقەلا، هەوڵ.
٣-لنگە فرتێ، تەلواسە.
**پەلەقاژەکردن** (ئد) ١ peleqaje kirdin
شێرزەبوون (بو تەواوکردنی ئیشێک)، هەوڵ دان بۆ تەواوکردنی هەرکارێک.
**پەلەقاژەکردن** (ئد) ٢ peleqaje kirdin
تووشی نارەحەتیی بوون، تێ کەوتن، لەرێی خۆلانەدان وبەرەوپێشەوە هەوڵ دان.
**پەلەقاژەکردن** (ئد) ٣ peleqaje kirdin
خۆ هاویشتن (بۆ کردنی کارێک).
**پەلەقاژەکردن** (کتن) ٤ peleqaje kirdin
پەل هاویشتن، دەست هەڵتەکاندن.
**پەلەقاژەکردن** (ئد) ٥ peleqaje kirdin
پەل بۆ کوتاندن، پەل کوتانن، پەلەکوتێ بۆ کرن.

پەلەقاژێ بۆ کردن، پەل بۆ وەشاندن، پەل وەشانن، چنگ بۆ قژ کردنەوە، شالاو بۆ بردن.

**پەلە قاژەی مردن کردن** (ند)
peleqajey mirdin kirdin
دەست بۆ هاویشتن،
مەول وتەقەلابۆ دان (دەسکەوت).

**پەلە قاژەی مردن کردن** (ند)
peleqajey mirdin kirdin
بەدبی کردن، بەهەرچوارلادا خراپەکردن، زیان بەم ویەوگەیاندن.

**پەل لەکراس هاتنە دەر** (ند)
pel le kirashatine der
نومێد نەمان، نائومێد بوون، هیوانەمان، بێ هیوابوون.

**پەلەک** (ن) pelek
جم وجۆل، جووڵە.

**پەلەکردن** (کتن) pelekirdin
خێراکردن، دەست وبردکردن، لەزیین، کات بەفیڕۆنەدان.

**پەلەکوتێ** (ن) pelekutê
پەلەفرتێ،پەلەقاژێ

**پەلەکوتێ کردن** (کتن) pelekutê kirdin
پەل هاویشتن، دەست کوتان، کوێرانە پەل کوتان.

**پەلەنگ** (ن،نا) peleng
ب (پلنگ).

**پەلەوور** (ن) pelewur
باڵندە، پەڕنە، پەلەوەر، مر، مەل.

**پەڵ** (ن) pel
بەرد، کەرسەک.

**پەڵاس** (ن) pelas
ژێرەخەر، ژێڕاخەر.

**پەڵپ** (ن) pelp
بیانگ، بینوو، بەهانە، رک، بیانگە، وورکە، هۆ، بڕوبیانوو، بەرپەرچ، بەربەن، بەرپێچ، بەرگل، جلەوگیری.

**پەڵپ بڕین** (کتپ) pelp birîn
بیانوو بۆ نەهێشتن،
بەرپێچ دانەوە، دەمکوت کردن.

**پەڵپ پێ گرتن** (کتن،کتپ) pelp pê girtin
بڕوبیانوو هێنانەوە، بۆنە گرتن، بەهانەگرتن، بیانوو گرتن، پەڵپ گرتن، پەڵپ لێ گرتن.

**پەڵپ گر** (ئان) pelpgir
بەهانەگر، بوونەگیر، بەبڕوبیانوو، بیانووگر، بەڵگەدۆز.

**پەڵپ گرتن** (کتپ) pelp giirtin
بیانوو گرتن، بیانووپێ گرتن.

**پەڵپ لێ گرتن** (کتپ) pelp lê girtin
ب (بڕوبیانوو پێ گرتن).

**پەڵتاف** (ن) peltaf
باز، قەڵەمباز.

**پەڵتاف دان** (کتن) peltafdan
بازدان، خۆ هاویشتن، قەڵەمبازدان.

**پەڵچم** (ن) pelçim
چوڵیی، گزرە (گەڵا، گیا).

**پەڵخ** (ئان) pelx ¹
تەمەڵ، لەش گران.

**پەڵخ** (ن) pelx ²
بەچکەبەراز، بیچوە وەراز.

**پەڵخ** (ن،ئان) pelx ³
بۆرە زەلام، زرتەبۆر.

**پەڵخورد** (نک) pelxurd
بروێش، نیمەکوت، نیوەکوتراو، نیوەهاڕراو (گەنم).

**پەڵخوردکردن** (کتپ،کتن) pelxurd kirdin
کیرەکیر کردن (بە دان)، دان لێک خستن.

**پەڵک** (ن،رو) pelk
١- پەڵک، خۆجەلی، شاتان. ٢- سوورەچنار.

**پەڵگرک** (نک) pelgirk
مەقاش، مقاش، پەنگر کێش، پەنگل کێش.

**پەڵگین** (کتن) pelgîn
بەرەوڕۆژئاوا ڕۆیشتن.

**پەڵوختە** (ن) ¹ peloxte
ب (ئاگرەخۆشە).

**پەڵوختە** (ئان) ² peloxte
ئاگربسێن، بسووت، گرسێن.

**پەڵوولە** (ن) ¹ pelüle
حەڵوای ئاردو دۆشاو یان هەنگوین.

**پەڵوولە** (ن) ² pelüle
پەلوو، ئاردخاف، ئارخاو، ئاسیدە.

**پەڵوولەش دەم دەسوتێنێ** (پن)
pelülešdem desütênê
تەنانەت مرۆڤی بودەڵەش دەستی خۆی دەهاوێژێ

**پەڵە** (ن) ¹ pelc
خاڵ، لەکە، نوختە، نیشانە.

پەلە (ن) ٢ pele
لەکەداری، نەنگیی، شەرم، شوورەیی، چەپکە، چەپەلیی.
پەلە (ن) ٣ pele
لەکە، پیسیی.
پەلە (ن) ٤ pele
پارچە(زەویی، شوێن).
پەلە پەلاوی (ئان) pele pelawî
خاڵ خالاوی، لەکاوی.
پەلە پەلە (ئان) pele pele
بەلەک، بەلەک بەلەک.
پەلیت (ن) ١ pelît
فەلیتە، چلیت، مرۆڤی هیچ وپووچ.
پەلیت (ئان) ٢ pelît
شر، شرو وڕ، هەلیت، شروپڕ.
پەم (ن) pem
مووشەدەمە، پەمپ.
پەم دان (کتپ) pemdan
فووتێ کردن، فوودان، پڕ لەفووکردن، هەواتێ کردن، دەمان.
پەمگین (ئان) pemgîn
لۆکەیی، نەرم، سپی.
پەموو (ن،رو) pemü
پەمبی، پەمگێ، پەمە، پەنبوو، لۆکە، پەمبوو.
پەمووجار (ن) pemücar
پەمووزار.
پەمەیی (ن،ئان) pemeyî
ئالی ڕووناکە، ئالگوون، سووری کاڵ، پەمبە.
پەنا (ن) ١ pena
پۆرگە.
پەنا (ن) ٢ pena
دژ، قەلا، قەلات، قەلادزە، قەلادزە، وەرز، سپێر.
پەنا (ن) ٣ pena
دالدە.
پەنابردن (کتن،کتپ) pena birdin
خۆ سایەخستن، خۆ حەشاردان، خۆشاردنەوە، نەدیو بوون، لەبەرچاو نەمان.
پەنابردنە بەر(کتن،کتپ) pena birdine ber
هانابردنەبەر، هاوار بۆ بردن، هانا هێنانەبەر.
پەنا بەری (ن) penaberî
دالدەیی، پەنایەندەیی، هانابەری.

پەنا پاسار (ن) penaberî
ب (پەناپەسیو).
پەنا پەسیو (ن) penapesêw
پەناپاسار، سووچ، قووژبن.
پەنادان (کتپ) penadan
دالدەدان، هانا پێدان، گرتنەخۆ.
پەناکردن (کتپ) penakirdin
پشت پێ بەستن، پەنا بردنەبەر، هاناکردن.
پەناگا (ن) penaga
١- پەناگە، دالدە. ٢- پەنا وپەسیو، چەپەکە.
پەناگر (ئان) penagir
گۆشەگیر، قولینچکگر، لەسووچ خزاو.
پەناگرتن (کتپ،کتن) ١ penagirtin
دانیشتن، گۆشەگیر بوون، نیشتن (بەتەنیا)، گۆشەگیریی کردن، قولنجک گرتن، خۆلە کۆمەل جیاکردنەوە، لەسووچ خزان، کونج گرتن.
پەناگرتن (کتن) ٢ penagirtin
ئاوابوون، نەدیوبوون (وەک ڕۆژ).
پەناگرتن (کتن) ٣ pena girtin
کەل گرتن.
پەناگیری (ن) penagirî
گۆشەگیری، تەنهایی.
پەنام (ن) penam
١-باس وخواسی {پاشمله، پاشەمله}. ٢-بوختان
پەنامگە (کتپ) penamge
پۆرگە.
پەناوپشت (ن) penaw pišt
پشت وپەنا، دالدە، دەرەدتان، دۆستی ڕاست، هاوڕێی گیانی بەگیانی.
پەناوپەسیو (ن) penawpesêw
پشت وپەسیر، پەناپاسار، شوێنی نهێنیی.
پەناهاوردن (کتن) pena hawurdin.
پەنابردن، پەنابردنەبەر، هانابردنەبەر.
پەناهێن (ن) pena hên
پەنابەر.
پەناهێنان (کتن،کتپ) pena hênan
پەنا بردنەبەر، هانابردن، هانا هێنان، داوای دالدە کردن، هانا بۆ بردن.
پەناهێنانە بەر (کتن) pena hênaneber
پەنابردنە بەر.
پەنجۆلە (ن) pencole
چەپۆلە (گیانەوەر).

**پەنجە** (ن) penje
ئەموست، ئەنگوست، بن، ترت، پەل، تبل، قامك، پیلك.

**پەنجە تێ گیرکردن** (ئد) penje tê gîr kirdin
دەست لێ گیرکردن،
دەست پێدا گەیشتن، وەدەست هێنان.

**پەنجەرە** (ن) penjere
پەنجەر، پیسترك، پاچە، پیجەرە، دەلاقە، رۆدە، ئاقدا، دوودەریی، كەلەبەر، رەوشەن، لەپ، رۆژنە.

**پەنجە شێر** (پز) penje şêr
شێرپەنجە.

**پەنجەی خۆ كوروشتن {كوروژتن}** (ئد)
penjey xo kuroştin (kurojtin)
لێوی خۆ كوروشتن:
١- زۆر تووڕەبوون، زۆر ڕق هەستان.
٢- سەرسامیی پیشان دان، سەرسوڕمان، سەرسام بوون.

**پەنجەی خۆ گەزتن** (ئد) penjey xo geztin
١-پشتی دەستی خۆ گەستن،
پەنجەی خۆ كوروشتن، پەنجە یان دەستی خۆ بەدەمدا كردن( بردن).
٢- پاشگەزبوونەوە، پەشیمان بوونەوە.
٣-كار ونهێنی دركاندن، نهێنی دركاندن، پەردەلەسەر نهێنی لابردن.

**پەنجەی دەست** (نك) penjey dest
١- پەنجە تووتە، پەنجەپچكۆلە، پەنجەپچووك، تلیاقەرەقوچكێ، تلیاقلیچكێ، كلكەپووتە، پیت، قجقجیلك.
٢- برا تووتەڵە، برای تووتە، براقیچ، تلیابابەلیچك.
٣- پەنجەی ناوەڕاست، تلیاناڤجار، بالابەرزە.
٤- پەنجەی شایەتمان، تلیادالاستۆكێ، دۆشاومژە.
٥- بەرانكێ، پەنجەكەڵە، تبلابەرانێ، تلیاگردین، تلیاگزری، قامكی گەورە، كەڵەبەرانكێ، كەڵەپەنجە، ئەسپێ كوژە.

**پەنجەی مریەم** (ن،ڕو) penjey miryem
بوغوردی كوردەواریی، چنگی مریەم.

**پەنج** (ن) penç
چنگی درندە، چەپۆلە، دەست، چەپۆك.

**پەنچك** (ن) pençik
پارچەی پچووك، پەترۆك.

**پەند** (ن) ١ pend
ئەتك، پەتك، هەتك.

**پەند** (ن) ٢ pend
ئامۆژگاریی، ئامۆژیاریی، مۆچ، مۆچیاریی.

**پەند** (ن) ٣ pend
پەنگ، تەڕن، داو، فێل، كەڵەك، كەتن، ئەتك، هەتك.

**پەند پێ دان** (كتپ) ١ pend pê dan
بەهەڵەدا بردن، خەجاڵەتیی بەسەرهێنان، لەڕێگەی ڕاست هێنانە دەر، مەخسەرە بەسەر هێنان.

**پەند پێ دان** (كتپ) ٢ pend pê dan
تەڕن پێ كردن،تەڕن كردن بەكەسێ، پەنگێ پێ دان، داوبۆنانەوە، كەتن پێ كردن.

**پەند پێ دان** (كتپ) ٣ pend pê dan
بەپەنگێ كردن، هەیابردن، ڕیسواكردن، سووكیی بەسەرهێنان.

**پەند دادان** (كتپ) pend dadan
ئامۆژگاریی كردن، ئامۆژیاریی كردن، مۆچیاریی كردن.

**پەندوباو** (ن) pendwbaw
ئاخاوتنی ناڕاست (دژی كەسێ)، بوختان، بۆختان، بۆختوم، درۆ ودەلەسە، ووتەی ناڕەوا.

**پەندەمووس** (ن) pendemüs
پەنگەمووس، خۆش خەو، خەوخۆش، خەولەمست.

**پەندەمووس كردن** (كتن) pendemüs kirdin
پەنگڵەمێش كردن، پەنگەمووس كردن، قنگە خەوكردن (لەڕووی سووكییەوە بەكەسێ دەوترێ) نووستن، ترشان (لەناوجێگەدا).

**پەندی بەرینان** (نك) pendî berînan
پەندی پێشینان.

**پەندی پێشینان** (نك) pendî pêşînan
پەندوباو، پەندوباو، پەندی بەرینان، ووتەی پێشینان: (بێژەیەكی كورتی سەرزمانە كەبەشێوەیەكی سەرنج ڕاكێش هەندێ ڕاستیی ئاشكرا ڕاڤەدەكات یان چەند تاقی كردنەوەیەكی ژیان بەسانایی وسووكەڵە دەخاتە ڕوو).

**پەندیی** (ئان) pendî
ئاشكرا، ئەشكرا، ئەشكەرا، خویا، دیار.

**پەنك {دەزوو}** (ن) ١ penk(dezü)
گلۆفە، كلافە.

**پەنك** (ن) ٢ penk
ریس، مووی ڕیسراو، بەنی بادراو.

**پەنكوور** (ئان،كل) penkür(kl)
پەنهان، شاراوە، نادیار.

**پەنگووربوون** (کتن،کل) penkürbün(kl)
پەنهان بوون.

**پەنگ** (ن) peng [1]
فیل.

**پەنگ** (ئان،ن) peng [2]
مەنگ، ئاوێ کەخوڕنەبێ، ئاوێ لەڕۆیشتندا سست بێ، ئاوی مەنگ و قووڵ.

**پەنگاو** (ن) pengaw
ئاوی پەنگ خواردوو، پۆنگاو، ئاڤپەنگ، بارانناو، گۆمی بارانناو، پۆنگ، ئاوی مەنگ (ئاوێ پەقی کردبێتەوە).

**پەنگ خواردنەوە** (کتن) [1] peng xwardinewe
پەق دانەوە (پیادەڕێ، ئۆتۆمبیل...).

**پەنگ خواردنەوە** (کتن) [2] peng xwardinewe
پونگ خواردنەوە،
پەنگەوە خواردن، گەڕانەوە پاش (ئاو..)، پەق دانەوە (ئاو...)، دەرنەچوون (ئاو لەبەرگیرانی بەریان).

**پەنگر کێش** (نک) pengir kêš
مقاش.

**پەنمان** (کتن،کی) peniman(ki)
ئاوسان.

**پەنماندن** (کتپ،کی) penimandin(ki)
ئاوساندن.

**پەنماو** (ئان) penimaw
باکردوو،ئاوساو.

**پەنمیان** (کتن) penimyan
ئاوسان.

**پەنمین** (کتن،کل) penimîn(kl)
ئاوسان.

**پەنهان** (ئان) penhan
نادیار، وون.

**پەنهان** (ئان) penhan
شارراوە، کەس پێ نەزان، نادیار، وون، بێپەی، پەی پێنەبەر، پۆشراو، ڕێ پێ نەبەر، گوم، بزر.

**پەنهان بوون** (کتن) penhanbün
شاررانەوە، وون بوون، پەنگووربوون.

**پەنهان کردن** (کتپ) penhan kirdin
شاردنەوە، گوم کردن، نەدیارکردن، وون کردن، بزرکردن، نەدرکاندن، وەشاردن، بەپەنهانی هێشتنەوە.

**پەنهانی** (ن) penhanî
نهێنی، ڕاز، سرت، سرتە.

**پەنیرە** (ن،رو) penîre
تۆلەکە.

**پەوکی** (ئپ،ئاک) pewkî
بۆیە، لەبەرئەوەی کە.....

**پەه!** (ئسپ) peh !
پەحا، پەح، پەها!، تەحا!.

**پەهن** (ئان،کی) pehin(ki)
پان.

**پەی** (ن،ئان) pey [1]
پاشەکەوت(پارە)، دەسکەوت، داهات.

**پەی** (ن) pey [2]
بارمتە، دیپۆزیت، دیپۆزیپۆ.

**پەی** (ن) pey [3]
قوولایی، قووڵیی، بنی ئاو.

**پەی** (ن) pey [4]
ڕێ، شوێن، جێ.

**پەی** (ن) pey [5]
(وورده) دەمار، ڕیشاڵی خوێن، بۆریی خوێن.

**پەی** (پر) pey ? [6]
بۆ؟ لەبەرچی؟، بۆچی؟.

**پەی** (ن) pey [7]
پشت، پشتەوە، پاش، دوا، دوما.

**پەی** (ن) pey [8]
دەوس، شوێنەوار، شوێن وجێگەپێ، جێپێ، شوێن پێ، شوێن هەڵگیریی.

**پەی** (ن) pey [9]
بن، بن وبێخ، بێخ، بنک.

**پەیا** (ن،ئان) peya [1]
ئامادە، پەیدا.

**پەیا** (ن) peya [2]
پیادە.

**پەیا** (ئان) peya [3]
ئاشکرا، دیار، وەدیار، پەیدا.

**پەیابوون** (کتن) [1] peyabün
پەیدابوون، ئامادەبوون، هاتن، دەرکەوتن خۆ دەرخستن.

**پەیابوون** (کتن) [2] peyabün
دابەزین، پیادەبوون، هاتنەخوار (لەسەر پشتی وولاخ).

**پەیاپەی** (ئان) peyapey
پەیتاپەیتا، پیاپێ، پەستاپەستا، پەی دەرپەی، یەک لەدوای یەک، یەک لەسەر یەک، گەنم گردیی، زوو زوو، بەردەوام، بێ پسانەوە.

**پەیاکردن** (کتپ) peyakirdin ١
پەیداکردن، دۆزینەوە، وەمل شتێکدا کەوتن.

**پەیاکردن** (کتپ) peyakirdin ٢
دابەزاندن(مرۆڤ)، هێنانەخوار، پیادەکردن، لەسەر زین هێنانەخوار.

**پەیام** (ن) peyam ١
پیام، مزگێن، مژدە، مزگێنیی.

**پەیام** (ن) peyam ٢
پەیخام، دەنگ وباس، نامە، دەنگ وباسی نێرراو.

**پەیامبەر** (ن) peyamber ١
پەیام هێنەر، پەیخامبەر، پەیغەمبەر، پێغەمبەر، پێغەمەر، نێرراوی خودا، رابەر وپێشەوای ئاینیی لەخواوە نێرراو بۆ ئادەمیزاد.

**پەیامبەر** (ن) peyamber ٢
پۆستەچیی، تەتەر، زیرەوان، شاتر، قاسید، نامەبەر، نێرراو، نامەهەڵگر.

**پەیام نێر** (ن) peyamnêr
نامەنێرەر (رۆژنامەگەریی).

**پەی بردن** (کتپ) peybirdin ١
ب (بنجۆریی کردن).

**پەی بردن** (ئد) peybirdin ٢
پەی پێبردن، رێ پێ بردن، زانیین، شتی شاراوە دۆزینەوە، سەر لێ دەرچوون، هەموو شتێ لێ زانیین.

**پەیت** (ئان) peyt ١
بەکار، زرنگ، زیرەک، لیهاتوو.

**پەیت** (ئان) peyt ٢
بەتاو، بەگوڕ، چاپک، چالاک، چوست، خۆشڕەو، خێرا، گورج.

**پەیتاپەیتا** (ئاک) peyta peyta
ب (پەیاپەی).

**پەیتووکە** (ئان) peytüke
چالاک، چوست، وریا، وتووووریا، خێرا.

**پەیجۆ** (ئان) peyco ١
جوست وجۆکەر، جستوجۆکەر، جموجۆڵکەر، هاتوو جۆکەر.

**پەیجۆ** (ن) peyco ٢
پشکنەر.

**پەیجۆ** (ن) peyco ٣
پەیجوو، پەیجووریی، جموجۆڵ، جوستوجۆ.

**پەیجۆر** (ن،ئان) peycor
ب (پەیجۆ).

**پەیجۆریی کردن** (کتپ) peycorî kirdin ١
پەیداکردن.

**پەیجۆریی کردن** (کتن) peycorî kirdin ٢
پەیجووریی کردن، جموجۆڵ کردن، جوستوجۆکردن.

**پەیخواز** (ن) peyxwaz
پشکنەر.

**پەیدا** (ئان) peyda
بەگیر، دەستگیر، دەست کەوت، دەکسەوتەنیی.

**پەیدابوون** (کتن) peyda bün ١
ئاشکرابوون، دەرکەوتن، وەدیار کەوتن، هەڵهاتن، سەردەرهێنان، دیار دان، دیاربوون.

**پەیدابوون** (کتن) peydabün ٢
بەگیر کەوتن، دەستگیر بوون، دەس کەوتن، دەست کەوتن، دەسگیربوون.

**پەیدابوون** (کتن) peydabün ٣
بەرپابوون، روودان، قەومان، هەڵکەوتن.

**پەیدابوون** (کتن) peydabün ٤
ئامادەبوون، رەخسان، گەیشتن، گەیشتنەجێ، هاتن.

**پەیدابوون** (کتن) peydabün ٥
زان، زایین، لەدایک بوون، هاتنەدنیاوە.

**پەیداکردن** (کتپ) peyda kirdin ١
ئافەریدە کردن، خوڵقاندن، لەنەبوو دروست کردن.

**پەیداکردن** (کتپ) peyda kirdin ٢
بەدیی هێنان، وەدی هێنان، دەردەست کردن، وەملدا کەوتن، دەرخستن، دەست خستن، وەدەست هێنان، بەگیر هێنان، بنجۆریی کردن، پەیجۆریی کردن.

**پەیداکردن** (کتپ) peyda kirdin ٣
بنگیریی کردن، دانان، دۆزینەوە، داهێنان، دروست کردن، دەرهانیین، دەرهاوردن، دەرهێنان، دیتنەوە.

**پەیداکردنەوە** (کتپ) peyda kirdinewe
دۆزینەوە،
دەست کەوتنەوە، دیتنەوە سەرلەنوێ.

**پەی دان** (کتپ) peydan ١
بارمتەدان.

**پەی دان** (کتن) peydan ٢
بواردن، رێدان (بۆ پەڕینەوە) {رووبار}.

**پەیرەو** (ن) peyr̲ew
چاولێکەر، لاسایی کەرەوە، وەدووکەوتە.
**پەیرەوکردن** (کتپ) ١ peyr̲ewkirdin
ب (پێ ڕاگەیاندن).
**پەیرەوکردن** (کتپ) ٢ peyr̲ewkirdin
ئامۆژگاریی کردن، پەیرەویی پێدان، ڕێ وشوێن پیشان دان، ئامۆژیاریی کردن.
**پەیرەوی کردن** (کتپ) peyr̲ew̲îkirdin
چاولێ کردن، لاسایی کردنەوە، لەسەر ڕێ وشوێنی کەسێ ڕۆیشتن (چوون)، وەک ئەو کردن، پێ لەشوێن پێی کەسێ خستن، چاولێکەریی کردن، چاو کردن.
**پەیرەوی وەرگرتن** (کتپ) peyr̲ewî wergirtin
ئامۆژگاری وەرگرتن، قسە وەرگرتن.
**پەیژە** (ن) peyje
پەینجە.
**پەیک** (ن) ١ peyk
مانگ (سەربەئەستێرەیەک).
**پەیک** (ن) ٢ peyk
نامەبەر، پەیا، پەیاک، تەتەر، قاسید، شاتر.
**پەیکار** (ن) ١ peykar
ئاژاوە، پشێویی، جەنگ، شەڕ.
**پەیکار** (ن) ٢ peykar
پەیکان.
**پەیکان** (ن) peykar
پەیکار، نووکی ڕم، نوکی تیر.
**پەی کردن** (کتپ) peykirdin
پەل وپۆ کردن.
**پەیکەر** (ن) peyker
ئابیدە، ڕواڵەت، کۆتەل (لەبەرد یان کان دروست کراو).
**پەیکەرتاش** (ن) peykertaš
ئابیدەکەر، کۆتەڵ تاش.
**پەیکەرتاشین** (کتپ) peykertašîn
کۆتەڵ دروست کردن، ڕواڵەت داتاشیین.
**پەیمان** (ن) peyman
بەڵێن، پەیمانە، پێمان، زوان، ژوان، شەرت، گفت، گرێبەند، هەرێ، بەڵێنیی، وادە.
**پەیمان بەجێ هێنان** (کتپ)
peyman becê hênan
بەڵێن جێ بەجێ کردن،
بەڵێن گەیاندنە ئەنجام، پەیمان جێ بەجێ کردن.

**پەیمان دان** (کتپ) peymandan
بەڵێن دان، ڕازیی بوون، گزاف دان، گفت دان، پەیمان بەستن.
**پەیماندەر** (ن) peymander
بەڵێندەر، گزافدەر، گفتدەر، لەخۆگر، ملدەر، وەخۆگر.
**پەیمان شکاندن** (کتپ) peyman šikandin
بەڵێن شکاندن، بەڵێن بەجێنەهێنان، بەڵێن نەبردنە سەر، زوان وەجێ نەهێنان.
**پەیمانە** (ن) ١ peymane
ئەیارە، پێوانە، جامی شت پێوان.
**پەیمانە** (ن) ٢ peymane
کاسە، تاس، جام، جامولکە، لیوان.
**پەیوەست** (ئان) ١ peywest
ئاشنا، ئاسیاو.
**پەیوەست** (ئان) ٢ peywest
پەیوەس، پێکەوەنووساو، پێوەنووساو.
**پەیوەست بوون** (کتن) peywest bûn
پێکەوەنووسان.
**پەیوەست کردن** (کتپ) peywest kirdin
پێوەبەستن، پێوەنووسان، پێوەلکاندن.
**پەیوەستی** (ن) ١ peywestî
پێوەلکاویی، نووساویی.
**پەیوەستی** (ن) ٢ peywestî
پەیوەندیی، پێوەندیی.
**پەیوەند** (ئان) peywend
ئاشنا، پەیوەست.
**پەیوەندکردن** (کتپ) ١ peywend kirdin
پێوەند کردن، پێکەوەبەستن، لێک گرێ دان.
**پەیوەندکردن** (کتپ) ٢ peywend kirdin
موتوربەرکردن (درەخت)، پترمەکرن.
**پەیوەندی** (ن) peywendî
بەین، پێوەندی، نێوان، هاوبەستی، پەیوەستی، ئاشنایی، دۆستایەتی، خزمایەتی، کەسایەتی.
**پەیوەندی لەگەڵ کەسێکدا پەیداکردن** (ند)
peywendî legel̲ kesêkda peyda kirdin
١- نێوان خۆش بوون. ٢- خۆش ویستن، دڵ پێوەبوون (بەکەسێکدا).
**پەی هەڵگرتن** (کتپ) pey hel̲girtin
پێ هەڵگرتن، شوێن پێ هەڵگرتن، بەبۆن شتێکەوە ڕۆیشتن.

**پیا(پیدا) (پ.ناک)** piya(pêda)
بەناودا.

**پیا(پیدا) بردن (کتپ)** piya(pêda) birdin
پیاکردن، تێچەقاندن، چەقاندن، خستنە ناو.

**پیا(پیدا) پەریک (ئان)** piya(pêda) perîk
پیدا پەڕیو، دیوانە، شێت، دین.

**پیا(پیدا) پەریگ (ئان)** piya(pêda) perîg
پیدا پەڕیو، تووشبوو،لێ پەڕیو (نەخۆشیی).

**پیا(پیدا) چزان (کتپ)** piya(pêda) çizan
سووتان، چزەلێ هەستان.

**پیا(پیدا) چزاندن (کتپ)** piya(pêda) çizandin
چزە لێ هەستاندن،
داخ کردن، سووتاندن، داخ پێوەنان.

**پیا (پیدا) چوون (کتن)** piya(pêda) çün
پیارۆیشتن، پیارۆیین، تێچەقیین،
چەقیان، چەقیین، چوونەناو، تێ خونجان.

**پیا(پیدا) چوونەوە (کتپ)**
piya(pêda) çünewe
جارێکی دی خوێندنەوە، دووبارە کردنەوە، دووپات کردنەوە، ووتنەوە (شت لەبەر یان لەنوسراودا)، بەسەرداچوونەوە، بەسەردا گەڕانەوە، بەسەردا ڕۆیشتنەوە، بەسەر کردنەوە، دووبارە خوێندنەوە، سەرلەنوێ ئازموون کردن، تەماشا کردنەوە، تاقی کردنەوە.

**پیا(پیدا) چەقاندن (کتپ)**
piya(pêda) çeqandin
پیداچەقاندن، چەقاندن بەشتێکدا.

**پیا(پیدا) چەقیین (کتپ)** piya(pêda) çeqîn
پیداچەقیین، چەقیین بەشتێکدا.

**پیا (پیدا) خشاندن (کتپ)** ١
piya (pêda) xišandin
بەسەرداتێ پەڕاندن، لێ خستن.

**پیا (پیدا) خشاندن (کتپ)** ٢
piya (pêda) xišandin
تەماشاکردن، لێ ووردبوونەوە، لێ نۆڕیین، چەوت وچیلەدان.

**پیا (پیدا) دان (کتپ)** ١ piya (pêda) dan
پیدادان، مالیین بەشتێکدا، پیدامالیین (بەنیازی ئەزیەت دان یان زەدەدار کردن).

**پیا (پیدا) دان (کتپ)** ٢ piya (pêda) dan
داپۆشیین، بان دان، بەسەرداداان، وەسەردا دان، بەسەردا بڵاوکردنەوە (پۆشە).

**پیادان (کتپ)** ٣ piydan
شەق تێ هەڵدان، لێدان.

**پیادان (کتپ)** ٤ piyadan
دزیین، گەندە دزیی کردن، شتی کەم بەهادزیین.

**پیادروون (کتپ)** piyadrün
پیدا دروون، شت دروون بەسەر شتێکی تردا.

**پیادە (ن)** ١ piyade
پاپیاگ، پاپیادە، پێ ڕۆ، پەیا، پێ کورە، نەسوار، پیادەڕۆ (سەرباز).

**پیادە (ن)** ٢ piyade
١- تەمەل، کەودەن.
٢- گەوج، نەزان، هیچ نەزان، ساویلکە، گەلحۆ.

**پیادەڕێ (ن)** piyaderê
تولەڕێ، سەڵتە ڕێ، لاڕێ، بارێکە ڕێ، ورچەڕێ، بزنەڕێ.

**پیادەیی (ن)** piyadeî
پیان، بەپێ ڕۆیشتن.

**پیادەیی (ن)** piyadeî
تەمەڵیی، کەودەنیی، گەوجیی، نەزانیی، ساویلکەیی، گەلحۆیی، ساوویین).

**پیاسە (ن)** piyase
ڕاوێچکە، گەڕان بۆ مەبەستیی حەسانەوە، هاتوو چۆ بۆ مەبەستی پشودان.

**پیاسە کردن (کتپ، کتن)** piyase kirdin
چوونە دەرەوەی ماڵ، گەڕانێکی سەرپێیی کردن، هەوا وەرگر گلۆریی.

**پیا (پیدا) ڕاکەوتن (کتپ)**
piya (pêda) rakewtin
پیداگەیشتن، فریاکەوتن، پیداگەیین، پێ ڕاگەیشتن، لەکاتی پێویستدا بەشتێ گەیشتن، لەکاتی پێویستدا گەیشتنەجێ.

**پیار (ئان)** piyar
بەزەییدار، دڵسۆز، دڵ نەرم، میهرەبان، پڕ بەزەیی.

**پیا (پیدا) ڕاگەیاندن (کتپ)**
piya (pêda) rageyandin
پێ گەیاندن، فریاخستن، گەیاندنەجێ، گەیاندنە شوێنی مەبەست.

**پیاز (ن.رو)** piyaz
پیڤاز، پیواز.

**پیازە خووگانە (ن.رو)** piyaze xügane
پیازەکێویلە، پیازە مشکانە، پیازی دەشتیی.

**پیا(پێدا)ساوین (کتپ)** piya (pêda) sawîn
پیاسوون، پێدا سوون، تێ هەڵسوون.
**پیاسوون (کتپ)** piysün
ب (پـیا تـن، راوچکـه کـردن، هـاتوچۆ کـردن (لەسەرخۆ).
**پیا(پێدا)کردن (کتپ)** [1] piya (pêda) kirdin
پێدا کێشان، پیامالین.
**پیا(پێدا)کردن (کتپ)** [2] piya (pêda) kirdin
پێوه کردن پێوەبەستن، لێ بەستن.
**پیا(پێدا) کردن (کتپ)** [3] piya (pêda) kirdin
بەسەردا رشتن، بەسەرداکردن، بەسەردا پرژان.
**پیا (پێدا) کردن (کتپ)** [4] piya (pêda) kirdin
شتێک بەناو شتێکدا کردن.
**پیا (پێدا) کێشان (کتپ)** piya (pêda) kêšan
شان پێداکردن، لرف لێ دان، ماڵی خەڵک بـەخۆرایی یان بێ پرس بردن، گەنگە نزیی کردن.
**پیا (پێدا) کێشان (کتپ)** piya (pêda) kêšan
مالین بەشتێکدا،تێ‌سرەواندن.
**پیا (پێدا) گرتن (کتپ)** piya (pêda) girtin
داپۆشـین، شـتێک بـەڕووی شـتێکی تـردا گـرتن، شاردنەوە، پەردەبەسەردا گرتن یان گێران.
**پیا (پێدا) گەیاندن (کتپ)**
piya (pêda) geyandin
بەدەسـت گەیانـدن، فریاخـستن، لـەکاتی پێویـستدا شت هێنان.
**پیا (پێدا) گەیشتن (ند)** piya (pêda) geyštin
بەشی خۆبردن، بەشی خۆ دەست کەوتن.
**پیا (پێدا) گەیشتن (ند)** piya (pêda) geyštin
دەستی یارمـەتیی بـۆ درێـژ کـردن، یارمـەتیی دان، یاریدەدان، یاریەدان.
**پیا (پێدا) گەیشتن (ند)** piya (pêda) geyštin
ب(پیا(پێدا) راکەوتن).
**پیا (پێدا) گێڕان (کتپ)** piya (pêda) gêřan
بەسەرد بڵاوکردنەوە، شتێک بەسەر شتێکدا گێڕان.
**پیاڵە (ن)** piyale
ئیستیکان، پیارە، پیال، پەیال، ستیکان.
**پیامالین (کتپ)** piyamalîn
پێدامالین، پێداکیشان، تـێ سـرەواندن، تـێ گـرتن، ئەنگاوتن، لێ دان، چەپۆک پیاکیشان.
**پیان (نک)** [1] piyan
پاگەل، پێ یەکان.

**پیان (فر)** [2] piyan
پێیان، بەمان، بەوان، لەتەکیان، لەگەڵیان.
**پیا (پێدا) نان (کتپ)** piya (pêda) nan
شـت لەسـەر شـتێکی دیکـەدانان، خـستنەسەر، لەسەردانان.
**پیا (پێدا) نووسان (کتپ)** piya(pêda)nüsan
١- گازلێ گرتن، قەپاڵ پیا(پێدا) کردن. ٢- گرتن، پڕ پێدا کردن، چنگ لێ گیر کردن.
**پیا (پێدا) نووسان (کتپ)** piya (pêda) nüsan
پێدالکاندن. پێدانووسان، شتێک بەشتێکدا لکانـدن یان لکان، پیا (پێدا) لکاندن.
**پیاو (ن)** [1] piyaw
مێرد، مێر، شوو.
**پیاو (ن)** [2] piyaw
پـیاگ، مێـر، نێرینـە(ئـادەمیزادی نێرینـە)، کەسێ، یەکێ.
**پیاو (ن،ئان)** [3] piyaw
جوامێر، مەرد، وەند، شاپیاو، پیاوی پیاوان.
**پیاو (ن)** [4] piyaw
خزمەتکار، نۆکەر، خزمەکار.
**پیاوانە (ئان،ئاک)** [1] piyawane
پیاوئاسـا، پیاواسـا، جوامێرانـە، کـردەوە مەردانـە، وەک پیاو.
**پیاوانە (ئان)** [2] piyawane
ئازا، بەدەست، بەزەبر وزەنگ.
**پیاو بەقسەیی ومانگا بەقۆچی دەبەسترێتەوە (پن)**
piyaw be qiseyî w manga be qoçî debestrêtewe
پیاو بەقسەیی وگا بەپەتک دەبەسترێتەوە، پـیاو بـە پەیمانی دەبەسترێتەوە، کەر بەپەتک. هەر ئاخاوتنە مرۆڤ دەبەستێتەوە.
**پیاوچاک (ئان)** [1] piyaw çak
خاس، جوامێر، چاک، مەرد، پیاوخاس، مێرخاس.
**پیاوچاک (ئان)** [2] piyaw çak
بەئایین، بەدین، پیاوی خوا، پیاوی خودایی، خوا - پەرست، خودا پەرست، دیندار، لەخواترس.
**پیاوچاک (ئان)** [3] piyaw çak
بێ زیان، بێئەوەزن، بێئەوەی، کردەوەچاک.
**پیاوخراپ (ئان)** piyaw xirap
بـەد، بـەدکردار، بـەدکردەوە، بـەدرەفتار، بـەزیان، بـەوەزن، خـراپ، زیـان بـەخش، زیانـدەر، ستەمکار، کردەوەخراپ، ناجوانمەرد، نامەرد.

**پیاو فرۆش(ئافرەت) (ئان)** piyaw froš(afret)

بەفروفێل، زمان لوس، دەست بڕ.

**پیاوکوژ (ن)** piyawkuj

بکوژ، خوێنڕێژ، کوژەر، کوژەوە.

**پیاوکوشتن (کتپ)** piyaw kuštin

مرۆڤ کوژتن

**پیاوکە چووە شاری کەچەڵان ئەبێ دەست بەسەریەوە بگرێت (پن)**

piyaw keçwe šarî keçelan ebêt dest be- seryewe bigrêt

کەچوویتە شاری کوێران دەست بەچاوتەوە بگرە.

**پیاو کە زۆری ووت چاکیش دەڵێ وخراپیش(دەڵێ) (پن)**

piyaw kezorîwüt çakîšdelê w xirapîš(delê)

زۆر بڵێ بێ وەزەندنایێ، زۆر ووتن وەزەندی لێ دەوەشێتەوە.

**پیاوەتی (ن)** [1] piyawetî

ئازایەتی، چالاکی، خورتی، دلێری.

**پیاوەتی (ن)** [2] piyawetî

ئەدا، پیاگەتی، جوامێری، چاکە، چاکی، چاکە، چاکیتی، کردەوەی چاکە، مەردایەتیی، مەردی، مرۆڤایەتی.

**پیاوەتی (ن)** [3] piyawetî

چاخی، کاملی پیاو.

**پیاوە ماقوولان (نک)** piyawe maqülan

خانەدان، گەورەپیاوان.

**پیاوی ئەوکارەنییە (رس)**

piyawî ew kare niye

بەکاری ئەو ئیشەنایەت.

**پیاوی خوا (خودا) (ئان)** piyawî xwa

پیاوچاکە.

**پیاوی وەک ئەو (مز)** piyawî wek ew

کەسی وەک ئەو، کەسانی وە تۆڤ.

**پیا(پێدا)هاتن (کتن)** [1] piya (pêda) hatin

هاتن (لەشوێنێکەوە).

**پیا (پێدا) هاتن (کتپ)** [2] piya (pêda) hatin

باس کردن (شتێ بەدوور ودرێژیی).

**پیا (پێدا) هاتنەوە (کتپ)**

piya (pêda) hatinewe

پیاچوونەوە، پێداچوونەوە، بەسەرکردنەوە.

**پیا (پێدا) هانین (کتپ)** piya (pêda) hanîn

پیا هاوردن، پێداخشاندن، پێداهێنان، سڕین.

**پیا (پێدا) هەڵپژان (کتن)**

piya (pêda) helpijan

هەڵپژان.

**پیا (پێدا) هەڵپژاندن (کتپ)**

piya (pêda) helpijandin

هەڵپژاندن.

**پیا (پێدا) هەڵپەڕین (کتپ)**

piya (pêda) helperîn

تووش بوون، گرفتاربوون، لێوەگرتن (نەخۆشیی درم لەیەکێکی دیکەوە).

**پیا (پێدا) هەڵپەڕین (کتپ)**

piya (pêda) helperîn

ئامبازبوون، ئەمبازبوون، پیا (پێدا) هەڵپژان، پیا (پێدا) هەڵتەقان، پیا (پێدا) هەڵتەقیین، هەستان و ئاوقەد بوون (کەسێ بە کەسێکدا).

**پیا (پێدا) هەڵپەساردن (کتپ)**

piya (pêda) helpesardin

پیا هەڵسپاردن.

**پیا (پێدا) هەڵتەقان (کتپ)**

piya (pêda) helteqan

پیاهەڵپەڕین.

**پیا (پێدا) هەڵچوون (کتپ،کتن)**

piya (pêda) helçün

پیا (پێدا) هەڵگەڕان، پیا (پێدا) هەڵزنان.

**پیا (پێدا) هەڵچەقیین (کتپ)**

piya (pêda) helçeqîn

پێداهەڵچەقیین، تێ چەقیین.

**پیا (پێدا) هەڵخوێندن (کتپ)**

piya (pêda) helxwêdin

پیا (پێدا) هەڵخوێندن، هاتن بەتانی کەسێکدا بەخراپی.

**پیا (پێدا) هەڵدان (کتپ)** piya (pêda) heldan

بەشان وپاهوودا هەڵدان، پیا (پێدا) وەتن، هاتن بەتانی یەکێکدا بەباشیی، بەدڵ وبەگیان پەسندکردن، پێ هەڵگوتن (بەدوور ودرێژیی)، چاکەی کەسێ باس کردن، هەڵنان.

**پیا (پێدا) هەڵزنین (کتپ،کتن)**

piya (pêda) helznîn

پێداهەڵگەڕان، پیا هەڵزنان، پیاسەرکەوتن.

**پیا (پێدا) هەڵشاخان (کتپ،کتن)**

piya (pêda) helšaxan

بەگژداچوون، ئەمبازبوون، ئاخاوتنی ناخۆش

ئاراستەی کەسێ کردن، تەریق کردنەوە، پیا (پێدا) هەڵکالیین، پیاهەڵکالان، لێ تووڕەبوون، پەلاماردان.

**پیا (پێدا) هەڵشاخیین (کتپ،کتن)**
piya (pêda) - helšaxîn
پیا {پێدا} هەڵشاخان.

**پیا (پێدا) هەڵکالان (کتپ،کتن)**
piya (pêda) - helkalan
پیا {پێدا} هەڵشاخان.

**پیا (پێدا) هەڵکالیین (کتپ،کتن)**
piya (pêda)- helkalîn
پیا {پێدا} هەڵشاخان.

**پیا هەڵگەڕان (کتپ)** piya helgeran
پیا {پێدا} هەڵچوون، پێداهەڵگەڕان.

**پیا (پێدا) هەڵنان (کتپ)**
piya (pêda) helnan
پیا{پێدا}هەڵپەساردن.

**پیا (پێدا) هەڵواسیین (کتپ)**
piya (pêda) helwasîn
پیاشۆڕکردنەوە،پیاکردن.

**پیا (پێدا) هەڵ ووتن (کتپ)**
piya (pêda) helwütin
پیا {پێدا} هەڵدان.

**پیا (پێدا) هێنان (کتپ)** piya (pêda) hênan
پیا {پێدا} هانیین.

**پیپک (ن)** pîpik
بیلبیلەی چاو، تیلبیلە، گلێنە.

**پیپل (ن)** pîpil
شەپۆل (ناو).

**پیت (ن،نان)** pît 1
کەم، چک.

**پیت (ن)** pît 2
ئەلف وبێ (ئـ، ب....).

**پیت (ن)** pît 3
خێر وبەرەکەت، فەڕ، ئیروو، برشت، ڕیژنە، ڕیژەوە.

**پیت (ن)** pît 4
بلیسە، کلپە، گوڕی، گڕ (ئاگر)، بلیزە، زووانە، سوولی، شید، پیت.

**پیتاک (ن)** pîtak 1
پڕ وپیت، خرت وپرت، شتی ناومال.

**پیتاک (نک)** pîtak 2
باربوو، باربوویی، بارەبوو، خەلات، دەقنە، پۆیلانە، ترەوانە، بدەهم، داشن، دەستیاو، دەسیاریی، خووک، کزمەک، کیشە، یاریدە، خێر.

**پیتاک کردن (کتپ)** pîtak kirdin
باربووکردن، باربوویی‌کردن، پارەوپوول.. کۆکردنەوە (بۆ مەبەستێکی مرۆڤایەتیی ویارمەتیی)، پیتاک کۆکردنەوە، باربوو کۆکردنەوە.

**پیتاک کۆکردنەوە(کتپ)** pîtak kokirdinewe
پیتاک کردن.

**پیتاک دانەوە (کتپ)** pîtak danewe
خێردانەوە، خێرلێ وەشانەوە، بەفەڕبوون.

**پیتگانن (کتپ)** pîtganin
بەزەوی‌یدا دان، بەئەرزدا کوتان، بەزەویداخستن، خستنە خوارەوە.

**پیتمار (ئان)** pîtmar
بەگوڕم، بەلەز، چالاک، چوست، خیرا.

**پیتۆل (ئان)** pîtol
زرنگ، زیرەک، زیخ، وریا.

**پیتە (ن)** pîte 1
پووش، پەلاش.

**پیتە (ن)** pîte 2
گۆشتاو.

**پیتە پیتە (ئاک)** pîte pîte
تۆزە تۆزە، کەم کەمە، وردە وردە.

**پیتەک (ن)** pîtek
ب (پیچەک).

**پیچ (ن،کل)** pîç(kl) 1
پێچ، خول، گەڕ.

**پیچ (ئان،ن)** pîç 2
بیچ، بیچم، بیژ، بیژیی، زۆڵ، حەرام زادە.

**پیچ پیچە (ئاک)** pîç pîçe
برپرە،برەبرە.

**پیچەک (ن،کی)** pîçek(ki)
کەم، تۆز، پیزە، تۆزقال، تۆسقال، ڕیزە، نەخت.

**پیچێ (ئان،کی)** pîçê(ki)
تۆزێ، تۆزێک، کەمێ، کەمیک، نەختێ، نەختێک، چکێ، چکێک.

**پیخ (ن،کل)** pîx(kl)
پەنهانی، حەشار، شارراوەیی، نهێنی.

**پیخ کردن (کتپ،کل)** pîx kirdin(kl)
پەنهان کردن، حەشار دان، شاردنەوە.

**پیر (ئان)** pîr 1
پیاوچاک.

میناییّ).

**تەڕپۆش** (ئان) ١ terpoš

ئاڵ و واڵاپـۆش، تەڕەنـدان، تـەڕ دڵ، دڵ تـەڕ، دەس بەخۆداهێنەر، زەرقی پۆش.

**تەڕپۆش** (ئان) ٢ terpoš

جوان پۆش، پاک پۆش، شیک پۆش، شیک.

**تەڕپۆشیی** (ن) terpošî

جوان پۆشیی، ڕێک پۆشیی، شیکیی.

**تەڕتلیک** (ئان) tertliîk

زۆر تەڕ.

**تەڕچک** (ئان) terçik

تەرچک، تەڕچک، جوان، جوان وناسک، نـەرم، نیـان، مەزەدار، جەرگە (ئافرەت).

**تەڕچکیی** (ن) terçikî

تەرچکیی، تەڕچکیی، تەڕوبڕیی، جـوانیی، ناسـکیی، نەرم ونیانیی.

**تەڕدەست** (ئان) terdest

بەدەست برد، چابک، چابوک، زرنگ.

**تەڕدەستیی** (ن) terdestî

چـابکیی، چـابووکیی، چـالاکیی، شـارەزایی زۆر (لەمەودا یەکدا).

**تەڕدەم** (ئان) terdem

بەزمان، تەڕزمان، تـەڕزوان، دەم وگفـت خـۆش، زوان لووس، زواندار، زوان وێژ، قسەخۆش، قسەڕەوان.

**تەڕزمان** (ئان) terziman

ب (تەڕدەم).

**تەڕزمانیی** (ن) terzimanî

تەڕزوانیی، زوان زانیی، زوان وێژیی.

**تەڕفرۆش** (ن) terfiroš

ب (تەڕەفرۆش).

**تەڕکردن** (کتپ) ١ ter kirdin

١- ئاوپێداکردن، شێدارکردن. ٢- خووساندن.

**تەڕکردن** (کتپ) ٢ ter kirdin

ئاوپڕژێن کردن، ئاوپشێن کردن.

**تەڕکردنەوە** (کتپ) ter kirdinewe

تـەڕەوکردن (گیـادان بـەوڵاخی بەرزەلـە بـەهاردا لەبریی کاوجۆ).

**تەڕکوت** (ن) ter kut

شلەکوت، فەلاقە، شل کوت.

**تەڕکوت کردن** (کتپ) ter kut kirdin

شلەکوت کردن،

شـل کـوتی مـەرگ کـردن، فەلاقـەکردن، بیرازکـردن، زریکەلێ هەڵساندن.

**تەڕلان** (ن.م) ١ terlan

بـاز، بـازی تـەواری گـەورە، تورلـک، تـەوار، شـاباز، شاواز، بازی مێچکە، بازی مێنگە، ئیلۆ.

**تەڕلان** (ئان) ٢ terlan

ب (تەرلان).

**تەڕن** (ن) ١ terin

فێرۆ.

**تەڕن** (ن) ٢ terin

زیان، زەرەر.

**تەڕن** (ن) ٣ terin

ب (پەند).

**تەڕن پێ‌دان** (کتپ) terin pêdan

ب (پەند پێ دان).

**تەڕن پێ‌کردن** (کتپ) ١ terin pê kirdin

زیان پێ گەیاندن.

**تەڕن پێ کردن** (کتپ) ٢ terin pê kirdin

بەفیرۆدان، بەتەڕن دان.

**تەڕنکەر** (ئان) terinker

ب (پیلانگێر).

**تەڕنە بوون** (کتن) ١ terin nebûn

ئاونەگرتنە خۆ.

**تەڕنە بوون** (کتن) ٢ terin nebûn

تەریق نەبوونەوە، تیلەتوانج نەگرتنەخۆ.

**تەڕنە بوون** (کتن) ٣ terin nebûn

لەڕێگەی خۆلانەدان، ڕێی خراپەگرتن.

**تەڕوبڕ** (ئان،می) terwbir

ئاڤـدار، ئاڤـیی، ئـاودار، پـڕ(لـە) ئـاو، تـەڕچک، تـەڕوتازە، تـەڕوناراو، گەیـشتوو، گـەیو (میـوە)، تازەوناسک، تازە وئاودار، تەڕوتازە.

**تەڕوبڕیی** (ن) terwbirî

جـوانیی، زێبـایی، شـیرینیی، قەشـەنگیی، نەشمیلانەیی.

**تەڕوتازە** (ئان،می) terwtaze

ب (تەڕوبڕ).

**تەڕوتفاق** (نک) terwtifaq

تروتفاق، تفاق، پێویستیی کاروبار، ساز.

**تەڕوتووشیی** (ن) terwtûšî

باران و وەیشوومە، بەفرباران، باران وتۆف.

**تەڕە** (نک) ١ tere

سەوزە.

**تەڕە** (نک) ٢ tere

سەوزەوات (بۆ چێشت...).

**تەڕە** (نک) ٣ tere

میوەهات، میوەوسەوزەی تازە، تەڕەکاڵ.

**تەڕەتۆڵەکە** (خ.) tere toleke

تالان، هەرزان، هەرزان وتالان.

**تەڕەتۆڵەکەی ناگاتێ** (ند)

tere tolekey nagatê

لەتەڕە تۆڵەکە هەرزانترە،

هەرزان وتالانە.

**تەرەتوورە** (ن،رو) tere türe
ب (تەرەتیزە).

**تەرەتیزە** (ن،رو) tere tîze
تەرەتوورە، تەرەتیژە.

**تەرەدین** (ئان) tere dîn
ئەقل سووکە، ترەدین، تەوتەو، گەلحۆ، گەوج.

**تەرەزەن** (ئان) terezen
ئـاژەلی دۆشـەنیی، تازەشـیر، تـەرە، تـەرە ژەن، شیردار، دۆشەندە (مەڕ، بزن...).

**تەرەژن** (ئان) tere jin
ژنی گەنج وجوان.

**تەرەژەن** (ن) tere jen
ب (تەرەزەن).

**تەرەسال** (ن) tere sal
تەڕ، سال، شالیکی بەباران، سالیکی تەڕوتووش.

**تەرەشوعدار** (ئان) terešu`adar
شیدار، نماویی.

**تەرەفرۆش** (ن) terefiroš
میوە فرۆش، تەرفرۆش، سەوزەفرۆش، تەرەکال.

**تەرەکال** (ن) terekal
ب (تەرەفرۆش).

**تەرەکال** (ن) terekal
ب (ئاوەنیا).

**تەرەماست** (ن) teremast[1]
کەرە.

**تەرەماست** (ن) teremast[2]
سەرتوێژی ماست یان شیر.

**تەرەماش** (ن،رو) teremaš
فەریکەماش، ماش، ماشی تەڕ.

**تەرەماش** (خ.) teremaš
هیچ وپووچ، بێ مانا.هیچ بۆ نەکردن.

**تەرەمالە** (ن) teremale
تەرەمالێ (بۆچیمەنتۆ یان قورەکاریی).

**تەرەی** (ن) terî
ب (تەرایی).

**تەریزە** (ن) terîze
بەشی لوارکەمەر (لەهەردوولاوە).

**تەز** (ن،کل) tez(kl)[1]
ماندوویی، ماندویتیی، ماندوویەتیی، هیلاکیی.

**تەز** (ن) tez[2]
سڕیی، گۆتیی.

**تەز** (ن) tez[3]
ب (تەزوو).

**تەزان** (کتن) tezan
تەزیین، سڕبوون، گۆت بوون، کەسیرەبوون.

**تەزاندن** (کتپ) tezandin[1]
تەزانن، تەزیین، سڕکردن.

**تەزاندن** (کتپ) tezandin[2]
سارد کردن.

**تەزاندن** (کتپ) tezandin[3]
ئازاردان، زیان پێ گەیاندن، سزادان، زیان پێدان.

**تەزاندن** (کتپ) tezandin[4]
دلگیربـوون، دەمەکـوت کـردن، سەرزەنـشت کـردن، قورپەدەمدادان، خراپ لەگەل کەسیکدا جوولانـەوە، خراپ رەفتار لەگەل کەسیکدا کردن.

**تەزبیح** (ن) tezbîh
تزبە، تەسبیە، دەسبیح.

**تەزەرچوون** (کتن،کل) tez derçün(kl)
حەسانەوە، ماندوویی دەرچوون، ئیسراحەت کردن.

**تەز دەرکردن** (کتپ) tez derkirdin
حەساندنەوە، ماندوویی دەرکردن.

**تەزگ** (ن) tezig
ب (تەزوو).

**تەزوو** (ن) tezü
ئازاشکە، تەز، تەزگ، لەرزە، مووچرکە(بەهۆی سەرما یان ترسەوە).

**تەزوو بەسەرداهاتن** (ئد) tezü beserda hatin
ترسـان، سـام گـرتن، سـام لێ نیـشتن، کەوتنـە بیرکردنەوەی سامدار.

**تەزوو(پێدا) پیا هاتن** (کتن)
tezü piya(pêda) hatin
مووچرکە پیا (پێدا)هاتن، لەرزپیدا هاتن.

**تەزی** (ئان) tezî
سار، سارد، ساردوسڕ، چەییگ.

**تەزیگ** (ئان،لو) tezîg(lu)
ب (تەزیو).

**تەزین** (کتن) tezîn
سڕبوون، گۆت بوون (لاق، قۆل...).

**تەزیو** (ئان) tezîw
تەزیگ، سڕبوون، گۆت، گۆت بوو.

**تەژاندن** (کتپ) tejandin
١- گوشیین (تری).
٢- گوشیین (جلی تەڕ).

**تەژگ** (ن) tejig
قوماشی کەتان، هەژگ.

**تەژگا** (ن،کل) tejiga(kl)
ب (ئوجاخ / ١).

**تەژنە** (ئان) tejine
ب (تینوو).

**تەژنەبوون** (کتن) tejinebün
ب (تینوو بوون).

**تەژە** (ن) teje[1]
بالار، حەمال (خانوو)، رایەل (بنمیچ)، کاریتە.

**تەژە** (ئان) teje[2]
ب (بالابەرز).

**تەژەنە** (ئان) tejene
ب (تەژنە).

**تەژیر** (ن،لو) tejîr(lu)
ب (تەویلە).

**تەژی** (ئان،کی) tejî(ki)[1]
تیر، گەدەپڕ، تەسەل، تێروپڕ وتێرو تەسەل.

**تەژی** (ئان،کی) tejî(ki)[2]
ئاختراو، پڕ، پڕکراو، دارمال، سەرلێوان، قەلاپەچن، مالامال.

**تەژی بوون** (کتن،کی) tejibün(ki)
پڕبوون، دارمال بوون، سەرلێوان بوون، قەلاپەچن بوون، لێوان بوون.

**تەژی کردن** (کتپ،کی) tejîkirdin(ki)
پڕکردن، دارمال کردن، سەرلێوان کردن، قەلاپەچن کردن، لێوان کردن.

**تەسک** (ئان) tesk[1]
تەنگەبەر، هاتوەوەیەک.

**تەسک** (ئان) tesk[2]
کۆتا، کەم بەر، کەم پانایی.

**تەسک بوونەوە** (کتن) teskbünewe
تەگەبەربوون، تەسکەوبوون، چوونەیەک.

**تەسک کردنەوە** (کتپ) tesk kirdinewe
تەسکەوکردن، تەنگەبەرکردن، هێنانەوەیەک.

**تەسک وترووسک** (ئان) teskwtrüsk
زۆرکۆتا، بەرکەم.

**تەسکینی** (ن) teskînî
ئارامیی، ئاسوودەیی، ئۆقرە، وەقرە.

**تەسکیی** (ن) teskî
تەنگەبەریی.

**تەسە** (ن) tese[1]
ئانگین، قوولینە.

**تەسە** (ن) tese[2]
ب (تەشت).

**تەسەق** (ن،کل) teseq(kl)
سکالا، سکالە، واوەیلا.

**تەسەق کردن** (کتپ،کل) teseq kirdin(kl)
سکالادەربڕین، سکالاکردن، سکالای دل دەرکردن، سکالای خۆ دەربڕیین.

**تەسەق کردن** (کتپ،کل) teseq kirdin(kl)
سکالا بردنە لای کەسێ.

**تەسەل** (ئان) tesel
ب (تێر).

**تەسەلاهاتن** (کتن) tesela hatin
تێر خواردن، چاو تێر بوون، تێربوون.

**تەسەل بوون** (کتن) teselbün
بەس بوون، تێرابوون، تێربوون.

**تەسەل کردن** (کتپ،کتن) tesel kirdin
تێرکردن، گەدە پڕ کردن (لەشتێ).

**تەشاوی** (ن) tešawî
ب (کلاو رۆژنە).

**تەشپی** (ن) tešpî
ب (تەبەق).

**تەشپی ترێن** (ئان) tešpî t<u>r</u>ên
زۆر خۆر.

**تەشت** (ن) tešt
پلاشە، تەس، تەسە، دۆلە، کوول، قەرەوانە.

**تەشتی تەلا بەسەرتەوەبنێ** (پن)
teštî te<u>l</u>a besertewe binê
هێمنیی وئاساییە.

**تەشق** (ن) tešq
تەشک، تەووژمی ساردیی، تەووشق، تەوەشق.

**تەشق شکان** (کتن) tešq šikan
تەشک شکان، تەووژمی ساردیی نەمان.

**تەشقەلە** (ن) tešqe<u>l</u>e False-claim, (n.).
ئاسیو، بڕوبیانوو، تەلەکە، چاچوولە، زۆرە ملە، گەڕ، گیچەل.

**تەشقەلە** (ن) tešqe<u>l</u>e Crisis, (n.).
تەنگ وچەلەمە، گیروگرفت.

**تەشقەلەباز** (ئان)
tešqe<u>l</u>ebaz Pugnacious,(adj.)
بەگیچەل، برزوو، تەشخەلەباز، شەڕانیی، شەڕفرۆش، گەڕ کەر، تەشقەلەچیی.

**تەشقەلە پێ کردن** (کتپ) tešqe<u>l</u>e pê kirdin
بڕوبیانوو پێ گرتن، بەزم پێ گرتن، بەگیرهێنان، گەڕ پێ کردن، شەڕ پێ فرۆشتن.

**تەشقەلە کردن** (کتپ) tešqe<u>l</u>e kirdin
بڕوبیانوو گرتن، شلتاخ کردن، گەڕکردن.

**تەشک** (ن) tešk
قەلافەت، قەوارە، درێژایی (قەدو بالای کەسێ)، تەشک و دیمەن.

**تەشکە بەرە** (ن) teške be<u>r</u>e
نوسراوی دووورودرێژ.

**تەشوێ** (ن) tešwê
ترشتە، ترێشتە، تەشوو، تەفشۆ، تەفشوو، تەوشوو، تەوشوێ، تیشکە، تیشە، بالتە.

**تەشەر** (ن) tešer*

ب (تانووت).

**تەشەردان** (کتپ) tešerdan

ب (تانووت لێ دان).

**تەشەنا** (ن،پز) tešena

تیراوی، گەنگەرین، برینی تەشەنەکردوو.

**تەشەنە {برین}** (ن) tešene (brîn)

ئاوجز، ئاودن، پەرە. تەنیین، هەو.

**تەشەنەکە** (ن) tešenek

ب (ئاوساویی).

**تەشەنەکردن** (کتن) tešenekirdin

ئاوسان و کیم کردن، تەنیینەوە، جەراحەت کردن، پەرەسەندن، ئاوجز کردن، ئاو کردن، هەو کردن.

**تەشەنەکردن** (کتپ) tešenekirdin

خۆ خواردنەوە، پێش خواردنەوە.

**تەشەنەکەر** (ئان) tešeneker

ب (پەرەسین).

**تەشی** (ن) tešî

پارکیر، پارگیر،تەشیلە، کلافە گیر، لەتەرە، خولخولۆکە.

**تەشی ڕستن** (کتپ) tešeî ristin

تەشی ڕیسیی کردن.

**تەشی ڕیسیی کردن** (ند) tešî rêsî kirdin

١- ماستاو سارد کردنەوە، میچکەمیچکەکردن، مەرایی کردن، ڕیایی کردن. ٢- زۆر ووتن، لە هەموو بابەتێک دووان، چەنەچەن کردن.

**تەشی ڕیسیی کردن** (ند) tešî rêsî kirdin

گوزەران کردن بەڕستنی تەشی.

**تەشیلان کردن** (کتپ) tešîlan kirdin

هەڵماتین کردن (یارییەکی مندالانەیە).

**تەشیلە** (ن) tehîle

ب (تەشی).

**تەشیلە** (ن) tešîle

ب (هەڵمات).

**تەغار** (ن) texar

تەخار، سییەمەن، دوو هەزار کیلۆغرام (لەکوردستان)، ١٥٣٧ کیلۆ غرام لەبەسرە.

**تەفاریک** (ن) tefarîk ١

ئەغیار، بیانیی، بێگانە، تەڤاریک، غەریبە.

**تەفاریک** (ئان) tefarîk ٢

بێسەرو سامان، ڕووت و قووت.

**تەفروتوونابوون** (کتن) tefrw tünabün ١

دوماهی هاتن، کۆتایی هاتن،نەمان.

**تەفروتوونابوون** (کتن) tef tünabün

بەربادبوون، تونابوون، تەپیین، داڕووخان، ڕووخان، سەرەو ژێربوون، فەوتان، لەناوچوون، ویران بوون، کاول بوون.

**تەفرو توونا کردن** (کتپ) tefrw tüna kirdin

١- ئاوارەکردن، دەربەدەر کردن.
٢- بەربادکردن، خراپ کردن، داغان کردن.
٣- فەوتاندن، لەناوبردن، لەنێو بردن، نەهێشتن.
٤- تەپاندن، بن کەند کردن، خاپوور کردن، دا ڕووخاندن، ڕماندن، کاول کردن، ویران کردن، سەرەو ژێر کردن، ڕووخاندن، لەبێخ دەرهێنان.
٥- بەکۆمەڵ خەڵک کوشتن، قڕتێ خستن، خت کردن، فت کردن.

**تەفرە** (ن) tefre

تەڵە، داو، فریو، ئۆین، ئەروەند، فێل، گز، گزەونی، پیلان، پلان، پەند، پەنگ، چڤ، تەڵەکەبازیی، دەهۆ، ڕیب، فەند.

**تەفرە خواردن** (کتن) tefre xwardin

فریوخواردن، هەڵخەڵەتان.

**تەفرەدان** (کتپ) tefredan ١

داوێزنانەوە، فریودان، هەڵخەڵەتاندن، هەڵفریواندن، لە خشتە بردن، بەهەڵەدا بردن، خەڵەتاندن.

**تەفرەدان** (کتپ) tefredan ٢

بەرووڕێیی خراپەبردن، لەڕێی ڕاست دوورخستنەوە.

**تەفرەدەر** (ئان) tefreder ١

جانانە.

**تەفرەدەر** (ئان) tefreder ٢

تەپکەر، چەپەڵ، چەپ ئەنداز، فریوباز، ناپاک، تەڵەکە باز، چڤۆ، فێڵەزان، فێڵباز گزەون.

**تەفری کردن** (کتن،کل) tefrî kirdin(kl)

چوون بۆ سەیران، سەیران، سەیران کردن، خواردەمەنیی بردن بۆ دەشت.

**تەفریگا** (ن،کل) tefrîga(kl)

باخچە، سەیرانگا، سەیرانگە.

**تەڤ** (ن،کی) tev(ki) ١

کۆمەڵ.

**تەڤ** (پ،کی) tev(ki) ٢

دەڤ، لەگەڵ، پێکەوە، هەموو.

**تەڤتەڤیک** (ن،نم،کی) tevtevîk(ki)

کەمانچە.

**تەڤدان** (کتپ،کی) tevdan(ki)

تێک وەردان (چێشت - لەسەر ئاگر).

**تەڤدیر** (ن،کی) tevdîr(ki)

تەگبیر.

**تەڤر** (ن،کی) tevir(ki) ١

ب (تەور).

**تەڤر** (ن،کی) tevir(ki) ٢

ب (تەرانە).

**تەڤز لێ دان** (کتپ،کی) teviz lê dan(ki)
بەتەوسەوە لەگەڵ کەسێکدا ئاخاوتن، تانووت لێ دان، لۆمەکردن.

**تەڤن** (ن،کی) tevin(ki)
ب (تەون).

**تەڤێل** (ن،کی) tevêl(ki)
ب (ئانی).

**تەقاندن** (کتپ) teqandin
ئاگردان، تەقانن(چەک).

**تەقاندنەوە** (کتپ) teqandinewe ¹
تەقاندنەوە.

**تەقاندنەوە** (کتپ) teqandinewe ²
بیژانن، بیژنگک کردن، لەبیژنگ دان.

**تەقاندیەوە** (ئد) teqandiyewe
نهێنییەکەی ئاشکراکرد، باسەکەی خستەڕوو.

**تەقانن** (کتپ) teqanin
پێوەنووساندن، چەسپاندن.

**تەقانەوە** (کتن) teqanewe
ب (تەقینەوە).

**تەق کردن{سلوا}** (کتن) teq kirdin(sawa)
زۆر گریان، سوێ بوونەوە، ماندوو بوون (لەبەر گریان).

**تەقلە** (ن) teqle ¹
تەقیلە، تەقیە، تەپلە، کڵاو، ئارەقچن.

**تەقلە** (ن.) teqle ²
سەرمەقولات، سەرمەقولات، کاری خۆ هەڵگێرانەوە.

**تەقلە لێ دان** (کتن) teqle lê dan
خۆ هەڵگێرانەوە بەسەردا، سەرمەوقولات دان، سەرمەقولات دان.

**تەقن** (ن،کی) teqin(ki)
تلۆل، قوڕ، کوڕ، گیل، لیتە، هەڕیی، چەرک، بشکوول، پشکوول، هەرک، زەل.

**تەقنین** (کتن،کی) teqnîn(ki) ¹
تەقیین، چەقیین، دۆش دامان، گیربوون، ماتەل بوون.

**تەقنین** (کتن،کی) teqnîn(ki) ²
قوڕاویی بوون، پیس بوون، لیتاویی بوون.

**تەقنین** (کتپ،کی) teqnîn(ki) ³
بەقوڕدابردن، لەقوڕداچەقاندن، خشتنە لیتاوەوە.

**تەقنین** (کتن،کی) teqnîn(ki) ⁴
قوڕاویی کردن.

**تەقنین** (کتن،کی) teqnîn(ki) ⁵
بەقوڕدا چوون، تەقیین، چەقیین (لەقوڕدا).

**تەق وپۆق** (ن) teqw poq ¹
ب (تەق وتۆق).

**تەق وپۆق** (ن) teqw poq ²
تاق وتووق، تەق وپۆق، تەقەتەقی زۆر وبەرز و هەر دەنگەی لەلایەکەوە.

**تەق ودەو** (ن) teqw dew
بێ ئاسایشیی، تەق وڕەو، تەک ودەو.

**تەق وڕەو** (ن) teqw rew
ب (تەق ودەو).

**تەق و ڕەو کردن** (کتن) teqw rew kirdin
ڕەو کردن (لەترسی تەقەو نائارامیی).

**تەق ولەق** (ئاک) teqw leq ¹
لارەولار، لارە لار.

**تەق ولەق** (ئان) teqw leq ²
تەق ولۆق، شلۆق، شلووقە.

**تەقوو** (ئاک،نسپ) teqû
بەڵکم، بەڵکە، بەڵکی، تەرەق.

**تەقە** (ن) teqe
دەنگ.

**تەقەتەق** (کتن) teqeteq
تەق وهوور، تەق ووڕ.

**تەقەتەق کردن** (ئد) teqeteq kirdin ¹
تەقەو ڕەقە کردن، دەنگە دەنگ کردن، تەقە لێ هاتن.
تەقە و ڕەقە لێ بەرزبوونەوە.

**تەقەتەق کردن** (ئد) teqeteq kirdin ²
پچڕ پچڕ نیش کردن، لەسەر خۆ کارکردن.

**تەقە تێ کەوتن** (کتن) teqe tê kewtîn ¹
چۆڵ بوون، کەس تێدانەمان (لەشوێنێکدا).

**تەقە تێ کەوتن** (کتن) teqe tê kewtîn ²
شیر تێدانەمان، گوان ووشک بوون (ئاژەڵی دۆشەنیی).

**تەقە داکەوتن** (کتن) teqe da kewtîn ¹
تەقەپەیدا کردن، بوون بەتەوە وڕەقە، تەقەدەس پێ کردن.

**تەقە داکەوتن** (کتن) teqe da kewtîn ²
ووتەی ڕەق پەیدابوون یان بلاوبوونەوە (لەناوخەڵکدا).

**تەقە فیرە** (ن،پز) teqefîre
ب (بەلریقە).

**تەقەڵ** (ن) teqel ¹
دانەی دروومان.

**تەقەڵ** (ن) teqel ²
نیشانەی سالیب.

**تەقەڵبەست** (ن) teqelbest
کۆک (دروومان).

**تەقەڵ تێ هەڵدان** (کتپ) teqeltê heldan
١- تەقەڵ دان، تەقەڵ لێ دان، درووین.

٢- دروونەوە (برین).

**تەقەلا** (ن) teqela [1]
تەقالا، تەلاش، تیکۆشیی، رەنج، هەوڵ.

**تەقەلا** (ن) teqela [2]
خەبات،کۆشش، تەلاش، تەفسنە، رەنج وکۆشش، هەوڵ.

**تەقەلا** (ن) teqela [3]
پەلەقاژە.

**تەقەلادان** (کتن،کتپ) teqeladan [1]
ئەرک کیشان، ئەمەگ دان، رەنج دان.

**تەقەلادان** (کتن) teqeladan [2]
خەبات کردن، تێ کۆشان، کۆشش کردن.

**تەقەلادەر** (ن) teqelader
تیکۆشەر، هەوڵدەر.

**تەقەلاکردن** (کتپ) teqela kirdin
تەلاش کردن، هەوڵ دان.
(بۆ وەدەس هینانی شتێ یان جێبەجێ کردنی کاریک).

**تەقەلاکەر** (ن) teqelaker
نیشکەر، رەنجبەر، رەنجکیش، کاسبکار، رەنجدەر.

**تەقەلێ کردن** (ند) teqelê kirdin [1]
ب (توانج تێ گرتن).

**تەقەلێ کردن** (ند) teqelê kirdin. [2]
گاڵتە پێ کردن، فشەپێ کردن، گەپ پێ دان، زرتەک و زرتۆڵە پێ کردن، گەنجەفەپێ کردن، مەزاق پێ کردن.

**تەقەلێ کردن** (کتپ) teqelêkirdin [3]
فیشەک پیوەنان، گوللەتێ گرتن، دانەبەرگوللە.

**تەقەمەنیی** (نک) teqemenî
فیشەک، گوللە...، گوللە وگوللە تۆپی هەمەجەشنە، جبەخانە، گوللەدەرمان، چەک وجبەخانە.

**تەقەی سەر هاتن** (ند) teqey ser hatin [1]
شارەزایی تێدانەبوون،هیچ لێ نەزانین.

**تەقەیسەرهاتن** (ند) teqeyserhatin [2]
لەناخاوتن نەگەیشتن.

**تەقیاگ** (ئان،لو) teqyag(lu)
بیژراوە، لەبیژنگ دراو (دانەویلە).

**تەقیان** (کتن) teqyan [1]
ب (تەقینەوە).

**تەقیان** (کتن) teqyan [2]
دەرچوون، رۆیشتن (بەپەلە).

**تەقیان** (کتپ) teqyan [3]
ئاوریش بوو، لووت بەلووتەوەبوون، لەپڕ چاو بەکەسێ کەوتن.

**تەقیلە** (ن) teqîle
ب (تەقلە).

**تەقیلین** (کتن) teqîlîn
خلیسکان، هەڵخلیسکان.

**تەقین** (کتن) teqîn [1]
تۆقیان، دەرچوون (چەک).

**تەقین** (کتن) teqîn [2]
درزبردن، شەق بردن، قلیشان، درزدان.

**تەقین** (کتن) teqîn [3]
لەت بوون، شکان.

**تەقین** (کتن) teqîn [4]
ئاوپەیدابوون بەزۆریی (لەکانی وکاریز) [لەبەهاردا]، ئاو تەقینەوە.

**تەقینەوە** (کتن) teqînewe [1]
تەقیانەوە، تەقین ودەنگ دانەوە (گوللە...)، تەقانەوە، تەقیان.

**تەقینەوە** (کتن) teqînewe [2]
بلاوبوونەوە (دەنگ وباس).

**تەقینەوە** (کتن) teqînewe [3]
چەوسانەوە، کۆشش کردن، هەوڵ دان (بەبەردەوامیی).

**تەک** (ن) tek [1]
پاڵ، تەنشت، تەنیشت، جەم، رۆخ، رەخ، قەد، قەراغ، کەنار، لیوار

**تەک** (ن) tek [2]
ب (پاڵ).

**تەک** (ن) tek [3]
کادان، کایەن.

**تەک** (ن) tek [4]
چەپەر (لەشووڵ دروستکراو).

**تەک** (ئان) tek [5]
قووڵ، ساکووڵ، سووتاڵ، سووتار، کوور، کوویر....

**تەکان** (ن) tekan [1]
تەووژم، پاڵ، کزریی، لەتر.

**تەکان** (ن) tekan [2]
تەڵەزگە، چورتم، نارەحەتیی.

**تەکان بردن** (کتن) tekan birdin
دڵ داخورپان، دڵ داکەوتن، هەناوکەوتنەخوارەوە.

**تەکان خواردن** (کتن) tekan xwardin
جووڵان (شت لەجێی خۆی).

**تەکان دان** (کتپ،کتن) tekandan
خۆ کوتان بەرەوپیشەوە، بەرەوپیشەوە رۆیشتن، کزردان، لەتردان.

**تەکاندن** (کتپ) tekandin [1]
ب (پرواندن).

**تەکاندن** (کتپ) tekandin [2]
راسکان، راکیشان، لابردن، راپسکاندن، فراندن (شتێ لەپڕ).

**تەکاندن (کتپ)** tekandin
لیس دان، هیچ نەهێشتن، هیچ تێدا نەهێشتن، بەتاڵ کردن.

**تەکاندن (کتپ)** tekandin [2]
داتەکاندن، وەراندن، هەڵ وەراندن، راوەشان. تەکانن (میوە لەدرەخت).

**تەکانەوە (کتن)** tekanewe
تەکینەوە، دوورکەوتنەوە.

**تەکبەند (ن)** tekbend
ب (پشتێن).

**تەک دان (کتن)** tek dan [1]
چوونەپێشەوە، بەرەوپێش چوون.

**تەک دان (کتن)** tekdan [2]
ب (پاڵ دان).

**تەک دانە دواوە (کتن)** tekane dwawe [1]
چوونەدواوە، ڕوویەدواوە کردن، ڕوو بەدواوەنان.

**تەک دانەوە (کتن)** tekaanwe [2]
ب (پاڵ دانەوە).

**تەکسە (ن)** tekse [1]
لاواز.

**تەکسە (ن،لو)** /tekse(lu [2]
لاوازیی.

**تەک کەوتن (کتن)** tek kewtin
لەتەکداڕۆیین، لەگەڵ ڕۆیشتن، هامرابوون.

**تەک کەوتوو (ن)** tek kewtü
تەک کەوتە، دواکەتە، وەتەک کەوتوو، هامرا، هاوڕێ.

**تەکلە (ن،لو)** tekle(lu) [1]
دەرخۆنە، سەرقاپ..

**تەکلە (ن)** tekle [2]
پەیدا، کۆ.

**تەکلە (ن)** tekle [3]
چارە، تیمار.

**تەکلە کردن (کتپ)** tekle kirdin [1]
پەیداکردن، خڕکردنەوە، کۆکردنەوە.

**تەکلە کردن (کتپ)** tekle kirdin [2]
چارەکردن، تیمارکردن، دەرمان کردن.

**تەکۆ (ن)** teko [1]
دڵەڕاوکێ، دوودڵیی، دلاودلیی.

**تەکۆ (ن)** teko [2]
لەرزە.

**تەک وتەنها (ئان)** tekwtenha
ب (تاک وتەنها).

**تەک ودەو (ن)** tekwdew
ب (تەق و دەو).

**تەکوو (نک)** tekü
پاشماوە، پیما، پیما، ماوەوە.

**تەکووز (ئان)** teküz
ئامادە، بەردەس، دەردەس، ساز.

**تەک وەتەکەوە (ن)** tekwetekewe
پشت بەپشتەوە، یەک لەتەنیشت، تەنیشت یەکەوە.

**تەکەتەک (ن.)** teketek [1]
جووڵە جووڵ، شەکەشەک، هاتوچۆ، چەکە چەک.

**تەکەتەک (ئان)** teke tek [2]
شۆڕ، شۆڕەوەبوو.

**تەکەتەک کردن (کتن)** teke tek kirdin
بەل بەل کردن، لەرزانەوە، لەرینەوە.

**تەکەدان (کتن)** tekedan
پاڵ دان، پاڵ دانەیەک، تەکەکردن، تەنگ بەیەک هەڵچنیین، تەنگ پێ هەڵچنیین، چوونەپاڵ یەک.

**تەکەکردن (کتن)** teke kirdin
جووڵانەوە (بۆدواوە و پێشەوە)، هاتوچۆ کردن.

**تەکەڵتوو (ن)** tekeltü
ب (ئارەقگیر).

**تەکەودان (کتن)** tekewdan
ب (پاڵ دانەوە).

**تەکیمە (ن)** tekîme
تەکەنمە، تەکینمە، لباد، لەباد، نمەد.

**تەکیە (ن)** tekye [1]
سەکۆ.

**تەکیە (ن)** tekye [2]
تەکیەگا، خانەقا، خانەگا.

**تەکینەوە (کتن)** tekînewe
دەست لێهەڵگرتن، لێ دوور کەوتنەوە، لێ جیابوونەوە.

**تەگبەند (ن)** tegbend
ب (پشتێن).

**تەگبیر (ن)** tegbîr
پلان، پیلان، تانگ، تەدبیر، ڕاوێژ.

**تەگبیرکردن (کتپ)** tegbîr kirdin [1]
پلان بۆ دانان، پلان دانان، چارەکردن.

**تەگبیرکردن (کتپ)** tegbîr kirdin [2]
بیروڕا گۆڕینەوە، ڕێ پیشان دان، ڕێنماکردن، ڕێنمایی کردن.

**تەگبیرکەر (ن)** tegbîrker
ئەتەر، پرس پێکەر، پێشڕۆ، ڕاوێژیار، ڕێ پیشاندەر، ئامۆژگاریکەر، مۆژیار.

**تەگبیروڕا کردن (ئد)** tegbîr w rakirdin
لەکار ئاگادار کردن.

**تەگبیر وڕاوێژ پێ کردن (کتپ)**
tegbîrw rawêj pêkirdin

پرس پێ کردن.

**تەگر** (ن.کل) tegir(kl)

ب (تەرزەلووکە).

**تەگرگ** (ن) tegirg

ب (تەرزە).

**تەگرەجیلە** (ن.کل) tegrecîle(kl)

ب (تەرزەلووکە).

**تەگرین** (ئان.کل) tegrîn(kl)

تەرزەیی، زۆرسپی، شیریی، بەفریی، بەفرین، زیویی.

**تەگش وبەرانیی** (نک) tegšwberanî

تەگێ وبەرانیی، تیبرەوتێ کوتە.

**تەگە** (ن.ئا) tege

ئەلۆریی، چیتر، خەزەل، نێریی، هەوری.

**تەگەرە** (ن) tegere [1]

ب (تاکۆس).

**تەگەرە** (ن) tegere [2]

ب (تەوەرە).

**تەگەرە** (ن) tegere [3]

ئیمرۆژ وسۆزیی، پا ئەو پا، دەساودەس، دەس ودەس، دەستیی دەستیی.

**تەگەرە** (ن) tegere [4]

بروبیانوو، بەهانە، بیانگە، پەلپ، تەوازۆ.

**تەگەرە** (ن) tegere [5]

بەرامبەریی، تەلەزگە، گیروگرفت.

**تەگەرەتێ خستن** (کتپ) tegere tê xistin [1]

بروبیانوو پێ گرتن، بەهانە پێ گرتن، پەلپ لێ گرتن.

**تەگەرە تێ خستن** (کتپ) tegere tê xistin [2]

ئەگەر تێ خستن، گومان خستنە سەر ووتە وباس، دوو دلیی لێ کردن.

**تەگەرە تێ خستن** (کتپ) tegere tê xistin [3]

ئیش دواخستن، ئیمرۆ وسبەی پێ کردن، تاکۆز خستنە بەر، تەگەرەدان، تەگەرەلێ دان، دەسیی بەدەسیی پێ کردن، کۆسپ خستنەبەر، کۆسپ هێنانە بەر.

**تەگەرە تێ کەوتن** (کتن) tegere tê kewtin

(ئیش) دواکەوتن، تاکۆز هاتنەبەر، کارتێک چوون، کۆسپ هاتنەبەر.

**تەگەرە خستنەبەر** (ند) tegere xistine ber [1]

بروبیانووگرتن، بەهانەگرتن، پەلپ گرتن، تەگەرە هێنانە بەردەم، چقڵ تێ خستن.

**تەگەرە خستنەبەر** (کتپ) tegere xistine ber [2]

پێ لێ گرتن.

**تەگەرە دان** (کتپ) tegeredan

ب (تەگەرە تێ خستن).

**تەگەرە لێ دان** (کتپ) tegere lê dan

ب (تەگەرە تێ خستن).

**تەگەرە هێنانەبەردەم** (ند) tegere hênane berdem

ب (تەگەرە خشتنە بەر).

**تەگە ڵبازیی** (ن) tegeḻbazî

بەرانبازیی، شەرەقۆچ، قۆچبازیی.

**تەل** (ن) tel [1]

یاریدە، پشتگیریی، یارمەتیی.

**تەل** (ن) tel [2]

ب (ئاوارەیی).

**تەل** (ن) tel [3]

سیم، وایەر، تەیل، تێل.

**تەلار** (ن) telar

بلەخانە، کۆشک، کۆچک.

**تەلاسابوون** (کتن) telasabûn

لەئەندازە دەرچوون.

**تەلاش** (ن) telaš

ب (تەقەلا).

**تەلاش کردن** (کتن) telaš kirdin

ب (تەقەلاکردن).

**تەلان** (ن) telan

تەارە، تەلان، پلەی شاخ وکێو، زەوی قەدپال شاخ.

**تەلبەند** (ئان) telbend [1]

چواردەورگیراو، چوار لاگیراو.

**تەلبەند** (ن) telbend [2]

تەلبەنگێ، تەیمان، تان، تانۆکە.

**تەل دان** (کتن) teldan

پەرەوازەبوون، تەل گرتن، جیابوونەوە، دوور کەوتنەوە.

**تەل لێ دان** (کتپ) tel lê dan

بروسکەلێدان، بێ سیم کردن، نامەناردن (بەبێ سیم).

**تەلوار** (ن) telwar

ب (تەروال).

**تەلەبەرد** (ن) teleberd [1]

کێل.

**تەلەبەرد** (ن) teleberd [2]

بەردی پان وتەنگێ ودرێژ، تەلەسەنگێ.

**تەلەس** (ئان) teles

سەرخۆش، مەست، کەیل، کەشەنگ.

**تەلەواژیی** (ئان) telewajî

ب (ئاوەژوو).

**تەلی دڕکاویی** (ن) teleî diṟkawî

ب (ئاسندرکە).

**تەلیس** (ن) telîs
تەلیزە، تیر، گوێنی.
**تەلیسم** (ن) telîsim
ئەفسوون، باربەژن، تەلەسم، دیوبەند، تەلەزم، جادوو.
**تەلیسم باز** (ئان) telîsim baz
ب (ئاوینەگرەوە / ٢).
**تەلیک** (ن) telîk
ئامێن، باخەڵ، باوەش.
**تەلیر** (ئان) ١ telêr
ب (قەلەو).
**تەلیر** (ئان) ٢ telêr
ئەبوتیر، دەفزگێ، زگێ زل، سک زل، ورگن، فرگێ مەزن.
**تەڵ** (ن) ١ teḻ
ب (بەتاڵ).
**تەڵ** (ن) ٢ teḻ
چڵ، لق.
**تەڵا** (ن) teḻa
تلا، تولا، زەڕ، زێڕ، ئالتون.
**تەڵاش** (نک) teḻaš
تۆلاش، تۆلاشە، تەڵەزمی تەنک (دار).
**تەڵاش کردن** (کتپ) teḻaš kirdin
کردن بەتەڵاش.
**تەڵاکاری** (ن) teḻakarî
ئالدووز، تەڵاکفت، زەرکفت، زەرکەفت.
**تەڵاکاری کردن** (کتپ) teḻakarî kirdin
ب (ئالدووز کردن /١).
**تەڵغ** (ئان) ١ teḻx
تاریک، ڕەش، بێ بریسکە، مات (ڕەنگ).
**تەڵغ** (ئان) ٢ teḻx
بەئازار، بەئێش، وئازار، تاڵ تەحل.
**تەڵفیز** (ن) teḻfîz
تەلفیس، گاڵتە، مەزاق.
**تەڵفیز کردن** (کتن) teḻfîz kirdin
ب (گاڵتەکردن).
**تەڵمیت** (ن) teḻmît
ئولاخی بۆسوار ئامادەکراو، ولاخی سواریی، ولاخی زین، ولاخی زین کراو.
**تەڵمیت کردن** (کتپ،کل) teḻmîtkirdin(kl)
١- (ولاخ) زین کردن، زین خستنەسەر پشتی ولاخ. ٢- بارکردن، بارلێ نان، بار خستنەسەر پشت، بەگیر هێنان. ٣- خستنە ژێربار، بارێکی گران خستنەسەر شانی کەسێ.
**تەڵوەنە** (ئان،کل) teḻwene
خوێناویی، لەخوێنەوەگلاو، لەخوێنەوە گەوزاو.

**تەڵوەنە بوون** (کتن،کل) teḻwenebûn(kl)
خوێناویی بوون، لەخوێنەوەگلان، لەخوێنەوە (خوێندا) گەوزان.
**تەڵوەنە کردن** (کتپ،کل) teḻwene kirdin(kl)
خوێناوی کردن، لەخوێنداگلاندن، لەخوێندا گەوزاندن.
**تەڵە** (ن)١ teḻe
ب (تەفرە).
**تەڵە** (ن)٢ teḻe
ب (تەپکە).
**تەڵەپ** (ن) teḻeb
ئارەزووی ماین.. بۆ لێ پەڕین.
**تەڵەکە بازیی** (ن) teḻekbazî
ب (تەفرە).
**تەڵە تەقێن** (ن) teḻe teqên
فێلاویی، فێلباز.
**تەڵەزگە** (ن) ١ teḻezge
ب (ئاپۆرە / ٢).
**تەڵەزگە** (ن) ٢ teḻezge
ئۆبال، پرۆشە، گیچەڵ، وەی.
**تەڵەزگە** (ن) ٣ teḻezge
تەگەرە، کۆسپ، گیروگرفت.
**تەڵەزم** (ن) ١ teḻezim
تیلماسک، زمانە، زووانە(دار).
**تەڵەزم** (ن) ٢ teḻezim
ب (تەلیسم).
**تەڵەکچان** (ن) teḻekiçan
جانتای دەست، جانتای ژنانە (پەڕۆ یان چەرم).
**تەڵەکە** (ن) ١ teḻeke
تەشخەڵە، گەڕ
**تەڵەکە** (ن) ٢ teḻeke
ب (بەرتیل).
**تەڵەکە باز** (ئان) teḻeke baz
بەپیچ وپەنا، فریوباز، فێلباز، کەڵەکەباز، ناڕاست، فێلاویی، گزیکەر، لەخشتەبەر.
**تەڵەکەبازیی** (ن) teḻekebazî
ساختە، ساختەبازیی، ساختەچیتیی، ساختەکاریی، کەڵەکە، کەڵەکەبازیی.
**تەڵەکەدان** (کتپ) teḻekedan
ب (بەرتیل دان).
**تەڵەکەکردن** (کتپ) teḻekekirdin
فێل کردن.
**تەم** (ن) ١ tem
مژ، هەڵاو، تەم ومژ، هەڵم.
**تەم** (ن) ٢ tem
ب (ئانوو).

**تەم** (ن) tem [2]
لیلایی.
**تەما** (ن) tema [1]
ب (ئارەزوو).
**تەما** (ن) tema [2]
تەمە، چلە، چاوەچاوە، رەچاو، قرم.
**تەما** (ن) tema [3]
چاوەڕوانیی، بەندەواریی، بەندەمانیی، پابین،
چاوەڕێیی، چاوەچاو.
**تەمابڕان** (کتن) tema bir̲an [1]
تەمانەمان، ئومێدنەمان، نائومێدبوون، تەما لەخۆنان.
**تەمابڕان** (کتپ) tema bir̲an [2]
بێئومێد کردن، هیوابڕیین، نائومێد کردن.
**تەمابڕاو** (ئان) tema bir̲aw
نائومێد، بێئومێد، بێهیوا (کەسێ).
**تەماتم** (ن) tematim
تورەتور، ورتە، ورتەورت.
**تەماتە** (ن،رو) temate
باجانی شامی، بینجانیی سوور.
**تەمادار** (ئان) temadar [1]
ئارەزوومەند، ئومێدەوار، ئاواتەخواز، بەهیوا، تەماکار، تەمەدار، تاسەمەند، تاسەمەن، گەرەکمەن، گەرەکمەند، تاسەخوار، هیوادار.
**تەمادار** (ئان) temadar [2]
چاوبرسیی، قورگ دڕاو، قورگ دریاگ، تەماعکار، چاوتێر نەخۆر، هەڵپەهەڵپەکەر.
**تەماداریی** (ن) temadarî
ئومێدەواریی، هیواداریی.
**تەمار** (ن) temar [1]
دەماری خوێن.
**تەمار** (ن) temar [2]
پەی، دەمار، رەگ (لەش).
**تەمارتن** (کتپ) temartin
شاردنەوە (لەژێر گڵدا).
**تەماشا** (ن) temaša
تەواشا، تۆواشا، چاوەچاو، سەیر، بەر، لا.
**تەماشاخانە** (ن) temaša xane
پیشانگا، پیشانگە، سەیرگا، تۆواشاخانە، سەیرگە.
**تەماشاکردن** (کتپ) temaša kirdin
بەرتێ کردن، تماشاکردن، بەری خۆدەدان، تێ رامان، چاوتێ کردن.
**تەماشاکردن** (کتپ) temaša kirdin
تاقی کردنەوە، تێ ڕوانیین، تێ نواڕیین، چاوتێ بڕیین، سەرنج لێ دان، لێ ڕوانیین، لێ وردبوونەوە، هێڤ کرن، چەوت وچیلەدان، لێ نۆڕیین.

**تەماعکار** (ئان) tema'akar
ب (تەماکار).
**تەماع سەری نەبڕیت سەرت ئەبڕێ** (پن)
tema'a serî nebrît serit ebr̲êt
تەماعکاریی باوکی چاوتێر نەبوونە. تەماعکاریی مایەی وێرانیی وئێش وئازارە. تەماعکاریی بنچینەی هەموو خراپکارییەکە.
**تەماعکار** (ئان) tema'akar
ب (تەمادار).
**تەما لە خۆنان** (کتن) temalexonan
ب (تەمابڕان).
**تەماڵ** (ن) temal̲
جێ پێ، شوێن پێ (نێچیر)، شوێن دەوس.
**تەماڵ کردن** (کتپ) temal̲ kirdin
شوێن پێی نێچیر بەدیی کردن، جێی نێچیر دیاریی کردن، پێ خوستی ئاژەڵ هەڵگرتن.
**تەماڵ هەڵگرتن** (کتپ) temal̲ kirdin
ب (تەماڵ کردن).
**تەماویی** (ئان) temawî
تەم، بەتەم، بەتەم ومژ.
**تەمباسک** (ن) tembasik
ب (بارستایی).
**تەمبەڵ** (ئان) tembel̲
ب (تەمەڵ).
**تەمتەراق** (ن) temteraq
پایەبەرزیی، گەورەیی، مەزنیی.
**تەمتەم** (ن) temtem [1]
بەردی گەورە، تاوێر، گابەرد.
**تەمتەم** (ئان) temtem [2]
ب (بەردانیی).
**تەمر** (ن) temir
پولی پۆستە.
**تەمراندن** (کتپ) temrandin
ب (ئاگر بڕ کردن / ١).
**تەمریین** (کتن) temrîn
ب (تۆپان).
**تەمسالیی** (ن،کل) temsalî(kl)
ب (تەمەڵیی).
**تەمساڵ** (ئان،کل) temsal̲(kl)
ب (تەمەڵ).
**تەمسالیی کردن** (کتن) temsal̲î kirdin
ب (تەمەڵیی کردن).
**تەمسق** (ئان،کل) temsiq(kl)
کەم و ڕێک و پێک.
**تەمو** (ن) temü [1]
ب (پەراسوو).

ته‌مو (ن) temü [2]

لاته‌نیشت، لاقه‌برغه.

ته‌م وتومان (ئان) tem w tuman

ب (ته‌م ومژ).

ته‌موخ (ن) temux

تاویره به‌رد (له‌لم په‌یدابوو).

ته‌م ومژ (ن) tem w mij

ته‌متومان، ته‌م وتومان، ته‌پ ومژ.

ته‌م ومژ ده‌ست پێ کردن (کتن)
temwmij dest pê kirdin

١- ته‌پ ومژ ده‌ست پێ کردن، ته‌م و مژ بلاوبوونه‌وه. ٢- نمه‌نم باران بارین.

ته‌مووره (ن،نم) temüre

ته‌میره، ده‌مووره، ته‌نبوور، ته‌موو.

ته‌مووره‌زه‌نانێکه بۆخۆی (ند)
temüre zenanêke boxoy

ته‌مووره زه‌نانێکه مه‌پرسه. ١- چڕی وبه‌یه‌کدا چوون، که‌س له‌که‌سه‌وه دیارنه‌بوون.
٢- ژاوه ژاووغه‌ڵبه‌غه‌ڵب کردن، ده‌نگه ده‌نگ و گمه‌گمی زۆر به‌رپابوون.

ته‌مه (ن) teme

ب (ته‌ما).

ته‌مه‌ره (ن) temere

به‌لا، قۆرت، کۆسپ، وه‌ی.

ته‌مه‌زی (ن) temezî

ته‌مه‌سی، ده‌سه‌سڕی ئاوریشم (له‌جیاتی پشتێن به‌کار ده‌هێنرێ).

ته‌مه‌ڵ (ئان) temeḻ [1]

ئاواره، بێ کاره، که‌وده‌ن.

ته‌مه‌ڵ (ئان) temeḻ [2]

کارنه‌که‌ر، تلار، ته‌مبه‌ڵ، ته‌مسال، ته‌نبه‌ڵ، ئه‌واره، ته‌وه‌زه‌ل، پالووته، چرو، سلۆرت، ته‌پلۆس، گرده‌نشین، ولووڵ، کارلێ نه‌هاتوو، له‌ش گران.

ته‌مه‌ڵ (ن) temeḻ [3]

ب (بناخه).

ته‌مه‌ڵخانه (ن) temeḻxane

خانوی په‌ک که‌وته‌کان، نیشته‌جێی عه‌مه‌ل مه‌نده‌کان.

ته‌مه‌ڵیت (نک) temeḻît

ته‌مه‌له، خورجێن.

ته‌مه‌ڵی (ن) temeḻî Laziness, (n.).

تلاری، ته‌مبه‌ڵی، ته‌نبه‌ڵی، ته‌نگه‌زکری، له‌ش به باری، له‌ش قورسی،له‌ش گرانی، که‌وده‌نی، گلۆری.

ته‌مه‌ڵی کردن (کتن) temeḻî kirdin

ئیش نه‌کردن، تلاری کردن، ته‌مبه‌ڵی کردن، ته‌نبه‌ڵی کردن، ته‌نگه‌زکری کردن، ته‌وه‌زه‌لی کردن، ته‌وه‌زه‌ل بوون، سستی کردن. که‌مته‌رخه‌می کردن.

ته‌مه‌ن (ن) temen

ماوه‌ی ژیان، درێژایی ژیان، عومر.

ته‌مه‌ن درێژ (ئان) temen drêj

به‌ته‌مه‌ن، ئاحیل، پۆس، به‌ساڵداچوو، پیر.

ته‌میان (کتن) temyan

ب (ته‌مبین).

ته‌میره (ن،نم) temîre

ب (ته‌مووره).

ته‌مێ (ن) temê

١- ئامۆژگاری، وریایی، کاری وریاکردنه‌وه.
٢-نیمچه‌گله‌یی، ورده‌ره‌خنه، نیوه‌گله‌یی.

ته‌مێ بوون (کتن) temêbün

ته‌مێ خواردن، ته‌مێ خواردوو بوون.

ته‌مێ خواردن (کتن) temêxwardin

ب (ته‌مێ بوون).

ته‌مێ خۆر (ئان) temêxor

ته‌مێ بوون.

ته‌مێ کردن (کتپ) temê kirdin

ئامۆژگاری کردن، وریاکردنه‌وه.

ته‌مێکه‌ر (ن) temêker

ئامۆژگاریکه‌ر، چاوسوورکه‌ره‌وه، وریاکه‌ره‌وه.

ته‌میز (ئان) temîz [1]

پاک، ته‌میس، خاوێن، پاکژ، پرچه‌ڤان.

ته‌میز (ئان) temîz [2]

ته‌بار، ڕێک وپێک.

ته‌میز (ئان) temîz [3]

بژارده، بژێراو، پوخته.

ته‌میزبوون (کتن) temîzbün [1]

ته‌باربوون، ڕێک وپێک بوون.

ته‌میزبوون (کتن) temîzbün [2]

پاک بوون، خاوێن بوون.

ته‌میزبوونه‌وه (کتن) temîzbünewe

پاک بوونه‌وه، خاوێن بوونه‌وه.

ته‌میزڕاگرتن (کتپ) temîz ṟagirtin

پاکڕاگرتن، خاوێن ڕاگرتن.

ته‌میز کراو (ئان) temîz kiraw

ب (پاکراو).

ته‌میز کردن (کتپ) temîz kirdin

پاک کردن، خاوێن کردن، پاکژ کردن.

ته‌میزی (ن) temîzî [1]

پاکی، ته‌میسی، خاوێنی.

ته‌میزی (ن) temîzî [2]

ته‌باری، ڕێک وپێکی، ڕێکی.

**تەمین** (کتن) temîn
تەمیان، خەم خواردن، خەم داگرتن.
**تهن** (نان،کی) tihin(ki)
ب (تینوو).
**تهن بوون** (کتن،کی) tihinbün(ki)
ب (تینوو بوون).
**تەن** (ن) ten [1]
ئەنام، ئەندام، بەدەن، تەمنە، جەستە، لاشە، لەش، ڕواڵەت، کلۆخ.
**تەن** (ن) ten [2]
تن، کەفەڵ.
**تەن** (ن) ten [3]
توانا، توانایی.
**تەن** (ن) ten [4]
تەنیی، ڕەشیی مەنجەڵ.
**تەناباز** (ن) tenabaz
ب (تەنافباز).
**تەناف** (ن) tenaf
پەت، تەل (کەبە بەرزییەوە بگیرێ).
**تەنافباز** (ن) tenafbaz
تەنابان، داربان، گوریس باز، گوریز باز، پاڵەوان.
**تەنافبازیی کردن** (کتن) tenafbazî kirdin
یاریی کردن لەسەر تەناف.
**تەنانەت** (ناک) tenanet [1]
تەنانە، هەتاوەکوو، ئان.
**تەنانەت** (نب) tenanet [2]
بەلام، بەلان، لێ، وەلێ.
**تەنانەت** (ناک) tenanet [3]
بەتایبەتیی.
**تەنبوو** (ن،جج) tenbü
ب (گەنە).
**تەنبوور** (ن،نم) tenbür
ب (تەموورە).
**تەنبووریی** (ن) tenbürî
کاکۆڵی (قژ).
**تەن بەتەن** (ناک) ten beten [1]
یەک بەرامبەر یەک، ڕوو بەڕووی یەکتر.
**تەن بەتەن** (ناک) ten beten [2]
لەش بەلەشەوە، یەک لەتەنیشت یەکەوە.
**تەنبەکی** (ن،ڕو) tenbekî
تنباکە، توتنی نێرگەلە.
**تەنبەڵ** (نان) tenbel
ب (تەمەڵ).
**تەن پەروەر** (نان) tenperwer
تەنخوا، خۆپەرست، خۆخۆ، خۆ خوویکەر.

**تەن پەروەریی** (ن) tenperwerî
خۆپەرستیی، خۆ خۆیی، تەنخوایی، خۆ خۆییکەریی.
**تەنتەنە** (ن) tentene [1]
فیز، فیز ودەمار، لووت وبەرزیی.
**تەنتەنە** (ن) tentene [2]
تەدارەک، جوانیی، ڕێک وپێکیی.
**تەنخوا** (نان) tenxwa [1]
ب (تەن پەروەر).
**تەنخوا** (ن) tenxwa [2]
باتیی، برەتیی، بریتیی، بریی، جێگە، جیاتیی، جێگە، جیە.
**تەنخوا** (ن) tenxwa [3]
دەستمایە، دەسمایە، سەرمایە.
**تەن دروست** (نان) tendirust
بەکێش، بەهێز، پڕزیو، لەش ساغ.
**تەن دروستیی** (ن) tendirustî
باشیی(لەش)، بەجێیی، پایەداریی، چاکیی، لەش ساغیی.
**تەندوور** (ن) tendür
ب (تەنوور).
**تەندووریی** (ن) tendürî
ب (بریانیی).
**تەنراو** (ن) tenraw
تەنیاگ، چنراو.
**تەنشت** (ن) teništ
ب (تەنیشت).
**تەنک** (نان) tenik [1]
تیواڵ، شاش.
**تەنک** (نان) tenik [2]
باریک، نازک، ناسک.
**تەنکاو** (ن) tenkaw
بوار، بووار، تەنگاف.
**تەنک بوون** (کتن) tenikbün [1]
شاش بوون.
**تەنک بوون** (کتن) tenikbün [2]
کزبوون، کەم بوون، زۆربەبەرەوە نەمان.
**تەنک کردن** (کتن) tenikkirdin [1]
شاش کردن، تەنکەکردن، ناوبەناو چڵ لێ هەڵکێشان (باخ).
**تەنک کردن** (کتپ) tenik kirdin [2]
کەم بەبەرەوەهێشتن، لێ کەم کردنەوە.
**تەنک کردن** (کتپ) tenik kirdin [3]
زۆر (بۆ) لێ خشاندن.
**تەنک وتیواڵ** (نان) tenik wtîwal
تەنک وەک تویژاڵ، زۆر تەنک.

**تەنکە کردن** (کتپ) tenike kirdin
ب (تەنگ کردن).

**تەنگ** (ئان) ١ teng
تەسک.

**تەنگ** (ئان) ٢ teng
بێ دەرەتان، بێ باڵ، بێچێ وپێ، لانەواز.

**تەنگ** (ن) ٣ teng
ب (تەنگاو).

**تەنگ** (ئان) ٤ teng
ب (پاڵ پشت).

**تەنگاڤ** (ن،کی) ١ tengaw(ki)
ب (تەنگاو).

**تەنگاڤ** (ئان،کی) ٢ tengaw(ki)
ب (تەنگاو).

**تەنگاڤ** (ئان،کی) ٣ tengaw(ki)
ب (تەنگەبەر).

**تەنگاڵ** (ن) tengal
ب (تەنیشت).

**تەنگانە** (ن) tengane
ناپوورە، تەنگ وچەڵەمە، سەختیی، کاتی لێ قەومان.

**تەنگاو** (ئان) ١ tengaw
تەنگەتاو، زۆر بۆ هاتوو، ناڕەحەت (بوو)، تەنگاڤ.

**تەنگاو** (ئان) ٢ tengaw
تەنگاوەر، تەنگە، تەنگەڵان، دەرگە، دەربەند، دەروو، دڕناڵ، گەلوو، دەرە، گەروو، گەلیی، تەنگ، ئەو دۆڵەی لە نێوان دوو کێودا ئاوی پیدا دەڕوات، تەنگاڤ.

**تەنگاوبوون** (کتن) ١ tengawbün
بەگیرهاتن، تەنگەتاو بوون، تەنگ بەگیر هاتن، چوورتم بەسەرهاتن، زۆر بۆ هاتن، تەنگ بوون، شپرزەبوون، کەوتنە چورتمەوە، کەوتنە ناڕەحەتییەوە، لێ قەومان.

**تەنگاو بوون** (کتن) ٢ tengawbün
کاری ناودەست هەبوون، گووهاتن.

**تەنگاوکردن** (کتپ) tengaw kirdin
ب ( ).

**تەنگاوەر** (ن) tengawer
ب (تەنگاو).

**تەنگاویی** (ن) tengawî
تەنگاو، تەنگیی، چورتم، سەختیی، لێ قەومایی، ناڕەحەتیی.

**تەنگ ئەڵچنین** (کتپ) teng elçinîn
ب (تەنگ هەڵچنین).

**تەنگ ئەڵکێشان** (کتپ) teng elkêšan
ب (تەنگە هەڵکێشان).

**تەنگ بوون** (کتن) ١ tengbün
تەسک بوون، تەنگەوبوون.

**تەنگ بوون** (کتن) ٢ tengbün
ب (تەنگاوبوون).

**تەنگ پێ هەڵچنین** (کتپ) teng pê helçinîn
تەنگەتاو کردن، زۆربۆ هێنان، لاڵێ بڕیینەوە، ناچار وبێزار کردن، ناڕەحەت کردن.

**تەنگ دان** (کتپ) tengdan
بەستن، تەنگە توند کردن، تەنگەدان، تەنگەکێشان، شەتەک دان، گرێ دان.

**تەنگ دەست** (ئان) tengdest
تەنگ دەس، نەدار، نەدارا، هەژار.

**تەنگ دەستیی** (ن) teng destî
تەنگیی، دەست تەنگیی، نەدارایی، نەداریی، هەژاریی.

**تەنگ ژیین** (کتن) teng jîn
تووڕەبوون، ڕق هەستان.

**تەنگ کردن** (کتپ) teng kirdin
تەسک کردنەوە، تەنگەبەر کردن، تەنگەو کردن.

**تەنگ وچەڵەمە** (ن) ١ teng w çeleme
سەختیی وگیروگرفت.

**تەنگ وچەڵەمە** (نک) ٢ teng w çeleme
ناڕەحەتیی، سەغڵەتیی.

**تەنگ و چەڵەمە هێنانەڕێ** (ند) tengwçelemehênanerê
ب (تووش کردن).

**تەنگە** (ن) ١ tenge
ب (تەنگاو).

**تەنگە** (ن) ٢ tenge
کەمەر، ناوقەد (مرۆڤ).

**تەنگ هاتن** (کتن) tenghatin
ب (تەنگاو بوون).

**تەنگ ئەستوور** (ئان) teng estür
زگ زل، سک زل، ورگن.

**تەنگەبەر** (ئان) tengeber
بەرتەسک، تەنگ، تەنگاڤ.

**تەنگەبەریی** (ن) tengeberî
بەرتەسکیی، تەسکیی، تەنگەوەریی، تەنگیی.

**تەنگەتاو** (ئان) tengetaw
ب (تەنگاو).

**تەنگەتاوبوون** (کتن) tengetawbün
ب (تەنگاوبوون).

**تەنگەتاو کردن** (کتپ) tengetaw kirdin
بەگیرهێنان، تەنگاو کردن. خستنەناڕەحەتییەوە. زۆر بۆ بردن، لێ تونگ کردن، لێ هەڵپێچان. هەراسان کردن.

**تەنگەتیلە** (ئان) tengetîle ١
ب (تووڕە).
**تەنگەتیلە** (ئان) tengetîle ٢
قورس، قەڵەو (ئاژەڵ).
**تەنگەتیلەبوون** (کتن) tengetîle bün
ب (تووڕەبوون).
**تەنگەدان** (کتپ) tengedan
ب (تەنگ دان).
**تەنگەکێشان** (کتپ) tenge kêšan
ب (تەنگ دان).
**تەنگەگرتن {بەتەوسەوە}** (ند) ١ tenge girtin
پەست بوون، دڵگیربوون.
**تەنگەگرتن** (کتن) ٢ tengegirtin
زۆرتووڕە بوون، هەڵچوون.
**تەنگەلان** (ن) tengelan
تەنگەی دەریا، دەروو، گەروو.
**تەنگەنەفەس** (ئان) tenge nefes
تەنگە هەناسە، هەناسەتونگ، هەناسەسوار.
**تەنگەنەفەس بوون** (کتن) tengenefesbün
برش هەڵاتن، پێش خواردن، پێش هەڵاتن.
**تەنگەنەفەسی** (ن.پز) tenge nefesî
بەرهەنگ، هەناسەتوندیی، هەناسەسواریی، برش، هەناسە تەنگیی.
**تەنگ هەڵچنین** (کتپ) teng helçinîn
تەنگ تەڵچنین، زۆر لەسەر کردن.
**تەنگەوبوون** (کتن) tengewbün
ب (تەنگ بوون).
**تەنگەوکردن** (کتپ) tengewkirdin
ب (تەنگ کردن).
**تەنگە هەڵکێش** (ن) tenge helkêš
تەنگەقاییمکەر، پشتێنە (چەرمێکی باریکە تەنگەی وڵاخی پێ توند دەکرێ).
**تەنگە هەڵکێشان** (کتپ) tenge helkêšan
تەنگ تەڵکێشان، تەنگە بەستن.
**تەنگیی** (ن) tengî
ب (تەنگەبەریی).
**تەنگیی** (ن) tengî
ب (تەنگاویی).
**تەن نادروست** (ئان) ten nadirust
لەش بەبار، ناساغ، نەخۆش.
**تەنواویی** (ئان) tenwawî
ب (بۆرە لووک).
**تەنومەن** (ئان) tenwmen
ب (بەخۆ).
**تەنوور** (ن) tenür
تەندوور، تەنیر.

**تەنوور بۆ کەسێ داخستن** (ند) tenür bo kesê daxistin
بەگەرم باسی خراپەی کەسێ کردن، ناوی یەکێ لەپاشملە بێخراپەهێنان، کۆڕ بۆ مرۆڤێ گرتن بەنەهێنیی، گەلەکۆمەکێ لەکەسێ کردن بەپەنهانیی.
**تەنوور تا گەرمە نان دەبرژێنێت** (پن) tenür ta germe nan debirjênêt
مەبەست هەل لەدەست نەدانە.
**تەنوور داخستن** (کتپ) tenür daxistin
تەنوور خستن، تەنوور گەرم کردن.
**تەنوورە** (ن) ١ tenüre
دۆڵیانی ئاش، تەنوورەی ئاش، تەنیرە ئاسیاو.
**تەنوورە** (ن) ٢ tenüre
گێژەلووکە.
**تەنوورە** (ن) ٣ tenüre
ب (ئاتە / ١).
**تەنەخیی** (ن) tenexî
دریخیی، ساردوسڕیی، سستی، کەمتەرخەمیی، تەرکە خەمیی، خوێڕنگێ.
**تەنەخیی کردن** (کتپ) tenexî kirdin
دریغیی کردن، خستنەپشت گوێ، کەمتەرخەمیی کردن، تەرکەخەمیی کردن، سستیی کردن، گوێ نەدان، دانەپشت گوێ.
**تەنها** (ئان) ١ tenha
تاک وتەنها.
**تەنها** (ئاک) ٢ tenha
بەس، هەر.
**تەنها** (ئان) ٣ tenha
ئاوارتە، جوێ، جیا.
**تەنها خۆر هاوڕێی شەیتانە** (پن) tenha xor hawrêy šeztane
مەبەست دەست نیشان کردنی میواندارێتیی وخێرخوایی کوردەوارییە.
**تەنهایی** (ن) tenhaî
بێ هاودەمیی، تاکیی، تەنیایی.
**تەنەکەچیی** (ن) tenekeçî
تەنەکەساز.
**تەنی** (ئان) tenî
ب (تەنها).
**تەنیا** (ئان) tenya
بێ باڵ، بێ یارمەتیی، تاق، تاک، تەنها.
**تەنیا باڵ** (ئان) ١ tenya bal
بێ یارمەتیدەر، بێ یاریدەدەر.
**تەنیا باڵ** (ئان) ٢ tenya bal
ب (تاقانە).

**تەنیا باڵیی** (ئان) tenya baḻî
بێ باڵیی، بێ یارمەتیی، تاک وتەنهایی، تەنهایی، تەنیایی.
**تەنیاگ** (ن) tenyag
ب (تەنراو).
**تەنیان** (کتپ) tenyan
چینان، هۆنیان، هۆنیین، چنیین، تیک هەڵکیشان.
**تەنیایی** (ن) tenyaî
پەناگیریی، تاکیی، تەنهایی، گۆشەگیریی.
**تەنیایی لە ئاوەڵی خراپ باشترە** (پن)
tenyaî le aweḻî xirap baštire
مەبەست پیشان دانی ئەفرەتە لەهاوڕێی خراپ.
**تەنیشت** (ن) tenîšt
بەر، پاڵ، ترکەش، تەرکە، تەموو، تەنشت، تەشک، تەنگاڵ، ڕەخ، ڕوو، کێل، لا.
**تەنین** (کتپ) tenîn
ب (تەنیان).
**تەنینەوە** (کتن) tenînewe
بڵاوبوونەوە، پەرەسەندن، هەموولایەک گرتنەوە.
**تەو** (ن،پز) tew
ب (تا).
**تەوا** (ن) tewa [1]
ب (تەما).
**تەوا** (ن) tewa [2]
ب (تشت).
**تەوات** (ئان) tewat
لەسەرخۆ، هێدیی، هێمن.
**تەوادار** (ئان) tewadar
بەتەما، تەمادار.
**تەوار** (ن،م) tewar [1]
ب (تەڕلان).
**تەوار** (ئان) tewar [2]
پێگەیشتوو، دەستە، هەراش(مزو).
**تەوار** (ئان) tewar [3]
جوان، جوان، خن، دەلال، فۆدل، قشت، قشتیلانە، قۆز، نەشمیل.
**تەوازۆ** (ن) tewazo [1]
ئەتەر، پەلپ، بەهانە، بیانگە، بیانوو.
**تەوازۆ** (ن) tewazo [2]
بینەوپەرۆی هەڵویست، ڕاڵە، عۆزر خوایی.
**تەوازۆ کردن** (کتپ) tewazo kirdin
بیانگە هینانەوە، داوای لێ بوردن کردن، عوزرخوایی هینانەوە.
**تەواسانن** (کتپ) tewasanin
دڵ سارد کردنەوە، هێدی کردنەوە، هیمن کردنەوە.

**تەواساو** (ئان) tewasaw
ب (تراڵ).
**تەواسیان** (کتن) tewasiyan
تەواسیانەوە، دڵ ساردبوونەوە.
**تەواش** (ئان) tewaš
ڕلن، چەوریی، لۆن (بۆ خواردن، چەورکردن، پێست هەنوون).
**تەواشا** (ن) tewaša
ب (تەماشا).
**تەوان** (کتن) tewan
ب (پێ کران).
**تەوانا** (ن) tewana
ب (توانا).
**تەوانایی** (ن) tewanayî
ب (توانایی).
**تەوانج** (ن) tewanc
ب (توانج).
**تەوانچە** (ن) tewançe
ب (دەمانچە).
**تەواو** (ن) tewaw [1]
ب (بەڕێ وجێ).
**تەواو** (ن) tewaw [2]
دوایی (هاتوو)، بنەبان، کۆتایی(هاتوو)، پاشین، دەمایی، پاومان.
**تەواوبوون** (کتن) tewawbûn [1]
ئەنجام هاتن، برنەوە، برپانەوە، بەئەنجام گەیشتن، بەجێ هاتن، جێ بەجێ بوون، دوایی هاتن، کۆتایی هاتن، گەیشتنە ئەنجام.
**تەواوبوون** (کتن) tewawbûn [2]
ئاو فرێ دان، ئاو هاتنەوە، بوون، ڕەحەت بوون.
**تەواوکردن** (کتپ) tewaw kirdin [1]
برینەوە، بەس کردن، تەس کردن، کۆتایی هینان.
**تەواوکردن** (کتپ) tewaw kirdin [2]
ئەنجام دان، ئەنجام هاوردن، بردنەسەر، براندنەوە، برینەوە، بەئەنجام گەیاندن، جێبەجێ کردن، دوایی پێ هینان، دوایی هینان، دوایی هاوردن، کۆتایی هینان، گەیاندنە ئەنجام.
**تەواویی** (ن) tewawî
دروستیی، گشت، هەموو، یەکجاریی، ئیجگاریی.
**تەوتین** (ن) tewtîn
لەسەرخۆیی.
**تەوخ** (ن) tewx
زاخە، گەوڕ، تەویلە، تاولە، شتیر.
**تەور** (ن) tewr [1]
بفر، بیفر، بیور، تەبر، تەفر.

**تەور (ئاک)** tewir [2]
بەجارێ، بەجارێک، خڕ، خڕپێکڤە، هەموو، هەموو پێکەوە.
**تەورزین (ن)** tewirzîn
تەبەرزین، دارەدەستێکە تەورێکی بچوکی پێوەیە.
**تەورکلکی خۆی نابڕێتەوە (پن)** tewirkilkîxoynabrêtewe
مەبەست وەفادارییە لەنێوان هاوڕێیاندا.
**تەوز (ئان)** tewz
پێ گەیوو، گەیشتوو، گەیوو(میوە).
**تەوزە (ن)** tewze
ب (گاڵتە).
**تەوزە پێ کردن (کتپ)** tewze pê kirdin
ب (گاڵتە پێ کردن).
**تەوزیل (نک،کل)** tewzîl(kl)
لق وپۆپ، لک، کەل، کەد، تا(دارو درەخت).
**تەوزیل کردن (داروودرەخت) (کتپ)** [1] tewzîl kirdin (darw dirext) (kl)
لق وپۆپ داهێنان، لق وپۆپ دەرکردن.
**تەوزیل کردن (کتن،کل)** [2] tewzîl kirdin(kl)
لق وپۆپ کردن، لق وپۆپ دەرکردن.
**تەوزیم (ن)** tewzîm
پێویستیی، پێداویستیی، ناچاریی.
**تەوژم (ن)** tewijim [1]
بەزە، پێز، قین، هێز، گوژمە.
**تەوژم (ن)** tewijim [2]
ب (تین).
**تەوس (ن)** tews [1]
تاس، بێ هۆشیی.
**تەوس (ن)** tews [2]
تانە، توانج، تیلە وتوانج، لۆمە.
**تەوس بردنەوە (کتن)** tews birdinewe
تاس بردنەوە، تاس بەسەرداهاتن،
بێ هۆش بوون، تاسانەوە.
**تەوش (ئان)** tewš
بێ جێ، بێ داخوان، بێ پێ وجێ، بێکار، هیچ وپووچ.
**تەوش کردن (کتپ،کل)** tewškirdin(kl)
ڕنین، کۆکردنەوە، لێ کردنەوە (میوە).
**تەوشکەر (ن،کل)** tewšker(kl)
میوەڕن.
**تەوشی (ن)** tewšî
١- ب (تەشپی). ٢- لەگەن.
**تەوق (ن)** tewq [1]
بازنە، چەمەرە.

**تەوق (ن)** tewq [2]
ب (ئاپتەر / ٢).
**تەوق (ن)** tewq [2]
ب (ئەلقە / ١).
**تەوق (ن)** tewq [2]
گەردانە، گەردن بەن، گەردن بەند.
**تەوقەتە (ن)** tewqete
ب (تەوقەسەر).
**تەوقەسەر (ن)** tewqeser [1]
ب (پۆپە).
**تەوقەسەر (ن)** tewqeser [2]
تەپڵەسەر، تەپەکە، تەوقەتە، تەوقەن، تەوقەنە، تەوقی سەر.
**تەوقەکردن (کتن)** tewqekirdin
دەست ومست کردن، دەست وموج کردن، مووچیاریی کردن (لەگەڵ کەسێکدا بۆ سوپاسگوزاریی یان
پیرۆزبایی).
**تەوقەن (ن)** tewqen
ب (تەوقەنە).
**تەوگرتن (کتن،کل)** tewgirtin(kl)
ب (تاگرتن).
**تەول (ن)** tewl
پەت، ڕست، گوریس، هەوسار.
**تەومان (ن)** tewman
دەمەر قۆپان، پانتۆل، شەروال.
**تەون (ن)** tewn [1]
ڕایەڵ، ڕاییل، ڕاهێل جوومک.
**تەون (ن)** tewn [2]
ب (تەونی جاڵجاڵۆکە).
**تەون کردن (کتپ)** tewn kirdin
(ڕایەڵ)چنینی بە (پۆ) کەبەدار تەونەوە بێ، با هەڵ دان.
**تەونکەر (ن)** tewnker
تەونکەر.
**تەون لێ گرتنەدار (ئد)** tewn lê girtine dar
بیانوو پێ گرتن، پەلپ لێ گرتن، پەلپ پێ گرتن.
**تەونی جاڵجاڵۆکە (ن)** tewnî calcaloke
مێلانەجاڵجاڵۆکە، تەفنک، تەفنکاپیرێ.
**تەووژم (ن)** tewüjim
تین، هێز.
**تەووژم هێنان (کتن)** tewüjim hênan
تین بۆهێنان، زۆر بۆ هاتن، زۆر بۆ هێنان.
**تەووشق (ن)** tewüšiq
ب (تەشق).

تەوەرە (ن) tewere [1]
تەگەرە، کەوەرە، گرە.

تەوەرە (ن) tewere [2]
ب (ئاشووب / ١).

تەوەرە بەدار کردن (ئد) tewere be dar kirdin
ئاشووب گیران، پشێویی گیران، پشێویی هەڵگیرساندن، پشێویی نانەوە.

تەوەزەل (ئان) tewezel
ب (تەمەڵ).

تەوەشق (ن) tewešiq
ب (تەشق).

تەوەق (ن) teweq [1]
حاجەت، دەوری، قاپ.

تەوەق (ن،پز) teweq [2]
ب (تەبەق).

تەوەل (ئان) tewel
سەرسەری، بێ نرخ، هیچ وپووچ، هیچ تێدا بەستەنەبوو (مرۆڤ).

تەوەلابوون (کتن) tewelabûn
ب (پەست بوون).

تەوەن (ن) tewen [1]
ب (بەرد / ١).

تەوەن (ن،کل) tewen(kl) [2]
بیر، هۆش، هوێر، یاد.

تەوەن بردن (کتن، کل) tewen birdin(kl)
بیرکردنەوە، تێ فکرین، چوونەژێر یادکردنەوە، چوونە قووڵایی بیرکردنەوە.

تەوەنە (ن) tewene
کۆمەڵە.

تەوەنەدان (کتن) tewenedan
کۆمەڵە پێکان، کۆمەڵەدان.

تەوەنیی (ن) tewenî
ب (بەرد / ١).

تەوێ (ئاک) tewê [1]
دەبێ، دەشێ، ڕەنگە، لەوانەیە، وێ دەچێ.

تەوێ (ف) tewê [2]
پێویستە، گەرەکە.

تەوێڵ (ن) tewêḻ
ب (ئەنی).

تەویلە (ن) tewîle
پاگە، پشتیر، تیولە، خۆلە، کۆتان، کۆلیت، گەوور، تەژیر، هەرخان.

تەهنە (ن) tehne
ب (تەن).

تهنوویی (ن) tihnüyî
ب (تینوویتیی).

تەی (ئان) tey [1]
١- تەیەوبووگک، دەرهاتوو، ڕام بوو، لینیی، مالیی.
٢-دەرهاتوو، قاڵ بوو.

تەی (نج) tey [2]
زۆرگەڕان بەشوێن شتدا.

تەیاخ (ن) teyax
تیلا، لیس.

تەیار (ئان) teyar
ب (ئامادە).

تەیارە (ن) teyare [1]
فرۆک، فرۆکە.

تەیارە (ن) teyare [2]
نیشتگەی باز (ئەو شوێنەی باز یان باڵندەی کێویی لەسەر دەنیشێتەوە).

تەیان (ن) teyan [1]
کارەکەر.

تەیان (ن) teyan [2]
تیان، تیانە، قازان، مەنجەڵی زنجیر لەمل، مەنجەڵی گەورە.

تەیچە (ن) teyçe
تەپکە، سەبەتە، سەڵەی توولین، نانەشان، پەلاو پاڵێو.

تەیری گوڵ ئاشق بەداری زەقنەمووتە (پن) teyrî gul aşiq be darî zeqnemüte
مرۆڤی هیچ وپووچ پابەندی شتی هیچ وپووچە، چاکە لەمرۆڤی خراپ ناوەشێتەوە.

تەیسان (کتن،کی) teysan(ki)
ب (بریسکانەوە).

تەیسین (کتن،کی) teysîn(ki)
ب (بریسکانەوە).

تەی کردن (کتپ) tey kirdin [1]
بەشوێن داگەڕان، پشکنین، زۆر لەدوو گەڕان، لەدوو گەڕان، لێ گەڕان (لەشتێ یان بۆ کەسێ).

تەی کردن (کتپ) tey kirdin [2]
ب (برینەوە).

تەیکە (ن) teyke
ب (تەیچە).

تەیڵ (ن) teyḻ [1]
ب (تەڵ).

تەیل (ن) teyl [2]
پەلە، خێرایی.

تەیمان (ن) teyman
ب (پەرژین).

**تەیمان کردن** (کتپ) teyman kirdin
١- پەرژین کردن، تەلبەند کردن، حەسار کردن.
٢- پـیش لێ گـرتن، چـوار دەور گـرتن، دەورگـرتن، تەوق کردن.

**تەیەوبوون** (کتن) teyewbün
دەرهاتن، رام بوون، قاڵ بوون.

**تەیەوکردن** (کتپ) teyew kirdin
رام کردن، رامینان، ماڵی کردن(گیانەوەر).

**تێ** (ن) tê [١]
مەرج.

**تێ** (ن) tê [٢]
ب (بەڵێن / ١).

**تێ** (ن،پز) tê [٣]
ب (تا).

**تێ ئاخنین** (کتپ) tê axinîn
ب (پڕ کردن).

**تێ ئاڵان** (کتن) tê a̲lan
ئاڵۆسکان.

**تێ ئاڵاندن** (کتپ) tê a̲landin
ئالاندن، پێچان.

**تێ ئاویشتن** (کتپ) tê awîštin
ب (تێ خستن).

**تێ بردن** (کتپ) tê birdin [١]
ب (تێ خستن).

**تێ بردن** (کتپ) tê birdin [٢]
تێ هەڵکیش کردن.

**تێ بردن** (کتپ) tê birdin [٣]
پێوە چەسپاندن، لێ قاییم کردن.

**تێ بڕین** (کتپ) tê bir̲în
پێداکردن، تێ ترنجاندن، تێ خستن، تێ کوتان.

**تێ بەربوون** (کتپ) tê berbün [١]
لێ بەربوون، بەگژ یەکداچوون، بەگژیەکترا چوون.

**تێ بەربوون** (کتپ) tê berbün [٢]
لێ بەربوون، شکاندن (کەسێ).

**تێ بەربوون** (کتپ) tê berbün [٣]
تێ بەربوون (بەچکەی ئاژەڵ لەگوانی دایکیان).

**تێ بەربوون** (کتپ) tê berbün [٤]
سواربوون (نێر بۆ مێ -ئاژەڵ).

**تێ بەردان** (کتپ) têberdan [١]
١- تێ کردن، بێچوی ئـاژەڵ بـەردان لـەدایکیان (بـۆ شیر خواردن). ٢- بەردان، بەرەڵاکردن سـەگی ڕاو یان تانجی بۆ گیانی ئاژەڵ).

**تێ بەردان** (کتپ) têberdan [٢]
بەگژداکردن،بەگژیـەکتردا کـردن، تێـک بـەردان، لێـک بەردان، بەشەڕدان.

**تێ بیریان** (کتپ) têbîryan
بـیر پـێدان، بـیرلێ کردنـەوە، بیروەکـردن، هـۆش پێدان.

**تێبین** (ئان) têbîn
وورد بینی.

**تێبینی** (ن) têbînî [١]
وورد بینی..

**تێبینی** (ن) têbînî [٢]
ئاگاداریی، ئامۆژگاریی.

**تێبینی کردن** (کتپ) têbînî kirdin
تێبینیین، دووربینیی لەکاردا کردن، ووردبوونەوە.

**تێ پەڕاندن** (کتپ) tê per̲andin [١]
بردن، ڕافڕاندن.

**تێ پەڕاندن** (کتپ) tê per̲andin [٢]
جێبەجێ کردن، ڕاپەڕاندن (کارێ بەدەست وبرد).

**تێ پەڕاندن** (کتپ) tê per̲andin [٣]
ئـاواکردن، بردنەئەویـەر، پـەڕاندنەوە، پـەڕاننەوە، دەرباز کردن، تێپەڕکردن.

**تێپەڕاندن{ژیان}** (کتپ) têper̲andin(jiyan) [٤]
تێپەڕکردن، قەتاندن، گوزەراندن.

**تێپەڕاندن** (کتپ) tê per̲andin [٥]
لەئەندازە دەرکردن، لەئەندازەدەرچوون.

**تێپەڕاندن** (کتپ) tê per̲andin [٦]
ب (بواردن / ٣).

**تێپەڕبوون** (کتن) têper̲ bün [١]
تێپەڕیین، دەربازبوون، گوزەرکردن.

**تێپەڕبوون** (کتن) têper̲ bün [٢]
بەسەرچوون، تێپەڕیین،ڕابردن، بڕانەوە، ڕابووردن.

**تێپەڕبوون** (کتن) têper̲ bün [٣]
لەئەندازە دەرچوون.

**تێپەڕبوون** (کتن) têper̲ bün [٤]
بوردن، ڕۆیشتن.

**تێپەڕکردن** (کتپ) têper̲kirdin
ب (تێ پەڕاندن).

**تێپەڕیین** (کتن) têper̲în [١]
ب (تێپەڕبوون).

**تێپەڕیین** (کتن) têper̲în [٢]
بەلادا ڕۆیشتن.

**تێپەڕیین** (کتن) têper̲în [٣]
بەسەرچوون، ڕابردن، ڕابوردن، کات بڕانەوە.

**تێ پەستان** (کتپ) têpestan
ب ([تێ] ئاخنین).

**تێ پەستاوتن** (کتپ) têpestawtin
تێئاخاندن، پەستاوتن، تێ ئاخنین، ناو ئاخن کردن، ناواخن کردن.

**تێ پەستراو** (ئان) têpestiraw
ب (ئاخنراو).
**تێ پێچان** (کتپ) ١ têpêçan
تێ ئالاندن.
**تێ پێچان** (کتپ) ٢ têpêçan
تێ ئالان (کەسێ، بەکارێکەوە)، تێ ئالاندن، تێوە گلاندن، تێوەئالاندن.
**تێ پێچان** (کتن) ٣ têpêçan
ب (تکاکردن).
**تێ پێچاندن** (کتپ) têpêçandin
ب (تێ پێچان).
**تێ ترنجان** (کتن) tê tirincan
گیر خواردن(لە شوێنێکی تەنگەبەردا).
**تێ ترنجاندن** (کتپ) ١ tê tirincandin
گیرکردن.
**تێ ترنجاندن** (کتپ) ٢ têtirincandin
ب (ئاخنین / ٢).
**تێ ترنجاو** (ئان) tê tirincaw
ب (ئاخنراو).
**تێ تراندن (بەتەوسەوە) (کتپ)**
tê tirandin (betewsewe)
زۆر خواردن، گەدە پڕ کردن.
**تێ ترێنەر** (ئان) têtirêner
ب (تێر نەخۆر).
**تێ تکان** (کتن) têtikan
بەدڵۆپ هاتنەخوار، تکان، چۆڕان.
**تێ تکاندن** (کتپ) têtikandin
تکاندن، تێکردن، چۆڕاندنەوە (بەدڵۆپەدڵۆپ).
**تێ تەپاندن** (کتپ) têtepandin
ب (ئاخنین / ٢).
**تێ تەقان** (کتن) têteqan
تێقاچان.
**تێ چاندن** (کتپ) ١ têçandin
بەخراپە دژی کەسێ قسەکردن، تێ چەندن، دژی کەسێ ئاخاوتن.
**تێ چاندن** (کتپ) ٢ têçandin
تێ چەندن، تێ کردن، کردنەناو.
**تێ چریکاندن** (کتن) têçrîkandin
بەبەردەوامیی هاوار کردن یان گۆرانیی ووتن.
**تێ چران** (کتن) têçiran
کۆبوونەوە (خەڵک لەشوێنێکدا بەزۆریی).
**تێ چراندن** (کتپ) têçirandin
کۆکردنەوە (ئاژەڵ لەیەک شوێندا).
**تێ چرین** (کتن) têçirîn
بەدەنگی بەرز گۆرانی ووتن.

**تێ چوون** (کتن) têçûn
چوونەناو، چوونە ژوور، وەژوورکەوتن.
**تێ چوون** (کتن) têçûn
شان دانە بەرکار، کارکردن بەگەرمیی، هەوڵ دان.
**تێ چەسپاندن** (کتپ) têçespandin
تێ خونجاندن، جێبۆکردنەوە، شوێن بۆ کردنەوە.
**تێ چەسپین** (کتن) têçespîn
تێ خونجان، لەگەڵ ڕێک کەوتن، بۆ بوون.
**تێ چەقاندن** (کتپ) ١ têçeqandin
پێدابردن، پێداکردن، خستنەناو، لەناودا تووند کردن.
**تێ چەقاندن** (کتپ) ٢ têçeqandin
ئاژن کردن، تێ ئاژنین.
**تێ چەقین** (کتن) ١ têçeqîn
پێوەچەسپاندن، پێوەنووسان.
**تێ چەقین** (کتن) ٢ têçeqîn
پێداچوون، تێ ڕۆچوون.
**تێ چەن** (ن) têçen
پیکوڵ چەند، تێ چین، فیتنەباز، مایەفیتنە، پشێوێنە، بوختانکەر، پیلانباز، چاڵ هەڵکەن.
**تێ چەندن** (کتپ) têçendin
ئاخاوتنی ناڕاست هێنان وبردن، تێ چاندن.
**تێ چین** (ن) ١ têçên
ب (تێ چەن).
**تێ چین** (ن) ٢ têçên
نۆبەبڕیی.
**تێخ** (ن) têxin
تیخ، تیغ، چەقۆ، کارت، کارتێغ، کافرمان، کێرد، بەنبڕ، قەڵەمبڕ.
**تێ خزان** (کتن) têxizan
**تێ خزاندن** (کتپ) têxizandin
ترنجاندن، تێ خستن، چراندن (بەزۆر)، خستنەناو.
**تێ خستن** (کتپ) ١ têxistin
خستنەناو، تۆمار کردن، داکردن، لیستەنووس کردن، وەرگرتن.
**تێ خستن** (کتپ) ٢ têxistin
ب (ئاخنین / ٢).
**تێ خستن** (کتپ) ٣ têxistin
بردنەژوور، تێ ڕۆکردن، تێهنان، دەنێونان، تێ بردن، خستنەناو.
**تێ خستن** (کتپ) ٤ têxistin
تێ ئاویشتن، تێ بڕیین، تێ هاویژتن، تێ هاویشتن.
**تێ خوڕیین** (کتپ) ١ têxurîn
بانگێ کردن، دەنگێ لێ کردن.
**تێ خوڕیین** (کتپ) ٢ têxurîn
تێ هەڵچوون، سەرزەنشتیی کردن، بەسەرکەسێکدا قیژاندن، هاواربەسەرداکردن.

**تێ خونجان** (کتن) têxuncan
بۆ بوون، گونجان، کیس بوون، لەباربوون، بۆ گونجان.
**تێدا (تیا)چوون** (کتن) têda(tiya)çûn
بەلاداهاتن، گیان بەدەستەوەدان، گیان سپاردن، نەمان، لەناوچوون.
**تێ دان** (کتپ) ^١ têdan
پان یان دریژکردن، پارچەخستنەسەر، لەسەر زیادکردن، تێدانەوە
**تێ دان** (کتپ) ^٢ têdan
تێ وەروژان، تێ وەروکان، تیوەئالان، لێ گردبوونەوە.
**تێ دانەوە** (کتپ) ^١ têdanewe
ب (تێدان).
**تێ دانەوە** (کتپ) ^٢ têdanewe
چوونەوەسەر، سەرلەنوێ دەست پێ کردنەوە، گەڕانەوە سەر.
**تێر** (ئان) ^١ têr
تەسەل، تەسەل بوو، تێروپڕ، تێروتەسەل.
**تێر** (ئان) ^٢ têr
بەرەنگ، پڕ ڕەنگ، تەلخ، خەست، مات.
**تێر** (ئان) ^٣ têr
بووە، دەولەمەند، دەولەتمەند، پارەدر، خاوەن پارە، هەبوو، ساماندار، کۆک.
**تێر ئاگای لە برسی نییە** (پن)
têr agay le birsî niye
ئەوی سکی تێرە بروای بەبرسێووان نییە.
**تێراو** (ئان) ^١ têraw
ب (ئاودار / ١).
**تێراو** (ئان) ^٢ têraw
ب (ئاواندر).
**تێراوی** (ن) têrawî
پاراوی، تێر ئاوی، تەڕوبڕی، تەڕی (میوە).
**تێربوون** (کتن) ^١ têrbûn
برسیتی نەمان، تەسەل بوون، تێرخواردن.
**تێربوون** (کتن) ^٢ têrbûn
بێنیازبوون، تێرلێ خواردن.
**تێربە سکی خۆنە خواردن** (ئد)
têr beskî xo nexwardin
١- چرووک بوون، هەژاربوون.
٢- پاشەکەوت کردن، دەس گرتنەوە.
**تێرپ** (ن،رو) têrp
ب (توور).
**تێرخواردن** (کتپ) têrxwardin
لێ تێربوون.

**تێرکردن** (کتپ) têrkirdin
خواردن پێدان بەتەسەلی، گەدەپڕ کردن، تێروتەسەل کردن.
**تێرنەخۆر** (ئان) têrnexor
تێ ترینەر، چاوبرسیی، چاوچنۆک، چاونزیر، زگەڕۆ، زۆر خۆر، سک دراو، گەدەدراو، لەپن، ورگ مەشکۆلە.
**تێرنە خواردن لە باوک مردن خراپترە** (پن)
têr nexwardin le bauk mirdin xiraptire
برسیتی لەشیر تیژترە. برسیتی ئەژارەییە.
پیاوی برسیی هەر لەدوورەوە بۆنی گۆشت دەکات.
**تێرنە خۆرە بانگی کردەوە** (ئد)
têrnexore bangîkirdwe
واتە: هەرگیز تێرناخوات. زۆرخۆرە.
**تێروپڕ** (ئان) têrwpiṟ
تێروتەسەل، تێروچاوپڕ، تێروگەدەپڕ.
**تێروتەسەل** (ئان) ^١ têrwtesel
ب (تێروپڕ).
**تێروتەسەل** (ئان) ^٢ têrwtesel
دەولەمەند، ساماندار، کۆک، گورجووپڕ.
**تێروتەسەلیی** (ن) têrwteselî
خۆش گەوزەرانیی، خێروخۆشیی، حاڵخۆشیی، دەولەمەندیی، سامانداریی، کۆکیی، کامەرانیی، کاسە پڕیی، بوونیی، بووەیی.
**تێرو** (ئان) têrû
١- درندە، کێویی. ٢-نهێنگر، پاشدڕ (درندە).
**تێرەخۆر** (ن) têre xor
تێرەخۆرە، ژەمێکی تەواو (لەخواردەمەنیی).
**تێریی** (ن) ^١ têrî
تەسەلیی، تێروپڕیی، گەدەپڕیی، گورجوو پڕیی.
**تێریی** (ن) ^٢ têrî
تۆخیی، تەڵخیی (ڕەنگ).
**تێڕ** (ن) ^١ têṟ
چێڕ، لاتێڕ، خێسە، مورە، مۆنە، مۆنێ.
**تێڕ** (ن) ^٢ têṟ
تێرکە، تێرکە، جەواڵ، خەرار، هۆر.
**تێڕ** (ئان) ^٣ têṟ
خێش کردوو، مرو مۆچ، مۆن، گرژ، رووتاڵ.
**تێ ڕاخوڕین** (کتپ،کتن) têṟaxuṟîn
دەنگ دان(کەسێ)، سەرزەنشت کردن (کەسێ) بەدەنگی بەرز.

**تێ ڕادان** (کتپ) têradan
ئـاوتێ کـردن، ئـاو تـێ وەردان، تـێ وەردان، شتن(دەفر... بەئاو).

**تێ ڕاديتن** (کتپ) têradîtin
باوەڕپێ بوون، باوەڕ هەبوون، بڕوا پێ بوون.

**تێ ڕاکردن** (کتپ) têrakirdin
تێ ڕۆکردن.

**تێ ڕامان** (کتپ) têraman ١
تەماشاکردن، تیاڕامان، تێ ڕوانين، سەرنج لێدان، لێ ووردبوونەوە، بەوورديی تەماشاکردن.

**تێ ڕامان** (کتپ) têraman ٢
بەراووردکردن، چاکەوخراپە بەراووردکردن.

**تێ ڕامان** (کتپ) têraman ٣
لێ کۆڵينەوە.

**تێرتێرە** (ن) têr têre
قومقمۆکەی گەورە.

**تێ ڕوانين** (کتپ) têrwanîn
ب (تەماشا کردن).

**تێ ڕۆکردن** (کتپ) têrokirdin
ب (تێ خستن).

**تێرەوەبوون** (کتن) têrewebün
تيرەويوون، چيرەوبوون، خيسەکردن، مۆڕ بوونەوە، مۆڕە کردن، مۆڕەوەبوون.

**تيزپێوەکردن** (کتپ) tîz pêwe kirdin
تيز پێوەکردن، بز پێوەکردن.

**تێزکراو** (ئان) têz kiraw
تيزکە کراو، تيسکەکراو.

**تێزکردن** (کتپ) têz kirdin ١
تيزکـەکردن، تيـسکە کـردن، ئامـادەکردن(بـۆ بەکارهێنان).

**تيزکردن** (کتپ) tîz kirdin ٢
ب (پڕ کردن).

**تيزکردن** (کتپ) tîz kirdin ٣
بوغراکردن، پاڵ پێوەنان، تيژکردن، فوو تـێ کـردن، هان دان.

**تێزە** (ن) têze ١
نووکە (شتی تيژ).

**تێزە** (ن) têze ٢
قوتکە، لوتکە.

**تێزە تێزەدان** (کتپ) têze têzedan
پەلەپەل لێ کردن، پەلەلێ کردن، تالووکـەلێ کـردن، خستنە گازودوو.

**تێژ** (ئان) têj ١
ب (تيژ).

**تێژ** (ئان) têj ٢
چابوکە، چاپکە، قۆچاغ، گورج وگۆڵ.

**تێژک** (ن) têjik
بەچلەی درندە، ساوای گيانداری کێويی.

**تێ ژەندن** (کتپ) têjendin
تێ ژەندن، تێ ژەنيين.

**تێژهۆش** (ئان) têjhoš
زيرەک، هۆشيار.

**تێ ساوين** (کتپ) têjsawîn
تێ سوون، تێ هەڵسوون، لێ سوون، تيوەسوون، تێ هەڵساوين.

**تێ سرەواندن** (کتپ) tê sirewandin
پێدادان، پێداکێشان، پێداماڵين، پێکان، لێ دان.

**تيسکە** (ن) têske
ب (تيژ).

**تيسکەی تفەنگ** (ئان) têskey tifeng
خێرا، گـورج، پـێتمار، چووسـت، چەسـپان، بـەگوڕ، بلەز.

**تێ سوون** (کتپ) têsün
ب (تێ ساوين).

**تيشت** (ن،کی) têšt(ki)
بـەرچايی، تاشـتێ، تيـشتێ، خـواردنی بـەيانيان، خوارنا سپێدێ.

**تێ شکان** (کتن) têšikan ١
فريوخواردن، هەڵ خەڵەتان، هەڵ فريوان.

**تێ شکان** (کتن) têšikan ٢
لەناودا شکان.

**تێ شکان** (کتن) têšikan ٣
ب (بۆڕ خواردن).

**تێ شکان** (کتن) têšikan ٤
ئەژنۆدادان، پاشەکشەکردن، ژێر کەوتن، سـەر بردنـە ناوسکە، سەردانەواندن.

**تێ شکان** (کتن) têšikatin ٥
بەزان، بەزيين، تێ قاچان، شـکان، قووچانـدن، کـۆڵ دان، هەڵاتن.

**تێ شکان** (کتن) têšikan ٦
١- هەست بەئێش کردن، هەست بەئازارکردن.
٢- ناڕەحەت بوون.
٣- سزاخواردن، بەسزای خۆ گەيشتن.
٤- زەرەرمەندبوون، تێداچوون، زيان پێ گەيستن.

**تێ شکاندن** (کتپ) têšikandin ١
فريودان، هەڵ خەڵەتاندن، هەڵ فريواندن.

**تێ شکاندن** (کتپ) têšikandin ٢
بەيەکداشکاندن، لەناويەکداشکاندن.

**تێ شکاندن** (کتپ) têšikandin ٣
ب (بۆڕدان / ١).

**تێ شکاو** (ئان) têšikaw ١
پـير، تـێ قوپـاو، عەمـەل مەنـدە، بەسـاڵداچوو، لێ

کەوتە.

**تێ شکاو** (ئان) ٢ têşikaw
ئەستۆخوار، داماو، لێ قەوماو، ناتەواو.

**تێ شکاو** (ئان) ٣ têşikaw
فریودراو، هەڵ خەڵەتاو.

**تێ شکاو** (ئان) ٤ têşikaw
بەسەریەکدا شکاو، لەناویەکدا شکاو.

**تێ شکاو** (ئان) ٥ têşikaw
بێ مایە، فەقیرکەوتوو، مایە پووت، مایەپووچ.

**تێشوو** (ن) têşü
ب (توێشوو).

**تێشوو بەرە** (ن) têşü bere
ب (توێشەبەرە).

**تێشووپێ دان** (کتپ) têşüpêdan
خواردن وپێویستیی ڕێ پێدان، ڕەخت کردن.

**تێشوو کردن** (کتپ) têşü kirdin
ب (توێشوو کردن).

**تێشووکردن** (کتپ،کتن) têşükirdin
نانی بەیانیی خواردن.

**تێغ** (ن) têx
ب (تیغ).

**تێغ** (ن) ١ têx
تیغە، کەنار، کەنارە، لێ لێوار.

**تێ فڕێدان** (کتپ) ٢ tê frêdan
فڕێدانە ناو.

**تێ قاچان** (کتن) ١ têqaçan
ب (پێوەنان).

**تێ قاچان** (کتن) ٢ têqaçan
ب (بۆرخواردن).

**تێ قلپاندن** (کتپ) têqapandin
تێ قلپ کردنەوە، قلپاندنە ناو.

**تێ قوپان** (کتن) têqupan
بەناوداچوون، دانەباریکیی، لاواز بوون.

**تێ قوپاو** (ئان) têqupaw
بەناوداچوو، دالگۆشت، لاواز.

**تێک** (ئان،ئاک،ن) têk
تەواو، گشت، گش، گشتکە، تەڤ، هەموو، ب جارەکێ، بەجاریێ، گشت بەیەکجار.

**تێک ئالان** (کتپ) têk alan
ب ({پێکا} پێکدا هاتن).

**تێک ئالاندن** (کتپ) têk alandin
لەیەک ئالاندن، لێک بادان.

**تێک ئالاو** (ئان) têk alaw
ئالۆزاو، ئالۆز، ئالۆزکاو، ئالۆسکاو، تێکالاو.

**تێک ئالقان** (کتپ،کتن) têkalqan
تێک ئالاندن، تێک گیران، تێک هالان، تێک هالاندن.

**تێک بردن** (کتن،کتپ) têkbirdin
تێک پەڕاندن، خستنەناو یەک.

**تێک بەربوون** (کتپ) ١ têkberbün
بەربوونەیەک، بەگژ یەکترداچوون، چوونەگیان یەکتر، لێک بەربوون.

**تێک بەربوون** (کتپ) ٢ têkberbün
سواری یەکتر بوون (ئاژەڵ)، {بۆ مەبەستی زاووزێ کردن}.

**تێک بەردان** (کتپ) ١ têkberdan
جات کردن، چاک کردن (نێر لەمێ ...ئاژەڵ)، تێ کردن، مێچکەی ئاژەڵ، لەبەر نێریی کردن، لە جووتیی کردن.

**تێک بەردان** (کتپ) ٢ têkberdan
بەشەڕدان، بەگژ یەکتردا کردن، تێک بردن، تێک خستن.

**تێکچوو** (ئان) têkçü
ب (پشێو).

**تێک چوون** (کتن) ١ têkçün
ئالۆزان، ڕێک وپێکی نەمان، شێوان.

**تێک چوون** (کتن) ٢ têkçün
دۆستایەتیی لەنێواندا نەمان.

**تێک چوون** (کتن) ٣ têk çün
ئالۆزان، پەشۆکان، شلەژان.

**تێک چوون** (کتن) ٤ têk çün
بۆن کردن، تام وبۆن گۆڕان.

**تێکخراو** (ئان) têk xiraw
لەناویەک براو، لێکخراو.

**تێک خستن** (کتپ) têk xistin
تێک بردن، خستنەناویەک.

**تێک دان** (کتپ) têk dan
بایەخ بۆ نەهێشتن، پووچەڵ کردن (یاسا).

**تێک دان** (کتپ) ١ têk dan
ئاشووب گێڕان، ئالۆزکردن، پەشۆکاندن، خراپ کردن، شێواندن.

**تێک دان** (کتپ) ٢ têk dan
خاپوور کردن، ڕووخاندن، کاول کردن، وێران کردن.

**تێک دان** (کتپ) ٣ têk dan
تەڤ دان، تێک وەردان، تێکەڵ دان، تێک هەڵ دان، تێکەڵ کردن.

**تێکدراو** (ئان) têkdiraw
ڕفتە، ژێرەو ژووربوو، نوغرۆ بوو، ڕووخاو، کاول، کاول بوو.

**تێ کردن** (کتپ) têkirdin
کردنەسەر، کردنە ناو.

**تێکرا** (ئاک) ١ têkra
گشتیی، هەموان، هەموو شتێ.

**تێکرا (ن)٢** têkra
تەڤدە، خڕ، خشت، سەراپا، سەرتاپا، گشت، هەمیی، هەموو.

**تێک رابوون (کتن)** têkrabün
راپەڕین، راچلەکین، راچەنیین، هەستانەسەرپێ (لەپڕێکدا).

**تێک سمران (کتن)** têksimran
تێسمریان، تێکسمریان، داریژان، داریژران، زڵ بوون، تەلەوبوون، کۆلۆفت بوون.

**تێکسمراو (ئان)١** têksimraw
بەخۆ، بەخۆوە، پڕومڕ، تێ سمرپاگ، داریژراو، تەلەو.

**تێک سمراو (ئان)٢** têksimraw
پان وپۆڕ، چوارشانە، دارشتوو، داگرتیی.

**تێک شکان (کتن)١** têkšikan
بەسەریەکدا شکان، پارچەپارچەبوون.

**تێک شکان (کتن)٢** têkšikan
بێ هێزبوون، لاواز بوون.

**تێک شکان (کتن)٣** têkšikan
پارە وپوول پێنەمان، تێ کەوتن، سوخت بوون.

**تێک شکاندن (کتپ)** têkšikan
بەسەریەکدا شکاندن، پارچەپارچە کردن.

**تێک شکاو (ئان)١** têkšikaw
بەسەریەکدا شکاو، پارچەپارچەبوو.

**تێک شکاو (ئان)٢** têkšikaw
بارکەوتوو، بارکەوتە، عەمەل مەندە.

**تێکلهەڤ (ئان،کی)** têkilhev(ki)
ب (تێکەڵاو).

**تێکلهەڤ کرن (کتپ،کی)** têkilhev kirn(ki)
ب (تێکەڵاو کردن).

**تێ کوتان (کتپ)** têkutan
بەتەنگ کەسی ترەوە نەهاتن، هەر کەسەخەمی خۆ خواردن.

**تێ کوتاندن (کتپ)١** têkutandin
پیا (پێدا)کوتاندن، تێبڕیان، تێ بڕین، تێکوتان، تێ کوتاندن، تێکوتیان.

**تێ کوتاندن (کتپ)٢** têkutandin
بەرەلایی وخۆپەرستیی کردن.

**تێ گەڕان (کتن)** tê geran
چەنەچەن ویستان، دەمەقرێ کردن، مشتومڕ کردن، هەراهەراکردن.

**تێک وپێک دان (کتپ)** têkupêkdan
تێک دان وبەیەکدادان، کاول کردن، لێک هەڵوەشاندن.

**تێ کۆشان (کتن)** têkošan
تەقەلادان، تەقەلاکردن، تێکۆشیین، خەبات کردن، رەنج دان، کۆشیین، هەوڵ دان.

**تێکۆشیی (ن)** têkošî
ب (تەقەلا).

**تێکۆشیین (کتن)** têkošîn
ب (تێکۆشان).

**تێکەڵ (ئان)١** têkel
ب (ئاوێتە).

**تێکەڵ (ئان)٢** têkel
ژاکاو، هیچ بەسەر هیچەوەنەماو.

**تێکەڵ (ئان)٣** têkel
ب (ئاشنا).

**تێکەڵاو (ئان)** têkelaw
ب (ئاوێتە).

**تێکەڵاوبوون (کتن)** têkelawbün
ئاوێتەبوون، تێکلاوبوون، تێکەڵ بوون، تێکلهەڤ بوون.

**تێکەڵاوکردن (کتپ)١** têkelaw kirdin
ئاوێتەکردن، تێکلاوکردن، تێکلهەڤ کرن، تێکەڵ کردن، ئامێتەکردن، تێک هەڵ دان.

**تێکەڵاوکردن (کتپ)٢** têkelaw kirdin
بێسەروبەر کردن، تێک دان، شێواندن.

**تێکەڵاوکردن (کتپ)٣** têkelaw kirdin
ئاڵۆزاندن، ئاڵۆز کردن، ئاڵۆسکاندن.

**تێکەڵ بوون (کتن)** têkel bün
ب (تێکەڵاوبوون).

**تێکەڵ دان (کتپ)** têkel dan
تێک هەڵ دان.

**تێکەڵ کردن (کتپ)** têkel kirdin
ب (تێکەڵاو کردن).

**تێکەڵ و پێکەڵ (ن)١** têkel wpêkel
ب (ئاشوو پاشوو/ ٢).

**تێکەڵ و پێکەڵ (ئان)٢** têkelw pêkel
بەیەکداچوو، تێک ئالاو، نارێک، نالەبار، شلەقاو، شێواو.

**تێکەڵ و پێکەڵیی (ن)** têkel w pêkelî
ئاڵۆزیی،نارێک و پێکیی.

**تێکەڵیی (ن)١** têkelî
ئاشنایەتیی، ئاوەڵیی، دۆستایەتیی، ناسیاویی.

**تێکەڵیی (ن)٢** têkelî
ئامۆشۆ، هاتوچۆ، ئامشۆ، دیدەنیی، هاتو چۆ، هامشۆ.

**تێکەڵیی لە نێواندا بوون (ند)**
têkelî le nêwandabün
ئاشنایەتی لەنێواندابوون، ئامۆشۆی یەکتر کردن. هاتو چۆی یەکتر کردن.

**تێ کەوتن** (کتن) têkewtin [١]

چوونە ناوناو، خۆشتن (لەناو ناودا)، مەلەکردن.

**تێ کەوتن** (کتن) têkewtin [٢]

وەسل دەرکردن، ئاژنیی کردن، تێهەلاتن، خۆ لەناو هەلکیشان، سوبایی کردن، سۆبەیی کردن، لەش پیسیی دەرکردن (بەناو).

**تێ کەوتن** (کتن،کتپ) têkewtin [٣]

دۆڕان، لەکیس چوون.

**تێ کەوتن** (کتن) têkewtin [٤]

شوین شتێ کەوتن، ویل بوون بەدوای شتیکدا، هەوڵ بۆ دان، هەوڵی پەیدا کردنی شتێ دان.

**تیکەولیکە** (ن) têkew lêke

بێ سەروبەرپیی، بێ شیرازەیی، تیکەل و پیکەلیی.

**تیکەولیکە کردن** (کتپ) têkew lêke kirdin [١]

کەس لەکەس نەپرسیینەوە، هەر کەسە بۆ خۆی نیش کردن.

**تیکەولیکە کردن** (کتپ) têkewlêke kirdin [٢]

شیرازەتیک دان، تیکەل وپیکەل کردن.

**تیکەوە پیچراو** (نان) têkewepêçraw

لیک پیچراو.

**تیک هە لپرژان** (کتن،کتپ) têk helpirjan

پیک هەلپرژان، تیک هەلچوون، بەگژداچوون، بەگژیەکدا چوون.

**تیک هە لچوون** (کتن،کتپ) têk helçün

ب (تیک هەلپرژان).

**تیک هە لدان** (کتپ) têkheldan

ب (تیکەلاو کردن).

**تیک هە لشیلان** (کتپ) têkhelšêlan

شیلان، شیلاندن (بەسەر یەکدا).

**تیک هە لە نگوتن** (کتپ) têkhelengütin

ب (بەرەنگاربوون / ٢).

**تێ گرتن** (کتپ) tê girtin [١]

بۆ فڕێ دان، بۆ هاویشتن، تێ سرەواندن.

**تێ گرتن {گوللە}** (کتپ) tê girtin(gulle) [٢]

ئاراستەکردن (چەک)، بۆ هاویشتن.

**تێ گرتن** (کتپ) tê girtin [٣]

لێدان (دەرمان... لەئەندامی لەش).

**تێ گرماندن** (کتپ) têgirmandin

پیدا هەلشاخان، تووڕەبوون (لەکەسێ).

**تێ گوشین** (کتپ) têgušîn [١]

تریت کردن، تێ ووشیین، تێ، وولیین.

**تێ گوشین** (کتپ) têgušîn [٢]

بەفیڕۆ پارە بەخت کردن، پارە بەفیڕۆ دان، تێ ووشیین، تێ وولیین (پارە...).

**تێ گونجاندن** (کتپ) têguncandin

تێخستن.

**تێ گەیاندن** (کتپ) têgeyandin

بۆ ڕوون کردنەوە، حالیی کردن، خستنە میشکەوە، ڕانان، گوێ پڕ کردن، وادار کردن.

**تێ گەیشتن** (کتن) têgeyštin

تێگەیین، حالیی بوون، زانیین، سەر لێ دەرچوون، سەر لێ دەرکردن، وادار بوون، چوونەبنج وبناوان، گەیشتنە بنج وبناوان.

**تێ گەیشتوو** (نان) têgeyštü

توانا وبەفام، تیگەییو، دانا، زانا، زیرەک، ژیرلۆ، شارەزا، لێزان، هوشیار، هۆشیار، هیردار.

**تێ گەیشتوو** (نان) têgeyštü

ب (بەسەلیقە).

**تێ گەیین** (کتن) têgeyîn

ب (تێ گەیشتن).

**تێ گەییو** (نان) têgeyîw

ب (تیگەیشتوو).

**تێ گیران** (کتن) têgîran [١]

تەگەرەهاتنە ڕێ، چوڕتم هاتنەڕێ.

**تێ گیران** (کتن) têgîran [٢]

پەک کەوتن، تووش بوون.

**تێ گیران** (کتن) têgîran [٣]

بەگژیەکداچوون، تێ گیریان، تیک ئالان، بەرو بیانوو هینانەوە.

**تێ گیران** (کتن) têgîran

دەمقالیی کردن، شەڕەدەنووکە کردن (دووکەس).

**تێ گیران** (کتن) têgîran [٤]

گیربوون.

**تێ گیران** (کتن) têgîran [٥]

تووشی تەنگانەبوون، تەنگانە هاتنە پیش، کەوتنە تەنگانەوە.

**تێ گیرکردن** (کتپ،کتن) têgîr kirdin [١]

لێ گیرکردن، زۆر بۆهینان.

**تێ گیرکردن** (کتپ) têgîr kirdin [٢]

تەنگاوکردن، تەنگە تاوکردن، زۆر بۆ هینان، هیرش بۆ کردن.

**تیلا** (ن) têla

بەرچینغ، تەیاخ، گورگەی دریژ.

**تیلا ترین کردن** (کتپ) têlatrên kirdin

بەدار لەکەسێ دان، بیرازکردن، زۆرلێدان.

**تیلەگە** (ن) têlege

ب (بوخچە).

**تێ نان** (کتپ) tênan

خستنەناو.

**تێ نوارین** (کتپ) tênwarîn

تەماشای شتێ کردن، تێ ڕوانیین، لێ ووردبوونەوە.

**تێن وبێن** (ن) tên wbên

پرس ورا، تەگبیر ورا، راوێژ.

**تێ نەوین** (کتپ) tê newîn

دەست بۆ بردن (بەنیازی هەڵگرتنەوە)، دەست دانەشت (بەنیازی هەڵکەندنیەوە).

**تێ وروکان** (کتپ) têwürükan

تێ مرووکان، قەلەبالغی لێکردن، لێ کۆبوونەوە.

**تێ وریان** (کتپ) têwuryan

گرتن (بەتوندیی)، دەست لێ گیرکردن.

**تێ وشیین** (کتپ) têwušîn

ب (تێ گووشیین).

**تێ ولیین** (کتپ) têwulîn ١

ب (تێ گووشیین).

**تێ ولیین** (کتپ) têwulîn ٢

ب (پرواندن).

**تیوەئالاندن** (کتپ) têwe alandin

پیچاندن، پیچانەوە.

**تیوە ئالاو** (ئان) têwealaw

تیوەگلاو، تووش بوو.

**تیوە پیچان** (کتپ) têwepêçan ١

ب (پیچان).

**تیوە پیچان** (کتپ) têwepêçan ٢

ب (تووش کردن).

**تیوە پیچراو** (ئان) têwepêçraw

ب (تیوەگلاو).

**تیوە چوون** (کتن) têweçün ١

ب (تیوەگلان).

**تیوە چوون** (کتن) têweçün ٢

پیس بوون.

**تیوەچوون** (کتن) têweçün

شان دانەبەر کاریک (بۆکردنی).

**تیوەدان** (کتپ) têwedan ١

تیکەڵ کردن.

**تیوەدان** (کتپ) têwedan ٢

تـــووش کـــردن، دووچـــار کـــردن، تیوەگلانـــدن، پیوەکردن.

**تیوەدان** (کتپ) têwedan ٣

خستنەسەر.

**تیوەدان** (کتپ) têwedan ٤

تێ هەڵسوون.

**تیوەدان** (کتپ) têwedan ٥

بوختان پێ کردن، دووچارکردن، تـاوان خـستنەپاڵ، تاوانبار کردن.

**تێ وەردان** (کتپ) têwerdan

تیکە دان (شتی ناو دەفر)، شییواندان.

**تێ وەردان** (کتپ) têwerdan

تێ رادان، شتن.

**تیوەڕ** (ن) têwer̲

تەماشا ، تێ ڕوان.

**تیوەڕ بردن** (کتن) têwer̲birdin

تەماشاکردن، تێ ڕوانیین.

**تیوەژاندن** (کتپ) têwejandin ١

ب (تیوەژەندن).

**تیوەژەندن** (کتپ) têwejerdin ٢

ئاگادار کردنەوە، تیوەژاندن.

**تیوەژەندن** (کتپ) têwejendin ٣

ب (تووڕەکردن).

**تیوەژەندن** (کتپ) têwejendin ٤

پاڵ پیوەنان (بۆ خیرا ڕۆیشتن).

**تیوەژەندن** (کتپ) têwejendin ٥

تیـــوەژەنن، تیـــوە ژەنـــیین، نـــەقیزەکاری کـــردن، تیوەژاندن.

**تێ وەشاندن** (کتپ) têwešandin

تەکاندن، راوەشاندن.

**تیوەگلان** (کتن) têwegilan

چوونە ژێر بار، گرتنەئەستۆ، گرتنـەخۆ، گرتنـەدەس، لەئەستۆگرتن.

**تیوەگلاندن** (کتن) têwegilan ١

تیوەئالان، تووش بوون، دووچار بوون، گرفتاربوون.

**تیوەگلاندن** (کتپ) têwe gilandin ٢

ب (بوختان پێ کردن).

**تیوەگلاندن** (کتپ) têwegilandin ٣

ب (بوختان پێ کردن).

**تیوەگلاندن** (کتپ) têwegilandin ٤

ب (تیوەدان).

**تیوەگلاو** (ئان) têwegilaw

تووشبوو، تیوە ئالاو، دووچار، گرفتار، تیوە پیچراو.

**تیویانەوە** (کتن) têwyanewe

ب (توانەوە).

**تێ هاتن** (کتن) têhatin ١

چوونە ناو، هاتنەناو.

**تێ هاتن** (کتن) têhatin ٢

دا هاتن.

**تێ هاتن** (کتپ) têhatin ٣

هەڵمەت بۆ بردن، هەڵمەت بردنەسەر، هەڵمەت دان.

**تێ هانیین** (کتپ) têhanîn ١

بەدەست هینان، تێ هینان.

**تێ هانیین** (کتپ،کتن) têhanîn ٢

توانایی بەسەر کارداشکان، کار بەباشی کردن.

**تێ هانیین** (کتپ) têhanîn ٣

شایستەی کاریکی دیاربوون.

**تێ هاویشتن** (کتپ) têhawîştin 1
ب (تێ خستن).

**تێ هاویشتن** (کتپ) têhawîştin 2
تێ فڕێدان، فڕێدانەناو.

**تێ هەلاتن** (کتن) têhelatin
ب (تێ کەوتن).

**تێ هەلاخنراو** (ئان) têhelaxinraw
ب (ئاخنراو).

**تێ هەڵچوو** (ئان) têhelçü
تێ هەڵچوو (کەسێ کەبەبێ بیرکردنەوە پەلاماری کارێک بدات).

**تێ هەڵچوون** (کتن) têhelçün 1
باوەش کردن بەکارێکدا، دەس پێکردن (بەئیشێ)، یەکەم هەنگاو هەڵهێنان.

**تێ هەڵچوون** (کتن) têhelçün 2
خۆ تێ هەڵقورتان.

**تێ هەڵچوون** (کتپ) têhelçün 3
پەلاماردان.

**تێ هەڵچوون** (کتپ) têhelçün 4
ب (تێ خوڕیین).

**تێ هەڵچوون** (کتن) têhelçün 5
تووڕەبوون، شێتگیر بوون.

**تێ هەڵچوونەوە** (کتپ) têhelçünewe
ب (بادانەوە سەر).

**تێ هەڵچەقین** (کتپ) têhelçeqîn
پێدا هەڵچەقیین، تێ چەقیین، پێداچوون، چوونە ناو.

**تێ هەڵدان** (کتپ) têheldan 1
بەشەق لەشتێ یان لەکەسێ دان، پەحنی لێدان، شەق پێدادان، شەق تێ هەڵدان.

**تێ هەڵدان** (کتپ) têheldan 2
تێکەڵ کردن، تێک هەڵدان.

**تێ هەڵدان** (کتپ) têheldan 3
ئاو پێدا کردن، ئاوتێ وەردان.

**تێ هەڵدان** (کتپ) têheldan 4
واز لێ هێنان (بەتەسەوە)، بەسووکییەوە مامەڵە کردن (شتێ یان کەسێ).

**تێ هەڵساوین** (کتپ) têhelsawîn
ب (تێ هەڵسوون).

**تێ هەڵسوون** (کتپ) têhelsün
ب (تێ ساویین).

**تێ هەڵقورتان** (کتپ) têhelqurtan
ب (تێ هەڵقولتان).

**تێ هەڵقولتان** (کتپ) têhelqultan
١-تێ هەڵچوون لەئاخاوتن یان کارێک بەبێ پرس وڕا، تێ هەڵقورتان، تێ هەڵکردن، دەست خستنەناو ئیش وکاری خەڵکی دیکەوە، لەخۆوە چوونەکاری ئەم وئەو، خۆ تێ هەڵقورتاندن.
٢- بێ بانگ کردن بەمیوانداریی کەسێ چوون، لە ناوەختدا هەڵکوتانەسەر خەڵک.

**تێ هەڵکردن** (کتپ) têhelkirdin
ب (تێ هەڵقولتان).

**تێ هەڵکێش کردن** (کتپ) têhelkêš kirdin
ب (تێ بردن).

**تێ هەڵکێشان** (کتپ) têhelkêšan
بەناودابردن، لەناودا هەڵکێشان (دەزوو... پەت).

**تێ هێنان** (کتپ) têhenan
ب (تێ هانیین).

**تیا (تێدا) بردن** (کتپ) tiya(têda) birdin
بەفیڕۆدان (کات)، فەوتاندن، لەناوبردن (پارە).

**تیا (تێدا) چوون** (کتن) tiya(têda) çün 1
فەوتان، لەناوچوون.

**تیا (تێدا) چوون** (کتن) tiya(têda) çün 2
تووشی زیان بوون.

**تیا (تێدا) رامان** (کتن) tiya(têda) raman
تیامان، تێدامان، سەرسام بوون، سەرسام مان، واق وڕمان.

**تیار** (ئان) tiyar
ب (ئامادە / ١).

**تیارکردن** (کتپ) tiyar kirdin
ب (ئامادەکردن / ١).

**تیان** (ن) tiyan
ب (تەیان).

**تیپ** (ن) tîp 1
بەرە، بتۆم، پۆل، تیپەن، دەستە، ڕەوە، کۆمەڵ، گەل.

**تیپ** (ن) tîp 2
پیت، حەرف.

**تیپ** (نک،س) tîp 3
ئۆردوو، سوپا، قۆشەن، لەشکر، هێزی چەکدار.

**تیپەن** (نک) tîpen
کۆمەڵە سوار.

**تیت** (نک) tît
ب (پرچ).

**تیتاڵ** (ن،کل) tîtal (kl) 1
تین، شۆخیی، تیتالیی، گاڵتە، گەمە، گاڵتەوگەپ، نوکتە بازیی.

**تیتاڵ** (ن،کل) tîtal (kl) 2
خۆشیی، کامرانیی، شادمانیی، شادیی.

**تیتاڵباز** (ن،کل) tîtalbaz(kl)
گاڵتەچیی، سوعبەتچیی.

**تیتاڵ کردن** (کتن،کل) tîtaḻkirdin(kl)
پێخۆشحاڵ بوون، گەشانەوە.
**تیتک** (ن) tîtik ١
ب (ئەگریجە).
**تیتک** (ن،نا) tîtik ٢
تووتکە سەگ، تووتکی سەگ.
**تیتک** (ن) tîtik ٣
پوور، خوشکی باوک، مەت، میمک، میمی.
**تیتە** (ن) tîte
خشڵ، زێڕ وزیو.
**تیتیلە وبیبیلە** (نک) tîtîle w bîbîle
بەچکەی ووردی گیاندار،
منداڵە وورتکە. **تیر** (ن) tîr ١
برو، بەشت، پەیکان، تەخش.
**تیر** (ن) tîr ٢
بەرک، گوللە.
**تیر** (ن) tîr ٣
باڵا، توور، قەد.
**تیر** (ن) tîr ٤
قەبارە، قەوارە.
**تیر** (ن) tîr ٥
ئەنازە، ئەندازە.
**تیراخە** (ن) tîraxe
ب (برپرە / ١).
**تیراوێ** (ن،پز) tîrawê
گەنگەرین، برینێ تەشەنەی کردبێ.
**تیروێژێک** (ن) tîrawêjêk
تیرهاوێژێک، ئەندازەی هاویشتنی تیرێک.
**تیر ئەنداز** (ن) tîrandaz
١- تیر ئەناز، تیراوێژ، تیرەئەنداز، تفەنگچیی.
٢- دەست ڕاست، پیکاوەر، نیشان شکێن.
**تیر ئەندازیی کردن** (کتپ) tîrandazî kirdin
تیر هاویشتن، تفەنگ تەقاندن، تفەنگ هاویشتن،
تەقەکردن.
**تیربار** (ن) tîrbar
شەستیر برین.
**تیرباران** (ن.) tîrbaran
تیرەباران، دەستڕێژ.
**تیرباران کردن** (ند) tîrbaran kirdin
١- تیرەباران کردن، دەستڕێژ لێ کردن، گوللەبارانی
کردن، تێ کردن.
٢- بەگوللە کەسێ کوشتن.
**تیربازیی** (ن) tîrbazî
١- تیروانە، تیرەوانیی.
٢- تفەنگچیتیی، دەست ڕاستیی، پیکاوەریی.

**تیربەتیر** (ئاک،ئان) tîrbetîr
بەرامبەر، بەرانبەر، ڕوویەڕوو.
**تیرتەش** (ن) tîrteš
وورده بارووت، خاکە بارووت.
**تیرتەش کردن** (کتپ) tîrteš kirdin
وورد کردن، کردن بەبارووت.
**تیرتوێ** (ن) tîrtwê
ب (ئارەقە).
**تیرخستن** (کتن) tîrxistin
پشک خستن.
**تیردان** (ن) tîrdan ١
تیرکێش، کیفی تیر، هەگبەی تیر.
**تیردان** (کتپ) tîr dan ٢
بڵاوەپێ کردن، پەرەوازە پێ کردن، پەرەوازە
کردن.
**تیرشەهاو** (ن،نس،لو) tîršehaw(lu)
شووڵە.
**تیرک** (ن) tîrik
دیرەگ، شەمەک، تیرەگ، کۆڵەکە، تیرمە،
ئەستوون، پاژدەر، پاژەر، پاشدەر.
**تیرکردن** (کتپ) tîr kirdin ١
دامۆچانن، هەڵخزاندن.
**تیرکردن** (کتپ) tîr kirdin ٢
ڕاسپاردن.
**تیرلە تیرداندا نەمان** (ند)
tîr le tîrdanda neman
هێز تیدانەمان، بێ‌هێزبوون،
توانایی جێ‌بەجێ کردنی کار نەمان، پەک کەوتن،
پیربوون.
**تیرلە کەوان دەرچوو ناگەڕێتەوە** (پن)
tîr le kewan derçü nagerêtewe
گوللە کەدەرچوو مرۆڤ نایگرێتەوە. ووتە کە لەدەم
دەرچوو بەرەودوا ڕا ناکێشرێتەوە. وشە کەووترا
تیرێکە وەشێنرا.
**تیرمە** (ن) tîrme
ب (تیرک).
**تیرمەبڕ** (ئان) tîrmebiṟ
گوللە بەند، گوللە نەبڕ (چاکەت....).
**تیرۆژ** (ن) tîroj
تیرووژ، ڕووناکیی ڕۆژ (کەلەکلاوڕۆژنەوە بێتە
ژوورەوە).
**تیرۆژوو** (ئان) tîrojü
باریک و درێژ.
**تیرۆک** (ن) tîrok
تیرەنان.

**تیروتوانج** (نک) tîrw twanc
ب (تیلەو توانج).
**تیرە** (ن) tîre [1]
ئەشکیل.
**تیرە** (ن) tîre [2]
بافک، بنەماڵە، جووم، خێل، هۆز، پیل، عیل، ئێل.
**تیرە** (ن) tîre [3]
گرۆ، گروو، گرۆە.
**تیرە** (ن) tîre [4]
کندر، کنگر.
**تیرە** (ن) tîre [5]
ئازار، ئێش، برووسکە، برووسکەی ئازار (لەپڕ).
**تیرە باران** (نچ) tîre baran
ب (تیر باران).
**تیرەژە** (ن) tîreje
ب (ئەستوونە زێڕینە).
**تیرەشان** (ن) tîrešan
تیغەشان، لاباسک (دریژایی سەر پۆپەی کەژ وکیو).
**تیرەخە** (ن) tîrexe
ب (برپرە).
**تیرەخەدار** (نک) tîrexedar
ب (برپرەدار).
**تیرەک** (ن) tîrek
توانا، توانایی، هێز.
**تیرەگ** (ن) tîrek
ب (تیرەک).
**تیرەمار** (ن) tîremar
ئەسپەمار.
**تیرەنداز** (ن) tîrendaz
ب (تیر ئەنداز).
**تیرێک ودوو نیشانە** (ئد) tîrêk w dü nîšane
ب (بەتیرێک دوو نیشان شکاندن).
**تیڕ** (ئان) tîr
بڵاوبوونەوە، پرش بوونەوە، پەرش بوونەوە.
**تیز** (ن) tîz
ب (تیتاڵ).
**تیزباڵ** (ن) tîzbal
شاباڵ، شاپەڕ.
**تیز پێ کردن** (کتپ) tîz pê kirdin
تیز پێوەکردن، دانەبەر کلکان،
گاڵتەپێ کردن، قەشمەریی پێ کردن، گەمە پێ
کردن، قەشمەریی پێ کردن، یاریی بەنەقلی کەسێ
کردن.
**تیز پێوەکردن** (کتپ) tîz pêwe kirdin
ب (تیز پێ کردن).

**تیزماڵک** (ن) tîz malk
ب (تیلماسک).
**تیزەجاڕ** (ن) tîzecar
ئاواووک، تیزە زارۆک، قەشمەرجاڕ، گاڵتەچیی،
گەمەجاڕ، گەمەکەر، لیقۆک.
**تیزەزارۆک** (ن) tîzezarok
ب (تیزەجاڕ).
**تیژ** (ئان) tîj [1]
برندە، بورا، بەپرشت، تیژ، ترنجل، ترنجوو، تووژە،
خوڕ، کۆ.
**تیژ** (ئان) tîj [2]
توند، توون، تووژ، کەسکوون (تام).
**تیژ** (ئان) tîj [3]
سوور (لەسەر کردنی کارێک).
**تیژبوون** (کتن) tîjbün
برندەبوون، بەپرشت بوون، تیژەوەبوون، تیژبوون.
**تیژ تیپەڕبوون** (کتن) tîj têperbün
ب (پێ هەڵگرتن).
**تیژ ڕەوت** (ئان) tîjrewt
ب (بەپێ).
**تیژک** (ن،ئا) tîjik
بێچوو شێر.
**تیژکردن** (کتپ) tîjkirdin [1]
تیژکردن، تیزە، تیزەدان، هان دان، هانە هانەدان،
هەڵخراندن.
**تیژکردن** (کتپ) tîj kirdin [2]
ب (ئاگر خۆش کردن).
**تیژکردن** (کتپ) tîjkirdin [3]
برشت پێ پەیداکردن (بەتیغ).
**تیژکردن** (کتپ) tîj kirdin [4]
ب (پڕ کردن).
**تیژکردن** (کتپ) tîj kirdin [5]
رق هەستاندن، توورەکردن.
**تیژکردن** (کتپ) tîj kirdin [6]
پاڵ پێوەنان، گاڵ دان، گوڕ پێ دان.
**تیژکردنەوە** (کتپ) tîjkirdinewe
پۆلانیا کردن.
**تیژکەر** (ن) tîjker
١- تیژکەر، تیژوەکەر. ٢- هەسان.
**تیژە** (ن،لو) tîje (lu) [1]
پارزنە، پالیوەر، پالیوکە.
**تیژە** (ن،لو) tîje (lu) [2]
دەمە مشار، برە.
**تیژەنگ** (ن) tîjeng
ئاوی خوڕ کەلە کەندەلانێکی نزمەوە بڕژێتەخوارەوە
بەخوڕیی

**تیژگۆش** (ئان) tîjgoš
ب (بیر تیژ).
**تیژی** (ن) [1] tîjî
برشت.
**تیژی** (ن) [2] tîjî
توونیی، کەسکوونیی.
**تیژی** (ن) [3] tîjî
١- قژ، موو. ٢- ب (تیشک).
**تیسکن** (ئان) tîskin
ب (تووکن).
**تیش** (ن) tîš
چیا، شاخ، کێو.
**تیشک** (ن) [1] tîšk
ب (تەشوێ).
**تیشک** (ن) [2] tîšk
تووک، کوڵک.
**تیشک** (ئان) [3] tîšk
دڕ، ناتەبا، ناڕێک، نەگونجاو.
**تیشک** (ن) [4] tîšk
ب (پرشنگ).
**تیغ** (ن) tîx
ب (تیغ).
**تیغە** (ن) tîxe
تیخە، تیغەرە، تیخەکە، دەپە، چیغ، نافبریک، ناویرە، دیواری باریک (لەنێوان دوو ژووردا).
**تیغە دروست کردن** (کتپ) tîxe dirust kirdin
کردنەوە (بەتیغە).
**تیغە شان** (ن) tîxe šan
زنجیرە چیا، زنجیرە شاخ، ڕیزەشاخ.
**تیف** (ن) tîf
پرژە، نم نم، نمەنمەی ئاو یان باران.
**تیف تیفە** (ن) tîf tîfe
بریقە، تیوتیوە، شەوق.
**تیف تیفەدان** (کتپ) tîf tîfedan
١- ئارایش کردن، تیف تیفەکردن، ڕازاندنەوە، تیو تیوەدان.
٢-لووس کردن، لووس وپووس کردن.
**تیڤل** (ن،کی) tîvil(ki)
ب (تویکل).
**تیق وەتیق** (ئان،کل) tîq we tîq(kl)
بەرامبەر یەک.
**تیکمە** (ئان) tîkme
پڕ، تۆکمە.
**تیکل** (ن،کل) tîkil(kl)
چلکاوخۆر، پاتەخۆر، بەکرێ گیراو (مرۆڤ).

**تیکل کردن** (کتپ) tîkil kirdin
چلکاو خۆریی کردن، پاتەخۆریی کردن.
**تیکە** (ن) [1] tîke
ب (پاروو).
**تیکە** (ن) [2] tîke
پارچە، برکە، قرتکە، کوت، کەت، لەت.
**تیکە** (ن) [3] tîke
پارچە، تیلمە، تیلماسک، کوت، کەرت، سفن، کەرتک، کەرک، لەت.
**تیکە تیکە** (ئاک) tîke tîke
ب (پارچە پارچە).
**تیکە تیکە بوون** (کتن) tîke tîkebûn
پارچە پارچەبوون، پەل پەل بوون، کوت کوت بوون، کەرت کەرت بوون، لەت لەت بوون.
**تیکە تیکە کردن** (کتپ) tîke tîke kirdin
پارچەپارچە کردن، پەل پەل کردن.
**تیکە چن** (ئان) tîkeçin
پاتەخۆر، تیکل، چاوبرسیی، چاو چنۆکە، چلکاوخۆر، سەر سوالکەر.
**تیکە چنیی** (ن) tîkeçinî
پاتە خۆریی، تیکلیی، چاو برسیتیی، چاو چنۆکیی، چلکاو، سەر سوالکەریی.
**تیکە گرتن** (کتپ) tîke girtin
ب (پاروو گرتن).
**تیکە گلین** (ئان) tîke glên
ب (پاروو گلین).
**تیل** (ئان) [1] tîl
خێل.
**تیل** (ن،لو) [2] tîl (lu)
توول، قەلەمێ دار.
**تیل** (ئان) [3] tîl
تۆڕ، شوت، لووس.
**تیلایی** (ن) tîlayî
(کاری ڕوانیین) بەگۆشەی چاو، بەتیلەی چاو، بەتیلایی چاو.
**تیلکە** (ن) tîlke
دیزە.
**تیلماسک** (ن) tîlmask
ب (تیکە).
**تیلماسک تێ گرتن** (کتپ) tîlmask tê girtin
پارچە تێ گرتن، پارچە لێ دان، پینەکردن.
**تیلمە** (ن،نا،لو) tîlme
ب (پارچە).
**تیلە** (ن،نا،لو) [1] tîle(lu)
ب (تووتک).

**تیله** (ن) tîle [1]

ب (تانووت).

**تیله** (ن) tîle [2]

گریشمه، ج'وبازیی.

**تیله‌که** (ن) tîleke

کۆل (پریاسکه‌ی ئاماده‌کراو که‌به‌کۆل هه‌لبگیرێ).

**تیله‌وتوانج** (نک) tîle w twanc

تیروتوانج، ئاخاوتنی تاڵ وجه‌رگ بڕ.

**تیله‌وتوانج تێ گرتن** (کتپ) tîle twanc tê girtin

باسـی که‌سـێ به‌خراپـه‌بردن، هه‌ڵـه لێ دۆزینـه‌وه، توانج تێ گرتن، توانج بۆ هاویشتن.

**تیله‌(ڕوخسار)** (ئان) tîle(ruxsar)

ڕه‌شتاڵه (پیست).

**تیله** (ن،کل) tîle(kl)

بـاوه‌ش (دار)، تیلـکێ، ئه‌وه‌نـده‌ی (هـه‌ردوو)بـاڵ بیگرێ.

**تیمار** (ن،پز) tîmar

چار، چاره، چاره‌سه‌ریی، ده‌رمانگه‌ریی.

**تیمارخانه** (ن) tîmarxane

بیمارخانه، خه‌سته‌خانه، نه‌خۆش خانه.

**تیمارکردن** (کتپ) tîmar kirdin [1]

چاره‌سه‌رکردن، چاره‌کردن، ده‌رمان کردن.

**تیمارکردن(ئه‌سپ)** (کتپ) tîmar kirdin (esp) [2]

ڕنه‌که کردن، شاڵ کردن، قاشاو کردن.

**تیمارکه‌ر** (ن) tîmarker

ده‌رمانکه‌ر، چاره‌که‌ر، چاک وه‌که‌ر.

**تیمانج** (ن) tîmanc

ئاڤار، پیسته‌ی خۆشکراو، تیماج، چه‌رمی خۆشـکراو، دووله، سه‌ختیان، سیرمه، شه‌قه، که‌وڵ.

**تیمچه** (ن) tîmçe

کاروان سه‌را، خان.

**تین** (ن) tîn [1]

تاقه‌ت، توانا، توانـایی، تـه‌وژم، گریـک، گـوڕ، ووزه، هیز.

**تین(ئاگر)** (ن) tîn(agir) [2]

گه‌رمایی، گرمیی، هه‌لاو، هه‌لم یان هه‌وای گه‌رم.

**تین پێ دان** (کتپ) tîn pêdan

به‌هیز کردن، تین دان.

**تین تیدا نه‌مان** (ند) tîn têda neman

ئاه له‌به‌ردا نه‌مان، بێ تین بوون، بێ هیزبوون.

**تیندار** (ئان) tîndar [1]

به‌توانا، کۆک، لیهاتوو.

**تیندار** (ئان) tîndar [2]

به‌تین، به‌هیز، له‌ش ساغ، هیزدار.

**تینگ** (ن،پز) tînig

ب (ئالگ).

**تینگانن** (کتپ) tîniganin

١- هینان وبردن، ئه‌مسه‌رو ئه‌سه‌ر پێ کردن.

٢- په‌ست کردن، بیزار کردن.

**تینگ پیوه‌نان** (کتپ) tînig pêwenan

بین پیوه‌نان، ده‌م پیوه‌نان، هه‌ڵ قوڕان.

**تینواره** (ئان،ن) tînware

ب (ئاواره).

**تینوو** (ن) tînü [1]

ته‌ژه‌نه، ته‌شه‌نه، تین، تینگ، تیه‌نگ، تیهن، تیی.

**تینوو** (ن) tînü [2]

ئاره‌زووه‌مه‌نـد، پـڕ ئـاره‌زوو، تاسـه‌مه‌ند، تامـه‌زرۆ، خواستار، دڵخواز.

**تینوو ئاو له‌ خه‌وا ئه‌بینێ** (پن)

tînü aw le xewa ebînê

مرۆڤی تینوو هه‌میشه ئاوی لـه‌یاد دایه، تینـوو هـه‌ر ئاوی له‌بیره. پشیله خه‌و به‌مشکه‌وه ده‌بینێ. دڵـدار خـه‌و به‌دڵبه‌ره‌که‌یـه‌وه ده‌بینـێ. واتـه: هـه‌موو که‌سێ‌له‌بیری ئه‌وشته‌دایه که‌گه‌ره‌کیه‌تیی.

**تینوو بوون** (کتن) tînübün [1]

ته‌ژه‌نـه‌بوون، ته‌شـه‌نه‌بوون، تیـه‌نگ بـوون، تینـگ بوون، ته‌ژنه‌بوون، تیهن بوون.

**تینوو بوون** (کتن) tînübün [2]

ئـاره‌زوو (هـه‌)بـوون، خواسـتن، دڵ خواسـتن، دڵ خوازتن، ویستن.

**تینوو کردن** (کتپ) tînükirdin

ته‌ژه‌نـه‌کردن، ته‌شـه‌نه‌کردن، تینـگ کـردن، تیـه‌نگ کردن، تیهن کردن.

**تینوو که‌وتن** (کتن) tînü kewtin

تینگ که‌وتن، پـیتاو کـردن، تووشـی نه‌خۆشـیی تیـر له‌ئاو نه‌خواردنه‌وه بوون.

**تینوویتی** (ن) tînüyêtî

تینگیی، ته‌ژه‌نگیی، ته‌شه‌نیی، تیه‌نگیی.

**تینوویتی شکاندن** (کتپ) tînüyêtî škandin

ته‌ژه‌نه شکاندن، تیهن شکاندن.

**تیوار** (ن) tîwar

زیپ، شه‌ماڵ.

**تیوه‌تیوه** (ن) tîwe tîwe

ب (تیفه‌تیفه).

**تیوه‌تیوه‌دان** (کتپ) tîwe tîwedan

ب (تیفه تیفه‌دان ١/).

**تیه‌ت** (ئان،کل) tîyet(kl)

ڕه‌قه‌لان، ڕه‌قان، ڕه‌قه‌ن (زه‌ویی).

**تیه** (ن،لو) tîye(lu)

چاو، چاڤ، چه‌م، چه‌و، چه‌هڤ، دیده.

**تیه‌ن** (ئاک) tîyen

بارنه‌قا، به‌ بارستایی.

**تیهن** ( ناو،کی ) tîhin(ki)
ب ( تینوو ).
**تیهن بوون** ( کتن،کی ) tîhin bün(ki)
ب ( تینوو بوون ).

**تیهن کرن** ( کتپ،کی ) tihin kirin(ki)
ب ( تینوو کردن ).
**تیی** ( ناو ) tîy
ب ( تینوو ).

**کۆتایی پیتی - ت -**

**-End of letter - T**

# ج

# -C-

**ج (ن)** c

پـێنجەم پـیتە لـەو ئـەلف وبێـیـەی ئـێستا زمانـی کوردیی پێ دەنوسرێت، پیتێکی کۆنسونانتە.

**جا (ئاک)**[1] ca[1]

جما،جا، ئنجا، ئینجا.

**جا (ئا** ca[2]

١- ئیتر، هەروەها،کەواتە. ٢- لەناکاما، لەناکامدا.

**جا (ن)** ca[3]

جێ.

**جا (ن)** ca[4]

١- رێ وشوێن، شوێن. ٢- پلە، رادە.

**جا ئاستە (ئان)** ca astc

جێماو.

**جاپاندن (کتپ)** capandin.

جوولاندن.

**جاپلووس (ن)** caplüs

جامەلووس، دەم تەر، ریاکار، زمان لـووس، کلکـە لـە -قێکەر، ماستاو ساردکەرەوە، مەراییکەر.

**جاپلووسیی (ن)** caplüsî

جامەلووسـیی، ریاکـاریی، زمـان لووسـیی، مـەرایی، کلکە سووتە، کلکەسووتێ.

**جاجکە (ن)** cacik

بنێشت، بنێشتی پـووختە، جاجکێ، جاچکێ، جاچکـە خۆشە، بەنوشت.

**جاجکە تاڵە (ن)** cacike tale

بنێـشتەتاڵ، شـیرەی دارقـەزوان، کـەتیرەی بـوتم، شیلەی دارەبەن (نەکولێنراو).

**جاجکە خۆشە (ن)** cacike xoše

بنێشتەخۆشە، بنێشتی خۆشکراو (کولاو).

**جاجم (ن)** cacim

جـارجم، پۆپـەشمێنێتەنکی لـەخوریی دروسـتکراو، مەوج.

**جاجوو (ن،کی)** cacü(kl)

دژمن، خەنیم، دژ، ناحەز، نەیار، دوژمن.

**جاچکە (ن،لو)** caçik(u)[1]

ب (بنێشت).

**جاچکە (ن)** caçik[2]

جاجکە، جاجیکە، کاهوی جنراو لەناو ماستدا.

**جاخ (ن)** cax[1]

١- توورەکەی موشەمما.

٢- توورەکەی بەرباخەڵ، کیسەی پەرۆ.

**جاخ (ن)** cax[2]

تەختەبەند.

**جاخ (ن)** cax[3]

١- دیواری لەدار (تەختە) دروست کراو.

٢- تامان، تەیمان، چەپەر.

**جاخ (ن)** cax[4]

چاخ، کات.

**جاخ (ن)** cax[5]

کاکۆل، گودلە.

**جادار (ن،لو)** cadar(lu)

١- جێگەدار، جێگەنشین، جێنشین، خەلفە.

٢- پایەدار، پایەبڵند، دیار، ناسراو.

٣- دەوڵەمەند، ساماندار، کۆکە.

**جادوو (ن)** cadü

ئەفسون، باربـەژن، تەلیسم، چاوبەسـت، دێوبەنـد، سیحر.

**جادووگەر (ن)** cadüger[1]

ئەفسوونباز، ئەفسوونکار، ئەفسوونکەر، باربەژنگەر، تەلیـسمان، تەلـەسمباز، جادووبـاز، جادووکـار، جادووکەر، جـادووگر، جـادوونوس، دێـو بەنـدنووس، جادوو نویس، سیحرباز.

**جادووگەر (ن)** cadüger[2]

نووشتەکەر.

**جادووگەری (ن)** cadügerî

ئەفسوونبازیی، ئەفسونگەریی، تەلیسمبازیی، جادوو بازیی، جادووکاریی، دێوبەندیی (بەهۆی جنۆکەوە)، جادوو گریی، سیحربازیی.

**جادوو لێ کردن (کتپ)** cadü lêkirdin

ئەفـسوون لێ کـردن، تەلیـسم لێ کـردن، سـیحر لێ کردن.

**جادە (ن)** cade

جەئد، جەئدە، راستەخیابان، راستەرێ، رێگـا، رێگـە، شەقام.

**جار (ن)** car[1]

دان، دەم، را، گەڕ، کەرەت، نۆبـە، نـۆرە، گـل، هـۆن، هەل، خول.

**جار (ن)** ٢ car
کات، گا، گاف، گاو.
**جاران (ناک)** caran
ئەوسا، لەڕابردوودا، لەوەپێشتر، لەکاتی ڕابردوودا، بەر لەئێستە.
**جارجار (ناک)** caran
١- جارجارە، جاروبار، جار وەجارێ، نۆرە نۆرە، جار بەجار، هەندێجار، جاربەجارێ، گاگایی، گاهگاه. ٢- بەبناوبەین، کات لەدوای کات.
٣- کەڕەت لەدوای کەڕەت.
**جاردۆ (ن)** cardo
جۆتۆ، کاردوو، کاردۆ، کوردۆ، گاردۆ، قاردۆ، گۆتۆ، ناوی کوردە لەمێژوودا.
**جاری (ناک)** ١ cardî
جاری بەرێ، جاری پێشوو.
**جاری (ناک)** ٢ cardî
دواجار.
**جارماز (ن)** carmaz
ب (جانماز).
**جاروبار (ناک)** carwbar
ب (جارجار).
**جارە (ن)** care
تاوێر، گابەرد، جالە، ئوتوز.
**جارەناجار (ناک)** carenacar
جارەناجارێ.
**جارەهایجار (ناک)** carehay care
چەندەها کەڕەت، زۆرجار، چەندەهاجار.
**جاری بەرێ (ناک)** carî berê
جاری پێشوو.
**جاریجاران (ناک)** carî caran
ڕۆژانی ڕابوردوو، زۆر پێش لەئێستا، لەمەوبەر، بەر لە ئێستا، لەپێشوودا.
**جاری دوایی (ناک)** carî dwayî
هەلی دوایی.
**جارێ (ناک)** ١ carê
ئێستانا، پاش.
**جارێ (ناک)** ٢ carê
کەڕەتێ، نۆرەیەک، کاتێک، کەڕەتێک، هەلێک.
**جارێکیان (ناک)** carêkyan
هەتا ئێستا.
**جارێکی تر (ناک)** carêkî tir
ئەمجارتر، جارێکی دی، دیسا، دیسان، دیسانەکە، دیسانەوە.
**جارێ لە جاران (ناک)** carêle caran
جارێکیان، ماوەیەکی زۆر لەمەوبەر، دەمێک لەدەمان.
**جاڕ (ن)** ١ car̲
زەوی ڕەق ونەکێلراو، زەویی سەخت، ڕەقانیی، ڕەقایی، ڕەقە، ڕەقەن.
**جاڕ (ن)** ٢ car̲
١- پاشماوەی دەغڵ ودانی هەڵگیراو، پەڕیز، جێگەی دەغڵی دروێنەکراو. ٢- لەوەڕگە
**جاڕ (ن)** ٣ car̲
جێگای دانەوێلە.
**جاڕ (ن)** ٤ car̲
جێگا، جێگە، دیبەر، شوێن.
**جاڕ (ن)** ٥ car̲
کەوشەن، گۆزەپان، مەیان.
**جاڕ (ن)** ٦ car̲
١- بانگەواز، قاو، هاوار، هەڵڵا هەڵڵا.
٢- بۆڕە، قاڕە، نەڕە.
**جاڕ (ن)** ٧ car̲
تاوێزە، چرای هەڵواسراو، چل چرا، لالە.
**جاڕچی (ن)** ١ car̲çî
جاڕدەر، جاڕکێش، بانگدەر، ڕاگەیەن، قاوکەر، چیرڤان، ئاگاکەر.
**جاڕچی (ن)** ٢ car̲çî
پروپاگەندەچیی، دەم بەهاوار.
**جاڕدان (کتن)** ١ car̲dan
بانگ ڕاهێشتن، بانگ هەڵدان، بانگەوازکردن، جاڕ ڕاهێشتن، جاڕ کێشان، ڕاگەیاندن بەدەنگی بەرز، خەبەر گوتن بەقەو.
**جاڕدان (کتپ)** ٢ car̲dan
ئاشکراکردن، دەرخستن، دەنگ دان، هەڵمالیین (نهێنی).
**جاڕس (ئان)** ١ car̲is
پەست.
**جاڕس (ئان)** ٢ car̲is
بێزۆ، وەڕز، وەڕس، جاڕز، وەڕس، بێزار، وەڕز، قەلس.
**جاڕس بوون (کتن)** car̲isbün
بێزاربوون، وەڕزبوون، وەڕس بوون، هەراسان بوون، جاڕز بوون، وەڕزبوون.
**جاڕس کردن (کتپ)** car̲is kirdin
ئارام لێ هەڵگرتن، بێزارکردن، تووڕەکردن، سەر

لێسەندن، وەڕزکردن، وەڕس کردن، هەراسان کردن، جاڕز کردن، وەڕزکردن.

**جاڕسکەر** (ئان) carisker
میشکبەر، هەراسانکەر.

**جاڕلێ دان** (کتپ) carlêdan
بوختان پێ کردن، پاشەڵ پیس کردن (کەسێ بەناڕەوا).

**جاڕوو** (ن،کل) carû(kl)
گزگێ، گەسک، گیزک، جاروفک.

**جاسووس** (ن) casûs
باس بەر، قسەبەر، شۆفار، سیخوڕ، زوانگیر، خەوەردن، هەواڵ دز.

**جاش** (ن،ئا) caş
بەچکەی کەر، بێچوەکەر، جاشک، جاشکۆلە، جاشولکە، جاشوولە،جاشەکەر، جەحشک، دەحشک، کورکێ، مۆلی.

**جاشی ماکەرێکن** (ئد) caşî makerêkin
ئاوری برکێکن.

**جاکەش** (ن،لو) cakeş(lu)
دەویت، کوسکەش، گەواد، ماسکەش.

**جام** (ن) cam [١]
ئاوخۆرە، ئاوخۆریی، بادە، بادێ، جامولکە، جامۆڵە، تاس، کاسە.

**جام** (ن) cam [٢]
حاجەت،دەوریی، دەفری قووڵ ودەم پەل، قاپ، زەرکێ.

**جام** (ن) cam [٣]
جامەکێ، قباڵە، قیبالە.

**جام** (ن) cam [٤]
ئاوێنەی بەختکرەوەکان.

**جام** (ن) cam [٥]
شووشە، وەنەدیکێ.

**جاماڵ** (ن) camal
خانەدان، ماڵەگەورە.

**جامالگە** (ن) camalge
شوێنی ئیلاخ (ئیلاتی کۆچەریی)، هەوار.

**جامباز** (ن) cambaz
بستە، تافتەخۆر، دەستبڕ، فریوباز، فێڵباز، قۆڵ بڕ.

**جامباز** (ن) cambaz[١]
پاڵەوان، پەتباز، تەنافباز.

**جامباز** (ن) cambaz [٢]
ب (دەلال).

**جامبازخانە** (ن) cambazxane
پەتبازخانە، سیرکێ.

**جامبازە** (ن) cambaze
خانبازی، نیسکە، یاریی وهەستانە سەر پاشوو(ئەسپ)، هەڵبەز ودابەزی ولاخ.

**جامبازەکردن** (کتن) cambazekirdin
جانبازەکردن، نیسکەکردن، یاریی کردن و هەستانەسەر پاشوو (ئەسپ).

**جامبازی** (ن) cambazî
تافتەخۆریی، تەڵەکەبازیی، فریوبازیی، فێڵبازیی.

**جامخانە** (ن) camxane [١]
پیشانگەی ناو دووکان، شوێنی ڕانانی کاڵا.

**جامخانە** (ن) camxane[٢]
جامەکان، جەمەکانە، شووشە بەند، هۆدەی شووشە بەند.

**جامڕێژ** (ن) camrêj
ئاوێنە بەند (ژوور).

**جامەدانە** (ن) camedane
منداڵدان (ئاژەڵ)، پزان، پزدان.

**جامەکە** (ن،کل) camek(kl)
زەرەبین، شت گەورەکەر.

**جامەلووس** (ن) camelûs
جاپلووس، مەراییکەر، ماستاو ساردکەرەوە، سفتەکەر، تەڕزوان، زمان لووس، ڕیاباز، جاملووس، زوان لووس، ماستاوکەر.

**جامەلووسی** (ن) camelûsî
سفتە، مەرایی، کلکە سووتە، کلکەسووتێ، کلکەلەقێ.

**جامەلووسی کردن** (کتپ) camelûsîkirdin
کلکەلەقێ کردن، مەرایی کردن، ماستاوکردن.

**جامەمەرگ** (ن) camemerg
بەرگی مردوو، کفن.

**جان** (ن) can [١]
کان، کانگە.

**جان** (ن) can [٢]
ژیان، ژین، گیان، ڕۆح.

**جانان** (سر) canan
خۆشەویست.

**جانانە** (ئان) canane [١]
زۆرزان (ئافرەت).

**جانانە** (ئان) canane [٢]
بەزمان، تەفرەدەر، زبان لووس، زمان لووس

(ئافرەت)، سازندە، سازنە.

**جانانە** (ئان) [2] canane

جانان، دۆستی گیانی بەگیانیی، گراوی، ماشووقە، یار.

**جانانە** (ئان) [4] canane

دولبەر، دلبەر، دل فڕین، ئارین، یاری زرنگ ودڵ رفێن.

**جانتا** (ن) canta

جامتا، جل بەنیی، باوڵ، چەمەدان.

**جانتای دەس** (ن) canty ades

جۆرێک، هەگبە، خورجین.

**جانفاس** (ن) canfas

تەنراوی گونیە، کوتاڵیی گوینیی چندراو لەگوش.

**جانکوش** (ن) cankuš

مجێوری کلیسا، خزمەکاری کەنیسە.

**جانگ** (ن) cang

ب (جاو).

**جانگی** (ن،کل) cangî(kl)

جانگیە، جاینگ، لاجانگ، نێوان چاووگوێ، جانگ، کەنارەی دەموچاو.

**جانماز** (ن،کل) cannimaz(kl)

بەرماڵی نوێژ، جارمان، دوگرد.

**جانەوەر** (ن) [1] canewer

١- جناوور، گیانەوەر، گیاندار، جەناوەر، جاندبەر، زیندەوەر، خاوەن گیان. ٢- جروجانەوەر، زیندوو.

**جانەوەر** (ن،ئان،ئا) [2] canewer

درندە، کێویی.

**جاو** (ن) caw

جاووک، کەرنە، کەزینە، خام جاو، جانگ، شاڵی لەداوە لۆکە دروست کراو.

**جاوبر** (ن) cawbir

قەیچیی، مقەست.

**جاوراو** (ن) cawraw

ب (جووراو).

**جاونانەوە** (کتپ) caw nanewe

جاورایەڵ کردن، داوی سریشاویی بوزوو رایەڵ کردن.

**جاونانەوە** (ئد) caw nanewe

زۆرهات وچۆ کردن، هاتوچۆکردن (زۆر وبەلەز).

**جاوید** (ئان) cawîd

ژیمان، نەمر.

**جاوینەوە** (کتپ،کتن) cawînewe

ب (جوونەوە).

**جاه** (ن) cah

بلندیی، پایە، پلە، گەورەیی (مرۆڤ).

**جاهیل** (ئان) cahêl

جحێل، جەحێل، جەهێل، جوان، جێل، دەستە، گەنج، لاو، هەرزە، جاڵ، نۆجوان، نەوجەوان.

**جاهیلان** (نک) cahêlan

پێکوڕە، جوانان، جەهێلان، گەنجان، لاوان، هەرزەکاران.

**جبرائیل** (ن) cibraîl

جبریل، گبریل، گەبریل، گەبرەییل، گەوریل، خۆش مژدە، دەروون پاک، گیان پاک، مژدە، مژدەهاوەر، مژداوەر، (یەکێکە لەوحەوت فریشتانەی لە قورئان وئینجیل وتەوراتدا ناویان هاتووە).

**جبۆ** (ج،ئان) cibo

فلان، فلان کەس، کابرا، فلانی، کاورا.

**جبە** (ن) cibe

بالاپۆش، پاڵتاوخەز، کەوا.

**جبەخانە** (ن) cibexane

١- باروتخانە، بارووخانە، جەبەخانە، خەبلخانە، قۆرخانە، قوورەخانە.

٢- کەرەستەی جەنگ، کەرەسەی شەڕ.

**جت** (ئان،کل) cit (kl)

جق، جقن، ڕەپ، هەستاو.

**جتەوبوون** (کتن،کل) [1] citewbûn(kl)

راست بوونەوە، هەستان، هەڵسان.

**جتەوبوون** (کتن) [2] citewbûn

جق بوونەوە، قوت بوونەوە، لەپڕ ئامادەبوون.

**جدەو** (ن،پز،کل) [1] cidew(kl)

بڕینی ناو شانی ولاخ (بەهۆی شت لێ خشانەوە)، جەدەو.

**جدەو** (ئان،کل) [2] cidew(kl)

١- خراپ، خراو، عەیبدار، نەنگدار، ناتەواو.

٢- لەکارکەوتوو.

**جدەوبوون** (کتن،کل) [1] cidewbûn(kl)

خراپ بوون، خراوبوون، نەنگداربوون.

**جدەوبوون** (کتن،کل) [2] cidewbûn(kl)

لەکارکەوتن.

**جدی** (ن،نس) [1] cidî

بزن، گدی، کەلووی بزن، دەهەم کەلوو.

**جدی** (ن.نا) [2] cidî
بزن، سابرێن، هەوریی، گدی.
**جر** (ن) cir
برادەریتیی، هاودەمیی، ناسیاویی.
**جراجر** (ن) ciracir
جرەجر، دەمەقالیی، دەمەقال، دەمەقرە، شەرە دەنووکێ.
**جرپ** (ن) cirp
ب (جوولە).
**جرپن** (ن) cirpin
برزیو، برزێ، برزۆک، بزووک، تۆسن، جوولە جوولکەر، دەلۆکار، کەرکاش، نارەحەت، نەسرەوت، هەلەشە، نۆقرە نەگر، دانەسەکناو، هەدانەدەر.
**جرت** (نان) [1] cirt
قرت، هەرزە.
**جرت** (ن) [2] cirt
ب (جرتە).
**جرت وفرت** (نک) [1] cirtw firt
تەراتێن، جرپ و جۆپ، جرت وپرت، جرپنی وفرتە فرتی نابەجێ، فرت وجرت، هەلبەزو دابەزی بێ سوود.
**جرت وفرت کردن** (کتن) [1] cirtw firtkirdin
جرپنی وبزێوی کردن، جرپنی وفرتەفرتی نابەجێکردن، جرپ وجۆپ کردن، هات وچۆکردن بەپەلە.
**جرت وفرت کردن** (کتن) [2] cirtw firtkirdin
دەلۆکاریی کردن، هەرزەیی کردن.
**جرتە** (ن) [1] cirte
پالتۆی لباد، کەپەنک، فەرەنجی.
**جرتە** (ن) [2] cirte
جرت، بزێویی، جرپنیی، جرپ وجۆپ.
**جرتەکردن** (کتن) cirte kirdin
بزێویی کردن، جرپنی کردن، هات وچۆکردن بە توورەییەوە.
**جرج** (ن.نا) circ
جرد، جوردی، جەرد، پنق، پزک، مشکی گەورە، مشکی دەشتیی.
**جرز** (ن) cirz
سووچ، گۆشەوارە.
**جرقە** (ن) cirqe
بروسکە، پرشە، پروسکە، پریشک، پزوسکە.

**جرک** (ن.پز) cirk
بەلسەم، مەرهەم، مەلحەم.
**جرم** (نل) cirm
ب (تلپە).
**جرنگاندن** (کتپ) ciringandin
پارەدان بەکەسێ بەنا بەدل، شت بەگران کرین.
**جرنگە** (ن) ciringe
دنگە، زرنگە، جرینگەجرینگە، جرینگێ.
**جرووکاندن** (کتن) cirükandin
جرووکەکردن، جریوەکردن، جریواندن، جریکەجریکێ کردن، جیکەجیکە کردن.
**جرووکە** (ن) cirüke
جریوە، جریکە، جریکە جریکێ، جیکە، جیکە جیکێ، جرووکە جرووکێ، دەنگی چۆلەکە.
**جریت** (ن) cirît
سووکەرم (بۆ هاویشتن).
**جریتان** (ن) cirîtan
١- جریتێن، جریتبازیی، جریێان، جلیتبازیی، جلیتێن. ٢- تۆپ تۆپێن بەسواری ئەسپەوە. کاری یاریی کردن بەتۆپ بەسەر پشتی ولاخەوە.
**جریتبازی** (ن) cirîtbazî
ب (جریتان).
**جریکە** (ن) cirîke
ب (جرووکە).
**جرینگاندن** (کتپ) cirîngandin
جرنگاندن، زرنگاندن، زرنگە پێ کردن.
**جریواندن** (کتن) cirîwandin
ب (جرووکاندن).
**جریوە** (ن) cirîwe
تروکە تروکی ئەستێرە.
**جڕ** (ن) [1] cir̲
ئەدا، پرەنگێ، رەوت، رەویەت، کردار، کەنشت.
**جڕ** (ن) [2] cir̲
بێ هێزیی.
**جڕجونگانێ** (نان) cir̲cunganê
جڕ جرونگانێ، توورەوتڕۆ، زوو تووڕ، زوو تۆڕ، کشە مرێ، تۆزینۆکە، جڕ جینگانێ.
**جڕنیاوفڕنیا** (ن) cir̲niyaw fir̲niya
١- ختوکە و گدەگدە، سوعبەت، گالتەوگەپ، یاریی و مەزاق.
٢- ئاخاوتنی بێ تام وخوێ، جڕنا.

**جروجانەوەر (نک)** cirwcanewer[1]
گیانەوەری بەوەزەن، گیانەوەی زیان بەخش.
**جروجانەوەر (نک)** cirwcanewer [2]
١- پرووپیتی بێکەلک، شرە، شرەوپرە.
٢- شتی هیچ وپووچ.
**جروجیاز (نک)** cirwciyaz
پرووپیتی ناومال، جروجیازیی ناومال.
**جرهاتن (کتن)** cirhatin
بەگیرهاتن، تەنگەتاوبوون، نارەحەت بوون.
**جرەجر (ن.)** cire cir
جراجر، شەرەچەقە، شەرەدەنووک.
**جزدان (ن)** cizdan
برادوو، بنۆلە، کیسە باخەل، کیسەی بەرباخەل، کیسەی پارە، کیسۆلکە، کیسە، کیسەباخەل.
**جزم (ن)** cizim [1]
بەرگ، بەش، پەلگیە (پەرتووک)، پاژ، جزو.
**جزم (ن)** cizim [2]
جۆر، چەشن.
**جزمە (ن)** cizime
چەکمە، پووت، کەوشی لاسک درێژی تاژێر ئەژنۆ، چزمە، کەوشی مل درێژ تازرانی.
**جزوبەندکردن (کتپ)** cizwbend kirdin
بەرگ تێ گرتن، بەندکردن، لەبەرگ گرتن،بەیەکەوە بەستن، پێکەوەدان ودروون (پاژەی کتێب).
**جزوبەندکەر (ن)** cizw bendker
بەرگ تێگر.
**جزە (ن)** cize
برژە، برژە برژ، جز، جزەجز.
**جست وجۆ (ن.ناک)** cistwco
١- پاپەی، پێجووریی، پێپەی، جس وجوو، کونجکاویی. ٢- هات وچۆ.
**جست وجۆکردن (کتپ)** cistw coker[1]
سەرنج دان، لێ ووردبوونەوە، لەدووگەڕان.
**جست وجۆکردن (کتپ)** cistwcokirdin[2]
پاپەی کردن، پێجووریی کردن، پێپەی کردن، جس وجۆکردن، هات وچۆکردن.
**جسن (ن)** cisin [1]
جسنات، بنەچەی خێزان، بنیچە، نەژاد.
**جسن (ن)** cisin [2]
ڕەسەن (وەک ئەسپ...)، ئەسل زادە.
**جسن (ئان)** cisin [3]
ڕەسەن، وەجاغزادە.

**جشک (ن.نا)** cišik
ژووشک، ژیشک، ژووژی.
**جغز (ن)** cixiz [1]
بازنە، جوغز، جەغز، کیڕی گرۆڤەر، خەتی بەدەورە. چووز.
**جغز (ن)** cixiz [2]
کیرە گرد، زنجیرە چیالەسەر خەتێ.
**جفت (ئان)** cift [1]
جووت بوو، لکاو، لکیاگ، نووساو.
**جفت (ئان)** cift [2]
چۆن یەک، وەک یەک، هاوکێش.
**جفت (ئان)** cift [3]
چەبت، جەوت، توێکلی بەڕوو، کلاوبەڕوو، جووت.
**جفت (ئان)** cift [4]
تا، جووت، جوور، لف، لنگ، لنگە، هاوکێش.
**جفت (ن)** cift [5]
گاجفت، گاجووت، گاوجفت.
**جفت (ن)** cift [6]
شیف، شۆ.
**جفتوو (ن)** ciftü
پێشبرکە، ملەملە (بۆ هەمان مەبەست).
**جفتە (نک)** cifte
دەمەقەل، ماشەی دەم باریک.
**جفتە وەشاندن (کتپ)** cifte weššandin
ب (جووتە وەشاندن)
**جڤات (ن.کی)** civat(ki)
بتۆم، دەستە، کۆمەل، کۆمەلە، گەل، گەلە، هوگە، جوات.
**جڤان (ن.کی)** civan(ki) [1]
ب (پەیمان).
**جڤان (ئان.کی)** civan(ki) [2]
خۆش مەشرەف، ڕووخۆش، کۆمەلیی، گولی کۆڕ (مرۆڤ).
**جڤاندن (کتپ)** civandin [1]
ب (جوولاندن).
**جڤاندن (کتپ.کی)** civandin(ki) [2]
کۆکردنەوە، کۆم کردن.
**جڤن (ن.کی)** civin(ki) [1]
چاخ، دەم، کات، ماوە، مەودا.
**جڤن (ن.کی)** civin(ki) [2]
جێ، جێگا، جێگە.

**جڤینگ** (ن،کی) civing(ki)
پەیمانگە، جڤینگە، جێی کۆبوونەوە، جەیێ کۆم بوون، کۆمەڵگا.
**جڤین** (کتن،کی) civîn(ki) ١
جیڤینگێ کرن، کۆبوونەوە، کۆم بوونەوە.
**جڤین** (کتن،کی) civîn(ki) ٢
ب (جوولان).
**جقە** (ن) ciqe ١
چقە(کەڵەشێر..)، پەنجەی هەرەسەرەوەی کەڵەشێری خرت، قوتکەی پشت پەنجەی کەڵەشێر، چق.
**جقە** (ن) ciqe ٢
١- شایەر.
٢- نیشانە، ئەوشاپەڕەی کەدەکرێ بەکڵاوەوە.
**جقە** (ئان) ciqe ٣
بادامیی، بایەمیی.
**جقە** (ن) ciqe ٤
پەرۆش، مەنجەڵ.
**جک** (ن) cik ١
میێ.
**جک** (ن) cik ٢
قاب، قاپ.
**جگ** (ن) cig
(پشتەوەی) میچ، چو، چوو، قاپ، جک، چک، قویرەی میچ، جگی لەسەر پشت کەوتوو.
**جگانێ** (ن) cigânê
جگین، میچین، جگ وپشت، یاریی میچ میچین، قاپین.
**جگە** (ئان) cige ١
تەنها، جیا، جیاواز، جگا، جودا.
**جگە** (ئاک) cige ٢
بەتەنها، بەجیا.
**جگەر** (ن) ciger
١- جەرگ، جەگەر، میلاک، کەزەب.
٢- جگەر گۆشە، رۆڵە،منداڵ.
**جگەرخوێن** (ئان) cigerxwên
جەگەر خۆن، دڵ بەخوێن، دڵ بریندار.
**جگەرسۆز** (ئان) ciger soz
بەتەنگەوە بوو، پەرۆش، خەمخوار، دڵسۆز، دڵۆڤان.
**جگەر سووتان** (کتن) ciger sûtan
جگەر گۆشەمردن، جەرگ سووتان، رۆڵەمردن، منداڵی کەسێ مردن.
**جگەرسووتاو** (ئان) ciger sûtaw
منداڵ مردوو.
**جگەرسۆزی** (ن) ciger sozî
بەزەیی،جەرگ سۆزیی، میهرەبانیی، هەستی دڵسۆزیی.
**جگەرگۆشە** (ن) cigergoše
رۆڵە، منداڵ، کۆرپە، کۆرپەلە.
**جگەرە** (ن) cigere
جغارە، جغەرە، جگارە، توتنی لەکاغەزەوە پێچراو بۆ کێشان.
**جگەرەخۆر** (ن) cigerexor
جگەرەکێش،جغارەخۆر، ئالوودەی جگەرە، جغارەکێش.
**جگەرەکێشان** (کتپ) cigere kêšan
جگەرەخواردن، جغارەکێشان.
**جگەرەکێشێ** (ئد) cigere kêšê
ئەوەندەی جگەرەیەک بکێشرێ، زۆر زوو.
**جگەرەکردن** (کتپ) cigere kirdin
بەلاوەنان، لێ گەڕان، وازلێ هێنان.
**جگەلە** (پ) cigele
بێجگە لە، بێلەوە.
**جل** (نک) cil ١
بەرگ، پۆشاک، جلک، کەل وپەل.
**جل** (ن) cil ٢
قوماش، کووتاڵ.
**جل** (نک) cil ٣
پەلاسی ولاخ، پارچە لبادی سەر پشتی بارەبەر.
**جل بڕ** (ن) cilbiṟ
ب (جلدروو).
**جلبڕۆکە** (ن) cilbiṟoke
مزرۆکە، مزراویلکە، شلەی هێلکەوسماق.
**جل بڕین** (کتپ) cilbiṟîn ١
جل(کردن، دروون).
**جل بڕین** (کتپ) cilbiṟîn ٢
داوەت کردن (لەلایەن ماڵی بووەکەوە بۆ بڕینی جلی بووک).
**جل بەند** (ن) cilbend
جل بەنی، جامتا، جانتا، باوول.
**جل پۆش کردن** (کتپ) cilpoš kirdin
داپۆشین، شاردنەوە.
**جل خوار** (ئان) cilxwar ١
١- پنتی. ٢- گێل، نەزان.

**جل خوار** (نان) cilxwar ٢
بیگانەپەرست، تەپرەش، نۆکەری بیگانە، خوێن خوار، جرخوار.

**جل داکەندن** (کتپ) cil dakendin
جل فڕێدان، جل لەبەرخۆ داماڵین خۆ ڕووت کردنەوە.

**جلدان** (ن) cildan
١- بوخچە، چارۆکە، کۆڵوانە.
٢- چارۆکە، کۆڵوانە (سەرشان).

**جلدروو** (ن) cildirû
بەرگدروو، بەرگساز، تەرزیی، خەیات، دروونکار، دروونکەر، دەرزی، جلبڕ.

**جل دروون** (کتپ) cildirûn
بەرگ دروون، خەیاتیی کردن، دروومان کردن، جل بڕین ودروون.

**جل ڕەش** (نان) cilreš
تازیبار، ڕەش پۆش، قەڵاخیی، کۆست کەوتوو.

**جل شتن** (کتپ) cilšitin
بەرگ و کالاشتن، جل پاک کردنەوە بەئاووسابوون، جل شوشتن، کەلیی کرن، بالاف کرن، شیووکوڵ کرن.

**جل شۆر** (ن) cilšor ١
جل شۆ، کارەکەر، ئەو کەسەی جل وبەرگ دەشوا (بۆ خەڵکی تر بەپارە..)، جل وبەرگ شۆر.

**جل شۆر** (ن) cilšor ٢
ماشینی جل شتن، جل شۆرک، بالافکەر.

**جل شۆرک** (ن) cilšork ١
جل شۆر، جل کوت، گەلا کوتک، داری جل کوت.

**جل شۆرک** (ن) cilšork ٢
ژووری جل تیدا شتن، جیگەی بالاف،شوینی کەل وبەل لێ شتن.

**جلفڕ** (نان،کل) cilfir(kl) ١
گلۆر، گەلحۆ، گەمژە.

**جلفڕ** (نان،کل) cilfir(kl) ٢
بزێو، جڕین، هەدانەدەر، شێتۆکە، گەللایی.

**جلکار** (ن) cilkar
جلی کار، بەرگی کارێ.

**جل کردن** (کتپ) cilkirdin ١
کورتان کردن، کورتان لێ کردن.

**جل کردن** (کتپ) cilkirdin ٢
جل دروست کردن، جل وبەرگ بەدروون دان.

**جل لەبەرکردن** (کتپ) cil leberkirdin
خۆ پۆشتەکردنەوە.

**جل وبەرگ** (نک) cilwberg
بەرگ، پۆشەن، پۆشەنی، تەرک، جل، جلک، جلک وجۆر، جل وجۆر، جل ومل، سیپاڵ، شمەک، کالا. کەل وبەل (بۆ لەبەرکردن).

**جل وجۆر** (نک) cilwcor ١
ب (جل وبەرگ).

**جل وجۆر** (نک) cilwcor ٢
شتی ناوماڵ، شرکەوپرکە، شرەی ناوماڵ.

**جل وجۆر** (نک) cilwcor ٣
بەرگ وسیپالی ولاخی بەرزە.

**جل ومل** (نک) cilwmil
ب (جل وبەرگ).

**جلە** (ن) cile ١
سیلە، ڕەقەی گەورە، جەلاویی، جلەناویی.

**جلە** (ن،رو) cile ٢
جلەشرە، قەوزەی ناوئاو، کەزو کوز، کەڤس، لیم، خوریەجنە، کەز، کەوز، خوریە جندۆکە.

**جلەگا** (ن) cilega
سیپال.

**جلی ناوماڵ** (ن) cilî nawmal
جلی شەو، جلی نوستن.

**جلد** (ن) cild ١
بەرگ (کتیب).

**جلد** (نان) cild ٢
زرنگ، قۆچاخ، گورج.

**جلف** (نان) cilf
سووک، سۆک، چرووک، قرت، هەرزە، هیچ وپووچ، ئاکار ناشرین.

**جلق** (ن) cilq
١- دراوی کەم بەها (لەمس دروستکراو).
٢- بێ ڕەواج، قەڵب.

**جلقێ ناهێنێ** (رس) cilqê nahênê
فلسێ ناهێنێ، بێ بەهایە.

**جلوە** (ن) cilwe
نمایشت، ڕوونیی، زەلالیی.

**جلەو** (ن) cilew
جەلەو، دانەلغاو، دەستەڕەشمە، دەستەوسار، قەراسە، قەوچە، لغان، دەسەجلەو، مەهار، هەڤسار، هەوسار، قامچیی لغاو، کلکەی لغاو، کلکە ڕەشمە.

**جلەو بەربوون** (ند) cilewberbûn
١- جلەوپچران، بواری هەموو جۆرە رەفتاری هەبوون، بەهەوەسی خۆ رەفتارکردن.
٢- یاخیی بوون، بەلەسەبوون، پەت پچران.
**جلەو بۆ بەردان** (ند) cilew bo berdan
بوارەدان، بەرەلاکردن، پەت بۆ بەردان،پەت بۆ شل کردن، جلەوشل کردن، ماوەپێ دان، بەربۆ بەرەلاکردن، بەدەمەوەدان ، لغاو بۆبەردان.
**جلەو بۆ شل کردن** (ند) cilew bo şil kirdin
١- ب (جلەوبۆ بەردان).
٢- ماوەپێ دان، بەربۆ بەرەلاکردن، بەدەمەوەدان
**جلەودار** (ن) ١ cilew dar
جلەوکێش، سەرەکە کاروان، هەوسارکێش.
**جلەودار** (ن) ٢ cilew dar
پیشەوا، سەراکە، سەرۆک.
**جلەوراکێشان** (ند) cilewrakêşan
ب (جلەوکێشان).
**جلەوشل** (ئان،فر) cilewşil
بەرەلا، بێ لغاو، بێ بەرهەڵست.
**جلەو بۆشل کردن** (ند) cilew bo şilkirdin
ب (جلەوبۆ بەردان).
**جلەوکێش** (ن) ١ cilewkêş
ب (جلەودار).
**جلەوکێش** (ن) ٢ cilewkêş
سەردەستە، سەردەسە، سەرکردە.
**جلەوکێشان** (کتپ) ١ cilewkêşan
دەستە رەشمەی ولاخ راکیشان، جلەوتوند کردن، جلەو راکێشان.
**جلەوکێشان** (ند) ٢ cilewkêşan
جلەوگیریی کردن (کەسێ لەکردارێکی هەلە).
**جلەوگرتن** (کتپ) cilewgirtin
تەگەرەتێ خستن، قەدەغەکردن، کۆسپ هێنانەبەر، بەربەست کردن، نەهێشتن، تەگەرەخستنەبەر، جلەو گیریی کردن.
**جلەوگیر** (ن) cilewgîr
١- جلەوکێش. ٢- سەرپەرشتیکەر.
**جلەوگیری** (ن) cilewgîrî
بەربەس، بەربەست، بەرپێچ، جلەوگیر، کۆسپ، کۆسپی سەر رێگە.
**جلەوگیری کردن** (کتپ) cilewgîrî kirdin
بەربەست کردن، بەرپێچ دان، بەرگرتن، بەرلێ گرتن، جلەوگرتن، جلەو هەڵتەکاندن، جلەوهەڵکێشان، دەست خستنەرێ، دەست خستنە رێگە، رێ پێنەدان.
**جلەوهەڵتەکاندن** (کتپ،ند) cilewheltekandin
وریاکردنەوە، وەئاگا هێنان (لەمەترسیی).
**جلیتبازی** (ن) cilîtbazî
جریتان.
**جم** (ن،کل) cim(kl)
ب (جوولە).
**جمان** (کتن،هە) ١ ciman(he)
جمیان، جمیین، جەمیین، جوولان، بزووتن، لبان. هەژان، جم دان.
**جمان** (کتن) ٢ ciman
پێکە گەیشتن، گەیشتنە یەکێ.
**جمان** (کتن) ٣ ciman
پرتەکردن، لێدان (دل).
**جماندن** (کتپ) ١ cimandin
جوولاندن، لەرزاندن، شەکاندن، شەکاندنەوە، راوەشاندن.
**جماندن** (کتپ) ٢ cimandin
تەدارەک کردن (بۆ کاتی شەڕ).
**جماندن** (کتپ) ٣ cimandin
بزاوتن، بزواندن، فڕفڕاندن، هەژاندن.
**جمبش** (ن) ١ cimbiş
ب (جمە).
**جمبش** (ن) ٢ cimbiş
ب (زەماوەند).
**جم دان** (کتن) ١ cimdan
جمان،جوولان، جنگێ دان، لەریینەوە، لەرانەوە.
**جم دان** (کتپ) ٢ cimdan
جوولاندن، لابردن.
**جمشرگ** (ن) cimşirg
مووچ دەس، مەچەک.
**جمک** (ن،شس) cimik
١- جووتە، دووبرالە. ٢- دووانە، هەوال دووانە، زگەدوانە، جێمک، هاوال دووانە، لفە.
**جمگە** (ن) cimge
پارچە، کوت، لەت.
**جمگە جمگە** (ئان) cimge cimge
پارچەپارچە، کوت کوت، لەت لەت.
**جم وجۆل** (ن) cimwcol
جوولە، جوولەجوول، جووم، پەیچوو، جنگێ وجۆل، فرت وجرت، نائارامیی، هات وچۆ، جوست وجۆ،

جوس وجۆ.

**جم وجۆڵ کردن** (کتن) [1] cimw colkirdin

جووڵـەجووڵ کـردن، جوسـت وجـۆکردن، هـات وچـۆکردن، نەسرەوتن، پـەیجۆریی کـردن، جـست و جۆکردن، جنگە وجوڵ کردن، بزووتن، هەدانەدان.

**جم وجۆڵ کردن** (کتن) cimwcolkirdin[2]

١-بەتالووکەبوون،بـەتاویوون، پەلەپـەل کـردن، لەزیین. ٢- پەشۆکان، شلەژان.

٣- بەشوێندا گەڕان، بەدووداگەڕان.

**جم وجۆڵکەر** (ئان) cimw colker

جووڵە جووڵکەر، جست وجۆکەر، نەسرەوت.

**جمە** (ن) [1] cime

جم، جمس، جووڵە.

**جمە** (ن) [2] cime

قەڵەبالغیی، هووژە، چرژە.

**جمە** (ئان) [3] cime

پڕ لەخەڵک، پڕ لەعەشامات، قەڵەبالغ.

**جمەکردن** (کتن) cimekirdin

ب (جووڵان).

**جمەهاتن** (کتن) cimehatin

ب (چڕبوون).

**جمێن** (ن،کی) cimên(ki)

ب (جنێو).

**جن** (ن) cin

ب (جنۆکە).

**جناغ** (ن،لو) cinax(lu)

قەفەزەی سنگ.

**جن تێ تسان** (ئد) cin tê tisan

پیت نەمان، جن تێ تسیین، کەم بوونەوە، زووتـەواو بوون(شت).

**جنچک** (ن،رو) [1] cinçik

جینچکە، ناوکە، ناوکی میوە، جنجکە، دەنکە.

**جنچک** (ئاکە) [2] cinçik

ڕیزە، بەکەمی.

**جنچکان** (کتن) cinçikan

جنچکـەدان، کزکۆڵـە دانیـشتن، کزۆڵـە دانیـشتن، هـەڵتووتان بەچیچکانـەوە، بەچیچکانـەوە دانیـشتن، هـــەڵ توتـــەکان، قونـــەڵتس دان، تووتـــەکان، هەڵتروشکان.

**جندار** (ئان) cindar

پەتەڕی.

**جنداربوون** (کتن) cindarbûn

پەتەڕیی بوون، شێت بوون، دین بوون.

**جندە** (ئان،کل) cinde(kl)

داوێن پـیس، خـراپ، کـۆڵان گـەڕ، بـەرەڵا، خـۆفرۆش (ئافرەت)، ناپاک، قەحبە، جوونە، قاحبە.

**جندەخانە** (ن) cindexane

قەحبەخانە، ماڵەجنـدە، مـەکۆی ژنـانی خـۆ فـرۆش، جۆبە.

**جندی** (ئان) cindî

١- باش، خاس. ٢- ئازا، بەکار.

٣- جوان، سپەهی.

**جنراو** (ئان) cinraw

وردکراو، پل کراو، ئەنجنراو، پل کریـاگ، قیمـە کـراو، هەنجناو.

**جنکە** (ن) cinke

ئەنجە، پل، ڕیزە.

**جنگانە** (ن) cingane

قـــەرەج، ڕەوەنـــد (کەلەبنەڕەتـــدا لەهندســـتانەوە هاتبن).

**جنگز** (ئان) cingiz

١- توند، تووڕە، جنگن، دڕ.

٢- بەدفەڕ، شەڕانیی، جەنگێز.

**جنگیر** (ئان) cingîr

خوێنخوار، دیکتاتۆر، زۆردار.

**جننە** (ن) cinne

١- بەجۆش، جۆشن، حەشەری.

٢- سۆزمایینی، سۆزانی.

**جننەباز** (ن) cinnebaz

خانمباز، سۆزانباز.

**جننەخانە** (ن) cinnexane

خراپخانە، ماڵەشایی، کارخانە، قەحبەخانە.

**جنۆکە** (ن) cinoke

ئەجننە، جن، درنج، دڕینج، قڕنەسەر، جندۆکە، جنـد، جندووکە.

**جنە شارەوشار** (ن) cinne šarewšar

شارانگەڕ، گەڕۆک، گەڕیدە.

**جنێو** (ن) cinêw

جۆن، جوێن، جوون، جمان، جژوێن، دژمێن، دژوێـن، دوژمان، دوژمـێن، دوژێـن، دوژن، بیزکـاریی، خەبـەر، دژمان، سخێف، دمژێن، دژنام، جمێن، چێر.

**جنێوخواردن** (کتن) cinêwxwardin

جوێن خواردن، دژمێن خواردن.

**جنێودان** (کتپ) cinêwdan
بەرجنێودان، جنێوپێ‌دان، جوێن پێ دان، جۆن دان، جوێن دان.

**جنێوفرۆش** (ئان) cinêwfiroš
جنێـودەر، جـوێن فـرۆش، دەم پـیس، زمـان پـیس، جوێندەر، سنحیف بێژ، جۆن فرۆش.

**جنین** (کتپ) cinîn¹
ئەنجن ئەنجن کردن، ئەنجنین، قیمەکردن، وردکردن، هەنجنین.

**جنین** (کتپ) cinîn²
پارچەپارچەکردن، پل پل کردن، لەت لەت کردن.

**جوابە جەنگی دان** (ند) cwabe cengî dan
بەگوێ نەکردن، بێگوێیی کـردن، گـوێ پـێ نـەدان، وەڵام نەدانەوە، جواوجوێی کردن بەدەم داهاتنەوە.

**جوابی نادان بێ دەنگییە** (پن) cwabî nadan bêdengîye
گـەوج ئـەو کەسـەیە کـەوەڵامی (مرۆڤـی )گـەوج بداتەوە.

**جوار** (ن) cwar
توورەکەی وڵاخ، توورەکـەی ئالیک، جۆرکە، تـووری ئالک.

**جوامێر** (ئان) cwamêr¹
دەسـت ودڵ بـاش، دڵ فـراوان، دڵفـرە، بەخـشندە، خێرکەر، خێرەومەند، ڕەند، ڕێژنە، سـەخـی، مـیران، بەدەست ودڵ، دەس ودڵدار، جوانمەرد.

**جوامێر** (ن،ئان) cwamêr²
پـیاو، پـیاوی پـیاوان، جـامێر، شاپـیاو، مـەرد، وەن، وەند، جوانمەرد، جۆمەرد، جوانمێر، قـاڵ، قـاڵ بـوو، دەرهاتوو، پیاگێ خاس، خۆشمرۆ، جۆمەرد.

**جوامێر** (ئان) cwamêr³
پیاوخاس، پیاوچاک، جامێر، چاک، خاس، مێرخاس.

**جوامێر** (ئان) cwamêr⁴
ب (ئازا).

**جوامێرانە** (ئان،ئاک) cwamêrane
پیاوانە، پیاوئاسا، کردەوە مەردانە.

**جوامێری** (ن) cwamêrî¹
پـیاوەتـی، پـیاگەتـی، ئەمـەگێ، چاکـە، چـاکیتـی، چاکی، کـردەوەی چـاک، مەردایـەتـی، مێرخاسـی، وەندی، ڕەندی.

**جوامێری** (ن) cwamêrî²
پاڵەوانیتی، پاڵەوانیی.

**جوامێری کردن** (کتن،کتپ) cwamêrî kirdin
پـــیاوەتی لێوەشـــاندنەوە،چاکەلەدەس هـــاتن، خێرخـــوایی کـــردن، دەس ودڵ بـــاش بـــوون، سوودبەخش بوون، سوودپێ گەیاندن.

**جوان** (ئان) cwan¹
دڵگیر، ڕێک وپێک(ڕوخسار)، دڵکێش.

**جوان** (ئان) cwan²
بەدەو، جەوان، تەوار، جان، خن، شـیرین، خوەشـک، دەلال، قشت، قشتیلانە، نارین، نەشمیل، نەشمیلانـە، خوێن شیرین، خوێن گەرم، چەڵەنگ، ڕازاو، زیرکەلـە، ژیکەلـە، ژیرلـۆ، شـۆخ ، شـەنگ، قەشـەنگ ، قـۆز، لەبەردڵان، نەخشین، سپەهی.

**جوانئاو** (ن) cwanaw
ئارەقەی لەش (زەیستان،،نەخۆش) مانی، مردەئارەق، ئارەقی سەرەمەرگ، خۆهدانی نەخۆشی لەمردن، ئارەقەی نەخۆشی لەسەر مردن.

**جوانئاو ڕشتن** (ند)¹ cwanawr̲ištin
ئارەق ڕشتن، ئارەقە کردنەوە، زۆرخۆ ماندووکردن

**جوانئاو ڕشتن** (ند)² cwanawr̲ištin
١- ئارەق ڕشتن بەفیڕۆ. ٢- بێکارەو تەمەڵ بوون.

**جوانخاس** (ئان) cwanxas
جوانکیلانـــە، جوانکیلـــە، جوانکەلانـــە، جوانکەلـــە، جەنیک، جەینیک، شۆخ، شـۆخ وشـەنگ، لاو، جـوان چـاک، ژیکەلـە، جـوان کـوڕ، لاوچـاک، گـەنج، جـوان وخنجیلانە، هەرزە، سپەهی، خوشیک.

**جوانکە** (ئان،ن) cwanke
جەرگە، موتولفە.

**جوانکەلە** (ئان) cwankele
ب (جوانخاس).

**جوانمەردی** (ن) cwanmerdî¹
بەخشندەیی، دەسودڵداریی، سـەخاوەت، دڵفرەیـی، خێرەومەندیی، ڕەندیی، ڕێژنەیی، جوامێریی.

**جوانمەردی** (ن) cwanmerdî²
ب (ئازایی).

**جوان نواندن** (کتن) cwan nwandin
بۆهاتن، ڕێک وپێک دەرکەوتن.

**جوانوو** (ن،ئا) cwanû
١- بێچـووی مـاین، جوانـی، جـەنئی، جوانوومـاین، جانی، جانۆکە، جوانیک، جانوو.
٢- جوانوونەسپ، کورگێ چاروا، کورگێ.

**جوانە زووە** (ن،پز) cwanezuwe¹
جوانـــەزەوە، زووە، ئازەبـــە، عازەبـــە، عـــازەویی،

زیپکەی دەموچاوی لاوی تازەپێگەیشتوو.

**جوانەزووە (ئان)** [2] cwanezuwe
کریت، ناشیرین.

**جوانەمەرگ (ئان)** cwanemerg
جوانەمەرگە، بەگەنجی مردوو، بێ وەخت مردوو (لاو).

**جوانی (ن)** [1] cwanî
بۆشناخی، قشتی، زیبایی، قەشەنگی، ڕێک وپێکی، خوشیکی.

**جوانی (ن)** [2] cwanî
ئارایش، ئارایشت، ئەدارەک، تەنتەنە.

**جوانیی وهەرزەیی (پن)** cwanî herzeyî
گەنجیتی پڕە لەهەڵەشەیی.

**جواو (ن)** cwaw
پاسوخ، وەرام، وەڵام، جواب، جاب، پەرسف.

**جواودان (کتپ)** cwawdan
پاسوخ دان، نائومیدکردن، ناهومیدکردن، پەرسف وەدان.

**جوتیار (ن)** cutyar
جووتیار، جووتکەر، جفتکەر، پالەی کشتوکاڵ، پالەی زەوی وزار، وەرزیار، وەرزێر، بەرزگر، جووتبەند، بکیل، چینەر، جووتکار، جفتیار، زەوی کیل، جووتبەندە، جۆتکار، جووتیر.

**جوچکە (ن)** cüçke
١- کلک.
٢- کلینچکە، قلینچکە، دووچکە، جووچکە.

**جوچکە لەقێ (ن)** cüçke leqê
کلکەلەقێ، ڕیایی، کوسکەشیی، مەرایی.

**جوچکە ناوگەڵ گرتن (ند)**
cüçke nawgel girtin
خۆشاردنەوە (لەدوژمن)، ڕەوکردن، شکان، بەزین، کلک خستنەناوگەڵ، لەمەترسی خۆشاردنەوە.

**جوچمین (کتن)** cüçmîn
تۆپین، مرداربوونەوە.

**جوخین (ن)** cüxên
ب (جوێ خوێن).

**جودا (ئان)** cuda
جیا، جیاواز، بەژک، ناتەبا، جدا.

**جودابون (کتن)** cudabün
ترازان، جیابوونەوە، لیک ترازان، لیک جیابوونەوە.

**جودابوونەوە (کتن)** cudabünewe
ب (جیابوونەوە).

**جوداکردن (کتپ)** cudakirdin
ترازاندن، جیاکردنەوە، لیک ترازاندن.

**جوداکردنەوە (کتپ)** cudakirdinewe
ب (جیاکردنەوە).

**جودایی (ن)** cudayî
جیاوازیی، جیایی.

**جورئەت (ن)** curet
زات، زاوور، ئەترەش، وره، ویران، هێزی دڵ.

**جورئەت دار (ئان)** curetdar
بەزات، پڕزات، پڕزاوور.

**جورئەت کردن (کتن)** curet kirdin
توانیین، زات کردن، زاوورهەبوون، پڕ زات بوون.

**جوربزە (ن)** curbze
برشت، شیاوی، گوربزە، لیهاتوویی.

**جوڕ (ئان)** cuṟ
نیرە، نیر، باوکە (باڵندە)، جوڕە.

**جوڕکردن (کتن)** cuṟ kirdin
لێ دەرهینان (شتێ لەکەسێ بەفرووفێل).

**جوڕنە (ن)** [1] cuṟne
قوولکەی ئاو (لەژووری گەرماودا)، خەزێنە، حەوزۆکەی حەمام کەئاوی گەرمی بۆ خۆشتن تێ دەکەن.

**جوڕنە (ن)** [2] cuṟne
بەلووعە، بەلۆعە، شیرە.

**جوڕە پیاو (ن)** cuṟe piyaw
پیاوی پیاوان، گەورەپیاو، پیاوی مەزن.

**جوڕیان (کتن)** cuṟyan
١- گۆڕان، هاتنەگۆڕیین.
٢- زمان بەهەڵەداچوون، ساتمەکردن.

**جوست وجۆ (ن)** [1] cust w co
ب (جم وجۆڵ).

**جوست وجۆ (ن)** [2] cust w co
تەقەلا، کۆشش، کۆشە، هەوڵ، هەوڵ وتەقەلا، کۆششت.

**جوست وجۆکردن (ن)** [1] custwco kirdin
ب (جم وجۆڵ کردن).

**جوست وجۆکردن (کتن)** custwco kirdin
تەقەلادان، کۆشش کردن، هەوڵ دان، کەوتنەدووی ئیش.

**جوستە (ن)** custe
١- جەستە، نەخشی چنراو (لەسەر ڕووی دەرەوەی جل). ٢- پەراوێز، قەراغ، لێوار.

**جوق** ( ن ) cüq
جووقە، دەستە، دەسە، کۆمەڵ، گرۆ، گروو، گەل.
**جوق جوق** ( ئاک ) cüq cüq
دەستەدەستە، دەسەدەسە، کۆمەڵ کۆمەڵ، گرۆ گرۆ، گەل گەل.
**جومبوش** ( ن. ) cumbuš
جوولانەوە، هاتوچۆ، جموجۆڵ.
**جومعە** ( ن ) cum'ae
ئینی، هەینی، جمعە، هەینە، ئین.
**جومگە** ( ن ) cmge
جمگە، چەمسەر، خرتەکە، خرتکە، بەنگە، بەن، بەند، لاولاوە، وەنگە، ووردەڵە، قەفە، جمشیرکە.
**جومگە ئێشە** ( ن،پز ) cmge êše
جومگەدەرد، بەنگە ئێشە، تیراویژ.
**جون** ( ن ) cün
بەرە.
**جونگ** ( ن ) cüng
بز، بووز، تیز ( بەپەنجە ).
**جونگ** ( ئان ) cüng
توورە.
**جونگ پێوەکردن** ( کتپ ) cüng pêwekirdin
بووز پێوەکردن، تیزپێوەکردن، جزنگ پێوەکردن، جووز پێوەکردن.
**جونگ کردن** ( کتن ) cüng kirrdin
توورەبوون، قین گرتن.
**جوول** ( ن ) cül
پەلاس، تەشکەبەرە.
**جوهیم** ( ئان ) cühîm
چەمووش.
**جوێ** ( ئان ) cwê
جیا، جودا.
**جوێ بوونەوە** ( کتن ) cwê bünewe
جیابوونەوە، لێ پچران، لێ دوورکەوتنەوە، لێک هەڵبران، لێک ترازان.
**جوێ جوێ** ( ئان ) [1] cwê cwê
بەجیاجیا.
**جوێ جوێ** ( ئان ) cwê cwê [2]
جیاجیا.
**جوێ چەشن** ( ئان ) cwê çešin
جیاواز، وێک نەچوو.
**جوێ خوێن** ( ئان ) cwê xwên
١- ناخڵە، جووخێنە، جوێ خێن، جێخەرمان، جووخێن، جۆخێن، جۆخین، بێدەر، جێخوون.
٢- خۆیان، خەرمانی کوتراو وکۆمەڵ کراو، کڵۆشی گێرەکراوی کۆم کراو.
**جوێ کردنەوە** ( کتپ ) cwêkirdinewe
١- لێک جیاکردنەوە، دوور خستنەوە.
٢- جیاکردنەوە، بەش کردن، واڵاکردن، جیاوازکردن، هەڵاواردن.
**جوێ کەرەوە** ( ن ) cwê kerewe
جیاکەرەوە.
**جوێن** ( ن ) cwên
جنێو.
**جوێن دان** ( کتپ ) cwêndan
جنێودان.
**جوێن فرۆش** ( ئان ) cwên firoš
جنێوفرۆش.
**جۆ** ( ن،رو ) [1] co
جە، جەو، جەە( دانەوێڵە )، دەغڵی هەواڵی گەنم.
**جۆ** ( ن ) [2] co
پشکنەر، جوویا.
**جۆبار** ( ن ) cobar
جۆگە.
**جۆبە دیواردا هەڵگێران** ( ئد )
co be dîwarda helgêran
زۆر بەتواناو دەسەڵات بوون، کاری قورس وگران کردن ( لەڕێی دینەوە بێت یان دنیاوە ).
**جۆتۆ** ( ن ) coto
جەنگاوەر، گۆتۆ.
**جۆخێن** ( ن ) coxên
جوێ خوێن.
**جۆدان** ( ن ) [1] codan
نیشانەی ڕەش لەسەر دانی ئەسپ،دانێکی ئەسپ کەلەپیریدا لووس دەبێ.
**جۆدان** ( ن ) [2] codan
گـۆخل، سەرپەرشتیکەری مەرەزە، مەرەزەوان، جۆدانە.
**جۆدرەو** ( ن ) codirew
١- کاتی جۆ دروونەوە. ٢- مانگی جۆزەردان.
**جۆر** ( ن ) cor
ئاسا، ئاسین، تەحر، تەرز، جفت، چەشن، دەس، ڕەوت، ڕەوش، ڕێباز، شێوە، لف، وەک، وێنە.
**جۆراوجۆر** ( ئان ) coraw cor
جۆر بەجۆر، جۆرجۆر، جۆرواجۆر، چەشناوچەشن،

جوورجوور، جوره‌جوره.

**جۆربه‌ جۆربوون** (کتن) cor be cor bün
جۆراوجۆربوون، جووریان، گۆڕان، گۆڕیان.

**جۆره‌ها** (نک) coreha
هه‌موو جۆرێ، هه‌موو چه‌شنێ.

**جۆرک** (ن) corik
١- تووره‌که، جۆرگه، جهورک، جه‌نتک.
٢- تووره‌که‌ی ئالیک، تووری کاو ئالک، جۆرکه.

**جۆریان** (کتن) coryan
به‌شۆکان، په‌شۆکیان، شله‌ژان، شه‌پووکیان.

**جۆزبوا** (ن،رو) cozbwa
جۆزبۆیا، گۆزبۆیا، گویز بۆیا.

**جۆزه‌ردان** (ن) cozerdan
جۆزه‌رد، جۆزه‌سان، جه‌هزه‌ر، جه‌هزه‌را، مانگی حوزه‌یران (٣٠)ڕۆژه، کاتی دروینه‌ی جۆ.

**جۆش** (ن) coš ١
کول، کولین، قول، قولپ، قولت.

**جۆش** (ن،پز) coš ٢
پیزۆکه، جووش، زووه، زیپکه.

**جۆش** (ن) coš ٣
چه‌سپ، جووش، له‌حیم، پیکه‌وه نووساندنی کانزا به‌قه‌لایی.

**جۆش خواردن** (کتن) coš xwardin ١
به‌یه‌که‌وه نووسان، جووش خواردن، توانه‌وه‌و به‌سه‌ریه‌کدا چوون (کان.. دوای نه‌رم کردنه‌وه‌ی به‌تینی ئاگر، توانه‌وه، چه‌کوشکاریی..).

**جۆش خواردن**(کتن) cošxwardin ٢
به‌سه‌ریه‌کدا توانه‌وه (کان...).

**جۆش دان** (کتپ) cošdan ١
جۆش کردن.

**جۆش دان** (کتپ) dančo ٢
چه‌سپاندن، چه‌سپ کردن، لکاندن.

**جۆش دان** (کتپ) cošdan ٣
تیزکردن، ته‌وژم پێدان، گه‌رم کردن،هان دان.

**جۆش سه‌ندن** (کتن) coš sendin ١
تاوسه‌ندن، جۆشیان، جۆشان، جووشیان، کولان، هاتنه‌کول، وه‌کول هاتن، جۆشیین، جۆش خواردن، کولیین.

**جۆش سه‌ندن**(کتن) cohsendin ٢
کارکردن به‌ئه‌وپه‌ڕی توانا‌وه، گه‌رم بوون(له‌ئیش دا).

**جۆش کردن** (کتن) coš kirdin ١
جۆشاندن، جۆشانن، کولاندن، وه‌کول هینان. هینانه‌کول، هینانه‌جۆش، که‌لاندن.

**جۆش کردن** (کتپ) coš kirdin ٢
چه‌سپاندن، چه‌سپ کردن، له‌حیم کردن.

**جۆشن** (ئان) cošin ١
به‌جۆش، ئاگراویی، خونگ، ته‌ڕ، ئالۆشاویی.

**جۆشن** (ئان) cošin ٢
خۆتێ هه‌لقورتین، خۆڕیکخه‌ر.

**جۆش وخرۆش** (ن) coš w xiroš
ئاشووب، هه‌راوهۆریا وناکۆکی.

**جۆشیان** (کتن) cošyan ١
جۆش سه‌ندن.

**جۆشیان** (کتن) cošyan ٢
جووشیان، هه‌لقولان.

**جۆشیان** (کتن) cohyan ٣
شیواندن، هه‌لژلیویان، هه‌لشیویان.

**جۆشیان** (کتن) cohyan ٤
جووشیان، ئاره‌زووکردن، تاسه‌کردن.

**جۆق** (ن) coq
جووت، جفت (گا).

**جۆگه** (ن) coge
جۆگا، جۆک، جهۆک، جۆگه‌له، ده‌راو، جۆبار، جووبار، دیراو، ڕفکه

**جۆگه‌ت** (ن) coget
ڕچه، ڕیگای ناویه‌فر، ڕیچکه.

**جۆل** (ن) col ١
کۆت، زنجیر، ڕین، زنجیره .

**جۆل** (ن) col ٢
چینی چه‌وساوه.

**جۆلانه** (ن) colane
١- جۆلانێ، ده‌یدیک. ٢- دیله‌کانێ، گوریسی به‌داره‌وه‌کراو بۆ لێ نیشتن و ڕاژاندن.

**جۆ لێ بڕین** (کتپ) co lê brîn
په‌ک خستن، بێهیزکردن، ده‌سته‌وسان کردن، هیزله‌به‌ر بڕین.

**جۆلا** (ن) cola
بوونوکه‌ر، بوونوته‌ن، شال باف، جوولگێ، جه‌وکه‌ر، جاوته‌ن.

**جۆلایکه‌ره** (ن،جج) colayîkere
جالجالۆکه، کاکله مووشان، جاته‌نه، جولاته‌نه، پس پسه‌کۆله، داپیرۆشکه، په‌سپه‌سه‌که‌ره، جیلاباف.

**جۆم** (ن) com ١
چەم، دڕناڵ، کەندەڵان.

**جۆم** (ن) com ٢
نۆبە، بابک، بەرە، بەرەباب، تووشماڵ، تیرە، قۆل.

**جۆماڵ** (ن) comal
(کاری)جۆگەپاک کردنەوەو قووڵ کردنی، جۆگاخاوێن کردنەوە لەقوڕولیتە.

**جۆمەرد** (ئان) comerd
جوامێر.

**جۆی دووکەری پێ دابەش ناکرێ** (پن)
coy dü kerî pê dabeš nakrê
مرۆڤێکی بێدەسەلات وبوودەڵەیە.

**جوو** (ن) cü
جوولەکە.

**جووت** (ن) cüt ١
جفت، جۆت، شۆ، شیف، شیف، کێلگە.

**جووت** (ن) cüt ٢
١- جمک، دووان، دوو (لەهەمان چەشن)، هاوتا، جیت. ٢- پێوەلکاو، پێوەنووساو.

**جووت** (ن) cüt ٣
هاوسەر، ژن ومێرد، ژن بۆ شووەکەی، مێرد بۆ ژنەکەی.

**جووت** (ن) cüt ٤
هاولف، هاونێلە، دوو گا بۆ زەوی کێلان، جۆت.

**جووت بوون** (کتن) cütbün ١
جووت گرتن (گیانەوەر)، جفت بوون، بوون بەهەوالی یەکتر بۆ مەبەستی زاووزێ.

**جووت بوون** (کتن) cütbün ٢
بەقەد یەک بوون، ڕێک بوون، وەک یەک لێهاتن.

**جووت بوون** (کتن) cütbün ٣
جفت بوون، چسپان، چسپیان، چەسپان، چەسپیان، لف گرتن، لکان، لکیان، پاڵ وێک دان، پێکەوەنووسان، پێکەوەلکان.

**جووت بەقیە** (ن) cütbeqiye
جووت باقی، کۆکلەیی.

**جووت بەقیە کردن** (کتپ) cütbeqiye kirdin
پەچ دانەوە، جووت باقی کردن، داگرتنەوە.

**جووت بەندان** (ن) cütbendan
کاتی جووت گرتن (مەل، ئاژەل..).

**جووت جووت** (ئان) cüt cüt
دوو دوو، دوو.. لەهەمان کاتدا.

**جووتکراو** (ئان) cütkiraw
بەستراو، پێوەدراو، داخراو، گیراو.

**جووت کردن** (کتپ) cüt kirdin
جووت ئاژووتن، زەوی کێلان، شیف بڕین.

**جووت کردن** (کتپ) cütkirdin ١
پێوەدان، داخستن (دەرگا..).

**جووت کردن** (کتپ) cüt kirdin ٢
١- پێکەوەنووساندن، جفت کردن، چەسپاندن، لکاندن. ٢- خستنەپاڵ یەک.

**جووت گرتن** (کتن) cütgirtin
جووت بوون، یەک کەوتن، تێکەگرتن( نێرومێی گیانەوەر)، نێر لەگەڵ مێینە یەک گرتن بۆ پێکەوەژین.

**جووت گیری** (ن) cüt gîrî
ژن ومێردایەتیی، لف گیریی، هاوجووتیی، هاولکیی، هاوسەریی.

**جووتە** (ن) cüte ١
پەهن، پەین، پێلەقە، پاشەلەقە، جفتە، لەقە، جووتکە، لووشکە، لەقەهاوێژی، جوحتکە.

**جووتە** (ئان) cüte ٢
هاوتا، هاوسەنگ.

**جووتە** (ئان) cüte ٣
جفتکە، جفتە، دووبرالە، دووانە، لفەدووانە، هەواڵ دووانە، جوملانە، جومڕانە، جمک، زگەدووانە، ئاواڵ دووانە، جووێک.

**جووتە** (ن.م) cüte ٤
جفتە، دووبرالە، مشک گرە.

**جووتە لێ دان** (کتپ) cüte lêdan ١
جووتە وەشاندن.

**جووتە لێ‌دان** (کتپ) cüte lêdan ٢
١- لەقەلێدان، بەچاوی سووک تەماشای کەسێ یان شتێکردن.
٢- نەویستن (شتێ بەچاوێکی سووکەوە).

**جووتەوجەیران** (نک) cütew ceyran
ب (ئاشقەوماشقە).

**جووتەوەشاندن** (کتپ) cüte wehandin
جفتەوەشاندن، پێلەقەدان، لەقە وەشاندن، پاشەلەقەلێ‌دان، پێ لەقەلێدان، لەقە هاویشتن، لووشک هاویژتن.

**جووتەوەشێن** (ن) cütewešên ١
چەمووش، شەمووز (ئەسپ)، دوورمەح، لوشکاوێژ، لوشکەهاوێژ، لەقەهاوێژ، جفتەوەشێن، لەقەوەشێن.

**جووتەوەشێن** (ن)[2] cütewešên
ترن، قسەترن، قسە ڕەق، نەزان دوو.
**جووتەی کەوان** (نل.ئس) cüteykewan
دووبراله، دوو ئەستێرەی لێک نزیکن.
**جووتەی هە نجیران** (ن.ئس) cütey hencîran
ئابـان، کـەلووی دووپـشک، هەشـتـەم بـورج، دووئەستێرەی لای کلکی کەلووی دووپشک.
**جوو جوو** (نک) cü cü
جانەوەر، جروجانەوەر، گیانەوەر.
**جووجەڵە** (ن.م) cücele
جووچک.
**جووچک** (ن.م) cüçik
ئایـل، جووجـک، جووچکـە، جووجەڵـە، جووجـە، جووجوو، جووجیلە، بێچوی مریشک، جۆلک.
**جووخێن** (ن.م) cüxên
جوێ خوێن.
**جوور** (ئان) cür
تەبا، ڕێک.
**جووراو** (ئان) cüraw
جاوراو، جاویاکێ، جیاویاکێ، جیاویاو، جووتراو.
**جووراوە** (ئان) cürawe
گرنج گرنج (کان، بەرد..).
**جوورەبوون** (ئد) cürebün
تەبابوون، دوژمنایەتیی لەنێواندا نەمان، ڕێک کەوتن، نێوان خۆش بوون.
**جووڕی** (ن) cürî
ئاشتی، تەبایی، ڕێک وپێکی، یەکێتی.
**جووزەکی** (ن) cüzekî
زەماوەند، شایی، هەڵپەڕکێ.
**جووزەلە** (ن.ئم) cüzele
دووزەلە، بیک، بلوێر، پیک، شمشاڵ.
**جووش** (ن.ڕو) cüš [1]
بن تاو، چووز، خەرکان، خەرکانە.
**جووش** (ن.ڕو) cüš [2]
جۆش، قولقولە، کانێیە قولقولە.
**جووشانە** (ن) cüšane
جێشانە.
**جووش هاوردن** (ن) cüš hawirdin
تووڕەبوون، تەنگەگرتن، هەڵچوون.
**جووقن** (ئان.ن) cüqin
جوقنە، جیقن، لەڕک، لاواز، فیقن، بێهێز.

**جووکاندن** (کتپ) cükandin
جووکـەکردن، جووکـەجووک کـردن (جۆلەکـە..).
جووکـان، دەنـگێ لێوەهـاتن بـۆ(بەچکـەیان مەلێ بچووک)، جووکانن.
**جووکن** (ئان)[1] cükin
جووکـەجووک کـەر، دەم بەگلـەیی(مـرۆڤ)، بەبۆڵەوپرتە، نووزەنووزکەر.
**جووکن** (ئان)[2] cükin
مێزن، مێز بەخۆداکەر.
**جووکە** (ن) cüke
جرووکە، جریکە، جیکە، جووکەجووک، دەنگی بێچوو یان باڵداری بچووک، جیکەجیک.
**جووکە بڕین** (کتپ) cüke birîn
بێدەنگ کردن، خەفەکردن، دەمکوت کردن.
**جووکەنە** (ن) cükene
سەرەمەرگێ، گیانەڵا.
**جووکی** (ن) cükî
١- جادووکەر، جادووباز.
٢- فروفێلکەر، تەڵەکەباز.
**جووڵان** (کتن)[1] cülan
بزڤـان، بـزووتن، بـزەفتن، جمـەکردن، جمـان، جووڵـەکردن، جووڵیـان، جـەمیین، بـزوان، لبان،لـەرزیین، هـەژان، وەرزان، جـم دان، تـەکان خواردن، جنگێ دان.
**جووڵان** (کتن)[2] cülan
ڕاستەوەبوون، ڕاسـەوەبوون، هەسـتان، هەڵـسان، هەڵستان، تەکان دان.
**جووڵاندن** (کتپ)[1] cülandin
بزوانـدن، بزڤـاندن، جمانـدن، جووڵانـدن، جاپـاندن، جـوانن، جـڤاندن، جـووڵانن، لەبتانـدن، لەرزانـدن، لەشوێنی خۆی نەهێشتن، هەژانـدن، بزاوتن، تـەکان پێدان.
**جووڵاندن** (کتپ)[2] cülandin
پاڵ پێوەنان، تاودان، قاودان، گاڵ دان، هان دان.
**جووڵانەوە** (کتن)[1] cülanewe
بزووتنەوە، جووڵیانەوە، جووڵەکردن، لەرینەوە.
**جووڵانەوە** (کتن)[2] cülanewe
زیادبوون، زێدەبوون (نرخیکاڵا).
**جووڵانەوە** (کتن)[3] cülanewe
لەرینەوە، هات وچۆکردن.
**جووڵاو** (ئان) cülw
بزاوتوو، بزوتوو، تەکان پێدراو.

**جووله** (ن) ١ cüle
بزوزیی، بزێویی، بێئارامیی، ماخۆلان، نارەحەتیی.
**جووله** (ن) ٢ cüle
پرته، فرته، لەرزە، لەرە، تەکان.
**جووله** (ن) ٣ cüle
بزوە، جمە، خول، گەڕ، جم، جڤ، بزاو، جنگە، بزوە.
**جووله جوول** (ن) ١ cüle cül
تەکەتەک، شەکەشەک، لەرەلەر، دۆلەدۆل.
**جووله جوول** (ن) ٢ cülecül
جم وجۆل، جێگۆرکە.
**جوولێنەر** (ن) ١ cülêner
جوولێن، بزوێنەر.
**جوولێنەر** (ن) ٢ cülêner
پاڵ پیوەنەر، هاندەر (هەست).
**جوولەکان** (ن) cülekan
گەرەکی جوولەکان، مەڵبەندی جوولەکان، نیشتگەی جوولەکان.
**جوولەکە** (ن) cüleke
جوو، ئیسرائیلیی، جهوو، موسایی، مووسەویی، عیبرانیی، مووساپەرست، یەهودایی، یەهودیی، جووله، ئۆمەتی مووساپێغەمبەر.
**جوون** (کتپ) ١ cün
بەدان ووردکردن، جاویین، جاویینەوە، جویین، جووتن، دان پێدانان وهارینی خواردەمەنیی لەناو دەمدا.
**جوون** (ن) ٢ cün
١- دۆل، جوونیی، جۆنی، دۆل (کەشتی تیدا دەکوترێ)، ئاونگی بەردین یان دارین، قوڵکەبەرد.
٢- دەس ئاونگ، دەسکەوان.
**جوون** (ن) ٣ cün
دارودەستە، دەستەوکۆمەل، زەڤان، زیوە.
**جوون** (ن) ٤ cün
بژە، بەش، بەهرە، بیەش، پش، پشک، قسن، قلە، قەت.
**جوون** (نک) ٥ cün
سپی واش، سپیی مەیلەوشین.
**جوونەوە** (کتپ) cünewe
چرچ کردن، لۆچ کردن، گرنج کردن.
**جوونەوە (ئاخاوتن)** (کتپ، کتب) ١ cünewe(axawtin)
بیر لێ کردنەوە، تێ فکریین، تێرامان.

**جوونەوە (ئاخاوتن)** (کتپ،کتب) ٢ cünewe(axawtin)
یاریی بەووتەکردن، منجەمنج کردن پێش ئاخاوتن، پاتەکردنەوە.
**جوونەوە** (کتپ) ٣ cünewe
دووبارە جاویین، دیسانەوەجوون، جوتنەوە.
**چە** (ن) ce
١- لە، لەدۆخێکدا. ٢- ل، ژ.
**چەب** (ن،س) ceb
شانەی ئەبشەک.
**چەپ دان** (کتپ) cebdan
بەخشیین، لێبوردن، چاولێپۆشیین.
**چەبرا** (ئان) cebra
لای دەستی چەپەوە، کەوتۆتەلای دەستی چەپەوە.

**چەبلە** (ئان) ١ ceble
ئەستوور، زل، مەزن.
**چەبە** (ئاک) ٢ cebe
بەلەسە، یاخیی، سل، قوشقی، سەرێزێو.
**چەبەبوون** (کتن) cebebün
بەلەسەبوون، بەرەلابوون، لەرێی راست لادان، یاخیی بوون.
**چەبەر** (ئان) ١ ceber
بوێرراو، رەهاکراو.
**چەبەر** (ئان) ٢ ceber
دەربوێرراو.
**چەبەر** (ن) ٣ ceber
تەرەف، لا، بەر.
**چەبەرە** (ن) cebere
سەرما، سەرماوسۆڵە، ساردوسۆڵ، جەوەرە، سەرمای زۆرسەخت.
**چەبەرە نواندن** (کتن) cebere nwandin
سەرماوسۆڵە دەرکەوتن یان دەست پێ کردن، سەرەتای هاتنی سەرمای توند دەست پێ کردن.
**چەبەکردن** (کتپ) ١ cebekirdin
چاوپۆشیی لێکردن، چاو لێ پۆشیین.
**چەبەکردن** (کتپ) ٢ cebekirdin
ئاوارەکردن، بەلەسەکردن.
**چەجال** (ن) cecal
١- دەجال، ججال، جرجال.
**چەحری** (ن،کی) cehrî(ki)
زەهر، ژار، ژەهر.

**جەحێل** (ئان) cehêl
ب (جەهێل).

**جەخ** (ن) cex
بـــووەیی، تێروتەســـــەلیی، خـــۆش گـــوزەرانیی، کاسەپڕیی.

**جەخار** (ن) cexar
بـار، ئـاراو، ئـالاو، ئامـە خـواریی، پـەرۆش، پـەژارە، چەرمەسـەری، خـەم، خەفـەت، زووخـاو، ناڕەحـەتی، جخار، کەسەر، کوڵ، مەینەت.

**جەخار چەشتن** (کتپ،کتن) cexarçeştin
تالاویەقورگـداچوون، زووخـاو خـواردن، تووشـی ناهـەمواریی بـوون، خـەم (بەدەسـت کەسـیکەوە) خواردن.

**جەخت** (ن) cext ١
کۆشش، هەوڵ، کۆششت، کۆشە.

**جەخت** (ئاک) cext ٢
بەپەلە، بەخێرایی.

**جەخت** (ن) cext ٣
پەلە، خێرایی، لەز.

**جەخت** (ئان) cext ٤
نوێ، تازە داهاتوو.

**جەخت کردن** (کتن) cext kirdin
کۆشـــش کـــردن، هـــەوڵ دان، خۆمانـــدووکردن، تەقەلادان.

**جەخت هێنان** (کتن،کتپ،ند) cexthênan
١- جەخت هاوردن، دڵنیاکردن.
٢- باش هێنان، بۆ هاتن.

**جەختی** (ن) cextî
چابوکیی، چالاکیی، گورج وگۆڵیی.

**جەختی** (ن) cextî
فەڕ، فەڕوبیت، هات.

**جەخ کردن** (ند) cex kirdin
خۆش گوزەران بوون، کاسەپڕبوون، ژیان بەخۆشـیی وپڕکاسەیەیی بردنەسەر، هـەبوون (پـارە وپـووڵ بـۆ ژیانی ئاسوودەیی).

**جەراعەت کردن**(کتن) cera`aetkirdin
ئاوجزکردن، ئاودزکردن، کـیم کـردن، هـەوکردن، زۆخ کردن.

**جەربەزە** (ئان) cerbeze ١
لێهاتوو، بەپڕشت، بڕشتدار.

**جەربەزە** (ئان) cerbeze ٢
بڕیو، چەتوون.

**جەربەزە** (ن) cerbeze ٣
ب (چەتوون).

**جەرخە** (ن) cerxe
جنجاڵی، قەڵەباڵغی.

**جەردە** (ن) cerde
تەریـــدە، تالانکـــەر، پـــیاو ڕووتکـــەرەوە، چەتـــە، ڕێگر،گۆران، ڕێبڕ، ڕابڕ.

**جەردەیی** (ن) cerdî ١
چەتـــەیی، ڕێگریـــی، تالانکـــەریی، چەتەگـــەریی، چەتەکاری
، ڕاووڕووت.

**جەردەیی** (ئان) cerdî ٢
سوور لەسەرکاری خۆ، گوێدەر بەکار.

**جەرسیی** (ئان) cersî ٢
ئاشکرا، دیار، هەڵماڵراو.

**جەردەیی کردن** (کتن،کتپ) cerdî kirdn
خەڵک ڕووت کردنەوە، ڕێگا بەخـەڵک گرتن،ڕێگریی کردن، کاروان ڕووت کردنەوە.

**جەرگ** (ن) cerg ١
جگەر.

**جەرگ** (ن) cerg ٢
ڕۆڵە، نەوە، جگەر.

**جەرگاووس** (ئان) cergawüs
١- بێزار، تەنگەتاو، ماندوو، وەڕس.
٢- دڵ پڕ لەخەم، مەینەتبار.

**جەرگاووس بوون** (کتن) cergawüsbn
١- بێزاربـــوون، تەنگـــەتاوبوون، جـــەرگ ئاوســـان، خەفـەت خـواردن، وەڕس بـوون. ٢- جـەرگ ئـاووس بوون، خەفەت بەدەست کەسێکەوە خواردن.

**جەرگ بڕین** (کتپ) cergbirîn ١
تاوان بەرامبەر کەسێ کردن، تاوان لێ کردن، کەسـو کاری کەسێ کوشتن.

**جەرگ بڕین** (کتپ) cergbirîn ١
سزادان، زیان پێ گەیاندن.

**جەرگ بڕین** (کتپ) cergbirîn ٢
جەرگ چووزاندنەوە، داخێکی زۆرپـێدان، خـەمێکی گەورە بردنەدڵی کەسێ، داخ پێ دان.

**جەرگ بۆسووتان** (کتن) cergbosütan
بەزەیی پێداهاتنەوە، جەرگ پێ سووتان، گـریۆ تـێ بەربوون.

**جەرگ چووزاندنەوە** (کتپ) cerg çüzandinewe
داخ پێدان، ژان بردنە دڵی کەسێکەوە.

**جەرگ سووتان** (کتن) cergsûtan
جگەر سووتان، منداڵ لێ مردن، زگ سووتان.
**جەرگ سووتاو** (ئان) cergsûtaw
جگەرسووتاو، منداڵ لێ مردوو، زگ سووتاو.
**جەرگ سۆز** (ئان) cergsoz
پڕ لەهەستی دڵسۆزیی، دڵسۆز.
**جەرگ قایم** (ئان) cergqayîm
١- ئازا، بەجەرگ. ٢- بەپشوو، پشوودار.
**جەرگە** (ن) cerge [1]
جەنگە، ناوەڕاست، ناوەند، دوڕ.
**جەرگە** (ئان) cerge [2]
جوان، جوانکیلە، نەشمیل، نەشمیلە.
**جەرگە** (ن) cerge [3]
یانە.
**جەرگە** (ن) cerge [4]
ئەوپەڕ، گەرمە، هەڕەت، جەنگە.
**جەرگە** (ن) cerge [5]
جەلە، کۆمەلە.
**جەرەتاو** (ن) ceretaw
چلکاو.
**جەریفک** (ن) cerîfik
گەسک، گزگ، جارو، گسک، گیزگ.
**جەڕ** (ن) cer
ب (برغو).
**جەڕان** (کتن) ceran
پێوەگیربوون، جەڕیین، تێ گیران بەتوندیی.
**جەڕاندن** (کتپ) cerandin [1]
بەستن، پێچ دان، توندکردن، جەڕانن، جەڕدان، سفتە وکردن، شەتەک دان.
**جەڕاندن** (کتپ) cerandin [2]
پێچاندن.
**جەڕدان** (کتپ) cerdan [1]
بادان، پێچ دان، جەڕانن، جەڕاندن، سفتەوکردن.
**جەڕدان** (کتپ) cerdan [2]
بەرەو پێشەوە بردن، خێراڵێ خوڕیین.
**جەڕکێشان** (کتن) cerkêşan
دەمەدەمێ کردن، شەڕەدەم کردن، شەڕە دەنووکە کردن.
**جەڕمەجووڕی** (ن،کل) cermecurî(kl)
جەڕکێشی، دەمەدەمێ، شەڕەدەم، شەڕەدەنووکە.
**جەڕە** (ن) cere [1]
شەربە، جێر، کوزە، گۆزە، گۆزەلە.

**جەڕە** (ن) cere [2]
باقە، چەپک، دەسک.
**جەڕەبابە** (ن) cerebabe
شەتەک.
**جەڕەبابەدان** (کتپ) cerebabedan
بەستن، توند کردن، جەڕاندن، جەڕیین، شەتەک دان (بە پەت...)، توندپێچان، شەداندن.
**جەڕەبابەدراو** (ئان) cerebabediraw
شەتەک دراو.
**جەڕهاوردن** (کتپ) cerhawirdin
تووڕەکردن، شێواندن.
**جەڕەباندن** (کتپ،کی) cerebandin(ki)
جەڕپاندن، تاقیی کردنەوە، ئەزموون کردن.
**جەزا** (ن) ceza [1]
سزا.
**جەزا** (ن) ceza [2]
خەرامانە، پاداشت.
**جەزرەبە** (ن) cezrebe [1]
ئازار، ئێش، جەزرەوە، ئەزیەت، عەزیەت، عەزێت.
**جەزرەبە** (ن) cezrebe [2]
تەڵەکە، داو.
**جەزرەبە** (ن) cezrebe [3]
بلۆف.
**جەزرەبە پێ گەیاندن** (کتپ)
cezrebe pê geyandin
ئازارپێ گەیاندن، ئێش پێگەیاندن، پێوەدان، جەزرەبەدان، جەزرەبە پێدان، چزەلێ هەڵسان، زریکەلێ، شلەکوتی مەرگ کردن، لێ دان، ئازاردان، جەزرەوەدان.
**جەزرەبەدار** (ئان) cezrebedar
ترسناک، جەزرەوەدار، سامناک.
**جەزرەبەدان** (کتپ) cezrebedan
ب (جەزرەبە پێ گەیاندن).
**جەژن** (ن) cejin [1]
جەژنە، جێژن، جێژنە، گێژن، گێژنە، جەشن.
**جەژن** (ن) cejin [2]
١- خۆشیی، شادیی.
٢- ڕۆژی بەتاڵیی وخۆشیی.
**جەژنان** (ن) cejinan
ڕۆژانی جەژن.
**جەژنانە** (ن) cejinane
بەرات (لەجەژندا)، خەڵات بۆ کەسێ(لەجەژندا)،

خەلات بەهۆی
هـاتنی جێژنـەوە، جێژنانـە، خـەلات وبەخـشیش لەجێژندا.

**جەژنە پیرۆزەکردن (کتپ)** cejine piroze kirdin
پـیرۆزبی کـردن (لەیـەکتر لەجەژنـدا)، جێژنـە پیرۆزەکردن، پیرۆزبایی کردن (لەجەژندا).

**جەژنە پیرۆزی (نک)** cejinepîrozî
جەژنەپیرۆزە، کاری پیرۆزبایی لەیەکتر کردن بەهۆی هاتنی جێژن، جێژنەپیرۆزە، جێژنەپیرۆزی.

**جەستە (ن)** 1 ceste
ئەندام، ئەننام، تەن، جەسە، قالک، لەش.

**جەستە (ن)** 2 ceste
بابەت، دەستە، ڕێزە.

**جەستە (ن)** 3 ceste
جۆر، چەشن، دەستە.

**جەستە جەستە (ئاک)** ceste csete
جۆراو جۆر، جۆر جۆرە.

**جەسوور (ئان)** 1 cesür
ئازا.

**جەسوور (ئان)** 2 cesür
بازەلە، بێباک، بێپەروا، پڕڕوو، گوساخ.

**جەغز (ن)** cexiz
١- دیخ، دێر، نوسراو. ٢- جغز، جوغز.

**جەغەتە (ن)** cexete
خوێنی مەییو.

**جەفا (ن)** 1 cefa
تەقەلا، هەوڵ.

**جەفا (ن)** 2 cefa
ئازار، ئێش، نارەحەتیی.

**جەفابوون (کتن)** cefabün
ئازار چەشتن، نارەحەت بوون.

**جەفات (ن)** cefat
بارەگا، جێی کۆبوونەوە، جێی دانیشتنی خەڵک.

**جەفات (ن)** cefat
کۆڕ، کۆمەڵە.

**جەفاکێش (ن)** cefakêš
تەقەلادەر، ڕەنجدەر، هەوڵدەر.

**جەفاکێش (ئان)** cefakêš
بەئارام، بەسەبر، خۆگر (بەرامبەرجورتم).

**جەفاکێشان (کتن)** cefakêšan
تەقەلادان، هەوڵ دان، ڕەنج دان، خۆماندووکردن.

**جەفنەگ (ن)** 1 cefneg
هـەڵیت، هـەڵیت وپـەڵیت، جرنیاوفـڕنیا، ئاخـاوتنی بێسەر وبەر.

**جەفنەگ (ن)** 2 cefneg
درکە، گووشە.

**جەفەن (ن)** cefen
سەرگوزەشتە.

**جەفەنگ (ن.لو)** 1 cefeng(lu)
زۆربلییی، هەڵەوەڕیی.

**جەفەنگ (ن.لو)** 2 cefeng(lu)
هەرزەگۆیی، گاڵتە، گاڵتەوگەپ.

**جەقن (ئان)** ceqin
قوڕن، لیقن.

**جەک (ن)** cek
جەکێ، هەڵین، ئـامرازی ئۆتۆمۆبیـل یـان شـتی دیکـە پێ بەرزکردنەوە.

**جەلا (ن)** cela
پەرداخ، لووسیی.

**جەلادان (کتپ)** celadan
پەرداخ دان، پەرداخ کردن، لووس کردن.

**جەلالە (ئان)** celale
چەپەڵ خۆر.

**جەلاب (ن)** celab
بنە.

**جەلاو (ن)** celaw
جەلـــدەژەن، جەڵدەلێـــدەر، ئەســـەقچیی، جەڵدەوەشێن، لەملدەر.

**جەلدە (ن)** celde
جلد، قامچیی، جەڵد.

**جەلخە (ئان)** celxe
ناتەواو، ناپوخت، هەڵە(ئیش یان کردار)، نیمەکارە.

**جەلەب (ن)** 1 celeb
بـڕ، پـارچەمەڕ، تـارم، تـاقم، جەلـە، جەڵـە، جلـەو، جەلەو، جوول، ڕان، ڕانەمەڕ، جەلەب، کۆمەڵە ئاژەڵ.

**جەلەب (ن)** 2 celeb
تەرز، جۆر، چەشن.

**جەلەب (ن)** 3 celeb
تاقم، دەستە، دەسە.

**جەلەب (ئان)** 4 celeb
دەغەڵ، بەدنەژاد، خوێنخوار، ناجسن، نارەسەن.

**جەلەب (ن)** 5 celeb
ئـەو مەڕومالاتـەی دەبـرێ بـۆ قەسـابخانە یـان بـۆ

فرۆشتن، جەڵەو.

**جەڵەبچی** (ن) celebçî

جەڵبکر،بازرگانی مەڕوبزن و ڕەشەوڵاخ.

**جەڵەبی** (ئان) ١ celebî

بازاڕیی، جەڵەویی، هەڕەمە(کاڵا).

**جەڵەبی {مرۆڤ}** (ئان) ٢ celebî

بێسەروپێ، خوێڕیی، گەمژە، نزم، کەم نرخ، نەهێژا.

**جەڵە کردن** (ند) cele kirdin

١- ڕیزکردن، تێکخستن.

٢- (هەموو شتێ) ئامادەکردن.

**جەم** (ن) ١ cem

ژەم، هەل، بەش.

**جەم** (ن) ٢ cem

پـاڵ، تەنـشت، تەنیـشت، ڕۆخ، ڕەخ، قـەد، قـەراغ، کەنار، لێوار.

**جەم** (ن،لو) ٣ cem(lu)

جەڵە، کۆ، گرد، گردواریی، گلێر، گلێر.

**جەم** (پ،کی) ٤ cem(ki)

کن، لا، نزیک لە، نک.

**جەم** (ن،کی) ٥ cem(ki)

لەکن، لەلا.

**جەم** (ن) ٦ cem

تابار، لنگەبار.

**جەمام** (ن،ئان،پز) ١ cemam

١- بەئازارهاتوو، بەئێش، بەگیرهاتوو (ئەندامێکی لەش). ٢- شڕ، سست (ئان).

**جەمام** (ئان) ٢ cemam

ئاسـوودە، نەبەسـراو، نەبەسـیاگ، دانەبەسـتراو، داڕسیاگ.

**جەمام بوون** (کتن) cemam

ئێشان، هاتنەئازار، هاتنەئێش، وەئێش هاتن، وەئازار هاتن.

**جەمامی** (ن) cemamî

١- ئازار، ئێش.

٢- ماندوویەتی، کەشەنگی، هیلاکی.

**جەماوەر** (ن) cemawer

١- کۆمەڵە، کۆمەڵگای مرۆڤان.

٢- پرایی خەڵک، قەڵەبالغی.

**جەم بەستن** (کتپ) cembestin

جەم بەسانن، قەڵەبالغیی کردن، کۆبوونەوە، کۆنگرە بەسـتن، جـەم بـوون، خڕبوونـەوە، کۆمـەڵ بـوون، کۆمەڵ بەستن.

**جەمجتین** (کتن) cemcitîn

شلەقان (شلەمەنیی)، جەمستیین، لێک دان (شتی تراو)، جەمقان.

**جەمسەر** (ن) cemser

ئەمسەروئەوسەری شتێ، سەری دوو شت کەبگەنەوە یەک.

**جەمک** (ن) ١ cemik

ژەم، ژەمک، جەم.

**جەمک** (ئان) ٢ cemik

دووانە، دووبراڵە، جووتە.

**جەم کردن** (کتپ) cemkirdin

جەڵەکردن، جەمەوکردن، خڕکردنەوە، خڕەوکردن، کۆکردنەوە، کۆوەکردن، گردکردنەوە، گردەوەکردن.

**جەمەوبوون** (کتن) cemew bûn

گردەوبوون، گلێرەوبوون، خڕبوونەوە، خڕەوبوون، کۆبوونەوە، کۆوەبوون.

**جەمیداندن** (کتپ،کی) cemîdandin(ki)

١- بەسـتاندن، تەزانـدن، تـەزی کـردن، کـردن بەسەهۆڵ، کردنەسەهۆڵ. ٢- ساردکردن.

**جەمین** (ن،کی) ١ cemîn(ki)

تەزوو، چۆقە، مووچرک.

**جەمین** (ن) ٢ cemîn

پێشانی، توێڵ، ناوتوێڵ، ناوچەوان، هەنیە، ئەنی.

**جەمیین** (کتن) cemîn

ب (جووڵان).

**جەنتک** (ن) centik

جانتـک، جـەواڵی پـچووک، جەنـدک، خـورجینیی بچکۆلە، جانتای چکۆلە.

**جەنتیانە** (ن،ڕو) centiyane

گورشلوو، جەرمقانیی، (دەرمانی مارانگاز).

**جەنجاڵ** (ن) ١ cencal

ئاپۆرە، قەڵەبالغیی، چێوکوتیی.

**جەنجاڵ** (ن) ٢ cencal

سەرقاڵیی، چەقەوگوڕە، زەنازەنا، هەراوهوریا.

**جەنجاڵ** (ئان) ٣ cencal

چێوکوت، قەڵەبالغ، چڕ، پڕ.

**جەنجاڵ بوون** (کتن) ١ cencalbûn

پڕبوون، چڕبوون، چێوکوت بوون، سیخناخ بوون، قەڵەبالغ بوون.

**جەنجاڵ بوون** (کتن) ٢ cencalbûn

کۆبوونەوە (خەڵک بەزۆریی وناڕێکیی).

**جەنجاڵ بوون** (کتن) cencalbûn[٢]
زۆریەئیش بوون، سەرقاڵ بوون، نەپەرژان.

**جەنجەڕ** (ن) cencer[١]
چەرخی ئاو هەڵێنجان، جەرجەرە، چەرخی ئاوپێ هەلگواستن (لەبیر..)، چەرخ ودۆلابی ئاو هەلکێشان.

**جەنجەڕ** (ن) cencer[٢]
ئامرازی خەرمان پێکوتان، چوو، ئامرازی گێرە کردنی دەغڵ ودان، جەرجەڕ، ئامرازی کلۆش وردکردن، ئامرازی لەدار دروستکراو بۆ گێرەکردنی خەرمان.

**جەندەخەون** (ن) cendewewn
زیندەخەو، بیرەخەو

**جەندەرە** (ن) cendere
سافکەرە، ئامرازی ساف کردن (چۆغەو کووتاڵی چنراو).

**جەندەرەکردن** (کتپ) cendere kirdin
دەق کردن، دەقاق لێدان، کەتیرە لەقوماش دان.

**جەندەک** (ن) cendek
تەرم، کەلاک، لاشە، لاک.

**جەنقیین** (کتن،کی) cenqîn
راپەڕیین.

**جەنگ** (ن) ceng
ئاشووب، ئاژاوە، پشێویی، داو، داوا، شەڕ، شەڕە، پۆبان، نەبەرد، نەوەرد، کێشە، هەراوکێشە (نێوان میللەتان).

**جەنگا** (ن) cenga
جنگ گاه، ئاوەردگا، کەرنەک، گەرنەک، نەردگا، نەوەردگا.

**جەنگاوەر** (ن) cengawer[١]
١- ئازا، بزەن، بژەن، جەنگیی، جەنگران، شمشێر کرۆژ، شەڕکەر، لێدەر، بە شەڕەڤان. ٢- چەکداری بەشدار لەشەڕدا.

**جەنگاوەر** (ئان) cengawer[٢]
جەنگساز، جەنگخواز، شەڕخواز، شەڕانیی، واز لەشەڕ، شەڕواز.

**جەنگ بەرپاکردن** (کتپ) ceng berpakirdin
شەڕنانەوە، شەڕ بەرپاکردن،شەڕ هەڵگیرساندن.

**جەنگ نامە** (ن) ceng name
بەیان نامەی شەڕ.

**جەنگ وگوریز** (ن) ceng wgurêz
بگرە وبەردە.

**جەنگە** (ن) cenge
جەرگە، هەرەت.

**جەنگەڵ** (ن) cengel
ب (بێشە).

**جەنگەلی** (ئان) cengelî
١- توورە، جەنگەری، شەڕانی، کەللەیی.
٢- کەمزان، گێل.

**جەنگەنە** (ئان) cengene
خراپکار، خوێریی، ناپاک، ناپوخت.

**جەنگیر** (ن) cengîr
جنگیر، جنگر، دیوگر.

**جەنگی** (ن) cengî
ب (جەنگاوەر).

**جەنگیین** (کتن) cengîn
شەڕکردن، شەڕوشۆڕ بەرپاکردن.

**جەنە** (ن) cene
گە، مان.

**جەنەب** (ن) ceneb
ڕواڵەت، شێوە.

**جەنەکردن** (کتن) cene kirdin
مان گرتن (ولاخ..)، گەگرتن، پێچەقاندن ونەڕۆیشتن (مرۆڤ).

**جەنیقاندن** (کتپ،کی) cenîqandin(ki)
١- تێخوڕیین، جەنیقین، راپەڕاندن، ڕاچڵەکاندن، ڕەتاندن، هاژدان.
٢- نێچیرماندوو کردن و لەغاروەستاندنی.

**جەو** (ن) cew
برنگ.

**جەواڵ** (ن) cewal
تێر، جانی خانی، فەردە، جەواڵ موتابی، چەوال، جەوال، خورج، گوێنی (لە موو دروست کراو)، جوال، جەوالە، کیسەی دەغلی گەورەی یەک لایی.

**جەوان** (ن) cewan[١]
ئاگاداریکەری مەرەزە، مەرەزەوان.

**جەوان** (ن) cewan[٢]
گۆخل.

**جەواهیر** (ن) cewahêr
دانە، گەوهەر، جەوهەر، بەردی بەنرخ.

**جەواهیرین** (ئان) cewahêrîn
جەواهیر بەند، دانەنیشان، گەوهەرنیشان. گەوهەربەند، بەگەوهەر ڕازێنراوەوە.

**جەوتک** (ن) cewtik
١- هەگبەی چەرمین، هەمانەبزرینە (بۆدانەویلە)، میزە(بۆ رۆن ودۆشاو)، جەوەنگە، کونگە، جەود، کوندە، جەودک، جەوەندە (بۆ ئاو). ٢- جانتای لەچەرم دروستکراو، خورجینی چەرمین.

**جەور** (ن) cewir [١]
جەفا، زووخاو.

**جەور** (ن) cewir [٢]
زۆر، ستەم، بێ دادی، جەورد، زۆرەملی، دەس دریژی، زۆرداری، کەلەگایی.

**جەورکردن** (کتن،کتپ) cewir kirdin
زۆرکردن، ستەم کردن، ستەمگەری کردن، بێ دادی کردن، زۆرەملێ کردن، دەس دریژی کردن، زۆردایی کردن، کەلەگایی کردن.

**جەورکەر** (ئان) cewirker
بێبەزەیی، جەورگر، خوێن خوار، زۆردار، ستەمگەر، ستەمکار.

**جەورکێشان** (کتن) cewirkêşan
تەقەلادان، هەوڵ دان.

**جەوسەق** (ن) cewseq
جادە، رێ، رێگا، رێگە، رێدەو، شەقام، شەقامەرێ، رێگەی گشتی، شوێنێ کەزۆرهاتوچۆی پێد بکرێ، کاروانەرێ.

**جەوسەق** (ن) cewseq
کۆشک.

**جەوشن** (ن،کی) cewşin(ki) [١]
سەرچاوە، سەروچاوە، کانی.

**جەوشەن** (ن،س) cewşen [٢]
زرێ، چاکەتی زرێ.

**جەوەرە** (ن) cewere
تەوەرە، سەختیی، نارەحەتیی.

**جەوەندە** (ن) cewende
جەوەنگە، دیمک، دیمکە، کوندەی پچووک، مەتارەی چەرمین، توورەکەی چەرمین بۆ ئاو تیدامینان، جەوەنە.

**جەوهەر** (ن) cewher [١]
رەنگ.

**جەوهەر** (ن) cewher [٢]
پیزە.

**جەوهەر** (ن) cewher [٣]
جورپوزە، زرنگی، لیهاتوویی.

**جەوهەر** (ن) cewher [٤]
ئاو یان رەقیی (پۆلا)، خاڵ ومیلی تیخی باش.

**جەوهەردار** (ئان) cewherdar [١]
ئاودراو(پۆلا)، ئاودار، دەبان، دەوان، بەخاڵ و میل (تیغ).

**جەوهەردار** (ئان) cewherdar [٢]
بەجەوهەر، پرپایەخ.

**جەوهەردار** (کتپ) cewherdan [٣]
ئاودان، ئاودانەوە.

**جەوی** (ن) cewî
جەووک، هەنگوژە، جەوک، کەتیرەی گەوەنگ، کەتیرەی هەندێ درەخت، جاوی، جیوە، شیلەی هەندێ دارو گەوەنگ.

**جەهر** (ن،کل) cehir(kl)
رق، رک، قین، کین، توورەیی، سڵیی.

**جەهرهاوردن** (کتپ) cehirhawirdin(kl)
تووڕەکردن، رق هەڵساندن، قین هەڵساندن.

**جەهەننەم** (ن) cehennem [١]
ئاتوون، ئەتوون، ئارتوون، جەحەندەم، دۆزەخ، جەهەندەم، دۆزەق، دۆژە، گەهەننەم، جەهەننم.

**جەهەننەم** (ن) cehennem [٢]
کوورەی حەمام.

**جەهیل** (ئان) cehêl
بزەڵە، جاهیل، جیل، جحیل، دەستە، گەنج، لاو، هەرزە، جاهاڵ، نۆجوان، جەحێل، تازەپێگەیشتوو.

**جەیهون** (ن) ceyhün
زۆرخۆر(مرۆڤ).

**جەیران** (ن،ئا) ceyran
ئاسک.

**جەینک** (نک) ceynik
١- زوڵف، قژی لاجانگ.
٢- جینک، لاجانگ، هەردوو ئالیی سەری مرۆڤ.

**جێ** (ن) cê [١]
جێگا، جێگە، جا، جیە، دەر، شوێن، جاگە، جی، جاگە، دان.

**جێ** (ن) cê [٢]
١- پێخەف، نوێن، جێگەوبان، شوێن وجێگە.
٢- شوێنێ نوستن، جێخەو، جێگەی نوستن، شوێنی هەلاژیان، جێ رازان.

**جێ** (ن) cê [٣]
پلە، جا، جێگە.

**جیٚ بۆ کردنەوە** (کتپ)[1] cê bo kirdinewe
بوارەدان، ماوەپیٚدان،مۆڵەت پیٚدان، هیٚشتن.
**جیٚ بۆ کردنەوە** (کتپ)[2] cê bo kirdinewe
١- شوێن بۆ کردنەوە.
٢- تیٚ چەسپاندن، تیٚ خونجاندن.
**جیٚ بوونەوە** (کتن) cê bünewe
بنج داکوتان، جیٚگەبۆ بوون، دامەزران، شوێن بۆ بوون، لەجیٚگەداحەوانەوە.
**جیٚ بە جیٚ** (ئاک)[1] cê be cê
جیٚگەبەجیٚگە، دەست وبرد، ڕووبەڕوو، کوتوپڕ، جاوەرجا، جاوەجا، هەرئێستە، دەس بەجیٚ، هەر لەجیٚ.
**جیٚ بە جیٚ** (ئان)[2] cê be cê
تەواو، ڕێک، مەیسەر.
**جیٚ بە جیٚ بوون** (کتن)[1] cêbecêbün
پێک هاتن، چەسپان، دامەزران، دروست بوون، ڕاپەڕیین، سازان، گونجان، حاوانەوە.
**جیٚ بە جیٚ بوون** (کتن)[2] cêbecêbün
بەجیٚ هاتن، بەدی هاتن، وەدیهاتن.
**جیٚ بە جیٚ کردن** (کتپ)[1] cêbecê kirdin
ئەنجام دان، بەئەنجام گەیاندن، بەجیٚگەهاوردن، پێک هێنان، جیٚ کرن، ڕاپەڕاندن، تەواوکردن، ئەداکردن، بەجیٚ کردن، ئەداکردن، بەجیٚکردن، بەجیٚگەیاندن، بەجیٚ هێنان، جیٚهێنان، بردنەسەر، بڕینەوە، دوایی پیٚهێنان، دوایی هاوردن، کردن، گەیاندنە ئەنجام، هەڵسووڕاندن.
**جیٚ بە جیٚ کردن** (کتپ)[2] cêbecêkirdin
جووڵاندن، گواستنەوە، گوێزاندنەوە، گوێزانەوە، جاوەجاکردن.
**جیٚبە جیٚ کردن** (کتپ)[3] cêbecêkirdin
بنج بەست کردن، دامەزراندن، ڕێک وپێک کردن، سازکردن.
**جیٚ بە جیٚ کەر** (ن) cêbecêker
بکار، بکر، بکەر، بەجیٚهێنەر، پێکهێنەر، ڕابوونەر، کارا، کردە،
کردەر، هەڵسەر، هەڵسووڕێنەر.
**جیٚ پیٚ** (ن) cêpê
باستان، پیٚ شوێن، تەماڵ، سۆراخ ، سۆراخگە، شوێن پیٚ، شوێنەوار، شوێن دەوس (نێچیر)، شۆپ.
**جیٚ پیٚ دۆزینەوە** (کتپ) cêpê dozînewe
شوێن پیٚ (زانیین، دیتنەوە).

**جیٚ پیٚ لەق بوون** (ن) cêpê leqbün
جیٚ پیٚ لیٚژبوون، ژێر (کەسیٚ) هەڵۆل بوون، شوێن پیٚ لیٚژبوون،
کەوکورتی هێنان (لەپایەومایەدا).
**جیٚ پیٚ لەق کردن** (ئد)[1] cêpê leqkirdin
جیٚ پیٚ لیٚژکردن، دەرپەڕاندن، ژێر(کەسیٚ) هەڵۆل کردن، شوێن پیٚ لیٚژکردن، بن هەڵۆل کردن، تەنگ پیٚ هەڵچنیین، جیٚ پیٚ شلۆق کردن، ئاوکردنە ژێرکەسیٚ.
**جیٚ پیٚ لیٚژکردن** (ئد)[2] cêpê lêjkirdin
ب (جیٚ پیٚ لەق کردن).
**جیٚ پیٚ لیٚژکردن** (ئد) cêpê lêjkirdin
ژیان لیٚ تاڵ کردن،
جاڕس کردن، وەڕس کردن.
**جیٚ پیٚ هەڵگرتن** (کتپ) cêpê helgirtin
شوێن پیٚ هەڵگرتن، شوێنەوار هەڵگرتن، تەماڵ هەڵگرتن، پیٚ وشوێن هەڵگرتن.
**جیٚ پیٚ هێلان** (ئد) cêpê hêlan
دەرکردن، ڕاکردن، لابردن، وەلانان.
**جیٚ جیٚ** (ئان)[1] cêcê
ب (پارچە پارچە).
**جیٚ جیٚ** (ن.ئان)[2] cêcê
ب (بڕ بڕ).
**جیٚ خۆش کردن** (کتپ) cêxoškirdin
جیٚگە خۆش کردن، هیٚشتنەوە لەشوێنێک بەخاترە جەمیی.
**جیٚ داخستن** (کتپ) cêcaxistin
جیٚ ڕاخستن، شوێنی نوستن ئامادەکردن، ڕەختی خەودانان، نوێن داخستن، جاوەنە.
**جیٚدار** (ئان)[1] cêdar
١- دیار (پلە)، بەپلەوپایە. ٢- بەڕیٚ وجیٚ.
**جیٚدار** (ئان)[2] cêdar
نوێنەر.
**جیٚدەست** (ن) cêdest
ئالقە، دەسک، قولف.
**جیٚر** (ن) cêr
کیش، هێز، ووزە.
**جیٚ ڕاو** (ن) cêraw
ڕاوگان، ڕاوگە، شوێن ڕاو، شوێنەڕاو، ڕافگە.
**جیٚز** (ن) cêz
شارا، کۆمەڵ (دانەوێڵە)، خەرمانی سووورکراو.
کۆمەڵ دەخڵ.

**جێ ژوان** (ن) cêjwan
لانەی دلداریی، ژوانگە، پەیمانگا.
**جێژن** (ن) cêjin
ب (جەژن).
**جێ فڕۆکە** (ن) cêfiroke
گەراجی فڕۆکە.
**جێ فڕین** (ن) cêfrîn
جێ نیشتنەوەی فڕۆکە (لەفڕۆکەخانەدا).
**جێ کردن** (کتپ) cêkirdin [1]
بوارەدان، پشوویێدان، جێگاکردن، جێگاکردنەوە، مۆڵەت دان، دەرفەت پێدان، ووچان دان، ڕێگاپێدان، ماوەپێدان.
**جێ کردن** (کتپ) cêkirdin
چاڵ کردن، قوولکە دروست کردن.
**جێ کردنەوە** (کتپ) cêkirdinewe [2]
دامەزراندن، شوێن بۆ دۆزینەوە، شوێن پێ دان، جێگەکردنەوە.
**جێگا** (ن) cêga [1]
ب (جێ).
**جێگا** (ن) cêga [2]
بوارە، پشوو، دەرفەت، ماوە، مۆڵەت، ووچان.
**جێگا** (ن) cêga [3]
هەوار، هەوارگە، وار.
**جێگاپێ دان** (کتپ) cêgapêdan
جێگابەرەڵاکردن، ڕێگەدان، شوێن کردن.
**جێگر** (ن) cêgir [1]
بنەگر، جێ نشین، دوومان، شوێنگر، میراتگر، وەرت.
**جێگر** (ئان) cêgir [2]
١- بنەگر، دوومان، شوێن گر. ٢- نوێنەر.
**جێ گرتن** (کتن،کتپ) cêgirtin [1]
چەسپان، چەسپاندن، دامەزران،
دامەزراندن (لەشوێنێکدا بۆ مەبەستی بەرگری یان هێرش بردن).
**جێ گرتن** (کتپ) cêgirtin [2]
خستنەوە شوێن.
**جێ گرتن** (کتپ) cêgirtin [3]
شوێن شتێ یان کەسێ گرتنەوە.
**جێگرتنەوە** (کتپ) cêgirtinewe
بەجێی کەسێ شادبوون، چوونەجێی کەسێ، جێی کەسێ پڕکردنەوە.
**جێگۆڕکە** (ن) cêgorke
جێ گۆڕکێ، جێگاگۆڕکێ، جێگەگۆڕکێ، شوێن گۆڕکە.
**جێ گۆڕکێ کردن** (کتپ) cêgorkê kirdin
ئاڵ وگۆڕکردن (جێگەی شت)، شوێن گۆڕکەکردن.
**جێ گۆڕین** (کتپ) cêgorîn
شوێن گۆڕین.
**جێگە** (ن) cêge [1]
ب (جێ).
**جێگە** (ن) cêge [2]
جێ، ڕەختی خەو، شوێن نوستن.
**جێگە** (ئاک) cêge [3]
باتیی، بریی، بەجێگەی، جێی، لەباتیی، لەبریی.
**جێگە** (ن) cêge [4]
ئەندازە، پایە، پلە، ڕادە، ڕێ وشوێن، جا.
**جێگە باز** (ن) cêge baz
بازگە، جێگای باز.
**جێگە برین** (ن) cêge brîn
جێ برین، جێگەی زەخم، زەخمگا.
**جێگە بۆ خۆش کردن** (ئد) cêge bo xoš kirdin
جێ بۆخۆش بوون، شوێن بۆ خۆش بوون، دڵ ئاسوودە بوون.
**جێگە بە جێگە** (ئاک) cêgebecêge
شوێن بەشوێن، دوا بەدوا.
**جێگە داغ** (ن،پز) cêge dax
داخگە (لەسەر پێست).
**جێگە دار** (ن) cêgedar
ب (جێ نشین).
**جێ گەرم کردن** (ئد) cê germ kirdin
شوێن خۆش کردن
**جێگە شەتڵ** (ن) cêge šetil
باخلە، تۆمەدانە، دووکان
**جێگە شەم** (ن) cêge šem
شەمگا، شەمگە، مۆمدان.
**جێگە مان** (کتن) cêgeman
بەجێمان، جێمان، دواکەوتن، دواوەمان، مانەوە، کەوتنەدواوە.
**جێگە وڕێگە** (ن) cêge wrêge
بنتار، جێ وشوێن، ڕێ وشوێن، سەروشوێن.
**جێگە هاوردن** (کتپ) cêge hawirdin
بەجێ هێنان، تێپەڕاندن، جێ هێنان.
**جێگە هێشتن** (کتپ) cêge hêštin
بەجێ هێشتن، جێ هێلان، لێ کشانەوە.

**جێگەی** (ن) cêgeî
جێی.
**جێگەی بڕوا{کەسێ}** (ن) cêgeî birwa
جێی باوەڕ.
**جێگیر** (ئان) cêgîr
جێگرتوو، چەسپاو، راوەستاو.
**جێگیربوو** (ئان) cêgîrbü
پێ بەجێ، چەسپاو، دامەزراو.
**جێگیربوون** (کتن) cêgîrbün
چەسپان، دامەزران، نیشتەجێبوون.
**جێگیرکردن** (کتپ) cêgîrkirdin
چەسپاندن، دامەزراندن، راگیرکردن.
**جێ مان** (کتن) cê man
بەجێمان، دواکەوتن، مانەوە، ماینان، لەدواوەمانەوە.
**جێماو** (ئان) cêmaw ١
١- بەجێماو، جێگەماکە، جێگەماو، جێماکە، جا ئاستە، جامەنە.
٢- دواکەوتوو، دواکەوتە، لەدواوەماو.
**جێماو** (ئان) cêmaw ٢
کەلەپوور(نەریت، رۆشنبیریی یان داب ودەستووری دەستاو دەست کەوتوو لەپێشینانەوە).
**جێماو** (ئان) cêmaw ٣
میراتیی، بۆماوە(پارەو پووڵ..).
**جێمک** (نک) cêmik
ب (جمک).
**جێ نزرگە** (ن) cê nizirge
شوێنی پیرۆز، جێ مشایەخ.
**جێ نشین** (ن) cênišîn ١
جادار، جێگر، جێگەدار، دوومان.
**جێ نشین** (ن) cênihîn ٢
١- جێگەنشین، میراتگر. ٢- بنەچە، نەوە، منداڵ.
**جێ نیشان دان** (کتپ) cênîšan dan
جێ پیشان دان.
**جێنیک** (ن) cênîk
لاجانگ، هەردووناڵی لی سەری مرۆڤ، زوڵف.
**جێ ورێ** (ن) cê w rê
ب (جێگە ورێگە).
**جێ هەڵگرتن** (کتپ) cê helgirtin
جێ پێچانەوە.
**جێ هێشتن** (کتپ) cê hêštin
١- بەجێ هێشتن، بەجێ هێلان، جێگە هێشتن، جێ هێلان. ٢- لێ رەت بوون.
**جێ هێشتن** (کتپ) cê hêštin
تەخرکردن، لێ گەڕان، لێکشانەوە، نەکردن، وازلێ هێنان، هەڵبواردن، تەرخ کردن، دەس لێ هەڵگرتن.
**جێ هێلان** (کتپ) cê hêlan
جێ هێشتن.
**جێی** (ن) cêy
باتیی، تەنخوا، جێگەی.
**جێی ئەوی گرتەوە** (ند) cêy ewî girtewe
١- جێی کەسێ گرتنەوە
٢- جێیکەسێ خۆگرتنەوە لەئیش وکاردا.
**جێی ئومێد بۆنەمان** (ند) cêy umêd bo neman
جێی ئومێد بران.
**جێ ئومێدبوون** (کتن) cê umêd bün
جێی هیوا بوون.
**جێی باوەڕ** (ن) cêybawer ١
باوەڕ پێکراو، بەقادار، باوەڕیی، جێگەی بڕوا، جێی بڕوا، جێی باوەڕ، جێی متمانە، جێگەی باوەڕ، سەر ڕاست، شوێن باوەڕ.
**جێی باوەڕ** (ن) cêybawer ٢
بڕوا، بەقا، باوەڕ.
**جێی باوەڕبوون** (ند) cêybawerbün
جێی متمانەبوون، سەر ڕاست بوون.
**جێی باوەڕنەبوون** (کتن) cêybawernebün
ئامان بۆ نەبوون، جێی گومان بوون، جێی بڕوانەبوون، ناپاک بوون.
**جێی پێ نەبوون** (ند) cêypê nebün
قەڵەباڵغیکی بێ شوماربوون، تێک چرژان.
**جێی خۆ خۆش کردن** (ند) cêyxo xoškirdinn
١- جێی خۆ گەرم کردن، جێی خۆ دامەزراندن، خۆ بنچ بەست کردن. ٢- زمان لووسیی کردن.
**جێی سەبری سووتاوە** (ند) cêy sebrî sütawe
ئارام لەبەر بران، خۆ پێ ڕاگیر نەکردن.
**جێی گومان** (ئان) cêy guman
بەشک،گوماندار.
**جێی گومان بوون** (کتن) cêy guman bün
ب (جێی باوەڕ نەبوون).
**جیا** (ئان) ciya ١
ب (جیاواز).
**جیا** (ئان) ciya ٢
پێک نەچوو، وێک نەچوو.

**جیا (ئان)** ٢ ciya
تەنها، جوێ.
**جیابوونەوە (کتن)** ١ ciya bünewe
بڕیوون، تاربوون، جدابوونـەوە، جودابوونـەوە، جـوێ بوونەوە، جیاوەبوون، جوێبوون، جێ بوون، دابـڕان، یەکتر بەجێهێشتن.
**جیابوونەوە (کتن)** ٢ ciyabünewe
بـڕان، پـچڕان، پـەرت بـوون، جوایەزبوونـەوە، لێـک دوورکەوتنەوە، لێک هەڵبڕان.
**جیات (ن)** ciyat
جهێ، جێ، شون، شوێن.
**جیاتی (ن)** ciyatî
بریی، جیات.
**جیاجیا (ئاک)** ciya ciya
تاکەتاکە، دانەدانە، یەک لەدوای یەک، جگاجگا.
**جیاجیا (ئاک)** ciyaciya
بچڕبچڕ، بڕبڕ، برەبرە، پچڕپچڕ، تیکەتیکە، یەکیـەک، بەش بەش.
**جیاخواز (ن)** ciyaxwaz
پەناگر، تەریک، قوژبنگر، لاگر.
**جیاخوازی (ن)** ciyaxwazî
پەناگری، تەریکی، لاگری.
**جیاز (ن)** ciyaz
کفنی مردوو.
**جیازی (ن)** ciyzî
بـاوانیی، پـیتک، جیـاز، جیهـز، خـەلاتیی، دەسـت وجیایی، ناوتیلان، کەل وپەل یان ئـەو شتومەکانەی بووک بۆ ماڵی زاوای دەبا.
**جیاکار (ئان)** ciya kar
جودا، جیاواز، تایبەتیی، وەک هیترنا.
**جیاکراوە (ئان)** ciya kirawe
بەئەولاوەخراو، جوێ کراوە.
**جیاکردنەوە (کتپ)** ١ ciya kirdinewe
بـڕدان، جوداکردنـەوە، دابـڕان، دوورخـستنەوە، هەڵاواردن.
**جیاکردنەوە (کتپ)** ٢ ciya kirdinewe
بڕیان، بڕیین، پارچەکردن، پچڕان، پچڕاندن، پچڕیان، پـچڕیین، پـچەڕاندن، پـشاندن، ژێ کـرن، قەتانـدن، قەرتلانـدن، کـوت کـردن، لـەت کـردن، لێـک جیاکردنەوە، لێک جداکرن.
**جیاکردنەوە (کتپ)** ٣ ciyakirdinewe
بەئەولاخستن، تاکـەوەکردن، جدواکردن، جـوداکرن، جهـێ کـرن، جیـاوەکردن، جیـاوەوکردن، جـوێ کردنەوە، خستنە ئەولاوە، دەربواردن، هەڵاواردن.
**جیاکردنەوە (کتپ)** ٤ ciyakirdinewe
لێ دەرهێنان، هەڵبژاردن.
**جیاکەرەوە (ن)** ciyakerewe
بەشکەر، جوێ کەرەوە.
**جیاواز (ئان)** ciyaz
جیا، جودا، جوێ، جدا.
**جیاوازی (ن)** ciyazî
جیایی، جودایی، جوییی.
**جیاوازیی کردن (کتپ)** ciyazî kirdin
جیایی کردن، جودایی کردن (لەبیروباوەڕ دا).
**جیاوەبوون (کتن)** ciyawe bün
تاکـــەوەبوون، جودابـــوون، جـــوێ بوونـــەوە. جیابوونەوە(لەکەسێ).
**جیایی (ن)** ciyayî
جیاوازیی، جودایی.
**جیرە (نک)** ١ cîre
ڕاتوو، ڕۆژانە، بەش، مووچە.
**جیرە (ن)** ٢ cîre
بەرات، جەمەکە.
**جیرەخۆر (ن)** cîrexor
مووچەخۆر، جیرەهەر.
**جیر (ئان)** ١ cîr̲
سەر ڕەق، سەرسەخت، کەللەڕەق، مانگر.
**جیر (ن)** ٢ cîr̲
کێش، هێز، ووزە.
**جیر (ئان)** ٣ cîr̲
٢کاڵ، کرچ، نەکوڵاو (گۆشت..).
**جیر (ئان)** ٤ cîr̲
پیسکە، گر، گیر.
**جیر (ئان)** ٥ cîr̲
چیر، خۆگر، نەپس.
**جیراندن (کتپ)** cîr̲andin
جیرەکردن، جیران.
**جیربوونەوە (کتن)** ١ cîr̲bünewe
ڕیچ بوونەوە، ناڕازیبوون.
**جیربوونەوە (کتن)** cîr̲bünewe
بەکیش بوون، بەهێزبوون.
**جیرە (ن)** ٢ cîr̲e
جیرەجیر، جیرەهوور.

**جیزه** ( ن ) cîze
گیزه ( گولله ).
**جیقاندن** ( کتپ ) cîqandin
جیقانن، جیقه‌کردن.
**جیق ده‌رهنان** ( کتپ )[١] cîq derhênan
خستنه جیق وفیق، هاوار لێ هه‌ڵساندن.
**جیق ده‌رهینان** ( کتپ )[٢] cîq derhênan
١- پلیشاندنه‌وه، پان کردنه‌وه، جیق وفیق ده‌رهینان، هه‌ناو ده‌رهینان یان پلیشاندنه‌وه.
٢- هاوار لێ هه‌ڵساندن.
**جیقن** ( ئان ) cîqin
لاواز، بێهێز، له‌ڕ، له‌جه‌ر، که‌له‌لا.
**جیقنه** ( ن ) cîqine
ڕیقنه، پیسایی باڵنده، چوغلی، چیرت، ده‌رق.
**جیقه** ( ن ) cîqe
جیق جیق، جیکه، زیقه، جووقه، هه‌ست وخوست، ده‌نگێ وبزاوی لاواز، جیکه.
**جیک** ( ن ) cîk
پاژنه ( پێ، پێلاو ).
**جیکاندن** ( کتن ) cîkandin
جیکه‌کردن، جیکانن، جوکه‌کردن، جووکه‌جووکه کردن.
**جیکه** ( ن ) cîke
جرووکه، جریکه، جریکه‌جریکه، جیکه‌جیکه.
**جیکه برین** ( کتپ ) cîke birîn
بێ ده‌نگ کردن، خه‌فه‌کردن، ده‌نگ لێ بڕین.
**جیکه‌نه** ( ئان ) cîkene
بێ ئۆقره، نه‌سره‌وت، بێئارام، ماخۆلانگرتوو.
**جینچک** ( ن ) cînçik
پارچه، تیلماسک، گوت.

**جیندی** ( ئان ) cîndî
باش، چاک.
**جینگل** ( ن ) cîngil
ئه‌مدیونه‌ودیو، جووڵه‌جووڵ، گنگل ( به‌ناره‌حه‌تی )، بزووتنه‌وه‌یه‌کی که‌م به‌ناره‌حه‌تی.
**جینگن** ( ئان ) cîngin
شه‌ڕانی.
**جیوه** ( ن ) cîwe
ئابه‌ک، زیوه، جه‌و.
**جیهان** ( ن )[١] cîhan
جه‌هان، دنیا، گیتی.
**جیهان** ( ن )[٢] cîhan
ڕۆژگار، ڕۆژان.
**جیه‌ڕ** ( ن،کل ) ciyer(kl)
جیره‌جیر، ده‌مه‌ده‌مێ، شه‌ڕه‌ده‌مێ، شه‌ڕه‌ده‌نووک.
**جیه‌ڕکێش** ( ئان،کل ) ciyerkêh(kl)
به‌رزه بڵیس، ده‌مه‌وه‌ر، جیره‌جیرکه‌ر ( مرۆڤ ).
**جیه‌ڕکێشان** ( کتن،کل ) ciyerkêhan(kl)
ده‌مه‌وه‌ریی کردن، شه‌ڕه‌ده‌م کردن.
**جیه‌ڕهاوردن** ( ند،کل ) ciyer hawirdin(kl)
هه‌ست بریندار کردن.
**جیه‌ڵ** ( ئان،کل ) ciyel(kl)
که‌لله‌ڕه‌ق، مانگر، چه‌مووش، چه‌مۆش.
**جیه‌ڵ کردن** ( کتپ،کل )[١] ciyelkirdin(kl)
به‌له‌سه‌بوون، چه‌مووشیی کردن، مان گرتن.
**جیه‌ڵ کردن** ( کتن،کل )[٢] ciyelkirdin(kl)
که‌لله‌ڕه‌قی پیشان دان، که‌لله ڕه‌قی کردن.

- چ -

-ç-

**چ، چ** (ن) ç
شەشەم پیتە لەوئەلف وبێیەی ئێستا زمانی کوردی پێ دەنوسرێت.

**چا** (ن،رو) ça ١
چایی، گەلا چا، تۆچا، تووچا، دەرمان چا.

**چا** (ن) ça ٢
چەم (بەئاو یان بێ ئاو).

**چا** (ن،رو) ça ٣
تیرەچا، چالاو، چاوانە.

**چا** (ن،لو) ça(lu) ٤
١- چال (زەویی). ٢- بیر.

**چا** (ئاک) ça ٥
(لە)ئەوێ، (لە)ئەویندەرێ، لەوێ، (لە)ویندەرێ.

**چابوک** (ئان) çabük
پەیت، چاپک، چالاک، چوست، خۆشرەو، خۆشرەوت، خیرا، سفک، گورج، چابک، لەش سووک، بەپێ.

**چابوک سوار** (ن) çabükswar
سوارچاک، شۆڕەسوار.

**چابوکی** (ن) çabükî
ئازایی، جەختی، چالاکی، خیرایی.

**چابوون** (کتن) çabün
ب (چاک بوون).

**چاپ** (ن) çap ١
ماشینی شت پێنووسین.

**چاپ** (نک) çap ٢
چاپەمەنی.

**چاپ** (ن) çap ٣
قورسایی، کێش.

**چاپ** (ن) çap ٤
ئەیارە، پێمانە، پێوانە، عەیارە، کێلە.

**چاپ** (ن) çap ٥
ستەمپا، مۆر، نیشانە.

**چاپ** (ن) çap ٦
چاخان، درۆ، دەلەسە، دەرەو، فیشال، فڕ، فڕکا، قەوانە، ناڕاستیی، هەڵیت، هەڵبەستە، چاخان وپاخان، شات ناڕاستیی، هەڵیت، هەڵبەستە، چاخان وپاخان، شات

**چاپ** (ن) çap ٧
ئاماژە، باسمە، شەقل، شەقلە.

**چاپالێو** (ن) çapaḻêw
چا پیالوون، پاڵوونی چای، کەوگیری بچکۆلەی چا پالاوتن.

**چاپباز** (ن) çapbaz
١- تەشقەڵەباز، تەڵەکەباز، چاپکەر، چاتۆڵباز، چا چۆڵباز، فریوباز، فێڵباز.
٢- بەفروفیشاڵ، درۆزن، بافیشکەر، چاپچایی.

**چاپخانە** (ن) çapxane
باسمەخانە، شەقلخانە، شوێنی نوسراو لەچاپدان، ئەو شوێنەی کتێب و بڵاوکراوەی لێ چاپ دەکەن.

**چاپدەر** (ن) çapder
چاپکەر، چاپ لێدەر، چاپ نووس،ئامێری چاپ.

**چاپ کردن** (کتپ) çap kirdin ١
چاپ دان، چاپ لێدان، شت بەچاپ نووسین، لە چاپ خستن، لەچاپ دان، کتێب بەماشێن نوسینەوە، نوسراو لەچاپ دان.

**چاپ کردن** (کتپ) çap kirdin ٢
بڵاوکردنەوە، لەچاپ دەرهێنان.

**چاپ کردن** (کتپ) çap kirdin ٣
بافیش کردن، درۆکردن.

**چاپلووس** (ن) çaplüs
پێ رامووس، زمان لووس، ماستاو ساردکەرەوە، مەراییکەر.

**چاپلووسی** (ن) çaplüsî
پێڕامووسی، ڕواڵەت، زمان لووسی، مەرایی.

**چاپلووسی کردن** (کتپ) çaplüsîkirdin
پێڕامووسیی کردن، ڕواڵەت کردن، زمان لووسیی کردن، مەرایی کردن.

**چاپ لێ دان** (کتن) çaplêdan
درۆکردن، درۆودەلەسە هەڵبەستن، دەلەسە ڕێکخستن، قەوانەلێدان، شان وشوت کردن.

**چاپ وچووپ** (ن) çap wçüp ١
١- چاپ وگووپ، ئاخونەک.
٢- شان وشوت، لاف وگەزاف.

**چاپ وچووپ** (ن) çapwçüp. ٢
چاخان وپاخان، درۆودەلەسە، هاشەوهووشە.

**چاپ وچووپ کردن** (کتپ) ١ çapwçüpkirdin
چاپ وگووپ کردن، ناخونەکە ئیدان، شتی ئەم وئەو بردن بێ پرسی خاوەنەکەی.

**چاپ وچووپ کردن** (کتن) ٢ çapwçüp kirdin
چاخان وپاخان کردن، درۆو دەلەسەکردن، هاشەو هووشەکردن، شات وشوت کردن، لاف وگەزاف لێ دان.

**چاپەز** (ن) çapez
١- چادان، چادانک، چایدان، چایدانک، قۆری، چاپەز. ٢- سەماوەر.

**چاپەمەنی** (ن) çapemenî
چاپ، رۆژنامەگەریی، شتی چاپکراوی وێژەیی، بەلاڤۆک، لەچاپ دەرچوو.

**چات کردن** (کتپ) çatkirdin
تیک بەردان، چاک کردن (نێر لەمێی ئاژەڵ)، بەراندن، لێ پەراندن، نێر هاویشتنە سەرمێ.

**چاتکێش** (ن) çatkêş
پەتکێش (ئاسنێکی باریکە پارچە پەڕۆی پێوەدەکرێ و لەناو لولەی تفەنگەوە رادەکێشرێ بۆ پاک کردنەوەی)، ئامرازی تفەنگ پاک کردنەوە کەشریتی لێ دەئالێنن.

**چاتمە** (ن) ١ çatime
پاسەوان، قەرەووڵ، کیشکچیی.

**چاتمە** (ن،کل) ٢ çatime(kl)
تاق، کەوانە (خانوو).

**چاتۆڵ** (ن،کل) ١ çatol(kl)
چاتۆلە، کۆڵەکەی دەوار.

**چاتۆڵ** (ن) ٢ çatol
خێوەتی تەنکی هاوینە، چاتۆلە.

**چاتۆڵ** (ن) ٣ çatol
دامۆڵ، داوەڵ.

**چاخ** (ئان،کل) ١ çax(kl)
پرومر، خەپان، قەڵەو، گۆشتن.

**چاخ** (ئان) ٢ çax
دروست، دورس، ساز، لەبار، بەکەیف.

**چاخ** (ن) ٣ çax
ئان، تاف، چاخک، دەم، دەور، دەوران، دەورە، رۆژگار، سات، کات، گاف، گاو، گاه.

**چاخ** (ئان) ٤ çax
ساز، تەیار کراو.

**چاخ** (نک) ٥ çax
ب (چەک).

**چاخ** (ن) ٦ çax
قەباڵە، قەواڵە(موڵکە).

**چاخ** (ن) ٧ çax
شوورە.

**چاخان** (ئان) çaxan
درۆزن، بەشات وشوت.

**چاخانە** (ن) çaxane
چاپخانە، قاوەخانە.

**چاخ بوون** (کتن) çax bün
پرومربوون، قەڵەوبوون، گۆشت گرتن (ئاژەڵ).

**چاخ کردن** (کتپ) ١ çax kirdin
چاخەوکردن، دابەستن، قەڵەوکردن(ئاژەڵ) بۆ سەربڕین.

**چاخ کردن** (کتپ) ٢ çaxkirdin
ئامادەکردن، سازکردن.

**چاخمە** (ن) çaxime
ئەڵقەی ئاسن (دەخرێتە ناوکونی قایشەوە بۆ ئەوەی هەڵ نەقلیشێ).

**چاخ وچڵ** (ئان) çaxw çil
پرومر، خەپان، خان ومان، گۆشتن، گردەڵی قەڵەو (ئافرەت).

**چاخی** (ن) çaxî
پرومریی، خەپانیی، قەڵەویی، گۆشتنیی، نەرم ونیانیی.

**چادان** (ن) çadan
ب (چاپەز).

**چادر** (ن) çadir
تاوڵ، خێوەت، کۆن، رەشماڵ، خێمە، خەیمە.

**چادرگا** (ن) ١ çadirga
خێوەتگا، شوێن چادر، هووبە، هۆبە، خێمەگا.

**چادرگا** (ن) ٢ çadirga
بارەگا.

**چادری بەلەم** (ن) çadirî belem
بایەوان، چارۆکەی بەلەم.

**چار** (ن) çar
ب (چارە).

**چارپایە** (ن) çarpaye
چارپا، چەرپایە، تەرەویلە، تەختی لەسەر نوستن.

**چارتا** (ئان) çarta
چارتاقدا، چوارتا، چوارتاو، چوارجەرد، چوارەفت چوارلۆ.

**حولحولی** (ئان) hulhulî

ڕاڕا، وازوازی، هەردەم لەسەر خەیالێک.

**حول دان** (کتپ) huldan ١

قووت دان، لرف دان، ماشینەوە، هەڵ لووشین.

**حول دان** (ئد) huldan ٢

بردن، دزین وشان پێداکردن.

**حول دان** (ئد) huldan

خۆ دەربازکردن(واتە بێ سزاو بێ جەزرەبە).

**حولوویسک** (ن) huluwîsk

١- هەوێن. ٢- هەوێنی پەنیر.

**حوله** (ن) hule

پشقل، پشکل، پشکەڵ

**حولەسێ** (ن) hulesê ١

چەقەوگوڕە، زەنازەنا، هەراوهوریا، هەراهەرا، هەراوزەنا.

**حولەسێ** (ن) hulesê ٢

نارێکیی، ناتەبایی.

**حولیاتی** (ن) hulyatî

ڕووبینی، مەرایی، کلکەلەقێ.

**حولیاتی کردن** (کتپ) hulyatî kirdin

ڕوبینی کردن، کلکەسوتێ کردن، کلکەلەقێ کردن (بۆ کەسێ)، ماستاو ساردکردنەوە، ماستاوکردن، مەرایی کردن.

**حولیی** (ئان) hulî ١

بێ موو، لووس (پێست).

**حولیی** (ئان) hulî ٢

زمان لووس، هەڵخەڵەتێن.

**حونجە** (ن) hunce

حونجیی، حینجە، هینجە، حینجە.

**حونجەت** (ئان) huncet ١

بەتەووژم، بەهێز، توانا.

**حونجەت** (ن) huncet ٢

تەووژم، توانایی، هێز.

**حونجە کردن** (کتپ) hunce kirdin

چەچەکردن، حونجێ کردن، حونجێی کردن، حینجە کردن، هینجەکردن.

**حونەر** (ن) huner

جوانکاریی، هونەر.

**حووج** (ن) hûc

مرۆڤی بالابەرز(لەئەندازەبەدەر).

**حۆت** (ئان) hot

حۆچ، سەرڕووتاو، کەسێ کەتووکی سەری وەریبێ، سەربێ تووک.

**حۆری** (ن) horî

پەری، پەری بەهەشت، کیژی ناوبەهەشت، هۆری.

**حۆق** (ن) hoq

هیلنج.

**حۆق دان** (کتن) hoqdan

هیلنج دان.

**حۆقە** (ن) hoqe ١

هۆقە، سەنگێکی کێشانەیە لەئینگلتەرە = ١,٢٤٨ کغم ، لەکوردستانی عێراق = ٢,٥٠٠کغم.

**حۆقە** (ن) hoqe ٢

دەوات، دەوێت، مەرەکبدان.

**حۆقەباز** (ن) hoqebaz

فریوباز، هەڵخەڵەتێنەر، دەسبڕ.

**حۆل** (ئان) hol ١

باڵە، بێچەت، بێ هۆش، بلح، پاتاڵ، حەپۆل، حەپۆلە، حەپینکێ، حەپەنکێ، زلحۆل، کاس، کەم هۆش، گەلحۆ، گەلۆر، گەمژە، گێچ، گێژ، گێژو وێژ، گێل، گێل وێل، گەوج، هێر.

**حۆل** (ئان) hol ٢

زل، زەبەللاح (مرۆڤ).

**حۆل** (ئان) hol ٣

تیل، چاوگێر، خویل، خێل، خۆل.

**حۆلانە** (ئاک) holane

بلحانە، بەکاسیی، بەگەوجیی، بێ هێشکانە، بێ هۆشانە، گەمژانە، گەوجانە، گێلانە، هێرانەیی.

**حۆل بوون** (کتن) holbûn

گێژبوون، گێژو وێژبوون، وێبوون، هێربوون.

**حۆل کردن** (کتپ) holkirdin

گێژکردن، گێژو وێژکردن، وێکردن، هێرکردن.

**حۆلی** (ن،ئا) holî

بەچکەچێل، گۆلک، گوێرەکە.

**حۆلی بیابان** (ن) holî biyaban

ئەزازیل، دێوی بیابان، عەزازیل، غۆلی بیابان، مێردە ئەزمە، مێردەزمە (یەکێکە لەو فریشتانەی لەگەڵ شەیتاندا یاخیی بوون).

**حۆلیی** (ن) holî

بلحێتیی، بلحیی، بێ هۆشیی، حەپۆلیی، کاسیی، گەلحۆیی، گەمژەیی، گەوجیی، هێریی.

**حەب** (ن،پز) heb

حوب، گرمۆلەدەرمان، حەف.

**حەبەساو** (ئان) hebesaw

حەپەساو.

**حەبی** (ن) hebî [1]

پەموو (بەهەلاجیی کراو)، لۆکە(شیی کراوە).

**حەبی** (ن،پو) hebî [2]

حەپی، قۆزاخە، گولە لۆکەی نەکراوە.

**حەبیشاندن** (ن) hebîšandin

بەپەلەشت خواردن، بەهەڵپەشت خواردن، بەهەڵپەو لەز شت ماشیینەوە، هەڵپەکردن (لەسەرنان خواردن).

**حەپارە** (ن) hepare

بژار.

**حەپاندن** (کتن) hepandin

حەپەکردن، حەپەحەپ کردن، حەپیین، حەچان، حەو حەوکردن، حەچولو و حەچەکردن، ڕەوویین، عەوعەوکردن، گەفیین، لوورە لوورکردن، وەڕیین.

**حەپس** (ن) hepis

بەند، بەندیی، دیل، زیندانیی، گراو، گرتوو، گیراو.

**حەپسخانە** (ن) hepisxane

بەندیخانە، حەپس، زیندان، گرتووخانە.

**حەپس کردن** (کتپ) hepis kirdin

بەدیل گرتن، بەندکردن، خستنەزیندانەوە، زیندانیی کردن، گرتن (مرۆڤ).

**حەپسیی** (ن) hepisî

بەندیی، زیندانیی.

**حەپش** (ئان) hepiš

حۆل، گیل، نەزان.

**حەپک** (ن،کی) hepik

ئەستۆ.

**حەپلە حورچ** (ئان) hepile hurç

تۆپەقەپان (مرۆڤ)، کورتە بالای قەلەو.

**حەپوو** (ئان،ئاکە) hepü [1]

تێکرا، گش، گشت، هەموو پێکەوە.

**حەپوو** (ف) hepü [2]

تەواوبوو، نەما(لە زمانی منالاندا).

**حەپوولە** (ئان) hepüle

حەپۆل.

**حەپۆل** (ئان) hepol [1]

بێکارەوگێژ، تەژەی نەفام، حەپوولە، حۆل، هەپۆل.

**حەپۆل** (ئان) hepol [2]

زل، زەلام، گەورە.

**حەپە** (ن) hepe

حەپ، حەپەحەپ، حەوتە حەوت، حەچولوو،گەفە، گەفەگەف، وەڕە، وەڕە وەڕ، سەگ وەڕ، لوورەی سەگ، وەڕەی تێکەڵ وپێکەڵی سەگ.

**حەپەسان** (کتن) hepesan [1]

ئاخاوتنی هیچ وپووچ.

**حەپەسان** (کتن) hepesan [2]

ئەبڵەق بوون، حەپەسیین، ڕامان، سەرسام بوون، سەرسام مان، لەجێی خۆ وشک بوون (کەسێ)، مات بوون، عەبەسان، واق وڕمان.

**حەپەسان** (کتن) hepesan [3]

پەشۆکان، شپرزەبوون، شلەژان.

**حەپەساندن** (کتپ) hepesandin

ئەبڵەق کردن، توشیی سەرسامی کردن، سەرسام کردن، گێژ و مات کردن، هۆش لێ ساندن.

**حەپەساو** (ئان) hepesaw

ئەبڵەق، پەشۆکاو، حەبەساو، حەپەسای، حەپەسیو، سەرسام، سەرسوڕماو، عەبەساو، واق وڕ، واق وڕماو.

**حەپەسێن** (ئان) hepesên

سەرسامیی هاوەر، سەرسوڕهێنەر.

**حەپەکردن** (کتن) hepekirdin

حەپاندن.

**حەپەلۆت** (ن) hepelot

زرمەزلیتانێ، زەیمە زلێ، هەڵبەزودابەز، چەقەو هەرا.

**حەپەنتی** (ن) hepentî

تەژەی پان وپۆڕ.

**حەتا** (پ،نپ،ئاکە) heta

تا، هەتا، هەیا.

**حەتار** (ن) hetar [1]

تیلا، کوتک، کوتەک.

**حەتار** (ن) hetar [2]

دەرمان فرۆش، عەتار.

**حەتر** (ن) hetir

١- عەتر. ٢- تراوی بۆنخۆش.

**حەترەک** (ن) hetrek

بیراز، تەپ، شلەکوت، شلکوت، کاری لێ دان بەتوندیی، گەپچە، مەژەندە.

**حەج** (نچ) hec

چوونەمەکە، سەردانی کابە، سەردانیی مەکە.

**حەجاج** (نک) hecac

حاجیان، ئەوانەوێکرا دەچنەسەردانی کابە.

**حەجامات** (ن،پز) hecamat
حەجام، حەجامەت، کەڵەشاخ.
**حەجاماتکێش** (ن) hecamatkêş
خوێن بەردەر، وەستای خوێن بەردان.
**حەجامات گرتن** (کتپ) hecamat girtin
حەجامات کردن، حەجامەت کردن، حەجام گرتن، خوێن بەردان، خوێن گرتن لەناو شان بەکەڵەشاخ، کەڵەشاخ گرتن.
**حەجاماتگا** (ن) hecamatga
ناوشان.
**حەج کردن** (کتپ) ١ hec kirdin
ماچ کردن، ماچەو کردن، ماچیین.
**حەج کردن** (کتپ) ٢ hec kirdin
چوون بۆ حەج، چوون بۆ مەکە، دیداریی لەکابەکردن، سەردانیی ماڵی خواکردن.
**حەجەم** (نک) ١ hecem
ئێرانی، عەجەم.
**حەجەم** (ن) ٢ hecem
ئێران، عەجەم.
**حەچ** (ن) heç
دارشەقین، داردەستی یاری حەچان، کاشۆ، گۆچانی چەگانبازیی، گۆچانی گەمەی گۆیین.
**حەچان** (ن) heçan
چۆگان بازیی، گۆیین، کاشۆ بازیی، گەمەی گۆو گۆچان، یارییەکی دوو دەستەیییە بەتۆپ وبە(حەچ) دەکرێ (لە شێوەی پۆلۆ یان هۆکی دایە).
**حەچاندن** (کتپ) heçandin
حەپەپێ کردن، دنەدانی سەگ کردن بۆ وەڕیین، هێنانە وەڕیین.
**حەچکۆ** (ناک) heçko
حەچیکە، هەرجۆر، هەر چۆنێک.
**حەچلوور** (ن) ١ heçwlür
حەپە.
**حەچلوور** (ن) ٢ heçwlür
دەنگە دەنگ، ژاوەژاو، قاو وقیژ، هەراوبگر، هەچەلوور.
**حەچلوور کردن** (کتن) heçwlür kirdin
ژاوەژاوکردن، قاووقیژ کردن، هەچو لوورکردن.
**حەچە** (ن،نا) ١ heçe
تکە، تەکە، تەگە، سابرێن، نێریی.

**حەچە** (ئان) ٢ heçe
تیسکن، قژاویی، قژن، مووایی.
**حەچەکردن** (کتن) heçe kirdin
حەپاندن.
**حەچەل** (ن) heçel
بیانوو، تەشقەڵە، دەبە، شلتاخ، شەلتاخ، گەڕ، گێچەڵ.
**حەد** (ن) ١ hed
ئەندازە، بەرەسە، رادە.
**حەد** (ن) ٢ hed
شیان.
**حەد** (نچ) ٣ hed
ماف، هەق.
**حەد** (ن) ٤ hed
سنوور، کەوشەن.
**حەدەف** (ن) hedef
تەپۆلکە، تەپۆکە، تەپۆڵە، حەندەف، گر، گردۆلکە، گردولکە.
**حەڕاج** (ن) herac
مەزات، مەزاد، هەراج.
**حەڕاجخانە** (ن) heracxane
مەزادخانە، هەراج خانە.
**حەڕاج کردن** (کتپ) herac kirdin
خستنە مەزادەوە، شت خستنەڕوو بۆ فرۆشتن لەسەر دەستی دەڵاڵدا، مەزات کردن، مەزاد کردن، هەراج کردن.
**حەڕگ** (ن،کی) herg(ki)
حەڕی.
**حەڕماندن** (کتپ،کی) hermandin
بەخەساردان، بەهەدەردان(هەوڵ یان پارە).
**حەڕمیین** (کتن) ١ hermîn
بێ بەش بوون، بێ بەهرەبوون.
**حەڕمیین** {خوێنی کەسێ} (کتن) ٢ hermîn
بەخەسارچوون، بەفیڕۆچوون.
**حەڕمیین** (کتن) ٣ hermîn
بەخەسارچوون، بەهەدەرچوون.
**حەڕی** (ن،کی) herî
چامۆر، حەڕگ، قوڕ، هەڕی.
**حەرام** (ئان) ١ heram
سوو، سووت، قازانجی ناڕەوا (لەپارە...).
**حەرام** (ئان) ٢ heram
نادروست (لەگەڵ یاسای ئاییندا)، ناڕەوا، نەگونجاو.

**حەرامخۆر** (ن) heramxor
سـووخۆر، سـووتخۆر، کەسێ پـارە بەقـەرز بـدات بەخەڵکی و سوودی لێ وەربگرێ.

**حەرامزادە** (ن،ئان) ١ heramzade
بیـێ، بیـژۆ، بیـژیی، جـاڕوو، حەرامزایـە، حەرومزایـە، زۆڵ، شیر حین، قومەزە.

**حەرامزادە** (ئان) ٢ heramzade
بەدفەڕ، تەڵەکەباز، فێڵباز.

**حەرامزادەیی** (ن) heramzadeyî
بیـژیتیی، جـاڕوویی، زۆڵیـی، قوماربـازیی، قومەزەگیی.

**حەربلیین** (کتن)١ herbilîn
ئاڵۆزان، ئاڵۆزبوون، ئاڵۆزکان، ئاڵۆسکان.

**حەربلیین** (کتن) ٢ herbilîn
گرێ تێ کەوتن، گرێ خواردن.

**حەرسیل** (ن) hersîl
بـەردی بناغـەی گۆشـەی دیـوار، بـەردی سەرسـیلە، حەرسیلە.

**حەرماندن** (کتپ،کی)١ hermandin(ki)
حەرام کردن.

**حەرماندن** (کتپ)٢ hermandin
حەرماندن، حەرمیین، لێ بەریی کردن.

**حەروون** (ئان،کی) herûn(ki)
سرک، سەرکێش، هەروون.

**حەرەم سەرا** (ن) hermsera
ئەندەروون، جێگەو ژووری ژنان لەخانوودا، هندروو.

**حەریر** (ن) herîr
پارچەی ئاوریشم، کوتاڵیی لەهەوریشم دروست کراو.

**حەریف** (ن)١ herîf
هاوپیر، هاوتا، هاولف.

**حەریف** (ن)٢ herîf
هاوقومار، کەسانیی بەرامبەر (لەقوماردا).

**حەریف** (ن)٣ herîf
حەز لێ کردووی ژنی مێردار، دۆست.

**حەز** (ن)١ hez
ئیشتیا، ئیشتیها، حەژ، واز.

**حەز** (ن)٢ hez
ئارەزوو.

**حەز** (ن)٣ hez
ئەوین، دڵداریی.

**حەز** (ن)٤ hez
دۆست، یار، دەنگ.

**حەز** (ئاک)٥ hez
بەردڵ، پەسەند.

**حەز** (ئان)٦ hez
بەدەو، جوان.

**حەز کردن** (کتپ)١ hezkirdin
ئارەزوو کردن.

**حەز کردن** (کتپ)٢ hezkirdin
بەتەمابوون، خوازتن، خواستن.

**حەز لە خۆکردن** (کتن) hez lexo kirdin
زۆر بەخۆداهاتن، زۆر خەریکی خۆ بوون.

**حەز لە خۆکردن** (ئد) hez lexo kirdin
زۆر لەبەرئاوێنـە راوەسـتان، گرفتـاریی خۆشەویستیی خۆبوون لەبەر ئاوێنە.

**حەز لە سەربوون** (کتپ) hez leserbûn
هەڵبژاردن مەندیی.

**حەز لێ کردن** (کتپ)١ hez lê kirdin
ئارەزوومەندی کەسێ کردن، ئاشق بوون، حەز بەپێ گەیشتنی کەسێ کردن، حەژێ کرن، خۆش ویستن.

**حەزلێ کردن** (کتپ)٢ hez lêkirdin
ئارەزووکردن، ئارەزوومەنـدیی شـتێ کـردن، حەزبـە پێ گەیشتنی شتێ کردن، دڵ لـەدووی شـتێ بـوون، قرم لێ خۆش کردن.

**حەزلێ کردن** (کتپ)٣ hez lêkirdin
ئارەزووکردن، بەدڵ بوون،بەدڵداچوون، چوونەدڵەوە، دڵ بۆ چوون.

**حەز لێ کردوویی** (ن) hez lê kirdûyî
ئەڤینیی، دڵداریی، حەزلێکەریی.

**حەز لێ نەکردن** (کتپ) hez lê nekirdin
ئیشتیانەبردن، دڵ بۆ نەچوون، دڵ نەبردن.

**حەز وناحەز** (نک) hezw nahez
دۆست ودوژمن

**حەژدەهیی** (ن،کی)١ hejdehî(ki)
دیـدەنیی، سـەردانیی، دیـداربینیی (بـۆ ماوەیـەکی کەم).

**حەژدەهیی** (ن،کی)٢ hejdehî(ki)
کاتی دیدەنی یەکتر، کاتی کۆبوونەوە.

**حەژدەهیی کرن** (کتپ،کی) hejdehî kirin(ki)
دیداربینیی کردن، دیدەنیی کردن،

**حەژمەت** (ن،کی) hejmet(ki)
خەفەت، خەم، کول، کەسەر، مەینەت.

**حەس** (ن) hes
ئاگا، ئاگاداریی، هەست.

**حەسار** (ن) hesar ١
دیوار.

**حەسار** (ن) hesar ٢
پەرژین.

**حەسار** (ن) hesar ٣
حەوش، گۆڕایی ناوچوار دیوارەی ماڵ.

**حەساندنەوە** (کتپ) hesandinewe ١
حەسانن، لەماندوەتیی ڕزگارکردن، ماندوویەتیی کەسێ بەسەربردن.

**حەساندنەوە** (کتپ) hesandinewe ٢
داکردن، داڵدەپێ دان، داڵدەدان.

**حەساندنەوە** (کتپ) hesandinewe ٣
بێ خەم کردن،خۆش گوزەران کردن، گوزەرانی یەکی خۆش بۆ تەرخان کردن.

**حەساندنەوە** (کتپ) hesandinewe ٤
ئاسوودەکردن، حەسانن، خاتر جەم کردن.

**حەسانەوە** (کتن) hesanewe ١
حەسیان، حەسینەوە، حەوانەوە، حەویینەوە، ژووژیان، ژووژیانەوە، لەماندوەتیی ڕزگاربوون، ماندویەتیی نەمان.

**حەسانەوە** (کتن) hesanewe ٢
حەسیانەوە، ڕۆژانێکی پڕ لەکامەرانیی بردنەسەر، ژیانێکی سانایی بردنەسەر.

**حەساو** (ئان) hesaw ١
حەساوە، وچان گرتوو.

**حەساو** (ئان) hesaw ٢
ئاسوودە، دوور لەماندوویی، سەرەحەت، سەر سووک، وچان گرتوو.

**حەساوگەر** (ن) hesawger
بەخت وێژ، پەنام وێژ، تاڵەگر، تاڵەگیر، ڕازبێژ، ڕاززان، ڕازگۆ، فاڵ گرەوە.

**حەسپن** (ئان) hesipn
دڵدار، شەیدا، شێتی، دڵداریی، شەیبا.

**حەستەم** (ن) hestem ١
دڵدار، شەیدا، کەسێ شەیدای کیژێ بووبێت.

**حەستەم** (ن) hestem ٢
ئەستەمیی، دژواریی، ستەمیی، سەختیی، نارەحەتیی.

**حەستەم** (ئان) hestem ٣
ئەستەم، هەستەم، دژوار، ستەم، سەخت، نارەحەت.

**حەس حەس** (ن) hes hes
ئاردەڵ، پاسەوانی شەو، جەزایرچیی، حەساس، شەوکەر، ئیشکدەری شەوان.

**حەسەد** (ن) hesed
بەخیلیی، حەسوودیی.

**حەسیان** (کتن،کتپ) hesyan
ئاگاداربوون، ئاگالێ بوون، ئاگالێ هەبوون، پێ زانیین، خەوەرداربوون.

**حەسیر** (ن) hesîr
رایەخ (لەپووش یان زەل دروستکراو)، ژێرەخەر (لەجەگەن دروستکراو).

**حەسیرچن** (ن) hesîrçin
حەسیرباف، حەسیر دروستکەر.

**حەسیرمەیدان** (ن) hesîrmeydan
بیراز، شلەکوت، کوتەکە کاریی.

**حەسیرمەیدان کردن** (ئد) hesîr meydan kirdin
بیرازکردن، تێروپڕ لەکەسێ دان، دارکاریی کردن، شلەکوتی مەرگێ کردن.

**حەسیرۆ** (ن) hesîro
خەزوور، خەسوو.

**حەسین** (کتن،کی) hesîn(ki)
ئاگاداربوون، پێ زانیین، هەست پێ کردن.

**حەشاردان** (کتپ) hešardan
بەردخستنەسەر، دیزە بەدەرخۆنەکردن، ساتارکردن، شاردنەوە، ڤەشارتن، وەشارتن،وەشاردن (پەنهانیی..).

**حەشاردراو** (ئان) hešardiraw
شاردراوە، شارراوە، شێراوە، ڤەشارتیی.

**حەشارگە** (ن) hešarge ١
بۆسە، بووسە، پەنا، پەناگە.

**حەشارگە** (ن) hešarge ٢
حاشەر، ڕەبات، ڕەبەت، گەمەکە.

**حەشارگە** (ن) hešarge ٣
حاشارگە، حەوانگە، داڵدە، داڵگە، کولێن، کەلێن.

**حەشامات** (ن) hešamat
ئاپۆرا، ئاپۆرە، عەشامات، قەڵەبالغیی، قەرەبالغیی، کۆمەڵی زۆر لەمەردووم.

**حەشر** (ن) hešir ١
تێکەڵ وپێکەڵیی، هەراو هۆریا.

**حەشر** (ن) hešir ٢
ڕۆژی پسات، ڕۆژی حەشر، ڕۆژی هەڵسانەوە (لەگۆڕ)، سەلا.

**حەشر پێ کردن** (کتپ) hešir pê kirdin
وتەی ناشرین پێ ووتن.

**حەشروحەلا** (ن) heširw hela

چەقەو گوڕە، حەشرەلا، حەشەرەلا، هەراوزەنا، هەراهەرا.

**حەشفاندن** (کتپ،کی)[1] hešfandin(ki)

دەراویتن، دەرهاویشتن، لابردن، لەرێز وەدەرنان.

**حەشفاندن** (کتپ،کی)[2] hešfandin(ki)

دەرکردن، کردنەدەرەوە.

**حەشکاندن** (کتپ) heškandin

گوشیین، ووشیین.

**حەشکۆلە** (ن،نا) heškole

بەچکەورچ، بیچوە ورچ، بیوەڵەورچ.

**حەشمەت** (ن)[1] hešmet

پاشگەزیی، پەژیوانیی، پەشیمانیی، زوڤانیی، پۆشمانیی.

**حەشمەت** (ن)[2] hešmet

تەریقیی، حەشیمەت، چاوبەرەژێریی، چاوشۆڕیی، چاو لەبەریی، شەرمەزاریی.

**حەشەری** (ئان) hešerî

ئالۆشاوی، ئالۆشدار، بەئالۆش، بەجۆش، کێرخۆر، خونکە.

**حەشیشە** (ن،رو) hešîše

برش، بەنگ، چەرس، حەشیش.

**حەشیڤاندن** (کتپ،کی) hešîvandin(ki)

نوسیین، نویسان، نڤیسیین، نویسیین.

**حەف** (ئان) hef

بۆگەن، بۆگەنیو، بۆگەندیی، بیگەن، گەن، گەند، گەنیی، گەنیو.

**حەفتانە** (ن) heftane

بەحەوت ڕۆژ جارێک..

**حەفتاو کردن** (کتپ) heftaw kirdin

بەحەوت ئاو شتنەوە، حەوتاو کردن، گلاودەرکردن (بەجارێک قوڕ وشەش جار ئاو).

**حەفت ڕەنگ** (ئان)[1] heftreng

دووڕوو، دوو ڕەنگ، ڕووبین.

**حەفت ڕەنگ** (ن)[2] heftreng

مەخمەری ڕێ ڕێ.

**حەفتە** (ن) hefte

حەفتیی، حەوت ڕۆژ، حەوتە، هەفتە، لەشەمەوە تاهەینی.

**حەف حەفی** (ن) hef hefî

زۆر خۆریی بەلەزخۆر، زۆرخۆری هەلپەکەر.

**حەفک** (ن،کی) hefik(ki)

ئەوک، قورگ، گەروو.

**حەفیان** (ئان) hefyan

تیرنەخۆر، زۆرخۆر، فرەخۆر.

**حەق** (ن)[1] heq

کرێ، من، مزە.

**حەق** (ن)[2] heq

بەها، قیمەت، نرخ.

**حەق** (ن)[3] heq

بیرە، بەرامبەر، لەراست(وی)، لەبارەی(ویدا)، لەمەڕ.

**حەق** (ن)[4] heq

دروستیی، راستیی.

**حەق** (ن)[5] heq

پیوەندیی، پەیوەندیی.

**حەق** (ن)[6] heq

خودا، خوا، یەزدان.

**حەق** (ن)[7] heq

جەنگە، هەڕەت، تاف، گۆنەر، گۆنەل.

**حەق ئاو رادەوەستێنێ** (رس) heq aw radewesatênê

ماف (ژێر) ئاو ناکەوێ.

**حەقانیی {مروڤ}** (ئان) heqanî

دروست، راست.

**حەقایەت** (ن) heqayet

چیرۆک، حەکایەت، حیکایەت، سەربهور، سەربوردە.

**حەق بڵێ** (ئان) heqblê

راست بێژ، راست گۆ.

**حەق بەحەق** (ف) heq be heq

واز لەشەڕ هێنان لەبەر ئەوەی تۆڵەی هەڵیەک کراوەتەوە.

**حەق بەحەق کردنەوە** (ند) heq be heq kirdinewe

حەق لێ کردنەوە، خراپەکردن بەرامبەر کەسێ خراپەی بەرامبەرت کردبێ.

**حەق حەقکەرە** (ن،م) heq heqkere

تاقتاقکەرە، توتاکە، قڕاوکە.

**حەق ساندنەوە** (کتپ) heq sandinewe

تۆڵەساندن، حەق سەندنەوە، حەق کردنەوە، حەیف هەلانیین، ماف سەندنەوە.

**حەق سەندنەوە** (کتپ) heq sendinewe

حەق ساندنەوە.

**حەق کردنەوە** (کتپ) heq kirdinewe
قەرەبودان.

**حەق وەسێن** (ن) heq wesên
تۆڵەکەرەوە، ماف وەسێن.

**حەکایەت** (ن) hekayet
حەقایەت.

**حەکیم** (ن) hekîm
پزیشک، دوکتۆر.

**حەل** (ئان) ¹ hel
دروست، ڕاست.

**حەل** (ئان) ² hel
شیاو.

**حەل** (ن) ³ hel
دەم، کات، گاڤ، گاو.

**حەلامەت** (ئان) helamet
سەیر، عەجایب.

**حەلان** (ن) ¹ helan
تاوێر، جالە.

**حەلان** (کتن) ² helan
حەل بوون،

**حەلاندن** (کتپ،کی) ¹ helandin(ki)
تاواندنەوە، تواندنەوە، حەل کردن.

**حەلاندن** (کتپ،کی) ² helandin(ki)
گرفتارکردن (دلدار)، گیرۆدەبوون.

**حەل بوون** (کتن) ¹ helabûn
جێ بەجێ بوون.

**حەل بوون** (کتن) ² helabûn
تاوانەوە، توانەوە، حەلان، حەلیین (دوای بەستن).

**حەلک** (ن) helik
ئاخاوتنی خۆش، گوفتار یان بێژەی خۆش، وتەی شیرین.

**حەلکی** (ئان) ¹ helkî
بایەخ پێکراو، جێی بڕوا.

**حەلکی** (ئان) ² helkî
بەنرخ ، هێژا.

**حەللەق ومەللەق** (ئان) helleqw melleq
بێ بایەخ، هیچ وپووچ (ئاخاوتن).

**حەللە لا!** (نسپ) helle la!
پەکوو!، تەحا!، چەندسەیرە!، زۆرسەیرە!، پەخ!، پەح!، پەحا!.

**حەلوەلا** (ن) helwela
پەلەپەل، پەلەپچرکێ، پەلەپروزکێ، پەلەپروزێ.

**حەلالخۆر** (ئان) helalxor
بەرتیل نەخۆر.

**حەلالزا** (ن،ئان) helalza
حەلاڵزادە (منداڵ).

**حەلال** (ئان،ن) ¹ helal
ڕەوا، گونجاو لەگەڵ یاسای ئایندا.

**حەلال** (ن،ئان) ² helal
ژنی مارەکراو، ژنی حەلاڵ، ژنی شەرعیی.

**حەلقە** (ن) helqe
ئالقە، گەو.

**حەلقە بەگۆش** (ن) helqe beqoš
ئەلقە لەگوێ.

**حەلقەدان** (کتن،کتپ) ¹ helqedan
ئەلقەبەستن، ئەلقەگرتن، بەدەوری یەکترەوە دانیشتن، بەکەوانەیی تەواو دانیشتن، بەگردی دانیشتن.

**حەلقەدان** (کتن) ² helqedan
پێچ خواردن، خۆلوول کردن.

**حەلقەدان** (کتپ) ³ helqedan
دەورلێ دان.

**حەلوا** (ن) ¹ helwa
ئاوار، شیرینیی، هەلوا، هەلیل.

**حەلوا** (ن) ² helwa
ئاردە پێچ، گالگالیی، گەرگەریی.

**حەلواچی** (ن) helwaçî
حەلوا فرۆش، شیرینی فرۆش، قەناتی، قەنادی.

**حەلوای گەزۆ** (ن) helwaî gezo
شیرینیی گەزۆ.

**حەمال** (ن) ¹ hemal
باربەر، بارکێش، بارهەڵگر، حەمبال، عەنبال، کۆڵ بەر، کۆڵکێش.

**حەمال** (ن) ² hemal
ئەستوون، ئەستووندوکە، حەنبال، ستون، کۆڵەکە.

**حەمام** (ن) hemam
حومام، گەرماو، گەرماوە.

**حەمامچی** (ن) ¹ hemamçî
خاوەنی گەرماو.

**حەمامچی** (ن) ² hemamçî
بەڕێوەبەری حەمام.

**حەمام کردن** (کتن،کتپ) ¹ hemamkirdin
چوونەحەمام خۆشتن لەگەرماودا.

**حەمام کردن** (کتپ) hemam kirdin ¹
خۆشتن بەئاو، خۆشتن لەناو ئاودا.

**حەمام کردن** (کتپ) hemam kirdin ²
گەرماو دروست کردن، حومام بیناکردن.

**حەمایەت** (ئان) hemayet
رام، کەدیی، کەویی، ماڵیی.

**حەمایەڵ** (ن) hemayel
پشتێنی راست وچەپی شان.

**حەمبار** (ن) hembar
ئەمبار، ئەنبار، عەمار، عەنبار.

**حەمبارەپۆ** (ن) hembarepo
عەمارەپۆ، کوتاڵی رزیو لە عەماردا.

**حەمتر** (ن.نا) hemtir
کەرەبزن، کەری بچکۆلەی بەکار، گوێ درێژی چکۆڵەی بەکار.

**حەمتەر** (ن.نا) hemter
عەنتەر، فلفل، قون سوور، مەیمونی لۆتی.

**حەم حەم** (ن.جج) hem hem
جوجە، چنگنە.

**حەمد** (ن) hemid
ئاگایی، قەست.

**حەمکە** (ئاک) hemke
ئەندازەیەکی زۆر.

**حەمل کردن** (کتن) hemilkirdin
رابواردن، کات بردنەسەر.

**حەموو** (ئاک) hemü
حەمکە، حەمیی، سەرپاک، گش، گشت، هەموو، هەمیی.

**حەمەرەفری** (ن) heme refrê
بەربەرەکانیی، رقە بەرقە، رقەبەرێ، رک بەرکێ، مل ملانێ.

**حەن** (ن) hen ¹
ئاست، جێگە، جانا، جاند، حەنا، شوێن، عاست.

**حەن** (ن) hen ²
سنوور.

**حەنتیکە** (ئان) hentîke ¹
ئەنتیکە، زۆرسەیر.

**حەنتیکە** (نک) hentîke ²
شتی زۆر لەمێژین، عەنتیکە.

**حەنتیکە** (ئان) hentîke ³
بەنرخ ، پر بەها.

**حەنتیکەخانە** (ن) hentîkexane
کەونارخانە، مۆزە، مۆزەخانە، جێگای رانانی شتی زۆر بەنرخ و کەونار.

**حەنجەت** (ن) henjet
بەهانە، بیانوو، پەلپ.

**حەندەرحوو** (ن) henderhü
جیجلقانە، حندرحو، سیسق، هیلاهۆب.

**حەندەکوو** (ن.رو) henekü
وینجە.

**حەنگرین** (کتن) hengirîn
بەرقداچوون، دەرکەوە چوون.

**حەنەک** (ن) henek
جەفەنگ، سوعبەت، گاڵتەو پێکەنین، گاڵتەو گەپ.

**حەنەکچی** (ن) henekçî
سوعبەتچی، قسەسەیر، قسەخۆش، گاڵتەچی.

**حەنو** (ن) henw
ب (حەپە).

**حەوا** (ن) hewa ¹
بلندایی، بەرزایی، بەرزیی.

**حەوا** (ن) hewa ²
ب (ئاسمان).

**حەوادان** (کتپ) hewadan
بەرەو ژوور هاویشتن، پەرت کردن، توردان، حەوانجەدان، فرێدان، هەوادان.

**حەوار** (ن) hewar
حەواریی، گاز، گازیی، هاوار.

**حەواق** (ن) hewaq
بلندیی، بەرزیی، حەویق (بەرەو ئاسمان).

**حەواڵە** (ن) hewale
پسووڵەی پارەناردن یان وەرگرتن لەپۆستە یان لە بانق.

**حەواڵە بەگەواڵە کردن** (ئد) hewale begewale kirdin
ئەمرۆ بەسبەی کردن، ئەمڕۆو سبەی پێ کردن، پێچ و پەناپێ کردن، تەفرەدان، دەستی بەدەستی پێکردن، هەڵ خەڵەتاندن، هێنان وبردن و ماندوو کردن (کەسێ بەکاریکەوە بەفرت وفێل).

**حەواڵە کردن** (کتپ) hewale kirdin
پێ سپاردن، سپاردن.

**حەواڵەی سەرخەرمانە** (رس) hewaley ser xermane
مەبەست پەیمانی درۆیەکە بدرێ بەخاوەن قەرز.

**حەوان** (کتن) hewn
ب (حاوانەوە).
**حەوانچە** (ئان) hewnçe
فڕێ دراو، هاوێژراو.
**حەوانچەدان** (کتپ) hewnçedan
بەرەو ژوور هاویشتن، حەوادان.
**حەواندنەوە** (کتپ) hewndinewe 1
حاواندنەوە، حەساندنەوە، حەساننەوە، حەواننەوە.
**حەواندنەوە** (کتپ) hewndinewe 2
ئەمۆن کردنەوە، هێدی کردنەوە.
**حەوانن** (کتپ) hewanin 1
بایەخ پێ دان، ڕێز لێ گرتن، قەدر گرتن.
**حەوانن** (ئد) hewanin 2
ئاگاداریی کردن ولای خۆ ڕاگرتن.
**حەوانەوە** (کتن) hewanewe 1
ب (حەسانەوە).
**حەوانەوە** (کتپ) hewanewe 2
ژیان بەئاسوودەیی بردنەسەر.
**حەوانەوە** (ئد) hewanewe 3
جێ بوونەوە (لەشوێنێکا) بوتێدا ژیان، شوێنی ژیان بردنە سەر هەبوون.
**حەواوێلکە** (ئان) hewawîlke
بەحەوادا فڕێ دراو، حەوانچە،
حەواویی، هاوێژراو، هەڵدراو بەرەو حەوا، هەوادراو بەرەو ئاسمان.
**حەواوێلکەیی** (ئان) hewawîlkeyî
ئاسمانیی، حەوانچەیی.
**حەواویی** (ئان) hewawî 1
گێژ، وڕ، هێر.
**حەواویی** (ئان) hewawî 2
چاو لەحەوا، حەوایی، کەسێ کەهەمیشە سەرەو ژوور بڕوانێ.
**حەوایی** (ئان) hewayî 3
ئاسمانیی، هەوایی.
**حەوبرا** (ن.ئس) hewbira
ب (حەوتەوانە).
**حەوبراڵە** (ن.ئس) hewbirale
ب (حەوتەوانە).
**حەوتانە** (ئان) hewtane
حەفتەیی، هەفتانە، حەوتەیی.
**حەوت برا** (خ.) hewt bira 1
حەوبرا، خۆشەویست، لەجێی حەوت برا (کەسێ).

**حەوت برا** (ن.ئس) hewtbira 2
ب (حەوتەوانە).
**حەوتە** (ن) hewte
مانەوەی بووک یا زەیستان بۆماوەی حەفتەیەک لەماڵەوە...
**حەوتەوانە** (ن.ئس) hewtewanr
تەرم، حەوبرا، حەوت برا، حەوت براڵە، حەفتەوانان، حەفتەوانە، حەوتەوانەی گەورە.
**حەوج** (ن) hewc
حەوجە.
**حەوجۆش** (ن) hewcoš 1
حەفجۆش، حەفتجۆش، مەفرەق.
**حەوجۆش** (ن) hewcoš 2
ب (ئافتاوە).
**حەوز** (ن) hewz
ئاوگا، ئاوگیر، ئاوبەرک، بەرک، جێی ئاو، چاڵاو، قووڵکەی ئاو.
**حەوسەلە** (ن) hewsele
پشوو، پەروا، تاو، توانا، سەبر، لەسەرخۆیی.
**حەوش** (ن) hewš
دەوروبەری ماڵ.
**حەوشە** (ن) hewše 1
حەسار، حەوش، حەوشێ، هەفشێ.
**حەوشە** (ن) hewše 2
خانوو، ماڵ.
**حەوشە** (ن) hewše 3
جێ شوێنی ئاژەڵ، شەوگا.
**حەوق** (ن) hewq 1
پلە، پلیکە، پێ پلیکانە.
**حەوق** (ن) hewq 2
بێ دەرەتانیی، گرفتاریی، گیرۆدەیی.
**حەوڵ** (ن) hewl
تەقەلا، کۆشش، کۆششت، هەوڵ.
**حەووا** (ن) hewa
خێزانی بابە ئادەم، دایەحەوا.
**حەوێق** (ن) hewêq 1
بەرزایی ئاسمان.
**حەوێق** (ئان) hewêq 2
هەرە بەرز.
**حەوێنجی** (ن) hewêncî
گون، گونەوێلە.

**حەیا** (نپ.ناک) heya ١
تا، تاکو، تاوەکو، هەتا، هەتاکو.
**حەیا** (ن) heya ٢
ئینیی، ڕوو سپیتیی، ڕوو سووریی، شووورەیی، شەرم، ناموس، فەوین، فهیت.
**حەیابردن** (کتپ) heya birdin
ئەتک کردن.
**حەیابەرە** (ئان) heyabere
ئابڕووبەرە.
**حەیات** (ن) heyat ١
ژیان، هەناسەی ژیان.
**حەیات** (ئان) heyat ٢
خۆش، دڵگر.
**حەیاتکان** (کتن) heyatikan
ئابڕوونەمان، بێ شەرم بوون، حەیاچوون.
**حەیاچوو** (ئان) heyaçû
حەیاتکاو.
**حەیاچوون** (کتن) heyaçûn
ئابڕوونەمان، ئابڕووچوون، حەیاتکان، حەیانەمان.
**حەیادار** (ئان) heyadar
بەحەیا.
**حەیاکردن** (کتن) heyakirdin
بەشەرم و شکۆ بوون.
**حەیام** (ن) heyam
دەورزەمانە، ڕۆژگار، عەیام.
**حەیان** (ئان) heyn
زانراو، عەیان.
**حەیب** (ن) heyb ١
شوورەیی.
**حەیب** (ن) heyb ٢
کەمایەسیی، ناتەواویی.
**حەیبدار** (ئان) heybdar
زەدەدار، ناتەواو، عەیبدار.
**حەیبەت** (ن) heybet
ترس، سام، مەترسیی.
**حەیتە** (ن) heyte ١
پاکورە، خزمەتکار (پیاو لەناو ماڵدا).
**حەیتە** (ئان) heyte ٢
زرتەبۆر، زلحۆرت.
**حەیتە** (ئان) heyte ٣
بەرەڵا، خوێڕی، سەرسەری.

**حەیچە** (ن) heyçe
حەیتە، حەیشە، دادوفوغان، دادوهاوار، گریان وهاوار هاواروداد.
**حەیران** (ن) heyran
حەیرانۆکێ، حەیرانە، داستان.
**حەیز** (ن) heyz
خوێن ڕێژیی مانگانەی ئافرەت، بێ نوێژیی ئافرەت، عوزر، عادەت.
**حەیزە** (ن.پز) heyze ١
ئاوبەند.
**حەیزە** (ن.پز) heyze ٢
هێلنج، یەق.
**حەیزەبوون** (کتن) heyzebûn ١
ڕەوان بوون، زگ چوون، سک چوون، عەمەل کردن.
**حەیزەبوون** (ن) heyzebûn ٢
پیرەژنی فێلباز، پیرەژنی سەرئاسنینە.
**حەیزەران** (ن.ڕو) heyzeran
ئارج.
**حەیش** (ن) heyš ١
خۆش گوزەرانیی، ژیانی خۆش.
**حەیش** (ن) heyš ٢
ژین.
**حەیشۆ** (ن) heyšo ١
ئابڕوو، شکۆ، شەرم، شوورەیی.
**حەیشۆ** (ن) heyšo ٢
بێ ئابڕوویی، بێ شکۆیی، بێ شەرمیی، شوورەیی.
**حەیشۆ بردن** (کتپ) heyšobirdin
ب (ئابڕووبردن).
**حەیشۆ لێ هەڵگیران** (کتن) heyšo lê helgîran
ب (ئابڕووچوون).
**حەیف** (ن) heyf ١
خەفەت، خەم، داخ.
**حەیف** (ن) heyf ٢
ڕووداویی ناهەموار، ڕووداو و هەڵوێستیی پڕ لە پەشیمانیی.
**حەیف** (ن) heyf ٣
ستەم، تۆڵە.
**حەیف** (ن) heyf ٤
تۆڵ، تۆڵە.
**حەیفا!** (نسپ) heyf! ٥
بەداخەوە!، حەیفێ!، حەیفێکم!، داخم ناچێ!، مەخابن!.

**حەیفێ!** (نسپ) heyfê!
ب (حەیف).

**حەین** (ئان) heyn
تەواو لەوێنەی، هەروەک.

**حەینە!** (نسپ) heyne!
بێدەنگێ!، وس!، دەم داخە.

**حەیهوو!** (نسپ) heyhü
تۆلەکوێی!، چۆن پێکە دێت!.

**حیجران** (ن) hîcran
بەلا، چورتم، دەرد، ناخۆشیی.

**حیچ** (ئان) hîç
بـەرەلا، بەلەســە، ســەرکێش، ســل، شـێتکێربوو، هارودین، یاخیی (ئەسپ).

**حیچ بوون** (کتن) hîçbün
بەرەلابوون، بەلەسەبوون، هەڵتیزان، یاخیی بوون (ئەسپ..).

**حیرس** (ن) hîrs
تووڕەیی، ڕق، ڕک، قەلسی.

**حیز(پیاو)** (ن) [1] hîz(piyaw)
بێ ڕەگ، پیاوبەسەر خۆدا کێش، چەماو، دوودەکی، شلەژە، قنگدەر، قوندەر، گاندەر، نامەرد.

**حیز(ئافرەت)** (ن) [2] hîz(afret)
بەرگەرم، خونەک، سووک وچرووک، کوزدەر.

**حیز** (ئان) [3] hîz
بێ دەسەلات، گەمژ، گەمژە، هیچ لەدەست نەهاتوو.

**حیزانە** (ئان،ئاک) [1] hîzane
ترسەنۆکانە، ترسنۆکانە.

**حیزانە** (ئاک،ئان) [2] hîzane
خوێڕیانە، ناپیاوانە، نامەردانە.

**حیزبگیر** (ن) hîzbigîr
بێ ئاکاریی نهێنی، دزە خورجەی نامەردانە.

**حیزکردن** (کتپ) hîzkirdin
چاو پێ شۆڕ کردن، حیزەڵە کردن.

**حیز بخۆیی** (ئان) hîzbixoyî
هامە یاریی دوژمن.

**حیزەڵ** (ئان) hîzel
بوودەڵــە، بــێ دەســەلات، ترسـنۆک، ترســەنۆک، حیزەڵ، هیچ لەباردانەبوو.

**حیزی حیزان** (ئان) hîzî hîzan
لەترسنۆک ترسنۆکتر.

**حیزیتی** (ن) [1] hîzêtî
حیزاتی، حیزایەتی، حیزیەتی، حیزی.

**حیزیتی** (ن) [2] hîzêtî
ترسـنۆکیی، ترســونۆکی، ترســەنۆکیی، ناپــیاویی، نامەردیی.

**حیسابگەر** (ن) [1] hîsabger
ئەستێرەناس، نجوومگەر.

**حیسابگەر** (ن) [2] hîsabger
فالچیی، فالگر.

**حیسابگەر** (ن) [3] hîsabger
پسپۆر لەژمارەدا.

**حیسابگەری** (ن) [1] hîsabgerî
ئەستێرەناسی، نجوومگەری.

**حیسابگەری** (ن) [2] hîsabgerî
فالچیتی، فالگری.

**حیشک** (ئان،کی) hîšik(ki)
ئیشک، زوها، وشک.

**حیشک بوون** (ئان،کی) hîšikbün(ki)
ئیشک بوون، زوهابوون، وشک بوون.

**حیشک کردن** (کتپ) hîšik kirdin
تـەرایی تێدانەهێـشتن، ئیـشک کـردن، زوهـا کـردن، وشک کردن.

**حیکایەت** (ن) hîkayet
ب (حەقایەت).

**حیلک وهوور** (ن) hîlkwhür
حیلکەحیلک، حیلکە هوور، تریقە، خەنیینی زۆر و بە دەنگـی بـەرز، قاقـا، گـارەی پـێکەنیین، هـاڕەی - پێکەنیین.

**حیلکە کردن** (کتن) hîlke kirdin
بــەدەنگی بــەرز خــەنیین، بــەقاقا پــێکەنیین، حیلکانــەوە، خــەنیین بــەدەنگی بــەرز، دانــەقاقای پـێکەنیین، دانـە هـاڕەی پـێکەنیین، کـەن بـەدەنگی بەقەو.

**حیلکە حیلک** (ن) hîlke hîlk
ب (حیلک وهوور).

**حیلە** (ن) [1] hîle
ئەروەندە.

**حیلە** (ن) [2] hîle
حرحــر، دەنگیئەســپ ومــاین و جوانــوو، حینــە، حیلەحیل.

**حیلە حیل کردن** (کتن) hîle hîlkirdin
حرحرکردن، حینەکردن، دانەحیلە.

**حیلە و حەوالە** (ن) [1] hîlew hewale
ئاین وئۆین، ساختەچیتیی، فروفێل، فێلبازیی، فێل و

فەرەج، فێڵ وفەنگ.

**حیلەو حەواڵە** (ن)[٢] hîlewhewale

ئەفسوون.

**حیلەو حەواڵەکردن** (کتپ) hîlew hewale kirdin

دەست بڕیین، ساختەچێتیی کردن، ساختەکردن، فڕوفێڵ کردن، فێڵبازیی کردن، فێڵ و فەرەج کردن.

**حیمی** (ئان) hîmî

پواو، داڕزاو (جلو بەرگ...)، شڕو وڕ، شڕو پڕ.

**حیناوە** (ن) hînawe

چنەدرازیی، چەنەچەن، چەنە هەراشیی، چەوچەو کەریی، چیرەدرێژیی، درێژدادڕیی، دەم هەراشیی، دەمە وەریی، هەڵەوەڕیی، هەڵیت وێژیی.

**حینجە** (ن) hînce

حونجە.

**حینجەت** (ن) hîncet

بەهانە، بیانوو، بیانگە، پەڵپ.

**حینجەکردن** (کتپ) hînce kirdin

حونجەکردن.

**حێ** (ن) hê

ناوی پیتی (ح)یە.

**حێجز** (ن) hêciz

جاڕس، نارەحەت، وەڕز، وەڕەز.

**حێدز** (ئان) hêdiz

تووڕە.

**حێز** (ن) hêz

حورمەت، ڕێز، قەدر.

**حێق** (ن) hêq

،هێلنج، یەق.

**حێق دان** (کتن) hêqdan

هێلنج دان، یەق دان.

**حێل** (ن،رو) hêl

حل، هێل، تۆوی ڕووەکێکی بەهاراتی بۆن خۆشە لە خێزانی زەنجەفیل.

**حێلم** (ن) hêlm

برەی مافوور.

**حێوەت** (ن) hêwet

ترس، سام، حەیوەت، حەیبەت.

**End of letter - H -** کۆتایی پیتی - ح

- خ -

- X -

**خ، خـ {خا،خێ}** (ن) x
ناوە بۆ هەشتەم پیت لەوئەلف وبێیەی ئێستا زمانی کوردی پێدەنوسرێت.

**خا** (ن،کل) ١ xa(kl)
مێک، مێلکە، خایە (پێتینراو).

**خا** (ن) ٢ xa
خایە، تۆوی مێینە.

**خا** (نک) ٣ xa
مێلکەی گوێ.

**خا** (ئان) ٤ xa
پیرۆز، خاوێن، پاکژ (ئاینیی).

**خاپ** (ن) xap
حیلە، فریو، فەن، فەند، فێل، گزی.

**خاپان** (ن) xapan
فریوخواردن، خەڵەتان.

**خاپاندن** (کتپ) xapandin
تەفردان، فریودان، خەڵەتاندن، لەخشتەبردن، هەڵ فریواندن.

**خاپاندی** (ئان) xapandî
تەفرەدراو، خەڵەتاو، لەخشتەبراو، هەڵ خەڵەتاو.

**خاپور** (ن) ١ xapaür
داروخاویی، وێرانە.

**خاپور** (ئان) ٢ xapaür
کاول، وێران.

**خاپوربوون** (کتن) xapaürbûn
ژێرەو ژووربوون، کاول بوون، کەمباخ بوون، وێران بوون.

**خاپورکردن** (کتپ) xapaür kirdin
داروخاندن، رماندن، ژێرە ژوورکردن، سەرەو ژێرکردن، کاول کردن، کەمباخ کردن، وێران کردن.

**خاپورەولات** (ن) xapaüre wulat
ولاتی وێران بووی کەس تێدانەماو.

**خاپەرۆک** (ن) ١ xaperok
تەتەڵە، کاری دەغل بەباکردن.

**خاپەرۆک** (نک) ٢ xaperok
پاشەرۆک، پاشارۆ.

**خاپەرۆک کردن** (کتپ) xaperok kirdin
تەتەڵەکردن، بەبا کردن (دەغل کەلەخۆڵ پاک بێتەوە).

**خاپینۆک** (ئان) xapînok
حیلەباز، فریوباز، فێلاویی، گزەون.

**خاپێن** (ن) xapên
حیلەکەر، فریودەر، دەستبڕ، دەسبڕ، هەڵخەڵەتێن.

**خاتر** (ن) ١ xatir
پایە، چاوەدێریی هەستی خەڵک، خۆشەویستیی، رێز.

**خاتر** (ن) ٢ xatir
لەبەر، بۆ رێز لە...

**خاترانە** (نک) xatirane
پاداش، خاترخۆیی، خاترو خۆتر، زیادە، سەربارە، لەبەردۆستایەتی...، کردنی کارێک بەهۆی دۆستایەتی و خۆشەویستیی کەسێکەوە.

**خاترجەم** (ئان) xatircem
ئارخەیان، ئاسودە، بێ خەم، بێ ترس ودوو دڵیی، دڵ ئاسودە، دڵنیا.

**خاترجەم بوون** (کتن) xatircembûn
ئاسودەبوون، بێ خەم بوون، پشت لێ کردنەوە،دڵ ئاسودەبوون، دڵنیابوون.

**خاترخوا** (ئان) xatirxwa
ئاشق، ئەویندار.

**خاترخوازیی** (نک) xatirxwazî
خاترخازیی، خواحافیزیی، ماڵاوایی(لەوانەی کە دانیشتوون).

**خاترخۆیی** (ن) xatirxoyî
سەرپشکی، سەربەشی، هەڵبژێری.

**خاترگرتن** (کتپ) xatirgirtin
خاتر خستن، خاتر خۆیی کردن.

**خاترگرتن** (کتپ) xatirgirtin
رێز لێ گرتن.

**خاترلێ کردن** (کتپ) xatir lê kirdin
تکالێ کردن.

**خاترناس** (ئان) ١ xatirnas
رێزگر، قەدرگر (لەپێویستیی خەڵک).

**خاترناس** (ئان) ٢ xatirnas
گوێ بەخەڵک دەر.

**خاتروخۆتر** (ن) ١ xatirwxotir
ب (خاترانە).

**خاترو خوتر** (ن) xatirwxotir [2]
کەین وبەین، لاگیریی لەیەکتر.
**خاتری تە!** (نسپ،کی) xatirî!(ki)
خواحافیز!، خوداحافیز!.
**خاتوون** (ن) xatûn [1]
خا، خات، خاتوو، خاد، خان، خانم، پای.
**خاتوون** (ن) xatûn [2]
خانم خاس.
**خاتە** (ن) xate
خاتێ، کەیبانوو، کەیوانوو، ژنی ماڵ، ماڵ بەڕێوەبەر (ژن).
**خاتێ** (ن) xatê
پوور، خاڵەت، خوشکی دایک.
**خاجە** (ن) xace
بازرگانی گەورە، خواجا، خواجە.
**خاچ** (ن) xaç [1]
چەلیپ، چەلیپا، سەلیب.
**خاچ** (ئاک،ئان) xaç [2]
ڕاست وبێ ڕاوەستان.
**خاچ پەرست** (ن،ئان) xaç perist
خاچ پەرس، خاچ پەرەس، خرستیان، عیساپەرست، عیسایی، عیسەویی، مەسیحیی، فەلە، فەڵە، فلە، دیان، دییان.
**خاچرکان** (ن) xaçirkan
خاجرکان، سێپا، سێ کوچکە، سێ کوچکەی ئاگر.
**خاچواریی** (ن،ئاک،ئان) xaçwarî
بەشێوەی هێڵ بڕیی، لەشێوەی هێڵ بڕیندا.
**خاخ** (نک) xax
بەسەرهات، چورتم، سەرپێهاتیی گران.
**خار** (ن) xar [1]
ڕەلم، ڕەمڵ، ڕیگ، زیخی ورد، قوم، لم.
**خار** (ن) xar [2]
ئەشکەوت، جەرد، زاخۆر، شکەفت، غار، موغارە، مەرە، هاڵ.
**خار** (ن) xar [3]
تیغ، دڕک، دڕو، ستری، چقڵ.
**خار** (ن) xar [4]
زەویی زۆر سەخت وبەردەڵان.
**خار** (ئان) xar [5]
دەرهاتوو(بۆ کار)، ڕاهاتوو (لەئیش وکاردا)، ڕەنیوهاتوو، قاڵ بوو (کەسێ)، خاران، خاراو.

**خارا** (ن،کل) xara(kl) [1]
تافتە، غارا، ئاوریشمی کارگەیی.
**خارا** (ن) xara [2]
شوێن ڕەوگە، شوێنی ڕەنیو هێنانی وڵاخی بەرزە.
**خارا** (ئان) xara [3]
ئامادە، بەردەست (بۆ بەکارهێنان)، دەردەست، بۆ کار ئامادەبوو.
**خارا** (ن) xara [4]
بەردی ڕەق.
**خاران** (نک) xaran [1]
گـوزەو دیـزەی سـوورەوە کـراو، نیربـاری سوورەوەکراو، قوڕی سوورەوەکراو، خاراو.
**خاران** (کتن) xaran [2]
خاریین، ڕاهاتن لەکار، ڕەنیوهاتن، قاڵ بوون، لە کار دەرهاتن. کار دەرهاتن.
**خاراندن** (کتپ) xarandin [1]
پوختەکردن، خاریین، خۆش کردن (چەرمی ئاژەڵ).
**خاراندن** (کتپ) xarandin [2]
سوورەوەکردن (لەناوکلدا)، هەوڕ سوورەوە کردن، سوورکردنەوە. سوورکردنەوە.
**خاراندن** (کتپ) xarandin [3]
ڕام کردن، ڕاهێنان.
**خاراو** (ئان) xaraw [1]
پوختە، پوختەبوو، خاریو، دنیادیدە، دەرهاتوو، قاڵ بوو.
**خاراو** (ئان) xaraw [2]
پوختەکراو، خاریو، خۆش کراو(چەرم).
**خاراو** (ئان) xaraw [3]
ڕام، ڕام بوو، ڕاهاتوو.
**خاراو** (ن) xaraw [4]
ئاوەسوو (پێستە)، چەرمی خۆش نەکراو، چەرمی دەباغ نەکراو.
**خارچک** (ن،ڕو،کل) xarçik(kl)
خارچک، قارچک، کارگ، کوارگ.
**خارچک تەقیلە** (ن،ڕو،کل) xarçik teqîle(kl)
قارچکەتەقیلە،
قارچکی کڵاودار.
**خارچک جۆیینە** (ن،ڕو،کل) xarçik coyîne(kl)
قارچکە جۆیینە.
**خارچک سەگانە** (ن،ڕو) xarçik segane
قارچکە سەگانە.

خارچکه گه نمینه (ن.رو.کل) xarçik genmîne(kl)
قارچکه گەنمینە.
خارچگین (ن) xarçgîn
قارچکزار، قارچگین.
خارخار (ئان) xarxar[1]
شەقار شەقار، لەت لەت.
خارخار (ئان) xarxar[2]
بریندار، زامدار (بەهەندیّ چەک).
خارخارین (ن) xarxarên
پیشبرکیّ بەئەسپ، غارغارین، گریوەغار.
خارخەسک (ن.رو.لو) xarxesik(lu)
پیکول، پەیکول، خارخەسەک.
خاردار (ئان.لو) xardar(lu)
بەچقل، چقلدار، درکاویی، درکدار، دڕاویی.
خاردان (کتن) xardan[1]
راکردن، هەڕاکردن.
خاردان (ئد) xardan[2]
پەلەکردن لەئیش وکاردا.
خاردان (کتن) xardan[3]
غاردان، غارکردن، داکردنە غار (ئەسپ).
خاردان (کتپ) xardan[4]
غاریێ کردن، وەغار خستن (ئەسپ).
خارز (ن) xazir
(چیشتی میوانیی کەلەئاردو رۆن دەیکەن: جاری وا هەیە ئەیدەن بە زەیستان)، هەرمیشک، هەوریشک.
خارسک (ن) xarisk
ژنە خرستیان، ژنە فەلە.
خارشت (ن.لو) xarišt(lu)
ئالۆش، خارش، خروو، خورووی لەش.
خارکیش (ن) xarkêš
دارفرۆش، دارکێوەکەر (بۆ مەبەستی فرۆشتن).
خارو خاشاک (نک) xarw xašak
ب (پووش وپەلاش).
خاروف (ن) xarüf[1]
کووپەی دەم پەل، کووپەی دەم گوشاد.
خاروف (ن) xarüf[2]
گلینە.
خاروک (ن) xarük
پـێلاوی لەپـووش دروسـتکراو، پـێلاوی لـەگیاچنراو، کلاشی لەپووش رێسراو.

خارورە (ن) xarore
ئاژاوە، هەراوئاژاوە، هـەراوزەنا، هـەراو هوریـا، هـەرا هەرا.
خارووز (ن) xarüz
رسـتەی میـوەی وشـکەوەبوو، میـوەی وشـکی بـە پەتەوەکراو.
خاریز (ن) xarêz
خاو رێن، هیلکەوڕێن.
خاز (ن.رو) xaz[1]
کاردوو، کاردیی، هاز.
خاز (ن) xaz[2]
جفز، جەغز.
خاز (ن) xaz[3]
کیر، میل.
خاز (ئان) xaz[4]
سوور، سۆر.
خازتن (کتپ.کی) xaztin(ki)
خوازتن، داواکردن، خواستن.
خازما (ئاک) xazma
بەتایبەتیی، نەخوازە، نەخوازەلا.
خازوق (ن) xazuq
سنگ (کەلەقنگی تاوان کراو یان دەبرێی).
خازۆک (ن.کی) xazok(ki)
ب (خوازەلۆکە).
خازی (ن) xazî
خویز، خووس، خووسار، ئالشک، زوقم، سیخوار.
خاژ (ئان) xaj
خز، خلیسک.
خاژبوون (کتن) xajbün
خزان، خلیسکان، هەل خلیسکان.
خاس (ئان) xas[1]
باش، بەجێ، چاک، دروست، رند، قنج، قەنج.
خاس (ئان) xas[2]
تازە، نویّ.
خاس (ئان) xas[3]
جوان، شیرین، قەشەنگ.
خاس (ن) xas[4]
فیل، گزیی.
خاس (ن.رو) xas[5]
خەس، کاهوو.
خاس بوون (کتن) xasbün
باش بوون، چابوون، چاک بوون، چێ بوون.

**خاس بوونەوە** (کتن) xasbünewe
باش بوونەوەن چابوونەوە، چاک بوونەوە، چێ بوونەوە، چێوەبوون، خاسەوەبوون، لەنەخۆشی هەستانەوە، هەستانەوە سەر پێ(لەناساغی).

**خاستر** (ئان) xastir
چاتر، چاکتر، چێتر، باشتر.

**خاس کردن** (کتپ) xaskirdin
باش کردن، چاک کردن، چێ کرن، خاس کردن، خاسەو کردن، وەش کردن.

**خاسگەل** (نکە) xasgel
باشان، باشگەل، پیاوچاکان، چاکەگەل.

**خاسما** (ئاک) xasima
بەتایبەت، بەوێژە.

**خاسووک** (ن) ١ xasük
هەل پەرست، هەلمەتەکاسە.

**خاسووک** (ئان) ٢ xasbün
تەلەکەباز، فێلباز.

**خاس ووتن** (ئد) xaswutin
باش ووتن، باش گوتن، خاس گوتن.

**خاس ووتن {لەبارەی کەسێ یان شتێکەوە}** (کتپ) xaswutin
ستایش کردن، ستایشت کردن، پەسن کردن، پەسند کردن، تاریف کردن.

**خاسە** (ن) ١ xase
باشیی، چاکە، چاکیی، خاسیی.

**خاسە** (نکە) ٢ xase
ملکی میریی، مولکی میریی.

**خاسە** (ئان) ٣ xase
هەلبژاردە، دانسقە.

**خاسەڕەنگ** (ئان) xase r̲eng
خۆڕەنگ، ڕەنگی کال نەبێتەوە، ڕەنگی کەناچێتەوە.

**خاسەکیی** (ئان) ١ xasekî
تاوبەتیی، تایبەتیی، خاسەیی(شت یان مەبەست).

**خاسەکیی** (ن) ٢ xasekî
کەنیزەک، کارەکەر.

**خاسەوکەر** (کتپ،کل) xasewker(kl)
چاک وەکەر، چاکەو کەر.

**خاسەیی** (ئان) xaseî
ب (خاسەکیی).

**خاسیی** (ن،کل) xasî(kl)
ئەمەکێ، باشە، باشیی، چاکە، چاکیی، ڕندیی، قنجیی، قەنجیی (بەپارە یان شتی دیکە).

**خاسیی کردن** (کتپ،کل) xasîkirdin(kl)
باشەکردن، چاکەکردن.

**خاش** (ن) ١ xaš
قاش، کووز، پارچەیەکی براو لەکالەک یا شووتیی.

**خاش** (ئان) ٢ xaš
زۆر وورد.

**خاش** (ن) ٣ xaš
نقیم (سەر مستیلە).

**خاشاڵ** (نکە) ١ xašal̲
١- پرووپووش، پووش، پەلاش، خاش، خاشاک، خاشە. ٢- چیلکەو چەوال.

**خاشاڵ** (ن) ٢ xašal̲
خاک وخۆل، خۆل وخاش، خەوش وخال.

**خاشخاش** (ن،رو) ١ xašxaš
خەشخاش، ڕووەکی تلیاک، ڕەبەنۆک، خاشخاشک، گورزە ڕۆستەم، گولە میلاقەی تلیاک، ڕووەکێکە لەشیرەی تۆمەدانەکەی تلیاک دروست دەکرێت.

**خاشخاش** (ن) ٢ xašxaš
پاوانەی بەزەنگۆلە، خڕخاڵی پا.

**خاشە** (ن،کل) ١ xaše(kl)
تۆز، وردەی شت.

**خاشە** (ن) ٢ xaše
جێ چرنووک، ڕووشان.

**خاشە** (ئان) xaše
تۆز، تۆزقاڵ، هەند.

**خاشە** (ئان) ٣ xaše
خاش، خاش بوو، وردوتێک شکاو.

**خاشە بڕ کردن** (کتپ) xaše bir̲kirdin
بنەبڕ کردن، ڕیشەکێش کردن..

**خاشە بوون** (کتن) xašebün
پەرت بوون، خاش بوون، وردبوون، وردوخاش بوون (بەنهێم).

**خاشە لێ هێنان** (کتپ) xaše lê hênan
برینداز کردن، چرنووک لێ گرتن، ڕووشاندن (بە نینۆک).

**خاشیل** (ن) xašîl
پەسیسە، شیوی گەنمەکوتاو.

**خافڵ** (ئان) xafil̲
ئاگالێ نەبوو، بێ ئاگا، لێبێ ئاگا، هالێ نەبوو، های لێ نا.

**خافلان** (کتن) xafilan [1]
ئاگالێ بڕان، ئاگالێ نەمان، لێ بێئاگابوون، هالێ نەمان، هالێ بڕان.

**خافلان** (کتن) xafilan [2]
سەرقال بوون، زۆرخەریکی کارێک بوون، نەپەرژانەسەر ئیشێکی دی.

**خافلاندن** (کتپ) xafilandin [1]
سەرقال کردن، سەرلێ تێک دان، سەر لێشێواندن، ئالۆزاندن، پەشۆکاندن.

**خافلاندن** (کتپ) xafilandin [2]
تەفرەدان، فریودان، هەڵ خەڵەتاندن.

**خافلیی** (ن) xafilî
خەریکیی، سەرقالیی.

**خافوور** (ئان) xafûr
ناوبەتال، دالا، ملۆل.

**خافۆ** (ن) xafo
قەراغ، کەنار، لێوار.

**خاڤ** (ئان،کی) xav(ki) [1]
کال، نەگەیشتوو، نەگەییو.

**خاڤ** (ئان،کی) xav(ki) [2]
خاو، نەڕێسراو.

**خاڤ** (ئان،کی) xav(ki) [3]
لێ نەندراو، لێ نەنراو، نەکولاو.

**خاڤک** (ن،کی) xavik(ki) [1]
تارا، دەسماڵی تەنکی سەری بووک یان ژنان.

**خاڤک** (ن،کی) xavik(ki) [2]
دڕاو، ڕزیو، شڕ، شڕووڕ (جل).

**خاڤک** (ن،کی) xavik(ki) [3]
خاسە، خالێکە، خالیە، لاکەلەکە، لاتەنیشت، لاقەبرغە.

**خاڤک** (ن،کی) xavik(ki)
پشتێنە، چەرمی لاورگ.

**خاڤلو** (ن،کی) xavlü(ki)
خاولیی.

**خاڤە** (ن،کی) xave(ki)
خاو، پێستی خاو، پێستی لەدەباغ نەدراو.

**خاڤەکیی** (ن،کی) xavekî(ki)
پیاوی لەش خاوودامێزراو، مرۆڤی خاووسست.

**خاک** (ن) xak [1]
ئاخ، خۆڵ، خۆر، گڵ.

**خاک** (ن) xak [2]
زێد، مەڵبەند، وڵات، وەتەن، نیشتمان.

**خاکاو شکاندن**(کتپ، کل) xakaw şikandin (kl)
پاراو کردن.

**خاکاویی** (ئان) xakawî
تۆزاویی، خۆڵاویی.

**خاکبازیی کردن** (کتپ) xakbazî kirdin
بەخاک یاریی کردن، بەخۆڵ گەمەکردن، خۆڵەپەتانی کردن، گالتە بەخۆڵ کردن، گەمە بەخۆڵ کردن (منالان).

**خاک بەتوورەکە بێژان** (ند)
xak be türeke bêjan
داتەپاندن، داڕووخاندن، کاوڵ کردن، لەبەین بردن، وێران کردن.

**خاک بەسەرکە سێ** (ئان) xak beser kesê [1]
تووشی چورتم بوو،نەگبەت.

**خاک بەسەر {کە سێ}** (ئان) xak beser (kesê) [2]
جگەر سووتاو، جەرگ بڕاو.

**خاک بەسەر بوون**(کتن) xak beserbün [1]
تووشی چورتم بوون، نەگبەتی بەسەرهاتن.

**خاک بەسەر بوون** (کتن) xak beserbün [2]
زەدەداربوون.

**خاک بەسەر بێ!** (نسپ) xak beser bê !
خەجاڵەت بێ!، شەرمەزار بێ!.

**خاک بێژ** (ن) xak bêj
سەرەن، سەرەند، کەو، مێلەک، هەرچێ خۆڵی پێ دا بێژن و زبرەکەی بهێڵێتەوە.

**خاکردن** (کتن،کل) xakirdin
مێلکە کردن.

**خاک ڕن** (ن) xakrin
خێشک، ماڵەی تەختە، مالنج، تەختەی ڕێک ولووس کردنی شیوەرد.

**خاک ڕن کردن** (کتپ) xakrin kirdin
تەخت کردن، خێشک لەشیوەردان، زەویی داماڵین، زەویی ماڵەدان (دوای کێلان).

**خاک ڕێز** (ئان) xakrêz
خڕ داخراو (دەرگا).

**خاک ڕێزکردن** (کتپ) xakrêz kirdin [1]
قوولکە پڕ کردنەوە(بەخۆڵ).

**خاک ڕێزکردن**(کتپ) xakrêzkirdin[2]
خڕ داخستن، دەرگا پێوەدان، قاپیی داخستن.

**خاکسار** (ئان) xaksar
بەلەنگاز، بێ چارە، بێ دەرەتان، بێ نەوا، خاکەسار، خاکەسەر، هەژار.

**خاكسارى** (ن) xaksarî
بێ چارەیی، بێ نەوایی، خاکەساریی، خاکەسەریی، هەژاریی.
**خاك كیش** (ن) xak kêš
دووچەرخە، عەرەبانەی خۆڵ گواستنەوە، عەرەبانەی دەست (یەک یان دوو پێچکە).
**خاكم بەسەرا** (نسپ) xakim beser
خاکی دنیام بەسەر، خۆڵی کوێ بکەم بەسەرمدا!، چیبکەم!، چیم دەسەڵاتە!.
**خاكەوپا** (ن) xakwpa
پەنا، دالدە، هانا.
**خاكەوپاكردن** (کتن) xakwpa kirdin
پەنا بۆ کەسێ بردن، داوای دالدەکردن، هانا بۆ بردن.
**خاكەوخۆڵ** (نک) xakwxol[1]
پیسیی، ناپوختیی، چەپەڵیی.
**خاكەوخۆڵ** (نک) xakwxol[2]
وردەگڵ، وردە خۆڵ و تۆز.
**خاكە** (نک) xake
وردە، هوردە.
**خاكە** (ن،جع) xake
ب (ئاخۆرە).
**خاكەچەرمگە** (ن) xakeçerimge
گڵەتەراو، گڵەسپی، گڵی تەراو، گڵی سپیکاریی (کەبۆ سواغ دانی دیواری ناومال بەکاردەهێنرێ).
**خاكەخەلووز** (ن) xake xelüz
وردە خەڵووز.
**خاكەڕۆ** (نک) xakero
خاپەڕۆکە، خاکارێ،خاکەڕۆکە، ڕۆ، ڕیزە، قرتکە، دەڕۆزان.
**خاكەر** (ن،م) xaker
هێلکەکەر (مریشک).
**خاكەڕۆكە كردن** (کتپ) xakerok kirdin
پاشەڕۆکە کۆکردنەوە، ژێر بەیدەرگەسک دان، ژێر بەیدەر مالین، خاکارێکردن، بن خەرمان مالین.
**خاكەسار** (ئان) xakesar
ب (خاکسار).
**خاكەسار** (ن) xakesar
ژێر دەستە، فەرمانبەر.
**خاكەساریی** (ن) xakesarî
بەخت ڕەشیی، داماویی، بەڵەنگازیی، قەرەبەختیی، چارە ڕەشیی، کلۆڵیی.

**خاكەلێوە** (ن) xakelêwe
ب (ئاخەلێوە).
**خاكەناز** (ن) xakenaz
بێلاسن، بێلی ئاسن، پەیمەرە، خاک ئەناس، خاک ئەنداز، خاکەناس، خاکەنداز.
**خاكی** (ئان) xakî
بۆر، بۆرەلووکە، بێجی، بەرەنگی خۆڵ، خاکین، خاکەسەری.
**خاگ** (ئان) xag
خاو، نەکوڵاو، نەگەیشتوو.
**خاڵ** (ن) xal[1]
ئاپۆ، برای دایک، خالۆ، لالە، لالۆ.
**خاڵ** (ن،پز) xal[2]
پت، تانە، پڵ، پەڵەی سپی سەر ڕەشێنەی چاو.
**خاڵ** (ن) xal[3]
نوختەی سەر پێست، نیشان، نیشانەی زگماکی.
**خاڵ** (ن) xal[4]
پنتکە، نوختە.
**خاڵ** (ن) xal[5]
ئارمانج، نچکە، نیشانە(بۆ مشتو لێ کردن).
**خاڵ** (ن) xal[6]
ب (خاڵ بەڵەک).
**خالانە** (نک) xalane[1]
ڕەفتاری بێ شەرمانە، کاری ناشیرین.
**خالانە** (نک) xalane[2]
ئاخاوتنیدڵخۆشکەرە، پێشبینیدڵ ڕوونکەرە، نۆقلانە.
**خالاویی** (ئان) xalanwî
خالدار، خالین، پەڵاویی، لەکاویی.
**خاڵ بۆ دانان** (کتپ) xal bo danan
پتاندن، خاڵ لەسەر دانان.
**خاڵ بەڵەک** (ن) xal belek
دووهەم مانگی بەهار.
**خالبەندیی** (ن) xal bendî
پنتکاریی، نیشانەکاریی، نوختە ونیشانەکاریی نێوان ڕستە.
**خالبەندیی کردن** (کتپ) xalbendî kirdin
پنتکاریی کردن، خاڵ ونیشانەدانان، نیشانەکاریی کردن (لەنوسیندا).
**خالتیکە** (ن) xaltîk
پوور، خاماچیی، خاڵەت، خوشکی دایک.

**خالخاس** (ئان) xaḻxas
بەدەو، جوان، قشت، لەبەردڵ.

**خالخال** (ئان) xaḻxaḻ
پەلەپەلە، زۆر پەڵاویی.

**خالخالاوی** (ئان) xaḻxaḻawî
پڕ لەخاڵ، خاڵخاڵ، خاڵدار.

**خالخالک** (ن) xaḻxaḻik
سپڵ، فاتەرەش.

**خالخالۆک** (ن.جع) xaḻxaḻok
گوڵە ئەستێرە.

**خالخالۆکە** (ن.جع) xaḻxaḻoke
خاڵخاڵان، خاڵخاڵک، خاڵخاڵۆک.

**خالدار** (ئان) xaḻdar
پەڵە، پەڵاویی، خاڵاویی(پێست).

**خاڵ کوت** (ن) xaḻkut
کەسێ کەخاڵی دەستکرد لەپێست نەخش بکا، خاڵ ومیل کوت.

**خاڵ کوتان** (کتپ) xaḻkutan
خاڵ کوتاندن، خاڵکوت کردن، خاڵ لێدان، خاڵ و میل ڕشتن، نیشانە کوتاندن.

**خاڵوان** (نک) xaḻwan
خاڵان، خزم وکەسوکاری دایک.

**خاڵ ومیل ڕشتن** (کتپ) xaḻwmîl riştin[1]
خۆجوان کردن، ئارایش کردن، خۆ ڕازانەوە.

**خاڵ ومیل ڕشتن** (کتن) xaḻwmîl riştin[2]
بێ گەیشتن، بەخۆداهاتن، خۆ دارشتن، خەت وخاڵ ڕشتن، خاڵ و میل دەرکەوتن، جوان بوون (کچ).

**خالە** (ن) xaḻe
وەستای ئاسنگەر.

**خالەخەمە** (ن) xaḻexeme
مامەخەمە، کەسێ کەلە خەمی هەموو کەس دایە.

**خالیچە** (ن) xaḻîçe
قالیچە، فەرشی بچووک، مافوری چکۆلە.

**خالیس** (ئان) xaḻîs
بێ خەوش، پاک، ساف.

**خالیکەر** (ن) xaḻîker
بەتاڵکەر، خاڵی وەکەر.

**خالیگە** (ن) xaḻîge
برک، پووتەگا، قەبرغە، کەلەکە.

**خالی** (ئان) xaḻî [1]
بێ ناووک، پووت، پووچ.

**خالی** (ئان) xaḻî [2]
ئاواق، بەتاڵ، چۆڵ، خواڵا، واڵا.

**خالی** (ئان) xaḻî [3]
بێ ناوەڕۆک.

**خالی** (ن) xaḻî [4]
فەرش، قالیی، مافوور.

**خالی بوون** (کتن) xaḻîbûn
بەتاڵ بوون، چۆڵ بوون.

**خالی کردن** (کتپ) xaḻîkirdin
بەتاڵ کردن، چۆڵ کردن، داکردن.

**خالی وخەوال** (ئان) xaḻîwxewaḻ
بەتاڵ وحەتاڵ، چۆڵ وهۆڵ، خالیی و خواڵا، خوت وخالیی، خوت و خافڵ.

**خام** (ن) xam
پارچە قوماشی سپی لەلۆکە دروست کراو.

**خام** (ن) xam [1]
خاو، ژێ.

**خام** (ئان) xam [2]
خاو، نەڕێسراو

**خام** (ئان) xam [3]
ناپوخت، ناپوختە.

**خام** (ئان) xam [4]
نەکولاو (گۆشت).

**خام** (ئان) xam [5]
پێستەی خۆش نەکراو، چەرمی خاو.

**خام** (ئان) xam [6]
کاڵ، نەپوخت، نەپوختە، نەگەیشتوو، نەگەییوو.

**خام** (ئان) xam [7]
فەقیرۆکەو کەم زان، کولیی، ساویلکە، کەم زان، ناشیی، نەزان، نەفام، هیچ نەزان.

**خاما** (ن) xama
کیژی ئازەب، کچ عەزەو، کیژی عەزەو، کیژێ کەوەختی شووکردنی هاتبێ.

**خاماچیی** (ن) xamaçî
خاڵتیک، خوشکی دایک، پوور.

**خامبا** (ن) xamba
خانەبا، خەمبا، هەڵاوسانێکی کەم.

**خامک** (ن) xamik
بەڵمی کونجی، کای کونجی.

**خامۆخ** (ن) xamox
پاراو، پاراوی یەکەم، خاموز، کەشاو، هەوەڵین ئاودانی زەویی داچێنراو.

**خاموش** (ئان) [1] xamoš
ئارام، بێدەنگ، کپ، کڕ، کش ومات، هێوەر.
**خاموش** (ئان) [2] xamoš
ئاگری تەمراو، ئیگری وەکوژاو، کوژاوە، کوژیاگە، کوژیاگەوە.
**خاموش بوون** (کتن) [1] xamošbün
بێ دەنگ بوون، بێ هەست وخوست بوون، کپ بوون، کڕبوون، کش ومات بوون، مت بوون.
**خاموش بوون** (کتن) [2] xamošbün
تەمران، کوژانەوە (ئاپەر)، وەکوژان (ئاگر).
**خاموش کردن** (کتپ) [1] xamoškirdin
بێ دەنگ کردن، فزەبڕیین،کپ کردن، مات کردن.
**خاموش کردن** (کتپ) [2] xamoš kirdin
تەمراندن، دامرکاندنەوە، خەفەکردن، ڕەش کردنەوە، فەمراندن، کوژاندنەوە (ئاگر).
**خاموش کردن** (کتپ) [3] xamoš kirdin
خافلاندن، خلەفاندن.
**خاموشی** (ن) xamošî
بێ دەنگی، کپی، هەداریی.
**خامە** (ئان) [1] xame
پێنووس، بنووس، ئالا، قەرەم، قەلەم.
**خامە** (ن) [2] xame
بانەدراو، نەڕێسراو.
**خامە** (ن) [3] xame
توێژ، توێژکە، سەرتوێژ، سەرتوو.
**خامە** (ن) [4] xame
توول، شوول.
**خامەک** (ن) xamek
خام، قەنەوز، کوتالی بنەوشە.
**خامەکی** (ئان) xamekî
بەرەنگی خامەک، مۆر، مۆرباو، قەنەوزیی، بنەوشەیی.
**خامینە** (ن) xamînc
کاڵەی چەرمی خاو، کاڵا، کالە.
**خان** (ن) [1] xan
نازناوی دەسەڵاتداران یان گەورە پیاوان وسەرۆکە هۆز.
**خان** (نک) [2] xan
خانە، خەتی ناو لوولەی تفەنگ، شوێن شوێنی ناو لوولەی چەکی گەرم.
**خان** (ن) [3] xan
کاروان سەرا، گەلەخان، خانوویەکی گەورەی هۆدە هۆدەیە کەرو وڵاخی تێ دەکرێ.
**خان** (ن) [4] xan
خانوویەکی گەورەیە دووکان یان چەند ماڵیکی تێدایە.
**خانباجی** (ن) [1] xanbacî
خوشکی مێرد، شوو خوشکە، دش.
**خانچی** (ن) [2] xançî
کاروانسەرادار، بەڕێوەبەری خان، سەرپەرشتیکەری خان.
**خان خان** (ئان) xan xan
چاوەچاوە، خانەخانە.
**خان خان** (ئان) xan xan
خەت خەتیچوارگۆشە لەسەر تەختەی دامەو شەترەنج.
**خانک** (ئان) [1] xanik
زرکە، کاڵ، کرچ، نەگەییو (کالەک).
**خانک** (ن) [2] xanik
زەمیلە، زەنبیلە.
**خانک** (ن) [3] xanik
قیرتەبەق.
**خانم** (ن) [1] xanim
خاتوون، خانم خاس.
**خانم!** (ئسب) [2] xanim!
ئەی گەورەی من!.
**خانمبی** (ن) [1] xanimbî
کەشکەشە، پەڕپەرە.
**خانمبی** (ن) [2] xanimbî
لەرزانە، خشڵیکی سەری ژنانە.
**خانوچکە** (ن) [1] xanüçke
خانولە، ماڵۆکە، خانوی بچکۆلە.
**خانوچکە** (ن) [2] xanüçke
حەمامۆکە، ماڵۆچکەی لەخۆڵ دروستکراو (کە منداڵان لەخۆڵەپەتانیدا سازی دەکەن).
**خانومان** (ئان) [1] xanuman
ب (جوان).
**خانومان** (ئان) [2] xanuman
سەلار، لەسەرخۆ، هێمن، هێدیی.
**خانومان** (ئان) [3] xanuman
خانەدان، لەبنەماڵەی ناودار، لەخێزانێکی ئابڕودار.
**خانوو** (ن) xanü
خانک، خانگ، خانە، خانیی، ماڵ، جێگەی حەوانەوەی مرۆڤ.

**خانووبەرە** (ن) xanübere
خانونشینگە، ماڵ وحاڵ، مەڵبەند، نیشتنگە.

**خانووت** (ن) ١ xanüt
جۆلا.

**خانووت** (ن) ٢ xanüt
جۆلایی، کاری جۆلا.

**خانوو دروست کردن** (کتپ)
xanü dirust kirdin
بنیادنان، خانووکردن، بناغەی خانوو دانان، دەست دانەخانوو کردن.

**خانووی پڕ لەشووشە بەردێکی بەسە** (پن)
xanüy piṟ le šuše berdêkî bese
ماڵی پڕ لەشووشە جێی یاریی نییە، یەکێک سەربانی خانوی لەشووشەبێ بەردناگرێتە کەس.

**خانووی دوو کەیبانوو، خۆڵی تائەژنۆیە** (پن)
xanüy dü keybanü, xoḻy ta ejnoye
بنکێ: هەر ماڵەویەکێ سەر گەورەیان ووتوە. چێشتکەر کەزۆر بوون چێشت خراپ دەردەچێ.

**خانە** (ن) ١ xane
(خەت دراوی) چوارگۆشە.

**خانە** (ن) ٢ xane
چاوە.

**خانە** (ن) ٣ xane
بەش.

**خانە** (نکێ) ٤ xane
خانوبەرە، خانوو ونەو زەوی یانەی پێوەندیی پێوەیەتیی.

**خانە** (ن) ٥ xane
جوون.

**خانە** (ن) ٦ xane
ڕیز.

**خانەبا** (ن) xaneba
ب (خەمبا).

**خانەبگیر** (ئان) xanebigîr
بەیدەست، بەیدەست کراو، خانەشاریی، خانەنشین، دەست بەسەر، ژێرچاودێریی، پیاوی میریی، لەماڵی خۆدا بەیەخسیر گیراو، کەسێ بە حوکمی میریی نەتوانێ لەماڵ دەرکەوێ، یەخسیر لەماڵی خۆیدا.

**خانە بگیرکردن** (کتپ) xane bigîrkirdin
بەیدەست کردن، خانەشاریی کردن، دەست بەسەردا گرتن (مرۆڤ لەخانووی خۆیدا)، لەماڵی خۆدا بە یەخسیر گرتن.

**خانە بەکۆڵ** (ئان) ١ xane bekoḻ
پێ‌سووتاو، جێ‌بەخۆ نەگر، قنگ تویتکەنەخۆر، گەڕۆک.

**خانە بەکۆڵ** (ئان) ٢ xane bekoḻ
ئاوارە، بێ لانە، بێ‌ماڵ وحاڵ، ڕەبەن، لانەواز.

**خانە بێزار** (ئان) xane bêzar
بەرەلا، لەماڵی خۆ وەڕس، لەماڵە خۆی وەڕێ.

**خانە خان** (ئان) xane xan
بەش بەش.

**خانە خراپ** (ئان) ١ xane xirap
بێ بەخت، کلۆل.

**خانە خراپ** (ئان) ٢ xane xirap
ماڵ وێران.

**خانە خوێ** (ن) xane xwê
خانە خوێکێ، خاوەن ماڵ، خاوەن میوان، خاوەنی ماڵی بەمیوان.

**خانە داریی** (ن) xanedarî
ماڵ بەڕێوەبەرایەتیی، ماڵداریی.

**خانە دان** (ن) ١ xanedan
پس میران، بنچینە عەسل، لەگەورە ماڵان، میرزا، میرزاد، میرزادە، نەجیب زادە، وەجاغزادە، کەسێ لە بنەماڵە یەکی گەورە ودیار بێ.

**خانە دان** (ن) ٢ xanedan
ماڵی گەورەی بەمیوان.

**خانە قا** (ن) xaneqa
بارەگای خوا پەرستیی، تەکیە، خانەگا، خانەی دەرویشان، دەرویش دان، سۆفیگە.

**خانە کیی** (ئان) xanekî
کەویی، کەهیی، ماڵیی.

**خانە گومان** (ئان.کل) xane guman(kl)
بەدگومان، دڵ پیس، دڵ چەپەڵ (لەژن).

**خانە نشین** (ئان) ١ xanenišîn
ئەفتادە، پەکێ کەوتە، خانگار، عەمەڵ مەندە، گردە نشین، لەکارکەوتوو، لەکارکەوتە، کەسێ کەنەتوانێ لەماڵ دەرکەوێ (لەبەر پیریی یان نەخۆشیی).

**خانە نشین** (ئان) ٢ xanenišîn
تەقاویت.

**خانە وادە** (ن) ١ xanewade
ماڵە گەورە.

**خانە وادە** (ن) ٢ xanewade
تیرە و تایەفە.

**خانەی زین** (ن) xaneîzîn

خونزایین، خونەی زین، جێ قنگی سوارلەسەر زین، ئەو بەشەی لە زین کەسوار لەسەری دادەنیشێ.

**خانێ** (ئان) xanê

گەورە، مەزن.

**خانیی** (ن) xanî

سەرچاوە، کانی.

**خاو** (ئان) [1] xaw

بانەدراو، خاف، خام، درژ، نەڕیسراو.

**خاو** (ئان) [2] xaw

نارێک، ناپوخت، چلکن، پنتیی، گوێ بەجل وبەرگی خۆنەدەر (مرۆڤ).

**خاو** (ئان) [3] xaw

بێ هێز، تراڵ، ترغەل، تەپلۆس، تەپۆ، خنەخنکەر، سست، شلەپەتە، فسۆس، گەلۆر، لەش گران، مردەلۆخە.

**خاو** (ئان) [4] xaw

خام، خۆش نەکراو، دەباغ نەکراو، دەواخ نەکریاگ (چەرم).

**خاو** (ئان) [5] xaw

کاڵ، کرچ، نەگەیشتوو.

**خاو** (ئان) [6] xaw

نەکولاو (خواردەمەنیی).

**خاو** (نک) [7] xaw

بنەمای کەرستە.

**خاو** (ن) [8] xaw

ئاخاوتنی خاووخلیچک وبێ سەروبێ.

**خاو** (ن) [9] xaw

گوڵی داری میوە.

**خاو** (ن) [10] xaw

پیستەی دەهۆڵ.

**خاو** (ن) [11] xaw

دابەستگە، جێگەی مالات وبەک سم کەقەڵەو بکرێت.

**خاو** (ن) [12] xaw

پرزەی شاڵ وقاڵیی، تووک (لەسەر ڕووکەشی قوماش)، خاوخاو.

**خاوالیی** (ئان) xawalî

چاوپڕ لەخەو، خەوالوو.

**خاوان** (کتن) [1] xawan

خافڵان، خلەفان، خەلەفان (بەکارێکەوە)، مژوول بوون.

**خاوان** (کتن) [2] xawan

خۆ خافڵاندن، خۆ خلافاندن، خۆ مژوول کرن.

**خاواندن** (کتپ) xawandin

خاوانن، خافڵاندن، خەلەفاندن، مژوول کرن.

**خاوانە** (ن) xawane

فرێت، داوی پۆ لەتەوندا.

**خاوبوونەوە** (کتن) [1] xawbûnewe

تووڕەیی نیشتنەوە، ساردو هێمن بوونەوە.

**خاوبوونەوە** (کتن) [2] xawbûnewe

ساردبوونەوە، سستەوەبوون، شل بوونەوە (لەکارێک).

**خاوبوونەوە** (کتن) [3] xawbûnewe

شل بوونەوە (شتی بادراو)، کرژیی تیادانەمان.

**خاوبوونەوە** (کتن) [4] xawbûnewe

نەرم بوونەوە (چەرمی وشک هەڵاتوو لەناو ئاودا).

**خاو پەڕ** (ئان) xawpeṟ

تەواویانەدراو، نیوەبادراو (ڕیس..).

**خاو ڕۆن** (ن) xawṟon

خایەڕۆن، هێلکەو ڕۆن، هێلکە وڕۆن، خایەوڕۆن، خایینە.

**خاوزان** (ن) xawzan

خەوزان، خەوگۆ، خەو لێکدەرەوە، لێکدەرەوەی خەون، کەسێ کەبتوانێ مانای خەو لێک بداتەوە.

**خاوس** (ئان) xawis

خواس، هب (پاپەتیی).

**خاو کردنەوە** (کتپ) [1] xawkirdinwe

کرژیی تێدانەهێشتن، شل کردنەوە، لەبادراویی ڕەواندنەوە.

**خاو کردنەوە** (کتپ) [2] xawkirdinewe

تووڕەیی نەهێشتن، داسەکناندن، ڕق نیشاندنەوە، سار کردنەوە، هێدی کردنەوە، هێمن کردنەوە، هێنانەوە سەرخۆ.

**خاو کردنەوە** (کتپ) [3] xawkirdinewe

چەرم خووساندن، چەرم نماندن (لە ئاودا).

**خاو کەر** (ن) [1] xawker

کرژیی نەهێل، نەرم کەرەوە.

**خاو کەر** (ن) [2] xawker

مەقامێکی فۆلکلۆریی کوردییە.

**خاو کەرەوە** (ن) [1] xawkerewe

ئارامیدەر، ساردکەرەوە.

**خاو کەرەوە** (ن) [2] xawkerewe

شل کەرەوە (لەمەبەست).

**خوبزه** ( ن ) xübize
خزمەتچیی، نۆكەر.
**خوت** ( ئاك ) xut [1]
بێ هۆ، لەخۆڕایی، لەهیچێ.
**خوت** ( ئان ) xut [2]
بەتال، خالیی، خت، خوالا، خەوال، وەتال.
**خوتبە** ( ن ) xutbe
خودبە، ویژه، ووتار، وتاری مەلا لەمزگەوتدا...
**خوترەك** ( ن ) xutrek
كوتكی لەدار، كوتەكی دار، گەلاكوتك.
**خوتن** ( ن ) xutin
بەبۆلە بۆل، بۆلە بۆل كەر، پرتەكەر، خوتەخوتكەر.
**خوت وخافل** ( ئاك ) xutw xafil [1]
لەپڕ، لەناكاو.
**خوت وخافل** ( ئان ) xutw xafil [2]
ب ( خالیی وخەوال ).
**خوت وخورایی** ( ئاك ) xutw xorayî
بەبێ هۆ، بێ هۆ، لەهیچێ، لەهیچە، هەر لەخۆوە.
**خوتووكە** ( ن ) xutüke
ب ( ختووكە ).
**خوتە** ( ن ) xutc
بێزاریی، خوت، هب( بۆلە ).
**خوتە خوت** ( ن ) xutexut
پرتە پرت، هب( بۆلەبۆل ).
**خوتە خوتكەر** ( ن ) xutexutker
بەپرتەو بۆلە، خوتەكەر، هب( خوتن ).
**خوتە كردن** ( كتن،كتپ ) xutekirdin
پرتاندن، پرتەو بۆلەكردن، خت كردن، خوتانن.
**خوتە و بۆلە كردن** ( كتن،كتپ )
xutew bole kirdin
ب ( بۆلاندن ).
**خوچۆكە** ( ئان ) xuçok
زۆر بچكۆلە، زۆر چكۆلە، وردیلە.
**خوخوتیی** ( ئان ) xuxutî
تایبەتیی، خۆخۆیی.
**خود** ( ن ) xud [1]
خودە، كلاوی ئاسن، كلاوقوت، كلاو زرێ.
**خود** ( ن ) xud [2]
خۆ ( كەسی ئاخاوتەر ).
**خود** ( ج ) xud [3]
خۆی.

**خوداپەرست** ( ئان،ن ) xuda perist
خواپەرس، خواپەرست، خودا پەرس.
**خوداگیر** ( ئان،ن ) xudagîr
دەست درێژكەر بۆ مافی بێ دەسەلات، زالم، زۆردار، خواگیر.
**خوداگیریی** ( ن ) xudagîrî
دەست درێژیی، بێ ئینسافیی، بێ ویژدانیی، ناڕەوایی.
**خودان** ( ن،كی ) xudan(ki)
ب ( خاوەن ).
**خودان** ( ن ) xudan
سالار، سان، سەراك، سەردار، سەركردە، سەرۆك، سەرەك.
**خود دار** ( ئان ) xud dar
بەحەوسەلە، خۆڕاگر، هب ( پشوو درێژ ).
**خود داریی** ( ن ) xud darî
پارێزگاریی، چاودێریی، چاوەدێریی.
**خود سەر** ( ئاك ) xud ser
سەربەخۆ، لەخۆوە.
**خود سەریی** ( ن ) xud serî
بێ گوێیی، لاساریی.
**خود سەریی كردن** ( كتپ ) xudserî kirdin
بێ گوێیی كردن، تێ هەڵچوون لەئیش وكار بەبێ پرس و لێك دانەوە، كار بەئارەزووی خۆ كردن، گوێ بەئاخاوتنی كەس نەدان.
**خودێ** ( ن،كی ) xudê(ki)
ب ( خوا ).
**خوران** ( كتن ) xuran [1]
ئالۆش بوون، خوروو پەیداكردن، خوریان، خوریین، هاتنە ئالۆش، هاتنە خوروو، زوخروو هاتن، كلاشیین.
**خوران** ( كتن ) xuran [2]
بەخواردن چوون، خوریان، خوریین.
**خوران** ( كتن ) xuran [3]
داڕووخان، ڕۆچوون( زەویی ).
**خوراندن** ( كتپ ) xurandin
ئالۆش لەلەش كردنەوە، خورانن، خارشت لەلەش كردنەوە، نینۆك دان لەشوێنێكی لەش كە ئالۆشی هەبێ، هەڵ كراندن.
**خورانەوە** ( كتن ) xuranewe [1]
لەخارن، وەخواردن.

**خورانەوە** (کتن) ٢ xuranewe
ژان کردن، وەژان هاتن..

**خوراو** (ئان) ١ xuraw
خواردوو، خورپاگ، وەخواردن چووگ.

**خوراو** (ئان) ٢ xuraw
هەلکرێنراو.

**خوراو** (ئان) ٣ xuraw
دارزاو.

**خوراو** (ئان) ٤ xuraw
بۆش، کرم خواردوو، کلۆر.

**خورپ** (ئاک) xurp
خرپ، لەپڕ.

**خورپان** (کتن) xurpan
خورپیان، داچلەکین، داچلەکان، داخورپان، دا خورپیان، راچلەکان، راچلەکین.

**خورپە** (ن) xurpe
تەکان، داچلەک، راتلەک، راچلەک، گورپە.

**خورپەکردن** (کتن) xurpekirdin
تەپــەکردن، لێــدان (دل لەپــڕو بــەخێرایی)، دل داکەوتن، دل راتلەکان.

**خورپەی دل** (ن) xurpey dil
تەپە، لێدانی لەپڕ وخێرایی دل، کاری راچلـەکانی دل.

**خورت** (ئان،کی) ١ xurt(ki)
جوان، جەحێل، جحێل، جێهل، گەنج، هەرزەکار.

**خورت** (ئان) ٢ xurt
بەتاووشــت، بــەتوانا، توانــا، بەدەســـەلات، بــەهێز، خاوەن دەسەلات، خۆرت، دەسەلاتدار.

**خورت** (ئان) ٣ xurt
دەولەمەند.

**خورت** (ئان،کی) ٤ xurt(ki)
تەن دروست، لەش ساغ، لەش توند وتۆل، خۆرت.

**خورت** (ئان) ٥ xurt
برێو، سەرکێش (ئەسپ).

**خورت** (ئان) ٦ xurt
توورە، سەرگەرم، کەللەیی.

**خورت** (ئان) ٧ xurt
تەنگە تیکلە، قەلەو، گۆشتن.

**خورت بوون** (کتن) xurtbûn
بەهێز بوون، پتەوبوون، توندو تۆل بوون.

**خورت کردن** (کتپ) xurtkirdin
بەهێزکردن، پتەوکردن، توند و تۆ ل کردن.

**خورتیی** (ن،کی) ١ xurtî(ki)
بـەزەبری، زۆر، زۆرەملـێ، زرتــە جـۆیی، زۆرە ملـی، زۆریی ، زۆرە ملە، بەزەبری هێز، تۆپز.

**خورتیی** (ن) ٢ xurtî
جوانکەیی، جەهێلیی، گەنجیی، لاویی.

**خورتیی** (ن) ٣ xurtî
بەهێزیی، زۆر دەستیی.

**خورتیی** (ن) ٤ xurtî
پیت، پڕ برشتیی.

**خورج** (ن) xurc
خورجک، تێری پچووک، خورجین، جەوالی پچووک، جەنتەی لەبەن تەنراو.

**خورجەزین** (نل) xurcezîn
هەگبەی پشی سوار، هەگبەزین، توورەکەی دوولایی کەلەپاش زینەوە هەل دەواسرێ.

**خورجی ئاو** (ن) xurcî aw
جەوەندە، جەوەنگە، شەلتە، کوندەی ئاو.

**خورجین** (ن) xurcên
ب (خورج).

**خورد** (ئان) ١ xurd
ورد، هوور.

**خورد** (ئان) ٢ xurd
ب (خۆراک).

**خوردە** (نک) ١ xurde
وردە (پــارەو پــوول)، پــارەی وردە، پــوولی ورد، پارەی هوور، پارەی ئاسن.

**خوردە** (نک) ٢ xurde
ئیراد، تانە، تەوس، پلار، رەخنە.

**خوردە** (نک) ٣ xurde
ب (خاکەڕۆ).

**خوردەگیر** (ن) xurdegîr
ئیرادگر، ئیرادگیر، رەخنەگر، سانسۆر، نقامگر.

**خوردەگیریی** (ن) xurdegîrî
رەخنەسازیی، رەخنەگیریی.

**خورسیی** (نک) xursî
خێــرۆکە، خێــرۆ، دەخلـی لـەتۆوی رژاوی پــار هــەلی دابێتەوە.

**خورک** (ن،جج) xurik
ب (خۆرکە).

**خورم** (ن) xurim
قورم، قورمە، ئالقە دارینە، ئەلقەدارینــە (لــەرەشمال بەستن وبارکردندا بەکاردێت).

خورما (ن.می) xurima
قەسپ، خورمە.
خورماپێچان (ن.نا) xurimapêçan
مشکی خورما، مشکی دارخورما، بزگەنگە.
خورمالوو (ن.می) xurimalû
کاکی.
خورمایی (ئان) xurimayî
ڕەشی ئامال سوور، سوورکار، سووری ئامال ڕەش.
خورمێن (ئان) xurimên
گرمەی هەور، گورمێن.
خورمیین (کتن) xurimîn
گرماندن، گرمەگرم کردن (هەور).
خوروو (ن) xurû ¹
ئالۆش، خارش، خارشت، خروو، خرووکە، خورۆکە، خورووکە، خرۆکە، هەکە، خورەک، درۆخە، دروخە.
خوروو (ن) xurû ²
ئـارەزووی بێـپایان، ئەوپـەڕی هـەوەس، ویـست وخواستی بێ ئەندازە، ئەلها.
خوروزەک (ن.پز) xurûzek
خرووزەک، خرووسەک، کۆکەڕەشە.
خورووژن (ن) xurûjin
وەخـروو هـاتنی گـش لـەش، هاتنـەخورووی هەمووگیان، و ئالۆش هاتنی گشت لەش.
خورۆشان (کتن) xurošan
ورووکان، هەراوهوریا کردن، وەیەکداچوون(خەڵک بە هەراو بگرەوە). هب (خرۆشان).
خورۆشاندن (کتپ) xurošandin
تێک دان، ورووکاندن، هەراوبگر کردن. هب (خرۆشاندن).
خورۆشاو (ئان) xurošaw
ورووکاو، هب(خرۆشاو).
خورۆڤی (ن.رو.کی) xurovî
هەرزنەی گەورەی بەمێشوو، گارس.
خورۆک (ن) xurok
کرتێن، مشکە خورۆکە.
خوری (ن) xurî
پەژم، پەشم، تووکی مەڕ، خۆلی، خۆلیی، کولکە، کولکەی پەن، هری.
خوریا (ن) xurya
چریکەی مەل، دەنگی زولالی مەل.
خوریاگ (ئان) xuryag
ب (خوراو).

خوریان (کتن) xuryan
قەڕێڵ بوون، گەڕێڵ بوون.
خوریانەوە (کتن) xuryanewe
ملۆل بوون.
خوریت (ن) xurît
قەلسیی، کەللەیی، نارەحەتیی، هب (توورەیی).
خوریلە (ن) xurîle
تۆپەلەی خوری، تیکەخوری، خوریی کەم.
خوڕ (ئان) xuṟ ¹
ب (تیژ).
خوڕ (ن.ئان) xuṟ ²
بەتەوژم، خوڕین، خێرا، ئاوی بەتەوژم، ئاوی بەگوڕ، خوڕاو.
خوڕخوڕ (ن) xuṟ xuṟ
دەنگی هاتنە خوارەوەی ئاوی زۆر.
خوڕزم (ن) xuṟzim
ئاوی توندی باران، تەوژمی ڕێژنە.
خوڕگە (ن.ئان) xuṟge
سەربەرەو خوارکە، لێژایی.
خوڕە (ن) xuṟe
دەنگی ڕۆیشتنی ئاو بەتەوژم، هاڕە، هاژە، خوڕین، خولخول، نێرینەی چەم کەبەتەوژم دێت، خوڕین.
خوڕەم (ن) xuṟem ¹
سەوزەلان، مێرگ.
خوڕەم (ئان) xuṟem ²
دلخۆش، شادمان.
خوڕەم (ن) xuṟem ³
تەوژم، توندیی (با).
خوڕەم (ن) xuṟem ⁴
لێزمە، تەوژمی ڕێژنە، خوڕم، ئاوی باران، خوڕزم، ڕەمێل، ڕەمێلە.
خوڕەهاتن (کتن.کتپ) xuṟe hatin
خوڕەکردن، کەڵەوکردن، نێرەکردن، خوڕیین (ئاوی چەم..).
خوڕین (ن) xuṟîn
پرمە وحیلە(ئەسپ).
خوڕیی (ن) xuṟî
پێت، گرەگڕی ئاگر، لرفە لرفی ئاگر، لرفەی ئاگر
خوڕیین (کتن) xuṟîn ¹
بەیەکیکەوە نازیین، پێنازیین، نازیین.
خوڕیین (کتن) xuṟîn ²
گـەف کـردن، هەڕەشـەکردن، هەڕەشـەو گوڕەشـە

کردن.

**خورپین** (کتپ) [٢] xur̄în

ئاژووتن، ڕانیین. خرپیان، هب (ئاژوتن/٢).

**خوز** (ن) [١] xuz

لیکاو، خوزی،

**خوز** (ن) [٢] xuz

ب (چین).

**خوز** (ئان،ن) [٣] xuz

پشت چەماو، پشت چەمیاگ، خووز، خوژ، کووپ، کۆم.

**خوز** (ئان) [٤] xuz

ب (چرچ).

**خوز** (ن) [٥] xuz

کۆم، دەرکی کۆم، کونی قنگ.

**خوزار** (ن) xuzar

فیق، فیقیی، فیکی، میوە، میوە.

**خوزتێ گەڕان** (کتن) xuztêger̄an

بووژانەوە، وەکەیف هاتنەوە، وەهیز کەوتن دوای نەخۆشیی خوز تێ گەڕانەوە.

**خوزگ** (ئان) xuzig

خونک (ئافرەت).

**خوزهێنانەوە** (کتن) [١] xuzhênanewe

سـاڕێژ بوونـەوە، گوشـتەو زوون هێنانـەوە، چـاک بوونەوە.

**خوزهێنانەوە** (کتن) [٢] xuz hênanewe

جۆش خواردنەوە، یەک گرتنەوە (ئێسک).

**خوزیان** (کتپ) xuzyan

پەسەندنەکردن، پەسند نەکردن.

**خوژە** (ن،رو) xuje

گیا ئەسریلک، گیاچریش، ڕووەکی سریش، گیایەکی کویـستانییە.. گـەڵا باریـک وسـێ کـوز وکلـۆر.. بنەکەی دەردەهێنرێ وئەکوترێ وئەبێ بەسریش.

**خوژین** (ن) xujîn

نرکەنرک، هەناسەی ماندوو، هەنکە هەنکی ماندگ، دەنگیهەناسەی مرۆڤی ماندوو.

**خوس** (ئان) [١] xus

خوز، خوسار، زوقم.

**خوس** (ئان) [٢] xus

بێدەنگ، وست، ووس.

**خوس** (ئان) [٣] xus

بێ دەنگیی، بێ خوستیی، بێ فزەیی.

**خوسار** (ن) xusar

زەرەر، زیان.

**خوس بوون** (کتن) xusbûn

وس بوون، ووس بوون، بێ دەنگ بوون.

**خوسپ** (ن) xusp

ئاخاوتنی بەد لەپاشەملە، بەدگۆیی، زەم، غەیبەت.

**خوسپ کردن** (کتپ) xuspkirdin

بـەدگۆیی کـردن لەپاشـەملە، بـەدووتن، لەپاشـەملە باسـی کەسـێ کـردن (بەخراپـە)، بەخراپـە نـاوی کەسێ بردن.

**خوست** (ن) [١] xust

خوس، زیی، سووسە، فزە، نقە، نتقە، ورتە.

**خوست** (ن) [٢] xust

بزوە، جووڵە، جمە، خوستە.

**خوست** (ن) [٣] xust

داوێن، دامێن (جل وبەرگ لەخوار کەمەرەوە).

**خوسل** (ن) xusil̲

غوسل، وسل، مەلە (بۆ دەرکردنی لەش پیسیی).

**خوسن** (ن) xusin

ب (جنێو).

**خوسەدارکردن** (کتپ) xusedar kirdin

تووڕەکردن، دڵ ئێشاندن، دڵ یەشاندن، زویر کردن، ناڕەحەت کردن.

**خوشار** (ن.) [١] xušar

تەوژم دان، تەوژم هێنان.

**خوشار** (ن.) [٢] xušar

گوشیین (ترێ).

**خوشار کردن** (کتپ) xušar kirdin

تەنگ پێ هەڵچنیین.

**خوش خوشک** (ن،پز) xuš xušk

گرێ، گلاند، لوو (لەناو لەشدا).

**خوش خوشکە** (ن) xuš xuške

سپڵ، پیرەفات.

**خوشک** (ن) xušk

خوار، خواکە، خوالە، خوانگ، خـوچ، خـۆە، خوەهـ، خوەیـشک، خویـشک، خۆیـشک، خیـشک، خوینـگ، هاوشیرە، والا، والە، والی.

**خوشکایەتیی** (ن) [١] xuškayetî

پێوەندیی دوو خوشک پێکەوە، خوشکێنیی.

**خوشکایەتیی** (ن) [٢] xuškayetî

خۆشی پـێوەندیی نێـوان دوویـان چەنـد ئافرەتێـک، نێوان خۆشیی دوو یان چەند ئافرەتێک پێکەوە.

**خوشکایەتیی گرتن لەگەڵ** (ند) xuškayetî girtin legeł
خۆش پەیوەند دروست کردن لەنێوان چەند نافرەتێکدا (خۆبەخۆ).

**خوشکۆک** (ئان) xuškok
خوشیک، خوشینک، خوشۆک، دلگیر، ڕند، جوان ودلگر.

**خوشک وبرایەتیی** (نل) xuškw brazetî
پەیوەندی نێوان کچ وکوڕ بەهەستی خوشک وبرایەتییەوە.

**خوشکەزا** (نل) xuškeya
ڕۆڵەی خوشک، منالی خوشک، خوارزا، خوارزی، خویشکەزا.

**خوشە** (ن) xuše
خوش، خوشین، خوشەخوش، دەنگی تیژی ئاوی کەم، هاژە.

**خوشەهاتن** (کتن) xušehatin
خوش دان، هاژە لێوەهاتن.

**خوشیان** (ن) xušyan
کشان، ڕاکشان، شەهاو کشان، خوشیین (ئەستێرە).

**خوشیل** (ن) xušîl
ڕنووس هەرەس هێناو، کلیلەی پساو، ڕەنیی داڕووخاو.

**خول** (ن) ١ xul
با، تاو، چەرخە، جولە، سووڕ، گل، گێچ، گێژ.

**خول** (ن) ٢ xul
لارەمل، مل خوار، لەڕولاواز، بێ تاقەت (بەهۆی ناساغییەوە).

**خول** (ن.) ٣ xul
١- زفرە، گەڕ. ٢- گەڕانەوە، وەگەڕان.

**خول** (ن) ٤ xul
پاژ، چرکە (شەستەم بەشی یەک سەعات).

**خولان** (کتن) xulan
چەرخان، چەرخەدان، خولانەوە، خول خواردن، سووڕان.

**خولاندنەوە** (کتپ) ١ xulandinewe
بادان، چەرخە پێدان، چەرخەدان، خول دان، زفراندن، سووڕاندنەوە، سووڕدان، گل پێدان، گل پێ خواردن، گێچ دان، گێژوەدان.

**خولاندنەوە** (کتپ) ٢ xulandinewe
ئاڵۆزکردن، سەرلێ شێواندن.

**خولانەوە** (کتن) ١ xulanewe
بەخێرایی گەڕان، سووڕانەوە، سووڕیانەوە، گەڕیان. گێژ خواردن، گێچ خواردن، خول خولردن، خولیانەوە، سوور خواردن.

**خولانەوە** (کتن) ٢ xulanewe
چەرخیان، گەڕیانەوە.

**خولخولۆکە** (ن) xulxuloke
ب (ئارماز).

**خولخولە** (ن) xulxule
خولخلۆکە یا فرفرۆکە.

**خولۆلیک** (نک) xulolîk
تەرزەی ورد، تەیرۆکی هوور، وردەتەرزە.

**خولیا** (ن) xulya
ئاواتی پڕوپووچ، پیران، خەیالات، خەیاڵ وئارەزوو، خولیان، دالغە، کەلکەلە، مەراق، هەوەس.

**خولیاکەوتنەسەر** (کتن) xulya kewtineser
مەراق پەیپینەسەر، مەراق کردن، کەوتنە کەلکەلە، کەوتنەسەر.

**خوڵام** (ن،کی) xułam
بەنە، هب(بەندە).

**خوڵامانە** (ن) xułamane
زلف، زولف، کاکۆل.

**خوڵامەتیی** (ن) xułametî
ب (بەندەیی ١/).

**خوڵتە** (ن) xułte
کلکەسووتە، کلکەلەقە، مەرایی.

**خوڵتەکردن** (کتن.کتپ) xułtekirdin
کلکەسووتەکردن، ماستاو ساردکردنەوە، مەرایی وڕیایی کردن.

**خوڵخوڵە** (ن) xułxułe
ئاژاوە، زەنا زەنا، غولغولە، هەراوبگر، هەراو ح ـ ف. هەرا و زەنا.

**خوڵق** (ن) ١ xułq
ئاکار، خوو، خولک.

**خوڵق** (ن) ٢ xułq
تاقەت، مەیل، هەوەس.

**خوڵقان** (کتن) xułqan
خولق بوون، دروست بوون.

**خوڵقاندن** (کتپ) xułqandin
دروست کردن، هێنانە پێشەوە، هێنانەکایەوە، هێنانە دیی.

**خولقاو** (ئان) xulqaw
چێ بوو، دروست بوو.

**خولق کردن** (کتپ) xulq kirdin
بانگ کردن(کەسێ بۆمیوانیی)، خولک کردن، فەرموو کردن (لەکەسێ بۆ هاتنەژوورەوە یان نان خواردن..)، گازکردن (بۆ بەشداربوون)، میوانداریی کەسێ کردن.

**خولق نەبوون** (کتن) xulqnebûn
بێتاقەت بوون، بێ خولق بوون، تاقەت نەبوون، مەیل نەبوون، هەوەس نەبوون.

**خولوپ** (ن) xulup
تل، تەپاوتل، گەوز.

**خولوپان** (کتن) xulupan
تل دان، تەپاوتل کردن، ئەمدیو وئەودیو کردن، خولوپیان، گەوزان، گەوزیین.

**خولوپاندن** (کتپ) xulupandin ١
ئەمدیو ئەودیو پێکردن، ئەمدیو ئەودیوکردن، تل پێ دان، تل دان، تەپاوتل پێ کردن، تەپاوتل دان، گەوزاندن.

**خولوپاندن** (کتپ) ٢ xulupandin
خولوپانن، خولوپیان، خولوپ کردن، گلۆفتنەوە، گولۆفتنەوە.

**خوم** (ن) ١ xum
کووپە.

**خوم** (ن) ٢ xum
خم، لیلنگ، نیل، هەش، جەوهەری ڕەنگی شینی لاجیوەردیی، چویت، ڕەنگی قەلاخیی

**خومار** (ن) ١ xumar
سەرخوش، گرێبور (بەبادە)، مەست.

**خومار** (ن) ٢ xumar
کەسێ کەدوای سەرخۆشیی سەری دیشێ.

**خومار** (ن) ٣ xumar
مەلم ومەلاو، مەوروهەلاو، تەپ ومژ.

**خومار** (ن) ٤ xumar
بۆق وتۆز، تەپ وتۆز، خومام، غومار.

**خوماریی** (ن) xumarî
سەرخۆشیی، مەستیی.

**خوماریین** (ن) xumar
خەفە، کزیی (ئاگر).

**خومالیکە** (ن) xumîk
جەڕەی گەورە، کووپە.

**خومام** (ن) ١ xumam
ڕووئەندار، لەش پۆش، سەرتاپا (جل).

**خومام** (ئان) ٢ xumam
تخێل، دەستەوکیرد، ڕاکشاو.

**خومچیی** (ن) xumçî
ب (خومخانەچیی).

**خومخانە** (ن) xumxane
خمخانە، دوکانی خومڕێژیی، دوکانی خمگەر، جێگای کالا لەخوم دان.

**خومخانەچیی** (ن) xumxaneçî
خمچیی، خمگەر، خومچیی، خومگەر، ڕەنگڕێژ.

**خومخۆرک** (ن) xumxorik
خمخۆرک، خەمخۆرک، درز، قەلشت، قلیش (زەویی)، کەلەبەر.

**خومخوم** (ئان) ١ xumxum
شەنگ وشۆخ.

**خومخوم** (ن) ٢ xumxum
گرمە، گورمین (هەور).

**خومخوم** (ن) ٣ xumxum
هاژە، هاژەهاژ(ئاو).

**خومریی** (ئان) xumrî
سووریی تێر، سووری مەیلەو ڕەش، خورمایی.

**خوم شێواوە** (ئد) xum šêwawe
بەولتا: ئاژاوە بلاوبوونەوە، ئاژاوە وپشێویی کەوتنەوە، ئاشووب بلاوبوونەوە، ئاگر بەرپابوون، خم شێوان، خوم شێویان، هەراقەومان.

**خوم شێوان** (ئد) xum šêwan
تەحاتەحا بلاوبوونەوە، درۆ ودەلەسە بلاوبوونەوە.

**خوم شێواندن** (ئد) xumšêwandin
١- گوێ نەدان بەهەلوێستی ئارامیی وهەداریی پێویست... ٢- بوونەهۆ یا بەشداریی کردن لەشەڕو بناردا، ئاژاوە خستنەوە.

**خوم شێوێن** (ن) xum šêwên
ئاژاوەچیی، ئاشووبگێڕ، ئاگر بەرپاکەر، بەئاشووب، خم شێوێن، خمەشێوێنە، خومە شێوێنە، خومە شێوێنکە، مایەفیتنە، سووری بەر لەشکر.

**خوم کردن** (کتپ) xum kirdin
خم کردن، لەهەش گرتن.

**خوم لێ شێوان** (ئد) xumlêšêwan
خم لێ شێوان، سەرگەردان بوون.

**خومیین** (کتن) xumîn
داتەپیین، ڕووخان.

**خومه ڕەژە** ( ن ) xume reje

خومه ڕیژە، کاسەڵەشینکە.

**خومیان** ( کتن ) xumyan

بەسەریەکدا کۆم بوون.

**خومیزیین** ( کتن ) xumîzîn

کوژانەوە ( ئاگر ).

**خومین** ( ئان ) xumîn

خمین، خمیی، خومیی، ڕەنگێ وەک خوم، شین، شین لەڕەنگی هەش.

**خوناو** ( ن ) xunaw

ئاورنگێ، ئاونگێ، ئاڤینگێ، خناڤ، خوناو، خناو، خناڤ، خوناڤ، خوناوکە، شەونم.

**خوناوکە** ( ن ) ١ xunawke

بارانی زۆر ورد، خوناوەباران، نمەباران، وردە باران.

**خوناوکە** ( ن )٢ xunawke

ئاوی لەقولکە داماوی باران، باراناو، گۆلاو.

**خوناوتە** ( ن ) xunawke

دەنکە دەنکە ئارەقەی دەموچاو.

**خوناوەباران** ( ن ) xunawke

ب ( خوناوکە ).

**خونج** ( ن ) xunc

جێ، جیگە.

**خونجان** ( کتن ) xuncan

جێ بوونەوە، جیگە هەبوون، خونجیان، ڕاست کەتن، گونجان.

**خونجاندن** ( کتپ ) xuncandin

جیگاتیدا کردنەوە، خونجانن، گونجاندن، گونجانن.

**خونجگا** ( ن ) xuncga

ئۆقرەگا، خونجگە، سرەوگا، وەقرەگا، شوێنێ کەمرۆ و بتوانێ تێیدا بسرەوێ.

**خونچە** ( ن ) xunçe

پشکووژە، شکۆفە، گولی نەپشکوتوو، گولێکەهیشتا نەگەشابیتەوە، بشکۆژ، چم.

**خونچەکردن** ( کتن ) xunçe kirdin

پشکووژەکردن، شکۆفە کردن، چم کرن، غونچەکردن.

**خونقیین** ( کتن ) xunqîn

بەنمەنمە باران بارین، هیدی ونەرم باران بارین.

**خونک** ( ئان ) ١ xunik

ئالۆشاویی، ئاگراویی، بەئالۆش، بەجۆش، بەرگەرم، جۆشن ( ئافرەت ).

**خونک** ( ئان ) ٢ xunik

گونک ژمیر، هەنگوتک ژمیر، هب :( پیسکە ).

**خونک** ( ئان ) ٣ xunik

جلف، دەستباز، هەرزە.

**خونکار** ( ن ) xunkar

فەرمانڕەوایی گەورە.

**خونکیی** ( ن ) xunkî

تەڕیی، خوزگیی، خونەکیی ( هۆڵمان ).

**خوە** ( ن ) xwe

ئارەقی لەش، هب( ئارەق ).

**خوەسەر** ( ئان ) xweser

سەربەخۆ.

**خوەنیین** ( کتپ ) xwenîn

حاشاکردن، نەچوونە ژێر.

**خویا** ( ئان ) xuya

ئاشکرا، بەردەر، بەرچاو، پەیدا، خویان، دیار.

**خویا** ( ئان ) ١ xuya

بەناویانگێ، پایەبلند، دەرکەوتوو، ناسراو ( مرۆڤ ).

**خویا** ( ئان ) ٢ xuya

ئەژمیررا، بایەخدار، هەڵکەوتوو، جێی ڕێز.

**خویا** ( ئان ) ٣ xuya

شتیار، وشیار، هوشیار.

**خویانەکە** ( ن ) xuyanek

چاوئەنداز، چاوەنداز، دیمەن، بەرچاوان، بەرچەوەن.

**خویرک** ( ن،جج ) xwîrk

مۆرانە، مۆرد، مۆرکە.

**خویشەبوون** ( کتن ) xwîşebûn

شەقار شەقاربوون ( زەویی کیلگێ ).

**خویەدان** ( کتن ) xwyedan

ب ( ئارەق کردنەوە ).

**خوێ** ( ن ) xwê

خوا، خووا، نمەک، بنەمای سویریی، بنەمای سۆڵیی.

**خوییاوک** ( ن ) xwêyawk

ئاووخوێ.

**خوێ چەژ** ( ن ) xwêçej

خوێ چیژ، خوێ تام کەر.

**خوێ چەژتن** ( کتپ )xwêçejtin

تام کردن، خوێ چەشتن، لێ چەژتن، لێ چەشتن، لێ خواردن، خوێ چیژتن، خوێ چیشتن، خوێ چەژیی کردن، خوێ چیژیی کردن، خوواچەشتن.

**خویدار** ( ئان ) xwêdar

جوان، دل چەسپ ( شت ).

**خویدان** (ن) ١ xwêdan
خویدانە، نمەکدان، خوتیهدان، دەفری خوێ (لەسەر خوان).

**خوێ دان** (کتپ) ٢ xwêdan
ئارەق کردنەوە، جوانـاو رشتن، لەش نیشتنەسەر ئاو.

**خوێ دان** (کتپ) ٣ xwêdan
خوێ بەئاژەڵ دان، خوێ بۆ رۆکردن، خوێ پێدان، نمەک پێ دان (بەئاژەڵ).

**خویدان** (ن) ٤ xwêdan
١- تیری خوێ، توورەکەی خوێ.
٢- دەفری گەورە بۆ خوێ تێ کردن.

**خویری** (ئان) ١ xwêrî
بەرەڵا، بێکارە، خۆری، خیرو، نامەرد، ناپیاو، سەرسەری، هیچ لەدەست نەهاتگ.

**خویری** (ئان) ٢ xwêrî
خراپکار، ناپاک، ناپوخت.

**خویریزگە** (ن) xwêrêjge
خویریز، خویریزگە، چەند بەردیکی پانە خولی لەسەر رۆ دەکرێ بۆ خوێ دانی ئاژەڵ.

**خویش** (ن) xwêš
خزم، قۆم، قەوم، کەسوکار، قەوم و قیلە.

**خویشان** (نک) xwêšan
خزمان، کەسوکار.

**خویشایەتی** (ن) xwêšayetî
کەسایەتی، خزمایەتی، خویشی.

**خوێ کراو** (ئان) xwêkiraw
خوێ پیوەکراو، خوێ لێدراو، خوازەدە، نمەک لێ دراو.

**خویلین** (ن) xwêlên
کانیی خوێ، سەرچاوەی خوێ، چاڵەخوێ، کانەخوێ، خۆیەلان.

**خوین** (ن) xwên
خوون، خوین، خی، خین، خێن، هوون.

**خوین ئەستین** (ن) xwên estên
تۆڵەستین، تۆڵەسین، هەقەوەسین.

**خویناو** (ن) ١ xwênaw
خوین وئاو، خوینی تیکەڵ بەئاو.

**خویناو** (ن،پز) ٢ xwênaw
خوینی ناوسک کەلە گەروو دیت، خوینێ کەلە گەروەوە مرۆڤ هەڵی بینیتەوە، رشانەوەی خویناوی.

**خویناو هەڵهینان** (کتن) xwênaw helhênan
خوین رشانەوە، خوین لەقورگەوە هاتنەدەر.

**خویناوی جگەر** (خ..) xwênawî ciger
ئەوپەری نائارامیی دڵ.

**خویناوی** (ئان) ١ xwênawî
خوونالی، خوونـاوی، خویناولین، خوین تیوەچوو، خەڵتانی خوین، خینالی، لەخوینەوەچوو، لەخوینەوە گلاو، لەخوینەوە گەوزاو.

**(فرمیسکی) خویناوی** (خ.) ٢
(firmêskî) xwênawî
فرمیسکی خوینین،فرمیسکی مەینەتیی.

**خویناوی بوون** (کتن) xwênawîbûn
خویناولین بوون، خوین تیوەچوون، خەڵتانی خوین بوون، لەخوینەوەچوون، لەخوینەوەگلان، لەخویندا گەوزان، خوونـاویی بوون.

**خویناوی کردن** (کتپ) xwênawî kirdin
لەخویندا گلاندن، لەخویندا گەوزاندن.

**خوینبایی** (ن) xwênbayî
خوین بەها، خی، ئەوپارەیەی لەخوینی کەسیکدا ئەدرێ، قەرەبوو کەلەپیاوکوژ دەسینرێ، قەرەبووی خوینی مرۆڤی کوژراو.

**خوین برا** (ن) xwênbira
کریف، هاوپەیمانی گیانی بەگیانیی.

**خوین بژاردن** (کتپ) xwên bijardin
خوینبایی دان، خوین بەهادان، قەرەبووی خوینی مرۆڤی کوژراودان.

**خوینبەر** (ن) xwênber
دەماری خوین راگویز لەدڵەوە بۆ لەش.

**خوین بە خوین پاک نابیتەوە** (ند)
xwên be xwên pak nabêtewe
هەڵەبەهەڵە راست ناکریتەوە.

**خوین بەربوون** (کتن) ١ xwênberbûn
خوون لبیڤل هاتن، خوین لەکەپووهاتن، خوین لەلووت هاتن، لووت پژان.

**خوین بەربوون** (کتن) ٢ xwênberbûn
خوین لێهاتن.

**خوین بەربەست کردن** (ند)
xwên berbest kirdin ١
خوین بەس کردن، دوژمنایەتیی داکوژاندن، دوژمنایەتیی لەنیواندا نەهیشتن، مەسڵەت کردن، خوین دا کوژاندن، کۆتایی بەدوژمنایەتیی هینان.

**خوێن بەربەست کردن** (ئد)
xwên berbest kirdin [2]
هێزی شەڕکەردا، خوێن بەست کردن، شەڕ ڕاوەستاندن لەنێوان دا.

**خوێن بەربەست کردن** (کتپ)
xwên berbest kirdin [3]
خوێن بەست کردن، خوێن ڕاوەستاندن، خوێن گرتنەوە (لەشوێنێکی ئەندامدا).

**خوێن بەردان** (کتپ) xwên berdan
١- خوون بەردان، خوێن بەرەڵاکردن (بۆ مەبەستی پزیشکی). ٢- حەجامات کردن.

**خوێن بەس** (ن) xwên bes
خوێن بەست، مەسلەت.

**خوێن بەست** (ئان،ن،پز) xwênbest
خوێن بەند، خوێن ڕاگر، خوێن ڕاگیر (دەرمان یان هەرشتێ کەخوێن بگیر سینێتەوە).

**خوێن بەست کردن** (ئد) xwênbest kirdin
ب(خوێن بەربەست کرد).

**خوێن پڕچاوبوون** (ئد) xwên pirçawbûn
چاوسوور بوون لەحیرسدا، دەمار هەستان ورق گرتن، چاو پڕ لەخوێن بوون.

**خوێن تاڵ** (ئان) [1] xwên tal
ئێسک قورس، ئێسک گران، چارەگران، ڕەزا تاڵ، ڕەزا گران، ڕەزاقورس، زەرەگران، فەساڵ گران، کرێت، مرقن، ناشرین.

**خوێن تاڵ** (ئان) [2] xwêntal
شەڕانیی.

**خوێنتاڵیی** (ن) xwên talî
ئێسک قورسیی، مرقنیی، ناشیرینیی.

**خوێن جمان** (ئد) [1] xwênciman
توورەبوون، چاوپەڕیینە پشتی سەر.

**خوێن جمان** (ن،پز) [2] xwênciman
ئەوژمی خوێن، خوێن پەستیی. خوێن جومان، جم وجۆڵی خوێن.

**خوێن جمان** (ن) [3] xwênciman
خوێن جومان، کاتی خوێن جمان، هەرەتی بەهار.

**خوێنخوا** (ن) xwênxwa
خوێنخواز، داواکاریی تۆڵەی کوژراو، کەسێ کەداوای خوێن بکات لەپیاوکوژ، خوێن ڕەس، خوێنەخوار، خوێنەخوێ، خوێنەخۆ، خزمێکی نزیکی کوژراو.

**خوێنخوار** (ئان) [1] xwênxwar
بێ بەزەیی، جەورکەر، جەورگر، خونخوار، خوێنخۆر، دڵ ڕەق، زاڵم، زۆردار، ستەمکار، بێبەزە، ستەمگەر. دوژمنی خوێنی، کەسێ کەئەم وئەو و هەژاران بچەوسێنێتەوە.

**خوێنخوار** (ئان) [2] xwênxwar
پیاوکوژ، خوێنخۆر، خوێنکەر، خوێنمژ.

**خوێن خواردنەوە** (ئد) xwênxwardinewe
١- بەخوێنی سەری کەسێ تینووبوون، زۆر ڕق لەکەسێ بوون.
٢- لەتۆڵەسەندن گەڕان.

**خوێنخواریی** (ن) [1] xwênxwarî
جەورکەریی، جەورگەریی، خونخواریی، دڵ ڕەقیی، زاڵمیی، زۆرداریی، ستەمکاریی، ستەمگەریی.

**خوێنخواریی** (ن) [2] xwênxwarî
دوژمنایەتیی بەتین، خوێنخوازیی.

**خوێندار** (ن) xwêndar
خێندار، خێنیی، دوژمنی خوێنیی.

**خوێن داکوژاندن** (ئد) xwên dakujandin
ب(خوێن بەربەست کردن).

**خوێن داویەتییە کەللەی** (ئد)
xwêndawyetîye kelley
خەریکە کەللەی بێت، دەماری هەستی هەستاوە، شێتگیربووە (لەداخی شتێ).

**خوێندکار** (ئان) xwêndkar
ئەوانەی لەپلەی باڵا لەزانکۆ دەخوێنن.

**خوێندگە** (ن) xwêndge
خوێندنخانە، خۆندگا، خوێندنگا، خوێندنگاە، خوێندنگە، خۆندنگا، خوەندەگا، فێرگا، فێرگە، قوتابخانە، مەکتەب، جێگەی دەرس خوێندن، زانکۆ، خوێندنگای باڵا، پەیمانگا.

**خوێندن** (کتپ) [1] xwêndin
خواندن، خۆندن، خۆنن، خوەنسن، خوەنیین، فێری نووسین وخوێندنەوە بوون.

**خوێندن** (کتن،کتپ) [2] xwêndin
ئاواز خوێندن، چریین، خۆندن، خۆنن، گۆرانیی گوتن، گۆرانی ووتن.

**خوێندن** (کتن) [3] xwêndin
چریکاندن، خوێنین (مەل..).

**خوێندن** (کتن) [4] xwêndin
دەورکردنەوە، پێداچوونەوە.

**خوێندنگە** (ن) xwêndinge
ب (خوێندگە).

**خويندنه‌وه** (ند) ١ xwêndinewe
ريز لىَ گرتن، جىَى ريَزبوون.

**خويندنه‌وه** (كتپ) ٢ xwêndinewe
خۆندنه‌وه، شتى نووسراو ده‌وركردنه‌وه، نوسراو خويندنه‌وه، به‌سه‌رشتى نووسراودا چوونه‌وه.

**خوينده‌وار** (ن.ئان) xwêndewar
خۆندكار، خۆنده‌وار، خۆنده‌ڤان، خۆنده‌وان، خۆندگار، خۆنده، خوونه‌وار، خۆنديى، خوه‌ندا، خوينده‌ڤان، خۆنه‌وار، خوينه‌وار، سه‌وادار، سيوادار، خويندكار، باسه‌ودا، ئه‌وكه‌سه‌ى ده‌زانىَ بخوينىَ وبنوسىَ.

**خوينده‌وارى** (ن) xwêndewarî
خۆنده‌وارى، خۆنه‌وارى، خوينده‌ڤانى، سيوادارى.

**خوين ديتن** (كتن) xwêndîtin
بىَ نويَژبوون، تىَكه‌وتن، كه‌وتنه عه‌وزره‌وه (ئافره‌ت).

**خوين رژان** (كتن) ١ xwên rijan
پياوكوژران، خوين كه‌وتنه‌وه.

**خوين رژان** (ند) ٢ xwên rijan
جه‌نگ به‌رپابوون، شه‌ر هه‌لگيرسان، شه‌ركه‌وتنه‌وه.

**خوين رژانه ده‌موچاو** (ند)
xwên rijane demw çaw
ته‌ريق بوونه‌وه، شه‌رم كردن، شه‌رمه‌زاربوون.

**خوين رژتن** (كتپ) xwên rijtin
خوين رژاندن، خوين رژانن، خوين كردن، مروڤ كوشتن، پياو كوشتن.

**خوينريژ** (ن) ١ xwênrêj
بكوژ، خوينخوار، خوينه‌خوار، خوينه‌خواره، خينيى، خوينين، ميركوژ، چاوسوور.

**خوينريژ** (ن) ٢ xwênrêj
بىَداد، چه‌پكه‌ر، خورت، زال.

**خوينريژى** (ن) ١ xwênrêjî
بكوژيى، ببريى، پياوكوژيى.

**خوينريژى** (ن) ٢ xwênrêjî
بىَداديى،چه‌پكه‌ريى، خورتيى، هب (خوينخواريى)

**خوين ژه‌هراويى بوون** (كتن)
xwên jehrawîbün
خوون ژه‌هريى بوون، خوين زه‌هراويى بوون.

**خوين سارد** (ئان) ١ xwênsard
به‌حه‌وسه‌له، به‌سه‌بر، له‌سه‌رخۆ، هيدى، هيمن، كه‌سىَ كه‌زوو هه‌ل نه‌چيت، يه‌كىَ كه‌دره‌نگ رقى هه‌ستىَ.

**خوين سارد** (ئان) ٢ xwênsard
خاو، خليچك، سسته‌په‌له، مرده‌لۆخه.

**خوين سارديى** (ن) xwênsardî
پشوودريژيى، حه‌وسه‌له، سه‌بر، له‌سه‌رخۆيى، هيمنيى.

**خوين سه‌ندان** (كتپ) xwênsendan
خوين ستاندن، تۆله‌كردنه‌وه، خوون سه‌نن.

**خوين شيرن**(ئان) xwên şîrîn
ب (خوين شيرين).

**خوين شيرين** (ئان)١ xwên şîrîn
ئيسك سووك، جوان، خوين شيرن، خوين گه‌رم، ره‌زاسووك، ژيكه‌له، قشت.

**خوين شيرين** (ئان)٢ xwên şîrîn
خۆش ره‌فتار، خۆشه‌ويست.

**خوين شيرينيى** (ن) xwên şîrînî
ئيسك سووكيى، جوانيى، خوين گه‌رميى، ره‌زاسووكيى، قشتيى.

**خوين قولپ دان** (ند) xwênqulpdan
ئيسك سووك بوون، خوين گه‌رم بوون.

**خوين كردن** (كتپ) xwênkirdin
ب (خوين رشتن).

**خوين كردنه كاسه‌وه** (پن)١
xwênkirdine kasewe
تاوان خستنه پال كه‌سىَ، چاره‌ى كه‌سىَ ره‌ش كردن له‌لاى يه‌كيكى ديكه، لايه‌ك له‌كه‌سىَ هاندان، درۆو ده‌له‌سه بۆ كه‌سىَ هه‌لبه‌ستن.

**خوين كردنه كاسه‌وه** (ند) ٢
xwênkirdine kasewe
هه‌ولى به‌كوشت دانى كه‌سىَ.

**خوين كردنه كاسه‌وه** (ند)
xwênkirdine kasewe٣
جزيادان، زۆر بۆ هينان.

**خوين كوژانده‌نه‌وه** (ند)
xwênkujandinewe
ئاژاوه‌نه‌هيشتن، خوين داكوژاندن، فيتنه‌يى وه‌ژى خوين رژاندن نه‌هيشتن، كۆتايى هينان به‌رووداويكى پر له‌مه‌ترسيى، خوين سرپينه‌وه، ئاشتى خستنه‌ناو كۆمه‌ليكى خوينه خوىَ.

**خوينگر** (ن) ١ xwêngir
خزمى زۆر نزيكى كوژراو.

**خوینگر** (ن) [۱] xwêngir
خزمی زۆر نزیک.
**خوینگر** (ن) [۲] xwêngir
کەسێ کەبتوانێ تۆڵەی کوژراو بکاتەوە.
**خوین گرتن** (کتپ،پز) [۱] xwêngirtin
خوین بەردان، حەجامەت گرتن، کەڵەشاخ گرتن.
**خوین گرتن** (ند) [۲] xwêngirtin
سام گرتن،قەڵەمی ئەژنۆشکان، شیوان و ورەبەردان، تۆقین (بەدیتنی مرۆڤی کوژراو).
**خوین گرتن** (کتپ) [۳] xwêngirtin
نمونەی خوین وەرگرتن (بۆ مەبەستی پزیشکیی).
**خوین گرتنەوە** (کتپ) xwêngirtinewe
خوین ڕاوەستاندن.
**خوین گرتوو** (ئان) xwêngirtü
خوینگیر، شیواو، شیویاگ، (لە دیتنی خوینی مرۆڤ...).
**خوینگەر** (ن) xwênger
حەجامەتگر، خوین بەردەر (بۆ مەبەستی چارەکردن).
**خوینگەرم** (ئان) [۱] xwêngerm
ب (خوین شیرین).
**خوینگەرم** (ئان) [۲] xwêngerm
بەهەڵمەت، سوورلەسەر ئەنجامی کار، سوور لەسەر مەبەست.
**خوین گەرم** (ئان) [۳] xwêngerm
تووڕە، ڕقاویی، قیناویی، کەللەیی، کەسێ کەزوو هەڵدەچێ.
**خوین گەرمیی** (ن) xwêngermî
تووڕەیی، ڕق.
**خوینگیر** (ن) xwêngerimî
خواگیری کوشتنی ناڕەوا،
خواگرتوو، غەزەب لێ گیراو (بەهۆی کوشتنی کەسیکەوە).
**خوین لەبەدەندانە مان** (ند) [۱]
xwên lebedenda neman
بێ هیزبوون، لاوازبوون.
**خوین لەبەدەندانە مان** (ند) [۲]
xwên lebedenda neman
ترسان، زارە ترەک بوون.
**خوین لەدڵ تکان** (ند) xwênle diltikan
خوین دانەکەللە، دڵ پڕ لەداخ بوون، زۆر خەفەت بەدەستەوە خواردن، مەراق کردن.

**خوین لێ هاتن** (کتن) xwên lê hatin
دەخوین هاتن، خوین لێ چۆڕان.
**خوینمژ** (ن) xwênmij
ب (خوین ڕیژ).
**خوین مژیین** (کتن) xwênmijîn
زۆرداریی کردن، ستەمکاریی کردن.
**خوین وون بوون** (ند) xwên wunbün
خوین با بردن، خوین بەهەدەرچوون، تۆڵەوەسین نەبوون، لەخۆڕایی کوژران.
**خوین هاتنە جۆش** (ند) xwên hatine coš
هەست جوولان بەهۆی هاو خوینیەوە.
**خوینە خوار** (ن) xwêne xwar
دوژمنی خوینیی، خوینەخوارە.
**خوینەر** (ن) xwêner
چراغ، فیرخواز، قوتابیی.
**خوین هەستان** (ند) xwênhestan
دەمارگرتن، زۆر تووڕەبوون.
**خوین هەڵاوردنەوە** (ند)
xwên helawirdinewe
زۆر قەڵس بوون، زۆر ناڕەحەت بوون.
**خوین هەڵینانەوە** (کتن) xwên helênanewe
خوین ڕشانەوە، خوین هەڵاوردنەوە، خوین هەڵهینانەوە،خوین هینانەوە.
**خوینی بۆ گەڕیی دەشێ** (ند)
xwênî bo gerî dešê
١- زۆر پیس وبۆگەنە. ٢- مرۆڤیکی زۆر نالەبارە.
**خوینی پیس** (ن) xwênî pîs
خوینی ڕەشەوەبوو.
**خوینی تۆ لە خوینی من ڕەنگینترە!** (پن)
xwênî to le xwênî min rengîn tire
لەیەک کەمترنیین، هەردووکمان چۆن یەکین.
**خوینی جگەر** (خ.) xwênîciger
چەرمەسەرە، خوینی دڵ، کۆتەک، مەینەت.
**خوینی سیاوەش** (خ.) xwênî siyaweš
خوینی سیاووشان،
ناڕەزایی بەردەوام، ناڕەحەتیی هەمیشەیی.
**خوینیی** (ئان) xwênî
پیاوکوژ.
**خویاوک** (ن) xwêwawk
ئاوخوا، ئاووخوێ، خوێ یاوک.
**خویی تەوزە** (ن) xwêy tewirze
خوێی سپی، خوێی هەوریی.

**خوو** (ن) xü ١

پیشه، خده، نه‌ریت، ئازین، ئاکار، ئه‌دا، ره‌وشت، کردار، سه‌رڕشته، خووی.

**خوو** (ن.پز) xü ٢

فێ، نه‌خۆشیی فیداریی.

**خووانچه** (ن) xüwançe

سینیی، ته‌بلیی، مه‌جمه‌عه.

**خوو خراپ** (ئان) xü xirap

ئاکاربه‌د، به‌دڕه‌وشت، خوو خراو.

**خووخنک** (نک) xüxink

کونه تفنگ، کونه لووت، کونه‌که‌پوو.

**خوو خۆش** (ئان) xüxoš

خوو ره‌وشت په‌سند.

**خوودانه شتێ** (ند) xüdane şitê

خوو به‌شتێکه‌وه گرتن.

**خووده** (ن) xüde

تاس کڵاو، کڵاوخوود، کڵاوقووت، کڵاوی جه‌نگ، خووده..

**خووده‌زرێ** (ن) xüdezrê

کڵاو زرێ.

**خوور** (ن.رو) xür

ئه‌سپیندار، خۆجه‌لی.

**خوورجێ** (ن) xürjê

تووڕه‌یی زۆر، قه‌ڵسیی، ناڕه‌حه‌تیی، شێتگیریی.

**خووره** (ن.می) xüre

به‌رسیله، خوورگ.

**خووز** (ئان) xüz ١

ناپه‌سند.

**خووز** (ئان.ن) xüz ٢

پشت چه‌ماو، پشت چه‌میاگ، خووز، کۆم، کووڕ، خوول.

**خووز** (نک) xüz ٣

چرچ، چرچ ولۆچ، چرچیی(ده‌م وچاو).

**خووز** (ن) xüz ٤

کیش، گوڕ.

**خووز تێ گه‌ران** (کتن) xüz têgeran

خووز تێگه‌رانه‌وه، بووژانه‌وه، که‌وتنه‌سه‌رخۆ، هێز تێ گه‌رانه‌وه (نه‌خۆش..)، وه‌که‌یف هاتن دوای لاوازیی، به‌خۆدا هاتنه‌وه.

**خووز تێ گه‌رانه‌وه** (کتن) xüz têgeranewe

ب(خووز تێگه‌ران).

**خووزهێنانه‌وه** (کتن) xüz hênanewe

جۆش خواردنه‌وه، ساڕێژبوون، خۆگرتنه‌وه (ئێسکی شکاو یان برین)، هاتنه‌وه‌یه‌ک (برین).

**خووس** (ن) xüs

ئاڵیشک، ئه‌ڵماسه، خویسار، خوێن، خوێس، خووز، خویسه، خویسک.

**خووسان** (کتن) xüsan ١

خاوبوونه‌وه، خووسیان، خویسان، نمان، نه‌رم بوون، نه‌رم بوونه‌وه، نه‌رمه‌وه‌بوون (به‌هۆی ئاوه‌وه یان ته‌ڕبوونی‌یه‌وه).

**خووسان** (کتن) xüsan ٢

خووسیان، دڵ نه‌رم بوون، قایل بوون، مل دان، رازی بوون، هاتنه‌سه‌ر ڕا.

**خووساندن** (کتپ) xüsandin ١

ته‌ڕکردن (چه‌رم بۆ نه‌رم بوون)، خاوکردنه‌وه، نماندن، نه‌رم کردن.

**خووساندن**(ند) xüsandin ٢

قایل کردن، که‌سێ نه‌رم کردن،هێنانه سه‌ر ڕا.

**خووساندنه‌وه** (کتپ) xüsandinewe

دووباره خووساندن، نه‌رم کردنه‌وه، تلیساندنه‌وه، خووساننه‌وه.

**خووسانه‌وه** (کتپ) xüsanewe

شل بوونه‌وه، نه‌رم بوونه‌وه، تلیسانه‌وه، خووسیانه‌وه.

**خووساو** (ئان) xüsaw

خووساوه، خووسیاگ، خویساو، خویساوه، ده‌ئاودا نه‌رم کراو، له‌ئاودا نه‌رم وه‌بوو، نه‌رم بوو، نه‌رم وه‌بوو (به‌هۆی ته‌ڕ بوونیه‌وه).

**خووسیان** (کتن) xüsyan

خۆدان، خۆه‌دان، هب(ئاره‌ق کردنه‌وه).

**خووک** (ن) xük

باج، پیتاکی میریی، خووگی، خویک، ماڵیات.

**خووگ** (ن.ئان) xüg

به‌ڵخه، گاکوڵ، ماڵوس، هب (به‌راز).

**خووگانه** (ئاک) xügane

به‌رازئاسایی، له‌ڕه‌فتاردا وه‌ک به‌راز.

**خووگرتن** (کتن) xügirtin ١

خووبه‌ستن، فێره‌خوویه‌ک بوون، فێری نه‌ریت بوون.

**خووگرتن** (کتن) xügirtin ٢

هۆگربوون.

**خووگرتوو** (ئان) xügirtü ١

فێر بووی ره‌وشتێک.

**خووگرتوو** (ئان) ٢ xügirtü

خووگرتیی، هۆگر.

**خووگەملە** (ئان) ١ xüge mile

مل ئەستوور، مل بەراز، مل قەویی.

**خووگەملە** (ئان) ٢ xüge mile

سەر رەق، کەللە رەق.

**خووگەملە** (ئان) ٣ xügemile

١- کیـــشمەکیش، گـــوریس کیـــشەکیی، گـــوریس کیشکێ. ٢- پێشبرکێ، پێش برکە، ملەملانێ.

**خوول** (ئان) xül

لارەمل، مل خوار (مرۆ ولەبەر نەخۆشیی).

**خووندیی** (ن) xündî

بـــووکیی، ئەوانـــەی لەگـــەڵ زاوا دەچـــن بـــووک دەگوێزنەوە بۆ ماڵی زاوا.

**خوونە** (ن،رو) xünc

چەڵتووک، تۆوی برنج.

**خوونەرم** (ئان) xünerim

رانەرم، لەسەرخۆ.

**خوو رەوشت** (ن) xüwrewišt

رەفتار، رەویەت، نەریت.

**خووهزیی** (نسپ،کی) xühzî(ki)

ب (خۆزگە).

**خوویا** (ئان) xüya

ئاشکرا، بەرچاو، دیار.

**خوویرک** (ن،جچ) xüwîrk

مۆرانە، مۆرکە.

**خووی شیریی هەتا پیریی** (پن)
xüy šîrî heta pîrî

خووی منداڵیی هەتا کاتی پیریش

خـــووی منـــداڵیی هـــەتا کـــاتی پـــیریش هـــەر لەگـــەڵ مرۆڤدایە.

**خووینەر** (ن) xüwyner

خوێنەخۆر، دوژمنی خوێنیی.

**خۆ** (ن) ١ xo

ئاشنا، دۆست، ئاسیاو.

**خۆ** (ئاک) ٢ xo

بەراستیی، تمەز، تومەز، لەڕاستیدا.

**خۆ** (ئاک) ٣ xo

لەئاکامدا، لەئاکاما.

**خۆ** (ئپ) ٤ xo

کەچیی.

**خۆ** (ن) ٥ xo

ئارەقەی لەش، هب(خوە).

**خۆ** (ج، ئاک) ٦ xo

خۆم، من خۆم، خودی خۆم، بۆ خۆم.

**خۆ** (ن) ٧ xo

ب (خوناو).

**خۆبادان** (کتن) xobadan

گەنجەفەکردن، نازکردن.

**خۆبان** (ئان) xoban

دل سارد، ناهومێد.

**خۆبردنە ئەوپەڕی دنیا** (ئد)
xo birdine ewperî dinya

خۆ بێ ئاگا پیشان دان، (لەکاروباریک) خۆ گێل پیشان دان (لەزانینی ئیش وکاریک).

**خۆ بردنە پێش** (ئد) xobirdine pêš

خۆ بردنە پێشەوە، خۆخۆشەویست کردن، دۆستایەتی خۆ نیشان بەکەسێدان، نەریت کردن بەئارەزوو و ویستی کاربەدەستێ، ئاخاوتن بەپێی دڵی کەسێ، خۆ رەپێش کردن.

**خۆبڕین** (کتپ) ١ xo birîn

خۆ بریندار کردن.

**خۆبڕین** (کتپ) ٢ xo birîn

خۆ کوشتن، خۆ لەبەین بردن.

**خۆبڕین** (کتپ) ٣ xo birîn

لـــەخۆدان (بەگریانـــەوە)، بەدەســـت لەســـەرو رووی خۆدان (لەشیوەندا)، خۆ رنینەوە، خۆ برینەوە.

**خۆ بۆکوتان** (ئد) xo bokutan

تەقەلادان، کۆشش کردن، هەوڵ دان.

**خۆبۆنانەوە** (ئد) ١ xobonanewe

چاوەڕێی هەلێ کردن بۆ تووش کردنیکەسێ، چاوەڕێی هەل کردن، خۆ بۆ هەڵخستن.

**خۆبۆنانەوە** (ئد) ٢ xo bonanewe

چـــاوەڕێی دەســـگیربوونی شـــتێ کـــردن، کەوتنـــە چاودێریی شتێکەوە، خۆ بۆ لەبنەدا شاردنەوە.

**خۆبوون** (کتن) ١ xobün

بوون بەخۆ، بوون بەخزم.

**خۆبوون** (کتن) ٢ xobün

بوون بەئەندام لەکۆمەڵێکدا.

**خۆبوون** (کتن) ٣ xobün

بەماڵی خۆزانیین(شوێنێ).

**خۆ بەترانن دان** (ئد) xobe tiranindan

بـــەرزیان کـــەوتن لەئـــەنجامی کارێکـــدا، خۆخـــستنە

چورتمەوە لەئەنجامی هەڵەشەییدا.

**خۆبەخت کردن** (ند) xobext kirdin

خۆ لەپێناو نان، خۆفیداکردن،
خـۆ لەپـێناوی مەبەسـتێکدا بـەخت کـردن، مـردن لەرێگەی مەبەستێکدا، خۆدانـان، خـۆ بەکوشـت دان (لەرێگەی مەبەستێکدا).

**خۆ بەردان** (ند) ١ xoberdan ( )

دڵفرەیی پیشاندان (لەجاران زیاتر)، دەست بڵاویی کردن، دەست بڵاویی و مـاڵ بەفیـڕۆدان، زیـاد لـەخۆ دەست بڵاویی کردن.

**خۆبەردان** (کتپ) ٢ xoberdan

خۆڕزگارکردن، خۆوەکردن (لەبەستنەوە).

**خۆبەردانەوە** (کتپ) ١ xo berdanewe

خۆخستنە خوار.

**خۆبەردانەوە** (کتپ) ٢ xoberdanewe

تەمەڵی کردن لەئانقەست، خۆ مراندن بەرامبەر ئیش و کار.

**خۆبەرپێش** (ئان) xoberpêş

پـاتەخۆر، زمـان لـووس، ماسـتاو سـاردکەرەوە، مەراییکەر.

**خۆبەزەویدادان** (ند) ١ xobezewîdadan

خەوتن، نوستن.

**خۆبەزەویدادان** (ند) ٢ xobezewîdadan

مان گرتن.

**خۆبەستن** (کتن) ١ xobestin

خۆگرتن.

**خۆبەستن** (ند) ٢ xobestin

ساز بوون.

**خۆبەشت زان** (ئان) xo bešit zan

ب (بەدەبدەبە).

**خۆبەشت زانین** (ند) xo bešit zanîn

خەڕۆ بوون، خۆ هەڵکێشان، شانازیی کـردن، قەپـی گەورە داگرتن، لووت بەرزبوون.

**خۆبەشتێکەوە بەستن** (ند) xo bešitêkewe bestin

چارە نووسی خۆ بەشتێکەوە بەندکردن.

**خۆ بەقەڵبەدادان** (ند) xo be qelbedadan

خۆ تووشی دەردەسەریی کردن، خـۆ تووشـی گاشـە کردن.

**خۆبەکەس نەدان** (ند) xo bekes nedan

خۆبەکەس نەگۆڕینەوە، خۆ لەگشت کـەس بـەزیاتر زانین.

**خۆبەکەسێکەوە بەستن** (ند) xo bekesêkewe bestin

چارەنووسی خۆ بەکەسێکەوە گرێ دان.

**خۆبەکەم زانین** (کتن) xo bekem zanîn

خۆبەکەم گرتن، سەرکز بوون، سەری خۆ بەکز گرتن.

**خۆبەکێش کردن** (ند) xobekêš kirdin

بـەدڕۆاری بەرێـداچوون، بەناڕەحـەتیی بـەرێگادا ڕۆیشتن، خۆ ڕەکێش کردن.

**خۆبەگورگان خواردوودان** (ند) xobegurgan xwardüdan

بەدەستی خۆ خۆتووشی بەڵایەکی گەورە کردن.

**خۆبەهۆ شەنگ شا نەدان** (رس) xo be hošeng ša nedan

بروایی‌یـەکی زۆر بـەخۆبوون، خـۆ لەهـەموو کـەس بەباشترو گەورەتر زانیین، زۆر لەخۆ قایل بوون.

**خۆبین** (ن) xobîn

خۆپەرست، خۆپەسند، خۆدیتن.

**خۆبینیی** (ن) xo bînî

بادی هەوایی، خـۆ پەسـندیی، خـۆ پەسـەندیی، خـۆ خـۆیی، خـۆ خوبیکـەریی، خۆمانـە خۆمانـە، تـەن پەروەریی، تەنخوانیی، من منۆکێ، بەخۆنازیی.

**خۆبینیی کردن** (کتن) xobînî kirdin

بەرزفریین، خۆبەشت زانیین، لووت لەئاسمان کـردن. لەپـشتی خـۆ دەرچـوون، لـەخۆ ڕازیـی بـوون، بـایی بوون.

**خۆپاراستن** (کتن) ١ xo parastin

پارێزگاریی لەخۆکردن، خۆپارازتن،
خـۆ دوورگـرتن لـە، خـۆ لێ پاراسـتن، دوورەپـەرێز بوون.

**خۆپاراستن** (کتن) ٢ xo parastin

پـــارێزکردن، دەســـت لەهەنـــدێ خواردەمـــەنی کشاندنەوە، وازهێنان لەهەندێ خواردەمەنیی کە بـە ئەو کەسە نەکەوێ.

**خۆپارێز** (ئان) ١ xoparêz

خۆدوورە پەرێز ڕاگر، خوددار، دوورەپەرێز.

**خۆپارێز** (ئان) ٢ xoparêz

بەدین، لەخواترس.

**خۆپارێزیی** (ن) xoparêzî

بـەرگریی لـەخۆ، پـارێزگاریی لـەخۆ، خـود داریـی. دوورە پەرێزیی.

**خۆپان** (ن) ١ xopan

تەوەزەلیی، هب(تەمەڵیی).

**خۆپان** (ن) ² xopan
کەلاوە، ویرانە.

**خۆپان** (ن) ³ xopan
جێ هەواری ئاوەدان، هب(ئۆبە).

**خۆپان** (ئان) ⁴ xopan
بێ چارە، کلۆل.

**خۆپۆشاندن** (کتپ) xopošandin
خۆ(پۆشانن، پەنهان کردن، حەشاردان، شاردنەوە، وەشارتن، وەشاردن، لەپەنادان).

**خۆپۆشتە کردنەوە** (کتپ) xo pošte kirdinewe
جل لەبەرکردن.

**خۆپە** (ن) xope
ئەشرەت، عەشرەت، هۆز، ئێل.

**خۆپەرس** (ئان) xoperis
ب (خۆپەرست).

**خۆپەرست** (ئان) xoperist
بەخۆ نـاز، تـەن پـەروەر، تـەنخوا، خـۆ پـەرس، خۆپەسن، خۆپەسەند، خۆ پەسەند، خۆخۆ، خۆبین، خۆخواز، من منۆکە.

**خۆپەسند** (ئان) xopesind
بەدەعیە، بەهەوا، ترزل، تـروتۆپ زل، خۆبەشت زان، لووت بەرز، لەخۆبایی.

**خۆپەسندیی مایە ڕسواییە** (پن)
xopesindî maye riswayîye
خۆ پەسندیی جلی پاکانە ناگریتـەوە. خـۆ پەسـەند کردن خۆ لەکەدار کردنە.

**خۆپێچ دان** (کتن) xopêçdan
خۆ گیف کـردن، خـۆ لـوول کـردن، پەپـۆکە خـواردن (مار..).

**خۆپێدا هەڵواسین** (ند) xopêda helwasîn
خـۆ لەکەسـێ نزیـک کردنـەوە، خـۆ واپیـشان دان کەسەر بەمرۆڤێ بوون، مەرایی کەسێ کردن.

**خۆپێوە ماندوو کردن** (ند)
xopêwe mandü kirdin
خۆماندوو کردن بەراپەڕاندنی ئـیش وکـاری یـەکیکی دیکـەوە، خـۆ مانـدوو کـردن لەگـەڵ، خـەریک بـوون بەجێ بەجێ کردنی ئیشی یەکیکی ترەوە.

**خۆت** (ف) ¹ xot
بۆ خۆت، تۆخۆت، تۆی تۆ، کەسی ترنا.

**خۆت** (ج) ² xot
ئیوە، تۆ، خوەد.

**خۆتاش** (ن) xotaš
خۆتراش، مەکینەی ڕیش تاشین، خـود تـراش، خـۆ تەراش.

**خۆتاڵ کردن** (ند) xotal kirdin
چارەی خۆ ڕەش کردن، چارە گران بوون، ڕەزاگران بوون، گۆشتی خۆتـاڵ کـردن، لای خـەڵک چارەگران بوون.

**خۆتان** (ف) ¹ xotan
ئیوە، بۆخۆتان، خەڵکی تر نا.

**خۆتان** (ف) ² xotan
خۆتانیی.

**خۆت بکە تێرە بەمن مەکە خێرە** (پن)
xot bike têre bemin meke xêre
ئەگەر ئەزانی کەنان دان خێرخواییە تۆ خۆت بیخـۆ کەبرسیت.

**خۆ تراندن** (ند) xotirandin
پـشتی خۆشـکاندن (لەئیـشیکدا)، خـۆ کەشـەنگ کردن، خۆماندوو کردن (ئیجگار زۆر).

**خۆت سەری خۆت نەخورێنیت بەکەس ناخورێ** (پن)
xot serî xot nexurênît bekes naxurê
سووربوون لەسەر پشت بەخۆ.. بەستن.

**خۆت لادە!** (ئسپ) xotlade!
بڕۆبەولاوە!، دوورکەوە!، هوشیاربە!.

**خۆتلاندنەوە** (کتپ،کتن) xotilandinewe
خۆگەوزاندن،گەوزیین.

**خۆ تۆزاویی کردن** (ند) xotozawî kirdin
خـۆ تـووش کـردن، کارێـک بەسـەر خـۆدا هێنـان کەنەکراوە.

**خۆ تووش کردن** (کتن) xotüš kirdin
بەسەهوو چوون، زەللەکردن، هەڵەکردن.

**خۆ تەکاندن** (کتپ) ¹ xotekandin
خـۆ لەتـەپ وتـۆز پـاک کردنـەو، خـۆ پـاک کردنـەوە لەخۆڵ وتۆز.

**خۆ تەکاندن** (ند) ² xo tekandin
پـارەو پـوول بەدەسـتەوەدان، خـۆ بەسـەخیی پیشاندان.

**خۆ تیل کردن** (کتن) ¹ xotîl kirdin
لابەلا ڕۆیشتن.

**خۆ تیل کردن** (کتن) ² xotîl kirdin
خۆتاس ولووس دان.

**خۆتێ خزان** (کتپ) xotêxizan
جلی خۆ کردنەوە، خۆ خزاندنە شوینیکی تەنگ.

**خۆتێ فڕێ دان** ( ند ) xotê firêdan

خــۆتێ هــەڵقورتان. خۆخــستنەناو( فرمانبــەر، هەڵبژاردنەوە ).

**خۆتێ کردن** ( کتپ ) xotê kirdin

خۆخستنە ناو، خۆ هەڵقورتانەناو.

**خۆتێ گرتن** ( کتپ ) ١ xotê girtin

تێ هەڵ کردن، خۆتێ ئاخنین، خۆ تــێ کــردن، خــۆ تێهاویشتن، خۆ تێ هەڵقورتاندن، خۆ قوت کردنەوە لەنێشی خەڵکدا، سنگ هێنانە پێشەوە ( بێ داوالێ کردن )، هەوڵ دان بۆ پچرینی سوودێک، چوونـە نـاو کاری خەڵکەوە سەربەخۆ.

**خۆتێ گرتن** ( کتن ) ٢ xotêgirtin

زیاخۆریی کردن، زێدەخۆریی کردن.

**خۆتێ وەشان** ( ند ) xotêwešan

بەرتیل دان، خۆبەپارە ڕزگارکردن لەگرفتارییەک.

**خۆتێ وەشاندن** ( ند ) xo têwešandin

کارێک جێبەجێ کردن بە- ڕێگەیەکی نهێنی یان نائاسایی.

**خۆتێوەگلان** ( ند ) xotêwe gilan

چوونە ژێربار، گرتنەئەستۆ، گرتنەدەس، وەئەستۆ گرتن.

**خۆتێ هەڵسوون** ( ند ) xotêhelsün

بەزمانی لووس بوونە هەڤاڵ، خۆ بەدۆستی کەسێ پیشان دان، لەکەسێ نزیک بوونەوە، مەرایی کەسێ کردن.

**خۆتێ هەڵقورتان** ( کتن ) xotêhelqurtan

ب( خۆتێ گرتن ).

**خۆتێ هەڵقورتێنەر** ( ن ) xotêhelqurtêner

هەڵمەتە کاسە، خۆبەرەپێش.

**خۆچەلی** ( ن،رو ) xoçelî

ئەسپیندار، سپیندار، سپیچنار، سپیدار، شاتان.

**خۆچێ** ( ن ) xoçê

خـۆجێیی، دانیـشتوی پێشینی گونـد... دانیـشتوی مێژینی دێ.

**خۆحەشاردان** ( کتن ) xo hešardan

خۆ بواردن، خۆ وەشارتن، خۆوەشاردن.

**خۆخ** ( ن،می ) xox

قۆخ، کۆخ ، هلو، هەشتالو.

**خۆخافلاندن** ( کتن ) xo xafilandin

خۆ بەکارێکەوە خەریک کردن، خۆ خلافاندن، خۆ خلافانن، خۆ خەریک کردن، سستە سست کردن.

**خۆ خڕدان** ( ند ) xoxirdan

ب ( خۆ خڕهەڵدان ).

**خۆ خڕ هەڵدان** ( ند ) xo xir heldan

خۆئامادەکردن، خۆ تـەیارکردن، خۆگـورج کردنـەوە، ئامادە وتەیار بوون ( بۆ.... ).

**خۆ خستنە ساجی عەلی** ( ند ) xo xistine sacî elî

ئایەومایە لەبەرد دان، خۆخستنە سـواڵ، خۆنـابووت کردن.

**خۆخلافکێ** ( ن ) xotxilafkê

خەریکیی، سستیی، قنگە قنگێ.

**خۆخواردنەوە** ( ند ) ١ xoxwardinewe

پێش خواردنەوە، قین پەچنینەدڵ، ڕق خواردنەوە، ڕک ئاشکرا نەکردن.

**خۆخواردنەوە** ( ند ) ٢ xoxwardinewe

خەم وخەفەت پەچنینە دڵ.

**خۆخواردنەوە** ( کتن ) ٣ xoxwardinewe

چکانەوە ( چێشت لەسەر ئاگر ).

**خۆخواردنەوە** ( کتن ) ٤ xo xwardinewe

تەرەشوع وەرگرتن، شێ وەرگرتن.

**خۆخۆر** ( ئان،ن ) ١ xoxor

زیان بۆ خۆ بەخش، زیان بەخۆ گەیێنەر.

**خۆخۆر** ( ئان ) ٢ xoxor

دوژمنی گیانی یەکتر، ناتەبا، نارێک ( هاووڵات لە نـاو یەکدا )، دوژمنی گەل ونەتەوەی خۆ.

**خۆخوراندن** ( ند ) ١ xoxurandin

بەشداربوون لەپیتاک کۆکردنەوە،خۆ ئامادەکردن بـۆ بەخشینی شتێ.

**خۆخوراندن** ( کتپ ) ٢ xoxurandin

خارشت لەکۆڵ لەش کردنەوە، خۆ هەڵکڕاندن.

**خۆخۆلێ** ( ن ) xoxolê

ئایشەگوێ درێژ، شەولەبان، منالْ ترسێن.

**خۆخۆیی کردن** ( کتن ) ١ xoxoyî kirdin

خۆپەرستن، خۆپەسندکردن، خۆمانە خۆمانـەکردن، مـن منـۆکێ کـردن، خـۆ بـەخۆیی کـردن، دەسـتەو بەستەکردن.

**خۆخۆیی کردن** ( کتن ) ٢ xoxoyî kirdin

ماڵ جیایی کردن.

**خۆخۆیی کردن** ( کتن ) ٣ xoxoyî kirdin

بەخۆ نازین.

**خۆ داڕشتن** ( کتن ) xo dariştin

بەخۆدا هاتن، پێ گەیشتن ( لاو )،گەورە وتەواو بـوون ( گـەنج )، گەیـشتنە هـەرەتی لاویـی، هـەڵ دان

(بالا..).

**خۆداریی** (ن) xodarî

پشوو، خود داریی، خۆ ڕاگریی، لەسەرخۆیی.

**خۆداریی کردن** (کتن) [1] xodarî kirdin

خودگیریی کردن،دەست پاراستن، دەست ڕاگرتن.

**خۆداریی کردن** (کتن) [2] xodarî kirdin

خۆڕاگرتن (بەرامبەر)، خۆگرتن،دان بەخۆداگرتن، نەکردن.

**خۆداکوتان** (ند) xodakutan

جێ بۆ خۆ کردنەوە، خۆ چەسپاندن، خۆ دامەزراندن، خۆ قاییم کردن، ڕیشە داکوتان.

**خۆداکوتەرە** (ن) xodakutere

خۆبەرەپێش، خۆ تێ هەڵقوتێنەر.

**خۆداگرتن** (ند) [1] xodagirtin

خۆلێ گرتن، گوێ گرتن لەخەڵک، خۆ لێ مات کردن (بۆ گوێ هەڵخستن).

**خۆداگرتن** (ند) [2] xodagirtin

خۆ حەشاردان، خۆ شاردنەوە، خۆ قاییم کردن (لەشوێنێ بۆ مەبەستێ).

**خۆدانان** (ند) [1] xodanan

خۆبەخت کردن.

**خۆدانان** (ند) [2] xodanan

خۆبەکوشت دان لەڕێگەی مەبەستێکدا، خۆ فەوتاندن لەپێناوی شتێکدا، خۆ بەکوشت دان (بۆ مەبەستێ).

**خۆدانان** (کتن،کتپ) [3] xodanan

بڕیار لەسەرخۆدان، لەخۆ ڕابینین.

**خۆدزینەوە** (کتن) xodizînewe

بەنهێنی بەجێ هێشتن، خۆدانەپەنا، خۆنەدیوکردن، شان پێداکردن.

**خۆدۆزین** (کتپ) xodozîn

خۆ لەئەسپێ پاک کردنەوە.

**خۆدەر** (ئان) xoder

کەس نەڕوانەدوو (دارو درەخت)، لەخۆوە دەرهاتوو(ڕووەک).

**خۆدیی کردن** (کتپ) xodî kirdin

ئاگاداریی لێ کردن، خەمخۆریی لێ کردن.

**خۆر** (ن) [1] xor

خوەر، ڕۆژ، هۆر.

**خۆر** (ن) [2] xor

تاو، تیشکی ڕۆژ، خۆرەتاو، هەتاو.

**خۆر** (ن) [3] xor

بێ هەوریی، خۆشیی، ڕۆژیار، سایەقە.

**خۆر** (ن) [4] xor

ب (خاک).

**خۆرا** (ئان) xora

بخۆر، خوری، خوەرا، خوەرۆک، خوەرە، خوەرەک، خۆهرا، خوەهرا، زگەڕۆ، زۆرخۆر، سک دڕاو، گەدەدڕاو، ورگ دڕاو، گاخۆر، لەدەم ڕەش بەربوو.

**خۆراک** (نک) [1] xorak

پرزە، پێخۆر، چاشتیی، چێشت، خارن، خواردن، خوراس، خۆرەن، خوویی، خواردنیی، ڕۆزیی، سەرنان، قووت، گرار، گیرمی، نان.

**خۆراک** (ن) [2] xorak

خۆرەن، ژەم.

**خۆراکیی** (ئان) xorakî

خواردەنیی، ئەوشتەی بۆ خواردن دەشێ، خۆرەن، شیاوی خواردن.

**خۆراندن** (کتپ) xorandin

دەرخوارد دان، دەرخواردان، بەقوڕگدا کردن، کردنە گەرووەوە، خۆرانن.

**خۆرانگاز** (ئان) [1] xorangaz

بەتیشکی خۆر سووتاو، تاو بردوو، تاوبردە، خۆرئەنگاز، خۆربردوو،خۆربردگ، خۆرزەدە، خۆرەنگاز، هەتاوبردوو.

**خۆرانگاز** (ن،پز) [2] xorangaz

شوێنێکی بریندار لەلەش بەهۆی تیشکی خۆرەوە.

**خۆرانگازبوون** (کتن) xorangazbûn

تاوبردن، خۆرانگازی بوون، لەبەرهەتاو لەش سووتان(لەشی مرۆڤ)، هەتاو بردن.

**خۆراوا** (ن) [1] xorawa

ئێوارە، تەنگی بانگی شێوان، تەنگی نوێژی شێوان، دەمی ڕۆژاوا، ڕۆژپەڕ، زەردەپەڕ.

**خۆراوا** (ن) [2] xorawa

خۆرنشین، ڕۆژاوا، ڕۆژئاوا، شوێنی خۆر لێ ئاوابوون.

**خۆراوا** (ئان) [3] xorawa

خۆرئاوا، خۆرنشین، ڕۆژئاوایی، ولاتانی خۆراوایی، ولاتانی ڕۆژاوایی.

**خۆراوابوون** (کتن) xorawabûn

خۆرئاوابوون، خۆرنیشتن، خۆەرنیشتن، یان: ڕۆژپەڕین، زەردپەڕ نەدوبوون.

**خۆراوایی** (نک) xorawayî

خۆرئاوایی، خەڵکی ولاتانی ڕۆژاوا، کەسانی خۆرئاوا، ئەورووپایی.

**خۆرا** (ن) ١ xora

خود سەر (کەسێ کەهەر بەقسەی خۆ ڕەفتار دەکا)، خودڕا.

**خۆرا** (ئان) ٢ xora

بێگوێ، لاسار، سەرسەخت، کەللەڕەق.

**خۆراپسکاندن** (کتن،کتپ) xorapiskandin

خۆراپسکان، خۆڕزگارکردن

لەدەس ئەوانەی کەگرتوویانە، خۆ لەدەس خەڵک ڕزگار کردن.

**خۆرازاندنەوە** (کتن) xorazandinewe

ب(خۆ لەتەل دان).

**خۆراگر** (ئان) xoragir

بەئارام، پشوو درێژ، بەحەوسەڵە، خوددار.

**خۆراگرتن** (کتن) xoragirtin

بەحەوسەڵەبوون، پشووهەبوون، دان بەخۆداگرتن، سەبر کردن، سەبرگرتن، ئارام گرتن.

**خۆراگری** (ن) ١ xoragirî

پشووداریی، لەسەرخۆیی.

**خۆراگری** (ن) ٢ xoragirî

ئارامی، حەوسەڵە، هب (ئارام).

**خۆرانان** (کتن) xoranan

بەخۆنازیین، بەخۆ هەڵگوتن، بەفیزبوون.

**خۆ ڕاوەشان بەسەر ئەم وئەودا** (ند)

xo rawešan beser emw ewda

خۆبادان بەسەرخەڵکدا، شانازیی کردن، گەنجەفە کردن.

**خۆرایی** (ئان) ١ xoraî

ئیف، بێ نرخ، بەلاش، بێپارە، خۆیرایی، خۆڕاویی، فیرۆ، مفت، مفتە، هەروا، بەهیچ.

**خۆرایی** (ئاک) ٢ xoraî

بەهیچێ چووکێ، بێ هۆ، لەفیرۆ، لەهیچێ، لەهیچە.

**خۆرست** (ئان) ١ xorist

خوا کرد.

**خۆرست** (ئان) ٢ xorist

ب (خۆدەر).

**خۆرسک** (ئان) xorisk

بۆ خۆڕواو، خۆرست، خۆدەر، درەختێکە لەخۆیەوە ڕوابێ، خۆکرد، لەخۆوەڕواو.

**خۆرم** (ن) xorim

بارەگیای پەستراو، بەستەگیای بەستراو بۆبار، شەغرە گیا.

**خۆرو** (ئان) xorü

بێ خەوش، پاقژ، پاکژ، پاک وخاوێن، ڕەنگ پاقژ.

**خۆرووت کردنەوە** (کتپ) xorütkirdinewe

جل داکەندن، جل فڕێ دان، جل لەبەرخۆداماڵیین.

**خۆ ڕەپێش کردن** (ند) xo repêš kirdin

ماستاو ساردکردنەوە، هەوڵ دان بۆ گەورەبوون (لەڕێگەی مەراییەوە).

**خۆرەم** (ن) ١ xorem

توندیی، تەوژمیی(با).

**خۆرەم** (ن) ٢ xorem

ڕەژنە (باران)، هب(تاو).

**خۆرەنگ** (ن) xoreng

١- ڕەنگی خواکرد. ٢- ڕەنگێ کەکاڵ نابێتەوە.

**خۆرێژگاو کردن** (ند) xorêjgaw kirdin

خۆسووک ورسواکردن، خۆ کردنە گاڵتە جاڕی ئەم وئەو.

**خۆرپەرست** (ن) xor perist

ڕۆژپەرست، مەجووسیی، مەجۆسیی، (ئەندامانی ئاینی زەردەشت ئەوەی ئەو کۆمەڵە ئاوارانەی لەسەدەی حەوت وهەشتی زاینیدا

لەدەست تەنگێ پێ هەڵچنینی ئیسلام دەرپەڕیون بۆ هندستان.

**خۆرتانیی** (ن) xortanî

تافی لاوی، ڕۆژیاریی گەنجیی، لاوەتیی، هەرەتی گەنجیی.

**خۆرزەردە** (ئان) xor zerde

ب (خۆرانگاز).

**خۆرشت** (ن) xorišt

ئاش، پێخۆریی کوڵاو، چێشتی شلە، خۆرش.

**خۆرکە** (ن،جج) xorke

خۆرک، مۆرانە، مۆرکە، خورکە.

**خۆرکەوتن** (کتن) xorkewtin

تاوهەڵاتن، ڕۆژ هەڵاتن، هەتاوکەوتن.

**خۆرگەزەردە** (ن) xorgezerde

زەردەپەڕ، کاتی زەردپەڕ.

**خۆرنشین** (ن) xornišîn

ب (خۆراوا).

**خۆرنەوەزان** (ن) ١ xornewezan

خۆرنەگەز، سێبەر، سێوەر، نزار، نسار، نسرم.

**خۆرنەوەزان** (ن) ٢ xornewezan

ئەشکەوتی بەدڵۆپە لەنزاری چیادا، شوێنی سەخت و نسرم لەشاخ کەهەتاوی تێ نەکەوێ وگیای تیاسەوز

ببێ ودڵۆپ دڵۆپ ئاوی لێ بتکیتە خوارەوە.

**خۆروەزان** (ن.) xorwezan

بەرۆچکە، بەر ڕۆژ، بەربەرۆچکە، بەرۆژ، بەربەرۆژ، خۆرەتاو، خۆرەوزان، خۆرەوزەن، خۆرگیر، بەرهەتاو.

**خۆروەزان** (ن) xorwezan

ب (خۆرهەلات).

**خۆرە** (ن،پز) [1] xore

برینی پیس، برینی داوەشین، پووتک، تیراوێ، خۆرکە، گانگرین.

**خۆرە** (ن) [2] xore

بخۆر، خۆر، ئەوکەسەی ئەخوا، ئەوەی دەخوا.

**خۆرەتاو** (ن) [1] xoretaw

تیشکی ڕۆژ، خۆر، هەتاو.

**خۆرەتاو** (ن) [2] xoretaw

ب (خۆروەزان).

**خۆرەنگازی**(ن،پز) xorengazî

تاو بردوویی، خۆر بردگیی، هەتاو بردوویی.

**خۆرەوە** (ن) xorewe

بنۆش، نۆشەر، کەسێ کەدەنۆشێ.

**خۆرهەلات** (ن) [1] xorhe<u>l</u>at

خۆرەلات، دەمی خۆرکەوتن، کاتی ڕۆژهەلات، کاتی ڕۆژەلات.

**خۆرهەلات** (ن) [2] xorhe<u>l</u>at

خاوەر، خوەرەلا، خۆرەوەزان، ڕۆژهەلات، هۆرامان، هەورامان، ئەو شوێنەی کەخۆر لێی هەڵ دێ.

**خۆرهەلاتن** (کتن) xorhe<u>l</u>atin

خۆرکەوتن.

**خۆرهەلاتناس** (ن) xorhe<u>l</u>atnas

ڕۆژ هەلاتناس.

**خۆز** (ن،پو) xoz

قۆزاخە (لۆکە..).

**خۆزگە!** (نسپ) [1] xozge!

بریێ، بریا، خۆزگا، خۆزگایەکوو، خۆزیا، خۆزیێ، خوەزکا، خوەزگە، خوەزێ، خوەزیا، خوەزیکا، خوەزەو، خۆزیکا، خووەزیێ، خۆشا، کاشکا، کاشکای، کاشکی!.

**خۆزگە** (ن) [2] xozge

خۆزێ، خۆزیا، خوەزێ.

**خۆزگە بەتۆ!** (نسپ) xozge beto

بریا وەک تۆ بام!، خۆزگەم بەتۆ!، خۆزگەم بەخۆت.

**خۆزگە بە خۆزگای خوا!** (نسپ)

xozge be xozgay xwa!

کاشکی، کاشکا.

**خۆزگە خواستن** (ند) xozge xwastin

ئاوات خواستن، ئارەزوو کردن، حەز بەجێبەجێ بوونی کارێک کردن، حەزگە بردن، خۆزگە بردن.

**خۆزگەی دڵ** (ن) xozgey di<u>l</u>

ئاواتی دڵ.

**خۆس** (ن) xos

تووڵ، شووسەوە، شووڵ، شوولک.

**خۆسازکردن** (کتن) xosazkirdin

خۆ ئامادەکردن.

**خۆسوورکردنەوە** (ند) xo sürkirdinewe

خۆ گیف کردن.هب (تووڕەبوون/١).

**خۆسەر** (ئان) [1] xoser

خودسەر، سەربەخۆ.

**خۆسەر** (ئان) [2] xoser

سەرەخەر، کەللەڕەق، لاسار.

**خۆسەر** (ئاک) [3] xoser

خودسەر، سەربەخۆ، لەخۆوە.

**خۆسەر** (ئان) [4] xoser

ب (تایبەتیی).

**خۆسەریی** (ن) xoserî

سەرەخەریی، کەللەڕەقیی، لاساریی.

**خۆش** (ئان) [1] xoš

چاخ ، چاک، دروست، ساغ، ساغ وسەلامەت، گەنگاز.

**خۆش** (ئان) [2] xoš

ب (ئاودار).

**خۆش** (ن) [3] xoš

خۆشیان، دەمی بێباران، کژو هەوای پەسند، سامال.

**خۆش** (ن) [4] xoš

توندیی با، خیرایی هەوا.

**خۆش** (ئاک) [5] xoš

پەلە، خیرا، لەز.

**خۆش** (ئان) [6] xoš

پەسند، دلگیر (بۆن).

**خۆش** (ئان) [7] xoš

جوان، قەشەنگ.

**خۆش** (ئان) [8] xoš

بەچێژ، پڕ لەچێژ، پرمەزە، خوەش. هب(بەتام).

**خۆش** (ئان) ١ xoš

دلشاد، کراوە (دل).

**خۆشا!** (ئسب) xoša

ب (خۆزگە).

**خۆشاتن لێ کردن** (کتپ) xošatin lê kirdin

بەخێرهاتن لێ کردن، بەخێرهێنان، خۆش هاتیی لێ کردن.

**خۆشاردنەوە** (کتن،کتپ) ١ xošardinewe

خۆ بزرکردن، خۆ پەنهان کردن، خۆ دزینەوە، خۆ شاردنەوە، خۆگوم کردن، خۆ لەخەڵک ون کردن، خۆ نەدیو کردن، خۆ وەشاردن.

**خۆشاردنەوە** (ئد) ٢ xošardinewe

دەموچاو شاردنەوە، ڕووشاردنەوە، شەرم کردن.

**خۆشاو** (ن) xošaw

خۆشاب، کەمپووت، ئاوی مێوژ لەگەڵ میوەی وشک.

**خۆشاواز** (ئان) xošawaz

خۆش ئاواز، خۆش بێژ، خۆش دەنگ، دەنگ بێژ، خۆش خوان.

**خۆشاوازیی** (ن) xošawazî

خۆش ئاوازیی، دەنگ خۆشیی.

**خۆش باوەڕ** (ئان) xošbawer̲

بێ فێڵ وفەرەج، خۆش بڕوا، دڵ ساف، زوو باوەڕ، ساویلکە.

**خۆش باوەڕیی** (ن) xošbawer̲î

خۆش بڕوایی، دڵ سافیی.

**خۆشبای!** (ئسب) xošbay!

خۆش بی!، ساغ بی!، سەلامەت بی!.

**خۆش بن!** (ئسب) ١ xošbin!

ئێوە ساغ بن.

**خۆش بن!** (ئسب) ٢ xošbin!

سوپاس !.

**خۆش بووران** (کتن) ١ xošbûran

خۆش ڕابواردن، کەیف کردن.

**خۆش بوون** (کتن) ٢ xošbûn

داگیرسان، گڕسەندن، هەڵ بوون، هەب (بلیسە سەندن).

**خۆش بوون{چەرم}** (کتن) ٣ xošbûn (çerim)

ئامادەبوون بوبەکارهێنان، شیاوی بەکارهێنان بوون.

**خۆش بوون** (کتن) ٤ xošbûn

لەناخۆشی ژیان دوور بوون.

**خۆش بوون** (کتن) ٥ xošbûn

پێگەیشتن، تام ولەزەت تێ‌زان، گەیشتن، گەیین (میوە..).

**خۆش بوون** (کتن) ٦ xošbûn

بووردن، بەخشیین، چاو لێ پۆشیین، لێ بوردن، لێ خۆش بوون، وەش کردن.

**خۆش بوون** (کتن) ٧ xošbûn

ڕێک وپێک بوون، لەجێی خۆیدابوون.

**خۆش بوون** (کتن) ٨ xošbûn

پوختەبوون، شیاوی خواردن بوون.

**خۆش بوونەوە {ئاووهەوا}** (کتن) ١ xošbûnewe(aw w hewa)

خۆش کردنەوە.

**خۆش بوونەوە** (کتن) ٢ xošbûnewe

خۆشەوەبوون، خاسەوەبوون، لەناساغی هەستانەوە، لەنەخۆشی هەڵسانەوە، خوەش بوون، خۆش بوون.

**خۆش بوونەوە** (کتن) ٣ xošbûnewe

ب (ئاشت بوونەوە).

**خۆش بە!** (ئسب) ١ xošbe!

خەمت نەبێ، خەمت نەوێ!.

**خۆش بە!** (ئسب) ٢ xošbe!

بنۆشە(مەی..)، مەست بە!، نۆشی گیانت بێ!، نۆشی کە!.

**خۆش بەخت** (ئان) xošbext

خاوەن نگین، خۆش نگین، ناوچاوپاک، ناوچەوان باش.

**خۆش بەختانە** (ئاک) xošbextane

بەختەوەرانە.

**خۆش بەخت بوون** (کتن) xošbext bûn

بەخت وبازبوون، بەختەوەربوون، بەهرەمەندبوون.

**خۆش بەختیی** (ن) xošbextî

بەختیاریی، خۆش نگینیی، ناوچاو ڕۆشنیی، نگینیی.

**خۆشبەز** (ئان) xošbez

تیژڕۆ، خۆش ڕەوت، خۆشڕەو.

**خۆشبین** (ئان) xošbîn

دوور لەناهومێدیی، چاکبین، گەشبین، هەر بەهیوا، هەر بەهومێد، خۆشنوود.

**خۆشبیی!** (ئسب) xošbî!

ساغ وبەدەماغ بی!.

**خۆش پۆش** (ئان) xoš poš

پۆشناخ، پۆشتەوپەرداخ، تەرپۆش، شیک پۆش، کۆک وپۆشتە، جوان پۆش.

**خۆشتن** (کتن) xoštin[1]
لەشی خۆشتن، گەرماوکردن.
**خۆشتن** (کتپ)[2] oštin
خوسڵ کردن، لەش پیسی دەرکردن، مەلەکردن بەنیازی لەش پیسیی خۆ دەرکردن.
**خۆشتەویی** (ن) xoštewî
ئارامی دڵان، خۆشەویس، خۆشەویست، خۆشەویی، دەنگ، لەبەردڵ، لەبەردڵان، دڵ ئارام، دڵارام.
**خۆشحاڵ** (ئان) xošh̲al̲
بەختیار، خۆش دەماخ ، خۆشنوود، خوەشاڵ، دلشاد، ڕازیی، شادمان، کەیف ساز، شاد.
**خۆشحاڵ بوون** (کتن) xošh̲al̲bûn
بەختیاربوون، خۆەشالە بوون، دلشادبوون، شادمان بوون.
**خۆشحاڵ کردن** (کتپ)[1] xošh̲al̲ kirdin
گوزەران خۆش کردن.
**خۆشحاڵ کردن**(کتپ)[2] xošh̲al̲kirdin
بەختیارکردن، دلشاد کردن، شادمان کردن، کامەران کردن.
**خۆشحالیی** (ن) xošh̲al̲î
بەختیاری، خۆشنوودی، دلخۆشی، دلشادی، شادمانی، خوەشالی.
**خۆشخانە** (ن) xošxane
خۆشگە، خۆشەخانە، دەباخانە، ئەو شوێنەی چەرمی تیداخۆش دەکەن.
**خۆش خۆر** (ئان) xošxor
کەسێ خۆراکی باش دەخوا.
**خۆش خۆش** (ئان)[1] xošxoš
بەدلشادیی، بەکەیف سازیی.
**خۆش خۆش** (ئان)[2] xošxoš
چیژەخۆش، هب:(بەلەزەت).
**خۆش خۆش** (ئاک)[3] xošxoš
پەلەپەل، خیرا خیرا.
**خۆش خۆش** (ئاک)[4] xošxoš
بەردەوام.
**خۆش خەبەر** (ن) xošxeber
بەمزگینیی، خۆش خەوەر، مژدەدەر، مژدە هین.
**خۆشدوو** (ئان)[1] xošdû
خۆش دەڤ، دەراوی ئاخاوتنی خۆش(کەسێ)، قسە خۆش، ووتە خۆش.
**خۆش دوو** (ئان)[2] xošdû
بدوو، بەدەم وپل، خۆش گوفتار، دەم پارام، قسەزان.
**خۆش ڕابواردن** (کتن،کتپ) xošd r̲abwardin
خۆش گوزەران کردن.
**خۆش ڕوو** (ئان) xošr̲û
خەنەران، دەم بەپێکەنین، ڕووخۆش، ڕووگوشاد.
**خۆش ڕوویی** (ن) xošr̲ûî
خەنەرانیی، ڕووخۆشیی، ڕووگوشادیی.
**خۆشڕۆ** (ئان) xošr̲o
فێری ڕەوتی پەسندکراو (ئەسپ).
**خۆشڕەفتار** (ئان) xošr̲eftar
ئاکارچاک، کارباش، بەئاکار، خدەپەسند، خۆش خوو، خۆش ڕەوتار، خوو وڕەوشت جوان، ڕەوشت جوان، وەش ڕەفتار، کردارجوان.
**خۆشڕەفتاریی** (ن) xošr̲eftarî
جوانیی خووڕەوشت، خۆش خوویی.
**خۆشڕەو** (ئان) xošr̲ew
پڕکیش، خۆش بەز، خۆشڕۆ، خۆش کیش، ڕەوت خۆش، ڕەهوان، غاردەر، غاردەر، لەڕەوتا بەکار (ئەسپ).
**خۆش زبان** (ئان) xošziban
خۆش زوبان، خۆش زووان، خۆش گفت، زبان شیرین، زمان خۆش، شەکر ڕاز، شیرین زووان، زمان شیرین..
**خۆش قەدەم** (ئان) xošqedem
پێ بەودم، پێ بەخێر.
**خۆشکایی** (ن) xoškayî
ئاسوودەیی، بێ خەمیی.
**خۆش کردن** (کتپ)[1] xoš kirdin
تام تێ خستن، تام شیرین کردن، شیرین کردن.
**خۆش کردن** (کتپ)[2] xoš kirdin
پیستەئامادەکردن بۆ بەکارهێنان، پیستەدەباغی کردن، پوختەکردن، چەرم ساز کردن بۆبەکارهێنان.
**خۆش کردن** (کتپ)[3] xoš kirdin
زەویی کێلان وئامادەکردن (بۆ چاندنی).
**خۆش کردن** (کتپ)[4] xoškirdin
(شوێنی ناڵەبار) تەخت کردن.
**خۆش کردن{قوڕ یان چیمەنتۆ}** (کتپ)[5]
xoš kirdin (qur̲ yan çîmento)
شیلان بەسەریەکدا، موونە ئامادە کردن.
**خۆش کردن** (کتپ)[6] xoš kirdin
بڵیسە پێ سەندن، تیژکردن، تیژکردن. گڕ پێ سەندن، گڕی ئاگر بەرزکردنەوە، ئاگر گەشاندنەوە.

**خۆش كردن (كتپ)** [7] xoš kirdin
١- پەروەردە كردن. ٢- رازاندنەوە.
**خۆش كردن (كتپ)** [8] xoš kirdin
جێگەتازە وگوشاد كردن، ڕێک وپێک كردن، شوێن گوشادو نوێ كردنەوە.
**خۆش كردن (كتپ)** [9] xoš kirdin
دەرهاوردن.
**خۆش كردن (كتپ)** [10] xoš kirdin
ڕەنیو هێنان.
**خۆش كردن (كتن)** [11] xoškirdin
ئاووهەوا خۆش بوون، باوباران یان بەفر وەستان، خۆش كردنەوە، بارشت ویستان.
**خۆش كردن (كتپ)** [12] xoš kirdin
ئامادەكردن، پوختەكردن، خۆش كرن.
**خۆش كردنەوە (كتپ)** xoš kirdinewe
ئاشت كردنەوە.
**خۆشكە! (كد)** xoške
بلەزە!، پەلەبكە!.
**خۆشكێش (ن،رو)** [1] xoškêš
توتنی تام ناونجیی، توتنی نەنەرم نەتوند.
**خۆشكێش (ن)** [2] xoškêš
ئەسپی ڕاهێندراو، ولاخی بەرزەی ڕام كراو.
**خۆشكێن (ئان)** xoškên
بێ فیز، بێ هەوا، خۆ بەزل نەزان.
**خۆشكێنیی (ن)** xoškênî
بێ فیزیی، بێ هەوایی.
**خۆش گوزەران (ئان)** xošguzeran
دل خۆش، كامران، كامەران، كەیف خۆش.
**خۆش گوزەران بوون(كتن)** xoš guzeran bûn
ژیـان بەخۆشـی وكاسەپـڕی بردنەسـەر، هـەبوون (پارەو سامان بۆ ژیانی ئاسوودەیی).
**خۆش گوزەرانیی (ن)** xoš guzeranî
خێـرو خۆشـی، بـوونیی، بـووەیی، تێـرو تەسـەلی، دەولەتمەندی، دەولەمەندی، ژیـن خۆشـی، سـاماندار ی، كاسە پڕی، كۆكی.
**خۆش گوفتار (ئان)** xošguftan
قسەخۆش، قسەلەمست، گـولی مـەجلیس، زیـرەک گوفتار، خۆش وتار، دەم ودومان خۆش.
**خۆشگۆیی (ن)** xošgoyî
خۆش زبانیی، شیرین زمانیی.
**خۆش گەرەک بوون (كتپ)** xošgerekbûn
خۆشەویستیی بەرامبەر كەسێ هەبوون، حەز لێ كردن، كەیف پێ هاتن، ویستن (كەسێ پڕ بەدل).
**خۆش لێ هاتن (كتن،كتپ)** [1] xošlê hatin
بەخۆش زانیین، لەلاخۆش بوون.
**خۆش لێ هاتن (كتن،كتپ)** [2] xošlê hatin
خۆش ویستن.
**خۆش مامەلە (ئان)** xoš mamele
خۆش مامڵە، سەوداخۆش.
**خۆش مەزە (ئان)** xošmeze
بەلەزەت، چێژ خۆش، خۆش چێژە.
**خۆش نان (ئان)** xošnan
دلاوا، سەخیی، بەدەست ودل، نان بدە، ناندەر.
**خۆشناو (ئان)** xošnaw
ناویەچاكە دەرچوو (كەسێ).
**خۆشنوود (ئان)** xošnûd
شاد، شادمان.
**خۆشنوودیی (ن)** xošnûdî
شادمانیی، شادیی.
**خۆشنووس (ن)** xošnûs
خەت خۆش.
**خۆش وچۆنیی (ن)** xošwçonî
چاک وچۆنی، چاک وخۆشی، خۆشی وپۆشی، هەوال پرسی.
**خۆش وچۆنیی لێ كردن (كتپ)**
xošwçonî lê kirdin
چاک وچۆنی لێ كردن، خۆش ووشیی كـردن، هـەوال پرسین.
**خۆش ویستن (كتپ)** xoš wîstin
بـەدل بـوون، بەدلـدا چـوون، بـەردل كەوتن،گاڤـیین، ویستن.
**خۆش هاتن! (ئسب)** [1] xošhatin
بەخێربێن!، بەخێرهاتنە!، خۆش هاتیی!.
**خۆش هاتن (كتپ)** [2] xošhatin
بەخێرهێنان.
**خۆشە (ئان)** [1] xoše
پوختە، هب (پێگەیشتوو).
**خۆشە (ئان)** [2] xoše
پیشەخۆش، خۆش ڕەفتار.
**خۆشە (ئان)** [3] xoše
ئامادە (بۆ بەكارهێنان).
**خۆشە (ن)** [4] xoše
پێـستەی خۆشـكراو، چـەرمی خۆشـكراو، چـەرمی پوختە كراو، كەولی دەباغكراو.

**خۆشە** (ن) ٥ xoše
دەرمانی چەرم خۆش کردن، گزگل وتال، گوڵوان وتال، هەلاڵ وتال.
**خۆشەبوون** (کتن) ١ xošebün
پوختە بوون.
**خۆشەبوون** (کتن)٢ xošebün
باش راهاتن، دەرهاتن (کەسێ لەئیشێکدا)، قاڵ بوون.
**خۆشەتالە** (ن،رو) xošetale
کاموی دەشتەکیی، خۆشە تاڵوو.
**خۆشەجان!** (فر) xošecan
نۆشی گیان!.
**خۆشەچن** (ن) ١ xošeçin
خۆشەچین (دوای دروونەوەی دەغڵ ودان)، گوڵ چنەوە، گوڵ هەڵگرەوە، گوڵەوەچن (لەپەریز).
**خۆشەچن** (ن) ٢ xošeçin
کەسێ کەدەسکەگوڵ ئامادە ئەکات.
**خۆشەچین** (ن) xošeçîn
بەهرەمەند وەرگرتوو (کەسێ لەیەکێکی دیکەوە)، خۆشەچن.
**خۆشەخانە** (ن) xošexane
دەباخانە، دەواخانە، خۆشخانە، خۆشگە، هەلاڵ خانە، شوێنی چەرم تێداخۆش کردن.
**خۆشەکراو** (ئان) xošekiraw
پوختەکراو، دەباغ کراو.
**خۆشەکردن** (کتپ)١ xošekirdin
رام کردن، راهێنان، قاڵ کردن (مرۆڤ لەکارێکدا).
**خۆشەکردن** (کتپ)٢ xošekirdin
ئامادەکردن.
**خۆشەکردن** (کتپ)٣ xošekirdin
پوختە کردن، دەباغیی کردن، دەواخیی کردن.
**خۆشەوکردن** (کتپ)١ xošew kirdin
خۆشەوەکردن، چاکە کردنەوە (نەخۆش..).
**خۆشەوکردن** (کتپ)٢ xošewkirdin
سزادان.
**خۆشەویست** (ئان)١ xošewîst
خۆشەویس، خۆشەویی، نازار، نازدار، شیرین.
**خۆشەویست** (ن)٢ xošewîst
ئەڤین، دلارام، دڵ ئارام، دڵدار، دڵبەر، لەبەردڵان، هەڤین، یار، یاوەر، نازیز.
**خۆشەویستیی** (ن) xošewîstî
دڵداریی، دۆستیی، یاوەریی، نازداریی، دڵ خوازیی.

**خۆشەویستیی دوورو نزیکی بۆنییە** (پن)
xošewîstî dürw nizîkîy bo niye
بنـگـێ: دووری خۆشەویستیی‌تیژتر دەکاو نزیکیی پتەوتر.
**خۆشەویی** (ئان) xošewî
ب (خۆشتەویی).
**خۆشیان** (ن) xošyan
خۆشیانیی، رۆژانی خۆش، بێ تەپوتووشیی، رۆژانی بێ بارشت وبێ سەرما (لەزستاندا).
**خۆشی بێ وترشی بێ** (فر) xošî bêw tiršî bê
بێیەوێ ... نەیەوێ.
**خۆشی خۆشیی** (ن)١ xošî xošî
ئاوات، هومێدی بەهێز.
**خۆشی خۆشیی** (ن)٢ xošî xošî
پەلەزیقان، هەڵەکەسەما، کەیف وشادیی.
**خۆشی خۆشی بوون** (کتن) xošî î xošî bün
پێخۆشحاڵ بوون، زۆر دڵخۆش بوون.
**خۆشی خۆشی پێ کەوتن** (کتن)
xošî xošî pê kewtin
گەشانەوە، کامەران بوون، هب:(خۆشی خۆشی بوون).
**خۆشیرین کردن لە لای کەسێ** (ئد)
xošîrînkirdin lelay kesê
خۆ بردنەپێشەوە(بەئاخاوتن ورەفتاری جوان)، خۆخۆشەویست کردن بەهەڵس وکەوتی جوان، خوەی شرینەکی کردن، خۆ شیرین کردن لەبەرچاو کەسێ.
**خۆشیی** (ن) ١ xošî
بەدەماخی، تەردەماخی، خۆشنوودی، دڵشادی، شادمانیی، شادی، شکۆفە، کامیرانیی، کامەرانی، کەیف خۆشی، نەبوونی خەم وپەژارە.
**خۆشیی** (ن) ٢ xošî
ئاسوودەیی، ئاشتیی، تەبایی، رەحەتیی.
**خۆشیی** (ن) ٣ xošî
تەندروستیی، ساغیی، ساقیی، سەلامەتیی، لەش ساغیی.
**خۆشیی** (ن) ٤ xošî
بەتامیی، بەلەزەتیی، بەچێژیی، پڕ چێژیی. تام خۆشیی، تامداریی.
**خۆشیی** (ن) ٥ xošî
تام، چێژ، لەزەت، مەزە.

**خۆشیی وبۆشیی** ( ن ) xošîw bošî
بـ( خۆشیی وچۆنیی ).

**خۆشێ!** ( نسب ) xošê !
خێرا!.

**خۆ فرۆش** ( ن ) xofiroš
بیگانەپەرست، بەکرێ گیراو، نۆکەری بیگانە.

**خۆ فڕێ دان** ( کتن ) xo firêdan
خۆ هاویشتن.

**خۆکار** ( نان ) xokar
ئۆتۆماتیک، خودکار، خۆگەڕ، خۆمەش، ئامێرێ کە سەربەخۆ کاردەکا.

**خۆکرد** ( نان ) xo kird
خۆکردوو، خۆکردە.

**خۆ کردنە ژێر ئاو** ( کتپ ) xokirdine jêr aw
خۆخستنە ژێر ئاو، ڕۆیشتنە ژێر ئاو، ژێر ئاو ڕۆیشتن.

**خۆ کوشتن** ( کتپ )١ xokuštin
خۆ کوژتن، خۆ لەناوبردن ( بەدەستی ئەنقەست ).

**خۆ کوشتن** ( کتپ )٢ xokuštin
لەخۆدان، لەسەروسنگ دان، ( لەشیوەندا.. ).

**خۆ کەرکردن** ( ند ) xoker kirdin
بەئانقەست گوێ نەدان بەفەرمان، خۆ گەوج کردن ( بەرامبەر هەڵویستێک ).

**خۆ کەرکردن** ( ند )١ xoker kirdin
کیشە بەخەڵک فرۆشتن، گەڕ بەخولک کردن ( لەخۆڕایی ).

**خۆ کەرکردن** ( ند )٢ xoker kirdin
خۆبەنەزان پیشان دان.

**خۆ کیشان** ( کتپ ) xokêšan
خۆ لەقەپان دان، خۆ هەڵسەنگاندن لەتەرازوودا.

**خۆ کیشانەوە** ( کتن )١ xokêšanewe
مردن ( بەمرۆڤی پیاو خراپ دەوترێ بەچاوی سووکی یەوە ).

**خۆ کیشانەوە** ( کتن )٢ xokêšanewe
خۆ دزینەوە لەکار، لەهاوکاری خەڵک دەرچوون.

**خۆ کیشانەوە** ( کتن )٣ xokêšanewe
باویشک دان وئەندامی لەشی خۆ تەقاندن ( بۆ دەرکردنی ماندوییەتی لەش، جەستە کیشمان کردن ).

**خۆ کیش کردن** ( ند )١ xokêš kirdin
بەبێ هێزی بۆ شوینیک ڕۆیشتن، خۆ ڕەکیش کردن ( بەنابەدڵیی.. ).

**خۆ کیش کردن** ( ند )٢ xokêš kirdin
بەنابەدڵی چوون بۆ جیگایەک، چوون بۆ شوینیک بەبێ ئارەزوو.

**خۆ گر** ( نان ) xogir
بەئارام، بەرگەگر، بەسەبر، خۆگیر، دڵفرە، بەپشوو، ئارام گرتوو، پشوودار، دان بەخۆداگر.

**خۆ گرتن** ( کتن )١ xo girtin
گوێ گرتن ( بەنهینی لەئاخاوتنی خەڵک )، ویستان ( بە دزیی یەوە ) بۆ گوێ گرتن لەخەڵک وئاگایی وەدەس هینان.

**خۆ گرتن** ( ند )٢ xo girtin
دەولەمەند بوون.

**خۆ گرتن** ( کتن )٣ xo girtin
چەقین، لەسەر پێ وەستان، وەستان، ویستان.

**خۆ گرتن** ( کتن )٤ xo girtin
سستی کردن، تەمەڵی کردن ( لەکارو فەرماندا ).

**خۆ گرتن** ( کتن )٥ xo girtin
بەستن، توند وەبوون، قرسین، قەرسان، مەیین.

**خۆ گرتن** ( ند )٦ xo girtin
فیرە نەریت بوون، هەرسان، هۆژان.

**خۆ گرتن** ( کتن )٧ xo girtin
خووگرتن، ڕام بوون، ڕاهاتن، هۆگربوون.

**خۆ گرتن** ( ند )٨ xo girtin
بەرگەگرتن، خۆڕاگرتن، ڕاوەستان ( بەرامبەر... ).

**خۆ گرتن** ( کتن )٩ xo girtin
ئارام بوون، بەئارام بوون، پشووبوون، بەحەوسەڵەبوون، بەسەبر بوون، پشووگرتن، پشووهەبوون، پشوو خواردنەوە، خودداریی کردن، خۆداریی کردن، دان بەخۆداگرتن، ورینگ دان، ورینگە دان، خۆ گیریی کردن.

**خۆ گرتن** ( کتن )١٠ xo girtin
خۆبەستن.

**خۆ گرتن** ( کتن )١١ xo girtin
بەئاوات گەیشتن، گەیشتنە ئامانج.

**خۆ گرتوو** ( نان )١ xo girtû
پەیت، مەییو.

**خۆ گرتوو** ( نان )٢ xo girtû
چەقیو، لەسەرپێ ڕاوەستاو، وەستاو، ویستاو.

**خۆ گرتوو** ( نان )٣ xo girtû
خود دار، خۆدار، خۆگرتیی.

**خۆ گرتوو** ( نان )٤ xo girtû
بەئاوات گەیشتوو، گەیشتووە ئاوات.

**خۆ گرتوو** (ن)* xo girtû
گوێگر (لەناخاوتنی خەڵک بەنهێنی).
**خۆ گشاشتن** (کتن،کی) xogivaştin(ki)
خۆ گوشیین، ڕژدبوون، ڕەزیلیی کردن.
**خۆ گورج کردن** (کتن) xo gurc kirdin
خۆئامادەکردن بۆ کار، خۆ پەت کردن، خۆ هەڵ کردن، کەوتنەکار.
**خۆ گورج کردنەوە** (ند) ١ xo gurc kirdinewe
کەوتنەوە کار،وەکار کەوتنەوە، دەست دانەوە ئیش، چوونەوەسەر کاروبار.
**خۆ گورج کردنەوە** (ند) ٢ xo gurc kirdinewe
خۆگۆڕیین، جلی دەرەوە دەبەر کردن، جلکی دەرەوە لەبەر کردن.
**خۆ گۆڕین** (ند)١ xogorîn
ب (خۆ گورج کردنەوە).
**خۆ گۆڕین** (ند)٢ xogorîn
خۆنیشان دان بەشێوەیەکی دیکە (نەک وەک هەیە).
**خۆ گەیاندنە حاڵی چاو** (ند)
xo geyandine ḥalî caw
خۆ خستنە باری گیانەڵا.
**خۆ گیریی** (ن) xogîrî
ئارامیی، خۆداریی، پشوو، پشووداریی، ورینگ، ورینگە.
**خۆ گیف کردن** (کتن)١ xogîv kirdin
خۆپیشان دان، سنگ دەرپەڕاندن.
**خۆ گیف کردن** (کتن)٢ xogîvkirdin
خۆ بەجوانی پیشاندان یان نیشان دان.
**خۆ گێل کردن** (کتن)١ xogêl kirdin
خۆ بەبێ ئاگا پیشان دان، خۆ بیانی کردن، خۆ وێل کردن، خۆ هەڵەکردن (بە نەنقەست)، خۆ بێگانە کردن، خۆ بەنەزان نیشان دان، خۆ لێ بیانی کردن، وەڵام نەدانەوە (کاتی بانگ کردن)، وەڵام نەدانەوە کاتی پرسیار لێ کردن.
**خۆ گێل کردن** (ند)٢ xogêl kirdin
کردەوەی نابەجێ یان ناشیرین کردن.
**خۆ گێل کردن** (ند)٣ xo gêl kirdin
کار پاش گوێ خستن.
**خۆ لە ئاو هەڵکێشان** (کتن) xo le aw heḻkêşan
ب (تێ کەوتن).
**خۆ لە تەل دان** (ند) xo letel dan
خۆ ڕازاندنەوە، خۆ ڕێک خستن.

**خۆ لە کەسێ دان** (ند) xo le kesêdan
زیان بەکەسێ گەیاندن.
**خۆ لە کەسێکەوە ئاڵاندن** (ند)
xo le kesêkewe aḻandin
خۆ بەکەسێکدا هەڵواسیین، خۆ تووشی داوی کەسێ کردن، خۆ لەکەسێکەوە پێچان.
**خۆ لە گەزدان** (کتن) xo le gazdan
بێ گرێ خۆ ڕاکێشان، دەستەو کێرد پاڵ کەوتن. ڕاست ڕاکشان، گنج لەخۆ بڕیین (لەسەر جێگە بۆ نوستن یان پشوودان).
**خۆ لە مەکۆدان** (ند) xolemeko dan
خۆ بۆشتێ نانەوە، خۆ خستنە حەشارگەوە.
**خۆلی پفک** (نک،کی) xo lî pifik(ki)
خۆڵەکەوەی گەرم و ئاگراویی، ژیلە، ژیلەمۆ.
**خۆلیدان** (ن) xolî dan
ژێرجگەرە، تەپلەکی جگەرە، ژێرجغارە، بن جغارە. کاسکی جغارە.
**خۆلی سەر** (ئان،کی) xolî ser(ki)
بێ چارە، کلۆل.
**خۆ لێ خواردنەوە** (ند) xo lê xwardinewe
داخ لێ خواردن، چاوەڕێی پێ ڕشتن کردن، ڕق لێ هەستان وپیش لێ خواردنەوە.
**خۆ لێ گێل کردن** (ند) xo lê gêl kirdin
بەتەنگەوە نەهاتن، چاو لێ قوچاندن، خۆ ناشیی کردن، خۆ نەزان کردن، گوێ پێ نەدان.
**خۆڵ** (ن) ١ xoḻ
خاک، ئاخ، خۆل، خۆلیی، خوول، خوولیی، گل، بەژ.
**خۆڵ** (ن) ٢ xoḻ
پتەو، تێر گۆشت، گۆشتن، بەخۆ، خڕوخەپان (مرۆف).
**خۆڵاو** (ن)١ xoḻaw
تیژاو، خۆڵەمێشاو، ئاو وخۆڵەمێش.
**خۆڵاو** (ن)٢ xoḻaw
ئامێتەی پۆتاش بۆ سابوون تێدا دروست کردن.
**خۆڵاویی** (ئان) xoḻawî
تۆزاویی، تەپ وتۆزاویی، گەرد ئێنیشتوو، خۆڕاویی.
**خۆڵماڵ** (ن) xoḻmaḻ
مشت ومالی شیر وخەنجەر.
**خۆڵە پۆت** (ن) xoḻepot
خۆڵەپۆتە، خۆڵەپۆتێ، خۆڵەپۆتیی، خۆڵەپۆتیە گلجان، گلنجانە، جێگەی پڕ سەحکی بفر سەرە

وورد.

**خۆلە پەتانیی** ( ن ) xole petanî

خۆلەپەتانێ، خۆلە پەتێ، یاریی خۆلە-پۆت، یاریی مندال بەخۆل، خاپتانێ.

**خۆلە ژان** ( ن،پز ) xole jan

زکە ئێشە، سکە ئێشە، ژانە سکە.

**خۆلە گەوان** ( ن ) xolegewan

خۆلە`عەمەلە، سەرەنویلکە، شوێنی زبل وزال لێ رشتن.

**خۆلە مێش** ( نک ) xolemêš

بۆل، خاکری، خاکسەر، خاکەری، خۆلەمێر، خۆلەمشکی، خۆلەکوو، خۆلەمژ، خۆ لی شتی سووتاو، تۆزینە، خەلە کوان.

**خۆم** ( ج ) xom

ئەز، بۆخۆم، خودم، من.

**خۆمالیی** ( ئان ) [1] xomalî

خۆمانیی، خۆمانە، خۆیی، ناوخۆیی.

**خۆمالیی** ( نک ) [2] xomalî .

تایبەتی بەمالی خۆ، شتی تایبەتیی کەبۆ ناومالی خۆتت کردبێ.

**خۆمالیی** ( ن ) [3] xomalî

خودمالیی.

**خۆمالیی** ( ن ) [4] xomalî

لەمالەوە دروستکراو، شتی لەناو ولاتی خۆدا دروستکراو

**خۆمالیی{ئاژەل}** ( ن ) [5] xomalî(ajêl)

مالی، لەمالدا زاو.

**خۆمالیی کردن** ( کتپ ) xomalîkirdin

خود مالی کردن.

**خۆمان** ( ج ) xoman

ئیمە، ئیمە ومانان، خۆن.

**خۆماندووکردن** ( کتن ) xomandü kirdin

تەقەلادان، جەخت کردن،رەنج دان، کۆشش کردن، هەول دان.

**خۆمانە** ( ئان ) xomane

تایبەتی بەخۆمان، لەخۆمان.

**خۆمانە خۆمانە** ( ن ) xomane xomane

پێکهاتنی بەنهێنی لەسەر کارێک،کەین وبەین.

**خۆمت کردن** ( کتن ) xomit kirdin

خۆبێ دەنگ کردن، خۆ مات کردن، خۆمت دان.

**خۆمەش** ( ئان ) xomeš

ب ( خۆکار ).

**خۆمیین** ( کتپ ) xomîn

بەسەریەکدا کردن، کۆماکردن، کۆم وەرکردن.

**خۆناس** ( ئان ) [1] xonas

ریز لەخۆگر، ریزی خۆ زان، قەدری خۆزان.

**خۆناس** ( ن ) [2] xonas

ئاشنا، ناسیاو.

**خۆناسیین** ( کتن ) xonasîn

ئەندازە وپایەی خۆزانیین، دەخۆگەیشتن، لەخۆگەیشتن.

**خۆندن** ( کتن ) xondin

گۆرانی گوتن.

**خۆنواندن** ( کتن،کتپ ) xonwandin

بەترو فیزبوون، خۆبردنەپیشەوە، خۆدەرخستن، خۆنمایی کردن، خۆنوانن، خۆنوێنیی کردن، خۆنیشان دان، فیزلێ دان.

**خۆنوس** ( ن ) xonüs

قەلەم پاندان.

**خۆنە** ( ئان ) [1] xone

بێخاوەن.

**خۆنە** ( ن ) [2] xone

دیزە.

**خۆنە** ( ن،ئا ) [3] xone

پشیلەی نێر.

**خۆنە** ( ن ) [4] xone

سەرقاپی دیزە، دەرخۆنە.

**خۆنە خۆر** ( ن ) xonexor

پاشەکەوتکەر.

**خۆنە گر** ( ئان ) [1] xonegir

بێ پشوو، بێ حەوسەلە، بێ سەبر.

**خۆنە گر** ( ئان ) [2] xonegir

شل، شل وەل، شل وول.

**خۆنە گیر** ( ن،ئان ) xonegîr

رەمکەر، کیفیی، یاخیی.

**خۆنیشان دان** ( کتن ) xonîšandan

ئاشکرابوون، بەرچاوکەوتن، خویابوون، دیاردان، کەوتنە بەرچاو.

**خۆو بە خت** ( ئاک ) xow bext

١- بەهەلکەوت، خوابەختەکیی، بەرێکەوت.

٢- رەنگە، لەوانەیە

**خۆو بە ختیی بۆ کردن** ( کتپ )

xow bextî bo kirdin

ب ( پشکە خستن ).

**خۆویژ** (ئان) xowêj

خۆ بیژ.

**خۆ ویل کردن** (کتن) ¹ xowêḻ kirdin

ب(خۆ گیل کردن).

**خۆ ویل کردن** (کتن) ² xowêḻ kirdin

خۆ گوم کردن، خۆ نەدیو کردن، لەرێ دەرچوون، لەرێ لادان (بەئانقەست).

**خۆه** (ئان) ¹ xoh

هەمان (شت).

**خۆه** (ن) ² xoh

بسکە، خەندە، کەن، هب(بزە).

**خۆهستەک** (ن) ¹ xohstek

ئاواتیی.

**خۆهستەک** (ن) ² xohstek

ئارۆزە، ئارزیی، ئارەزوو، ئیشتیا (بۆ خواردن).

**خۆهاویشتن** (ند) xohawîştin

پەلەکردن (لەرۆیشتندا)، خێرا رۆیشتن، گورج کردن.

**خۆهشکا** (ئان) xohşka

رند، رەند، هب:(جوان).

**خۆهشکۆک** (ئان) xohşkok

خوشکۆکە، رێک وپێک.

**خۆهەڵاوردن** (کتن) xoheḻawardin

خۆ کیشانەوە لە، خۆ لەهاوبەشیی کیشانەوە، خۆ کەنارە گیر گرتن.

**خۆهەڵبواردن** (ند) xoheḻbwardin

خۆ لەبیر چوون،خۆکەنار گرتن، خۆ حیساو نەکردن.

**خۆهەڵبەست** (ن) xoheḻbest

ئیفتەرا، بوختان ودرۆ،خۆکرد، درۆیەک کەمرۆڤێ لەخۆیەوە هەڵی بەستبێ، لای خۆوە هەڵبەستراو.

**خۆهەڵتراندن** (کتن) xoheḻtir̄andin

ترۆتۆپ کردن، خۆ نواندن، خۆ هەڵ شرنگاندن، خۆ هەڵکیشان، فشەکردن، ماشەوهوشەکردن.

**خۆهەڵغراندن** (ند) xoheḻxir̄andin

چوونە پیشەوە بۆ راپەراندنی ئیشێک کەلەتوانای ئەو کەسەدا نەبێت، دەست دانە کارێک کەلەوزەی ئەو کەسەدا نەبێ.

**خۆهەڵخستن** (کتن) xoheḻxistin

خۆ خستنە بەر بەرۆچکە، لەبەر هەتاو دانیشتن بۆ خۆ گەرم کردنەوە.

**خۆهەڵخستنەوە** (کتن) xoheḻxistinewe

هەڵپەرو داپەر کردن.

**خۆهەڵدان** (ند) xoheḻdan

خۆ هەڵماڵیین، خۆ هەڵکردن،لنگ هەڵکردن.

**خۆهەڵکردن** (ند) xoheḻkirdin

خۆ ئامادەکردن، خۆگرد کردنەوە، داوێن بەلاداکردن، داوێن کردن بەلادا، چاک بەلادا کردن.

**خۆهەڵکیش** (ئان) xoheḻkêş

فشەکەر،فیزلیدەر، بەخۆهەڵدەر، لاف لیدەر، فیشالکەر.

**خۆهەڵکیشان** (کتن) xoheḻkêşan

خۆپیف دان، خۆ هەڵدان، فشەکردن، بەخۆ هەڵگوتن، فیزکردن، لاف لیدان، ماشەوهووشە کردن، فش وهوور کردن.

**خۆهەڵکیشیی** (ن) xoheḻkêşî

فشە، لاف، ماشەوهووشە.

**خۆی** (ج) ¹ xoy

ئەو، ئەویش خۆی، تایبەتیی ئەو، هەو.

**خۆی** (ن) ² xoy

سەرپەرشت، سەرپەرشتیکەر.

**خۆیابوون** (کتن) xoyabûn

دەرکەوتن، هاتنەکایەوە، هاتنەمەیدان.

**خۆیان** (ج) ¹ xoyan

ئازێ، ئەوان، وان.

**خۆیان** (ن) ² xoyan

خەیان، تەبارەی دەغلی گیرەکراو، کلۆشی گیرە کراوی خڕەوەبووی شەن نەکراو.

**خۆیایەتیی** (ن) xoyayetî

خزمایەتیی، دۆستایەتیی.

**خۆی بردە ئەوپەڕی دنیا** (رس)

xoy birde ewper̄î dinya

خۆ بردنە ئەوپەڕی دنیا، خۆ بێ ئاگا پیشان دان، خۆ گیل کردن، خۆ بەنەشارەزا پیشان دان.

**خۆی بوون** (کتن) ¹ xoybûn

سەربەست بوون، لەدەست بیگانە رزگار بوون.

**خۆی بوون** (ند) ² xoybûn

ئیش بەکەسی تر نەمان.

**خۆیبوون** (ن) ³ xoybûn

سەربەستیی.

**خۆی ریشی نییەو بەکۆستە پێ دەکەنێ** (پن)

xoy r̄îşî niyew be koste pê dekenê

خۆی لەکەدارەو لەکەسانی دیکە دەدوێ. تەنگی لەخەڵک دەردەهینێ، کەس نەنگی خۆی نابینێ.

**خۆی لێ‌دا** (رس) ١ xoy lêda
خۆ لەکەسێ دان، زیان پێ گەیاندن.
**خۆی لێ دا** (رس) ٢ xoy lêda
خۆ لێدان، چنگە لێ گیر کردن،
شت داگیر کردن، شت دەس خۆ خستن.
**خۆی لێرەیەو کلکی لە بەغدا تۆز دەکا** (رس)
xoy - lêreyew kilkî le bexda toz deka
بەیەکێکی (ئاژاوەچیی، بزێو، ئارەحەت) دەوترێ.
**خۆیی** (ن) xoyî
١- خۆمـانیی، خـۆمیی، خۆیـاتیی، خۆیایـەتیی، خۆیەتیی. ٢- خوێش، کەس.
**خە** (نچ) xe
پێوە هەڵواسیین.
**خەبات** (ن) ١ xebat
تەقەلا، کۆشش، کۆششت، هەوڵ، رەنج، خەبس.
**خەبات** (ن) ٢ xebat
ئیش، کار.
**خەباتکار** (ن) ١ xebatkar
ئیشکەر، کارکەر.
**خەباتکار** (ن) ٢ xebatkar
ب (خەباتکەر).
**خەبات کردن** (کتن) ١ xebat kirdin
تەقەلادان، تێکۆشان، تەقەلاکردن، کۆشش دان، کۆشش کردن، تێ کۆشین، خەبتیین، خەبتان، هـەوڵ دان.
**خەبات کردن** (کتن) ٢ xebat kirdin
ئیش کردن، رەنج دان، کارکردن.
**خەباتکەر** (ن) xebat
بەکۆششت، تێکۆشەر، خەباتکار، هەوڵدەر.
**خەبار** (ئان) xebar
١- بقە، تەڵەکە. ٢- سامدار، سامناوەر.
**خەبتان** (کتن) xebtan
خەبەتاندن، خەبەتیین، هب:(خەبات کردن).
**خەبس** (نک) xebis
١- دەس رەنج، دەست رەنج.
٢- هەرچ شتێ بەتەقەلا هاتبێتە دەس
**خەبسین** (کتن) xebisîn
پەشێوبوون، سەر لێ تێکچوون، هب:(ئالۆزان).
**خەبەر** (ن) ١ xeber
ئاگایی، پەیام.
**خەبەر** (ن) ٢ xeber
ئاگا، دەنگە، دەنگوباس، ولام، وەڵام، خـەوەر، بـاس، هەواڵ.
**خەبەر** (نک) ٣ xeber
ئاگایی، باس وخەبـەر، بـاس وخـواس، خەبـەروباس. هەواڵ،
**خەبەربردن** (کتپ) xeber birdin
هەواڵ بردن.
**خەبەربوونەوە** (کتن) xeberbûnewe
بێداربوونەوە، خەوەربوونەوە، خەوەرەوەبوون، وریـبوونەوە، وریاوەبوون، هب (بێداربوونەوە).
**خەبەربەر** (ن) xebeber
پەیامبەر، هەواڵ بەر، وەڵام بەر، ولامبەر.
**خەبەر پێ‌دان** (کتپ) xeberpêdan
ئاگادارکردن، پێ راگەیانـدن، پـێ گـوتن، پـێ ووتـن. رانان، وەڵام دان، هەواڵ بۆ ناردن، هەواڵ پێ دان.
**خەبەردار** (ئان) ١ xeberdar
باخەوەر، بەخەوەر، خەوەردار.
**خەبەردارا** (ئسب) ٢ xeberdar!
ئاگاداربە !، رێگەبەردە !، لادە !، لادەن !.
**خەبەرداربوون** (کتن) xeberdarbûn
ئاگاداربوون، خەبەربوون، هالێ بوون.
**خەبەردان** (کتپ) ١ xeberdan
ئاگـایی دان، وشـەی نهێنـی ئاشـکراکردن، هـەواڵ پێدان.
**خەبەردان** (کتپ) ٢ xeberdan
ئاگاکردن، خەبەردار کردن، وەئاگا کردن.
**خەبەرۆخ** (ن) xeberdox
ئاخاوتەر (لەجیاتی کەسانی تر)، هەواڵدەر، راپۆرت دەر.
**خەبەر کردنەوە** (کتپ) xeberkirdinewe
وەئاگا هێنان.
**خەبەر گۆهێز** (ن.کی) xeber gohêz
ئاخـاوتن را گـوێز، قسەراگوێز، خەبـەرگوێز، خەبـەر هێن، وەڵام هێن.
**خەبەر گێرانەوە** (کتپ) xeber gêranewe
ئاخاوتن راگوێزتن، قسەهێنان وبردن.
**خەبەرۆشک** (ن) xeberošk
چیرۆک، ئەزیلە.
**خەبەرهێن** (ن) xeberhên
وەڵام هێن، وەڵام هێنەر.
**خەبەنگ** (ن) xebeng
جەماڵیون، جەمەڵیون، سەربانی لەرۆکیش وتەنەکە.

**خەبینەتا!** (نسب) xebînet
بەداخەوە!، حەیف!، داخەکەم!، مەخابن!.
**خەپار** (ن) ١ xepar
ئامادە (کێڵگە بۆ چاندن)، زەویی کێڵراو.
**خەپار** (ن) ٢ xepar
بژار.
**خەپان** (ئان) xepan
پـان وپـۆڕ، پـرومڕ، خرپـن، خرپـۆڵە، خەپـەتۆڵە، خرومڕ، خرت ومرت، خرت وخۆڵ.
**خەپر** (ن) xepir
دووجار کێڵراو، وەرد.
**خەپراندن** (کتپ) xeprandin
زەویی خۆش کردن بۆ چاندن، زەویی شیی کردنەوە وبژارکردن بۆ تۆوپیوەکردنی، ، زەویی پاک کردنەوە و هەڵگێڕانەوە، کێڵکە ئامادەکردن بـۆ چانـدن، وەرد دانەوە، زەویی خەپار کردن.
**خەپرە** (ن) xepre
پاپۆکە، پەپکە، لیک ئالانی بەئەلقە.
**خەپشە** (ن) xepşe
شەرمی ئافرەت، قوز، کوز.
**خەپک** (ن) ١ xepik
تەپکە.
**خەپک** (ن) ٢ xepik
خەپلە، کولێرەی هەرزن.
**خەپکە** (ن) xepke
ئالقە، ئەلقە.
**خەپلۆن** (ئان) xeplon
ئاقزلا، خواروخێچ، چەف و لار.
**خەپلە** (ن) xeple
ئەسـتوورکە، ئەسـتوورکە، پەپـکە کـولێرە، کـولێرە، کێتکە، گێتکە، نانی ئەستوورو پان کراوە.
**خەپلە** (ئان،خ.) xeple١
کورتە باڵای قەڵەو.
**خەپلە** (ئان) ٢ xeple
گێلۆکەی ئازیرەک.
**خەپوولیی** (ئان) xepülî
پارەخۆشەویست، پوول پەرست، پوول دۆست.
**خەپە** (ن) xepe١
هەپە، شانەی تەون کوتان.
**خەپە** (ن) ٢ xepe
درمغ، ئـامێرێکی بەدانـە کلۆشـی پـێ کۆدەکەنـەوە، شانە بۆ کۆکردنەوەی کلۆش.

**خەپەتۆڵە** (ئان) xepetole
ب (خەپان).
**خەپەخان** (ئان،کل) xepexan(kl)
خلتانی خوێن، خوێناویی.
**خەپەخان بوون** (کتن،کل) xepexan bün(kl)
خلتانی خوێن بوون، خوێناویی بوون.
**خەپەخان کردن** (کتپ،کل) xepexan kirdin(kl)
خلتـــانیخوێن کـــردن، لەخوێنداگـــەوزان، لەخوێناگەوزاندن.
**خەپەخەپ کردن** (کتن) xepexep kirdin
لارەولار ڕۆیشتن.
**خەپەرە** (ئان) xepere
ساواو قەڵـەو، خەپـەتۆڵە، خرپـنە، خەپـەڵە (منـداڵ یان بێچوی ئاژەڵ).
**خەپەرەبوون** (کتن) xeperebün
قەڵەوبوون.
**خەپەرەکردن** (کتپ) xepere kirdin
خڕبوونـەوە، خۆلێـک هاڵانـدن، نوسـتن بەگرمۆڵـەیی (ساوا یان بێچوی ئاژەڵ).
**خەت** (ن) ١ xet
مووی تازە (لەڕووی لاو دەرهاتوو)، گەنگەموو.
**خەت** (ن) ٢ xet
١- کێر، مێل، خێر، خێت. ٢- خێت (جووت).
**خەت** (ن) ٣ xet
دێر.
**خەت** (ن) ٤ xet
نووێس.
**خەتا** (ن) ١ xeta
هەڵە.
**خەتا** (ن) ٢ xeta
تاوان، سووچ، گوناه.
**خەتابار** (ن) xeabar
تاوانبار، خەتاکار، گوناهبار.
**خەتات** (ن،رو) ١ xetat
وەسمەی برۆ، خەنەو ڕەنگ، ڕەنگێ کەلەبرۆ دەدرێ.
**خەتات** (ن) ٢ xetat
خۆشنووس.
**خەتاکردن** (کتپ) xetakirdin
تاوان کردن، گوناه کردن.
**خەت بۆ کێشان** (ند) ١ xet bo kêşan
ئـاوی گوێچکـەدان. پێـشەکی کەسـێ وێبکرێـەوە خەت دان.

**خەت بۆ کێشان (ند)** xet bo kêšan ٢
ئەگبیرو را بۆکەسێ کردن، راوێژ بۆ کەسێ کردن، ڕەنگێ بۆ کەسێ ڕشتن (لەبارەی چۆنیەتی کارێکە یان ئامۆژگاری شتێ).

**خەت خەت (ئان)** xet xet
میلدار، ڕێ ڕێ، میل میل.

**خەت دان (کتپ)** xetdan ١
(شت) نووسین.

**خەت دان (کتپ)** xetdan ٢
موو لەڕوو هاتن، بالق بوون، موو لێ هاتن (لاو)، خەت خسن، ڕیش وسمێل دەرهاتن، هەرزەبوون.

**خەتکیش (ن)** xetkêš
خەتکەش، ڕاستە، ئامرازی خەتی ڕاست کێشان.

**خەتکیشان (کتن)** xetkêšan
خەت لێدان، کێر لێدان، هێڵ کێشان.

**خەت لێ کێشان (ند)** xet lê kêšan
پێشبینی دوا ڕۆژێکی ناخۆش بۆ کەسێ کردن، نوقلانەی دوا ڕۆژێکی خراپ بۆ کەسێ لێدان.

**خەتمی (ن)** xetmî ١
لغاو، لەواشە.

**خەتمی (ئان)** xetmî ٢
سەربزێو، یاخیی، یاغیی، دژی یاسا.

**خەتە سوورێ لە خۆم دوورێ (ند)**
xete sûrê lexom dûrê
تەنها خۆ خۆش ویستن، خۆخۆیی کردن، گوێ نەدان بەکەس.

**خەتە سوورێ لە خۆم دوورێ (ند)**
xete sûrê lexom dûrê
خۆ لەکارەسات یان قەوماو دوورە پەرێز گرتن.

**خەتەنەگا (ن)** xetenega
پێستی سەر پۆپەی چووک.

**خەتەنە کردن (کتپ)** xetene kirdin
سوننەت کردن،چەرمی سەر پۆپەی کێر بڕین، خرووسە بڕین.

**خەتەنە سووران کردن (کتن)**
xetene sûran kirdin
بەزم وبانگ هێشتن بەهۆی سوننەت کردنی منداڵەوە، شایی کردن بەهۆی منداڵ خەتەنە کردنەوە.

**خەتیرە (ن)** xetîre
١- ب (چلووسکە). ٢- مەشخەڵ، مەخشەڵ.

**خەجاڵەت (ئان)** xecalet
چاو بەرەژێر، مل کەچ، فەدیکار، فهیت کار، خەجاڵە تکێش، شەرمەزار.

**خەجاڵەت بوون (کتن)** xecaletbûn
خەجاڵەت کێشان، لەڕووچوون، لەڕوو دامان، سەر داخستن، سەری خۆ شۆڕکردن لەشەرماندا.

**خەجاڵەت کردن (کتپ)** xecalet kirdin
تەریق کردنەوە، چاو بەرەژێر کردن، سەر پێ داخستن، سەر پێ شۆڕ کردن، شەرمەزار کردن.

**خەجاڵەتم نەکەیت! (رس)** xecaletim nekeyt!
ڕوو زەردم نەکەیت (بەگوتن یان کردنی کارێکی ناشیرین..).

**خەجاڵەتیی (ن)** xecaletî
تەریقیی، چاو بەرەژێریی، سەر شۆڕیی، شوورەیی، شەرمەزاریی، مل کەچیی، ئەنگیی.

**خەجاڵەتیی بەسەر هێنان (ند)**
xecaletî beser hênan
ئەتک کردن، بەپەنگ کردن، پەند(پەنگ) پێدان، حەیا بردن، ڕسواکردن، سووکایەتیی بەسەر هێنان.

**خەجلیین (کتن)** xecilîn ١
داچلەکیین، ڕاچلەکیین.

**خەجلیین (کتن)** xecilîn ٢
شلەژان.

**خەر (ن،ئان،کل)** xer(kl)
کەر، گوێ درێژ، هەر.

**خەرابە (ئان)** xerabe ١
خەرا، ویران، کاول.

**خەرابە (ن)** xerabe ٢
کەلاوە، ویرانە، خەراوە.

**خەرار (ن)** xerar
تیرکە، خرار، خرارکە، خەشە، خیرار، ئەنراویکە شاش لە مووی بزن.

**خەراف (ن)** xeraf
تۆڕی ماسی گرتن.

**خەرام (ن)** xeram ١
خۆش ڕەوتیی، خۆش ڕەفتاریی.

**خەرام (ن)** xeram ٢
قونە، قونە قون.

**خەرام (ن)** xeram ٣
شنە (با).

**خەرامان (ن)** xeraman ١
شۆخ ، شەنگ، شۆخ وشەنگ، نازدار، ناز ڕەفتار

(ئافرەت).

**خەرامان** (ن) ٢ xeraman ² E

لەنجەو لار.

**خەرامانە** (ن) xeramane

بریی، بەها، بەهای بریتیی، پاداش.

**خەرامانە پێ‌دان** (کتپ) xeramane pêdan

پاداشت دانەوە، چاکەبەچاکە کردن،
چاکە کردن لەگەڵ کەسێ بەرامبەر بەچاکەکەی.

**خەرامانەدان** (کتپ) xeramanedan

بۆ ئەژماردن، بۆ بژاردن، پیدانەوە، تۆڵەدانەوە،
خستنەوەجێ، قەز ڤراندن، هۆدانەوە.

**خەراو** (ئان) ١ xeraw ¹

لەکار کەوتە، هب:(پەکە کەوتە).

**خەراو** (ئان) ٢ xeraw ²

ب (خراپ).

**خەراو** (ن) ٣ xeraw ³

خەراو ویژیی، هب(جنێو).

**خەراو وتن** (کتپ) xeraw wutin

دژمان داین، سخیف دان، هب:(جنێودان).

**خەراو ویژیی** (ن) xeraw wêjî

خەراو بێژیی.

**خەراوەکار** (ن) xerawekar

جەردە، ڕێگر.

**خەربار** (ن) ١ xerbar ¹

باری کەر.

**خەربار** (ن) ٢ xerbar ²

خەروار، خەڵوار، کێشێکە بەرامبەری سێسەد
کیلۆگرام یان سەد باتمان.

**خەربازیی** (ن) xerbazî

چنگە فلیقێ، گاڵتەبازیی، یارییە کەرانە.

**خەربەستە، خاوەن ڕستە** (پن)
xerbeste xawen riste

بێداریی بنچینەی هەدارییە. توند بەستراو، زوو
دۆزراو(ولاخ).

**خەربەند** (ن،رو) xerbend

خەربەنگێ، خەرەبەنگێ، غەربەنگێ، گرنگێ فەرەنگیی،
گەرچەکە فەرەنگیی.

**خەربەندە** (ن،کی) xerbende(ki)

خەربەنگێ، قەتارچیی، کەردار، ئاگاداریکەر و ئاژو
وەری بارەبەران.

**خەرپشت** (ن) ١ xerpişt ¹

خەر پشتە، بنمیچیی بەخشت چنراو، سەربان
وینمیچی لەخشت وتاق دروست کراو.

**خەرپشت** (ن) ٢ xerpişt ²

پاڵپشت، کۆڵەکەی پاڵ دیوار (بۆ قایمیی).

**خەرپشت** (ن) ٣ xerpişt ³

پشت دەرگا، پاڵپشتی دەرگا (پارچە دار بۆ
داخستن).

**خەرپونگ** (ن،رو) xerpung

خەر پنگێ، خەر پونگە، زرەپنگێ، جۆرە پونگەیەکی
کێوییە، پونگەی دەم گۆلاو... پونگە کێویلە (بۆ
ناو چێشت بەکاردەهێنرێ).

**خەرت** (ن) xert

مەتەوکەوان، ئامرازی دارتاش کەداری پێ خڕو
لووس ئەکات، ئامرازی دار لووس کردن وکون
تێکردن، ئامرازی خەڕاتی.

**خەرتا** (ن) xerta

تیر، جەوالیی زیخ ولم کێشان، شەلتەی گەورە.

**خەرت وپەرت** (ئان) xertw pert

پارچە پارچە، خەرت وپرت، کەرت ولەت، لەت
وپەت.

**خەرتوش** (ن) xertûş

پاشەڕۆکە.

**خەرتۆک** (نک) xertok

پاشەڕۆکە.

**خەرتەل** (ن،م) xertel

خرتەل، خرتل، خەردال، دالاش، دالەکەرخۆرە،
سوورە دال، لاشەخۆرە.

**خەرتەلە** (ن،رو) xertele

تۆوێکی تیژە لەخێزانی خەردەل.

**خەرج** (ن) ١ xerc ¹

شیربایی.

**خەرج** (ن) ٢ xerc ²

باج وخەراج، باجی دەوڵەت، هب:(باج ١/).

**خەرج کردن** (کتپ) xerc kirdin

پارە بەشت دان.

**خەرج کردن** (کتپ) xerc kirdin

ب (بەخت کردن).

**خەرج ودەخل** (نک) xercw dexil

مەسرەف ودرامەت.

**خەرجیی** (ن) ١ xercî ¹

بافتەی پان.

**خەرجیی** (ئان) ٢ xercî ²

گشت لایی، گش لایی، هەموانیی.

**خەرجیی** (ن) ۲ xercî
ڕۆژانە، مووچە.
**خەرجیی وەمەرجیی** (نک) xercîw mercî
پارەمارە.
**خەرخودا** (ن،جج) xerxuda
جالجالۆکە، کاکلەمووشان، داپیرۆشکە.
**خەرخەشە** (ن) ۱ xerxeşe
جفجفە، شەق شەقە.
**خەرخەشە** (ن) ۲ xerxeşe
قەرقەش، کیشەوھەرا، کیشمە کیش.
**خەرز** (ن) ۱ xerz
لێ پەڕینی جانەوەران جگە لەمرۆ.
**خەرز** (نک) ۲ xerz
گەرا، میلکە، میلکە(جروجانەوەر).
**خەرز گرتن** (کتن،کتپ) xerzgirtin
لێ پەڕیین (گیاندار بێجگە لەمرۆڤ)، هـب: (جووت گرتن).
**خەرس** (ن) xers
بەراورد، خەمڵ، قەرس.
**خەرساندن** (کتپ) ۱ xersandin
ب (خەساندن).
**خەرساندن** (کتپ) ۲ xersandin
۱- خەرسـاندن، خـەرس کـردن، بـەراورد کـردن، خەملاندن، قەرساندن، قەبلاندن.
۲- هەڵسەنگاندن، تەخمین کردن.
**خەرسەک** (ن) ۱ xersek
کلۆکل، گلمتک، کەرسەک.
**خەرسەک** (ن) ۲ xersek
سیپالی ئەستوور.
**خەرسەک** (ن) ۳ xersek
فەرشی تووکن، قالیی تیسکن، مافورەی بەکولک.
**خەرشۆف** (ن) xerşof
زەویی نابابەت بۆ کێلان، زەویی ناجۆر بۆ کشتو کاڵ.
**خەرقە** (ن) xerqe
بالاپۆشیی دەرویش، جبە.
**خەرک** (ن) ۱ xerk
باوەش، هامێز.
**خەرک** (ن) xerk
ناوگەڵ، نێوان ڕان.
**خەرک** (ن) ۲ xerk
بن هەنگڵ، بن باخەڵ، بن دەس.

**خەرک** (ن،کی) ۳ xerk(kl)
قوڕوچڵپاو.
**خەرک** (ن) ٤ xerk
دووتـای دارێـن (لەسـەر پـشتی باربـەر دادەنرێ بـۆ بەرد کێشان) یان دارتاش داری لەسەر دادەتاشێ.
**خەرک** (ن) ٥ xerk
(داری درێـژی سـێ پـێچک کـەتاوانباری لەسـەر بـەر قامچی دەدرا) سێپا، سێپایە، سێ پێچکە.
**خەرکانە** (ن،پز) xerkane
خـشرووک، خـەرکان، خرکانـە، جـۆرە برینێکـی پەرەسینە.
**خەرکنج** (ن) xerkinc
قرژاڵ، قرژانگ، خەرچنگ.
**خەرکۆڵ** (ن،رو) ۱ xerkol
کەرکۆڵ، گیای پیفو، گیای قاو(وەک پووشوو بەکار دەهێنرێ بۆ ئاگر پێ کردنەوە، یان وەک دەرمان بۆ ڕاوەستاندنی خوێن چۆڕیین).
**خەرکۆڵ** (ن،رو) ۲ xerkol
کەرکۆڵ، کەرتەشیی، گیایەکی سەر زلی بەدڕکە.
**خەرکەمان** (ن) xerkeman
خەرکـەوان، ئامـرازی چەماندنـەوەی کەللـە بێژنـگ وکەمـەی دەف، ئامرازێکـە کەمـەی میلـەک وبێـژنگی پێ ئەچەمێنرێتەوە.
**خەرگۆلک** (ن،ئا) xergolik
خەرگۆڕ، کەرەکێویی، گۆڕ.
**خەرگووش** (ن،ئا) xergüş
کەرویشک، خەروێ، هەوریشە، کەوریشک.
**خەرگە** (نک) xerge
پەڕۆشر، پەڕۆکۆن، شرکەو پرکە، شڕەو مڕە.
**خەرگەلە** (ن) ۱ xergele
کەر لەوەڕین.
**خەرگەلە** (ئان) ۲ xergele
پیس وچەپەڵ، کۆنە پۆش، پیس و پۆخل، شڕپـۆش، شەخسەپەڕۆ.
**خەرمان** (ن) xerman
بەرهەمی دەغلودانی کـۆکراوە لەسـەر جـۆی خـوێن، کۆی سووری دەغلودان، دەغلی سوورکراو، خرمان.
**خەرمانان** (ن) ۱ xermanan
شەشەمین مانگی ساڵ (۳۱ ڕۆژە).
**خەرمانان** (ن) ۲ xermanan
جەنگەی خـەرمان هـەڵگرتن، خـەرمان سـوور، کـاتی خەرمانان، کاتی بێدەر.

**خەرماناو** (ن) xermanaw
ب (خەرمان بەرەکەت).
**خەرمان بەرەکەت** (ن) 1 xerman bereket
خەرماناو، نزای پیت بۆ خەرمانان،نزا بۆ زۆر بوونی خەرمان.
**خەرمان بەرەکەت** (ن) 2 xerman bereket
بەخششێ کەخاوەن خەرمان ئەیدا.
**خەرمان بەرەکەتا!** (ئسب) 3 xerman bereket !
سلاو بۆ خەرمان کەران.
**خەرمان پێو** (ن) xerman pêw
خەرمان کێل، کەسێ کەخەرمان بەکێلە دەپێوێ.
**خەرمان پێوان** (کتپ) 1 xerman pêwan
خەرمان پێوانە کردن.
**خەرمان پێوان** (کتپ) 2 xerman pêwan
بێدەر بەکێل وەرگێران.
**خەرمان سوور** (ن) xerman sûr
خەرمانی سوور کراو، کۆ گەنمی خەرمان.
**خەرمانگا** (ن) xermanga
جێ خەرمان، جێگە خەرمان (شوێنێ کەبێدەری لەسەرە)، خەرمانگە، خەرمەجا، هب(جوێ خوێن).
**خەرمان لۆغە** (ن) xerman loxe
خەرمانگە، خەرمان لۆغە، دانەوێلە کەلەسەر خەرمان دەدرێ بەهەژاران.
**خەرمانە** (ن) xermane
ئاخلە، هالە، ڕووناکی تەم ومژێ کە لەبەرچاو بۆتە کەمەی دەوری مانگ.
**خەرمانەدان** (کتن) xermanedan
ئاخلەدان، کەمەی ڕووناکیی تەم ومژ لەدەوری مانگ پەیدابوون.
**خەرمان هەلگرتن** (کتپ) xerman helgirtin
خەرمان پێوان و کۆکردنەوەی، خەرمان کۆوەکردن.
**خەرمشک** (ن،ئا) xermişik
جرج، مشکەکوێرە، مشکی دەشتیی.
**خەرمووگ** (نک) xermûrg
مووڕگ کەر، مووروەکەرانە، مووروی درشت وشین.
**خەرمە خیل** (ن،ئا) xerme xîl
بەرگاوێلکە، هب(ئێستر بالانی).
**خەرمەگەز** (ن،جج) xermegez
کەرمێش، مێشەکەرانە، هب(خەرەنگەر).
**خەرمێز** (ن) xermîz
ب (چاولێکەریی).

**خەرناز** (ن) xernaz
نازەکەرانە، نازو ئەدای زیاد لەخۆ.
**خەروا** (ن) xerwa
کولێرەی لەژێر ژیلەمۆ برژاو.
**خەرەزەن** (ن) xerezen
قامچی.
**خەرەفان** (کتن) xerefan
خەرەفیان، خەرەفین، خەڵەفان، لەبەر پیریی‌هۆش نەمان، خڵەفان، بیر خراپ بوون، بیر تێکچوون، خرەفان (لەبەر پیریی)، گەوج بوون، خەڵەمیین.
**خەرەفاو** (ئان،ن) xerefaw
خەرەف، خەرفاو، خەرف، خەرفتیی، خەرفیو، خەرفیی، خەڵەفاو، خڵەفاو، لەبەر پیریی هۆش لاوازبوو، خەرفاو، خەرەفیاگ، ژیریی تێکچوو (لەبەر پیریی)، خەرەفیاو، خەرەفیو، خەڵەفیاگ، گەوج، هۆش نەماو (لەبەر پیریی).
**خەرەن** (ن) xeren
بەردچن، خەرە، کوچک چن، وشکەکەڵەک، دیواری لەکوچک بێ هەڕ، دیواری لەوشکە کەڵەک.
**خەرەند** (ن) 1 xerend
خەندەق، خەندەک، خەندۆر، خەننەک.
**خەرەند** (ن) 2 xerend
چالاو، قولکەی ئاو.
**خەرەنگز** (ن،جج) xerengiz
خەرەنگەز، خەرەنگەزە، مۆزەشینە، جۆرەمێشێکی زلی سەوزە گەراکەی لەناو گۆشت یان برینـدا دادەنێ.
**خەریب** (ئان) 1 xerîb
سەیر، سەیرو سەمەرە.
**خەریب** (ن) 2 xerîb
دەنگ وئاوازی خەمگینانە.
**خەریب** (ن) 3 xerîb
بیانی، بێگانە.
**خەریب** (ن) 4 xerîb
لاوەکیی، خەریبە.
**خەریب** (ئان) 5 xerîb
بەلەنگاز، بێ چارە.
**خەریت** (ئان) xerît
فیت، گرسە، گەورە، مەزن.
**خەریتە** (ن) 1 xerîte
فیشەکدان.

**خەریتە** (ن) ١ xerîte
نەخشە، وێنەی زەویی بەهێل دەستنیشان کراو.

**خەریتە** (ن) ٢ xerîte
قومقمۆکەی بارووت، باروتدان.

**خەریک** (ئان) xerîk
سەرقاڵ، سەرگەرم، خەرکاو، مژووڵ، تێوەگلاو، دەسگیراو، خەجل، بەکاریکەوە ئاڵاوە، سەرگەرمی ئیش.

**خەریک بوون** (کتن) xerîkbün
سەرگەرمی ئیشێ بوون، لەئیشێکەوە ئاڵان، لەکاریکەوە گلان، مژووڵ بوون.

**خەریک کردن** (کتپ) xerîkkirdin
ڕێ لێ گرتن، کۆسپ لەبەر دانان، کۆسپ هێنانەبەر، گیروگرفت هێنانەبەر.

**خەریک مان** (کتن) xerîkman
بەکاریکەوە خەریک بوون، دەست گیران، سەرقاڵ بوون، سەرگەرم بوون.

**خەریکماو** (ئان) xerîkmaw
بەکارەوە سەرگەرم، خەریک وخەرکاو، سەرقاڵ و سەرگەرم بوو، مژووڵ بوو.

**خەریک وخەرکاو کردن** (ند)
xerîkw xerkaw kirdin
جاڕس کردن، سەرلەکەسێ سەندن، شپرزەکردن.

**خەریکی** (ن) xerîkî
سەرگەرمیی.

**خەرین** (کتن) xerîn
پرخەکردن، پرخە پرخ کردن (لەخەودا).

**خەڕا** (ئان) xera
تام تیژ، تیژ (لەچێژەدا)، هب (تیژ).

**خەڕات** (ن) xerat
تراشکار، تەراشگەر، چێوتاش، دارتاشی خەڕت، دار خەڕتکەر، دار لووسکەر، دار تاشی دار لووسکەر... بە ئامرازی خەڕاتیی.

**خەڕاتیی** (ن) xeratî
تراشکاریی، تەراشگەریی، ئاسن یان چێوتاشیی، خەڕتکەریی، کاری خەڕات، پیشەی خەڕات.

**خەڕاتیی کردن** (کتپ) xeratîkirdin
خەڕت کردن، تراشکاریی کردن، تەراشگەریی کردن، چێوتاشیی کردن، بەخەڕت دارتاشیی یان ئاسنگەریی کردن، بەخەڕت ئیش کردن.

**خەڕار** (ئان) xerar
بەباق وبریقە، بەبریقە، هب (بریسکە دار).

**خەڕاز** (ن) ١ xeraz
پینەچیی، پینەدۆز.

**خەڕاز** (ن) ٢ xeraz
وردەفرۆش، وردەواڵا فرۆش.

**خەڕتاندن** (کتپ) xertandin
لەبن وبێخ دەرهێنان، لەبن وڕەگەز دەرکێشان.

**خەڕت کردن** (کتپ) xertkirdin
ب (خەڕاتیی کردن).

**خەڕگ** (ن) xerg
قوڕ، هەڕگ، هەڕ، هەڕیی، خەڕە، حەڕیی.

**خەڕگین** (ئان) ١ xergîn
لەقوڕدروستکراو.

**خەڕگین** (ئان) ٢ xergîn
قوڕاویی.

**خەڕناش** (ن) xernaš
کونای لووت، کونە تفنگ، کونە لووت، کونە کەپوو.

**خەڕۆ** (ئان) ١ xero
بوغرا، خەڕە، خلۆر، بەفیز، لووت بڵند، لووت بەرز، لە خۆبایی، خودسەر.

**خەڕۆ** (ئان) ٢ xero
تەفرەخواردوو، تەفرەدراو، فریوخواردوو.

**خەڕۆبوون** (کتن) ١ xerobün
بایی‌بوون، لەخۆبایی بوون، خۆ هەڵکێشان، هاشەوهوو شەکردن.

**خەڕۆبوون** (کتن) ٢ xerobün
تەفرەخواردن، تەفرەدران، فریوخواردن، هەڵ خەڵەتان.

**خەڕۆکردن** (کتپ) xero kirdin
تەفردان، هەڵ فریواندن.

**خەڕە** (ئان) xere
چاوەڕوان، چاوەنوار.

**خەڕەک** (ن) ١ xerek
ئامرازی لۆکەڕیسیی، دەزگای پەموو ڕستن، چەرخی لۆکە دووخ وخوریی ڕستن.

**خەڕەک** (ن) ٢ xerek
بەردکێشیی‌داریین، دووتاییبەردکێشیی(سەرپشتی وڵاخ.)

**خەڕەک ڕستن** (ند) ١ xerek ristin
زۆر ووتن، هب (باریکان ڕستن /٢).

**خەڕەک ڕستن** (کتپ) ٢ xerek ristin
ڕاکێشان وبادانی لۆکەوخوریی وکردنی بەڕیس.

**خەڕەم** (ن.ئا) xerem
خەڕەمە، نێرەکەر، نێرەکەری پەڕین، نێرەکەری تۆو، نێرەکەرێ بۆ پەڕین تەرخان کرابێ.
**خەز** (ن.ئا) xez
خـز، {گیانـەوەرێکی شـیر دەری گۆشـت خـۆرە.. تــووکی ســوور و بــۆرە و لەزســتاندا ســپی هەڵدەگەڕێ}.
**خەزا** (ن) xeza
جەنگێ بەناوی ئایینەوە، غەزا، جەنگێ لەڕێی خوادا.
**خەزاڵ** (ن.ئا) xezal
ئاسک، خەزال، کەژاڵ، مامز.
**خەزان** (ن) [1] xezan
خەزام، دەمی خەزەڵوەر، کەژی دوای هاوین.
**خەزان** (نک) [2] xezan
خــەزام، خــەزەڵ، گــەڵای زەردی پــایز، گــەڵای هەڵوەریو، گەڵای زەردو سیس بووی داوەریو.
**خەزان** (ن) [3] xezan
قازان، خەزگان.
**خەزان کردن** (کتن) xezan kirdin
گــەڵارێزان، گــەڵا هــەڵوەریین، مزەردەهەڵگــەڕان و داوەریـین، گــەڵا وەریـین، سـیس بـوون و داوەریـین (گەڵا)، گەڵا داکەوتن لەدارو درەخت.
**خەزانەدار** (ن) xezanedar
گەنجەوان، گەنجینەدار.
**خەزایی** (ن.م) xezyî
عەینەمەل، کەندەسمە، مێش خۆرە، هەنگە خۆرە، خەنجەرباڵا، ڕەنگاڵە، خەنجەر باڵە، کەنەسمە.
**خەزر** (ن.ئان) xezir
ڕک، سەرسەختیی، هب (تووڕەبوو).
**خەزرین** (کتن) [1] xezirîn
پێ چەقاندن، مان گرتن.
**خەزرین** (کتن) [2] xezirîn
دەرکەوەچوون، ڕک بوونەوە، ڕق گرتن.
**خەزگاڵ** (ن.لو) xezgal(lu)
کاشکا، هب (خۆزگە).
**خەزن** (ن) xezîn
خوشکی ژن، ژن خوشک.
**خەزنە** (ن) xezne
خەزینە، گەنج، گەنجینە، خزنە، ترەوە.
**خەزوور** (ن) xezûr
باوکی ژن یان مێرد، خەزوورە، خەزیر، خوەزوور.

**خەزەڵ** (نک) xezel
ب (خەزان).
**خەزەڵوەر** (ن) xezelwer
مانگی گـەڵارێزان، مـانگی هەشـتەمی سـال، خـەزەڵ وەریـن، هەشـتەمین مـانگی سـال، حەوتـەم مـانگی ڕۆژیی.
**خەزێم** (ن) xezêm
ئالقـەی زێـڕ یـان زیـوینی نێـوان کونـە لـووتی ژن، قولفەیـەکی ئـاڵتوون یـان زیوینـە ئافرەتـانی لادێ دەیکەنە پەڕەی لووت بۆ جوانیی.
**خەزێمۆک** (ن.رو) xezêmok
گوڵە مرواری.
**خەزێنە** (ن) [1] xezêne
ب (خەزنە).
**خەزێنە** (ن) [2] xezêne
گەنجینەی پارە (سەر بەکۆمەڵەیەک).
**خەزێنە** (ن) xezêne
ئەماراوی گەرماو.
**خەزێنە** (ن) [2] xezêne
(خەزان) تیانی گەرماو، خەزنە.
**خەس** (ن) xes
بێگونیی، خەساویی.
**خەسار** (ن) xesar
خەسارەت، زەرەر، زیان.
**خەسارە** (ن) xesare
خەسار، نیرگە، داری ژێر کاریتە.
**خەساس** (ن) xesas
خەسۆک، گون دەرهێن، گون دەرهێنەر، وەستای خەساندنی وڵاخ، کەسێکە ئاژەڵ بخەسێنێ.
**خەسان** (کتن) xesan
پیاوەتیی نەمان، خەسیین، هێلکەی گون دەرهاتن.
**خەساندن** (کتپ) [1] xesandin
خەرسـاندن، خــەرس کــردن، خەســانن، گــون دەرهـاوردن، گـونی ئـاژەڵ دەرهێنـان، هـب(ئیختـە کردن ١/).
**خەساندن** (کتپ) [2] xesandin
ب (ئیختە کردن ٢ و ٣).
**خەساندن** (کتپ) [3] xesandin
تـەرزی تـووتن وتەماتـە... شـکاندنەوە (بـۆ ئـەوەی پەل بهاوێ وبەر دابێلێ)، سەر لکی ڕووەک پەڕاندن.
**خەساندن** (ئد) [4] xesandin
پـیاوەتیی کەسـێ نەهێـشتن، دەسـەڵات بـڕیـن. ـە

پیاوەتی خستن، لەهەرەو گیف وگورە خستن.

**خەساندن** (ند) xesandin°

ترساندن.

**خەساو** (ئان) xesaw

نەختە، بێ گون، خەسیاگ، خەسیاو، خەسێنراو، گون دەرهاتگ، گونەویلە دەرهێنراو.

**خەسپال** (ئان) xespal

زورهان، لەکارکەوتە، عەمەل مەندە (لەبەر پیریی).

**خەست** (ئان)[1] xest

پەیت، توند، تونددەوەبوو، تیر، خەس، خەست وەبوو، خەستاو، هەس (شلەمەنی).

**خەست** (ئان)[2] xest

بەرەنگ، پڕرەنگ، تەڵغ، تۆخ، تیر، رەنگ تیر، خەستەک، کەوەیی.

**خەست بوونەوە** (کتن) xestbünewe

پەیت بوون، توندبوونەوە، تونددەوەبوون، چکانەوە.

**خەست کردنەوە** (کتپ)[1] xestbünewe

پەیت کردنەوە، توند کردنەوە، تونددەوەکردن، چکاندنەوە

**خەست کردنەوە** (کتپ)[2] xestbünewe

تۆخ کردنەوە، تەڵغ کردن.

**خەست وخۆڵ** (ئان)[1] xestwxoḻ

خەست وبەلەزەت.

**خەست وخۆڵ** (ئان)[2] xestwxoḻ

سەرخۆشی زۆر مەست یان بێ هۆش.

**خەستە** (ئان)[1] xeste

بیمار، خەسە، دەردەدار، نەخۆش، ناساغ.

**خەستە** (ن)[2] xeste

تۆراخ، خەست، خەسە، دۆی تونددەوەکراو، دۆی بە تورەکەدا کراو.

دۆی دەتوورەکەکراو.

**خەستە** (ئان)[3] xeste

شەکەت، ماندوو، هیلاک.

**خەستەخانە** (ن) xestexane

تیمارخانە، خەسەخانە، نەخۆشخانە، نەخۆشگە.

**خەستیی** (ن)[1] xestî

پەیتیی، توندیی، تونگیی، خەسیی.

**خەستیی** (ن)[2] xestî

بەرەنگیی، پڕ رەنگیی، تۆخیی، تیریی(رەنگ).

**خەسرک** (ن) xesrik

تریانی گەورە، قەرتاڵەی زل.

**خەسرەوانیی** (ن) xesrewaní

کوپەی زل، کوپەی گەورە.

**خەسوو** (ن) xesü

خوسسیی، خەسیی، دایکی خیزانی کەسێ، دایکی ژن، دایکی مێرد، داڵکی ژن وشوو، داڵکی هاوسەر، دایکی هاوسەر.

**خەسیس** (ئان) xesîs

چکووس، رەزیل، ب (چرووک).

**خەش** (ن)[1] xeš

عەیب، عەیبە، کەمایەسیی، نەنگیی.

**خەش** (ن،کل)[2] xeś(kl)

بێئاگایی، گێژیی، وڕیی، هێڕیی.

**خەش بڕیین** (کتپ،کل) xeš birîn(kl)

خەش کردن، خەشەلێ بڕیین، گێژکردن، وڕکردن، هێڕ کردن.

**خەش بوون** (کتن،کل) xešbün(kl)

خەشە لێ بڕان، گێژبوون، وڕبوون، هێڕبوون.

**خەشخاشک** (ن،رو) xešxašik

گوڵاڵەسوورە، گوڵاڵە سوورکە.

**خەشۆ** (ئان) xešo

نەزان، هەقمەق، هب(بلح).

**خەشە** (ن) xeše

خەرار، خیشی.

**خەشیفک** (ن) xešîfik

جەواڵی یەکسەریی، هۆڕ (دووتایی).

**خەشیڤولک** (ن) xešîvulk

١- خلیسک، خلیسکایی.

٢- سەرەو ژێریی، سەرەو لێژایی.

**خەشیل** (ن،رو) xešxîl

ب (خوشیلک).

**خەشیم** (ن) xešîm

فێرەکارنەکراو، کارنەزان، ناشی.

**خەف** (ن) xef

نادیاریی، نهێنیی.

**خەفان** (کتن) xefan

نەوان، نەویی بوون.

**خەفان** (کتن) xefan

ب (خەوتن).

**خەفاندن** (کتپ)[1] xefandin

خەواندن، خەو لێ خستن، کردنەخەو، دەخەو کردن (منداڵ).

**خەفاندن** (کتپ) ٢ xefandin

چەماندنەوە، دانەواندن.

**خەفتان** (ن) ١ xeftan

خـەفتیان، سـەرۆکی گەمیـە، قـەفتان، قـەفتیان، کەشتیەوان، کەشتیوان.

**خەفتان** (ئان) ٢ xeftan

چاوەڕوانی دەرفەت، چاوەنۆڕی هەل.

**خەفتان** (ن) ٣ xeftan

خوبـار،زەویی بەوشـکیی تـۆوکراو، زەویـی دیـم کەبەوشکی بەر لەباران چێندرابێ، هشکاوس.

**خەفتو** (ن) xeftû

موتە، مۆتەکە، خەفێ.

**خەفتیان** (ن) xeftiyan

ساردەپایز، سەرمای پایز (کەئیتر ناشێ تـۆوی تێـدا بچێنن).

**خەفک** (ن) xefik

خەپک، خەفکێ، خەفیکێ، تەڵە، فاقە، هێ(تەپکە).

**خەفگە** (ن) xefge

چاڵـــەتوتن، چـــاڵاو، شـــوێنێکە تـــوتنی تێـــدا هەڵدەگیرێ.

**خەفۆک** (ئان) ١ xefok

خەو لەمست (کەسێ کەزوو خەوی لێ بکەوێ)، خەو خۆش.

**خەفۆک** (ئان) ٢ xefok

بغوز، ئەوگایەی لەخەتی جووتدا دەخەوێ، گـاجوتێ کەلەکاتی جوت کردندا بخەوێ، خەوۆک.

**خەفۆک** (ئان) ٣ xefok

١- کەسێکە زۆر خەفەت بخوات.

٢- مامەخەمە، خەمخۆری هەموو کەسێ.

**خەفە** (ئان) ١ xefe

کپ.

**خەفە** (ئان) ٢ xefe

ئاگری ڕەش بووەوە، ئاگری کـوژاوە، (گـرە) ئـاگری کز.

**خەفە** (ئان) ٣ xefe

پشوو لێ براو، تاساو، تاسیاگ، خنکیاگ.

**خەفەبوون** (کتن) ١ xefebûn

ڕەش بوونەوە، کپ بوون (ئاگر)، خەمتیین.

**خەفەبوون** (کتن) ٢ xefebûn

تاسان، تاسیان، خنکان، خنکیان.

**خەفەت** (ن) xefet

ئانوو، ئامین، ئـەرنوو، بـار، پـەلمە، پـەرۆش، پـەژارە، تـەم، تـاراو، تـالاو، جغـار، جـەخار، خـەم. داخ. دڵ پڕیی، دڵ تەنگیی، رۆخ، زووخاو، غەم، سوو، کـول، کەسـەر، مەینـەت، ناخۆشـیی، ناڕەحـەتیی، ناهەمواریی.

**خەفەتبار** (ئان) xefetbar

پەرۆشدار، پەشێو، تەمبار، تەمیین، خەمبار، غەمبار، غەمگین، دڵ بریندار، دڵ تەنگ، دڵ بکول، دڵ پڕ، دڵ پڕ لەکەسەر، غەمناک، مەینەتبار، هەناسەسارد.

**خەفەتباریی** (ن) xefetbarî

خەمباریی، خـەمناکیی، خـەمخۆریی، غـەمناکیی، دڵ تەنگیی، زویریی.

**خەفەت خواردن** (کتن) ١ xefet xwardin

مشوور خواردن.

**خەفەت خواردن** (کتن) ٢ xefetxwardin

خەم خواردن، خەم داگرتن، خەمگین بوون، خـەمناک بوون، خەفەت هەڵگرتن، خەفـەت پـەچنینە دڵ، داخ خواردن، دڵ تەنگ بوون، ناڕەحەت بوون.

**خەفەتدەر** (ئان) xefetder

خەفەت ئاوەر، خەفەت هاوەر، پەرۆش هێنەر.

**خەفەکردن** (کتپ) ١ xefekirdin

کپ کردن، کز کردن (ئاگر، گڕی چرا).

**خەفەکردن** (کتپ) xefekirdin

پشوو لێ بڕیین، تاساندن، خنکاندن.

**خەفەکردن** (کتپ) ٢ xefekirdin

خپ کردن، قت کردن، لەناو بردن(مرۆڤ).

**خەفەکردن** (کتپ) ٣ xefekirdin

بێ دەنگ کردن.

**خەفیاگ** (ن،رو) xefyag

تـۆلکیش، تـوولی داری مێـو، (بەسـەر زەویـدا ڕاکێشراو و ناوبەناو خۆڵ بکرێت بەسەریا بۆ ناشتن وسەوز بوونی).

**خەفیە** (ن) xefye

خەوەڕچن، خەوەر چێن، زوان گیر، سیخوڕ.

**خەل** (ن،س) xel

خەڵ، سەنگەر، سپێر، سوپێر، یان کەڵەکە بەرد (بۆ شەڕ لەپەنادا کردن).

**خەلاس** (ن) ١ xelas

دوایی هاتگ، دوایی هاتوو.

**خەلاس** (ئان) ٢ xelas

ڕزگار، ڕزگار بوو.

**خەلاسیی** (ن) xelasî

ڕزگاریی.

**خەلان** (کتن) xelan

لەجێ چوون، خەلیان (جومگە).

**خەلاندن** (کتپ) xelandin

خەلیاندن، لەجێ بردن (جومگە).

**خەلستن** (کتن) xelistin

ڕزگاربوون، دەرچوون.

**خەلفە** (ن) xelfe

بەردەستیکەر، دومایوەستا، بەردەستییوەستای پیشە ساز.

**خەلۆل** (ن) [1] xelol

جگەکۆلک، میچەگویلک، میچی قاچی ڕەشە ولاخ.

**خەلۆل** (ئان) [2] xelol

ناقۆلا (پیاو). دژو: جوانخاس.

**خەلە** (ن) xele

دانەویلە، دەغل، ودان، گەنم وجۆ...، خەلیە.

**خەلەدان** (ن) xeledan

ئەماری دانەویلە، خەلیەدان.

**خەلەستوو** (ئان) xelestû

قال، قالبوو.

**خەلەفرۆش** (ن) [1] xele firoş

دانەویلە فرۆش، عەلاف.

**خەلەک** (ئان) [2] xelek

ئالۆسکاو، لیک هالاو (قژ)، ئالۆزاو.

**خەلەک** (ن،ئان) [3] xelek

مووی سەری بەپێچ، مووی لوول، قژی لوول.

**خەلەکە** (ن) xeleke

بازنەی دارینی هەوجاڕ.

**خەلەنگ** (ن،ڕو) xeleng

گەزگەزک، گەزگەسک، گەزگەزۆک، گیایەکە کەمرۆڤ دەگەزێ، گیاگەزنە.

**خەلەوخەرمان** (نک) xelewxerman

خلەوخەرسان، دەغل ودانی سال.

**خەلیت** (نک) xelît

گوللەدەرمان وکەرەسەی تفەنگی شینکە، تەرەقەو پشتاو ویاروت وچەشنی پەڕۆی تفەنگی ڕەشۆکیی.

**خەلیتە** (ن) xelîte

قەلادەی ملی سەگ، گەردن بەندی سەگ.

**خەلیش** (ن) xelîş

دارستانی چوغر، قۆپی، لیرەواری پر وچڕ.

**خەلیفە** (ن) [1] xelîfe

جێ نشینی پێغەمبەر، سەرۆکی موسلمانان.

**خەلیفە** (ن) [2] xelîfe

ڕاسپاردەی شێخی تەریقەت، لەبریکاریی شێخ.

**خەلیلە** (ن،ڕو) xelîle

گیای دان ئاژنیین، خەلتانە، ڕووەکیکە گولیکی بزیڕی دانەدانە دەگریێ وپیژەکانی بۆ دان ئاژنیین بەکار دەهێنرێ.

**خەلیلی** (نک) xelîlî

کۆت وزنجیری لاقی زیندانی.

**خەلێلە** (ن) xelêle

دوو دلیی، دلەڕاوکێ، ڕاڕایی، بێ باوەڕیی.

**خەڵ** (ن) [1] xel

کوز (لەبەرد دروستکراو).

**خەڵ** (نک) [2] xel

خەلق، خەلک، مەردم، مەردووم.

**خەڵات** (ن) [1] xelat

ناوەلانە، پالادرانە، پالامز، پامز، پاداش، پاگوشادانە، پێ گوشادانە، پێ مزانە، پێ مز، خەلاتیی، مژدانە، مزگێنیی، ناو تیلانە، بەخشیش.

**خەڵات** (ن) [2] xelat

دیاریی.

**خەڵات** (ن) [3] xelat

کفن.

**خەڵات پێدان** (کتپ) xelat pêdan

پاداش پێدان، پاداش دانەوە،خەلات کردن.

**خەڵاتیی** (ن،ئان) xelatî

بەخشراو، پیشکەش کراوە، بەخشش، پیشکەشیی.

**خەڵتان** (کتن) xeltan

تیوەچوون، تیوەگەوزان، خلتان، گەوزان (لەخوینی خۆدا وەک یەکیکی بریندار).

**خەڵتە** (ن) xelte

چەلەمە، کولەن، کەلەمە، کەلەوە.

**خەڵف** (ن،ڕو) [1] xelf

باخ نەمامە، نەمامی یەک سال.

**خەڵف** (ن،ڕو) [2] xelf

توولی یەک سالە، لقەداری ئەمسال، لقی یەک سالەی درەخت.

**خەڵق** (ن) [1] xelq

خەلک، دانیشتوو.

**خەڵق** (ن) [2] xelq

خەلکی دیکە، کەسانی تر.

**خەڵق** (ن) [3] xelq

هەموو بوونەوەر.

**خەڵقنۆ!** (ئسب) xelqino!
خەڵقۆ!، ئەی خەڵکینە!.

**خەڵقیی** (ن.ج) xelqî
خەڵکی، کەسانی تر، خەڵکی دیکە.

**خەڵک** (ن) xelk
خەڵق، کەس.

**خەڵک ڕووت کردنەوە** (ئد) xelk rûtkirdinewe
جەردەیی کردن،ڕێگا بەخەڵک گرتن، ڕێگریی کردن، کاروان ڕووت کردنەوە.

**خەڵک وخوا** (نک) xelkw xaw
خەڵق وخوا، هەموو کەس.

**خەڵوا** (ئان) xelwa
بەدەست پانەوە کراو.

**خەڵۆتە** (ن) xelote
١- ئەشکەولەت، بنەدیزەو گۆزەی شکاو، سواڵەت، خەڵوەتە.
٢- قاپ یان جێ خۆراکی سەگ.

**خەڵووز** (ن) xelûz
خلۆز، ڕەژیی، ڕەژوو، ڕژیی، ڕێژوو، زووخاڵ، کۆمر، پشکۆ ئاگری ڕەشەوەبوو، پشکۆ ئاگری کوژاوە.

**خەڵووزان** (ن) xelûzan
ئەماری خەڵووز، جێ خەڵووز، جێگەی ڕەژیی، خەڵووز دان، ڕەژیدان، زوخاڵدان، شوێن وجێگای‌دانانی خەڵووز.

**خەڵووزە** (ن) xelûze
بەلایەکی‌دەغل ودانە گەلاکانی‌ڕەش هەڵدەگێڕێ، ژەنگ.

**خەڵووزی بەرد** (ن) xelûzî berdî
بەرکەمرە، ڕەژیی بەرد، زوخاڵ سەنگ.

**خەڵوە** (ن) xelwe
چلەکێشیی، چلەنشینیی، تەنیا نشینیی.

**خەڵوەت** (ن) xelwet
جێگەی تەنیایی، تەریک گاە، تەریکخان.

**خەڵوەت کێش** (ن) xelwet kêş
چلەکێش، چلەنشین، تەنیا نشین، ئەو کەسەی بەتەنیا دەژی لەتەریک گامێکدا بۆ مەبەستێکی ئاینیی.

**خەڵوەتیی** (ن) xelwetî
ئەمار، ژووری ئازووقە، گەنجینە، وچخانە.

**خەڵەت** (ن)١ xelet
سەهو، هەڵە.

**خەڵەت** (ن)٢ xelet
تەفرە، فریو.

**خەڵەتان** (کتن) xeletan
بەهەڵەداچوون، هەڵ فریوان، هب(تەفرەدان).

**خەڵەتاندن** (کتپ) xeletandin
بەسەردا تێپەڕاندن، بەهەڵەدا بردن، تەفرەدان، چاو بەست لێ کردن، خەڵەتانن، دەست بڕین، دەست بەزاخداکردن، دەسخەڕۆ کردن، فریودان، لەخشتەبردن، هەڵ خەڵەتاندن، هەڵ فریواندن.

**خەڵەتاو** (ئان) xeletaw
تەفرەخواردوو، تەفرەدراو، خەڵەتیاگ، خلەتیاگ. خەڵەتیاو، فریوخواردوو، فریودراو، لاسدراو، لەخشتە براو، هەڵ خەڵەتاو، هەڵ فریواندراو.

**خەڵەتێن** (ئان) xeltên
تەفرەدەر، فریودەر، دەسخەڕۆکەر، دەسبڕ.

**خەڵەف** (ن)١ xelef
پێس، پووس، ب (تویکل).

**خەڵەف** (ن.ڕو)٢ xelef
کاسە، کۆمەڵ، گەلای دەوری گوڵی دار...هتد.

**خەڵەف** (ن)٣ xelef
ب (خەڵەت).

**خەڵەفان** (کتن)١ xelefan
خەریک بوون، خلەفان، ماتەڵ بوون.

**خەڵەفان** (کتن)٢ xelefan
خەرەفان.

**خەڵەفاندن** (کتپ)١ xelefandin
خلەفاندن، خەریک کردن، ماتەڵ کردن.

**خەڵەفاندن** (کتپ)٢ xelefandin
خەڵەفاندن، خەریک کردن، ماتەڵ کردن.

**خەڵەفاو** (ئان) xelefaw
خەرەفاو.

**خەڵەڵە** (ئان)١ xelele
خڕی لوولەیی، خڕی لۆلەپیی.

**خەڵەڵە** (ئان)٢ xelele
لەلەی کێری براو، لەلەی چووکی خەتەنەکراو، جێ خەتەنەی نێرینە.

**خەڵێف** (ن) xelêf
بەرچنەی مەنگ، پلوور، توولینەی مەنگ، ماڵی مێشە نگوین (لەشوول تەنراو).

**خەم** (ن)١ xem
خەفەت.

**خەم** (ن) [2] xem
پێچ، لوولپێچ.
**خەم** (ن) [3] xem
چەم، چەماو، چەمیاگ.
**خەمازە** (ن) xemaze.
داری قولاپی ماسیی.
**خەمان** (ئان) xeman
پڕ کوڵ وکەسەر، پڕ لەخەم.
**خەماویی** (ئان) xemawî
پـڕ لەخـەم، خـەم ئـاوەر، خـەماوەر، خـەم هێنـەر، خەمگینکەر، مایەی دڵ تەنگیی، هۆی دڵ تەنگیی.
**خەمبا** (ن) xemba
مەیلەو ڕەقیی، نیمچە هەستاویی، هـەوەس، مـەیل (لە ئامرازی نێرینەدا).
**خەمبار** (ئان) xembar
خەفەتبار.
**خەمباریی** (ن) xembarî
خەفەتباریی.
**خەمت نەبێ!** (شر) xemit nebê
پشتی لێ بکەرەوە،بێ خەم بە، دڵنیابە!.
**خەمچوور** (ن) xemçûr
پووشانە، سەرانە، قەمچوور، بـاج وخـەراج (بـۆ ئاغا یان میریی).
**خەمخوار** (ئان،ن) xemxwar
بەتەنگــەوەبوو، بەتەنگــەوە هــاتوو، بەمــشوور، خـەمخۆر، خاڵەخەمـە، خەمکـەی خـەمان، دڵـسۆز، مامەخەمە، کوڕی لێ قەومان.
**خەمخوار** (ئان) xemxwar
ب (خەفەتبار).
**خەمخواریی** (ن) xemçûr
خەمخۆریی، خاڵەخەمەیی، دڵسۆزیی، مامەخەمـەیی، مشووردایی.
**خەمخواریی کردن** (ئد) xemxwarî kirdin
ب(خەمخۆریی کردن).
**خەمخۆر** (ئان،ن) [1] xemxor
ب (خەمخوار).
**خەمخۆر** (ئان) [2] xemxor
ب (خەفەتبار).
**خەمخۆرک** (ن) xemxorik
خەمخۆرکە، خەمخۆرکێ، درز، قڵیش، قـەڵش، کـون و کەلەبەر (کەلەزەویی پەیدابوویێ لەبەر بێ ئاویی).

**خەمخۆرە** (ن.م) xemxore
خـەمـەخۆرە، شاوەشـینکە، شـاهۆ، باڵندەیـەکی گەورەی قاچ وملی درێژە و لەکەناری ئاو هەڵدەنیشێ بەماتی.
**خەمخۆریی** (ن) xemxorî
خەفەتباریی.
**خەمخۆریی کردن** (ئد) [1] xemxorî kirdin
دەست گرتن، لالێ کردنەوە، یارمەتیدان.
**خەمخۆریی کردن** (ئد) [2] xemxorî kirdin
بەتەنگـەوە بـوون، بەتەنگـەوەهاتن، خـەمخواریی کـردن، مامەخەمـەیی کـردن، مـشوورخواردن، مشووردایی کردن، دەربەست هاتن.
**خەمخۆریی لێ کردن** (ئد) xemxorî lê kirdin
بەخەم کەسێ یان شتێکەوە بوون، خەم بۆ خـواردن، خـەم لێ خـواردن، خـەمخۆریی لێ کـردن، گـوێ پـێ دان، مشوور لێ خواردن.
**خەمخەمۆک** (ن.ڕو) xemxemok
خەمخۆکــە، شــکۆفەی داری میــو، گــوڵی ڕەز، جاسەنە.
**خەم داگرتن** (ئد) xem dagirtin
تـەمیان، تـەمیین، خـەمناک بـوون، دڵ تـەنگ بـوون، دڵگیر بوون.
**خەمرک** (ن) xemirk
کانیی وشینایی لەناو بیاباندا.
**خەمڕە** (ن) xemre
قۆڵکەی ئاو، گۆلاو.
**خەم ڕەوێن** (ئان) [1] xemrewên
ئاو دەنگیی، تەسەلادەر، خەم لابەر، خەم نەهێل.
**خەمڕەوێن** (ن) [2] xemrewên
وەڕوێرکە، وەڕۆژێلکە، شاگرد، بەردەستیکەر.
**خەمریی** (ن) [1] xemrî
پرچۆکە، پرچی سەرتوێل، پەرچۆکە، پەرچووکە.
**خەمریی** (ن) [2] xemrî
ئەنی بەند، پەڕۆی ناوچەوان بەستن، توێل پێچ.
**خەمزە** (ن) xemze
ئەدا، ئیشوە، خنچکە، خنچـە، غنچـە، غـەمزە، نـازی بەچاوان.
**خەمزەکردن** (کتن) xemze kirdin
خنچکەکردن، خنچەکردن، غەمزەکردن، نازکردن.
**خەمزەکەر** (ئان) xemzeker
بەئەدا، بەناز، خنچەکەر، نازکەر.

**داردان** (ن) ٢ dardan
لەسێدارەدان، لەقەنارەدان، مل بەپەتەوە کردن، بەسێدارەوە کردن، پەت بۆ هەڵ خستن، ئیعدام کردن.
**دارەدەس{دار دەست}** (ن) dardes(dar dest)
دارئەسا، چێوی کەبە دەستەوە دەگیرێ.
**دارەدەستی ئەم وئەو**(ئد) dardestî emw ew
١- بوون بە(پیاو، دەسکەلا، کوتەک، مەقاش)ی ئەم وئەو. ٢- چەوساندنەوە (کەسێ).
٣- خراپە پێ کردن(بەکەسێ).
**دارەدەستییەتی** (رس) dardestîytî
هەموو کاری بەو ڕادەپەڕێ، جێی متمانەیەتی، جێی بروایەتی.
**دارەدینک** (ن) dardînk
داری (ڕاهەنگاو، ڕایەڵکراو) بەسەر ئاخوڕدا.
**دار ژمێر کردن** (کتپ) dar jmêr kirdin
بەداردەست (شت ژماردن، هێما بۆ کردن بۆ مەبەستی ژماردن، سەر ژمێر کردن).
**دارستان** (ن) daristan
بێشە.
**دار شاخ کردن** (کتپ) daršax kirdin
ئابڕوو بردن، سووکایەتی بەسەرهێنان.
**دار شەق** (نک) ١ daršeq
داری بن باڵی مرۆڤی شەل (بۆ بەڕێگەوە ڕۆیشتنی).
**دار شەق** (ن) ٢ dar šeq
دارشەقین، کاشۆ، گۆچانی گەمەی شەقین.
**دار فرسەغ** (ن) dar firsex
دار فرسەق، فرسەقسان، فرسەق نیشان، نیشانەی ڕێگە، بەرد یان داری چەقاولەدەم ڕێگە بۆ مەودای دیاریی کردن.
**دار قەسپ** (ن،رو) dar qesp
دارخورما.
**دارقەلۆتکە** (ن،رو) dar qelotik
لاسکی وشکی ڕووەکە.
**دار قەوام** (ن) dar qewam
ئامرازی داریخوار ڕاست کردنەوە.
**دارکە** (ن) darik
دەمارە تووتن.
**دارکاچکە** (ن،رو) dar kaçik
داری کرۆسکە، درەختی هەرمێ کێویلە.

**دارکاریی** (ن) darkarî
حەسیرمەیدان، بیراز(بەدار)، داروفەلاقە.
**دارکاریی کردن** (کتپ) darkarî kirdin
بەدار لێدان، حەسیرمەیدان کردن، دانەبەردار.
**دارکە بژێر** (ن) ١ darkbijêr
کەسێ کەدەمار لەتووتن جیادەکاتەوە.
**دارکە بژێر** (ن) ٢ darkbijêr
بژار، هەڵاواردنی دەمار لەتووتن.
**دارکردن** (کتپ) dar kirdin
ئێزنگ کۆ کردنەوە، دارخستن، گزرەخستن، هێزم خستن یان کۆکردنەوە، دارشکاندن.
**دارکوتکە** (ن) darkutik
دارکوزرکە، کۆڵەووژ، داری کەئاگری پێ تێک وەردەدەن.
**دارکۆلکە** (ن) darkolik
داری (جلیت بازیی، چۆگانبازیی).
**دارکونکەرە** (ن) ١ darkunkere
دریل، مەتکەب، پلەمەتە، پلەمەتێ.
**دارکونکەرە** (ن،م) ٢ darkunkere
دارەسمە، دارەکەوە، دار(تورکنەکە، تەقینە، کرۆکە، کرۆکە، کوت، کوتکە).
**دارکە پێچان** (ئان) ١ darkepêçan
کزوکەنەفت، لەڕولاواز.
**دارکە پێچان** (ن) ٢ dar kepêçan
لەڕیی، لاوازیی، کزیی وکەنەفتیی.
**دارکەر** (ن) darker
ئێزنگڤان، داربڕ، داربڕەوە، دارشکێن، گزرەخەر، ئێزنگ کۆکەرەوە، هێزم کۆکەرەوە، دارکۆوەکەر، دارلێوەکەر.
**دارکە لاربوو سێبەریش لارە** (پن)
darkelarbü sêberîš lare
مرۆڤی خراپ چاکەی لێ ناوەشێتەوە.
**دار لە جێی کول ژەندن** (ئد)
dar le cêgey kul jendin
کەسێ جوڵاندن، دڵی کەسێ کولاندنەوە، پەژارەی کۆن هێنانەوەیاد.
**دارماڵ** (ئان) darmal
پڕاوپڕ، سەرپڕ، سەرلێوان، لێوان لێو، مالاومال، لچان، پڕکراو، مالامال، داگرتوو، داگرتیی.
**دارماڵ بوون** (کتن) darmalbün
تەژیی بوون.
**دارماڵ کردن** (کتپ) darmalkirdin
پڕاوپڕ کردن، لێواو لێو کردن، مالاومال کردن، لێوان

کردن.

**داروبەرد (نک)** darwberd

دەشت ودەر، هەردووبەر، هەموو (شت، شوێنێ)، کوچک وکەلەکە.

**داروپەردوو (نک)** darwperdü

داروچیلکەو چەویلی سەر خانوو وخێزەر.

**داروودەستە (نک)** darwdeste¹

دەس وپێوەند، ژێر دەستان.

**داروودەستە (نک)** darwdeste²

دارودەسە، دام ودەستە، دەستەودایەرە، دەس و پێوەند، دەسەوبەسە، دەستەو کۆمەڵە، زەڤان، زیوە.

**داروودەوەن (نک)** darwdewen

لێرەواری بەپێنچک، بەرزایی بەدارو درەخت داپۆشراو.

**داروودیوار گوێی هەیە (پن)**
darwdîwar güêy heye

زمانی بەد زیان ئاوەرە، بێ پەروا وپارێز ئاخاوتن زمان دەسووتێنێ.

**داروغا (ن)** daroxa¹

پاسەوانی شار، داروغە، قولچیی ناوشار.

**داروغا (ن)** daroxa²

سەرپەرشتیکەری پۆلیس.

**دارەبەن (ن،رو)** dareben

دار( قەزوان، کەسکان، بەنک، بەنوشت، بنێشت).

**دارەدارکردن{منال} (کتن)**
dare darkirdin(minal)

بەرەو پێ گرتن چوون.

**دارە دارە{منال} (ن)** dare dare(minal)

تازە سەرپێیی منداڵ، چۆنیەتیی رۆیشتنی منداڵی تازە پێ گرتوو.

**دارەڕا (ن)** dare ra

داری دارەڕا (لەسەر دیوارێکەوە بۆ سەر دیوارێکی بەرامبەری).

**دارەڕاکردن (کتپ)** dare ra kirdin

بەراپەڵ..هتد سەری خانوو گرتن، بەکاریتەو دەستەکە سەری ژوور داپۆشین.

**دارەڕەش (ن،رو)** dare reš

بناو، بناوەچ، داربناو، نارەوەن.

**دارەست (ن)** darest

لەمپەر، بەرگر.

**دارەشکێنە (ن)** dareškêne

دارنەشکێنە، مەرگەموش، دەرمانی مشک(کوژ).

**دارەخاڵ{ئاژەڵ} (ئان)** darexal

بازەڵە، تەرە، دارەغان، لەلانەتۆراو.

**دارەگەڵ (ن،رو)** dare gel

درەختی گەورە کەدوو ناوپەلی قوولی بێ و ئالفی لەسەر دابنرێ بۆ زستان.

**دارەمەیت (ن)** dare meyît

تابووت، تاووت، تاویت، تەتە، دار( بەس،بەست، بازە)، دارە( باز، تەرم)، دووداره، لاشەکێش.

**دارەوان (ن)** darewan

داربان، دارڤان، کەسێ کەباش بە( داردا، درەختدا) هەڵدەچێ یان هەڵدەگەڕێ.

**دار هەڵبڕە سەگی دز دیارە (پن)**
dar hel bire segî diz diyare

مرۆڤی پڕ هەڵە گومانی لەهەموو کەسە. ئەو کەسەی هەڵەیەکی کردبێ ویەکێ باسی شتێ بکات ئەو لەوێوە دەیباتە سەرخۆی. پاک بەو لەکەس مەترسە.

**داریانەوە (کتن)** daryanewe

بەملاوبەولادا کەوتن، لارەوە لارەوە ڕۆیشتن.

**داری بەسەر بەردیەوە نەماوە(رس)**
darî beser berdiyewe nemawe

١- هەردی بەسەر بەردەوە نەمان، تێک وپێک دران و هیچ بەسەر هیچەوە نەمان، کاول بوون.

٢- پەرش وبلاوبوونەوە.

**داری پیرەدار، بەدارنابێ، یاری دوور بەیار نابێ (پن)**
darî pîredar, bedar nabê, yarîdür beyar nabê

داری پیرو یاری دوور جێی هیوانیین.

**داری سواڵ دانە دەست کەسێ (ند)**
darî swal dane dest kesê

نابووت کردن، هەژارخستن، هیچ پێ نەهێشتن (پارەوپوول)، خستنە سەر ساجی عەلی.

**داری سەماوات (خ)** darî semawat

١- بۆ ژنێ، ئەوپەڕی هەراسانیی.

٢- ژیانێکی پڕ ناڕەحەتیی.

**دارێکی بەدەستەوەیە هەردوو سەری پیسە (پن)**
darêkî be desteweye herdü serî pîse

کەوتۆتە هەڵوێستێکی دوو سەرییەوە هیچیانی لا پەسەند نییە.

**دارین (ئان)** darîn¹

دارینە، لەتەختە دروستکراو، لەدار( دروستکراو، کرلو، کریاکە، کریاو).

داڕین (ناو) [2] dar̲în
بەداروبار، پڕ لەداروردەخت، یاپڕ لە( بێشە، جەنگەڵ، لێرەوار).
داڕزان (کتن) [1] dar̲izan
داتولان، لەبەر یەک چوون، پووان، پەرپووت بوون، پەرتووک بوون، ڕزان، تووڵانەوە، داتولیین.
داڕزان (کتن) [2] dar̲izan
داڕزیان، داڕزیین، گەندن، گەندبوون، گەنیین، گەنیو بوون، گەنان، داوەشان (لەبۆگەنیدا).
داڕزاندن (کتپ) [1] dar̲izandin
تۆلاندنەوە، داتۆلاندن، لەبرەبردن.
داڕزاندن (کتپ) [2] dar̲izandin
ڕزاندن، ڕزانن، دافرەقاندن، دافرەقانن.
داڕزاو (ناو) [1] dar̲izaw
زۆر بەکارهێنراو، زۆر لەبەرکراو( جل وبەرگ..).
داڕزاو (ناو) [2] dar̲izaw
ئەمارەبۆ، عەمارەبۆ، لەناو عەماردا یان دوکاندا ڕزیو
داڕزاو (ناو) [3] dar̲izaw
شرۆڵ، داوەشاو، پرتوکیاگ، داتولاو، داڕزای، داڕزیاگ، داڕزیاو، دافرەقیاگ، پوواو.
داڕزیویی (ن) dar̲izîwî
ڕزیویی، گەندەڵیی.
داڕژان (کتن) [1] dar̲ijan
دا(ڕژیان، یاریین، ڕشان، ڕشیان، وارین) {خەڵک}.
داڕژان{باران} (کتن) [2] dar̲ijan(baran)
داواریان، بەلێزمەهاتنەخوار، شەست کردن.
داڕژان (کتن) dar̲ijan
هەڵ ڕژان، ڕژان(لەسەرەوە بۆ خوار)، قلپ بوونەوە (شلەمەنیی ناو دەفر).
داڕژاندن (کتپ) dar̲ijandin
داڕژیاندن، هەڵ ڕژاندن، لەسەرەوەبۆخوار ڕژاندن.
داڕژاو{کانزا} (ناو) [1] dar̲ijaw (kanza)
داڕێژراو، دارشتە، دارشتوو،
لەقاڵب کراو، دەقاڵب کراو، دەناو قاڵب کراو.
داڕژاو (ناو) [2] dar̲ijaw
هەڵڕژاو، هەڵڕێژراو.
داڕسان (کتپ) dar̲isan
پەلاماردان.
داڕساو (ناو) dar̲isaw
ئاسوودە، نەبەسراو، نەبەسیاگ.
داڕسکاندن (کتپ) dar̲iskandin
داڕسکانن، ڕاپسکانن، گرتن وبەزۆر ڕاکێشان
(بەرقەوە، لەترساندا، لەبەر ناڕەزایی).
داڕشتن (کتپ) [1] dar̲iştin
داڕژتن، کردنە ناوقاڵب، لەناوقاڵب کردن، خستنە قاڵبەوە، لەقاڵب دان، دەقاڵب کردن، دەناوقاڵب کردن.
داڕشتن (کتپ) [2] dar̲iştin
١- داڕژاندن، داڕژتن، داڕیتن، ڕۆکردن.
٢- هەڵ ڕشتن، هەڵ ڕتن.
داڕشتن{چاو} (کتپ) [3] dar̲iştin(çaw)
چاو ڕشتن، کل لەچاو کردن،کل دەچاو کێشان.
داڕشتن (کتپ) [4] dar̲iştin
دانان، گوتن، ووتن، هەڵبەستن.
داڕشتن (کتپ) [5] dar̲iştin
بنیادنان، پێکەوەنان، دروست کردن.
داڕشتوو{خۆ} (ناو) dar̲iştü(xo)
پان وپۆڕ، چوارشانە، خەپان، داگرتیی.
داڕن (ن) dar̲in
ڕووتەوەکەر بەدەست( مووی پێستە ).
داڕنان{پێستە} (کتن) dar̲inan
ڕووت بوونەوە، ڕووتەوەبوون.
داڕنیین (کتپ) [1] dar̲inîn
هیچ پێ نەهێشتن (شت سەندن لەکەسێ ودابەش کردنی بەسەر کەسانی دیکەدا).
داڕنیین{پێستە} (کتپ) [2] dar̲inîn(pêste)
ڕووتاندنەوە، ڕووتەوەکردن، لێ داماڵیین.
داڕنیین (کتپ) [3] dar̲inîn
ساف کردن، داتاشیین، داڕووتاندن( بەڕەندەی داڕتاشی ).
داڕنیین (کتپ) [4] dar̲inîn
داڕوتاندن، داڕوتانن، لێکردنەوە (بەروبووم).
داڕوو (ن) dar̲ü
داڕووی گەرماو، دەرمان حەمام، مووداماڵ (دەرمان).
داڕووتان (کتن) [1] dar̲ütan
گەلا (پێوەنەمان، هەڵوەریین، ڕێزان، کەوتنەخوار).
داڕووتان (کتن) [2] dar̲ütan
ڕووت بوون، ڕووت وەبوون، ڕووتەوەبوون، جل لەبەردا نەمان.
داڕووتاو (ناو) dar̲ütaw
تاوەرووتکراو، دا(ڕنراو، ڕووچاو، ڕووچای) {پەلەوەر}.

**داڕووچان** (کتن) dar̄üçan
ناوەڕووت بوون، موویان پەڕ پیوەنەمان.
**داڕووچاندن** (کتن) dar̄üçandin
موویان پەڕپیوەنەهیشتن.
**داڕووخان** (کتن) dar̄üxan
دا( تەپان، ڕمان، ڕمیان، ڕمیین، ڕووخیان )، ڕۆچوون، سەرەوژێربوون، ویران بوون، بەربادبوون.
**داڕووخاندن** (کتپ) dar̄üxandin
دا( تەپاندن، ڕماندن، ڕمانن )، ویران کردن.
**داڕووخاو** (ئان) dar̄üxaw
ویران، بەرباد، بەربات، دا( ڕماو، تەپاو، ڕووخیاگ، ڕووخیاو ).
**داڕووخێن** (ن) dar̄üxên
داڕمێن، ڕووخێنەر.
**داڕووگرتن** (کتپ) dar̄ügirtin
داڕوو لەخۆگرتن، دەرمانی موو داماڵ لەخۆدان، موو لەخۆ کردنەوە بەداڕوو.
**داڕەت** (ئان) dar̄et
بەردەس، بەردەست، نزیک دەست، نزیک لەدەستەوە، قامچ.
**داڕێژراو** (ئان) dar̄êjraw
پتەو، توند، سفت، قاییم، توندوتۆڵ.
**داڕێژگە** (ن) dar̄êjge
قالبی( ڕێژگریی، ڕێژەگریی، شت تیدا تواندنەوەی پیشەسازان ).
**داڕێژی** (ن) dar̄êjî
ڕێژەگریی، ڕێژەگەرییەر.
**داژدار** [1] (ن) dajdar
داشدار، قەلاچیی، پاسەوانی کەڵهە.
**داژدار** [2] (ن) dajdar
ئاگاداریکەر، پاریزەر.
**داژداریی کردن** (کتپ) dajdarî kirdin
بەخێوکردن، گۆش کردن.
**داژگیر** (ن) dajgîr
داشگیر، بێژنگ.
**داژەندن** [1] (کتپ) dajendin
بەرەوخواربردن، داژەنیین، داژەنن، شۆڕکردن.
**داژەندن** [2] (کتپ) dajendin
هەڵواسیین.
**داژەنیین** (کتپ) dajenîn
پارچەپارچە لێک جیاکردنەوە، هەڵوەشاندن )، لەبەر یەک هەڵ وەشاندن.

**داژیار** (نک) dajyar
ڕنق، ڕسق، ڕۆزیی.
**داس** (ن) das
داسی دروێنە، دارە، دارێ.
**داسپاردن** (کتپ) dasipardin
ڕاسپاردن، پێ‌وتن.
**داستان** (ن) dastan
چیرۆک، سەرگوروشتە، دەستان، سەرگوزەشت، ئەفسانە، قەواتی، دەسان، هەقایەت.
**داسخاڵە** (ن) dasxal̄e
داسماڵە، گیابڕ، مەڵەغان، داسی پەل( کە تایبەتی گیا دروونە ).
**داسمانگ** (ن) dasmang
مانگی( تازە، نوێ )، داسولکەی مانگ لەیەکەم ڕۆژی مانگدا.
**داسنیی** [1] (نک) dasnî
١- یەزیدیی، ئێزدیی.
٢- زەردەشتیی، لەسەر ئاینی زەردەشت.
**داسنیی** [2] (نک) dasnî
خوازبێنیکەران، داواکاران.
**داسوو** (ن،رو) dasü
داسک، داسوکە، بژ، داسەی گوڵی گەنم وجۆ.
**داسەکنان** (کتن) daseknan
دا( سەکنیین، سرەوتن، سرەوییین، سرەفتن، کاسیین، کەسیان )، هەدادان.
**داسەکناندن** (کتپ) daseknandin
ئارام کردن، ئۆقرە پێ گرتن، داکاساندن، داکاسانن.
**داسەکناو** (ئان) daseknaw
ئارام گرتوو، ئۆقرەگرتوو، خاتر جەم، دا( سرەوتوو، سەکنیو، کاسیای، کەسیو، مرکاو )، سرەوتوو، هەداداو.
**داش** [1] (ن) daš
کوورەی ( ئاسنگەر، ئاگری پیشەسازان ).
**داش**{ دامە ، شەترەنج} (ن) [2] daš(dame. šetrenc)
بەرد، پیادە.
**داشاخە** (ئان) dašaxe
ئاشاخە، ئەیاخ ، ڕزیو، قرپۆک ( میوە ).
**داش بە داش کردن** (کتپ) daš be daš kirdin
تۆڵە ساندنەوە.
**داشت** (ن،ئا) dašt
ئاژەڵی ڕاگیراو بۆ بەروبوو، داشتە، داشە.

**داشتن** (کتپ) daštin

ئاودێریی کردن، ئاو(لێدان، کردنەسەر)، ئاویاریی کردن (زەویی..).

**داشته {جل وبەرگ}** (نک) dašte(cilw berg)

کۆنه، لەنگه(بۆ فرۆشتنەوه).

**داشداریی** (ن) dašdarî

١- داژداریی، ئاگاداریی.

٢- لایەنگریی، لایەنگیریی.

**داشدیار** (ن) dašdiyar

بناوان، کەیبانوو، ئاگادارێکەری ماڵ.

**داشکان** (کتن) dašikan [1]

تێک شکان.

**داشکان** (کتن) dašikan [2]

هەڵەوگەڕان، هەڵوگەڕیان، مووچیان، مووچیانەوه.

**داشکاندن** (کتپ) dašikandin [1]

داشکانن، لەحەساوکەم کردنەوه، لێ دەرهێنان، لێ کەم کردن.

**داشکاندن{ئاو}** (کتپ) dašikandin(aw) [2]

جۆگەهەڵبڕان، ڕایی کردن، وێڵ کردن.

**داشکاندن{ئاو}** (کتپ) dašikandin(aw) [3]

بەربۆ بەرەلاکردن، ڕایی کردن،ڕەهاکردن.

**داشکاندن{شتی چنراو}** (کتپ) [4] dašikandin (šitî çinraw)

داکوژاندن، دوایی پێ هێنان.

**داشکه لەرم** (ن،رو) daške lerm

داش کەلەم، کەلەرمی بێ گەلای ڕەق.

**داشلانه** (ن) dašilane

سوختەی کلیسه، شاگردی کلیسا.

**داشلیقان** (کتن) dašliqan

فلیقانەوه، پلیخانەوه.

**داشۆران** (کتن) dašoran

بەرەو ژێر شۆڕبوونەوه، دا(ڕۆچکان، شۆڕیان)، شۆڕ(وەبوون، بوونەوه)، شۆڕەوەبوون.

**داشۆراندن** (کتپ) dašorandin [1]

دامیشتن.

**داشۆراندن** (کتپ) dašorandin [2]

بێ شەرمیی بەسەرهێنان، ئابڕوو بردن.

**داشۆرین** (کتپ) dašorîn

دا (شۆران، شۆراندن، شۆرانن، شۆردن، شتن)، شتن یان شوشتن لەسەرەوه بۆ خوار، لەسەر بۆ خوار شوشتن.

**داشەکان** (کتن) dašekan

خواربوونەوه، چەمانەوه.

**داشەکاندن** (کتپ) dašekandin

خوارکردنەوه، شەکاندنەوه(بەملاوبەولادا).

**داشەهارە** (ن) dašehare [1]

دوامیین پیادەی یاری دامه.

**داشەهارە** (خ) dašehare [2]

نەسرەوت، هاروهاج.

**داشێلان** (کتپ) dašêlan [1]

پلیشاندنەوه، جیق وفیق دەرهێنان، فلیقاندنەوه.

**داشێلان** (کتپ) dašêlan [2]

دەست(پیا، پیدا)هێنان، لەسەرەوه بۆ خوار بەنهێم شێلان، مەساج کردن.

**داشێلان** (کتپ) dašêlan [3]

شێلان، پێوان(هەویر).

**داشیی** (ن) dašî

گوڵ چنەوه، گوڵچن(لەپەرێز).

**داعووران** (کتپ) da'ûran

قووت دان، قویت دان، قورچاندن، داقورچاندن.

**داغان** (ئان) daxan

بەرباد، تەرت وتونا، تارومار.

**داغان بوون** (کتن) daxanbûn [1]

تاروماربوون، وردوخاش بوون، پارچەپارچەبوون.

**داغان بوون** (کتن) daxanbûn [2]

پرش وبڵاوبوون، پەرش وبڵاوبوون.

**داغان کردن** (کتپ) daxan kirdin

تەرت وتوناکردن، هەپروون بەهەپروون کردن، تارومار کردن.

**داغ دیه** (ئان) daxdiye

بەلابەسەر هاتوو.

**داف** (ن) daf

گرفتاریی، دووچاریی، گیرۆدەیی.

**دافرتان** (کتن) dafirtan

لێ بەربوونەوه، لێ دەرپەڕین.

**دافرتاندن** (کتپ) dafirtandin

بەردانەوه، خستنەخوار.

**دافلیقان** (کتن) dafilîqan

پلیشانەوه.

**داڤەڕستن** (کتپ،کی) daveristin(ki)

ڕاسان، هەڕەشەکردن.

**داقرتاندن** (کتپ) daqirtandin

کرماندن، کرۆژتن، کرۆشتن، داکرماندن، داکرۆژتن،

داکرۆشتن (بەددان).

**داقرچان** (کتن) daqirçan

ترنجان، هەڵ (قرچان، قرچیان)، داقرچیان.

**داقرچاندن** (کتپ) daqirçandin

گرنج کردن، هەڵ قرچاندن.

**داقلیشان** (کتن) daqil̲îšan

داقەڵشان، قلیشان، کرانەوە (لەباری دریژیی).

**داقلیشاندن** (کتپ) ١ daqil̲îšandin

قلیشاندن، کردنەوە، والاکردن.

**داقلیشاندن** (کتپ) ٢ daqil̲îšandin

داقەڵشاندن، داقەڵەشاندن، داتلیشاندن.

**داقلیشاندن** (کتپ) ٣ daqil̲îšandin

داقەلاشتن، لەت کردن.

**داقلیشاو** (ئان) daqil̲îšaw

دا (قەڵەشیاو، قەڵەشاو، قلیشیاگ).

**داقنان** (کتن) ١ daqinan

دا (فەتان، ڕزان، وەشان).

**داقنان** (کتن) ٢ daqnan

داقنیین.

**داقناو** (ئان) daqnaw

دافەتاو، داڕزاو.

**داقنیین** (کتن) daqnîn

داقنان، ڕوو زەردبوون، شەرمەزاربوون.

**داقوساندن** (کتپ،کی) daqusandin(ki)

(بەمقەست) بڕیین، قەیچی کردن.

**داقولیین** (کتن) daqülîn

شکان، شکیان.

**داقەلاشتن** (کتن) daqel̲atšin

بەپەلەهاتن.

**داکالیان** (کتن) dakal̲yan

نەڕان، نەڕاندن، هاوارکردن، خوڕیین، داخوڕیین.

**داکردن** (کتپ) ١ dakirdin

ئەنبارکردن، ئەمبارکردن، عەمارکردن، عەمبارکردن، کۆم کرن، گردکردنەوە، ئەمارکردن.

**داکردن** (کتپ) ٢ dakirdin

پاشەکەوت کردن، خستنەلاوە (شت بۆ پاشەڕۆژ).

**داکردن** (کتپ) ٣ dakirdin

ڕۆکردن (شتی ڕەق).

**داکردن** (کتپ) ٤ dakirdin

تێ کردن، کردنە (ژوور،ناو)، لەژوورەوە توندکردن، لە ژوورەوە کردن، تێ خستن.

**داکردن** (کتپ) ٥ dakirdin

داکرن، کردنەسەر (ئاو).

**داکردن** (کتن) ٦ dakirdin

بارین، دەست بەهاتنەخوار کردن، دادان.

**داکردن** (کتپ) ٧ dakirdin

داکرن، کردنەژوور، لەژوورەوە کردن (ئاژەڵ).

**داکردن** (کتپ) ٨ dakirdin

ئاسیی کردن، حەپس کردن.

**داکردن** (کتپ) ٩ dakirdin

دەست بەیاریی کردن (لە هەڵماتیندا).

**داکردن** (کتپ) ١٠ dakirdin

بەتاڵ کردن، خاڵیی کردن، ڕژاندن.

**داکرماندن** (کتپ) dakirmandin

دا (کرمان، کرمیین، کورنژیین)، هاڕیین (شتی ڕەق بە ددان).

**داکرماو** (ئان) dakirmaw

کرۆژراو، ووردکراو، بەددان هاڕراو.

**داکروپان** (کتپ) dakrüpan

چاو پۆشیی لێ کردن.

**داکشان** (کتن) ١ dakišan

دانەکورتیی، لەکورتی دان.

**داکشان** (کتن) ٢ dakišan

هاتنەخوار بەگورجیی (بەرەوژێر)، خشیین (بەرەوژێر).

**داکشاندن** (کتپ) dakišandin

داڕەتاندن، بەرەوژێرڕەتاندن.

**داکشاو** (ئان) dakišaw

خزاو، خزیو.

**داکشە کردن** (کتن) ١ dakišc kirdin

بەخشکەبەرەو خوارچوون.

**داکشەکردن** (کتن) ٢ dakiše kirdin

شەپۆل لەبەست گەڕانەوە.

**داکوت** (ن) daküt

داقوق، داری سەر خڕی سنگێ پێ داکوتان.

**داکوتان** (کتپ) ١ dakütan

دەست پێ کردن (دەست بەجێ)، دەست دانەکار (بەپەلە).

**داکوتان** (کتپ) ٢ dakütan

داکوتیان، هەڵوەراندن (دانەویلە)، دان لەگوڵ جیا کردنەوە (بەلادان).

**داکوتان** (کتپ) ٣ dakütan

بەنهێم بەزەویدا دان (وەک مزراح).

**داكوتان** (كتپ) dakütan [4]
لەبێژنگ دان (دەغل..).

**داكوتاندن** (كتپ) dakütandin
چەقانـــدن، دا(چەقانـــدن، كوتـــان)، بردنـــەخوار (بەنهێم)
{تێلا، سنگ، بزمار}.

**داكوژان** (كتن) daküjan [1]
برانەوە، داشكان.

**داكوژان** (كتپ) daküjan [2]
براندنەوە، برپینەوە، داكوژیان(شەروكێشە).

**داكوژاندن{ئاگر}** (كتپ) daküjandin(agir)
وەكوژاندن، ئاگر بڕكردن.

**داكۆكە** (ن) dakoke
هەراوهۆریای ئاپۆرەی خەلک.

**داكۆكیان** (كتن) dakokyan
كۆشیان، كووشیان، تێ كۆشان.

**داكۆكیی** (ن) dakokî
پـشتگیریی، پـشتیوانیی، پـشتیوانداریی، لاگیریـی، كۆمەک، لاكوشیی، یاریدە.

**داكەتن{نێر لە مێی ئاژەل}** (كتپ،كی) daketin (nêr le mêy ajel) [ki]
جووت گرتن، لێ پەڕیین.

**داكەن** (ن) daken
لەخۆ (داماڵ، وەكەر) {جل وبەرگ} - ئارتیست لە تیاترۆخانە..

**داكەندن** (كتپ) dakendin [1]
جل (لەبـەرخۆ دامـاڵیین یـان كردنـەوە)، خۆ ڕووت كردنەوە، جلک ژخۆ كرن.

**داكەندن** (كتپ) dakendin [2]
فڕێ دان.

**داكەواندن** (كتپ) dakewandin
بەردانەوە، خستنەخوارەوە.

**داكەوتن** (كتن) dakewtin [1]
بەروەبوون، كەوتنەخوار، خواركەوتن.

**داكەوتن** (كتن) dakewtin [2]
بەرەوخوارهاتن، نزم بوونەوە، هاتنـەوەخوار (نـرخ، مەسرەف).

**داكەوتن** (كتن) dakewtin [3]
بوونەداب وباو، هاتنە(پیشەوە،كایەوە).

**داكەوتن** (كتن) dakewtin [4]
داسـەكنان، دەسـت هـەلگرتن، وازهێنـان (لـەجم وجۆل..).

**داكەوتن{نەخۆشیی}** (كتن) [5]
dakewtin(nexoşî)
بلاوبوونەوە، پەرەسەندن.

**داكەوتن** (كتن) dakewtin [6]
لەكاركەوتن (بەتەواویی).

**داكەوتن** (كتن) dakewtin [7]
بەسالداچوون، پیربوون، پەک كەوتن، عەمەل مەنـدە بوون (بەنەخۆشیی، لەبەرپیریی).

**داكەوتن{دەردوبەلا، نەخۆشیی}** (كتن) [8]
dakewtin (derdw bela, nexoşî)
بلاوبوونەوە، پەرەسەندن.

**داكەوتن** (كتن) dakewtin [9]
تەپان، تەپیین، نەوان، نەویین، داكەفتن، هاتنەخوار.

**داكەوتن** (كتن) dakewtin [10]
شل بوون(گۆشتی لەش، ماسولكەی لەش).

**داكەوتنیی** (ن) dakewtinî
داكفتـــەگیی، داكـــەوتیی، چـــالآیی، داكـــەوتوویی (زەویی).

**داكەوتوو** (ئان) dakewtü [1]
دا (تەپوو، ڕووخاو، كەفتگ، هاتوو) {بان، زەویی}.

**داكەوتوو** (ئان) dakewtü [2]
بلاو وەبوو، تەشەنەكردوو(دەردوبەلا، نەخۆشیی).

**داكەوتوو** (ئان) dakewtü [3]
بەسالداچوو، پیربوو.

**داكەوتوویی** (ن) dakewtüyî
داكەفتگیی، قوپاویی، پیریی.

**داكێشان** (كتپ) dakêşan
بەرەو خوار ڕاكیشان.

**داگ** (ن) dag [1]
بەخشش، دیاریی، خەلات.

**داگ** (ن) dag [2]
گۆڕ، ئاوەوە، نێوان.

**داگر** (ئان) dagir [1]
هەموولا وەبەر خۆدەر.

**داگر** (ئان) dagir [2]
داگیر كەر.

**داگرتن** (كتپ) dagirtin [1]
بەسەردا زاڵ بوون.

**داگرتن** (كتپ) dagirtin [2]
هێنانەخوار، بردنەخوار، هێنانەخوارەوە، پانان، خوارەوە هاوردن.

**داگرتن** (كتپ) dagirtin [3]
داپۆشیین، داگیر كردن (مەودا).

**داگرتن** (کتپ) ¹ dagirtin

دەست بەلێ دانی کەسێ کردن، لێدان (بەقامچی یێ پسانەوە).

**داگرتن** (کتپ) ° dagirtin

پر کردن، تەژیی کردن، مالامال کردن.

**داگرتن** (کتن) ¹ dagirtin

بەهەموو لاراگەیشتن، گرتنەوە.

**داگرتن** (کتپ) ² dagirtin

زۆر (لەگەل کەسێ ناخاوتن، لەگەل یەکێ ووتن)، سەری کەسێ گێژ کردن (بەلۆمەی زۆر).

**داگرتنەوە** (کتپ) ¹ dagirtinewe

دووبارە پرکردنەوە، سەر لەنوێ پر کردنەوە.

**داگرتنەوە** (کتپ) ² dagirtinewe

پەستاوتنەوە، تەپاندنەناو، تێ(ئاخنین، پەستاوتن، ئاخاندن)، پەستانەوە.

**داگرتنەوە** {چەکا} (کتپ) ² dagirtinewe(çek)

تیز کردنەوە.

**داگرتنەوە** {جل} (کتپ) ⁴ dagirtinewe(cil)

بەسەریەکدا دروون، دووران، هەل پێچان، داشکاندن، جووت بەقیەکردن.

**داگرتوو** (ئان) ¹ dagirtü

١- پەستراو، پەستراوە، پەستێنراو.
٢- تێ ئاخنراو.

**داگرتوو** (ئان) ² dagirtü

هاوردە (لەسەربۆخوار).

**داگرتیی** (ئان) dagirtî

بەدەعیە، بەفیز.

**داگوشین** (کتپ) dagušîn

داوشیین، گوشیین.

**داگەران** {رەنگ} (کتن) ¹ dageṟan(reng)

رەنگ گۆران.

**داگەران** (کتن) ² dageṟan

بەرەوخوارهاتن، هاتنەخوار (لەشوێنی بەرزەوە).

**داگەراندن** (کتپ) dageṟandin

بەرەولایەکی دیکەخستنە رێ، بەری رێ پێ گۆرپین، خستنەسەر رێگایەکی تر، رێگەپێ گۆرپین.

**داگیران** {لە ش بە تا}(کتن) ¹ dagîran(le beš ta)

گەرم داهاتن.

**داگیران** (کتن) ² dagîran

گرتێ چوون، داگیرسان.

**داگیران** (کتن) ³ dagîran

قورس بوون، گران بوون(گوێ).

**داگیراو** (ئان) ¹ dagîraw

داگیریاک، بەخۆوە، قەلەو.

**داگیراو** (ئان) ² dagîraw

داگیریاگ، بۆ خوارەوەهێنراو، هێنراوەخوار.

**داگیراو** {بەتا} (ئان) ² dagîrsaw (be ta)

تالێ هاتوو، گەرم داهاتوو.

**داگیرسان** {پشێوی، نائارامی} (کتن) ¹ dagîrsan(pišêwî, naaramî)

دامەزران دەست پێکردن.

**داگیرسان** (کتن) ² dagîrsan

داگرسان، داگیرسیان، داگیریان، گرسان، گیرسان، هەل گیرسان، هەل گیرسیان، پێ بوون، رۆشن بوون، ئاییسان (ئاگر، چرا).

**داگیرسان** (کتن) ³ dagîrsan

١- داگریان، گرگرتن، داگیرسیان، گر لێ بەرزبوونەوە. ٢- سووربوونەوە، سوورەبوون (بەهۆی تینی زۆر).

**داگیرساندن** (کتپ) ¹ dagîrsandin

رۆشن کردن، گراندن، گرانن، هەل گیرساندن، هەل کردن، پێ کردن.

**داگیرساندن** (کتپ) ² dagîrsandin

گەش کردنەوە، گەشەوکردن.

**داگیرساندن** {ئاگر، چرا} (کتپ) ³ dagîrsandin (agir, çira)

داگیراندن، گرساندن، گیرساندن، ئاییساندن.

**داگیرساو** (ئان) ¹ dagîrsaw

پێ(بوو، کراو)، داگیراو، رۆهن، هەل بوو، هەلکراو.

**داگیرساو** (ئان) ² dagîrsaw

ئاگرتێ بەربوو، گرتێچوو، گر گرتوو.

**داگیرکراو** (ئان) dagîr kiraw

بەخورتیی سێندراو، بەزۆرسەندراو، دەست بەسەردا گیراو، زەوت کراو.

**داگیرکردن** (کتپ) ¹ dagîr kirdin

بەخورتی ساندن، بەزۆر سەندن، دەست بەسەرداگرتن، بۆ خۆ(بردن، بەکارهێنان)، شان پێداکردن، زەوت کردن، بردن، دابرپین، گرتن وبردن.

**داگیرکردن** (کتپ) ² dagîr kirdin

بردان، بردن، دابرکردن (بۆخۆ).

**داگیر کردن** {ناوچە، قەلا} (کتپ) dagîr kirdin (nawçe, qela)

دەست بەسەرداگرتن.

**داگیرکەر** (ن،ئان،س) dagîrker
داگـــر، داگــیر، زەوتکـــەر، بەزۆرســـێن، دەســـت بەسەرداگر.

**داگران** (کتن) dagir̲an
هاتنەخوروو(لەش)، وەخورووهاتن.

**داگراندن** (کتپ) dagîr̲andin
وەخورووهێنان، هێنانەخوروو.

**داگراو** (ئان) dagîr̲aw
وەخورووهاتگ، وەخورووهاتوو.

**دال** (ن) ١ dal
نـاوی پـیتی(د)ە لەئـەلف بێـی کـوردی و عـەرەبی وعیبری و فارسی.

**دال** (ن) ٢ dal
جار.

**دال** (ن) ٣ dal
قۆناخ، قۆناغ، مەودای ڕۆیشتنی ڕۆژەڕێیەک بەپێ.

**دال** (ن) ٤ dal
بەردی نیشانەیە لە بەردەفڕکێدا.

**دال** (ن) ٥ dal
پارچە.

**دال دال کردن** (کتپ) dal dal kirdin
پارچەپارچەکردن.

**دالستن** (کتپ) dalistin
دالیستن، دالیسان، لستن، ئالستن(بەزمان)، لیس دان.

**دالشونەک** (ئان) dalšünek
خراپکەر، خراوکار، خراوکەر، خراپەکار.

**دال شونەک** (ن) dalšünek
گیرەشێوێن.

**دالکان** (کتن) dalkan
پێوەکان، دالکیان، چەسپان.

**دالکاندن** (کتپ) dalikandin ١
پێوەچەسپاندن، دا(چەسپان، چەسپاندن، لکانن)، پێوە چەسپاندن.

**دالکاندن** (کتپ) dalikandin ٢
چەسپاندن، چەسپانن، دروومان کردن.

**دالکاو** (ئان) dalikaw
پێوە(چەسپاو، نووساو)، دا(چەسپیاو، چەسپیو).

**دالووشاندن** (کتپ) dalüšandin
دا(لوشکاندن، لوشکانن، لووشانن)، داسڕین، سڕیین بەرەوخوار.

**دالەقاندن** (کتپ) daleqandín
شـــۆڕەوەکردن، هەڵاوەســـیین، هەڵواســـیین (بەرەوژێر)، بەرەوخوار.

**دالەقاو** (ئان) ١ daleqaw
شۆڕ، دەحل.

**دالەقاو** (ئان) ٢ daleqaw
شۆڕەوەبوو، شۆڕەوەکراو، بەرەوخوارهەڵواسراو.

**دالیان** (ن) ١ dalyan
بێ گوێیی، لاساریی.

**دالیان** (کتن، کتپ) ٢ dalyan
پێ داگرتن.

**داڵ** (ن،م) dal̲
داڵاش.

**داڵاش** (ن،م) dal̲aš
دال، خەرتل، لاشەخۆر، کەلاک خۆر.

**داڵان** (ن) dal̲an
دالــۆ، دالـــوو، دالــە، دارەپــێچان، ڕاڕەو، ڕێــڕەوی سەرگیراو بەدەم قاپیی حەوشەوە، ڕێگەی نێوان دوو ڕاستە دیواریی سەرداپۆشراو.

**داڵاندار** (ن) ١ dal̲andar
خانچیی، پاساوڵی کاروانسەرا.

**داڵاندار** (ن) ٢ dal̲andar
پاسەوان.

**داڵان دۆڕەپ** (ئان) dal̲an-dor̲ep
درێژ داهۆل.

**داڵاوخوەر** (ن) dal̲awxwer
قاچاخچیی.

**داڵاوێزبڕین** (کتپ) dal̲awêz bir̲în
بەرەچەڵەکداچوونەخوار، ڕەچەڵەک بڕینەوە.

**داڵبڕ** (نک) dal̲bir̲
برشتی کەوانەیی لەجلدا.

**داڵ بوون** (کتن) dal̲bün
لاوازبوون.

**داڵدە** (ن) ١ dal̲de
کۆلەکە.

**داڵدە** (ن) ٢ dal̲de
قوژبن، کۆلین، کولینکە، کولینکێ.

**داڵدە** (ن) ٣ dal̲de
پەنا، پەناگا، داڵە، دەخالەت.

**داڵدەدان** (کتپ) dal̲dedan
پــەنادان، پەناگاپــێدان، داڵدەپــێدان، حاواندنــەوە، پشتیوانکردن، لەپەنای خۆدا دانان، ستارکردن، ستر

کردن، پەناگەپێدان.

**دالدەهێنان (کتن)** daldehênan

پەنابۆ بردن، پەنا(هێنان، بردن)، دالدەبردن، دەخالەت بردن.

**دالخە پێوە لێ‌دان (ند)** dalxe pêwelêdan

خەوپێوەبینین، عەزرەتیی بوون(بۆ شتێ).

**دالخەچی (ن)** dalxeçî

خەیالاویی، بیر ڕۆیشتوو، مەراق(گرتوو، لێداو).

**دالخە لێدان (ند)** dalxe lêdan

خەیال کردنەوە، چوونەژێر.

**دالگوشت (ئان)** dalgüšt

لاولز.

**دالگە (ن،کل)** dalge(kl)

سەرشار یان شار.

**دالوچان (کتن)** dalüçan

دا(لۆچیان، لۆزان، لەقان)، شۆڕبوونەوە.

**دالوچکە (ن)** dalüçike

دا(لووچکە، لۆچە، ڕۆچکاو، لۆزکە، میلراو، ڕۆچکە)، بەرەوخوار هەلواسراو، شۆڕەوەکراو، شۆڕەوەبوو، شۆڕ بووەوە، شۆڕبووەبوو.

**دالوەخش (ن،کل)** dalwexiš (kl)

چاوپۆشیی، نۆبەخش.

**دالوەخش کردن (کتپ،کل)** dalwexiš kirdin(kl)

چاوپۆشیی کردن.

**دالیت (ن)** dalît [1]

دللوت، دلریەست، چەفتە، کەپری دارمێو.

**دالیت (ن،رو)** dalît [2]

بەلەم، دارمێو کەبەدرەختێکداسەرکەوتبێ، مێوێکە بەقەد درەختێکدا هەلچووبێت.

**دالیە (ن)** dalye [1]

سەوزە (بۆخواردن).

**دالیە (ن)** dalye [2]

تەغار، کێشانەیەکە بەرامبەر ٢٠٠٠کیلۆغرام، لەبەسرە بەرامبەر ١٥٣٧ کلیۆغرامە.

**دام (ن)** dam [1]

جێگای ئاغا لەتەختە دامەدا.

**دام (ن)** dam [2]

بووەیی، دەولەمەندیی.

**داماک (ن)** damak

داماری، دامەهر، باوەژن، زڕ(داک، دایک)، ژن باف.

**داماڵان (کتپ)** damalan [1]

دا (خزاندن، مالیان)، خلیسکاندن.

**داماڵان (کتپ)** damalan [2]

شیلان، مەساج کردن.

**داماڵراو (ئان)** damalraw

دا(مالاو، مالدراو، مالیاکێ، مالیو).

**داماڵین (کتپ)** damalîn [1]

دا(کەندن، مالاندن، مالیان، کەناندن، کەنن، ملکاندن، ملکانن).

**داماڵین (کتپ)** damalîn [2]

١- هێنانە خوار. ٢- لێ کردنەوە.

**دامان (کتن)** daman [1]

تێمان، سەرگەردان بوون، پەک کەوتن.

**دامان (کتن)** daman [2]

کەوتنەهێزرەوە، مات بوون، تێدامان.

**دامان (کتن)** daman [3]

لەسەر شتێ (پەک کەوتن، ڕاوەستان).

**دامان لەڕوودا (ند)** daman lerüda

لەڕوودا دامان، شەرمەزاربوون لەبەردەم کەسێکدا.

**داماو (ئان)** damaw [1]

بێ (دەستەلات، دەسەلات، دەر)، بەلەنگاز، دەستەوستان، دەستەوسان، دەسەوسان.

**داماو (ئان)** damaw [2]

نەبوو، هەژار، شایستەی خێرپێکردن.

**داماو (ئان)** damaw [3]

دل (پڕ لەئەسرین، تەنگ)، پەست.

**داماو (ئان)** damaw [4]

زەلیل، تێماو، داماکێ، دامای.

**داماو (ئان)** damaw [5]

تێشکاو، لێقەوماو، ناتەواو، ئەرامەند.

**داماوبوون (کتن)** damawbün

بێ چارەبوون، پەک کەوتن، دەستەوسان بوون، سەرگەردان بوون، مەلوول بوون.

**داماوکردن (کتپ)** damawkirdin

بێ چارەکردن، پەک خستن، سەرگەردان کردن، مەلوول کردن.

**داماویی (ن)** damawî

بێچارەیی، داماگیی، دامایی، دەستەوسانیی، سەرگەر دانیی، کزیی، مەلوولیی، ماتیی.

**دامران(ئاگر) (کتن)** damiran(agir)

تەمران، دا(تەمریان، مردن، کوژیان، مردنەوە، مرکن، مرکیان، مرکانەوە، مرکیین)، کوژانەوە، گرنەمان، وەکوژان.

**دامراندن** (کتپ) damirandin
دا( مراندنەوە، مرکاندن، مرکاندنەوە، مرکانن)، گڕ نەهێشتن (ئاگر).

**دامرکان** (کتن) ^1^ damirkan
دا( سەکنان، کاسیین)، لە( بزووتن کەوتن، بزوەکەوتن، جوولەکەوتن)، وەئارام ڕۆنیشتن، هەدادان، هێدی هێدی بوونەوە، ئارام بوون.

**دامرکان** (کتن) ^2^ damirkan
دا( تەمریان، بیین بوون، مرکیان)، بێدەنگ بوون، تووڕەیی نیشتنەوە، ڕق نیشتنەوە.

**دامرکاندن** (کتپ) ^1^ damirkandin
ئارام دان، ئەهۆن کردن، بێدەنگ کردن، هێدیی کردن، هێمن وەکردن.

**دامرکاندن** (کتپ) ^2^ damirkandin
دامرکانن، لە( بزووتن، بزوە، جوولە )خستن، ئارام دان.

**دامرکانەوە** (کتن) ^1^ damirkanewe
دامرکان.

**دامرکانەوە** (کتن) ^2^ damirkanewe
ئێش وئازار نەمان، ورینگ گرتن.

**دامرکاو** (ئان) damirkaw
ئارام بوو، بێدەنگ بوو، داتەمریاگ، وەئارام ڕۆنیشتوو.

**دامرکێنەر** (ئان) damirkêner
ئارامیدەر، تەسەلاپێدەر، چارەسەرکەر، چارەکەر، دامرکێن.

**دامغە** (ن) damxe
تامغە، مۆر.

**دامڵە چەقان** (ن،نا) damileçeqa
مانگای بەرکەل، تینگوین،نیونی بەرکەل، نوینگین.

**دامۆچاندن** (کتپ) ^1^ damoçandin
دنەدان، دامۆچانن، لێ تیژکردن، هانەدان، هەڵخرانن.

**دامۆچاندن** (کتپ) ^2^ damoçandin
ڕام کردن، ڕاهێنان.

**دامۆچیاگ** (ئان) ^1^ damoçyag
تیژکراو، دنەدراو، هاندراو، هانەهاندراو.

**دامۆچیاگ** (ئان) ^2^ damoçyag
دامۆچیاو، ڕام کراو، ڕاهێنراو، فێری بار یان سواریی کراو( ولاخ ).

**دامۆچیان** (کتپ) damoçyan
چارەوێ فێری سواریی کردن،ڕاهێنان، پشت شکاندن.

**دام ودەزگا** (ن) ^1^ damw dezga
دەوڵەت وبەڕێوەبەرایەتیە ڕامیارییەکانی، ڕەژێم، ڕێژیم، دەم ودەزگا، دەزگاونوکان، یەکەیەکی جێوپێژلەتیکی ڕێکخراوە.

**دام ودەزگا** (ن) ^2^ damw dezga
خۆش گوزەرانیی.

**دام ودەزگا** (ن) ^3^ damw dezga
کۆشک، خانوی بەرز وگەورە( لەبەرد دروستکراو.. ).

**دام ودەستوور** (ن) damw dezga
جۆری فەرمانڕەوایی.

**داموسک** (ن) damüsik
تاموسک، داڵسک، داموس، داموسکە، مووی یال یان کلکی ئاژەڵی یەکسم.

**دامە** (ن) dame
داما، یارییەکی دوو قۆڵییە لەسەر تەختەیەکی شەست وچوار خانەیی، هەرکەسەی بەشانزەبەرد یاری دەکا هەتا یەکێکیان دەیباتەوە.

**دامەزران** (کتن) damezran
بەنگ بوون، پاوەجێبوون، جێگرتن، جێگیربوون، نیشتەجێبوون، بنج داکوتان لەشوێنێ.

**دامەزراندن{ئاژاوە}** (کتپ) ^1^
damezrandin(ajawe)
سازاندن، هەڵگیرساندن.

**دامەزراندن** (کتپ) ^2^ damezrandin
ڕێک وپێک کردن،بەجوانیی شت دانان.

**دامەزراندن** (کتپ) ^3^ damezrandin
بنیاد( نان، کردن)، دروست کردن.

**دامەزراندن** (کتپ) ^4^ damezrandin
جێگیرکردن، دامەزرانن، چەسپاندن، پاوەجێ کردن.

**دامەزراو** (ئان) ^1^ damezraw
تەبار، ڕێک، بەسەرویەر.

**دامەزراو** (ئان) ^2^ damezraw
دامەزریاگ، دامەزریاو، جێگیربوو، جێگیربووگ، چەسپاو، پاوەجێبوو، پێ بەجێ.

**دامەلاغاس** (ئان) damelaxas
پۆڕکریی، تالان کراو، ڕووتەوەکراو، هیچ پێ نەهێڵراو (پارەوپوول).

**دامێن بە لاداکردن** (ند) damên be lada kirdin
خۆ بۆکار ئامادەکردن، خۆ گورج کردنەوە بۆ ئیش وکار.

**دامێنگیر** (ئان) damêngîr
تووش هاتوو، دەستەویەخە، یەخەگر.

**دان** (کتپ) [١] dan
داین، داینان، دران، پیان، بەخشیین، نیان..

**دان** (ن) [٢] dan
بەخشش، خەلات، دای.

**دان** (نک) [٣] dan
خۆراکی باڵندەی ماڵی (مریشک، مەل، پەلەوەر).

**دان** (ن،رو) [٤] dan
خەلە(گەنم وجۆ، گەنمەشامی.. ).

**دان** (ن) [٥] dan
نیوەڕۆژ.

**دان** (ن) [٦] dan
ددان، دگان، دندان، دیان، دنو، دنوا.

**دان** (ن) [٧] dan
کەمێک، بەشێکی کەم.

**دان** (ن) [٨] dan
فەسل، کژ، وەرز(ساڵ).

**دان ئاژن** (ن) danajin
چیلکەی دان ئاژنین، پارچەچیلکەی تیژ بۆ پاک کردنەوەی نێوان دان لەپارچەی خواردن.

**دانا بە دڕکاندن، کەر بە نەقیزە** (پن)
dana be - irkandin, ker be neqîze
دانا بەدرکاندن، نادان بەکوتەک. دانائامـاژە یەک، گەوج بەدار.

**دانار** (ئان) danar
تێکەلاونەبوو، بەسەریەکدانەچوو.

**دان ئاژنین** (کتپ) dan ajnîn
نێوان دانەکان پاک کردنەوە(بەچیلکە.. )، ددان ئاژنین.

**دان ئاڵ بوونەوە** (کتن) dan al̲bünewe
١- ددان بەشتی ترش کول بوون. ٢- کەسێ دەهری کردن یان بوونەهۆی دەهریی کردنی.

**دانان** (کتپ) [١] danan
داکردن، دانیان.

**دانان** (کتپ) [٢] danan
دامەزراندن، هینانەکایەوە.

**دانان** (کتپ) danan
وازلێ هینان، لێدوورکەوتنەوە(نەریت.. ).

**دانان** (کتپ) [٣] danan
دانیین، دانیان، ڕۆنان، خستن یان نانەسەر زەویی.

**دانان** (کتپ) [٤] danan
بەفیڕۆدان، دۆڕاندن(ماڵی دنیا).

**دانان** (کتپ) [٥] danan
دانیان، نووسین (کتیب).

**دانان** (کتپ) [٦] danan
دامێنـان، دەرهـانیین، دەرهـاوردن، دەرهێنـان، دیتنەوە، دروست کردن (شتێ لەنەبوو).

**دان ئێشان، چارەی کێشان** (پن)
dan êšan. çarcy kêšan
هەموو ناخۆشی یەک ئەبێ لەبندا ڕیشەکێش بکرێ. دان بکێشرێ باشترە لەوەی هەمیشە بیەشێ. دەری بینی باشترە لەوەی هەردەم بەئازار بێ.

**دان ئێشە** (ن،پز) dan êše
ئێش وئازاری ناو یان دەوروپشتی ددان.

**دان بۆریی** (ن) danborî
ئۆرخـۆریی، ژەمـەن بـوردەیی (دوای لەنەخۆشـی هەستانەوە ).

**دان بە خۆداگرتن** (ئد) [١] dan bexoda girtin
پشوودان، وچان (گرتن، دان).

**دان بە خۆداگرتن** (ئد) [٢] dan bexoda girtin
ئارام گرتن لەبەرباریکدا، پـشوودرێژ بـوون، چاوەڕێ کردن بێ گلەیی، خۆگرتن، سەبرگرتن.

**دان بە خۆداگرتن** (کتن) [٣] dan bexoda girtin
دەرهەڵ نەبوون،لەپڕ هەڵ نەچوون.

**دان بە خۆداگرتن** (کتن) [٤] dan bexoda girtin
بەرگەگرتن.

**دان پیا( پیدا ) نان**(کتپ) [١] dan piya(pêda) nan
ڕاست ڕۆیشتن یـان ووتـن (لەسـەر خۆیـان کەسێکی دیکە ).

**دان پیا( پیدا ) نان** (ئد) dan piya(pêda)'nan
پێ لێنان، چوونە ژێر، ڕاستیی گوتن، دان بـەکردنی کاریکـدا نـان، وەلامـی ڕاسـت دەربـڕیین، دان نـان بەڕاستیدا، ڕاست ووتن، ڕاستیی وەرگرتن یان سەلماندن، قـسەوەرگرتن، هەلـەی خۆ بۆ دەرکەوتن.

**دان پیا( پیدا ) نان**(کتپ) [٢] dan piya(pêda) nan
بەڕاست زانیین، سەلماندن.

**دان پیا( پیدا ) نان**(کتپ) [٣] dan piya(pêda) nan
نرخ بۆدانان، نرخاندن.

**دان پیا( پیدا ) نان** (ئد) [٤] dan piya(pêda) nan
بەشت زانیین.

**دان تیژکردن** (ئد) dantîjkirdin
تەماع کردن (لەشتێ).

**دان جیڕکردن** (ند) dan cîr̲ kirdin
دان بەگرپی (نیشان دان، جیڕ کردنـەوە، جیـڕکردن، ریچ کردنەوە).
**دان چوونە کلیلە** (ند) dan çüne klîle
دان بەسەریەکدا نووسان و زار (هـەڵ نەپـچران، رەق بوون).
**دان خۆشک** (ن) dan xošik
سپل، پیرەفات.
**داندار** (ئان) dandar
پڕ لەدەنک، دانەدار(میوە، دانەوێلە).
**داندان** (ن) [1] dandan
دانەدان، ئەماری دانەوێلە، جێ دانەوێلە، سایلۆ.
**دان دان** (کتپ) [2] dan dan
دان پێدان.
**داندن** (کتن) dandin
خۆهەڵکێشان، هاشەوهووشە کردن، فشەکردن.
**داندۆڵ** (ن) dandol̲
داندۆر، دایرۆدە، کاری خۆ پیشاندانی بەکۆمەڵ.
**داندۆڵ کرن** (کتپ،ن،کی) dandol kirin(ki)
داندۆرکرن، داندۆڕکرن، دایرۆدەکرن، خۆپیـشان دان بەکۆمەڵ.
**دانراو** (ئان) [1] danraw
داندراو، سەرزەویی نراو.
**دانراو** (ئان) [2] danraw
بەیاساکراو، کراوبەیاسا.
**دانراو** (ئان) [3] danraw
پاشەکەوت کراو، هەڵگیراو بۆ کاتی پێویست.
**دانساز** (ن) dansaz
دگانـساز، کەسـێ کـەتاقمی دان دروسـت بکـات بـۆ خـەڵک، کەسـێ کەئیـشەکەی پـڕ کردنـەوە وپـاکـ کردنەوە و دەرهێنانی دان بێ...
**دان سپی بوونەوە** (ند) [1] dan spî bünewe
ترس لەکەسێ شـکان، ترسـی کەسـێ لەدڵدانـەمان، سـام لاچـوون، سـام لەیـەک شـکان، قـسەلەیەک نەخواردنەوە.
**دان سپی بوونەوە** (ند) [2] dan spî bünewe
بێـشەرم بـوون، شـەرم وشـکۆ لانـەمان (لـەڕووی گـەورەدا)، بێچـاوڕ ووبـوون، پـڕ ڕووبـوون، سـیوا لەیەک هاتنەوە، شەرم لەیەک نەکردن، دیان چەرمگ بوون، دیان چەرمگەو بوون.
**دانسقە** (ئان) [1] danisqe
کەم وێنە، نایاب، نایافت، نایـەب، بـێ(جـۆر، وێنـە)، تەنها، دەگمەن.
**دانسقە** (ئان) [2] danisqe
بەنرخ، پڕ بەها، گرانبا، گران بەها.
**دانسقە** (ن) [3] danisqe
نیشی هونەریی، پارچە، دەسکردی هونەریی.
**دانسقە** (ئان) [4] danisqe
تاک، ئەنتیکە.
**دان شاش** (ئان) danšaš
دان بڵاو.
**دان کردن** (کتن) [1] dan kirdin
دان گـرتن، دەنـک پـەیدابوون، شـیر تـێ پەڕین(خەلە..).
**دان کردن** (کتپ) [2] dan kirdin
دان دروست کردن.
**دانکە** (ن،پز) danke
دانۆکە، دانوو، دەردەمریشک.
**دانکە دەردان** (کتن) danke derdan
تووشـی دانۆکـەبوون، ئاوڵـە (دەردان، لی هـاتن) {مریشک، پەلەوە}.
**دانکەل** (ئان) dankel
دان (شکاو، شکیاگ، کەفتک)، دگان شکیاگ.
**دان کەوتن** (کتن) dan kewtin
دان لێ کەم بوونەوە.
**دان کێشان** (کتپ) dan kêšan
دان دەرهێنان.
**دان گڕ** (ئان) dan gir̲
دان (دەرپەڕیو، بۆ پێشەوەچوو).
**دانگو** (ئان) dangü
جیاجیا، نەبەستراو، نەبەسیاگ.
**دانگیر** (ن) [1] dangîr
دانەوێلەی (نیوەکوڵاو، باش نەکوڵاو).
**دانگیر** (ن) [2] ( dangîr
چێودانە، چیکەنە، ئامرازی پەموو دانەگرتن.
**دانگیر** (ن،پز) dangîr
نەخۆشیی ئاژەڵ لەئاکامی زۆر خواردنی ئالیک.
**دان لەسنگی هاتووە** (رس) dan le singî hatwe
دان لەسنگی دەرهاتووە، زۆرزانە، فێلبازە.
**دان لێ تیژکردن** (ند) [1] dan lê tîj kirdin
مرخ لێ خۆش کردن، نیازی خواردنی شتێ هەبوون.
**دان لێ تیژکردن** (ند) [2] dan lê tîj kirdin
چاوتێ بڕین وبەتەمابوونی شتێ، نیازی داگیرکـردن و دەست بەسەرداگرتنی شتێ هەبوون، دیان لێ تیـژ

کردن، ته‌ماح لێ کردن، مڵاس بۆ گرتن.

**دان لێ تیژکردن** (ئد) ٣ dan lê tîj kirdin
خۆ بۆ تۆڵه لێ سه‌ندن ئاماده‌کردن.

**دان لێک خستن** (کتن،کتپ) dan lêk xistin
کیره‌کێر کردن به‌ددان.

**دان وستان** (کتپ،کتن) danw sitan
کڕین وفرۆشتن، مامڵه‌کردن.

**دانوشتان** (کتن) danwšitan
قه‌د بوون، لایه‌ک به‌سه‌رلایه‌کدا هاتن، نوشتانه‌وه.

**دانوشتاندن** (کتپ) ١ danwšitan
دانوشتانن، دانوراشتن، دوولابه‌سه‌ریه‌کتردا هێنان، قه‌د کردن، لایه‌ک به‌سه‌ر یه‌کترداهێنان.

**دانوشتاندن** (کتپ) ٢ danwšitandin
ده‌ق پێگرتن.

**دانوشتاو** (ئان) danwštaw
به‌سه‌ریه‌کدا دووراو(که‌ناره).

**دانوو کوڵان له‌گه‌ڵ** (ئد) danûkulan legel
له‌گه‌ڵ که‌سێکدا هه‌ڵ کردن.

**دانوویان پێکه‌وه ناکوڵێ** (پن)
danûyan pêkewe nakulê
١- هه‌مووکات دژی یه‌کترن، هه‌میشه‌نه‌یاری یه‌کترن (دووکه‌س).
٢- پێکه‌وه هه‌ڵ ناکه‌ن، ناته‌بان، دانوویان به‌یه‌که‌وه ناکوڵێ، یه‌ک ناگرن، پێکه‌وه ناگونجێن، رێک ناکه‌ون، سروشتیان چۆن یه‌ک نییه.

**دانه** (ن) ١ dane
ده‌نک.

**دانه** (ن) ٢ dane
یه‌ک شت، یه‌ک پارچه.

**دانه** (ن) ٣ dane
دانه‌لغاو، ئاسنی لغاو که‌ده‌چێته ناوزاری ئه‌سپ یان ئێستره‌وه.

**دانه** (ن) ٤ dane
دوڕ، گه‌وهه‌ر.

**دانه** (ن) ٥ dane
تانه، په‌ڵه‌ی سپی سه‌رچاو.

**دانه** (ن) ٦ dane
ددانه، گرنج گرنجیی، گرنی گرنیایه‌تیی، دچ، دان، دانۆکه، که‌لایی (ده‌می مشار..).

**دانه** (ئان) ٧ dane
ته‌نها (یه‌ک، یه‌ک ژماره)، یه‌ک به‌ته‌نها، دیانه.

**دانه‌به‌رکلکان** (ئد) dane berkilkan
تیزپێ کردن.

**دانه‌به‌رگولله** (کتپ) dane bergulle
ته‌قه‌لێ کردن، فیشه‌ک پیوه‌نان، گولله تێ گرتن.

**دانه‌به‌رهه‌ڤ** (کتن،کی) dan berhev(ki)
پێگرتن، له‌به‌رامبه‌ر یه‌کتر رانان، پێک گرتن.

**دانه‌پاش** (کتن) danepaš
خۆ لێ(دزینه‌وه، کشانه‌وه).

**دانه‌پاڵ** (کتپ) danepal
خستنه(ئه‌ستۆ، پاڵ)، وه‌پاڵ خستن، وه‌ئه‌ستۆ خستن (ئیش).

**دانه‌پاڵ خۆ** (کتپ) ١ danepalxo
پاراستن، پارێزگاریی کردن.

**دانه‌پاڵ خۆ** (کتپ) ٢ danepalxo
کردن به‌هی خۆ(شتێ).

**دانه‌پاڵ خۆ** (کتپ) ٣ danepalxo
پێ‌ده‌نان، دان پیا(پێدا) نان(له تاوانی خۆ، راستیی..).

**دانه‌پاڵ خۆ** (ئد) ٤ danepalxo
خۆ تاوانبارکردن، شانی خۆ ئارداویی کردن.

**دانه‌ پرمه‌ی گریان** (کتپ) dane pirmey giryan
به‌کوڵ گریان، دانه‌قوڵپی گریان.

**دانه‌پشت گوێ** (کتپ) danepištgwê
ئاراستن،خستنه‌پشت گوێ، سستیی لێکردن، که‌مته‌رخه‌میی لێ کردن، گوێ پێنه‌دان.

**دانه‌پەی** (کتپ) danepey
شوێن پێکه‌وتن، که‌وتنه‌شوێن پێ، وه‌دواکه‌وتن، که‌وتنه دوای که‌سێ یان شتێ.

**دانه‌پێش خۆ** (ئد) ١ danepêšxo
خستنه‌رێ،رێ‌پێشان دان، رێ نیشان دان.

**دانه‌پێش خۆ** (ئد) ٢ danepêšxo
به‌رخۆدان، داپێچاندن، ره‌پێچه‌ک دان.

**دانه‌ته‌مه‌ڵیی** (ئد) dane temelî
سستی کردن.

**دانه‌چۆقه** (ن) ١ daneçoqe
چۆقه، چۆقه‌چۆقی دان، ته‌قه‌ته‌قی دان (بێ ده‌سه‌ڵاتی ئه‌وکه‌سه، له‌به‌رسه‌رما، ترس یان له‌رز).

**دانه‌چۆقه** (کتن) ٢ daneçoqe
چۆقه چۆق (پێ که‌وتن، کردن)، ته‌قه‌ته‌ق له‌دانه‌وه هاتن. (له‌سه‌رماندا یان به‌هۆی ترس، له‌رز لێ هاتنه‌وه).

**دانه چیره پێ كه‌وتن** (كتن)
daneçîre pê kewtin
دان (له‌چیره‌وه بردن، له‌سه‌ریه‌ك داگرتن، لیك خشاندن وسیره لێ هاتنیان)، دانه‌چیره كردن (وه‌ك پیشاندانی ئازار ونیش یان په‌ستی).

**دانه خۆره** (ن) danexore
چه‌شه، دانه‌یه‌كه ئه‌كرێ به‌فاقه‌و ته‌له‌وه بۆ گرتنی نێچیر.

**دانه دانه** (ئاك) dane dane
یه‌كه‌یه‌كه، ده‌نكه‌ده‌نكه.

**دانه دوو** (كتن) danedû ١
به‌رده‌وام بوون، پێوه‌چوون، له‌سه‌ررۆیشتن، ده‌رانده‌ر بوون، هه‌میشه له‌سه‌ر (رۆیشتن، به‌رده‌وام بوون).

**دانه دوو** (كتن) danedû ٢
له‌دووی بیروڕای كه‌سێ چوون.

**دانه ده‌ست** (كتپ) danedest ١
پێ (سپاردن، دان بۆئاگاداری لێ كردن)، لادانان، له‌لادانان، خستنه‌لا.

**دانه ده‌ست** (كتپ) danedest ٢
به‌ده‌ست(پێدان، پێ گه‌یاندن).

**دانه‌ر** (ن) daner ١
بانده‌ر، كه‌سێ شتێ بنێته‌بان زه‌ویی یان سه‌ر هه‌رشتێ، كه‌سێ شتێكی له‌شوێنێك دانابێ.

**دانه‌ر** (ن) daner ٢
بناغه دارێژ، بنچینه دروستكه‌ر.

**دانه‌ر** (ن) daner ٣
دروستكه‌ر، رێكخه‌ر، رێخه‌ر، ده‌رهێنه‌ر، داهێنه‌ر.

**دانه‌ر** (ن) daner ٤
نووسه‌ر، بنووس، دارێژه‌ری نوسراو.

**دانه رۆكه** (ن) daner̲oke
چێشتێ گه‌نم ونۆكێ كه‌به‌سه‌ر ده‌روردراوسێدا ده‌به‌خشرێته‌وه له‌كاتێكدا منداڵی ساوای ئه‌و ماڵه تازه دانی روابێ، شێوی گه‌نم و نۆكێ كه‌له‌مزگێنیی دان هاتنی منداڵ ده‌یبه‌شنه‌وه، دیان رۆكله.

**دانه ریچه** (ن) daner̲îçe
ددان رچه، دنوریچه.

**دانه ریچه پێ كه‌وتن** (ئد) ١ daner̲îçe pê kewtin
زۆر لاوازبوون، په‌ك كه‌وتن.

**دانه ریچه پێ كه‌وتن** (ئد) ٢
daner̲îçe pê kewtin
به‌ره‌ومردن رۆیشتن، گه‌یشتنه گیانه‌لاو.

**دانه زانیین** (كتپ) ١ dane zanîn(ki)
پێ(گوتن، ووتن، راگه‌یاندن)، سه‌رنج راكێشان، وه‌لام دان.

**دانه زانیین** (كتپ) ٢ dane zanîn(ki)
تێگه‌یاندن، كارپێناسیین،حاڵیی كردن.

**دانه سه‌ر** (كتپ) dane ser
به‌سه‌ردادان،هێرش(بردنه‌سه‌ر، بۆ بردن) له‌ناكاو.

**دانه غار** (كتن) dane xar̲
ئاوزه‌نگی تێ ته‌قاندن.

**دانه قاقای پێكه نیین** (كتن)
dane qaqay pêkenîn
تریقه‌كردن، تریق وهووڕ كردن، حیلكه‌حیلك كردن، دانه‌گاره‌ی پێكه‌نیین.

**دانه كێو** (ئد) ١ dane kêw
شێتگیربوون.

**دانه كێو** (كتن) ٢ dane kêw
یاخی بوون، هه‌ڵ هاتن.

**دانه كێو** (كتن) ٣ dane kêw
شۆڕش به‌رپاكردن.

**دانه كێو** (ئد) ٤ dane kêw
شێت بوون.

**دانه لۆق** (ن) dane loq
شێوی سه‌وزیجات.

**دانه ماش** (ن) danemaš
ماش وبرنج(موو، قژ).

**دانه نیشان** (ئان) dane nîšan
گه‌وهه‌ر(نیشان، نیگار، دار)، به‌به‌ردی به‌نرخ (رازێنراو، نه‌خشێنراو، جوانكراو).

**دانه واندن** (كتپ) ١ danewandin
به‌ره‌وخوارنه‌وویی كردن، چه‌ماندنه‌وه، خواره‌وه‌هاوردن، نزم وه‌كردن،دانه‌وانن، له‌زه‌ویی نزیك خستنه‌وه.

**دانه واندن** (كتپ) ٢ danewandin
سه‌ر پێ شۆڕ كردن.

**دانه‌وه** (كتپ) ١ danewe
گه‌راندنه‌وه، پێدانه‌وه، دانه‌دواوه، زڤراندن، ڤه‌زڤراندن، ڤه‌گه‌راندن، گه‌راندنه‌وه، گێرانه‌وه.

**دانه‌وه** (كتپ) ٢ danewe
كۆڵیین، هه‌لكۆڵیین، هه‌ڵكه‌ندن (زه‌ویی).

**دانه وێله** (نك،رو) danewêl̲e
دركه‌دو، وشكه، دانوو، گه‌نم وجۆ... هه‌موو جۆره دانێك به‌گشتیی.

**دانه‌وین** (کتن) danewîn
نزم بوونه‌وه له‌زه‌ویی، دابوون.
**دان هه‌لکیشان** (کتپ) dan helkêšan
دان ده‌رهینان.
**دانه‌یه‌ک** (کتپ) ١ daneyek
پـاڵ یـه‌ک خـستن، خـستنه‌(لای‌یـه‌ک، تـه‌ک یـه‌ک)، دانه‌پاڵ.
**دانه‌یه‌ک** (کتپ) ٢ daneyek
خستنه‌سه‌ر، تی‌دان.
**دانه‌یه‌ک** (کتپ) ٣ daneyek
پریه‌یه‌کدا کردن
**دانه‌یه‌ک** (ئان) ٤ daneyek
یه‌ک دانه، یه‌کیک، یه‌کێ(که‌س یان شت).
**دانه‌یه‌ک** (کتن) ٥ daneyek
چربوون.
**دانیر** (ن) danêr
دادپه‌روه‌ر.
**دانیرکردن** (کتپ) danêr kirdin
دادگایی‌کردن، بانگ کردنه‌دادگا.
**دانیشاندن** (کتپ) ١ danîšandin
پـاڵ پـی‌دانه‌وه، چیچکه‌پـێ کـردن، داسـه‌کناندن، رۆنیشاندن.
**دانیشاندن** (کتپ) ٢ danîšandin
دانیشانن، وازپێ هینان.
**دانیشتگه** (ن) danîštge
کۆرگه، جێ کۆڕ.
**دانیشتن** (کتن) ١ danîštin
دانشتن، رۆیشتن، پاڵ دانه‌وه، نیشتن، رۆنیین، قنـگ دانه‌وه.
**دانیشتن** (کتن) ٢ danîštin
خۆلـه‌ئیش دزیینـه‌وه، خـۆ کـشانه‌وه (له‌راپـه‌راندنی ئیش و کار).
**دانیشتوو** (ن.ئان) danîštû
نیشته‌جێ(بـوو)، رۆنیـشتوو، رۆنیـشتیی، دانیـشتگ، نیشتوو.
**دانیشن به‌خیرا** (شر) danîšin be xêr!
خاتری‌ته! (به‌ئه‌وکه‌سانه ده‌ووترێ که‌ده‌مینننه‌وه).
**دانی فیل** (ن) ١ danîfîl
شفره‌ی فیل.
**دانی فیل** (خ) ٢ danîfîl
که‌م بازاڕ، کالآیه‌ک که‌س نه‌یکرێ.

**دانی مار** (خ) danî mar
مرۆڤی (زیره‌ک ولیهاتوو، وریاو پرهۆش).
**داو** (ن) ١ daw
گره‌و.
**داو** (ن) ٢ daw
تـاوه‌ده‌زووی راو، داف، داڤ، داڤـک، دام، ده‌زووی راو، جۆره ته‌ڵه‌یه‌که له‌ده‌زووی قوڵفدراو دروستکراوه (بـۆ مه‌به‌سـتی راوکردنـی گیانـه‌وه‌ری بچـوک و په‌له‌وه‌ر).
**داو** (ن) ٣ daw
تاڵ، تاو، هه‌فدا، ئافدا، لیزه‌ک، که‌ندر، نه‌ی.
**داو** (ن) ٤ daw
گزیی.
**داو** (ن) ٥ daw
که‌ڵه‌ک، ته‌فره.
**داوا** (ن) ١ dawa
خواز، خواست، داخواز، گه‌ره‌ک، گه‌ره‌کیی، ویست.
**داوا** (ن) ٢ dawa
داواکاریی، ده‌عوا(له‌دادگا).
**داوا** (ن) ٣ dawa
حه‌چولوور، حه‌چه‌ل، قره، گله‌یی به‌ده‌نگی به‌رز.
**داواکار** (ن) ١ dawakar
خوازبینیکه‌ر.
**داواکار** (ن) ٢ dawakar
خوازه‌ر، خواستکار، داواخواز، داوخواز.
**داواکردن** (کتپ) dawakirdin
خوازتن، خواستن، خوابیشت کردن، داخوازیی کردن، داواخوازیی کردن، لێ ویستن، دۆزکرن.
**داوای لیبووردن کردن** (کتپ)
dawaî lê bürdin kirdin
ته‌وازۆ کردن.
**داوباز** (ن.ئان) ١ dawbaz
گزیکه‌ر، گزیکار، شیوه‌باز.
**داوباز** (ن) ٢ dawbaz
داوبه‌سـت، داوچـه‌قین، داودانـه‌ر، راوچیـی بـه‌هۆی داوه‌وه.
**داوبازیی** (ن) ١ dawbazî
فیلبازیی، که‌ڵه‌کبازیی، شیوه‌بازیی، حوقه‌بازیی.
**داوبازیی** (ن) ٢ dawbazî
داوبه‌ستیی، داولیده‌ریی، راوچیتیی (به‌داو).
**داوبه‌ست** (ن) dawbiset
سه‌ودا، مامله‌، مامه‌له‌، ئاڵشت، ئاڵ وگۆڕ.

**داوبۆنانەوە** (ئد) [١] daw bonanewe

پیلان بۆ ڕێکخستن، تەڵە(بۆ دانان، بۆکەسێ نانەوە)، هەوڵی تووش کردنی کەسێ دان.

**داوبۆنانەوە** (ئد) [٢] daw bonanewe

پەت بۆ هەڵخستن،چاڵ بۆ هەڵکەندن، داوبۆ هەڵخستن، پیلان بۆ کەسێ گێران، یان ڕێک خستن.

**داوبۆنانەوە** (کتپ) [٣] daw bonanewe

تووش کردن، تووشی بەڵاکردن، بەتەڵەوە کردن.

**داوداکردن** (ئد) dawdakirdin

گرەوکردن، داودانان، لگاوکردن.

**داو دامەزران** (ئد) [١] daw damezran

لەسەرکار جێگیربوون.

**داودامەزران {ئافرەت}** (ئد) [٢] daw damezran

شووکردن، مێردکردن.

**داوڕ** (ن) dawiṟ

دابڕ، دادڕ، پاژبووکێ، بەشی جوێ وەبوو.

**داوڕین** (کتپ) dawuṟîn

ئاخاوتن لەگەڵ کەسێکدا بڕیین، هاتوچۆ دابڕیین.

**داوکەفتن** (کتن) daw keftin

داوکەوتن، کەوتنەناوداو، بەداوەوەبوون، گیران (بەداو).

**داوگە** (ن) [١] dawge

جێ داو، جێی داولێنانەوە، ئەوشوێنەی داوی لێ ئەنێنەوە.

**داوگە** (ن) [٢] dawge

ڕاوگە، ڕاوگان، ئەوشوێنەی ڕاوی لێ دەکرێ.

**داولێین** (کتپ) [١] dawul̲în

تێ(گوشیین، ولێین)، نان گوشینە ناو شۆربا یان ماست.

**داولێین** (کتپ) [٢] dawul̲în

پەستانەوە، پەستاوتن، دەسەریەک ئاخنیین.

**داو لەداو ئاڵان** (ئد) daw le daw al̲an

بەدەست کەسێکەوە (تووش بوون، گرفتاربوون)، تووش بەتووشی کەسێکەوەبوون، پێوەگیرۆدەبوون و لەکۆڵ نەبوونەوە.

**داو لە داوی کەسێ نەبوونەوە** (ئد)

daw le dawî kesê nebünewe

بەرۆک بەرنەدان، دەست نەبەخەی کەسێ نەبوونەوە، لێ ڕزگارنەبوون، واز لێ نەهێنان.

**داو نانەوە** (ئد) [١] daw nanewe

داو بۆ(دانان، هەڵخستن).

**داو نانەوە** (کتپ) [٢] daw nanewe

داو(چەقاندن، داخستن، دانان، نیانەوە، هەڵخستن).

**داوو** (ن.نا) daüw

پشیلەخرتە(گوربن، گوربە)، پشیلەی نێر.

**داوو دەرمان** (نک) [١] daüw derman

دەرمانی هەمەچەشنە، دەرمانوپێویستیی نەخۆش، ئەجزا (بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشی و دیاردەکانی).

**داوو دەرمان** (نک) [٢] daüw derman

گژوگیای تام وبۆن خۆشی هەمەڕەنگە بۆ ناو چێشت وخواردەمەنی،ئاڵەت و زەردەچەوە...، بەهارات.

**داوەت** (ن) [١] dawet

دەعوەت، زیافەت.

**داوەت** (ن) [٢] dawet

زەماوەند، زەماوەن، شایی، شاهیی، دۆوات.

**داوەت کردن** (کتن) dawet kirdin

شایی کردن.

**داوەتە جنۆکە** (ن) dawete cinoke

بامۆز، گێژەڵۆکە.

**داوە دەزوو** (ن) dawe dezü

هەودا دەزوو.

**داوەران** (کتن) daweran

دارژان، داوەریین، کەوتنەخوار، هەڵ(وەران، وەریین).

**داوەراندن** (کتپ) dawerandin

دا(وەراندن، واراندن، وەراندنەخوار، وەراندن، وەشاندن)، لەبەرزەوە ڕژاندنەخوار، هەڵ وەراندن، واراندن، وارانن، وەشانن.

**داوەڕستن** (کتپ) daweṟistin

خۆ پێکەوە نووساندن، خۆدانەپاڵیەک، داڤەڕستن.

**داوەڕیان** (کتن) daweṟyan

شۆڕەوەبوون.

**داوەڕێس** (ن) daweṟês

ئاوریشمی نەڕێسراو.

**داوەستان** (کتن) dawestan

ڕاوەستان(ئاو لەجێگایەکی نەویدا).

**داوەسێن** (ن) dawesên

١- چاروابەخێوکەر، خوێدار، خوێداریکەر.

٢- وڵاخدار، کەردار، خەربەندە.

**داوەشان** (کتن) [١] dawešan

هەژارکەوتن.

**داوەشان** (کتن) [2] dawešan
داوەشیان، داوەشیین، لێک ترازان، هەڵاهەڵابوون.

**داوەشان** (کتپ) dawešan
تێ وەشاندن، داوەشاندن، ڕاتلەکاندن بەرەوژێر.

**داوەشان** (کتپ) [3] dawešan
تەکاندنەخوار، داتەکاندن (بەری درەخت).

**داوەشاندن** (کتپ) [1] dawešandin
تێ سرەواندن.

**داوەشاندن** (کتپ) [2] dawešandin
دەست هەڵهێنانەوە بۆ لێدان.

**داوەشاو** (ئان) [1] dawešaw
چوو، چووکێ، پواو، پاشیاکێ، دا(وەشیاکێ، وشیاکێ)، داغان، لەبەریەکچ(چوو، چووکێ).

**داوەشاو{تۆو}** (ئان) [2] dawešaw(tow)
پێوەکراو، چێندراو.

**داوی جاڵجاڵۆکە** (ن) dawî calcaloke
تەونی جاڵجاڵۆکە.

**داوێن {جل وبەرگ}**(ن) [1] dawên(cilw berg)
دامێن، دامان، دامو، دامەن، داو، داوان، داوێنە، داینە، لێف.

**داوێن{چیا}** (ن) [2] dawên(çiya)
دامێن، قەدپاڵ، قەراغ، لای خوارووی چیا، بنار، داوێنەی چیا.

**داوێن پاک** (ئان) [1] dawên pak
داوان پاک، دووریلەگوناه، بێ(تاوان، سووچ، گوناه)، پاک داوێن.

**داوێن پاک** (ئان) [2] dawên pak
پاک، پیاوی چاک، مرۆڤی ساغ.

**داوێن پاک** (ئان) [3] dawên pak
بێگەرد، بێ لەکە(مرۆڤ)، بەکەسێ دەوترێ کەبەدوای زینادا نەگەڕێ.

**داوێن پاکی** (ن) dawênpakî
پاکیی، دامێن پاکیی، دووریی لەگوناه، ڕاستیی.

**داوێن پیس** (ئان) [1] dawên pîs
ناپاک، چاولەدەر، لۆتیی، دامێن تەڕ، داوێن تەڕ، ترەک، سۆتە.

**داوێن پیس{پیاو}**(ن) [2] dawênpîs(piyaw)
شەرواڵ پیس،زیناکەر.

**داوێن پیسیی** (ن) dawên pîsî
شەرواڵ پیسیی، فیطبازیی.

**داوێن تەکاو** (ئان) dawên tekaw
بێمنداڵ، وەجاخ کوێر.

**داوێن دادانەوە** (کتپ) dawên dadanwe
چمک دادانەوە (داوێنی هەڵکراو).

**داوێن کردن بە لادا** (ئد) dawên kirdin be lada
داوێن(هەڵ کردن، هەڵ مالیین)، خۆبۆ کاروبار ئامادەکردن، چمک بەلادا کردن، خۆ گورج وگۆڵ کردن (بۆ ئیش کردن).

**داوێن گرتن** (کتپ) dawên girtin
دامێن گرتن، هانابۆ بردن، هەنابۆ بردن، داوێن ماچ کردن.

**داوێنە** (ئاک) dawêne
پاش هەموو شت، پاشینە.

**داوێن هەڵکردن** (ئد) dawên hel kirdin
داوێن کردن بەلادا.

**داویە** (ئان) dawye
بەردەوام، هەمیشە ژیو، ژیمان.

**داهات** (نک) [1] dahat
بەهرەی ڕۆژانە، دەخل، دەرامەت، سوود، دەستکەوت، هاتی ڕۆژانە (لەکاسبی، دووکان)، دەرامەد، دەستکەوتێکە گوزەرانی پێ بکرێ.

**داهات** (ن) [2] dahat
پارەوپوول، پوول وپارە، سامان، ماڵ.

**داهات** (نک) [3] dahat
بەروبوو، بەروبووم، بەرهەم، بەهرەی زەویی، حاسڵ، حاسلات، وەر.

**داهاتانە** (نک) dahatane
موڵکانە، بەشی خاوەن موڵک لەدەرامەتی زەویی.

**داهاتن** (کتپ) [1] dahatin
تازە(پەیدابوون، دەرچوون، هاتن).

**داهاتن** (کتن) [2] dahatin
چەمانەوە، چەمینەوە، نەوانەوە، نەوینەوە.

**داهاتن{بە مشار}**(کتن) [3] dahatin(be mišar)
لەت بوون،برانەوە.

**داهاتن{چاو}** (کتن) [4] dahatin (çaw)
سووربوونەوە، گڵ کردن، Turn **red** **(eyes),** (vi.).
هاتنەئیش، سوورهەڵگەڕان.

**داهاتن{قژی سەر}** (کتن) [5] dahatin (qijî ser)
بەشانەکران، دانەدانەو ڕێک وەستان.

**داهاتن** (کتن) [6] dahatin
باوسەندن، بوون بەباو، بوونە باو.

**داهاتن** (کتن) [7] dahatin
ڕام بوون، ڕاهاتن، کەویی بوون، مالیی بوون.

**داهاتن{ولاغ}** (کتن)[٨] dahatin (wulax)
فێری باربردن بوون.

**داهاتن{دارو درەخت}** (کتن)[٩] dahatin (darw dirext)
داپاچراوبوون، ڕووت بوون، لق وپۆپ پێوەنەمان.

**داهاتوو** (ئان)[١] dahatû
باوسەندوو، داکەوتوو، داهاتگ، وەباویوو.

**داهاتوو** (ئان)[٢] dahatû
تازە(پەیدابوو، داباریو، دەرچوو).

**داهاتوو** (ئان)[٣] dahatû
ڕام(بوو، بووکێ)، ڕاهاتوو، کەویی بوو، ماڵیی بوو.

**داهاتوو** (ئان)[٤] dahatû
لەت بوو، لێک جیاوەکراو.

**داهاتوو** (ئان)[٥] dahatû
وەنێش هاتوو، سوورەوەبوو، گل کردوو(چاو).

**داهاتوو** (ئان)[٦] dahatû
دامێنراو، شانەکراو.

**داهاتوو** (ن)[٧] dahatû
ئایندە.

**داهاڕین** (کتپ)[١] dahaṟîn
وردکردن.

**داهاڕین** (کتپ)[٢] dahaṟîn
هاڕیین، کردنەئارد، بەئاردکردن، کردن بەئارد، وەئارد کردن.

**داهانین** (کتپ)[١] dahanîn
دامێنان، داهاوردن، تازە(پەیداکردن، مێنانەکایەوە).

**داهانین** (کتپ)[٢] dahanîn
بەدیی هێنان، وەدیی هێنان، هێنانەدیی.

**داهۆڕ** (ئان)[١] dahor
دەڵب.

**داهۆڕ** (ئان)[٢] dahar
شەپ وشۆڕ.

**داهۆڵ** (ن) dahol
داڵۆ، داڵەهۆ، داوڵ، داوەڵ، مەترەس، چاتۆڵ، هەراسە، پەیکەری لەپۆش وپەلاش یان پەڕۆ دروستکراو لەمەزرا هەڵ دەواسرێ بۆلێ سلەمیینەوەی باڵندەو گیانەوەر.

**داهەراندن** (کتپ) daherandin
کردنەسەر، ناردنەسەر.

**داهەڕستن** (کتن) daherstin
بەسەریەکدا لکان، لێک توندبوون.

**داهێزان** (کتن) dahêzan
ئاودانەوە، شل بوونەوە (هەویر).

**داهێزران{لەش بەهۆی تاوە}** (کتن) dahêzran (leš be hoy tawe)
دامێزان، دامێزیان، داگیرسان، قورس بوون، گران بوون (جەستە).

**داهێشتن** (کتپ)[١] dahêštin
(بەرەو شوێنێکی کووڕ وسەرەوژێر شت) شۆڕ کردنەوە، دادێران، داڵۆچاندن، داکێشان، دا(هشتن، هێلان، لۆسکاندن)، دەحلاندن، داحلاندن، داحەلاندن، شۆڕکردنەوە، شۆڕەوەکردن.

**داهێشتن** (کتن)[٢] dahêštin
درێژبوون، پەرەق بوون، شۆڕەوەبوون (ئامرازی نێرینەی ولاخ).

**داهێشتن{لەلە}** (کتپ)[٣] dahêštin(ele)
درێژکردن.

**داهێلراو** (ئان) dahêlraw
دا(شۆڕیاگ، شۆڕیاو، لۆچیاگ، لۆسکیاگ، شۆڕاو، لۆسکیاو، هێژراو)، شۆڕبووەوە، شۆڕوەبوو، شۆڕەوە بوو.

**داهێنان{مەتەڵ}** (کتپ)[١] dahênan
مەتەڵ مێنانەپێش (بۆ دۆزینەوە).

**داهێنان** (کتپ)[٢] dahênan
داتاشیین.

**داهێنان** (کتپ)[٣] dahênan
کردنەباو، باوکردن، کردن بەباو، وەباو کردن، تازە (دەرهێنان، دائێخستن).

**داهێنان{لق وپۆپی درەخت}** (کتپ)[٤] dahênan(liqw popî dirext)
دائێنان، بڕیینەوە، کورت کردنەوە، لێ کردنەوە، هەڵپاچیین.

**داهێنان** (کتپ)[٥] dahênan
ڕام کردن، ڕاهێنان، کەویی کردن، ماڵیی کردن، کەدیی کردن.

**داهێنان** (کتپ)[٦] dahênan
دائێنان، هێنانەدیی، لەنەبووشت (دروست کردن، چێ کرن)، ئازراندن، ئافەریدکردن.

**داهێنان** (کتپ)[٧] dahênan
دائێنان، بڕیینەوە، داپاچیین، لەت کردن، لێک دائێنان، لێک جیاکردنەوە(داروتەختە).

**داهێنان** (کتپ)[٨] dahênan
دائێنان، خوارکردنەوە، لەزەویی نزم کردنەوە، دائێخستن، نەویی کردن، هێنانەخوار (لق وپۆپی

دار).

داهێنان (کتپ) [10] dahênan

لەنوێ (دەرهێنان، هێنان).

داهێنان{قژ بە شانە} (کتپ)[11]

dahênan(qij be šane)

داماوردن، شانەکردن.

داهێنانەوە (کتپ) dahênanewe

ئاراستەکردن، داشینانەوە.

داهێنەر (ن) dahêner

بەدیی هێنەر، وەدیی هێنەر.

دایاخ (ن) dayax

حەوسەلە، پشوو.

دایرە (ن،ئم) dayre

دەف.

دایرەزەن (ن،کل،لو) dayrezen(kl,lu)

دەفژەن.

دایرەزەنگیی (ن،ئم،لو) dayre zengî(lu)

دەفی پچوکی بەزریزە، گەوال.

دایک (ن) dayk

داک، دالک، دا، دای، دایە، دایکە، دیە، دیا، دەیک، ئامە، ئانە، ئەننە.

دایک وباوک (نک) daykw bawk

باوک ودایک، داک وباب.

دایکەدزە (ن) daykedize

دز دەسەک، دەستەک دز، دەستەدز، دالکەدزان، دەلالی دز، جاسوسی دز، دەسکیس، دزەکە، پاشدز، هاوکاری نهێنیی دز.

دایلاغ (ن،نا) daylax

دایلاغ، بەچکەوشتری یەکسالە.

دایلان (ن) daylan

سەمەرە، سەیر.

دایم ودەرەم (ئاک) dayim wderem

دایم ودەرهەم، هەمیشە، بەبەردەوامیی.

دایە ببینە، دوێتە بخوازە (پن)

daye bibîne, dwête bixwaze

گەوهەری کچ بەدایکیا دەردەکەوێ.

دایەغ (ن) dayex

سوود.

دایەر (ن) dayer

بدەر.

دایەرە (ن) [1] dayere

دیوان.

دایەرە (ن) [2] dayere

چەلەمە، کەمە.

دایەگەورە (ن) daye gewre

داپیر.

دایەن (ن) dayen

دادیی، دایان، داین، تایەن، لەلە(ژن)، مەمە، ئەو ژنەی شیر ئەدا بەمنداڵی خەڵک.

دایەنگا (ن) dayenga

دایانگا.

دایندەیی (ن) dayindeyî

دایەندەیی، بدەریی، بەخشندەیی، سەخاوەت.

دبدب (ن) dibdib

دبدۆب، ئێشکگر، پاسەوان.

دپشت ڤە (ئیک،کی) dipišt ve(ki)

پاش ئەمە(ئەوە)، لەپاشان.

دچ (ن) [1] diç

سووچ، قوژبن.

دچ{مشار} (ن) [2] diç(mišarš

کەلابی دەمی مشار.

دراخە (ن) diraxe

مەلۆز (دەغل).

دراڤ (ن،کی) dirav(ki)

بالاف، کاری جل شتن.

دراو (ن) [1] diraw

هاوڕێتیی.

دراو (ن) [2] diraw

وتوویژ.

دراو (ن) [3] diraw

دراڤ، درهاف، دەرهەف، پارە، درهەم، دەرهەم.

دراوسێ (ن) dirawsê

دەراوسێ، هامسێ، هاوسا، هاوسێ، ئاوسێ.

دراوسێتیی (ن) dirawsêtî

ئاوسێتیی.

دراوسێ لە دراوسێ، ئەگەر سەراسێ(پن)

dirawsê le dirawsê, egrê sera sê

دراوسێی باش هاوڕێی باش وەدەست دەخات، هاوسێی خراپ خووی خراپت فێردەکات.

دراوی خۆشە (رس) dirawî xoše

هاوڕێتیی خۆشە.

دربەشە (ن) dirbaše

زەرگێ.

**دردوک** (ئان) ١ dir dûk
بێ تام ویژ(مرۆڤ).

**دردوک** (ن) ٢ dir dûk
زۆربلێ، هەڵەوەڕ، لۆترەوان، لاترقەوچ.

**درز** (ن) dirz
دراڤ، دەغەن، دەرز، ترەک، ترین، تەرەک، زەندۆل، زندۆر، قلیش، چەت، ڕەمۆل، قەڵشت، قلیش، قەڵش.

**درزبردن** (کتن) ١ dirz birdin
درز (تێبوون، تێکەوتن، پەیداکردن، دان)، درزیین، قلیشان، قەڵشیین، قلیش تێبوون، دەرزبردن.

**درزبردن** (کتن) ٢ dirz birdin
ترکیین، قلیشان، قلیشیان.

**درزبردوو** (ئان) dirz birdû
درز(تێ بوو، تێ کەوتوو)، قلیشاو، قەڵشتوو.

**درز تێ کردن** (کتپ) dirz tê kirdin
درز (تێخستن، پێ بردن)، ترەکاندن، دەرزتێ کردن.

**درزگرتن** (کتپ) ١ dirz girtin
کون وکەلەبەر گرتن، کەلێن گرتن.

**درزگرتن** (کتپ) ٢ dirz girtin
قلیش گرتن، قەڵشت چاک کردن.

**درژ** (ئان) ١ dirj
تووڕە، تووڕەوترۆ.

**درژ** (ئان) ٢ dirj
تووڕە، گرژ، مۆن.

**درژبوون** (کتن) ١ dirjbûn
تووڕەبوون.

**درژبوون** (کتن) ٢ dirjbûn
گرژبوون.

**درژ کردن** (کتپ) dirj kirdin
تووڕەکردن، ڕق هەستاندن.

**درشت** (ئان) ١ dirišt
ئاڵۆزاو، لێک ئاڵاو، لێک هاڵاو.

**درشت** (ئان) ٢ dirišt
دەستە، شتێ کەوردیلەنەبێ، مام ناوەندیی، مام ناوەنگیی، نەگەورە نەبچووک.

**درشت** (ئان) ٣ dirišt
زەبەرلاح وگەمژە، قەبەو تێ نەگەیشتوو، گەورەو بێ فەڕ.

**درشتیی** (ن) dirištî
تێنەگەیشتوویی، حۆلیی.

**درخە** (ن) ١ dirx̱e
مراز، ئامانج.

**درخە** (ن) ٢ dirx̱e
سووژە، شیاوی نووسین یان باس.

**درقە** (ن) dirqe
قرتە، کرتە.

**درکان** (کتن،کتپ) dirkan
درکاندن، دەربڕیین (ئاخاوتنێ کەپێویست نەبێ بە ووتن)، بە(دەمداهاتن، زماندا هاتن)، لەدەم(ترازان، دەرچوون)، ساتمەکردن، لەدەم دەرچوون(قسەو باس کە مەبەستت بووەنەیدرکێنیی).

**درکاندن** (کتپ) ١ dirkandin
باس کردن(شتی، نهێنیی)، پەرت کردن، درکانن، دەرخستن، خستنەڕوو، ڕاستیی گوتن، نهێنیی ئاشکرا کردن، پەردە لەسەر(ڕاز یان نهێنی)داماڵیین.

**درکاندن** (کتپ) ٢ dirkandin
ئاماژەبۆ کردن، بەگوێدادان، گۆشەدان، نیشانەپێدان، هێماکردن، پیشان دان.

**درکاو** (ئان) dirkaw
بێژراو، پێژنا، گوتراو، ووتراو.

**درکە** (ن) ١ dirke
ئاماژە، سەرەتایەک لەنهێنی.

**درکە** (ن،ری) ٢ dirke
ناوەگۆڕکێ، ناوەگۆڕکە، داتاشینی وشەیەکی نوێ لەوشەیەک(ئەم وشەیەش لەماناداپ لێکچووی وشەی پێشووتر بێت) لێ دوان لەوشەیەک بەهۆی بەکارهێنانی پاشکۆیەکی ڕەوان وبەپێز، ئەمەش لەبریتی ناوبردنی دەقی وشەی پێشووتر، بەکارهێنانی ناوێکی دیکە بۆ شتێ لەبریتی ناوی خۆی.

**درکەکردن** (کتن،کتپ) dirke kirdin
دەربڕیین (ئاخاوتن).

**درگان** (ن) dirgan
شەن، شەنە.

**درم** (ئان،پز) ١ drim
پەرەسین (نەخۆشیی).

**درم** (ن) ٢ drim
نەخۆشیی پەرەسێن.

**درم** (ن،پز) ٣ drim
ئامۆ، پەتا، دروشە، درۆم، هەلامەت.

**درم** (ن) ٤ drim

دەنگی دەهۆل، گرمەی دەهۆل.

**درم داکەوتن** (کتن) drim dakewtin

درم بلاوبوونەوە.

**درنگاندن** (کتن) dringandin

درنگە لێوەهاتن (ئامرازی مۆسیقای ژێدار).

**درنگانەوە** (کتن) dringanewe

دەنگ دانەوە، زرنگە لێوەهاتن، زرینگانەوە.

**درنگە** (ن) dringe

زرنگ، زرنگە، زرینگ، زرینگە.

**درنگە درنگە** (ن) dringe dringe

زرنگەزرنگ، زرینگە زرینگ، درنگەی یەک لەدوای یەک.

**درۆباندن** (کتپ) drübandin

شباندن، شوبهاندن، شوبهانن، وێ چواندن، وەک ئەو زانین.

**درۆخان** (کتن) ١ drüxan

کاویان، کاوەکاودان، چووزانەوە.

**درۆخان** (کتن) ٢ drüxan

دروخیان، درۆخیان، هاتنەخورو، وەخوروو هاتن.

**درۆود** (ن) drüd

سلاو.

**دروست** (ئان) ١ drust

دەست لێنەدراو، دەس نەخواردگ.

**دروست** (ئان) ٢ drust

بێ دەردو دوو، تەن (دروست، ساغ)، لەش ساغ، باش، چاک.

**دروست** (ئان) ٣ drust

پوختە، تەیار، دەبار،لەبار.

**دروست** (ئان) ٤ drust

ئامادە، ساز.

**دروست** (ئان) ٥ drust

ئازار یان ئەزیەت نەدراو.

**دروست** (ئان) ٦ drust

بەجێ، بەجێگە، دروس، راست، ڕەوا، شیاو، شان.

**دروست** (ئان) ٧ drust

ئامادەکراو، دروس، بێ (کەمایەتی، پووشە، کەمایەسی)، ڕێک، ڕێک وپێک، سازکراو، سەروین بەستراو، گەلالە کراو.

**دروستایی** (ن) ١ drustayî

ساغیی، سەلامەتیی، باشیی.

**دروستایی** (ن) ٢ drustayî

ئامادەیی، دروستیی، ڕێکیی، ڕێک وپێکیی.

**دروست بوون** (کتن) ١ drust bün

جێبەجێبوون، ڕێک کەوتن، سازبوون، سەرگرتن. دروس بوون.

**دروست بوون** (کتن) ٢ drust bün

هاتنەکایەوە. (vi.).

**دروست بوون لەگەل** (کتن) drust bün legel

لەگەل دروس بوون، لەگەل ژن خەوتن یان سەرجێی کردن.

**دروست بێژ** (ئان) drust bêj

١- راست بێژ، راستگۆ. ٢- دروست پەیمان.

**دروستکراو** (ئان) ١ drustkiraw

دروستکار، جێبەجێ کراو، سازکراو، سازاو، سازدراو، دروستکەردە.

**دروستکراو** (ئان) ٢ drustkiraw

دەستکرد، بەئیشی دەست کراو.

**دروستکراو** (ئان) ٣ drustkiraw

درۆ، دەلەسە، ئاخاوتنی هەلبەستراو.

**دروست کردن** (کتپ) ١ drustkirdin

بەرپاکردن، قەوماندن.

**دروست کردن** (کتپ) ٢ drustkirdin

دروس کرن، ڕێک خستن، ساز (دان، کردن)، جێبەجێ کردن،
چاک کردن، چێکرن، ڕێک وپێک کردن.

**دروست کردن** (کتپ) ٣ drustkirdin

وەدیی هێنان، پەیداکردن (لەنەبوو)، هێنانەکایەوە، کردن،

**دروستیی** (ن) ١ drustî

تەواویی.

**دروستیی** (ن) ٢ drustî

باشیی، چاکیی، ساغیی(تەن، لەش).

**دروستیی** (ن) ٣ drustî

ئەورام، سازگاریی.

**دروستیی** (ن) ٤ drustî

راستیی، ڕەوانیی، بێدرۆیی.

**دروستیی** (ن) ٥ drustî

پاکیی، چاکیی، دروستکاریی، دروسکاریی. دروسیی، راستیی، ساغیی، بێگەزەندەیی.

**درۆشم** (ن) ١ drüšim

بیچم، کەسم.

**دروشم** (ن) ٢ drüšim
نیشانە، درف.
**دروشم** (ن) ٣ drüšim
دەمەجوو.
**دروشمی بازرگانی** (ن) drüšimî bazirganî
نیشانەی بازرگانیی.
**دروشن** (ئان) drüšin
بریقەدەر، بەدرەوشین.
**دروشە** (ن) ١ drüše
درەوش.
**دروشە** (ن) ٢ drüše
ووتە، وشە.
**دروشە** (ن) ٣ drüše
گەشە، ورشە.
**دروشیین** (کتن) drüšîn
درەوشان.
**درووا(گیا..)** (ئان) drüwaw(giya)
داڕناو، داڕووتاو، داڕووتای، لێکراوە (بەداس..).
**درومان** (ن) drüman
تەقەڵکاریی، خەیاتی، باریکە، کاری شت دروون.
**درومان کردن** (کتپ) drüman kirdin
دروون، درواندن، دوریین، درووتن، تەقەڵ(لێدان، لەشت دان) تەقەڵکاریی کردن، دروتتن، دووریان، خەیاتیی کردن، بەدەرزیی ودەزوو شت(دروون، دوروون، دووراندن، دووران) {وەک جل وبەرگ}.
**دروون** (کتپ) ١ drün
درومان کردن.
**دروون** (کتپ) ٢ drün
دروینە کردن.
**دروونکار** (ن) ١ drünkar
جلدروو.
**دروونکار** (ن) ٢ drünkar
وەدروونەر.
**دروونەوە(سەوزە)** (کتپ) ١ rünewe(sewze)
دووران، دووراندن، ڕنیینەوە، داڕنیین، بڕیین(گژوگیای بەپێوە وەستاو یان دەغڵ ودان بەداس یان مەکینە دروینە).
**دروونەوە** (کتپ) ٢ drünewe
کۆکردنەوە، گردکردنەوە، گردەوکردن.
**دروونەوە** (کتپ) ٣ drünewe
پێکەوە نانەوە (شتی دڕاو، بەتەقەڵ)، سەر لەنوێ دروون (شتی هەڵپچڕاو یان دڕاو).
**دروونەوە** (کتپ) ٤ drünewe
دروینەکردن.
**دروینە** (ن) drwêne
درونە، درەو، دوروینە.
**دروینەکردن** (کتپ) drwêne kirdin
درەوکردن، درونەکردن، دروونەوە، درویین، دوورانەوە، دوروینەکردن، داسماڵ کردن، داسماڵەکردن.
**دروینەکراو** (ئان) drwêne kiraw
دووراو، درەو(کراو،کریاگ)، دووریاگ.
**دروینەکەر** (ن) drwêneker
پاڵە، درەوکەر، دروینەوان، درەوەنیکەر.
**درۆ** (ن) diro
دروو، دەرەو، دەلەسە، ئاخاوتنی ناڕاست، پۆت، دەم هەڵبەست، فیشاڵ، فڕ، فڕکا، قەوانە، هەلات، هەڵیت، ووتەی هەڵبەستراوی بێبناغە، ئاخاوتنی هەڵبەستە.
**درۆخان** (ن،پز) diroxan
دروخان، خورووی گەروو.
**درۆخیان** (کتن) diroxyan
چوورزانەوە.
**درۆ بۆ هەڵبەستن** (کتپ) diro bo helbestin
بوختان پێ کردن.
**درۆ دەرهێنان** (کتپ) diro derhênan
ناڕاستیی(شتێ) چەسپاندن.
**درۆزن** (ن) dirozin
درۆکەر، دەرەوکەر، دەرەوین، دروزە، درووکەر، دروونن، دەڤ خار، فڕکار، قەوانە(بێژ، هەڵبەست)، هەلاتکەر، دەلەسەباز، ناڕاست.
**درۆزن ئاگر لە ماڵیشی بەربێ، کەس باوەڕ ناکات** (پن)
dirozin agir le malîšiî berbbê.kes bawer nakat
درۆزن، ئەگەر ڕاستیش بڵێ کەس پێی باوەڕناکات.
**درۆزن دوژمنی خوایە** (پن)
dirozin dujminî xwaye
درۆکەر ناحەزی خوایە.
**درۆزنانە** (ئان) diroznane
درووکانیی، درۆزنە، قەڵب، ناڕاستەقینە.
**درۆزن شتی لە بیرنامێنێ** (پن)
dirozin šitîlebîr namênê
درۆزن ئەبێ بیری تیژ بێ.
**درۆزنە(کانیاو)** (ن) dirozine(kanyaw)
ئاوێ کەهاوین وشک دەکات.

**دروشم** (ن) dirošim

درف، دروف، نیشانەی تایبەتیی گەل یان دەوڵەتێ.

**درۆ کردن** (کتن) diro kirdin

داندن، درۆ ووتن، درووکردن، ئاخاوتن بەناڕاست گێرانەوە، بەدرۆشت گێرانەوە، ڕاست (نەکردن، نەڕزیین)، شت بەدرۆ گێرانەوە، ئاخاوتنی ناڕاست کردن.

**درۆکەر** (ن) diroker

درۆزن.

**دروم** (ن،پز) dirom

ژەقنە، تاعوون.

**درۆو دەلەسە** (ن) dirow delese

ئاخاوتنی ناڕاست وکەلەک، کەلەک وکولۆکە، هاشەو هووشە، چاپ وچووپ، چاخان وپاخان، ناڕاستیی.

**درۆو دەلەسە کردن** (کتپ) dirow delese kirdin

هاشەوهووشەکردن، ئاخاوتنی ناڕاست هەڵبەستن.

**درۆ وفیشاڵ** (ن) dirow fîšal

هاشەوهووشە.

**درۆی بە باڵ دەفڕێ** (رس) diroy be bal defrê

زۆر درۆزن وفیشاڵکەرە، درۆی زل وئاشکەرادەکات.

**درۆی شاخدار** (ن) diroy šaxdar

درۆی (باڵدار، زۆر زل).

**درەخت** (ن،رو) dirext

دار، داری (بەپێوەی وشک نەبوو، سەوزی ڕەگ داکوتاو).

**درەخشان** (ئان) direxšan

دروشێن، بەدرەوش، پرشنگدار، ڕووناک.

**درەنگ** (ئاک) direng

دێر، لەکات (ڕابراو، ڕابوردوو)، دێرس.

**درەنگان** (ن) direngan

درەنگیی، دەمەدەمی ڕۆژاوا.

**درەنگ بوون** (کتن) direngbûn

درەنگ کردن.

**درەنگ پێ چوون** (کتن) direng pê çûn

درەنگ پێ کەوتن.

**درەنگ خایان** (کتن) direngxayan

کەوتنە دواوە.

**درەنگ خستن** (کتپ) direng xistin

دواخستن، خستنەدرەنگان.

**درەنگ خێز** (ئان) direng xêz

دێرخێز، سست، مردەلۆخە.

**درەنگ کردن** (کتن) direng kirdin

بوون بەدرەنگ دیرکردن، کات (بەسەرچوون، ڕابوردن)، درەنگ، خایاندن.

**درەنگ کێشان** (کتن) direng kêšan

زۆرپێ چوون، زۆرخایان.

**درەنگیی** (ن) direngî

دێریی، دێرسیی.

**درەوش** (ن) direwš ¹

بریقە، ترووسکە.

**درەوش** (ن) direwš ²

درێشک، دروش، درەوشە، درێشە، سووژنی دەسکداری چەرم کون کردن.

**درەوشان** (ئان) direwšan ¹

درەوشەدار.

**درەوشان** (کتن) direwšan ²

دروشیان، دروشیین، درەوشیان، درەوشیین، درەوشیینەوە، ترووسکەدان، بریسکانەوە.

**درەوشانەوە** (کتن) direwšanewe

بریسکەدانەوە، پرشنگ دانەوە، تریوەکردن، تریفە (کردن، هاتن).

**درەوشەدار** (ئان) direwšedar

تریفەدار، بریسکەدار، درەوشان.

**درەوکردن** (کتپ) direwkirdin

دروێنەکردن.

**دری** (ن) dirî

شەرم، فەدیی.

**دریچە** (ن) drîçe ¹

کولانە.

**دریچە** (ن) drîçe ²

بۆتە، دەفری زێڕوزیو تێدا توانەوە.

**درێژ** (ئان) drêj ¹

بالابەرز.

**درێژ** (ئان) drêj ²

ڕاکشاو، درێژبوو.

**درێژ** (ئان) drêj ³

ئاکۆتا، نەکۆتا.

**درێژایی** (ن) drêjayî ¹

درێژیی.

**درێژایی** (ن) drêjayî ²

دووراقە، دووراییی، ماوە، مەودا، مەیدان، ناوەند، نێوان.

**دریژبوون** (کتن) ١ drêjbün

دانەدریژیی، لەدریژیی دان، تووڵانیی کیشان.

**دریژبوون** (کتن) ٢ drêjbün

ڕاکشان، پاڵ کەوتن، قنگەوتلوور کەوتن، تلوور کەفت.

**دریژبوونەوە** (کتن) ١ drêjbünewe

دریژخایان، زۆر(پیچوون، خایان)، زۆرکات پیچوون، دریژەوبوون، ماوەزیادبوون.

**دریژبوونەوە** (کتن) ٢ drêjbünewe

١- قەتیس(بوون، مان). ٢- کاردواکەوتن.

**دریژدادڕ** (ئان) drêj dadir̲

چەقەسرۆ، ویرە ویرکەر، دریژبیژ، هەرزەچەنە، چەنەباز.

**دریژدادڕیی** (ن) drêj dadir̲î

دەم دریژیی.

**دریژدادڕیی کردن** (کتپ) drêj dadir̲î kirdin

زۆر (بلییی کردن،لەسەرقسە ڕۆیشتن، ویژیی کردن)، چەقەسرۆیی کردن، سازندەیی کردن، ویرە ویر کردن، دریژەبەگفت وگۆدان، دریژەدان بەئاخاوتن، لەسەر ئاخاوتن ڕۆیشتن، چەنە بازیی کردن.

**دریژداهۆڵ** (ئان) drêj dahol̲

تەژەولاوان، داهۆڵ ئاسا، دریژولەڕ.

**دریژکردن** (کتپ) ١ drêj kirdin

لەدوو دان.

**دریژکردن** (ئد) ٢ drêj kirdin

ماوە یان مۆڵەت پیدان.

**دریژکردن** (کتپ) ٣ drêj kirdin

بەزەویدا دان ڕاکیشانەسەرزەویی، لەسەرزەویی (پاڵ خستن، ڕاکیشان).

**دریژکردن{ئەلە}** (کتپ) ٤ drêj kirdin(ele)

ئیرەق کردن، دامیشتن.

**دریژکردنەوە** (کتپ) ١ drêj kirdinewe

دریژە پیدان، زیاتر لەپیویست ماوەپیدان، پتر لە پیویست کات پیدان.

**دریژکردنەوە** (کتپ) ٢ drêj kirdinewe

شت خستنەسەرباری کورتیی، لەکورتییەوە لەدوودان.

**دریژکۆلە** (ئان) drêj kole

دریژۆکە، دریژۆنکە، کەمیک دریژ.

**دریژکیشان** (کتن) drêj kêšan

زۆرماوەپی چوون.

**دریژن** (ئان) drêjin

دریژ، باڵابەرز، بەژن بلند.

**دریژە** (ن) ١ drêje

ماوەیەکی زۆر.

**دریژە** (ن) ٢ drêje

وەدرەنگیی، کاری وەدواخستن.

**دریژەپی دان{ئاخاوتن}** (کتن) ١

drêje pêdan(axawtin)

لەسەر ئاخاوتن ڕۆیشتن،دریژەوکردن، دریژکردنەوە، ئاخاوتنی بی سوود کردن، حەکایەتی میش کردن، چەنەبازیی کردن، زۆربلییی کردن، دریژەدان بەئاخاوتن، لەدوادان، دانەدەم.

**دریژەپی دان** (کتپ) ٢ drêje pêdan

دریژەوکردن، دەست لەئەرک هەڵ نەگرتن.

**دریژیی** (ن) drêjî

دریژایی، دریژا، ناکۆتایی، نەلەکورتیی.

**دریسمە** (ن) drême

ڕیسمە، گریژەنە، پاژنەی دەرگا.

**دریغ** (ن) ١ drêx̲

دریغ، دریغیی، دریخیی، کۆتایی، کۆتامیی، ناتەواویی.

**دریغ** (ن) ٢ drêx̲

دریغ، حەیف، مەخابن.

**دریغ کردن** (کتپ،کتن) drêx̲kirdin

بەناتەواویی کارئەنجام دان، دریغیی کردن، دریخیی کردن، ئیش بەناتەواویی بەجی هیشتن، کۆتایی کردن لە کاروباردا.

**دریغیی** (ن) drêx̲î

کەمتەرخەمیی، سستیی، ساردوسڕیی، تەرکەخەمیی.

**دریغیی کردن** (کتپ) ١ drêx̲î kidin

کەمتەرخەمیی کردن، سستیی کردن، خستنەپشت گوی، دانەپشت گوی، گوی نەدان.

**دریغیی کردن** (کتپ،کتن) ٢ drêx̲î kirdin

بەناتەواوی کارئەنجام دان.

**دڕ{سەگ}** (ئان) ١ dir̲(seg)

دڕنە، دەبنەوەدڕ، پاشدڕ، نهینگر، ئازا، نەترس.

**دڕ** (ئان) ٢ dir̲

بەدفەڕ، شەڕانیی(مرۆڤ).

**دڕ** (ئان) ٣ dir̲

دڕشت، دوڕشت، زبر، زرب، ئاژین، گرنجاویی.

**دڕ** (ناو) ٤ dir̲

زل، گەورە (قەبارە).

**دڕ** (ناو) ٥ dir̲

شەڕانی، هاروهاج، گەلاج، بدەک.

**دڕان** (کتن) ١ dir̲an

پارچەپارچە وکون تێبوون، دڕیان، شڕبوون، لەت لەت بوون (کالا..)، جرتیین، چوون.

**دڕان** (کتن) ٢ dir̲an

ئاشکرابوون، بلاوبوونەوە (نهێنیی، ئاخاوتنی شارراوە).

**دڕان** (کتن،ند) ٣ dir̲an

زۆر قەلەوبوون.

**دڕان** (کتن) ٤ dir̲an

مردارببوونەوە، قنگ کردنەڕەشەبا، لنگ لێ ڕاکشان (مرۆڤی بێ ئایین یان لەبەر چاوبێزراو، هەروەها ئاژەل..).

**دڕاندن** (کتپ) dir̲andin

دڕانن، دڕیین، شڕووڕکردن، هەلاهەلاکردن، لەت لەت کردن.

**دڕاو** (ناو) ١ dir̲aw

دڕیاو، شڕووڕ، دڕیاگ، پارەبووگ، چڕیاگ، دەڕسە.

**دڕاو** (خ) ٢ dir̲aw

زۆر قەلەو.

**دڕپێدان** (کتپ) dir̲ pê dan

بلاوەپێ کردن.

**دڕدان** (کتپ) dir̲dan

بەپالەپەستۆ جێ کردنەوە، ڕێگە بەناڕەحەت کردنەوە (لەناو عەشاماتدا)، تەکەکردن.

**دڕدووک** (ن،ڕو) dir̲dük

تووترک، دڕەی.

**دڕدۆک** (ناو) dir̲dok

خۆتێ هەلقوتین، هەلقوتین، هەلقوتینەر، ئەسکویی ناو هەموو دیزەیەک.

**دڕک** (ن،ڕو) dir̲k

ئەستری.

**دڕکاویی** (ناو) ١ dir̲kawî

بەدڕک تەنراو.

**دڕکاویی** (ناو) ٢ dir̲kawî

دڕکین، دڕکینە، دڕگین، دڕاویی، پڕ لە (چقل، دڕک)، قەلەماویی.

**دڕک تری ناگری** (پن) dir̲k trê nagrê

ئەنجامی خراپەهەرخراپەیە، شتی باش لەپیاوی خراپ ناوەشیتەوە.

**دڕک کۆکردنەوە** (کتپ) dir̲k ko kirdinewe

دڕوو کردن.

**دڕک ودال** (نک) dir̲kw dal̲

دڕوو، دڕودال.

**دڕکە** (ن،پز) dir̲ke

پیزۆکە، دڕیلە، گرمژنەی کیماویی، جۆرە زیپکەیەکی تەڕە سەری وەک نووکی دەرزی وایە لەلەشی‌مندال دیت بەهۆی جۆرە ڤایرۆسیکەوە تەشەنەدەکات و (تا) دارە.

**دڕکە ئاسنینە** (ن) ١ dir̲ke asnîne

ئاسندڕک.

**دڕکە ئاسنینە** (ن،ڕو) ٢ dir̲keasnîne

پەیکول، کەلەوێ، دڕکەلەوێ.

**دڕکە جاڕ** (ن) dir̲ke car̲

دڕوەلان، جیگەی دڕاون، شوینی پڕ چقل.

**دڕکە زیی** (ن،ڕو) dir̲kezî

زیی، زرین، تالووک، تەلۆک، دڕکی پەرژین، جۆری دەوەنی زۆر دڕکاوییە.

**دڕکی مەم وزین** (ن،ناو) ١ dir̲kî mem w zîn

دڕکی مەموزینان،گیرەشێوین، شۆفارودۆی دوو دۆست.

**دڕکی مەم وزین** (غ) ٢ dir̲kî mem w zîn

جیرەجیرکەر، مەژگ، ئەسپی کەولەکۆن.

**دڕکین** (ناو) dir̲kîn

دڕکاویی، دڕکدار، دڕک دڕک، دڕکینە، بەدڕوو، چقلاویی.

**دڕکینە** (ن،م) dir̲kîne

زەڕنەقووتە، تووکنە، جوجکی تازەتووک لیهاتوو.

**دڕگە** (ن) dir̲ge

ئاوگردان، دەرە (نیوان گردۆلکە).

**دڕن** (ن) dirin

دڕنیی، بۆدڕ، بۆن چلک، بۆنی ناخۆش.

**دڕنال** (ن) ١ dir̲nal̲

ئاودڕ، بوودڕ، دەرە، کەند، کەن، کەندولەند، گڕنال، ئاودڕکە.

**دڕنال** (ن) ٢ dir̲nal̲

نۆکەند.

**دڕندار** (ناو) dir̲ndar

بۆدڕن، بۆسار، بۆمج.

**دڕندە** (ناو) ١ dir̲nde

کیویی.

**دڕنده** (ن) [٢] dir̲nde

دڕنده، دەڕ، تیروو، جانەوەری گۆشت خۆری کێویی.

**دڕنه لێ گرتن** (کتن) dir̲n lê girtin

مل نەدان.

**دڕۆکە** (ن) [١] dir̲ok

کەلبە، کەلپ، دانی تیژی دڕندە.

**دڕۆکە** (ئان) [٢] dir̲ok

مل نەدەر(مرۆڤ).

**دڕۆکە** (ئان) [٣] dir̲ok

تیژ.

**دڕەماسی** (ن،ئا) dir̲e masî

ماسییە دڕکە، چقلەماسی.

**دڕی** (ن) dir̲î

شەڕ ئەنگێزیی.

**دڕین** (کتپ) dir̲în

بۆدڕ یان بوودڕ لێدان.

**دڕین** (کتپ) dir̲în

دڕاندن.

**دز** (ن) [١] diz

١- کەسێ کەماڵی خەڵک بەنهێنیی دەبا، دزگەردەنە، دەس پیس، پیاوخراپ، ناپاک.

٢- پیاو(ڕووتکەرەوە، ڕووتەوەکەر)، تالانکەر، دووکانبڕ، چەتە.

**دز** (ن) [٢] diz

دزە، دژ، قەلا، کەلە.

**دزان** (کتپ) dizan

خۆش نەویستن، نەویستن، ڕکە لێ بوونەوە.

**دزانە** (ئاک) dizane

بەنهێنیی، دزە، بەبێ دەنگ، بێ سرپە، بە(پەنهانیی، خشکەیی، دزییەوە)، سووکە، لەسەرخۆ.

**دزبازاڕ** (ن) diz bazar̲

شوێن یان بازاڕی شێواو وپڕ لەدز و ساختەچیی.

**دزبازاڕی شێواوی ئەوێ** (پن)

diz bazar̲ šêwawî ewê

چونکە ئاڵۆزیی بواری خراپەکاریی ئەدات.

**دز بەڕێیەکدا ئەڕواوخاوەن ماڵ بەهەزار ڕێدا** (پن)

diz ber̲êyekda er̲waw xawen mal̲ be hezar r̲êda

واتە: ١- خاوەن ماڵ زۆر شوێن دەپشکنێ.

٢- ئەو گومانەی کەلە دز دەکرێ بەرەو زۆر شوێنت دەبا.

**دزدار** (ن) diz dar.

دژدار، پاسەوانی قەلا، قەلاچیی.

**دز دز ئەناسێ** (پن) diz diz enasê

١- دز بەدز ئەگیرێ. ٢. دز ئەزانێ دز بیر لەچی ئەکاتەوە، دزان هاوکاری خۆیان دەناسن.

**دزراو** (ئان) dizraw

دز بردوو، دزریاگ، دزریاو، دزیاگ، بڕاو(بەنهێنی)، بەنهێنی بڕاو.

**دزکۆشکە** (ن) diz koške

دزگا، دزگە، مەکۆی دزان، جێگەی دزیکەران، حەشارگەی دزان.

**دز گوون** (ئان) dizgün

پەسند، ڕێک(ئیش وکار)، جوان.

**دزگیین** (ئان) dizgîn

بێنرخ، نەهێژا، هیچ وپووچ.

**دزنەبەرە** (ئان) diz nebere

دزنەبەر، دزنەخۆرە، بێ بەها، بێ نرخ.

**دز ودرۆزن** (نک) dizw drozin

کۆمەڵی پیاو خراپان.

**دزەخورجێنیی کردن** (ئد) dize xurcêyî kirdin

بەپەنهانیی بەئیش هەڵسان،بەدزییەوە کارکردن، کاروبارکردن بەدزییەوە و پەنهان کردنی لەم ولەو.

**دزە خورجێنیی لێ کردن** (ئد)

dize xurcênî kirdin

قسەلەیەکێ شاردنەوە.

**دزەخەنە** (ن) dizexene

خەندە، لێو (خەنە، خەندە)، بزە.

**دزەقەسابیی** (ن) [١] dize qesabî

قەسابیی نائاسایی.

**دزە قەسابیی** (ع) [٢] dize qesabî

خۆ فرۆشیی ئافرەت بەدزیمێردییەوە.

**دزە کردن** (کتن) [١] dize kirdin

خۆدزینەوە، پێدزکێ کردن، پاچرکێ کردن.

**دزە کردن** (ئد) [٢] dize kirdin

چوونەژوورەوە یان ناوەوە (بەپەنهانیی، بەسرپە)، خۆ بەژووردا کردن (بەدزییەوە).

**دزە کردن** (کتن) [٣] dize kirdin

ئاو لێ چوون.

**دزیتەنیی** (ئان) dizîtenî

دزدیتنیی، شتێ کەبۆدزیین دەست ئەدا، شتێ کە سەرنجی دز ڕابکێشێ وبیدزێ.

**دزی گای خۆیەتیی** (پن) dizî gay xoyetî
ئەوەندە دزە ماڵی خۆشی دەدزێ.
**دزی ناشیی لە کادان ئەدات** (پن)
dizî naşî le kadan edat
بەدزێک دەوترێ، کەلەدزیی نەزانێ.
**دزێو** (ئان) dizêw
ئێسک قورس، ناشیرین، ناشرین.
**دزیی** (ن) [1] dizî
دزیەتیی، دزێتیی، چاپ وگووپ، چرپ وچاپ، بردنی ماڵی خەڵک بەنهێنیی، پیشەی دزێتیی
**دزیی** (نک) [2] dizî
ماڵی دزراو، شتی دزێتیی.
**دزیی** (ن) [3] dizî
پەنهانیی، نهێنیی.
**دزیی کردن** (کتپ) dizî kirdin
دزیین.
**دزیی لێ کردن** (ن) dizî lê kirdin
لێ دزیین، چزەلێ دان.
**دزیین** (کتپ) [1] dizîn
دزیەتیی کردن، دزێتیی کردن، دزیی لێ کردن، شان پیدا کردن، دزیی لەخەڵک کردن، شت لەخەڵک دزیین، ماڵی خەڵک بەدزیەوە بردن.
**دزیین** (کتپ) [2] dizîn
دووکان بڕیین، ماڵ بڕیین، چوونەناو (دووکان یان ماڵ) بۆ دزیی (کردن).
**دزیین** (کتپ) [3] dizîn
تاڵان کردن، جەردەیی کردن، چەتەیی کردن، ڕێ بەخەڵک گرتن ورووت کردنەوەیان.
**دزیین** (کتپ) [4] dizîn
باخەڵ بڕیین، گیرفان بڕیین.
**دزیینەوە** (کتپ) [1] dizînewe
لێ(داشکاندن، کەم کردنەوە).
**دزیینەوە** (کتپ) [2] dizînewe
لێ گێڕانەوە.
**دزیینەوە** (کتپ) [3] dizînewe
شاردنەوە، وەشارتن.
**دزیی وفزیی** (ن) dizîy wfizî
فێل و(فەرەج، فەنگ، تەڵەکە)، فێلبازیی.
**دژ** (ن) [1] dij
دوژ، دش، پێچەوانە.
**دژ** (ئان) [2] dij
درژ، ڕوو(تاڵ، ترش، گرژ)، گرژ.

**دژ** (ئان) [3] dij
بەد، چەپەڵ، خراو، ناپاک.
**دژ** (ئان) [4] dij
ناتەبا، ناڕێک، نەگونجاو.
**دژ** (ن) [5] dij
خەنیم، دش، دوژ، ناحەز، نەیار.
**دژ** (ئان) [6] dij
کز، مات، مەلول.
**دژ** (ن) [7] dij
پەنا، قەڵات.
**دژ** (ئان) [8] dij
وەڕس، بۆڵۆ.
**دژایەتیکەر** (ن) dijayetîker
بەرهەڵستکەر، ڕقەبەریکەر، ملەملکەر.
**دژایەتیی** (ن) [1] dijayetî
بەرهەڵستیی، بەرپێچیی، بەرپێچیتیی، ناحەزیی، لایەتیی.
**دژایەتیی** (ن) [2] dijayetî
ناتەبایی، ناجۆریی، ناڕێکیی، نەیاریی.
**دژبوون** (کتن) [1] dijbûn
دۆش دامان.
**دژبوون** (کتن) [2] dijbûn
درژبوون، گرژبوون، ئەخم کردن.
**دژپەسند** (ئان) dijpesind
دژپەسەن، دژوار پەسەند، دیر پەسەن(سەبارەت بەشتێ)، دوخشارپەسەن.
**دژخۆر** (ئان) dijxor
کەم خۆر.
**دژخوو** (ئان) dijxû
شەڕانیی.
**دژداشە** (ن) dijdaşe
دشداشە، دزداشە، عەزیزیی، کراسی(ئاودامێن، ئاوداوێن).
**دژڕابەر** (ئان) dijraber
موخننەت، بەڕواڵەت دڵسۆز ولەبنەوەناپاک.
**دژکام** (ن،ئان) dijkam
تەرکەدنیا، تەریک، خۆپارێز لەخۆشیی دنیایی.
**دژکردن** (کتن) dij kirdin
دەموچاوگرژ کردن، ڕووتێکنان، ناوچاوترشاندن.
**دژگەن** (ن،ئان) dijgen
دژگەنە، گەنیونەمیل، دەرمانێ کەبۆنیخۆش لەناوبەرێ.

**دژمین** (ن) dijmên
جنێو.

**دژوار** (ئان) ١ dijwar
دشـوار، دوژوار، زەحمـەت، سـتەم، سـەخت، گـران، نارەحەت، توند (ئیش،کار).

**دژوار** (ئان) ٢ dijwar
خورت، دوخشار(مرۆڤ).

**دژوار** (ئان) ٣ dijwar
سەخت، قاییم، پتەو.

**دژواریی** (ن) dijwarî
دشواریی، دڵ گرانیی، دژیا، زەحمەتیی، سەختیی، ناخۆشیی، چورتم.

**دژون** (ئان) dijûn
چلکن، کۆتیی، گەمار، دژوین(جل وبەرگ).

**دژوینیی** (ن) dijwênî
پیسیی، چلکنیی، چەپەڵیی.

**دژەبا** (ن) dijeba
بایەک کەپێچەوانەی ویستی مرۆڤ بێ.

**دژهونیی** (ن) dijhonî
کۆکردنەوەی دووپێچەوانە لەهەڵبەستێکدا(دوو وشـە کە دژایەتی بێ لەناوەندیانا لەرستەیەکدا).

**دژیا** (ئان) dijya
قژن، سەرقژن، قژ تیکەڵ وپیکەڵ.

**دژێتیی** (ن) dijêtî
پێچەوانەیی، نەیاریی.

**دژێن** (ن) dijên
گلاند، لوو، گرێی ناوگۆشت.

**دژیی** (ن) dijî
دشیی، دشتیی، ناحەزیی، ناڕێکیی، نەیاریی.

**دسەڕە** (ئاک) ١ diserre
سەرەڕا، لەگەڵ ئەوەشدا.

**دسەڕە** (ئاک) ٢ diserre
لەسەرەوە.

**دش** (ن) diš
دوش، باجیی، خوشکی(مێرد،شوو).

**دشپووک** (ن،پز،کل) dišpük(kl)
دومەڵی بچووک.

**دشت** (ئان) dišt
دشتە، ناشیرین.

**دشتە** (ن) dište
ئیشی خراپ، کاری خراو.

**دش کردن** (کتن) ١ diškirdin
دەست لەئیش هەڵگرتن، خۆ لەکارکیشانەوە.

**دش کردن** (کتن) ٢ diš kirdin
چوونەناو ئاو، مەلەکردن.

**دشنە** (ن) dišne
خەنجەری دەم ڕاست.

**دشە** (ن) diše
جێگەی خراپ، شوێنی خەراو.

**دخە** (ن) dixe
فیل، گزیی، گەڕ.

**دفرە** (ئان) difre
لەخۆبایی.

**دفلۆک** (ن) diflok
ژێرکراس، فانیلە.

**دفن** (ن،کل) difin(kl)
لووت.

**دفناک** (ن،کل) difnak(kl)
پەرپەرەی کەوانەدار(ماسی).

**دڤانەک** (ن،کل) divanek(ki)
پسوولەی(ڕەسید، وام ساندنەوە).

**دڤری** (ن،کی) divrî(ki)
تەوەرەی ئاش.

**دڤ مریی** (ئان،کی) divmirî(ki)
دەم مردوو.

**دڤ نەرم** (ئان،کی) div nerim(ki)
دەڤ نەرم، دەم وراوێژخۆش، قسەخۆش.

**دڤەدڤ** (ن،کی) dive div(ki)
گفەگف، گزەگزی با، دەنگی بای توند.

**دڤێ** (پ،کی) divê(ki)
لەناو ئەوەدا، دەناوئەوە.

**دڤێت** (ئاک،کی) ١ divêt(ki)
ئەبێ هەربێ، هەرئەشێ بوێ.

**دڤێت** (ن،کی) ٢ divêt(ki)
دەوات، مەرەکەبدان.

**دق** (ن) diq
گارە، گارەگاری مریشک.

**دکن** (ئان) dikin
بواردوو، چلکەسوو، دکین، کالایـەک کەبـەهیچ جـۆرە شتنێ پاک نابێتەوە.

**دکە** (ن) dike
دکە، سەکۆ(لەقوڕی هەڵشێلراو دروستکراو).

**دگان تیژکەر** (ن.ر.و) digantîjker
پەلپینە، ڕوەکێکیی وەرزییە دەکرێتە ناوەندی خواردەمەنی و زەلاتەوە یان لەگەڵ نیسک.. لێ دەنرێ.

**دگاندار** (ئان.کل) digandar(kI)
داندار، گرنج گرنج.

**دگدگە** (ن.پز) digdige [1]
چیچکەسلاو.

**دگدگە** (ن) digdige [2]
ئەمتەمەی مزراح(یاری منداڵان).

**دگدگە** (ن) digdige
مزراحێکە لەخولانەوەدا نەیەتە سەردەست، مزراحی ئەمتەمەکول.

**دگەر** (ن) diger
بێگانە، نامەحرەم.

**دگەڵ** (ئاک) digel
لەگەڵ.

**دگەڵ ڤی هەندی** (ئپ.کی) digel vîhendî(ki)
ئەگەرچی.

**دڵ** (ن) dil
١- ئۆرگانی سووری خوێن، بنەمای ژیان، ماسولکەیەکی ناوبۆشەوبریتییە لەترومپای ئەوژمی خوێن، کانگای پاڵ پێوەنەری خوێن، زێل، زیلی.
٢- چەق، کاکڵە، مەگەن، ناو، ناڤند، ناوجەرگە، ناوەند. ٣- ئاریش، بیر، هۆش، فر.
٤- ئەڤینی، ئەڤینی، خۆشەویستی، هەڤینی.
٥- بنچینەی خۆیەتیی مرۆڤ، دەروون، فرووکەر، هەستی چاکەوخراپە٦- بێز، قێز.
٧- ئارەزوو، ئیشتیا، خواز، خواست، کەوژ، مگێن، مگێن، ویست، هەوەس. ٨- ئازایی، بەجەرگیی، زاتداریی،زاخیی، گەڕناسیی.

**دلارا** {دڵ ئارا} (ئان) dilara (dil ara)
١- دلخۆشکەر، بەردڵ، شتێ بیتەهۆی دل کرینەوە.
٢- دلارام، دڵ(ئارام، فێنک کەرەوە).

**دلارام** (ئان) dilaram
دلنیا.

**دلازار**{دڵ ئازار} (ئان) [1] dilazar(dil azar)
دل نارەحەتکەر، هەرچێ وەبەردل ناکەوێ.

**دلازار** {دڵ ئازار}(ئان) [2] dilazar (dil azar)
دل شکاو، دل شکست.

**دلاسوودە** {دڵ ئاسوودە} (ئان)
dilasüde (dil asüde)
دلنیا، بێخەم، خاترجەم، یەک دل.

**دڵ ئاسوودەبوون** (کتن) dil asüdebün
دل رەحەت بوون.

**دلاوا**{دڵ ئاوا} (ئان) dilawa (dil awa)
بەخشننە، دڵ(ڤال، ڤالا،فرە، گوشاد)، دەهندە، دەهەندە، بەخشایشتگەر.

**دلاوخواردنەوە** {دڵ ئاو خواردنەوە} (کتن)
dilaw xwardinewe (dil awxwardinewe)
دلنیابوون، بێخەم بوون، خاترجەم بوون، پرپەدل باوەڕ بەشتێ کردن.

**دڵ ئاو خواردنەوە** (ئد) dil awxwardinewe
دل هەداربوون(بەهۆی بیستنی جێبەجێ بوونی ئیش یان کارێکی مەبەست)، دل ئاوڕشێن کران.

**دڵ ئاودان** (کتپ) dil awdan
دڵ(ئاڤدان، ئاودان، خۆش کردن، شادکردن)، مژدەی خۆشی پێدان.

**دلاودڵ** (ئان) [1] dilaw dil
دوو دل.

**دلاودڵ** (ئان) [2] dilaw dil
دڵ(پیس، چەپەل، کرمۆل).

**دلاودلیی** (ن) dilaw dilî
دوودلیی.

**دلاودلیی کردن** (کتن) dilawdili kirdin
دلەڕاوکێ کردن، ڕاڕابوون، گومان کردن.

**دلاوەدان** {دڵ ئاوەدان} (ئان)
(dil awedan ilawedan )
بەهۆش، وریا.

**دلاوەدان** {دڵ ئاوەدان}(ئان) [2]
dilawedan (dil awedan)
دل بەدنیاخۆش، دلخۆش.

**دلاوەر** {دڵ ئاوەر}(ئان) dilawer (dil awer)
دل ئاودەر(وە)، دلخۆشیدەر(وە)، دلنەواییدەر، دلنەواییدەر، دلنەواییکەر.

**دڵ ئاگای لەدڵە** (رس) dil agay le dile
هەست بەخۆشەویستیی یەکترکردن (بەهۆی وردەی دەروونەوە). دل لەدل دەڕوانێ.

**دڵ ئاوێنەی دڵە** (رس) dil awênez dile
هەرچی لەدلدا بێ لەڕوخساردا دەردەکەوێ، ئەوشتەی بەدلدا دێ، زمان دەری دەبڕێ.

**دڵ ئێشان** (کتن) dil êšan

دڵ(ڕەنجان، مان)، ئاجزبوون، زویربوون.

**دڵ ئێشاندن** (کتپ) dilêšandin

دڵ (ڕەنجاندن، هەشتن)، ئاجزکردن، ڕەنجاندن، زویرکردن، ئاراندن، زیزکردن، هەست بریندار کردن، پەست کردن، ناڕەحەت کردن.

**دڵ ئێشە** (ن) dilêše

١- ژان وبرکی دڵ. ٢- پەژارە، خەم، خەفەت.

**دڵ براو** (ن،ئان) dil braw

سەوداسەر، گرفتاری خۆشەویستیی، دڵکەتیی.

**دڵ بردن** (ئد) [1] dilbirdin

ویستن، کاڤیین، مەبەست بوون(کردنی شتێ).

**دڵ بردن** (ئد) [2] dilbirdin

خەم وخەفەت پەکی کەسێ خستن، زۆرناڕەحەت بوون.

**دڵ بردن** (ئد) [3] dilbirdin

ئارەزووکردن، ئیشتیا(لێبوون، هەبوون)، حەزلێ بوون، دڵ چوونەسەر، وازلێ بوون (بۆ خواردەمەنیی، خواردنەوە..).

**دڵ بردن** (کتن،کتپ) [4] dilbirdin

ئاشق بوون، خۆزکردن بەئەویندارى کەسێ، دڵ(ڕفاندن، بردن، ڕفانن، لێسەندن)، بەندەواربوون، حەزلێ کردن، بوون بەخۆشەویست ودڵداری کەسێ..

**دڵ بردنەوە** (کتن) dilbirdinewe

دڵ ڕۆیین.

**دڵ بریندار** (ئان) dilbirîndar

دڵ برین، خەمبار، خەفەتبار، هەناسەسارد.

**دڵ برینداربوون** (کتن) dil birîndarbûn

گرتنە دڵ (ئاخاوتن یان کرداری ناپەسەندی کەسێ)، دڵ ڕەنجان.

**دڵ بریندار کردن** (ئد) dilbirîndar kirdin

دڵ(شکاندن، شکست کردن)، تاڵیی دەرخوارددان، ناڕەحەت کردن، هەست بریندارکردن، زیزکردن.

**دڵ بژۆکیی** (ن) [1] dilbijokî

ئیشتیا، تامەزرۆیی.

**دڵ بژۆکیی** (ن) [2] dilbijokî

تەماع، چاولەدوویی، تەما.

**دڵ بژۆکیی** (ن) [3] dilbijokî

چاوچنۆکیی، زک برسیتیی، سک برسیتیی.

**دڵ بۆچوون** (کتن،کتپ) [1] dil bo çûn

بەدڵ بوون، پەسندکردن.

**دڵ بۆچوون** (کتپ) [2] dil boçûn

ئارەزووکردن، حەزلێ کردن.

**دڵ بۆسووتان** (کتن) dil bo sûtan

ئاگر (بۆکەسێ تێ بەربوون، چوونەگیان بۆکەسێ)، بەزەیی پێداهاتنەوە.

**دڵ بە جێ هێنان** (کتپ) dil becêhênan

ئارەزووی دڵ بەئەنجام گەیاندن، ڕازیی کردن، ویستی کەسێ جێبەجێ کردن.

**دڵ بە خوێن** (ئان) dil bexwên

جگەرخوێن.

**دڵ بە دڵی کەسێکەوەنان** (ئد)

dil be dilî kesêkewenan

دڵ بەدڵەوەنان، لەگەڵدا(ڕێکەوتن، گونجان).

**دڵ بە دنیا** (ئان) dil be dinya

دڵ بەدنیاخۆش، شادبەژیان.

**دڵ بە دوا** (ئان) dil be dwa

ناهومێد، نیگەران.

**دڵبەر** (ن،ئان) [1] dilber

دلبەر، دولبەر، دلوەر، دڵ ڕفێین، دایلان، دۆست.

**دڵبەر** (ئان) [2] dilber

دڵ بۆخۆبەر، حەزناوەر، دڵڕفێن، دڵفڕێن.

**دڵ بە ڕایی دان** (کتن) dilberayîdan

چاو بەڕایی (هاتن، دان).

**دڵ بەرد** (ئان) dil berd

دڵ ڕەق.

**دڵ بەست** (ن) dilbest

ئاشقیی، ئەڤینداریی، ئەوین.

**دڵ بەستە** (ئان) [1] dilbeste

ئارەزوومەند، پڕتاسە، دڵ پێوەبوو، چاو لەدووی شتێ یان مەبەستێ.

**دڵ بەستە** (ئان) [2] dilbeste

دڵبەند، گراویی، ماشقە.

**دڵ بەسیان** (کتن) dilbesyan

تێرخواردن، دڵ پڕبوون، گەدەپڕ بوون ودەست لە خواردن هەڵگرتن.

**دڵ بەسیی** (ن،پز) dilbesî

ئینتەلا.

**دڵ بەیان** (ن) dilbeyan

بێز، قێز.

**دڵ بەیەکاهاتن** (کتن) dilbeyeka hatin

دڵ(پێکاهاتن، پیاکاهاتن،خراپ بوون، تێکچوون، تێک هالان، تێک هەڵاتن، تێکەڵاتن، زڤڕان، زڤڕیین،

شیوان، کازیین، ماتنەیەکدا، هەڵ شیوان)، هێلنج دان.

**دڵ بەیەکەوەبوون (کتن)** dil̲beyekewe bün
بوون بە(دلخوازی یەکتر، هاودڵداری یەکتر)، حەز لەیەک کردن، دڵ چوونە یەکتریی.

**دڵ بەیەکەوە نووسان (ند)**
dil̲beyekewe nüsan
بەیەک قایل بوون، ڕێک کەوتن، سەربەسەری یەکەوەنان.

**دڵ پاک (ئان)١** dil̲ pak
بێ(فروفێل، گزیی)، دڵ(پاقژ، خاوێن، فەکریی، ساف)، سینەساف، ڕاستگۆ.

**دڵپاک (ئان)٢** dil̲pak
خۆش(باوەڕ، بڕوا)، ساویلکە، سادە، بێگومان.

**دڵپاک (ئان)٣** dil̲pak
بێکینە، کەسێ کەزوویریی وتووڕەیی زۆر بەردەوام نەبێ و زوو لەبیری بچێتەدەر.

**دڵ پاک بوونەوە (کتن)** dil̲ pak bünewe
بڕوا(باوەڕ) بەپاکانەی کەسێکردن، کینەوگومان لەدڵدا نەمان، لەهەڵەی کەسێ بووردن، ڕیزی لەدڵدانەمان.

**دڵپاکیی (ن)** dil̲pakî
بێخەوشیی، دڵ(پاقژیی، خاوێنیی، سافیی)، ساویلکەیی.

**دڵ پتەوکردن (کتپ)** dil̲pitew kirdin
پاڵ پێوەنان.

**دڵپڕ (ئان)١** dil̲pir̲
خەفەتبار.

**دڵپڕ (ئان)٢** dil̲pir̲
بێ ئیشتیا(لەبەرتێریی..).

**دڵپڕ (ئان)٣** dil̲pir̲
کەسێ کەئەوەندەی خواردبێ وسەردڵی کەوتبێ.

**دڵپڕ (ئان)٤** dil̲pir̲
دنیا لەبەرچاوکەوتوو، دڵ تژیی، ڕووخاو(دەروون).

**دڵپڕ (ئان)** dil̲pir̲
قین گرتوو.

**دڵ پڕبوون (کتن)١** dil̲pir̲bün
دڵ تەنگ بوون.

**دڵ پڕبوون (کتن)٢** dil̲pir̲bün
زۆر خواردن، زیادەخۆریی کردن.

**دڵ پڕبوون (کتن)٣** dil̲pir̲bün.
تووڕەبوون.

**دڵ پڕلەئاوات (ئان)** dil̲pir̲bün
گەشبین، ئالگۆن، خۆشنوود.

**دڵ پڕلەخوێن (ند)** dil̲pir̲xwên
خوێن لەدڵ تکان، خەفەتی زۆر لەدڵداهەبوون، دڵ خوون، (id.) خەمگین.

**دڵ پڕلەقین (ئان)** dil̲pir̲ le qîn
دڵ ڕەش.

**دڵ پەرت (ن)** dil̲ pert
خەیاڵ پلاو.

**دڵ پەرتیی (ن)١** dil̲ pertî
خەیاڵ پلاویی، ناخاترجەمیی.

**دڵ پەرتیی{کەسێ} (ئان)٢** dil̲ pertî (kesê)
خەمبار، دڵ (ناڕەحەت، سووتاو).

**دڵ پەرێشان (ئان)** dil̲ perêšan
دڵ پەرت، دڵخورد، ناخاتر جەم.

**دڵ پەسند (ئان)** dil̲ pesind
دڵگیر، دڵگر، خۆشەویست.

**دڵ پیا(پێدا)چوون (کتپ)** dil̲ piya(pêda) çün
ئارەزووکردن، پەسندکردن، حەزلێ کردن.

**دڵ پیر (ئان)** dil̲ pîr
دڵ (تەنگ، مردوو).

**دڵ پیس (ئان)١** dil̲ pîs
دڵ(چەپەڵ، خار، خراپ، خەراپ، کرمۆڵ، کرمێ، گەمار)، بەدگومان، بەشک، گومانکەر، بەگومان، گوماندار، هزر خراپ، هەزرخراو. دژ: دڵ(پاک، ساف)، هزرپاش.

**دڵ پیس (ئان)٢** dil̲ pîs
بەدخوا، بەدخواز، دڕدۆنگ.

**دڵ پیس کردن (ند)** dil̲ pîs kirdin
بیروهەزری خراپ لێ کردن، لێ(بەدگومان بوون، دوودڵ بوون.

**دڵ پیسیی (ن)١** dil̲ pîsî
بەدخوازیی، بەدخوایی.

**دڵ پیسیی (ن)٢** dil̲ pîsî
بەدگومانیی، دڵ (چەپەڵیی، خراپیی، خەراویی)، دوودڵیی لەکەسێ.

**دڵ پیسیی (ن)٣** dil̲ pîsî
بیرخراپیی، دڕدۆنگیی، هەزرخراپیی، دڵ (ڕەشیی، کرمنیی، کرمۆڵیی، کرمێتیی).

**دڵ پێ دان (ند)** dil̲ pêdan
ئەوین بۆهەبوون، حەزلێ کردن، خۆش ویستن.

دڵ پێ سووتان (ئد) diḻ pê sütan
بەزەیی‌پیا(پێدا) هاتنەوە، بەزەیی پێداهاتنەوە، بەزەیی هاتنەوە بەکەسێکدا.

دڵ پێک (ئان) diḻ pêk
دڵ(ئەنگیو، هەنگیو)، کاریگەر لەدڵ.

دڵ پێکان (ئد) diḻ pêkan
١- دڵ(ئەنگاوتن، هەنگیوتن)،لەدڵ دان، لەناوجەرگە دان. ٢- لەناوەڕاستی نیشانەدان.
٣- پێوەگرفتاربوون، زۆرخۆش ویستن، حەز لێ کردن.

دڵ پێکاهاتن (کتن) diḻ pêkahatin
دڵ بەیەکا هاتن.

دڵ پێکاو(ئان) diḻpêkaw
ئەنگیوراو، هەنگیوراو، گرفتار.

دڵ پێوەبوون (کتن،کتپ) ١ diḻpêwebün
خۆش ویستن، حەزلێ کردن.

دڵ پێوەبوون (کتن،کتپ) ٢ diḻpêwebün
ئارەزووکردن، ئیشتیاکردن، حەزلەشتێ کردن، دڵ (تێچوون، چوونەسەر)، پەسند کردن، ویستن.

دڵ تواندنەوە (کتپ) ١ diḻtwandinewe
کارتێ کردن، کاریگەربوون لەسەرکەسێ، بەلای خۆداهێنان و دڵ ڕاکێشان، سەوداسەربوون(یان کردن).

دڵ تواندنەوە (ئد) ٢ diḻtwandinewe
١-خەفەت پێدان. ٢- هەست بریندارکردن.

دڵ توانەوە (ئد) diḻtwanewe
چوونەدڵەوە، بەهەموو دڵێکەوە کەسێ خۆش ویستن.

دڵ توانەوە (ئد) diḻtwanewe
زەردو لاوازبوون لەغەمناکیی و دڵ تەنگیدا.

دڵ تەڕ (ئان) ١ diḻ teṟ
تەڕپۆش، خۆڕازێن، دەست بەخۆداهێنەر، کەسێ کە هەمیشە بەرگی جوان لەبەردەکا، مرۆڤێ کەحەز لەجل و بەرگی جوان بکات (ئەگەر چی تەمەن گەورەش بێ).

دڵ تەڕ (ئان) ٢ diḻ teṟ
ئەویندار بۆ کیژۆڵە وبۆ ڕابواردن(مرۆڤی گەورەسال).

دڵ تەزین (کتن) diḻ tezîn
دڵ سست بوون.

دڵ تەزێن (ئان) diḻ tezên
دڵ سستکەر (ڕووداو یان دیمەنی زۆر ناخۆش)، دڵ چڕین، خەم وخەفەت هاوەر.

دڵ تەمریی {کەسێ} (ئان) ١ diḻ temirî(kesê)
دڵ مردوو.

دڵ تەمریی (ئان،کی) ٢ diḻ temirî(ki)
پۆرخس، کەم پێکەنین، مروموچ، پۆرخز.

دڵ تەنا (ئان) diḻ tena
دڵ ئاسوودە، ئارخەیان.

دڵ تەنگ (ئان) diḻ teng
خەفەتبار، تەمین، سەخڵەت، خەمبار، خەمدار، زویر، زویر، دڵ ڕەش، زیز، مات، دڵگیریوو، دڵ(پڕ لەئەسرین، پڕ لەخەفەت، تەنگ).

دڵ تەنگ بوون (کتن) diḻ tengbün
ناجزبوون، تەم لەدڵ نیشتن، خەمباربوون، دڵگیربوون، زویربوون، پەشێوبوون، خەم داگرتن، دڵ گیران، نارەحەت بوون، دڵ پڕلەئەسرین بوون.

دڵ تەنگ کردن (کتپ) diḻ teng kirdin
ناجزکردن، دڵ ئێشاندن، زویرکردن.

دڵتەنگیی (ن) diḻtengî
ناجزیی، خەفەتباریی، خەمناکیی، خەمباریی، دڵ پڕیی، پەستیی، زویریی، زوێریی، زیزیی.

دڵ تێر (ئان) diḻtêr
بێ تەماع، چاوتێر.

دڵ تێک چوون (کتن) diḻtêkçün
هەست بەنەخۆشیی کردن.

دڵ تێکە ڵاتن (کتن) diḻtêkeḻatin
دڵ بەیەکاهاتن.

دڵ تێکەڵ هاتن (کتن) diḻtêkeḻ hatin
دڵ (مەڵ شێوان، تێک هاتن).

دڵ چڕ (ئان) ١ diḻ çiṟ
چرووک.

دڵ چڕ (ئان) ٢ diḻ çiṟ
بەدفەڕ، خەڵک ئازاردەر، مەردم ئازاردەر.

دڵ چڕێن (ئان) diḻ çiṟên
دڵ تەزێن.

دڵ چووزانەوە (کتن) diḻ çüzanewe
دڵ زۆر ئێشان، دڵگیربوون.

دڵ چووزێن (ئان) diḻ çüzên
تراجیدیی، دڵ وەتوێن.

دڵ چوون (کتن) diḻ çün
دڵ سست بوون، بوورانەوە.

دڵ چوونەسەر (ئد) ١ diḻ çüneser
دڵ (بردن، بۆچوون، لێچوون، تێچوون)، بەتاسەوە

بوون.

**دڵ چوونەسەر** (کتپ) ٢ dil çüneser

ئیشتیاکردن، تاسەکردن، حەزلێ کردن، دڵ بۆ چوون.

**دڵ چەپەڵ** (ئان) dil çepepl

دڵ پیس.

**دڵ چەڕاندن** (کتپ،کتن) dilçerandin

بەکەیفی خۆ(ڕابواردن، کردن)، خۆش ڕابواردن.

**دڵ چەرێن** (ئان) dil çerên

خۆڕابوێر، ئەهلی زەوق(کەسێ).

**دڵ چەسپ** (ئان) ١ dil çesip

دڵخوا، دڵ ڕاکێش.

**دڵ چەسپ** (ئان) ٢ dil çesip

پڕبەدڵ، جێگیربوو(لەدڵدا)، لەدڵداجێگیربوو، چەسپاو.

**دڵ چیچک** (ئان) dil çîçik

ترسنۆک، دژو: ئازا.

**دڵ خالیی**(ئان) dilxalî

هیچ نەخواردوو، ناشتا، سکی برسیی.

**دڵ خاوبوونەوە** (ند) ١ dil xawbünewe

نەرم بوون، باوەڕپێ کردن.

**دڵ خاوبوونەوە** (ند) dil xawbünewe

ئارەزووی خواردن نەمان، ئیشتیا نەمان.

**دڵ خاوبوونەوە** (ند) ٢ dil waxbünewe

تووڕەیی

(لەدڵدانەمان، بەسەر چوون)، ڕق نیشتنەوە.

**دڵ خواز** (ن) ١ dilxwaz

ئارەزوو، تاسووخ، تاسە، خواهیش.

**دڵ خواز** (ن) ٢ dilxwaz

ئامانج، ئاوات، خواست، سەرکە، ویست، هەویا، هیوا.

**دڵ خواز** (ن) dilxwaz

(ئەوەی دڵ ئارەزووی دەکات)، دڵخاز، دڵخوا، دڵها، دڵیان، شتێ کەدڵ ئارەزووی بکات.

**دڵ خوازتن** (کتپ) dilxwaztin

دڵ خواستن، ویستن.

**دڵ خوازتە** (ن) dil xwazte

دڵ خواستە، کاری خۆکردە.

**دڵ خوازیی** (ن) dilxwazî

ئارەزوو، دڵهای، هەوەس.

**دڵخورد** (ئان) dilxurd

دڵ (پەڕێشان، تەنگ، خۆر، خوەر، شکستە، مەن، مەند، گیربوو)، زویر، نیگەران.

**دڵخوردبوون** (کتن) dilxurdbün

دڵ خوەربوون، زویربوون.

**دڵخورد کردن** (کتپ) dilxurd kirdin

خەفەت پێدان، دڵ خوەرکردن، دڵگیرکردن، نیگەرانیی بەسەر هێنان.

**دڵخوردیی** (ن) dilxurdî

دڵخۆریی، دڵخوەریی، دڵ شکاویی.

**دڵخۆش** (ئان) dilxoš

بە(دەماغ، شەوق، کەیف)، پڕ(ئارەزوو، کەیف، مەیل)، دەماخ چاخ، خەنیی، شاد، شادمان، کامران، کامەران، هاش، بەدەوق، کەیف خۆش.

**دڵخۆش بوون** (کتن) dilxošbün

بە(دەماغ بوون، شەوق بوون)، پڕ مەیل بوون، خۆشیی کەوتنە دڵەوە، شادبوون، شادمان بوون، کەیف خۆش بوون، گەش بوونەوە، هاش بوون.

**دڵخۆش کردن** (کتپ) dilxoš kird

خۆشیی پێگەیاندن، تەسەلای دڵی کەسێ دان، دڵ (ئاف دان، ئاوڕشێن کردن).

**دڵخۆشکەرە** (ئان) dilxoškere

خەم ڕەوێن، شادادوەر، شتێ کەدڵ خۆش دەکات، کەیفاوەر، دڵ گوشادکەر، دڵ کەرەوە.

**دڵخۆشیی** (ن) dilxošî

خۆشیی دڵ، بەدەماخیی، بەکەیفیی، شادیی.

**دڵخۆشیی** (ن) dilxošî

دڵ نەوایی.

**دڵخۆشیی دانەوە**(کتپ) dilxošî danewe

دڵ نەوایی کردن.

**دڵ خوێن** (ئان) dilxwên

دڵ خوێن، زۆرخەمگین.

**دڵ خوێناویی** (خ.) dilxwênawî

کۆست کەوتوو، کەسێ کەیەکێکی بەم نزیکانە کوژرابێ لەلایەن دوژمنەوە (یان مردبێ).

**دڵ خەبەردان** (کتن،کتپ) dil xeberdan

بەدڵداهاتن، پێش زانیی کردن، پێشەکیی هەست پێ کردن.

**دڵ خەفەبوون** (کتن) dil xefebün

دڵ تەنگ بوون.

**دڵ داخوڕپان** (کتن) dil daxurpan

دڵ (داخوڕپیان، داکەفتن)، داکەوتن، ڕاچەنیین، شڵەژان)، ترسان، خوڕپەلێ کەوتن، هەناو کەوتنەخوارەوە، (بەهۆی هەواڵێکی ناخۆش) یان گرمەیەکی کتوپڕی چاوەڕوان نەکراو.

**دلدار (ن.ئان)** [1] dil dar
ئـازیز، ئاشـق، ئەویـنـدار، ماشـوق، دل( داگە، داو، لێ سەندراو).

**دلدار (ئان)** [2] dildar
ئازا، بەجەرگە، نەترس.

**دلداری (ن)** dildarî
ئەوین، دلخوازیی، ڤین.

**دل داکەوتن (کتن)** [1] dildakwetin
دل داخوریان.

**دل داکەوتن (کتن)** [2] dil dakwetin
حەز لێ کردن و بوون بەدلداری کەسێ.

**دل داکەوتن (کتن)** [3] dildakwetin
سەرنج لێ گرتن ولێ ورد بوونەوە.

**دل دان (ند)** dildan
دلداریی لەگەڵ کردن، حەزلێ کردن.

**دلداو (ن)** dildaw
دل داگە، شەیدا، ئەویندار، هسپن.

**دلدز (ن)** dildiz
دل سەندوو، گراویی، ماشقە.

**دلدزی (ن)** dildizî
پەنهانیی دل، نهێنیی دل.

**دل دەرچوون (ند)** dilderçûn
دل دەرهاتن، نارەحەت بوون.

**دل دەرهاتن (ند)** [1] dil derehatin
زۆربیری کەسێ کردن، سۆز بۆ کەسێ جوولان.

**دل دەرهاتن (ند)** [2] dilderhatin
هێلنج دان وخەریکی رشانەوەبوون.

**دل دەرهاتن (ند)** [3] dilderhatin
زۆر رشانەوەو پەکە کەوتن و خواردەمەنی هێنانەوە لەدەم را، دەم راپین.

**دل رابوون (کتن)** dilrabûn
رشانەوە( خواردەمەنیی ناوسک لەدەمەوە ).

**دل راکێش (ئان)** dilrakêş
دل( فرین، رفین ).

**دل راگرتن (ند)** dilragirtin
بەخۆشیی لەگەڵ رابواردن، تووڕەنەکردن، دلگیر نەکردن، دل نەشکاندن.

**دل راگیرکردن (ند)** dilragir kirdin
پارێزگاریی دلی کەسێ کردن لەزویربوون، چاودێریی هەستی کەسێ کردن.

**دل رفاندن (ند)** dil rifandin
دل ( فراندن، سەندن ).

**دل رفێن (ئان)** dil rifên
دل( بەر، رەڤێن، فرین، کر)، دولبەر، گراوی، ماشقە، دل نیشان.

**دل رن (ئان)** dilrin
داخ ئاوەر.

**دل روون (ئان)** dilrûn
دلخۆش.

**دل رۆیین (کتن)** dilroyîn
بێهـۆش کـەوتن، دل( بیـاوان بـوون، بـووریین)، بوورینەوە، بوورانەوە، بێهۆش بوون.

**دل رەش (ئان)** [1] dilreş
دل شکاو.

**دل رەش (ئان)** [2] dilreş
دل رەق.

**دل رەش (ئان)** [3] dilreş
دل پیس.

**دل رەش (ئان)** [4] dilreş
دل پڕ لەقین.

**دل رەش بوون (ند)** dilreşbûn
دل (رەق بـوون لەئاسـتی کەسـێ، لێ پـڕبوون، لێ رەنجان)، لێ دلگیربوون.

**دل رەق (ئان)** dilreq
دل( رەش، سـەخت، هـشک)، بـێ( بـەزەیی، بـەزە، رەحم، سۆز)، نامیهرەبان، زۆردار، زۆرکار..

**دل رەقی (ن)** dilreqî
دل (رەشـی، سـەختیی، هـشکیی)، زۆرداریـی، نامیهرەبانیی، بێبەزەییتیی.

**دل رەنجان (کتن)** dilrenjan
دل( ئێشان، شکان، شکیان، گران بوون، گیربوون، لێ رەش بوون، پەشان)، زویربوون.

**دل رەنجاندن (کتپ)** dilrenjandin
دل (ئێشاندن، ئـازاردان، شـکاندن، شـێلاندن، گـران کـردن)، دلگیرکـردن، ئەزیـەت دان، رەنجانـدن، زویرکردن، نارەحەت کردن.

**دل رەنجاو (ئان)** dilrenjaw
دل شکاو، رۆژرەش.

**دل رێش (ئان)** [1] dilrêş
ئەنگە کراو، تێشکاو.

**دل رێش (ئان)** [2] dilrêş
خەفەتبار.

**دڵ زراڤ** ( ئان.کی ) dilzirav(ki)
ترسنۆک.

**دڵ زیندوو** ( ئان ) dilzîndü
١- دڵاوەدان، دڵ ئاوەدان.
٢- دڵ زیندیی، وریا، وشیار

**دڵ سادە** ( ئان ) dilsade
دڵ پاک.

**دڵ سارد** ( ئان ) ١ dilsard
بێ( ئـارەزوو، مـەیل، هیـوا )، دڵ سـار، ناهومێـد، نائومێد.

**دڵ سارد** ( ئان ) ٢ dil sard
لێ ( دوو دڵ، پەشیمان، ڕاڕا ).

**دڵ سارد{لە کارێک}** ( ئان ) ٣ dil sard (le karêk)
دڵ سەرد، ساردوسڕ ( لەئیشێ ). دژ: سوور.

**دڵ ساردبوونەوە** ( کتن ) ١ dil sardbünewe
هێمن بوونەوە، هێدی بوونەوە.

**دڵ ساردبوونەوە** ( کتن ) ٢ dil sardbünewe
لێ پەشیمان بوونەوە،پاشگەزبوونەوە.

**دڵ ساردکردنەوە** ( کتپ ) ١ dil sardkirdinewe
هێمن کردنەوە، هێدیی کردنەوە.

**دڵ ساردکردنەوە** ( کتپ ) ٢ dilsard kirdinewe
پاشگەز کردنەوە، پەشیمان کردنەوە، دوودڵ کردن.

**دڵ ساردیی** ( ن ) dil sardî
بێ( ئـارەزوویی، مـەیلیی )، نائومێـدیی، ناهومێـدیی، سارد وسڕیی ( لەکارێکدا ).

**دڵ ساز** ( ئان ) dilsaz
ڕەزامەند، قایل.

**دڵ ساف** ( ئان ) dil saf
دڵ پاک.

**دڵ سفرە نییە بۆ هەموو کەسێ بکرێتەوە** ( پن )
dil sifre niye bo hemü kesê bikrêtewe
پیاو ناتوانێ ڕازی دڵی خۆی لای هەموو کەسێ بڵێ.

**دڵ سوتان** ( کتن ) dil sütan
بەتەنگەوە هاتن، بەزەیی( پێدا ) هاتن، بەزەیی( پیا ) هاتنـەوە، دڵ( بـۆ )سـووتیان، دڵ شـەوتیین، ڕۆحـم کردن، ڕەحم( پێ ) کردن.

**دڵ سووتاو** ( ئان ) ١ dil sütaw
کەس لێ مردوو، جەرگ براو.

**دڵ سووتاو** ( ئان ) ٢ dil sütaw
بـە( بـەزەیی، ڕەحـم )، دڵ( سـووتیاگ، سـۆتی )، زۆر بەتاسە، پڕ بەزەیی.

**دڵ سووتێن** ( ئان ) dil sütên
دڵ ناڕەحەتکەر.

**دڵسۆز** ( ئان ) ١ dilsoz
دلسۆز، دڵ نەرم، بەتەنگەوە هاتوو، خاوەن بەزەیی، خەمخوار، میهرەبان، دەردەەر، بەپەرۆش، پەرۆشدار، بەزەییدار، پڕ بەزەیی.

**دڵسۆز** ( ئان ) ٢ dilsoz
دەریاپست ( بەوەفا ).

**دڵسۆزانە کار کردن** ( ئد ) dilsozane kar kirdin
دەغەڵیی لەکاروباردا نەکردن.

**دڵسۆزبوون** ( کتن ) dilsozbün
بەتەنگەوە هاتن، بەپەرۆش بوون،
جەرگ بۆ ژان کردن، گوێ پێدان.

**دڵسۆزیی** ( ن ) dilsozî
بەزەیی، بەزەویی، دڵسۆزیی، میهرەبانیی.

**دڵ سەخت** ( ئان ) dilsexit
دڵ ڕەق.

**دڵ سەرئاو کەوتن** ( ئد ) dilseraw kewtin
ڕق هەسـتان وتابوشـت نـەمان، زۆر توورەبـوون، دڵ ( کـەف چەنـدن، کـەف کـردن )، تابوشـت نـەمان لەحیرساندا.

**دڵ سەرکردن** ( ئد ) dilserkirdin
دڵ سەر ئاو کەوتن.

**دڵ سەندن** ( ئد ) ١ dil sendin
مۆگری خۆ کردن.

**دڵ سەندن** ( ئد ) ٢ dil sendin
دڵ بەرەوخۆ ڕاکێشان، دڵ بردن.

**دڵ سیە** ( ئان.کل ) dil siye(ki)
بێ ئیشتیا.

**دڵ سیە بوون** ( کتن.کل ) dil siyebün(ki)
دڵ نەبردن( خواردەمەنی ).

**دڵ شاد{دڵشاد}** ( ئان ) dil šad
دڵشا، دلواز، بەئارەزووگەیشتوو، سەرودڵ خۆش.

**دڵ شادبوون** ( کتن ) ١ dil šadbün
دڵ( شادەوەبوون، کرانەوە )، سەرودڵ خۆش بـوون، بە ئارەزوو گەیشتن.

**دڵ شادبوون** ( کتن ) ٢ dil šadbün
پێخۆشحاڵ بوون، شادمان بوون، دڵ گەشانەوە.

**دڵ شادکردن** ( کتپ ) dilšadkirdin
دڵ( خۆش کردن، کردنەوە، شادەوەکردن، شادەو کردن )، سەرودڵ خۆش کردن.

**دڵ شادکەر** (ئان) dil šadker
دڵ شاکەر، دڵخۆشیی هێن، کەیفدەر.
**دڵ شادیی** (ن) dil šadî
دڵ کراوەیی، شادمانیی، سەروودڵ خۆشیی.
**دڵ شکان** (کتن) dil šikan
دڵ ڕەنجان.
**دڵ شکاندن** (کتپ) dil šikandin
دڵ ڕەنجاندن.
**دڵ شکاو** (ئان) ١ dil šikaw
ئاجز، ئەزیەتدراو، ڕەنجاو، ڕەنجیاگ، زیز، هەست ئازاردراو، بینەویەرەپێ کراو، دڵ(ئیشاو، ڕەنجاو، شکستە، گران، مای، ئیشاندراو).
**دڵشکاو** (ئان) ٢ dilšikaw
ناڕازیی لەژیان، خۆشیی ژیان نەویست، دڵ(مردوو، مردە).
**دڵ شکاویی** (ن) dil šikawî
ئاجزیی، دڵ شکستیی، دلازاریی، هەستی بریندارکراو.
**دڵ شکێن** (ن) dil šikên
دڵ (ئازاردەر، ڕەنجێن)، هەست ئازاردەر، جارسکەر.
**دڵ شەق بردن** (ند) dil šeq birdin
ئارام(لەبەربڕان، لێ بڕان)، نارەحەت بوون.
**دڵ شێر** (ئان) dil šêr
بوێر.
**دڵ فراوان** (ئان) ١ dilfirawan
بە(پشوو، حەوسەڵە)، لەسەرخۆ، پشوودرێژ.
**دڵ فراوان** (ئان) ٢ dilfirawan
دڵ گوشاد، مەردەمێر، (بەر)چاوتێر.
**دڵ فراوان** (ئان) ٣ dilfirawan
١- چاوپۆشیکەر، لێبوردە.
٢- هێمن ولەسەرخۆ، کەم تووڕە.
**دڵ فراوانیی** (ن) ١ dilfirawanî
خۆگریی، لەسەرخۆیی، هێمنیی.
**دڵ فراوانیی** (ن) ٢ dilfirawanî
سەخاوەت، ئەورەنگ.
**دڵ فرەبوون** (کتن) dilfirebün
بەچیکلدانەبوون، پشووخواردنەوە، خۆگرتن، دڵ هەڵگرتن(بەرامبەر ناهەمواریی..).
**دڵفرێن** (ئان) dilfirên
جوان وسەرسامکەر، دڵپیک، ڕاکەش، کێشەر، دڵ (ڕاکێش، نیشان، سێن).

**دڵ فینک بوونەوە** (ند) dilfênik bünewe
تەسەلاهاتن.
**دڵ قاییم** (ئان) dilqayîm
ورە(بەرز، بەهێز)، خۆگر، ترس کارلێ نەکەر (مرۆڤ).
**دڵ قاییم کردن** (کتپ) dilqayîm kirdin
زات نانەبەر (کەسێ).
**دڵ قرچیان** (کتن) dilqirçyan
بیر کردن، بیری کەسێ کردن.
**دڵ کرانەوە** (کتن) dilkiranewe
پەستیی وماتیی ڕەوینەوە، دڵ(خۆش بوون، کریانەوە، گوشاد بوون، وازبوون)، ڕۆشنایی کەوتنە دڵ و دەروونە گوشاد بوون، وازبوون)، ڕۆشنایی کەوتنە دڵ و دەروونە
**دڵ کراوە** (ئان) ١ dilkirdawe
بەرفەرەح، بەراوەڵە.
**دڵ کراوە** (ئان) ٢ dilkirdawe
شاد، شادمان، کەیف خۆش.
**دڵ کردن بەئاو** (ند) dilkirdin be aw
کار لەدڵی مرۆڤ کردن.
**دڵ کردنەوە** (کتپ) dilkirdnewe
دڵشاد کردن.
**دڵ کرمێ بوون** (کتن) dilkirmê bün
گومان (پەیداکردن، هەبوون) لەکەسێ.
**دڵ کلافە بوون** (کتن) dilkilafe bün
دڵ (تەنگ، خەفە، گران)بوون، دڵ داگیریان، دڵخووربوون.
**دڵ کورکان** (کتن،کتپ) dilkurkan
دڵ(بۆلێدان، کورکیان)، ئارەزوولێبوون، هەوەس (کردن، لێبوون).
**دڵ کەچک** (ئان) dilkeçik
بێ(جەرگ، دەسەڵات، غیرەت).
**دڵ کەف کردن** (ند) ١ dilkef kirdin
ڕق هەستان وخۆپێ نەگیران، بێ تاقەت وبێ ئارام بوون (لەکردار یان ڕەفتاری کەسێ).
**دڵ کەف کردن** (ند) ٢ dilkef kirdin
نارەحەت بوون.
**دڵ کەوتنە مۆڵەقە** (ند) ١ dilkewtine moleqe
دڵخوردە ومەترسیی پەیداکردن.
**دڵ کەوتنە مۆڵەقە** (ند) ٢ dilkewtine moleqe
١- هەست بەئازاریکی زۆر کردن. ٢- گینگڵ دان.

**دڵ گران بوون** (کتن) ١ dilqiranbün
دڵ ڕەنجان.
**دڵ گران بوون** (کتن)٢ dilqiranbün
دڵگیربوون، زیزبوون، لاڵووت بوون.
**دڵ گرتن** (کتن) ١ dilgirtin
خەمناک بوون، غەمگین بوون.
**دڵ گرتن** (کتپ) ٢ dilgirtin
دڵ ڕاکێشان.
**دڵ گۆڕین** (ئد) dilgorîn
١- یاریکی دیکەگرتن.
٢- بیروڕاگۆڕین، لێ پەشیمان بوونەوە، یاریکی تر گرتن، پاشگەزبوونەوە(لەدۆخی جاران).
**دڵ گوشران** (کتن) dilgušran
خەفەتباربوون.
**دڵ گەرد گرتن** (ئد) dilgerd girtin
قسەی کەسێ لەدڵ گرتن، بەئاخاوتنی خەڵک زیزبوون، زویربوون لە (کار، کردەوە یان ڕەفتاری کەسێ).
**دڵ گەرم** (ئان) ١ dilgerm
بەتاسە، پرتاسە، چێ، سەرگەرم(لەکاریکدا).
**دڵ گەرم** (ئان) ٢ dilgerm
دڵ (پڕ لەئێش، ئازار، داخ، جۆش).
**دڵ گەرمیی** (ن) ١ dilgermî
دڵخۆشیی، سەرگەرمیی (لەکاریکدا).
**دڵ گەرمیی** (ن) ٢ dilgermî
زویریی.
**دڵ گەرمیی** (ن) ٣ dilgermî
خورتیی، نەترە، پرکێشیی.
**دڵ گەش** (ئان) dilgeš
دڵ(بەهومێد، خۆش)، دڵ پڕ لە(هومێد، هیوا)، بەهومێد، پرهیوا، هیوادار.
**دڵ گیر** (ئان) ١ dilgîr
١- دڵ کەرەوە، خۆش، خۆش وبەربەرەڵا، خۆش دیمەن (جێگا، شوێن، چاوەنداز).
٢- جوان، دڵکێش(مرۆڤ).
**دڵگیر** (ئان) ٢ dilgîr
پەست، زویر، زیز، دمۆ، دڕدۆنگ.
**دڵگیر** (ئان) ٣ dilgîr
دڵ (تەنگ، ناخۆش).
**دڵگیران** (کتن) ١ dilgîran
دڵ تەنگ بوون.
**دڵگیران** (کتن) ٢ dilgîran
خواردن پێ نەخواردن، ئیشتیا گیران.
**دڵگیران** (کتپ) ٣ dilgêran
چاوونارەزوو بۆ خواردن گیران، حەز بۆ خواردن گیران.
**دڵگیربوو** (ئان) dilgîrbün
تووڕە.
**دڵگیربوون** (کتن)١ dilgîrbün
تووڕەبوون.
**دڵگیربوون** (کتن)٢ dilgîrbün
تۆران.
**دڵگیرکردن** (کتپ) ١ dilgîrkirdin
تووڕەکردن.
**دڵگیرکردن** (کتپ) ٢ dilgîr kirdin
پەست کردن.
**دڵگیریی** (ن) dilgîrî
پەستیی، دڵ(گرانیی، ناخۆشیی، زویریی).
**دڵ لەخۆبوونەوە** (ئد) dil le xobünewe
بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە.
**دڵ لەدڵ دان** (کتن)١ dil le dildan
دلاودڵ بوون، دوودڵیی کردن، دلاودڵیی کردن.
**دڵ لەدڵ دان** (کتن)٢ dil le dildan
دڵە ڕاوکێ کردن.
**دڵ لەدڵ نەدان** (ئد) ١ dil le dil nedan
دڵنیابوون.
**دڵ لەدڵ نەدان** (ئد) ٢ dil le dil nedan
دڵخورد نەبوون، هەمووشت بەدڵی کەسێ بوون، گەیشتنەمەرامی خۆ.
**دڵ لەدوا** (ئان) dil le dwa
چاو لەدوا، چاوە دوا، چاوەو دوا، چاو لەدوو، دڵەدوا، ئومێدەوار.
**دڵ لەدوو بوون** (کتپ) dil ledübün
مرخ لێ خۆش کردن، ڕەچاوکردن، قرم لێ خۆش کردن.
**دڵ لەرزان** (کتن) dil lerzan
ترسان.
**دڵ لەرزۆک** (ئان) dil lerzok
ترسنۆک.
**دڵ لەسەرخۆچوون** (کتن) dil leserxoçün
بێ هۆش کەوتن.

**دڵ لەسەر لەپێ دەست بوون (ئد)** dil leser desbûn
خۆ بەخت کردن لەپێناوی ئامانجێکدا، لەپێناوی مەبەستێکدا ئامادەی مردن بوون.

**دڵ لەمشتدابوون (ئد)** dil lemišt da bûn
چاوەچاوی قەومانی ڕووداوێک بوون، لەوەترسان کەشتێ ڕوویدات، پێشبینیی ڕوودانی بفەکردن.

**دڵ لێ دان (کتن)** dil lêdan
دڵ پەلەپەل کردن.

**دڵ لێ ڕەش بوون (ئد)** dil lê reşbûn
دڵ (لەئاستی کەسێکدا ڕەق بوون، لێ ڕەنجان)، لەکەسێ دلگیربوون.

**دڵ لێ سەندن (ئد)** dil lê sendin
حەزوئارەزووی کەسێ ڕاکێشان، خۆشەویستیی کەسێ وەدەست هێنان، دڵ بۆ خۆ (بردن، هێنان).

**دڵ لێ نان (ئد)** dil lênan
بەخت کردن، وازلەئارەزوو وسوودی خۆ هێنان لەپێناوی شتێ یان کەسێکدا.

**دڵ لێ هەڵکەندران (ئد)** dil lê helkendran
لەبەر یان لەپێش چاوکەوتن، دڵ لێ (بێزران، هەڵ کەنران).

**دڵمان یەک بوو (رس)** dilman yek bû
کاتێ دەووترێ کەدووکەس هەمان شت بڵێن لەهەمان کاتدا.

**دڵ مردوو (ئان)** dilmirdû
بێدڵ، دڵ(تەمری، مردگ، مردە، مریی)، کەسێ کە (ئارەزووی نەبێ لەخۆشیی وجوانیی، بەتەنگ جوانیی و ڕازاندنەوەنەبێ وگوێ بەجل وپۆشاکی خۆنەدات)، مرۆڤێ کەدڵی بەدنیا خۆش نەبێ.

**دڵ مردەکردن (کتپ)** dil mirde kirdin
بێ(ئومێدکردن، هیواکردن)، هیوا(پێ بڕین، پێ نەهێشتن).

**دڵ مەند (ئان)** ١ dil mend
دڵ(ئێشاو، ڕەنجاو، گران، مەن).

**دڵمەند (ئان)** ٢ dil mend
وریاو ژیر، هێمن ولەسەرخۆ.

**دڵمەندبوون (کتن)** dil mendbûn
بەتەنگ دڵی خەڵکەوە هاتن، هەستی خەڵک ڕاگرتن.

**دڵ نەبردن (ئد)** dilnebirdin
ئیشتیا لێنەبوون، بێ ئیشتیابوون، حەز لێ نەکردن (لەخواردن).

**دڵ نەخواز (ئاک)** dilnexwaz
دڵ نەویست، بێ مەبەست.

**دڵ نەرم (ئان)** ١ dil nerim
بەزەییدار، پڕبەزەیی، دڵۆڤان، سوەیبە.

**دڵ نەرم (ئان)** ٢ dil nerim
ناسک، نەرم(هەست)، ڕازراف، ڕانەرم، میهرەبان.

**دڵ نەرم بوون (کتن)** ١ dil nerimbûn
قایل بوون،مل دان.

**دڵ نەرم بوون (کتن)** ٢ dil nerimbûn
بەزەیی جوولان،سۆز جوولان.

**دڵ نەرمیی (ن)** dil nerimî
دلۆڤانیی، بەزەیی.

**دڵ نەوا (ئان)** dil newa
پڕ بەزەیی.

**دڵ نەوایی (ن)** dil newaî
دلجۆیی، دڵ لاوێنیی، دلەدلە.

**دڵ نەوایی کردن (کتپ)** dil newaî kirdin
بەسەرداهاتن، باوەڕپێدانەوە، پەژارە لەبیر بردنەوە، خەفەتی کەسێ ڕەواندنەوە، دڵ ئاشت کردنەوە، دلجۆیی کردن، دلخۆشیی دانەوە، دڵ دانەوە، دلەدلی کردن، دڵ هێنانەجێ، هێنانەوە سەرخۆ، دەلالەت دان.

**دڵنیا (ئان)** ١ dilniya
ئاسوودە، بارسووک، سەرسووک.

**دڵنیا (ئان)** ٢ dilniya
گەشبین، چاک نەخشە.

**دڵنیا (ئان)** ٣ dilniya
بێ (خەم، دلاودل، گومان)، خاترجەم، دڵ(ئارام، ڕەحەت)، دلارام.

**دڵنیابوون (کتن)** dilniyabûn
بێ(خەم بوون لەشتێ، گومان بوون، مەترسیی بوون)، خاترجەم بوون، یەک دڵ بوون، ئاسوودەبوون، پاڵ لێدانەوە، پشتێ لێ کردنەوە.

**دڵنیا کردن (کتپ)** dilniya kirdin
خاترجەم کردن، گومان لەدڵدانەهێشتن،یەک لاکردنەوە.

**دڵنیایی (ن)** ١ dilniyaî
بەرداربوونیی، ڕەزامەندیی، قایلیی.

**دڵنیایی (ن)** ٢ dilniyayî
بێ(خەمیی، دلاودلیی، گومانیی)، خاترجەمیی، پشت ئەستووریی.

**دلۆ** (ن) dilo
تەڵەزمی پچووک لەپیست، پێستی لەبنی نینۆکە هەڵی دابێ، زیلو.

**دلۆپاندن** (کتپ) dilopandin
تکاندن، تکانن( بەهۆی تینی گەرماوە ).

**دلۆپە** (ن) ¹ dilope
تکە، دڵۆپ، دڵۆپە، دکە، دکە، زەنگوڵ، تنۆکە، تنۆکە.

**دلۆپە** (ن) ² dilope
قسەلەناو قسەدا، هەڵقورتە( ئاخاوتن ).

**دلۆپە تێداکردن** (ئد) dilope têda kirdin
خۆ لەئاخاوتنی خەڵکدا هەڵقورتان، قسە لەناو قسەدا کردن.

**دلۆپە دادان** (کتن،کتپ) dilope dadan
دلۆپەکردن.

**دلۆپە کردن** (کتن،کتپ) dilope kirdin
دلۆپەدادان، دلۆپاندن، تکەکردن، لیک کردن.

**دڵ ودەروون** (ن) ¹ dil w derûn
هەناو، ناخی دەروون.

**دڵ ودەروون** (ن) ² dil w derûn
زەمیر، ویژدان.

**دڵ وریا** (ئان) dil wirya
دڵ زیندوو، هوشیار، بەپارێز.

**دڵ وەڕزبوون** (کتن) dil weriz bûn
نارەحەت بوون.

**دڵ وەستان** (کتن) dil westan
دڵ ڕاوەستان، کتوپڕمردن، لەپڕ مردن، بەدڵەکێێ مردن، بەمەرگی مفاجات مردن.

**دڵە تەپێ** (ن،پز) ¹ dile tepê
دڵە خورپێ.

**دڵە تەپێ** (ن) ² dile tepê
شەرم، شەرم وشکۆ.

**دڵە تەپێ** (ن) ³ dile tepê
ترس، ترسولەرز، دڵە(لەرزە،گورپێ، لەرزێ).

**دڵە خورپێ** (ن) ¹ dile xurpê
نیگەرانیی.

**دڵە خورپێ** (ن،پز) ² dile xurpê
دڵە(تەپە، تەپێ، ڕەپێ، کوتە، کوتێ، گورپە، لەرزە، گورپێ، لەرزێ لەبەر (ترس، شەرم، خۆشیی، یان ناخۆشیی ).

**دڵە خورت** (ن) dile xurt
هێزی دڵ.

**دڵە ڕاوکێ** (ن) dile rawkê
دوو دڵیی.

**دڵە ڕاوکێ کردن** (کتن) dile rawkê kirdin
دڵاودڵیی کردن.

**دڵەک بردن** (کتن،کل) dilek birdin(kl)
سەرسم دان، هەڵنووتان لەپەو ڕووکەوتن.

**دڵە کزە** (ن،پز) dile kize
دڵە کزێ، گەدەسووزش، دۆخی هەست کردن بە سووتانەوەی ژێر کوڵەکەی سنگ لە ئاکامی هێلنجدانەوەی ترشەڵۆکی گەدە بۆ ناوگەروو.

**دڵە کوتە کردن** (کتن) dile kute kirdin
دڵە خورپێ کردن، یەک لەسەریەک دڵ لێدان.

**دڵ هاتنەوە جێی خۆ** (ئد) dil hatinewe cêy xo
زیزی یان زویریی لەدڵدانەمان بەرامبەر..

**دڵە هەزارە کردن** (ئد) ¹ dile hezare kirdin
چاو هەزارەکردن، خەوڵێ نەکەوتن( بەهۆی ترس، خەفەت، نارەحەتیی دەروونیی ).

**دڵ هەزارەکردن** (ئد) ² dil hezare kirdin
مەترسیی هەبوون.

**دڵ هەڵکەندران** (ئد) dil helknran
دڵ لێ هەڵکەندران.

**دڵ هەڵگرتن** (ئد) ¹ dil helgirtin
قابیل بوون، ڕازیی بوون.

**دڵ هەڵگرتن** (ئد) ² dil helgirtin
پشوو( خواردنەوە، هەبوون)، خۆگرتن.

**دڵ هەڵ نەگرتن** (ئد) ¹ dil hel ne girtin
پێ نەخواردن، تێربوون،چی دی خواردەمەنیی پێ نەخواردن.

**دڵ هەڵ نەگرتن** (ئد) ² dile hel negirtin
نەچوونە ژێربار.

**دڵ هەڵ نەگرتن** (ئد) ³ dil hel negirtin
بەرگەنەگرتن، بێ (وزە، هێز) بوون.

**دڵ هێشتن** (کتپ) dil hêştin
ناجز کردن، دڵ(ئازاردان، شکاندن، نارەحەت کردن ).

**دڵ هێنان** (ئد) ¹ dil hênan
بەبەزەیی بوون، دڵ هەڵگرتن.

**دڵ هێنان** (ئد) ² dil hênan
نەجوولان وپێخۆش بوون (لەهەڵوێستیکدا ).

**دڵ هێنانە جێ** (کتپ) dil hênanecê
دڵ نەوایی کردن.

**دڵ هێنانەوەجێ (کتپ)** dil hênanewecê
ئاشت کردنەوە، زیزیی یان زویریی لەدڵی کەسێکدا نەهێشتن.

**دلاوەر (ئان)** dilawer
بوێر، دڵ شێر، دوێر، ڕەشید، گەرناس، نەترس.

**دلاوەریی (ن)** dilawerî
دلێریی.

**دڵ بجێ (ئان)** dil bicê
ئاسوودە، دوورلەنیگەرانیی.

**دڵ بژۆک (ن)** dilbijok
ئارەزووکەر، لەدووگەڕ.

**دڵ لێ چوون (کتپ،کی)** dil jêçün
دڵ لێ ڕەنجان، لەبەر دڵ(چاو)کەوتن، خۆش نەویستن.

**دلمە (ئان)** dilme
سەخیی.

**دلواپەس (ئان)** dilwapes
نیگەران.

**دلۆرکردن (کتن)** dilor kirdin
قنگەو تلوور کەوتن(ڕاکشان)، ڕازان.

**دلۆڤان (ئان،کی)** dilovan(ki)
ماودەم، دۆستی گیانی بەگیانیی، یاری وەفادار

**دلهان (ن)** dilhan
کەژ، فریەچەرمگێ، کەسێ کەڕەنگی پێستی وقژی و چاوی ڕەنگی سروشتیی ناتەواوبێ بەهۆی (هۆکاری بۆماوە)وە.

**دلە (ئان)** dile [1]
چلێس، نەوسن.

**دلە (ئان)** dile [2]
هەرزەکار.

**دڵ هشک (ئان،کی)** dilhišk(ki)
ڕووگرژ، مرومۆچ.

**دڵ هورە (ئان)** dil hure
شپرزە.

**دلێر (ئان)** dilêr
چاونەترس، پرکێش.

**دلێرانە (ئاک)** dilêrane
چاوقاییمانە.

**دلێریی (ن)** dilêrî [1]
ئازایەتیی.

**دلێریی (ن)** dilêrî [2]
بەجەرگیی، بێباکیی، ئاخوەوەندیی.

**دلێق (ن،رو)** dilêq
شیلان، دلیق، جلێق.

**دلیوان (ن)** dlîwan
تەبەنە، دەرزیی لیفەدروو(ن).

**دم (ن)** dim
کێر.

**دما (پ،ئاک،کی)** dima(ki) [1]
پاش، دوایی.

**دما (ن)** dima [2]
قنگ.

**دما (ن)** dima [3]
پشتەوە، دوا.

**دمازا (ن،لو)** dimaza(lu)
دوازا، پاشەبەرە.

**دمان (ن)** diman
کرێ.

**دمان کرن (کتپ،کی)** diman kirn(ki)
بەکرێ گرتن.

**دماوە (ئاک)** dimawe
پاشیی، دوای ئەم یان ئەو، لەپاش ئەو.

**دمایی (ئاک،کی)** dimayî(ki)
دوایی.

**دمایین (ئان،کی)** dimyîn(ki)
هەرەپاشیین، پاش هەموو.

**دمل (ئان)** dimil
ناوشان پان.

**دمەد (ن)** dimed
شیشی ڕست، توولّ (بۆ گەلا تووتن).

**دمەدم (ن)** dimedim
گرمەگرم، دەنگەدەنگ، دمبلی دمباو (دەنگی دەهۆل).

**دن (ج،ئان)** din
دیی.

**دنج (ئان)** dinc
ئاشیت، ئوودە، میهرەبان.

**دندان (ن)** dindan
دان.

**دندوک (ن)** dindük
دەنووک.

**دندوکە (ن)** dindüke
نووک، لای سەرووی شتێ، سەری تیژوبارێکی هەرشتێ.

باریکەلەیی.

**دندوکەدان** (کتن) ١ dindükedan

چەکەرە(کردن، دەرچوون).

**دندوکەدان** (کتن) ٢ dindükedan

شکۆفە وچلو دەرکردن.

**دنگ** (ن) ١ ding

نۆل.

**دنگ** (ن) ٢ ding

مستەکۆلە، مشت.

**دنگ** (ئان) ٣ ding

سەرخۆش، مەست.

**دنگ بوون** (کتن) ١ dingbün

سەرخۆش بوون، مەست بوون(لەبەر زۆر خواردنەوەی مەی).

**دنگ بوون** (کتن) ٢ dingbün

زگ هەلاوسان (لەبەر خواردنی زۆر)، تیرخواردن ورگ تیربوون.

**دنگچیی** (ن) dingçî

دنگ کوت، دەنگچیی، کەسێ کەبەدەسک ودیبەگ ساوەر یان برنج بکوتێ.

**دنگ کوت** (ن) ding kut

دەسکی دنگ.

**دنگ لێ دان** (کتپ) ding lêdan

دنگ کوت، دەنگچیی، مشت لێدان.

**دنگە** (ن) ١ dinge

جرنگە.

**دنگە** (ن) ٢ dinge

دونگە، دینگە، فیل پایە، پایە.

**دنە** (ن) dine

هانە، تاو، گال.

**دنەدان** (کتپ) dinedan

هاندان، هانەدان، هانەهان دان.

**دنەدەر** (ن) dineder

هاندەر، هانەدەر.

**دنیا** (ن) ١ dinya

دونیا، دنا، دنێ، جیهان.

**دنیا** (ن) ٢ dinya

چەرخی زەمان، دەوران، رۆژگار.

**دنیابووا** (ئپ،ئاک) dinyabü

ئەگەر هەلکەوت، بەشکا.

**دنیابەجێ هێشتن** (ئد) dinya becê hêştin

ناکام هاتن، گیان بەدەستەوەدان، مردن، مەرگ بۆ هاتن، بەلاداهاتن، گیان سپاردن، لەناوچوون، فەرمانی خودا بەجێ هینان.

**دنیا بەهەشتی کەرانە** (پن) •

dinya beheštî kerane

دنیا بەکامی گەوجانە. گەوجان بەختەوەرن. بلحان لەخۆش گوزەرانیدان.

**دنیاداریی** (ن) dinya darî

جیهانداریی، دونیاداریی، سەرگەرمیی بەپەیداکردنیی پێویستی ژیانەوە.

**دنیا دەوران دەورانە** (پن)

dinya dewran dewrane

١- دنیا هەمیشە هەروەک خۆی نابێ(نامینێ).

بەخت بێ بارە.

٢- چەرخی زەمان هەررۆژەی لەگەل یەکیکە.

**دنیادیدە** (ئان) dinyadîde

دنیادیەیە، خاوەن ئەزموون، بەئەزموون، کەسێ کەزۆر ئەزموونی لەدنیا هەبێ، مرۆڤی لەدنیا شارەزا یان لە کارویاریکدا.

**دنیاریی** (نک) dinyarî

رامیاریی، سیاسەتزانیی.

**دنیاگەڕان** (کتن) dinyageran

گەشت کردن بەجیهاندا.

**دنیاگەڕاو** (ئان) dinyageraw

دنیادیدە.

**دنیانەدیو** (ئان) dinyanedîw

چاوکرتوو.

**دنیایە** (ئاک) dinyaye

رەنگە، لەوانەیە، گریمان، وێ دەچێ.

**دنیایی** (ئان) ١ dinyayî

شتی سەردنیا.

**دنیایی** (نک) ٢ dinyayî

ئاژەل وپاتال.

**دو** (ن) du

چوارنالە.

**دوا** (ن،ئاک) dwa

١-پاش، پاشین (کات).

٢- پشت، پەی سەر، دوف.

**دوابڕان** (کتن) dwa biran

ئاسەوار بڕان، لەبەین چوون، قرهاتن، برانەوە، کۆتایی هاتن، نەمان، بەسەرچوون، دواهاتن، دوابرانەوە.

**دوابڕاو** (ئان،ئا) ١ dwa biraw

بێ کلک، کلک(براو، قرتاو)، دۆم بوڕسە، جووچکە

برپاکێ.

**دوابراو** (ئان) ٢ dwa bir̲aw

نافرەجا، بەروم.

**دوابرین** (کتپ) ١ dwabir̲în

ئاسەواربرین، قرتێ خستن، لەبەین بردن، نەهێشتن، قران (کردن، تێ خستن)، بن بڕکردن، لەڕەگ دەرهێنان، لەریشەدەرهێنان.

**دوابرین** (کتپ) ٢ dwabir̲în

گەیاندنە کۆتاییەکی سەرکەوتوو، و بەئامانج گەیاندن.

**دوابرینەوە** (کتپ) ١ dwabir̲înewe

توونا و توون کردن.

**دوابرینەوە** (کتپ) ٢ dwabir̲înewe

١- کۆتایی پێ هاتن. ٢- سەرەونگون کردن.

**دوابەدوا** (ئاک) ١ dwabedwa

لەدوای یەکتر.

**دوابەدوا** (ئاک) ٢ dwabedwa

بەشوێنیدا، شوێن بەشوێن، بەشوێندا.

**دوابەگ** (ن) dwabeg

بوزرگچە، پاش بەگ.

**دوابینی** (ن) dwabînî

دووربینیی، خوێندنەوەی ئاکامیی کار، پێش بینیی.

**دوابینی کردن** (کتن) dwabînî kirdin

پێشبینیی کردن، دوابینیین.

**دواپارێز** (ن،س) d waparêz

دووا پارێزی لەشکر، دوماهی، دوواقەرەوڵ.

**دواپێ هێنان** (کتپ) ١ dwa pê hênan

تەواو کردن، هیچ نەهێشتنەوە، براندنەوە، کۆتایی پێ هێنان، بڕینەوە.

**دواپێ هێنان** (کتپ) ٢ dwa pê hênan

دوا پێ هێنان.

**دواتر** (ئان) ١ dwatir

پاشووتر، پاشتر.

**دواتر** (ئاک) ٢ dwatir

پاشتر.

**دواجار** (ئاک) ١ dwacar

جاردیی، دوای هەموان.

**دواجار** (ئاک) ٢ dwacar

**دواجەنگ** (ن،س) dwaceg

ئەو جەنگاوەرانەی هێزی پاشەوەی لەشکر دەپارێزن، پاشداری لەشکر، پەس قەرەووڵ، دوایی لەشکر.

**دواچۆر** (خ) ١ dwaçor̲

دوا دوایی، ئاخریی وئۆخریی.

**دواچۆر** (ن) ٢ dwaçor̲

دوا دلۆپ.

**دواخستن** (کتپ) ١ dwaxistin

بەند کردن، بەنگ کردن، پاش خستن، گیرکردن، گیرۆ کردن، ماتەڵ کردن، وەدرەنگیی خستن، وەدوا هێلان، وەدوا خستن.

**دواخستن** (کتپ) ٢ dwaxistin

پەک خستن.

**دوادە** (ن) dwade

بژاری دووبارە.

**دوار** (ن) ١ dwar

قەیچی، مقەست.

**دوار** (ن،ئا) ٢ dwar

چوارپێ، ئاژەڵ.

**دواڕۆ** (ن) dwa r̲o

بەدوو کەوتوو، پاشەڕۆ، شوێن کەوتوو، وەدوو کەوتوو.

**دواڕۆژ** (ن) dwa r̲oj

ڕۆژانی پاش.

**دوازا** (ن) dwaza

پاشەبەرە.

**دواکەوتن** (کتن) ١ dwakewtin

دوو کەوتن.

**دواکەوتن** (کتن) ٢ dwakewtin

بەجێ مان، جێگەمان، جێ مان، دواوەکەفتن، دواوە کەوتن، کەوتنەدواوە، مانەوە، مانیان، پاش کەوتن، پاش وەدان، کەوتنەپاش.

**دواکەوتن** (کتن) ٣ dwakewtin

دانەدواوە، دواوەدان، دانەتەمەڵیی، لەکەمیی دان، دەست دانە تەمەڵیی.

**دواکەوتوو** (ئان) dwakewtû

پاش کەوتە، پاشکەوتیی، دواوە کەفتگ، پاشکەتیی، دواماو، شوندە ماو.

**دواگیان** (ن) dwagyan

دواهەناسەی ژیان، کۆچی دوایی.

**دوامین** (ئان) ١ dwamîn

نزیکترین کات.

**دوامین** (ئاک) ٢ dwamîn

دواترین، دواگین، دواهەمین، دوای هەموان، پاش

هەموان، هەرە دوایی.
**دواندن** (کتپ) ¹ dwandin
ڕاوێژ لەگەڵ کردن، قسەلەگەڵ کردن، ئاخافتن.
**دواندن** (کتن،کتپ) ² dwandin
سەرکردنە سەر، سەرەسەرنیان، وتـەوت( ووتـەووت)،
لەگەڵ کردن.
**دوانگە** (ن) dwnge
دەساوێژ.
**دواوە** (ن) ¹ dwawe
پاشەوە، پشتەوە، دوا.
**دواوە** (ن) ² dwawe
پاشەوە.
**دواوەدان** (کتپ) ¹ dwawe dan
گەڕاندنەدواوە، گێڕاندنەوە، ناردنەوە، وەگەڕان.
**دواوەدان** (کتن) ² dwawe dan
دواکەوتن.
**دواهاتن** (کتن) dwahatin
تەواوبوون، کۆتایی هاتن.
**دواهەمین** (ئان) dwahemîn
دواگین، دوامین، قرە.
**دواهەناسەی ژیان** (ن) dwahenasey jîyan
گیانەلە، ئاوزنگ.
**دواهێنان** (کتپ) dwahênan
دوا پێ هێنان.
**دوای ئەوە** (ئاک) dway ewe
ئنجا، ئینجا، ئیدی، پاش ئەوە، کاتێکی تر.
**دوای باران کەپنک** (پن) dway baran kepnik
پاش ڕابوردنی کاتی مەبەست هەوڵدان بێسوودە، پاش لەدەست چوونی هەل یان کار( تەقەلا یان هەوڵ) سوودی نییە، دوای بەزێرەوەکردن، ئنجا "خەبەردار". دوای مردن ئینجا حەکیم بانگ کردن. دوای دزینی ڕەخش، ئنجا تەویلە داخستن.( یان دوای دەرپەڕینی ئەسپ ئنجا دەرگای تەویلە داخستن).
**دوای خولیا کەوتن** (کتن) dway xulya kewtin
کەلکەڵە کەوتنەسەر ( یان میشک).
**دوای شەڕ ئاشتییە** (پن) dway šer aštiye
ئاکۆکی نابێ بەدرێژایی ژیان بەردەوام بێ ئاکۆکی، دڵ تەنگی دەهێنێ.
**دوا یەک** (ج) ¹ dwayek
ئاخرین، دواگین( کەس).
**دوا یەک** (ئاک) ² dwayek
بەشوێن یەکدا.
**دوا یەک** (ن) ³ dwayek
دوادانە، خڕ، گشت، هەموو.
**دوایی** (ئاک) ¹ dwayî
دپشت ئە، پاشان، ئاگە، لەوێ بەدواوە.
**دوا یی** (ئاک) ² dwayî
دواگین، دوای هەموان، دوماهکی، دوماهی، دومایی، دووڤک، دۆنگی، لەپاشان، لە( ئەنجامدا، پاشدا، کۆتاییدا، پاشاندا، ئاکامدا).
**دوا یی** (ن) ³ dwayî
پاشین، پاومان، دوایین، سەرئەنجام، کۆتایی، بنەبان، پایان، پاومان.
**دوا یی پێ هێنان** (کتپ) ¹ dwayî pê hênan
جێ بەجێ کردن.
**دوا یی پێ هێنان** (کتپ) ² dwayî pê hênan
ئەنجام پێدان، دوایی( پێ هاوردن، هاوردن)، بەجێ گەیاندن، کۆتایی پێ هێنان، بنەبان کردن، دوماهیی پێ هێنان.
**دوا یی هاتن**( کتن) ¹ dwayîhatin
نیشکاو هاتن، کۆتایی هاتن، نەمان( پاشەکەوت).
**دوا یی هاتن** (کتن) ² dwayî hatin
خراپ بوون، سەرەونگون بوون، نوغرۆبوون، هەڵپیچان.
**دوا یی هاتن** (کتن) ³ dwayî hatin
ڕزگار بوون، قووتاربوون.
**دوبارە** (ن) dübare
فیل.
**دوپشک** (ن،جع) düpišk
دووپشت، دمارەکۆل، دەمارەکۆڵ، دمارەکۆلە، دول پی، کلاشدم، کەژدم، زوشک، جانەوەرێکی سەر بەخێزانی جاڵجاڵۆکە وچنگنی کلک گرێ گرێی چزوو ژاراوییە
**دوتا** (ئان) düta
لابەلا.
**دوترینچکە** (ن) dütrîncik
هەڵتروشکە، چیچکە.
**دوچ!** (نسپ) düç!
نەچی وابکەی!، نەکەی!.
**دوچار** (ئان) düçar
تووش بوو، ئاوقەد، تووش بووگ، تووشیار، ئالفتە، تیوەئالاو، ئالودە، پاگیر.

**دوچاربوون(نەخۆشیی)** (کتن)[1] düçarbün (nexoşî)
تووش بوون، پێ هەڵپەڕیین.

**دوچاربوون** (کتن)[2] düçarbün
ئاڵوودە بـوون، ئالفتـەبوون، تێـوەگلان، تێکـەوتن. (vi.).

**دوچارکردن** (کتپ) düçar kirdin
تووش کردن، گیرۆدەکردن، تێوە(پـێچان، گلانـدن)، تەنگە وچەڵەمە هێنانە ڕێ، خستنەچورتمەوە، بـۆتێ چەندن.

**دوچاریی** (ن) düçarî
تووش بوویی، گیرۆدەیی، گرفتاریی، چورتم، تەنگە و چەڵەمە، پاگیریی، تووشیی.

**دوچک** (ن) düçik
ترۆپک، قووچکە.

**دوخشار** (ئان)[1] düxşar
١- ناڵەبار. ٢- چەتوون، کەللەڕەق.

**دوخشار** (ئان)[2] düxşar
دژوار.

**دوخمان** (ئان)[1] düxman
بێ فەڕ.

**دوخمان** (ن)[2] düxman
بێئەمـەکە، غایـان، غـاین(بەرامبـەر کەسـێ..) یـان: جاسوسی، خەوەرێن، هەواڵ دز.

**دوخ هەفسار** (ن) düxhefsar
دەستە جڵەو.

**دودک** (ن،نم) düdik
شەباب، بلوێر.

**دودکبێژ** (ن) düdikbêj
بلوێرژەن.

**دورد** (نک) dürd
خلتە.

**دودکێش** (ن) düdkêş
دووکەڵ کێش (دووکەڵکێش).

**دودە** (ن) düde
قوڕم.

**دورزو** (ن) dürzü
ئالمەقالم، هەراویگر.

**دورزیلە** (ن،رو) dürzîle
گەزگەزۆکە.

**دورک** (ن) dürik
شەپڵرنامە.

**دورمە** (ن) dürme
بابۆڵە، تیکەی پێچراو، دورووم.

**دوروڤ** (ن،کی) dürüv(ki)
ڕوخسار، سەروسیما.

**دوریا** (ئان) dürya
بەسەلیقە.

**دوریش** (ن) dürîş
لولاق.

**دور** (ن)[1] dür̲
توخن، نزیک.

**دور** (ن)[2] dür̲
گەوهەر، پێزە، پیزە، ستام، بلەخش.

**دور** (ن)[3] dür̲
مرواریی درشت.

**دور** (ن)[4] dür̲
ناوەڕاست، ناوەند، جەرگە، نێوەڕاست، هاوێر.

**دور** (ئان)[5] dür̲
ئاوێز، هەڵواسراو، هەڵاوەسراو.

**دوراشو** (ن،ئان) dür̲aşo
دەمەوەر (ئافرەت).

**دورگە** (ن) dür̲ge
ئاد، جزیرە، چزیرگە، گەزیرە، گزیرە، ئاویگە، جزرە، چزیرە، دوراجە، زەوی وشک لەناوەڕاستی ئاو، لـەب، ئافـرۆ، نیـڤرۆ، وشـکاییەکە هـەرچوارلای ئـاوبێ، وشکانی لەناو ئاودا.

**دورناس** (ئان) dür̲nas
پسپۆڕ.

**دورەشێر** (ن،تا) dür̲eşêr
بەور.

**دوری تاقانە** (ن)[1] dür̲îtaqane
مرواریی تەنیا لەناو سەدەفدا، مرواریی‌یـەکە لەوێنـەی نەبێ.

**دوری تاقانە** (خ)[2] dür̲îtaqane
مرۆڤی(بێ هاوتا، هەڵکەوتەو بێ وێنە).

**دوز** (ن) düz
بوزو، پەشم بەرگوێز، شـاڵ، تـەنراوی جـۆڵا لـەخوری یان مەرەزە.

**دوزاخە** (ن) duzaxe
جاڕزیی، وەڕزیی، قەڵسیی، بێزاریی.

**دوزاخەدان** (کتپ) duzaxedan
جاڕزکردن، سەغڵەت کردن، قەڵس کردن.

**دوزان (ن)** duzan
گویزان.

**دوزەنە (ن)** duzene
تەکووزیی، ڕێک وپێکیی.

**دوژ (ئان)** ١ duj
سیس، کز(کەسێ).

**دوژ (ئان)** ٢ duj
دژ.

**دوژ (ئان)** ٣ duj
گوریس (لەمووی بزن دروستکراو).

**دوژکێشان (ن)** dujkêşan
گوریسە کێشکە.

**دوژمان (ن.کی)** dujman(ki)
جنێو.

**دوژمن (ن)** ١ dujmin
دژمن، دژمین، دشمن، دوشمن، دوشمە، بەدخوا، بەدخواز، ناحەز، نەدۆست، نەیار.

**دوژمن (ن)** ٢ dujmin
بەلا، تەوەرە.

**دوژمنانە (ناک)** dujminane
دوژمن ئاسا، هەروەکە ناحەز، نەیارانە.

**دوژمنایەتیی (ن)** dujminayetî
دژایەتـیی، دژمنـاتیی، دژمنایـەتیی، دژمنیـیی، دژمینیـیی، دشمنیـیی، دوژمنـاتیی، دوژمنیتیـیی، بەدخوازیی، خەنیمنیی، ناحەزیی، نەدۆستیی.

**دوژمنایەتیی زانا، لە دۆستایەتیی نەزان خۆشترە (پن)**
dujminayetîy yana, le dostayetî nezan xoştire
دۆستایەتیی نەزان، لەدوژمنایەتیی بەدترە.

**دوژمنایەتیی کردن (کتپ)** dujminayetî kirdin
دوژمنایـەتیی لەگـەڵ کـردن، دژایـەتیی کـردن، بەربەرەکانیی کردن، بەرپـێچیی کـردن، بەرهەڵستی کردن، ڕووبەڕوو وەستان، بەرپـێچیتیی کـردن، بـوون بـەدوژمنی کەسـێ، ناحـەزیی بەرامبـەر (کەسـێ) {پیشان دان، دەرخستن، دەربڕیین}.

**دوژمنایەتیی لە نێواندا نەمان (ند)**
dujminayetî le nêwandaneman
تەبابوون، ڕێک کەوتنەوە، نێوان خۆش بوون.

**دوژمن یەک، دۆست هەزار (پن)**
dujmin yek, dost hezar
دوژمنێ زۆرە، سەد دۆست کەمە. : یـەک دوژمـن ئیجگـار زۆرە بـۆ مرۆڤـێ لەسـەر دام و دەزگایـەکی بلندایێ.

**دوژەنگ (ن)** ١ dujeng
گرژیی، مۆنیی.

**دوژەنگ (ن)** ٢ dujeng
دۆژەنگ، لۆچ یان چرچیی ناوچەوان، چین پێشانی.

**دوژەنگ یەکدان (کتن)** dujeng yekdan
گرژبوون، مۆڕبوون، مـۆن بوون، ناوچەوان بەیەکدا دان، بـرۆ تورشـاندن، (بـرۆ، ڕوو، یـان ناوچـەوان) گرژکردن.

**دوساخ (ن)** dusax
بەنـد، بـەندیی، گـراو، گـیراو، گیریـاگ، گیریـاو، نیگادریاگ.

**دوساخچیی (ن)** dusaxçî
زیندانەوان، زینـاوان، بـەنیوان، دوسـاخوان، دوسـاق، بەندیوان.

**دوعا (ن)** duj`aa
دوحا، نزا، ئاه، نزولە، پاڕانەوە.

**دوڤ بەردان (کتپ.کی)** duv berdan(ki)
ماوەپێدان، مۆڵەت دان.

**دوقۆچکە (ن)** düqoçke
سەرکڵاوە، کڵاوی خوریی.

**دوکان (ن)** ١ dükan
جێگـەی شت تێدافرۆشتن، چاوەخـانوی شت تێـدا فرۆشتن وکڕیین، فرۆشگا.

**دوکان (ن)** ٢ dükan
تۆمگە، تۆوگە، شەتلگە، باخلە، تۆمەدانە، جێنەمام، شوێنێکیی خۆش کراوە لە زەویی بۆ تۆو پـێوەکردن یان شەتل لێدان.

**دوکاندار (ن)** dükandar
خاوەن دوکان.

**دوکانداریی (ن)** dükandarî
سەوداومامەڵە.

**دوکلە (ن)** ١ dükḻe
کلۆلە، دوکولیە(دەزوو، بەن...).

**دوکلە (ن)** ٢ dükḻe
تەشی.

**دوکلە (ن.ڕو)** ٣ dükḻe
قۆزاخە.

**دوگر (ن)** dügir
بەرماڵ.

**دوگرد (ن)** dügird
جاجم، پێخەفی لەخوری دروستکراو.

**دوگمه** (ن) ١ dugme
قۆپچه.

**دوگمه** (ن.رو) ٢ dugme
چرۆ.

**دوگمه داخستن** (کتپ) dugme daxistin
قۆپچه‌داخستن.

**دوگمه‌و دۆلاب** (ن) dugmewdolab
خشلێکه له‌بن سوخمه‌وه ده‌به‌سترێ و مه‌مک قیت راده‌گرێ.

**دوگمه‌و قه‌یتان** (ن) dugmew qeytan
که‌ناره‌ی سوخمه‌ی ژنانه.

**دوگون** (ن) dügun
گرێ کوێره.

**دولاب** (ن) ١ dülab
چه‌رخی ئاوکێشان.

**دولاب** (ن) ٢ dülab
خه‌رپه‌ک.

**دولاب** (ن) ٣ dülab
تۆپی ئاش.

**دولبه‌ر** (ن) ١ dülber
یار.

**دولبه‌ر** (ئان) ٢ dülber
دلبه‌ر، نارین، دڵ فڕین.

**دولبه‌ریی** (ن) dülberî
دلبه‌ریی، دڵ دزیی، ماشقه‌یی له‌گه‌ڵ ئه‌ویندار.

**دولگه** (ن.جو) ١ dülge
هه‌زارپێ.

**دولگه** (ن) ٢ dulge
کۆته‌لگیڕیی، شیوه‌ن یان هه‌لگوتنی به‌سه‌ر مردووان‌دا.

**دولگه** (ن) ٣ dulge
هه‌لبه‌سی دلخۆشکه‌ره، هۆنراوه‌ی مه‌دح.

**دولۆر** (ئان) dulor
تلۆر، دولۆره، قنگه‌وتلوور.

**دومات** (نک) dumat
به‌لاو به‌سه‌رهاتی ناخۆش.

**دومان** (ن) ١ duman
ته‌م، تومان، ته‌م وتومان.

**دومان** (نک) ٢ duman
خۆلی راماڵراوی به‌ده‌م باوه.

**دوماوه‌ن** (نک) dumawen
خزم و که‌س وکاری زاوا.

**دوماهکی** (ن.کی) dümhkî(ki)
ئه‌نجام، کۆتایی.

**دوماهیی پێ هینان** (ن.کی) dümahî pê hênan(ki)
دوایی پێ هینان.

**دومبه‌له‌ک** (ن.نم) dümbelek
دمبه‌ک، دمه‌ک، دمه‌له‌ک، دنبک، دنبه‌ک، دومبه‌ک، دومه‌، دوممه‌، دومه‌ک، دونبک، دومه‌له‌ک، تومه‌له‌ک، تومه‌ک.

**دومبه‌له‌ک ژه‌ن** (ن) dümbelek jen
دومه‌له‌ک لیده‌ر، دومه‌ک ژه‌ن، دومه‌ک لیده‌ر، دنبه‌ک لیده‌ر، دومبک لیده‌ر، دومه‌له‌ک ژه‌ن.

**دومدیکه** (ن.جو) dümdike
پوشکه به‌قنگ، پوش به‌قونه، زل به‌قنگه، زل به‌قوونه.

**دومه‌ڵ** (ن.پز) dümel
دمه‌ڵ، قونیر، کوان، کۆڤان، ئارینج، ریشک، سووره‌کوان، کولک، کره، کونیر، مووچ.

**دومه‌ڵ گه‌یین** (کتن) dümel geyîn
دومه‌ڵ زه‌ردبوون.

**دون** (ن) ١ dün
تروشکه، چیچکان، هه‌ڵچیچکه.

**دون** (ن) ٢ dün
دوند، قولله، ترۆپکی چیا.

**دون** (ن) ٣ dün
چرچ ولۆچی ده‌موچاو، چرچیی وگنجیی روخسار.

**دوندول** (ن) dündül
کاروانه‌ی حوشتر، قه‌تاری وشتر.

**دونده** (ن) dünde
ده‌نده، جیگه‌ی گاسن له‌هه‌وجاردا، لووتی هه‌وجار که‌گاسنی پیداده‌کرێ.

**دونگه** (ن) dünge
په‌راسوو.

**دونگه‌نه** (ئان) düngene
دووگن (مه‌ر).

**دونیا** (ن) dünya
رانه‌مه‌ر.

**دونیاداریی** (ن) dünyadarî
ماڵداریی.

**دوه** (ن) dwe
تراویلکه، تینی هه‌تاو، که‌هاوینان له‌زه‌ویی هه‌ڵده‌ستێ وده‌بینرێ له‌شیوه‌ی گۆلاوی ئاودا

ئەنزیک زەوییەوە.

**دوەم** (ئان) dwem

دووهەم، یەکێ دوای یەکەم (لەشوێنێ یان کاتێ).

**دویت** (ن) dwît

دەویت، گەواد، ناموس فرۆش، بێ ناموس (کەسێ).

**دوێ** (ن) dwê

وتار، ووتە.

**دوێت** (ن) ١ dwêt

دۆت، دۆتە، دەویت، دۆخت، دەوەر، قیز، کیژ، کەنیشک.

**دوێت** (ن) ٢ dwêt

مەرەکەبدان، دەویت، دەوان، مەرەکەفدان، قوتو یان شوشەی مەرەکەب بۆ بەردەست.

**دوێچە** (ن) dwêçe

لەرز، لەرزە.

**دوێرد** (نک) dwêrd

دوێردگ، دووێردە، دوێردە، تۆرتۆ، قەبچیی، مقەست (گەورە)، برینگ.

**دوێڵ** (ن) ١ dwêḻ

دوویل، زوێڵ، پارچەی باریک لەچەرم.

**دوێڵ** (ن) ٢ dwêḻ

تەلەبەرد.

**دوێن** (ن) dwên

ئاخاوتەر، قسەکەر.

**دوێنێ** (ن) dwênê

دونێ، دوهی، دوێنیکە، دوێکە، دوش، دووەکە، دۆ، دۆە، دوێ، دوێ ڕۆژ، دوهیی، دینی، دهۆ، ڕۆژێ(پێش ئیمڕۆ،ڕۆژی ڕابردوو).

**دوێنێ شەو** (ن) dwênê şew

دوێ شەو، شەوادی، شەوی (پێش ئەمشەو، شەوی ڕابووردوو، ڕابردوو، دیشەو، دۆشینا).

**دوو** (ن،ئان) ١ dü

دووان، دوێ، یەک لەگەڵ یەک، یەک ویەک.

**دوو** (پ) ٢ dü

پاش، پەی.

**دووئاوان** (ن) düawan

دواوان، ڕێژاو، گەیشتنگەی دووئاو، جێگەی پێک گەیشتنی دووچەم.

**دووئاوبوون** (کتن) düawbün

دوو ئاو کەوتن، ئەخۆش کەوتن کاتی هەوا گۆڕین، دووئاوەکیی (بوون، کەوتن).

**دوو ئەستێرە** (ن،نس) dü estêre

دووبرا.

**دووئەوەندە** (ئان) düewende

دوو(ئەوەندە، بەرامبەری ئەمە، بەرانبەری ئەمە، جار بەقەی ئەمە، جار هێندە، چەندان، چەندانە، چەنانە، قات، هێندە).

**دووان** (کتن) ١ dwan

ئاخاوتن، گفتوگۆ کردن، قسەکردن.

**دووان** (کتن) ٢ dwan

ووتاردان، بوێژدان.

**دووان** (ن،ئان) ٣ dwan

دوو، ژمارە دوو.

**دووان** (ن) ٤ dwan

جووت، دووشت (لەهەمان چەشن).

**دواندن** (کتپ) dwandin

لەگەڵ ئاخاوتن، ووتەووت لەگەڵ کردن، قسەبۆ کەسێ کردن.

**دووانە** (ئان) ١ dwane

جووتە.

**دووانە** (نک) ٢ dwane

ئاوزا، دووبرالە، دوودانە، لفەدووانە، جفت، جمکان، جمکانە، هەڤاڵزا.

**دووبا** (ئان) düba

ئیسک ئەستوور.

**دووباد** (ئان) ١ dübad

دوولۆنە، پێچەن، بەن یان دەزووی دووجار بادراو، دوو تاوەرێسی بەیەکدا بادراو، ڕێسراوی دوولانە کراو.

**دووباد** (ن،ئا) ٢ dübad

بارەبەری (پتەوی بەهێز، بەهەرەکەت وتوانا، گورج و خۆشڕەو).

**دووبارە** (ئاک) ١ dübare

دووارە، دووپات، دووپاتە، دنوو، ژنویکا، بۆجاری دووهەم، جارێکی(تر،دیی)، سەرلەنوێ، لەنووکەوە.

**دووبارە** (ن) ٢ dübare

تەشقەلە.

**دووبارە** (ن) ٣ dübare

فێڵ، فێڵ وفەرەج، گزیی.

**دووبارە (گوڵاو)** (ن،ئان) ٤ dübare (guḻaw)

گوڵاوی (دووجارچکێنراو، لەگوڵاوگیراو).

**دووبارە** (ن) ٥ dübare

هاتنی ژمارەدوو (هەردوک مۆرە).

**دووبارەکردنەوە** (کتپ) dübare kirdinewe
دووبارە (پات کردنەوە، گوتنەوە، کردنەوە، کردن)، دووپات کردنەوە، دووجار هەستان بە کارێک، سەرلەنوێ پێ هەستان یان کردنەوە (ئیش..).

**دووبارە لێ کردن** (ئد) dübare lê kirdin
کەین وبەین لێ کردن، تەگبیر (دژی کەسێ) کردن.

**دووبانەکیی** (ن) dübanekî
گلەبانی خانوو.

**دووبڕ** (ن،ئان) dübir̲
ئاژەڵی یەک سم کەدووساڵی تەواو کردبێ.

**دووبرا** (ن،ئس) ۱ dübira
دوو(ئەستێرە، براڵە، خوشک، خوشکە)، جووتە کەوان.

**دووبرا** (ن،م) ۲ dübra
دووبراڵە، جۆری هەڵۆیە، باڵندەیەکی راوکەری گۆشت خۆرە هەمیشە دووانیان پێکەوە ئەفڕن وبەدوای نێچیردا ئەگەڕێن.

**دووبراڵە** (ن،رو) dübrale
دووبرا(سەلکی پیاز، مازوو..)، دوو دەنکەمیوەی هاوچەشنی پێکەوە نووساو.

**دووبڕۆ** (ن،رو) ۱ dübro
کۆزەر.

**دووبڕۆ** (نک) ۲ dübro
دوو دانەبرۆ.

**دووبرە** (ن) ۱ dübre
مەرمەڕی خام.

**دووبرە** (ن) ۲ dübre
خشڵێکی سەر کڵاوی ژنانە.

**دوو بەختیی** (ن) dübextî
۱- دەبێ یان نابێ، ئەبێ یان نابێ، دوو بەختەکیی، کارێ کەئاکامی نادیارە.
۲- ئاکام باش یان لەوانەیە خراپ.

**دووبەدوو** (ئاک) dübedü
هەردوو پێکەوە.

**دووبەدوو پێکەوە** (ئاک) dübedü pêkewe
بەتەک یەکەوە، تەک وەتەک، شان بەشان.

**دووبەدووچوون** (کتن) dübedü çün
شوێن کەوتن.

**دووبەرد** (ن) düberd
بەردی (ئەلحەد، ناوگڵ).

**دووبەرە** (ن) dübere
دەفرێکە لەپشت پلورە هەنگی دائەنێن، دەفرێکی گرد وکلۆرە ئەنرێت بەپاشەوانەی پلورە هەنگەوە بۆئەوەی هەنگەکە شانەی تێدا هەڵبەستێ وهەنگوینی تیا کۆبکاتەوە.

**دووبەرەکیی** (ن) düberekî
دووبەندیی، کێشەوهەرا(لەنێوان یەک هۆز یان گەلدا..)، ناڕێکیی، نەیاریی، بەربەرەکیی، بەربەرەکانیی، ملەملانێی نێوان دووکەس یان زیاتر لەگەڵ یەکدا.

**دووبەرەکیی نانەوە** (کتپ) düberekî nanewe
بەربەرەکانیی نانەوە، ملەملانێ وێستان لەگەڵ یەکتریدا.

**دووبەرەکیی وەستان** (ئد) düberekî westan
دوژمنایەتیی یەکتریی کردن (دوو کۆمەڵ..).

**دووبەلا** (ئاک) dübel̲a
زۆر بە(ئەسپایی، هێدیی).

**دووبەند** (نک) dübend
دوو(بەر، بەش، پارچە).

**دووبەندیی** (ن) dübendî
دوو(بەشیی، پارچەیی، بەرەکیی، بەرەیی).

**دووپات بوونەوە** (کتن) düpat bünewe
دەست پێ کردنەوە، سەرلەنوێ (ڕوودانەوە، هاتنەکایەوە).

**دووپات کردنەوە** (کتپ) düpat kirdinewe
دووبارە کردنەوە.

**دووپاپیلە** (ن،ئا) düpapîle
دوو(پاپیلکە، پاپیلە)، مشک کەرویشک، جانەوەرێکە لەتیرەی سمۆرەو پچووکتر و لەمشک گەورەتر.

**دووپشتەکیی** (ن) düpiştekî
هاوپشتیی.

**دووپڵ** (ئان) ۱ düpil̲
کونج،خاڵ خاڵ، خاڵخاڵاوی، شڵ، شلە.

**دووپڵ** (ئان) ۲ düpil̲
دووزمان یان دووڕوو.

**دووپەلکە** (ن،رو) düpelke
دووپەلە، ڕووەکی تازەشین بوو، ڕووەکێ ڕوابێ وسەوز بووبێ وتازە لەخاک سەر بێنێتەدەر وپەلی دەرکردبێ.

**دووپەلە بوون** (کتن،رو) düpele bün
ڕووان، دووپەلە دەرکردن.

**دووپێ** (ئان.خ) düpê

دووپا، مرۆڤ، مرۆو.

**دووتا** (ئان) düta

دوولایی.

**دووتایی** (ن) dütayî

تیر.

**دووتن** (ن) dütin

سواخی دیوار.

**دووتوێ** (ن) dütwê

دوو تیوێ، دووتیی.

**دووتیغ** (ن) dütîx

دووتیغ، تیغێ کەهەردوولای دەبڕێ، چەقۆیەک کە هەردوو دەمەکانی تیژین.

**دووتیلمە** (ئان) dütîlme

دووتیلو، دووپارچە.

**دووچک** (ن) düçik

لوتکە.

**دووچکدار** (ئان.کل) düçikdar(kl)

کلکدار.

**دووچەرخە** ١ (ن) düçerxe

ئەسپەئاسنینە، پایسکل.

**دووچەرخە** ٢ (ن) düçerxe

عەرەبانەی خۆڵ گویزانەوە.

**دووچەوەکیی** (ن) düçewekî

جیاوازیی.

**دووچەوەکیی کردن** (کتپ) düçewekî kirdin

جیاوازیی کردن (لە نێواندا)، فەرق وجیاوازیی کردن (لەمابەیندا).

**دووخ** (ن) düx

دووک، شبک، ئاسنێکی راستی بەتم تەمەیە لەخەرەکی پەموو رستندا، ئامرازێکە لووت تیژە بەدەم خەرەکەوە ریسراوی لەسەر هەڵ دەکرێت.

**دووخاڵ** (ن) düxal̲

دوو نوختەی لەسەریەک لەنووسیندا، نیشانەیەکە بەم چەشنە( : ) لەشوێنێکدا دائەنرێ کەپاشەکەی راڤەی پێشەکەی بێ.

**دوودارە** (ن) düdare

داربەستی مردوو، تابووت.

**دوودان** ١ (ن) düdan

دوو دانگێ(لەقەبارەدا یان رەنگدا)، دانەویلەی هاڕراو کەوردو درشتی تێکەڵ بێ.

**دوودان** ٢ (کتپ) düdan

قانگێ دان، بدووکەڵ دەرکردن.

**دوودڵ** ١ (ئان) düdil̲

دووگومان، دووشک، بەگومان، ناخاتر جەم.

**دوودڵ** ٢ (ئان) düdil̲

دەردۆک، دڕدۆنگێ، دەمەدڵ، دمەۆ، راڕا، نیگەران، نێ سۆز، ئەوکەسەی ناتوانێ زوو بڕیاربدا، ئێنکارێ زوو بڕیار بدی.

**دوودڵیی** (ن) düdil̲î

دلاودلیی، دڕدۆنگیی، دامانیی، دووگومانیی، ناخاترجەمیی، نادڵنیایی، دڵەڕاوکێ، نیگەرانیی، شڤیشک، سیودوو، گومان، دڵەڕاوکێ.

**دوودڵیی کردن** (ئد) düdil̲î kirdin

گومان خستنەسەر، گومان لێ کردن.

**دوودمان** ١ (ن) düdman

ئاکام.

**دوودمان** ٢ (نک) düdman

ئەوە، وەچە، وەجاخ.

**دوودمان** ٣ (ن) düdman(kl)

تەڵەزگە، چورتم.

**دوودمان کوێر** (ئان) düdman kwêr

وەجاخ کوێر.

**دوودوو** (ئان) düdü

جووت جووت، جۆت جۆت، دۆدۆ، زۆزۆ.

**دوودووگ(حوشتر)** (ن.ئا) düdüg(h̲uštir)

وشترێ کەدوو کۆپارەی لەسەر پشتە، وشتری دووکۆپار.

**دوودەریی** (ن) düderî

ئاقشفە، پەنجەرەی دوولایی، پەنجەرەیەک (کە هەردوولای دەکرێتەوە).

**دوودەسماڵە** (ن) düdesmal̲e

هەڵپەرکێ..

**دوودەکیی** (ن) düdekî

پیاوی (گاندەر، نێر بەسەر خۆداکیش).

**دوودەم** (ئان) düdem

دوولای تیژو بوڕ راپیوە.

**دوودهۆک** (ئان) düdihok

ناتەبا، ناڕێک.

**دوودیی کردن** (کتن.کل) düdî kirdin

دووکەڵ کردن.

**دوور** ١ (ئان) dür

دوێر، دیر، پەڕ، پەرانپەڕ، ئانزیک.

**دوور** (ئان) [٢] dür

پاک، خاوێن.

**دووران** (کتپ) [١] düran

دروێنە کردن.

**دووران** (کتپ) [٢] düran

دروومان کردن.

**دووراو** (ئان) düraw

تەقەڵ لێ دراو، دووریاکێ، دووریاو.

**دووراو دوور** (ئاکە) düraw dür

دووراندوور، دووربەدوور، دووراو، لەدوورەوە، هەر لە دوورەوە، نەلەنزیکەوە.

**دووراوێژ** (ئان) dürawêj

دوور ئاڤێژ، دوور هاوێژ.

**دوور برۆ، دروست وەرەوە** (پن)

dür biro, drust werewe

١- دوور ودروست.

٢- بەشێنەیی ڕەفتاربکە، پەلەمەکە.

**دوور بێ!** (رس) [١] dür bê!

خوا نەخواستە، خوانەکا، دووربا، دووروا(لە ئێوە).

**دوور بێ** (کد) [٢] dür bê!

بانزیک نەکەوێ.

**دوور بین** (ئان) [١] dürbîn

چاو (تیژ، بەحوکم)، دوورنواڕ، ئەو مرۆڤەی کە لە دوورەوە شت(باش) دەبینێ.

**دوور بین** (ئان) [٢] dürbîn

بیر لەدوا ڕۆژکەرەوە، پێش بین، تێ بین، دوور(ئەندیش، ئەنیش، نواڕ)، کەسێکە زۆر بیر لەئەنجامی شت بکاتەوە.

**دوور بین** (نکە) [٢] dürbîn

دوربین،دووردوون، ئامرازی دوورنزیک کردنەوە لەبەرچاو ئەڤ ئالاڤا کۆمرۆڤ پێ دوورڤە(دبینی)

**دوور بینیی** (ن) dürbînî

تێ بینیی، دوور ئەندیشیی، دوور نواڕیی.

**دوورخراو** (ئان) dürxiraw

تارکراو، تاریاکێ، دوورخراوە، دوورخراوێنراو، دوورەوە خزاو.

**دوورخستنەوە** (کتپ) [١] dür xistinewe

١- دوورکردن، لەخۆ دوورکردنەوە، دوور لەخۆ گێڕان. ٢- دوورخستنەوە، ئاوارەکردن.

**دوورخستنەوە** (کتپ) [٢] dürxistinewe

خستنەکاتێکی دیکە، وەدواخستن، ڤارڤلاندن، کاش کردن.

**دوورخستنەوە** (کتپ) [٣] dürxistinewe

جوێ کردنەوە، جیاکردنەوە، جودا کردنەوە، بڕدان، هەڵاواردن.

**دوورخستنەوە** (کتپ) [٤] dürxistinewe

ڕاگواستن، لەجێگەی خۆ هەڵگرتن.

**دووردەست** (ئان) dürdest

دووردەس، دوورە(دەس، دەست)، شتێ کەدەستی پێ ڕانەگا.

**دوور دەم** (ن) dürdem

پۆز، پووزە (ئاژەڵ).

**دوورک** (نکە) [١] dürik

لۆچکە، لەواشە(ی دەمی یەکسم، سەرکێش یان کاتی ناڵ کردنی)، بۆی بەکاردەهێنرێ.

**دوورک** (ن) [٢] dürik

زمانەی قفل، کۆلە، شمشێرەی دەرگا.

**دوور کەوتنەوە** (کتن) dür kewtinewe

دوور (بوونەوە، کەتن، کەفتن،کەفتنەوە)، دوورەوکەفتن، دوورەوە کەوتن، دوورەوە کەفتن، تەکینەوە، پێکەوەنەمان.

**دوورکەوە!** (ئسب) !dürkewe

بڕۆبەولاوە.

**دوورکێشان** (کتن) [١] dürkêšan

زۆرپێ چوون.

**دوور کێشان** (کتن) [٢] dürkêšan

درەنگ دەرکەوتن یان ڕوودان.

**دوور لە ڕووتان!** (رس) !dür le rütan

دوور بێ لەئێوە !.

**دوور نیازیی** (ن) dürniyazî

سەربەخۆیی، کاربەکەس نەکەریی.

**دوور ودرێژ** (ئان) dürw dirêj

درێژە پێدراو، بەدرێژیی ووتراو، دوڤ درێژ.

**دوورە پەرێز** (ئان) düre perêz

دوورەو پەرێز، خۆلەخەڵک پارێز، لا، لاتەریک.

**دوورە پەرێز بۆ چوون** (ئد) [١] düre perêz bo çün

ڕەم کردن، ڕەو کردن، کۆ لێ کردن.

**دوورە پەرێز بۆ چوون** (کتن) [٢]

düre perêz bo çün

بەدوورە پەرێز بۆ چوون، بەماتەماتە بۆ شت چوون.

**دوورە پەرێز وەستان** (ئد) [١] düre perêz westan

خۆپارێزیی کردن، تێکەڵیی لەگەڵ کەسانی دیکە نەکردن.

**دووره پەریز وەستان**(ند)[٢] düre perêz westan
تاربردن، خۆ دوور لێ راگرتن، لێ دوور کەوتنەوە، خۆ لێ پاراستن، توخن نەکەوتن.

**دووریی** (ن)[١] dürî
دوریی، دووراهیی، دووریتیی، دۆژ، نانزیکیی (شوێن).

**دووریی** (ن)[٢] dürî
پاکیی، خاوێنیی (نەریت).

**دووڕوو** (ن) dürü
دوو زمان.

**دووڕوە** (ن) dürwe
دووچۆمان، زەویی نێوان دوو ڕووبار.

**دووڕەگ** (ئان) düreg
دوو(تۆمە، تۆو، ڕەهـ، ڕیژە، دەمار، نەژاد).

**دووڕیان** (ن) düryan
دووڕییان، سەری(دووڕێ، دووڕیگە کەدەگەنە یەک)، شوێنیکە دوو ڕێی لێ بووبیتەوە.

**دووڕیویلە** (ن،رو) dürêwîle
کلکە ڕێویی، دووڤ ڕێویی.

**دووز** (ئان)[١] düz
ڕاست، ڕیک (لەگەل هەست و نەستی کەسیکی دیکە).

**دووز** (ن)[٢] düz
ڕاستە (ڕێ، خیابان)، جادە یان ڕیگەی ڕاست.

**دووزان** (ن) düzan
گویزان.

**دووزمان** (ئان) düziman
دوو(ڕوو، زیان، زوان، سەر، ڕاز، قوون، لاژەن)، فیتنەباز، دنە دەری کیشە(بەناخاوتن)، قسە(هینەروبەر، چن)، چقۆ، پیکول چین، تێ(چەند، چین)، مایەفیتنە.

**دووزمانیی** (ن) düzimanî
دوو(ڕوویی، زبانیی، سەریی، پلیی، زوانیی، ڕازیی)، فیتنە بازیی، ناپاکیی، ناڕاستیی، دۆخمانیی.

**دووزمانیی کردن** (کتن،کتپ) düzimanî kirdin
دووڕوویی کردن، فیتنەیی کردن، فیتنەبازی کردن، قسەهینان وبردن.

**دووزەلە** (ن،ئم) düzele
چووزەلە، دیزەلە.

**دووزەمە** (ن) düzeme
تەلەزگە، چورتم.

**دووژکردن** (کتپ) düj kirdin
خوێن بەردان.

**دووسبەی** (ن،ئاک) düsibey
دوو (سوو، سبحەی)، دوو ڕۆژ دوای ئەمرۆ.

**دووسەر** (ن،ئان) düser
ناڕاست.

**دووش** (ن) düš
ڕەخ، لا.

**دووشەممە** (ن) düšemme
دووشەم، دووشەمب، دووشەمیی، دووشەممو، سێهەم ڕۆژی حەفتە.

**دووفاق** (ئان) düfaq
دوو(پەل، پەلان، شاخە، فلیقان، گلاشکۆ، فەلیقان، لپ، لقان، لک، لکان، لکە، حاچە، لەپان)، لقی دارکە دوولکی تری لێ بووبیتەوە.

**دووفلیچقانە** (نک)[١] düfilîçqane
دوو(فلیقانە، لەپان، پەلان، فلیقان، لیوەی شەرمی ئافرەت)، هەردوو لچەکانی کوز.

**دووفلیچقانە** (ئان)[٢] düfilîçqane
دوولکی لیک نزیک، لقی قەلشیو، شتیکە دوو پەلی لێ بوو بیتەوە وپەلەکانی لەیەک نزیک بن.

**دوو فوو وسە بریکی ئەوێ** (رس)
düfü w sebrêkî ewê
هەرکەسێ سەبری نەبێ، حیکمەتیشی نیەیە.

**دووڤ** (ن،کی) düv(ki)
کلک.

**دووڤ دەهۆل** (خ،کی) düvdehol(ki)
زکێ لەوەڕین، مشەخۆر.

**دووڤک** (ن،کی)[١] düvik(ki)
گولینکەی خورجین(بۆ جوانیی وڕازاندنەوەی..).

**دووڤک** (ن،کی)[٢] düvik(ki)
کلکە، غولام.

**دووڤک** (ن،کی)[٣] düvik(ki)
بەرماوەی پاش خەرمان،جێ خەرمان مال.

**دووقات{خانوو}** (ئان) düqat (xanü)
دوو(تەبەقە، مەرتەبە، نهۆم).

**دووقات** (ئان) düqat
دوو ئەوەندە.

**دووقیمە** (ن) düqîme
کەلاکی دوولەت، لاشەی بەدوو بەشەوە کراو.

**دووک** (ن،رو) dük
لقی وردی قەدی درەخت، لقەوردەی بن لق وگەلای

دار.

**دووکاڵەک بە دەستێ هەڵ ناگیرێ (پن)**
dü kalek be dest helnagîrê

چوونە ژێرباری دوو ئیشی جیاواز لەهەمان کاتدا. لەیەک کاتدا تەنها بەیەک فرمان ڕابە

**دووکوت (نک)** dükut

دوو(لەت، نیوە، نیم، نیمە، بەش)، لەت لەناوەڕاستدا.

**دووکۆیی (ناک)** dükoyî

دوو (بەشی، قۆڵیی)، هاوبەشی دووکەسیی (لەیەک شتدا)، یەک شتی دووبەشیی لەنێوان دووکەسدا.

**دووکەس بچن بۆلای قازی، هەر یەکێکیان دێتەوە بە ڕازیی (پن)**
dü kes biçin bo lay qazî, her yekêkyan dêtewe be razî

چونکە هەریەکێکیان خاوەن مافە وحوکمی بۆ ئەدرێ.

**دووکەڵ (ن)** dükel

دو، دوود، دوکڵە، دوکێل، دووکێل، دی، دیکەڵ، قانگێ، کادوو، کیدوو، هەڵمێکی ڕەشی تاریکە.. لەناکامی شت سووتانەوە پەیدا ئەبێ وبەرز دەبێتەوە.

**دووکەلاویی (ئان)** dükelawî

دووکێلیی، ڕەش هەڵگەڕاو بەدووکەڵ.

**دووکەڵ دان (کتپ)** ١ dükeldan

بەدووکەڵ جانەوەر لەکون دەرکردن، دووکەڵ بەگژدا کردن، قانگێ دان.

**دووکەڵ دان{مەشکە..} (کتپ)** ٢
dükeldan(meške..)

دوودیی دان، مەشکە خستنەبەر دووکەڵ بۆ ئەوەی بۆ نەکەی بگرێ.

**دووکەڵ کردن (کتن)** dükel kirdin

دووکەڵ لێ هەستان، دوودیی کردن.

**دووکەڵکێش (ن)** dükel kêš

دوودکێش، دووکەڵدان، دووکەڵگیر، باجە، بۆرییسۆپا... لولەی سۆپا... بۆرییەکە دووکەڵی لێوە دەردەچێ.

**دووکەڵ لەماڵی هەڵناسێ (رس)** dükel le malî helnasê

١- هەژارە، بێدەستە. ٢- پیسکەیە، چرووکە، ڕەزیلە.
٣- چێشت لێ نانێن، میوانداریی کەس ناکەن.

**دووکەوتن (کتپ)** ١ dükewtin

ڕاونان.

**دووکەوتن (کتپ)** ٢ dükewtin

دانەدوو، دەرەدوانان، دانەپەی، شوێن کەوتن، کەوتنە شوێن، شوێن کەفتن، کەوتنە(دوا، شوێن پێی کەسێ)، لەپشتەوە ڕۆیشتن، لەدووچوون، کەوتنەدوو.

**دووگ{مەڕ} (ن)** ١ düg(mer)

دمە، دونگێ، دووی پەز، دیف، تەری، ئەو کۆمەڵە چەورییە نەرم وشلەی بەپاشی مەڕەوەیە.

**دووگ{حوشتر} (ن)** ٢ düg(hüšür)

کۆپارە.

**دووگاسنە (ن)** dügasine

دوو هیشە، زەویی دووجار کێڵراو، دووجار شۆڕکراو.

**دووگلاشکۆ (ن)** dügilaško

دوو شاخەی تیروکەوان.

**دووگن (ئان)** dügin

دووگێ (زل، گەورە)، دونگەنە، دۆنگیی.

**دووگوە (ن)** dügwe

ئامرازێکی دووپەلە ئالف یان درکی پێ ئەشکێنرێ... دار یان دووفاقە و دەسکدار.

**دووگە (ئان)** düge

بەختەوەر، بەشانس(مرۆڤ).

**دووگیان (ئان)** dügyan

ئاووس.

**دووگی سەر تەلە (خ)** dügî ser tele

دووگی دانەڕێکە، بەئاخاوتنێکە، شتێ..دەوترێ کە بۆ تووش کردن.. هەڵخەڵەتاندن.. ساز درابێ.

**دوولا (ئان)** ١ düla

لەدوو تەرەف.

**دوولا (ئان)** ٢ düla

دوو(قەد، توێ، تیکە، لانە، یاد، لایی، لۆ).

**دوولابوون (کتن)** dülabün

تابوون، تاکە بوونەوە، جیابوونەوە.

**دوولادان (کتپ)** düladan

بەدوولایی قەد کردن، مووچاننەوە، نوشتاندنەوە.

**دوولانە کردن (کتپ)** dülane kirdin

دوولاکردن، دوولایی کردن.

**دوولایی (ن)** dülayî

ئەنجامە.

**دوولوولە{تفەنگ} (ن)** düllüle (tifeng)

دوو لیلی (تفەنگی ڕاو).

**دوومان** (ن،کی) düman(ki)

ئەو کەسەی لەدوای یەکێکی ترەوە دێت.

**دوومقەسکە** (ن،م) dümiqesk

حاجی ڕەشکە، پەڕەسێلکە.

**دوومل** (ئان) dümil

ناوشان پانی مل قەویی.

**دووملانە** (ن) dümilane

دوو بەرزایی کەنێوانیان قووڵ بێ.

**دوومو** (ئان) dümü

فێلباز.

**دووندان** (نک) dündan

تورەمە، وەچە، بەرەی منداڵی کەسێ.

**دووهۆیی** (ن) ١ dühoyî

جیاوازیی.

**دووهۆیی** (ن) ٢ dühoyî

خۆمانە خۆمانە، خۆمانەیی.

**دووهەم** (ئان) dühem

دوومین، دوەم، دوەمین، دوهەمین.

**دوویساندن** (کتپ) ١ düwîsandin

شیلاندن(بەقاچ)، قاچ پێدانان، پێ پێدانان.

**دوویساندن{کەسێ}** (کتپ) ٢ düwîsandin (kesê)

پێ شێل کردن.

**دووی هەوەسی خۆکەوتن** (ئـد) düy hewsî xo kewtin

بەئارەزووی خۆڕەفتارکردن، کەوتنەدووی ئارەزووی خۆ.

**دوویین** (کتپ) düyîn

دیوار دانان (بەخشتی کاڵ).

**دۆ** (ن) ١ do

دێ، دەو، ئاووماستی ژەنراو کەکەرەی لێ دەرهێنرابێ، ماستاوی لەمەشکەدا ژەنراو، ماستی ژەنراوی کەرە لێ گیراو.

**دۆ** (ن) ٢ do

کیژێ کەلەهەڵپەڕکێدا دێتە دەستی لاو.

**دۆ** (ن) ٣ do

دەو، ڕا، ڕەو، غار، هەڕا.

**دۆ** (ن) ٤ do

دوێنێ.

**دۆبا** (کد) !dob

ڕاکە، غاردە، هەڵێ!.

**دۆب دۆبا** (کتپ) !dob dob

دەی بەغار برۆ، ڕاکە ڕاکە!.

**دۆبڕ** (ئان) dobir̲

بەووم، جووت قۆشە، شووم، دوومۆمر.

**دۆب ژێن** (ن) dob jên

مێلەکێ.

**دۆبە** (ن) ١ dobe

بەرەمێو، مێوی هەنگوین، خلتە ولێلەی هەنگوین، خشت و خاڵی هەنگوین.

**دۆبە** (ن) ٢ dobe

هەنگوینی (پاڵاوتە، سافکراو، قاڵکراو).

**دۆپ** (ئان) dop

نزم، نەویی.

**دۆچن** (ئان) doçin

تۆچن، بەلکان، لیچق، لینج.

**دۆخ** (ن) ١ dox

بار، چۆنایەتیی، چلۆنەتیی.

**دوخ** (ن) ٢ dox

تیری کەوان.

**دۆخ** (ن،ئان) ٣ dox

بەرامبەر، تەراز.

**دوخ** (ئان) ٤ dox

تیژ(لە چێژەدا).

**دۆخ** (ن) ٥ dox

تاف، جەنگە، دۆخیان، دۆخیانەت، هەڕەت.

**دۆخاو** (ن) doxaw

دۆغاو، گەچاو، گێچاو، شۆرواڕێژ، گەچی شلی گیراوە بۆ سپیکاریی دیوار).

**دۆخ ڕەشمە** (ن) doxr̲ešme

دۆخ هەفسار، دەستکێ هەفسار، دەست هەوسار، ڕسەن.

**دۆدانە** (ن) dodane

دۆوانە، دۆدان، دوودانە، دروولە، مەشکۆلەی دۆ، توورەکەی دۆ.

**دۆدکە** (ن) dodik

گەردانە، گەردن بەند.

**دۆدی** (ن) dodî

تەفرە، گزیی.

**دۆدێ وبۆدێ** (ن،رو) dodê w bodê

فێڵ و(تەڵەکە، فەرەج، فەنگێ)، فێلبازیی.

**دۆراخ** (ن،پو) dorax

شویت.

**دۆرا دۆر** (نک) dora dor

دۆر، دەور، ڕۆژگار، زەمانە.

**دۆرنج** (ن) dormic

دۆزەنـگ، دۆرژنـگ، دودە، دیلـە، دێـوەرژەن، قـرم، قورم، گوژەنگ، تەنی، سیان، دووکـەڵ و تۆزوسیانی شـۆڕەوە بـووی بـەبنمیچی ڕووەوە نووسـاو (بەتایبەتی لە لادێ).

**دۆریش** (ن،جج) dorîš

تاجیلۆکـە، حوشـترخوا، دەوریـش، تـاجی ئەحمـەد ڕاوکەر.

**دۆرینگ** (ن) dorîng

مەودا، نیوان.

**دۆڕان** (کتن) [1] Lose, (vi.). doṟan

لەکیس چوون.

**دۆڕان** (کتپ) [2] doṟan

ڕاوکـە گـوم کـردن، لەشـوێنێکی دیکـە هێلکـەکردن (مریشک..).

**دۆڕاندن** (کتپ) doṟandin

دۆڕان، دۆڕیان، زیان کردن، ژێـر(کـەوتن)، لەدەست دان، نەبردنەوە(شتێ لەگرەویان لەیاریدا).

**دۆڕاو** (ئان) [1] doṟaw

لەکیس چوو.

**دۆڕاو** (ن) [2] doṟaw

دۆڕیـاگ، دۆڕیـاو، ژێرکـەوتوو، ژێرکەوتـە(لەگەمـە، یاریی..)، دانیاگ.

**دۆڕێن** (ن) doṟên

بەفیڕۆدەر، ماڵ دۆڕێن.

**دۆز** (ن) [1] doz

١- مەبەست، مەرام، نیاز. ٢-ئامانج، هیوا.

**دۆز** (ن) [2] doz

تۆل، تۆڵە، حەیف.

**دۆز** (ن) [3] doz

پشکن، تەماشا، کاری لێ گەڕان.

**دۆزراو** (ئان) dozraw

پشکێنراو، پشکنراو، پشکناوە.

**دۆزراوە** (ئان) dozrawe

گومی پەیداکراو، وەدۆزراو.

**دۆزەخ** (ن) dozex

دۆژ، دۆژمـە، دۆژەهـ، دووژە، دۆزەمـە، دەرەک، جەهەننەم.

**دۆزەخە** (ن) [1] dozexe

دۆزەقـەی ئـاش، دۆژەزەر، دۆژەکائیـشی، دۆژزر، چرتوون، کونێکە لەژێر ئاشی ئاودا.. ئاوەکەی لێـوە دەردەچێ.

**دۆزەخە** (ن) [2] dozexe

توونی گەرماو، جەهەننەمی حەمام.

**دۆزین** (کتپ) dozîn

بەشوێندا گەڕان، پشکنین، لەدوو گەڕان.

**دۆزینەوە** (کتپ) [1] dozînewe

پەیا(پەیدا) کردن.

**دۆزینەوە** (کتپ) [2] dozînewe

ئاوەڵە کردن، هێنانە ڕوو، هێنانە دی.

**دۆزینەوە{شتی گومبوو}** (کتپ) [3] dozînewe(šitî gumbû)

دۆزیـین، سـەرلەنوێ پـەیداکردن، پـەیداکردنەوە، بینینـــەوە، دەســـت کەوتنـــەوە، دیتنـــەوە، وەملداکەوتن، پەی پێ بردن.

**دۆژ** (ئان) doj

کزۆڵە، کزۆلکە، کزەڵە.

**دۆژەدەر** (ئان،پز) dojeder

بریني (کیماویی، هەوکردوو)، زامێ کـەکێم وهـەوای هەبێ.

**دۆژەن** (ن) [1] ( dojen

لاوێ کەزۆر لەسەر هەوای ژن هێنان بێ، لەسـەر پـێ بۆ ژن هێنان.

**دۆژەن** (ن) [2] dojen

داری دۆتێـک وەردان، دارێ کـەدۆی پـێ تێـک وەردەدەن لەناو مەشکەدا.

**دۆژەنگ** (ن) dojeng

لۆچی ناوچەوان یان لاچاو، گنجیی تویل.

**دۆست** (ن) [1] dost

ئاشـنا، دۆس، ئـەروو، هەڤـاڵ، هـەواڵ، دەسـتە(بـرا، خوشک).

**دۆست** (ن،ئان) [2] dost

دڵخـوان، دڵـدار، دۆس،.. دۆسـتک، دڵارام، دڵ ئـارام، دولبەر، خۆشەویست، ماشـقە، ماشـوق، یـار، یـاوەر، لاوک هەڤین.

**دۆستانە** (ئاک) dostane

برایانە.

**دۆستایەتیی** (ن) [1] dostayetî

ئەینیی، ئەوینیی، هەڤینیی، هەیڤین.

**دۆستایەتیی** (ن) [2] dostayetî

دۆستیی، هاودڵیی.

**دۆستایەتیی** (ن) [3] dostayetî

دۆسایەتیی، دۆسیی، هاودەمیی.

**دۆستایەتیی لەگەڵ گرتن** (کتن) dostayetî legel girtin
هاوەڵایەتیی لەگەڵ گرتن، دۆستایەتیی گرتن(لەگەڵ کەسێ).

**دۆستان** (نک) dostan
ئاشنایان، یاران.

**دۆستان** (ن) dostan
سیپا، سیپایەی سەر ئاگر (کەلەئاسن.. دروستکرابێ).

**دۆست پەروەر** (ئان) dostperwer
هەواڵدۆست، ڕەفیق دۆست.

**دۆسیە** (ن) dosye
فایل، دەوسیە.

**دۆش** (ن) doš
١- مل. ٢- ئاوشان.

**دۆشاو** (ن) došaw
دۆشاب، دۆشاف، دیشاف، دیشاو، دمس، شۆک، ئاوی تریێ کوڵاو، شیرەی کوڵاوی ترێ، خورما، توو..

**دۆشاو مژە** (ن) došaw mije
پەنجەی (ئاماژە، شادە)، پەنجەی تەنیشت پەنجە گەورە.

**دۆشاویی** (ن) ١ došawî
ڕەنگی سووری تاریک، قرمزیی.

**دۆشاویی** (ئان) ٢ došawî
دۆشاو بەرکەوتوو، لەدۆشاوەوەچوو.

**دۆش دامان** (ند) ١ doš daman
گیربوون، ماتەڵ بوون.

**دۆش دامان** (کتن) ٢ doš daman
ڕامان، بیرکردنەوە.

**دۆش دامان** (کتن) ٣ doš daman
دۆژدامان، دەستەوستان بوون، دامان، دژ دامان، کز دانیشتن، مات (بوون، دانیشتن)

**دۆش داماو** (ئان) ١ došdamaw
ڕاماو لەدەریای بیر کردنەوەدا.

**دۆش داماو** (ئان) ٢ došdamaw
دۆژداماو، دژ داماو، دۆش داماگ، دژبوو، کزدانیشتوو، مات (ڕۆنیشتوو،بوو)، سیس ڕۆنیشتوو، تێماو.

**دۆشراو** (ئان) došraw
دۆشیاگ، دۆتیی، شیرلەگوان وەرگیراو.

**دۆشەک** (ن) došek
دۆشک، دۆشەکە، دۆشەگ، توشەک، ڕایەخی ئاوئاخنراو ژێر ڕایەخی ئاوتێخراو، ژێرەخەری پڕ لە (لۆکە، پەڕۆ یان خوریی).

**دۆشەکەلە** (ن) došekele
دۆشەکچە، دۆشەکی(پچووک، چکۆڵە)، مەندەر.

**دۆشەنیی** (ن،ئان) došenî
دۆشانیی، دۆشیدەنیی، دۆشەندە، دووشا، دۆکردە، مەڕوماڵاتی شیردەر، ئاژەڵی شیردەر کەبۆدۆشیین دەست ئەدا، ئاژەڵێکە بۆ دۆشیین بەکار بهێنرێ، تەڕەزەن.

**دۆشیین** (کتپ) došîn
دۆتن، دۆشان، دووشیین، شیر(لەگوانی ئاژەڵی شیردار دەرهێنان).

**دۆخریی** (ن) doxrî
ئاخاوتنی دروست، قسەی ڕاست.

**دۆق** (ن) ١ doq
کوتەک، میکوت، دووق، توپز، داردەستی (سەر ئەستوور، سەرخڕ)، داردەست کەسەرەکەی بەگرێیەک کۆتایی هاتبێ.

**دۆق** (ع) ٢ doq
کاری (لێدان، تێ سرەواندن).

**دۆق** (ع) ٣ doq
کاری (لێخستن، تێسوون).

**دۆق** (ن) ٤ doq
خامی ڕەش، مادامی ڕەش، مایەی ڕەش.

**دۆقلمەر** (ن) doqilmer
دەم شڕ.

**دۆک** (ن) ١ dok
دۆوک، دۆکە، دەووک، دەوژن، تلپە، خلتەوکەف وکوڵ(دۆشاو یان کەرەی قاڵکراو).

**دۆک** (ن) ٢ dok
تەشی.

**دۆکولیو** (ن) dokulîw
دۆخاوە، دۆخۆ، دۆغەوا، دۆکلیو، هب(ئاشماست).

**دۆڵ** (ن) ١ dol
دۆڵیان، دەوڵ، خانۆک، گەروو، گەریی، گوهۆر، شیوەدەرە، ئەقب.

**دۆڵ** (ن) ٢ dol
دەراو، دەرە، دۆپ، دەهل، شیو، شیوەڵە.

**دۆڵ** (ن) ٣ dol
١- کیسەی چەرمین بۆ ئاو. ٢- کوندەی پچووک.

**دۆڵ** (ن) ٤ dol

پارچە زەویی ڕاست، گۆشتەزەویی.

**دۆڵ** (ن) ٥ dol

دنکێ، سندۆڵ، دەستگایەکە لەبەرد یان دار قووڵ هەڵکەنراوە بۆ ئەوەی گەنمی ساوەر یان برنجی تێدا بکوترێ، ئاونگی بەردین.

**دۆڵ** (ن.ئم) ٦ dol

دەمۆڵ.

**دۆڵ** (ن) ٧ dol

خلۆر، گلار.

**دۆڵ** (ن) ٨ dol

گاسنی سەرچەماو (بۆ بەرز کردنەوە و هەڵگێرانەوەی زەویی).

**دۆلاب** (ن) ١ dolab

دۆلابە، دۆڵاو، جێگەی جل وبەرگ لەدیواردا یان لەتەختە دروستکراو، کەنتۆر، دۆلابەی مووبەق.

**دۆلاب** (ن) ٢ dolab

فێل وفەرەج.

**دۆلابە** (ن) dolabe

کونی جێگەی دۆڵاش، کونێکی گەورەیە لەسەربانی ئاسیاو دەهێلرێتەوە بۆ ئەوەی لەوێوە (نێ)دا بهێلرێتە خوارەوە.

**دۆلاغ** (نک) ١ dolax

پووزێیچ، بەلەک پێچ.

**دۆلاغ** (ن) ٢ dolax

فۆتەی ڕەشی سەرپۆشی ژنان.

**دۆڵ بوون** (کتن) dolbûn

خلۆربوونەوە، گلۆربوونەوە، گلارەوەبوون.

**دۆڵپا** (ن) ١ dolpa

میردەزمە، میرەزمە، دێوێکی چیرۆکانە کەسواری ملی خەڵک دەبێ لەکاتیخنووستندا.

**دۆڵپا** (ئان) ٢ dolpa

مرۆڤی دەست هەڵ نەگری چەل ومەل.

**دۆڵچە** (ن) dolçe

سەتڵی چەرمین، سەتڵی کاریزکەن یان بیر هەڵکەن.

**دۆڵک** (ن) dolik

شیوەڵە.

**دۆڵکان** (ن) dolkan

خوارەکەو پێچەکە، زیگزاگ.

**دۆڵکە** (ن) ١ dolke

دۆڵگە، دەفری سەربەرەڵای لێودار بۆ ئاو، دەفری قووڵ و دەسکدار بۆ شلەمەنی تێ کردن و ڕۆکردن...

**دۆڵکە** (ن.ئس) ٢ dolke

دۆلکە، بورجی(سەقا، ئاوهێنەر، سەتڵ).

**دۆڵە** (ن) dole

کووڵ، تەشتیدارین.

**دۆڵەدرێژ** (ن) dole drêj

پەنجەی ناوەند، قامکی ناوەڕاست.

**دۆڵەکە** (ن) ١ doleke

قووڵینە، جێخنان.

**دۆڵەکە** (ن) ٢ doleke

سوێنە.

**دۆڵیان** (ن) ١ dolyan

دۆڵاش، دۆڵدان، دۆڵیدان، سەرنێ وتەنوورەی ئاش.

**دۆڵیان** (ن) ٢ dolyan

ئەو شوێنەی لەئاشدا دانەوێڵەی تێ دەکرێ بۆ هاڕین، نێ.

**دۆڵیان** (ن) ٣ dolyan

ئاوگیر، دۆڵاش، دۆڵاو، دۆڵە(بۆ ئاش گێران).

**دۆڵیانە** (ن) dolyane

جێ(دانە)ی ئاش، ئەوشوێنەی کەدانەی ئاشی تێ دەکرێ، بانێژەی ئاش.

**دۆم** (ئاک) ١ dom

بەردەوام، داییم، هەروەهەر، هەمیشە، دەراندەر.

**دۆم** (ن) ٢ dom

کاولیی، کاوەلیی، هۆزێکیکۆچەریناسایییە.

**دۆماندن** (کتپ.کی) domandin(ki)

دەوام پێدان.

**دۆمانە** (ن) domane

گورگەلۆقە، قۆرتە، قەترە.

**دۆمە** (پ) dome

نێوان، مابەین.

**دۆمێ** (ن) domê

دۆستی بەڕاستی، هەوالی بەئەمەگ.

**دۆمینە** (ن) domîne

دۆمنە، یەکێ لەویاریانەی بە ٢٨ پوولی دۆمینە دەکرێ.

**دۆن** (ن) ١ don

ڕۆن، بەزی تواوە، ڕۆنەکەرە...

**دۆن** (ن) ٢ don

نزیکە، نێزیکە، نزیکیی، نزیکایی، نیزیکیی.

**دۆنادۆن** (ن) donadon

بڕوای ئاڵ وگۆڕبوونی گیان لەپاش مردن لەکەسێ یان زیندەوەرێکەوە بۆ یەکێکی دیکە.

**دۆن دان** (کتپ) ١ dondan
چەورکردن، چەوریی تێ هەڵسوون.

**دۆن دان** (کتپ) ٢ dondan
بەرتیل پێدان.

**دۆندرمە** (ن) dondirme
بەستەنیی.

**دۆنگیی** (ن) ١ dongî
هەست.

**دۆنگیی** (ن) ٢ dongî
گومان.

**دۆنم** (ن) donim
پێوانەیەکی زەوییە=٢٥٠٠ مەتری چوارگۆشە.

**دۆو** (ن) dow
ڕەدوو.

**دۆوات** (ن) dow wat
بووکێنیی.

**دۆیجە** (ن) doyce
لەرزە.

**دۆیرد** (نک) doyrd
دوویردە، دوێردک، دووکیردە، قەیچیی.

**دە** (پ) ١ de
لە، لە(دەمی، کاتی).

**دە!** (نسپ) ٢ de!
وشەی هاندان: دەبچۆ!، ئێستا، هەرئێستا!.

**دە** (ن،ئان) ٣ de
یەک ونۆ، یەک لەنۆزیاتر، پێنج وپێنج دەکاتە(دە)،ژمارەی پەنجەکانی دەست یان قاچی مرۆڤ.

**دە** (ئان، ئاک) ٤ de
ئێجگار، زۆر.

**دە** (ئاک، ئپ) ٥ de
ئیتر، سا.

**دهار** (ن،ئان) dihar
ئەوپەڕ، چلەپۆپە، دوند.

**دەب** (ن) deb
تختە، تەختە، دار، دیبەکێ، لەوحی دار.

**دەبا** (ف) ١ deba
قەیناکا، قەیناکە، قەی چدەکا.

**دەبا** (ف) ٢ deba
دەبووایە.

**دەبا** (نسب) ٣ deba!
بریا، خۆزگە، کاشکی.

**دەباخ** (ن) debax
خۆش کردنی چەرم، هەڵاڵ دانی پێستە.

**دەباخانە** (ن) ١ debaxane
جێگەی (دەباخیی، دەباخ دان)، شوێنێکە پێستەی تیا دەباخ بدرێ، جێگەی پێستە لەدەباخ (دان، کردن)، خۆشەخانە.

**دەباخانە** (ن) ٢ debaxane
مزی چەرم لەهەڵاڵ دان.

**دەباخچیی** (ن) debaxçî
دەبباخ ، دەبباغ، ئەوکەسەی پێستە دەباخ بدا.

**دەباخ دان** (کتپ) debax dan
دەباخ کردن.

**دەباخ کردن** (کتپ) debaxkirdin
پێستە(خۆش کردن، لەدەباخ دان، دەباخ دان، دەباخ کردن، جەوت.. لێ دان.)، چەرم (خۆش کردن، هەڵاڵ دان).

**دەباخیی** (ن) debaxî
دەباغیی، کاری(خاوێن کردنەوە و خۆش کردنی پێستە، لەدەباخ دانی چەرم).

**دەبار** (ئان) ١ debar
هاوشان، هاوهێز.

**دەبار** (ن) ٢ debar
جێ بەجێ، کاری بەجێ هێنان.

**دەباغ** (ن) debax̲
دەباخ.

**دەبان** (ن،ئان) deban
جۆرێ پۆڵایە بۆ دروست کردنی شیر وخەنجەر.. بەکار دەهێنرێ،
پۆڵای ئاوداری پڕنەخش ونیگار.

**دەب دەبە** (ن) ١ debdebe
پروپاگاندە.

**دەب دەبە** (ن) ٢ debdebe
هەراوبگر، هەراوزەنا، هب:(ئاژاوە ١/).

**دەبدەبە** (ن) ٣ debdebe
تەنتەنەو دەست وپێوەند، شکۆومەزنیی عەشاماتی گەورەپیاوان.

**دەبر** (ن) debir
ژیان وگوزەران، تفاق وهۆی پێویست بۆ ژیان.

**دەبنەوەبر** (ئان) debinewebir̲
سەرکزی دڵ وریا، مرۆڤی دڵ وریای بەڕواڵەت فەقیرۆکە.

**دەبۆ** (ن) debo ١
شوێنی هەڵگرتنی چەک وتەقەمەنیی.

**دەبۆ** (ن) debo ٢
سەبازگە.

**دەبوو** (ف) debü
دەبووایە.

**دەبووایە** (ف) debwaye
ئەبوو، ئەبووایە، دەبوو.

**دەبوور** (ن) debür
بای (ڕۆژهەڵاتی خواروو، خۆرهەڵاتی خواروو).

**دەبووش** (ئان) debuš ١
چەسپی ڕووەک، جەوری.

**دەبووش** (ئان) debuš ٢
لینج، نووسەک، دەبیش، لیچق.

**دەبە** (ن) debe
قۆربی پچووک.

**دەبە** (ئان) debe
ژیر ملۆل، ملۆل، مەلۆل.

**دەبە** (ن) debe ١
تەشقەڵە.

**دەبە** (ن) debe ٢
توورەکەی بارووت (بۆ تفەنگی ڕاو).

**دەبە** (ئان،پز) debe ٣
قۆڕ، (مرۆڤ).

**دەبە** (ن) debe ٤
١- پیپ، بەرمیل.
٢- خیگە، کووپە، دەفری ئازووقە

**دەبەر** (ن) deber
دەبر، جێبەجێ، چارە.

**دەبەر کردن** (کتپ) deber kirdin ١
دەبرکردن، پێک هینان، جێبەجێ کردن، بەجێ هینان، چارەکردن.

**دەبەرکردن {جل وبەرگ}** (کتپ) ٢
deber kirdin (cil w berg)
لەبەرکردن، کردنەبەر، پۆشیین.

**دەبەرکەوتن** (کتن) deber kewtin ١
چوونەلای ژێروو لەڕێگەدا، کەوتنەبەرەوە لەڕێشتندا.

**دەبەرکەوتن** (کتن،کتپ) deber kewtin ٢
چوونەلای ژێروو لەڕێگەدا، کەوتنەبەرەوە لەبەر پارانەوە، لێ پارانەوە.

**دەبەر مردن** (کتپ،کتن) deber mirdin
بەقوربان بوون، دەبەرکەوتن، دەبەرگەڕان، لەبەرمردن.

**دەبەنگ** (ن) debeng ١
سۆزانیی، قەحبە.

**دەبەنگ** (ئان) debeng ٢
سەرخۆش.

**دەبەنگ** (ئان) debeng ٣
بێناوەن، گێژ، گێل، گەمژە، وڕ، حەپۆل.

**دەبێ** (ئاک،شر) debê ١
ئەبێ، ئەشێ، دەشێ، قەمیی، لەوەدەچێ، لەوانەیە، وێ دەچێ.

**دەبێ** (شر) debê ٢
ئەبێ، پێویستە.

**دەپەڕێش** (ئان) deperêš
ئەردین زەلام، دەپەردین، ڕیش پان.

**دەپەشۆر** (ن) depešor
تاتەشۆر، تەختەی مردوو لەسەر شتن.

**دەپەقوون** (ئان) depeqün
پاشل زەلام، قنگ پان، سمت ئەستوور.

**دەپێ کردن {دەرپێ، پێلاو}** (کتپ)
depê kirdin (derpê, pêlaw)
لەپێ کردن.

**دەجاڵ** (ن) decal ١
جەجاڵ، بەرهەڵستیکەر (عیسا، مەهدیی).

**دەجاڵ** (ن) decal ٢
فێڵباز.

**دەحا** (ن) deha
ئەحا!.

**دەحل** (ن،کی) dehil(ki) ١
بیشەی دەستکرد، دارستانی دەستنیژ.

**دەحل** (ن،کی) dehil(ki) ٢
باخ وباخاتی زۆر، شوێنی (پرپێنچک و چوغور، زەبەند وچر).

**دەخالەت** (ن) dexalet
داڵدە.

**دەخالەت بۆ بردن** (کتن) dexalet bo birdin
داڵدە هینان.

**دەخس** (ئان) dexis ١
بوغزاویی، بوغز لەسک، ڕقاویی.

**دەخس** (ن،پز) dexis ٢
نەخۆشیی دڵ.

دەخسین (کتن،کتپ،کی) dexisîn(ki)
نیرەیی بردن، بەخیلیی پێ بردن، پێ هەڵکالان.
دەخش (ن) dexiš [1]
سەرمەقولات.
دەخش (ن) dexiš [2]
زللە، شەپازلە، شەقازلە، شەقام، شەپەلاخ.
دەغل (نک) dexil [1]
داهات.
دەغل (ن) dexil [2]
پێوەندیی، پەیوەندیی، بەندیواریی.
دەغلدار (ن) dexildar
سەرپەرشتیکەری دەخیلە، کەسێ ئاگای لەپارەو پوولی ڕۆژانەی ماملەدەبێ، شارەزا لەکاروباری مالداریدا.
دەغل کردن (کتپ) dexil kirdin
دەغل کردن، لاقەکردن، سەرجێبیی لەگەڵ کردن.
دەخمە (ن،لو) dexme(lu) [1]
١- بۆدر، بوودر، دەغمە، قوولکەی ژێر زەوی.
٢- تونێل، ڕێگەی ژێر زەویی.
دەخمە (ن) dexme [2]
قەبر، قەور، گۆڕ.
دەخۆنووسان {ئەسپ} (کتن) dexo nüsan(esip)
غار(کردن، دان)، دانەغار، لینگ دان.
دەخوەر (ئان) dexwer
ئازا، میرخاس.
دەخیل (ن) dexîl [1]
پەنابەر، پەناهێندە، پەنایەندە، پەناهاوردوو، پەناهێناو، دەغیل.
دەخیل (ن) dexîl [2]
دەغیل، تەسلیم بووگ(بوو) لە (جەنگدا، شەڕدا).
دەخیل (ئان،ن) dexîl [3]
هاواربردوو، پەنابردوو(بۆ کەسێ).
دەخیل بردن (کتپ) dexîl birdin
پەنا (بردن، هاوردن، هێنان)، هانابۆ بردن.
دەخیلت بم! (رس) dexîlt bim!
تکات لێ دەکەم.
دەخیلە! (نسب) dexîle [1]
نەچی وابکەی!، هەی نەکەی!.
دەخیلە (ن) dexîle [2]
دەغیلە، قوتوی (دراوی دوکاندار، داهاتی ڕۆژانە).
دەدڵ چەقیین (کتن،کتپ) de dil çeqîn
بە(دڵداهاتن، یاددهاتن)، بیرکردن لەشتێ کەنەزانرابێ، لەدڵ چەقیین.
دەدە (ئاک) dede [1]
دەبەیەکجار، دەپێکەوە و ئنجا دەی تریش.
دەدە (ن) dede [2]
وەرپێلکە، کچی پچکۆلەی لەلە، کچۆڵەی وەرگێرکەی منداڵ..
دەدە (ن) dede [3]
پوور، مەت.
دە دەورگەڕان (کتن) de dewir geran
بەسەدەقە بوون، بەقوربان بوون، خۆ بەقوربانی کەسێ کردن، لە دەور گەڕان.
دەدی (ئاک، ئپ) dedî
وەک، وەکو، هەروەک، چون، چۆن، لەگوین.
دەر (ن) der [1]
جێ، جێگە، شوێن.
دەر (ن) der [2]
دەرگا.
دەر (پ) der [3]
بە، سەر، لە، ناو.
دەر (ن) der [4]
دەشت.
دەراب (نک) derab
تەریب، تەقەڵی درشت (شتی درواو).
دەرازین (ن) derazîn
دەرازوون، دەرازوونە، دەرازینک، دەریزان، سەردەرانە، ئاستانەی دەرگا، بەردەمی قاپی.
دەرامەت (ن) deramet
ئەنوا، مایەی (ژین، گوزەران)، هۆی ژیان بەڕێ چوون.
دەراندن (کتپ) derandin
پەرژوبڵاو کردنەوە، پرش وبڵاوکردنەوە.
دەراندەر (ئاک) derander
تێکرا، بەتەواویی.
دەراو (ن) deraw [1]
دەراف، بوار، جێگەی پەڕینەوە لەئاو.
دەراو (ن) deraw [2]
دەراف، جێگەی ئاوخواردنەوەی مەڕ ومالات وچارەوێ.
دەراهی (ئاک،کی) derahî(ki)
ئەوێ، ئەوێرێ، ئۆگە.
دەربار (ن) derbar
دیوەخانی پاشا، کۆشکی پاشایی.

**دەستومۆچ** (ن) destwmoç
دەس(مۆچ، مشتاخ) یان دەس ومۆچ.

**دەستومۆچ کردن** (کتپ) destwmoç kirdin
دەس ومۆچ کردن، دەستی یەکتر ماچ کردن.

**دەست وەشێن** (ن)[1] destwešên
دەس وەشێن، لێدەر، هێرش(بۆبەر، هێنەر)، گەمارۆ دەر.

**دەست وەشێن** (ئان)[2] destwešên
دەس وەشێن، بێپارێز، پەتەریی، نەپارێز.

**دەست وەشێن** (ئان)[3] destwešên
دەس وەشێن، شێتێ(کەلەخەڵک دەدا، کەهێرش بۆ خەڵک ببا).

**دەستە** (ئان)[1] deste
دەسە، مام ناوەندیی، نێوان ئەستوور وبارێک.

**دەستە** (ئان)[2] deste
دەسە، نێوان درێژوکورت.

**دەستە** (ئان)[3] deste
دەسە، نێوان گەورەو پچووک.

**دەستە** (ئان)[4] deste
گەنج، جاهێل.

**دەستە** (ن)[5] deste
دەسە، بڕ، تاقم، تارم، ڕەوە، جەلەب، گرۆ، گروو، گەل، گەلە، کۆمەل، کۆمەلە.

**دەستە** (ن)[6] deste
هاومال.

**دەستە** (ئان)[7] deste
دەسە، هاو(تەمەن، عومر).

**دەستە** (ن.س)[8] deste
کۆمەلی ١٠-١٢ (جەنگاوەر، سەرباز).

**دەستە** (ئان)[9] deste
دەسە، هاو(توخم، ڕەسەن).

**دەستە** (ن)[10] deste
ژمارەی (١٢)لە سەعاتدا.

**دەست هاتن** (کتن) dest hatin
دەس هاتن، بۆ(شیان، گونجان)، بوزخواردن.

**دەستەبرا** (ن) destebra
دەسەبرا، برادەر، دۆستی خۆشەویستی پیاو بۆ پیاو، دۆست وبرادەری یەکتر، دۆستی گیانی بەگیانی، دەس برا، دۆستی یەکتر، هەڤاڵی نزیک.

**دەستەبوخچە** (نک) destebuxçe
دەسەبوخچە، بوخچە، بوخچەو پریاسکەی ژنانە، بەروبوخچەی ئافرەت.

**دەستەبەر** (ن) desteber
دەسەبەر، دەستەوەر، بەڵێندەر، بەرعۆدە، زامن. کەسێ کە بەڵێنی بەمرۆڤێ دابێ بۆجێبەجێ کردنی فەرمانێک.

**دەستەبەربوون** (کتن.کتپ) desteberbûn
دەسەبەربوون، دەستەبەریی کردن، لەئەستۆی خۆ گرتن، لەملی خۆ گرتن.

**دەستەبەرە** (ن)[1] destebere
دەسەبەرە، دەستەبەر، عەرەبانەی دەست.

**دەستەبەرە** (ن)[2] destebere
تەختەڕەوان.

**دەستەبەریی** (ن) desteberî
دەسەبەریی، زامنیی، بەڵێن، دەستەواریی.

**دەستەبەندیی** (ن) destebendî
دەسەبەندیی، خۆبەخۆیی.

**دەستە پاچە** (ئان)[1] destepaçe
دەسەپاچە، دەسپاچە، دەستەپارچە، دەسەپارچە، نەتوان، هیچ پێ نەکەر.

**دەستە پاچە** (ئان)[2] destepaçe
١- دەسەپاچە. ٢- سەرگەردان، سەراسیمە، سەر لێ شێواو، داماو. ٣- بێکار.

**دەستە جلەو** (ن) deste cilew
دەسەجلەو، دەست هەوسار، هەوسار، دزگین، دەستە ڕیسمە، دزگیر، دەسکەڕەشمە، دەسکەوسار، ئەوپارچە قایشەی لەلغاو هەڵ دەکێشرێ.

**دەستە چرا** (ن) deste çira
دەسەچرا، چرادەستیی، قوتیلە، قوتیلکە، قوتولە،قودیلەچرا، فتیلە.

**دەستە خوشک** (نک) deste xûşik
دەسەخوشک، چەندئافرەتێک کە دۆستایەتیان خۆش بێ، دۆستی خۆشەویستی ئافرەت بۆ ئافرەت، هەوالی ژن بۆ ژن.

**دەستە داو** (نک) deste daw
دەسەداو، دەسکەداو، چەپکەداو، کۆمەڵێک(داوی ڕاو، داموسکی بادراو بۆ ڕاو ئامادەکراو).

**دەستەدوو** (ن) destedû
دەسە(دوو، کەوشە)، دەستە(کەوشە، گوشە، مستە، دووقک)، دەستەندووی هێشە، دەزگری (جوتێر لە هەوجاردا، هەوجاڕ)، دەسگیرەی جوتیار لەپاشر بارەدا،ئەو دارەی دا ئەکوترێ بەسەر هەوجاڕدا ودەستی پێ ئەگیرێ لەکاتی جووت کردندا.

**دەستەدەستە** (ناک) destedeste
دەسەدەسە، کۆمەڵ کۆمەڵ، گرۆگرۆ، گەڵ گەڵ، پۆل پۆلە.

**دەستەر** (ن) dester
دەسەر، دەستەر، شەقل.

**دەستەشکاو** (ئان) deste şikaw
کۆڵەوار، ماڵ ویران.

**دەستەک** (ن) ¹ destek
ئالۆدار، دەسەک، داری داڕەرا، ئەودارانەی لەخانو دا-پۆشیندا دەکەونە سەرکاریتە.

**دەستەک** (نک) ² destek
ریزەدیراو.

**دەستەکچ** (ئان) destekiç
کچی ئازەب، کیژی تازە پێگەیشتوو، کچ عازەو، بەشوو، هەرزە، ئاڵ وبۆڵ، کیژۆلە.

**دەستەک دز** (ن) destek diz
کەسێکە ماڵ(بنێتەوە بۆ دزی، دەسنیشان بکات بۆ بڕین).

**دەستەکردن** (کتپ) destekirdin
دەسەکردن، بەستەبەستە لەسەریەک دانان، چین لەسەر چین خستنە سەریەک، شت بەدەستەکردن، وە بەستە کردن، کردنەدەستە.

**دەستەکوتە** (ن) destekute
پەلەکوتە، دەستە(قوتێ، کوتێ) {وەک لە تاریکیدا}.

**دەستەکوڕ** (ن) destekur̄
تازەلاو، تازە نەوخەت، جحێل، جەهێل، کوڕی هەشت نۆ ساڵەیی.

**دەستەمۆ** (ئان) ¹ destemo
دەست ئاژۆ، دەستاژۆ، دەس ئاژۆ، دەساژۆ، دەستیی، رام، کەدیی، ئاژەڵێ کە رامی دەستی خاوەنی بێ ونوو بگیرێ کەویی، ماڵیی، ئاژەڵێ کەخووی بەخاوەنییەوە گرتووە ونوو دەگیرێ.

**دەستەمۆ** (ئان) ² destemo
کارەکەر، کەنیزەک.

**دەستەنگ** (ئان) ¹ desteng
دەست تەنگ، دەس (دەست) {وشک، هیشک}، کەم دەست، هەژار.

**دەستەنگ** (ئان) ² desteng
سوخت، بێپارەوپوول، موفلیس، لات.

**دەستەنگیی** (ن) destengî
دەست (تەنگیی، کورتیی)، کەم دەستیی، هەژاریی.

**دەستەوئەژنۆ** (ئان) ¹ deste w ejno
دەستەئەژنۆ، دەس(بەئەژنۆ، بەزرانی)، دەسەوئەژنۆ، خەمبار، مات ومەلوول، مەلوول، ژیان لەبەرچاو تاریک بوو، هەناسەسارد.

**دەستەوئەژنۆ** (خ.) ² deste w ejno
١- بێ کارە، دەست بەتاڵ.
٢- پەک کەوتە، لەکارکەوتوو.

**دەستەوا** (ن) destewa
دەستیاو، کاری شت بەشتی وەک خۆی گۆڕینەوە، ئاڵ و گۆڕ.

**دەستەوارە** (ن) ¹ desteware
دەستەوار، دەسەوار، دەسەوازە.

**دەستەوارە** (ن) ² desteware
دەسەوارە، دەسەوار، ئەوەندەی لەسەردەست هەڵ بگیرێ(شت).

**دەستەوانە** (ن) destewane
بازن، مووچەوانە، دەسبێنک، دەزبێنک.

**دەستەو خەنجەر ڕاوەستان** (ند) destew xencer r̄awestan.
گورەشە(کردن، لێ کردن)، گەف(لێ کردن، کردن)، هەڕوگیف کردن.

**دەستەو داوێن بوون** (کتن) deste dawên bûn
پاڕانەوە، لالانەوە، واریانەوە.

**دەستەودوعا** (ناک) destew dû'aa
بەدوعا پاڕانەوە، پاڕانەوەی (بەدوعاوە، بەنزاوە).

**دەستەوسان** (ن) destewsan
١- دەسە(دەستە) {پارچە، وسان، وستان}، بێ(چارە، عیلاج)، پەک کەوتە. ٢- بێکارە، تەمەڵ، بەتاڵ پێ، هیچ لەباردانەبوو.

**دەستەوسان کردن** (کتپ) destewsan kirdin
بێ هێزکردن، پەک خستن، هێز لەبەربڕین.

**دەستەوشار** (ئان) destewşar
بەدەست گوشراو.

**دەستەوکەمەر وەستان** (ند) destewkemer westan
بێ دەربەس بوون، دەربایس نەبوون، دوورە پەرێز لێ ڕاوەستان.

**دەستەوکێرد** (ئان) destewkêrd
گیاندارێکە کەوتبێ وچرچی لنگی لێ ڕاکێشابێ.

**دەستەوناو** (ن) destewnaw
ڕێگای سەربەرەوخوار، ڕێگەی سەر بەرەژێر.

**دەستەو نەزەر** (ن) destew nezer
دەسەونەزەر، دەس (دەست) (بەسینە، بەسنگەوە

ڕاوەستاو)، لەخزمەت ڕاوەستاو، چاوەڕێی فەرمان.

**دەستەو یەخە** (ن) destew yexe [1]

{دەس(دەست)}بەیەخە، دەستەویەخە، بناقێ، شەڕو بنار، شەڕوکێشە، دەستەوبەرۆک.

**دەستەو یەخە** (ن)[2] destew yexe

دەسەویەخە، شوێنی زۆرنزیک.

**دەستەو یەخەبوون** (ئد)[1] destew yexebûn

دەست دانەیەخەی یەکتر، دەسەو یەخەبوون، ڕووبەڕووبوون، دەستەوبەرۆک بوون، دوژمنانە ڕوو بەڕووی یەک بوون، بەگژیەکتریدا چوون.

**دەستەو یەخەبوون** (ئد)[2] destew yexebûn

لێ نزیک بوونەوە.

**دەست هەڵبەست** (ن) dest helbest

دەس هەڵبەس، درۆی بەتایبەتی ڕێکخراو، دەس ئەلوەس.

**دەست هەڵبەست کردن** (کتپ)

dest helbest kirdin

دەس ئەلوەس کردن بۆکەسێ،

دەم هەڵبەست کردن بەرامبەریەکێ.

**دەست هەڵگرتن** (ئد) destew helgirtin

١- وازهێنان (لەکار). ٢- پشوودان.

**دەست تێ نان** (کتپ) dest tênan

خۆ تێ هەڵقورتان.

**دەستیار** (ن) destyar

یارمەتیدەر، یاریدەدەر، هاودەست، یاوەر، هاوکارە، هامەکارە.

**دەستیاری** (ن) destyarî

یارمەتیی، یاریدە، هاودەستیی، زبارە، هاوکاریی، هەرەوەز.

**دەستیاو** (ن) destiyaw

١- دەساو، دەستاو، پاداشی چاکە، چاکەبەچاکە.

٢- دەستەواو، دەستەڤایی.

**دەستی پشتەوەی نییە** (ئد)

destî piştewey niye

دەرگاکە لەدوایخۆیەوە داناخاتەوە کاتێدێتە ژوورەوە.

**دەستێ حاکم بیبرێ خوێنی نییە** (رس)

destê hakim bîbrê xwênî niye

هەر کارێک لەڕێی یاساوەبکرێ پەسەندە.

**دەستی شکاو ئاو ملی گەردنە** (پن)

destî şikaw awmily gerdine

قورسایی دەستی شکاو لەئەستۆی گەردنە واتە: جاری وامەیە مرۆڤ ناچارە بەدرەفتاریی خزم و خۆیش قووت بدا، یان مەبەست: دەستی یارمەتی درێژ کردنە بۆ کەسوکاری هەژار.

**دەستێک نەتوانم بیبرم ماچی دەکەم** (پن)

destêk netwanim bîbrim maçî dekem

هەرچ شتێ چارەی نەبێ پێویستە بەچیکلدانەبی لەگەڵیدا.

**دەستی لێ پشۆ** (رس) destî lê pişo

١- چاوەڕێی مەبەکەبێتەوە.

٢- چاوەڕێیی مەبە ئەنجامێکی باشی ببێت.

**دەستی والە کیسەی خەلیفەدا** (رس)

destî wa le kîsey xelîfeda

پارە لەکیسەی خەلیفەخەرج کردن،

پیاوەتیی بەسەر پارەی خەڵکەوەکردن.

**دەستی یارمەتیی** (ن) destîyarmetî

پشتیوانیی، داکۆکیی، فریاڕەسیی.

**دەستی یارمەتیی بۆ درێژکردن** (ئد)

destî yarmetî bo drêj kirdin

یاریوو بۆ کردن، یارمەتی فریاخستن، چوونەژێر باڵ.

**دەستیی** (ئاک) destî

بەدەستیی، دەست بەدەست دراو، نەقدیی.

**دەستیی دەستیی** (ن) destî destî

دەسیی دەسیی، دەستیبەدەستیی، دەسیبەدەسیی، ئەفرە، فریو، پەت پەتیی.

**دەس خستن** (ئد) des xistin

دەست خستن، بەگیرهێنان، وەگیرهێنان.

**دەسخۆر** (ن) desxor

تونگە، چێشتی گرار (توندەوە بوو).

**دەسخورێن** (ن،رو) desxurên

گەزگەزۆک.

**دەسخۆش!** (ئسپ) desxoş!

ئافەرین!، بەجێیە!، پەسندە!، باشە!.

**دەسخەت** (ن) desxet

دەستخەت، دەسنووس، بەدەست نوسراو، وەدەست نوسیاگ.

**دەسخەر** (ن) desxer

دەستخەر، پەیداکەر، کەسێکەدەتوانێ شت پەیدابکات.

**دەسخەڕۆ** (ئان) desxero

دەستەشکینی(کراو)، دەسەشکین، فێڵ لێ کراو، دەستخەڕۆ.

**دەسخەڕۆبوون** (کتن)[1] desxerobûn

دەستخەڕۆبوون، ئەفرەخواردن.

**دەسخەڕۆبوون** (کتن) ٢ desxerobûn
لەئیش بوون، دەسەپاچەبوون.

**دەسخەڕۆ کردن** (کتپ) desxero kirdin
دەستخەڕۆ کردن، دەستەشکین کردن، دەس بەستن، تەفرەدان.

**دەسخەڕۆیی** (ن) desxeroyî
دەستخەڕۆیی، دەسخەرە، دەستەشکین.

**دەسخەلیان** (کتن،لو) desxelyan(lu)
دەس لەجێ چوون.

**دەسدار** (ئان) desdar
بەجەوڕ، خاوەن زۆر، زۆردار، ستەمکار.

**دەسداری** (ن) ١ desdarî
دارایی، دەوڵەمەندیی.

**دەسداری** (ن) ٢ desdarî
دەستداریی، دەس ڕۆیی، فەرمانڕەوایی.

**دەس داگرتن** (کتپ) ١ desdagirtin
دەس(دەست) {بردنەخوار،داگرتن، لەژێرەوە گرتن}.

**دەس داگرتن** (کتپ) ٢ desdagirtin
دەست داگرتن، بەدەست(پەستاوتن، داگرتنەوە).

**دەس دانان** (ند) desdanan
دەس یان دەست(نەکردنەوە، کشاندنەوە، دەگێڕانە چوونـەوە) بەگێڕدانەچوونەوە، بەرهەڵستیی نەکردنەوە.

**دەس دانە چەک** (ند) desdaneçek
دەست دانەچەک، ڕابوون، ڕاپەڕین، شۆڕش بەرپاکردن.

**دەس دانە لایەنی بێ عاریی** (ند)
desdane layenî bê ‘aarî
پێ لێ هەڵبڕین، دانەبێ عاریی، شوول لێ هەڵکێشان.

**دەسدروو** (ن) ١ desdirû
بەدست (دووراو، دووریاگ)، دەستدروو.

**دەسدروو** (ن) ٢ desdirû
دەستدروو، بەتایبەتیی یان بەراسپاردە دووراو.

**دەسدرێژ** (ئان) ١ desdrêj
دەستدرێژ، بەتەماع، قرم خۆشکەر.

**دەسدرێژ** (ئان) ٢ desdrêj
دەستدرێژ، بریف، بژێر، زیرەک، لێوەشاو، لیهاتوو، وریا،وشیار، پرکێش.

**دەسدرێژ** (ن) ٣ desdrêj
داگیرکەر، زەوتکەر، فەگر، دەستبەسەرداگر.

**دەسدرێژ** (ئان) desdrêj
دەستدرێژ، زۆرکار، چەپەڵ.

**دەسدرێژیی** (ن) desdrêjî
دەستدرێژیی، زۆر، زۆرووستەم، زوڵم، ستەمکاریی.

**دەسدرێژی کردن** (کتپ) desdrêjî kirdin
دەستدرێژیی کردن، جەورکردن.

**دەسدرێژیی کردنە سەر** (ند)
desdrêjî kirdine ser
دەستدرێژیی کردنەسەر، ڕێز بۆ نەهێشتن.

**دەسڕاست** (ن،ئان) desdrast
دەست ڕاست، پێکاوەر، تفەنگچیی، تیرنەندازە، بەپێک، تیرنەنان، لەنیشاندەر،نیشانە(شکێن، ئەنگێو)، سەگڤان، سەگوان، نیشان شکێن، نیشانەچیی.

**دەسڕۆکە** (ن) desroke
دەسماڵی پچووک.

**دەس ڕۆیشتن** (کتن) ١ des royîştin
دەوڵەمەندبوون، هەبوون، خاوەن سامان بوون، بوونە خاوەن پارەوپووڵ.

**دەس ڕۆیشتن** (کتن) ٢ des royîştin
دەست ڕۆیشتن، دەس (دەست)ڕۆیین، دەسەڵات بەسەردا هەبوون، دەسەڵات هەبوون، کاربەدەست بوون(لەمیریدا..)، کارپێ کران (بۆ کەسانی دیکە لەمیریدا..).

**دەس ڕۆیو** (ئان) des royîw
دەست ڕۆییو، دەس ڕۆیگ، بەدەسەڵات.

**دەس ڕەس** (ن) ١ des res
دەستڕەس، بەدەست کەوتوو، شتێ کە(دەستی پێ ڕابگات، دەسکەوتنی ئاسان بێ).

**دەس ڕەس** (ن) ٢ des res
دەست(ڕەس، پەرژ)، هەل.

**دەس ڕەش** (ئان) des reš
دەست ڕەش، دەس(دەست) نابەخێر، ئەوکەسەی هەرشتێکی لێوەدەستکەوێ فەڕی لێ نەبینرێ.

**دەس ڕەنگین** (ئان) des rengîn
دەست ڕەنگین، بەهونەر، پیشەجوان، دەستکردجوان، کارجوان، خاوەن بەهرە.

**دەسڕێژ** (نک) des rêj
دەزرێژ، دەستڕێژ، ڕەگباری گوللە، گوللەباران، تەقاندنی چەند گوللەیەک بەجارێک، تەقینی گوللەی

زۆر یەک لەدوای یەک.

**دەسریژ لێ کردن** (کتپ) desr̲êj lê kirdin

دەستریژ لێ کردن، ئاگرباران کردن، دەزریژ لێ کردن، گوللەباران کردن.

**دەس شۆرک** (ن) des šorik

دەست شۆرک، جیگەی دەست لی شتن، شوینی دەس لێ شتن، دەستشۆ.

**دەسقالە** (ن،کل) desqal̲e(kl)

دەستقالە، داسولکە.

**دەسک** (ن) [١] desik

هەنگل، جیگای دەست لەدەفر.

**دەسک** (ن) [٢] desik

دەستک، دەستو، دووف، دوفک، دەسە، دەستوو، جیگای (دەست لەئامراز دا، دەست گرتن)، قولف، قولفە، دەربەن.

**دەسک** (ن) [٣] desik

جی٠دەست، دەسە، مشتوو(شیر، خەنجەر).

**دەسک** (ن) [٣] desik

دەسکی دەسکەوان.

**دەسک** (ن) [٤] desik

دەستبڕ، تاخە، تاغە، ڕست.

**دەسک** (ن) [٥] desik

ئامرازی برنج یان دانەویلە کوتان.

**دەسک دەسک** (ئان) desik desik

بێ(شەرت، بەقا).

**دەسک کردن**(کتپ)[١] desikkirdin

دەسک (بۆ کردن، لێنان) {لەشیر، چەقۆ..}.

**دەسک کردن** (کتپ) [٢] desik kirdin

بەدەسک بەستن، دەسەکردن، کردنە(باقە، چەپک..).

**دەسک لە دوو نە کردن** (ئد) desik le dü neirdin

١- بەئاخاوتن دەرەقەتی کەسێ نەهاتن، بەقسەپێ نەوەستان (لەبەر زۆر بلێی ئەو کەسە).

٢- دەم بەکەسی بەرامبەر داخستن.

**دەس کورت بوون**(کتن) deskurtbün

ئاتاج بوون، ئاوسەرکەم بوون، پێداویست بوون، هەژار کەوتن.

**دەسکە جۆنی** (ن) deske conî

دەسکەدۆل.

**دەسکە گوڵ** (ن)[١] deske gul̲

چەپکەگول، دەستەگول، باقەگول، گول پر قولی دەست.

**دەسکە گوڵ** (خ) [٢] deskegul̲

کاری نالەبار.

**دەسکە لا** (ن) deskela

ژێر دەستە.

**دەسکە لووچە** (ن) deske l̲üce

جێ دەست (خەرەک).

**دەسکە کەللە** (ن) deske kelle

ڕەشمە، هەوسارۆک، دەسکەڕەشمە(دەخرێتە سەر کەللەی ولاخی بەرزە).

**دەس کەم** (ئاک) des kem

بەلانی کەمەوە، بەلایەنی کەمەوە، دەستی کەم.

**دەسکە نە کردن** (کتپ) deskene kirdin

دەسکەنک کردن، وشکەڕن کردن، ڕنیینەوە (بەدەست){خوریی، موو}.

**دەسکەوان** (ن) deskewan

ئاونگێ بەدەستەکەیەوە، دەسکاونگێ، دەسک وئاونگێ،دەس ئاوان، دەساوان، هاوان، هاوەن.

**دەسکەوت** (ن) [١] deskewt

دەستکەوت، دامات، دەزگیر، دەستگیر، دەسگیر، دەسکەفت.

**دەسکەوت{جەنگ}** (ن)[٢] deskewt (ceng)

ئیختەرمە، یەختەرمە، چەک وکەلوپەلی دوژمن کەلەکاتی شەڕدا بەزۆر دەستی بەسەردا دەگیرێ.

**دەسکەوت** (ن) [٣] deskewt

بەر، بەرهەم، سوود، قازانج.

**دەسکیسیی** (ن) deskîsî

پاش دزیی، شەریکەدزیی.

**دەسکیش** (ن) deskêš

دەستکیش، دەسەوانە، لەپک، پۆشاکی دەست، دەستەوانە، بالە، بیلاس.

**دەس گرتن** (کتپ) des girtin

دەزگرتن، دەز(دەس) گیرۆیی کردن، یارمەتییدان.

**دەسگوش** (ئان) desguš

بەدەست گوشراو، دەزگوش، دەستگوش.

**دەسگیران** (کتن) [١] desgîran

دەست گیران، ئەوق بوون، لەکارکەوتن، ماتەڵ بوون.

**دەسگیران** (ن) [٢] desgîran

دەزگیران.

**دەسگیربوون** (کتن) desgîrbün

بەگیر هاتن.

**دەس لە جێ چوون** (کتن) des lecêçün

دەست(خەلیان، وەرگەڕان).

**دەس لەسەردانان** ( ند ) des leser danan

دەست لەسەر دانان.

**دەس لەمل دان** ( ند ) des le mildan

دەست لەمل دان، ئۆباڵ بەئەستۆ کردن، بەڕاست زانینی (وتەیان کردەوەی کەسێ)، شایەتیی بۆدان، لە ئەستۆدان.

**دەس لێ‌دان** ( کتپ ) des lê dan

دەست لێدان، دەس لێ کوتان.

**دەس لێ ساردبوونەوە** ( ند ) des lê sardbünewe

١- لێ نائومێد بوون،ئومێد لێ بڕان. ٢- تابوشتی کاری مەبەست نەمان، لەبەر تێداشکان.

**دەس لێ شتن** ( ند ) des lê šitin

١- ئومێد لێ بڕین. ٢- ئیتر چاوەڕێ نەکردن، هیوای گەڕانەوە پێنەمان.
٣- لێ کشانەوە، چیی دیی لێ بەرپرسیار نەبوون.

**دەس لێ‌وەشان** ( ند ) des lêwešan [1]

دوژمنکارانە زیان یان ئازار پێگەیاندن.

**دەس لێ وەشان** ( ند ) deslêwešan [2]

شێت بوون (گوایا بەهۆی دەست لێ وەشانی جنۆکەوە).

**دەسماڵ** ( ن ) desmal [1]

لەچک وسەرپۆشی ژن.

**دەسماڵ** ( ن ) desmal [2]

پێچ ومێزەر.

**دەسمایە** ( ن ) desmaye

دەستمایە، دەزمایە، سەرمایە، سەرمیان، مایە، بنەپیت، پارەیەک کەکڕین وفرۆشتنی پێ بکرێ.

**دەسمایەدار** ( ن ) desmayedar

دەستمایەدار، دەزمایەدار، سەرمایەدار، سەرمیاندەر، خاوەن( دەزمایە، سەرمایە )، خاوەن پارەیەک کەکڕین و فرۆشتنی پێ بکرێ.

**دەسمەلە** ( ن ) desmele

باسکەمەلە، مەلەباسکە، سۆبایی بدەستان.

**دەسنگە** ( ن ) desinge [1]

دەستنگە، دەستندە، دەستننە، کاری شت بەخەڵک دان بە ئەندازە و و کەموکوڕیی.

**دەسنگە** ( ن ) desinge [2]

دەستنگە، بە(ژمارە، ئەژمارە، ژماردە ).

**دەسنگە** ( ن ) desinge [3]

دەستنگە، دەسندە، دەسننە.

**دەسنوس** ( ن ) desnüs

دەستنوس، دەس نوس، بەدەست نوسراو، نوسراوی دەستیی، بەخامەنوسراو، خەت.

**دەس نیشان** ( ن ) des nîšan

ئاماژە، دەست نیشان، هێما، نیشانە.

**دەس نیشان کراو** ( ئان ) des nîšan kirdw

دەست نیشانکراو، ئاماژەکراو،هێمابۆ دانراو.

**دەس وبرد** ( ئان ) des w bird [1]

دەستوبرد، گورج و گۆڵ (لەئیشدا)، زووخێز (لەکاردا).

**دەس وبرد** ( ن ) des w bird [2]

دەستوبرد، پەلە، لەز، خێرایی.

**دەس وبرد** ( ئاک ) des w bird [3]

دەستوبرد، بەخێرایی، دەستاوبرد، لەپڕ.

**دەس وپێوەند** ( نک ) desw pêwend [1]

دەستوپێوەند، دەس وپەیمان، نۆکەرو کارەکەر، کۆمەڵی خزمەکاران وژێر دەستان.

**دەس وپێوەند** ( نک ) deswpêwend [2]

خزمان، کەسوکار.

**دەس هاوردن** ( کتپ ) des hawirdin

پەیا یان پەیداکردن، وەدەست هێنان، هێنانە( بەردەس، ژێر دەس ).

**دەسە چینە** ( ن ) dese çîne

تریان، سەبەتۆلکەی دەسکداڕ.

**دەسە داس** ( ن ) dese das

تەوراس، تەورداس، داسی لقەدار پەڕاندن.

**دەسەر** ( ن ) deser

زیادە، سەربارە، لەسەریی.

**دەسەرچوون** ( کتپ ) deserçün

سەهووکردن، فەرامۆش کردن، لەبیرچوون.

**دەسەردانەوە** ( کتپ ) deserdanewe

لەسەردانەوە، زیادێ لە گۆڕینەوەی شت بەشت پێ دانەوە.

**دەسەرکردن** ( کتپ ) deser kirdin

ڕەوانەکردنەسەر، کردنەسەر، ناردنەسەر(کەسێ وزۆر لێ کردن بۆ ئەنجامدانی مەبەستێ).

**دەسەرگەڕان** ( کتن ) deser geran

بەقوربان بوون، دەدەورگەڕاندن، لەدەورگەڕان، لەدەوری سەر گەڕان.

**دەسەرگێران** ( کتپ ) deser gêran

بەقوربان کردن، دەدەورگەڕان،

**دەسەرەوەچوون** ( کتپ ) desereweçün

ماوە پێدان، مۆڵەت پێدان، مۆڵەت دان.

**دەسەرە** (ن) desere
مشارۆکە، مشاری دەست.

**دەسەژەن** (ن) desejen
دەسەژەنە، لۆرەلەپ، دەسەلقوت، داری دەزگیرەی مەشکە.

**دەسەسر** (ن) dese sir
دەستەسر، دەرسۆکە، دەستمال، دەسرە، دەسرە دەست، دەسمال، دەساۆ، دەرچاف، دەرچاو.

**دەسەسەر** (ئان) dese ser
گیژومات.

**دەسەکەشتیی** (ن) desekeştî
کەشتی پچکۆلانە(کەبەکاری گەشتی دەریایی نایەت).

**دەسەلات** (ن) ١ deselat
دەستەلات، دەستوور، فەرمان، یاسا.

**دەسەلات** (ن) ٢ deselat
دەستەلات، دەست ڕۆیشتوویی، دەست ڕۆیی، دەسەلاتداریی، بەهێزیی، توانایی، بال.

**دەسەلات بەسەردا پەیداکردن** (کتپ) deselat beserda peyda kirdin
بەسەردازاڵ بوون، هێزبەسەردا شکان.

**دەسەلاتداربوون** (کتن) deselatdar bûn
دەستەلاتداربوون، کارامەبوون، لەکارزانیین.

**دەسەملانێ** (ن) desemlanê
چەچەملان، دەستە(دەسە) {مل، ملانێ}.

**دەسەملانێ کردن** (کتپ) desemlanê kirdin
دەستە یان دەسە(ملان کردن)، چەچەملان کردن، دەست خستنە(کردنە)مل.

**دەسەنە** (ن) desene
بەخشیش، دەستەنە.

**دەسەواکردن** (کتن) desewa kirdin
لەزکردن، پەلەکردن.

**دەسەوبەسە** (ن) desew bese
بنکۆل، دەسیسە.

**دەسەوبەسەکردن** (کتپ) desew bese kirdin
بنکۆل کردن، پیلانبازیی کردن، بەپەنهانیی کار دژی کەسێ کردن.

**دەس هەرە** (ن) deshere
١- چەقۆی دەم مشاریی، جۆرە مشارێکی پچکۆلەیە (وەکە ٢ چەقۆی قەڵەمبڕ) دەنوشتێنرێتەوە. - مشاری پچکۆلەی باخ.

**دەس هەڵبەس** (ن) des helbest
بەدەست چنراو، بافیاگ، چنراو، چنیاگ.

**دەس هەڵتەکاندن بۆ(کەسێ)** (ئد) des heltekandin bo(kesê)
ئیشارەت بۆ کردن.

**دەسی خۆبردن بەدەمدا** (ئد) desî xo birdin bedemda
دەستی خۆ(بردن بەدەما، گەزتن): زۆرپەشیمان بوونەوە، پاشگەز بوونەوە.

**دەشت** (ن) ١ deşt
چۆل، ڕووتەن، شوێنی تەخت و ڕووتەن(بێ داروبار).

**دەشت** (ن) ٢ deşt
سفتاح، هەوەڵ(یەکەم) فرۆشی ڕۆژانە.

**دەشت** (ن) ٣ deşt
دەشتان، پادەشت، دەر، هەرد، پێدەشت، زەویی(گۆڕ، تەخت، ڕاست).

**دەشتان** (ن) ١ deştan
دەشت.

**دەشتان** (ئان) ٢ deştan
بێ نوێژ(ژن)

**دەشتایی** (ن) deştayî
دەشتانیی، ڕاستیی، زەوییی، گۆڕایی، زەمین، تەختانیی، تەختایی، پانتایی.

**دەشت ودەر** (ن) ١ deşt w der
چۆل وسارا، دەرودەشت.

**دەشت ودەر** (ن) ٢ deşt w der
دەرەوەی ئاوایی، بەدەرلەئاوایی

**دەشت وکێو** (نک) deşt w kêw
چواردەور، دەرەوەی مەڵبەند.

**دەشتەکیی** (ن) ١ deştekî
چۆل پەرست، دەشت نشین، سارانشین.

**دەشتەکیی** (ئان) ٢ deştekî
دەشتیی، دیاتیی، دیهاتیی.

**دەشتەکیی** (ئان) ٣ deştekî
ڕووەکە و گژوگیای دەشت.

**دەشتەکیی** (ن) ٤ deştekî
ئەیاغ، کەم نرخ (کالا).

**دەشتەوان** (ئان.ن) deştewan
کەسێ کەئیش وکاری پاراستنی کێلگەبێ.

**دەشتیی** (ن) deştî
جۆرەمەقامێکی فۆلکلۆری کوردیییە، هەوایەکی گۆرانی سۆزاوەرە.

**دەشکە** (ن) deške
دەزووی نرومان.
**دەشنە** (ن) dešine
قیمەکیش.
**دەشۆ** (ن) dešo
ئالشۆ، دەفشۆ، کەفاو.
**دەشە** (ئان) deše
بەدیمەن، دیمەن جوان.
**دەشەنیی** (ئان) dešenî
مەزلووم، نامەقیی لێ کراو.
**دەشێ** (ف) dehê
ئەشێ، ئەگونجێ، دەس(دەست)ئەدا، دەگونجێ.
**دەعبا** (ن) de`aba
جانەوەری نەناسراوی سامناک، داعبا، دەحبا، دەحبە.
**دەعەجانێ** (ئان) ١ de'aecanê
دەعجانێ، دەعەجانیی، سامناک (ڕوخسار).
**دەعەجانێ** (ئان) ٢ de'aecanê
ناپەسند، ناپەسەند، ناشیرین.
**دەعەجانێ** (ئان) ٣ de'aecanê
تەفرەدەر، فریوباز.
**دەعیە** (ن) de`aye
با، تڕزلیی، دەحیە، دەمار، فیز، لووت بەرزیی.
**دەعیە بوون** (کتن) de'ayebün
بەفیزبوون، لەخۆبایی بوون.
**دەعیە لێ دان** (کتن) de`ayelêdan
خۆنواندن.
**دەغ** (ن) dex
بوور، بەیار، زەویی(نەچێندراو، نەکێڵراو، تۆوپیوە نەکراو).
**دەغڵ** (نک،رو) dexil
دەخل، خەلە، دانەوێلە.
**دەغڵ کردن** (کتپ) ١ dexil kirdin
دەخل چاندن، خەلەچاندن، دانەوێلە هێنانە بەرهەم.
**دەغڵ کردن** (کتپ) ٢ dexilkirdin
دەخل کردن(ئافرەت).
**دەغڵ کردن** (کتن،کتپ) ٣ dexilkirdin
دەخل کردن، بەلاوەچوون،
توخن کەوتن، چوون بەلاوە، خۆتێ گەیاندن.
**دەغڵ ودان** (نک) dexilwdan
بەهرەی زەوی لەدانەوێلە، خەلەوخەرمان، دانەوێلەی چێنراو، دەخل ودان، دەخل و دانەوێلە.

**دەغوول** (ئان) dexül
دەغەڵباز، دەغەڵ، دەسبڕ، چوغل، فێلباز، ناڕاست، ناپاک.
**دەغەز** (ن) dexez
ناساغیی، نەخۆشیی.
**دەغەزار** (ئان) ١ dexezar
ڕەنگ نەخۆش، دەردەدار، سیسەڵەو ژاکاو، عیللەتاویی.
**دەغەزار** (ئان) ٢ dexezar
بوغز لەسک، دەخس، دەخەس، ڕقاویی، ڕک لەزک.
**دەغەڵ** (ن،رو) ١ dexel
گیای بێگانە لەناو دەغڵدا.
**دەغەڵ** (ن،رو) ٢ dexel
دەخیل، دەغەڵە، زۆڵەک، دەنکی بێگانە لەناو گەنم و جۆدا.
**دەغەڵ** (ن،رو) ٣ dexel
مرۆڕ(ناو دەعل ودان).
**دەغەڵ** (ئان) ٤ dexel
ناپاک.
**دەغەڵ** (ئان) ٥ dexel
بەدنەژاد، خوێنخوار، ناجسن، ناڕەسەن.
**دەغەلی** (ن) dexelî
فێڵبازی، فێل وفەرەج، گزی، ناڕاستی.
**دەغەلی لەگەڵ کردن** (کتپ)
dexelî legel kirdin
بەدنمەکیی لەگەڵ کردن، ناپاکیی لەگەڵ کردن.
**دەف** (ن،ئم) ١ def
دەفک، دەفە، دەفک، دایرە، ئامرازێکی مۆسیقایە لە کەمەیەک چەرمی بەسەرداکێشراوە، بێژنگی بێ کون و چەرمی خاو تێ گیراو...
**دەف** (پ،رو) ٢ def(ki)
پێکەوە، لەگەڵ، ژ، دەف.
**دەف** (پ،کی) ٣ def(ki)
دەف، لنک، ل نک، لەکن، لەلا، جەم.
**دەفتەر** (ن) ١ defter
پەڕاو، سیپارەی پەڕەپەڕەی سپی بۆ شت تیانووسیین، قاقەزی سپی لێکدراو بۆ بیرەوەریی...
**دەفتەر** (ن) ٢ defter
پەڕاوی سپایی، دەفتەری لیستەکێشیی.
**دەفتەرخانە** (ن) defterxane
بیرۆ، شوێنی بەڕێوەبردنی قەڵەمسازیی، نوسینگە.

**دەفتەردار** (ن) defterdar
ژمێریار.

**دەف دان** (کتن) ١ defdan
دڵ( خورپەکردن، تەپەتەپ کردن یان لێدان، توند لێ دان).

**دەف دان** (کتن) ٢ defdan
١- پشووسواربوون، هەناسەسواربوون.
٢- تەنگەنەفەس بوون( بەهۆی نەخۆشیی..).

**دەفدەفینک** (ن،نم) defdefînk
دەف فیکە، بلوێرونوڕنا کەفووی لەهەمبانەوە دەدەنێ.

**دەفر** (ن،کی) defir(ki)
ترار، حاجەت، قاپ.

**دەفروئامان** (نک) defirw aman
قاپ وقاجاخ.

**دەفرە** (ن) defire
زۆرە( ملێ، بانێ)، ملەملانێ، ملانێ.

**دەفزگ** (ئان،کی) defzig(ki)
دەفـزک، دەفەزکە، دەفەزگە، وڕگێ زل، عوورمەزن، وڕگن.

**دەفزەن** (ن) defzen
دەفـژەن، دەف لێدەر، دایرەزەن، کەسێ کەدەف دەژەنێ.

**دەفک** (ن) defik
دەموچاو، چارە، دەم ولووت.

**دەف لێ دان** (کتپ) def lêdan
لەدەف دان،دەف ژەندن.

**دەفن** (ن) defin
شاردنەوەی مردوو، وەشاردنی مردوو.

**دەفە** (ن) ١ defe
پانایی سنگێ وناوشان، مەودای نێوان هەردووشان.

**دەفە** (ن) ٢ defe
دەفی شان، ئێسقانی شان، دەفەی شان، ئێسکی پانی شان.

**دەفە** (ن) ٣ defe
هەف، تەختەیەکی پانە جۆلاتەنراوی پێ سفت دەکا.

**دەڤ ئاوێتن** (کتن،کی) devawîtin(ki)
بەدرۆ خۆ هەڵکێشان، (فیشاڵ، فشە، ماشەوهووشە) کردن.

**دەڤ تووک** (ن،کی) devtük(ki)
دەم تووک، کەسێ کەلەتووڕەبوندا کەف لەدەم دەچرێنێ.

**دەڤ چەنگ** (ن،کی) devçeng(ki)
گفت وگۆ، گفتوگۆ، وتوویژ.

**دەڤخۆر** (ن،کی) devxor(ki)
تابشت، توان، دەفخوور، تاووشت.

**دەڤخۆش** (ئان،کی) devxoš(ki)
دەم وکاوێژخۆش، راوێژخۆش.

**دەڤ دان** (کتپ،کی) devdan(ki)
فوو بەبلوێردا کردن، فووپێداکردن.

**دەڤژەن** (خ،کی) devjen(ki)
١- پڕوپاگاندەچیی. ٢- درۆزن، فیشاڵکەر.

**دەڤ سفک** (ئان،کی) devsifik(ki)
بەهەلپە، لەپن.

**دەڤشۆ** (ن،کی) ١ devšo(ki)
بەرماوە، بەرماو.

**دەڤشۆ** (ئان،کی) ٢ devšo(ki)
دەشۆ، دەف بەردا، دەم پاراو، دیلبار، دۆش دانەماو (لەئاخاوتندا)، تێیان تیدا نەوەستاو، قسەزان، لەسەر قسەدانەماو.

**دەڤ کەنۆک** (ئان،کی) dev kenok(ki)
دەم بەپیکەنین، ڕوو( خۆش، گەش).

**دەڤکیی** (ئان،کی) devkî(ki)
دەمیی.

**دەڤگلیز** (ن،کی) devglîz(ki)
لیکاو، لیکاوی دەم.

**دەڤگەم** (ن،کی) devgem(ki)
دانەلغاو، دەفکەم، ئاسنی لغاو کەئەکەوێتە ناو دەمی ولاخەوە

**دەڤ گەنیی** (ئان،کی) dev genî(ki)
دەم بۆگەن.

**دەڤل** (ن،کی) devil(ki)
بەرە، بەرەباب، تۆرەمە.

**دەڤلۆ** (ن،کی) devilo(ki)
تیخی دەم( کروچ، ڕووزەلە، کول).

**دەڤلیی** (ن،کی) devilî(ki)
ئاگاداریی، های.

**دەڤۆک** (ن،کی) devok(ki)
شیوەی (ئاخاوتن، زمان، پەیڤین).

**دەڤە** (ن،ئا،کی) deve(ki)
حوشتری نێر.

**دەڤەر** (ن،کی) dever(ki)
جێ، شوێن.

**دەڤ هلو** (ن،کی) dev hilü(ki)
ڕیایی.
**دەق** (ن،کی) ١ deq(ki)
تەواو، خشت، بێکەم وزیاد.
**دەق** (ن) ٢ deq
قەد، لێ، نوشت، نوشتە.
**دەق** (ن) ٣ deq
شۆق، کەیف.
**دەق** (ن) ٤ deq
باری هەمیشەیی، ڕەوت، ڕۆتین.
**دەق** (ئان) ٥ deq
بێ(چرچ ولۆچ، گرێ وگۆل)، ساف.
**دەق** (ئان) ٦ deq
وەک، هەمان چەشن، دەس، لەگوین.
**دەق** (ن،کل) ٧ deq(kl)
ڕق، ڕک.
**دەق** (ن) ٨ deq
خاڵی کوتراو.
**دەقاق** (ن) ١ deqaq
جەوی یان کەتیرەی دەق دانی قوماش، نیشاستە.
**دەقاق** (ن) ٢ deqaq
نوتوو، وتوو(جل).
**دەقاق دان** (کتپ) deqaqdan
لێدان، دەقاق لێدان، کەتیرەلێدان، چەسپاندن (بەکەتیرە).
**دەقاق لێ‌دان** (کتپ) deqaq lê dan
نوتووکردن، وتوو(دان، کردن، کێشان) ساف کردن{جل و بەرگ}.
**دەقان** (کتپ) deqan
خاڵ لەسەرپێست کوتان، دەقاندن، دەق دان.
**دەقان دووقان** (ئاک) deqan düqan
پێ بەپێی(کەسێ، شتێ)، بەئەندازەی (ئەو شتە یان ئەو کەسە).
**دەقاندیی** (ئان) deqandî
خاڵ لێ کوتراو.
**دەقاو دەق** (ئاک) deqaw deq
١- خشت، ڕاستەوڕاست، سەربەسەر.
٢- بەتەواویی، دەقاودەق، ڕەپ وڕاست، دەق ودۆغریی.
**دەق بەستن** (کتن) deq bestin
دەق گرتن.

**دەقدار** (ئان) deqdar
ساز، دەبار.
**دەق دان** (کتپ) ١ deqdan
ڕێک کردن، سازاندن.
**دەق دان** (کتپ) ٢ deqdan
دەق کردن، بەسەریەکدا نوشتاندنەوە.
**دەق دان** (کتپ) ٣ deqdan
ئارایشت دان.
**دەق دان** (کتپ) ٤ deqdan
دەق پێ دان، ساف کردن، لووس کردن، چرچ ولۆچ تێدا نەهێشتن.
**دەق دان** (کتپ) ٥ deqdan
کوتان(کەسێ بەمادەی ڤاکسین..).
**دەق دانەوە** (کتپ) ١ deqdanewe
چەماندنەوە، دەقانەوە.
**دەق دانەوە** (کتپ) ٢ deqdanewe
دووبارە کوتانەوە(برنجی نیوەکوتراو..).
**دەق دانەوە** (ئد) ٣ deqdanewe
لێدان، شلەکوتی مەرگ کردن.
**دەق دانەوە** (کتپ) ٤ deqdanewe
تەتەڵەکردن، لەتەتەڵەدان، لەبێژنگ دان(دانەوێلە..).
**دەق دانەوە** (کتپ) ٥ deqdanewe
دیسانەوە دەقێکی تر پێدان.
**دەق دانەوە** (ئد) ٦ deqdanewe
تەخت کردن، بەزەویدا دان(کەسێ).
**دەق دراو** (ئان) deq diraw
(نوتوو، وتوو) لێدراو، دەقاقلیی.
**دەق شکان** (کتن) deq šikan
دۆخ تێک چوون.
**دەق کراو** (ئان) deq kiraw
دەق دراو، دەق پێگیراو، دانوشتاو، بەسەریەکدا نوشتێنراو، قەدکراو، نوشتاوە، وەنوشتاو.
**دەق گرتن** (کتن) ١ deq girtin
قەدبوون بەسەریەکدا، نوشتانەوە.
**دەق گرتن** (کتن) ٢ deq girtin
باری خۆگرتن، کەوتنەسەرباری خۆ.
**دەق گرتن{نرخ}** (کتن) ٣ deq girtin(nirx)
جێگیربوون.
**دەق گرتن** (کتن) ٤ deqgirtin
بوونە(داب، دەستوور).

**دەقل** (ن) deqil

تم تمان، دەقەل، زەویی سەخت کەبۆ کێلان ناشێ.

**دەقلوس** (ن) deqlüs

سەرمەقولات، سەرمەوقولات، تەقلەبازیی.

**دەقلوک** (ن،رو) deqlük

مازوو، مازیی.

**دەقنە** (ن) deqine

دەقن، دەبرە، بەرات، ڕاتـووی فـەقێ، ساوریی، ئـەو بژێوییەی دەدرێ بەفەقێ.

**دەقنەکردن** (کتپ) deqine kirdin

پارسـەکـ کـردن، نـان چنینـەوە لـەماڵان، ئازووقـە کۆکردنەوە لەماڵان بۆ زستان(قوتابیی مزگەوت..).

**دەق ودەق** (ئان،ئاک) deq w deq

کوت ومت.

**دەقور** (ن) deqor

تیکەڵاو، دووڕەگ.

**دەقوول کەوتن(چاو)**(کتن) deqül kewtin(çaw)

بەقووڵاچوون (چاو)، مەبەست: لاوازبوون (مرۆڤ).

**دەقەلۆز** (ن) deqeloz

قونەقون، هەڵبەز ودابەز.

**دەقەن دووقەن**(ئان) deqendüqen

ڕاگوێز، ڕاڕا.

**دەقەنا** (ئاک) deqena

لەبەر(ئەمە، ئەوەی کە..)، بۆیە.

**دەک** (ئسب) dek!

ئەکێ!، پەککو، هەک.

**دەکارکراو** (ئان) dekr kiraw

بەکارهێنراو، کارپێ کراو.

**دەکارکردن** (کتپ) dekar kirdin

بەکارهێنان، دەکارهێنان، کارپێ کردن.

**دەک پێ نەگەی** (رس) dek pê negey!

خواپێت نەگەیەنێ، عەمرت نەمێنێ.

**دەک نەنالێی!** (رس) dek nanalêî

هـەرگیز نـەخۆش نەکـەوی!، واتـە: سوپـاس بـۆ ئەرکتان.

**دەکە** (ن) deke

سەکۆ.

**دەکەل** (ئان) ١ dekel

بێموو، ساف.

**دەکەل** (ئان) ٢ dekel

سادە.

**دەکەل** (ئان) ٣ dekel

کۆستە، کۆسە(مرۆڤ).

**دەکەم ودەگرێنم!** (شر) dekem w derênim!

ئەکەم وئەکۆشم، هەوڵ وتەقەلادەدەم.

**دەگ** (ن) deg

داری بڵنـدی ناوگەمیەکـە بـادەوەی پـێوەقاییم دەکەن.

**دەگژراچوون** (کتپ) degijraçün

بەگژداچوون، لێ هەڵگەڕانەوە وبەرەنگاربوون.

**دەگمەن** (ئان) ١ degmen

ڕێکەوت، هەڵکەوت.

**دەگمەن** (ئان) ٢ degmen

دانسقە، دەگمە، کەم وێنە، نایاب، نایەب.

**دەگەر** (ن) ١ deger

زەبر بەدەستیی.

**دەگەر** (ن) ٢ deger

تابشت، تاوشت، لیهاتوویی.

**دەگەل** (ن) ١ degel

سوعبەت، گاڵتەوگەپ، گەمە، وازیی، یاریی.

**دەگەل** (ئان) ٢ degel

زرینگ.

**دەگەل** (پ،ئاک) ٣ degel

پێرا، دگەل، لەگەڵ، هامرا، پێکەوە.

**دەگەنەکیی** (ئاک) degenekî

بخورتیی، بەزۆرەملیی، بەزۆر.

**دەگەنەگ** (ئان) ١ degeneg

(زۆر) بەهێز.

**دەگەنەگ** (ن) ٢ degeneg

خورتیی، زۆرە(ملیی، ملێ).

**دەگەنەگ** (ئان) ٣ degeneg

تەڕاح، زلحۆرت، زەبەلاح.

**دەل** (ئان) del

ئازا، بوێر، چاونەترس.

**دەلاش** (ن،ئا) delaš

بەرخۆلە.

**دەلاڤ** (ن،کی) delav(ki)

گزمی پچووکـ، گزمیلکە.

**دەلاڤ** (ن،کی) delav(ki)

جێگەی ئاودانی ئاژەڵ.

**دەلاقە** (ن) ١ delaqe

ڕۆچنـە، ڕۆژنـە، کـون لـەدیواردا بـۆ ڕووناکیی لێـوە هاتنە ژوور.

**دەلاقە** (ن) ٢ delaqe
کەلەبەر، کەلین، کولین، قلیش.

**دەلاقە** (ن) ٣ delaqe
تاق (لەدیواردا).

**دەلاقە {برین}** (ن.پز) ٤ delaqe(birîn)
چاوگە، چاویلکە.

**دەلاقەتێ خستن** (کتپ) delaqetêxistin
کون تێ کردن، کەلەبەرتێ(خستن، کردن).

**دەلاقەتێ کەوتن** (کتن) delaqe tê kewtin
کون تێ بوون، کەلەبەر تێ(بوون، کەوتن).

**دەلاک** (ن) ١ delak
بەربەر.

**دەلاک** (ن) ٢ delak
ناتر، مرۆڤ شۆرلەگەرماودا.

**دەلاکخانە** (ن) delakxane
سەرتاشخانە، دوکانی(سەرتاش، دەلاک)، شوێنی سەر یان سەروریش تیدا (چاک کردن، تاشین)، کوافیر.

**دەلال** (ئان) delal
خۆشەویست، نازدار.

**دەلالێ** (ن) delalê
لایلایە، لایەلایە، گۆرانیی بۆ منداڵ ژیرکردن یان کردنە خەو.

**دەلق** (ن) deliq
ئار، ئەیب، عەیب وعار.

**دەلقین** (کتن) delqîn
ئابڕوو(چوون، نەمان)، ئاوزڕان، بەدناوبوون.

**دەلک** (ن) delik
سواغ، سواق.

**دهلک** (ن.ئا) dihlik
پشیلەی مێ، پشیلەی مێوینە.

**دەلکی** (ئان) delkî
حەنەکچیی، جەفەنگباز، قسەخۆش.

**دەللە** (ن) ١ delle
قاوەجۆش، جزوە، جەزوەی دەسکدارو سەرقاپدار و لیودار بۆ قاوە.. تیدالینان یان تێکردن.

**دەللە** (ن) ٢ delle
تەڵەکە، فێل.

**دەلمە** (ن) delme
جبە، بالاپۆشی پێش ئاوەڵەی مەلایان، کەوای ئاودامانی پێشەوەکراو.

**دەلنگ** (ن) ١ deling
دەرەلنگ.

**دەلنگ** (ن) ٢ deling
دەلینگ، لینگ.

**دەلنگ** (ن) ٣ deling
جلی پاووپووز داپۆش، جلکی بەلەک داپۆش، ماکسی.

**دەلنگ هەلکراو** (ئان) ١ deling helkiraw
دەرەلنگ هەلکراو، لای خوارووی دەرپێ ورانک.. بەرەو ژوور دانوشتاو.

**دەلنگ هەلکراو** (خ.) ٢ deling helkiraw
ئامادەی کار، لەسەرپێ بۆ ئیش وکار، دەرەلنگ هەلکراو.

**دەلو** (ئان) delü
بەزمگیر، سەماکەر.

**دەلو** (ن) delü
لۆتیی، دەهۆلکوتی شایی.

**دەلوبیەر** (ن.رو) delübîber
١- بیبەری (سەوز، شیرین)، بیباری شین.
٢- تیژ، بیبەری (تیژ، توون).

**دەلۆش** (ئان) deloš
بێ ئەمەگ، دەغەل.

**دەلۆشیی** (ن) delošî
بێ(ئەمەگیی، شەرتیی، وەفایی)، دەغەلیی.

**دەلووف** (ن) delüf
مانگی ڕەشەمە.

**دەلۆی دومان** (ن) deloy düman
دەلیی دومان،
یاریدەدەری تەنافباز.

**دەلۆیی** (ن) deloyî
شێتیی، گەللایی، کەللەیی.

**دەلەسە** (ن) delese
فیل، فەرەج.

**دەلەندە** (ن) delende
مارەبڕ، دەزگیرانی مارەبڕاو.

**دەلیا** (خ) delya
ئیجگار زۆر، یەکجار فرە.

**دەلیا دڵ** (ئان) delya dil
دل گەورە، بەسەبر.

**دەلیالووش** (ئان) delya lüš
زۆر خۆر، خۆرا.

**دەلیقانیی** (ئان) delîqanî

بێ شەرم وزمان دریژ (ئافرەت).

**دەلیی** (ئان) delî

دەلو، شیت، شیتۆکە.

**دەڵ** (ن،ئا) del [١]

دەڵـەق، میوینـە(میینـە)ی سـەگ وگـورگ...، دەلە(سەگ، گورگ).

**دەڵ** (ن) del [٢]

تەڕەشوع، تەڕایی، شێ.

**دەلاڵ** (ن) delal [١]

ناوەندیار، نێوەنجیکەر (نێوان کڕیار وفرۆشیار..).

**دەلاڵ** (ن) delal [٢]

کەسێ کـەژن بـۆ پـیاو سـازدەدا، ناوەنـدیاری ژن خوازیی.

**دەلالخانە** (ن) delalxane

مەزاتخانە، مەزادخانە، هەڕاجخانە، هەڕاجە بازاڕ.

**دەلالیی** (ن) delalî

١- دەلالبازیی، هەڕاجیی، کاری دەلال.

٢- دەلالانە، کرێ یان مزی دەلالیی.

**دەلان** (کتن) delan

تـەڕایی دادان، تەڕەشـوع دانـەوە، یـان: چـۆڕان، دەلانن،یان دادان، دەلیان (ئاو، شلەمەنیی..).

**دەلاو** (ئان) delaw [١]

ئاولێ چوو، تەڕایی داداو، تەڕەشوع کردوو.

**دەلاو** (ن) delaw [٢]

جیگەی زنەوهەمیشەتەڕ، زەویی تەڕەشوعدار.

**دەلاو** (ن) delalw [٣]

خەلیج.

**دەلپ** (ئان) delp

دەلـب، بـە بەرگـەروە، زرت، فـراوان، فـرت، گوشـاد، هەراو، دامۆڕ (پیلاو، جل وبەرگ..).

**دەلپ وداهۆڕ** (ئان) delp w dahor

دەلپ ودۆپ، زۆرگوشاد، فرەهەراو، دەلپ ودۆل (جل وبەرگ..).

**دەڵ وبەڵ** (ئان) del w bel

بلقن، نەرم(ترێ..).

**دەلەبەبا** (ن) dele beba

دەلەسـەگی بـەبا، دەلـەف، دیلەبـەبا، دەلـەوەبا، میوینە سەگی وەباهـاتوو، میچکەسـەگی نێـر خـواز، دەلەسەگی گۆڵ خواز.

**دەلەچە** (ئان،ن) deleçe

ڕیاییکەر.

**دەلەچەیی** (ن) deleçeyî

ڕیایی.

**دەلەدەڵ کردن** (کتن) [١] dele delkirdin

لەرەلەر کردن، بەملاویەولادا کەوتن.

**دەلەدەڵ کردن** (کتن) [٢] dele delkirdin

شلەقان.

**دەلەدیو** (ن) dele dêw [١]

ژنی دیو، ژنەدیو.

**دەلەدیو** (خ) deledêw [٢]

ژنی ناشیرین و قەڵەوی زەبەلاح.

**دەلەک** (ن،ئا) delek

دوللەک، جانەوەریکە لەخیزانی ڕێوی ولەو پچووکترە وکەولی بەنرخە.

**دەم** (ن) dem [١]

دەق، دەو، زار، بۆشایی نێوان هەردوو شەویلاگە.

**دەم** (ن) dem [٢]

پشوو، هەناسە.

**دەم** (ن) dem [٣]

دەڤ، ڕەخ، قەراخ، کەنار، گوێ، لیو، لیوار.

**دەم** (ن) dem [٤]

چاخ، دم، زەمان، سات، کات، گاف، گاه، گاو، ماوە، وەخت.

**دەم** (ن) dem [٥]

دەمـە، دەڤـەر، دیـوی تیـژی تیـغ، ڕیـزەی دەمـی تیغ،لیواری تیغ، لای تیژی تیـغ، لیـوی تیـژی(چـەقۆ، کیرد..)، لیوی بوڕای تیغ.

**دەم** (نک) dem [٦]

مووشە دەمەی ئاگرپێ(گەشاندنەوە، گەشاندنەوە).

**دەم** (ن) dem [٧]

جار.

**دهم** (ن) dihim

زەویی بەیار.

**دەما** (ئاک) dema

وەختێکە، کاتیکی.

**دەماخ** (ن) demax [١]

شادیی، کەیفخۆشیی، کەیفسازیی.

**دەماخ** (ن) demax [٢]

مژی، میشک.

**دەماخ پرواندن** (ئد) demax pirwandin

دەمـاخ پـروانن، کـەیف تیکـدان، وەڕزکـردن، وەڕەزکردن.

**دەماغ تەخت کردن** (ئد) demax texit kirdin ١
بەخۆشیی(ڕابواردن، کات بردنەسەر).
**دەماغ تەخت کردن** (ئد) demax exit kirdin ٢
خۆنواندن وهەوەس تەخت کردن بەسەرکەسێکدا.
**دەماغ ساز** (ئان) demax saz
تەڕە دەماغ، دڵخۆش ولەسەردا هەوەس، کەیفساز، کەیفخۆش.
**دەماغ شکاندن** (ئد) demax şikandin
١- پۆزشکاندن، کەیف وخۆشی بۆ نەهێشتن، لەزەوق دان، تەریق کردنەوە، لەکەیف و خۆشیی دان، لەلووت دان، لووت هێنانەبەرخۆ و لە گەنجەفەکردن، بەگژداچوون، لەدەماخ دان، لێ تووڕە بوون. ٢- بەدرۆ خستنەوە، درۆزنیی کەسێ وەدەرخستن.
**دەماغ کردن** (کتپ) demax kirdin
بەرلووت(هەڵبەستن، هەڵپێچان)، دەماغ (هەڵبەستن، هەڵدان)، دەم هەڵبەست کردن.
**دەمار** (ن) demar ١
تەمار، ڕەگ، جۆگەی خوێن گوێزتنەوە لەلەشدا.
**دەمار** (ن) demar ٢
ژێ، پەی، چەق.
**دەمار** (ن) demar ٣
دارۆکەی ناوگەڵا.
**دەمار** (ن) demar ٤
جامێریی.
**دەمار بزووتن** (ئد) demar bizütin
ڕەگی شازایی بزووتن، دەست دانەکار بەچاپووکیی،دەمار جووڵان (بۆ فەرمان).
**دەماردەر** (ن) demar der
ئازاری زۆر چەتوون، ئێش وئازاری زۆر.
**دەماردەرهاتن** (ئد) demarderhatin ١
تێداچوون، لەناوچوون.
**دەماردەرهاتن** (ئد) demarder hatin ٢
بێزاربوون، نارەحەت بوون.
**دەمار دەرهاتن** (ئد) demar derhatin ٣
تین پێگەیین، تەنگاو بوون.
**دەمار دەرهێنان** (ئد) demar derhênan ١
١- بەسەردا(زاڵ بوون، سەرکەوتن)، بەزاندن.
٢- کارجێبەجێ کردن بەچاپوکیی
**دەمار دەرهێنان** (ئد) derhênan ٢
١- لەناو بردن.
٢- کارجێبەجێ کردن بەچاپوکیی.

**دەمار کرژ** (ئان) demar kirj
١- توند وتۆڵ، چابوک. ٢- لێهاتوو.
**دەمار گرتن** (کتن) demar girtin
دەمار وەرگەڕان.
**دەمار گرتوو** (ئان) demargirtü
تووڕە، دەماردار.
**دەماری پیاوەتیی** (ن) demarî piywetî
هەستی پیاوەتیی.
**دەمامک** (ن) demamik
کەپوو هەڵپێچ، لووت پێچ.
**دەمانچە** (ن) demançe
دەبانچە، دەرمانچە، دەرمانجە، دەوانچە، وەروەر، پشتاو.
**دەمانچە ئاگردان** (کتپ) demançe agirdan
دەمانچە تەقاندن.
**دەماندن** (کتپ) demandin ١
دەمان، دەمانن،دەمیین، دەم دان، دەڤ دان، باتێ کردن، وەکارخستن (مووشەدەمە).
**دەماندن** (کتپ) demandin ٢
ئاگرگەشاندنەوە، فوولێ کردن (ئاگر بەمووشە دەمە، یان پف لێ کردن).
**دەماندن** (کتپ) demandin ٣
دەم پێ کێشان.
**دەمانە** (ن) demane
جێی ژیان، ماڵ، خانوو.
**دەماو دەم** (ئاک) demaw dem ١
دەڤ بدەڤ، دەم بەدەم، زاربەزار، لەزاربۆزار.
**دەماو دەم** (ئاک) demawdem ٢
وەختاو وەخت.
**دەماودەم کەوتن** (کتن) demawdem kewtin
ئاخاوتن بڵاوبوونەوە لەدەمەوە بۆ ئەم وئەو، ئاشکرا بوون.
**دەم ئاو کردن** (ئد) dem aw kirdin
دەم پڕ لەئاوبوون، ئاو زایینە دەم، دەم پاراوبوون(بەبینینی خواردنی خۆش).
**دەماوەر** (ئان) demawer ١
دەمەوەر.
**دەماوەر** (ئان) demawer ٢
وتەپاراو، قسەزان، دەم پاراو.
**دەمبڕ** (ن) dembir
بێ(سەوادیی، سەوایی)، بەگۆترە، لەگۆترە، گۆترە.

**دەم بردنە بەست** (ند) dem birdine best
دەم نەکردنەوە، نەئاخاوتن.

**دەمبرکردن** (کتپ) dem birkirdin
نرخ برِینەوە لەگەڵ کەسێکدا (بەگوترە).

**دەم بڵ** (ن) dem bil
١- بلمەبلمەکەر، کەسێ ئاخاوتنی بەرەوانیی بۆنایە. ٢- دەم خاو.

**دەم بوونە تە لەی تە قیو** (ند)
dem büne teley teqîw
١- دەم بوون بەتاقی چرا، دەم بوونەتاقی چرا،حەپەسان، سەرسام بوون، واق ورمان.
٢- قسەبۆ نەکران لەشەرماندا.

**دەم بۆ بردن** (کتپ) dem bo birdin
دەست بۆ خواردن بردن( خواردنی هەندێ ).

**دەم بە** (پ) dembe
رووبەرەو.

**دەم بە پێکە نین** (ئان) dem be pêkenîn [1]
روو(خۆش، گەش)، بزەکار،بزەکەر، شەن، هاش.

**دەم بە پێکە نین** (ئان) dembe pêkenîn[2]
خۆش گوفتار، زمان شیرین، سوعبەتچیی، قسەخۆش.

**دەم بە پێکە نین** (ئاک) dem be pêkenîn [3]
بەروو خۆشیی.

**دەم بە دەم** (ئاک) dembedem[1]
بەردەوام، بێبەرودوایی، هەمیشە، هەروەهەر.

**دەم بە دەم** (ئاک) dembedem[2]
جارەناجار، جارەوجار، کاتەناکات، وەختاو وەخت.

**دەم بە ربوون{بە رامبە رکە سێ}** (ند)
dem berbün(beramber kesê)
دەمی جنێو کرانەوە (بەرەو رووی کەسێ).

**دەم بە ربوون** (ند) dem berbün [1]
کەوتنەئاخاوتن و زۆر لەسەر رۆیشتن.

**دەم بە ربوون** (ند) demberbün[2]
دەست بەخواردن کردن بەهەلپە. .

**دەمبە ست کردن** (کتپ) dembestkirdin
قوربەدەمدا دان، بێ دەنگ کردن.

**دەم بە قوتە وەگرتن** (ند) dem beqtewe girtin
میچ (نەخواردن، نەخواردنەوە).

**دەم بە گلە یی** (ئان) dem beileyî
ئاخدار، نووزە نووزکەر.

**دەم بە هانان** (ن) dem be hanan
نزقلانەی خراپ لێدەر.

**دەم بە هاوار** (ن) dem be hawar
دەم بەهەرا.

**دەم بە یە کاهاتن** (ند) dem beyekahatin [1]
گیان دەرچوون، دەم بەیەکدادان، مردن.

**دەم بە یە کاهاتن** (ند) dem beyekahatin[2]
دەم پێکاهاتن، قسەباش (بۆ نەهاتن، نەکردن، دەرنەبرِین).

**دەمبێن** (ن) dembên [1]
دەڤ بێنک، دەڤۆک، دەمبێن، دەمدوور، دەوبێن، دەمبەست، دەمبەس، دەردوو، زارەمبێن، زاربەست، زاربێنک، زاربێن، ئەو ئامرازەی دەمی ماڵاتی پێ دەبەستن.

**دەمبێن** (ن) dembên [2]
دەربەن، دەروەن، دەرگابێن، دەمبینە، پەتک، گوش، ئەو پەتکەی زاری مەشکەو هەمانەی پێ دەبەسترێ.

**دەم پان کردنە وە** (ند) dem pankirdinewe
پێکەنین بەدەنگی بەرز (بەرامبەر کەسێ بەتەوسەوە).

**دەم پووچ** (ئان) dem püç
دەم پووچەڵ، بێ( دان، ددان).

**دەم پە لوولە** (خ) dempelüle
دەم پەڵو، شەرمنی بێ دەم و پل، شەرمیوونی قسە نەزان.

**دەم پیاکاهاتن** (ند) dem piyaka hatin
دەم (پێکاهاتن، تێکەڵ بوون)، لەکاتی ئاخاوتندا (لە ترسا یان لەشەرماندا).

**دەم پیس** (ئان) dem pîs
دژوندەر، دەڤ(پیس، چیر، چەپەڵ، گەنیی)، زمان پیس، سخێف بێژ، جنێوفرۆش.

**دەم پێوەنان{شلە مە نی}** (کتن)
dem pêwenan (şilemenî)
بێن پێوەنان، هەڵقوران، بەتاسەوە ئاو یان شلەمەنی خواردنەوە.

**دەم تاڵ** (ئان) dem tal
ترش، راوێژناخۆش، قسەرەق، خوێن تاڵ لەکاتی ئاخاوتندا.

**دەم تەر** (ئان) dem ter [1]
بەلێندەری( خۆراپی، هەربەدەم).

**دەم تەر** (ن) dem ter [2]
فریودەر.

**دەم تەرکەرە** (نک) dem terkere
تەرە، تەرەکار( میوە..).

**دەم تەقاندن** (کتپ)[1] dem teqandin
تەقە لەدەمەوە هینان، دەم تەقاندن.

**دەم تەقاندن** (کتپ)[2] dem teqandin
گفتوگۆ کردن.

**دەم تێ بەردان** (ند)[1] dem tê berdan
کەسێ هان دان کەبەگژ یەکیکدا بچێ.

**دەم تێ بەردان** (ند)[2] dem tê berdan
دەست کردن بەجنێودانی کەسێ.

**دەم تێ ژەندن** (ند)[1] dem têjendin
زار( تێهنان، نانەناو) {خواردن}.

**دەم تێ ژەندن** (ند)[2] dem têjendin
بەهەلپەو بەردەوامیی سەرکردنە سەرشت خواردن، خواردن ماشیینەوە.

**دەم تێ ژەندن** (ند)[3] dem têjendin
دەم تێهنان.

**دەم تێ ژەندن** (کتپ)[4] dem têjendin
سەرکردنەسەر (بەکارهینان و لەناو دانی شت ).

**دەم تێ ژەندن** (ند)[5] dem têjendin
زیاد لەپیویست (تێگوشیین، پارەخەرج کردن )، زیادە خەرجیی کردن، دەم تێ نان.

**دەم تیک ئالان** (ند) dem têk alan
بەگژیەکدا چوون، کەوتنەشەرەقسە.

**دەم تیوەدان** (ند) dem têwe dan
خۆ تی ٚهەلقورتاندن( لەئیش یان ئاخاوتنی خەلکدا )، لاپرسەنانە قسەلێ کردن، لەخۆوە دەم بردن بۆ ئاخاوتنێ ودوان لەبابەتیەوە.

**دەم جوو** (ن) dem cü
خواردنی( جووراو، جاوراو، جاویاگ ).

**دەم چوونەکلیلە** (ند) dem çüne klîle
دەم( بەستران، نەکردنەوە )، ئاخاوتن بۆ نەهاتن، دەم هەل نەهاتنەوە، دیان کلیلەوبوون، دەم گۆ نەکردن.

**دەم چەوت**(ئان.ن)[1] demçewt
دەف خار، دەم( پووچ، چەفت، خوار)، قسەنەزان، بێدەم وپل.

**دەم چەوت** (ئان)[2] demçewt
گەلحۆ، گیل، گیلۆکە.

**دەم خاو** (ئان) demxaw
دەم( سارد، وپل خاو خلیچک )، سستگۆ.

**دەم خۆش!** (نسب) dem xoš!
ئافەرین!، ( بۆ ئاخاوتنت، بۆ ئەو وتەباشەی درکانت.

**دەم خۆشانە** (ن) demxošane
مژدانە، مزگینیی خەبەری خۆش.

**دەم داچەقاندن** (کتن)[1] dem daçeqandin
دەم( ئاواڵە کردن، کردنەوە )
، زار( ئاواڵەکردن، کردنەوە ).

**دەم داچەقاندن**(کتن)[2] dem daçeqandin
دەم ( ئاواڵەکردن، کردنەوە )، زار ( ئاواڵەکردن، کردنەوە ).

**دەم داچەقاو** (ئان)[1] dem daçeqaw
دەم( کراوە، داچەقیو )، حەبەساو، ئەبلەق.

**دەم داچەقاو** (خ.)[2] dem daçeqaw
مردوو.

**دەم داخستن** (ند) dem daxistin
قرۆقەپ کردن، قسەپێ نەمان، نقە( تیدا {تیا}نەمان، لەبەر بڕان، نەکردن )، ورتە لەبەر بڕان، نە ئاخاوتن، دەم قووچاندن.

**دەم دادروون** (ند) dem da dirün
بێ( دەنگ بوون، دەنگ کردن )، فزەلێ بڕیین.

**دەم دار** (ئان) demdar
بەدەم وگفت، بەگفتوگۆ.

**دەم دروون** (کتپ) dem dirün
دەم( دا دروون، هەل دروون ).

**دەم دان** (کتن)[1] dem dan
سەوزبوون، شین بوون.

**دەم دان** (کتن)[2] dem dan
لەوەڕان، لەوەڕیین.

**دەم دان** (کتپ)[3] dem dan
دانەدەم، تێدان.

**دەم دانەوە** (کتن) dem danewe
پشکووتن، دەم کردنەوە، گەشانەوە، هەل پشکووتن (گول.. ).

**دەم دانەوە {برین}** (کتن) dem danewe(birîn)
دڕان، دەرگابوون، چاوگە داکەوتن، والابوون، دەربوون.

**دەم دروون** (ند) dem dirün
بێدەنگ کردن، دەمکوت کردن، دەم گرتن.

**دەم دریژیی** (ن) dem dirêjî
دریژدادڕیی، چەنەبازیی، چەقەسرۆیی، دەمەوەڕیی.

**دەم دەم** (ئاک) demdem
جارجار، گاگا، ناوبەناو، دەمدەمێ، جاربەجار.

**دەم دەما** (ن) dem dema
بەرەبەیان، بولیلە، شەوەکیی، کازیوە.

**دەم دەمو** (نک) dem demu
بەرماوە، پاشماوە(خۆراک).
**دەم دەمی** (ئان) dem demî
ڕاڕا، قەولەهوبەولەهو، وازوازیی، هەر کاتە لەسەر هەوایەک.
**دەمڕاست** (ن) [1] dem rast
پیاوماقووڵ.
**دەمڕاست** (ن) [2] demrast
ئاخاوتەر، قسەکەر، نوێنەر(بۆ وتووێژ).
**دەمڕاست** (ن،ئان) [3] dem rast
دەم(ڕاس، پاراو، گفت خۆش)، دیواندڕ، بەزمان، قسەزان، بدوو، خۆش(دوو، گوفتار).
**دەمڕاست** (ن) [4] dem rast
ئەوقات، پارێزەر.
**دەمڕووت** (ئان) [1] dem rût
بێمووی(لاو).
**دەمڕووت** (ئان) [2] dem rût
چلێت، مرۆڤی منالکاری بێ نموکەشەرمی لێ نەکرێ، بەستە نەبوو.
**دەم ڕەساندن** (کتپ) dem resandin
دەم ڕەسانن، ناوەندیاریی کردن، نێوبنجی کردن، بەر ئەدەریی کردن، کەوتنەنێوان کۆمەڵانێکەوە بۆ ئاشت کردنەوەیان.
**دەم ڕەش** (ئان) dem reš
چاک نەبێژ، زمان بەد، شووم، نوقلانەی خراپ لێدەر.
**دەم سارد** (ئان) dem sard
ناهومێد، نائومێد.
**دەمساز** (ن) demsaz
گیانی بەگیانی.
**دەم سپی** (ن) [1] demspî
خێرخوای خەڵک، پیاوچاک.
**دەم سپی** (ئان) [2] demspî
قسەڕەوا، کەسێ ئاخاوتنی پڕ بایەخ بێ.
**دەم سووتان** (ند) demsûtan
قسەلەدەم دەرچوون، نهێنیی درکاندن.
**دەم سوور** (ئان) [1] demsûr
١- جەنگیی، جینگی، دلێر، نەبەرد.
٢- بوێر، گوستاخ ، نەترس.
**دەم سوور** (ئان) [2] demsûr
پێداگر، سوور(لەسەرکار).

**دەم سوێر کردن** (ند) demswêr kirdin
١- ناودەم سوێر کردن،بەدەمدا کێشان وناودەم پڕ لەخوێن کردن.
٢- گۆشتی برژاو دەرخوارد دان.
**دەم شڕ** (ن) demšir
دەم(دڕاو، هەڵە)، زاردڕاو، دەڤشڕ، نهێنیی ئاشکراکەر، دەم(دڕاو، هەڵە)، زاردڕاو، دەڤشڕ، نهێنیی ئاشکراکەر،زمان شڕ، زوان شڕ، نهێنیی پێ هەڵنەگر، دۆقلمەر، بێ نهێنیی.
**دەم شکاندن** (ند) demšikandin
پۆزشکاندن، تەمێ کردن، لووت شکاندن،لەدەم دان.
**دەم شیرین کردن** (ند) demšîrîn kirdin
١- بەرتیل پێدان. ٢- دیاریی بۆ بردن.
٣- بەلای خۆدا بردن.
**دەم شیرینیی** (ن) dem šîrînî
دەم شیرینکەرە، بەرتیل، زمان گوشادانە.
**دهمک** (ن،ڕو) dihmik
داری ناولیڕەوار.
**دەمکار** (ن) demkar
دیمەنی دەرەوەی دیوار، چینی دیوار بەڕووکاری دیوی دەرەوەیدا.
**دەم کردن** (کتپ) dem kirdin
دەم پێکێشان، سەرداپۆشیین ونانەسەر ئاگر، لینان (چا، برنج..).
**دەم کردنەوە** (ند) demkirdinewe
١- دەم(بەرەلابوون، بادان).
٢- ئاخاوتنی ڕەق یان خراپ دەربڕیین.
**دەمکوت** (ئان) [1] demkut
لەئاخاوتن کەوتوو، لەگفتوگۆ خراو.
**دەمکوت** (ن) [2] demkut
سەرزەنش، سەرزەنشت، سەرکۆنە، لۆمە.
**دەمکوت بوون** (ند) demkut bûn
بێ دەنگ بوون، دەم دروون، فزەلێ بڕان، قسەپێ نەمان، لەئاخاوتن کەوتن، بۆڕخواردن، دەم لە یەک نان(کاتی ناڕەحەتیی یان ترس).
**دەمکوت کردن** (کتپ) [1] demkut kirdin
فزەلێ بڕیین، قسەپێ نەهێشتن، قوڕ بەدەمدادان، لە گفتوگۆ خستن، بۆڕدان، بێدەنگ کردن، دەم ئەلوەخت دان.
**دەمکوت کردن** (کتپ) [2] demkut kirdin
ڕاڕایی کردن، پێسەلماندن، سەرپێ دانەواندن.

**دەمکەمچە** (ن) ¹ demkemçe
کەوچکەقوڵە، کەوچکی پچووک.

**دەمکەمچە** (ن،نا) ² demkemçe
بەچکەبۆق، سەرمێکوتە.

**دەم کێشان** (کتن) dem kêšan
پێ(گەیشتن، گەیین)، دەم بوون(چا یان برنجی لێنراو بەداپۆشینی لەسەر ئاگر)، دەم(دان، هێنان).

**دەم گاوەخان** (خ) demgawexan
دەم(گاوخان، پان، هەژدیها، زل). ت: گاوەخان = گاوخوان، مریژیی ڕووبەری یەک ڕۆژ جووت.

**دەم گرتن** (کتن) ¹ dem girtin
دەمی خۆ داخستن، قروقەپ کردن، بێدەنگ بوون.

**دەم گرتن** (ند) ² dem girtin
ئاخاوتن بە(ڕووکراوەیی، گەرمیی).

**دەم گرتن** (کتپ) ³ dem girtin
دەم(ئاخنین، داخستن).

**دەم گرتنەوە** (کتن،کتپ) dem girtinewe
پاریزکردن لەخواردن،دەستی خۆ(پارازتن، پاراستن)لە هەندێ خواردەمەنیی..)، خۆگیرانەوە لەهەندێ خۆراک.

**دەمگرتە** (ن) dem girte
گۆرانی گوتنی تێکرایی لەیەک سات وئاندا.

**دەم گۆ نەکردن** (ند) dem go nekirdin
قسەبۆ نەکران (بە هۆی سەرما، نەخۆشیی..).

**دەم گەرم** (ئان) ¹ dem gerim
شەڕانیی.

**دەم گەرم** (ن،ئان) ² demgerim
ئەو تانجیەیەی باش ڕاو دەکات، تاژیی ئازا لەڕاودا.

**دەم گەرم** (ئان) ³ demgerim
ڕەوانبێژ، قسەڕەوان، وتاربێژی چاک.

**دەم لارە** (ن) dem lare
تونگەلەیمل خوار، دۆلکەی دەم لار.

**دەملە** (ن،پز) demle
١- ئیفلیجیی، شەپلە. ٢- لەرزک.

**دەم لێ بەرەڵاکردن** (ند) dem lê bereḻa kirdin
پاریز شکاندن، هەموو جۆرەخواردنی (خواردن، ماشینەوە).

**دەم لێ دان** (ند) dem lêdan
١- پرگویی کردن، چەنەلێدان.
٢- زۆروتن، سازندەیی کردن.

**دەم لێ کردنەوە** (ند) dem lê kirdinewe
١- زمان لێ بەربوون، دەم تێ بەربوون، زمان گەزارەبوون، دەم لێ بەرەڵاکردن، هێرش بردنە سەر(بەئاخاوتن، جنێو). ٢- بەخراپە باسێ کەسێ کردن، کەسێ بەخراپیی دەرهێنان.

**دەم لێکدانان** (ند) ¹ dem lêkdan
دەم یەک نیان، بەلاداهاتن، مردن، هەناسە بڕان.

**دەم لێکدانان** (ند) ² dem lêkdan
بێ دەنگ بوون، قروقەپ کردن.

**دەم مردوو** (ئان) dem mirdû
دەڤ مریی، کەم بێژ.
شەرمن لەئاخاوتندا، شەرمیوون لەقسەکردندا.

**دەم نانەدەم** (ند) dem nane dem
دەم خستنەدەم، دەس بەچەنەچەن کردن، شەڕەقسەکردن.

**دەم نخوون** (ئان) dem nixûn
دەمەونخوون، سەرەونخوون.

**دەمنە** (ن،نم) demne
پیکی زۆرنا(کەدەخرێتە ناو دەم یان بەدەم دەگیرێ).

**دەمنێ** (ن) demnê
دارەکونی ژێر دۆڵاش، زەنبور، شوێنی شاگونج (ئاشی ئاو).

**دەم وپل** (نک) ¹ demwpil
دەم ولێو، دەم وچەناگە.

**دەم وپل** (ن) ² demwpil
زرنگیی لەکاردا.

**دەم وپل** (ن) ³ demwpil
زرنگیی لە(ئاخاوتندا، بواری پیکانی مەبەستدا)، قسە ڕەوانیی، دەم و(گفت، ئاخاوتن).

**دەم وپل بەیەکا دراو** (ئان)
demwpil be yeka diraw
تۆراو، تۆریاو، ڕووپەپ، نویر، زیز، لالووت، لوت خوار.

**دەم وچەم** (ئاک) demw cem
دەم وژەم، جەم ودەم، بەکات، بەوەخت.

**دەم وچاو** (ن) demwçaw
دەموچاو، ڕوخسار، ڕوو، دیم، دیمە.

**دەموچاو ترشاو** (ئان) demwçaw tiršaw
ڕوو(تاڵ، گرژ)، مرومۆچ، ناوچاو ترشیاگ.

**دەموچاوهەڵگر** (ن) demwçaw heḻgir
ئارایشتکەری ئافرەتان، ئافرەتێ کەهەنیە هەڵدەگرێ، ژنێ کە ڕوومەتی ئافرەت هەڵدەگرێ، هەنیە هەڵگر.

**دەموچاو هەڵگرتن** (کتپ) demwçaw hel̲girtin

ڕووبەت هەڵگرتن، هەنیەهەڵگرتن، موو هەڵکەندن لەدەموچاو بۆ جوانیی، تاس ولووس دان(خۆ یان یەکێکی دیکە).

**دەموچاو هەڵگوشیین** (کتپ) demwçaw helgušîn

چرچاو هەڵگوشیین.

**دەمودوو** (ن) demw dü

دەموکاویژ، دەم ودووان، دەراوی دەم، گفتوگۆ، وتوویژ، تەرزیان شێوەی ئاخاوتن.

**دەمودەست** (ئاک) demwdest[1]

دەمودەس، لەناکاو، دەس بەجێ.

**دەم ودەست** (ئاک) demw dest[2]

هەرنهۆ، یەکەندەر دوو، هەرئێستە، ڕاستەوخۆ.

**دەم وفلچ** (ن) dem wfil̲ç

دەمو دووی ناشیرین، دەموفلق، دەم و(لەوس، کاویژ، قەوچ)، ئاخاوتنی پڕ وپووچ.

**دەموکانە** (ن،رو) demw kane

دەمکانە، دەمکانە، دەموکە، دەبوقان، دوکا، دوکانە،دەنوکە، دیکانە، زلیقۆ، پنچە دارێکە وەک دوومەڵ لەسەر دارمازوو سەوزدەبێ و بەرێکی وردی لینجی هەیە.

**دەمولموز** (ن) demw limoz

دەم وقەپوزی ئاژەڵ.

**دەمولووت بەیەکدادان** (ئد)
demw lüt be yekdadan

١- پەست بوون، دڵگیربوون.
٢- لێ وەرزبوون، چارەنەویستن.

**دەمە** (نک) deme[1]

موشەدەمە، ئامرازی ئاگرگەشاندنەوە بەفوو بەرەنگار کردنی.

**دەمە** (ن) deme[2]

١- کزەبای سەرکێوان لەزستاندا.
٢- ڕۆژی باو باران.

**دەمە** (ن) deme[3]

بنکە(جغارە، جگەرە).

**دەمە** (ن) deme[4]

بەفرەلووکەی باهاوردوو.

**دەمەتەقە** (ن) deme teqe

دەمەتەقێ، دمەتەقە، گفتوگۆی نێوان دووکەس...

**دەمەتەقێ کردن** (کتن) deme teqê kirdin

پێکەوەبەئاخاوتن کات بردنەسەر.

**دەمەچاو** (ن) deme caw

خواردنی جووراو.

**دەمەداچەقێ** (ن) demedaçeqê

دەمەکوتێ، نزیکە مەرگێ، گیانەڵا، هەناسەسواری کاتی مردن.

**دەمەداچەقێ پێ کەوتن** (ئد)
demedaçeqê pê kewtin

نزیکە مەرگێ بوون،
دەمەجووڵێی سەرە مەرگێ پێ کەوتن.

**دەمەدەم** (ن) demedem[1]

پێش وتار، دەستپێک، سەرەتا.

**دەمەدەم** (ن) demedem[2]

پێش وتار، دەستپێک، سەرەتا.

**دەمەدەمێ** (ن) demedemê

شەرەدەمێ، کێشەوهەرا، هەراوبگر، قرەوهوور، بۆرەبنار، لۆغەلۆغ.

**دەمەدەمێ کردن** (کتن) demedemê kirdin

شەڕە(دەمێ، دەنووکە، دەم)کردن، دەمەوەریی کردن، بەرزەچەنەیی کردن، زمان درێژیی کردن.

**دەمەرقاچان** (ن) demer qaçan

فیشەکەشیتە.

**دەمەرقوپان** (ن) demer qopan

پانتۆل، شەڕواڵ، شەڵواری سەردەرپێ.

**دەمەرێزە** (ئان) deme r̲êze

دەم هەڵوەریو، کول، کولارتە، کولبوو(تیغ).

**دەمەرێزەبوون** (کتن) deme r̲êzebün

دەم هەڵوەریین، کولارتەبوون، کول بوون.

**دەمەزەردکردنەوە** (کتپ) demzerd kirdinewe

دەمەزەردکردنەوە، دەم تیژ کردنەوە، ئاودانەوە، دەمەزەن کردن، سەرنیاکردن، ئاودان، (ئامرازێلەئاسن دروستکراو).

**دەمەشێر** (ن،رو) deme šêr

گوڵی دەمەشێر.

**دەمەقاڵە کردن**(کتن) demeqwal̲e kirdin

قرەقر کردن، گاشەکردن.

**دەمەقاڵێ** (ن) deme qal̲ê

جرەجر، دەم قرە، دەمرگە، دەمقاڵێ، دەمەقاڵە، دەقڕەنگێ، دەمە(قال، قاڵە، قرە)، شەڕە(دەنووکە، دندوکە)، کێشە(بەئاخاوتن، وقرە)، مشتومڕ.

**دەمەقەیچی{قوماش}** (نک) deme qeyçî

برش، برشتی مقەست.

**دەمەلاسکە** (ن) demelaske
دەمەلاسکێ، دمەلاسکە، دەم(هەڵکی، لاسا)، دەم (پاچقانیی، پاچگانیی)، زارزارکە، زارڤە.

**دەمەلاسکە کردن** (کتن،کتپ) deme laske kirdin
١- دەمەلاسکێ کردن، لاسایی کردنەوە، وەک یەکێ کردن بۆ گاڵتە، ئەداڵێ دەرهێنان.
٢- دەم لێ خوارکردنەوە.
٣- تیزپیوەکردن، دانەبەر کلکان، لێ پارانەوە.
٤- لێ پارانەوە.

**دەمەنادەمێ** (ئاک) deme nadmê
جارەناجارە.

**دەمەوانە** (ن) demewane
تۆپەوانە، دەربین، دەربینک، دەرین، دەم هەڵبین، دەمەڵبین، زارەوانە، زاربین، زاراخن، زارەوانە، پاشەوانە.

**دەمەڕوو** (ئان) deme r̲ü
بەسەر ڕوودا کەوتوو، لەپەڕوو کەوتوو.

**دەمەونخوون{دەفر}** (ئان) deme w nixün (defir)
دەرنخوون، دەمەو (خوار، خوون، ژێر، ڕوو)، نخونکراو، سەرەو(نخون، ژێر)، نخون وەکراو.

**دەمەونخوون بوون** (کتن) deme w nixün
بەدەما(دەمدا) خستن.

**دەمەونخوون کردن** (کتپ) demewnixün kirdin
بەدەما(دەمدا) خستن.

**دەمەوەر** (ئان،ن) demewer
بەرزەبلیس، بەزۆک، بەسبیژ، خیراگۆ، چەڵتەکەر، چەنەباز، دەڤ یان دەم(سڤک، گەرم، هار)، دەڤەڕێ، دەڤەژەن، دەماوەر، زمان درێژ، زۆر وێژ.

**دەم هەڵبەست** (ئان) dem hel̲best
دەم هەڵبەستراو، کەسێ کەدەم ولوتی خۆی داپۆشیوە.

**دەم هەڵپچران** (ئد) dem helpiçr̲an
ئاخاوتن دەست پێ کردن، دەست بە ئاخاوتن کردن، دەم کردنەوە بۆ قسەکردن، دەم (هەڵێنان، هەڵێنانەوە).

**دەم هەڵپێچ** (ن) dem helpêç
پەڕۆی دەم پێ هەڵ بەستن، دەسەسڕی بە دەم و لووتەوە پێچان.

**دەم هەڵە** (ئان) dem hel̲e
زۆر بەقسە، قسەهەڵبەست.

**دەم هەڵێنانەوە** (کتن) dem hel̲ênanewe
ئامادەبوون بۆ وەرام
دانەوە، خۆ ئامادەکردن بۆ ئاخاوتن.

**دەمی خۆنائخنین** (ئد) demî xo axinîn
نەئاخاوتن، نهێنیی ئاشکرا نەکردن، دەمی خۆگرتن.

**دەمی خەڵکی مشتی خۆم نییە بینوقێنم** (رس) demî xel̲kî miştî xom niye bînüqênim
دەمی گۆزەت پێ دەگیرێ، نەک دەمی خەڵکان.

**دەمیرە** (ن) demîre
سەڵتە، کولۆنجە(مەلایان).

**دەمی سەگ بە تیکە ببەستە** (پن) demî seg be tîke bibeste
ئەگەر دەتەوێ سەگ لەدووتەوە بڕوا خواردنی پێبدە. پالەی چاک، ڕۆژانەی چاکی دەوێ.

**دەن** (ن) den
هەرس، هەزم، هەڵتاو.

**دەنا** (ئپ) dena
مەگین، مەگەر.

**دەناچیە** (ن) denaçîye
مەتەڵ.

**دەناندن {خواردنی ناوگەدە}** (کتپ) denandin (xwardinî naw gede)
هەرس کردن.

**دەند** (ن) dend
دەندە، دەنتە، دیمەک، جیگە گاسن لەئامووردا، زبانەی ئیرەق (کەگاسنی پێوەدەکەن).

**دەندردار** (ئان) dendir̲dar
داندر، دڕن، گرنج گرنج.

**دەندی** (ئان) dendî
شەتەک دراو.

**دەنک** (ن) denik
١- دانەی دانەوێڵە. ٢- دندک، دەندک، دانک، دەنکە، ناوک(میوە)، لب، تۆو، دیانە.

**دەنکە** (ن،ڕو) denke
چاودار، جۆدان، چۆدان.

**دەنکە دەنکە** (ئاک) denke denke
تۆزە تۆزە.

**دەنگ** ١ (ن) deng
ئاواز، ئاوازە.

**دەنگ** ٢ (ن) deng
تەقە، دەی.

**دەنگ** (ن) ٢ deng
باس، باس وخەبەر، هەواڵ، ئاگا، خەبەر.
**دەنگان** (ن) dengan
ناوبانگ.
**دەنگبڕ** (ن) dengbir̲
دەنگ (کپکەر، ئەهێل، سایلەنسەر، هەرشتێ دەنگ کپ دەکا).
**دەنگ بڕان** (ئد) deng bir̲an
١- لەناوچوون، فەوتان.. ٢- ون بوون.
٣- دەمکوت بوون، دەنگ نەمان، بێ دەنگ بوون.
**دەنگ بڕین** (کتپ) deng birîn
دەنگ(کپ کردن، نەهێشتن، نەهێلان).
**دەنگ بڵاوبوونەوە** (کتن) deng bil̲aw bûnewe
پڕوپاگاندە بڵاوبوونەوە.
**دەنگ بڵاوکردنەوە** (کتن)
deng bil̲aw kirdinewe
پڕوپاگەندە بڵاوکردنەوە.
**دەنگ بڵاوە** (ش) dengbil̲awe
دەنگ(هەیە، گەرمە).
**دەنگ بلند** (ئان) deng bil̲in
دەنگ(بەرز، زل، گەورە)، کەسێ دەنگی زۆر دەڕوا.
**دەنگبێژ** (ن) dengbêj
سترانڤان، قامبێژ، دنگبێژ.
**دەنگ خۆش** (ئان) deng xoš
ئاواز دڵگیر، خۆش ئاواز.
**دەنگ خۆشی** (ن) dengxošî
خۆشی دەنگ، دڵگیری ئاواز.
**دەنگ دابڕین** (ئد) deng dabirîn
ئاخاوتن بڕینەوە لەگەڵ کەسێکدا، گفتوگۆ لەگەڵ دابڕین، لەگەڵ کەسێکدا نەئاخاوتن، ئاشنایەتی لەگەڵ کەسێ نەهێشتن.
**دەنگدار** (ئان) ١ dengdar
بە(دەنگ، خوست، ورتە، هەست).
**دەنگدار** (ئان) ٢ dengdar
بەناوبانگ، دەنگین.
**دەنگدار** (ئان) ٣ dengdar
بەدەنگ.
**دەنگدار** (ئان،ری) ٤ dengdar
بەبزوێن نیشانە لەسەر (دانراو، کراو).
**دەنگدان** (کتپ) ١ dengdan
بانگێشتن(کەسێ بۆ سەر فەرمان، بانگ کردن، قاو کردن، خەڵک وەدەرنان(بۆکار).

**دەنگ دان** (کتپ) ٢ deng dan
بیرورا دەرخستن(بەدەنگ) لە هەڵبژاردنی نوێنەر (لە پارلەمان..).
**دەنگدان** (کتپ) ٣ dengdan
سەرزەنشت کردن، لێ تووڕەبوون (بەدەنگی بەرز).
**دەنگدان** (کتپ) ٤ dengdan
بانگ کردن بۆ سەرداوەت، داوەت کردن، زیافەت کردن (کەسێ).
**دەنگدانەوە** (کتن) ١ dengdanewe
زرنگانەوە.
**دەنگدانەوە** (کتن) ٢ dengdanewe
دەنگ(گەڕانەوە، وەگەڕان، هاتنەوە)لەناوچیا، دۆڵ...
**دەنگ دڕان** (کتن) deng dir̲an
بەدەنگی بەرز هاوارکردن، بەقەو هەراکردن، نەعرەتەپێکدان، قیژان، قیژاندن، نەڕان، نەڕاندن.
**دەنگ دلێر** (ئان) dengdilêr
لەخۆڕازیی، پڕ باوەڕ (بەخۆ).
**دەنگ دەرچوون** (کتن) deng derçûn ١
دەنگ وباس بڵاوبوونەوە، قسەچوونەدەرەو لەیەکێکەوە بۆ ناو کەسانی دیکە، دەنگ(دانەوە، ئەدان).
**دەنگ دەرچوون** (کتن) deng derçûn ٢
وەدەنگ هاتن لەسەرشتێ، لەسەرهاتنە وەڵام.
**دەنگ دەرچوون** (ئد) deng derçûn ٣
تووڕەبوون، دەنگ دەرهاتن، لەتووڕەیییەوە وەدەنگ هاتن.
**دەنگ دەرهاتن** (کتن) deng derhatin
دەنگ دەرچوون، (بەجۆرێک ئەم و ئەو بیبیستێ).
**دەنگ دەرهێنان** (کتپ) deng derhênan
ئاخاوتن.
**دەنگ دەرهێنان** (کتپ) deng derhênan
هێنانە ئاخاوتن.
**دەنگ زل** (ئان) deng zil
دەنگ (گەورە، قەبە).
**دەنگژار** (ن) deng jar
نووزە لەقوڕگەوە، ناڵەی دەروون.
**دەنگ کردن** (کتن) ١ deng kirdin
ئاخاوتن، پەیڤین، قسەکردن، وەرام وەدان، وەڵام دانەوە، گوتن، ووتن.
**دەنگ کردن** (کتپ) ٢ deng kirdin
نهێنی ئاشکراکردن.

**دەنگ گیران** (کتن) dengĝîran
دەنگ( دەرنەچوون، دەرنەهاتن، کپ بوون، کەوتن، گیریان، نووسان).

**دەنگ لی کردن** (ئد) deng lê kirdin
بەدەنگی بەرزکەسێ بانگ کردن،
بەقەودواندن، تێ خوڕیین، لێ گۆڕاندن.

**دەنگ لیوەهاتن** (کتن) deng derhênan
دەنگ کردن، دەست بەئاخاوتن کردن.

**دەنگ لێ نەکردن** (ئد) deng lê nekirdin
باس نەکردن، لێ نەدوان.

**دەنگ نووسان** (کتن) deng nüsan
دەنگ دەرنەچوون( بەهۆی سەرما خواردەگیی)، دەنگ گیران.

**دەنگ نووساو** (ئان) deng nüsaw
دەنگ( کپ بوو، کەوتوو، گیراو، گیریاو).

**دەنگ نیر** (ئان) deng nêr
دەنگ( زیر وبەرز، گڕ، گڕوقەبە ).

**دەنگۆ** (ن) dengo
دەنگ، وتەوت، شایەعە.

**دەنگوباس** (نک) dengwbas
ئاخاوتن وگفتوگۆی سەرزمان، باس وخواس، قسەوباسی سەر دەمان، بنتار، هەواڵی نوێ، نووچە.

**دەنگ وسەدا** (ن) dengw seda
ئاوازە.

**دەنگ وسەنگ** (ن) deng w seng
هەواڵ.

**دەنگە دەنگ** (ن) denge deng
هەراوبگر، دەنگاتیی، دەنگەشە، ژاوەژاو.

**دەنگەشە بلاوبوونەوە** ( ئد )
dengešc bilawbünewe
پڕوپاگاندە بلاوبوونەوە، تەحاتەحا کەوتنەوە.

**دەنگ هاتن** (کتن) deng hatin
دەنگ بیستن.

**دەنگ هەلبرین** (کتن) deng helbirîn
دەنگ بەرز کردنەوە.

**دەنگی دلیرە** (رس) dengî dilêre
بنکە: دوور بەدوور دیمەن و
رواڵەت جوان ورەنگینە.

**دەنگیی دل** (ن) dengî dil
نەبز، نەزم، نەزلە، ترنگە، شوار، شوارۆ.

**دەنووکە** (ن) denük
دندوکە، دوندوکە، دندوڵ، دمکە، دەندوکە، نیکل.

**دەنووکە** (ن.ئم) denüke
ئەو ئامرازەی ژێی تار یان گیتاری پێ لێ دەدەن.

**دەو** (ن.کل) [1] dew(kl)
غار، هەرا.

**دەو** (ن) [2] dew
بەن، پەلە، پەل، پەلەیی، دەسوبردیی.

**دهۆ** (ن) [1] diho
فیل.

**دهۆ** (ئان) [2] diho
وەڕز، وەڕەز، نارەحەت.

**دەوار** (ن.ئا.کی)[1] dewar(ki)
دەوێر، ولاخ، ولاخی بەرزە، چارەوێ.

**دەوار** (ن) [2] dewar
رەشماڵ.

**دەوارنشین** (نک) dewarnišîn
چادرنشین، کۆچەریی.

**دەوال** (ن) dewal
دزی( شەوانە، شەوگەڕ).

**دەوانیی** (ن) dewanî
غارغارین ( بەئەسپ ).

**دەودەوانەکیی** (ن) dewdewanekî
پێشبرکێ.

**دەور** (نک) dewr
دۆر، دۆن، دەورە، دەوراو دەور، دۆرمادار.

**دەوراندەور** (ن.ئاک) dewrandewr
بەهەموولادا، دەوران پشت، لەهەموو لای شتێ.

**دەوردان** (کتن) [1] dewirdan
ئاخلەدان، دەورەدان.

**دەوردان** (کتپ) [2] dewirdan
دەورەگرتن، دەورپشت گرتن، هەمووڵاێ گرتن.

**دەوردان** (کتن.کتپ) [3] dewirdan
تەقەلا لەگەڵ کردن بۆ پێک هێنانی نیازێ، تێ کۆشیین بۆ وەدیی هێنانی مەبەستێ.

**دەور کردنەوە** {وانە} ( کتپ )
dewir kirdinewe(wane)
پێداچوونەوە،چلانن.

**دەورگرتن** (کتپ) dewir girtin
ئابلوقەدان، چوار( لادان، لاگرتن، دەورلێ گرتن).

**دەوروبەر** (ئاک) dewr w brer
ئاقار، دەوروپشت.

**دەوروپشت** (نک) dewrwpišt
دەوروبەر، دەوران پشت.

**دەورە** (ن) dewre
دۆر، خوڵ.
**دەوروودوکان** (ن) dewrew dukan
سەردەم.
**دەوریی** (ن) dewrî
دۆریی، دەفری (پەلی لێودار، پەل، نەقووڵ)، قاپی پەل.
**دەوس** (ن،کی) dews(ki)
جێپێ، شۆپ، شوێن پێ.
**دەوساندن** (کتپ،کی)[1] dewsandin(ki)
پا یان پێ(لێنان، پێدانان، پیانان).
**دەوساندن** (کتپ،کی)[2] dewsandin(ki)
پێشێل کردن، بەزۆر پەستاوتن.
**دەوس دۆزیی** (ن،کی) dews dozî(ki)
ئاژۆ، شوێن پێ دۆزیی.
**دەوس دۆزیی کردن** (کتپ،کی)
dews dozî kirdin(ki)
ئاژۆکردن، شوێن پێ هەڵگرتن، شوێن دۆزینەوە بەهۆی جێپێ.
**دەوکردن** (کتن،کل)[1] dew kirdin(kl)
راکردن، هەرا کردن.
**دەوکردن** (کتن،کل)[2] dew kirdin(kl)
غارکردن، دەوان، دەوین.
**دەوکیس** (ن،کی) dew kîs(ki)
دۆی(کیس، لەکیس کراوی هەڵچۆراو، لەناوکیسەدا خەستەوە کراو)، خەستەی توورەکە، تۆراغ.
**دەوڵەت** (نک)[1] dewlet
تەرش، ماڵات، مەڕوماڵات، گاوگۆتاڵ، ولس، ولست.
**دەوڵەت** (نک)[2] dewlet
دارایی.
**دەوڵەت** (ن)[3] dewlet
ڕەژیم، ڕێژیم، میریی.
**دەوڵەتگەریی** (ن) dewletgerî
هونەری دەوڵەت بەڕێوەبردن، دیپلوماسیەت، دیپلۆماسیتیی.
**دەوڵەتیی** (ئان)[1] dewletî
میریی، تایبەتی میریی.
**دەوڵەتیی** (ئان)[2] dewletî
سەربەمیریی.
**دەوڵەمەند** (ئان) dewlemend
دارا، دارندە، دەوڵەتمەن، دەوڵەتمەند، دەسڕۆ، دەستڕۆ، بوودە، بووە، پارەدار، پوولدار، خاوەن پارەوپوول، ساماندار، کۆک، هەبوو.
**دەوڵەمەندبوون** (کتن) dewlemendbûn
بوون بەخاوەن سامان، سازبوون.
**دەوڵەمەندیی** (ن) dewlemendî
بوونیی، بووەیی، پارەداریی، دارەندەیی، دەوڵەتمەند یی، ساماندار یی، کۆکیی، کاسەپڕیی، خۆش گوزەرانیی.
**دەوە** (ن)[1] dewe
گەڕ، گیچەڵ، شلتاخ . شەلتاخ.
**دەوە** (نک)[2] dewe
تەپاڵە.
**دەوەڵان** (ن) dewelan
ئەنباری تەپاڵە، تەپاڵدان، تەپاڵەدان، قەلاخ.
**دەوەن** (ن،رو)[1] dewen
دەڤی، دەون، دەوون، دەوەند، دەوی، سالویت، سالووت، چنجەداری لێرەوار، درەختی پچووکی لە یەکەوە نزیک، کۆمەڵە درەختی لێرەوار کەیەشتا نەبوو بن بەدار.
**دەوەن** (ن،رو)[2] dewen
بنکەدار کەتازە هەڵی دابێتەوە، دارێکە بڕابێ و خەڵفی تازەی دەرکردبێتەوە و زۆر بەرزنەبێ ونەبوو بێ بەدار.
**دەوەن بەئاش** (شر) dewen be aš
کێشەوهەرای بێ سوود، ئاخاوتنی بێهوودەو بێکەڵک، شەرەقسەی بێفەڕ.
**دەویان** (کتپ) dewyan
لێ وردبوونەوە، زۆر بەوردیی تەماشاکردن.
**دەویت** (ن) dewît
دویت، دەود، دەوید، دەیوس، ماسکەش، گەواد.
**دەوێڵ** (ن) dewêl
زوێل، پارچەچەرمی بارێک.
**دەویین** (کتن)[1] dewîn
دانەغار.
**دەویین** (کتن)[2] dewîn
راکردن، هەراکردن.
**دەهر** (ن) dehir
چەرخ، ڕۆزگار، ڕۆژگار.
**دەهریی** (ئان)[1] dehirî
زۆر توورە، دەمریی، ڕق هەستاو، شێتگیربوو.
**دەهریی** (ئان)[2] dehirî
خوێن سارد، گوێ بەهیچ نەدەر.

**دەهریی** (ئان) ٢ dehirî
پێچەقین، سوورلەسەر مەبەست.
**دەهریی بوون** (کتن) dehirîbûn
توورەبوون، ڕق هەستان،
شێتگیربوون، ڕکێ(هەستان، هەڵستان..).
**دەهۆ** (ن) ١ deho
فیل.
**دەهۆ**(ن) ٢ deho
جاجمی هەڵدوراو.
**دەهۆڵ** (ن،ئم) dehol
دهۆل، دەزوول، تەپلی گەورەی بەزم گێران.
**دەهۆڵدان** (ئان) deholdan
زکێ زل، ورگن.
**دەهۆڵژەن** (ن) deholjen
دەهۆڵ(کوت، لێدەر، ئەنگێو).
**دەهۆڵ کوت** (خ) deholkut
١- دەم دڕاو، نهێنیی‌ئاشکراکەر. ٢- فشەکەر.
**دەهۆڵ لێدان** (کتپ) dehollêdan
دەهۆڵ ژەندن، لەدەهۆڵ دان.
**دەهۆڵ وزوڕنا** (ن) dehol w zurna
پۆستەوئیدارە پۆستەویدارە.
**دەی!** (ئسب) dey!
دی!، دێ!، دێ هـ!.
**دەیدیک** (ن) deydîk
بێشکە، لانکە، بێشکە، دەرکوش، دەرگوش،
دەرگوشکە، دەکوش.
**دەیز** (ن) deyz
گزرەگیای وشکە وکوتراو بۆ ئالفی ئاژەڵ لەزستاندا.
**دەی سا!** (ئاکە) dey sa!
دەجا، دەکا!، (لەسەرەتای ڕستەوە بەکاردەهێنرێ
بۆ مەبەستی ناڕەزایی، وریاکردنەوە، یان سەرنج
ڕاکێشان
**دەیلاخ** (ن،ئان) deylax
دەیلاغ، بەچکەوشتر(شیرەخۆرە).
**دەیلەم** (ن) deylem
دەلەم، باری، باریە، لەوازە، لۆسە، نویل، شیشێکی
ئاسنی درێژە وسەرێکی دەم دڕەوشەییە دەیخەنەبن
سەنگی قورس تا هەڵی بڕێ.
**دەیەک** (ن) deyek
لەدەبەش بەشێک، لەدە پاژ پاژێک، دەمەک.
**دیار** (ئان) ١ diyar
ئاشکرا، بەرچاو، خۆیا.

**دیار** (ئان) ٢ diyar
بەر(گشت، هەموان)، دەرکەوتوو، ناسراو.
**دیار** (ئان) ٣ diyar
بێ(چەندوچوون، گومان، هەڵە).
**دیار** (ئان) ٤ diyar
بایەخدار، خۆیا، گەورە، هەڵکەوتوو(مرۆڤ).
**دیار** (ن) ٥ diyar
سەروسیما.
**دیاربوون** (کتن) diyarbûn
١- دەرکەوتن، ئاشکرابوون. ٢- کەوتنەبەرچاو،
وەبەرچاو کەوتن، هاتنەبەرچاو.
**دیاردان** (کتن) ١ diyardan
وەدەرکەوتن، هاتنەکایەوە.
**دیاردان** (کتپ) ٢ diyardan
خستنەروو، پیشاندن.
**دیاردە** (ن) ١ diyarde
دیاردی، دابی تازەپەیدابوو، دەستوری تازەداهاتوو.
**دیاردە** (ن،ئا) ٢ diyarde,
تەماڵ، کەرویشکی خۆ لەلانەدا مەڵاس کردوو.
**دیاردیی** (ن) diyardî
پاسەوانیی شەوانە، پاسەوانیی،
کێشک(لەشەودا..).
**دیاردیی کردن** (کتپ) diyardî kirdin
نێچیر بەدیی کردن، چاو بەنێچیر کەوتن.
**دیار کردن** (کتپ) diyar kirdin
پیشان دان.
**دیارگا** (ن) diyarga
چاوەندارگا، دیمەنگا، ڕوانگا، ڕوانگە(پەنجەرەی
خانووی سەرگردێکی بلند یان چیایەک کەدەڕوانێ
بەسەر چاوەندازێکی دەوروبەردا).
**دیارناو** (ن،ری) diyarnaw
ناوی ناسراو(کەسێ یان شوێنێ).
**دیارنەمان** (کتن) ١ diyar neman
ڕۆیشتن، لەبەرچاونەمان، شوێن
بەجێ هێشتن، لەبەرچاو گوم بوون، لەچاو بزربوون.
**دیارنەمان** (کتن) ٢ diyar neman
بزربوون، ڕەش ڕاهاتن، گوم بوون،نەمان، ون بوون.
**دیارنەماو** (ئان) diyar nemaw
بزر، بزربوو، گوم، گوم بوو، نەماو، ون.
**دیار ونادیار** (ئاکە) diyar w nadiyar
دەروژوور، لای ئاشکراو لای نادیار.

**دیاری** (ن) diyarî
پێشکەشی، پێشکێش(بەبێ یان بنێرێ بۆ دۆستێک)، دەساوێز، سەوقات، بەخشش.

**دیاری دان** (کتن) ١ diyarî dan
بەرچاو(کەوتن، هاتن)، دەرکەوتن.

**دیاری دان** (کتپ) ٢ diyarî dan
دەساوێز بۆناردن، سەوقات دان، پێشکێش بۆ ناردن.

**دیاری کردن** (کتپ) ١ diyarî kirdin
نیشانەکردن، دەست نیشان کردن.

**دیاری کردن** (کتپ) ٢ diyarî kirdin
ئاماژەکردن (تابیبنرێ).

**دیاریکردن{دەزگیران}** (کتپ) ٣ diyarîkirdin(dezgîran)
نیشانەکردن و شەکراو خواردنەوە.

**دیباجە** (ن) dîbace
پێشەکی، دیباجە، دیواچە.

**دیبەگ** (ن) dîbeg
دنکی گەورەی برنج...تێدا کوتان.

**دیتراو** (ئان) dîtraw
دیو، بینراو.

**دیتن** (کتپ) dîtin
بەرچاوکەوتن، چاوکەوتنەسەر، چاو پێکەوتن.

**دیتنەوە{شتی گومبوو..}** (کتپ) dîtinewe(şitî gumbû)
پەیداکردنەوە،دۆزینەوە.

**دیتنی** (ئان) dîtinî
شتێ شایانی(دیتنە، دیتن بێ).

**دیتۆخ** (ئان) dîtox
بینا، چاوساغ.

**دیتی** (ن) dîtî
دۆزراوە، هەتیو، منداڵی دایک وباوک نەناسراوی فڕێ دراو.

**دیدار** (ن) dîdar
دیار، ڕوخسار.

**دیدە** (ن) dîde
بینایی، چەو، چەهڤ، سۆمایچاو.

**دیدە نمین{ئافرەت}** (ئان) dîdenimîn(afret)
چاو(فرمیسکاویی،بەگریان)، گرینۆک.

**دیدەنی** (ن) dîdenî
دیدار، دیداربینیی، دیدەن، دیەنیی.

**دیدەنی کردن** (کتپ) dîdenî kirdin
چوون بۆ لای کەسێ بۆچاوپێ کەوتن، دیداربینیی کردن.

**دیدەوانیی** (ن) dîdewanî
پاسەوانیی، کیشکچیتیی، کیشکڤانیی، ئارینەک.

**دیدی** (ن) dîdî
باواژن، باوەژن، دیماریی، زردایک.

**دیرۆکڤان** (ن،کی) dîrokvan(ki)
مێژوبێژ، مێژو(ناس، نووس).

**دیزداشە** (ن) dîzdaşe
دزداشە، دژداشە، شەوکراس، کراسی ناوماڵ.

**دیزە** (ن) dîze
دیزە، دیزک، دیگە(لەگڵی سووروەوەکراو دروستکراو).

**دیزە بە دەرخۆنە کردن** (ئد) dîze be derxonekirdin
داپۆشیین وشاردنەوە(ئاخاوتنێکی تایبەتیی)، ڕازپۆشیین.

**دیزەبەکوڵ** (خ) dîze bekol̲
کەسێ خاوەنی ماڵ ومنداڵ یان داراییەکەی زۆربێ ونەتوانێ بەئاسانی کۆچ وباریکات، کەسێ لەبەر پارازتنی ماڵی زۆر ناوێرێ کۆچ بکات.

**دیزەی ڕەش** (خ) dîzeyr̲eş
بەد، خراپ، گەندەژە.

**دیزەی شەریکیی نایەتە کوڵ** (پن) dîzey şerîkî nayete kol̲
شەریکیی وخەریکیی.

**دیس** (ئان) dîs
بەسەریەکا لکاو، توندپێکەوە نووساو.

**دیسان** (ئاک) dîsan
ئەمجاریش، ئیدی، ئەمجارتر، ئیسن، جارێکی دیکە، دیسا، دیسانەکە، دووبارە، هەمدیسان، دیسانەوە، هەمیسان، هەمیسانەوە.

**دیستان** (ن) dîstan
سپیا، سپیایەی بن مەنجەڵ.

**دیسک** (ن) dîsk
سوینە، ئەشتی قورین.

**دیسە** (ن،ئا) dîse
مەرەکێویی.

**دیش** (ن) ١ dîş
پروپیت، کەلوپەل، شتی ناوماڵ.

**دیش** (نک) ٢ dîş
١- پارەوپوولی بەردەست (بۆ پێویستیی ڕۆژانە).
٢- پاشماوە، پاشەڕۆک.

**دیڤۆک** (ئان،کی) dîvok(ki)
نەگونجاو، نەشیاو.

**دیق** (ن،پز) [1] dîq
دەردەباریکە، دیق، سیل.

**دیق** (ن،پز) [2] dîq
(تا) ونەخۆشیی سیل.

**دیق** (ن) [3] dîq
خەم وخەفەت، خەمی زۆر، دیق، سوێ وخەفەتی دەروون.

**دیق پێ کردن** (کتن) dîq pêkirdin
سوێ خستنە ناو دڵ.

**دیق چوونە دڵ** (کتن) dîq çûne diḻ
سوێ چوونە دڵ.

**دیق کردن** (کتن) [1] dîq kirdin
پیش خواردنەوە و تووڕەبوون.

**دیق کردن** (کتن) [2] dîq kirdin
١- سوێ بوونەوە، مردن. ٢- دەردەباریکە گرتن.

**دیقڵ** (ن،م،کی) dîqḻ(ki)
کەڵەشێر.

**دیقە دیقەدان** (ند) dîqe dîqedan
گاڵتەپێ کردن و تووڕە کردن.

**دیل** (ن،ئان) dîl
ئێسیر، یەخسیر.

**دیلان** (ن) dîlan
جۆلانە، دیلەکان، دەلەکانێ، دیلانێ.

**دیلانە** (ن) dîlane
دیدەکانیی، هەڵپەرکێ، گۆبەند، گۆڤەند.

**دیلانێ کردن** (کتن) [1] dîlanê kirdin
دیلان کردن، زەماوەند کردن، گۆڤەند گێران.

**دیلانێ کردن** (کتن) [2] dîlanê kirdin
جۆلانەکردن، لەگوریس نیشتن، لەجۆلانەنیشتن، دیلەکانێ کردن.

**دیلباز** (ئان) dîlbaz
شارەزا، کارامە.

**دیلبەند** (ن) dîlbend
پاچڤەکار، تەرجمان، تەرجومان، دیلماج، دیلمان، دیلمانچ.

**دیلۆک** (ن،کی) dîlok(ki)
ستراني داوەتێ، گۆرانیی هەڵپەرکێ.

**دیلۆکڤان** (ن،کی) dîlokvan(ki)
شایەر، گۆرانی بێژی شایی.

**دیلەک** (ن) [1] dîlek
پارانەوە، تکا.

**دیلەک** (ف) [2] dîlek
شفات، چاوپۆشیی.

**دیلەک{خیوەت}** (ن) [3] dîlek(xîwet)
دیلەی، داری چادر.

**دیلەکچی** (ن) [1] dîlekçî
تکاکار، تکاکەر.

**دیلەکچی** (ن) [2] dîlekçî
بەخشندە، چاوپۆشیکەر.

**دیلیی** (ن) dîlî
یەخسیریی.

**دیم** (ن) dîm
ڕوومەت.

**دیماتیی** (ن) dîmatî
نیشتەجێ.

**دیماتیی کردن** (کتن) dîmatî kirdin
نیشتەجێ بوون، مانەوە(لەشوێنێ).

**دیمانە** (ن) dîmane
دیمان، چاوپێ کەوتنەوەی دۆست.

**دیمەشۆرە** (ن) dîmešorc
سەرکەف(ژنان دەموچاوی پێ دەشۆن).

**دیمەک** (ن) dîmek
دار، موور.

**دیمەن** (ن) [1] dîmen
بەرچاو، پیش چاو، وێنەگا.

**دیمەن** (ن) [2] dîmen
ڕواڵەت، قەلافەت.

**دیمەن** (ن) [3] dîmen
چاوئەندان، چاوەندان، چاواندان، دیا، دیمان.

**دین** (ن) [1] dîn
ئایین، خواپەرستیی، بیروڕای خواپەرستیی.

**دین** (ئان) [2] dîn
دیوانە.

**دینا** (ن) dîna
بڕیارێکی شەرعی، وەڵامی موفتی بۆ کێشەیەکی یاسا.

**دینار** (ن) [1] dînar
١- بیست درهەم(پەنجایی) پارەی وڵاتی عێراق.
٢- کێشانەی ١،٥ی درهەمێ.

**دینار** (ن) [2] dînar
پەرە قومار کەخاڵی خشتی چوار گۆشەی سووری تێدایە.

**دیناوەر(ئاینی ئیسلام) (ن)** dînawer(ayinî îslam)
فەتوادەر، فتوادەر، موفتی، دینەوەر

**دین تەنک (ئان)** ۱ dîn tenik
کەم پارە.

**دین تەنک (ئان)** ۲ dîn tenik
کەم باوەڕ بەئایین، دینەڕ، بێ(بڕوا بەخوا، ئایین، دین)، خوانەناس.

**دینج (ئان)** ۱ dînc
ئاسوودەو بێ خەم، ئاسوودەی بێ خەفەت، سەروەل رەحەت.

**دینج (ئان)** ۲ dînc
مەشکین، نەشکاو، ئەزیەت نەدراو.

**دینج (ن)** ۳ dînc
جێگەی تەنیایی مرۆڤی(دیندار، دەرویش).

**دیندار (ئان)** dîndar
دینیی، پیاوی‌خوا، پیاوخاس، پیاوچاک.

**دین دۆراندن (کتن)** dîn dor̲andin
لەدین بەریی بوون.

**دین وئایین (ن)** dînw ayin
۱- خواست، مەبەست. ۲- ڕێگاو شوێن.

**دینۆکە (ئان،کی)** dînoke(ki)
جرپن، شێتۆکە.

**دینەوەر (ئان)** ۱ dînewer
پڕ دەسەلات.

**دینەوەر (ن)** ۲ dînewer
پردی سیرات، ئەوپردەی ئۆمەت لێی دەپەڕێتەوە بۆ بەهەشت، تاوانباران لەسەری دەکەونە خوارەوە.

**دینیی (ئان)** ۱ dînî
بە(ئایین، ئیمان، دین)، دین قایم، خوا پەرستی ڕاست.

**دینیی (ئان)** ۲ dînî
شێتایەتیی، شێتیی.

**دیو (ن)** ۱ dîw
مەلبەند، ناوچە.

**دیو (ن)** ۲ dîw
چاوە، ژوور، هۆدە.

**دیو (ن)** ۳ dîw
خانوو، ماڵ.

**دیو (ن)** ٤ dîw
دیو، پشت، پێش، ڕوو، ڕووکار، لا، بەر.

**دیوار (ن)** ۱ dîwar
هەڵچناوی بلند لەکەرەستەی ماڵ دروست کردن، بارستایی دروستکراوی ڕێک وبەرز لەکەرەستەی ماڵ دروست کراو.

**دیوار (ن)** ۲ dîwar
بەربەست، باروو، ڕەمپە.

**دیواربڕ (ن)** dîwar bir̲
ئامرازی دیوارکون کردن، ئاسنێکی لووت تیژە دیواری گلی پێ دەبڕێ، پیکی دیوار بڕین.

**دیوارکردن (کتپ)** dîwar kirdin
دیواردانان، هەرچواردەور بەدیوار گرتن.

**دیوارە (ن)** dîware
حەسار، زیوار، لێواری بلند.

**دیوار هەڵچنین (کتپ)** dîwar helçinîn
دیوار بەرز کردنەوە.

**دیوان (ن)** ۱ dîwan
دەزگای میری، سەرا، بارەگای دامودەزگا (دەستگا)ی میری.

**دیوان (ن)** ۲ dîwan
کتێبی هۆنراوە.

**دیواندڕ (ئان)** dîwan dir̲
دەنگ گەورە، قەرەباڵغکەر، قەرەباڵغیکەر.

**دیوانیی (ئان)** ۱ dîwanî
سەربەدەوڵەت.

**دیوانیی (ن)** ۲ dîwanî
خەتی تێ هەڵکێش، جۆری ڕەنووسی نوسینە.

**دیواودەر (ئان)** dîwaw der
دیواندەر، دیواندەر، دیوەدەر، کوناودەر، کونبوو لە هەردوو دیو.

**دیواودیو (ئان)** dîwa w dîw
دیواندیو، بەراوەژوو.

**دیواودیو کردن (کتپ)** dîwaw dîw kirdin
بەراوەژوو کردن، شت هەڵگێرانەوە ئەمدیو بۆ ئەودیو.

**دیوەخان (ن)** dîwexan
دیواخان، دیواخانە، دیوان، دیوانخانە، دیوەخانە، ژووری بەکۆمەڵ لێ دانیشتن، هۆدەی میوان.

**دیی (ئان،ج)** ۱ dî
ئیتر، ئیکە، هیتر.

**دیی (ئان،ج)** ۲ dî
تر، دن، دی.

**دیتنەوە** (کتپ) ١ dîtnewe
دووبارە کەسێ دیتن.
**دیتنەوە** (کتپ) ٢ dîtinewe
بینینەوە، دۆزینەوە، وەدیتن.
**دین** (کتن) dîn
بوون، زان، زایین.
**دێ** (ن) ١ dê
ئاوایی، دهێ، دیاک، دەگا.
**دێ** (ن) ٢ dê
جـولـێی، گـەلای بـەڕوو ومـازووی دلپـاچراوی لەناوپـەلی درەختدا هەلگیراو بـۆ ئـالفی ئـاژەل لـە زسـتاندا. (دی، دەی، دێو، دەین، دێن، دەیدیک).
**دێ باف** (ن،کی) dê bav(ki)
دایکی باوک، نەنک لەباوکەوە.
**دێدار** (ن) dêdar
خاوەن(دێ، ئاوایی)، خێوی گوند.
**دێر** (ن) ١ dêr
مەڵبەندی ڕەبەنی خاچ پەرست، ڕەبەنۆک.
**دێر** (ئاک) ٢ dêr
دەمێکە، لە(مێژە، مێژینە).
**دێڕ** (ن) ٣ dêr
خەتێ لەنوسین، ڕیزی لەنوسراو، هێل.
**دێراخێز** (ئان) dêra xêz
دیرخێز، دیزەک، تەمەل.
**دێران** (کتپ) ١ dêran
ئاوداشن، دێراندن.
**دێران** (کتن) ٢ dêran
بوون، گونجان.
**دێران** (کتن) ٣ dêran
جـێ(بوونـەوە، تیابوونـەوە)، جیگاتێدابوونـەوە، گرتن.
**دێران** (کتن) ٤ dêran
ویران.
**دێران** (کتپ) ٥ dêran
دێراندن، تەتەڵەکردن.
**دێران** (ئان) ٦ dêran
ئاتاج.
**دێراو** (ن) dêraw
جـۆ، جۆگـە، زەویـی چـاڵکراو، بـۆ ئـاوی ئاویـاریی، جۆگەلە، دەراو، کەردوو، مشار.
**دێر دراو** (ئان) dêr diraw
ئاودراو، ئاوداشت، دەوە.

**دێرس** (ئان) dêris
کۆنینە، کەونارا، دێریک.
**دێرسی** (ن) dêrsî
ویرانیی.
**دێرک** (ن) dêrik
دێری پچووک، ژوورۆکەی ڕەبەنان.
**دێرگا** (ئان) dêrga
لە(زووڕا، مێژ، مێژینە).
**دێرۆک** (ن) dêrok
ڕووداوی مێژوویی.
**دێریک** (ن) dêrîk
مێژوو.
**دێرین** (ن) ١ dêrîn
ڕابردەی کۆن، ڕابوردووی کۆن، دێرساڵ.
**دێرین** (ن) ٢ dêrîn
دێرینە، زۆرکۆن، ساڵان دیدە(شت..).
**دێز** (ئان) ١ dêz
دیزک، ڕەش.
**دێز** (ئان) ٢ dêz
دیـزک، دیـزکێ، بـۆزی ڕەشـتاڵە، ڕەشـی ئامـاڵ بـۆر، ڕەشبام، ڕەشباو، تاڵە.
**دێز** (ئان) ٣ dêz
بەیوم، جووت قوشە، شووم.
**دێز** (ئان) ٤ dêz
بێ فەڕ.
**دێز** (ئان) ٥ dêz
بـۆ(نـەهاتوو، نـەهاتکێ)، کلـۆل، بەوخـەت، دیـزکێ، دیزەک.
**دێزا** (ن) dêza
زرکچ (کەلەگەل دایکی هاتبێتە ماڵی زرباوکی).
**دێ کرن** (کتپ،کی) dê kirn
تەماشاکردن، لێ وردبوونەوە.
**دێگە** (ن) dêge
خوشکی دایک، خاڵتیک، هەب(پوور).
**دێل** (ن،ئان) ١ dêl
دەل.
**دێل** (ن) ٢ dêl
دوێل، زەیل، ژێ.
**دێلم** (ن) dêlim
قاش، کووز(مێوە..).
**دێلە** (ن) dêle
دیلێ، تەختەبەرد.

**دێلەبەن** (ئان) dêleben
دوێلبەن، بەتەلە بەرد تەختە پۆش کراو.
**دێلەدڕ(ئافرەت)** (ئان) dêle dir(afret)
١- بێ شەرم وشۆ ٢- زمان درێژ.
**دێلەمار** (ن،نا)[1] dêlemar
بنن مژ، بنن مشک.
**دێلەمار** (ن،نا)[2] dêlemar
ماری ژەهراویی.
**دێم** (ن)[1] dêm
دیمزار، دیمەکار، دیمەرۆک، دیمەرووک، دیمەرۆ، دەیمەرۆ، دەیمەکار، زەویی(دەیم، بێئاو)، ئەو زەوی یەی ئاو نادرێ.
**دێم** (ن)[2] dêm
دەیم، ئەو ڕووەکەی ئاو نادرێ، کەشتی دیمیی، ئەو کشتوکاڵەی بەتەمای باران دەچێنرێ.
**دێماگۆگ** (ن،ند) dêmagog
ئاژاوەچیی، ئاژاوەگێڕ.
**دێمکە** (ن) dêmke
١- دەمکە، دێبکە، تونکە، تەنکە، مەتارە.
٢- ئاودەمکە، تەرمۆس.
**دێمیلە** (ن،رو) dêmîle
زوڕات، کەردن، گاڵ، هەرزنەگەورە.
**دێمیی** (ئان)[1] dêmî
ئەو ڕووەکەی لەشوێنی دیم پەیدابووبێ، چاندراوی دیم.
**دێمیی** (ئان)[2] dêmî
خۆماڵیی کراو.
**دێ نشین** (ن) dê nişîn
دێهاتیی.
**دێو** (ن) dêw
ئەرژەنگ، ئەهریمەن، ئەهرەمەن، درنج، دەئێڤە، دێڤ جانەوەریکی قەبەی خەیاڵیی ترساوەرە.
**دێوان** (ن) dêwan
کویخا، ئاگاداریکەری گوند، گزیر، پاریزگاری گوند.
**دێوانە** (ئان)[1] dêwane
ئاسمانیی، دێڤانە، دێڤۆنە، سەرسەم، شێت، کەللەیی، لێوە.
**دێوانە** (ن)[2] dêwane
جۆرە دەرویشێکی شێخان.
**دێوانە** (ئان،خ)[3] dêwane
بەتیری ئەشق پێکراو، مەفتوونی خۆشەویستیی.
**دێوانە** (ئان)[4] dêwane
وەک دێو، دێوئاسا.
**دێو بەند** (ن) dêw bend
نوشتە، دوعایەکەگوایا بەهەرکەسێ بێ دێودرنج زیانی پێ ناگەنێ.
**دێوجامە** (ن) dêw came
دیجامە، دیجومە، چەند پارچە پەڕۆی ڕەنگاوڕەنگی لێکدراوە لەڕاودا بەکاردەهێنرێ بۆ هەڵ خەڵەتانی نێچیر..
**دێو دڵ** (ئان) dêw dil
دڵ قاییم، نەترس.
**دێوگیر** (ن) dêw gîr
جن گر، جنگیر.
**دێو ودرنج** (نک) dêw w drinc
ئەزنەوەر.
**دێوەزمە** (ن) dêwe zime
میردەزمە.
**دێوەلووکە** (ن) dêwelûke
١- ئەرژەنگی دێو، مرۆڤ یان جانەوەری زلی کولکن. ٢- مرۆڤی کریتی دەشتەکیی.
**دێویی** (ئان) dêwî
دیوانە، کردەوە نالەبار، کاری وەک کاری دێو(کەسێ)، نالەبار.
**دێهات** (ن) dêhat
دێکان، ئاوایی گەل، گوند گەل، گوندان.
**دێهاتیی** (ن) dêhatî
دیاتیی، دێکانیی، دیماتیی، دێ نشین، دێهات نشین، خەڵکی دێ، لادێیی، لاگەیی، لەدێ نیشتەجێ، گوندیی، نیشتەجێی دێ، دێیی.
**دێیی** (ن) dêyî
دێهاتیی.

کۆتایی پیتی - د -
**End of letter -D-**

# پیتی - ڕ -

# - R -

ر (ن) r

دەهەم پیتە لەو ئەلف وبێیەی ئێستا زمانی كوردی پێ دەنوسرێ، پیتێكی بێدەنگە.

ڕا (ن) ١ ra

ڕای، تەگبیر.

ڕا (ن) ٢ ra

ڕێگە.

ڕا (پر،ئاك) ٣ ra

بۆچی؟، لەبەرچی؟.

ڕا (ن) ٤ ra

جار، كەڕەت، كەشە.

ڕا (ن) ٥ ra

ڕەزامەندیی.

ڕا (پ،ئاك) ٦ ra

دەگەڵ، لەگەڵ.

ڕا (پ) ٧ ra

لایەن..

ڕا (ن) ٨ ra

چاودێریی، چاوێریی.

ڕا (ن) ٩ ra

پێز، كێش.

ڕا (ن) ١٠ ra

ناوەوە.

ڕا (ن) ١١ ra

یادگیریی.

ڕائاو (ن) ١ ra-aw

ئاوەڕۆ، زێراب.

ڕائاو (ن) ٢ ra-aw

ئاوەڕێ، ڕێگەی گەشت وگوزار بەئاودا.

ڕابراودوو (ن،س) rabirawdü

پێش قەرەوڵ، دیدەوان.

ڕابردوو (ئان) rabirdü

ڕابوردوو.

ڕابواردن (كتن) ١ rabwardin

خۆش ژیان بەسەربردن، ڕابووریین، كات بەسەر بردن، كات بردنەسەر(بەخۆشنوودیی).

ڕابووردن (كتن) ٢ rabürdin

بەسەرچوون، ڕەت بوون، تێپەڕیین، ڕابگوردن، ڕابووریین، تێپەڕبوون.

ڕابوردوو (ئان) ١ raburdü

ڕابردوو، ڕابردە، ڕابووریی، تێپەڕیو، كۆن، كەڤن، كەوون.

ڕابوردوو (ن،ئان) ٢ raburdü

پێش، بەرین.

ڕابووریین (ئد) rabürîn

ڕاباتن، بەسەربردن، گوزەران كردن.

ڕابوون (كتن) rabün

ڕابیین، بەرزەوەبوون، پاداربوون.

ڕابوونەر (ن) rabüner

بكار، جێبەجێكەر پێكهێنەر.

ڕابوونەوە (كتپ) rabünewe

هەستانەوە(ڕۆژی دوایی{قیامەت}).

ڕابەر (ن) raber

ئیلچیی، ڕەهبەر، ڕاسپێراو، پەیامبەر.

ڕابەریی (ن) ١ raberî

ڕەهبەریی، ڕاسپێریی.

ڕابەریی (ن) ٢ raberî

پێشڕەویی، سەرۆكیی.

ڕابەریی كردن (كتپ) ١ raberî kirdin

ڕێبەریی كردن، بەڵەدیی كردن، شارەزایی كردن، ڕێ نیشان دان.

ڕابەریی كردن (كتپ) ٢ raberî kirdin

گەیاندن(ڕاسپاردە، نامە).

ڕابەزاندن (كتن،كتپ) rabezandin

شەڕەچەقەكردن، شەڕو هەراكردن(هەر بەدەم).

ڕابەستن (كتپ) rabestin

بەخۆوە(بەستن، توندكردن، قاییم كردن).

ڕابینیی (ن) ١ rabînî

تێ ڕادیویی.

ڕابینیی (ن) ٢ rabînî

باوەڕ، بڕوا.

ڕابینیی (ن) ٣ rabînî

بەرپرسیی.

ڕابینیین (كتپ) rabînîn

ڕابینیی كردن، باوەڕپێ هاتن، بڕواپێ كردن، تێڕا (دیتن، دیین)، ڕاپەڕموون، شایان زانیین.

**راپسان** (کتن) rapisan
لەپڕجیابوونەوە.

**راپسکان** (کتن) rapiskan
لەپڕو بەهێز جیابوونەوە.

**راپسکاندن** (کتپ) rapiskandin
لەناکاو لابردن.

**راپۆراندن** (کتپ) raporandin
بەزۆر دەناونان، بەنهێم خستنەناو، ئاخنیین.

**راپۆرت** (ن) raport
راپۆر، خەبەری ڕووداو بەنوسراو، خەوەر، گوزارش، نامە (کەلەدژی کەسێ بنوسرێ).

**راپۆرتچیی** (ن) raportçî
١- خەربەرنێر، پەیامنووس، هەواڵچیی.
٢- خەوەرچیی، کەسێکە کەنامەی پەنهانیی لەم و لەو بنوسێ.

**راپەڕ** (ن) raper
چالاکیی، توندوتۆڵیی، گورج و گۆڵیی.

**راپەڕاندن** (کتپ) raperandin
کار( جێبەجێ کردن بەدەستو بردیی، بەجێ هێنان، پێک هێنان بەرێک وپێکیی، ئازایانە ئەنجام دان).

**راپەڕاندن** (کتپ) raperandin
ژ خەو راکرن، لەخەو (هەڵستاندن، هەستاندن)، خەبەر کردنەوە).

**راپەرکاندن** (کتپ،کتن) raperkandin
(بەدار وچیادا..)، پێهەڵچوون، راپەلکاندن.

**راپەرموون** (کتپ) ١ rapermün
لێ ئومێد کردن(شتێ لەکەسێ کەلەباریدا بێ).

**راپەرموون** (کتپ) ٢ rapermün
رابینیین.

**راپەڕین** (کتن) ١ raperîn
راپەڕان، لەپڕ( بلندبوون، راست بوونەوە)، زووهەستان، هەڵبەزیین.

**راپەڕین** (کتن) ٢ raperîn
گورج دەست دانەکار، لەز کردن.

**راپەڕین** (کتن) ٣ raperîn
(لەناکاو)لەخەو هەستان.

**راپەڕین** (کتن) ٤ raperîn
راست بوونەوە( دژی رێژیم) {گەل}، سەرهەڵدان، سەرهلدان.

**راپەڕێن** (ئان) raperên
سەرهەڵداو، راستەوەبوو( دژی رەژێم).

**راپەڕێن** (ئان) ١ raperên
کەسێ کەرادەپەڕێتە سەرپێ.

**راپیتە** (ن) ٢ rapîte
راوێچکە، پیاسە، هاتوچۆ( بۆ ئەوسەرو ئەمسەر).

**راپێچان** (کتپ) ١ rapêçan
کۆکردنەوە.

**راپێچان** (کتپ) ٢ rapêçan
راپێچ کردن.

**راپێچان** (کتپ) ٣ rapêçan
خۆ گورج کردنەوە.

**راپێچان** (کتپ) ٤ rapêçan
رامالیین.

**راپێچ کردن** (کتپ) rapêç kirdin
فراندن، وەبەرخۆدان و بەغار بردن.

**راتلەک** (ن) ratlek
١- خورپەی هەناو. ٢- خورپەی دل.

**راتلەکاندن** (کتپ) ratlekandin
١- ژەندن، هەژاندن، وەجووڵەخستن، راتلەقان، راتلە قاندن، راشەکاندن. ٢- هێنان و بردن.

**راتوو** (ن) ١ ratü
راتوە، راتبە، خێری نان و شتی دیکە کەبەفەقێ دەدرێ.

**راتوو** (ن) ٢ ratü
رۆژانە( یان مانگانە..)، جیرە، بژێوێ کەدەدرێ بەکار کەری میری.

**راتوو** (ن) ٣ ratü
پارە، نان یان بژێویی کەدەدرێ بەقوتابیی، دەقنە.

**راتوول** (ن) ratül
راتۆ، ریتاڵ، گەرۆک، گەرێدە.

**راتەکان** (کتن) ١ ratekan
جووڵان، راقوتان (بەتوندیی).

**راتەکان{دڵ}** (کتن) ٢ ratekan(dil)
خورپە کردن،راچلەکیین.

**راتەکاندن** (کتپ) ١ ratekandin
راپسکاندن، راکیشان، تەکان پی‌دان (بەتوندیی).

**راتەکاندن{تۆز}** (کتپ) ٢ ratekandin (toz)
رایەخ...تەکاندن، راپسکاوتن.

**راتەکاندن{رایەخ}** (کتپ) ٣ ratekandin (rayex)
هەڵتەکاندن( نوین، یان رایەخ دوای ئەوەی کەسێ لەسەری دانیشتبێ، بۆ مەبەستی جێ خۆش کردنەوە).

**راته‌کاندن** (کتپ) ratekandin [1]
راوه‌شاندن.
**راچه** (ن) race [1]
راچه، راژه، په‌یاغ، ته‌یاخ ، دارده‌ستی دریژ.
**راچه** (ن) race [2]
رایه‌ل، کاریته، دیره‌کێ، داری داره‌را.
**راچاو کردن** (کتپ) raçaw kirdin
ده‌به‌رچاوگرتن، خستنه‌به‌رچاو، ده‌ستنیشان کردن، هه‌لبژاردن.
**راچراندن** (کتپ) raçrandin
راسته‌وراست دراندن.
**راچله‌ک** (ن) raçlek
راجلف، داچله‌ک.
**راچله‌کاندن** (کتپ) raçlekandin
داچله‌کاندن.
**راچله‌کین** (کتن) raçlekîn
داچله‌کین.
**راچه** (ن) raçe
باسکیشی نامور.
**راچه‌فت** (ئان) raçeft
که‌م ئاوه‌ن، ته‌گبیرنه‌زان، گه‌لحۆ.
**راچه‌نین** (کتن) raçenîn [1]
راجلفین، له‌رزین(که‌م وله‌پڕ، له‌ناکاو).
**راچه‌نین** (کتن) raçenîn [2]
داچله‌کان.
**راچیته** (ن) raçête
ره‌چه‌ته‌، پسووله‌ی پزیسک، نوسخه‌ی حه‌کیم، سیایی ده‌رمانی دکتۆر.
**راخ** (ن) rax
گرد یان به‌رزایی پڕ له‌گیا.
**راخران** (کتن،کتپ) raxiran
داخران، پان وه‌کران(رایه‌خ له‌سه‌رزه‌ویی).
**راخراندن** (کتپ) raxirandin
راکیشان (به‌سه‌ر زه‌ویدا)، خزاندن.
**راخراو** (ئان) raxiraw
داخراو(شت له‌سه‌ر زه‌ویی)، پان کراوه(رایه‌خ، ژێره خه‌ر).
**راخستن** (کتپ) raxistin [1]
داخستن، بلاوکردنه‌وه،پان کردنه‌وه(ژێره‌خه‌ر..).
**راخستن** (کتپ) raxistin [2]
خستنه‌ڕێ، ڕێگه‌خستن، به‌ڕێ کردن.
**راخستن** (کتپ) raxistin [3]
به‌ڕێگه‌دا ناردن.
**راخشین** (کتن) raxişîn
خوشـیین، راخوشـیین، بـه‌خزیین ڕۆیشتن (ماروخشۆکی تر).
**راخشین** (کتن) raxişîn
کشان (ئه‌ستێره له‌ئاسمان)، راکشان.
**راخورین** (کتن) raxurîn [1]
هه‌ره‌شه‌کردن.
**راخورین** (کتن) raxurîn [2]
هانه‌دان، هان دان.
**راخورین** (کتپ) raxurîn [3]
تێ خورین، خورین.
**راخوستن** (کتن) raxustin
په‌نابردن، چوونه‌ژێر دالده، هانا بردن (بۆ که‌سێ).
**راخه‌ر** (ن) raxer [1]
رایخ، رایه‌خ، راژێر، رایاخ، ژێر راخه‌ر، ژێره‌خه‌ر، چیره خه‌ر، به‌ره، حه‌سیر..و هه‌رچی له‌سه‌ر زه‌ویی پان ده‌کرێته‌وه.
**راخه‌ر** (ن) raxer [2]
پان وه‌که‌ر، بلاووه‌که‌ر.
**راد** (ن) rad
په‌ری تیری که‌وان، چوکله‌ی لای خوارووی تیر.
**رادار** (ن) radar [1]
ڕێوان، ئاگاداریکه‌ری ڕێ ویان، پۆلیسی سه‌ر ڕێگه، پاسه‌وانی ڕێگه‌ویان.
**رادار** (ن) radar [2]
پیتاک (وه‌رگر، کۆوه‌که‌ر).
**رادار** (ن) radar [3]
که‌سێ که‌له‌سه‌ر پیتاک ده‌ژیی.
**رادار** (ن) radar [4]
باجگر.
**رادارانه** (ن) radarane
رادارین، باجێ که‌له‌ڕێگه ده‌دریێ، پیتاکی سه‌ره ڕێ.
**رادارخانه** (ن) radarxane
باجگه، باجخانه، باجگا، جێگه‌ی باج سه‌ندن له‌سه‌ر ڕێگه.
**رادان** (کتپ) radan [1]
رامالین، وه‌به‌رخۆدان و ماشتن، هب(بۆق پیوه‌نان، پال پێوه‌نان).
**رادان** (کتن) radan [2]
هه‌ستان(ڕووبار)، به‌رزبوونه‌وه(ئاو)،

ڕزیدەبوون(لاڤو).

ڕادان (ن) [٢] ṟadan

پالپشت (دارکەلەباتی گۆلە بەدەرگایەوە دەنێن).

ڕادان {سۆپە} (کتپ) [٤] ṟadan(sope)

داگیرساندن.

ڕادان{ورگ} (کتپ) [٥] ṟadan(wirg)

ورگ(دڕیین، هەڵ دڕیین).

ڕادوونان (کتپ) ṟadünan

پاش وەدان، خستنەدواوە، پاشەکشەپێ کردن.

ڕادە (ن) [١] ṟade

چۆنایەتیی، چۆنێتیی، چۆنیی، چۆنیەتیی.

ڕادە (ن) [٢] ṟade

بارست، قەبارە، قەوارە.

ڕادە (ن) [٣] ṟade

کلۆم، کلیلی دارین (بۆ قفلی لەدار دروستکراو یان دەرگای دارین).

ڕادە (ن) [٤] ṟade

پەلامار.

ڕادەر (ئان) ṟader

تەرزەنوێ، نۆژەن، تازەباو.

ڕادەست بوون (کتن) ṟadestbün

خۆبەدەستەوە دان، تەسلیم بوون.

ڕادەست کردن (کتپ) ṟadest kirdin

بەگیرهێنان، وەگیرهێنان، تەنگەتاو کردن، هێنانەگاز و دوو.

ڕاڕ (ئان،کل) [١] ṟaṟ(kl)

کەللەڕەق، ڕق ئەستوور.

ڕاڕ{گۆشت} (ئان) [٢] ṟaṟ(gošt)

فرە کولاو، لەبەریەک بلاوبووگ، هەلاهەلا.

ڕاڕ{سەگ} (ئان) [٣] ṟaṟ(seg)

پاشدڕ، دڕ، یاخیی.

ڕاڕا (ئان) [١] ṟaṟa

دوودڵ، سەوش، وازواز، هەردەم لەسەربیر یان ڕایەک، وەسواس.

ڕاڕا (ئان) [٢] ṟaṟa

میل میل، خەت خەت، میلدار، خەتدار، ڕێڕێ.

ڕاڕایی (ن) ṟaṟayî

وازوازیی، باوەڕگومان.

ڕاڕڤاندن (کتپ) [١] ṟaṟifandin

ڕاڕفان، ڕافڕاندن، ڕارەڤان، ڕافڕان، ڕافڕیین، ڕاڕفیین، پێوە هەڕاکردن، بەگیرهێنان و فڕاندن.

ڕاڕڤاندن (کتپ) [٢] ṟaṟifandin

ڕاوەدوونان، شوێن کەوتن، کەوتنەدوو.

ڕاڕفێن (ن) ṟaṟifên

ڕافڕێن، فڕێنەر، کەسێ کەشت دەڕفێنێ.

ڕاڕەڤ (ن) ṟaṟev

ڕێ گوزەر، ڕێگەی هاتوچۆ.

ڕاڕەو (ن) ṟaṟrew

ڕارەڤ، ڕەهڕەو، ڕێڕەو، دالان(کەهاتوچۆی بەسەردا بکرێ).

ڕاز (ن) [١] ṟaz

(چیا، شاخ، کێو)ی بلند.

ڕاز (ن) [٢] ṟaz

تیشەبەردی سەرکێو.

ڕاز (ن) [٣] ṟaz

نهێنیی، پەنامەکیی.

ڕاز (ن) [٤] ṟaz

دەسان، چیرۆکی کورت، سەرگوزەشتە.

ڕاز (ن) [٥] ṟaz

وتەی دۆستانە، گفتوگۆی نێوان ئاشنایان.

ڕازان (کتن) [١] ṟazan

ڕاژان، خۆدرێژ کردن، پاڵ کەوتن.

ڕازان (کتن) [٢] ṟazan

ئامادەبوون، سازبوون، خۆکارکردن، ڕازیین.

ڕازاندن (کتپ) ṟazandin

ڕازانن، جوان کردن، قەشەنگ کردن.

ڕازاندنەوە (کتپ) ṟazandinewe

ڕازاننەوە، ڕێک وپێک کردن، ڕازانیینەوە.

ڕازانەوە (کتن) ṟazanewe

جوان بوون، ڕێک وپێک بوون، ڕازیانەوە.

ڕازاوە (ئان) ṟazawe

جوانکراو، ڕازاڤ، ڕازێنراو، خەملاو، خەملیو.

ڕازایی (ئان) ṟazayi

خەوتوو، نوستوو.

ڕازپۆش (ن) ṟazpoš

ڕازدار، ڕازڤان، ڕازگر، سرهەلگر، کەسێ کەبەنهێنیی دەزانێ ونای درکێنێ.

ڕازکردن (کتن) ṟazkirdin

لەخودا پاڕانەوە بەسرتە، موناجات کردن لەژێر لێوەوە.

ڕازوگلەیی (نک) ṟazwgileyî

نهێنیی وگلەمەندیی‌نێوان ئاشنایان.

**رازوگلەیی کردن (کتپ)** ṟazw gileyî kirdin
کەوتنەدەرخستنی نهێنیی یەکتروگلەیی لەیەک کردن.
**رازونیاز (نک)**[1] ṟazw niyaz
رازی دەروون، نهێنیی دەروون وئارەزووی دڵ.
**رازونیاز (نک)**[2] ṟazw niyaz
پیراموسیی، مەرایی، کلکەسوتە.
**رازە (ن)** ṟaze
چیرۆکیی خەیالیی.
**رازەک (ن،رو)** ṟazek
رووەکێکە گوڵەکانی بەکاردەهێنرێ بۆ خۆش کردنی تام وچێژی بیرە.. هەروەها بۆ دەرمانیش دەشێ.
**رازەن (ن)** ṟazen
خراپەکەر، جەردە.
**رازەوان (ن)** ṟazewan
شاخەوان، کەسێ لەهەڵگەران بەچیادا زۆر بەکارە.
**رازیار (ن،ئان)** ṟazyar
رازدار، هاودەم، هەواڵی نزیک.
**رازیانک (ن،رو)** ṟazyanik
گژنیژە کێویلە (لەخێزانی کەرەوز).
**رازیانە (ن،رو)** ṟazyane
رازانە، رزیانک، بەرەکەی بۆنی خۆشە ودەکرێتە ناو نانە وە و بۆدەرمانیش دەشێ.
**رازی دەروون (ن)** ṟazî derûn
رازونیاز.
**رازی (ئان)**[1] ṟazî
قایل، قادێ، خۆشنوود.
**رازی (ئان)**[2] ṟazî
دڵنیا، بێ پەسند، قایلکار.
**رازی بوون (کتن)** ṟazîbûn
قایل بوون، قادێ بوون، بەڵیاندن.
**رازی کردن (کتپ)** ṟazî kirdin
قایل کردن، پێ پەسند کردن.
**رازینەر (ن)** ṟazêner
رازینەرەوە، رازێنەوە، وەرازێن، جوانکەر، کەسێکە یەکێک یان شتێک برازێنیتەوە.
**راژان (کتن)** ṟajan
جوولانەوە، هەژان، هەژیان.
**راژاندنەوە (کتپ)** ṟajandinewe
١- راژاننەوە، راژەندن.
٢- هەڵسووراندن (شیر، خەنجەر)، راژاندن.

**راژۆر (ن)** ṟajor
١- لای(بەرز، ژوورو) لەکۆڕدا.
٢- باکوور(ژوور، شوێن).
**راژەندن{بێشکە}(کتپ)**[1] ṟajendin (bêşke)
راژاندن، راژانن، راژەنیین،بەرەو پیشەوە ودواوە جوولاندن، بەرەو پێش وپاشەوە بزاوتن، راوەشاندن.
**راژەندن{منداڵ}(کتپ)**[2] ṟajendin (mindaḻ)
لایلایە بۆ کردن، داسەکناندن، ئارام کردن، کردنەخەو.
**راژێر (ئان)** ṟajêr
باشوور، ئالی بێ ژێرێ.
**راژێن (ن)** ṟajên
راژاندەر، راژەندەر، راژەنەر، کەسێ یان شتێ کە راژەندن کاریەتی.
**راسان (کتپ)** ṟasan
راپسان، دەست بەرز کردنەو، (بۆ هەرەشە).
**راسایی{زەویی} (کتپ)** ṟasayî(zewî)
پانایی، پانتایی، تەختایی، مەیدان، مەیان.
**راسپاردن (کتپ)** ṟaspardin
راسپێران، راسپێریی لێ کردن، راداب، راگەیاندن، رانەسپاردن، پێ گوتن، وتەناردن بەکەسێکدا بۆ یەکێکی دی، قەوینتیی لێ کردن.
**راسپاردە (ن)** ṟasiparde
راسپارە، راسپێرە، رانەسپاردە، ئەسپاردە، وتەیەکە بەیەکێکدا بنێررێ بۆ یەکێکی تر، قەوینتیی، وتەی راسپێرراو.
**راسپێر (ن)** ṟaspêr
خاوەنی راسپاردە.
**راسپێران (کتپ)** ṟaspêran
راسپاردن.
**راسپێراو (ن)** ṟaspêraw
راسپێرراو، راسپێرە، کار پێ(سپێردراو، سپێرراو)، کەسێ کەکاری مرۆڤێ یان کەسانی دیکەی پێ سپێردرا بێ.
**راسپێریی (ن)** ṟaspêrî
راسپاردە.
**راست (ئان)**[1] ṟast
راس، شتێ کەخوارنەبێ.
**راست (ئان)**[2] ṟast
دروست، دۆغریی، ئاخاوتنێ کەدرۆ نەبێ.
**راست (ئان)**[3] ṟast
راس، بەجێ.

**راست (ئان)** ٤ rast
تەخت، تەختان، ڕێک.
**راست (ئان)** ٥ rast
راس، راستا، راسا، رێگەی (بێ پێچ، قەدبڕ).
**راست{ڕەخ} (ن)** ٦ rast(rex)
راستاڵ، بەرامبەری چەپ(شوێن، لا)، لای بەرامبەری چەپ لەشت.
**راست (ئان)** ٧ rast
ڕووبەڕوو.
**راست (ن)** ٨ rast
ئاقار، جێگە.
**راستا (ئاک)** ١ rasta
راسا، راستەوخۆ.
**راستا (ن)** ٢ rasta
راسا، گەف(بەدەست).
**راستان (نک)** rastan
پیاوچاکان، لەخواترس (کەسان).
**راستاندن (کتپ)** rastanidn
(شتی خوار) راست کردنەوە.
**راستانە (ئاک)** rastane
راست بەراست، لە(راستیدا، راستەقینەدا)، بەراستی یەکەی.
**راستاهەڤ (ئاک،کی)** rastahev(ki)
بەرامبەر بەیەک، ڕوو بەڕووی یەکتر.
**راستایی (ن)** ١ rastayî
راستان، راس، راسا، راست، راستک، تەختی، تەختایی، دەشت، ڕێک(زەویی، زەمین، ئەرز).
**راستایی (ئاک)** ٢ rastayî
لەئاستی راست، لای راستە.
**راستایی (ئان)** ٣ rastayî
بەرامبەر.
**راست بوونەوە (کتن)** rast bünewe
راس بوونەوە، راسەوبوون، راست وەبوون، راستەوە بوون، راستەوبوون، هەڵسانەوە، کەوتنەوە سەرپێ، هەڵسان (لەپاڵ کەوتنەوە بۆ دانیشتن یان لە دانیشتنە وە بۆ سەر پیان).
**راست بوونەوە (کتن)** ١ rast bünewe
ئاگابوونەوە، لەخەو هەستان.
**راست بوونەوە (کتن)** ٢ rast bünewe
هەستانە سەرپێ.
**راست بوونەوە (کتن)** ٣ rastbünewe
خواروخێچیی تێدانەمان.

**راست بوونەوە {لەنەخۆشیی} (کتن)** ٤ rast bünewe (le nexoşî)
بەخۆدا(هاتن، هاتنەوە)، چاک بوونەوە، ساغ بوونەوە، راستەوە بوون، هەستانەوە، لەنەخۆشیی هەستانەوە.
**راست بەو بەلای شێردا بڕۆ (پن)** rast bew belay şêrda biro
راست بەو لەهیچ یان لەکەس مەترسە.هیچ جۆرە خۆپاراستنێک ناکاتە بێ تاوانیی.
**راستبێژ (ئان)** rastbêj
راستگۆ.
**راستبێژی (ن)** rastbêjî
راستگۆیی.
**راستبین (ئان)** rasbîn
بیر راست، دڵ باش.
**راست دەرچوون (کتن)** rast derçün
بەراست دەرچوون.
**راست دەمی (ن)** rast demî
ڕێک وپێکیی، تەکووز.
**راست ڕۆیشتن (کتپ)** ١ rast royştin
راست(ووتن، گوتن)، مکوڕبوون (تاوان، هەڵە..).
**راست ڕۆیشتن (کتن)** ٢ rast royştin
راست ڕۆیین، قنج وقیت بەرێگادا ڕۆیشتن
**راست ڕۆیین (ند)** ١ rast royîn
راست ڕۆیشتن، خواروخێچ نەبوون لەژیاندا، راس ڕۆیین.
**راست ڕۆیین (کتپ)** ٢ rast royîn
راست کردن.
**راستکار (ئان)** rastkar
مرۆڤی بێ(لاریی وخواریی، گزیی ودزیی).
**راست کردن (کتپ)** rast kirdin
ئاخاوتنی راست(بێژتن، گوتن، وێژتن، ڕۆیین، ڕۆیشتن، واتن، وتن، کرن)، ئاخافتنی بێ درۆ بێژتن، درۆ نەکردن (کاتی پەیڤین)، دان پیا(پێدا)نان {بە راستیدا}.
**راست کردنەوە (کتپ)** ١ rast kirdinewe
ڕاکرن، راستەوەکردن، بلندکردن، هەڵستاندن، خستنەوەسەرپێ.
**راست کردنەوە (کتپ)** ٢ rast kirdinewe
چەوتیی تێدانەهێشتن،خواریی شت لابردن، راستەوەکردن، ،راسەوکردن.

**ڕاست کردنەوە** (کتپ) ٣ rast kirdinewe

ڕاپەڕاندن.

**ڕاست کردنەوە** (کتپ) ٤ rast kirdinewe

دامەزراندن، دانان.

**ڕاست کردنەوە {ئیشێکی خراپ}** (ئد) ٥ rast kirdinewe (îşêkî xirap)

چاک کردنەوە وبەئەنجام گەیاندن( ئیشێکی گێر).

**ڕاستکەر** (ن) rastker

تاوکەر، سازدەر، ڕاکەر، دەلالی نێوان کڕ وکوڕ.

**ڕاستکەرەوە** (ن) ١ rastkerewe

ڕاسەوکەر، چەوتیی ڕاست وەکەر، خواریی لابەر، کەسێ کەشتی خوار ڕاست دەکاتەوە.

**ڕاستکەرەوە** (ن) ٢ rastkerewe

هەڵەی نوسراو( ڕاستەوەکەر، ڕاسەوکەر، لابەر) بەتایبەتی هەڵەی چاپیی...

**ڕاستگۆ** (ئان) ١ rastgo

ڕاستکار، ڕاسترەو، ڕاستڕۆ، ڕاستدەر، ڕاستاڵ، ڕاستۆکە، ڕاستوێژ، ڕاسوێژ، خەدنگ، بێ پێچ وپەنا( مرۆڤ)، بێ درۆ دەلەسە.

**ڕاستگۆ** (ئان) ٢ rastgo

بێ ڕیا، شتیار، جێی بڕوا.

**ڕاستگۆبوون** (کتن) rastgo bûn

جێی بڕوابوون.

**ڕاست گوتن** (کتپ) rast gutin

ڕاست گۆتن، ڕاست کردن.

**ڕاستگۆیی** (ن) rastgoyî

ڕاستڕۆیی، ڕاستبێژیی، ڕاستوێژیی، بێ پێچ وپەنایی.

**ڕاستلەر** (ن،ئان) rastler

ڕاستە، ڕاسیل، ڕاستەوانە، ئەوکەسەی (دەستی ڕاست بەکاردێنێ، بەدەستی ڕاست کاردەکا).

**ڕاست وچەپ** (ئان،ن) ١ rast w çep

تیلاوتیل، قیلەوقانج، ڕاستەوچۆیە. یان(زەرب لیدراو، خەتی ڕاست وچەپ پێداهێنراو).

**ڕاست وچەپ** (ئان،ن) ٢ rastwçep

ئامرازێکە پەڕۆ یان ئەوشیشەی لەتفەنگدا گیریوە پێی دەردەهێننەوە.

**ڕاست وچەپ** (ئان) ٣ rast w çep

چەلیپا.

**ڕاست وچەپی خۆی لێک جیا ناکاتەوە** (پن) rast w çepî xoy lêk ciya nakatewe

یەشتا(باڵق نەبووە، نەفامە)، چاک وخراپ لێک جیانەکردنەوە، شارەزای ژیان نەبوون.

**ڕاست ودروست** (ئان) ١ rastwdirust

بەڵگە نەویست.

**ڕاست ودروست** (ئان) ٢ rast w dirust

بەڕێ وجێ.

**ڕاست وڕەوان** (ن،ئان،ئاک) rast w rewan

ڕاست ودروست، ئاخاوتنێ بێ پەردەو مینگەبکرێ، بێ( درۆ ودەلەسە، پێچ وپەنا، پەنهانی)، ڕەپ و ڕاست.

**ڕاستە** (ن) ١ raste

دەستی ڕاست.

**ڕاستە** (ن،ئان) ٢ raste

ڕاستلەر.

**ڕاستە بازاڕ** (ن) raste bazar

ڕاسابازاڕ، ڕیزەدوکان، لایەک یان بەشێ لەناوبازاڕ.

**ڕاستە خیابان** (ن) raste xiyaban

ڕاستەڕێ.

**ڕاستەڕێ** (ن) raste rê

ڕاستە، ڕاستەخیابان، ڕێگەی(بێ پێچ، ڕاستەوڕاست)، دووز.

**ڕاستەقینە** (ئان) rasteqîne

ڕاستەقانیی، ڕاستی تەواو، ڕاستەکینە، ڕاسەقانیی، ڕاستەکیی، بێلاریی وخواریی، ئاخاوتنێ کە( درۆی تیدا نەبێ، درۆزنە نەبێ).

**ڕاستەوانە** (ئان) rastewane

دروست بەکارهاتوو، هەرشتێ پێچەوانە نەبێ.

**ڕاستەوخۆ** (ئاک) rastewxo

ڕاستەوڕاست، یەکسەر، یەکراست، بێلادان ولەڕێ دەرچوون، بێیەک ودوو.

**ڕاستەوڕاست** (ئاک) rastewrast

ڕاست وڕاست، بێدرۆ.

**ڕاستیی** (ن) ١ rastî

دۆستایەتیی، دۆستینیی، دڵسۆزیی.

**ڕاستیی** (ن) ٢ rastî

دروستیی، ڕاسیی، بێ(درۆیی، خواریی، پێچ وپەنایی) لە ئاخاوتندا.

**ڕاستیی** (ئاک) ٣ rastî

لەڕاستیدا، ڕاستیەکەی.

**ڕاسو** (ن.ئا) r̲asû
مشکی دارخورما.

**ڕاس هاوردن** (کتن.کتپ) r̲as hawirdin
ئاوات هاتنەدی، ڕاست( هاوردن.هێنان).
سەرکەوتن.

**ڕاسەری** (ن) r̲aserî
بلندی، بەرزیی.

**ڕاشکاوی** (ئاک) r̲aşkawî
بەئاشکرا، بێ پێچ وپەنا.

**ڕاشلکان** (کتن) r̲aşilkan
بەشەلەشەل ڕۆیشتن.

**ڕاشلەقان** (کتن) r̲aşl̲eqan
هەڵ شلەقان، بزاوتن( تراو لەدەفردا).

**ڕاشلەقاندن** (کتپ) r̲aşl̲eqandin
هەڵ شلەقاندن، جووڵاندن( شلەمەنیی لەناو دەفردا).

**ڕاشەکان** (کتن.کتپ) r̲aşekan
ڕاتلەقان، ڕاتلەکان.

**ڕاشەکاو** (ئان) r̲aşekaw
ڕاتلەقاو، هەژاو، ژەندراو، هەژێندراو.

**ڕاشەن** (ن) r̲aşen
توێشوو، تیشوی ڕێگە.

**ڕاف** (ن.کی) r̲af(ki)
شەرم وشوورەیی، حەیاو حورمەت.

**ڕاڤرۆ** (ن.کی) r̲avr̲o(ki)
ڕاوکەری هەمەڕۆژ، کەسێ کەڕاوچیتی پیشەیەتیی.

**ڕاڤە** (ن.کی) r̲ave(ki)
ڕاوە، شیی.ڕاژە، هب( ئازەنتیی).

**ڕاڤەر** (ن.کی) r̲aver(ki)
کاری( پارانەوە، لاڵانەوە).

**ڕاڤەراندن** (کتپ.کتن) r̲averandin(ki)
پارانەوە، لاڵانەوە.

**ڕاڤەک** (ن.کی) r̲avek(ki)
پاڵوێنە، ڕاوکە، شیرپاڵێو.

**ڕاڤەکراو** (ئان) r̲ave kiraw(ki)
ڕاژەکراو، ڕاوەکراو، ڕاڤەکریی، واتا شیی کراوە، مانا لیکەوەدراو.

**ڕاڤەکردن** (کتپ) r̲ave kirdin
ڕاژەکردن، ڕاوەکردن، ڕاڤەکرن، واتا( شیی کردنەوە، ڕوون کردنەوە، لیکە دانەوە).

**ڕاڤەکەر** (ن) ١ r̲ave ker
ڕاڤەکار، ڕاوەکەر، ڕاژەکەر، واتاشیکەرەوە.

**ڕاڤەکەر** (ن.رس) ٢ r̲ave ker
ڕاڤەکار، دووخاڵی لەسەریەک( : ) لەنوسیندا دادەنرێ و واپیشان ئەدا کەپاشووەکەی ڕاڤەی پیشووەکەی دەکا...

**ڕاقوتان** (کتپ) ١ r̲aqutan
پەلاماردان.

**ڕاقوتان** (کتن) ٢ r̲aqutan
چوونە ناو.

**ڕاقەتاندن** (کتپ) r̲aqetandin
لەسەرکار لابردن، لەکارلادان.

**ڕاقەتاندیی** (ئان) r̲aqetandî
لەسەرکار لابراو، لەکار لادراو، دەرکراو، دوورەوە دراو.

**ڕا کردن** (کتن) ١ r̲a kirdin
ڕاکرن، ڕەڤیین، ڕەوییین، هەڵاکردن، بەلەزچوون، بەتاو ڕۆیشتن، غاردان، بەغار ڕۆیشتن، دەوکردن، دەوییین،چەنگ کردن.

**ڕاکردن** (کتپ) ٢ r̲a kirdin
بەجێ هیشتن، وازلێ هینان.

**ڕاکردن** (کتن) ٣ r̲akirdin
تێقاچان، قووچاندن، تۆزکردن، هەڵاتن( لەترسان).

**ڕاکرن** (کتپ.کی) ١ r̲akirn(ki)
بلندکردنەوە، بەرزەوەکردن.

**ڕاکرن** (کتپ.کی) ٢ r̲akirn(ki)
هەڵساندن، هینانەسەر پێ.

**ڕاکشان** (کتن) ١ r̲akişan
خەوتن، نوستن.

**ڕاکشان** (کتن) ٢ r̲akişan
پاڵ( کەوتن، کەفتن)، ڕاکەتن، ڕازان، پێ لێ ڕاکێشان.

**ڕاکشان** (کتن) ٣ r̲akişan
خزان، خزیین( بەسەرزەویدا).

**ڕاکشان** (کتن) ٤ r̲akişan
دەرکشان.

**ڕاکشاندن** (کتپ) r̲akişandin
پاڵ خستن، لەسەر زەویی درێژ کردن.

**ڕاکشاو** (ئان) ١ r̲akişaw
پالکەوتوو، پالکەفتە.

**ڕاکشاو** (ئان) ٢ r̲akişaw
بەزەویدا کیشراو، کیشراو بە ئەرزدا.

**ڕاکشاو** (ئان) ٣ r̲akişaw
بلند، بەرز، درێژ، بەقەلافەت.

**راکۆڵیین (کتن)** rakolîn
راسان، بۆ چوون(بەرەو رووی‌کەسێ بەنیازی لێدان..).
**راکەتن (کتن)** raketin
**راکەوتن (کتن)** [1] rakewtin
راکەتن، چاوەڕوان یان چاوەنۆڕی دەرفەت بوون، خۆ ئامادەکردن بۆ دەرفەت.
**راکەوتن (کتن)** [2] rakewtin
پێداگەیشتن.
**راکێش (ن.ئان)** rakêš
راکێشکەر، راکەش، هۆی راکێشان.
**راکێشان (کتپ)** [1] rakêšan
(بردن، خزاندن، کشان)بەسەر زەویدا.
**راکێشان (کتپ)** [2] rakêšan
بەکێش کردن، کێش کردن، بەرەو خۆهێنان.
**راکێشان (کتپ)** [3] rakêšan
درێژکردن، لەدوودان.
**راکێشان (کتپ)** [4] rakêšan
کێشان، خرکاندن.
**راکێشان (کتپ)** [5] rakêšan
بڵاوکردنەوە، پەخش کردن.
**راکێشان(کتپ)** [6] rakêšan
فراندن(کچ بەزۆر)، هەڵگرتن(ئافرەت).
**راگر (ئان)** [1] ragir
بەرلێگر، پێشگر، راگیر، وەستێن، وەستێنەر.
**راگر (ن)** [2] ragir
بەڕێوەبەر، ئاگاداریکەر، سەرپەرشتیکەر.
**راگر (ئان)** [3] ragir
سەرۆکی دانشگای بەرز(کۆلیج..).
**راگر (ن)** [4] ragir
سەرۆکی خێزان، بەڕێوەبەری ماڵ ومنداڵ.
**راگرتن (کتپ)** [1] ragirtin
ئاگاداریی لێ کردن، چاودێریی کردن.
**راگرتن (کتپ)** [2] ragirtin
بەربەست کردن، پێش لێ گرتن، وەستاندن، بەند یان بەنگ کردن، دواخستن، ماتەڵ کردن.
**راگرتن (کتپ)** [3] ragirtin
دامەزراندن(ئیشکەر).
**راگرتن{زیندەوەر} (کتپ)** ragirtin (zîndewer)
بەخێو کردن.
**راگرتە (ن)** ragirte
ژێر دەستە.

**راگواستن (کتپ)** [1] ragwastin
راگوێزان، شتێ لەجێیەکەوە بۆ جێیەکی تر بردن، لەجێگەی خۆ هەڵگرتن.
**راگواستن (کتپ)** [2] ragwastin
جێ گۆڕکە پێ کردن.
**راگۆڕ (ئان)** ragor
دەقەن دووقەن.
**راگوشیین (کتپ)** ragüšîn
راگفاشتن، گوشیین(بەدەست..).
**راگەش (ن.ئان)** rageš
نازکەر.
**راگەیاندن (کتپ)** rageyandin
پێگەیاندن، بەگوێدادان، راگەهاندن (ئاخاوتنی مەبەست).
**راگەیشتن (کتن)** [1] rageyštin
تێراکردن، بۆ بوون(بێ کەم و کورتی)، کورتیی نەهێنان، پێداگەیشتن، گەیشتن(بەشتێکدا).
**راگەیشتن (کتپ)** [2] rageyštin
سەرپەرشتیی کردن.
**راگەیین (کتن)** [1] rageyîn
گەیین، گەیشتن(لەکاتی خۆیدا..).
**راگەیین (ن)** [2] rageyîn
دەنگ وباس گەیەنەر، کەسێ کەسپاردەی ئاخاوتنێ دەگەیێنێ).
**راگیر (ئان)** [1] ragîr
راگیراو، دواخراو.
**راگیر (ئان)** [2] ragîr
چەسپاو.
**راگیران (کتن)** ragîran
پێش گیران، وەستان.
**راگیربوون (کتن)** ragîrbün
وەستان، بەند(بەنگ)بوون، مانەوە.
**راگیرنامە (ن)** ragîrname
گرتننامە، پسووڵەی بردنەزیندان.
**رالەسەربوون (کتپ)** [1] ra leserbün
بڕیاردان.
**رالەسەربوون (ند)** [2] ra leserbün
پێوەنووسان(بڕیار)، وزالێ نەهێنان(ڕەوتار).
**رالێ بوون (کتپ)** [1] ralêbün
پشتگیریی کردن.
**رالێ بوون (کتپ)** [2] ralêbün
رالەسەربوون، بەچاک زانیین.

**رام (ئان،ئا)** ram
خووگرتوو، فێر، ماڵی، کەویی، هۆگر، خاراو.

**راماڵ (ن)** ramal
لیس.

**راماڵ بوون (کتن)** ramalbün
١- راپێچ بوون(قووولیتە). ٢- رافران {ئاژەڵ}.

**راماڵین (کتپ)** ramalîn
راپێچ کردن، رادان، رافراندن، راماڵان، راماشتن، راپێچان.

**رامان (کتن)** raman ١
بێدەنگ بوون وبیر لەشتێ کردنەوە، دەبیرەوەچوون، مات بوون وهێزرکردن، چوونە ژێربیری شتێکەوە.

**رامان (کتن)** raman ٢
سەرسوڕمان، حەپەسان.

**راماو (ئان)** ramaw
رامای، لەهێزرا، دەبیرەوەچووگ، وەبیرەوەچوو، وەژێر بیری شتێکەوە کەوتوو.

**رام بوو (ئان)** rambü
بێدەنگ بوون وبیر لەشتێ کردنەوە، دەبیرەوەچوون، لەسرکێی ڕزگابوو، دەستەمۆکراو، ماڵی کراو، پشت (گیراو، شکێنراو -ئەسپ).

**رام بوون (کتن)** rambün ١
راهاتن، کەویی بوون، لەسڵێی دەست هەڵگرتن، هێدیی بوون، دەستەمۆبوون، ماڵیی بوون.

**رام بوون{لەسەر} (ند)** rambün(leser)٢
راهاتن(بە، پێ، لەسەر)،
کەوتنەسەرریاری شتێ.

**رام کردن (کتپ)** ramb kirdin ١
رامێنان، دەستەمۆ، (کەویی)کردن، ماڵیی کردن، تەیەو کردن.

**رام کردن (کتپ)** ramkirdin ٢
ئارام کردن، هێدیی کردن.

**رامل (ن)** ramil
قروقەپ، قروقپ، پەکە کەوتەیی یان داماویی لەوەلامدا.

**رامل بوون (کتن)** ramil bün
پەکە کەوتن لەوەرام دانەوە، دامان لەوەلام.

**رامل خستن (کتپ،کتن)** ramil xistin
قسەپێ نەهێشتن، هاودوین پەکە خستن لەوەرام.

**رامووده کردن (کتپ)** ramüde kirdin
متمانەی کەسێ وەدەست خستن یان هێنانەدەس.

**راموس (ن)** ramüs
ماچ.

**رامووسین (کتپ)** ramüîn
ماچ کردن.

**راموک (ئان،کل)** ramük(kl)
رەقاسبوو(دەست لەئیشیکدا)، قالبوو(کەسێ لە کارو باریکدا).

**راموک بوون (کتن،کل)** ramük bün(kl)
دەست رەقاس بوون،
قال بوون(لەکاروباردا).

**رامیار (ن)** ramyar ١
شوانی پەز(مەڕو ماڵات).

**رامیار (ن)** ramyar ٢
ئاگادارێکەری رەوەی ئەسپ، رەوکەوان.

**رامیار (ئان)** ramyar ٣
سیاسەتزان، پۆلاتیک، سیاسەت مەدار.

**رامیاری (ن)** ramyarî ١
شوانیی، رەوکەوانیی.

**رامیاری (ن)** ramyarî ٢
سیاسەت، پۆلاتیکە، پۆلاتیقە.

**ران (ن)** ran ١
راهن، لەئەژنۆ بەرەوژوور تاسمت، ئەستوورایی لاق لە سمت بەرەوخوارو تائەژنۆ.

**ران (ن)** ran ٢
ریان، ریەن، رووێل، رەوە، رین، رەڤە، دونیا، کەرد، کۆمەڵی ئاژاڵ ویاتاڵ، میگەلە مەڕ، گەلە یان کۆمەڵی مەڕوبزن.

**ران (ن)** ran ٣
گاگەل.

**رانان (کتپ)** ranan ١
رانوان، پیشان دان، خستنەبەرچاو، بەرچاوی خەڵک دان.

**رانان(کتپ)** ranan٢
دەم خستنەناو کانێیەوە... لەسەرسنگ ئاوخواردنەوە.

**رانان (کتپ)** ranan ٣
ئامۆژگاریی کردن.

**راناو (ئان)** ranaw
نیشانی ئەم وئەو دراو(کالا بۆ کریار..).

**راندن (کتپ)** randin ١
رانیین، خوڕیین، ئاژۆتن.

**راندن (کتپ)** ٢ ṟandin

هاویشتن، هاویتن، هەل دان.

**رانک (ن)** ṟanik

شەروال، شاپکە، پانتۆلی شال، سەردەرپێ، رانیی، رانە.

**رانما (ن)** ṟanima

رابەر، بەلەد، شارەزا(رێگەوبان).

**رانمونیی (ن)** ṟanimünî

رابەریی، رێ(نمونیی، نوینیی)، بەلەدیی، شارەزایی.

**رانمونیی کردن (کتپ)** ṟanimünî kirdin

رێ نمونیی کردن، رابەریی کردن، شارەزایی کردن.

**رانەرم (ئان)** ṟanerim

خۆش چێژە، بەتام.

**راو (ن)** ١ ṟaw

راڤ، نێچیر، نچیر، شکار، نێچیرەوانیی، نچیروانیی (بەداو، تفەنگ، باز، هەلۆ..).

**راو (ن،ئان)** ٢ ṟaw

تراو، تووا، شل.

**راو (ن)** ٣ ṟaw

فیل.

**راوار{ئەسپ} (ئان)** ṟawar(horse)

خۆشرەوت.

**راوان (ن)** ṟawan

بزرکان، ورینە، ئاخاوتنی نەخۆشی بێ هۆش یان سەر خۆش.

**راواندن (کتن،کتپ)** ṟawandin

بزرکاندن.

**راوچیی (ن)** ṟawçî

راڤەڤان، راوکەر، راویار، راڤکار، راڤیار، نچیرکار، نچیروان، نێچیرڤان، نێچیرەوان.

**راور (ن)** ṟawir

درندە، جانەوەری کێویی.

**راورتن (کتن)** ṟawirtin.

پەرەگەندەبوون، هەریەک بەلایەکداچوون، لێک بلاو بوون.

**راوکردن (کتپ)** ṟawkirdin

چوونە(ڕوا، شکار)، نێچیر(گرتن، کردن).

**راوکە (ن)** ١ ṟawke

رامکە، رامە، مارە، هێلکەی(دەستکرد، سەلکە پیازی سپی..) یان هێلکەی راستەقینە لەناو کولانەدا بەجێ دەهێلرێ بۆ مریشکە کەلەسەری هەل نیشێ ویەئاسانیی هێلکەبکات یان بۆ ئەوەی مریشکەکە بچێتەوە هەمان شوێن وهێلکەکە نەدڕێنێ..).

**راوکە (ن،خ.)** ٢ ṟawke

پەسمەندە، پەسمەنگە، ئیحتیات، پاشەکەوت کراو،تفاق، شتی(ئەنبارکراو، کۆکراوە، داکراو، داخراو،شارراوە)بۆ دواڕۆژ یان کاتی پێویست یان پارە پێکەوە نان.

**راوکەر (ن)** ṟawker

راوچیی.

**راوگان (ن)** ṟawgan

جێ راو.

**راونان (کتپ)** ṟawnan

رادوونان، راونیان، رانان، رامال نیان، رادان، راوە دوونان (بۆمەبەستی گرتن..)، بەرەو دوانان، کەوتنە شوێن، بەرودوونان، بەرەودوانان، دانەدوو، دانەپەی، کەوتنە دوو...

**راووتەگبیر (ن)** ṟawwtegbîr

راوێژیاریی، تەگبیرورا.

**راووڕوو (ن)** ṟaw wṟü

مەرایی.

**راووڕووت (ن)** ṟaw wṟüt

جەردەیی.

**راووڕووت کردن (ئد)** ṟawwṟütkirdin

هێرش بردنەسەرومالی ئەم وئەو بەزۆر خواردن.

**راووریس (ن)** ١ ṟaw wṟîs

بەنی تەون، رایەل وریسی شتی تەنراو.

**راووریس (ن)** ṟaw wṟîs

بیانوو، بەلگەی قاییلکەری ناوەڕۆک پووچ.

**راووشکار (ن)** ٢ ṟawwiškar

راوشکار، راو(بەکۆمەل، بەدەستی جەم).

**راوەدوونان{دوژمن} (کتپ)** ṟaw wṟîs

بەزاندن، شکاندن.

**راوەراو (ن)** ṟawe ṟaw

بگرەو بەردە، هاوار هاوار.

**راوەڕاوە (ن)** ṟawe ṟawe

راونانی گیاندار بۆ گرتن یان دەرکردنی.

**راوەڕێویی (ن)** ١ ṟawe ṟêwî

راووڕێو، فیل وفەرەج.

**راوەڕێویی (ن)** ٢ ṟawe ṟêwî

راوشکاری ڕێویی(بۆ مەبەستی گرتن یان کوشتنی).

**ڕاوەڕێویی** (ن)[٢] rawerêwî
پێچوپەنا لەکاروباردا

**ڕاوەڕێویی بۆ کەسێ هێنانەوە** (ئد) rawe rêwî bo kesê hênanewe
بیانووی ناڕاست وکەلـەکە وپـێچ وپـەنا بـۆ کەسـێ هێنانە کایەوە.

**ڕاوەستان** (کتن)[١] rawestan
بەپێوە وەستان، بەپاوەویستان، ویستان.

**ڕاوەستان** (کتن)[٢] rawestan
ڕاویستان، لەشوێنی خۆمانەوە،
نەبزووتن، لەجووڵە کەوتن.

**ڕاوەستان** (کتن)[٣] rawestan
بێکاربوون، لەئیش کەوتن.

**ڕاوەستان** (کتن)[٤] rawestan
بێدەنگ بوون، مات بوون، وڕە لەبـەر بـڕان، لەورتـە کەوتن،ورتەلەبەربڕان.

**ڕاوەستان** (کتن)[٥] rawestan
بڕانەوە، وەستان، کۆتایی هاتن.

**ڕاوەستاندن** (کتپ)[١] rawestandin
بەپـــێوە(ڕاگیرکـــردن، وەســـتاندن، ویـــستاندن، ڕاویستاندن

**ڕاوەستاندن** (کتپ)[٢] rawestandin
لەبزووتن(خستن، گێڕانەوە)، لەجووڵەخستن.

**ڕاوەستاندن** (کتپ)[٣] rawestandin
بەقینەوە(بڵند کردن، وەستاندن، ویستاندن).

**ڕاوەستاو** (ئان)[١] rawestaw
بەرلێ گرتن.

**ڕاوەستاو** (ئان)[٢] rawestaw
چەق، بێ بزوە، وەستاو، ڕاویستاو.

**ڕاوەستاو** (ئان)[٣] rawestaw
خۆگرتوو.

**ڕاوەستاو** (ئان)[٤] rawestaw
بەپێوە(وەستاو).

**ڕاوەستاو** (ئان)[٥] rawestaw
پایەدار، دەسەڵاتدار وهەرمان.

**ڕاوەستۆخ** (ئان) rawestox
بەردەوام لەشوێنێ دانیشتوو، هەمیشەنیشتەجێ.

**ڕاوەش** (ن) raweš
(بزوە، تەکان، جووڵە )بەتوندیی.

**ڕاوەشان** (کتن) rawešan
بزووتن، جووڵان، تەکان خواردن، ڕاوەشیین.

**ڕاوەشاندن** (کتپ)[١] rawešandin
هەڵتەکاندن.

**ڕاوەشاندن** (کتپ)[٢] rawešandin
بزواندن، ڕاتەکاندن، دانەبەرتەکان، ڕاشەکاندن.

**ڕاوەشاو** (ئان) rawešaw
ڕاتەکاو، تەکاو، تەکێنراو.

**ڕاوەشێن** (ن) rawešên
تەکێنەر.

**ڕاوەکانیی** (ن) rawe kanî
ڕاوی(سـەرکانیی، کـەو.. بەدیوجامـە یـان تـۆڕ..) لەسەر کانیاو.

**ڕاوەماسیی** (ن) rawemasî
کاری چوونە سەرئاو وڕووبار بۆ گرتن یـان هـەوڵ دان بۆ گرتنی ماسیی...

**ڕاویی** (ن) rawî
تاژیی یان مەلی فێرە ڕاوکراو، سـەگ یـان مـەلی ڕاو، توولەو تانجیی یان باڵندەی فێرە ڕاوکراو.

**ڕاوێچکە** (ن)[١] rawêçke
ڕابێژکە، ڕاوێشکە، بیر، هزر.

**ڕاوێچکە** (ن)[٢] rawêçke
ڕاوێژکە، ڕایەڵگە، ڕایەڵە، هات وچۆ.

**ڕاوێچکە** (ن)[٣] rawêçke
ڕاوێشک.

**ڕاوێچکە کردن** (کتن)[١] rawêçke kirdin
ڕامان، ڕاوێـژ کـردن، ڕاوێژکـە کـردن، ڕاوێـشکەکردن، بیرکردنەوە لەشتێ، هزرکردن.

**ڕاوێچکە کردن** (کتن)[٢] rawêçke kirdin
هات وچۆ کردن(بۆ یان لەیەک شوێن).

**ڕاوێژ** (ن)[١] rawêj
ڕابێژ، ڕابێژەکە، خەیاڵ.

**ڕاوێژ** (ن)[٢] rawêj
پرس، پرس وڕا، تەگبیروڕا.

**ڕاوێژ کردن** (کتن،کتپ) rawêj kirdin
تـــەگبیر کـــردن، لێ(دوان، کۆڵیینـــەوە)، ئـــەنجانی کارلێک دانەوە(لەگەڵ کەسێکدا).

**ڕاوێژکەر** (ن) rawêjker
ڕاوێژەر، ڕاوێژیار، بەتەگبیر، تەگبیرکەر، ئەو کەسەی ڕاوێژی لەگەڵ یان پێ دەکرێ.

**ڕاوێژگا** (ن) rawêjga
ڕاوێژگـــە، جێگـــەی تـــەگبیروڕا، کـــۆڕی تـــەگبیروڕا، شوێنی ڕاوێژ(تێدا کردن).

**راهاتن** (کتن) rahatin
فێربوون، هەڤۆتن، لێ ئاشنابوون.
**راهاتن** (کتن) rahatin
خووگرتن.
**راهاتوو** (ئان) rahatû
راهاتیی، فێرکراو، فێرەکارکراو، فێرەبوو.
**راهشتن** (کتپ) rahiştin
راهێشتن، شاتاوڵ بردن، پەلامار( بردن، دان)، بۆچوون، چوونەسەر، هێرش بردن.
**راهی** (ئان) rahî
رەها، رزگار، قوتار.
**راهێشتن{ئامرازی نێرینە}** (کتن)
rahêştin(amrazî nêrîne)
دامێشتن و درێژبوون.
**راهێشتن** (کتپ) rahêştin
داوی بەقولاپەوە فرێدانە ناو ئاو( بۆ ماسیی گرتن).
**راهێلان** (کتپ) rahêlan [1]
راهێشتن، راداشتن، مێزوپیسایی بەمنداڵ کردن.
**راهێلان{گوێ}** (کتپ،کتن) rahêlan(gwê) [2]
گوێ لێ گرتن، گوێی خوپێدان.
**راهێل بوون** (کتن) rahêl bûn[1]
رەهێل بوون، رایەڵ بوون، رێزبوون.
**راهێل بوون** (کتن) rahêl bûn [2]
رەهێل بوون، هەڵەنگوتن، رەت بردن.
**راهێل کردن** (کتپ) rahêl kirdin
رایەڵ کردن.
**راهێن** (ن) rahên
راهێنەر، فێرکەر، کەسێ کەمرۆڤ یان گیانداری تر تالیم دەدا.
**راهێنان** (کتپ) rahênan [1]
کەویی کردن، ماڵیی کردن.
**راهێنان** (کتپ) rahênan [2]
فێرکردن، تالیم دادان، راهانیین..
**رای** (پر،ئاک،کل) ray(kl) [1]
ئەرای، بۆچە، بۆ.
**رای** (پ،ئپ) ray [2]
لەبەر، بۆخاتری، بەهۆی، بەسەبەبی.
**رایج** (ئان) rayic
ئەو پارەیەی کە وەردەگیرێ و لە بازاڕی کڕین و فرۆشتندایە.
**رایدان** (کتپ) raydan
شان دان، نیشان دان.

**رایش** (ن) rayiş
روونوس، لەبەرنوسراو.
**رایشان** (کتپ) rayişan
روونوس کردن، لەبەر نووسینەوە.
**رایگان** (ئان) raygan
خۆڕایی، مفت، مفتە.
**رایگەم** (ئاک) raygem
تیکرا، بەگشتیی.
**رای مەزن** (ئان) ray mezin
لەخۆبایی، خۆلەخەڵک بەزیاتر زان.
**رایە** (ن) raye
شیاوی، حەد، شایانیی، شایانیتیی.
**رایەت** (ن) rayet
رەعیەت، مسکین، گوندیی یان کاسبکاری بەردەستی ئاغا.
**رایەغ** (ن) rayex
راخەر.
**رایەکەوتن** (کتن) rayekewtin
رایەهەبوون، شیان، بۆ( بوون، هەبوون)، جێی شایان بوون، لێهاتن، بۆهاتن.
**رایەڵ** (ن) rayel
١- رایێلە، رایەلە، راهێل، تان. ٢- هێل.
**رایەڵکراو** (ئان) rayel kiraw
راتەنگیوە، راهەنگاو.
**رایەڵ کردن** (کتپ) rayelkirdin[1]
هەڵواسیین، داخستن( گوریس..).
**رایەڵ کردن** (کتپ) rayel kirdin [2]
راهێل کردن، رایێل کردن، رێزکردن (دوای چنین بۆ تیوەدانی پۆ)، هەودا بەرایەڵ کردن، راچاندن، داچاندن.
**رایەڵ کردن** (کتپ) rayel kirdin [3]
داری دارەڕا بەسەردیواردا دانان، راتەنگاوتن، راهێشتن، راهێلان، راستەوراست دار یان ئاسن درێژکردن بەسەر بۆشاییدا.
**رایەنەبوون** (کتن) rayenebûn
١- بۆ نەبوون. ٢- دەسەڵات نەبوون
**رایی** (ئان) rayî [1]
راهیی، رەها، ئازاد، بەرداو.
**رایی** (ن) rayî [2]
هەڵ ماتنێتەنگ وچەڵەمەی دژواروستەم.
**رایی بوون** (کتن) rayîbûn [1]
١- بەرهەڵست لەبەردەمدانەمان. ٢- کەوتنەڕێ،

بەرێ کەوتن، چوونەسەفەر.

**رایی بوون (کتن)** ² rayîbûn

سانابوون، هەڵ نان.

**رایی بوون (کتن)** ³ rayîbûn

فێربوون.

**رایی کردن (کتپ)** ¹ rayî kirdin

ڕەوانەکردن،بەرێ کردن، خستنەرێ.

**رایی کردن (کتپ)** ² rayî kirdin

خستنە سەر نیش.

**رایی کردن (کتپ)** ³ rayîkirdin

ساناکردن، حەل کردن.

**رایی کردن (کتپ)** ⁴ rayî kirdin

فێرکردن، دەرس دادان.

**ڕب{میوە} (ن)** ¹ rib(mîwe)

ڕوب، ڕووگێ، ئاو، شیرە، شیلە.

**ڕب (ن)** ² rib

مرەبا میوە وشیلەکەی(پێکەوە هەڵگیراو).

**ڕباس (ن)** ribas

ڕباسە، ڕبس، ڕبسان، ڕەفس، ڕەفسان، ڕبازە، کەشاو، دیرانی زەویی بەر لەچاندن، ئاوداشتنی زەویی بۆ ڕەپستە، ئاویاریی بۆ ئاوەنیا، ئامادەکردنی زەویی (بەئاودان) بۆ کیلان.

**ڕبە (ن)** ribe

جۆرێ پێوانەی وشکەدانە(دەغڵ، دانەویلە)، دەفریکە دانەویلە یان وشکەدانی پێ دەپێورێ = بەنزیکەی ٢٥ کیلۆگرام.

**ڕبەنار (ن)** ribenar

ڕوبنار، ڕبەهەنار، تاتولیی، دۆشاوی هەناری گوشراو، شیرەی هەنار، هەناراوی خەستەوەکراو.

**ڕپ (ن)** rip

پەلەپەل(دل).

**ڕپ دان (کتن)** ripdan

پەلەپەل کردن (دل).

**ڕپلاندن (کتپ)** riplandin

هرس کردن، هەڵ پەرتاوتن(لق وپۆپی دار).

**ڕپن (ن،رو)** ripin

بنج، پنج.

**ڕپن داکوتان (کتن)** ripin dakutan

ڕپن دان، ڕپن داکوتان، پنج( بەزەویدا )کوتان، هب(ڕەگ داکوتان).

**ڕپنین (کتن)** ripnîn

پەلەدان، بارانی تیریژ کشتوکاڵ بارین.

**ڕپە (ن)** ripe

ترپە، تەپە، دەنگی تەپەی پێ.

**ڕت (ن)** ¹ rit

نفرە، نەفرەت، کردار یان ئاخاوتنی بێزاریی.

**ڕت (ن)** ² rit

دەرکردنی کەسێکی ناخۆشەویست.

**ڕتام (نک)** ¹ ritam

خۆڵەمێش.

**ڕتام (ن)** ² ritam

لمی ورد(تێکەڵاو بەلیتاوی ڕوبار)،قوم.

**ڕتان (کتپ)** ritan

نەفرەت کردن.

**ڕتاندن (کتپ)** ritandin

ڕتان، دەرپەڕاندن، کردنەدەر، وەدەرنان.

**ڕتلۆ (ئان،پز)** ritlo

باتوباکردوو، گون هەڵاوساو.

**ڕتم (ن)** ritim

بەرگر، لەمپەر.

**ڕتمیی (ئان)** ritmî

بەرگیراو، لەمپەر لەبەردەمدا دانراو.

**ڕجرج (ن،پز)** ricirc

ڕوشاویی یان پەڵەی شین لەسەرپێست(لەئاکامی کەوتن یان لێدانەوە).

**ڕجرجان (کتن)** ricircan

ڕجرجیین، ڕوشان یان سووربوونەوە و شین بوونەوە (شوێنێ لەئەندامی لەش بەهۆی لێدان یان کەوتنی لە شتێ بەنهیم).

**ڕجە (ن)** ¹ rice

تەناف(بۆ جل لەسەر هەڵخستن و وشک بوونەوەی).

**ڕجە (ن)** ² rice

شاووڵ، بەنی شاقووڵی بەننا.

**ڕچ (ن،لو)** riç(lu)

ڕەچ، بەستەڵۆک.

**ڕچان (ن،کل)** ¹ riçan(kl)

بەستن(ئاو بەسەهۆڵ)، بوونە(سەهۆڵ، بەستەک، بەستە لەک، سەهۆڵ بەندان)، ڕچیان، ڕچیین، ڕسکان، ڕچگان.

**ڕچان (ن)** ² riçan

ڕچیان، ڕچیین، ڕسیان، مەیین، خەست(بوونەوە، وەبوون)، توند(بوونەوە، وەبوون).

**ڕچاندن (کتپ)** ¹ riçandin

ڕچانن، توندوەکردن، خەست کردنەوە، مەیاندن.

**ڕچاندن** (کتپ) [2] ṟiçandin
کردنە( سەهۆڵ، بەستەڵەک، سەهۆڵ بەندان).

**ڕچاو** (ئان) [1] ṟiçaw
ڕچیو، بەستوو(ئاو).

**ڕچاو** (ئان) [2] ṟiçaw
ڕچ، ڕچیاو، ڕچیاگ، مەیو، خەست، خەستەوەبوو، توند وەبوو، توندەوەبوو.

**ڕچە** (ن) [1] ṟiçe
ڕێچکە، باریکەڕێ، ڕێگەی زۆر باریک، ڕێچک، ڕێچ، ڕێکۆک، بزنەڕێ.

**ڕچە** (ن) [2] ṟiçe
جۆگەت، بەفرەسەر، جێگاپێ لەسەربەفر، باریکەڕێی ناو بەفر.

**ڕچە** (ن) [3] ṟiçe
کۆلانێ کەلەوسەرەوە داخرابێ، کۆلانێ کە(دەرنەچێ،ئەوسەری گیرابێ..).

**ڕچەشکاندن** (کتپ) [1] ṟiçešikanidn
ڕچە(قوتان، کردنەوە)، ڕچەکوتاندن یان کوتان، ڕێگاشکاندن لەناویەفردا، بەفرکوتان(بۆ ڕێگە کردنەوە).

**ڕچەشکاندن** (ئد) [2] ṟiçe škandin
پێش کەریی کردن(لەکارێکدا لەلایەن یەکێکەوە )،سەرفرازبوون لەئیشێکدا.

**ڕخ** (ن،کل) ṟix(kl)
ترس.

**ڕخ بردن** (کتپ) ṟix birdin
ترساندن.

**ڕخ چوون** (کتن،کل) ṟixçün(kl)
ترسان.

**ڕخن** (ئان،کل) ṟixin(kl)
ترسنۆک.

**ڕداڵ** (ئان) ṟidal
تەپیر، ڕەداڵە، پیری(هەوەسباز، پڕ هەوەس).

**ڕدۆز** (ن) ṟidoz
ڕۆز، کۆک، تەقەڵ لیدانی جل وبەرگ بەسەریەکدا بەشێوەی کاتیی کەبەرگدروو دەیکەن پێش خستنەبەر مەکینەی دروومان.

**ڕدە** (ن،جج،کل) ṟide(kl)
مۆرانە.

**ڕز** (ن) ṟiz
زنجیری باریک.

**ڕزان** (کتن) [1] ṟizan
ڕزیین، ڕزیان، داوەشان، داوەشیین، شڕو وڕبوون، پۆرتکان، پەرتیین، لەکارکەوتن(شتێ، لەبەر کۆنیی، زۆر مانەوە..)، لەبەریەک چوون، خراپ بوون.

**ڕزان** (کتن) [2] ṟizan
بەربوونەوە، بەرەوەبوون، کەوتن.

**ڕزاندن** (کتپ) ṟizandin
پەرتاندن، پوواندن، هەلاهەلاکردن، داوەشاندن، شڕو وڕکردن، دارزانن.

**ڕزاو** (ئان) [1] ṟizaw
ڕزیو.

**ڕزاو** (ئان) [2] ṟizaw
داوەریو، وەریو.

**ڕزد** (ن) ṟizd
ڕزدە، ڕزدی، زنجیرەچیا، چەند کێوێک بەپاڵ یەکەوە.

**ڕزق** (نک) [1] ṟizq
بژێویی، داژیار، ڕۆزیی، قووت.

**ڕزق** (ن) [2] ṟizq
ڕسک، ڕسق، ڕیچاڵ، هەرچی لەشیر پەیدادەبێ.

**ڕزق** (نک) [3] ṟizq
ئەشتەبا، زاد، وشکە، ماڵی دنیا.

**ڕزق** (ن،ئا) [4] ṟizq
ڕزک، ڕسق، جرج، بان بانک، ڕسک، جانەوەرێکی شەو گەڕە لەخێزانی مشک وسمۆرە.

**ڕزک** (ن) ṟizk
ڕسک، خوێنی لووت(ڕژاو، بەربوو).

**ڕزکیان** (کتن) ṟizkyan
ڕسکیان، ڕسکیین، ڕسیین، ڕژان، بەربوون(خوێنی لووت).

**ڕزگار** (ئان) ṟizgar
ئازاد، هب(دەرباز).

**ڕزگاربوون** (کتن) ṟizgarbün
بەرخورداربوون، خۆی بوون، سەرفرازبوون.

**ڕزگارکردن** (کتپ) [1] ṟizgar kirdin
ئازادکردن، هب(دەربازکردن).

**ڕزگارکردن** (کتپ) [2] ṟizgar kirdin
ئازادکردن(ولات).

**ڕزگارکردن** (کتپ) [3] ṟizgar kirdin
بەردان.

**ڕزگارگە** (ن) ṟizgarge
ڕستگارگە، جێگای ڕزگاریی.

**ڕزگاریی** (ن) ṟizgarî
سەربەستیی، ڕەهایی.
**ڕزم** (ن) ṟizim
ڕووداوی لەناکاو.
**ڕزندیی** (ن) ṟizindî
لوولە.
**ڕزۆک** (ئان) ṟizok
ڕەزەک، بەرەوڕزیویی چوو(میوە).
**ڕەزەڵ{مرۆڤ}** (ئان) ṟizeḻ(mirov)
ڕزیلە، پەکی کەوتە، کەنەفت، نەخۆشی بێهێز.
**ڕزیو{کەل وپەل}** (ئان) ṟizîw(kel wpel)
ڕزۆک، ڕزەک، ڕزەڵ، ڕزەڵۆک، ڕزیاگ، ڕزیی، بەکارنەماو (لەبەر ڕزیویی)، چووگ، هب(پوواو).
**ڕزیوەت** (ن.کل) ṟizîwet(kl)
بنەچە، وەچە.
**ڕزین** (کتن) ṟizîn
زۆر پێ گەیشتن(میوە).
**ڕژان** (کتن) ṟijan 1
ڕزان.
**ڕژان** (کتن) ṟijan 2
پرش وبلاوبوونەوە.
**ڕژان** (کتن) ṟijan 3
ڕژین، دارژان، هەڵ ڕژان، بەتاڵ بوون.
**ڕژان** (کتن) ṟijan 4
ڕژیان، پرژان، پژان.
**ڕژان{گەلا}** (کتن) ṟijan(geḻa) 5
وەرین، هەڵ وەرین.
**ڕژاندن** (کتپ) ṟijandin 1
ڕژانن، ڕژتن، ڕهتن، ڕیتن، ڕیهتن، هەڵ(ڕژاندن، ڕشتن)، دارژاندن، هیچ تێدانەهێشتن (لەدەفرێکدا بەهەڵ ڕشتنی نیوەڕۆکی)، قلپ کردنەوە(نیوەڕۆکی دەفر).
**ڕژاندن** (کتپ) ṟijandin 2
پرژاندن، پرش وبلاوکردنەوە، بلاووەکردن.
**ڕژانە مل** (ند) ṟijane mil
ڕژیانەمل، بەچەندکەسێ لەیەکێدان، گەلەکۆمەکێ لێکردن.
**ڕژانە یەک** (کتن) ṟijane yek 1
تێکەڵاوبوون.
**ڕژانەیەک{دوو دەستە مرۆڤ}** (ند) 2
ṟijaneyek(dü deste mirov)
مل دەبەرملی یەکترنان، ڕژیانەیەک، بەیەکدادان و
تێکەڵاوبوون، تێکەڵاوبوون و ئاوملی یەکتربوون.
**ڕژاو** (ئان) ṟijaw
بلاووەبوو، پرژاو، ڕژیاگ، پەرشاو.
**ڕژتن** (کتپ) ṟijtin
ڕژاندن.
**ڕژد** (ئان) ṟijd 1
پێداگر، سوور(لەسەر کردنی شتێ).
**ڕژد** (ئان) ṟijd 2
ڕک، ڕکە، چەخت، هەڵەموت، هەڵدێر، هەورازی کوور، سەربەرەوژوورکە، سەرەولێژکە یان ژێرە(کە بەدژواریی لیی سەردەکەون)، لاپاڵ یان هەورازی سەخت ولێژ، سەرەو لێژکەی کوور(لە گرد، چیا..).
**ڕژد** (ئان) ṟijd 3
چرووک.
**ڕژدبوون** (کتن) ṟijdbün 1
ڕەزیلیی کردن، خۆ(گڵاشتن، گوشیین)، مست قووچاندن.
**ڕژدبوون** (کتن) ṟijdbün 2
ڕژدکردن، بالاکردن، گەورەبوون، هەڵ چوون، بەرزبوونەوە، دانەبالا(کەسێ).
**ڕژدیی** (ن) ṟijdî
تەوژم، بەتوندیی هاتنی ئاو.
**ڕژە** (ن) ṟije
کرێژ، کرێش(سەر).
**ڕژەدار** (ئان) ṟijedar
کرێژاویی، کرێشاویی، سەربەکرێش، قرێش بەسەر.
**ڕژێم** (ن) ṟijêm
ڕێژیم، ڕژیم، دام ودەزگای میریی، سیستەمی دەزگای میریی.
**ڕساو** (ئان) ṟisaw
نەبەسراو، نەبەستراو.
**ڕست{بۆ دەنکی تەزبیح}** (ن) 1
ṟist(bo denkî tezbîẖ)
ڕستە، ڕشتە.
**ڕست** (ن) ṟist 2
ڕس، ڕستک، ڕستکێ، ڕسک، پەت
**ڕست** (ن) ṟist 3
تاخە، ڕیزێک شتی هۆنراوە.
**ڕست** (ن) ṟist 4
ڕستە، قەڵادە، قەڵاتە، قایشی ملی سەگێ یان بازی ڕاو.

**ڕست کردن (کتپ)** ١ r̲ist kirdin
بەپەتەوەکردن، هۆنینەوە.

**ڕست کردن (کتپ)** ٢ r̲ist kirdin
پــەت خــستنە(قەلاتــە)ی ملــی تــانجیی.. (بــۆ ڕاکیشان).

**ڕستن (کتپ)** ١ r̲istin
بادان.

**ڕستن (کتپ)** ٢ r̲istin
ڕیــستن، ڕیــسیین، بــافیین، بــادان(بــەن، خــوریی، لۆکە..).

**ڕستن (ند)** r̲istin ٣
نۆز(وتن، گوتن)، چەنەبازیی کردن.

**ڕستە (ن،ری)** r̲iste.
چەند وشەیەکی ڕیزمانیی پیکەوە واتاتەواو دەکەن.

**ڕستی ساڵ (خ)** r̲istî sal̲
تەمەن.

**ڕستیی (ن)** r̲istî
بناغە، بناخە، بنچینەی خانوو، هیم.

**ڕسکان (کتن)** ١ r̲iskan
دروست بوون(شتی سروشتیی).

**ڕسکان{ڕووەک} (کتن)** r̲iskan(r̲wwek) ٢
ڕووان، جــۆش خــواردن، پــیوەبوون، گیرســان، لکــان (درەخت کەموتوربە کرا بێ..).

**ڕسکاندن{خوین} (کتپ)** r̲iskandin(xwên)
رسکانن، ڕزکاندن، پژاندن.

**ڕسکاو (نک)** r̲iskaw ١
دروست بووی سروشت.

**ڕسکاو{ڕووەک} (نان)** r̲iskaw(r̲wek) ٢
گیرســـاو، ڕوواو، ڕواو، پەیوەســـتبوو (موتوربـــە)، پەیوەندی خۆگرتوو، خەڵفیکە لەپاش موتوربە کردن پەیوەست بوویێ.

**ڕسم (نان)** r̲isim
پتەو، توند، قاییم.

**ڕسوا (نان)** r̲iswa
نابروو(چوو، نەماو) ناوزراو، ڕووسیا، ڕیسوا.

**ڕسوابوون (کتن)** r̲iswa bûn
ڕیسوابوون، نابرووچوون.

**ڕسواکردن (کتپ)** r̲iswa kirdin
پەندپێدان.

**ڕسوایی (ن)** r̲iswayî
ڕیسوایی، بێ نابروویی، بەدناوی، نەمانی نابروو.

**ڕسیان (کتن)** ١ r̲isyan
پەرت بوون، هەڵدیران.

**ڕسیان{میوە} (کتن)** r̲isyan(mîwe) ٢
پێگەیشتن، گەیشتن، گەیین.

**ڕسیین (کتپ)** r̲isîn
بەیەکترەوەنووساندن.

**ڕشاندن (کتپ)** r̲išandin
ئاورشین کردن.

**ڕشانەوە{گوڵی دارمێو} (کتن)** ١
r̲išanewe (gul̲î dar mêw)
بوون بەبەر.

**ڕشانەوە (کتن،کتپ)** ٢ r̲išanewe
خــواردن هەڵهاوردنــەوە، وەرشــان، ئیــق کردنــەوە، هینانەوە (خواردن.. لەدەمەوە).

**ڕشانەوە{گوڵی داری بەردار} (کتن)** ٣
r̲išanewe(gul̲î darî berdar)
وەریین، هەڵ وەریین(گوڵی داری بەرداریــش کاتی خۆی، پیش خربوونی بەرەکە).

**ڕشانەوە (ن،پز)** ٤ r̲išanewe
چاوقووڵکە، ئاهۆ، هب (چاوەقووڵە)

**ڕشت (ن)** r̲išt
ئاڵ وگۆڕیی شت بەشت.

**ڕشتن{چاو} (کتپ)** ١ r̲ištin(çaw)
ڕیــژان، چــاو(ڕژتــن، ڕشــتن)، کــل بــەچاوداهینان بەکلچیوکە، کل دەچاو (کیشان، کردن).

**ڕشتن (کتپ)** ٢ r̲ištin
نەخشاندن.

**ڕشتنەوە (کتپ)** r̲ištinewe
ڕەژتنەوە، ئاژاوە نانەوە وخەڵک بەگژیەکداکردن، مەردوم بەدەمەوەدان وتێوەگلانیان لەچورتمیکدا.

**ڕشتە (ن)** ١ r̲ište
بەن، بەند، پەت.

**ڕشتە (ن)** ٢ r̲ište
ڕشــدە، ڕســتە، ڕوشــتە، هەرشــتەی گەنمەبــەهاروو، هەویری ئاردی گەنمەبەهارەی باریک براوی وشکەوە کراو بۆ چیشت یان حەڵوا وشیرەمەنیی.

**ڕشڤەت (ن،کی)** r̲išvet(ki)
بەرتیل.

**ڕشک (ن،جج)** r̲išk
سپیلکە، گــەرای ئەســپێ (لــەناو لــەش یــان ناوجــل)، ڕژک.

**رشکاویی** (ئان) r̲iškawî

رشکن، رشکۆ: ئەسپیاویی.

**رشک دانەسەر** (کتن) r̲išk daneser

سەر رشکاویی بوون.

**رش ویش** (ن) r̲iš w piš

تەخشان وپەخشان.

**رش ویش بوون** (کتن) r̲iš w pišbün

بەفیرۆچوون.

**رش ویش کردن** (کتپ) r̲išwpiš kirdin

تەخشان وپەخشان کردن، بەفیرۆدان.

**رشینە** (ن) r̲išêne

بارانی(ریزە بەریزە، وردی لەسەرخۆ)، وردەبارانی هیدیی ونەرم.

**رف** (ن) r̲if

رەفە، رفە، رفحە، تاقی دەرپەریوی بەرز لەدیوار بۆ شت لەسەردانان.

**رفان** (کتن) r̲ifan

فران.

**رفاندن** (کتپ) r̲ifandin

رفانن، فرانن، ترافانن، پەلاماردان وبردن(شتێ) وبەدەست وبرد.

**رفاو** (ئان) r̲ifaw

رفیاگ، فریندراو، فرینراو.

**رفیو** (ئان) r̲ifîw

فریو، هەلفریو.

**رفین** (کتن) r̲ifîn

فرین، هەل فرین، بال(گرتن، گرتنەوە)، کەوتنە ئاسمان (بالندە..).

**رفین** (ن) [1] r̲ifên

فرین، برفین، کەسێ شت برفێنێ.

**رفین** (ن،کی) [2] r̲ifvîn(ki)

گری ئاگر، پیت، رمی.

**رق** (ن) r̲iq

رک، قین، کین، حیرس، توندیی.

**رقاویی** (ئان) r̲iqawî

رقن، رق(لەسک، لەدل)، رککۆ، رککین، رقدار، رکن، رکۆ، رکوونیی،

رقدار، رکن، دەبنەوەبر، ئەرنۆ.

**رق ئەستوور** (ئان) r̲iq estür

کەللەرەق، سەرسەخت، سەرپێچیکەر.

**رق گرتن** (کتن) r̲iq girtin

رق دانەمرکانەوە، رق(هەستان، هەلسان)، دەرقەوە چوون، رک(بوونەوە، کردن، چوون، گرتن)، تووڕەبوون، قین گرتن، جەحنیین،توندبوون، بەرچاو تاریک بوون.

**رق لێ بوون** (کتپ) r̲iq lêbün

بوغزاندن.

**رق لی کیشان** (ئد) r̲iq lêkêšan

رق (-لەکەسێ- لەدل گرتن، لەدلدا هەلگرتن بەرامبەر کەسێ، لێ هەلگرتن)، رقە بەریی لەگەل کردن، قینەبەریی کردن لەگەل یەکیکدا ، رقە کیشان.

**رق نیشتنەوە** (کتن) r̲iq nîštinewe

هیدیی بوونەوە.

**رقە بەریی** (ن) r̲iqe berî

رکبەرکێ، رکبەرکینە، بەربەرەکانیی، قینەبەریی، مل ملانێ، رقەبەرقە.

**رقەبەریی کردن** (کتپ) r̲iqe berî kirdin

بەربەرەکانی کردن.

**رق هەلساندن** (کتپ) r̲iq hel̲sandin

تووڕەکردن، قین(هەستاندن، هەلساندن)، ئاژیین، تیوە ژەندن.

**رک** (ن) [1] r̲ik

قەفەز، قەفەس.

**رک** (ن) [2] r̲ik

پەت، هەوسار.

**رکاکە** (ن) r̲ikake

بنکۆل، تەکمیش(بنی میو)، گل هەلدانەوەی بنی دارو درەخت.

**رکان** (ن) r̲ikan

باوەریی، خاترجەمیی.

**رک چوون** (کتن) r̲ik çün

ئارام بوونەوە لەپاش تووڕەبوون.

**رک رکین** (ن) r̲ik r̲ikên

چیرەچیری ددان.

**رک گرتن** (کتن) r̲ik girtin

تووڕەبوون ومان گرتن.

**رک لی بوونەوە** (کتپ) r̲ik lêbünenwe

رق لێ بوونەوە، خۆش نەویستن.

**رکو** (ن) r̲ikü

لەرزە، هەل لەرزە(لەسەرما یان لەترساندا).

**رکە** (ن) r̲ike

ملە، کێ بەرکێ.

**رکەنە** (ن،پز) ṟikene
حەجامات.

**رکیان** (کتن) ṟikyan
رکان، لەرزان، لەرزین.

**رکیشە** (ن،رو) ṟikêše
رەکیشە، گیایەکی پزیشکییە بۆ دومەڵ گەیاندن بەکاردێ.

**رکیشە بەرەگ، گلێنە بەبنەتوو** (پن)
ṟikêše be reg, glêne be bine tow
سروشتی مرۆڤ بەرەفتاریدا دەردەکەوێ لەوانەیە نەریتی کوڕ بچێتەوە سەر (رەفتاری) باوکی.
ب- وەچە بەبنەتوو. ت. گلێنە = کزن.

**رکێف دەواڵ** (ن) ṟikêf dewal
قایش دەواڵ، قایشیئاوزەنگی.

**رکێف کوت** (ن) ṟikêf kut
تاودانی ئەسپ لەلایەن سوارەوە.

**رم** (ن) ṟim
رمب، سەقاو، نیزەی درێژ.

**رمان** (کتن) ṟiman
رمیین، رمیان، ڕووخان، تێکچ(تەپان، تەپیین)، هەرفتن.

**رماندن** (کتپ) ¹ ṟimandin
رمانن، ڕووخاندن، پردان، تێکچ(تەپاندن، تەپانن).

**رماندن** (کتپ) ² ṟimandin
بەزەویدادان.

**رماو** (ئان) ṟimaw
رمیاگ، ڕووخاو، ئارفتە، تێک تەپیو.

**رمباز** (ن) ṟimbaz
رم وەشێن، کەسێ لەرم بەکارهێناندا چابوک بێ.

**رمبازی** (ن) ¹ ṟimbazî
نیرەبازی، شەڕەرم لەسەر پشتی وڵاخ.

**رمبازی** (ن) ² ṟimbazî
غار غارێن، هات وچۆبەسواریی لەمەیدان دا.

**رمبازی کردن** (کتن) ¹ ṟimbazîkirdin
یاریی کردن بە(رم) لەکاتی وڵاخ تاوداندا.

**رمبازی کردن** (کتن) ² ṟimbazî kirdin
غارغارێن کردن، غار کردن(بەئەسپ).

**رمبە** (ن) ¹ ṟimbe
رمب، رمە، رمە، دەنگی دەهۆڵ.

**رمبە** (ن) ² ṟimbe
گرمە، دەنگی کەوتنی شتی قورس بەسەرزەویدا.

**رمبە** (خ) ³ ṟimbe
سازیی، بەکەیفیی، بەدەماخیی، ئەوپەڕی کامەرانیی.

**رمبێشک** (ن) ṟimbêšik
تاوەی بچووکی دەسکدار، دەفری بچووکی گوێچکەدار (بۆ خواردن تێدا سوورکردنەوە).

**رمچە** (ن) ṟimçe
رمی بچووک، کوڵەرم.

**رمدار** (ن) ṟimdar
نیزەدار، رم(هەڵگر، هاوێژ) سەربازی (سوارە، سواریی).

**رمژەوە** (ئان) ṟimjewe
تاڵ، تەحل، وەک ژاراو.

**رموودە** (ئان) ṟimüde
ئالوودە، ئۆگر، هۆگر، خووپێوە گرتوو، چەش (چەشەبوو).

**رموزن** (ن) ṟimüzin
مێردەزمە، دێوەزمە، جنۆکەیەکە دەبێتە هۆی خەوی پیاوترسێن (لە ئەفسانەی کوردیدا).

**رن** (ن) ṟin
روشێن، کرێن.

**رنا** (ن،کل) ṟina
هاوار(لە ئێش وئازاردا)، قیژە(لە ترساندا).

**رناو** (ئان) ṟinaw
رنیاگ، رنیاو، رنراو(پێست).

**رند** (ئان) ¹ ṟind
باش، پەسند، خاس.

**رند** (ئان) ² ṟind
جوان، خوشکۆک.

**رندیی** (ن) ṟindî
پیاوچاکیی، چاکەکاریی، هب(پیاوەتیی).

**رنگاڵ** (ن) ṟingaḻ
رنگ، رینگاڵ، رینگ، هەنگوینی پاڵاوتە، شیلەی خەستی بێ گرێ وقۆرت.

**رنگان** (کتن) ṟingan
ئاخاوتنی بێ تام کردن.

**رنگاندنەوە** (کتپ) ¹ ṟingandinwe
دووپات کردنەوە، ووتنەوە، لەسەر ڕۆیشتن(ئاخاوتن).

**رنگاندنەوە** (کتپ) ² ṟingandinwe
بێزاری دەربڕین،بۆڵاندن.

**رنگاو** (ن) ringaw

رەنگاو، شەربەتی تریێ کەمێشوە تریی تێ کرابێ، خۆشاوی میوژ..

**رنگیین** (کتن) ringîn

رنگە لێ هاتن.

**رنو** (ن) rinü

رەنی، رنی، رەنوو، ئاشۆت، کەویەبەفر، کلیلە، بەفری زۆری رەنی، رنی، رەنوو، ئاشۆت، کەویەبەفر، کلیلە، بەفری زۆری بارنیوو کۆمەل بوو، بەفری کەلەکەبووی لەسەر یان ناو قەدشاخەوە باهاوردوو تیکەلاو بەگل وبەرد.. وگرمۆلەتر دەبێ لەکاتی لەپر هاتنەخوارەوەیدا..

**رنە** (ن) ١ rine

رەنە، چنینی میوە.

**رنە** (ن) ٢ rine

کاتی چنینی میوە.

**رنە** (ن) ٣ rine

خەپە، درمغ، ئامرازێکی دەسک درێژ وداندارى کشتو کالە بۆ کۆکردنەوەی گژوگیا، بۆهەلگێرانەوەی زەوی وزارو یەکسان کردنی بەکار دەهێنرێ..

**رنەک** (ن) ١ rinek

قەشەو، ئاسنێکی پر بەدەستی ددانەدارە ولاخی پێ پاک دەکەنەوە.

**رنەک** (ن) ٢ rinek

بریەنگی زۆر زبر.

**رنەکردن** (کتپ) ١ rine kirdin

رەنەکردن، لەرنەدان، بەرنەوردتر کردن.

**رنەکردن** (کتپ) ٢ rine kirdin

خەپەکردن، درمغ کردن، گژوگیا کۆکردنەوە بە(رنە).

**رنەک کردن** (کتپ) ٣ rinek kirdin

لەبریەند(بریەنگ)دان، بریەند کردن.

**رنەک کردن** (کتپ) ٤ rinek kirdin

پێ شال کردن، قەشاوکردن، پاک کردنەوە(چارەوێ بە رنەک).

**رنیین** (کتپ) ١ rinîn

چنیینەوە.

**رنیین{گەلا لە لق وپۆپ}** (کتپ) ٢ rinîn(gela le liq w pop)

دارنیین.

**رنیین** (کتپ) ٣ rinîn

لێ کردنەوە(گول..).

**رنیین** (کتپ) ٤ rinîn

رۆشاندن، رووکاندن، چرنووک لێدان.

**رنیین** (کتپ) ٥ rinîn

کراندن(وەک بەبریەنگ).

**رنیینەوە{قژ}** (کتپ) ١ rinînewe(qij)

هەل کەندن.

**رنیینەوە** (کتپ) ٢ rinînewe

دروونەوە، دوورینەوە(گژوگیا، دەغل ودان).

**رواڵەت** (ن) rwalet

دەرکەوت، دیمەن.

**روبار** (ن) rubar

روو، رۆ، رووخانە، رووار، روبال، رۆخانە، روبیار، شەت.

**روبال** (نپ) rubal

بە(هۆ، سەبەب)، سۆنگە، سەمەد.

**روخسار** (ن) ruxsar

تەرمال، دەموچاو.

**روو** (ن) ١ rü

ب (بەر).

**روو** (ن) ٢ rü

رووچک، رووک، ری، ریت، چارە، دیدار،دیم، بیچم، تەرح.

**روو** (ن) ٣ rü

رواڵەت، روال، رووال، رەوال، بەروم، پیش، پیشگاه، دیو، لای بەرچاو(لە قەبارەی شتێ).

**روو** (ن) ٤ rü

حەیا، شەرم.

**روو** (ن) ٥ rü

رێز.

**روو** (ن) ٦ rü

پیش، پیشگاه، بەروم.

**روو** (ن) ٧ rü

خار، زەویی سەخت.

**رووئاوا** (ن) rüawa

رۆژئاوا، زەردەپەر، نزیک بەشەو.

**رووادگە** (ن) rüwadge

نیشتگە، نیشتنگا.

**رووال** (ن) ١ rüwal

هەرزەکار، تازەجوان، گەنجی موولێ نەهاتوو.

**رووال** (ئاکە) ٢ rüwal

تەنیشت، نزیک بە.

**ڕووان (کتن)** rüwan
ڕەگ داکوتـان، ڕیشەداکوتان، ڕەھـستن، بـن کـردن، شین بوون، سەوزبوون.

**ڕووان{ددان لە ناودەم، موو لە لەش}(کتن)** rüwan(didanle naw dem, mü le leš)
دەرهاتن.

**ڕواندن (کتپ)** ruwandin [1]
چەقاندن(شەتل، نەمام) بەزەویدا، ڕپاندن.

**ڕواندن (کتپ)** ruwnadin [2]
جێ بەجێ کردن(کار).

**ڕواندن (کتپ)** rüwnadin [3]
وە دەرنان.

**ڕوانراو (ئان)** ruwanraw
ڕواندراو، ڕوێندراو، ڕوێنراو، چێنراو.

**ڕوانگە (ن)** ruwange
بینینگا، بینینگە، جێگەیەک کەلێیەوە دەڕوانن.

**ڕوانە (ئان)** ruwane
ناردراو، نێرراو، بەڕێ کراو.

**ڕوانەوە (کتن)** ruwanewe [1]
توندبوونەوە، خەست بوونەوە.

**ڕوانەوە(کتن)** ruwanewe [2]
دووبارە سەوزبوونەوە (گژوگیا، دارودرەخت..).

**ڕوانین (کتن،کتپ)** ruwanîn
ڕۆنیین، تەماشاکردن، تواشـاکردن، نـوارین، وردەوە بوون.

**ڕوواو (ئان)** ruwaw
ڕەھـستیی، ڕەگ داکوتـاو، سـەوزبوو(نـەمام پـاش ناشتن و چەقاندن).

**ڕوواوە (ئان)** ruwawe
خەست وەبوو، خەستەوەبوو.

**ڕوو بادان (ند)** rü badan
ڕوولێ وەرگێران، خۆتێ نەگەیاندن.

**ڕوو بازاڕیی (ئان)** rü bazarî [1]
بەرمێن، برەودار، بەبرەو(کەلوپەلی بازرگانیی).

**ڕوو بازاڕیی{ئافرەت} (ئان)** rü bazarî(afiret) [2]
جوان، بخوازدار.

**ڕووباڵ بوونەوە (کتن)** rübal bünewe
بەرەو ڕوو بوونەوە.

**ڕووبەر (ن)** rüber [1]
بەرامبەر، بەرانبەر.

**ڕووبەر (ن)** rüber [2]
پشتەلیفە.

**ڕووبەڕوو (ئاک)** rüberü
ڕووبەرامبەر یەک، بەرەو ڕووی یەکتر، ڕوو لەیەک.

**ڕووبەڕووبوونەوە (کتن)** rüberü bünewe
بەرەو ڕووبوونەوە، ڕووباڵ بوونەوە.

**ڕووبەڕوو وەستان (کتن،کتپ)** rüberü westan
بەرهەڵستیی کردن، دوژمنایەتی کردن.

**ڕووبەڕوویی (ن)** rüberüî
بەرامبەریی، بەرهەڵستیی، ئاوریش.

**ڕووبەرەو پشتەوە (ئاک)** rüberw piştewe
پشتەو پشت.

**ڕووبەند (ن)** rübend
ڕووبەنە، ڕووپۆش، پووشی، پەچە.

**ڕووبینیی کردن (کتپ)** rübînî kirdin
تارا لەسەر بووک هەڵدانەوە.

**ڕووبینین (کتن)** rübînîn
پاڵپشت وەرگرتن.

**ڕووپاک (ئان)** rüpak
بە(ئابروو، حورمەت).

**ڕووپامایی کردن (کتپ)** rüpamayîkirdin
ڕواڵەت کردن، کلکەسووتەکردن، مەرایی کردن.

**ڕووپەڕە (ن)** rüpere
ڕووپـەل، لاپـەڕ، لاپـەڕە، دیویـک لەپـەڕەیەک (پەڕتووک، گۆڤار..).

**ڕووپێدان (کتپ)** rüpêdan
ڕێـز(گـرتن، پـێدان)، قـەدرگرتن، ڕووی خـۆش پـێ دان.

**ڕووپێو (ن)** rüpêw
زەویی پێو، کەسێ کەزەویی لەگەز دەدا.

**ڕووت (ئان)** rüt [1]
ناڕازاو، دەست پێدانەهێنراو.

**ڕووت (ئان)** rüt [2]
ڕووس، ڕوھت، ڕوویت، ڕوویچ، ڕیت، بێ(جل، جلک)، جل لەبەردا نەبوو.

**ڕووت{درەخت} (ئان)** rüt(dirext) [2]
بێ گەڵا.

**ڕووتاڵ (ئان)** rütal
ڕوو(گرژ، ترش، ترشاو، تەحل، مۆن، درژ، ترشیاگ)، دەموچاوگرژ، ناوچاوان ترش، پۆرخس، وشک وکـەم دوو، توندشێوە

**ڕووتاندنەوە (ند)** rütandinewe [1]
ڕووتاننەوە، شتی زۆر (لێ ساندن، لێ ستاندن).

**رووتاندنەوە** (کتپ)² rütandinewe

رووتاندنەوە، لێ کردنەوە(گەڵا.. لەدارو درەخت).

**رووتاندنەوە** (کتپ)³ rütandinewe

دەسکەنەکردن (مووی لەش).

**رووتاندنەوە{پەڕ}** (کتپ)⁴ rütandinewe(per)

ناوەرووت کردن.

**رووتانەوە{قژ،گەڵا..}** (کتپ)⁵

rütanewe (qij, gela)

رووتیانەوە، رووچکان، بێ پەڕو پۆمانەوە، پەڕو پۆ یان گەڵا لێ بوونەوە، گەڵا یان موو لێ(هەڵوەران، هەڵوەریین).

**رووتانەوە{سەر}** (کتن)⁶ rütanewe(ser)

موو بەتەپلی سەرەوە(نەمان ، کەوتنەخوار).

**رووتانەوە** (کتن)⁷ rütanewe

ڕووانەوە.

**رووتاوە** (ئان) rütawe

(گەڵا، موو، پەڕ)لێ هەڵوەریو، لەپەڕوپۆ (کراو، بوو)، پەڕ و پۆ پێوەنەماو.

**رووتایی** (ن) rütaî

رووتەن (ناوچە).

**رووت بوون** (کتن)¹ rütbün

رووت بوونەوە، جل وبەرگ پێوەنەمان، بێ جل بوون، جل لەبەردانەمان.

**رووت بوون{مەل}** (کتن)² rütbün(mel)

بێ پەڕبوون، پەڕ پێوەنەمان.

**رووت بوون** (کتن)³ rütbün

موو پێوەنەبوون، بێ موو بوون(پێست).

**رووت بوون** (کتن)⁴ rütbün

هەژار بوون، فەقیربوون.

**رووت بوونەوە**(کتن) rütbünewe

ب (رووت بوون).

**رووت کردن** (کتپ)¹ rüt kirdin

رووت کردنەوە.

**رووت کردن{درەخت لەگەڵا}** (کتپ)²

rüt kirdin(dirext le gela)

گەڵاپێوە نەهێشتن، بێ گەڵاکردن.

**رووت کردن{چەک}** (کتپ)³ rüt kirdin(çek)

چەک هەڵوەشاندن (بۆ پاک کردنەوەی پارچەکانی).

**رووت کردنەوە** (کتپ)¹ rüt kirdinewe

پۆشاک یان جل وبەرگ (لێ کردنەوە، لێ دارنیین، لێ داماڵیین، لەبەرداکەندن)، رووتاندن، رووت کرن، رووتەو کردن، رووتەوەکردن، ڕوەت کرن.

**رووت کردنەوە** (ئد)² rüt kirdinewe

ڕێ پێ گرتن(بەچەک..)و پارەو پووڵ لێ سەندن. تاراج کردن.

**رووت وقووت** (ئان) rüt w qüt

رەش ورووت.

**رووتە** (ئان)¹ rüte

رووتەڵ، رووتەڵە.

**رووتە** (ئان)² rüte

لات، بێ پارە وپووڵ، کەسێ کەهیچ(سامانێک) شک نەبا.

**رووتە** (ئان)³ rüte

بوودەڵە، بێنموود، پووتەکە.

**رووتەخت** (ئان) rütexit

ڕوو هەڵماڵراو، بێشەرم.

**رووتەڵە** (ئان)¹ rütele

رووتە.

**رووتەڵە** (ئان)² rütele

ئاژەڵی تووک لێ هەڵوەریو.

. **رووتەڵە** (ئان)³ rütele

داروبرەختی کزوکەم گەڵا.

**رووتەن** (ن) rüten

رووتەنیی، رووبال، رووتیان، رووێتانە، زەویی بێ گژوگیا و درەخت لێ نەرواو.

**رووتەنک** (ئان)¹ rütenik

پڕحەیاو حورمەت، بەشەرم.

**رووتەنک** (ئان)² rütenik

شەفاف، هەرشتێ وەک شووشە ئەودیوی لێ دیاربێ.

**رووتیی** (ن)¹ rütî

بێ(بەرگیی، پۆشاکیی، کاڵاوبەرگ).

**رووتیی** (ن)² rütî

رووتەڵیی، نەداریی، هەژاریی.

**رووتێ کردن{ئاخاوتن}** (کتپ)¹

rütê kirdin(axawtin)

روو(لێ کردن، کردن)، قسەلەگەڵ کەسێکدا کردن، رووی قسەتێ کردن.

**رووتێ کردن** (کتن)² rütê kirdin

بەرەو جێ یان کەسێ ڕۆیشتن.

**رووتێ کردن** (ئد)³ rütê kirdin

تووش هاتن(خۆشیی یان ناخۆشیی).

ڕووتێ کردن (کتپ) r̲ütê kirdin [1]
تەماشاکردن، تێ ڕوانیین.
ڕووتێ کردن (کتپ) r̲ütê kirdin [2]
چاودێریی کردن.
ڕووخ (ن.م) r̲üx
١- پیشەخۆرە. ٢- ناوی مەلیکی ئێجگار گەورەی ئەفسانەیییە.
ڕووخار (ئان) r̲üxar [1]
شەرمەزار.
ڕووخار (خ) r̲üxar [2]
مل (کەچ، خوار).
ڕووخان (کتن) r̲üxan
ڕووخیان، هەرەس هێنان، تەپیین، خاپووربوون، پەشلیین.
ڕووخاندن (کتپ) r̲üxandin
ڕماندن، ڕووخانن، تەپاندن، تێکدان، خاپوورکردن، خراپ کردن، کاول کردن، ویران کردن.
ڕووخانە (ن) r̲üxane [1]
ڕووبار.
ڕووخانە (ن) r̲üxane [2]
چوخور.
ڕووخانە (ن) r̲üxane [3]
بەست، بەستێ، زەویی کەنار ڕووبار.
ڕووخاو (ئان) r̲üxaw
ڕماو، ڕمیاو، ڕووخیاگ، هەرەس هێناو، تەپیو.
ڕووخۆش (ئان) r̲üxoš
ڕوو(کراوە، گەن، لکەن)، دەم بە(پێکەنین، پێخەنین)، خۆشڕوو، ناوچەوان ڕوون، زمان شیرین، ئاگرخۆش، بزەکار، میرەوان.
ڕووخۆشیی (ن) r̲üxošî
زمان شیرینیی، خۆشڕوویی، میرەوانیی، ناوچەوان ڕوونیی.
ڕووخەک (ئان) r̲üxek [1]
ڕووخە، نزیک بەڕووخان(خانووبەرە).
ڕووخەک (ئان) r̲üxek [2]
ڕێچوو، ڕێچووک، داڕووخاو.
ڕووخێنراو (ئان) r̲üxênraw
ڕووخاو، تەخت(بوو، کراو).
ڕوودار (ئان) r̲üdar [1]
بەڕێز، بەقەدرو حورمەت.
ڕوودار (ئان) r̲üdar [2]
بوێر، نەترس، بێ ترس.

ڕووداماڵراو (ئان) r̲üdamal̲raw
ڕوو(داماڵاو، داماڵیاگ، سەخت، داماڵیاو، هەڵماڵراو، هەڵماڵدراو، قایم)، پڕڕوو، چاوکراوە، ڕیلاس، ئاوەسوو، بێ شەرم.
ڕوودان (کتن) r̲üdan [1]
بەسەرهاتن، بەرپابوون، پەیدابوون، قۆمان، قەومان، هاتنەکایەوە.
ڕوودان (کتپ) r̲üdan [2]
لاواندنەوە، خۆش ویستن.
ڕووداو (ن) r̲üdaw
ڕوودای، بەسەرهات، قۆمیاو، قەوماو، دیرۆک.
ڕوودەربایس (ئان) r̲üderbays
ڕووگیر، ڕوودەربایست، کەم ڕوو، بەشەرم وشکۆ.
ڕوودەربایستیی (ن) r̲üderbaystî
ڕووگیریی، کەم ڕوویی، شەرم وشکۆ.
ڕووڕاست (ن) r̲ür̲ast
ئاخاوتنی(بێ پەناو پەسێو، ڕاست ودروست).
ڕووڕەش (ئان) r̲ür̲eš [1]
ڕووزەرد، تاوانبار، گوناهبار، فەدیکار.
ڕووڕەش (ئان) r̲ür̲eš [2]
بەدخوو، پیاوخراپ، ناپاک.
ڕووڕەش (ئان) r̲ür̲eš [3]
تەریق، شەرمەزار، خەجاڵەت، فهیتکار.
ڕووڕەشیی (ن) r̲ür̲ešî [1]
تاوانباریی، گوناهباریی، گوناهکاریی.
ڕووڕەشیی (ن) r̲ür̲ešî [2]
تەریقیی، خەجاڵەتیی، شەرمەزاریی.
ڕووزە (ئان) r̲üze [1]
ڕووزەڵە، تیکێ شکاوو ژەنگ خواردوو، کەچ وکرووچ و ژەنگاویی.
ڕووزە (ئان) r̲üze [2]
ڕووش، ڕووشە، ئاولاویی، کونج، دەموچاو ئاولاویی.
ڕووزەرد (ئان) r̲üzerd [1]
ب(ڕوو ڕەش).
ڕووزەرد (ئان) r̲üzerd [2]
ڕەنگ هەڵبزرکاو.
ڕووزەرد (ئان) r̲üzerd [3]
پێست سپیی ئامال زەرد، جوانی سەوزەڕەنگ، زەرد ئەسمەر.
ڕووس (ئان) r̲üs
تیژ(لەچێژەدا) - [وەک بەهارات]

**ڕووسارد** ( ئان ) ṟüsard
ڕوو( بەخەڵکە نەدەر، پەڕنەدەر)، ساردەلاو، سارد وسڕ ( مرۆڤ لەگەڵ کەسێکدا).

**ڕووساردیی** ( ن ) ṟüsardî
ساردوسڕیی، ساردەلاویی.

**ڕووسپی** ( ئان ) ١ ṟüsipî
بەئابڕوو، سەربەرز، کردار جوان.

**ڕووسپی** ( ئان ) ٢ ṟüsipî
ئەرکی خۆ بەجێ هاوردوو.

**ڕووسپی کردنەوە** ( ئد ) ١ ṟüsipî kirdinewe
ئەرکی خۆ بەجێ هێنان، کاری باش وپڕ هونەر کردن.

**ڕووسپی کردنەوە** ( ئد ) ٢ ṟüsipî kirdinewe
ئابڕوو کڕینەوە.

**ڕووسپی یەتیی** ( ن ) ṟüsipî petî
ڕووسپیتیی.

**ڕووسوور** ( ئان ) ṟüsür
ڕووسپی، سەربەرز وبەئابڕوو.

**ڕووسووریی** ( ن ) ṟüsürî
ئابڕومەندیی، بێڕەنگیی، ڕووسپیتیی، سەربەرزیی.

**ڕووسەخت** ( ئان ) ṟüsext
دڕ، توند ڕەفتار.

**ڕووسەریی** ( ن ) ṟüserî
دەسماڵی سەر، سەرپۆشی ژنانە.

**ڕووسیا** ( ئان ) ١ ṟüsiya
خەجاڵەت، شەرمەزار.

**ڕووسیا** ( ئان ) ٢ ṟüsiya
ئابڕووتکاو، ناوزڕاو.

**ڕووش** ( ن ) ١ ṟüš
ڕووشاڵ، ڕووکە، ڕووکە، ڕووشە، ڕوویس، ڕوویش، بریندار بوونی توێکی سەرەوەی پێست.

**ڕووش** ( ئان ) ٢ ṟüš
ڕووشن، شەڕانیی، نەگونجاو، بەدفەڕی شەڕئەنگێز.

**ڕووش** ( ئان ) ٣ ṟüš
درشت، زبر.

**ڕووشان** ( کتن ) ṟüšan
ڕووکان، ڕووشاڵ بوون، ڕووکیان، ڕووش هەڵدان، ڕووشیان، ڕووشیین، ڕووکەداربوون، بەکەمیی پێست بریندار بوون، توێکی ڕووشیین، ڕووکەداربوون، بەکەمیی پێست ڕووشان.

**ڕووشاندن** ( کتپ ) ṟüšandin
ڕووکاندن، ڕووکانن، ڕوێشاندن، توێکی پێست بریندار کردن.

**ڕووشاو** ( ئان ) ṟüšaw
ڕووکاو، ڕووش هەڵداو، ڕوێشاوی، هەڵ ڕووشاو، پڕ ڕووش،
توێخ هەڵداو، توێکی سەرەوەی پێست بریندار کراو.

**ڕووشاویی** ( ن ) ṟüšawî
ڕووکاویی، ڕووشاڵیی.

**ڕووشکان** ( کتن ) ṟüšikan
تەریق بوونەوە، خەجاڵەت بوون.

**ڕووشکاندن** ( کتپ ) ṟüšikandin
ڕووشکانن، تەریق کردنەوە، خەجاڵەت کردن، دەست بەڕووەوەنان، داخوازیی کەسێ بەجێ نەهێنان.

**ڕووشکێن** ( ئان ) ṟüškên
تەریق(کەرەوە، کەر)، ڕەفتار یان قسە ڕەق.

**ڕووشە** ( ن ) ṟüše
١- بەلا، بەسەرهاتی خراپ، بۆبلات، تەڵەزگە. ٢- چورتم، دژواریی، ناڕەحەتیی.

**ڕووشیرین** ( ئان ) ṟüšîrîn
ڕووخۆش.

**ڕووشێن** ( ئان ) ṟüšên
ڕووشێنەر، ڕووکێنەر.

**ڕووڤک** ( ن.کی ) ṟüvik(ki)
تووکەبەر، مووی(بەر، بەرگەدە، ڕووڤ، ڕیڤ، ڕیو، ڕوەم، ڕووی، ڕۆڤک).

**ڕووقورس** ( ئان ) ṟüqurs
نەیار( لەڕەفتاردا).

**ڕووکار** ( ئان ) ١ ṟükar
دیار، لەبەرچاو.

**ڕووکار** ( ن ) ٢ ṟükar
دەمکار، لای بەرامبەر.

**ڕووکار** ( ن ) ٣ ṟükar
توێکی سەرەوە، دیوی دەرەوە.

**ڕووکار** ( ن ) ٤ ṟükar
کاری ئەنجام دراوی دیار.

**ڕووکرانەوە** ( کتن ) ṟükiranewe
شەرم(شکان، لەلاچوون، لانەمان)، لەشەرمنی ڕزگاربوون.

**ڕووکراوە** ( ئان ) ṟükirawe
ڕووقاییم، ئالوولە، شەرم نەکەر(لەخەڵکە بۆ ئاخاوتن یەوو بەڕوو بوون).

**ڕووکراوەیی** ( ن ) ṟükiraweyî
ڕووشەلیی، ڕووقایمیی، بەڕوویی.

**رووکردن** (کتن) ١ rükirrdin

بەرەوشوێنێ چوون.

**رووکردن** (کتن) ٢ rükirdin

ڕوو کرن، شەرم کردن.

**رووکردن** (کتپ) ٣ rükirdin

پیشاندان، نیشان دان، دەرخستن.

**رووکەش{بە زێر یان زیو}** (ن) ١ rükeš(be zêr yan be zîw)

ڕووکیش، ئالدوون، ڕووکەشیی، چیمکۆ.

**رووکەش** (ن) ٢ rükeš

تەڵەکە.

**رووکەش کردن{بە زێر}** (کتپ) rükeš kirdin (be zêr)

ڕووکیش کردن، دیوی دەرەوەیشتێ داپۆشیین..

**رووگر** (ئان) rügir

شەرمن.

**رووگرتن** (کتن) ١ rügirtin

شەرم کردن، لەڕوودا دامان.

**رووگرتن{شیر}** (کتن) ٢ rügirtin(šir)

توندبوون.

**رووگرتیی{شیر}** (ن.کی) rügirtî(šîr){ki}

تویژگرتوو، تویژاڵ گرتوو،

بەندهاتوو.

**رووگرژ** (ئان) ١ rügirj

ڕوومیشک، توورەو(ترۆ، ترنۆ)، قەلس.

**رووگرژ** (ئان) ٢ rügirj

ڕوو(پەڕ، ترش)، بەلووت وپووت.

**رووگرژ کردن** (کتن) rügirj kirdin

خۆ(گرژکردن، مۆن کردن)، ڕوو(تاڵ کردن، ترش کردن)، ناوچەوان(بەیەکدادان، گرژکردن).

**رووگرژیی** (ن) rügirjî

توورەو ترۆیی، توورەو ترنۆیی، قەلسیی.

**رووگە** (ن) rüge

ڕووگا، قوبلە، قیبلە.

**رووگەش** (ئان) rügeš

ڕەنگ سوور، ڕوومەت سوور.

**رووگیربوون** (کتن) rügîrbün

تەریق بوونەوە، خەجاڵەت کیشان، لەڕوودا دامان.

**رووگیریی** (ن) rügîrî

تەریقیی، خەجاڵەتیی.

**رووڵک** (ن.رو) ١ rülik

ژاڵە.

**رووڵک** (ن.جچ) ٢ rülik

سیسرک (ئەو چەشنەی کەشەوان جرەجردەکا).

**رووڵێ نان** (ئد) rü lênan

تکالێ کردن(بۆ یارمەتیی..).

**روو لێ وەرگێران** (ئد) rü lê wergêran

پشت تێکردن، بەرلێ کردن، بێزاریی لەکەسێ دەربڕیین، لێ هەڵگەڕانەوە وبوون بە ناحەزی کەسێ.

**روومەت** (ن) ١ rümet

کولم، کولمە، گۆنە، گۆنا.

**روومەت** (خ) ٢ rümet

ڕێز، حورمەت.

**روومەت گرتن** (کتپ) rümet girtin

ڕێزلێنان، قەدرگرتن.

**روون** (ئان) ١ rün

بێ لیلایی بەڕەنگی ئاوی پاک.

**روون** (ئان) ٢ rün

ئاشکرا، دیار، ئاشیزە.

**روون{شیر}** (ئان) ٣ rün(šîr)

بێتام، شیناو، چەوریی لی دەرهێنراو.

**روون** (ئان) ٤ rün

شل، تراو.

**روون** (ئان) ٥ rün

بەکەیف، دڵخۆش.

**روناک** (ئان) rünak

ڕوون، ڕۆشن، ڕۆشنا، ڕەوشەن.

**رووناکایی** (ن) rünakayî

ڕۆشنایی(شوێن).

**رووناکایی** (ن) rünakayî

ب (ڕووناکیی).

**رووناک بوونەوە** (کتن) rünak bünewe

ڕۆشن بوونەوە، ڕوون بوونەوە.

**رووناک کردنەوە** (کتپ) rünak kirdinewe

ڕووناک وەکردن، ڕۆناندن، ڕۆشن کردنەوە، ڕۆشنایی(دان بەتاریکیی، پێدان).

**رووناکیی** (ن) rünakî

ڕووناکایی، ڕۆنکایی، ڕۆشنایی، ڕۆشناکیی، ڕوونامیی، ڕۆنامیی، ڕۆشنیی، ڕەنگ، ڕۆژنامیی، ڕۆژنایی.

**روونان** (کتن) rünan

دانیشتن، نیشتن.

**ڕووناندن (کتپ)** r̲ünandin
دڵنیاکردن، بێخەم کردن، خاتر جەم کردن....
**ڕوون بوونەوە (لەوی لێل) (کتن)**[1] r̲ün bünewe(awî lêl̲)
ڕۆشن بوونەوە، ساف بوون.
**ڕوون بوونەوە (کتن)**[2] r̲ün bünewe
ڕووناکە بوونەوە، ئاشکرابوون، دەرکەوتن، هاتنەپێش (ڕاستیی ڕووداو، نهێنیی کار)، دیاردان، دیارییدان.
**ڕوون بوونەوە (ند)**[3] r̲ün bünewe
گەش بوونەوە، دڵ کرانەوە.
**ڕوون کردنەوە (کتپ)** r̲ün kirdinewe
ئاشکراکردن، هێنانەپێش،ڕۆشن کردنەوە، ڕاستیی ڕووداو یان مەبەستیکی نەزانراو دەرخستن.
**ڕوون کەرەوە (ن)** r̲ün kerewe
ڕوون وەکەر(کەسێ).
**ڕوونووس (ن)** r̲ünüs
لەبەرنوسراو، وێنەی دەسنووس.
**ڕوونووس کردن (کتپ)** r̲ünüskirdin
وێنەلەسەرنووسینەوە، وێنەی شتێ نوسراوگرتن یان لەبەرگرتنەوە.
**ڕوونە (ن)** r̲üne
دەمی باریکی تیغ.
**ڕوونەک (ن)** r̲ünek
قنگێ، جێگەی لەسەر دانیشتن لەئەندامی لەشدا.
**ڕوونە هاتن (کتن)** r̲ünehatin
ناخاترجەم بوون.
**ڕوونیی (ن)** r̲ünî
ب (ئاشکرایی).
**ڕوو وەرگێران(لەکەسێ) (ند)**
r̲ü wergêr̲an(le kesê)
ڕوو (کردنە ئەولا، هەڵ چەرخاندن، لێلادان)، پشت(تێ کردن، هەڵکردن)، نارەزایی پیشان دان(بەرامبەر کەسێ).
**ڕووه (ن)** r̲üh
بەر، پانایی(کاڵا..).
**ڕووهاتن (کتن)** r̲ühatin
لە ڕووهاتن، شەرم نەکردن(لە ئاخاوتن وکاردا)، خەجاڵەت نەبوون(لەووتن یان لەکردن).
**ڕووهستێن (ن)** r̲ühstên
ڕۆحستێن، گیان ستێن، عیزرائیل.
**ڕووەک (ن)** r̲uwek
گژوگیا، دارودرەخت، هەرچی لەسەر ڕووی زەوی شین دەبێ.
**ڕووهەڵماڵراو (ئان)** r̲ühel̲mal̲raw
ب (بێ ئابروو /٢).
**ڕووهەڵماڵراویی (ن)** r̲ühel̲mal̲rawî
چەتاوەڕوویی، ڕووکراوەیی..
**ڕووی ڕۆژ بە بێژنگ ناگیرێ (پن)**
r̲üy roj be bêjing na gîrê
مەبەست هەوڵ دانی کەسێکە بۆ شاردنەوەی ڕاستیی و دروستیی. شتی ڕوون وئاشکرا ناشاررێتەوە.
**ڕوویێز (ن)** r̲üwêz
دوودڵیی، گومان.
**ڕووێڵ (ئان)** r̲uwêl̲
دەشتەکیی، کێویی..
**ڕۆ (ن)**[1] r̲o
کات، وەخت، هەل.
**ڕۆ (ن)**[2] r̲o
شیوەن، گریان، وەی، داخ وحەیف(بۆ مردوو..).
**ڕۆ (ن)**[3] r̲o
پارچە ئاوێک کە سێ لای وشکایی بێت.
**ڕۆ (ئاک)**[4] r̲o
بەرەوخوارەوە، بۆ خوارەوە.
**ڕۆب (ن)** r̲ob
سووکەلە پالتۆی ناوماڵ، بالاپۆشی قۆڵدار بەسەرجلی ناو ماڵەوە لەبەردەکرێ.
**ڕۆپڵ (ن)** r̲opil̲
بەرت، پەڕ.
**ڕۆپڵاندن (کتپ)** r̲opl̲andin
پەرتاوتن، پەڕاندن، هەڵ پەرتاوتن(درەخت..).
**ڕۆت (ن)** r̲ot
داردەست(درێژ)، چەلاکی دەستیی.
**ڕۆچوون (کتن)**[1] r̲oçün
ڕاچوون(بەناو ئاو یان زەوی…)، داچوون، چوونەخوار.
**ڕۆچوون (کتن)**[2] r̲oçün
داڕووخان، تێک ڕووخان.
**ڕۆح (ن)** r̲oh̲
ڕح، ڕەح، جان، مەناسەی ژیان، گیانی(گیاندار، گیانەوەر، زیندەوەر، جانەوەر).
**ڕۆح زل (ئان)** r̲oh̲zil
بە(فیز، دەعیە)، ترزل، خۆبین، لووت بەرز، لەخۆبایی.

**ڕۆح سووک** (ئان) rohsük

میهرەبان(کەسێ).

**ڕۆح لەبەر** (ئان) rohleber

ڕۆح دەبەر، زیندەوەر، ڕۆحدار، گیان لەبەر، گیانەوەر،گیاندار، خاوەن ژین.

**ڕۆحی خۆ خستنە بەردەست** (ئد)

rohî xo xistine ber dest

ڕووبەڕووی ژیانی خەتەرناک بوون خۆخستنە تالووکە، ژیانی خۆخستنەمەترسییەوە.

**ڕۆخ{ڕووبار}** (ن)[1] rox(rübar)

گۆی ڕوبار.

**ڕۆخ** (ن)[2] rox

بەر، دەم، ڕەفی.

**ڕۆخار** (ئان) roxar

شەرمەزار.

**ڕۆخانە** (ن) roxane

چەم، چەمێ، چەمێ ئاوپێیدا دەڕوا یان پێیدا ڕۆیشتبێ.

**ڕۆدی** (نک) rodî

ب (ڕیخۆلە).

**ڕۆ ڕۆ کردن** (کتن) ro ro kirdin

شین وشەپۆڕکردن، هاوارو گریەکردن.

**ڕۆز** (ن) roz

دۆز، کۆک، پێکەوە نووساندنی پارچەی براو بە شێوەیەکی کاتیی.

**ڕۆزکردن** (کتپ) rozkirdin

١- دۆزکردن، کۆک کردن، لەیەک دان وتەقەڵ تێهەڵدان (پارچەی کالا دوای ئەوەش دروونی). ٢- جل وبەرگێ(دروست کردن، دروون).

**ڕۆزی** (نک) rozî

ڕزق، ڕسق، بژێویی، ئازووقە.

**ڕۆژ** (ن)[1] roj

ڕۆژی ئاسمان، ڕۆ، ڕۆج، ڕۆچ.

**ڕۆژ** (ن)[2] roj

خۆر، تاو، هەتاو.

**ڕۆژ** (ن)[3] roj

بروار، بەروار، مێژوو.

**ڕۆژ** (ن)[4] roj

کاتی ڕووناک بوونەوە وبەرزبوونەوەی خۆر لەئاسۆدا تا خۆر ئاوابوون.

**ڕۆژا پاشین** (ن) roja pašîn

ب (ڕۆژی قیامەت).

**ڕۆژان** (نک) rojan

ڕۆژانی(ڕابردوو، ڕابوردوو).

**ڕۆژانە** (ئاک)[1] rojane

هەموو ڕۆژێ.

**ڕۆژانە** (ن)[2] rojane

ڕۆژ(بر، مز، مووچە، مژ)، ڕۆژینە، هیشکەمز، کرێی ڕۆژ بەڕۆژ، جیرە، مووچەی ڕۆژ بەڕۆژ.

**ڕۆژانە** (ئان)[3] rojane

بەڕۆژ، هەموو ڕۆژێ، لەکاتی ڕۆژدا.

**ڕۆژانی پاش** (ن) rojanî paš

ئاییندە، دواڕۆژ.

**ڕۆژاوا** (ن)[1] rojawa

ڕۆژاڤا، خۆرنشین، ڕۆژنشین، لای ڕۆژئاوا، خۆراوا، ڕووئاوا، شوێنێکە بەدیمەن کەوتبێتەلای ئاوابوونی ڕۆژەوە.

**ڕۆژاوا** (ن)[2] rojawa

زەردەپەڕ، ئێوارە، کاتی ئاوابوونی ڕۆژ.

**ڕۆژاوابوون** (کتن) rojawabün

ب (خۆراوا بوون).

**ڕۆژاوایی** (نک) rojawayî

ڕۆژاڤایی، خەڵکی ولاتی خۆرنشین، ئەوکەسانەی کەلە جێگا خۆرنشینەکانی سەرزەمین دادەنیشن.

**ڕۆژباش!** (ئسب) roj baš!

ڕۆژێکی شاد!.

**ڕۆژبردن** (کتن) roj birdin

ڕۆژەنگازبوون، ڕۆژگازبوون، هەتاو (بردن، ئەنگازبوون)، هەتاوانگازبوون، تاوبردن، تاوانگازبوون.

**ڕۆژ بوونەوە** (کتن) roj bünewe

شەونەمان، ڕۆژهاتن، بەرەبەیان هاتن، بوونەسەرەتای بەیان.

**ڕۆژ بە پە نجە ژماردن** (ئد)

roj be pence jimardin

ماوەیەکی زۆرچاوەڕوانی شتێ کردن، بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی شتێ کردن.

**ڕۆژ بەرەلابوون** (کتن) roj berelabün

ڕۆژدەرکەوتن (دوای گیران).

**ڕۆژ بەسەربردن** (ئد)[1] roj beserbirdin

ڕۆژگار ڕابواردن، ڕۆژقەتاندن، کات بردنەسەر (بەخۆشیی..).

**ڕۆژ بەسەربردن** (ئد)[2] roj beserbirdin

دان بەخۆدا گرتن، گوزەران کردن.

**رۆژ پەڕ** (ن) roj per
ئێوارە، ترەنگ، دەمی رۆژاوا.

**رۆژ پەرست** ١ (ن) roj perist
خۆرپەرست، مەگۆس.

**رۆژپەرست** ٢ (ن.نا) rojperist
خەمەگرۆ، خەمخۆرکە.

**رۆژ رەش** ١ (ئان) roj reš
بەدبەخت، چارەرەش.

**رۆژ رەش** ٢ (ئان) roj reš
دڵ(رەنجاو، شکاو).

**رۆژ رەشیی** (ن) roj reşî
بەدبەختیی، چارەرەشیی.

**رۆژ کوێر** (ئان) roj kwêr
هەتاوکوێر. دژو: شەوکوێر.

**رۆژ ژمێر** (ن) roj jimêr
رۆژ ئەژمێر، سال پێو، سالنامە، تەقویم، رۆژمێر، رۆژنامە نوسراوێکە رۆژومانگ وسال پیشان ئەدا.

**رۆژکردنەوە** (کتن) roj kirdinewe
شەو بەسەربردن، شەونەنوستن، دانیشتن لەشەودا تا بەیانیی.

**رۆژگار** ١ (ن) rojgar
رۆژگار، رۆجیار، رۆچیار، ئەو کات ودەمەی دێت و دەڕوا.

**رۆژگار** ٢ (ن) rojgar
رۆژتائێوارە، رۆژان، بەرۆژتاشەو، درێژایی رۆژ لەبەیانی یەوە تا ئێوارە.

**رۆژگاز** (ئان) rojgaz
رۆژەنگاز، رۆژگەز، رۆژگەستیی، تاوانگاز، تاوەنگاز، هەتاوانگاز، هەتاوەنگاز.

**رۆژگیران** (کتن) rojgîran
ڕووناکیی رۆژنەمان: دەمێ کەمانگ دەکەوێتە نێوان ئەرز ورۆژ.

**رۆژلێ بوونەوە** (ند) roj lêbûnewe
شەولێ بەسەرچوون، کەوتنە ناسوودەیی و لەچوورتم رزگاربوون.

**رۆژنامە** (ن) rojname
رۆزنامە، رۆژنامچە، نوسراوێکی چاپکراوە رۆژ بەرۆژ دەردەچێ بۆ بلاوکردنەوەی دەنگ وباس.

**رۆژنامە چێتیی** (ن) rojnameçêtî
رۆژنامەگەریی، کاروباری دەرکردنی رۆژنامە.

**رۆژنامەچی** (ن) rojnameçî
رۆژنامەنووس، رۆژنامەگەر، کارمەندی رۆژنامە،
کەسێ کار لەرۆژنامەدا دەکا رۆژنامەدەرکەر.

**رۆژنە** (ن) rojne
رۆژن، رۆژەن، رۆژەنە، کلاورۆژنە، کوناڕۆچن، رۆچن.

**رۆژوو** (ن) rojû
رۆژیی، رۆژگ، رۆچە، نەخواردن ونەخواردنەوە و... ، یەکێکە لە ئەو
پێنج فەرمانە سەرەکیانەی پێویستە موسلمان پێی هەستێ.

**رۆژووان** (ن) rojûwan
رۆژووگر، بەرۆژوو، رۆچەوان، مرۆڤی بەرۆژوو.

**رۆژووخواردن** (کتپ) rojû xwardin
رۆژوو نەگرتن، بەرۆژوو نەبوون، رۆژووشکاندن.

**رۆژووکردنەوە** (کتپ) rojû kirdinewe
بەربانگ کردنەوە، شت خواردن دوای تەواوبوونی کاتی رۆژوو.

**رۆژووگرتن** (کتپ) rojû girtin
بەرۆژووبوون، وەرۆژگ بوون.

**رۆژەلات** (ن) rojelat
١- رۆژهەلات، رۆهەلات، خاوەر، خۆرهەلات.
٢- شوێنێکە بەدیمەن کەوتبێتە لای هەلاتنی رۆژەوە.

**رۆژەلات** (ن) rojelat
رۆژهەلات، رۆهەلات، دەمی هەلاتنی رۆژ، کاتی خۆر هەلات.

**رۆژهەلات** (ن) rojhelat
کاتی رۆژبوونەوە یان رۆژهەلاتن.

**رۆژهەلاتن** (کتن) rojhelatin
رۆژ(دەرکەوتن، هەلاتن)، تاڤ دان، رۆکەوتن، خۆرکەوتن، هەتاو(کەوتن، دەرکەوتن).

**رۆژەنارۆژێ** (ناک) roje na rojê
رۆژنارۆژ، رۆژێ نەرۆژێ، رۆنەرۆ،رۆژێک کردن ورۆژێ ویستان.

**رۆژیدەر** (ن) rojîder
خوداوەند.

**رۆژی قیامەت** (ن) rojî qiyamet
رۆژی (هەستانەوە، پەسلان، حەشر، پساتێ)، رۆژا پەسلانێ.

**رۆژینگ** (ن) rojîng
دووکەلکێش، لوولەی سۆپا.

**رۆژی** (ن) rojî
رۆزیی، رزق، رسق، پێ بژیو.

**ڕۆشن بوونەوە {ئاگر} (کتن)** rošinbünewe(agir)
گەشانەوە، داگیرسان.

**ڕۆشنبیر (ئان)** ١ rošinbîr
زانا بەداب ودەستووری زمان.

**ڕۆشنبیر (ئان)** ٢ rošinbîr
تێگەیشتوو، خوێندەواری تێگەیشتووی پلەبەرز(لەبارەی ویژەو زانستەوە).

**ڕۆشن کردن {ئاگر، چرا} (کتپ)** ١ rošin kirdin (agir, çira)
داگیرساندن، هەلکردن.

**ڕۆشن کردن (کتپ)** ٢ rošin kirdin
شتی نەزانراو( دیارکردن، ئاشکراکردن).

**ڕۆشن کردنەوە {شتی نەزانراو} (کتپ)** ١ rošin kirdinewe (šitî nezanraw)
شیی کردنەوە، ڕووت کردنەوە، ساغ کردنەوە.

**ڕۆشن کردنەوە {ئاگر} (کتپ)** ٢ rošin kirdinewe(aigr)
گەشاندنەوە، هەلکردنەوە.

**ڕۆڤە (ن،کی)** rove(ki)
بادەوە، کرێوە، باسریشک.

**ڕۆق (ن)** roq
شۆربا، شۆربە، چیشتی( شلە، تراو).

**ڕۆکران (کتن،کتپ)** rokiran
بەرەوژێر( ڕژان، ڕژاندن).

**ڕۆکراو (ئان)** rokiraw
داکراو، دارژاو، هەل ڕێژراو( شتی وردە یان تراو).

**ڕۆکردن (کتپ)** rokirdin
تێکردن، داکردن، ڕێتن، کردنەناو( شتی خواردنەوە لە دەفرێکەوە..).

**ڕۆکەوتن (کتن)** ro kewtin
پال کەوتن، پشوودان، ئیسراحەت کردن( بەراکشاویی).

**ڕۆلە (ن)** role
منال، مندال، پس، زار، زارۆ، زارووڕ، وەچە.

**ڕۆلە مردوو (ئان)** role mirdü
جەرگ( براو، سووتاو).

**ڕۆمەلەخەزا (ن)** romelxeza
ڕۆمەلخەزا، هۆمەلغەزا، زەنا زەنا و ئاژاەو پشێویی.

**ڕۆمیی (ن)** ١ romî
خواجانشین، خواجانە، سەکۆی بەردەرگا.

**ڕۆمیی (ئان،ن)** ٢ romî
ترکیی، تورکیی، خەلکی ولاتی (ترکان، تورکان، تورکیا).

**ڕۆن (ن)** ١ ron
ڕوان، ڕۆغان، ڕوون، ڕوهن، ڕوون، تام، چەوریی.

**ڕۆن (ن)** ٢ ron
پیو.

**ڕۆن (ن)** ٣ ron
چەوریی( بۆ پێست هەنوون).

**ڕۆن (ن)** ٤ ron
چەورستان.

**ڕۆنان (کتپ،کی)** ronan(ki)
دانان، دانیان، نیان.

**ڕۆناو (ن)** ronaw
ڕووناو، دۆناڤ، تاماو، چەوریی لەگەل ئاودا تێکەل (بوو، کراو)، ڕۆنی زۆری لەگەل ئاوی کەم تێکەلاو.

**ڕۆناویی (ئان)** ronawî
چەور، ڕۆن تێ هەلسووراو.

**ڕۆناویی بوون (کتن)** ronawî bün
چەوربوون.

**ڕۆن تێ کردن (کتپ)** ron tê kirdin
ڕۆن کردنەناو، ڕوون کرن.

**ڕۆندار (ئان)** rondar
تیشکدەر.

**ڕۆنکاچاڤ (ن،کی)** ronkaçav(ki)
ڕووناکیی چاو، بینایی، سۆمایی(سۆی)چاو، ڕۆنیا چاڤ.

**ڕۆن کردن (کتپ)** ron kirdin
١- چەورکردن، ڕوون کرن.
٢- ڕۆن یان گریس تێ هەلسوون.

**ڕۆن گرتن (کتپ)** rongirtin
چەوراییی لێ دەرهێنان، چەوریی لێ گرتن، هەل چزاندن (پیو، دووگ..).

**ڕۆنەک (ن)** ronek
ڕووناکیدەر، ڕووناکاییدەر.

**ڕۆنەکەرە (ن)** rone kere
ڕۆنی کەرە، نڤیشک، فەریکەڕۆن.

**ڕۆیشتنەوە (کتن)** royštinewe
ڕۆینەوە، گەڕانەوە (بۆ شوێنی بەرێ).

**ڕەب (ن)** reb
بەرەی زین وکورتان.

**ڕەبات (ن)** rebat
ڕەبەت، ڕەوەت، ڕوبات، بۆسە، حەشارگە (ڕاوچیی)، سیبە، کۆلیت.

**ڕەبەق** (ئاك) rebeq
بەتەواویی، بێ(زیادوکەم، کەم وکووڕیی)، ڕەق.

**ڕەبەن** (ئان) [1] reben
بێ ژن، سەڵت.

**ڕەبەن** (ن،کی) [2] reben(ki)
ئەوداڵ، بێ(ئەوا، ماڵ وحاڵ)، گەڕیدەی ماڵ بەکۆڵەوە، هەڵوەدا.

**ڕەبەن** (ئان) [3] reben
پووتەکە، بێ نموود، گەمژ.

**ڕەبەنۆک** (ن،رو) rebenok
گوڵەمیلاقە.

**ڕەبیت** (ئان) rebît
ڕەبت، زووهەڵچوو، لەسەرپێ، هەراش، زووتر پێ گەیشتوو(مرۆڤ یان ڕووەک).

**ڕەپ** (ئان) [1] rep
ئامادە، ڕەق، قیت، نەچەماو، هەستاو، هەڵساو (ئامرازی نێرینە).

**ڕەپ** (ئان) [2] rep
ڕاست، زۆپ.

**ڕەپ** (ئان) [3] rep
پەنەماو، توندبوو.

**ڕەپاڵ{چل وبەرگ}** (ئان) [1] repal(cilw berg)
داڕزاو، شڕۆڵ، کۆن ودڕاو.

**ڕەپاڵ** (ن) [2] repal
دووکەوتوویی، ڕەگەڵ کەوتوویی.

**ڕەپاڵ** (ئان) [3] repal
ئەیاغ، پەک کەوتوو، لەکارکەوتوو.

**ڕەپاڵ دان** (کتپ) repal dan
پێوەخستن، ڕەگەڵ خستن، خستنەپاڵ.

**ڕەپاڵ نان** (کتپ) repalnan
دەرکردن، قاودان، دەرپەڕاندن (کەسێ بەزۆر و بەسووکایەتیی).

**ڕەپاندن** (کتپ) [1] repandin
سوێند پێ خواردن، سوێندخواردن.

**ڕەپاندن** (کتپ) [2] repandin
کوتاندن، کوتان، تەپەڵێ هەستاندن.

**ڕەپ بوون** (کتن) [1] repbûn
ئێرەق بوون، هەستان، هەڵسان.

**ڕەپ بوون** (کتن) [2] repbûn
پڕبوون، چرچیی وقۆرت تێدانەمان، گنج لێ بڕان، پەنمان.

**ڕەپ ڕەپان** (ن) rep repan
تەپەتەپ، تەپتەپان، ڕەپەڕەپ.

**ڕەپ ڕەپە** (ئان) rep repe
بالابەرز، بەژن بلندو ڕاست.

**ڕەپ کردن{ئامرازی نێرینە}** (کتپ)
rep kirdin (amrazî nêrîne)
ئێرەق کردن، بەل کردن، قیت کردنەوە، هەستاندن، هەڵساندن.

**ڕەپن** (ن) repin
ڕوو، ڕووکار(خانوو).

**ڕەپ وڕاست** (ئاك) [1] repw rast
ئاشکراویێ پێچ وپەنا، بەئاشکرا، بێ(ڕووبینیی، وە شارتن، پەردە)، ڕاست و ڕەوان، ڕەپا و ڕەپ، ڕەپ وڕوون..

**ڕەپ وڕاست** (ئاك) [2] repw rast
ڕاستەوخۆ.

**ڕەپوول** (ن) repûl
شەپازلە.

**ڕەپوول لێ دان** (کتپ) repûl lêdan
شەپازلەپێداکێشان، شەقازلە لێدان.

**ڕەپە** (ن) repe
تەپە.

**ڕەپەڵ** (ن) repel
ڕەپەڵگاو، جێ لەوەڕی ئازاد، پووش وپەڵاشی (بێ خاوەن، ئازاد).

**ڕەپێڵگە** (ن) repêlge
ڕەبیلە، ڕەوەن، ڕێگەی بەپێچ و پەنا.

**ڕەت** (ن) [1] ret
نووچ، سەرسم.

**ڕەت** (ن) [2] ret
لارەولاری بەتەکان.

**ڕەت** (ن) [3] ret
قوولکە(لەسەر ڕێگەی نێچیر).

**ڕەت** (ن) [4] ret
هزر وبیر.

**ڕەت** (ئان) [5] ret
دەرچوو، کلا(لەڕێ).

**ڕەت** (ن) [6] ret
بنچینە.

**ڕەت** (ن) [7] ret
ئێسقانی پشتی مل.

**ڕەتان** (کتن) [1] retan

ڕاکردن، ڕەتیان، ڕەتیین، هەڵاتن.

**ڕەتان** (کتن) [2] retan

ماندووبوون، هیلاک بوون.

**ڕەتاندن** (کتپ) [1] retandin

ترساندن، جەفلاندن.

**ڕەتاندن{ولاغ}** (کتپ) [2] retandin(wulax)

غارپێکردن، لنگ دان، هێنان و بردن.

**ڕەتاندن** (کتپ) [3] retandin

ماندووکردن، ڕەتاندن.

**ڕەتاو** (ئان) [1] retaw

ماندوو(بوو، کراو).

**ڕەتاو{ولاغ}** (ئان) [2] retaw(wulax)

ڕەتیاگ، ترۆقیاگ، ئۆز(غاردراو، بەغار ماندووکراو، وەغاردراو).

**ڕەت بردن** (کتن) ret birdin

تەکان(دان، خواردن) لەپڕ.

**ڕەت بوون** (کتن) ret bün

ڕەد(بوون، بیین)، ڕابردن، ڕابوردن، تێپەڕبوون.

**ڕەتدان** (کتن) retdan

ڕەدبردن، ڕەت(بردن، دان)، سەرسم دان، هەڵەنگوتن، نووچ بردن.

**ڕەت کردن** (کتپ) ret kirdin

بەرێ کردن، تێپەڕاندن، لەخۆ دوورخستنەوە.

**ڕەتە پۆس کەنە** (فر،کل) rete pos ken(kl)

ئاخاوتنی ڕاست و بێ توێکڵ.

**ڕەتەوە** (ن) [1] retewe

ڕەسەن نامە، نەژادنامە، شەجەرەی باب وباپیران، تۆرە مەنامە.

**ڕەتەوە** (ن) [2] retewe

بنەچە، ڕیشە، تۆرمە.

**ڕەتیم** (ن) retîm

بیر یان چاڵی پڕوەکراو.

**ڕەتیماندن{بیر یان چاڵ}** (کتپ)

retîmandin(bî yan çal)

پڕ(لەخۆڵ، خۆڵ)کردن، پڕکردنەوە(بەخۆڵ، لەخۆڵ).

**ڕەتێن** (ن) retên

ڕەتێنەر، غارپێدەر، سوار.

**ڕەجاڵ** (ئان) [1] recal

نەدار، هەژار، بێسامان.

**ڕەجاڵ** (ئان) [2] recal

ئاس، ڕووت، ڕەجەن.

**ڕەجاڵیی** (ن) recalî

نەبوونیی، بێنەوایی.

**ڕەجل** (ئان) recil

شیاو.

**ڕەجوان** (ن) recwan

ئەسپی(خۆشڕۆ، خۆشڕەوت، خۆشبەز، ڕەهوان، ڕەوان).

**ڕەجەوە** (ن،کل) [1] recewe(kl)

پەیکەر، تابین(لەبەرد یان کان..).

**ڕەجەوە** (ن،کل) [2] recewe(kl)

چوون، هەڵکەوت.

**ڕەجەوەبرین** (کتن،کل) recewe birîn(kl)

لاوازبوون.

**ڕەچاو** (ن) reçaw

ڕاچاو، ڕەچەسە، ژێر(چاو، چاودێریی)، دەس(دەست) نیشان کردنی کەسێ یان شتێ بۆ کارێ.

**ڕەچاوکردن** (کتپ) reçaw kirdin

ڕاچاوکردن، خستنەژێرچاوەوە، دەست نیشان کردن (شتێ یان کەسێ بۆ کارێ)، بەرچاوخستن.

**ڕەچوو** (ن) reçü

گوێ نەبیسیی، لاساریی.

**ڕەچوکار** (ئان) reçukar

گوێنەبیس، لاسار.

**ڕەچەڵ** (ن) reçel

مرەبای میوە.

**ڕەچەلەک** (ن) [1] reçelek

ڕەچەلاک، بنچینە.

**ڕەچەلەک** (نک) [2] reçelek

ڕەگ وریشە(ڕووەک).

**ڕەچەلەک بڕینەوە** (کتپ) reçelek brînewe

بەرەچەڵەکدا چوونە خوار، دالاویز بڕین.

**ڕەحم** (ن) rehim

بەزەیی، میهرەبانیی.

**ڕەحم بوون** (کتن) rehim bün

پڕبەزەیی بوون، میهرەبان بوون.

**ڕەحم پێ کردن** (کتپ) rehim pê kirdin

پڕ بەزەیی بوون، میهرەبانیی بوون.

ڕەحم کردن بەزۆردار، زوڵمە لەهەژار (رس)
rehim kirdin be, zordar, zulme le hejar

بەزەیی هاتنەوە بە زاڵمدا ناهەقییە لەماف خوراوان.پاراستنی پیاو خراپ ئازاردانی میرخاسە.

ڕەحمەت لەکفن دزی پێشوو (پن)
rehmet le kifin dizî pêşû

کاتێ دەوترێ کە بەهۆی خوێنخوارێکەوە ئاکارێک ڕووی دابێ
خراپتر لە ئاکاری ستەمکاری پێشوو.

ڕەحمەتیی (ئان) rehmetî ¹
خوالێ خۆشبوو.

ڕەحەتیی (ن) rehetî ²
خۆشیی وئاسوودەیی.

ڕەخ (ن) rex
ئەرەف، تەنیشت، لا.

ڕەخت (ن) rext ¹
خشلی زیوین.

ڕەخت (ن) rext ²
زەنبەری سەر ئەسپ.

ڕەخت (ن) rext ³
دیدار، سیما.

ڕەخت (ن) rext ⁴
فیشەکدان.

ڕەخت کردن (کتپ) rext kirdin
تیشووپێدان.

ڕەخت وشەقە بەند (ن) rextwşeqe bend
سەرزین، پۆشاکی ڕەنگاوڕەنگی سەرزینی ولاخ.

ڕەختی بووک (ن) rextî bûk
جیازیی.

ڕەختە (ئاک) rexte
توند، ساغ، خۆگرتە، هب(تۆکمە).

ڕەخدار (ن) rexdar
قۆڵچیی، ئاگاداری ڕێگەویان.

ڕەخس (ن) rexis ¹
چۆڕیی.

ڕەخس (ن) rexis ²
پەیدا، هات.

ڕەخسان (کتن) rexsan ¹
بەدیی هاتن.

ڕەخسان (کتن) rexsan ²
ڕەخسیین، پەیدابوون، هاتن، ئامادەبوو(کەسێ یان شتی چاوەڕوان نەکراو)، گەیشتن(لە لایەکەوە یان لە کاتێکی چاوەڕوان نەکراودا).

ڕەخساندن (کتپ) rexsandin ¹
(پێ)گەیاندن، خستنەژێردەست، هێنان، هێنانە بەر دەست.

ڕەخساندن (کتپ) rexsandin ²
بەدیی هێنان.

ڕەخساو (ئان) rexsaw
ڕەخسیو، گەیشتوو، پەیدابوو.

ڕەخش (ن،ئا) rexş
شەودیز ئەسپێکی خۆشڕەوت و بەکێش وخۆش ڕەفتار.

ڕەخشان (ئان) rexşan
بریقەدار، تیشکدەر.

ڕەخنە (ن) rexne ¹
تانە، سەرکۆنە.

ڕەخنە (ن) rexne ²
بەزاقیت، دۆزینەوەی هەڵە.

ڕەخنە (ن) rexne ³
ئەیب، ڕەغنە، نەنگیی، ناتەواویی، کەم وکوڕیی.

ڕەخنە (ن) rexne ⁴
سستیی، شلیی.

ڕەخنە (ن) rexne ⁵
درز، قەڵش، قلیش، کەلەبەر.

ڕەخنەگر (ن) rexnegir ¹
ئەیبگر، ڕەغنەگر، نەنگیی دەرهێنەر، چەوت وچێلە لێ گر، نەنگێ لەشت یان کەسێ دەرهێنەر.

ڕەخنەگر (ن) rexnegir ²
کونگر، درزگر.

ڕەخنەگرتن (کتپ) rexne girtin
ئەیب گرتن، ڕەغنەگرتن، ڕەخنەلێ گرتن، نەنگێ گرتن.

ڕەد (ن) red ¹
شوێن(جێگە)پێ.

ڕەد (ئان) red ²
لەئەزموون دەرنەچوو.

ڕەد (ن) red ³
دوورە پەرێزیی.

ڕەدوو(ئافرەت) (ن) redû(afret)
ڕادوو، هەڵاتنی کچ.. لەگەڵ کوڕ بێ ڕەزامەندیی دایک وباوک بۆ
مەبەستی شووکردن، دزو، ڕەدووکەوتنیی.

هەڵگیرانی ئافرەت
لەگەڵ دۆستیدا بەمەبەستی شوو پێکردن.

**ڕەدووکەوتن** (کتن) ١ redükewtin
ڕاڕدووکەوتن، ڕەڤـین، وەدووکەوتن، کەوتنەدوو، وەشوێن کەوتن، هەڵاتن، هەڵگیران(ژن لەگەڵ پیاوی دڵخوازی بەمەبەستی شووپێکردن بێ ڕەزامەندیی دایک وباوک).

**ڕەدووکەوتن** (کتن) ٢ redükewtin
بەدوواداچوون.

**ڕەدووکەوتوو** (ن) redükewtü
ڕەدووکەوتە، هەڵگیراو.

**ڕەدیمان کردن** (کتپ) redîman kirdin
ئاوەژوو کردنەوە نخون کردنەوە (دەفر).

**ڕەدیماندن** (کتپ،کل) redîmandin(kl)
پڕ کردن وسەر ڕێژکردن.

**ڕەز** (ن) ١ rez
باخی مێو.

**ڕەز** (ن،ڕو) ٢ rez
بنەمێو.

**ڕەزا** (ن) reza
شێوە، تەرح، دیدار.

**ڕەزاسووک** (ئان) rezasük
ئێسک سووک، ڕەزا(شیرین، شیرن)، ئۆقلاز.

**ڕەزاگران** (ئان) reza giran
ڕەزا(تاڵ، قورس)، ئێسک(قورس، گران)، خوێن تاڵ.

**ڕەزامەند** (ئان) rezamend
ڕازیی، قایل.

**ڕەزامەندیی** (ن) rezamend
ڕەزا، ڕەدا، قایلیی.

**ڕەزامەندیی پیشاندان** (کتن) rezamendî pîşandan
خۆشنود بوون.

**ڕەزاو** (ن) rezaw
ڕێژگەی ڕوبار، ڕێژاف، ڕێژاو، سەرەتای پێک گەیشتنی دووچەم.

**ڕەز بڕین** (کتپ) rez birîn
مێوبڕینەوە.

**ڕەزڵ** (ئان) rezil
کەنەفت، کەلەلا.

**ڕەزڵخوا** (فر) rezilxwa
لەڕای خوا، ڕەزەڵخوا.

**ڕەزڵخوایی** (ن) rezilxwayî
داماویی، ڕووتی ونەدلریی، هەژاریی.

**ڕەزڵە** (ن،ڕو) rezile
ڕەنزەرزۆک، ڕیزەڵە، ڕەزەڵە، ڕەسلی ڕووقی، تووڵە زەرە.

**ڕەزڵە پێچ** (ن،ڕو) rezilepêç
سکارپۆن.

**ڕەزم** (ن) rezim
جەنگ، شەڕ.

**ڕەزمگە** (ن) rezimge
ڕەزمگا، کۆڕی شەڕ.

**ڕەزەن** (ن) rezen
ڕزدە، ئاڵقەڕیزودوولایی.

**ڕەزەوان** (ن) rezewan
ڕەزڤان، باخەوانی ڕەز، پاریزەریی باخی ترێ، ڕەز بەخێوکەر، چاودێریکەری ڕەز.

**ڕەزیل** (ئان) ١ rezîl
ب (چرووک).

**ڕەزیل** (ئان) ٢ rezîl
پەک کەوتە، لەکارکەوتە(مرۆڤ)، بەهۆی پیریەوە.

**ڕەزیل** (ئان) ٣ rezîl
بێئابروو، سووک.

**ڕەژ** (ن) rej
دەرمانی ڕەنگ کردنی موو، جەوهەری ڕەنگ.

**ڕەژان** (کتپ) ١ rejan
ب (ڕەنگ کردن).

**ڕەژان** (کتپ) ٢ rejan
چاو بەکل ڕشتن، کل کردنەچاو.

**ڕەژتنەوە** (کتن) rejtinewe
هەموو لا گرتنەوە.

**ڕەژوو** (ن) rejü
ب (خەڵووز).

**ڕەژۆ** (ن) rejo
برەژێ، کلچێوک.

**ڕەژەن** (ن) rejen
ڕەشیی، دوودە، قورم.

**ڕەسا** (ئان) ١ resa
پان وپۆڕ.

**ڕەسا** (ئان) ٢ resa
پێگەیشتوو، پێ ڕاگەیشتوو، پڕاوپڕ (بۆ شتێ).

**ڕەساندن** (کتپ) ١ resaandin
پێوەنووساندن، لکاندن.

**ژلیوه** (ن) ji lêwe

ئاژاوه، پشێویی.

**ژمار** (ن) jimar

بژار، بژاره، حیساب.

**ژماردن** (کتپ) jimardin

ئەژمارتن، شماردن.

**ژماره** (ن) jimare

نمره، شماره.

**ژمارەگر** (ن) jimare gir

ژمێریار، ژمارگەر، ژماریار، حیسابگەر.

**ژمارەگریی** (ن) jimaregirî

ژمارەگەریی، بەسەرکردنەوەی ژمارەی شت.

**ژمارەی جووجەڵە ومریشك پاییز دەرنەکەوێ** (پن)
jimarey cücelew mirîšk le payzda derekewê

کاتێ جووجکەکانت بژمێرە کەسەریان لەهێلکە دەرهێنابێ. واتە:شتێ تا نەیەتە دەستت بەهی خۆتی مەزانە.ئەو کەسەی بەتەمای هیچ نییە هەرگیز دڵ شکاو نابێ.

**ژمژیه** (ن) jimjiye

ژم وژۆڵ، جموجۆڵ.

**ژمن ڤه** (شر،کی) jimin ve(ki)

ئەوەندەی من بزانم، بەبیرو هزری من.

**ژمن وەرە** (شر،کی) jimin were(ki)

لەمنەوە، ئەوەندەی لەسەر شانی من بێ.

**ژن** ١ (ن) jin

ژەنی، ئافرەت، زە، بنیادەمی مێچکە، مێینە، مێ، هەواڵی پیاو.

**ژن** ٢ (ن) jin

هاوسەر، هاو خەف، ژنك،هاوڕێی ژیان، ژنی پیاو ،جووت، جفت.

**ژنانه** (ن) jinane

هەرشتێ تایبەتی ژنە، شت، گوفتار یان کردارێکە تایبەت بەژن بێ.

**ژنانیی** (ئان) jinanî

ژنانیلە، بلەکناچێ، سەرژنانیی، ڕەنگێ ژنانیی، ژنە ڕەنگە، پیاوێ کە ئاکاری ژنانەی هەبێ.

**ژنایەتیی** (ن) jinayetî

ژنەتیی، ژنێتیی، کەیوانوویی.

**ژنباز** (ن) jinbaz

مێباز.

**ژنبازیی** (ن) jin bazî

مێبازیی، چاولەدەریی.

**ژنباڤ** (ن،کی) jin bav(ki)

باوەژن، زڕدایك.

**ژنبرا** ١ (ن) jin bira

برای ژنی هاوجووت.

**ژنبرا** ٢ (ن) jin bira

ژنی برا، براژن، ژنابرایێ مرۆڤ.

**ژن بەژن کردن** (کتپ) jin be jin kirdin

ژناو ژن کردن، ژن دان بەکەسێ بەرامبەر بەژن لێ خواستنی، خوشك یان کچ پێك گۆڕینەوە.

**ژن بەمز** (ن) jin bemiz

بێ‌ناموس، دەویت، قوڕمساخ، گەواد.

**ژن پەرست{مێرد}** (ئان،ن) jin perist(mêrd)

مەفتونی ژن، پیاوێ کەزۆر باڵاگەردانی ژنێیەتی.

**ژنخواز** (ن) jin xwaz

ژن(خواس، داواکەر).

**ژن خوازتن** (کتپ) jinxiwaztin

ژن(خواستن، داواکردن) کەبێتە خێزانی.

**ژندار** (ئان) jindar

زەدار، خێزاندار، بەژن، خاوەن ژن، ژنیان، کەسێ کە ژنی هەیە وڕەبەن نییە.

**ژنك** (ن) jinik

ژنێك، مەبەست ژنێکی ناسراوە.

**ژنکۆك** (ن) jinkok

ژان، ژنی ناتەواولەئاوەزدا.

**ژنشکاڤی** (ئاک،کی) jinškavî

لە(ناکاو، پڕ).

**ژن مام** (ن) jin mam

ئامۆژن، ژن ئاپ، مامۆژن.

**ژنۆ** (ن) jino

ئەژنۆ، ژووني، ژەنوو.

**ژنۆکه** (ن) jinoke

جنۆکە.

**ژن و ژنخوازیی** (نل) jin w jinxwazî

ژن هێنانی دووتیرە لەیەکتری ژنخوازیی نێوان کەس وکاری نزیك.

**ژن وماڵ** (ن) jin w mal

ماڵ وژن، خێزان.

**ژن ومێرد** (نل) jinw mêrd

هاوسەر، پیاووژنەکەی.

**ژن ومێردایەتیی** (ن) jinw mêrdayetî
ژن ومێردیی، پەیوەندیی نێوان ژن ومێرد.

**ژنوو** (ئاک) jinü
لەنوێ، سەرلەنوێ، لەسەرڕا، ژنووڤە.

**ژن هێنان** (کتپ) jin hênan
ژن( هانیین، هاوردن، مارەکردن)، ئامسەرپەیدا کردن.

**ژنەفتن** (کتن،کتپ) jineftin
ئەژنەفتن، بیستن، ژنەویین.

**ژنەوا** (ئان) jinewa
ئەژنەوا، بیسەر، گوێ قولاغ.

**ژنەوای** (ن) jineway
گوێ سووکیی.

**ژنیاگ** (ئان) jinyag
بەستراو، بەسیاگ، پێوەدراو، ژنیای، داخراو.

**ژنین** (کتپ) jinîn
ئاخنیین، پەستاوتن.

**ژنێو** (ن) jinêw
جنێو، دژنام، ژوون.

**ژۆ** (ئپ،ئاک) jo
بۆیە، لەبەرئەوە.

**ژوار** (ن) jwar
ژانی سەخت، ئازاری زۆر.

**ژوان** ١ (ن) jwan
بەڵێن، پەیمان.

**ژوان** ٢ (ن) jwan
وەنەوز، وەنەوس.

**ژوان** ٣ (کتپ) jwan
پێک گەیشتن، چاو بەیەکتر کەوتن.

**ژوان** ٤ (کتن،کتپ) jwan
چاوچوونە خەو( بەئاستەم بۆ ماوەیەکی کورت).

**ژوان پێ دان** (کتپ) jwan pêdan
گفتی چاوپێ کەوتن دان.

**ژوانگە** (ن) jwange
پەیمانگە، پەیمانگاه، جێگەی بەیەکتر گەیشتن.

**ژۆرین** ١ (ن) jorîn
لای (سەروو، ژووروو).

**ژۆرین** ٢ (ن) jorîn
بەشی(ناوەوە، بەرەوناوەوە ).

**ژۆژان** (کتن) jujan
بووژان، گورپەیداکردن، وەگورهاتن.

**ژۆژاندن** ١ (کتپ) jujandin
ژۆژاتن، گورپێ پەیداکردنەوە، وەگور هێنانەوە، هێنانە وەگور.

**ژۆژاندن** ٢ (کتپ) jujandin
حەساندنەوە.

**ژۆژانەوە** (کتن) jujanewe
ژۆژیان، بووژانەوە.

**ژۆژیاگ** (ئان) jujyag
بووژاوە، وەگورهاتوو.

**ژۆژیانەوە** (کتن) jujyanewe
حەسانەوە، ماندوێتیی دەرچوون.

**ژۆڤان** (ئان،کی) juvan(ki)
پەشیمان، پێژەوان.

**ژوپاشی** (ئاک) jupašî
ژووپیڤە، لەداهاتوودا، لەمەولا.

**ژوور** ١ (ن) jür
ژێر، لای(سەر، سەروو، ژووروو، بەرەو ژوور).

**ژوور** ٢ (ن) jür
ئۆدە، چاوەخانوو.

**ژوور** ٣ (ن) jür
ناو، ناوەوە، بەشی ناوەوە.

**ژوور** ٤ (ن،رو) jür
بەرسیلە.

**ژووران** ١ (نک) jüran
بلندایی، کێوان.

**ژووران** ٢ (ن) jüran
کاتی چوونە ژوورەوە لەسەرماندا، کاتی سەرماهاتن.

**ژوورگ** ١ (ن) jürig
ئەفراز، بەرەوژوورە، ژوورگین.

**ژوورگ** ٢ (ئان) jürig
ژوورنگ، لای ژوورەوە.

**ژوورو** (ن) jürü
بان، لای(سەروو، بەرەوژوور).

**ژووڤە** (ن،کی) jüve(ki)
جیوە.

**ژوولە** (ن) jüle
بزاو، جوولە.

**ژوی** (ن) jwî
جەوی، جیوەی داروگیا...

**ژە** ١ (ن) je
جە، جێگە، شوێن.

ژە (ن) ² je
ب (ژێ).
ژەڤ کەتن (کتن،کی) jev ketin(ki)
تەواو کۆن وبوون وبڕان.
ژەڤەک (پ،کی) jevek(ki)
نێوان، مابەین.
ژەک{ئاو} (ئان) ¹ jek(aw)
شلەتێن، کەمێ گەرم.
ژەک (نک. ) ² jek
زاکە، زکە، زاکە، زاکێ، زەها، فریشکە، فرچکە، هەوەڵ شیر.
ژەک ( ) ³ jek
پیزۆقی چاو.
ژەک (ئان) ⁴ jek
فەریک، نیوە گەیشتوو.
ژەلم (ن) ¹ jelim
سیسی.
ژەلم (ن) ² jelim
ناوێ(لیل، شیلو).
ژەلمژا (ئان) jelmja
پەلخوێن، نیوەجووراو(خۆراک).
ژەلمو (ئان) jelmü
تەمەڵ، سست.
ژەم (ن) ¹ jem
خۆراک، ئۆرەخۆراک، بەش، ئەندازەیەکی دیاری کراو لە دەرمان.
ژەم (ن) ² jem
ژەمەن، ژەمەکە، ژەمەنە، ژوم، ژەمکە، جەمکە، جەم، ئەندازەیەکە خۆراکە کەلە جەمێکدا مرۆڤ پێی دابکەوێ.
ژەم بوردە (ئان) jem bürde
ژەم بوردو، ژەمەن بگردگێ، ژەمەن بردوو، جەم مردوو، ژەمی خۆراکە لە دەست چووگێ.
ژەندن{مۆسیقا} (کتپ) ¹ jendin(mosîqa)
لێدان.
ژەندن (کتپ) ² jendin
ژاندن، ژەنن، ژنیان، تلەقان، شلەقاندن، راوەشاندن و هێنان و بردن، هێنان وبردن بەپاڵ پێوەنان.
ژەندن (کتپ) ³ jendin
حینچکەدان، فنچکە لێدان، کوت پێوەدان.
ژەندن{دەرگا، پەنجەرە} (کتپ) ⁴ jendin(derga, pencere)
ژەنن، ژنیان، داخستن.
ژەندن (کتپ) ⁵ jendin
بردنەناو، تێ خستن.
ژەندن{ئاگر} (کتپ) ⁶ jendin(agir)
پێ کردن.
ژەنراو (ئان) jenraw
ژاو، ژنیاگێ.
ژەنگ (ن) ¹ jeng
١- زنجار، زنگار، زەنج، زەنگێ، تۆفاڵ، فەرێژ، گەمار.
٢- ژەنگاس.
ژەنگ{گەنم} (ن) ² jeng(genim)
ماکێکی رەشی ئاماڵ سوورە ئەدا لەگوڵەگەنم.
ژەنگ{گوێ} (ن) ³ jeng(gwê)
چلکی گوێ، ژەنگی گوێچکە، سمراخە.
ژەنگار (ئان) ¹ jengar
شینی مەیلەوکاڵ.قاوەیی.
ژەنگار (ن) ² jengar
مووروەشینە، رەنگاڵ.
ژەنگاڵ (ن) jengal
ب (زەرگاڵ).
ژەنگاوی (ئان) jengawî
ژەنگیی، رەنگدار، ژەنگن، ژەنگ(ماوردوو، هێناو، لێداو، هاوردگێ).
ژەنگ لێ دان (کتن) jeng lêdan
ژەنگ(لێ نیشتن، هەڵهێنان، هێنان، هەڵێنان، گرتن، کەوتنەسەر).
ژەنین (کتن) jenîn
ژەندن، هەڵپەڕین.
ژەهرەبا (نل) jehreba
زەهرەبا، گرەبا، بای سەموم (سەبوێ).
ژەهرۆژەنگ (ن.) jehrwjeng
ئاتاجیی، نەبوونیی، هەژاریی.
ژهەڤ کرن (کتپ،کی) ji hev kirin(ki)
ژەڤ کرن، لێکە جیا کردنەوە، لەیەکترییێ بەش کردن.
ژی (ن) jî
ژیان.
ژیار (ن) jiyar
زیندەگیی (ژیانی) شارستانیانە.
ژیاریی (ن) jiyarî
ژیوەر، شارستانیەتیی.

ژیان (ن) ¹ jiyan
ژی، ژین، ژینداریی، جیو، هەبوویی.

ژیان (کتن) ² jiyan
گوزەران کردن، نەمردن، مان، تەمەن بردنەسەر.

ژیاندار (ئان) jiyandar
زیندوو، گیاندار.

ژیاندن (کتپ) jiyandin
ژیانن، بەخێوکردن، بژیوپێدان، گوزەران (پێدان، دان).

ژیاندنەوە (کتپ) jiyandinewe
بووژاندنەوە.

ژیانەوە (کتن) ¹ jiyanewe
زیندوو بوونەوە.

ژیانەوە (کتن) ² jiyanewe
بووژانەوە، تازەبوونەوە.

ژیانیی (ئان) jiyanî
شتی بۆ ژیان پێویست.

ژیر (ئان) ¹ jîr
ئاقل، بەبیر.

ژیر{منال} (ئان) ² jîr(minal)
لەگریان (بەسکردە، بەسکردوو).

ژیرانە (ئاک) jîrane
ئاقلانە.

ژیربوون (کتن) jîrbûn
بێدەنگ بوون، لەگریان بەس کردن، دەست لەگریان هەلگرتن.

ژیربوونەوە (کتن) jîr bûnewe
ئارام بوون، ژیرەوبوون، ژیرەبوون.

ژیرک (ن) jîrik
ڕیبەر، مەزنی کۆمەلی مرۆڤ.

ژیر کردن{منال} (کتپ) jîr kirdin(minal)
خافلاندن.

ژیرکردنەوە (کتپ) jîr kirdinewe
ژیرەوکردن، دەس پێ لە گریان هەلگرتن، بێ دەنگ کردنەوە (لەگریان).

ژیرکەلە (ئان) jîrkele
ژیرکەلۆکە.

ژیریی (ن) ¹ jîrî
هێمنی، لەسەرخۆیی.

ژیریی (ن) ² jîrî
ئاقلی، زانایی، سەلیقە، ماریفەت، سەرڕشتە.

ژیشک (ن،ئا) jîşik
ژژو، ژوژک، ژوژوو، ژوژیی، ژیژو، ژیژۆ، ژژی، چوولە.

ژیڤان (ئان،کی) jîvan(ki)
پاشگەز، پۆژمان.

ژیڤانیی (ن،کی) jîvanî(ki)
ژیوانیی، پەشیمانیی.

ژیکەلە{منال} (ئان) jîkele(minal)
ژیرکەلــە، ژیرکەلــە، ژیروجوانکیلــە، خنجیلانــە خونچیلانە، خونچیلە.

ژیل (ن) ¹ jîl
لەرە، لەرزە.

ژیل (ئان) ² jîl
ورد، هورد.

ژیلاڤە (ئان) jîlafe
کارا، کارزان.

ژیلە (ن) jîle
تەرزەلووکە، تەرزەی ورد.

ژین (ن) jîn
زیندەگیی.

ژینگاریی (ن) jîngarî
جۆری ژیان، ڕەوشا ژیانا مرۆڤ.

ژینهار (ن) jînhar
مایەی نائارامیی، هۆی ئەزیەت(بۆ مرۆڤ).

ژیو (ئان) jîw
زیندوو.

ژیوار (ن) ¹ jîwar
بژیو.

ژیوار (ن) ² jîwar
١- ڕابواردنی تەمەن.
٢- باری ژیان، چۆنیەتیی ژین، ژیان، گوزەران.

ژێ (ن) jê
ژە، ژەهـ، زە(بۆ کەوان یان ئامیاری مۆسیقا).

ژێ بوون (کتن،کی) jêbûn(ki)
پچران، لێجیابوونەوە، لێوەبوون، پێوەنەمان.

ژێ بەردان (کتپ،کی) jê berdan(ki)
دەست لێ بەردان، لێجیابوونەوە.

ژێ حەزکردن (کتپ،کی) jê hezkirdin(ki)
حەز لێکردن، خۆش ویستن.

ژێدەر (ن،ری،کی) ¹ jêder(ki)
چاووگ، بنەمای وشە کەلەکردارەوە وەرگیرابێ وەهەندێ لەئیشەکانی ناو بەجێ بێنێ، ڕەگەزی وشە.

**ژێدەر** (پ) [٢] jêder

بیجگە، بەجگە.

**ژێ دەرکەفتن** (کتپ،کی) jê derkeftin(ki)

دەرەقەت هاتن، پیکێ هینان، لەکار دەرۆست هاتن.

**ژێر** (ن) jêr

١- لای خواروو. ٢- بن.

**ژێرئاگرە** (نک) jêr agire

ئاگرگیرە، بن ئاگرە، چاووگی ئاگر.

**ژێراو** (ن) [١] jêraw

ڕەهەندی ئاوی پیس.

**ژێراو** (ن) [٢] jêraw

ژێراف، بناف، بناو، بن ئاو.

**ژێراو** (ئان) [٣] jêraw

مەرشتێ بتوانێ ژێر ئاو بکەوێ.

**ژێرئاویی** (ن) jêr awî

ژێر دەریایی.

**ژێربال** (ن.) [١] jêr bal̲

بن(باخەل، مەنگل).

**ژێربال** (ن) [٢] jêr bal̲

ئاوارە، پەنابردە.

**ژێربال خستن** (کتپ) jêr bal̲ xistin

پەنا پێدان، گرتنەخۆ.

**ژێربەرەوژوور** (ئان) jêr berew jür

بەرەوژوور، لەخوارەوە بۆ (بالا، سەرەوە).

**ژێرپیالە** (نل) jêr piyal̲e

ژێر ئیستیکان.

**ژێرپێ خستن** (کتپ) jêr pê xistin

خستنە ژێر پێ.

**ژێرپێ کردن** (کتپ) jêr pêkirdin

پێ(شێل کردن، مال کردن).

**ژێرجگەرە** (نل) jêr cigere

ژێرجغارە، تەپلەکی جگەرە.

**ژێرجلەکیی** (ئاک) jêr cilekî

بە(پەنهانیی، نهێنیی)، پەناوەکیی، پەنامەکیی، بێ ئەوەی کەس بزانێ.

**ژێرچەپۆکە** (ئان) jêr çepoke

ژێردەستە.

**ژێرچەم** (ئان) jêrçem

بەرچاو، بەرچاوێریی.

**ژێرچەم** (ن) jêr çem

پەیرەو، دواکەوتە.

**ژێرچەناگە** (نل) jêr çenage

غەبغەبە.

**ژێرچەناگە** (نل) jêr çenage

ژێرچەنەوخشلی ژێر چەنە.

**ژێرچەناگە** (ن) jêr çenage

ملپێچ.

**ژێرخاک کردن** (کتپ) jêr xak kirdin

خستنە(ژێر خاک، گۆڕ)، بەگۆڕسپاردن، ناشتن.

**ژێرخان** (ن.) jêrxan

نهۆمی یەکەم وهۆدەی بنەوە لەخانوو.

**ژێرخستن** (کتپ) [١] jêr xistin

خستنە(ژێر، ژێرەوە)، دانەبنەوە.

**ژێرخستن** (کتپ) [٢] jêr xistin

زەبوون کردن، نابووت کردن، داماوکردن.

**ژێرخوان** (ن) jêrxwan

خوانکە.

**ژێردار** (ئان) jêrdar

بنکدار.

**ژێردەرگا** (نل) jêr derga

ئاسانە، ژێر(بەران، دەر، دەران)، داری لای خوارووی چوار چێوەی دەرگا.

**ژێردەریا** (نل) jêr derya

ژێر(زێ، زریە، ئاویی، دەریایی)، بناویلە.

**ژێردەست** (نک) [١] jêr dest

داروودەستە، ژێردەس، بەردەستە، خواردەست، فەرمان بەر، ژێردەسە.

**ژێردەست** (ئان) [٢] jêr dest

١- ژێردەس، بن دەس، نزیک.

٢- خۆش(کردەنیی، دەس)، سانا

**ژێردەست** (ن،ئان) [٣] jêr dest

دەستەکزمەک، دوارۆ.

**ژێردەستان** (نک) [١] jêr destan

نۆکەران، خزمەتکاران.

**ژێردەستان** (نک) [٢] jêr destan

کەلوپەلی بەردەست.

**ژێردەستیی** (ن) jêr destî

بەرفەرمانیی، خزمەتکاریی.

**ژێرڕاخەر** (نل) jêr r̲axer

ڕایەخ.

**ژێرزرێ** (نل) jêr zirê

خەفتان، جلێ کەلەژێر زریوە دەپۆشرێ.

**ژێر زوان (ن)** jêr ziwan
بەرتیل.

**ژێر زوان چەشتن (ند)** jêr ziwan çeştin
زمانی کەسێ تاقی کردنەوە، ڕا لێ (دەرهێنان، پرسیین).

**ژێر زەمین (ن)** ١ jêr zemîn
ژێر(زەوین، زەوی)، توێژی ناوەوەی ئەرز.

**ژێر زەمین (ن)** ٢ jêr zemîn
ژێرخان، ژوور لەبەشی ژێرەوەی خانوو.

**ژێر زین (نل)** jêr zîn
پەتوی ژێر زین.

**ژێرسەر (ن)** ١ jêrser
بالگە، سەنیر.

**ژێرسەر (ن)** ٢ jêrser
کەین ویەین.

**ژێرقلیان (ن.)** jêr qilyan
ژێر قلیانی، بەرقلیان، نانی سەر لەبەیانی.

**ژێرکراس (ن.)** jêr kiras
جلی ژێرەوەی تەنکۆلەی ژنانە.

**ژێرکەندکردن (کتپ)** jêr kend kirdin
جێ پێ لێژکردن.

**ژێرکەوتن (کتن،کتپ)** jêrkewtin
١- دۆڕان، دۆڕاندن، ژێرکەفتن( لەگەمەدا ).
٢- سەرنەکەوتن، کەوتنەژێر.
٣ - نابووت بوون، زیان لێ کەوتن.

**ژێرگین (ئان)** jêrgîn
بن بنەوە، ژێر بن، هەرەژێرەوە.

**ژێرلچەکی (ن)** jêrliçekî
چرپە، پرتەپرت، چپە.

**ژێروو (ن)** jêrü
ژێرکێ، خواروو، لای خواروو.

**ژێرو ژوور (ئان)**١ jêr w jür
سەرەونخون، قلپ، قلپ وەبوو.

**ژێرو ژوور (ئان)**٢ jêr w jür
ژێرەوزەبەر، ژێرەوژوور، کاول.

**ژێرەو ژووربوون (کتن)** jêrewjürbün
ژێروژوور بوون، ژێرەو زەبەربوون، وێران بوون، سەرەونگوون بوون.

**ژێرەوکردن (کتپ)** jêrew kirdin
شاردنەوە، وەشارتن، وەشاردن.

**ژێرەوە (پ.ئاک)** jêrewe
بنەوە.

**ژێر هاڕ (ن)** jêr har
بەردی بنەوەی (ئاسیاو، دەستاڕ).

**ژێ کرن (کتپ،کی)** ١ jê kirin(ki)
ژێبڕیین، بڕیین.

**ژێ کرن (کتپ،کی)** ٢ jê kirin(ki)
لێ کردنەوە، جیا کردنەوە.

**ژێ گرتن (کتپ،کی)** jê girtin(ki)
١- لاسایی کردنەوە، لاساکردنەوە
٢ -. هونەر لەهونەرمەندان دزیین.

**ژێ گرتیی (ن،کی)** jê girtî(ki)
فۆتۆکۆپی.

**ژێل (ن،رو)** ١ jêl
دول، گولی دارمێو، گولووکی بەرسیلە کەئەوەرێ لەکاتی ڕشانەوەیدا.

**ژێل (ن)** ٢ jêl
کارامەیی.

**ژێ هاتن (کتن،کی)** jê hatin(ki)
شیان، لێ هاتن.

**ژێهاتوو (ئان)** jê hatü
١- دەرهاتوو، ڤالبوو، کارامە.
٢- ئیشکەر، ئیش ڕاپەڕێنەر.

**ژێهاتیی (ئان،کی)** jê hatî(ki)
ژێهاتوو، شیاو، لێهاتوو، لایق

# پیتی - س -
# -S -

**سا** ( ن ) ١ sa
سات.
**سا** ( ن ) ٢ sa
سیبەر.
**سا** ( ن ) ٣ sa
سایەقە.
**سا** ( ن ) ٤ sa
پەنا، دالدە.
**سا** ( ن ) ٥ sa
وەستا، مامۆستا.
**سا** ( ئاک ) ٦ sa
١ - کەوابوو، جا. ٢- دەسا، سادەی.
**سا** ( ئان ) ٧ sa
سواو.
**سا** ( ئاک،پر ) ٨ sa
بۆ، بۆچ، بۆچیی.
**سائەقڵ** ( ئان،کل ) saeqil(kl)
شێتۆکە، نەفام.
**ساب** ( ن ) sab
سام.
**سابات** ( ن ) ١ sabat
کەپر.
**سابات** ( ن ) ٢ sabat
ژووری لەگەڵاو چرۆ دروستکراو.
**ساباق{شوێن}** ( ئان ) aq(šwên)
بەرفراوان، بەربەرەڵا، وراق.
**سابخۆر** ( ن ) sabxor
زیادەخۆریی، ئینتەلا.
**سابرێن** ( ن،نا ) sabrên
تەگە، نێری، ئەژە، خرت، ساورێن.
**سابوورە** ( ن،ئان ) ١ sabüre
نێرەمووک، نەنێر نەمێ.
**سابوورە** ( ن ) ٢ sabüre
سەبوورە، تەختەی ڕەشی پان ولووس بۆ شت لەسەر نوسین یان وێنە لەسەرکێشان بەدەباشیر.
**سابوون** ( ن ) sabün
سابین، ساوون.
**سابووناو** ( ن ) sabünaw
کەفاو.

**سابوونلویی** ( ئان ) sabünawî
کەفاویی، سابوون یان کەفی سابوون تێوەچوو.
**سابوونچیی** ( ن ) sabünçî
١-سابوونکەر.٢- سابوون فرۆش.
**سابوون لێ‌دان** ( کتپ ) sabün lêdan
بەسابوون(شت ) شتن، سابوون تێ هەڵسوون.
**سابوون مەدە لەژێر پێم** ( رس )
sabün mede le jêr pên
سابوونی خۆت مەدە لەژێر پێم، واتە: من هەڵمەخەڵە تێنە، هەڵم مەخەڵەتێنە.
**ساپ** ( ن،رو ) ١ sap
کۆمەڵی خەرمانی سوورکراو.
**ساپ** ( ن،رو ) ٢ sap
قەسەڵ، قەد یان لقی گەنم وجۆی دووراوە ( دروێنە کراو ).
**ساپ** ( ن ) ٣ sap
بەردی ( تەنک ولووسی گوێ چەم، ساف ).
**ساپۆکە** ( ن ) sapok
چەکمە، کەوشی مل درێژ.
**ساپیتکە** ( ن ) ١ sapîtik
بنمیچی خانوو، ساپووتکە، ساپیتە، ڕووی سەربان لە دیوی ژوورەوە.
**ساپیتکە** ( ن ) ٢ pîtik
کاریتە.
**ساپیتە**( ن،رو ) sapîte
چلەپۆپە، لای هەرەبلند ( درەخت ).
**سات** ( ن ) ١ at
سا، کات، دەم، وەخت.
**سات** ( ن ) ٢ at
تاو، کاتێکی زۆر کەم.
**سات** ( ن ) ٣ at
سەعات، شەست چرکە، یەک بەش لەشەوورۆژێک.
**سات** ( ئان ) ٤ at
سەڵت.
**ساتان** ( کتپ ) ١ tan
ساتاندن، کوتان، کرەکردن ( برنج ).
**ساتان** ( نکە ) ٢ satan
دەرپێی ژنان، هاوەڵ کراس.

**ساتان** (نک) ٢ satan
ڕان وسمت.
**ساتان** (ن) ٤ satan
سەتەن، کرێم سەتەن، جۆری قوماشە.
**ساتف کردن{هەویر}** (کتپ) satifkirdin (hewîr)
شێلان، هەڵ شێلان.
**ساتل** (ن) ١ satil
سەتل.
**ساتل** (ن) ٢ satil
مەنجەڵ، بەرۆش.
**ساتمەکردن** (کتن) ١ satmekirdin
سەرسم دان.
**ساتمەکردن** (کتن) ٢ satmekirdin
سەتمەکردن، هەڵەکرد (لەگفت وگۆدا).
**ساتۆر** (ن) ١ sator
قیمەکێش.
**ساتۆر** (ئان.کل) ٢ sator(kl)
تەمەڵ، سات ور.
**ساتی** (ن) ١ satî
پەلە، پەز.
**ساتی** (ئان) ٢ satî
کاتی، نە(هەمیشەیی، بەردەوامیی).
**ساتێ** (ئاک) satê
کاتێ، دەمێک.
**ساج** (ن) ١ sac
سێل، ساجی نان لەسەر برژاندن.
**ساج** (ن) ٢ sac
جۆرێ داری دارتاشییە.
**ساجاخ** (نک) sacax
گولێنکەو ریشووی زین.
**ساجلەخ** (ن) saclex
خشڵێکە لەپرچ دەدرێ.
**ساجوور** (ن) ١ sacûr
سەمەندۆک، ساجۆڵ، سنک، (قەلاتە، قاییش، پەت)ی ملی سەگ.
**ساجوور** (ن.س) ٢ sacûr
ساژوور، خەشاب، دەراغ، شانەی فیشەک.
**ساچاخ** (ن) ١ saçax
بارۆکە، مووچاخ، ساچاخە، قژەسەری دروستکردە.
**ساچاخ** (ن) ٢ saçax
ریشوو (پەردە، جل وبەرگ).

**ساچان** (کتن) saçan
قبوول کردن، لەگەڵ سازان، ساچیین، دەگەڵ ڕابواردن.
**ساچمە** (ن) ١ saçime
زۆیالمە، وردە قورقوشمی خڕیلە کەدەیکەنە ناو تفەنگی ساچمەزەن.
**ساچمە** (ن.خ) ٢ saçime
زیپک، تیلەوتوانج، قسەی بەتویکل.
**ساچ وپەرچەم** (ن) saçw perçem
زاچ وپەرچەم، کاکۆل، مووی سەرناوچەوانی منداڵ.. کەبۆ جوانیی دەهێلرێتەوە.
**ساچین** (ن) saçîn
گۆنیا، ڕاستەی بەنا یان دارتاش.
**ساچیی** (ئاک) saçî
بۆچی، لەبەرچی، هۆی چییە.
**ساحێب** (ن) sahêb
خاوەن.
**ساخ** (ئان) ١ sax
ساغ، تەندروست، ساق.
**ساخ** (ن) ٢ sax
مالی بێ عەیب، کالای چاک.
**ساخ** (ئان) ٣ sax
بێ فروفێل، ڕاست، سەرڕاست، ساخلەم، ساق.
**ساخت** (ن) saxit
دەسکرد، دەستکردە.
**ساختمان** (ن) ١ saxtiman
کۆشکی گەورە، خانوویەرەی مەزن، ساختومان.
**ساختمان** (ن) ٢ saxtiman
دامەزراوە (بۆ کاروبار).
**ساخت وپاخت** (نل) saxtw paxt
خلێنەو بلێنە، سازومان، کەین وبەین، قومە قوم، رەتم، پچەپچ(بۆ مەبەستێکی ناپاک).
**ساختە** (ن) saxte
١- درۆ. ٢- بوختان.
٣- فروفێل، گزیی وتەلەکە ٤- ناشەرعی.
**ساختەچیی** (ن) saxteçî
١- ساختەکار، دەسبڕ، فێلباز.
٢- درۆزن، درۆ هەڵبەست.
**ساختەچێتی** (ن) saxteçêtî
ساختەکاریی، دەسبڕیی، فێلبازیی.

**ساخ کردنەوە (شتی نەزانراو) (کتپ)** saxkirdinewe
ڕۆشن کردنەوە.

**ساغلەم (ئان)** ١ saxlem
بێ پێچ وپەنا.

**ساغلەم (ئان)** ٢ saxlem
ساغلەم، بێ کەم وکوڕیی.

**ساخۆر (ن)** saxor
بەرۆژ، ڕوویەرەو ڕۆژ، ڕوتەنی دارستان کەرۆژ لیی ئەدا.

**ساخوشک (ن)** saxüšik
میوەی لەبەر سیبەر وشک وەکراو.

**ساخەس (ئان)** saxes
سیبەر خەست، پرسیبەر، سیبەرچر، داری پر لق وپۆپ کەسیبەری خەست وچرە.

**ساغیی (ن)** saxî
١- بێ (ئەیبیی، کەل وکۆمیی).
٢ - سەلامەتیی، تەندروستیی.
٣- ساغیی، بێ فروفیلیی.

**سادار (ئان)** ١ sadar
بەسیبەر.

**سادار (ئان)** ٢ sadar
شیت، دین، لیوە.

**سادر (نک)** sadir
چینگە، شەتلگە.

**سادە (ئان)** ١ sade
سایە، ساکار، شتی (یەک ڕەنگ، بێنەخش ونیگار).

**سادە (ن)** ٢ sade
دەمرووت، لاوی (خەت نەداو، موو لەڕوو نەهاتوو).

**سادە (ئان)** ٣ sade
ساویلکە، بەسەزمان، سادەلۆکە، گێلۆکە، سادەکار، سادەلۆح، کەم فام.

**سادە (ئان)** ٤ sade
ئاسان.

**سادەیی (ن)** ١ sadeyî
بێ (موویی، تووکیی).

**سادەیی (ن)** ٢ sadeyî
بەسەزمانیی، بەسەزوانیی، سادەکاریی (لەڕووی تیز یان سووکییەوە).

**سار (ئان)** ١ sar
سارد.

**سار (ن)** ٢ sar
جار، جێ، شوین، زار.

**سار (ن.نا)** ٣ sar
حووشتری (دووکۆپان، بەختیاریی).

**سارا (ن)** ١ sara
بیابان، دەشت، چۆڵەوانیی.

**سارا (ن)** ٢ sara
دوڕ، مرواریی درشت.

**ساراکردنەوە (کتپ)** sarakirdinewe
١- تەخت کردن، کردن بەدەشت (شوینێ).
٢ - خاپوورکردن، ویران کردن.

**سارانشین (ن)** sara nšîn
دەشتەکیی.

**سارد (ئان)** ١ sard
سار، چایکێ.

**سارد (ئان)** ٢ sard
بێ (مەیل، هەوەس).

**سارد (ن)** ٣ sard
سەرما (ئاووهەوا).

**سارد (ئان)** ٤ sard
کەم ئارەزوو (بۆ سەرجییی).

**ساردانک (ن)** sardanik
یەخچال، سەلاجە.

**سارداو (ن)** ١ sardaw
ژێر زەمین، ژێر (زەوی، خان).

**سارداو (ن)** ٢ sardaw
ساریج.

**ساردبوون (کتن)** ١ sardbün
سەرما (پەیدا) {بوون، هاتن}، گەرمی نەمان، گەرما نەمان، لەگەرمی ڕزگاربوون.

**ساردبوون (کتن)** ٢ sardbün
لالووت بوون، بێ مەیل بوون بەرامبەر کەسێ.

**ساردبوونەوە (ئد)** ١ sardbünewe
مردن، بەلاداهاتن.

**ساردبوونەوە (کتن)** ٢ sardbünewe
چایکێ بوون (شتی گەرم، داغ)، گەرمیی لەسەرنەمان.

**ساردبوونەوە (کتن)** ٣ sardbünewe
لەکارناهومیدبوون، خاوبوونەوە (لەکردنی کارێک).

**ساردبوونەوە (ئد)** ٤ sardbünewe
چاو چوونە خەو.

**ساردکردن** (کتپ) sardkirdin[1]
چایکێ کردن، لەگەرمی ڕزگارکردن، کردنە سەهۆڵ.
**ساردکردن** (کتن) sardkirdin[2]
هەوا سارد(بوون، کردن).
**ساردکردنەوە** (کتپ) sardkirdinewe[1]
شتی گەرم ساردوەکردن، گەرمیی تێدانەهێشتن.
**ساردکردنەوە** (ئد) sardkirdinewe[2]
کوژتن، کوشتن.
**ساردکردنەوە** (ئد) sardkirdinewe[3]
پەشیمان کردنەوە (کەسێ لەکارێک)، دڵ لێ تۆراندن.
**ساردوسڕ** (ئان) sardw sir̠[1]
زۆرسارد.
**سارد وسڕ** (ئان) sardw sir̠[2]
زۆر بێ مەیل و ئارەزوو.
**ساردوسڕی** (ن) sardw sir̠î[1]
کاتی سەرماو سۆڵە.
**ساردوسڕی** (ن) sardwsir̠î[2]
بێ مەیلیی، لاڵووتیی.
**ساردوسەرما** (نل) sardwserma
سەرماوسۆڵە.
**ساردوگەرم** (ئان) sardwgerim[1]
شلەتێن.
**ساردوگەرم** (ن.) sardwgerim[2]
تەرمۆس، فلاسک، دەفرێکی تایبەتی کەشلەمەنیی بەساردیی یان گەرمیی ڕادەگرێ.
**ساردوگەرم کەوتن** (کتن) sardwgerim kewtin
باپەڕ کردن.
**ساردەسنگان** (ن.پز) sarde sindan
ساردەسنگان (ولاخ)، ئازار و گرژبوونی ناوسک.
**ساردەسێر** (ن.) sardesêr
هاوینەهەوار.
**ساردەمەنیی** (نک) sardemenî
خواردن وخواردنەوەی سارد، ساردیی.
**ساردیی** (ن) sardî[1]
سەرما، ساریی.
**ساردیی** (ن) sardî[2]
چایکیی، فێنکیی.
**سارساروک** (ن.جچ) sar sarok
سیسرک.
**سارق** (ن) sariq
بوخچە، پریاسکە، پرێسکە.

**ساروج** (ن) sarüc
خاکەنازی ئاگرکێش، مەسێ.
**ساروخ** (ن) sarox
سەرپۆش.
**ساروکیی** (ن) sarokî
سەرمابردەڵە.
**سارومار** (ئان) sarwmar
زۆر بۆگەن.
**سارە** (ن)[1] sare
بەرەبەیان، سووێو.
**سارە** (ن.ئاک)[2] sare
سبەینێ.
**سارەزیی** (ئاک) sarezî
سبەینێ زوو.
**سارەوان** (ن) sarewan
حوشترەوان.
**ساریج** (ن) sarîc
سارداو، سەهریج، سارگە، چاڵاوی سەردانەپۆشراو، سارداوە، حەوزی بن زەویی.
**سارێژبوون** (برین) (کتن) sar̠êjbün
سارێش بوون، دەم داخستن، چاک بوونەوە، پێست بەسەرداهاتن، پڕبوونەوە (جێ برین یان جێ برین)، خۆشەوەبوون.
**سارێژکردن** (ئد) sar̠êjkirdin
ئاشت کردنەوە، دڵ هێنانەوەجێ.
**ساز** (نک.ئم)[1] saz
زاز، سازوسەمتووروو تاروعوود.
**ساز** (ن)[2] saz
دەنگی پارچەمۆسیقا، ئاوازی مۆسیقا.
**ساز** (ئان)[3] saz
ئامادە، حازر، دروست، ڕێکخراو.
**ساز** (ئان)[4] saz
بەدەماخ، چاخ، کۆک، دڵخۆش.
**ساز** (ئان)[5] saz
دەوڵەمەند.
**ساز** (ئان)[6] saz
ڕێک، ئاشت.
**ساز** (نک)[7] saz
بارگەو کەلوپەلی سەفەر.
**ساز** (ن.ڕو)[8] saz
قامیش.

**سازان** (کتن) sazan
سازبوون، ڕێک کەوتن (یەکێک لەگەڵ کەسێکی
ساردەوە، حەوزی بن زەویی.

**سازاندن** (کتپ) ١ sazandin
پێک هێنانەوە (دووکەس نەیار بەیەکتر)، ڕێک
خستنەوە.

**سازاندن** (کتپ) ٢ sazandin
ئەنجام دان(کار، پرۆژە).

**سازبوون** (کتن) ١ sazbün
ئامادەبوون.

**سازبوون** (کتن) ٢ sazbün
دەوڵەمەندبوون.

**سازبەند** (ن) ١ sazbend
ساز لێدەر، ساز ژەن، سازڤان، سازندە، مۆسیقاژەن.

**سازبەند** (ن) ٢ sazbend
دەستەی (مۆسیقا ژەنان، سیمفۆنی، فیلهارمۆنی)،
سازوسەمتوور.

**سازدان** (کتپ) sazdan
ئامادەکردن، سازکردن، سازیان، حازرکردن، ڕێک
خستن.

**سازکردن** (کتپ) ١ sazkirdin
سازدان.

**سازکردن** (کتپ) ٢ sazkirdin
ڕازی کردن، هێنانەسەریار.

**سازکراو** (ئان) sazkiraw
سازکریی، ئامادەکراو.

**سازگار** (ئان) ١ sazgar
شوێن وئاووهەوایەک کەبەئەندامی
لەش بکەوێ.

**سازگار{ئاو}** (ئان) ٢ sazgar(aw)
سووک، زوڵاڵ.

**سازگاریی** (ن) sazgarî
سووکیی وخۆشیی ئاووهەوای شوێنێک.

**سازندە** (ن) ١ sazinde
زوڕناژەن.

**سازندە** (ئان) ٢ sazinde
زمان درێژ، سازنە، چەنەباز، سازنگە.

**سازندە** (ن) ٣ sazinde
گۆرانی بێژ.

**سازندە** (ن) ٤ sazinde
کارو فرمان ڕێکخەر.

**سازندەیی** (ن) sazindeyî
زمان درێژیی، چەنەبازیی.

**سازوباز** (ن) sazwbaz
بن بەست، ساخت وپاخت.

**سازوسەمتوور** (نک) sazwsemtür
سازبەند.

**سازوسەودا** (ن) sazwsewda
١- خەیاڵاتی پڕوپووچ.٢ خولیا، کەلکەلە.

**ساس** (ن،جج) sas
مۆرانە، مێروولەی سپی.

**ساغ** (ئان) sax
ساخ ، دروست، بێ کەل وکۆم.

**ساغ** (ئان) sax
ساخ.

**ساغ بوونەوە** (کتن) ١ saxbünewe
بەناکام گەیشتن (کار).

**ساغ بوونەوە {لەنەخۆشیی}** (کتن) ٢ saxbünewe(le nexošî)
چاک بوونەوە، چاببوونەوە.

**ساغ بوونەوە** (کتن) ٣ saxbünewe
فرۆشران ونەمان (ماڵی بازرگانیی).

**ساغ کردنەوە** (کتپ) ١ saxkirdinewe
چاک کردنەوە.

**ساغ کردنەوە** (کتپ) ٢ saxkirdinewe
فرۆشتن وهیچ نەهێشتن (ماڵی بازرگانیی).

**ساغ وسەلیم** (فر) sax wselîm
ئەزیەت پێ نەگەیشتوو، ئازار نەدراو، ڕێک وپێک.

**ساف** (ئان) ١ saf
لووس، حولیی، سالووس، بێ(گرێ، گنج).

**ساف** (ئان) ٢ saf
تەخت، ڕاست.

**ساف{ئاو}** (ئان) ٣ saf(aw)
زوڵاڵ.

**ساف{بەرد}** (ن) ٤ saf(berd)
ساپ، لووس وتەنک.

**ساف** (ئان) ٥ saf
دڵپاک، بێ فڕوفێل.

**ساف** (ن) ٦ saf
دەزووی دوولا، کشتەک.

**ساف** (ئان) ٧ saf
هەموو، گش، گشت.

سافان (ئان) safan
دڵۆپە.
سافاندن (کتن) safandin
دڵۆپەکردن.
سافسافین (ن) safsafên
پانپانۆکێ.
سافۆ (ن) safo
پارزن، پاوەکە، مەسفیی.
سافەندەر کردن (ند) safender kirdin
پاک وەکردن، راماڵیین.
سافیی (ن) safî
دڵپاکیی.
ساڤ (ن،پز) sav
مەلامەت.
ساق (ن،رو) ١ saq
لاسک، ساقەتە، کولەش، تەنە.
ساق (ئان) ٢ saq
جیقنە، ریقنە.
ساق{سەگ} (ن) ٣ saq(seq)
تەپەگوو.
ساق (نک) ٤ saq
پوزەوانە، بەلەک پێچ.
ساقپەڕ (ن) saqper̲
پینە (کەبۆجوانی بەسەر جلدا دای دەدروون).
ساقۆ (ن) saqo
پاڵتۆ، پاڵتە، سامتۆر، باڵتە، ساکۆ.
ساقۆڕ (ن) saqor̲
سەبەتە (گەورە).
ساقۆڵ (ن) saqol̲
قەرتاڵە.
ساقەتە (ن) saqete
کۆتەرەدار.
ساقیی (ن) ١ saqî
ئاوگێر.
ساقیی (ن) ٢ saqî
مەیگێر، بادەچیی، مەیچیی.
ساقیی وباقیی (ن.) saqîw baqî
١- سەوداو مامەڵە.
٢- گۆڕینەوەی شتێ بەشتێ، ئاڵ وگۆڕ، ئاڵوگۆڕ.
ساک (ن،ئا) sak
پالاغ، پەڵخەگامیش، گۆلکا گامیش.

ساکار (ئان) sakar
سادە.
ساکوڵ (ن) ١ sakul
باسک وقۆڵ، ساکووڵ.
ساکۆل (ن) ٢ sakol
گەمژە، بێ فەڕ.
ساکۆڵ (ئان) ٣ sakol̲
قووڵ.
ساگات (ن) sagat
سایە.
ساگوور (ن) sagür
پارشێو، سەحەر.
سال (ن) sal
تەلەبەرد.
سالار (ن) ١ salar
سەردار، سەرکردە، گەورەی کۆمەڵ.
سالار (ئان) ٢ salar
لەسەرخۆ، ژیر، بەئاوەز، سالۆر.
سالاریی (ن) ١ salarî
سەرداریی، گەورەیی، سەرکردەیی.
سالاریی (ن) ٢ salarî
لەسەرخۆیی.
ساڵۆخ (ن) sal̲ox
١- سۆراغ. ٢- دەنگ وباس.
سالۆخدە (ن) saloxde
سۆراغکەر، قاسیت.
سالۆخیی (ن) saloxî
ئامازە.
سالۆس (ن) salos
زمان لووس.
سالوق (ن) ١ salouq
کورک، وردەپەڕی باڵدار.
سالوق (ن) ٢ salouq
تووکی نەرمی گیاندار، وردەخووریی نەرم.
سالوول (ن) salül
١- زینـدانی بەتـەنها لـەژوورێک. ٢- ژووری تـەنها لەبەندیخانە بۆ حەپسێکی تاوان گەورە.
سالیس (ن) salîs
سالووس، داردەستی لووسی بێ گرێ.
ساڵ (ن) sal̲
ماوەی دوانزەمانگ.

**سالان** (ن،ئان) salan
جاران.
**سالانە** (ن) [1] salane
١- دەرامەتی سال، سالاوەر. ٢- مووچەی سالەوسال، سالیانە، سالبڕ، خەراجی سالەوسال.
**سالانە** (ن) [2] salane
سالیانە، هەرسال، تیپەڕبوونی سال بەسەر ڕووداودا.
**سالانە** (ئاک) [3] salane
هەموو سالێک، هەر سالێک، هەر سال.
**سالبۆڕی** (ئان) salborî
پیر، زۆر بەتەمەن.
**سال بە سال** (ئاک) salbe sal
هەموو سالێک.
**سال بە سال خۆزگەم بە پار** (پن)
sal be sal xozgem be par
هەرسالەی دادێ لەسالی ڕابوردوو خراپترە.سالی ڕابووردوو لەئەمسال خۆشتربوو.
**سالخ** (ن) salix
ئاگایی، خەبەر.
**سالدات** (ن) saldat
سەرباز.
**سالدانە سالدانە** (ئاک) saldane saldane
لۆش لۆش.
**سالنامە** (ن) salname
سالپێو، سالنما، سالنوما، تەقویم، ڕۆژنامەی سال.
**سالەوسال** (ئاک) salew sal
سال بەسال، سالی دوای سال.
**سالی ئاییندە** (ئاک) salî ayînde
سالی داهاتوو.
**سالی پڕ** (نل) salî pir
سالی کەبیسە.
**سام** (ن) [1] sam
ساو، ساب، حەیبەت، عەیبەت، ترس، ساوێر، مەترسی، سامەک، سوهن.
**سام** (ن) [2] sam
پایە (بەرزی، بلندیی).
**سامال** (ن،ئان) samal
سایەقە.
**سامال کردن** (کتن) samal kirdin
هەور (لاچوون ویوون بەسایەقە، ڕەوینەوە لەئاسمان).

**سامالە کردن** (کتپ) samale kirdin
مالە کردن (زەوی بۆ دووەم جار)، خیشک لەشیوەرددان.
**سامالی** (ن) samalî
بێ گەردیی.
**سامان** (ن) [1] saman
دارایی، دەولەت، دەسترۆیی (بەپارەو پوول).
**سامان** (ن) [2] saman
ئامان، هێمنیی وئارامیی.
**ساماندار** (ئان) samandar
دەولەمەند.
**سامان دان** (کتپ) samandan
ڕێک خستن.
**سامانگە** (ن) samange
١-خەزێنە. ٢- سندوقی پارەو پوول.
**سام بوون** (کتن) sambûn
پایەبەرزبوون، بەشان وگەورەبوون.
**سامدار** (ئان) [1] samdar
بە(سام،هەیبەت).
**سامدار** (ئان) [2] samdar
سامناک.
**سام کردن** (کتن) sam kirdin
ترسان.
**سام لێ کردن** (کتن) sam lê kirdin
لێ ترسان.
**سام لێ نیشتن** (کتن) sam lê nîştin
زۆر لێ ترسان، سام گرتن.
**سامناک** (ئان) samnak
سامدار، پڕترس.
**سامۆتک** (ن) samotik
تارمایی.
**سامە** (ن) [1] same
١-پەیمان، مەرج. ٢- بڕیار.
**سامە** (ن) [2] same
قەرز.
**سامە** (ن) [3] same
پەناگا.
**سان** (ن) [1] san
سولتان.
**سان** (ن) [2] san
تەپالە.

**سان** (ن) ۳ san
هەسان.
**سان** (ن) ٤ san
تەرز، چەشن.
**سان** (ن) ٥ san
نەریت(کەسێ).
**سان** (ن) ٦ san
جۆر.
**سان** (ن) ٧ san
نمانایی، پیشچاڤیی(سوپایی).
**سانا** (ئان) sana
ئاسان، نەدژوار.
**ساناهیی** (ن،کی) ١ sanahî(ki)
ئاسانیی، بێ دژواریی.
**ساناهیی** (ن،کی) ٢ sanahî(ki)
ئاسوودەیی، بێ خەمیی.
**سان بەستن** (کتن،کتپ) sanbestin
ریز بەستن.
**ساندان** (کتپ) ١ sandan
بەسەرداچوونەوە.
**سان دان** (کتپ) ٢ sandan
پشکنین، بەسەرکردنەوە.
**ساندن** (کتپ) sandin
سەندن.
**ساندنەوە** (کتپ) sandinewe
وەرگرتنەوە.
**ساو** (ئان) ١ saw
لەهەسان دراو، بەهەسان تیژکراو(تیغ).
**ساو** (ئان) ٢ saw
هەتاو.
**ساو** (ن) ٣ saw
ماڵشت.
**ساو** (ن) ٤ saw
مەودای تیغ، تیژایی دەمی تیغ.
**ساو** (ئان) ٥ saw
حەساو.
**ساوا** (ن) ١ sawa
بەرمەمکانە، سوولکە، منالی بچکۆلە، بەچکەی تازەبووی گیاندار.
**ساوا** (ن) ٢ sawa
پسکاو، کشتوکاڵ وگیای تازە لەخاکە دەرهاتوو.

**ساواز** (ئان) sawaz
بێ ئابروو.
**ساوایی** (ن) sawayî
ساڤایی، کاتی منالیی.
**ساودان** (کتپ) sawdan
تیژ کردن.
**ساورمە** (ن) sawirme
داری (وشکی سووتەمەنیی، بێ گرێ، قەلاشکەریی).
**ساوریی** (ن) sawrî
دەقنە.
**ساوە** (ن،نس) ١ sawe
زاڵ، زاوە، عەتارید، بچووکترین ئەستێرەی گەڕیدەیەو نزیکترینیانە لەرۆژەوە
**ساوە** (ن،نا) ٢ sawe
بەرخەل، بەرغەل، گەلەبەرخ.
**ساوەر** (ن) sawer
ساوار، ساڤار، گەنمی کوڵاوی وشکەوە کراوی هاڕراو.
**ساویلکە** (ئان) sawîlke
بەسەزمان، بی فروفێل، سافیلکە، دل سادە.
**ساوین** (کتپ) sawîn
سوون.
**سایە** (ن) ١ saye
سێبەر.
**سایە** (ن) ٢ saye
ژەنگی ئاسن.
**سایەپۆش** (ن) sayepoš
چوخمە، کۆڵانی تەنگ کەسەری دوکانەکان یان خانوەکان گەیشتونەتەوە یەک.
**سایەچەور** (ئان) sayeçewr
سەغیی.
**سایەدار** (ئان) ١ sayedar
سایەبان، بەسێبەر.
**سایەدار** (ن) ٢ sayedar
پەنادەری لێ قەوماوان، کەسێ کەخەلک لەسێبەریا بحەسێتەوە.
**سایەقە** (ن،ئان) sayeqe
سایقە، سا، سامال، ساو، سایی، زرەئاسارە، ئاسمانی بێ هەورو تەم ومژ.
**سایەوشکە** (ئان) sayewišk
چرووکە.

**سبات (ن)** sibat
پایەداریی، بەرقەراریی.
**سبحەینێ (ن،ئاک)** sib<u>h</u>eynê
سبەینێ، سبەی، سبحەی، سبا، سۆ، سۆزی، سبحە، سبەینە، سب، سبێ، سبیانێ، سبەی بەیانیی، سەبینێ بەیانیی، سەبا، سارە، ڕۆژی دوایی، ڕۆژی دادێ، ڕۆژی پاش ئەو ڕۆژەی کەتیایت.
**سبە (ن)** sibe
سبا.
**سبەینان (ن،ئان)** sibeynan
سبحەینان، بەیانیان، لەسەرەتای هەر ڕۆژدا.
**سپا (ن،س)** spa
سوپا.
**سپات (ئان)** ١ spat
سبات، سپیواش، سپیواز، ئامال سپی، کەمێ سپی.
**سپات (ئان)** ٢ spat
ڕەبەن.
**سپاخانە (ن)** spaxane
سپاگە.
**سپاران (ن،س)** spa<u>r</u>an
سوپاران، شارەزا لەمناوەرەی جەنگدا.
**سپارانیی (ن،س)** spa<u>r</u>anî
سوپارانیی.
**سپاردن (کتپ)** ١ spardin
سپارتن، شت لای کەسێ دانان(بۆ ئاگاداریی کردنی).
**سپاردن (کتپ)** ٢ spardin
بەرێ کردن.
**سپاردە (ئان)** ١ sparde
سپارتی، سپاردەیی، سپەردە.
**سپاردە {مردوو} (ئان)** ٢ sparde
بەخاکە سپێردراو، سپوردە.
**سپاردە (ئان)** ٣ sparde
ئەسپێرراو، بەرێ کراو.
**سپارش (ن)** spariš
ڕاسپێریی.
**سپارەیی (ن)** sparey
ئەسپارەیی، ئەسپاردەیی، سپارە.
**سپاس (ن)** spas
سوپاس.
**سپاسکار (ئان)** spaskar
بەئەمەگ، سپاسگوزار، کەسێ کەسوپاسی کەسێ بکا.
**سپاس کردن (کتپ)** spaskirdin
سوپاسگوزاریی دەربڕین.
**سپایی (ن،س)** ١ spayî
سەرباز.
**سپایی (ن)** ٢ spayî
ئەسپایی.
**سپر (ن،م)** spir
مەلۆ.
**سپڵ (ن)** spi<u>l</u>
فاتە ڕەش، سوویە.
**سپڵۆ (ن،ئا)** spi<u>l</u>o
سەگ.
**سپڵۆت (ئان)** spi<u>l</u>ot
پیس، گڵاو.
**سپڵە (ئان)** spi<u>l</u>e
بەدنمەک، چاکەلەبەرچاو نەبوو.
**سپڵی لاووڕگ (خ.)** spi<u>l</u>î lawirg
کەسێ کەنەتەوێ وەهەمیشە لووتیشی بێ بەلووتتەوە.
**سپۆن (ن،رو)** spon
ئەسپۆن.
**سپەر (ن،س)** ١ sper
سپیر.
**سپەر (ن،س)** ٢ sper
قەڵغان.
**سپەند (ن،رو)** sipend
ئەسپەندەر.
**سپی (ئان)** sipî
چەرمگ، چەرموگ، بەڕەنگی بەفر.
**سپیاتیی (نک)** ١ spiyatî
بەرهەمەکانیی شیر (ماست وکەرەو پەنیر).
**سپیاتیی (ن)** ٢ spiyatî
سپیتیی.
**سپیاو (ن)** spiyaw
سپیاف، سیماف.
**سپیاوکردن (کتپ)** spiywkirdin
سپیاف کرن، سپیاو لەدەم وچاودان.
**سپی باو (ئان)** spîbaw
سپیکار.
**سپی بوون (کتن)** ١ spîbün
سپی هەڵگەڕان، ڕەنگی سپی گرتن، چەرمگ بوون.

**سپی بوون (ند)** [2] spîbûn
ترسان، ڕەنگ پەڕین.
**سپی بوونەوە (کتن)** spîbûnewe
سپی واش بوون، چەرمگەویوون، کاڵ بوونەوە، پاک بوونەوە، تەمیزبوونەوە.
**سپیدار (ن،ڕو)** spîdar
ئەسپیندار.
**سپیکاری (ن)** spîkarî
گەچکاریی.
**سپیکاری کردن (کتپ)** spîkarîkirdin
گەچکاریی کردن، دیوار بەگەچ سواغ دان.
**سپی کردن {ئاژەڵی سەربڕاو} (کتپ)** [1] spîkirdin (ajelî serbiraw)
پێست (گوروون، داماڵین).
**سپی کردن (کتپ)** [2] spîkirdin
ڕنینەوە(موو لەپێست).
**سپی کردن (کتپ)** [3] spîkirdin
پاک کردن.
**سپی کردنەوە {دەفری سپی} (کتپ)** spîkirdinewe (defrî sipî).
قەلایی لێدان، بەقەلایی سواخ دان، سپل کردن، سیقال دان، لەژەنگ وژار پاک کردنەوە(قاپ وقاجاغی لەکانزا دروستکراو).
**سپیکەلە (ئان)** spîkele
ئامال سپی، سپی واش، سپیکار، سپیلە، سپی باو.
**سپیلک (ن)** [1] spîlk
گڵەسپی، خاکی سپی.
**سپیلک (ن،جج)** [2] spîlk
ڕشک (گەرای ئەسپێ).
**سپین (ن)** spîn
تیغە.
**سپیواش (ئان)** spîwašš
سپیکەلە.
**سپی هەڵگەڕان (کتن)** spîhelgeran
ڕەنگ بزرکان(بەهۆی ترس یان نەخۆشیی).
**سپێتی (ن)** spêtî
سپیاتیی، سپیایی، چەرمگیی.
**سپێدە (ن)** spêde
سپیدە، سپیەپەهنا، دەمەدەمی ڕۆژ، دماکوڕنێ ڕۆژسفیدە، سپیدەمان.
**سپێر (ن،س)** [1] spêr
سەنگەر.

**سپێر (ن)** [2] spêr
پەدەکیی، ئامرازی زیدەبۆ کاتی پێویست بەکارهێنان.
**سپێناخ (ن،ڕو)** spênax
ئەسپەناخ، سپەناخ، سپناخ.
**سپێنە (ن)** [1] spêne
بەشی سپی لەهێلکە، سپیک، سپیلک، سپوچک، سپیچک.
**سپێنە(چاو) (ن)** [2] spêne(çaw)
سپیلکی چاو.
**سپێوێن (ئان)** spêwin
پڕ لەئەسپێ، ئەسپیاویی.
**ستار (ن)** sitar
ستر، پەناگە، داڵدە.
**ستارکردن (کتپ)** [1] sitarkirdin
داڵدە دان.
**ستارکردن (کتپ)** [2] sitarkirdin
ئارام کردن، دامەکناندن.
**ستارکردن (کتپ)** [3] sitarkirdin
دەست کێشانەوە.
**ستارە (ن،تس)** sitare
ئەستێرە.
**ستایشت (ن)** sitayîšt
مەدح.
**ستایشت کردن (کتپ)** sitayîšt kirdin
مەدح کردن، پێ هەڵگوتن.
**ستران (ن)** sitran
گۆرانی، مەقام، لاوک.
**سترانبێژ (ن)** sitranbêj
گۆرانی بێژ.
**ستراندن (کتن)** [1] sitrandin
گۆرانی گوتن.
**ستراندن (کتپ)** [2] sitrandin
هەویر شێلان.
**سترکردن (کتپ)** sitrkirdin
پۆشین (نهێنیی).
**ستری (ن،ڕو)** sitrî
ئەستری، درک، خێپ، کلەم، قونچر.
**ستۆ (ن)** sito
ئەستۆ.
**ستوور (ئان)** [1] stûr
ئەستوور.

**ستوور (ئان)** ٢ stür
قەڵەو، ئەستوور.
**ستوون (ن)** stün
ئەستوون.
**ستوونیی (ئان)** stünî
شاقوولیی.
**ستەم (ن)** stem
زوڵم.
**ستەمدیدە (ئان)** stemdîde
ستەم لێکراو.
**ستەمکار (ئان)** stemkar
زۆردار.
**ستەم کردن (کتپ)** ١ stemkirdin
ئازاردان، زیان پێ گەیاندن (بەناڕەوا).
**ستەم کردن (کتپ)** ٢ stemkirdin
ئازاردان.
**ستەمگەڕیی (ن)** stemgeȓî
زۆرداریی.
**ستێ (ن)** ١ stê
ئەستێ.
**ستێ (ن)** ٢ stê
دش، خوشکی مێرد.
**ستێ (ن.نس)** ٣ stê
ئەستێرە.
**ستێر (ن)** stêr
ئەستێرک، گۆڵاوێ کە(پێشی گیرابێ، بەردەمەکەی بە دیوار هەڵچنرابێ).
**سجووق (ن)** sicüq
باسووق.
**سچق (ن)** siçiq
باسترمە، پاسترمە.
**سرایەت (ن)** sirayet
ستیرمە، تەشەنە.
**سرایەت کردن {لە نەخۆشیی} (کتن)** sirayetkirdin
تەشەنەکردن.
**سرپاندن (کتن)** sirpandin
چرپە چرپ کردن.
**سرپەسرپ (ن)** sirpesirp
چرپەچرپ، سووسە سووس.
**سرت (ن.رو)** ١ sirt
نرکە.

**سرت (ئان)** ٢ sirt
زبر.
**سرت (ن)** ٣ sirt
ئەرکە.
**سرت (ن)** ٤ sirt
بەلا، چورتم، بەسەرهاتی ناخۆش.
**سرت (ئان)** ٥ sirt
بەرزەفڕ، چاولەبەرزیی.
**سرتەسرت (ن.)** sirtesirt
چرپە چرپ.
**سرتەسرت کردن (کتن)** sirtesirt kirdin
چرپاندن.
**سرتیی (ن)** ١ sirtî
بوێریی، وەپێشەوەچوونی ئازایانە.
**سرتیی (ن)** ٢ sirtî
چەمووشیی.
**سرتیی (ن)** ٣ sirtî
دڵ ڕەقیی، هشکیی.
**سرتیی (ن)** ٤ sirtî
دژواریی.
**سرک (ئان)** sirk
١- سرکێ، سرد، سرت، سڵ، چەمووش، قوشقیی، ڕەوەکە، نوخس. ٢- کێویی، گیانداری نامالیی.
**سرک وهوور (ن)** sirkwhür
مقزمقز، ورتەورت.
**سرکە (ن)** sirke
سهک.
**سرکەسرک (ن)** sirkesirk
چرپە.
**سرکەی دەساڵە (خ.)** sirkeydesale
کۆنەقین، قینی کۆن کەلە دڵدا مابێ.
**سرنج دان (کتپ)** ١ sirincdan
بەوردی لێ ڕوانیین، وردبوونەوە (لەشتێ).
**سرنج دان (کتپ)** ٢ sirincdan
بیر لێ کردنەوە.
**سرووت (ن.رو)** sirüt
لاسکی گژوگیا، ساق، فەسەڵ، قەسەر.
**سروود (ن)** sirüd
گۆرانی نیشتمانیی.
**سرووش (ن)** ١ sirüš
وەحی، فەرمانی خوا بۆ پێغەمبەران (بەهۆی فریشتەوە).

**سروش** (ن) ٢ sirûş

فریشتەی پەیامبەر، جبرائیل، جوبرائیل، یەکێکە لە حەوت فریشتەکان.

**سروە** (ن) ١ sirwe

سووسە.

**سروە** (ن) ٢ sirwe

سر، سریوە، شنە، شنەبا، بای (فێنک وهێواش، بسکان).

**سرە** (ن) sire

سەرە، نۆبە، نۆرە، باو.

**سرەوت** (ن) sirewt

ئۆقرە، ئارام، سرەفت.

**سرەوتن** (کتن) sirewtin

سرەوت گرتن، سرەفتن، سرەویین.

**سریش** (ن) sirêş

سریژ، چریش، ئەسریلک، سترک.

**سریشلەمە** (ن) srêşleme

کاری (ناپوخت، ناتەواو).

**سڕ** (ن) ١ sir̲

چالاکیی.

**سڕ** (ئان) ٢ sir̲

تەزیو، کەسیرە(بوو).

**سڕ{مار}** (ئان) sir̲(mar)٢

تەزیو.

**سڕبوون** (کتن) sir̲bûn

تەزیین، کەسیرەبوون.

**سڕکردن{ئەندامی لەش}** (کتپ) sir̲kirdin(endamî leş)

تەزاندن، بێهەست کردن.

**سڕیی** (ن) sir̲î

تەزیوی، کەسیرەیی.

**سڕیین** (کتپ) sir̲în

پاک کردنەوە، پاک وەکردن.

**سڕینەوە** (کتپ) sir̲înewe

کوژاندنەوە، هەڵ گرتنەوە(نوسراو لەسەرکاغەز)، پاک کردنەوە(پەڵە یان خەت).

**سزا** (ن) ١ siza

پاداشت، سەزا.

**سزا** (ن) ٢ siza

ئازار، جزیا، دەردی سەریی، جەزرەبە، سەزا.

**سزاچەژتن** (کتن) sizaçejtin

سزاچەشتن، تووشی رەنج وئازاربوون، سزا (خواردن، چەشتین)، ئازار ودەردی سەریی ماتنەڕێ، داخ و خەفەت چوونەدڵ.

**سزادان** (کتپ) ١ sizadan

پاداشت دانەوە.

**سزادان** (کتپ) ٢ sizadan

ئازاردان، سەزادان.

**سزادانەوە** (کتپ) sizadanewe

تۆڵە لێسەندنەوە، هەق لێ کردنەوە.

**سزادیران** (کتن) sizadiran

جەزرەبەدران.

**سست** (ئان) sist

سس، شل و ول، تەمەڵ، مردەلۆخە، بێ دەست وبرد.

**سست بوون** (کتن) ١ sistbûn

تەوژم نەمان، لەدەست وبرد کەوتن.

**سست بوون** (کتن) ٢ sistbûn

حەپەسان.

**سست وپەلەفت** (ئان) sistw peleşt

تەمەڵ، تەوەزەل، لەکارنەزان،سستەپەلە، پەلەنەکەر.

**سستەسست کردن** (کتن) siste sist kirdin

خاوەخاو کردن، خۆ لەکار بواردن.

**سستەهۆش** (ئان) sistehoş

گێل، گێژ.

**سستیی** (ن) ١ sistî

تەمەڵیی، لەش گرانیی، خاو وخلیچکیی، بێ دەست و بردیی، ساوەساو.

**سستیی** (ن) ٢ sistî

بێ هێزیی.

**سفت** (ئان) sift

پتەو، سەخت، سخ، زەیە، چنراوێکە شاش نەبێ.

**سفت بوون** (کتن) siftbûn

پتەوبوون، سفت وسۆڵ بوون، شاشیی تیادا نەمان (چنراو)، سەخت بوون.

**سفتۆ بوون** (کتن) ١ siftobûn

دامێزران، دامیزان، لەش گران بوون.

**سفتۆ بوون** (کتن) ٢ siftobûn

خراپ بوون، بۆگەن کردن.

**سفت وسۆ** (ن) siftu so

سفت وسۆس، ئازاروئێش.

**سفت وسۆڵ** (ئان) siftu sol̲

چڕ.

سفته (ن) sifte
ریایی.

سفره (ن) sifre
خوان، کەولی نان لەسەر خواردن.

سفرەدڕ (ن،جچ) ١ sifre diṟ
سیسرکە.

سفرەدڕ (ئان) ٢ sifre diṟ
بێ ئەمەک.

سفور (ن) ١ sifür
گەسکدەری کۆلان، کەناس.

سفور (ن) ٢ sifür
ئافرەتی بێ (عەبا، پووپۆش).

سفەت (ن) ١ sifet
ئەمەکێ، وەفا.

سفەت (ن) ٢ sifet
تاریف، وەسف.

سک (ن) ١ sik
ب (زک).

سک (ن) ٢ sik
ب (زک).

سک (ئان) ٣ sik
ناشرین.

سکاڵا (ن) ١ sikaḻa
دەردی دڵ، داخ وخەفەتی هەڵرێژراوی دڵ، نارەزایی.

سکاڵا (ن) ٢ sikaḻa
گلەیی، لۆمە.

سکاڵا (ن) ٣ sikaḻa
پێشنیار.

سکاڵاکردن (کتپ) sikaḻa kirdin
سکاڵای دڵی خۆ کردن، داخ و خەفەتی دڵ هەڵڕشتن.

سکاڵانامە (ن) sikaḻaname
ڕازونیازی وەسەر کاغەزخراو.

سک برسی، چ ناپرسی (پن) sik birsî, çi naprsî
سک کۆیلەیە چی تێکەیت پێی دائەکەوێ.

سک پڕبوون (کتن) sikpiṟ bün
زک پڕ بوون.

سک چوون (کتن) sikçün
زکێ چوون.

سکڵ (نک) skiḻ
پشکۆ.

سک نانەسەر (کتپ،کتن) sik naneser
زکێ نانەسەر، بەهەڵمەت وئارەزوووەوە شت خواردن.

سکە (ن) sike
پارەی لەکانزا دروست کراو، پول وپارەی لەزێڕو زیو... دروستکراو، پارە، قەرەپوول.

سکە لێ دان (کتپ) sike lêdan
پارەو پوول دارشتن.

سک هەڵگوشین (ند) sik helgušîn
برسی بوون، هەست بە برسیتی کردن.

سل (ن) sil
سلەگوو، تەپەگوو، سللە.

سلف (نک) silf
تلپە.

سلۆرت (ن) silort
بێ ئیشیی.

سلێمانی (ن) slêmanî
جۆری [ بەرد،موورو]ی بەنرخە.

سڵ (ئان) ١ siḻ
سرکێ.

سڵ (ن) ٢ siḻ
سلی، سول، سنە، ڕەو، ڕەوەکێ.

سڵاو (ن) ١ siḻaw
سەلام، سلام، سلاف، سلامالێ.

سڵاو (ن) ٢ siḻaw
پارسەنگێ، سەرسەنگێ، سەلاوانە، خاترانە.

سڵاودانەوە (کتپ) siḻawdanewe
شت کیشان بەتەرازوو بەجۆرێک کەقورستریێ لە سەنگەکە، توزێک گران کیشان (تەرازوو بۆ دڵخۆشیی کڕیار).

سڵ بوون (کتن) ١ siḻbün
زویر بوون.

سڵ بوون (کتن) ٢ siḻbün
ڕاکردن، سرک بوون، ڕەوکردن، هەڵاتن.

سڵ کردن (کتن) ١ siḻkirdin
ڕەوینەوە، کۆکردن، ڕاچلەکیین، هەڵ سلەمینەوە.

سڵ کردن (کتن) ٢ siḻkirdin
شەرم کردن لەڕووی خەڵکدا، کز لێ کردن.

سلەمینەوە (کتن) siḻemînewe
وریا بوونەوە.

سلیی (ن) siḻî
ڕەو.

**سم** (ن) sim

سموچک، نینۆکی ئاژەڵی‌سمدار، سەرپەڕی ڕەقی ئاژەڵ و ولاخی بەرزە.

**سمارتە** (ن) simarte

سماتە، سوماتە، زمپەر، بەردەسماتە، کاغەزی بە وردە ئاسن سواغدراو (ئاسن وداری پێ لووس ئەکەن).

**سماق** (ن.رو) simaq

سماقە، ترش، سفووک، بەری داری ترش.

**سماق دەرێنان** (ئد) simaq derênan

سماق دەرهێنان، ئازار پێگەیاندن، جەزرەبەدان.

**سماقە بوون{لە سەرماوە}** (کتن)

simaqebûn (le sermawe)

لەش ڕەق بوون، ڕەوەنج (ڕەوونج) بوون، تووشی ڕەقیتەبوون.

**سمبڕ** (ن) simbir̲

سم تەراش، سمتاش، ئامرازی سم تاشین.

**سمت** (ن) simt

سمتۆل، سورین، تەراف، لاقوون، کلۆک، ئەستوورایی بەرکەمەر.

**سمڕ** (ن) simir̲

هەراوهوریا، دەنگە دەنگ.

**سمڕاخە** (ن) simr̲axe

ژەنگی گوێ.

**سمڕسمڕ** (ن) simir̲ simir̲

سرمەسرم، هەراوبگر، سنگە سنگ، دەنگە دەنگ ویگرەو بەردە، هەراوچەقە.

**سمکۆڵ کردن {لە سپ}** (کتپ)

simkol kirdin (csp)

سم کۆلان، سمەکوتێ کردن، پێ لە زەوی دان، چەپۆکان کردن، سمەکوتێ کردن.

**سمڵ** (ن.رو) simil̲

سۆتکە، گیایەکی پزیشکییە ڕیزومی ڕەگەکانی بۆن خۆش و بەسوودە.

**سموم** (ن) simûm

بای(سموم، سەبوون).

**سمۆک** (ن) simok

سمەک، ستمۆتک، کونکەر، سمە، سوینە، کونکەر، کونکەرە، کون تێکەرە، کون تێکەر، مەتکەو.

**سمۆرە** (ن.نا) simore

سمبۆرە، سفۆر، سفۆر، سامورر، سمۆلەک.

**سمە** (ن) sime

زمە.

**سمێڵ** (ن) simêl̲

سبێل، زمبێل، سوێل، سمبێل، مووی سەر لێو وبەر لووتی پیاو.

**سمین** (کتپ) simîn

سمتن، سماندن، سۆنتن، کون کردن.

**سنج** (ن.ئم) sinc

زیل.

**سنجاق** (ن) ١ sincaq

سنجاخ ، دەرزی سنجەق.

**سنجاق** (ن) ٢ sincaq

بەیداخ.

**سنجڕان{ئاگر}** (کتن) sincir̲an(agir)

بڵێسەداربوون، گڕ لێ بەرزبوونەوە.

**سنجڕاندن {تەندوور}** (کتپ)

sincir̲andin (tendûr)

داخستن(تەندوور).

**سنجو** (ن.رو) sincû

سنج، سنجی، سنجەی، سینجی، سرینچک، زەیزەفوون.

**سنجوق** (ن) sincûq

سنگ (لەدار، ئاسن).

**سندان** (ن) sindan

سنگان، دەزگا، سندیان.

**سندم** (ن) sindim

پێوەندی ئاسن.

**سندم کردن** (کتپ) sindim kirdin

پێوەند کردن.

**سندۆڵ** (ن) sindol̲

دۆڵ (بۆ برنج یان گەنم تیادا کوتان).

**سندە** (ن) sinde

سمتە، سنە، تۆلا، تۆپەل.

**سنعات** (ن) sin'at

پیشە، کار.

**سنعاتکار** (ن) sin'atkar

پیشەساز.

**سنگ** (ن) ١ sing

سینگ، سینە، لەسک بەرەوژوور تاخوارمل.

**سنگ** (ن) ٢ sing

میخ، سینگ، بزماری ئەستوور(لەدار یان ئاسن).

**سنگان (ن،پز)** singan
سادجن، دەردیکە تووشی لووی لەشی یەکسم دەبێ.
**سنگ داکوتان (کتپ)** singdakutan
میخ چەقاندن بەنهیم.
**سنگ دانە پێش (کتن،کتپ)** singdane pêš
خۆ نواندن.
**سنگ دانە پێشەوە (ئد)** singdane pêšewe
چوونە پێشەوە بەخورتیی.
**سنگ دەرپەڕ (ئان)** ۱ sing derpeṟ
خۆ هەڵکێش.
**سنگ دەرپەڕ (ئان)** ۲ sing derpeṟ
خۆ بەنازازان.
**سنگ کوتان (کتپ)** sing kutan
سنگ قوتان، بەسنگدا ماڵیین، لەخۆدان (بۆ مردنی کەسێ..).
**سنگ لێ کوتان (ئد)** sing lêkutan
دوعا لێ کردن.
**سنگە پێ (ئان)** singepê
چەق، نەبزوو، لەشوێنی خۆ چەقیو.
**سنگە چەلەمە (ن)** singçeḻeme
دەفەی سنگ، پانایی سنگ.
**سنوور (ن)** sinür
سەرحەد، حدود، سەرحەن، کەوشەن.
**سنووربۆ دانراو (ئان)** sinür bodanraw
سنووردار، کەوشەن دیاریی کراو.
**سنەوبەر (ن،رو)** sinewber
سەروو.
**سنێر (ن)** sinêr
ریخ.
**سواخ (ن)** swax
سواغ، سیواخ.
**سواخ دان (کتپ)** swaxdan
سواغ (دان، کێشان)، قوڕ یان گەچ (تێهەڵسوون، پێدا ساوین). **سوار (ن)** ۱ swar
سوارە، سیار.
**سوار (ئان)** ۲ swar
زاڵ، باوخۆش.
**سوار (ئان)** ۳ swar
بلندتر، بەرزتر، سیار.
**سوار (ئان)** ٤ swar
منالێ کەقاچی لەپێش سەریدا دیتەدنیاوە.

**سواربوون (کتن،کتپ)** ۱ swarbün
پەرینەکۆڵی ولاخ، خۆ هاویشتنە سەرپشتی پایسکل.
**سواربوون (کتن)** ۲ swarbün
چوونە ناو (ئۆتۆمبیل..)،
سواری دووچەرخەبوون.
**سواربوون (کتن)** ۳ swarbün
سەرجێی کردن، جووت گرتن (سێکس کردن).
**سوارچاک (ئان)** swarçak
سوارخاس، شۆڕەسوار، چابوک سوار
**سوارە (ن)** sware
دەستەی سواران، کۆمەڵەسوار، کەسانێ کە بەسوارێی برۆن.
**سواری مل بوون (ئد)** swarî milbnbün
زۆرە ملێ کردن.
**سواری پێ کردن{لەسپ} (کتپ)**
swarî pê kirdin(esp)
(چاروا) تالیم دان، فەنتازیی کردن، تیەوکردن، قاڵ کردن.
**سواڵ (ن)** swaḻ
پارسە، دەرۆزە، لەتەچنیی.
**سواڵ کردن (کتن)** swaḻkirdin
پارسەکردن، دەرۆزەکردن، خوازەڵۆکیی کردن، لە تەچنیی کردن.
**سواڵکەر (ن)** swaḻker
دەرۆزەکەر، لەتەچن.
**سواڵەت (ن)** ۱ swaḻet
دەفرێ کەسواڵکەر دەیگێرێ کاتی دەرۆزە.
**سواڵەت (ن)** ۲ swaḻet
۱- پارچەی شکاوی چینی وفەرفوریی..
۲- کاشیەشکاو کەئاووخواردنی سەگ وپشیلەی تێ دەکرێ.
**سوان{لێغ} (کتن)** ۱ swan
ساوان، سوویان، لووس بوون، زبرێ یان تیژیی پێوە نەمان، لەکارکەوتن، کول بوون.
**سوان (کتن)** ۲ swan
ماندووبوون، لەپەل وپۆکەوتن، پەکە کەوتن.
**سوان (کتن)** ۳ swan
سووتان (نابووت بوون).
**سواندن (کتپ)** swandin
سوانن، زبری یان تیژیی (ئامراز..) نەهێشتن. سوانەوە.

**سوانلۆکە** (ن.م) swandoke
چۆلەکە.
**سواندە** (ن) swande
گوێسوانە.
**سواو** (ئان) swaw
ساویاکَ، سیویاکَ، سویاکَ، سایسە، سووراوە، لووس (بوو)، برگە(نەماو، پیوەنەماو)، حولیی، کول، کول بوو.
**سوپا** (ن.س) supa
سپا، لەشکر، ئۆردوو.
**سوپاخانە** (ن.س) supaxane
سوپاگە، سپاخانە، جێی سوپا، سپاگە، بارەگای لەشکر.
**سوپاران** (ن.س) supaṟan
سپاران.
**سوپارانیی** (ن) supaṟanî
سپارانیی، لەشکرکێشیی، لەشکر گێریی.
**سوپاس** (ن) supas
سپاس، ستایش (لەپاداشتی چاکەدا).
**سوپاس کردن** (کتپ) supas kirdin
سپاس کردن، ستایش کردن لەپاداشی چاکەدا.
**سوخت کردن** (کتپ) suxtkirdin
بێ پارە وپوول کردن، داماڵاغاسیی کردن، ماڵ لێ ساندن، هیچ پێ نەهێشتن (پوول وپارە).
**سوخرە** (ن) süxre
بێگار، سوغرە، سۆژە.
**سوغرە پێ کردن** (کتپ) suxre pê kirdin
سوغرە پێ کردن، بێگاریی کردن
**سوخمە** (ن) ١ suxme
زوخە، سەڵتە، سخمە، کوڵونجەی بێ قۆڵ.
**سوخمە** (ن) ٢ suxme
ئەستوون.
**سوراحی** (ن) süraẖî
دۆلکە، تونگە یان شەربەی لەشووشە دروستکراو.
**سورانچک** (ن) surançik
قوڕ قوراگە.
**سورشت** (ن) sürišt
سرشت، خۆکرد، خواکرد، خۆرست، سورووشت.
**سورشتیی** (ئان) sürşitî
خۆڕسکاو، سورووشتیی.
**سورمە** (ن) ١ sürme
کل.
**سورمە** (ن) ٢ sürme
سارمە، سرمە، پارچە ئاوریشمی بەکلابدۆن چنراو.
**سورمەدان** (ن) sürmedan
کلتور.
**سوعبەت** (ن) sü'abet
گاڵتە.
**سونەت** (ن) sünet
خەتەنە.
**سوننی** (ن) ١ sünnî
تیزە، سوننی تاق.
**سوننی** (نک) ٢ sünnî
پەیرەویکەری پێغەمبەر ویارانی.
**سوێ** (ن) ١ swê
ژان.
**سوێ** (ن) ٢ swê
خەفەت.
**سوێ** (ن) ٣ swê
تاسە، سوو.
**سوێ** (ن) ٤ swê
ئاسۆ.
**سوێ** (ئان) ٥ swê
نزیک.
**سوێ بوونەوە** (کتن) swêbünewe
١- خەم خواردن بۆ کەسێ ونەخۆش کەوتن.
٢ - مردن (لەخەمان، داخ) دا.
**سوێدار** (ئان) swêdar
خەمبار.
**سوێر** (ئان) ١ swêr
سۆڵ، سوور، سۆڵەخوا، سوێرمەزە، تام سوێر، پڕ خوێ، سوێرەڵوکە.
**سوێر** (ئان) ٢ swêr
تامەزرۆ، بەئارەزوو، ئارەزوومەند (بۆ شتێ).
**سوێسکە** (ن.م) swêske
سووسکە، سوسکە، سویسکە، زرەکەو.
**سوێند** (ن) swênd
سوێن، سووند، سۆند، سوکەند، سوێنگ.
**سوێند خواردن** (کتن) swênd xwardin
پاکانە کردن (بەناوی خوا..).
**سوێندخۆر** (ن) swêndxor
سوێندخوار، هاوپەیمان.
**سوێنددان** (کتپ) swênddan
پاکانە پێ کردن.

**سویندکەوتن** (کتن) swêndkewtin
سویندی خۆ بەجێ نەهێنان.

**سوێنە** (ن) swêne
تەشتی(گلینە، لەگڵ دروستکراو)، تەشتی قوڕین.

**سوو** (ن)[1] sü
ئێرەیی.

**سوو(لەقەرز)** (ن)[2] sü(leqerz)
سوود، سووت، کرێی پارەی بە قەرز دراو.

**سوو** (ن)[3] sü
بەزەیی.

**سوو** (ن)[4] sü
گلەیی.

**سووت** (کتن) süt
تەپکە، سووتار.

**سووتان** (کتن)[1] sütan
ئـاگر(تـێ بـەربوون، تێچـوون)، سـۆژان، سـووژان، سۆژین، سۆهتن، سووزیان، سۆزان، سووزان، سۆتن، سووتن، شەوتان.

**سووتان** (کتن)[2] sütan
سۆزیان، گڕی دەروون لێبەرزبوونەوە.

**سووتان** (کتن)[3] sütan
سوزان، نابووت بوون.

**سووتان{پارە، قەرز}** (کتن)[4] sütan (pare,qerz)
فەوتان، تیاچوون، لەدەست چوون.

**سووتاندن** (کتپ) sütandin
سووتانن، ئاگرتێ بەردان، سچاندن، سووزاندن، شەوتاندن، سووزانن، سۆژاندن.

**سووتانەوە** (کتن) sütanewe
برژانەوە، سووربوونەوە وەک زلەپێن، سوتیانەوە، سـۆلیینەوە، سـووزیانەوە، چووزانـەوە(پێـست یـان برین).

**سووتاو** (ئان)[1] sütaw
ئـاگر تـێ(چـوو، بـەربراو)، سـووزیاگ، سـووتیاگ، سووزیاو، سووژیاو.

**سووتاو{بۆخوازێ}** (ئان)[2] sütaw(bo xwazê)
ئاواتەخواز.

**سووتاو{لە یاریدا}** (ئان)[3] sütaw(le yarîda)
دۆڕاو.

**سووتاو{قەرز}** (ئان)[4] sütaw(qerz)
فەوتاو، تیاچوو، لەدەس چوو.

**سووتوو** (ن) sütü
خۆڵەمێشی جگەرە.

**سووتەڵ** (ن)[1] sütel̲
سەرەبزووت.

**سووتەڵ** (ئان)[2] sütel̲
لاسووتاو، نیوەسووتاو.

**سووتەمەرۆ** (ئان)[1] sütemero
سەرمابردەڵە.

**سووتەمەرۆ** (ن)[2] sütemero
سەرەبزووت.

**سووتەمەنیی** (ن) sütemenî
سووتەنیی، سۆخت.

**سووتەنیی** (ئان) sütenî
ئاگریسین، پەڵۆختە.

**سووتیان** (کتن)[1] sütyan
سووتان.

**سووتیان** (ن)[2] sütyan
مەمک بەند، سوخمەی مەمک.

**سووتێن** (ئان،ن) sütên
سووتێنەر(کەسێ یان شتێ کەبسووتێنێ).

**سووچ** (ن)[1] süç
تاوان، گونەهـ، گوناح.

**سووچ** (ن)[2] süç
خەتا، هەڵە.

**سووچ** (ن)[3] süç
قوژبن، گۆشە، لا، سیلە، پەنا، کونج، قولینچک.

**سووخۆر** (ن) süxor
سووتخۆر.

**سووخواردن** (کتپ) süxwardin
سوو وەرگرتن.

**سوور** (ن)[1] sür
ئاخاوتنی ڕەپ وڕاست.

**سوور** (ن)[2] sür
شایی.

**سوور** (ن)[3] sür
دیوار (دەوری باغ...).

**سوور** (ئان)[4] sür
ئاشکرا.

**سوور** (ئان)[5] sür
پێ چەقین، پێداگر، سوێر، سەنەو.

**سوور** (ئان)[6] sür
سۆرینگ، سوهر، سۆر، سووێر، بەڕەنگی خوێن.

**سووراو** (ن) süraw

سووراڤک، سوهراف، سۆراف، دەرمانی ئارایشی ژنان بە تایبەتی بۆ لیو ورووومەت سوورکردن.

**سووراوکردن** (کتپ) sürawkirdin

گۆنەولیوئاڵ کردن،، مکیاج کردن.

**سووربلو** (ئان) sürbaw

ئامال سوور، مەیلەوسوور، سوورکەلە، سوورکار، سوورکارە.

**سووربوون** (کتن) ١ sürbün

سوورهەلگەڕان، ڕەنگی سوور بەسەرداهاتن.

**سووربوون** (کتن) ٢ sürbün

چەقیین لەسەر ڕای خۆ، پێ داگرتن (لەسەر کارێ..).

**سووربوون** (کتن) ٣

sürbünewe (gošt le naw ṟonda)

ئاڵ بوون، سوورەوە بوون.

**سووربوونەوە** (کتن) sürbünewe

سوور(هەلگەڕان، داگەڕان) ڕوومەت، شەرم گرتن ورووومەت سووربوونەوە، سوورەوە بوون، دەموچاو سووربوون لەشەرمان.

**سوور داگەڕان** (کتن) sürdageṟan

سووربوونەوە.

**سووڕ** (ن) ١ süṟ

چەرخ.

**سووڕ** (ن) ٢ süṟ

خول.

**سووڕ** (ن) süṟ

سەما، چەرخەوخول، زڤڕ.

**سووڕاندن** (کتپ) süṟandin

چەرخاندن.

**سووڕاندنەوە** (کتپ) ١ süṟandinewe

خولاندنەوە.

**سووڕاندنەوە** (کتپ) ٢ süṟandinewe

گەشت پێ کردن، گەڕاندن.

**سووڕانەوە** (کتن) ١ süṟanewe

بەرەودواهاتنەوە، زڤڕان، گەڕانەوە.

**سووڕانەوە** (کتن) süṟanewe

خولانەوە.

**سووڕانەوە {بێ ئامانج}** (کتن) ٢

süṟanewe(bê amanc)

گەڕان بەولاولادا، گەڕان، گەڕیان، خول خواردن.

**سووڕخواردن** (کتن) süṟxwardin

سووڕانەوە.

**سووڕدان** (کتپ) ١ süṟdan

خول (دان، پێ خولردن).

**سووڕدان** (کتن) ٢ süṟdan

سەما کردن.

**سووڕدان** (کتپ) ٣ süṟdan

تووڕدان.

**سوورفل** (ئان) sürfil

١- سوور (خوول، پڕنۆل).٢ - شل، منجل.

**سوورکار** (ئان) sürkar

سووریاو.

**سوورکراوە** (ئان) sürkirawe

سوورەوەکراو، سوورەوە بوو، سوورەوە بووگ، سوور کراوەوە، سوورەوەکریاو.

**سوورکردن** (کتپ) ١ sürkirdin

بەرەنگی سوور ڕەنگاندن..

**سوورکردن** (کتپ) ٢ sürkirdin

گەنم لەکاوکۆتەڵ (جیاکردنەوە، دەرخستن).

**سوورکردن** (کتپ) ٣ sürkirdin

برینداركردن.

**سوورکردنەوە {کل، خشت}** (کتپ) ١

sürkirdinewe (kil̲,xišt)

خستنە ناو کل (بۆ سوورکردنەوە).

**سوورکردنەوە** (کتپ) ٢ sürkirdinewe

ئاڵ کردن، لەڕۆندا چزاندن.

**سوورکردنەوە {کانزا}** (کتپ) ٣

sürkirdinewe (kanza)

کانزا بەتینیگەرما نەرم کردن.

**سوورکەوە {لەسپ}** (ئان) sürkewe

سوورکەوکێ.

**سوورگوم کردن** (ئد) sür gum kirdin

وون کردن، بێ سەروشوین کردن.

**سووروسپی** (ئان) sürwspî

ڕەزاسوورکە.

**سوورەتاو** (ن) süretaw

سوورەهەتاو، گەرمایی بەتەوژمی خۆر، گەرمای قرچەی نیوەڕۆ(لەهاویندا).

**سوورەچنار** (ن،ڕو) süreçinar

چناری جەوهەردار، پەلک.

**سوورەوەبوو** (ئان) sürewebü

سوورکراوە.

**سوورهه‌ڵدان (کتپ)** sürheldan
به‌ده‌وری خۆدا خولاندنه‌وه.

**سوورهه‌ڵگه‌ڕان (کتن)** sürhelgeran
تووڕه‌بوون.

**سوورهه‌ڵگه‌ڕاو (ئان)** ١ sürhelgeraw
سووربۆوه (له‌شه‌رمان).

**سوورهه‌ڵگه‌ڕاو (ئان)** ٢ sürhelgeraw
ڕه‌نگی سوور به‌سه‌رداهاتوو

**سووریی (ن)** sürî
سووراتیی، سووریتیی، سووریه‌تیی، سوزهریی، سوورایه‌تیی.

**سووریژه (ن.پز)** sürêje
سووریجه، سۆرکه، سووریچکه، سوورانچکه، سه‌ره‌جه، ئه‌سپه، سووریکه، سووریکه، سوهرکه، سویریژکه.

**سووریێنچک (ن)** sürênçik
سوورانچک، سۆریچک، سوورینچکه، سوورینه، سوهریچک.

**سووزانی (ئان)** süzanî
ئافره‌تی خۆفرۆش، سووزمانی.

**سووزمه (ن)** süzme
پالووکه.

**سووژن (ن)** süjin
سوژنن، سیژن، شیژن، جه‌والدوز.

**سووژن ئاژن کردن (کتپ)** süjin ajin kirdin
به‌سوژن کون کون کردن.

**سووسه (ن)** ١ süse
سوسه، سسروه، ده‌نگوباسێکه به‌شتا بلاونه‌بوبیته‌وه، ده‌نگ وباسی سه‌رپێیی.

**سووسه (ن)** ٢ süse
قاسیتیی.

**سووک (ئان)** ١ sük
سفک، نه‌سه‌نگین، دژو: گران، قورس.

**سووک (ئان)** ٢ sük
زوو، بله‌ز.

**سووک (ن)** ٣ sük
بازاڕ، مه‌یان(مه‌یدان)ی کڕین وفرۆشتنی پێویستیی ڕۆژانه.

**سووک (ئان)** ٤ sük
چرووک، بێ(مایه، ڕێز، قه‌در).

**سووک{قسه} (ن)** sük(qise)
ئاخاوتنی ناپوخت.

**سووکبار (ئان)** sükbar
بارسووک، بێ ئه‌رک.

**سووک بڕۆ سه‌لامه‌ت وه‌ره‌وه (پن)** sük biro,selamet werewe
له‌سه‌رخۆیی، دڵنیایی له‌دوایه.

**سووکبوون (کتن)** ١ sükbün
ئاسان بوون، گیروگرفت له‌به‌ر ده‌مدانه‌مان، سفک بوون.

**سووک بوون (کتن)** ٢ sük bün
چرووک بوون، بێ(ڕێز، قه‌در)بوون.

**سووک ده‌ست (ئان)** sükdest
ده‌ست سووک.

**سووک کردن (کتپ)** ١ sükkirdin
ئاسان کردن، گیروگرفت له‌به‌رده‌م(شتێکدا) نه‌هێشتن.

**سووک کردن (کتپ)** ٢ sük kirdin
له‌کێش (که‌م کردن، هێنانه‌خوار).

**سووک کردن (کتپ)** ٣ sük kirdin
ئابڕووبردن.

**سووکیی (ن)** ١ sükî
سفکیی، کێش که‌میی.

**سووکیی (ن)** ٢ sükî
بێ (ئابڕوویی، نرخیی).

**سوول (ن)** ١ sül
پلووسک.

**سوول (ن)** ٢ sül
سۆلاف.

**سوول (ن)** ٣ sül
جوڕنه.

**سوون (کتپ)** sün
ساوین، سیویان، سویان.

**سوونه‌وه {تیغ} (کتپ)** sünewe
ساودان، له‌هه‌سان(دان، سوون)، ساویان، ساوان، ساویین، سوینه‌وه (تیغ بۆ تیژکردن)، سووین، سوانه‌وه، به‌هه‌سان تیژ کردن.

**سۆپا (ن)** sopa
زۆپا.

**سۆراغ (ن)** sorax
سالۆخ، سۆراخ.

**سۆراغ کردن {به پرسیار} (کتپ)**
sorax kirdin (be pirsyar)
سۆراخ کردن، به‌دووداگه‌ڕان، له‌دووگه‌ڕان، چوونه‌بنج

**کورسی** ( ن ) kursî ٢
تەختی پاشا.
**کوژاندنەوە {ئاگر}** ( کتپ ) ١ kujandinewe
کوژاندنەڤـە، تەمرانـدن، کوژانـدن، وەکوژانـدن،
کوژاننەوە، خامۆش کردن.
**کوژاندنەوە** ( کتپ ) ٢ kujandinewe
پاکێ کردنەوە، وەکوژاندن.
**کوژانەوە {ئاگر}** ( کتن ) kujanewe(agir)
دامرکانـەوە، تـەمران، نـەمان، ڤـەکوژان، وەکـوژان،
خامۆش بوون،
کوژیانەوە، دامرانەوە.
**کوژەر** ( ن ) kujer
پیاوکوژ، کووژەوە، خوینرێژ، خوینیی، کوژەکێ.
**کوشتار** ( ن ) kuštar
کوژتنی( بەکۆمەڵ، دەستە جەمعی )، حەمامی خوین،
قەتلوعام.
**کوشتارگە** ( ن ) kuštarge
کوشتارگا، سەربڕینگە، قەسابخانە.
**کوشتن** ( کتپ ) kuštin
کـوژتن، کـوژیین، مرانـدن، گیـان( لەبـەر بـڕیین،
دەرهێنان ).
**کوشندە** ( ئان ) kušinde
کوژندە، کوژنە، کوشننە، بکوژ.
**کول** ( ئان ) kul
نەبڕ، کۆ، سوو، کیل، سواو، کەرۆ، نەتیژ.
**کولاندنەوە** ( کتپ ) kulandinewe
وەژان( هێناندنـەوە، خـستنەوە ). وەئـازار
( هێناندنەوە بردنەوە ).
**کولانەوە** ( کتن ) kulanewe
( وە ژان، وەئازار، وەئێش ) هاتنەوە.
**کول کردن** ( کتپ ) kul kirdin
تیژیی تیخ..نەهێشتن.
**کولەمەرگی** ( ن ) kulemergî
کولەمـەرگی، کـوێرەوەر، ژیـانی پـڕ لەدەردەسـەری،
گوزەرانی پڕ کەموکووڕی.
**کوڵ** ( ئان ) ١ kul̲
کۆتا، کورت، قوڵ، قولە.
**کوڵ** ( ن ) ٢ kul̲
سۆز، قولپی دەروون.
**کوڵ** ( ن ) ٣ kul̲
قولپ، قولپە، جۆش، قولت.

**کوڵان** ( کتن ) ١ kul̲an
قولپ دان، قولان، کـولیین، کولیـان، کـەلیین، هاتنـە
(کوڵ، جۆش ).
**کوڵان** ( کتن ) ٢ kul̲an
پوخت بوون، پێگەیشتن ( گۆشت.. ).
**کوڵاندن** ( کتپ ) kul̲andin
لێنان، کوڵانن.
**کوڵاو** ( ئان ) ١ kul̲aw
جۆش هاتوو، کولیو.
**کوڵاو** ( ئان ) ٢ kul̲aw
پوختەبوو.
**کوڵکە** ( ن ) ١ kul̲ik
قرخ ، کولکە، موو یان خوریی کورت.
**کوڵکە** ( ن ) ٢ kul̲k
تووش، دووچار، دوچار، هەڵویستی ئاڵۆز.
**کوڵکن** ( ئان ) kul̲kin
کولکنە، تیسکن، تووکن، زۆربەموو.
**کوڵم** ( ن ) kul̲m
کولمە، سەرگۆنە، ڕوومەت.
**کون** ( ن ) ١ kun
کەلەبەر، دەلاقە، شەبەق.
**کون** ( ن ) ٢ kun
شار، شارا.
**کوناودەر** ( ئان ) kunawder
کون( تێبوو، کراو )، سماو، سمراو، کون ( لەهـەردوک
دیوەوە ).
**کونج** ( ن ) ١ kunc
سووچ.
**کونج** ( ئان ) ٢ kunc
خاڵخاڵاویی.
**کون کردن** ( کتپ ) ١ kunkirdin
کون تێکردن، کوناودەر کردن، سمیین.
**کون کردن {کچ}** ( کتپ ) ٢ kunkirdin(kiç)
سەرگوڵ بردن، کچێنی ( بردن، بۆ نەهێشتن ).
**کووڕ** ( ئان ) ١ kür̲
خوار، خوارەوەبوو.
**کووڕ** ( ئان ) ٢ kür̲
چەماو، کرکێ( پشت ).
**کووڕ** ( ئان ) ٣ kür̲
لێژ، سەربەرە( خوار، ژێر ).
**کوورە** ( ن ) ١ küre
سۆپە، زۆپا.

**کوره** (ن) ٢ küre
کل. مەوەر.
**کوز** (ن) küz
قاش(لەمیوە).
**کوێر** (ئان) kwêr
نابینا، کوێر، کوێرە، بێ چاو.
**کوێرەوەری** (ن) kwêrewerî
کولەمەرگی.
**کوێستان** (ن) kwêstan
زۆزان، سەردەسێر.
**کۆ** (ن) ١ ko
زۆرشت پێکەوە.
**کۆ** (ن، ئس) ٢ ko
پێرو، پێرۆ، کۆمەک، کۆمکا سێویان، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە لە ناوەراستی ئاسماندا، بورجی.
**کۆ** (ن) ٣ ko
سلێی، رەوەکیی، رەو.
**کۆبوونەوە** (کتن) kobünewe
گردبوونەوە، خڕبوونەوە.
**کۆپارە** (ن) kopare
کۆپار، گۆپارە، کۆپانە، کۆمەڵەبەزی سەر پشتی حوشتر.
**کۆتابوون** (کتن) kotabün
تەواوبوون، کۆتایی هاتن.
**کۆتاکردن** (کتپ) kotakirdin
تەواوکردن، کۆتایی پێ هێنان.
**کۆتایی** (ن) kotayî
ئاکام، ئەنجام، کۆتاهیی، دوایی(هەمووشت).
**کۆتایی هاتن** (کتن) kotayî hatin
دوایی هاتن، کۆتا هاتن، گەیشتنە(ئەنجام، کۆتایی).
**کۆتایی هێنان** (کتپ) kotayî hênan
دوایی هێنان، گەیاندنە ئەنجام، کۆتایی پێدان.
**کۆتەڵ** (ن) ١ kotel
کۆزەرە، کۆزەر، سەرکۆزەر، سەرکوێن، کۆزەڵ (دانەویلە).
**کۆتەڵ** (ن) ٢ kotel
دارستانی چوخور.
**کۆچ** (ن) ١ koç
١- رەو. ٢- مەڕا، بەز.
**کۆچ** (ن) ٢ koç
گەشت، باربەندیی.

**کۆچ کردن** (کتن) koçirdin
کۆچان، بارکردن.
**کۆچەر** (ن) koçer
کۆچەریی، رەوەند، خێلات، چادرنشین، چۆل پەرست.
**کۆچی دوایی** (ن) koçî dwayî
ئاکامی ژیان، مەرگ.
**کۆر** (ن) kor
کژ، کژم.
**کۆرپە** (ن) korpe
بەرمەمکانە،شیرەخۆرە،کۆرپەلە، ساوا.
**کۆزەر** (ن) kozer
کۆتەڵ، قەسەڵی بن خەرمان.
**کۆسپ** (ن) ١ kosp
کۆس، بەرگر، قۆرت، تەوەرە.
**کۆسپ** (ن) ٢ kosp
بەلا، تەگەرە، کۆسپە، قۆرتی رۆژگار.
**کۆسپ** (ن) ٣ kosp
بەد(بەختیی، تاڵەیی).
**کۆست** (ن) kost
کزیی، پەرۆش، خەم، پەژارە، کەسر، بار، مەینەت.
**کۆش** (ن) ١ koš
سەرمەردووران (مروڤ).
**کۆش** (ن) ٢ koš
تەقەلا، تەقالا.
**کۆشش** (ن) košiš
کۆشە، کۆشەش، کۆشەوە، هەوڵ، تەلاش، داکۆکیی.
**کۆشک** (ن) košk
قەسر، باڵەخانەی چواردەور باخ وباخات.
**کۆک** (ن) ١ kok
سەردروو، باقیە، شلاڵە، تەقەڵی(شاش، درشت)، درونێ کە تەقەڵەکانی گەورەو لەدەرەوەبن.
**کۆک** (ئان) ٢ kok
تەبا، تیوان(خۆش، ئاشت، رێک).
**کۆکردن** (کتن) kokirdin
رەم کردن، داچلەکین، سلەمینەوە.
**کۆکردنەوە** (کتپ) ١ kokirdinewe
خڕکردنەوە، کۆمەڵەکردن، جەم کردن.
**کۆکردنەوە** (کتپ) ٢ kokirdinewe
پەسمەندەکردن.
**کۆکە** (ن،پز) koke
کۆخە، قۆزە، قف.

**کۆکین** (کتن) kokîn
کۆکەکردن، کۆخین، قفەکردن، قۆزیین، قفیین.
**کۆگا** (ن) ۱ koga
موغازە، دوکانی وردەوالا.
**کۆگا** (ن) ۲ koga
کۆمەلە، کۆگە، کەلەکە، رەپەلە، رەپەل.
**کۆل** (نان) ۱ koḻ
قرتاو (دەست یان پەنجە).
**کۆل** (ن) ۲ koḻ
سەرشان، قەلاندۆش، پشت(بەلای هەردووشانەوە).
**کۆلان** (ن) ۱ koḻan
کووچە، تاخ ، دەربوونە، ریرەوێ کەلەوسەرەوە دەردەچێ.
**کۆلان** (کتپ) ۲ koḻan
هەلکەندن، ناوملۆل کردن، هەلقەندن.
**کۆل دان** (کتن) koḻ dan
۱- بەزیین، تەسلیم بوون. ۲ - پشت دادان، مل دان. ۳- هیوا(بران، نەمان).
**کۆلکە زێرینە** (ن) kolke zêrîne
کۆلکەرەنگینە، ئەستونەزێرینە، پەلکەرەنگینە، کۆلەکە زێرینە، کەسکوسۆر.
**کۆلکێش** (ن) koḻkêš
کۆلکەر، کۆلبەر، کۆل هەلگر، حەمال.
**کۆل نەدەر** (نان) koḻneder
نەبەز.
**کۆلەکە** (ن) koḻeke
کۆلەگە، ئەستون، ستون، ئەستوند، ستینک، هەسوون، ئەستوندەک.
**کۆلە مستە** (ن) koḻe miste
کۆلەمشت، مستەکۆلە، مشتەکۆلە.
**کۆلین** (کتپ) koḻîn
هەلکەندن، هەلکۆلیین.
**کۆلینەوە** (کتپ) koḻînewe
توێژینەوە، وردکردنەوە و لێک دانەوە، توێژانەوە.
**کۆم** (ن) ۱ kom
دەرچەی قنگ، شوێنی پیسایی لێوەکردن.
**کۆم** (نان) ۲ kom
قەموور، قۆز، قۆپ، پشت(کووپ، چەماو).
**کۆم بوونەوە** (کتن) kombünewe
چەمانەوە، چەمینەوە، کۆمانەوە، چەوتانەوە.
**کۆمەک** (ن) komek
۱- یاریدە، یاریە، یارمەتیی.
۲- دەسیاریی، باربوو.
**کۆمەل** (ن) ۱ komeḻ
کۆ، گردەوەبوو تۆپەل.
**کۆمەل** (ن) ۲ komeḻ
ئاپۆرە، جڤات، مۆل.
**کۆمەل بوون** (کتن) komeḻbün
کۆوەبوون، گردبوونەوە، کۆمەلەبەستن.
**کۆمەل کردن** (کتپ) komeḻkirdin
گرد کردنەوە، خستنەسەر یەک.
**کۆمەلە** (ن) komeḻe
پرایی خەلکان، لێک گردەوەبووی کەسان، یەکێتیی.
**کۆن** (نان) kon
۱- کەون، کەهەن، کەیەن، کومۆن، شتی زۆر بەکار ۲- دێرینە، پێشونان.
**کۆنگرە** (ن) kongre
کاری کۆبوونەوە، کۆنگەرە.
**کۆنە پەرست** (نان) kone perist
کەللەکۆن، کەسێ کەبەتازەداهاتوو رازیی نییە، لەسەر بیروباوەڕی کۆن، راست رەو.
**کە** (نپ) ۱ ke
ئەگەر، ئەگەرەکو، گریمان.
**کە** (نپ،ناک) ۲ ke
هەر(دەمێ، کاتێ، وەختێ).
**کەبات** (ن،می) kebat
نارنجی مەیلەو زەردی گرنج گرنج، جۆرێ نارنجی زلە.
**کەپر** (ن) kepir
سابات، سایەبان، سەیوان، سایەوان، خانۆچکەی لە شوول وقامیش.
**کەپرۆکە** (ن) keproke
توێژ، توێژالک، کەپرە.
**کەپرۆکە بەستن** (کتن) keproke bestin
توێژ لەسەر پەیدابوون، توێژالک لەسەر پەیدا(کردن، بوون).
**کەپرەشینە** (ن) keprešîne
کەپرەسەوزە، جەژنێکی جولەکەیە.
**کەپوو** (ن) kepü
لووت.
**کەپەک** (ن) kepek
سەرمێلەک، سۆ، سۆس، سۆست، گرێک، توێکلی دانەوێلەی هاڕاو.

**کەتان** (ن.ڕو) ketan
١- ڕووەکی کەتان، تۆوکەتان.
٢ - قوماشـێکەتان، قوماشـێکی سـپیی تەنکـە لەکەتان دروستکراوە، کەتەن.
**کەتن پێ کردن** (کتپ) ketin pê kirdin
تەڕن پێدان، فریودان، بەهەڵەبردن.
**کەتن کردن** (ند) ketin kirdin
کاری خراپ کردن.
**کەتە {مرۆڤ}** (ئان) kete(mirove)
تــەژە، کــەتوکلفت، زل، زەبــەلاح، تیکـسمراو، تــێ سمرپاکێ، کەتێ، قەبە.
**کەتیرە** (ن) ketîre
گــەون، شـیرەی وشـکەوەبووی (گـەوەنکێ، گـوینیی جەباریی).
**کەچ** (ئان) keç
کـەج، کـەل، گـێر، خـوار، خێـچ، چـەوت، چـەفت، لار، ناراست.
**کەچەڵ** (ئان) keçel
کەچەر، کەلەش، سەر بێ تووک و موو.
**کەحێل{ئەسپ}** (ن.ئا) kehêl(esp)
کەحلان، ئەسپی(ڕەسەن،حدود)، کەحیل.
**کەر** (ئان) [1] ker
دەبەنگێ، گەوج، نەفام.
**کەر** (ن.ئا) [2] ker
گوێ درێژ، بارەبەری بەزەرە زەڕ، خەر، کەهر، هەر.
**کەرانە** (ئان) kerane
کەرەکیی، کەرکیی، وەکێ کەر.
**کەرپووچ** (ن) kerpüç
خشت، کەلپیچ.
**کەرت کردن** (کتپ) kert kirdin
لەت کردن، بەش کردن، بەش بەش کردن.
**کەرت وپەرت** (ئان) kertw pert
پەرش وبڵاو، لەت لەت.
**کەرخ** (ن) [1] kerx
سنوور، کەوشەن.
**کەرخ** (ن) [2] kerx
لا، ئالی.
**کەرسەک** (ن) kersek
گلمتک، کەرسەکێ، کەستک، کەستەک، کلـۆگل، سـن، سندە.
**کەرکردن** (کتپ) kerkirdin
فریودان، خەڵەتاندن.

**کەرکە** (ن) kerke
شێوە دورگە، کەرگراف، زەوییەکێ سێ لای، ئـاویێ و لایەکی وشکانیی.
**کەرۆکە** (ئان) keroke
حۆل، گێلۆکە.
**کەرویشک** (ن.ئا) kerwêšk
کیفرۆشک، کەرووشک.
**کەرویشکە خەو** (ن) kerwêškc xew
سەرخەو، سووکەخەو.
**کەرویشکە کردن** (کتن) kerwêškekirdin
زنجیرەکردن، شەپۆل دان، بزوتنەوە بەدە م باوە.
**کەرە** (ن) kere
نفیـشک، ڕۆنیقــاڵ نــەکراو(لەماســت یــان شــیر دەرهێنراو).
**کەرەستە** (ن) kereste
١- کەرستە، کەرەسە، وردەبابەت.
٢ - ئامرازی شت لێ دروست کردن.
**کەرەکێویی** (ن.ئا) kere kêwî
کەرەکێــڤیی، خـــەرگۆر، خەرگۆلک،کەرەکووڤـــی، گۆرەکەر.
**کەرەم** (ن) [1] kerem
بەخشش، دانی بێ قەرەبوو.
**کەرەم** (ن) [2] kerem
بەهرە، فایدە، کەڵک.
**کەرەمدار** (ئان) keremdar
کەرەمکار، جوامێر.
**کەرەوز** (ن.ڕو) kerewuz
کەرەوس، کەرسەپ، کرسپ.
**کەرەوێتە** (ن) kerewête
کراوات، کەرەوات، قەرەوێتە، بۆیمباغ، بۆینباخ.
**کەرێتی** (ن) kerêtî
کەریی، بێ ژیریی، کەریەتیی، کاری بێ ئەقلانە.
**کەری دێز** (ن.ئا) kerîdêz
کـەری(ڕەشـی مەیلـەو بـۆر) کەلەبـەر کەلاـەڕەقیی خــۆی دەخاتــە تەنگوچەڵەمــەوە بــۆ زەرەردان لەخاوەنەکەی مەبەست: مرۆڤی کەلاـەڕەقە.
**کەڕ** (ئان) [1] keṟ
کەڕیل، کەهڕ، نەبیس، نەژنـەوا، گـوێ (کـپ، گـران)، کەهڕۆ.
**کەڕ** (ئان، خ) [2] keṟ
زۆر سارد.

**کەڕ** (ئان) ٢ ker
تیر، خەست (ماستاو).
**کەڕبوون** (کتن) kerbûn
کپ بوون، گران بوون.
**کەڕوو** (ن) kerû
کەڕە، کەڕەکیفە، کەڕەوڵ، بڕش، کفکە، تویژاڵکی شین(سەوز) کە لەسەر(نان، خواردەمەنیی..) دەنیشێ.
**کەڕووهەڵهێنان** (کتن) kerû helhênan
کەڕوو(هێنان، هەڵهێنان)، بڕش هەڵهێنان، کەڕوایی بوون.
**کەڕووهەڵهێناو** (ئان) kerû helhênaw
کەڕووایی، کەڕوو هەڵهاوردوو بڕش هەڵهێناو.
**کەڕەت** (ن) keret
جار، بار، بارە، دەفعە، دەحفە، چەل، کەشە، وارە.
**کەڕەسیسە** (ن) keresîse
کولوە بەفری تەنکی ورد، کلوەبەفر بەدەم بای ساردەوە، پرووشە بەفرکەکزەبا ئەیهێنێ و ئەیبا.
**کەڕەواڵە** (ئان) kerewale
حۆل، کەم ئاوەز.
**کەڕی** (ن) kerî
گوێ گرانیی، نەژنەوایی، نەخۆشیی کپ بوونی گوێ.
**کەزی** (ن) kezî
ئەگریجە، بسک، پرچۆکە، زولف، زلف.
**کەژ** (ن) ١ kej
گرد.
**کەژ** (ن) ٢ kej
شوێنی هەڵەموت
**کەژ** (ئان) ٣ kej
زۆرسپی، فرەچەرمگ، فریە چەرموو.
**کەس** (ن) ١ kes
ئەفەر، تاکێ لەبنیادەم.
**کەس** (ن) ٢ kes
کەسوکار، خزم، خوێش.
**کەساس** (ئان) kesas
زەبوون، بێ سەرویەر، حاڵ پەریشان.
**کەسایەتیی** (ن) kesayetî
کەسێتیی، خزمایەتیی.
**کەس نەزان** (ئان) kes nezan
نادیار.
**کەسەر** (ن) keser
خەم، خەفەت، پەژارە.

**کەسیی** (ئان) kesî
(تایبەت، تایبەتیی، سەربە)مرۆڤێ.
**کەسیرە** (ئان) kesîre
سڕ، سەرما بردوو، کرژهەڵاتوو لەسەرماندا، تەزیو (لە سەرمان).
**کەش** (ن) keš
ئاووهەوا، چۆنایەتیی هەوا.
**کەشتی** (ن) keštî
گەمی، گەمیە، پاپۆڕ، واپۆڕ.
**کەشتی گەل** (ن) keštî gel
کاروانە کەشتیی.
**کەشتیوان** (ن) keštîwan
گەمیەوان، پاپۆڕەوان، کەشتیڤان، کەشتیەوان، قەفتان، خەفتان.
**کەشخەیی** (ن) ١ kešxeyî
ڕێکیی و جوانیی.
**کەشخەیی** (ن) ٢ kešxeyî
فیز، دەعیە.
**کەشکەژنۆ** (ن) keškejino
کلاوەی ئەژنۆ، کاسەی زرانی، کەشکەزرانی.
**کەشەنگ** (ئان) kešeng
شەکەت، ماندوو.
**کەف** (ن) kef
کۆمەڵە بلقی سابوناو.
**کەفارەت** (ن) kefaret
تۆڵەی تاوان.
**کەفاو** (ن) kefaw
کەفی سابوون، سابووناو.
**کەفتەکار** (ن) keftekar
لەکارکەوتوو، عەمەلمەندە، زەبوون.
**کەف کردن** (کتن) kef kirdin
کەف لێ پەیدابوون.
**کەف لێ‌دان** (کتپ) kef lêdan
خەڵەتاندن
**کەڤر** (ن،کی) kevir(ki)
گابەرد، بەردی زل.
**کەل{مانگ}** (ئان) ١ kel(mang)
مانگی نوێ(لە ئاسمان).
**کەل** (ن) ٢ kel
چیا، شاخ.
**کەل** (ئان) ٣ kel
لا(شکاو، لێتەکراو، پێوەنەماو).

کەڵ (ئان،کی) [1] kel(ki)

گەرم، داغ، پرتینی گەرمیی.

کەلا (ئان) kela

کلا، دوورەپەرێز.

کەلار (ئان) kelar

کەلەکەکراو، لەسەریەکە دانراوی بلندەوەبوو.

کەلاک (ن) kelak

کەلاش، کەلاخ ، لاکە، لاشە.

کەلاوە (ن) kelawe

١- کاول، ویرانە، خاپوور.٢ - ویرانە، ئاسەوار، خانووبەرەی داڕووخاو و داتەپیو

کەل کردن (کتپ) [1] kel kirdin

لا لێ(کردنەوە، وەکردنەوە، وەکردن ).

کەل کردن (کتپ) [2] kel kirdin

بەل کردن، پەل کردن، لێ برین، تیکە لێ کردنەوە.

کەللە (ن) kelle

سەلکە، لەئەستۆ بەرەوژوور، سەر.

کەللە پاچە (ن) kelle paçe

کەلەپاچە، کەلوپا، چێشتی سەروپێ.

کەللە رەق (ئان) kelle r̲eq

رەق ئەستوور، تووڕەوتڕۆ، کەللەشەق، تووڕەوتۆسن، گژو فش.

کەللەیی (ئان) kelleyî

شێتگیر(بوو).

کەڵ وپەل (نک) [1] kelw pel

ئەسپاباتی ماڵ، وردەواڵەی ناوماڵ، شتومەکی ناوماڵ.

کەڵ وپەل (نک) [2] kelwpel

جل وبەرگ.

کەلەبەر (ن) keleber

١- کەلەوەر، قەڵش. ٢- دەرەتانی(تەنگە، نارەحەت)، ڕێگەی تەنگە.

کەلە پاچەکردن (کتپ) kelepaçe kirdin

لەت وکوت کردن، لەت وپەت کردن،ئەنجن ئەنجن کردن، هەلا هەلا کردن.

کەلەپچە (ن) kelepçe

پێوەند، دەستبەند، ئەڵقەوقفل وزنجیری لەئاسن دروستکراو بۆ دەسی تاوانبار.

کەلەپۆ (ن) kelepo

ئاسۆ، ئەوجێگایەی خۆری لێ ئاوادەبێ.

کەلەپوور (ن) [1] kelepür

کەلوپوور، جێما، بۆماوە، چاندیی، شارستانێتیی، داب و دەستووری کۆمەڵایەتیی.

کەلەپوور (نک) [2] kelepür

شرکەوپرکە، شرەوبرە، خرت وپرت.

کەلەپوور (ن) [3] kelepür

میرات، میراتیی.

کەلەکە (ن) keleke

لاپەراسوو، پاڵوو، خالیگە، برگە، کیلەکە، تەنیشت.

کەلەکە برین (کتپ) keleke bir̲în

پاڵ پێوەنان. ـەنگ پێ هەڵچنین (بەسیحورسە... )

کەلەلا (ئان) [1] kelela

شەکەت، ماندوو.

کەلەلا (ئان) [2] kelela

بریندار، زامدار(کراو).

کەلەلا (ئان) [3] kelela

زۆر نەخۆش.

کەلین (کتن) kelîn

کولیین، جۆش هاتن.

کەلێن (ن) [1] kelên

پەناگا، داڵدە.

کەلێن (ن) [2] kelên

کەلەبەر، قەڵشتیگەورە(لەدیوار، شاخ..).

کەلێن (ن،س) [3] kelên

بۆسە، سپێر، چەپەر، خەڵ، کەمینگا.

کەڵ (ن،ئا) [1] kel̲

گامێش(نێر).

کەڵ (ن،ئا) [2] kel̲

گای ئەحل، کەلەگا.

کەڵ (ئان) [3] kel̲

ئازا، بەکار(بەرامبەر دوژمن)، پیاوانە.

کەڵ (ن) [4] kel̲

جۆشی ئاو، قولپ، بلقەئاوی (لەکول، کولهاتوو).

کەڵ (ئان) [5] kel̲

زل، زەلام.

کەڵبە (ن) kel̲be

کەلوە، بەرازە، کەڵبە، کەلپ، ددانی پێشەوەی سەگ..

کەڵک (ن) kel̲k

سوود، فایدە، بارە، بەهرە.

کەڵک لێ کەوتن (کتن) kel̲be

پێویست پێ بوون، کار تێ کەوتن.

کەڵک دان (کتپ) kel̲kdan

بەهرەدان، سوود بەخشیین.

کەلکەلە (ن) kelkele
خولیا، مەراق.
کەلەباب (ن.م) kelebab
کەلەشێر.
کەلەبابە (ن) kelebabe
شێرە، سەری بەلووعە، کەلەشێرە.
کەلەشێر (ن.م) kelešêr
کەڵەباب، کەرەشێر، کەرەباب، کەڵەکووکە، دیکەل، دیقل.
کەلەک (ن) ١ kelek
کۆمەلە بەردی بەسەریەکدا دراو.
کەلەک (ن) ٢ kelek
وشکەکەلەکە، دیواری بێ ناوکار لەبەرد هەڵچنراو.
کەلەک (ن) ٣ kelek
فێل، فێلبازیی.
کەلەک (ن) ٤ kelek
کۆما، کۆمەڵ، شتی لەسەریەک دانراو.
کەلەک لێ‌دان (کتپ) kelek lêdan
فێل لێ کردن.
کەلەک بازیی (ن) kelekbazî
حیلەوحەواڵە، فێل وفەرەج.
کەلەکە کردن (کتپ) keleke kirdn
کۆمەڵ کردن، خستنەسەر یەک.
کەلە کێویی (ن.نا) kele kêwî
نێری مەڕ و بزنەکێویی.
کەلەگا (ن.نا) kelega
گای(بەگون، نەخەسێنراو).
کەلەگەت (ئان) keleget
بالابەرز، قەدبلند.
کەم (ئان) kem
کم، نەخت، پیچ، تۆز.
کەمان (ن.ئم) keman
کەمانچە، سینەکەمان.
کەمایەتیی (ن) ١ kemayetî
کەمیتیی، کەمایی.
کەمایەتیی (ن) ٢ kemayetî
ناتەواویی، کەموکووڕیی، کیماسیی، کەمایەسیی.
کەم بوون (کتن) kem bûn
بەرەو نەمان ڕۆیشتن(شت)، هاتنەکزیی.
کەم بوونەوە (کتن) kem bûnewe
هاتنەکەمیی، لەکەمیی دان.

کەمتابێژ (ئاک) kemtabêj
کەم یان زۆر، کەم تا بیش، کەمراوێژ، زۆریان کەم.
کەم تەرخەم (ئان) kemterxem
سستەکار، کەترەخەم، گوێ نەدەر، کارپشت گوێخەر کەسێ کەشتی مەبەستی لا پەشم بێ.
کەم چیکلدانەیە (رس) kem çîkldane
زۆر زوو توورە دەبێ، بێ سەبرە.
کەم دوو (ئان) kemdû
کەمدوو، کەم قسە.
کەم ڕوو (ئان) kemrû
کەمڕوو، شەرمن، شەرمێون.
کەم کردن (کتن) kem kirdin
کەم بوونەوە، کورت هێنان، لەکەمیی دان.
کەم و کووڕیی (ن) kemw kûrî
ناتەواویی، نوقسانیی، کیماسیی.
کەنار (ن) kenar
لێوار، زێوار، زێوارە، ڕەخ، قەراخ، لا، تەنیشت.
کەنارەگیریی (ن) kenare gîrî
دوورەپەرێزیی، بێلایەنیی، گۆشەگیریی.
کەند (ن) ١ kend
کەنەک، قوولکە.
کەند (ن) ٢ kend
کۆسپ، تەگەرە.
کەندال (ن) kendal
کەند، کەنەک، کەنگەلان، کەناو، ناوسرگە، زەویی دادڕاو.
کەنداو (ن) kendaw
دەلاف، دراف، شاوێ کەدوولای وشکایی لێچوویێتەپێش، خەلیج.
کەندن (کتپ) kendin
کۆلان، هەلکەندن (گل لەزەویی).
کەندەک (ن) kendek
کەندە، خەندەق، زەویی کۆلدراوی درێژکۆلەویان.
کەندەلان (ن) kendelan
کەند، کەنکێ(درێژکۆلە).
کەنشتە (ن) kenište
کەنشت، مزگێت، پەرستگای جوولەکان، کەنیشتە.
کەنگ (ن) keng
چنگی بالدار، چەنگی مەل.
کەنەفت (ئان) ١ keneft
کەلەلا، حال پەریشان.

**کەنەفت** (ئان) ٢ keneft
زەبوون.
**کەنیشک** (ن) kenîšk
کچ.
**کەو** (ن.م) ١ kew
کەف، بەق، ژەرەژ، چیل، زارا، زارانج، زارانز، کەوک.
**کەو** (ن) ٢ kew
سەرەت، سەرەند، سەراد، بێژنگی( شاش، کون گەورە ).
**کەواتە** (ئاک) kewate
کەوابوو، کەوایە، جا ئەگەر وایە، هەر گاوایە، لەبەرئەوەی کە..
**کەوتن** (کتن) ١ kewtin
ڕاکشان، خۆدرێژ کردن.
**کەوتن** (کتن) ٢ kewtin
بەربوونەوە، کەوتنە( خوار، سەرزەویی ).
**کەوتن** (کتن) ٣ kewtin
( نوستن، مانەوە )کەسێ لەسەر جێگەی نەخۆشیی.
**کەوتنە خاک و پای کەسێ** (ند)
kewtine xakw pay kesê
خۆ شکاندن لەبەردەمی کەسێکدا.
**کەوتنە ڕێ** (کتن) kewtine r̲ê
بەڕێ کەوتن،تۆغر کردن.
**کەوچک** (ن) kewçik
کاچ، کەوچە، کەچکێ، کەفچی، چەمچە.
**کەوشدروو** (ن) kewšdirû
کەوش دروو، کەوشدۆز، کەوشدوور، پێلاودروو، قوندەرە دروو.
**کەوڵ** (ن) kewl̲
کەوەڵ، پێستە( خۆشکراو، دەباخکراو).
**کەوڵ کردن** (کتپ) ١ kewl̲ kirdin
گروون، گورووین، پێست لەبەر داماڵین، سپی کردن( ئاژاڵ).
**کەوڵ کردن{کەسێ}** (ند) ٢ kewl̲ kirdin(kesê)
١- بۆڕۆ کردن، بەتوندی سەرزەنشت کردن.
٢- زەبوون کردن، تەنگێ پێ هەڵچنین.
**کەوڵەکۆن** (خ.) kewl̲e kon
پیری( پەک کەوتە، قرخنی عەمەل مەندە ).
**کەون** (ن) ١ kewn
هەموو دنیا.
**کەون** (ن) ٢ kewn
١- کۆن، دێرین. ٢- پەڕیووت، کۆنە.

**کەون** (ن) ٣ kewn
دەم هەڵپێچی ژنانە.
**کەونینە** (ن) kewnîne
کەونارا، شتی(لەمێژینە، قەدیمیی ).
**کەویی** (ئان) kewî
کەدیی، کدیی، کەهیی، کەیی، ڕام، گیانداری کێویی کە ماڵیی بووبێ.
**کەویی کردن** (کتپ) kewî kirdin
ماڵیی کردن، ڕام کردن، کەهیی کرن.
**کەیل** (ئان) ١ keyîl
سەرخۆش، زۆرمەست ( بەهۆی بادەنۆشیینەوە ).
**کەیل** (ئان) ٢ keyîl
ئالۆز، دلپڕ.
**کەین** (ن) ١ keyn
نێوان، ئاشنایەتیی، پێوەندیی، پەیوەندیی.
**کەین** (ن) ٢ keyn
ڕەتم، تەگبیر دژی کەسێ.
**کەین وبەین** (ن) keynw beyn
تەگبیر ورازی پەنهانیی.
**کەیوان** (ن.ئس) keywan
ئەستێرەی ( زوحەل، کیوان، کاروان کوژ، کاروان کوژە )، دووهەم ئەستێرەیە بۆ گەورەیی و نۆمانگی زانراوی بەدەوردایە.
**کێ بەرکێ** (ن) kêberkê
مل ملانێ، ڕکەبەریی، ڕک بەرکە، ملە.
**کێر** (ن) kêr
چووک، ئەلە، سیرەت، ئالەت، ئامرازی نێر ینەیی.
**کێرد** (ن) kêrd
چەقۆ، کارد، گێر، تیغی دەم پانی مشتودار کە ئانوشتێتەوە.
**کێڕ** (ن) kêr̲
هێل، خەت، خێت.
**کیس** (ن) kîs
هەگبە. جۆرکێ. کیسک.
**کیس کردن** (کتن) ١ kîs kirdin
پەنمان ( پووک ).
**کیس کردن**(کتن) ٢ kîskirdin
پێش خواردنەوە، تووڕەیی( خۆ ) شاردنەوە.
**کیسە** (ن) kîse
کیسک، کیسە( باخەڵ، پارە ).
**کیسە کێش** (ن) ١ kîse kêš
ئاتر، دەمامچیی، کەسێ کەلەگەرماوە( حەمام )

خەلک دەشوا.

**کیسەکیش (خ)٢** kîse kêš

زمان لووس، کلکەسووتەکەر.

**کیش (ن)١** kêš

قورسایی، سەنگینیی.

**کیش (ن)٢** kêš

پێز، را(ئاردی گەنم، هەویر).

**کیش (ن)٣** kêš

تاقەت، وزە، توان، تابشت.

**کیش (ن)٤** kêš

ئەسپابی جووت، نیرو ئاموور.

**کیشان (کتپ)١** kêšan

تەرازووکردن، ئەندازەی قورسایی شت زانیین (بەسەنگ و تەرازوو)، خستنە(سەر، ناو) تەرازوو بۆ قورسایی زانیین.

**کیشان (کتپ)٢** kêšan

راکیشان، کیشیان.

**کیشان{جگەرە} (کتپ)٣** kêšan (cigere)

(قوم، مژ)لیدان، کیشیان.

**کیشان (کتپ)٤** kêšan

(تیغ..لە کیلان) دەرهینان.

**کیشانە (ن)** kêšane

کیش، سەنگ، ئەندازەی قورسایی شت بەسەنگ و تەرازوو.

**کیشانە کردن (کتپ)** kêšane kirdin

لەتەرازوونان، خستنەناو تەرازوو (شت بۆ زانیینی قورسایی).

**کیشانەوە (کتپ)** kêšanewe

هینانەدواوە، کشاندنەوە، وەکشاندن.

**کیشک (ن)** kêhik

ئیشک، پاس، پاسەوانیی.

**کیشکچیی (ن)** kêšikçî

ئیشکچیی، پاسدار، پاسەوان.

**کیش کردن (کتپ)١** kêš kirdin

راکیشان، کشاندن، بەکیش کردن.

**کیش کردن (کتپ)٢** kêš kirdin

راکیشان (بۆ لای خۆ).

**کیشک گرتن (کتپ)** kêšk girtin

پاسەوانیی کردن، کیشک لێ گرتن، ئیشک لێ گرتن.

**کیشماکیش (ن)** kêšma kêš

١- کیشمەکیش، کەشمەکەش، بگرەوبەردە، کەشما کەش، کەشاکەش، گیرەوکیشە، کیشەوبەرە، ئەرکی گران. ٢- کیشەکیش، شەڕوەڕا، ناکۆکیی وینار، شەڕەفانیی.

**کیشە (ن)١** kêše

١- شەڕ. ٢- دەمەقالە، دمەقالە، ناڕیکیی، ناتەبایی.

**کیشە (ن)٢** kêše

سەرپۆشی ژنان.

**کیل (ن)١** kêl

کیل، بەردی سەرین و پاینی قەبر، بەردی سەرو خواری گۆڕ.

**کیل (ن)٢** kêl

بلندیی، بلندایی، بەرزیی، بەرزایی.

**کیل بوونەوە (کتن)** kêl bünewe

بەرزبوونەوە، بلندبوونەوە.

**کیل کردنەوە (کتپ)** kêl kirdinewe

بەرزکردنەوە، بلند کردنەوە.

**کیلگە (ن)١** kêlge

زەویی وزار.

**کیلگە (ن)٢** kêlge

زەویی شیوکراو.

**کیم (ن،پز)** kêm

جەراعەت، زەرداوی برین، زووخاو، زلفنجاو، زلزلە.

**کین (ن)** kîn

رک، رق، قین.

**کینە کیشان (کتن)** kîne kêšan

رق (کیشان، هەلگرتن)لە دلدا.

**کیو (ن)** kêw

کیف، کەژ، کۆ، چیا، شاخ.

**کیویی (ئان)١** kêwî

کیفیی، کەژیی (درندە، گیان لەبر).

**کیویی (ئان)٢** kêwî

خۆڕست، خۆڕسک، کیویلە، کیویلکە، شتی(سروشتیی، خواکرد).

# پیتی - گ-

# -G-

**گا** (ن.نا) ga [١]
گاو، گاجووت، ڕەشەوڵاخی نێر، نێری چێل.
**گا** (نان) ga [٢]
گێل، گەوج، هەری، گەلحۆ.
**گا** (نان) ga [٣]
زل، قەبە.
**گا** (ن) ga [٤]
جار، چەل، کەرەت.
**گا** (ن) ga [٥]
جێ، شوێن.
**گابارە** (ن) gabare
شکێر، قەڵشەشاخ.
**گابۆر** (ن) gabor [١]
گاقۆڕ، بۆڕەبۆڕ، قیڕوهووڕی گاگەل، بۆڕە.
**گابۆڕ** (ن) gabor̲ [٢]
شین و گریانی بەدەنگی بەرز.
**گابەرد** (ن) gaberd
گاشـەبەرد، گاکوچـک، تـل، تلەبـەرد، سـاغوورەک، بـەردی (زل، گـەورە) ، کەڤـرێ مـەزن، تـاوێر، تاوێرەبەرد.
**گاپەل** (ن.م) gapel
گاپل، گاپێل، گاکۆترە، کۆترە گایە، کـۆترە کێـوی شین، کۆترە گاپەلە.
**گاپێ** (نان) gapê
تەپ، تەپۆ، سستەپەلە، مردەلۆخە(لەڕۆیشتندا) .
**گاتوو** (ن.رو) gatû
شاتوو، توومۆرە، تووی سووری تۆخ.
**گادار** (ن) gadar
لەوەڕگا، شوێن لەوەڕ.
**گادان** (کتپ) gadan [١]
گابەردانە سەر مانگا، چێل لەکەل کێشان.
**گادان** (ن) gadan [٢]
قازانج (لەمامەڵەدا) .
**گادانە** (ن.رو) gadane
کزن، گاودانە، گلینە، هەرتۆمان.
**گاران** (کتن) garan
گاراندن، گارانن، گارەگارکردن (مریشک) .
**گاڕان** (ن) gar̲an
گاگـەل، گاڵـەل، گـاڕێن، گاگەلـە، گایـەل، گۆبـارە، ڕەوەی گاوگامێش، گەلـەی (گـاجووت، ڕەشـەو[illegible] ، چێل وگا و گامێش) .
**گارە** (ن) gare
گار،گاری مریشک.
**گاز** (ن) gaz [١]
قەپ، قەپاڵ، گەژ، گەوز.
**گاز** (ن) gaz [٢]
لەلە، خەت (قووڵ) .
**گاز** (ن) gaz [٣]
گازکە، گاسک، ئامرازی بزمار کێشانەوە.
**گاز** (ن) gaz [٤]
بانگ، بانگەواز، گازی، گاس، هاوار.
**گاز** (ن) gaz [٥]
زنجیرە چیا.
**گاز** (ن) gaz [٦]
لا، ئالی.
**گاز** (ن) gaz [٧]
گازەدۆکە، شێوی زۆرتەنگ، شێوەڵەی تەنگ
**گاز** (ن) gaz [٨]
باسک، درێژایی لەجومگەی دەستەوە تاشان.
**گاز** (ن) gaz [٩]
غازی خۆڕسک.
**گازر** (ن) gazir
جلـشۆر، کەسـێ کـەجلی خـەڵک بەپـارە دەشـوا، قەسار.
**گازکردن** (کتپ) gazkirdin
بانگ کردن، گازی [illegible]
**گازگرتن** (کتپ) gaz girtin
قەپ گرتن، قەپاڵ لێ گرتن، گەژ کرن، ددان لێ گیر کردن.
**گازن** (ن) gazin
شفرەی پێڵاو دروو، گازە، چەقۆی چەرم بڕین.
**گازندۆک** (ن) gazindok
گلەییکەر، بەپرتە وبۆڵە.
**گازندە** (ن) gazinde
گازن، گازە، گازەندە، گلە، گیلە، گلەیی.
**گازەرە** (ن) gazere
گـازەرا، گـازی پـشت، موورەغـەی پـشت، دڕوپـشت، ناوەڕاستی پشت.

**گاستین** (ن) gastîn
گازتین، جێگەی کۆبوونەوە بۆ کات بردنەسەر..
**گاسن** (ن) gasin
گاواسن.
**گاشە** (ن) gaše
ئاژاوە، پشێویی.
**گاڤ** (ن،کی) ١ gav(ki)
گاە،دەم، کات، سات.
**گاڤ** (ن،کی) ٢ gav(ki)
مەنگاو، شەقاو.
**گاڤ دان** (کتپ) gavdan
دەرفەت پێدان.
**گاڤین** (کتپ،کی) gavîn(ki)
ویستن.
**گاگا** (ناک) gaga
جارجار، گاگوار.
**گاگۆلکە کردن** (کتن) gagoḻke kirdin
گـاگۆلکێ کـردن، گاگۆلـە کـردن، ڕۆیـشتن لەسـەر هەردوو دەست و هەردوو ئـەژنۆ (منـداڵ) ، گاگۆلـە کردن.
**گاگەل** (ن) gagel
گاران.
**گالا** (ن) gala
مێرش، هروژم.
**گالە** (ن) gale
جۆرێک هەگبەی پشت زین.
**گالیسکە** (ن) galîske
کالیـسکە، فـایتوون، دروشـکە، تەختەتـەرەوان، کەژاوەی پێچکەدار.
**گاڵ** (ن،رو) ١ gaḻ
هەرزنەتاڵە.
**گاڵ** (ن) ٢ gaḻ
ڕاوەدوو (بەهەراو هوریا) .
**گاڵ** (ن) ٣ gaḻ
کرۆگاڵ، گاڵ وبۆغ (منداڵی ساوا) .
**گاڵتە** (ن) ١ gaḻte
گەمە، گەپ، سوعبەت، شۆخیی، زرتۆڵە.
**گاڵتە** (ن) ٢ gaḻte
تیز، قەشمەریی.
**گاڵتە** (ن) ٣ gaḻte
گاڵتەبازیی، گاڵتین، گاڵتین، کایە، یاریی.

**گاڵتە پێ کردن** (کتپ) gaḻte pê kirdin
تیز (پێ کردن، پێوەکردن) ، سوعبەت پـێ کـردن، دانە بەرکلکان.
**گاڵتەچیی** (ن) gaḻteçî
گاڵتەبێژ، سوعبەتچیی، حەنەکبێژ، کەسێ کەقسەی سەیردەکا بۆ پێکەنین.
**گاڵتەکردن** (کتن) gaḻte kirdin
شۆخیی کردن، سوعبەت کردن، شت ووتن یان کردن بەسوعبەتەوە.
**گاڵ دان** (کتپ) gaḻ dan
دەرکردن، پاڵ پێوەنان، دەرپەڕاندن.
**گاڵۆک** (ن) gaḻok
گـاڕام، گـارم، گـاڕان، داردەسـتی درێـژی (جـوتێر، جوتیار، جووتکەر، گاوان) .
**گاڵە** (ن) ١ gaḻe
دادوهاوار.
**گاڵە** (ن) ٢ gaḻe
گرمەی هەور، گرمەگرمی هەور.
**گاڵە کردن** (ئد) gaḻe kirdin
گاڵەپـێکردن، ئـیش ڕاپـەڕاندن بـەچالاکی ، چـاک وەخۆ کەوتن لەکارێکدا.
**گامەلاس بوون** (کتن) gameḻasbûn
مان گـرتن، خۆبەزەویـدادان، لـەکار غەزریین،چێـدی کارنەکردن.
**گامێش** (ن،نا) gamêš
گامووش، ڕەشە ولاخێکە لەگازلتر.
**گان** (ن) gan
جووتگیری، سەر جێیی، جفتیی، ئیلاقە.
**گاو** (ن) gaw
گا، کات.
**گاوان** (ن) gawan
شوانی (گاگەل، گانەل) ، گاچەرێن، گاچێر، گـادێر، گالو، گاوو، گاوون.
**گاوچە** (ن) gawçe
چەرخی ئاوکێشان لەبیری ئاو... ئاعوور.
**گاور** (ن) gawir
١- ئاگر پەرست. ٢- بێ بڕوا.
**گاوگۆتاڵ** (نک،نا) gaw gotaḻ
گاو گۆل، ڕەشەولاخ بەتێکرایی: گا، مانگا، گامێش، گوێرەکە، پارین.
**گاوگەردوون** (ن،ئس) ١ gaw gerdûn
بـورجی گـا(لـەئاسمان) ، دووهـەم بـورج لـە

ـمیوومەری بیستی نیسان تێ ئەکەوێ.

**گاو گەردوون** (ن) ٢ ga w gerdûn

تووێـنی. سـەربڕینی ئـاژەڵ (بـۆ پیـشوازی لەگـەورە پیـاوان یان مـەمستیکی ئاینی) .

**گاوەخان** (ن) gawexan

گومسوو، تەویلەی گاگەل، پشتیری گائـەل، گـەوڕی گ و مانگا.

**گر** (ئان) gir

ـرشت. نەگەورە نەپچووک، مام ناوەندیی.

**گرار** (ن.کی) girar(ki)

چیشتی توندە.

**گراز** (ن.کی) giraz(ki).

شۆربای برنج.

**گران** (ئان) ١ giran

قورس، سەنگین.

**گران** (ئان) ٢ giran

گران بەها، بوها، پڕ بەها، نرخ(بەرز، زۆر) ، گرانبا.

**گران{مرۆڤ}** (ئان) ٣ giran(mirov)

لەسەرخۆ، سەنگین، هێمن.

**گرانبار{مرۆڤ}** (ئان) giranbar(mirov)

بارگران، خاوەن خێزانێکی زۆر.

**گران بوون** (کتن) giranbûn

(بەها، بوها، نرخ) بەرز بوونەوە.

**گرانیی** (ن) ١ giranî

قورسیی، گرانایی، قورسایی، سەنگینیی.

**گرانیی** (ن) ٢ giranî

١- قاتیی، دەست نەکەوتنی بژێو.

٢- برسێتیی، قاتوقڕیی.

**گرانیی** (ن) ٣ giranî

نرخ بەرەو ژوورێی.

**گربوون** (کتن) gir bûn

هەراش بوون، خۆگرتن، بەخۆداهاتن.

**گرتن** (کتپ) ١ girtin

خستنەناو (چنگ، دەست) ، هێنانە ناودەست.

**گرتن** (کتپ) ٢ girtin

(بەند، دیل، حەپس) کردن، خستنەگرتووخانە.

**گرتن{ڕۆژوو}** (کتپ) ٣ girtin(rojû)

پێبوون (لەمانگی ڕەمەزاندا) .

**گرتن** (کتپ) ٤ girtin

داگیرکردن، دەست(بەسەردا گرتن، بگیرکردن) : دەستدرێژیی کردن(سوپا) .

**گرتنەوە** (کتپ) ١ girtinewe

قۆزتنەوە (لەهەواوە) .

**گرتنەوە** (کتپ) ٢ girtinewe

هێنانـەوە جـێ (ئەنـدامی لـەش..شـکاو یـان لـەجێ چوو) .

**گرتنەوە{کتێب..}**(کتپ) ٣ girtinewe(ktêb)

بەخت گرتنەوە، لەکتێب ڕوانیین (بۆ ئایندە زانـیین) .

**گرتووخانە** (ن) girtûxane

گرتیخانە، بەندیخانە، حەپسخانە.

**گرد** (ن) ١ gird

تەپۆلکە.

**گرد** (ئان) ٢ gird

خڕ، گردەڵ.

**گرد** (ئان) ٣ gird

درشت.

**گردبوونەوە** (کتن) girdbûnewe

کۆبوونەوە، کۆم بوونەوە، گردوەبوون.

**گردکردنەوە** (کتن) gird kirdinewe

کۆ کردنەوە، کۆوەکردن، کۆم وەکردن.

**گردوکۆ** (ن) girdw ko

هەموو پێکەوە، ویکرایی.

**گردەنشین** (ن) girdenişîn

١- لەپێ کەوتوو، لەپەل وپۆ کەوتوو، لەکارکەوتە (مرۆڤ) . ٢- دەست یان پێ نەماو.

**گردیی** (ن) girdî

تێکرا، کۆ، هەموو، گردین.

**گرژ** (ئان) girj

١- مـۆن، ناوچـەوان(تـرش، چـرچ کـردوو) لەتووڕەیی.٢ - مات، مەلوول، خەمبار.

**گرژیی** (ن) girjî

مۆنیی، تووڕەیی، ناوچەوان ترشیی.

**گرفت** (ن.پز) ١ girift

ڕۆدل، سقل.

**گرفت** (ن) ٢ girift

بەرهەڵست، بەرگرلەکار.

**گرفتار** (ئان) giriftar

تووشیار، تووش (هاتوو، هاتگ) ، دوچار.

**گرفتاریی** (ن) giriftarî

تووشیاریی، دووچاریی.

**گرفە** (ن) girfe

گرفە گرف، دەنگی گڕی ئاگر.

**گرک (ن)** girk
دووگی سەرپشتی حوشتر، کۆپارەی (سەر پشتی گای جبوری) .

**گرگاشە (ن)** girgaşe
بەلا، بەلای لابەلا، نەهامەت، دەردو مەینەت.

**گرماندن (کتن)** girmandin
گرمە(کردن، هاتن) ، گرماندن، گرمانن، گرمیین، گومیین ، گمیین، گوڕژان، گوڕزان، گوڕژاندن (هەور) .

**گرنج (ئان)** girinc
زبر، دڕ.

**گرنجایی (ن)** girincayî
زبریی، دڕیی، دەندرە، دان، برگە.

**گرنج گرنج (ئان)** girinc girinc
برگەدار، دڕن، داندار، گرنیی، دەندرەدار.

**گرنگ (ئان)** giring
گرینگ، پڕ بایەخ، بایەخدار، زۆر مەبەست(شت) .

**گرنگیی (ن)** giringî
بایەخداریی، پڕبایخیی.

**گرۆ (ن)** giro
کۆمەل، دەستە.

**گروون (کتپ)** girün
گوروون، گرواندن، گروان، پێست لێ داڕنیین، کەوڵ کردن، کوڕژاندن، پاک کردن.

**گرەو (ن)** girew
گەرەو، گرەوای، گرێو، شەرت، مەرج.

**گرەوکردن (کتپ)** girew kirdin
گرۆ کردن، گرێو کردن، (شەرت، مەرج) کردن.

**گرەوەک (ئان)** girewek
لەبارمتەنراو، بارمتەکراو، بارمتەنراو.

**گریان (کتن)** giryan
گیریان، ناریان، شین کردن، شەپۆر کردن، هەنسک،هەلدان وفرمێسک هاتنەخوار لەچاو.

**گریاندن (کتپ)** giryandin
کردنەگریی، هێنانە گریان.

**گریشمە (ن)** grîşme
ناز، غەمزە، قەمزە، تەماشا بەتیلەی چاو.

**گریمان (ئپ)** grîman
وامان دانا، بابلێین.

**گرینۆک (ئان)** grînok
گرۆک، قاڕن، قەرەزاغ، کەسێ کەزوو دەگری.

**گریە (ن)** girye
گری، زاریی، شیوەن، شین.

**گڕ (ن)** [1] gir̲
پێت، سلۆری، تاووبلیسەی ئاگر، بلیسە، کلپە، گڕیە، شیت.

**گڕ (ن)** [2] gir̲
تین، گەرمایی، گەرمیی و هالاوی ئاگری بلیسەدار.

**گڕ (ن)** [3] gir̲
زبریی، قونجر قونجریی.

**گڕ (ئان)** [4] gir̲
دووبارە، جارێکی تر.

**گڕ(دەنگ) (ئان)** [5] gir̲(deng)
دەنگی(نێر، گیرپاگ، زرب، زبرو درشت) .

**گڕ (ن)** [6] gir̲
دەورە، سووڕ.

**گڕتێ بەربوون (کتن)** [1] gir̲tê berbün
ئاگر گرتن، شەوتیین.

**گڕتێ بەربوون (ئد)** [2] gir̲tê berbün
ئارەزوو جوولان، سۆز جوولان.

**گڕتێ بەربوون (ئد)** [3] gir̲ tê berbün
بەزەیی پێداهاتنەوە.

**گڕ خواردن (کتن)** gir̲ xwardin
گردان، گەڕان، بەدەوردا(سووڕانەوە، هاتوچۆکردن)

**گڕسەندن (کتن)** gir̲ sendin
گڕ گرتن.

**گڕکان (ن)** gir̲kan
ئاگر پڕژێن، ئاگری، ئاگری(شاخ، چیا) ، شاخی ئاگرین، چیای ئاگرین.

**گڕگڕ (ئاک)** gir̲ gir̲
دیسانەوە، هەمدیسانەوە، جارێکی تر.

**گڕگرتن (کتن)** gir̲ girtin
١- گڕ تێ بەربوون. ٢- زۆر تووڕە بوون.

**گڕۆزیی (ن)** gir̲ozî
گڕوگریی، گڕە زۆک، گوڕۆزیی، بەهانە، پەلپ، مان.

**گڕوکف (ف)** gir̲ w kif
کەسێ یان ئیشێ بەگەرمیی بجوولێ ولەپڕ راوەستێ، دەست دانە ئیشێک و زوو لێ ساردبوونەوە، کورتە سەرکەوتنێک لەکاروباردا و تەواو نەکردنی.

**گڕوگاڵ (ن)** gir̲ w gal̲
کالە، ورتەورتی منداڵی ساوا لەپێش زمان گرتنیدا،دەنگی زاڕۆی ساوای تازە زمانگرتوو.

**گره** (ن) ١ gire
سەموم، شەرا، بای گەرمی لەناکاو.
**گره** (ن) ٢ gire
گر، گەرمی.
**گره** (ن) ٣ gire
کلپە.
**گرێ** (ن) ١ girê
گره، گریک، بەند.
**گرێ** (ن) ٢ girê
کۆسپ، تەگەرە، تەنگە وچەلەمە.
**گرێ** (ن) ٣ girê
جومگە، گە، بەند، گریچکە.
**گرێ دان** (کتپ) ١ girê dan
گرێ(لێدان، تێ هەڵدان) .
**گرێ دان** (کتپ) ٢ girêdan
توند لیک بەستن، قاییم کردن.
**گرێ کردنەوە** (کتپ) girê kirdinewe
١- گرێ وەکردن، بەندکردنەوە.
٢- گیروگرفت(نەهێشتن، چارەکردن) .
**گرێ کوێرە** (ن) girê kwêre
١- گرێ(پووچکە، کوورە، کوتکە) ، جۆرێ گرێ کە کردنەوەی دژوارە.
٢- چورتمی(دژوار، بێ چارە) .
**گریوەخار** (ن) girêwe xar
کێبەرکێ (لەغارغاریندا) .
**گزرە** (ن) gizre
١- ئالف، زرکۆ.
٢ - گیای وردکراو بۆ ئالیکی ئاژەڵ.
**گزنگ** (ن) gizing
گزینگ، زراق، سەرەتای هەتاوی بەیانیی، ڕووناکیی خۆر کاتی بەیانیی، تیشکی تازە دەرکەوتووی خۆر.
**گزنگ دان** (کتن) gizing dan
ڕۆژهەلاتن، هەتاو کەوتن.
**گزیی** (ن) gizî
گزە، تەڵەکە، فێل، چاوبڕاو.
**گزیی کردن** (کتپ) gizî kirdin
گزەکردن، تەڵەکەبازیی کردن، فێڵ وفەرەج کردن.
**گزیکەر** (ن) gizîker
گزیکار، تەڵەکەباز، گزەون، فێلباز، فیلەباز، حیلەباز،شەمچێ.
**گژ** (ئان) ١ gij
بژ، تیک ئالاو.

**گژ** (ئان) ٢ gij
گشت، هەموو.
**گژکردن** (کتپ) gij kirdin
لیک(هالاندن، ئالاندن) .
**گژوگیا** (ن) gij w giya
گیای زۆر و هەمەچەشنە، هەزگە ویژال.
**گژەبا** (ن) gijeba
باگژە، بای توندی پاییزی.
**گسک** (ن) gisik
گەسک، گزگە، گزک، جارۆ.
**گسکدەر** (ن) gisikder
گەسکدەر، گزکدەر.
**گشت** (ئان) gişit
گش، پێکەوە، هەموو، بتوون، سەراپا.
**گشتیی** (ئاک) gişitî
تێکڕایی، هەموانیی.
**گفت** (ن) gift
بەڵێن، پەیمان، گفتە.
**گفت دان** (کتپ) giftdan
(بەڵین دان، پەیمان) .
**گفتوگۆ** (ن) giftw go
وتوویژ، ئاخافتنی پێکەوە.
**گڤ{قژ}** (ئان) giv(qij)
گرژ، لوول، باخواردوو.
**گل** (ن) ١ gil
ئێش، ژان (چاو) .
**گل** (ن) ٢ gil
بزاو، بزوە، جووڵە، گڕ.
**گلاراو** (ئان) gilaraw
ئۆقرە نەگر، بێ(ئارام، قەرار) ، ماخۆلانگرتوو.
**گلان{سوار}** (کتن) ١ gilan(swar)
کەوتن، لەسەر وڵاخ (بەربوونەوە، کەوتنەخوار) .
**گلان** (کتن) ٢ gilan
بەسەرڕوودا کەوتن، گلیان.
**گلاندن** (کتپ) gilandin
١- خستنەخوار، فڕێ دانەخوار.
٢- دوچاری چورتم کردن.
**گل خواردنەوە** (کتن) gil xwardinewe
گل خواردن، مانەوە، ویستان، ویسان.
**گل کردن{چاو}** (کتن) gil kirdin(çaw)
هاتنەئێش، وەژان کەوتن، چاوئێشان.

**گلۆربوونەوە** (کتن) gilor bünewe

(گولۆر، گلێر، گلۆڵ، خلۆر، تلۆر، تل) بوونەوە ،گلێرە وەبوون، خلێرەوەبوون، تلێروەبوون.

**گلەیی** (ن) gileyî

١- گلـە، گلـی، گلیـی، گـازە، گازنـدە، باسـی ناڕەزایی. ٢- سەرزەنشت.

**گلەیی کردن** (کتن) gileyî kirdın

١- (گلە، گازندە) کردن.

٢- ناڕەزایی دەربڕین، دلگیریی باس کردن.

**گڵ** (ن) giḻ

خاک، خۆڵ.

**گڵاو** [1] (ئان) giḻaw

پیس، حەفتاو، سیلۆت.

**گڵاو{مرۆڤ}** [2] (ئان) giḻaw

بەدفەڕ، بێ ئاکار، پیس، خراپ.

**گڵکۆ** (ن) giḻko

گۆڕ، قەبر.

**گڵمتکە** (ن) giḻmtik

گلمت، کەرسەک، خەرسەک، سمتەگل، گلمەت.

**گڵۆڵە** (ن) giḻoḻe

١- گول مشتک، دەزوو یان بەنی لێک ئاڵاوی خڕ هەڵدراو. ٢- سەرەداوی ڕێ نیشاندەر (لەناو ئەشکەوتی تاریک ..) دا.

**گڵۆڵەبوون** (کتن) giḻoḻe bün

هاتنەوەیەک، چوون بەیەکدا.

**گڵێن** (ئان) giḻên

شتی لەگڵ(دروستکراو، چێکریی) ، هەڕگین.

**گڵێنە** (ن) giḻêne

کاسەی قوڕیین، کۆچەڵەی قوڕی سوورەوەکراو.

**گمگمۆکە** (ن) gimgimok

شەربە، تونگە، گمگمە، دەفری(ئەستۆ زراو، مل باریک) ، لوولێنە.

**گمی** (ن) gimî

گمە، دەنگدانەوەی چیا..

**گنجڕ** (ئان) gincir

زبر.

**گوارا** (ئان) gwara

خۆش، نۆش، هەموار.

**گوارە** (ن) gware

خشڵێ کەلەگوێ دەکرێ، گۆشەوارە، گۆشوارە (شۆڕ، کورت، یان بەگوێ وەنووساو) .

**گوازتنەوە** (کتپ،کتن) gwaztinewe

گوازتن، گواستن، گواستنەوە، گوێزانەوە، گۆمازتن، گۆماستن، ڕاگوێزان، ڕاگوێزتن، لەشوێنێ بۆ شوێنێکی تر (بردن، چوون) .

**گواو** (ن) gwaw

ئاوی(تێکەڵ بەپیسایی، زێراب) .

**گواوی** (ئان) gwawî

زۆر پیس یان خراپ، لەپیساییەوە چوو.

**گوایا** (ئاک) gwaya

١- گوایە، وێدەچێ، لەوە(دەچێ، ئەچێ) .

٢ - ئەدی، چما، ئەیژێ، گۆیا، چمان.

**گوتن** (کتن) gutin

بێژتن، پەیڤین، ئاخافتن، گفت وگۆکردن، قسەکردن.

**گوتە** (ن) gute

١- ووتە، گفتە، بێژە، قسە. ٢- ئیشاعە، شایەعە، گۆتە، ووتەووت، گوتەی خەڵک.

**گوتەنیی** (ن) gutenî

گۆتەنیی، گۆتیی، وەک (دەڵێ، دەڵێن) .

**گوڕ** [1] (ن) gur̲

توان، تاقەت، توانایی، گریک، هێز و تەوژم.

**گوڕ** [2] (ن) gur̲

خێرایی، تەوژم، بلەزیی.

**گوربزە** (ئان) gurbize

بووژاوە، بەخۆداهاتوو، بەکەیف وتەیار.

**گوربزەبوون** (کتن) gurbizebün

بەخۆدا هاتن، بووژانەوە.

**گوڕبەستنەوە** (کتن) gur̲bestinewe

هاتنەدواوە بۆ هەڵمەت دان و چوونە پێشەوە بەگوڕ: گەرم بوون، خۆ ئامادەکردن.

**گوربە** (ن) gurbe

خورپە، تەپەی دل، پتەی دل، خورپەی توند ویەک لەسەریەک، پەلەپەلی دل.

**گورج** [1] (ئان) gurc

١- زوو، بلەز، خێرا. ٢- بەکار، قۆجاخ، چالاک.

**گورج** [2] (ئان) gurc

کۆتا، کورت (داوێن) .

**گورج بوونەوە** (کتن) gurc bünewe

ئامادەبوون، خۆحازر کردن.

**گورج وێژ** (ئان) gurc wêj

کورجبێژ، زوبێژ، زووگۆ.

**گورچیله** ( ن ) gurçîle
گورچــو، گرچــک، گرچــوو، گورچــک، گورچەویلــە، گورچەویلـــە، گورچیلـــک، گوردالـــە، گولچیلـــە، گولچیسک.

**گورد** ( ئان ) ١ gurd
بەکار، چابک.

**گورد** ( ن ) ٢ gurd
تاقەت، هێز.

**گورز** ( ن ) gurz
تۆپز، داردەستی سەر ئەستووری دەسکدار.

**گورزە** ( ن ) gurze
گورز، باقەبێنی لێکدراو.

**گورگان گاز** ( ن ) gurgan gaz
گورگانەگاز، ماری بن کا، خەنجەر لەپشتەوەدەر.

**گورگە بوون** ( کتن ) gurge bûn
بەلەسەبوون، تاربوون، سڵ بوون، قوشقی بوون.

**گورگە خەو** ( ن ) gurgexew
کەرویشکەخەو، سووکەلەخەو.

**گورگە لۆقە** ( ن ) gurge loqe
هــەراکردنی خێــرا ( بەهــەنگاوی کــورت ) ، قــۆترە، قۆرتە، گورگەلۆق.

**گورگە و لە پێستی مەڕدا** ( پن )
gurge w le pêstî merda
بەکەسێ دەووترێ کەخۆی بەپیاوچاک پیشان بدا و ئەو خۆی پیاو خراپ بێ.

**گورگی بارانیدیدە** ( ند ) gurgî baran dîde
بەیــەکێکی خــاوەن تەجروبــە دەووتــرێ: مرۆڤــی بــە ئەزموون.

**گوڕنی** ( ن ) gurnî
جێگەی گوڵ پەروەردە کردن، شەتلگەی سەرداخراو، پەروەردگەی گوڵ، نەمامگە.

**گوریزدان** ( کتن ) ١ gurêzdan
خۆپارازتن لەکارێ.

**گوریزدان** ( کتن ) ٢ gurêzdan
دەســت لــەئیش کێــشانەوە، خــۆ لــەکار کێــشانەوە ( مووچە خۆر ) .

**گوریس** ( ن ) gurîs
وەریس، تەوژ، گورویس، گوریس، پەتی درێژ لــەمووی بزن دروستکراو.

**گوریس کێشیی پێ کردن** ( ند )
gurîs kêşî pêkirdin
بینەوبەرە پێ کردن، ئەمسەوڕو ئەوسەر پێ کردن.

**گوزارە** ( ن ) gurzare
واتا، مانا، ڕوونکردنەوەی نیاز لەپێڤیین.

**گوزەر** ( ن ) ١ guzer
ڕاستەبازاڕ: ڕیزەدوکانی سەر داپۆشراو.

**گوزەر** ( ن ) ٢ guzer
کۆلانێ کەدەرپچێ، دەربوونە.

**گوزەر** ( ن ) ٣ guzer
بوار، بڤار.

**گوزەران** ( ن ) guzeran
١- مایەی ژیان. ٢- کار، ئیش.

**گوزەران کردن** ( کتپ، کتن ) guzeran kirdin
ژیان( بردنەسەر، قەتاندن ) ، ژیــان( بــەڕێوە چــوون ) بەو ڕۆژیی‌یەی کەچنگێ دەکەوێ.

**گوزەرکردن** ( کتن ) guzer kirdin
ڕابوردن، ڕۆیشتن، تێپەڕبوون، تێپەڕیین.

**گوژم** ( ن ) gujim
تەکان، پاڵ، گۆت.

**گوستاخ** ( ئان ) ١ gustax
نەترس، بێ باک.

**گوستاخ** ( ئان ) ٢ gustax
گوساخ، شەرم نەکەر، ڕووقاییم.

**گوش** ( ن،رو ) guş
ککسین، گیای کەنــەف کــە( گــوینی، تــەلیس ) یــلێ دروست دەکەن، دەتەنن ) .

**گوشاد** ( ئان ) guşad
بەرپان، بەرفەرەح، فرەهـ، فراوان، فرەوان، وڕاق.

**گوشین** ( کتپ ) guşîn
کوشــیین، گوشــیان، گوشــانن، گۆشــیین، گۆشاشــتن، بادان و ولیین ( شت ) بەنهێم.

**گول** ( ئان،پز ) gul
کەسێ کەتووشی نەخۆشیی گولیی بوویێ.

**گوللە** ( ن ) gulle
فیشەک، بەرک.

**گوو** ( ن ) gü
پیسایی، سل، خلتــەو خــەواڵی خــۆراک کەلەکۆمــەوە دەردەچێ.

**گووپ** ( ن ) güp
گــووب، نــاوەوەی لاڕوومــەت، بۆشــایی لاشــەویلاگە ( بەفوو هەلاوساو ) .

**گووپن** ( ن ) güpin
قولپن.

**گوڵ** (ن،رو) gul
١- وول، خونچەی پشکوتوو. ٢- نەخش، نەقش. ٣- هەرەت، ئەوپەڕ. ٤- باشترین، هەڵبژاردە.

**گوڵاڵە** (ن،رو) gulale
میلاقە، چارەچەقیلە، چاران چەقیلە، گوڵاڵە(سوورە، سوورکە).

**گوڵاو** (ن) gulaw
گولاف، بەرکم، ئارەق(ئارەقەی) گوڵەباخ، ئاوی لەگوڵ گیراو، عەتری ئارەق وهەڵمی گوڵ.

**گوڵبێن ئاخن** (ن) gulbên axin
گوڕلۆ، گوڵواخن، تۆپەوانە.

**گوڵبێنە** (ن) gulbêne
گۆلوینە، گۆڵۆنە، گۆلونە، دروکەلکێش باکێش.

**گوڵچن** (ئان) gulçin
هەڵبژاردە، هەڵبژێرە.

**گوڵخانە** (ن) gulxane
١- جێگەی(شەتل، قەڵەم، نەمام)ی گوڵ پەروەردە کردن. ٢- باخی گوڵ، گوڵستان.

**گوڵدان** (ن) guldan
١- دەفری گوڵ تێ خستن. ٢- ئینجانە، گوڵدانک.

**گوڵزار** (ن) gulzar
گوڵجاڕ، باخچەی گوڵ، گوڵشەن، گوڵشین.

**گوڵ کردن** (کتن) gul kirdin
گوڵ (گرتن، پشکووتن).

**گوڵگەشت** (ن) gulgešit
باخچە.

**گوڵمە** (ن) gulame
نەرمەگۆشت، وولمە، گولم، پارچەگۆشتی بێ ئێسقان.

**گوڵمێخ** (ن) gulmêx
سکە، مێخ سندان، سنگی ئەستوور و درێژ.

**گوڵەئەستێرە** (ن،جج) gule estêre
گوڵەستێرە، گۆمسارە، ئەستێرۆک، کرمی شەوچرا.

**گۆ** (ن) ١ go
چیچک، خڕیی سەریی مەمک.

**گۆ** (ن) ٢ go
١- هەست (ئەندامی لەش).
٢- توانای کارکردن بەسانایی (پەنجەکانی دەست..).

**گۆ** (ن) ٣ go
تۆپ(تێنس، یاریی، شەقێن...).

**گۆبەند** (ن) ١ gobend
گۆڤەند، گۆوەند، کۆبوونەوەی بەزم وشایی.

**گۆبەند** (ن) ٢ gobend
گۆبەنگ، هەراوکێشە.

**گۆپکە** (ن،رو) gopke
گۆپک، گۆپیتە.

**گۆت** (ئان) ١ got
تەزیو، سڕ، گۆد.

**گۆت** (ئان،پز) ٢ got
ئیفلیج.

**گۆترە** (ن) gotre
گۆترمە، لەبڕ، دەمبڕ، تێکڕا، سەرجەم، خەملاندنی بێ کێشانە و پێوانە.

**گۆج** (ئان) goc
١- گیڕ، شەل، سەقەت.
٢- کۆل، ئەنگوست(قرتاو، چەسپاو، نووساو).

**گۆچان** (ن) goçan
گالۆک، داردەستی(سەر چەماوە، ڕاست و قەف چەماو).

**گۆڕ** (ن) ١ gor
ئارامگا، قەبر، گلکۆ، قەوڕ.

**گۆڕ** (ن) ٢ gor
تەختان، زەویی(تەخت، ڕاست).

**گۆڕ** (ن) ٣ gor
سزا، جزیا.

**گۆڕ** (ن) ٤ gor
ئاوکۆڕ، مەیدان، مەیان.

**گۆران** (نک) ١ goran
ڕاثیەت، دەست وپێوەند.

**گۆران** (ن) ٢ goran
چەتە، ڕێگر، پیاوڕووتکەرەوە.

**گۆران** (ن) ٣ goran
لەوەڕگە.

**گۆڕان** (کتن) goran
١- گۆڕین، بارەوباربوون، لەدۆخێکەوە بۆ دۆخێکی تر چوون. ٢- تێک چوون، وەرگەڕان.

**گۆرانیی** (ن) goranî
قام وبەستە، مەقام وبەستە، هەوا، ئاواز، لاوک، ستران.

**گۆرانی بێژ** (ن) goranî bêj
قامبێژ، دنگبێژ، سترانبێژ، مەقامبێژ، دەنگبێژ، سازندە، سازنە، گۆرانی چڕ.

**گۆرانی گوتن** (کتپ) goranî gutin
گۆرانیی (چڕیین، خۆنن، کوتن، وتن، ووتن)، قام بێژتن،ئاواز (خوێندن، خوەندن)، ستراندن.

**گۆرستان** (ن) goristan
گۆڕسان، قەبرستان، زیارەتان، گەرەکی جاولەبەران.

**گۆرەپان** (ن) gorepan
مەیدان، مەیان، ساحەی ناوەڕاست شار، گۆڤان.

**گۆڕین** (کتپ) gorîn
١- شتێ لەجێگەی شتێ دانان.
٢ - جێ گۆڕکەپێ کردن، سەر لەنوێ ڕیزکردنەوە.
٣- ئال وگۆڕ کردن، گۆڕاننەوە، ئاڵوگۆڕ کردن، شتێ بەکەسێ دان و شتێکی تر لەجێی وەرگرتن.
٤- جل(داکەندن، گۆڕیین).

**گۆزە** (ن) goze
کاوشە، جەرەی گەورە، دەفری ئاو لەقوڕی سوورەوە کراو دروستکراو.

**گۆشت** (ن) gošt
نەرمەی ئاژەڵ، گووشت، پارچەگۆشت، گۆشتی (گا، گوێرەکە، بەرخ، مەڕ).

**گۆشتخۆر** (ئان) goštxor
١- گیانداری گۆشت خۆر، هەرجانەوەرێک کەگۆشت بخوا. ٢- پیاوخۆر، زەلام خۆر، مرۆڤی مرۆڤ خۆر، مرۆڤخۆر.

**گۆشت گرتن** (کتن) gošt girtin
قەڵەوبوون.

**گۆشتن** (ئان) goštin
قەڵەو، پرگۆشت، گۆشتین، جاخ، چاخ، خیپشنە.

**گۆشە** (ن) goše
پەنا، سووچ، قوژبن، کونجر.

**گۆشەگیر** (ن) gošegîr
کەنارەگیر، گۆشەنشین، تەرکەدنیا، دوورە(پەرێز، خەڵک).

**گۆڤار** (ن) govar
نوسراوی چەندپەرەیی کەهەفتانە یان مانگانە بڵاوبێتەوە.

**گۆل** (ن) gol [1]
١- گۆلاو، ئەستێر، ئەستێلک.
٢ - دەریاچە، زرێبار.

**گۆل** (ن) gol [2]
دێراو، جۆگەی ئاومەزرا.

**گوم** (ئان) gum
وون، نادیار، گومەسار.

**گومان** (ن) guman
شک، دوودڵیی، دڕدۆنگیی، سۆ، ڕوێز.

**گوم بوون** (کتن) gumbûn
١- نادیاربوون، دیارنەمان. ٢ - بێ سەروشوێن بوون، نەمان، ڕەش ڕاهاتن، غەیب بوون.

**گومڕا** (ئان) gumra
١- ڕێ لێ ونبوو، گومبوو، گومرە.
٢ - بەهەڵەداچیی، هەڵە(مرۆڤ)، سەهوو(کەسێ)، هەڵەکار. ٣ - چەواشەکراو، بەهەڵەدابراو.
٤ - فێڵ لێ کراو، دەست بەزاخداکراو.

**گوم کردن** (کتپ) gum kirdin
١- فەوتاندن، نەهێشتن، پرش وبڵاوکردن. ٢- بێ سەرو شوێن کردن، لەدەست دان، گومە سارکردن.

**گومەز** (ن) gumez
گومبەز، گومەت، گونبەز، گومەد، گومەزە.

**گوناح** (ن) gunah
١- گونا، گوناع، گوناه، گوناسا، گوناسە، ئەویال، تاوان. ٢- خوانەناسیی، بەدخوایی، بەدیی.

**گونجان** (کتن) guncan
١- بوون، گونجیین، جێگەبوونەوە.
٢ - سازان(پێکەوە، لەگەڵ).

**گوند** (ن) gund
دێ، ئاوایی.

**گونیە** (ن) gunye
گوێنی، تەلیس.

**گوێ** (ن) gwê
١- گوە، گو، گوێچکە، گۆە، گوێچک، گویە.
٢- ژنەفت، ژنەوت، هەستیاری (ژنەفتن، ژنەوتن)
٣- وریایی، ئاگاداریی.

**گوێ خەفاندن** (ئد) gwê xefandin
خۆ لێ کەڕ کردن، گوێ پێ نەدان.

**گوێزان** (ن) gwêzan
دروزان، مووتاش، مووس، گووزان، تیخی(مووتاش، مووتاشین).

**گوێزانەوە** (کتن،کتپ) gwêzanewe
گوازتنەوە.

**گوێسوانە** (ن) gwêswane
سوانە، سوانده، سڤاندە، سیڤاندە، گوێسەبانە، گوێسوانە، سەرلێواری بان.

**گوێگر** (ئان) gwêgir
گوێ(هەڵخەر، قولاغ)، وریا.

**گوێ گران (ئان)** gwê giran
گوێ کەڕ، کەڕ، کەسێ کە گوێی قورسە.

**گوێ لێ بوون (کتن)** gwê lê bün
ژنەوتن، ژنەفتن، شنەوتن، بیستن.

**گەدا (ن)** geda
سوالکەر.

**گەدە (ن)** gede
ورگ، عوور، گەدگ، مادە.

**گەر (نپ)** ger
ئەگەر، ئار.

**گەرا (ن)** gera
تۆم، توخم، پرگ، بەزر.

**گەرادانان (کتپ)** geradanan
گەراخستن، تۆم داخستن.

**گەرد (ن)** gerd [1]
١- تۆز، غوبار. ٢- خۆڵی ورد، خاکە.

**گەرد (ن)** gerd [2]
ئەنگیی، ئەیب.

**گەردان کردن (کتن)** gerdan kirdin [1]
هاتوچۆکردن، هاتن و چوون، گەڕان بەمڵاولادا.

**گەردان کردن(کردار) (کتپ،ری)** [2] gerdan kirdin(kirdar)
تەسریف کردن، گۆڕینی (دۆخی کردار بەگوێرەی تەسریفەکەی) .

**گەردانە (ن)** gerdane
سینەبەند، گولوەن، گەردن بەند، گەردنلغ، گەردوان،قەڵەدەی زەنبەر، خشڵی(ئەستۆ، مل، گەردن) .

**گەرداو (ن)** gerdaw
گەرداف، ڕەشەبای سەر دەریا...

**گەردن (ن)** gerdin
مل، بەرئەستۆ، ئەستۆ لەلای سنگەوە.

**گەردوخوڵ کردن (کتن)** gerdw xul̲ kirdin
گەڕان، سووڕانەوە (بێ مەبەست) .

**گەردون (ن،نس)** gerdün [1]
ئاسمان، لوتکەی ئاسمان، حەوا.

**گەردون (ن)** grddün [2]
عەرەبانە، گالیسکە.

**گەردون (ن)** gerdün [3]
گەردونە، چەرخی ئاو هەڵێنجان، ناعوور.

**گەردەلوول (ن)** gerdelül
گەردولوول، گێژەلووکە، گەردەبا، گەردەبل،
گەرەپێچ،گەرەپێچە، بای لەپڕو توند وتۆزاویی.

**گەرم (ئان)** germ [1]
١- پڕ ئەوژم وتینی گەرمیی.
٢- پڕ(تاسە، ئارەزوو) .
٣- بەرگەرم، خونەک. ٤- تازە، نوێ، تازە کوورە.

**گەرم (ئاک)** germ [2]
زوو، دەست بەجێ، بەپەلە، گەرماو گەرم.

**گەرم (ئان)** germ [3]
بەکار.

**گەرما (ن)** germa
گەرمیی، گەرماتیی.

**گەرمایی (ن)** germayî
گەرمامیی، تینی شتی گەرم، ئەوژمی گەرما.

**گەرم بوون (کتن)** germ bün
گەرم(داهاتن، راهاتن) ، گەرمیی تیا(تیدا) پەیدابوون.

**گەروو (ن)** gerü [1]
قورگ، قورقوراگە.

**گەروو (ن)** gerü [2]
دەرە، دەربەند.

**گەروو (ن)** gerü [3]
بستوو زینو(چیا) .

**گەرەک (ئان)** gerek
بایس، گەرە، ئەشێ، دەشێ، پێویست.

**گەڕ (ن)** ger̲ [1]
پێچ، سووڕ.

**گەڕ (ن)** ger̲ [2]
فیل، گزیی.

**گەڕ (ن)** ger̲ [3]
تەشقەڵە، تەشخەڵە، شلتاخ.

**گەڕ (ئان،پز)** ger̲ [4]
گڕوێ، گڕو، گەڕەل، گەڕۆل، توشی گەڕیی(بوو، بووگ) .

**گەڕ (ن)** ger̲ [5]
نۆبە، نۆرە، نۆگە.

**گەڕان (کتن)** ger̲an
ڕۆیشتن، گەڕیان، گێلان، هاتوچۆکردن، هاتن وچوون، گەشت کردن، دنیابینیین.

**گەڕانەوە (کتن)** ger̲anewe
هاتنەوە، گەڕیانەوە، ڕۆینەوە.

**گەڕۆک (ن)** ger̲ok
گەڕا، فرەگەڕ، هەمیشەلەڕێ، شارانگەڕ، گەڕندە.

**گەرەک (ن)** gerek
تاخ.

**گەزتن (کتپ)** geztin
گازلێ گرتن، گەزگرتن، گەزیین.

**گەزیین (کتپ)** gezîn
گەزتن (بەددان..) .

**گەش (ئان)** ١ geš
بلیسەدار، گەشاو(ئاگر) .

**گەش (ئان)** ٢ geš
ئازاو، تیراو، بەورشەو پرشە.

**گەشانەوە (کتن)** ١ gešanewe
پشکووتن، گەشیانەوە، دەم دانەوە(گوڵ) .

**گەشانەوە (کتن)** ٢ gešanewe
بەدەق بوون، شادبوون، کەیف خۆش بوون.

**گەشت (ن)** gešt
گەڕیە، گێل، کێل.

**گەشت کردن (کتن)** gešt kirdin
سەفەرکردن، چوونەگەڕان.

**گەشە (ن)** geše
شادیی، خۆشیی.

**گەشە (ن)** geše
بزە، زەردەخەنە.

**گەشە (ن)** geše
نشونەما، نشونوما، نەشونما.

**گەف (ن)** gef
گف، گڤ، گەزاف، زڕت، هەڕەشە.

**گەفاندن (کتپن)** gefandin
گەف کردن، گەفیین، گوڕەشەکردن، هەڕەشە کردن.

**گەل (ن)** ١ gel
کۆمەڵ.

**گەل (ئان)** ٢ gel
زۆر، زیدە.

**گەل (ن)** ٣ gel
میللەت، نەتەوە، کۆمەڵەخەڵکی هاوڕەچەڵەک.

**گەڵ (ن)** geḻ
ئاولنگ، نێوان هەردووران.

**گەڵا (ن،رو)** geḻa
بەرگی درەخت وسەوزایی، پەلک.

**گەڵاڵە (ن)** geḻaḻe
گلاڵـە، نیـوە(دروسـت بـوو، تـەواو، ناتـەواو) ، نموونەی نیوەتەواو.

**گەڵهۆ (ئان)** gelho
گـاحۆل، گێلۆکـە، گـەلۆر، گێژوویـژ، دەبـەنگ، ناتێگەیشتوو ، نەزان، گەمژە، گەمژەل

**گەمارۆ (ن)** ١ gemaro
پەلامار، شالاو.

**گەمارۆ (ن)** ٢ gemaro
ئابلووقە، بڕینی هەموو ڕێگایەکی بژێوی.

**گەمارۆدان (کتپ)** gemarodan
چوار دەورگرتن، دەورەگرتن، ئابلوقەدان، تەوق دان.

**گەمیە (ن)** gemye
گەمەی، گەمێ، کەشتی ـ بەلەم.

**گەمیەوان (ن)** gemyewan
گەمیوان، کەشتیوان، بەلەمەوان.

**گەنج (ئان)** genc
جاهیل، جحێل، لاو، (جوانکە، جوان) لەتەمەندا.

**گەنجینە (ن)** ١ gencîne
١- گەنج، خەزینە. ٢- خەزانەی نەغدینە.

**گەنجینە (ن)** ٢ gencîne
ژووری زەخیرە وشتی بەنرخی ناومال.

**گەنجیی (ن)** gencî
گەنجێتیی، لاویی، گەنجایەتیی، ڕۆژگاری جوانیی.

**گەنیین (کتن)** ١ genîn
گەنان، بۆگەن بوون، لەکـەڵکـە کـەوتن، خـراپ بـوون، تام وبۆن گۆڕان.

**گەنیین (کتن)** ٢ genîn
ڕزان، ڕزیین، هەڵ ڕزان.

**گەنیو (ئان)** genîw
گەنیک، گەنیی، گەنی، داوەشاو.

**گەوج (ئان)** gewc
بێئاوەز، کەڕۆکە.

**گەوجیی (ن)** gewcî
نەزانیی، دەبـەنگیی، گێلیـی، بـێ(ژیریـی، مەغزیی، ئاوەزیی) .

**گەوڕ (ن)** gewiṟ
ئاغەل، تەویلە، سەبل، ستەوڵ، گەلەخان.

**گەورە (ئان)** ١ gewre
١- زل، زەلام، فیلەتەن. ٢- هەلچوو، پێگەیشتوو.
٣- قورس، سەنگین. ٤- گرنگ، دیار.
٥- قەڵەو، گۆشتن.
٦- بەڕێز، شکۆمەند، پایەبەرز.

**گەورە (ئان)** ٢ gewre
بەتەمەن، پیر.

**گەوزان** (کتن) gewzan
گەڤـزان، گەڤـزدان، تـل(دان، خـواردن) ، تەپـاوتل (تەپ تل) کردن.

**گەوهەر** (ن) ١ gewher
گەوەر، دوڕی گەورە، بەردیکی زۆر بەنرخە.

**گەوهەر** (ن) ٢ gewher
جەوهەر، مادە، مایە.

**گەیاندن** (کتپ) geyandin
گەهانـدن، گـەیانن، بـردن ودانـان، بـۆ بـردن، دانەدەست.

**گەیشتن** (کتن) ١ geyštin
گەیین، گەمیشتن، گەیینەجێ.

**گەیشتن{میوە}** (کتن) ٢ geyštin(mîwe)
گەیین، پێ گەیین، بوون، پوختەبوون، خـۆش بـوون، ئاوتێ زان.

**گەییو{میوە}** (ئان) geyîw(mîwe)
پیگەیشتوو، گەییک، گەیشتیی، گەمیشتیی.

**گیا** (ن،رو) giya
گەیا، سەوزایی، سەوزە، میرگ.

**گیان** (ن) ١ giyan
١- ڕۆح، ڕۆح وجەستە، هەناسەی ژیان، ژیان.
٢- جەرگەی هەست، ناخی هەست و ویژدان.
٣ - بوون، مرۆڤ.

**گیان** (ن) ٢ giyan
ئەندام، ئەننام، بەدەن.

**گیاندار** (ن) giyandar
گیـان لەبـەر، زینـدوو، زینـگ، زیـڕۆح، ڕۆح لەبـەر، جوودار، زیندەوەر، گیانەوەر، جانەوەر، گیان دەبەر.

**گیان سپاردن** (کتن) giyan sipardin
گیان (ئەسـپاردن، دان، بەدەسـتەوەدان، کەنـدن) ، ڕۆح یان گیان دەرچوون، مردن، زایەبوون.

**گیانە لا** (ن) giyanela.
گیانـەلاو، گیانـەلان، دەمـی ئاویلکـەدان، دەمـەدەمی ڕۆح دەرچوون.

**گیچەڵ** (ن) gêçel
گەڕ، دەبە.

**گیر** (ئان) gîr
چرووک.

**گێڕ** (ئان) ١ gêr
چەوت، خواروخێچ، لار.

**گێڕ{مرۆڤ}** (ئان) ٢ gêr(mirov)
شەل، سمت(لەجێ چوو، سەقەت) .

**گیرفان** (ن) gîrfan
باخەڵ، بەریک، بەرک، جیو، کورک.

**گیرفان بڕ** (ن) gîrfanbir
بەرۆکبڕ، بەرکبڕ، باخەڵ بڕ.

**گیرۆدە** (ئان) ١ gîrode
گیرەوە، گرفتار.

**گیرۆدە** (ئان) ٢ gîrode
ئالوودە، ئۆگر، هۆگر، خوویێ گرتوو.

**گیرۆدە** (ن) ٣ gîrode
ئەڤیندار، ئەویندار، دولبەر.

**گیروگرفت** (ن) gîrw girift
قۆرت وگرێ، تەنگ وچەڵەمە.

**گێرەشێوێن** (ن) gêrew šêwên
ئاژاوەچیی، ئاشووبگێڕ، فیتنەباز.

**گێرەوکێشە** (نک) gêrew kêše
گیرۆدەیـی، گرفتـاریی، دەردەسـەریی، دەردی سەریی.

**گێژ** (ئان) ١ gêj
گێج، وڕ، دنگ.

**گێژ** (ن) ٢ gêj
خول.

**گێژ** (ئان) ٣ gêj
مەست، سەرخۆش.

**گێژاو** (ن) gêjaw
گێژاڤ، گیجاو، گەڕینەک.

**گێژەلووکە** (ن) gêjelüke
گیجەلووکـە، گـەردەلوول، گەژگـەڕینک، بـاهۆز، بـاگ ڕۆک، باگرۆک.

**گێسوو** (ن) gêsü
گیسی، ئەگریجە، پرچ، کەزی، پۆڕ.

**گیشە** (ن) gîše
شارا، تەبارە، گەلاویژ.

**گێل** (ن) ١ gêl
قوڕ، هەڕک.

**گێل** (ئان) ٢ gêl
گیلۆکە، سست هۆش.

**گێوڵ** (ن) gêwul
گیڤل، تاسە، تامەزرۆیی، ئیشتیا، واز.

# پیتی - ل -

# -L-

**لا** (ن) ١ la
ئالی، تەنیشت، رەخ.

**لا** (ن) ٢ la
توێ.

**لا** (ن) ٣ la
نیوە، نیمە.

**لا** (پ) ٤ la
جەم، کن، نک.

**لا** (ئسب) ٥ la
برۆ بەولاوە!، وەل بە!.

**لا،** (ن) ٦ la
یاریدە، یارمەتیی.

**لا** (ن) ٧ la
بەش.

**لابار** (ن) ١ laabr
تابار، نیوەبار.

**لابار** (ن) ٢ labar
خوار، نارێک.

**لابڕ** (ن) labar
قەدبڕ، سەربڕ، کاری لاڕێ گرتن بۆ کورت کردنـەوەی ڕێگە.

**لابردن** (کتپ) ١ labirdin
١- پاک کردنەوە، پاکەو کردن. ٢- سڕیین.
٣- خستنە ئەولاوە، لەسەر فڕێدان.

**لابردن** (کتپ) ٢ labirdin
دوور خستنەوە.

**لابوون** (کتن) ١ labün
کلابـوون، کـەنارەگیریی بـوون، دوورەپـەرێز (ڕاوەستان، وەستان).

**لابوون** (کتن) ٢ labün
سەرســەختیی پیـشان دان، نەهاتنەســەر ڕێ، بەرهەڵستیی کردن.

**لابەلا** (ئان) ١ labela
لاوەلا، خوارۆخێچ، پێچاو پێچ.

**لابەلا{مرۆڤ}** (ن) ٢ labela(mirov)
خۆتێ هەڵقوتین، لاپلارسەنگ، لاپلار، خۆهەڵواس.

**لاپاڵ** (ن) lapa̱l
لاپار، کەمەر، قەدپاڵ.

**لاپچین** (ن) lapçîn
پۆتین، پێلاوی تاسەر قولەپێ.

**لاپلار** (ن) lapilar
پلار، ئاخافتنی بەتوێکڵ، بەرد، ساچمە.

**لاپوشک** (ن) lapušk
چنگ، چنگورک، چنگاڵ( درندە ).

**لاپەڕ** (ئان) ١ lape̱r
دوور، دوورکەوتە، تاک ودوور.

**لاپەڕ** (ئان) ٢ lape̱r
دوورە پەرێز، کەنارەگیر.

**لاپەڕە** (ن) lape̱re
ڕوویەک لەپەڕەیەک، لاتەوەق.

**لات** (ئان) ١ lat
بێ(پول وپارە، پارەوپول)، نەدار.

**لات** (ئان) ٢ lat
حاڵ پەرێشان، داماو.

**لات بوون** (کتن) ١ latbün
حاڵ پەرێشان بوون، دامان، بێ حاڵ بوون.

**لات بوون** (کتن) ٢ latbün
لات کەوتن، هەژار کەوتن، نەداربوون.

**لات بوون** (کتن) ٣ latbün
لاوازبوون، زەعیف بوون، لەربوون.

**لاترقەو چە پێچ** (ئان) latirqew çepêç
لاترقــەو چــەڵفاچ، لاترقــەوچ، لاترقەوچـە، لارو پــەرو پووچ، ئاخاوتن یـان کـردەوەی( بـێ تـام و ناتـەواو، نەفامانە ).

**لات ولوت** (ئان) latwlüt
لەسەر ( بەردی ڕەق، ساجی عەلی )، شرولات.

**لاتەرێک** (ئان) laterîk
دوورە پەرێز.

**لاتەنیشت** (ن) la tenîšt
لاتەک، لاتەنشت.

**لاتیر** (ن) latîr
تیلایی چاو، لاتیل، تەماشابە (گۆشەی چـاو، تیلایـی چاو).

**لاجانگ** (ن) lacang
جنیـک، نێـوان ڕوومـەت وئەسـتۆ، لاڕوومـەت، قـەراغ ڕوومەت، نیوە لایەک لەڕوومەت.

**لاجلەو** (ئان) laci̱lew
سەر ڕەق، ڕەوت خوار، بەد (سەر، لغاو)، لارە جلە.

**لاچوون** (کتن) laçün
دوورکەوتنەوە، ڕۆیشتن، بـەجێ هێشتن ( شوێنێ ).

چوونە ئەولاوە.

**لاخستن** (کتپ) ¹ laxistin

دانە(ئەولاوە، کەنارەوە)، کەنارخستن.

**لاخستن** (کتپ) ² laxistin

خوارکردنەوە، چەماندنەوە، نوشتاندنەوە، چەماندن

**لاخۆر** (ن) laxor

چەورە، مالانگەر.

**لادان** (کتپ) ¹ ladan

١- خستنە (ئەولاوە، کەنارەوە).

٢- لەبیرچوون گوێ پێ نەدان.

**لادان** (کتن) ladan

چوونە (میوانیی، لای کەسێ بەسەردانیی)، دیدەنیی کەسێ کردن، چوونە دیدەنیی کەسێ، سەر لێدان،سەردانی کەسێ کردن.

**لادان** (کتن) ² ladan

کلابوون، کەنار (کەوتن، گرتن)، گوم بوون (لە ریگەوباندا).

**لادان{پەردەی پەنجەرە}** (کتپ) ³ ladan (perdey pencere)

لابردن، هەلدانەوە.

**لادز** (ن) ¹ ladiz

پاشدز، دەسکیس.

**لادز** (ن) ² ladiz

سیرمەخۆر، دزی خوێریلە.

**لادێ** (ن) ladê

لادەگا، لاگە، ئاوایی، دێ.

**لادێیی** (ن) ladêyî

لاگایی، لاگەیی، گوندیی، دیهاتیی.

**لار** (ئان) lar

چەوت، چەویل، کەچ، گیر، خوار.

**لاربوون** (کتن) larbûn

خواربوون، کەچ بوون، چەوتانەوە.

**لاربوونەوە** (کتن) ¹ larbûnewe

لارەوەبوون، لارەوبوون، چەمانەوە، خواربوونەوە.

**لاربوونەوە** (کتن) ² larbûnewe

مردن، گیان دەرچوون، بەلاداهاتن.

**لارکردنەوە** (کتپ) larkirdinewe

لار وەکردن، لارەو (کردن، کردنەوە)، خوارکردنەوە

**لاریی** (ن) ¹ larî

خواریی، کەچیی، گیریی، چەوتیی.

**لاریی** (ن) ² larî

نارەزایی، ناقایلیی.

**لاریی لێ نەبوون** (کتن) larî lê nebûn

رازیی بوون، قاییل بوون.

**لاسار** (ئان) lasar

١- گوێ نەبیس، بێ گوێ، نەگریس.

٢- سەرسەخت، کەللەرەق.

**لاسایی** (ن) lasayî

لاسا، دەمەلاسکە، گەمە، دەمەلاسکێ.

**لاسایی کردنەوە** (کتپ) lasayî kirdinewe

١- لاسا کردنەوە، (دەمەلاسکە، دەمەلاسکێ) کردن. ٢- چاولەکەسێ کردن، چاولێکەریی کردن (لەکردار یان گوفتاردا).

**لاس دان** (کتپ) ¹ lasdan

خەلەتاندن، فریودان، بلۆف لێدان.

**لاس دان** (کتپ) ² lasdan

رازیی کردن، قاییل کردن، هێنانە سەرڕا.

**لاسک** (ن) lasik

لاچک، ساقەتە، قەد.

**لاشە** (ن) laše

تەرم، جەستەی مرۆڤی مردوو.

**لاشە{زیندەوەر}** (ن) laše (zîndewer)

کەلاک (ئاژەلی تۆپیو).

**لاشەڕ** (ئان) lašer̄

١- هێمن، لەسەرخۆ.

٢- ئاشتیخواز، ئاشتی پەروەر.

**لاف** (ن) laf

گەزاف، خۆهەلکیشیی.

**لافاو** (ن) lafaw

لێزماو، لەهی، لێ، باراناوی زۆر، ئاوی بەتەوژم کەدوای باران هەلدەسێ.

**لاف لێدان** (کتن) laf lêdan

خۆ هەلکیشان، پەسنیی خۆدان، زرت دان، بەخۆدا هەلدان.

**لاق** (ن) laq

لینگ، لنگ، پاق، چاق، لەران بەرەوخوار، لەبەری پێوە تاجومگەی ران.

**لاقە** (ن) ¹ laqe

پەیوەندیی، پێوەندیی.

**لاقە{ژن}** (ن) laqe(jin)²

گاینی (نارەوا، زۆرەکیی).

**لاکۆلان** (ن) lakol̲an

کۆلانی (تەسک، لابەلا)، کوچەی تەنگ وپەر.

**لاکەی سەرهاتن** (ند) lakey serhatin

١- زۆر برسیی بوون، لەبرساندا مردن.

٢- زۆرماندوو بوون.
٣- زۆر هەست بەئازار کردن.

**لاگرتن** (کتپ) lagirtin
لایەن گرتن، لایەنگیریی کردن، تەرەفداریی کردن، دژ داریی کردن (کەسێ دژی کەسێکی دیکە لەشەڕدا، شەڕە دەنوکە، یان جیاوازی را).

**لاگری** (ن) lagrî
لایەنگیریی، لاگیریی، تەرەفداریی، داکۆکیی، لا کۆشکەیی.

**لاڵ** (ئان) lal
لاڵ، زمان لەنگ.

**لالاموکردن** (ئد) lalamükirdin
زۆر (مەست، سەرخۆش، بێ هۆش) بوون.

**لاڵانەوە** (کتن) lalanewe
پارانەوە، لاڵان، لاڵیانەوە، پاڕیانەوە، لاڤەکرن، لاوەکرن.

**لالوت** (ئان) lalüt
تەلس، دلگیر، دلگران، دل (ڕەنجاو، ڕەنجینراو).

**لاله** (ن) lale
لالا، شەمدانی(بەشووشە، شووشە لەسەر)، فرەمۆمدان.

**لالەزار** (ن) lalezar
گوڵجاڕ، گوڵزار.

**لالێ کردنەوە** (کتپ) la lêkirdinewe
یارمەتییدان، دەستگیرۆیی کردن، ئاوڕ (وەسەردان، لێ دانەوە).

**لانک** (ن) lanik
بێشکە.

**لانە** ١ (ن) lane
لان، هێلانە، شوێنی شەوانەی باڵدار.

**لانە** ٢ (ن) lane
کونی شێر.

**لانە** ٣ (ن) lane
خانووبەرە، شوێنی حەسانەوەی مرۆڤ.

**لانەواز** (ن) lanewaz
ئاوارە، جێگاو ڕێگا لێ شێواو، دەربەدەر.

**لاو** (ن) law
لاوە، لاویژە، لاجک، لەجەک، لاوژۆک، لاوژۆکە، جحێل، تازە (جوان، پێگەیشتوو)، سنێل.

**لاواز** (ئان) lawaz
لەڕ.

**لاواندنەوە** ١ (کتپ) lawandinewe
بەسەر مردوودا (هەڵ ووتن، هەڵگوتن) بەدەم گریانەوە، لاواننەوە، لاوانەوە.

**لاواندنەوە** ٢ (کتپ) lawandinew
دڵ نەوایی کردن، دڵ دانەوە، ئاگاداری لێ کردن.

**لاوڕ** (ن.ئا) lawir
جانەوەری کێویی، گیانەوەری ناماڵیی.

**لاوژە** (ن) lawje
لاویژە، قام، مەقام بەسەر دوڵبەری خۆدا.

**لاولووسە** (ن) lawlüse
ئاراییش، ئاراییشت.

**لاوەکیی** (ن) lawekî
لەلاوەهاتوو، بیانیی، بێگانە، لایدە، خەڵکی دەرەوە، غەوارە.

**لاوێتیی** (ن) lawêtî
لاویی، جەحێلیی، جحێلیی، جوانچاکیی، لاوێنیی، تافی جوانیی، ڕۆژگاری جحێلیی.

**لایلایە** (ن) laylaye
لایەلای، لایلایی، لالایی، لایەلایە، لایەلایی، لۆرک، گۆرانیی منداڵ کردنە خەو.

**لایەن** (ن) layen
ئالی، لایین، تەرەف.

**لایەنگیر** (ن) layengîr
لایەنگر، تەرەفدار، داژدار.

**لب لب** (ئاک.کی) lib lib(ki)
دانەدانە، دەنکە دەنکە، یەکە یەکە.

**لبێ** (ئاک.کی) libê(ki)
بەڵێ، بەلی.

**لچ** (ن) liç
١- لێوی خوارەوە (دەم).
٢- قەراغ، کەنارە، لێوار.
٣- لێوەکان.

**لچ خوار کردنەوە** (ئد) liç xwarkirdinewe
لچ ولێوکۆ کردنەوە و خوارکردنەوە بۆ پیشاندانی (ناڕەزایی، گومان، تێ ڕامان..).

**لچ ولێو** (نک) liçwlêw
دەم ولێو، دەم، دەرگا یان بۆشایی زار.

**لچ هەڵقوتاندن** (کتن) liçhelqutandin
لچ (هەڵقرچان، هەڵقرچاندن، هەڵقورتاندن، هەڵقوتانن، لارەوەکردن، خوارکردنەوە)، دەم خوارکردنەوە.

**لرخە** (ن) lirxe
لرخ، قرخە، قرخەو پرخە، خرەخرەی سنگ.

**لرف** (ن) lirf
قووت چوونی (خواردن، خواردنەوە)، لرفە.

**لرف لیَ‌دان (کتپ)** lirf lêdan

لرف دان، قووت دان، شت خواردن یان خواردنەوە (بەزۆری یان بەپەلە)، ماشیینەوە.

**لستنەوە (کتپ)** listinewe

لستن، لیستنەوە، لیسیینەوە، لیسانەوە، لیستنەوە،لشتنەوە، لشتن، خواردن (شتیَ)، بەزمان (ساویین، پیداهینان)، خواردەمەنی شل بەزمان یان پەنجە لە دەفردا لابردن.

**لغاو (ن)** lixaw

لغاف، دانەلغاو، سەلەف.

**لغاو بۆشل کردن (ند)** lixaw bo şil kirdin

ریَگە بەکەسیَ دان کاری سەربەخۆ بکات، زیادەسەربەستی دان بەکەسیَ.

**لغاوکردن (ند)** lixaw kirdin

ریَگەپیَ نەدان، لەکار گەرانەوە، لغاو گرتن.

**لف (ئان)١** lif

وەک، چون، وینەی، دەق وەک.

**لف (ن)٢** lif

١- تا، هاوتا، هاوشان. ٢- لفە، لفانە، لفەدوانە، دووانە. ٣- ژن، هاوجووت، هاوسەر، هاوسەرین.

**لف گرتن (کتپ،کتن)** lifgirtin

ژن هینان، شووکردن، جووت(گرتن، بوون)، هاوسەر گرتن.

**لڤ (ن،کی)** liv(ki)

بزلو، بزوە، جوولە.

**لڤاندن (کتپ،کی)** livandin(ki)

بزواندن، جوولاندن.

**لڤر (ئاک،کی)** livir(ki)

لڤیا، لەگرە، لیرە، لڤرە، لەم شوینە.

**لڤۆک (ئان،کی)** livok(ki)

١-لڤەک، بزۆز، دانەسەکناو، دانەسەکناو، بیَ ئۆقرە.

٢- وریا، چالاک، گورج، خیرا، لەش سووک

**لق (ن،رو)١** liq

پەل، پژ، لک، شاخە، چل، پەل وپۆی داروبرەخت.

**لق (ن،س)٢** liq

قۆلەی لەشکر، سریە.

**لکاندن (کتپ)** lkandin

چەسپاندن، پیکەوەنووساندن، سکاندن، سکانن، پیَوە نووساندن، زەلقاندن، زەلیقاندن.

**لم (ن)** lim

خیز، ریخ، رەمل، زیخی ورد.

**لمۆز (ن)** limoz

لمبۆز، پۆز، قەپۆز، دەمولووتی گیانەوەر.

**لنگ دان (کتن)** lingdan

١- دانەتاو، راکردن، تەراتین کردن، غاردان، غارکردن. ٢- غاریَ کردن، تاودان، رەتاندن، تەراتین پیَ کردن.

**لنگەوقووچ (ن)** lingewqüç

١- لنگەوژوور، لنگ بەرەوسەروو، سەرمەقولاتیی.

٢- لەدۆخی پشیویی وناریَکیدا.

٣ - زۆر بەخیرایی(ئاک).

**لوان (کتن)١** lwan

گونجان، هەلسوران، سەرگرتن، (بۆ) چوونەسەر.

**لوان (کتن)٢** lwan

رۆیشتن، رۆیین.

**لوتکە (ن)** lütke

تەوقەسەری چیا، ترۆپک، دوند، سەرقەل، قەلەپۆپە.

**لوخم (ن)١** luxim

توونیل، ریَگەی بەبن زەویدا، قوموشی قوولیی سەرگیراو.

**لوخم (ن)٢** luxim

لەغەم، بۆمبای کەدەخریتە ژیر گل دژی مرۆڤ...، لەغم.

**لووت (ن)** lüt

دەماغ، دەفن، دفن، دم، دمناک، کەپوو، کەپ، درناخ، زنژ، تفنک، بیڤل، بۆنگە، زنجی.

**لووت بەرز (ئان)** lüt berz

بە(فین، دەعیە)، بەخۆنان، بەخۆوە نان.

**لووت بە لووتەوەنان (ند)** lütbelütewe nan

لووت بەقنگەوەنان، سۆراغی هەموو هەلسوکەوتی کەسیَ کردن.

**لووت داژەنیین (ند)** lüt dajenîn

لووت (داژاندن، داژەندن)، مات بوون، زویرچوونە سەر لەبەر خۆنان بەناڕەحەتیی وخەمباریی.

**لووت شکاندن (ند)** lütşikandin

لەدەماخ دان، دەماخ شکاندن، تەمیَ کردن بەناخاوتنی رەق.

**لووت لیَ‌خوران (ند)** lütlê xuran

هەوەس (لیَبوون، کردن)، لووت (خوران، خوربان)، خەیال لیَ کردن وبەتەمابوون، دالغە لەکردنی کاریکە (کردن، دان)، دل بۆ چوون.

**لووراندن{سەگ وگورگ} (کتن)** lürandin

لوورەکردن، لوورەلوور کردن، لووران، تیَ هەلکردن بەلوورە.

**لوورە (ن)** lüre

قوورە، دەنگی(لووراندن، سەگ وگورگ وچەقەل)،

بەماوای درێژ وبەرز.

**لووس** (ئان) [1] lüs

ساف، خز، حولیی، بێ موو.

**لووس** (ن) [2] lüs

لووساو، سۆلاف، تاڤگە.

**لووس کردن** (کتپ) lüs kirdin

ساف کردن، پەرداخ کردن، زبری نەهێشتن.

**لووشکە** (ن) lüške

جووتە.

**لوول** (ئان) [1] lül

قژی (لوور، پێچ خواردوو، گرژ).

**لوول** (ن) [2] lül

لوور، تەنوورە، هاتنەخوارەوەی باڵندە لەئاسمانەوە بەرەوخوار بەتیژیی، خۆهاویشتنی مەلەوان لەبەرزایی یەوە بۆ ناوئاو.

**لوول بوون** (کتن) lül kirdin

پێچ خواردن، گرژبوون.

**لوول دان** (کتپ) [1] lüldan

پێچ دان، پێچانەوە، لوول کردن وخول پێدان.

**لوول دان** (ئد) [2] lüldan

بەهەڵپە خواردن، بەپەلە خواردن.

**لوولە** (ن) [1] lüle

بۆری، شتی گرۆڤەری ناوخالیی.

**لوولە** (ن) [2] lüle

شتی(پێچراو، بادراو).

**لۆ** (ن) [1] lo

لا، لانە، قەد.

**لۆ** (پر) [2] lo

بۆچیی؟، چما؟.

**لۆ** (پ) [3] lo

بۆ، ژ، لەبەرخاتری.

**لۆ** (ن) [4] lo

تەرز، جۆر، چەشن.

**لۆتی** (ن) [1] lotî

کوڕی گەنج کە(خۆی تاس ولووس بدا، زۆر دەست بە خۆیدا بێنێ).

**لۆتی** (ن) [2] lotî

بێ (ئابروو، شەرم وشکۆ).

**لۆچ** (ن) loç

چرچیی، گرژیی (شت).

**لۆزەندەر** (ن،ئان) lozender

لۆزندەر، زەبەلاحی تەژە.

**لۆزەلۆز** (ئاک) lozender

تەمەڵیانە، تەمەڵانە.

**لۆقە کردن**{لەسپ} (کتن) loqekirdin(esp)

بەلۆقە ڕۆیشتن، گورگە لۆقەکردن.

**لۆمە** (ن) lome

لۆم، تانە، سەرزەنشت، سەرکۆنە.

**لەئاودان** (کتن) leawdan

لەئاوپەڕینەوە، چوونە ئەوبەری ئاو.

**لەباتی** (ئاک) lebatî

لە(جیاتیی، جێگەی، بات، جیات، باتیان، جێی، جیای).

**لەبار** (ئان) lebar

گونجاو، ڕێک و پێک.

**لەبتاندن** (کتپ،کی) lebitandin(ki)

جووڵاندن، تەکان پێدان.

**لەبریی** (ئاک) lebirî

لە(بریتی ، بریتی).

**لەبن** (ئان) [1] lebin

گش، گشت، تێکڕا.

**لەبن** (ئان) [2] lebin

هەرگیز، قەت.

**لەبن** (پ) [3] lebin

**لەبن هاتن** (کتن) lebin hatin

(دوایی، کۆتایی) هاتن.

**لەبەر** (پ) leber

بۆخاتری، بە(هۆی، سەبەبی)، لەپای، سۆنگە.

**لەبەرچاو کەوتن** (کتپ) leber çaw kewtin

لەبەر دڵ(بێزران، بێزان)، قێز لێ(کرندەوە هاتنەوە).

**لەبەرڕۆیشتن** (کتن) leber roÿštin

لێ(چوون، دەرچوون) تراو لەشتێکەوە.

**لەبەرکردن** (کتپ) [1] leber kirdin

پۆشین، دەبەرکردن، کردنەبەر.

**لەبەرکردن** (کتپ) [2] leber kirdin

داکەندن، ژخۆکرن، لەبەرداکەندن.

**لەبەرکردن** (کتپ) [3] leberkirdin

خستنە مێشک ولەبەرگوتن، فێربوون و(هاتنەوە یاد بێ نوسراو)، یاد وجێگیر کردن.

**لەبەرەوە** (ئاک) [1] leberewe

لەڕۆژگاری پێشترەوە.

**لەبەرەوە** (ئاک) [2] leberewe

هێواش هێواش، لەسەرخۆ، بەکاووخۆ.

**لەبەرەوە** ٢ (ناک) leberewe
لەپێشەوە، پێش هەموو شتێ.
**لەبیربوون** (کتن) lebîbün
فەرامۆش نەبوون، لە(یادبوون، بیردامان، یاددامان).
**لەبیرچوون** (کتن) lebîçün
١- فەرامۆش(کردن، بوون)، لە(یادچوون، بیروە چوون). ٢- لەبیرکردن، ژ بیرکرن.
**لەپ** (ن) lep
بەری (دەست، مشت).
**لەپاش** (ناک) lepaš
دوایی، لەدوایی، لە(پاشا، پاشاندا، پاشانا).
**لەپڕ** (ناک) lepiṟ
لە (ناکاو، پڕا، پڕوا، پڕێ، پڕایەکی)، ناگەهان، گوزو گومەت.
**لەپێست چوونەدەر** (ند) lpêst çüneder
لەپێست (چوونەدەرەوە،دەرچوون)، نۆر (تووڕەبوون، دڵ تەنگ بوون).
**لەپێ کردن** (کتپ) lepê kirdin
کردنەپێ، دەپێ کردن.
**لەپێ کەوتن** (کتن) lepê kewtin
لەپاکەوتن، هێزی ڕۆیین نەمان، ماندووبوون.
**لەت** ١ (ن) let
پارچە، پاژ، کەرت، کوت، تیکە.
**لەت** ٢ (ن) let
نیوە، نیمە.
**لەتاو** (ناک) letaw
لە (ناچاریی، دەست، تاوا، تاوان، تاوانا).
**لەت بوون** (کتن) letbün
١- پارچەبوون، کەرت بوون.
٢- بوون بە(دوولەتەوە، دووپارچەوە).
٣- شکان، وردبوون، پارچەپارچەبوون.
**لەتەک** (پ) letek
لەگەڵ، لەگەر، دەگەڵ.
**لەجوولەکەوتن** (کتن) le cüle kewtin
جوولە لەبەربڕان، بێ حەرەکەت بوون.
**لەچەک کردن** (کتپ) leçek kirdin
چەک لێ (سەندن، داماڵین)، چەک پێدانان.
**لەحیوەت** (نپ) lehêwet
١- لە(حەیبەت، حیوەتا، سام وترسەوە، ترس).٢- نەبادا، نەوەکوو، نەمەدنیایە!.
**لەخشتەبردن** (کتپ) lexište birdin
خەڵەتاندن، فریودان، هەڵ خەڵەتاندن، لەڕێ دەرکردن.

**لەخۆبوردن** (کتن) lexobirdin
دەست لەژیان بەردان بۆ مەبەستێ.
**لەخۆچوون** (کتن) lexoçün
لەهۆش چوون، بێهۆش کەوتن، بوورانەوە، دنیا لەبەرچاو تاریک بوون.
**لەخۆڕا** (ناک) lexoṟa
بێ هیچ هۆیەک، بێ هۆ، لەبەرهیچ ،سەبەبێ، ... هیچ.
**لەخۆڕابینین** (ند) le xoṟabînîn
لەخۆ(ڕاپەڕموون، ڕادیتن ڕادیین)، خۆبەشیاوی کارێ زانیین، بەخۆدا ڕاپەرموون.
**لەخورێن** (ناک) lexurên
لە (خورێن، ناشتا، خوورێیی، خورێیی)، هیچ نەخواردنیی، لەسەرگەدەی خاڵیی.
**لەخۆوە** (ناک) lexowe
هەر بۆخۆ، بێ ئەوەی کەس دەستی تیابێ.
**لەدز وایە هەموو کەس دزە** (رس)
le diz waye hemü kes dize
مرۆڤ لەچاوی خۆیەوە تەماشای خەڵک ئەکا، دانەویلەی خەڵک بەقەسناغی خۆت دەپێویی.
**لەدەست چوون** (کتن) ledest çün
١- لەناوچوون، نەمان (شتێ کەسێ بوویەتی).٢- زایەبوون، مردن.
٣- هەڵ لەکیس(چوون ،دان).
**لەدەستدان** (کتپ) ledest dan
لەناوبردن، بەفیڕۆدان.
**لەدەست هاتن** (کتن) ledest hatin
لەتواناو دەسەڵاتدابوون، توانایی بەسەر کاردابوون.
**لەدەم دەرپەڕین** (ند) ledem derpeṟîn
لەدەم(ترازان،دەرچوون، داکەوتن، دەرهاتن)، لەزارترازان، قسە بەسەحۆو کردن.
**لەڕ** (ئان) leṟ
لاواز، ڕەقەڵە.
**لەڕوودامان** (کتن) leṟü daman
شەرم کردن لەبەرامبەر کەسێ، ڕووگیربوون.
**لەڕیی** (ن) leṟî
لاوازیی، کەم گۆشتیی.
**لەڕێ دەرچوون** (کتن) leṟê derçün
١- لەڕێ لادان، گومڕابوون. ٢- بەهەڵەداچوون، لەڕێی ڕاست لادان، کەوتنەهەڵەوە
**لەڕانەوە** (کتن) leranewe
لەران، لەرینەوە، لەریانەوە، شەکانەوە، جوولانەوە.

**لەرز (ن،پز)** ١ lerz
ساردەتا، سەرمای دوای تا.
**لەرز (ن)** ٢ lerz
لەرزە، ترس.
**لەرزان (کتن)** lerzan
لەرزین.
**لەرزوتا (ن،پز)** lerzwta
مەلاریا، زەردەتا، سێبەرێ.
**لەرزە (ن)** lerze
لەرز.
**لەز (ن،کی)** lez(ki)
پەلە، زوو، خێرا، خێرایی.
**لەزکرن (کتن،کی)** lez kirin(ki)
لەزاندن، پەلەکردن، کەوتنەخۆ، لەزین.
**لەزگین (ئان،کی)** ١ lezgîn(ki)
ڕووخۆش.
**لەزگین (ئاک،کی)** ٢ lezgîn(ki)
زۆربەپەلە، خێرا.
**لەسەرخۆ (ئان)** leserxo
١- ئارام، هێدی، بەپشوو. ٢ - بەهۆش، ئاگادار.
**لەسەرڕۆیشتن (کتن)** leserṟoyştin
١- لەسەرچوون، درێژەپێدان.
٢- دەست بەرنەدان، بەشوێنداچوون.
٣- لەسەر ڕۆیین، پێ چەقاندن، سووربوون (لەسەر).
**لەسەرکردنەوە (کتپ)** leser kirdinewe
لەسەرەوکردن، لەسەر(هاتنەجواب، وەکردن، هەڵدان)، ئاریکاریی کردن.
**لەش (ن)** leš
ئەندام، بەدەن، بەدن، تەن، جەستە، کەلەخ ، قالب.
**لەش سووک (ئان)** leššük
لەش سڤک، ئیشکەر، ئیش ڕاپەڕێنەر، ئازا لەکاردا.
**لەشکر (ن،س)** leškir
ئۆردوو، سپا، هۆردوو، سوپا، کۆمەڵی زۆر لەچەکداران لەژێر ڕێکخراوەیەکی تایبەتدا، هێزی چەکدار.
**لەشکرگا (ن،س)** leškirga
بنکەی سپا، سوپاگە، جێگەی بەردەوامی لەشکر.
بەردەوامی لەشکر.
**لەش گران (ئان)** lešgiran
لەش (قورس، داهێزراو)، تەمەڵ، سست.
**لەغەم (ن)** lex̱em
لەغم، لوغم.

**لەق (ئان)** leq
شل، بن سست، ناقایم.
**لەقاندن (کتپ)** leqandin
لەشوێنیخۆ(جووڵاندن، لەراندن)، شل یان سست کردن ، لەقانن.
**لەقەشێل کردن (کتپ)** leqešêl kirdin
پێ شێل کردن، پاشێل کردن، خستنەژێر پێ، بەرپێ دان، بەلەقەشێلان.
**لەقەلەق (ن)** leqeleq
جووڵە جووڵ.
**لەقەوەشاندن (کتپ)** leqewešandin
لەقە (هاویشتن، داوەشاندن)، لاق بەتوندیی هاویشتن بۆ دواوە، جووتە (وەشاندن، هاویشتن).
**لەکارخستن (کتپ)** lekarxistin
لەکار (کردن، پەکخستن)، بێ بەهرە کردن.
**لەکارکەوتوو (ئان)** lekarkewtü
لەکارکەوتە، لەکارتە، لەکارکەفتگ، پەک کەوتە، بەکەرەم نەماو، لەکەرەم (کەوتوو، کەفتگ).
**لەکورتیی (ئاک)** lekürtî
بێ درێژەدان بەئاخافتن، بەکورت وکرمانجیی.
**لەکۆڵ کردنەوە (کتپ)** lekoḻ kirdinewe
لەکۆڵ خستنەوە، بەلالەسەر (لابردن، نەهێشتن)، لەبەلا(ڕزگارکردن، قوتار کردن).
**لەکۆڵ گرتن (کتپ)** lekoḻ girtin
گرتنە کۆڵ، خستنەکۆڵی خۆ، لەکۆڵ کردن (باری کەسێکی دیکە).
**لەکە (ن)** ١ leke
پەڵە، پیسی.
**لەکە (ن)** ٢ leke
ئەیب، عەیب، عار، ئەنگیی.
**لەکەدار (ئان)** ١ lekedar
پەڵاویی، لەکیین، بەپەڵە.
**لەکەدار (ئان)** ٢ lekedar
ئەنگدار، ناوزڕاو.
**لەکیس چوون (کتن)** lekîsçün
لەدەست چوون، ژدەست چوون، لەدەست دەرچوون، لە ناوچوون، زایەبوون.
**لەگام (ن)** legam
جەورە، زگ لەوەڕین.
**لەگوێ دان (ئد)** legüpdan
پەشیمانیی حاسڵ کردن، ناهومێدبوون، نائومێدبوون.

**لەگۆترە** (ئاک) legotre

لەبڕ، بێ کێشان و بێ پێوان، چکیی، بەگۆترە.

**لەگۆچوون** (کتن) legoçün

لەجوولە کەوتن، گۆنەکردن، لەگۆکەوتن.

**لەگەڵ** (پ) legel

دەگەڵ، لەگەر، لەتەک، ویکرا، ڕەگەڵ، بەهاوڕا، ڤیرا، پێرا، پێکەوە، ب هاڤرە، بهڤرە.

**لەلە** (ن) [1] lele

دایەن.

**لەلە** (ن) [2] lele

نۆکەری زارۆک بەخێوکەر، پیاوێ کەڕاگیرابێ بۆ بەخێو کردن وپەروەردەی منداڵ.

**لەلە** (ن) [3] lele

بڕاوە، دابڕ.

**لەلە** (ن) [4] lele

گرێ، قۆرت، کرت.

**لەمەوبەر** (ئاک) lemewber

لەمەبەر، لەمەوپێش، بەرلەئێستا، ئەوسا، پێش ئێستا،جاران، دێرزەمان، زووگێن.

**لەمەولا** (ئاک) lemewla

لەمەودوا، لەمەوپاش، لەمەولاوە، لەئێستا بەدواوە، ئێساو لا، لەگرەولا.

**لەناکاو** (ئاک) lenakaw

لە (پڕ، پڕیکا، پڕا).

**لەناوبردن** (کتپ) lenawbirdin

لەنێوبردن، لەناودان، نەهێشتن، بەربادکردن، توناکردن.

**لەناوچوون** (کتن) lenawçün

نەمان، لەنێوچوون.

**لەنگ(مرۆڤ)** (نان) [1] leng(mirov)

شەل، لەنگر، پێ سەقەت.

**لەنگ** (نان) [2] leng

خوار، لار.

**لەنگ** (نان) [3] leng

لاسەنگ، کەچ.

**لەنگە** (ن) lenge

لەرە.

**لەنگەر** (ن) [1] lenger

ڕاگر، ڕاگیر، ئاسنی سەر بەقولاپی بەزنجیرەوە بۆ ڕاوەستاندنی گەمیە دەخرێتە قەراغ دەریاوە...

**لەنگەر** (ن) [2] lenger

بەحەواوە لەفڕین ڕاوەستانی مەل.

**لەنگەر** (ن) [3] lenger

تەوازن.

**لەنگەرگا** (ن) lengerga

لەنگەرگە، مەنەرگا، جێ وەستانی کەشتی، قەراغ دەریا کە گەمیە لەنگەری لێ دەگرێ.

**لەنگەرگرتن** (کتن) lenger girtin

بەئاسمانەوە لەفڕین ڕاوەستان (مەل).

**لەنگەرهاویشتن** (کتپ) lenger hawîştin

لەنگەر(فرێدان، خستن، گرتن،هاویتن)، ڕاوەستاندن (کەشتی بەهۆی لەنگەرەوە).

**لەوانەیە** (ئاک) lewaneye

ڕەنگە، دوورنیە.

**لەوچە** (نان) lewçe

چەنەباز، زۆر بلێ.

**لەوەڕ** (ن) [1] lewer

ئالف.

**لەوەڕ** (ن) [2] lewer

لەوەرگە، پاوان، شوێن لەوەڕ.

**لەوەڕاندن** (کتپ) lewerandin

ئاژاڵ بردن بۆ لەوەڕخواردن، لەوەڕانن.

**لەوەڕگە** (ن) lewerge

لەوەرگا، جێ لەوەڕ، چەراگا، ئالفجاڕ، گیاجاڕ، ئالفگا.

**لەهۆش خۆ چوون** (کتن) lehoš xo çün

بوورانەوە، لەهۆش چوون، ژ خۆ چوون.

**لەیز** (ن،کی) [1] leyz(ki)

هەڵپەرکێ، سەما.

**لەیز** (ن) [2] leyz

یاریی ومەزاق، گاڵتەو لاریی.

**لەیزتن** (کتن،کی) [1] leyztin(ki)

سەماکردن، هەڵپەڕین.

**لەیزتن** (کتن) [2] leyztin

یاریی کردن، لەیزین، لەیشتن، کایەکردن.

**لەیلان** (ن) [1] leylan

بیابان، سارای بەرپان، چۆڵ ودەشت.

**لەیلان** (ن) [2] leylan

تراویلکە.

**لەیەک بوون** (کتن) leyekbün

جیابوونەوە، لێک جیاوەبوون.

**لەیەک بەربوون** (کتن) leyek berbün

تێک بەربوون، کەوتنەگیان یەکە، گیان یەک کەوتن،بەگژیەکدا چوون، بەیەکداهاتن (بەئاخاوتن یان کردار).

**لێ بران** (کتن) lê biran
کەم هێنان، کورت هێنان، بەش نەکردن.
**لێ بردن** (کتپ) ١ lê birdin
لێ (ڕفاندن، فڕاندن).
**لێ بردن** (کتپ) ٢ lê birdin
پێدابردن، دەناونان، دەناوراکردن.
**لێ بوردن** (کتپ) lê burdin
لێ خۆش بوون، بەخشیین (کەسێ لەهەڵە وخەتا)، عەفوکردن، چاوپۆشیی لێ کردن، سەرفی نەزەر لێ کردن.
**لێ بوونەوە** (کتن) ١ lê bünewe
لەکار(تەواوبوون، بوونەوە)، دەست خاڵیی بوونەوە.
**لێ بوونەوە** (ند) ٢ lê bünewe
دەست لێ هەڵگرتن، وازلێ هێنان.
**لێ پرسین** (کتپ) lê pirsîn
پرسیار (لێ کردن، لەکەسێ کردن).
**لێ پرسینەوە** (کتپ) lêpirsînewe
لێ کۆڵینەوە، پرسیار لێ کردن،لێ پێچانەوە.
**لیتە** (ن) lîte
١- لیتاو، هەڕگاو، قوڕاو. ٢- قوم.
**لێ چوون** (کتن) ١ lêçün
لێ کردن، وێ چوون، وەک یەک وابوون، شباندن.
**لێ چوون** (کتن) ٢ lêçün
دادان، دەلان، دەلیان، دەلاندن، دەلانن (تەڕایی لەدەفر).
**لێ خستن** (کتپ) ١ lêxistin
لەسەرکار دەرکردن، بەرکەنار کردن، لەپیشەدەرکردن، لەوەزیفە (دەرکردن، کردنەدەر).
**لێ خستن** (کتپ) ٢ lêxistin
پیا(پێدا) {سوون، ساویین، هێنان، مانیین}، لێدان (شتێ لەشتێکی دیکە).
**لێ خواردن** (کتپ) lêxwardin
بەهرە لەشتێ دەست کەوتن.
**لێ خوڕین** (کتپ) lêxurîn
ئاژۆتن، بەڕێگادا بردن.
**لێ خۆش بوون** (کتپ) lêxošbün
چاو لێ پۆشیین (بەرامبەر هەڵەیەکی بچووک).
**لێ دان** (کتپ) ١ lêdan
پێدامالیین، کوتان، قوتان، پێدا( دان، کێشان، کوتان).
**لێ دان{دەرگا}** (کتپ) ٢ lêdan(derga)
دەرگا کوتان

**لێ دان{شتێ}** (کتپ) ٣ lêdan(štê)
بەناڕەوا (بردن)، دەست بەسەرداگرتن.
**لێ دەرکردن** (کتپ) lêderkirdin
لێ (فڕێدان، دەرهێنان).
**لێڕەوار** (ن) lêrewar
لێڕ، دارستان، جەنگەڵ.
**لێزان** (ن) lêzan
پسپۆڕ، زانا (لەشتێکدا)، شارەزا.
**لێزگ** (ن) lêzig
تیرۆژ، ستوونە، تیشکی خۆر.
**لێزمە** (ن) lêzime
١- ڕێژنە، ڕەهێڵە، بارانی بە(خوڕ، تەوژم).
٢- لافاو، باراناوی بەتەوژم، لێزماو.
**لێژایی** (ن) lêjayî
سەربەرەو ژێریی، سەربەرەوخواریی، بەرەژێریی، خزایی، قەدپاڵی گرد.
**لیژنە** (ن) ١ lîjine
لژنە، دەستەیەک (کۆمەڵەیەک) لەخەڵک کەپێکەوە کارێ ئەنجام ئەدەن.
**لیژنە** (ن) ٢ lîjine
کۆمەڵەداری لەسەریەک هەڵچنراو.
**لیس** (ن) lîs
تیلا.
**لێشاو** (ن) lêšaw
زۆر وزەبەند، زەحف، فرە، مشە.
**لێشاو** (ن) lêšaw
ئاوی زۆر بەتەوژم.
**لێ شێوان** (کتن) lêšêwan
لێ تێکچوون.
**لێ قەومان** (کتن) lê qewman
لێ (قۆمیان، قەومیین)، سەر لێ شێوان، ژیان لێ تێکچوون، تووشی بەڵابوون، پەرێش بوون.
**لیک** (ن) lîk
لیکاو، لیق، تف ولینجاوی بەدەمدا هاتوەخوار، ئاوی دەم.
**لێک بوونەوە** (کتن) lêk bünewe
شەق بردن، لەت بوون، یەکالا بوونەوە.
**لێک ترازان** (کتن) lêk tirazan
لێک دوورکەوتنەوە.
**لێک دان** (کتپ) ١ lêkdan
تێکەڵ کردن، ئاوێتە کردن.
**لێک دان** (کتپ) ٢ lêkdan
لەیەکتر پەیوەندکردن، پێکەوە بەستن.

**لێ کردن (کتن)** lêkirdin
لێ چوون، وەک بوون.
**لێ کردنەوە (کتپ)**¹ lêkirdinewe
لێ (جیاکردنەوە، جیاوەکردن).
**لێ کردنەوە (کتپ)**² lê kirdinewe
١- چنینەوە (میوە لەدار وبیستان).
٢- رنینەوە(گەلا، گول).
**لێک ڕەوینەوە (کتن)** lêkreînewe
گوشادبوون، بەرفرەبوون. **(vi.).**
**لێک کردن (کتن)**¹ lêk kirdin
(دووریی) خستنە نێوان (دووکەس..). .
**لێک کردن (کتن)**² lêk kirdin
لەیەک کردن.
**لێ کۆلینەوە (کتپ)** lêkolînewe
تۆژینەوە، پۆستکەندە کردن، چوونە بنج وبناوان.
**لێ کەوتن (کتن)**¹ lêkewtin
لێ کەفتن، نابووت بوون، هەژار کەوتن.
**لێ کەوتن (کتن)**² lêkewtin
دەستەوسان بوون.
**لێ گرێ دان (کتپ)** lêgrêdan
پەیوەند (پێوەند) کردن.
**لێ گۆڕان (کتپ)** lêgoran
لێ تێکچوون، بەسەهوو شتێ بەشتێکی تر زانیین.
**لێ گەڕان (کتپ)**¹ lêgeran
وازلێ هێنان، دەست لێ هەلگرتن.
**لێ گەڕان (کتپ)**² lêgeran
بەشوێن شتێکدا گەڕان، دوای شتێ کەوتن بۆدۆزیینەوەی، لێ (گەڕیان، گەڕیین).
**لێل{لێلاو} (ناو)**¹ lêl (aw)
لیخن، شلوێ، ناساف، لیخناو، لیخن.
**لێل (ناو)**² lêl
تەماویی، هەور (ئاسمان)، تاریک.
**لێ نان (کتپ)** lênan
بارکردن.

**لینج (ناو)** lînc
لینجق، لچق، لیچق.
**لێ نیشتن (کتپ)** lênîštin
سواربوون.
**لێ نیشتن (کتپ)** lênîštin
دەست پێ کردن.
**لێو (نک)** lêw
لەب، لەو، لو، هەردوو لچ ولێوی(دەم، زار).
**لێوار (ن)** lêwar
لێوارە، کەنار، کەنارە، زێوار، قەراخ، لچ وکەناری شت.
**لێواولێو (ناو)** lêwaw lêw
لێوان لێو، لێپاو لێپ، سەر ڕێژ، دارماڵ، ماڵاماڵ، پڕاوپڕ.
**لێوبەبار (ناو)** lêwbebar
خەفەتبار، خەمبار.
**لێ وردبوونەوە (کتپ)**¹ lê wurdbûnewe
تەماشاکردن بەوردیی، تەواو تواشاکردن.
**لێ وردبوونەوە (کتپ)**² lê wurdbûnewe
ئەزموون کردن.
**لێ وەشاردن (کتپ)** lêwešardin
لێ(شاردنەوە، وەشارتن)، تاقەت کردن (شتێ کە کەسێ نەیبینێ).
**لێ وەشانەوە (کتن)** lêwešanewe
لێ وەشینەوە، شیان.
**لێ هاتن (کتن)**¹ lêhatin
لێک هاتن، شیاوی یەکتر بوون.
**لێ هاتن (کتن)**² lêhatin
بۆ بوون (جل وبەرگ).
**لێ هالان (کتپ)** lêhalan
بەدەوردا پێچان، (تیوە، لیوە) {ئالان، ئالاندن}.
**لێ هەڵگەڕانەوە (کتپ)** lê helgeranewe
لێ(ڕاست بوونەوە، هەستانە سەر پێ).
**لێ یە (ن)** lêye
لافاو، لەهی، لاپاو، لێ، سێلاو.

# پیتی - م -

# -M-

ما (ئاک) ١ ma
ڕەنگە، لەوانەیە.

ما (ئپ) ٢ ma
ئاخۆ، مەگەر.

ما (پر،ئاک) ٣ ma
بۆچی؟، لەبەرچی؟.

ما (ن،ئان) ٤ ma
مێیینە.

ما (ن) ٥ ma
شاخی لووس، چیای بێدارو درەخت.

ما (ن) ٦ ma
هۆ، سەبەب.

مابەین (ن) ١ mabeyn
نێوان.

مابەین (ن) ٢ mabeyn
ئاشنایەتیی.

مات (ئان) ١ mat
کز، کروشمەکردوو.

مات (ئان) ٢ mat
خەمگین، مەلول.

مات (ن) ٣ mat
شامات، لەکارکەوتنی شای شەترەنج.

مات (ن) mat
ڕەنگی بێ بریقە.

مات (ئان) ٤ mat
بێ دەنگ.

مات بوون (کتن) ١ matbün
کزبوون.

مات بوون (کتن) ٢ matbün
بێ دەنگ بوون.

مات کردن (کتپ) mat kirdin
بێ دەنگ کردن، ژێرکردن.

ماتڵ (ئان) matiḻ
پەک کەوتوو، لەکارکەوتوو.

ماتڵ بوون (کتن) matiḻbün
بێکارمانەوە، وەستان.

ماتڵ کردن (کتپ) matiḻ kirdin
لەکاروەدواخستن، وەستاندن.

ماتەم (ن) matem
پرسە، مردەمو،پرسە،شین،تازێ.

ماچ (ن) maç
ڕامووس، ڕامووز، ڕامیس، ڕامووسان، پاچ، ماچیک.

ماخۆلان (ن) ١ maxolan
بزێویی، گلاراو، نەسرەوتیی.

ماخۆلان (ن) ٢ maxolan
گلاراو و خەمباریی.

ماخولیا (ئان) maxulya
گێژ، حۆل.

مادەن (ن) maden
کان، کانگە.

مار (ن،ئا) mar
حەفی، هەفیی، جانەوەرێکی خشۆکی بەدرێشووکەیە و بەشی زۆریان ژاراوین وپێوەدەدەن.

ماراو (ن) maraw
ئیقبال، بەخت، تالع، هات.

مارس (ن) ١ maṟs
بێ(ئایین، بڕوا، باوەڕ).

مارس (ئان) ٢ maṟs
لاسار، سەرسەخت.

مارگیسک (ن،ئا) margîsk
ماری ژەهراویی.

مارمێلکە (ن،ئا) mar mêlke
مارمێزولکە، مارمێلک، مارمێلۆک، مارمیلک، مارمەزوکە.

مارو دوو (ئان) mar w dü
شەفتوول، فیچەلفاچ.

مارە (ن) mare
پێوەندیی ژن ومێرد بەچەند ووتەیەکی ئایینیی، شوو کردنی ژن هاوسەریی، هاوجووتیی.

مارەکردن (کتپ) mare kirdin
هاوسەریی کردن، کردنەهاوسەر، مەهرکردن، ژن کردنە حەلاڵی پیاو بەڕێ وشوێنی ئایینیی.

مارەیی (ن) mareyî
مارەبرانە، پارەی مارەیی، کابین، کاوین، پارەیەک..کە ژنی لەسەر مارە دەکرێ (پیشەکیی یان پاشیینە).

**ماسان** (کتن) masan
ئاوسان.
**ماست** (ن) mast
مـاس، شـیری گـەرم کـراوی هـەوێن تـێ کـراوی توندەوبوو (مەیوو).
**ماستاو ساردکردنەوە** (ند)
mastaw sard kirdinewe
مەرایی کردن، ماستاو کردن، خۆلەکەسێ هەڵسوون، کلکەسووتەکردن.
**ماسولکە** (ن) masulke
مابیچە، ماهیچە،ماینجە، ماسوولە، گۆشتی پتەوی ناوەڕاسـت ئەسـتووری ئەمـسەر و ئەوسـەر باریکەزەڵەک، زیپەر.
**ماسۆڵە** (ن) masole
ماسـولکەی جـۆلایی (داوی لەسـەر دەپـێچن بـۆ تەنیین).
**ماسە** (ن) mase
زیخی ورد، لم.
**ماسیگر** (ن) masîgir
ماسیڤان، ماسیەوان، کەسێ ڕاوەماسی دەکا.
**ماسی لەسەرییەوە بۆن ئەکا** (پن)
masî leseryewe bon eka
گەورەپـیاوانی سـەر کاروبـار بەرپرسـیارن لـەخراپ بـوونی فەرمانـڕەوایی. (کۆمـەڵ کـە بۆگـەنی تـێ ئەکەوێ لەپیاوە گەورەکانیەوە دەست پێ ئەکا).
**ماشقە** (ن) mašqe
یار، دلبەر، دولبەر، دۆست(ژن).
**ماش وبرنج{قژ}** (ن) maš w birinc(qij)
مووی ڕەش وسپی، جۆگەنمی، دانەماش، دانامە.
**ماشەڵان** (ن) mašelan
سروەی بای خۆراوا، بای شەماڵ.
**ماشینەوە** (کتپ) mašînewe
لێس دان، خواردن(شت بەتەواوی).
**ماف** (ن) ١ maf
مز، بەش.
**ماف** (ن) ٢ maf
حەق، هەق.
**مافنگی** (ئان) mafingî
مافندیی، نابووت، پارەوپول نەماو.
**مافوور** (ن) mafür
فەرش، قالیی، ڕایەخی بەتەون تەنراوی پرزەدار.

**ماک** (ن) ١ mak
بنچینە، بنەما، ڕەگ وڕیشە.
**ماک** (ن) ٢ mak
دایک.
**ماک** (ن) ٣ mak
کون، لانە(درندە، کێویی).
**ماکەر** (ن،ئا) maker
دێلەکەر، ماهەر، مێکەر
**ماڵ** (ن) ١ mal
شتی تایبەتی کەسێ.
**ماڵ** (ن) ٢ mal
دارایی، دەوڵەت، سامان.
**ماڵ** (ن) ٣ mal
کەلوپەلی بازرگانیی، ماڵات.
**ماڵ** (ن) ٤ mal
خانوو، خانووبەرە، جێی ژیانی خێزان.
**ماڵاماڵ** (ئان) mala mal
دارماڵ، تژە.
**ماڵاوا!** (فر) !malawa!
خواحافیز!، خاترێ وە!، خوداحـافیز (بـەو کەسـانە دەوترێ کەبەجێیان دەهێڵی).
**ماڵ ئاوایی لە دنیا کردن** (ند)
malawayî le dinya kirdin
مردن.
**ماڵبڕ** (ن) malbir
دیواربـڕ، ماڵۆکـەن دزێ کەبەشـەو دەچێتـە سـەر ماڵان.
**ماڵبڕین** (کتپ) malbrîn
دیواربـڕیین، مـاڵ دزیـین، چونەسـەرماڵی خـەڵک (بەشەو) بۆ مەبەستی دزیی کردن.
**ماڵبەند** (ن) ١ malbend
چەقۆ، مەنزڵگە.
**ماڵبەند** (ن) ٢ malbend
جێی ماڵ وژیان.
**ماڵخۆ** (ن) malxo
خێو، خاوەن.
**ماڵدار** (ئان) maldar
دەولەمەند.
**ماڵداریی** (ن) maldarî
کردەوێزانیی، دنیاداریی، گردەوکۆیی (لەبەرویومدا)
**ماڵشت کردن** (کتپ) ١ mališt kirdin
دەست بەلەشدا هێنان، دەست پیداهێنان، شێلان.

**مالشت کردن (کتپ)** ٢ mal̲ištkirdin
گەسک دان، خاوێن کردنەوە، پاک وەکردن، مالّین.
**مالّ کامباخ (ئان،کی)** mal̲ kambax(ki)
بەدبەخت، بێچارە، چارەڕەش.
**مالّ کردن (کتپ)** ١ mal̲ kirdin
خانوو دروست کردن، بیناکردن.
**مالّ کردن (کتپ)** ٢ mal̲ kirdin
مالّ پێکەوەنان.
**مالۆس (ن،ئا)** malos
بەرانی مێ، ماچەبەران، دەلّەبەران، دەز، دەپ، مەمۆ، مێچکەبەران، بەرانی مێنگە.
**مالّ ویران (ئان)** mal̲ wêran
لێقەوماو، مالّ شێواو،زیان لێ کەوتوو.
**مالەومالّ کردن (کتن)** mal̲ew mal̲ kirdin
ئەم مالەومالّ کردن.
**مالی با بەبالە چێ (رس)** mal̲î ba be ba eçê
مالی بەهەوانتە دەست کەوێ ، بەهەوانتەش لەدەست دەرئەچێ.
ا-مالی حەرام کەس دەولّەمەند ناکا.
ب- شتی بەناڕەوا دەستکەوتوو بەناڕەوا دەڕوا.
ج- ئەوشتەی بەبا بێ بەئاودا دەڕوا.
**مالی خۆت توندبگرە، سەگی هاوسێ بەدز مەگرە (پن)**
mal̲î xot tund bigre, segî kes be diz mezane
ا- تقل کردن لەگومان کردن باشترە.
ب- باش بەستە لە خەم ڕستە.
**مالی خۆ ویران کردن (ئد)**
mal̲ xo wêran kirdin
زیان بەخۆ گەیاندن.
**مالیی (ئان)** mal̲î
کەویی، کەدیی، لینیی.
**مالّین (کتپ)** mal̲în
گەسک دان، پاک کردنەوە، گزگ دان.
**مامان (ن)** maman
مامۆ، مامون، ئاریکەری ژنی سکپڕ (لەکاتی زاندا).
**مامزە (ن)** mamize
مامین، مەهمین، مامێن، مێهمۆن، چەرخی ئاسنی پەڕەدار بەپاژنەی پێلاوی سوارەوە..
**مامناوندیی (ئان)** mam nawindî
مامناونجیی، مامناوەندیی، نێوان(زل وبچووک، زۆر و کەم)، میانە، دەستە.

**مامۆستا (ن)** mamosta
ماموسا، سەیدا، فێرکار، ئوستاد.
**مامەخەمە (ن)** mame xeme
مشووڕخۆر، خەمخوار، خەمخۆری کەسانی دیکە.
**مامەلە کردن (کتن)** mamel̲e kirdin
سەوداوامامەلّەکردن، کڕین وسەدوا کردن.
**مان (کتن)** ١ man
نەمردن، لەژیاندابوون.
**مان (کتن)** ٢ man
نە(چوون، ڕۆیشتن).
**مان (کتن)** ٣ man
لەناونەچوون، لەبەین نەچوون.
**مان (ن)** ٤ man
گە، گەی، تۆر.
**مانا (ن)** ١ mana
مانە، واتا.
**مانا (ن)** ٢ mana
مەبەست، وێژ، گوزارە، نیاز لەئاخاوتن یان لەنوسراو.
**ماندوو (ئان)** mandü
ماندگ، ماندک، ماندی، مانگ، مانگو ، مانو، شەکەت، خەستەلەکار، کفت، هیلاک.
**ماندووبوون (کتن)** mandü bün
شەکەت بوون، کفت بوون، مانیان.
**ماندوویی (ن)** mandüyî
ماندوویتیی، ماندوەتیی، شەکەتیی، کفتیی، هیلاکیی.
**ماندەل (ن،کی)** manel(ki)
حاشا، ئینکاریی، ئینکیریی.
**مانگ (ن)** ١ mang
ما، ماە، هەیف، مان (کەلەئاسمانەوە [بەشەو] ڕوناکیی ئەداتەوە بەزەویی).
**مانگ (ن)** ٢ mang
چوارحەفتە، سیی ڕۆژ، مانگی(قەمەریی، ڕۆژیی).
**مانگا (ن،ئا)** manga
چێل، مانگە، چێر، مانگەو، دایکی گۆلکە، مێنگەی ڕەشەولاخ، ڕەشە ولاخ یکە کەوتبێتە سک وزا.
**مانگابە دزییەوە کەڵ ئەگرێ وبە ئاشکرا ئەزێ (پن)**
manga be dizyewe kel̲ egrê w be aškira ezê
تاوان بەدزیشەوە بکرێ، لە ئەنجامدا هەر دەرئەکەوێ.

**مانگامردوو، دۆ برا** (پن)
manga mirdü do bira
مانگا که فرۆشرا، شیریش نامێنێ فر کرێ.

**مانگانه** (ن) ١ mangane
مەهانی، مووچەی سەری مانگ، کرێی مانگ بەمانگ.

**مانگانه** (ن) ٢ mangane
١- گزڤارێ.. کەمانگی جارێک دەردەچێ.
٢- بێ نوێژیی ژن، مەهک.

**مان گرتن** (کتن) man girtin
١- گەگرتن، تووڕەبوون ونیش نەکردن.
٢- خیش کردن، پێ چەقاندن ونەڕۆیشتن.

**مانگه شەو** (ن) mange şew
مانگاشەو، ماتاو، شەومە، تاف هەیڤ، تریفە، تریفـە، مەهتاو.

**مانگی نوێ** (ن) mangî nwê
مانگی یەک شەوە، مانگ(نوێ، مانگیلە، تازە).

**ماوه** (ن) ١ mawe
ماوڵ، ماوەکات، قانە، کات، دەرفەت بۆ تاوێ.

**ماوه** (ن) ٢ mawe
ئەندازەی (جێ، جێگە، جێگا).

**ماوه** (ن) ٣ mawe
باقی، باقیماو(لەشتێ).

**ماوەدان** (کتپ) mawedan
ڕێ پێدان، مۆڵەت دان، دەرفەت دان، ماوڵ دان.

**ماین** (ن،تا) mayin
ماهین، مایین، مێنگەی ئەسپ، ژنـی ئەسپ، دایکی جوانوو.

**ماین بەراز** (ن،تا) mayin beraz
ماین وەران، ئەسپی(ڕەسەن، پەڕین) بۆ تۆو ڕاگیراو، ئەسپی فەحل کەماینی لێ چاک دەکەن.

**ماین چەقەڵ** (ن) mayinçeqel
چەرخوفەلەک.

**مایه** (ن) ١ maye
هۆ، سەبەب.

**مایه** (ن) ٢ maye
گەوهەری شت، بنەما

**مایه** (ن) ٣ maye
دەسمایە، سـەرمایە، ئـەو پـارەیەی کەکاسبکار یـان کەسێ کڕین و فرۆشتنی پێوەدەکا.

**مایه پووچ** (ئان) maye püç
مافنگیی.

**مایه سیری** (ن،پز) mayesîrî
مایەسیر.

**مت** (ئان) ١ mit
خۆماتکردوو.

**مت** (ن) ٢ mit
ڕەبەن، خەلەک، سیپە.

**متالا** (ن) ١ mitala
خوێندنەوەی بەچاو.

**متالا** (ن) ٢ mitala
بیر، هیزر، هزر.

**مت بوون** (کتن) mitbün
بێ دەنگ بوون.

**متمانه** (ن) mitmane
بڕوایی، باوەڕ، دڵنیایی، خاترجەمیی.

**متورفه** (ن) miturfe
جوان، بزماتوو، نەشمیل.

**مت ومورو** (نک) mit w mürü
متوموور، زنوزەنگیانە، متومورک، متوموورە.

**متیل** (ن) mitîl
متیل، بەرگەلیفەبەرگی لێفە.

**مجرۆ** (ئان) micro
کوێر، کۆرە.

**مچورک** (ن) miçurk
مچرک، تەزوی لەش، موچرک، موچرکە.

**مخابن** (ئسب،کی) mixabin
بەداخەوە، حەیف!

**مر** (ئان) mir
زۆرتێر، سێر، تێروتەسەل.

**مراد** (ن) mirad
مراز، ئارەزووی دڵ، ئاوات، ویست وخواستی دڵ.

**مراز** (ن) miraz
کام، هەوەس.

**مربوون** (کتن) mirbün
تەواو تێربوون، تێروتەسەل بوون.

**مرخ** (ن) mirx
قرم، خەیاڵی تەماحکارانە، دڵە(کورکە، کورکێ).

**مرخ لێ خۆش کردن** (ئد) mirx lê xoşbün
مـرخ(لێ چـوون، لێ پـەڕین)، دڵ بـۆ کورکیـان، تامـەزرۆی وەدەسـت هێنـان بـوون (شـتێ یـان مەبەستێ).

**مرخێش مرخێش (شت) ڕاکێشان** (کتپ)
mirxêš mirxêš(šit)rakêšan

مرخیش مرخیش بەکێش کردن.

**مرداربوونەوە (کتن)** mirdarbûnewe

مردارەوەبوون، گیان دەرچوون، بەلاداهاتن.

**مردن (کتن)** mirdin

گیان(دەرچوون، لەلەشدا نەمان) ڕۆح تێدانەمان.

**مردن کەری دەچاڵە، لەهەموو ماڵە (پن)**

mirdin kerî decale, male

هەموو کەس هەر دەمرێ.

**مردن هەرجارێکە، شیوەن یەکجار (پن)**

mirrdin her carêke, šîwen jekcar

خۆت بهاویتە خەتەرناکیەوە، باشترە لەوەی هەمیشە لە مەترسیدابیی.

**مردنی پێ نیشاندە، تا بە لەرزوتا ڕازی بێ (پن)**

mirdinî pê nišande, ta be lerzwta razî bê

باری قورس بدەبەسەر کەسێکدا تا بەبارێکی سووکتر ڕازی بێ.

**مردنی میریی چاکترە لەژینی ئەسیریی (پن)**

mirdnî mîrî çaktre le jînî esîrî

ا- یان مردن یان ژیانی بەشەرەف.

ب- مەردانە مردن نەک ناکەسانە ژین.

**مردوو (ئان)** mirdû

مردگ، مردیی، مریک، گیان تیانەماو.

**مردەلۆخە (ئان)** mirdeloxe

سست، مردوولە، مریلە(مرۆڤ).

**مرقاندن (کتن)** mirqandin

مرقان، مرق کردن، مرکاندن، مرقانن، مرقە(کردن، لێوە هاتن)، دەنگێ لەگەرووهێنان(هاتن) بەبێ دەم کردنەوە.

**مرواریی (ن)** mirwarî

مراری، لولو.

**مرۆڤ (ن)** mirov

١- مرق، مرۆو، ئینسان، پیاو، کەسێ، یەکێ. ٢- خزمەتکار، خزمەکار، پیاوی ژێردەستەی کەسێ. ٣- خزم، کەس.

**مرۆک (ئان)** mirok

کوشندە، کوشننە، کوژە.

**مرومشت (ن)** mirw mišt

دەمەدەمێ، دەم بەدەمە، مشتومڕ.

**مرومۆچ (ئان)** mirw moç

مرومۆن، مۆن وگرژ، ڕوو(گرژ، تاڵ، ترشاو).

**مروموش (ن)** mirwmûš

مل ومووش، بۆن بەئەرزەوە کردنی حەیوان(سەگ، گورگ..) بۆ دۆزینەوەی خواردەمەنیی.

**مرە (ن)** mire

کەف، مرەمری سەگ.

**مریشک (ن.م)** mirîšk

مر، مامر، کەرکی، کەرگی، کارگ.

**مریشکی ڕەش، هێلکەی سپی ئەکا (پن)**

mirîškî reš ,hêlkey spî eka

لەسەر ڕواڵەت حوکم مەدە بەسەر خەڵکدا.

**مز (ن)** miz

مزە، ماف، هەق، کرێ، هەقدەست، هەقی کار، مزد.

**مزر (ئان)** mizir

ترش وشیرین، مێخۆش.

**مزرە (ن)** mizre

ناوجۆ، بیرە.

**مزرەمەنیی (ن.می)** mizremenî

پرتەقاڵ ولیمۆو نارنج...

**مزگەر (ن)** mizger

وەستای حاجەت سپی کردنەوە.

**مزگەوت (ن)** mizgewt

مزگەت، مزگی، مزگ، مزگەفت، مەچت، جێگەی نوێژ لێ کردنی بەکۆمەڵ.

**مزگێنیی (ن)** mizgênî

١-مژدە، مزگانیی.

٢- مژدانە، مژدانیی، مژدیان، مژدینیی.

**مزمەعیل (ئان)** mizme'aîl

کوێر، کوێرایی داهاتوو.

**مژ (ن)** ١ mij

موژ، تەم، تۆمان، هەور وهەڵا، هەوری نەویی (تەنک یان خەست).

**مژ (ن)** ٢ mij

مژە، کاری(هەڵمژین، چەکاندن).

**مژان (ن)** mijan

برژانگ.

**مژدە (ن)** mijde

ب (مزگینیی).

**مژۆڵ (ئان.کی)** mijol(ki)

خەریک، سەرگەرمی(ئیش، کار).

**مژین (کتپ)** mijîn

١- مژتن، مێژان، مێژتن، چکاندن، چلپاندن، چکانن، مریستن، قوم لێدان، دەم(تێنان، لێ نان). ٢ - هەڵمژین.

**مست** ( ن ) [١] mist

١- دەستی( داخراو، قوچاو ).

٢- پال یان کۆلەمستە( بەمست ).

**مست** ( ن ) [٢] mist

لەپ، بەری دەست، مشت.

**مستە کۆلە لێ دان** ( کتپ ) mistekole lêdan

سیخورمەلێدان، کولمەک پیداکیشان، تێ سرەواندن، پیداکیشان( بەمستەکۆلە ).

**مسکین** ( ن ) miskên

رایەت، دیهاتیی، ژێردەستە.

**مشار** ( ن ) mišar

هەرە، ئەرە، ئامرازی ددانەداری( دارتاش، قەساب، دارکەر )، هەرەی:( داپاچیین، دایەرەیی، دریژاو دریژ.. ).

**مشت** ( ن ) mišt

دەمەقالە.

**مشتاخان** ( ن ) mištaxan

مشتاخە، مستاخ، کاتی میوە وشک کردنەوە ( میوژ، میوە.. ).

**مشتو** ( ن ) mištü

قەفت، قەفد، دەسک، جیگای مست ودەست پیوەگرتن، دەستک، دەسە.

**مشت ومالٚ کردن** ( کتپ )mištwmal kirdin

مالشت کردن، مالیین، پاک کردنەوە، خاوین کردنەوە، ساف کردن.

**مشتەگان** ( ن ) mištegan

دەستپەڕ، دەسپەڕ، جلق.

**مشتی داوە بەدرەوشا** ( پن )

mištî dawe be direwša

بەگژ ئیشیکیی گەورەدا چوون و زیان لیوەتووش بوون. ا- بەرەوڕووی نووکی ڕم ڕاکردن.

ب- شەق لەدرک هەلدان.

**مشوورخواردن** ( کتن ) mišür xwardin

خەم لەبەربوون، بەتەنگەوە( بوون، هاتن )، هەولٚ دان بۆ پیک هینان وڕاپەڕاندن ( ئیش، کار ).

**مشە** ( ئان،کی ) [١] miše(ki)

زۆر، زەحف، فرە، بۆش.

**مشە** ( ن ) [٢] miše

مشەمش، دەنگی هەناسە لەلووتەوە، دەنگێ کەلە لووتەوە بیتەدەرکاتی هەناسەدان.

**مشەخت** ( ئان ) mišexit

ئاوارە، دەربەدەر.

**مفت** ( ئان ) mift

هەوانتە، هەروا، موفت، موفتە، مفتە، بەلاش، خۆڕایی.

**مفتەخۆر** ( ن ) miftexor

مفتخۆر، هەوانتەچیی، هەوانتەخۆر، لەبەلاشگەڕ.

**مفتی** ( ن ) miftî

شەرعیی، دەسووردەر، دەسوورنووس، موفتی.

**مل** ( ن ) mil

ئەستۆ، گەردن، سوکر، پیسیر، قەرپک.

**ملانێ** ( ن ) [١] milanê

نۆدان، نۆرەوانیی.

**ملانێ** ( ن ) [٢] milanê

ملانە، ڕقەبەریی، ڕکەبەریی، گولاش.

**ملپیچ** ( ن ) milpêç

ستۆپارێز، پارچەیە تەنراو یان قوماشە کەلە( مل،ئەستۆ )ی دەئالینن.

**ملتە** ( ن ) milte

ملت، خلتە، تلپە، تلتە.

**ملچاندن** ( کتن ) milçandin

( ملچ، مرچ، مرچە مرچ، ملچە، ملچەملچ )کردن.

**مل دان** ( کتن ) mildan

١- مل ( کەش کردن، شوڕکردن، ڕاکیشان )، قایل بوون. ٢- گوێ( ڕایەلٚ بوون، ڕایەلیی کردن )، مل لێ ڕاکیشان.

**مل شکاندن** ( کتپ ) mil šikandin

١- زیان پێ گەیاندن. ٢- سەر پێ دانەواندن.

**ملک** ( ن ) milk

مولک.

**مل کەچ** ( ئان ) mil keç

١- گەردن کەچ، گوێ ڕایەلٚ، ژێرفەرمان.

٢- لارەمل، کوسکەش.

**مل نەدان** ( کتن ) mil nedan

سەرپیچیی کردن، ڕازیی نەبوون، قبوولٚ نەکردن.

**ملوانکە** ( ن ) milwanke

ملوانە، ملوینە، ملەوانە، ملوەن، ملوینک، ملوینکە، گەردنبەند.

**ملٚ وموش کردن** ( کتن ) milw müš kirdin

ملومۆکردن، کەوتنەسۆراخی خۆتێر کردن.

**ملیوان** ( ن ) milîwan

یەخە، ملشۆ، جیگای مل لەجل دا.

**منالٚ** ( ن ) [١] minal

مندالٚ، زاڕۆک، زاڕۆ، زاڕوو، زاڕۆنگ، زاڕۆلە، مندار.

**منال** (ن) ² minal

کـوڕ، کـچ، بەچکـە، پزلـە، بێچـوو، بـەچ، منـدال، وەڵە،زارۆک.

**منال بوون** (کتن) minalbûn

مندال بوون، بێچوو(بوون، هێنان)، زان.

**منالدان** (ن) minaldan

منداردان، زاگە، جێگەی پیزە لەزگدا، پرزانگە، پـزوو، چارەکە.

**منال لەمنالییەوە دیارە** (رس)

minal le minalîyewe diyare

داهـاتووی منـدال لەسـەرەتاوە دیـارە، نموونـەی داهاتووی مندال لەسەرەتاوە دیارە.

**منالە بەر** (ن) minaleber

منداڵـە بـەر، ژنـێ کـە(منـالی بچوکی بەبـەرەوەبێ، زارۆی شیرەخۆرەی هەیە).

**منالەورتکە** (ن) minalewirtke

منالەورکـە، منالەوردکـە، زارۆلان، منـدارە (ورتکـە، ورکە).

**منالی** (ن) minalî

مندالی، ڕۆژگاری (زارۆکیی، منداڵیتیی، منالیتیی).

**منجل** (ن) mincil

پەلە، منجەلی، منجلیی.

**منگن** (ئان) mingin

گن، کەسێ کەبەلووت قسەبکات.

**منمنۆک** (ئان) minminok

من منێ، خۆ پەسند، خۆخۆییکەر.

**منەت** (ن) minet

منە، چاکە، سپاس، چکیی، باری چاکەی کەسێ.

**منەتبار** (ئان) minetbar

سوپاسگوزار، منەبار.

**موو** (ن) ¹ mü

تـووک، قـژ، ئەوتالانـەی لەسـەر پێسـتی مـرۆڤ.. دەڕوێن.

**موو** (ن،پز) ² mü

دوومەلێکی قوولی بەئازارو پـڕ کێم وجەراحەتـە لـە کۆتـایی سـەری پـەنجەی دەسـت یـان قـاچ دێـت بـە تایبەتی لەدەوروپشتی نینۆک.

**موبەق** (ن) mübeq

مەتبەخ، مدبەق، جێگەیان ژووری چێشت لێنان.

**موتوربە** (ن،رو) muturbe

متربە، متوربە، پەیوەندی داروددرەخت.

**مۆتەکە** (ن) moteke

١- مۆتە، کـاوس، سـرنجک. ٢ - خـەوی(نـاخۆش، بەترس) کەهەناسەی مرۆڤ سواردەکا.

**مووچاغ** (ن) müçax

باروکە، کلاوقیرینـە، موچاغ، سەروپـرچی دەسـکرد، قژ یان پرچی بەدەل.

**موچرک** (ن) muçirk

مچورک.

**مووچە** (ن) ¹ müçe

مەعاش، معاش، جیرە، جەلات، مانگانە..

**مووچە** (ن) ² müçe

بەش، بەرات.

**مووچە** (ن) ³ müçe

جومگەی لاقی ولاخ.

**مووچەخۆر** (ن) müçexor

جیرەخۆر، مووچە بۆ وەبـراو، مـەعاش خـۆر، معاش خۆر، فەرمانبەر.

**مۆخ** (ن) mox

١- مەغز، مژی، مەژگ(ناو ئێسکی لەش).

٢-مێشک، مەغز. ٣- ناو، ناوک، کاکل، کاکلە.

**موور** (ن) mür

بارسـتەی قـوڕ لەسـەریەک وبـەدرێژیی(بـۆ دیوارکردن) دیواری لەقوڕ دروستکراو.

**مووروو** (ن) mürü

مووروک، موور، مووروگ.

**مووڕێژە** (ن،پز) mürêje

مـووزەرە، مـووپزە، مـووپژە، نەخۆشـیی تـووک لێ وەرین.

**مووسایی** (ن) müsayî

جوو، جوولەکە.

**مووشەدەمە** (ن) müšedeme

دەمە، کوورکە.

**موخەیری** (ن) müxeyrî

ئاگردانی ناودیوار، موغاریی، بوغاریی.

**موقرایی** (ن) muqrayî

کویرایی، لێلایی(چاو).

**مووینە** (ئان) müyîne

پڕموو، مووین، گژنە.

**موویەک لەبەراز بکرێتەوە هەرباشە** (پن)

müyek le beraz bikrêtewe her baše

هـەر پـارەیەکی کـەم لەدەسـتی چـرووک بێتـەوە هەرباشە.

**مووبەك لەم ناوستەهەلكەنە** (رس) müyek lem naw miste helkene
لەنەبوو هیچ ناكرێ.

**مۆدە** (ن) mode
مۆد، داب، ڕێ وشوێنی تازەبابەت.

**مۆر** (ئان) mor [1]
بنەوشەیی، ڕەنگی بنەوش، وەنەوشەیی.

**مۆر** (ئان) mor [2]
١- دەست لێ نەدراو. ٢- كار پێ نەكراو.

**مۆر** (ن) mor [3]
تامغە، دامغە، خەتم(پۆستە، بازرگانیی).

**مۆڕ** (ئان) mor [4]
مۆچ، مۆن، ڕووگرژ، تێڕ، ترش، زارچاو.

**مۆرانە** (ن.جج) morrane
كرمیدار، جانەوەری (دارخۆر، جل خۆر..).

**مۆڕبوونەوە** (كتن) mor bünewe
بەتووڕەیی وچاوزەق كردنەوە تەماشای كەسێ كردن،بەتەوس وڕقەوە تەماشاكردن، بەزارچاو نوارین، بە ڕقی چاو تەماشا كردن.

**مۆركردن** (كتپ) mor kirdin
مۆرپێوەنان، تامغەلێدان، ئیمزا كردن بەمۆر.

**مۆڕە** (ن) more
خێسە، تەماشا بەچاوی زەق و(تووڕەیی یان گومان).

**مۆرەخە** (ن) morexe
موورەغە، مۆرتخە، مووركە، مورەتخە، موورەگە، مازە، موورێ، تیرەغە، بربڕە، ستون، گازەرە، سینسیل (پشت).

**مۆسیقا** (ن) mosîqa
مۆزیقا، مۆزیقە، دەنگی سازو سەمتوور، ئاوازی تەپڵ و دەهۆڵ وزوڕنا یان نای وكەرەنا وتاروعوود، ئاوازەكانی لە ئامرازی مۆسیقا (دەرهاوردوو، دەرهێنان،دەرهێنراو).

**مۆڵ** (ن) mol [1]
كۆمەڵ، گردو كۆمەڵ.

**مۆڵ** (ئان) mol [2]
زۆر، زەحف.

**مۆڵ خواردن** (كتن) mol xwardin
كۆمەڵ بوون، خڕبوونەوە (لەنزیك یەكتر)، كۆم وەبوون، چوونە پاڵ یەك، خڕبوونەوە.

**مۆڵەت** (ن) molet
ماوە، قان، قانە.

**مۆڵەت دان** (كتپ) moletdan
بوارەدان، ماوەدان، ڕوخسەتدان.

**مۆڵەكە** (ن) moleke
مۆلاكە، جێگەی(ترس، مەترسیی)، پڕ مەترسیی.

**مۆم** (ن) mom
مووم، شەم، شەمێ.

**مۆمدان** (ن) momdan
شەمدان.

**مۆن** (ئان) mon
مرومۆچ، گرژ، ترش، ڕووگرژ.

**مەبەست** (ن) mebest
مەبەس، نیاز.

**مەتاڵ** (ن) metal
زرێ، سوپێر، قەڵغان.

**مەترسیی** (ن) metirsî
١- ترس، جێگەی ترس.
٢- سام، بیم، عەیبەت، هەیبەت.

**مەتكەب** (ن) metkeb
مەتكەو، سمە، سمبە، كونكەرە، مەتە، شخاب، شخاف، شفاب.

**مەتەریز** (ن.س) meterêz
مەتەریس، سەنگەر، خەڵ، كونەمەتەریس.

**مەتەڵ** (ن) metel
مەتەلە، مەتەڵۆكە، مەتەڵۆكە، دەناچیە، ئەوەچیە، شتێكانێ.

**مەڕ** (ن.ئا) mer
مەه، مە، مەها، مێ، پەز.

**مەراق** (ن) meraq
١- خەم وكول، خەفەتی زۆر بەدەست شتێكەوە یان كەسێكەوە. ٢- ئارەزوو، تاسە.

**مەرام** (ن) meram
مەبەستی دڵ، نۆز.

**مەرایی** (ن) merayî
ڕیایی، كلكە(لەقێ،سووتە).

**مەرایی كردن** (كتپ) merayî kirdin
ڕیایی كردن، كلكە(لەقێ، سووتە)كردن.

**مەرج** (ن) merc
بەڵێن، پەیمان، گفت، قەول.

**مەرد** (ن.ئان) merd [1]
ئازا، دلاوا(لەشەڕدا).

**مەرد** (ئان) merd [2]
مەرەدمیر، جوامێر، خاوەن پیاوەتیی.

مەرگ (ن) merg

مردن.

مەڕمەڕ (ن) mer̲ mer̲

جۆرێ بەردی سەختی هەمەڕەنگەی باشە.

مەرە (ن) mere

سەغڵەتیی، دەردی سەریی، گرفتاریی.

مەڕەسوورە (ن،ئا) mer̲esüre

سەرەکێویی، حەیوانەکێویی، پەزی کۆفیی (بەرانەکەی دووشاخی هەڵگەڕاوەی هەیە).

مەرهەم (ن) merhem

مەڵحەم، مەلهەم، هەتوان، دەرمانی تێ هەڵسوون، بەڵسەم.

مەزات (ن) mezat

مەزاد، هەراج، فرۆشتنی بەجاڕدان کەهەرکەسێ زیاتری دا بۆ ئەوێ شرەفرۆشیی، شرکەو پرکە فرۆشیی.

مەزاق (ن) [1] mezaq

گاڵتە، شۆخیی، حەنەک.

مەزاق (ن) [2] mezaq

چێژ، چێژە.

مەزرا (ن) mezra

کەشتگا، کێلگە، مەزرە، دەشتاییەک کەشینایی تێدا کرابێ، جێگەی شت لێ چاندن.

مەزن (ئان) [1] mezin

زەلام، گەورە.

مەزن (ن) [2] mezin

سەرۆک.

مەزن (ئان) [3] mezin

مازن، مەزند، شاهانە، شکۆمەند.

مەزندە (ن) mezinde

مەزەندە، بیر، بیروڕا.

مەزە (ن) [1] meze

دەمچروو، خواردنێ کەلەگەڵ مەی خواردنەوە دەخورێ.

مەزە (ن) [2] meze

تام، چەشکە، چەش، چێژە، مێ.

مەزەدار (ئان) [1] mezedar

بەلەزەت، بەتام، خۆش چێژە.

مەزەدار(ژن) (ئان) [2] mezedar(jin)

زۆرجوان.

مەست (ئان) [1] mest

دنگێ، مەس، سەرخۆش، مەستوور.

مەست (ئان) [2] mest

غەڕا، لەخۆبایی.

مەست (ئان) [3] mest

چاوگەورە و ڕەش.

مەسینە (ن) mesîne

مەسین، ئافتاوە، لوولێنە.

مەشرەف (ن) mešref

ڕاوێژ وبوو.

مەشق (ن) mešiq

مەشغ، مەخش، هۆژان.

مەشکە (ن) meške

مەلێز، پێستەی حەیوانی گووراو، مەشکالە.

مەغز (ن) [1] mex̲iz

کاکڵ(گوێز..).

مەغز (ن) [2] mex̲iz

مێشک.

مەکتەب (ن) mekteb

مەکتەف، مەکتەو، فێرگە.

مەکۆ (ن) meko

جێگەی نهێنیی کۆبوونەوەی خەڵک.

مەگەر (ئپ،ئاک) meger

مەگەن، مەگین.

مەگەز (ن،جع) megez

جروجانەوەری بچوکی باڵدار(مێش، مێشی ئاومال،مێشەکەرانە، مێشی سەوز).

مەل (ن،م) mel

باڵدار، پەلەوەر، پەلەور، پەڕندە، فرندە، تەیر، مەلی (گۆشتخۆر، ئاوازە خوان، چرین).

مەلاس (ن) mel̲as

ملاز، بەزەوییەوە(چەسپاو، نووساو).

مەلاس دان (کتن) mel̲asdan

ملازدان، خۆمەلازدان، خۆنانەوە، خۆبەزەویدا نووساندن.

مەلاشوو (ن) mel̲ašü

مەلاشک، ملاشک، ملاز، بنمیچی زار، ئاسمانەی ناودەم.

مەلامەت (ن) [1] mel̲amet

هۆ، سەبەب.

مەلامەت (ن) [2] mel̲amet

نهێنیی، پەنهایی.

مەلبەند (ن) mel̲bend

١- مەڵبەن، مەڵوەن، کاڤار، ناوچە.

٢- ئاقار، جێگە.

**مەلهەم** (ن.پز) melhem

ب (مەرهەم).

**مەلۆ** (ن) melo

دراخە، مەلۆک، لۆدەی دەغلی درواو، دەسەوارەی گەنموجۆی دوراوە.

**مەلۆتکە** (ن) melotke

مەلۆتکە، منداڵی(ساوای پێچراوە، قۆناغەکراو، قوماتە کراو).

**مەلوول** (ئان) melül

خەمبار، کز.

**مەلە** (ن) ١ mele

سۆبایی.

**مەلە** (ن) ٢ mele

وسل، شتاو.

**مەلەکردن** (کتن) melekirdin

١- سۆباهییکرن، سۆبایی‌کردن، لەئاو(دان، پەرپینەوە) بەمەلە، لەئاودا یاریی کردن و نەخنکان.
٢- خۆشتن. ٣- وسل دەرکردن.

**مەلەوان** (ن) melewan

مەلەزان، ئاویار، سۆبەباز.

**مەمک** (ن) memik

مەم، مەمان، مەمکە، مەمل، مەمۆ، مەمۆلە، مەملە،مەمیلە، مەمۆتێ، دوو هەنارەی خڕ وپڕی گۆشتنی گۆمۆری سەرسنگی ژنە...کەمنداڵی بوو شیریان تێ ئەزێ، لەسەر سنگی پیاو دووگۆی پچووکن.

**مەمکەخۆرە** (ن) memke xore

شیرەخۆرە، مەمکخۆر، منالی بەرمەمکانە، مەملە دەمێ.

**مەمکەمژە** (ن) memke mije

مەمکە، مەمکەمژ، مەمکەی منداڵ خافلاندن.

**مەنجەڵ** (ن) mencel

مەنجیل، قازان، قەزان، تیانە، بەرۆش.

**مەنزڵ** (ن) menzil

مەنزڵگە، مزلگە، لادەگا، لاگا، بارگا، مەنزەل، مزل، بارەگا، مەنزیل، شوێنی کاروان لێ خستن، خان.

**مەنگ** (ئان) meng

١- مەند، ئاوی(پەنگ خواردوو، قووڵ کەخوڕیش نەبێ، راوەستاوی بێ بزوتن). ٢- سەنگین، بەپشوو ولەسەرخۆ، مرۆڤێ هەڵەشەنەبێ.

**مەنگەنە** (ن) mengene

گیرە، گیرکە، گیرە، مەنگەن.

**مەوج** (ن) ١ mewc

شەپۆل.

**مەوج** (ن) ٢ mewc

جاجم.

**مەودا** (ن) ١ mewda

تیژایی، دەمی تیغ، لێواری تیغ..

**مەودا** (ن) ٢ mewda

١- ماوە، نێوان. ٢- مەیدان، مەیان.
٢- سەردەمێ لە(کات، سات، ماوە).

**مەی** (ن) mey

بادە، شەراو.

**مەیان** (ن) meyan

مەیدان، گۆڕەپان، دەشتایی پانی گەورە.

**مەیاندن** (کتپ) ١ meyandin

مەیانن، ئامیان لێدان، هەویر ترش تێ کردن.

**مەیاندن** (کتپ) ٢ meyandin

مەیانن، کردنە سەهۆڵ.

**مەیانە** (ن) meyane

دۆستایەتیی، ئاشنایەتیی، بەین، نێوان.

**مەیت** (ن) meyt

جەنازە، لاشەی مردوو.

**مەیتەر** (ن) meyter

مەهتەر، سایس، سەیس، خزمەتکاری ئەسپ.

**مەیخانە** (ن) meyxane

شەرابخانە، شیرەخانە، دوکانی(مەیفرۆش، مەی لێ خواردنەوە).

**مەیخانەچیی** (ن) meyaxaneçî

مەیفرۆش، ئارەق فرۆش، شەراوفرۆش.

**مەیخۆر** (ن) meyxor

ئارەقخۆر، مەینۆش، شەراوخۆر، بادەنۆش.

**مەیدان** (ن) meydan

جەنگا، شەرگە.

**مەیدانبازیی** (ن) meydanbazî

مەیدانوازیی، گۆڕەپانی (یاریی، گەمە).

**مەیل** (ن) ١ meyl

ئارەزوو، تاسە، هەوەس.

**مەیل** (ن) ٢ meyl

خۆشەویستیی.

**مەیلەو** (ئپ.ئاک) meylew

ئامال، هەروەک.

**مه یموون ( ن،نا )** meymün
مه‌مینه، مه‌یمینک، قوونسوور.
**مه یموون خۆی جوان بوو ئاوله‌شی ده‌ردا ( پن )**
meymün xpy jwan bü, awleşî derda
کاتێ ده‌وترێ که‌ دۆخی کاروباری له‌خراپ بۆ خراپتر بروا.
**مه‌ینه‌ت ( ن )** meynet
ده‌ردوئازار، تالاووده‌ردی سه‌ریی.
**مه‌یین ( کتن )** meyîn
توندبوونه‌وه( تراو..)، گڤیین.
**میاو ( ن )** miyaw
میاوه، میاوه‌میاو، مرمیاو، میاومیاو، ده‌نگی پشیله.
**میاواندن{پشیله} ( کتن )** miyawandin (pişîle)
میاوه‌کردن، میاوه‌میاوکردن،مرمیاوکردن.
**میچ ( ن )** mîç
جگ، چوو، قاپ.
**میر ( ن )** ١ mîr
ڕۆژ، ڕووناکیده‌ر، کانگای ڕووناکیی، میترا.
**میر ( ن )** ٢ mîr
سه‌رۆک، سه‌ردار، گه‌وره، پایه‌دار.
**میر ( ن )** ٣ mîr
خۆشه‌ویستیی، میهر.
**میرات ( ن )** ١ mîrat
که‌له‌پوور، بۆماوه.
**میرات ( ن )** ٢ mîrat
میراتیی، ماڵێ بۆ که‌سێ به‌جێمابێ.
**میراتگر ( ن )** mîratgir
میراتبه‌ر، میرات به‌رکه‌وتوو، که‌له‌پوورگر.
**میرزا ( نان )** ١ mîrza
خوێنده‌وار، نووسنده، خوێنه‌ر.
**میرزا ( ن )** ٢ mîrza
میرزاده.
**میرنشین ( ن )** mîrnişîn
ئیماره‌ت، ولاتێکه که‌میرێک به‌ڕێوه‌ی به‌رێ.
**میره ( ن )** mîre
په‌یمانگه، جێ ژوان، ژوانگه.
**میریی ( ن )** ١ mîrî
سه‌ربه‌ده‌وله‌ت( دارایی..).
**میریی ( ن )** ٢ mîrî
گه‌وره‌یی، سه‌رۆکیی.
**میزکردن ( کتن )** mîz kirdin
میزتن، میزیان، میز به‌ردانه‌وه، میزکردن، هه‌لمیزتن، گمیز کردن.

**میل ( ن )** ١ mîl
نه‌شته‌ر.
**میل ( ن )** ٢ mîl
خه‌تی ڕاست له‌سه‌رکوتال.
**میل ( ن )** ٣ mîl
یه‌که‌یه‌کی پێوانه‌یه به‌رامبه‌ر ١٧٦٠ یارد( نزیکه‌ی ١,٦١ کیلۆمه‌تر).
**میل ( ن )** ٤ mîl
ئاسنی درێژکۆله، ڕۆت.
**میل ( ن )** ٥ mîl
کیلی قه‌بر.
**میل ( ن )** ٦ mîl
پایه‌یه‌که له‌ڕێ وباندا دروست ده‌کرێ بۆ ئامۆژگاریی مه‌ورداوهات وچۆ...
**مینا ( ن )** ١ mîna
شووشه.
**مینا ( ن،رو )** ٢ mîna
گوله‌مینا.
**میوان ( ن )** mîwan
مه‌یمان، میهمان، میڤان، میهڤان، مه‌هڤان، میهڤان، میرفان، میوان.
**میوانخانه ( ن )** mîwanxane
١- میوانخانه، میهڤان خانه٢. - جێگه‌ی شه‌و.
**میواندار ( ن )** mîwandar
میهمانـدار، میڤاندار، که‌سـێ که‌زۆر( میـوانی هه‌یـه، میوان ڕاده‌گرێ ).
**میوان که‌ری خانه خوێیه ( پن )**
mîwan kerî xane xwêye
مه‌به‌ست ئه‌وه‌یه میوان نابێ ناڕه‌زایی ده‌ربـڕێ یـان تیلـه‌وتوانج بگریتـه ئـه‌و خـواردن و خزمه‌تـه‌ی خانه‌خوێ پێشکه‌شی ئه‌کات.
**میوانی دره‌نگ وه‌خت گله‌یی له‌سه‌ر خۆیه‌تیی ( پن )**
mîwanî direngwext gileyî leser xoyetî
میوانی ناوه‌خت هه‌ر ئێسقانی بۆ ده‌مێنێته‌وه.
**میوانیی ( ن )** mîwanî
مه‌یمانیی، میهمانیی، سه‌ردانیی.
**میوه ( ن )** mîwe
میوه، فێقی، به‌ری خوارده‌نیی باخ و بێستانی گولیلکدار.

**مێ** (ن) mê

ما، ماکە، ماینە، مەها، ماچە، میچکە، مینگە.

**میباز** (ن) mêbaz

ژنباز، تۆلاز، داوێن تەڕ، پیاوێ کەزۆردەوری ژنان ئەدا.

**میچکە میچک** (ن) mêçke mêçk

مەرایی، کلکە سووتە.

**میخ** (ن) mêx

میخانە، سنگی ئاسن.

**میخۆش** (ئان) mêxoš

ترش وشیرین، ترش مەزە، مەزەدار.

**میخەک** (ن،رو) mêxek

قەنەفل، قەرەنفول.

**میراتیی** (ن،کی) mêratî(ki)

١- پیاوەتیی، میرانیی. ٢- ئازاتیی، ئازایەتیی

**میرخوزار** (ن) mêrxuzar

میرگ، میرگزار، میرغوزار، گیاجاڕ، چیمەن.

**میرد** (ن) mêrd

میر، میردە، میرە، شوو، هاوسەری ژنی مارەکراو.

**میردکردن** (کتن) mêrd kirdin

شوو کردن.

**میردەزمە** (ن) mêrdezime

کاوس، مۆتەکە.

**میرکوژ** (ن،کی) mêrkuj

١- پیاوکوژ، کوژەر. ٢- زۆر جوان(خ).
٣ - چاو جوان(خ).

**میروولە** (ن،جج) mêrüle

میروو، میلوورە، گیرکە، گرنگ، مرۆچە، مۆریلە، میرووچە.

**میروولە کردن(لە ش)** (کتن) mêrule kirdin(leš)

ملووچەکردن، ملۆچەکردن، تەزیین(ئەندامی لەش)

**میریڤان** (ئان،کی) mêrîvan(ki)

مەریوان، میهرەبان، دلۆڤان.

**میز** (ن) ١ mêz

تەپلەکی پان، ستەرک، کورسیلەی شت لەسەردانان خوان.

**میز** (ن) ٢ mêz

ئامێز، باوەش.

**میزەر** (ن) mêzer

سەرپێچ، سەرپێچ، شاشک، میزەرە...

**میژ** (ن) mêj

دێر، دێرنگ، رابردوو، رابوردوو، رۆژگاری کۆن.

**میژوو** (ن) mêjü

سەرگوزەشت، سەرنوێشت، تاریخ، دەنگوباسی رابوردوو (نوسراو، یان دەماو دەم).

**میش** (ن،جج) mêš

مەش، مەشە، مەش، مەگەز، مەگەس.

**میش لە قە پینێتەوە** (ن،جج) mêš eqepênêtewe

واتە: بێ ئیش وکارە، کات بەفیڕۆ ئەباتەسەر، پەنجەی خۆ ئەتەقێنێ.

**میشک** (ن) mêšik

١- میژی، مژی، مەژگ، مەغز، مۆخ، دەماخ، مەژۆ، مەژگە، مەزگ، مەژو.
٢- زیرەکیی، پڕ هۆشیی، هۆش، بیر، ژیریی.

**میشن** (ن) mêšin

پێستەی دەباغکراوی مەڕوبزن.

**میشۆ** (ئان) mêšo

حۆل، گەلۆر- نەفام.

**میشوولە کۆمەلە بێ، فیل ییخ ئەدا** (پن) mêšüle komele bê, fîl yîx eda

مەبەست گرنگیی یەکیتیی ویەک بوونەشان بەشانی مێزو ژمارەی مرۆڤ.

**میکوت** (ن) mêküt

کوتەک، مالکوت، توخماخ.

**میمل** (ن) ١ mêmil

بەلا، ئافات.

**میمل** (ن) ٢ mêmil

دوژمن، دژ، ملۆزم.

**میو** (ن) ١ mêw

تلپەی هەنگوین، خلتە یان کریشی هەنگوین، شەم، شەمێ.

**میو** (ن،رو) ٢ mêw

دار(میو، ترێ)، رەز.

**میودان** (کتپ) mêwdan

میو(کردن، تێ هەلسوون).

**میینە** (ن،ئان) mêyîne

میوینە، مێ، گیانداری مێ، مینگە، دەل، دەر، مێیە، جووتی نێرە.

**مێ یەتیی** (ن) mêyetî

میاتیی، مێینەیی، مینگەیی.

